



# لە کوردایەتییەوە بۆ دابەشکردنی کوردستان

د. فایەق گوڵپیی

# له کوردایەتییەوە بۆ دابەشکردنی کوردستان


بابەت: ڕامیاریی و کۆمەڵایەتیی
نوسەر: دکتۆر فایەق موحەممەد گوڵپیی
پێداچوونەوە: دکتۆر (کامەران مەنتیک)، (جهانگیر گوڵپیی)، (هۆگر ئیبراهیم)
هەڵەچن: ڕێبەر بەختیار
دیزاین: ئومێد محەمەد
نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم 2011
تیراژ: 1000 دانە
نرخ: 10000 دینار
چاپ: تاران

# له کوردایه‌تییه‌وه بۆ دابه‌شکردنی کوردستان

## پێشەکیی

ساڵی ٢٠١٠ کتێبی: «سیاسەتی نەتەوەپەرستیی داگیرکەران و پەرچەکرداری خێڵەکیی کورد»م نوسی و بڵاومکردەوە. لەم ساڵانەی دواییدا هەندێک لە هاوڕێکانم و خوێنەرانی کتێبەکە داوایاندەکرد بە کتێبەکەدا بچمەوە، لە چاپێکی نوێدا گۆڕانکارییەکانی ئەم ١٠ ساڵەی دوایی بخەمەسەری و جارێکی تر بڵاویبکەمەوە. منیش ئەو پێشنیازەم قبوڵکرد. لە هەمان کاتدا بێجگە لەوەی بە لامەوە گرنگبوو گۆڕانکارییەکانی ئەم ١٠ ساڵە لە چاپە نوێیەکەدا جێبکەمەوە، سەرنجم لەسەر ناوی درێژی کتێبەکە و هەندێک بەشی هەبوو، کە زۆر درێژمەپێدابوون، بۆیە دەمویست ناوی چاپی دووەمی کتێبەکە، ناوە درێژەکەی چاپی یەکەم نەبێت. دوای گفتگۆیەکی زۆر لەگەڵ خۆم و لەگەڵ هەندێک لە هاوڕێکانم ناوی: (لە کوردایەتییەوە بۆ دابەشکردنی کوردستان) م بە باش زانی، لەبەرئەوەی ئەم ناوە کورتە و واتاکەیشی لە ناوی چاپی یەکەمەوە دوور نییە. بارودۆخی سیاسیی ئەمڕۆی هەرێمی کوردستانیش لەم ناوە نوێیەوە نزیکبووەتەوە. لە لایەکی ترەوە هەندێک لە بەشەکانی چاپی یەکەم، بە تایبەتیی بەشی دووەم و سێیەم زۆر بە درێژیی نوسرابوون، ئەو بەشانەم کورتکردەوە. بۆ بەشی تایبەت بە کەرکوک، بۆچوونێکم لەسەر شەڕی ١٦ی ئۆکتۆبەر هەیە، لەگەڵ شەڕی ٣١ی ئابدا بەراوردیدەکەم. سەبارەت بە بەشی کۆتایی کە تایبەتە بە سیستەمی سیاسیی هەرێمی کوردستان، بە قووڵیی و فراوانیی شیکردنەوەم بۆ کردووە. هیوادارم ئەم چاپە نوێیەم کەموکووڕییەکانی چاپی یەکەمی ڕاستکردبێتەوە و خوێنەر سودی لێوەربگرێت.

ئەم کتێبەم بۆ ئەو کەسە سیاسییانە نوسیوە، کە گرنگیی بە چارەسەرکردنی کێشەی کورد دەدەن، تایبەتتر بۆ ئەو حیزبە سیاسییانەی کوردستانم نوسیوە کە سالآنێکە لە باشوری کوردستاندا خەباتی چەکداریی و خەباتی سیاسیی دەکەن. هیوادارم ئەو حیزبە سیاسییانەیش کە لە ئایندەدا دروستدەبن سودی لێوەربگرن.

لە نوسینی ئەم کتێبەکەدا سودم لە بیروبۆچوونی بیرمەندان و نوسەران وەرگرتووە، سودم لە هەواڵی کەنالەکانی ڕاگەیاندن وەرگرتووە، سودم لە بیرەوەرییەکانی خۆم وەرگرتووە، چونکە چالاکێکی سیاسیی و چاودێرێکی سیاسیی گۆڕەپانی سیاسیی کوردستان و عێراق بووم، سودم لە کاروچالاکییەکانی خۆم وەرگرتووە.

٣١/ ٣/ ٢٠٢٢

**د. فایەق گوڵپیی**

# ١
# دەستپێك

لە باشووری کوردستان، ململانێی بنەماڵەکان لە ڕێگەی حیزبەوە، دیاردەیەکی زەقی بڵاوە و دەستی لە بینەقاقای بوارەکانی ژیانی خەڵک گیرکردووە. ئەگەر لە سەردەمی خەباتی چەکدارییدا حیزبایەتیی کاریگەریی ئەرێنیی لەسەر سیاسەتی کوردستان هەبووبێت، هەوڵی چارەسەرکردنی کێشە نەتەوەییەکانی گەلی کوردی دابێت، لە ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ بە دواوە، لایەنە نەرێنییەکانی حیزب موتوربەکراو بە ململانێی خێڵایەتییەوە، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ فراوانتر دەبن و کاریگەریی خراپ لەسەر دۆزی کورد دادەنێن. لە دوای ڕاپەڕینەوە حیزب ئاستەنگیی جدیی بۆ ئەرکەکانی حکومەت و پەرلەمان و دادگا دروستدەکات. لەبەرئەوەی حیزب بەرژەوەندیی توێژێکی تەسکی کۆمەڵگە دەپارێزێت، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ناکۆکیی زیاتر لە نێوان خەڵک و حیزبدا دروستدەبێت، خەڵک بە گومانەوە سەیری حیزب دەکات.

ئەمە لە کاتێکدایە کە گەلی کورد لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بە دەست چەندیین کێشەی نەتەوەیی و ئابووریی و کەلتوریی و کۆمەڵایەتییەوە دەناڵێنێت، بۆ لابەلاکردنەوەی ئەو کێشانە، شانبەشانی دامودەزگاکانی دەوڵەت، حیزبیشی پێویستە. کەوابوو لێرەدا ڕووبەڕووی بارودۆخێکی ناکۆک دەبینەوە، لە سەرێکەوە جەماوەر

حیزبی لەبەرچاوکەوتووە، لە سەرێکی ترەوە حیزب بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان پێویستە.

بۆ بەلاوەنانی ئەم ناکۆکییە، دوو ڕێگە هەیە، یان دەبێت حیزبەکان چاکسازیی بکەن، یان حیزبی مۆدیل_نوێ دابمەزرێت. بەو شێوەیە دیاردەی حیزبایەتیی سکەی سروشتیی خۆی وەردەگرێتەوە.

بەڵام ئەوەی لە باشووری کوردستان دەیبینین، حیزبە دەسەڵاتدارەکان دان بەم ڕاستییەدا نانێن، چاکسازیی ناکەن، خۆیان ناگۆڕن، ڕێگەنادەن حیزبی نوێ پێکبێت و چالاکییبکات. ئەگەر لە دەرەوەی ئیرادەی ئەوانیشەوە حیزبی نوێ دروستبێت، ئاستەنگیی و گێرەوکێشەی بۆ دروستدەکەن.

حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشووری کوردستان دەمێکە لە ئامانجە نەتەوەییەکانی گەلی کورد دوورکەوتوونەتەوە و ناسنامەی نەتەوەیی گەلی کورد ناپارێزن. لە دوای ڕاپەڕینەوە دەرفەت هەبوو بنەماکانی نەتەوەییبوونی گەلی کورد وەکو هەستی نەتەوەیی، هوشیاریی نەتەوەیی، زمان و کەلتوری نەتەوەیی، ستراتیژی نەتەوەیی، ئاسایشی نەتەوەیی، دەزگای نەتەوەیی، ئاوابکەن (دروستبکەن) و کاری نەتەوەیی پێشبخەن، بەڵام نەک هەر ئەوەیان نەکرد، بە شەڕی ناوخۆیی و دابەشکردنی بەشە ڕزگارکراوەکەی کوردستان و پارچەکردنی کۆمەڵگەی کوردستان، هێندەی تر پایەکانی نەتەوەبوونی گەلی کورد و یەکێتیی نەتەوەیی کوردیان دواخست.

حیزبە دەسەڵاتدارەکان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ کۆمەڵگەی کوردستان بەرەو کۆمەڵگەیەکی خێڵەکیی دەگێڕنەوە، پێکهاتە خێڵەکییە دەسەڵاتدارەکان بۆ ئەوە کاردەکەن هەموو کوردستان بکەنە مسکینی خێڵەکانی خۆیان. حیزبە دەسەڵاتدارەکان و حکومەتی هەرێم پشتیوانیی کۆمەڵگەی کلاسیک و تاکی کلاسیک دەکەن، ڕادەی کوشتوبڕی ژنان و جۆرەکانی تری چەوسانەوەی ژن زیاددەکەن. لە هەرێمی کوردستاندا ڕۆژ لە دوای ڕۆژ جیاوازیی چینایەتیی لە نێوان هەژار و دەوڵەمەندا زیاددەبێت. شێوازی دەوڵەمەندبوونی خەڵک پشت بە پلە و پایەی حیزبیی دەبەستێت. پشت بە توانا و لێهاتوویی کاسپکاران و بازرگانان نابەستێت.

بەهۆی شەڕی ناوخۆیی حیزباکانی کوردستانەوە، بەهۆی شەڕی پێشمەرگە و هێزە چەکدارەکانی عێراقەوە، بەهۆی شەڕە خێڵەکییەکانی ناو کۆمەڵگەی کوردستانەوە، ئاشتیی کۆمەڵایەتیی لە کۆمەڵگەی کوردستاندا هەتا دێت پاشەکشەدەکات.دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان لایەک لە چارەسەری ئەم کێشانە ناکاتەوە، بەرنامەی جدیی بۆ مافەکانی ژن نییە، بەرنامەیەکی جدیی بۆ دادپەروەریی نییە، بەرنامەی بۆ گێڕانەوەی ئاشتیی کۆمەڵایەتیی بۆ خەڵکی کوردستان نییە.

لە ئاستی پێشخستنی سیستەمی دیموکراسیی و کۆمەڵگەی مەدەنییدا، حیزب خۆی لە جێگەی دەسەڵاتەکانی پەرلەمان و حکومەت و دادوەریی و رێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنیی داناوە، دەرفەت بە هیچ یەکێک لەو دەزگایانە نادات بە سەربەخۆیی ئەرکی ئەنجامبدات، دەبێت هەموویان خزمەتی قەڵەوکردنی حیزب بکەن. لەم سەردەمەی کوردستاندا لە باتی دەستوور و یاسا، هاوپەیمانییە خێڵەکییەکان و کۆبوونەوە حیزبییەکان ڕۆڵدەبینن، بەرنامەی کۆنگرەیەکی حیزب، دەستووری هەرێمی کوردستانە، لێدوانی بەرپرسێکی حیزب، دەقی یاسایی هەرێمە و کارییێدەکرێت. ئازادیی ڕادەربڕین و خۆپیشاندان بە شەق و گوللە وەڵامدەدرێتەوە.

حیزب ئابوریی کوردستانی بۆ بنەماڵە قۆرخکردووە، لە دوای ڕاپەڕینەوە ئامێرەکانی ئاوەدانکردنەوەی کوردستان تالانکران و بە وڵاتانی دەوروبەر فرۆشران. ژێرخانی ئابوریی کوردستان ڕاستنەکرایەوە. لەو کاتەوە بە بەردەوامیی نەوت و خاکی هەرێمی کوردستان دەفرۆشرێن. دوای ٣٠ ساڵ لە حوکمی حیزبە دەسەڵاتدارەکان، کشتوکاڵ و گەشتوگوزار و پیشەسازیی لە هەرێمی کوردستان هەتا دێت زیاتر بەلادادەکەوێت. هەرێمی کوردستان بووەتە بازاڕی ساخکردنەوەی شمەکی وڵاتانی داگیرکەری کوردستان.

لە ئاستی خەبات و تێکۆشانی دیبلۆماسییدا، خۆبەدەستەوەدانێکی ئاشکرا دەبینرێت، پاشگەزبوونەوە لە مافە نەتەوەییەکانی کورد بە دەموچاو و هەڵسوکەوتی دیبلۆماتکارانی کوردەوە دیارە، سیاسەتمەدارانی ئەمڕۆی کورد لەپێناو دەسەڵات و بازرگانیی و چنینەوەی دەسکەوتی مادییدا، مافە سیاسییەکانی گەلی کوردیان فەرامۆشکردووە. دیبلۆماتی کوردیی نەیتوانی سود لەو گێژاوە سیاسییە وەربگرێت،

که له ئەنجامی شەڕەکانی نێوان ڕژێمی سەدام و هەر یەک لە ئێران و کوێت و هاوپەیمانان هاتەپێشەوە، نەیتوانی سود له گێژاوی ڕوخانی ڕژێمی سەدام بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد وەربگرێت. دیبلۆماسیەتی هەرێمی کوردستان نەیتوانی ئەو پەیامە بگەیەنێت، کە هەتا کێشەی کورد چارەسەرنەکرێت، ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئاشتیی و ئارامیی بە خۆیەوە نابینێت.

له دابینکردنی خزمەتگوزاریی و پێویستییەکانی ڕۆژانەی خەڵکی کوردستان، کەموکووڕیی جدیی دەبینرێت، دیاردەی گەندەڵیی بە هەموو جۆرەکانیەوە هەتا دێت پێشدەکەوێت و میکانزمی پێویست بۆ سنووردارکردنی دانانرێت. دواخستن و پاشەکەوتکردن و لێبڕینی موچە، له هیچ وڵاتێک و له هیچ هەرێمێکی جیهاندا نییە، دەسەڵاتدارانی هەرێم ئەم نمونە جوانەی چەوسانەوەی ئابوریيان بۆ خەڵکی کوردستان داهێنا.

له هەرێمی کوردستان، بارێکی دەرونیی وا هاتووەتە پێشەوە کە خەڵکی کوردستان حکومەتی هەرێم و دەسکەوتەکانی تری باشووری کوردستان بە موڵکی خۆی نازانێت، داکۆکییان لێناکات، پێشیاننناخات، لەبەرئەوەی لە سەرووی حکومەتی هەرێمەوە، حیزب و خێڵ و بنەماڵەی دەسەڵاتدار هەن، دامودەزگاکانی دەوڵەت بۆ بەرژەوەندیی خۆیان بەکاردەهێنن، خەڵکی پێدەچەوسێننەوە.

بەو شێوەیە له ئەمڕۆی باشووری کوردستان، خەڵکی کوردستان له بەرانبەر حکومەتی هەرێم و دەسکەوتەکانی تری تێکۆشانی گەلی باشووری کوردستان و له بەرانبەر حیزبدا، بەسەر دوو بەرەدا دابەشبوون. بەشە دەسەڵاتدارەکەی باشووری کوردستان ئینتمای بۆ حیزب و خێڵ و بنەماڵە له ئینتمای بۆ حکومەت و پەرلەمان و دادگا بەهێزترە. حکومەتی هەرێمی کوردستان بە خزمەتکاری حیزب و خێڵ و بنەماڵە دادەنێت. بەشەکەی تری خەڵکی کوردستان کە له دەرەوەی دەسەڵاتدا وەستاوە، دەسەڵات لە ڕێگەی دامودەزگاکانی حکومەتەوە دەیچەوسێنێتەوە، دەسەڵاتەکانی پەرلەمان و حکومەت و دادوەریی و حیزب بە موڵکی خۆی نازانێت، بە دەزگای دەستی دەسەڵاتی دەبینێت، ڕقی لێدەبێتەوە و دژایەتییدەکات.

بەو شێوەیە دەبینین پێکهاتەی دەسەڵاتدار و پێکهاتەی بێدەسەڵاتی باشووری کوردستان، هەر یەک لە لایەکەوە و هەر یەک بە شێوەیەک دژی دامودەزگاکانی هەرێم و دژی دەسکەوتەکانی تری باشووری کوردستان و دژی حیزبەکان کاردەکەن، ئەمەیش لادانێکی سیاسییە، کە دەسەڵاتی باشووری کوردستان دروستیکردووە.

لە باشووری کوردستان کۆمەڵێک تێگەیشتنی هەڵە بۆ ژیان و سیاسەت و ئابوریی و بەرهەمهێنان بڵاوبوونەتەوە و کاریانپێدەکرێت، کە کەلتوری سیاسیی داگیرکەرانی کوردستان و سیاسەتی هەڵەی حیزبایەتی باشووری کوردستان دروستیکردون. لەبەرئەوە پێداچوونەوە بە ڕاستینەی حیزبدا، دیاریکردنی لادانەکانی حیزبایەتیی لە باشووری کوردستان، ڕاستکردنەوەی چەمکە هەڵەکان و ئازادکردنی تاک و پێکهاتەکان لە مۆتەکەی ئەم تێگەیشتنانە، هەنگاوی سەرەتاییە بۆ ئەوەی گەلی کورد وەکو پێکهاتە نەتەوەییەکانی تری ناوچەکە و جیهان، بە ماف و ئازادییەکانی شادبێتەوە.

ئەم ڕەوشە نالەبارەی باشووری کوردستان لە کاتێکدایە، هێشتا هزری شۆڤێنیی دەسەڵاتدارانی ناوچەکە لە دژی گەلی کورد پاشەکشەینەکردووە. تێگەیشتنێکی دیموکراتیی ڕاستەقینە لە لایەن دەسەڵاتدارانی ناوچەکە و جیهانەوە بەرانبەر بە دۆزی کورد پێشنەکەوتووە، ئەگەری ئەوە هەیە پلانگێڕیی نوێ و گەلەکۆمەکێی نوێ دژی گەلی کورد بەڕێوەببرێت، لەبەرئەوە بەخۆداچوونەوە و خۆڕێکخستن و خۆبەهێزکردنی گەلی کورد لە هەموو بوارێکی ژیاندا، لە هەموو کاتێک پێویستترە.

من وەکو تاکێکی کۆمەڵگەی باشووری کوردستان کە لە گەرمەی ململانێ و تەنگژەکاندا دەژیم، هەوڵدەدەم لە ڕێگەی ئەم کتێبەوە تێگەیشتنی خۆم بۆ دیاردە و تێگەیشتنە هەڵەکان پیشانبدەم. لە بارەی مێژووی تێکۆشانی گەلی کوردەوە سەرنجی خۆم دەربیبڕم. لە بارەی هزری باوی کۆمەڵگەی باشووری کوردستانەوە سەرنجی خۆم بخەمەڕوو. لەسەر شێواز و هۆکاری پێکهێنانی حیزبەکانی باشووری کوردستان تێگەیشتنی خۆم دیاریبکەم. لەسەر شۆڕشی ئەیلول و شۆڕشی نوێ سەرنج و تێبینییەکان بنوسم. لەسەر ململانێی شۆڕشی کورد و حکومەتی عێراقی ناوەندیی، لەسەر سنووری هەرێمی کوردستان و مافەکانی تری گەلی کورد هەڵوەستە بکەم.

لەسەر کەرکوک و ناوچە دابڕاوەکانی تری باشووری کوردستان، بە هەڵوێستی جیاواز و ناکۆکیی گەلی کورد و دەسەلاتی کوردیی و دەسەلاتدارنی عێراق و ناوچەکە و جیهاندا شۆڕبیمەوە. لەسەر ئەنفال و کیمیابارنی هەڵەبجە و شەڕی براکوژیی، هەڵوێستەبکەم. لەسەر باری ئابوریی و خزمەتگوزاریی و دادپەروەریی دەسەلاتی ئەمڕۆی باشووری کوردستان، تێبینیی خۆم بنوسم. لە کۆتاییدا لەسەر سیستەمی سیاسیی ئەمڕۆی هەرێمی کوردستان سەرنج و تێبینییەکانم بخەمەڕوو، بۆ ئەوەی بە هەمووومانەوە هەوڵی شڵەقاندنی ئەم گۆمە قەوزاوییەی سیاسەتی هەرێم بدەین و پاکیبکەینەوە.

# ٢
# ئایا کورد دەبێتەوە پێکهاتەیەکی چالاک؟

بۆ باسکردن و هەڵسەنگاندنی ڕەوشی ئەمڕۆی کوردستان، بۆ تێگەیشتن لە هۆکار و کاریگەریی لایەنە خراپەکانی ژیانی سیاسیی ئەمڕۆی کوردستان، گەڕانەوە بۆ دواوە، هەڵسەنگاندنی قوناغەکانی گۆڕان و گەشەکردنی کۆمەڵگەی کوردستان بە پێویست دەزانم.

کورد یەکێکە لەو پێکهاتانە کە لە سەردەمی ململانێی ئاینییدا لە ڕێگەی ئاینی ئیسلامەوە لەژێر کاریگەریی هزر و کەلتوری نەتەوە سەردەستەکانی ناوچەکەدا ژیاوە، لە سەردەمی دەوڵەت نەتەوەدا بۆی نەکراوە دەوڵەتی نەتەوەیی دروستبکات، وەکو پێکهاتەیەکی پلە دووی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان هەڵسوکەوتی لەگەڵ کراوە. ئەمە وایکردووە هەم کورد خۆی بە کەم بزانێت، هەم نەتەوە سەردەستەکانی کوردستان و دەوروبەر بە کەم سەیری بکەن و وەکو پاشکۆی خۆیان تەماشایبکەن.

پیشاندانی ڕەچەڵەک و نەتەوەی کورد وەکو پێکهاتەیەکی چالاکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، گەلی کورد لەو گرێ دەروونییە ڕزگاردەکات، کورد هەڵدەستێنێتەوە. لەبەرئەوە بە لامەوە گرنگە کەمێک بۆ دواوە بگەڕێمەوە و بۆ خوێنەری بسەلمێنم، لەگەڵ ئەوەیشدا کە کورد دەرفەتی بۆ نەڕەخساوە دەوڵەت دروستبکات، بەڵام خزمەتێکی گەورەی بە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیی کردووە، ئەو پێکهاتانەیش کە دەوڵەتیان دروستکردووە، زیانێکی زۆریان بە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیی گەیاندووە.

مرۆڤ لە سەردەم و شوێنی جیاوازدا، بەگوێرەی بەرژەوەندیی جیاواز، بەگوێرەی بیروباوەر و هەڵوێستی جیاواز، لە دروستبوونی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتییەوە هەتا ئەمڕۆ، بۆ پێکهاتەی بنەماڵە و خێڵ و نەتەوە، بۆ چینوتوێژی کۆمەڵایەتیی، بۆ هەڵگری ئاین و ئاینزای جیاواز پۆلێنکراوە. لەپێناو مانەوە و پێشکەوتندا لە ململانێ و یەکگرتندا ژیان بەسەردەبات.

پێکهاتە مرۆڤایەتییەکان لە هەر چوارچێوەیەکدا خۆیان ڕێکخستبێت، بەگوێرەی چالاکیی و بەرهەمهێنان، جارێکی تر بۆ پێکهاتەی چالاک و پێکهاتەی سست پۆلێنکراونەتەوە. لەوانەیە خێڵێک لە خێڵەکان، نەتەوەیەک، یان ئاینێکی تایبەت، لە سەردەمێکدا، لە شوێنێکی جوگرافییدا، بۆ خۆی، بۆ مرۆڤایەتیی، داهێنانی کردبێت و بەرهەمی بەدەستخستبێت، ئەم پێکهاتایە بە پێکهاتەی چالاک ناوزەددەکرێت.

پێکاهاتەی چالاک، ئەو پێکهاتەیەیە کە لە بوارە جیاکانی ژیاندا ڕۆڵی کاریگەر دەبینێت، جێپەنجەی لەسەر دروستکردنی شارستانیەت و پاراستنی مرۆڤایەتیی دەردەکەوێت. لە گۆڕان و گەشەکردنی کۆمەڵگەدا دەستپێشخەرییدەکات و کاریگەریی لەسەر پێکهاتە سستەکانی کۆمەڵگە دادەنێت و ئاراستەیاندەکات.

پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی سست، ئەو پێکهاتەیەیە کە لە داهێنان و خزمەتکردنی مرۆڤایەتییدا، خاوەنی ڕۆڵێکی بەرچاو نییە، شوێنی پێکهاتە چالاکەکان دەکەوێت، مێژووی بۆ خۆی تۆمارنەکردووە، لەسەر ڕەنجی پێکهاتە چالاکەکان دەژی.

چۆن پێکهاتەی چالاک و پێکهاتەی سستی کۆمەڵایەتیی هەن، هەر بە هەمان شێوە تاکی چالاک و تاکی سستیش هەیە. هەر کۆمەڵگەیەک زۆرینەی تاکەکانی چالاک بن،

کۆمەڵگەکە چالاک دەردەچێت. بە پێچەوانەیشەوە هەر کۆمەڵگەیەک زۆربەی تاکەکانی سست بن، ئەو کۆمەڵگەیە سست دەردەچێت.

ئەم پۆلێنکردنەی پێکهاتەکانی کۆمەڵگە لە لایەن کۆمەڵناسان و بیرمەندانی هزر و فەلسەفەوە گرنگییەکی ئەوتۆی پێنەدراوە، بەڵام کارل پۆپەری کۆمەڵناسی نەمساویی لایەکی لەم لایەنە شاراوەیەی ژیانی مرۆڤایەتیی و کۆمەڵگەکان کردووەتەوە. لە کتێبە بەناوبانگەکیەدا (کۆمەڵگەی کراوە و دوژمنەکان)*١ بە باشیی باسیکردووە.

گرنگییدان بە چالاکیی پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکان ئامرازێکە لە ڕێگەیەوە پەی بە کۆمەڵێک کێشەی هەنوکەیی و ئایندەی کۆمەڵگەکەمان دەبەین، کە ڕیشەی مێژوویيان هەیە و فەرامۆشکراون. ئێمەیش لەم ڕێگەیەوە دەتوانین بڕێک لە قەیران و گێژاوەکانی کۆمەڵگەی کوردستان تیبگەین و ئێش و ئازارەکانی کەمبکەینەوە.

بەڵام ئەمەیش ئەوە ناگەیەنێت کە هەر پێکهاتەیەک لە مێژوودا بە پێکهاتەی چالاک نەناسرابێت ئیتر چالاک نەبووە. هەندێک تاک و پێکهاتە هەن زۆر چالاک بوون، بەڵام لەبەرئەوەی نەگەیشتوونەتە دەسەڵات، مێژوو کار و چالاکییەکانی بۆ حسابنەکردوون. کەس بە کار و چالاکییان نازانێت. لەبەرئەوەی مێژوو هەتا ئەمڕۆیش تەنها زانستی نوسینەوە و گێڕانەوەی ژیانی تاک و پێکهاتە دەسەڵاتدارەکانی کۆمەڵگەیە.

ئەو پێکهاتە خێڵەکیی و ئاینیی و چینایەتیی و نەتەوەییانەی لە ڕابردوودا چالاک بوون و دەسەڵاتیان بەدەستەوەگرتووە، دەسکەوت و ڕوداوەکانی ژیانی خۆیانیان بە زیادەوە باسکردووە. لە ڕێگەی دەسەڵاتەکەیانەوە دەسکەوت و ڕەنجی ئەو پێکهاتە چالاکانەی تریشیان بە ناوی خۆیانەوە تۆمارکردووە، کە دەرفەتی بەدەسەڵاتبوونیان بۆ نەڕەخساوە. لە لایەکی ترەوە مێژوو زوڵمێکی گەورەی لەو پێکهاتە چالاکانە کردووە، کە پێش داهێنانی نوسین، ئاواکردنی یەکەم شارستانیەتی مرۆڤایەتییان لەئەستۆگرتووە، وەکو باپیرانی گەلی کورد کە پێش داهێنانی نوسین لە ناوچەی میزۆپۆتامیا لە قۆناغی نیۆلۆتیکدا یەکەم شارستانیەتی مرۆڤایەتییان ئاواکردووە.

# داپیرەی پێشەنگ

ئەگەرچی لە سەردەمی ململانێ ئاینیی و ململانێ نەتەوەییەکاندا گەلی کورد پێکهاتەیەکی چالاک نەبووە، شوێنی پێکهاتەکانی تری ناوچەکە و جیهان کەوتووە. لە داهێنان و بەرهەمداریی دورکەوتووەتەوە، بەڵام داپیرە و باپیرەی کورد، لە دۆڵی میزۆپۆتامیای جاران و کوردستانی ئەمڕۆدا، پێکهاتەیەکی چالاکی سەرەتای مێژووی مرۆڤایەتیی بوون و داهێنانی گرنگیان پێشکەشی مرۆڤایەتیی کردووە. لەبەرئەوەی لەو سەردەمەدا نوسین و دەوڵەت نەبووە، داهێنانەکانی کورد تۆمارنەکراون. کۆمەڵگە دەوڵەتدارەکانی دواتر، داهێنان و بەرهەمی گەلی کوردیان فەرامۆشکردووە و بە پێکهاتەی چالاک نایناسن. گەلی کوردیش باوەڕی بەو واقع (کەتوار)ە هێناوە و بەو دەردەوە ژیان بەڕێوەدەبات.

ئەگەر لەمەودوا مێژوونوسان و کۆمەڵناسان و دەسەلاتدارانی جیهان، بە هزر و دیدی نوێوە سەیری ڕابردوو و ئێستا و داهاتوو بکەن، دەسکەوتەکانی ڕەنجی مرۆڤایەتیی تەنها بە بلیمەتیی دەسەلاتداران و زانا و دانا و بیرمەندەکانی دەولەتانی تورک و فارس و عەرەب ئەوروپا و ئەمریکاوە نەبەستنەوە، تەنها خۆیان بە ناوەندی داهێنانی شارستانیەتی مرۆڤایەتیی دانەنێن، بڕوا بەوە بهێنن کە لە سەردەمەکانی تری مێژوودا، لە شوێنەکانی تری جیهاندا، پێکهاتە کۆمەلایەتییەکانی تریش بۆ ماوەیەک ئاواکەر و داهێنەر و هاوکەرییکەری ئەو شارستانیەتەی ئەمڕۆی مرۆڤایەتیی بوون، کە تەنها بە ناوی گەلە دەسەلاتدار و دەوڵەتدارەکانەوە تۆمارکراوە. هەڵوێستەیەکی بەسود دەبێت بۆ ڕاستکردنەوە و پێداچوونەوەی مێژووی مرۆڤایەتیی. گۆڕانکارییەکی بەنرخیش دەبێت لە هزری پێکهاتە چەوساوە و ژێردەستەکانی ئەم سەردەمەی مرۆڤایەتییدا، هەست بە گرنگیی خۆیان دەکەن و چیتر خۆیان بە کەم نابینن.

ئەم گۆڕانکارییە دووسەرییە خزمەتی ئاشتیی کۆمەلایەتیی و پێکەوەژیانی گەلان دەکات، مرۆڤایەتیی بەرەو چارەسەری گێژاو و قەیرانە هەمەجۆرەکانی ئاراستەدەکات.

ئەگەر لەمەودوا بەگوێرەی بەری رەنج و داهێنانی پێکهاتەکان هەڵسەنگاندن بکرێت، دەسەلاتداریی و دەوڵەتداریی بەتەنها پێوەری دڵسۆزیی مرۆڤایەتیی و داهێنان نەبێت،

هەموو لایەک مافی چالاکیی و داهێنانی خۆی بدرێتێ، هەنگاوێکی سەرەتایی دەبێت بۆ گێڕانەوەی بەرهەمە دزراوەکانی ڕەنجدەران و پایەیەکی ئەستوور دەبێت بۆ پێرەوکردنی دادوەریی مرۆڤایەتیی و لەدایکبوونی ئاشتییەکی ناوخۆیی و ناوچەیی و نێونەتەوەیی لە نێوان پێکهاتە ناکۆک و بەشەڕهاتووەکانی ئەم سەردەمەی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتییدا.

ئەگەر چاوێک بە مێژووی لەدایکبوونی مرۆڤ و پێشکەوتنی هزر و دیاردەی بەکۆمەڵگەبوونیشدا بخشێنین، دەبینین پاش تێفکرینی مرۆڤ لە خۆی و دەوروبەری و جیابوونەوەی لە ئاژەڵەکان و پێکهێنانی ژیانی کۆمەڵایەتیی هەتا ئەمڕۆ، بە بەردەوامیی لە پێشکەوتن و گەشەکردنی کۆمەڵایەتیی و ئابوریی و بەڕێوەبردندایە، ململانێی نێوان پێکهاتەی کۆن و پێکاهاتەی نوێ کە لە ئەنجامی پێشکەوتنی هزری مرۆڤدا دەردەکەوێت، بە فاکتەرێکی سەرەکیی پێشکەوتن و گۆڕانکارییەکان دەژمێردرێت. لە هەر سەردەم و شوێنێکی جوگرافیی تایبەتدا، زەمینەی بابەتیی و ناوخۆیی بۆ پێشکەوتن ئامادەبووبێت، ئەو هەنگاوە نراوە، لەگەڵ هەنگاوی پێش خۆی تێکەڵکراوە، بە گوێرەی چەمکی ململانێ و یەکگرتن، بە تێکەڵکردنی هەنگاوەکان بەرهەمێکی نوێی مرۆڤایەتیی (تێکەڵە لە کۆن و نوێ) لەدایکبووە و باشتر و زیاتر لە بەرهەمەکانی پێش خۆی خزمەتی بە مرۆڤایەتیی کردووە*٢.

بۆیە بۆ ئێمەی کورد گرنگە کە بزانین ئەو دەستکەوتانەی ئەمڕۆی مرۆڤایەتیی، تەنها بەرهەمی چالاکیی و تێکۆشانی پێکهاتە دەسەڵاتدارەکانی ئەمڕۆی جیهان نییە، بەڵکو ئەوە بەری ڕەنجی تێکۆشان و چالاکیی ئەو گەل و پێکهاتە کۆنانەی سەردەمەکانی پێشووتریشە، کە بناغەی شارستاینەتی مرۆڤایەتییان داناوە، لە پێشەنگی ئەو پێکهاتانەدا داپیرە و باپیرانی گەلی کورد دێت.

کێشەی گەورەی زانستی کۆمەڵناسیی و سیستەمی کۆمەڵایەتیی ئەم سەردەمە ئەوەیە، کە بەگوێرەی ئەو مەسەلە کوردییە بڕیاردەدات و کاردەکات کە دەڵێت: «نان ئەو نانەیە ئەمڕۆ لە خوانە». بەم شێوەیە بەرهەمی ڕەنج و تێکۆشانی پێکهاتە و تاکە کۆنەکان ناخرێتە سەر خەرمانی شارستانیەت و پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیی و کەلتوریی ئەمڕۆی جیهان، ئەوانەی لە ڕابردوودا خزمەتی گەورەی مرۆڤایەتییان کردووە، وەکو

پێکهاتەی ئەتنیکیی و ئاینیی و نەتەوەیی و چینایەتیی سست و بێبەرهەم و مشەخۆر هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکرێت.

ئەمە یەکێک لە دەردەکانی کۆمەڵگەی کوردستانە، لە ئەنجامی ئەو تێگەیشتنە هەڵەیەدا کورد باوەڕی هێناوە لە بواری داهێنان و چالاکیی مرۆڤایەتییدا ڕۆڵی نەبووە و ئێستایش هیچی دیار نییە، کۆمەڵگەی کوردستان و توێژە دەسەڵاتدارەکەی هەتا ئەوپەڕی رادە بەرانبەر بە هێزە ناوچەیی و جیهانییەکان دوچاری گرێی خۆبەکەمزانین هاتووە. لە هەڵوێست و کرداری تاک و پێکهاتە سیاسییەکانی وەکو حیزب و شۆڕش و حکومەتدا، ڕەنگیداوەتەوە. ئەم گرێیە بە ئاشکرا دیارە و ئەگەر بمانەوێت ئەو گرێیە بکەینەوە دەبێت بزانین کەی و چۆن دورستبووە.

بەگوێرەی لێکۆڵینەوە تیۆلۆژیی و ئانترۆلۆژییەکان، مرۆڤەکانی ناوچەی دۆڵی میزۆپۆتامیای سەروو، چالاکترین پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی قۆناغی نیولوتیک بوون. هەر لە هەنگاوی یەکەمی خۆدوورخستەنەوە و خۆجیاکردنەوەی مرۆڤ لە ئاژەڵ هەتا بەکارهێنانی بەرد و دار بۆ خۆپاراستن لە ئاژەڵە دڕندەکان، هەتا خۆپاراستن لە مەترسییەکانی سروشت، هەتا دۆزینەوەی مس و ئاسن و کانزاکانی تر کە بۆ دروستکردن و پێشخستنی هۆکارەکانی بەرهەمهێنان سودیان لێوەردەگیرا، هەتا ماڵییکردنی ئاژەڵی سودبەخش و دۆزینەوەی دانەوێڵە و دارودرەختە بەسودەکان، هەتا دۆزینەوەی ئاگر و پەنابردن بۆ بنبەرد و ئەشکەوت و دروستکردنی خانوو و ئاواکردن گوند، کە لە مێژوودا بە یەکەم شۆڕشی کۆمەڵایەتیی و گەشەکردنی شارستانیەتی مرۆڤایەتیی دەژمێردێت. لە لایەن داپیرە و باپیرەی گەلی کوردی ئەمڕۆوە بەرهەمهێنراوە*٣.

بیرمەندی کورد عەبدوڵا ئۆچ ئالان، لە کتێبی (بەرگرییکردن لە گەلێک) دەڵێت: بەرهەمی شۆڕشی نیۆلۆتیک کە بە دەست و پەنجە و هزری دایە گەورە و بابە گەورەی ئەمڕۆی کوردان ئاواکراوە، هێندە زۆر و بەرهەمدارە، هەتا سەردەمی شۆڕشی پیشەسازیی سەدەی حەڤدەهەمی ئەوروپا، بە شێوەیەکی سەرەکیی مرۆڤایەتیی بەخێوکردووە. بەرهەمە کشتوکاڵییەکانی ئەو کاتانە هەتا ئێستایش سەرچاوەی سەرەکیی بەرهەمی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتییە*٤.

له ئەنجامی پێشکەوتنی زانستی شوێنەوارناسیی و زەویناسیی و زمانناسیی له سەدەکانی دواییدا، ئەم ڕاستییانە دەربارەی ڕۆڵی پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکانی سەردەمی نیۆلۆتیک له ناوچەی میزۆپۆتامیا سەلمێنرا. کەوابوو ئەگەر مێژوونوس و کۆمەڵناس بۆ خوێندنەوە و هەڵسەنگاندنی کارەکانیان سود له پێشکەوتنی زانست وەربگرن، ڕۆڵی داهێنانەکانی کۆمەڵگەی نیولۆتیک ببینن، داهێنانەکانی ئەو سەردەمە بخەنەوە سەر پێشکەوتنی زانست و تەکنۆلۆژیا، شۆڕشێکی ئەخلاقیی مەزن بە شوێن ئەو شۆڕشە زانستییەدا دێت، کە دەمێکە مرۆڤایەتیی چاوەڕوانیدەکات. دەسەڵاتدارانی جیهان ناچاردەکرێن بگەنە ئەو بڕوایەی کە گەلانی ئەو سەردەمانەی ناوچەی میزۆپۆتامیا (داپیرە و باپیرەی گەلی کورد) له مێژوودا پێکهاتەیەکی چالاک بوون، هەتا ماوەیەکی زۆر خزمەتی مرۆڤایەتییان کردووە، بەرانبەر بەو چاکەیەیان دەبێت لەم سەردەمەدا حسابی ئەو خزمەتەیان بۆ بکرێت و پاداشتیانبدرێتەوە و چیتر پەراوێزنەخرێن.

له ناو کۆمەڵگەی کوردستانیشدا، دەبێت پێکهاتەی نێرینەی گەلی کورد پێش هەر پێکهاتەیەکی نێرینەی کۆمەڵگەکانی تر، هەست بە گرنگیی داهێنەرانە و جەوهەری ژنی کورد بکات، کە له خوڵقاندنی شارستانیەتدا ڕۆڵی گرنگی بینیوە. دۆزینەوەکانی زانایانی ئاسەوارناسیی لەو ناوچانەی ئەمڕۆ بە کوردستان ناسراوە، وەکو ئۆرفە و دهۆک و چەمچەماڵ و هەزارمێرد، مێژووی بەرهەمەکان و جۆری بەرهەم و داهێنانەکان شارستانیەتی کۆمەڵگەی نیۆلۆتیک دەسەلمێنێت، بەڵگەی زانستییشن هەن بۆ ئەوەی پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی ئەو سەردەمەی میزۆپۆتامیای سەروو، مێیینە تێیدا باڵادەستبووە.

کۆمەڵگەی چالاک تێڕوانین و ئایدۆلۆژیی هەیە، ئەرکی ئایدۆلۆژیا ئەوەیە تاکەکانی کۆمەڵگە له ئەرک و مافەکانی تێبگەیەنێت و توانا هزریی و ڕۆحیی و مادیی و فیزیکییەکانی تاک و پێکهاتەکەی له باری سستییدا بۆ باری چالاک وەربگێڕێت، کۆمەڵگە بکاتە پێکهاتەیەکی بەرهەمدار. لەبەرئەوە یەکێک له پێویستییە سەرەکییەکانی کۆمەڵگەی چالاک ئایدۆلۆژیایە. ئایدۆلۆژیای کۆمەڵگەی نیۆلۆتیک (چاخی بەردیینی نوێ) هزری یەکسانیی ڕەگەزیی و یەکسانیی چینایەتیی بووە. هزری دادپەروەریی و ئازادیی نێوان تاکەکانی ناو تیرە و خێڵەکانی ئەو سەردەمە بووە. ئەم کۆمەڵگە چالاکە کە له سەرەتای مێژوودا بە ویستی ئازادانەی مرۆڤەکان ئاواکراوە، بە ئایدۆلۆژیای یەکسانیی ڕەگەزیی و یەکسانیی چینایەتیی و سیستەمی دادپەروەریی بەڕێوەبراوە.

ئەو کۆمەڵگەیەی پێکهاتە چالاکەکەی قۆناغی نیۆلۆتیکی تێدا ژیاوە، بە کۆمەڵگەی سروشتیی ناسراوە. سیستەمەکەی سیستەمی دایک_سالاریی بووە.

عەبدوڵا ئۆچ ئالان پێیوایە بەها بەرزەکانی مرۆڤایەتیی کە لەو قۆناغەدا دەرکەوتوون، هەتا ئەمڕۆیش لە ژیاندان و لەگەڵ ئەو پێوانە نامرۆڤایەتییانەی کۆمەڵگەی پلەداریی و چینایەتییدا ملاملانێدەکەن، پێیوایە لە دژی کۆمەڵگەی سروشتیی لادانێک لە ڕێڕەوی کۆمەڵگە دروستبووە، کۆمەڵگەی پلەداری لێکەوتووەتەوە لە یەکسانیی و دادپەروەریی کۆمەڵگەی سروشتیی لایداوە، بەڵام لەو کاتەوە یەکسانیی و ئازادیی و دادپەروەریی کۆمەڵگەی سروشتیی کۆڵنەداوە، لەگەڵ جیاکاریی و خۆبەدەستەوەدان و زوڵمی کۆمەڵگەکانی پلەداریی و دەوڵەتکارییدا زۆرانبازیی و ململانێدەکەن و شکستیان نەهێناوە. پێیوایە پەڕینەی کۆمەڵگەی سروشتیی بۆ کۆمەڵگەی چینایەتیی و پلەداریی لادانە و ناچاریی و سروشتیی نییە. دەکرا کۆمەڵگەی سروشتیی بەردەوامبایە و پێشکەوتنیش نەوەستایە*٥

## داپیرە و باپیری پەراوێزخراو

لە ساڵانی ٤ چوار هەزار هەتا ٢ دوو هەزاری پێش زاین، لە کۆتایی سەردەمی نیۆلۆتیکدا، میزۆپۆتامیای خواروو سەرەداوی چالاکی ناوچەی میزۆپۆتامیای سەروو بە دەستی خۆیەوە دەگرێت، چەمانەوە و لادانێک لە هزری یەکسانیی ڕەگەزیی و دەسەڵاتی دایک_سالاریی کۆمەڵگەی سروشتییدا دروستدەبێت. هزری باوک_سالاریی و دەسەڵاتی شارستانیەتی دەوڵەت_شار و قۆناغی کۆیلایەتیی دەستپێدەکات. یەکەم قۆناغی چەوسانەوەی ڕەگەزیی و چینایەتیی و ئەتنیکیی و نادادپەروەریی کۆمەڵایەتیی لە میزۆپۆتامیای خواروو بە جیهاندا بڵاودەبێتەوە. لەو سەردەمەوە داپیرە و باپیرەی گەلی کورد پێشڕەوایەتیی شارستانیەت لەدەستدەدەن.

پاشماوەی شارەکانی (ئۆر، بابل، نەینەوا)، ئاسەوارەکانی سەردەمی پادشایەتیی حامۆرابیی و نەبوخزنەسر و نارامسین، نیشانەی چالاکبوونی دژە یەکسانیی و ئازادیی و دادپەروەریی ئەو پێکهاتە کۆمەڵایەتییەی ئەو سەردەمە پیشاندەدات. ئەم سەردەمە نوێیە بە سەردەمی شارستانیەتی سۆمەر و کۆمەڵگەی کۆیلایەتیی ناسراوە.

لەم سەردەمەدا ئایدۆلۆژیای سەرەکیی سیستەم ئەفسانە بووە، بیروباوەڕی ئەفسانە، خودا ژنەکانی کردە خودا پیاو. خوداکانی لەسەر زەمینەوە گواستەوە بۆ ئاسمان. خودا بەڕەحمەکانی کۆمەڵگەی سروشتیی گۆڕی بە خودای تۆقێنەر. هەمووی لەپێناو ئەوەدا بوو هەتا مرۆڤە کۆیلەکان لە خواوەندە تۆقێنەرە نەبینراوەکان بترسن و کۆنترۆڵبکرێن و زۆرترین بەرهەمیان پێ بەدەستبهێنن. نەک هەر ئەوە، ئایدۆلۆژیای ئەفسانە ژنی لە پلەی خوڵقێنەری شارستانیەتەوە گواستەوە بۆ ئامرازێکی تێرکردنی ئارەزووەکانی پیاو. سیستەمی بەڕێوەبردنی ئەو سەردەمەی کۆمەڵگەی کۆیلایەتیی ژنی وەکو ئامرازێک بۆ بەرتیلدان بە پیاوە دەسەڵاتدارەکان و کۆیلەکردنیان بەکاردەهێنا. لەم بارەیەوە عەبدولا ئۆج ئالان لە کتێبی (بەرگرییکردن لە گەلێک) دەڵێت: (ڕاهێنانی مرۆڤی کۆمەڵگەی سروشتیی بۆ سیستەمی کۆیلایەتیی بە ئاسانیی نەهاتووەتەدی، لە لایەکەوە لە ڕێگەی حوکمکردنی هزری مرۆڤەکان بە ترسی خودا تۆقێنەرەکان بووە، لە لایەکی ترەوە لە ڕێگەی پێشکەشکردنی ژن بووە وەکو ئامرازی لەڕێدەرخستن –یەکەمین سۆزانیی– بووە. ئەم دوو ئامرازە پێڕەوی سەرەکیی ژیانی ئەو سیستەمە بوون).

بەرانبەر بە چەوساندنەوەی هزریی و فیزیکیی پێکهاتە چەوساوەکان، دەنگی نارەزایی و یاخییبوون لە بەرزبوونەوەدا بووە. ئەم نارەزایەتیی و یاخییبوونانە لە کەسایەتیی ئیبراهیمی پەیامنێردا لە دژی نەمروودەکان بەرجەستەبووە*٦.

بەو شێوەیە دەبینین کە داپیرە و باپیرەی گەلی کورد لە بەڕێوەبردن و پاراستنی کۆمەڵگەی سروشتیی دووردەخرێنەوە، کۆمەڵگەی چەوسانەوەی چینایەتیی و ڕەگەزیی و بەلاڕێدابردنی هزریی دروستدەبێت.

لەم سەردەمەدا، لە سەدەی بیست بە دواوە، زانست و پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیی بە ئاستێک گەیشتووە، خەریکە چەوسانەوەی چینایەتیی و ڕەگەزیی و چەواشەکاریی هزریی ڕاستدەکرێتەوە. مافی ئازادیی و یەکسانیی و دادپەروەریی بۆ سەرجەم پێکهاتەکانی کۆمەڵگە بەدەستدەخرێتەوە. جارێکی تر کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیی لە کۆمەڵگەی سروشتیی نزیکدەبێتەوە، گرنگیی گەلی کورد و گەلە چەوساوەکانی تر، گرنگیی ژن بە گشتیی و گرنگیی و ژنی کورد بە تایبەتیی، وەکو ڕاستییەکی زەق خۆی لە بەرچاوی مرۆڤایەتییدا ڕاستدەکاتەوە.

## هاوکاریی

حەوتسەد ساڵ پێش زاین، جارێکی تر باپیرانی گەلی کورد لەژێر ڕۆشنایی ئاینی زەردەشتییدا، لە چوارچێوەی ڕێکخستنی کۆنیفدراڵیی خێڵەکانی میدیا و پارس و ئەوانی تر، وەکو پێکهاتەیەکی چالاک خۆیان ڕێکدەخەن و سنوور بۆ ستەمی حوکمڕانیی ئاشوورییەکان دادەنێن و ئیمپراتۆریەتی ئاشووریی دەروخێنن. بۆ ماوەی ١٥٠ سەدوپەنجا ساڵ ئیمپراتۆریەتی میدیا ئاوادەکەن. بە ڕوخانی ئمپراتۆریەتی ئاشووریی و بە ئاواکردنی ئیمپراتۆریەتی میدیا، مرۆڤایەتیی ئاهێکی بەبەردادێت، سیستەمی داگیرکاریی و کۆیلایەتیی بڕێک نەرمدەبێت. بەو شێوەیە باپیرانی گەلی کورد جارێکی تر خزمەتێکی گرنگی مرۆڤایەتیی دەکەن.

لە دوای پاشەکشەی شارستانیەتی ناوچەکانی میزۆپۆتامیای خواروو، میسری کۆن لە سالانی سێ هەزاری پێش زاین هەتا سەرەتای زاین، جڵەوی پێشکەوتن و پێکهاتەی کۆمەڵگەی چالاک بەدەستەوەدەگرێت، بۆ هەزاران ساڵ جێپەنجەی ئەم پێکهاتەیە لەسەر بوارەکانی ژیانی مرۆڤایەتیی، لەسەر دید و بۆچوونی گەلانی جیهانی ئەو سەردەمە بە ئاشکرا دەردەکەوێت و هەتا ئەمڕۆیش کاریگەرییەکەی ماوەتەوە، ئەو شارستانیەتەی میسر پێویستی بە داهێنانەکانی میزۆپۆتامیای سەر دەبێت.

کتێبە بەناوبانگەکەی (سینۆهە)ی پزیشکی فرعەونەکان *٧، کە باس لە سەردەمی فەرمانڕەوایی فرعەونەکانی ئەو سەردەمانەی میسر دەکات، پیشانیدەدات کە نیشتیمانی ئەمڕۆی کوردان و پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکەی ئەو سەردەمەی نیشتیمانی کوردان (میتانییەکان) لە دۆزینەوە و بەکارهێنانی کانزاکانی مس و ئاسندا لە پێشەوەی پێکهاتەکانی تردا بوون. یەکێک لە هۆکارەکانی سەفەری سینۆهە بۆ ئەو ناوچەیە بە ئامانجی ناسین و سودوەرگرتن بووە لەو کانزایانە، کە میتانییەکان بۆ دروستکردنی عەرەبانەی جەنگ بەکاریاندەهێنا. ئەمە پیشانیدەدات کە لەو کاتەیشدا لە سنوورێکی دیاریکراودا باووباپیرانی گەلی کورد پێکهاتەیەکی چالاک بوون.

کە چالاکییە هەمەجۆرەکانی کۆمەڵگەی میسریی پێش زاین، بەرەو لوتکە و پیربوون ملدەنێت. پێکهاتەیەکی تری چالاک لە شوێنیکی تری جیهاندا لە

یۆنان، دەستکەوتەکانی شارستانیەتی مرۆڤایەتیی لە میسرییەکان وەردەگرێت و داهێنەکانی خۆی دەخاتەسەری و وەکو پێکهاتەیەکی چالاکی کۆمەڵایەتیی خۆی ڕادەگەینێ.

ئەو پێکهاتە چالاکەی مرۆڤایەتیی، هەتا مێژوویەکی نزیک بە سەرەتای یەکەم شارستانیەتی مرۆڤایەتیی دەناسرا، ئەو هۆکارەی کە کۆمەڵگەی یۆنانیی بە پێکهاتەیەکی هەرە چالاکی مرۆڤایەتیی دایەقەڵەم، فەلسەفەی (خۆشەویستیی بۆ زانیاریی) یۆنانیی سیستەمی حوکمڕانیی کۆمارە دیمۆکراتەکانی یۆنان بوو. چەندیین سەرچاوەی مێژوویی باوەڕپێکراو پشتڕاستیانکردووەتەوە، کە فەیلسوفەکانی یۆنان سودیان لە ئاینی زەردەشت و ئاینەکەی مانیی لە کوردستان وەرگرتووە.

لە سەردەمی قۆناغی کۆیلایەتیی سۆمەر و میسردا، لەبەر ترس و تۆڵەی خواوەندەکانی زەوی و ئاسمان، مرۆڤ خاوەنی سێبەری خۆی نەبوو، بەڵام لە سەردەمی شارستانیەتی یۆناندا، فەیلەسوفەکان وایان لە مرۆڤ کرد، کە ببێتە خاوەنی ئیرادەی ئازاد، بەبێ ترس بیر لە خۆی و لە دەوروبەری بکاتەوە. ئەفلاتون کاریگەرییەکی بێوێنەی لەسەر چالاککردنی تاک و پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی وڵاتی یۆنان هەبووە. لە یەکێک لە شیکردنەوە فەلسەفییەکانیدا دەڵێت: (تاک لە سێ بەشی سەرەکیی پێکهاتووە: عەقڵ، وزە، غەریزە. واتە تاک لە یەک کاتدا سێ کەسی ناکۆک و جیاوازە)*٨

لە سەدەی کۆتایی پێش زاینیدا جڵەوی پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی چالاک لە دەستی یۆنانییەکان دەردەچێت و ئاواکەرانی شارستانیەتی ڕۆمای دراوسێیان بەدەستیەوەدەگرن. ڕۆمانییەکان بە پشتبەستن بە فەلسەفەی یۆنان و پێدراوەکانی تری سەردەم، کە لە شارستانیەتی پێکهاتە چالاکەکانی تری جیهانەوە وەریانگرتبوو، وەکو پێکهاتەیەکی گرنگی چالاکی کۆمەڵایەتیی لە سەدەی یەکەمی پێش زاین هەتا ساڵەکانی ٥٠٠ پێنجسەدی زایینیی شارستانیەتێکی مێژووییان ئاواکرد، کە هەتا ئەمڕۆیش مرۆڤایەتیی ناتوانێت لایەنی یاسایی و مافپەروەریی و سەربازیی و پێشکەوتنی ئابوریی ئەو سەردەمەی نیمچە دورگەی ئیتالیا فەرامۆشبکات*٩.

## شوێنکەوتوویی

بینیمان کە چۆن چالاکیی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیی پێش زاین بە هەزاران ساڵ، لە ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و سەرووی ئەفریقاوە بەرەو ئەورووپا کشا، بەڵام لە دەوروبەری کۆتایی سالانی پێش زاین، جارێکی تر رۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئامادەکاریی بۆ لە دایکبوونێکی تر دەکات. لە دوای ئاینی (تاک_خودایی/ موسایی)، ئاینی تاک_خودایی مەسیحیی و دواتر لە رێگەی ئاینی ئیسلامەوە، گەلانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست وەکو پێکهاتەیەکی چالاک، جارێکی تر ناوی خۆیان تۆماردەکەن و بۆ ماوەیەکی تر مۆرکی خۆیان لە هزر و کەلتور و سیستەمی بەڕێوەبردنی جیهان دەدەن.

دەوڵەتی ئیسلامیی سەردەمی پێغەمبەری مسوڵمانان (د. خ)، دەوڵەتی خەلیفەکانی راشدین، دەوڵەتی ئەمەویی و عەباسیی، نمونەی کۆمەڵگەیەکی چالاکی ئەو سەردەمانەی ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەبێت، کە بە ئایدۆلۆژیای ئاینی ئیسلامیی تاک_خودایی ئاراستەدەکرێت، هەتا سەدەی دوازدەی زاینیی میللەتی عەرەبی بە لوتکەی دەسەڵات گەیاند. عەرەبی وەکو پێکهاتەیەکی چالاک بە جیهان ناساند.

لەو سەردەمەدا باپیرانی گەلی کورد ئاینی ئیسلام قبوڵدەکەن، شانبەشانی پێکهاتە چالاکەکانی تری ناوچەکە، کۆمەک بە شارستانیەتی مرۆڤایەتیی دەکەن و خزمەتی ئیسلام و کەڵتوری عەرەب دەکەن، بەڵام وەکو پێویست داهێنان ناکەن. وەکو پێکهاتەکانی تر، بۆ چارەسەرکردنی کێشەکەیان سود لە ئاینی ئیسلام وەرناگرن. زۆربەی کات وەکو پێکهاتەیەکی پاشکۆی گەلانی مسوڵمان، بەشداریی لە پێشخستن و پاراستنی شارستانیەتی مرۆڤایەتییدا دەکات.

لە دوای رووخانی دەوڵەتی عەباسیی، سەرکردەیەکی ئاینیی جەنگاوەر بە ناوی سەلاحەدینی ئەیوبییەوە دەردەکەوێت، داکۆکیی لە ئیسلام و وڵاتی ئیسلامیی دەکات. ئەو سەرکردەیە بە رەچەڵەک کورد دەبێت، دەرفەتی هەبووە لە یەک کاتدا خزمەتی ئاینی ئیسلام و خزمەتی کورد بکات، بەڵام هەموو توانا و کار و چالاکیی خۆی، لەپێناو ئاینی ئیسلام و وڵاتانی ئیسلامدا بەکاردەهێنێت، بە ناوی میللەتی کوردەوە کارناکات، لەبەرئەوە لێرەدا تەنها دەتوانین بڵێین چالاکەکانی گەلی کورد، وەکو پێکهاتەیەکی چالاکی گشتیی کۆمەڵگەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست رۆڵدەبینن. وەکو پێکهاتەیەکی نەتەوەیی کورد رۆڵیان نابێت.

له سەرەتای سەدەی شازدەهەمدا لە ڕێگەی تیژکردنی ئایدۆلۆژیای تەریقەتی ئیسلامی سوننییەوە، تورکەکان دەوڵەتی عوسمانیی دادەمەزرێنن. حوکمڕانیی گەلانی مسوڵمان بەدەستەوەدەگرن. گەلی تورک وەکو پێکهاتەیەکی چالاکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و جیهان دەناسرێت، هەتا کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و جەنگی یەکەمی جیهانیی، دەوڵەتی عوسمانیی وەکو پێکهاتەیەکی چالاک مۆرکی خۆی لە مێژووی جیهان دەدات.

لەبەرئەوەی گەلی کورد زۆرینە پێکهاتەیەکی سوننییە، مەزهەبی دەوڵەتی عوسمانییش سوننە بوو، بۆیە لەگەڵ ئەوەیشدا مەولانا خالیدی نەقشبەندیی تەریقەتی نەقشبەندیی لە باشووری کوردستان پێشخست، بەڵام تورکەکان توانییان تەریقەتی نەقشبەندیی لە کورد وەربگرن و بۆ خۆیان سودی لێوەربگرن، ئیتر کورد هەر وەکو پێکهاتەیەکی پاشکۆی تورکە عوسمانییەکان مایەوە، داهێنانێکی ئەوتۆی نەکرد. ئەو چالاکییە ناڕێکوپێکانەی هەیبوون، بەشی ئەوەی نەدەکرد وەکو پێکهاتەیەکی چالاک بناسرێت*١٠. هەرچی گەلی فارسە، ئاینزای شیعە بۆ خۆی هەڵدەبژێرێت، خۆی لە نەتەوە مسوڵمانەکانی تر جیادەکاتەوە و ئیسلام بۆ بەرژەوەندیی نەتەوەیی خۆی بەکاردەهێنێت.

لەو سەردەمەدا گەلی کورد لە چوارچێوەی ئیمارەتی و خێڵدا، وەکو پشتیوانێکی دەوڵەتی عوسمانیی و دەوڵەتی سەفەویی خۆی ڕێکدەخات. بە بەردەوامیی ئەو دوو ئیمپراتۆرە دەپارێزێت، بۆ خۆی هیچ کارێک ناکات. وەکو پێکهاتەیەکی کاریگەر و چالاک نایەتە مەیدانەوە و پاشکۆی ئەو دەوڵەتە مسوڵمانانە دەبێت.

سەدەی حەڤدە بە دواوە کۆمەڵگەی ئەوروپا و وڵاتە ئەوروپییەکان لە گەشەکردنێکی بەردەوامدا دەژیان، قۆناغی ڕێنسانس و ڕیفۆرمی ئاینیی و ڕۆشنەگەریی و زانستخوازییان دەبڕی. لە ڕووی هزر و ئایدۆلۆژییدا گەشەکردنێکی دیاریان ئەنجامدەدا. لە بواری ئابورییدا سامانی زیاتریان بەرهەمدەهێنا. لە بواری سیاسیی و سەربازییدا پێشی دەوڵەتی عوسمانیی دەکەوتن. لە جەنگی یەکەمی جهانییدا ئیمپراتۆرە نەخۆشەکەی عوسمانییان ڕوخاند. وەکو پێکهاتەیەکی چالاک جاڕی دەسەڵاتداریی خۆیان بەسەر جیهاندا ڕاگەیاند.

لەو کاتەوە هەتا کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانیی، وڵاتانی ئەوروپا دەبنە پێکهاتەی هەرە چالاکی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیی. بە شێوەی سیاسیی و کەلتوریی و سەربازیی و ئابوریی جیهان کۆنترۆڵدەکەن. لەو سەردەمەدا گەلی کورد هەوڵیدا وەکو پێکهاتەکانی تری ناوچەکە خۆی چالاکبکاتەوە، بێتەوە سەر شانۆی تێکۆشان و مافە نەتەوەییەکانی

وەربگرێت، بەڵام لەبەر چەندیین هۆکار ئەو ئامانجە بەدەستنەهات و گەلی کورد لە باری سستییدا بە پاشکۆیەتیی مایەوە.

لە دوای جەنگی دووەمی جیهانییەوە، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و یەکێتیی سۆڤیەت وەکو دوو پێکهاتەی ڕکابەری چالاکی سەردەم، دژی یەکتر دەست بە کێبڕکێ دەکەن. سیستەمی حوکمڕانیی جیهان بە سیستەمی دوو جەمسەریی ناو دەردەکات. زۆر گەل سودی لە ململانێی نێوان ئەو دوو جەمسەرە وەردەگرێت، وەکو پێکهاتەیەکی چالاک دێتەوە مەیدان و بە ئامانجی خۆی دەگات، بەڵام گەلی کورد لەو سەردەمەیشدا بە سستیی دەمێنێتەوە، سود لە ناکۆکییەکانی ئەو دوو جەمسەرە وەرناگرێت و دەرفەتی زێڕیینی لەدەستدەچێت و وەکو پاشکۆ دەمێنێتەوە. لە دوای هەڵوەشانەوەی یەکێتیی سۆڤیەت، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەکو پێکهاتەی چالاکی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیی خۆی دەسەپێنێت. لەو کاتەوە بەرنامەڕێژیی بۆ ئەوە دەکات هەتاهەتایە پێکهاتەی چالاک و سەروەری جیهان بێت.

لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە هەتا ئەمڕۆ، پاش ڕوخانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی و ئاواکردنی دەوڵەتی عێراق، چەندیین جار دەرفەتی لەبار بۆ گەلی کورد هاتووەتە پێشەوە، هەتا وەکو پێکهاتەیەکی چالاک خۆی ڕێکبخاتەوە و مافەکانی بەدەستبهێنێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەی گەلی کورد قوربانیی زۆری دەدا، چەندیین جار زەمیینەی لەبار دێتەپێشەوە، وەکو جەنگی یەکەمی جیهانیی و جەنگی دووەمی جیهانیی، جەنگی ئێران و عێراق و جەنگی عێراق و کوێت و ڕوخانی ڕژێمی سەدام، کەچی کورد لە باشووری کوردستان ناتوانێت جارێکی تر وەکو پێکهاتەیەکی چالاک بێتەوە مەیدان.

لە دوای داگیرکردنی کوێت لە لایەن سوپای عێراقەوە، ئەستێرەی بەختی کورد دەدرەوشێتەوە و ڕاپەڕیینی بەهاری ١٩٩١ دەکات. بۆ پاراستنی کورد لە تاوانەکانی ڕژێمی سەدام، ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی بڕیاری ٦٨٨ دەردەکات. پێش ڕوخانی ڕژێمی سەدام، کورد چالاکترین پێکهاتەی سیاسیی عێراق بوو، بەڵام لەبەرئەوەی کورد بە ئایدۆلۆژیایەکی خێڵەکیی و حیزبیی، نەک بە ئایدۆلۆژیایەکی دیموکراتیی حوکمدەکات. لە دەوڵەتی عێراقی نوێیشدا، بە هەمان هزری حیزبیی و خێڵەکییەوە نوێنەرایەتیی گەلی کورد دەکات. نەیتوانی وەکو پێکهاتەیەکی چالاکی باشووری کوردستان و عێراق و ناوچەکە خۆی ڕێکبخاتەوە. وەکو پێکهاتەیەکی پاشکۆی هێزە عێراقیی و ناوچەیی و جیهانییەکانی مایەوە.

## چالاکبوونەوە

ئایدۆلۆژیا لە چالاککردنی پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکاندا ڕۆڵی سەرەکیی و چارەنوسسازی دەبێت، ئەگەرچی ئاووهەوا، زەوی بەپیت و بەرەکەت، ڕووبار و دەریا، زەمینەی دەرەکیی لەبار، کاریگەرییان لەسەر ئاواکردنی شارستانیەت هەیە، بەڵام لێکۆڵینەوەی زانستیی دەریخستووە ئایدۆلۆژیا کاریگەریی سەرەکیی لە ئاواکردنی شارستانیەت و ئافراندنی تاک و پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی چالاکدا هەیە.

ئایدۆلۆژیا وەکو بەنزین وایە وزە بۆ چالاکیی تاکە دەگمەنەکان و پێکهاتەکان دابیندەکات، بەرنامەی کار دیاریدەکات. سەرکەوتن گەرەنتییدەکات، بەبێ ئایدۆلۆژیا گەڕانەوەی گەلی کورد بۆ ناو پێکهاتە چالاکەکانی کۆمەڵگە سەرکەوتوو نابێت.

لەبەرئەوەی کورد لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا خاوەنی گەورەترین و قووڵترین کێشەی نەتەوەییە، کاتێک چارەسەری ئەو کێشەیە دەکرێت، کە کورد پێکهاتەیەکی چالاک بێت، ئەوەیش پێویستی بە ئایدۆلۆژیا هەیە، بە مەرجێک ئەو ئایدۆلۆژیایە لەگەڵ ڕەوڕەوەی گەشەکردنی مێژوو و بەرژەوندیی پێکهاتەکانی تردا بگونجێت. ئەگەر ئەو ئایدۆلۆژیایە بتوانێت چەمکە هەڵەکانی هزر و سیاسەت و کەلتوری ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست تێپەڕێنێت، بەرنامەیەکی چارەسەری هەمەلایەن داڕێژێت و کارپێبکات، دەتوانێت کورد چالاکبکاتەوە.

لە حەفتاکانی سەدەی بیستدا، لە باکوری کوردستان کەسایەتییەکی کورد بە ناوی عەبدوڵڵا ئۆج ئالان، چاوی بە جیهانی سیاسەت هەڵهێنا. ئەم کەسایەتییە حیزبێکی نوێی بە ناوی پارتی کرێکارانی کوردستان (پ. ک. ک) دادەمەزرێنێت. ئەم ڕێکخراوە سیاسییە لە چاو حیزبە سیاسییەکانی تری کوردستان و وڵاتانی دەوروبەردا، بە ئایدۆلۆژیا و ڕێکخستن و چالاکیی نوێیە، لە ڕووی ئایدۆلۆژییەوە سکۆلاریزم و لیبراڵیزمی ئەورووپیی و کۆمۆنیزمی سۆڤیەتیی و ئیسلامگەرایی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست تێدەپەڕێنێت. وەکو هزری سیاسیی تایبەتی ئەم سەردەمەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست خۆی دەردەخات. پێکهاتە چەوساوەکانی کۆمەڵگەی وەکو ژن و نەتەوەی بندەست و ئاین و ئاینزا سەرکوتکراوەکان و گەنج و کەلتورە پەراوێزخراوەکان ڕێکدەخات و بەرنامەی ئازادکردنیان بۆ دادەنێت.

ئەم جوڵانەوە ئایدۆلۆژییە بە شێوەیەکی سیستەماتیک، کاریگەریی لەسەر دوو بەشی هەرە سەرکوتکراوی کوردستان (باکوور و ڕۆژئاوا) دەکات. لەوێوە ڕابونێکی نەتەوەیی و دیموکراتیی سەرهەڵدەدات، کورد هەڵدەسێتە سەرپێ. زیندوویی چالاکیی باکوری کوردستان بە ئاستێک دەگات، چل ساڵ زیاترە دەوڵەتی تورکیای سەر بە پەیمانی ناتۆ هەرچی توانای سەربازیی و سیاسیی و دیبلۆماسیی و تەکنۆلۆژیی خۆی هەیە دژی شۆڕشی باکوور بەکاریدەهێنێت، بۆی سەرکوتناکرێت*١١.

لەژێر کاریگەریی هزری ئۆج ئالاندا، لە بەهاری عەرەبیی ساڵی ٢٠١٢ سوریادا، گەلی کورد لە ڕۆژئاوای کوردستان، وەکو هێزێکی سیاسیی و سەربازیی و کەلتوریی خۆی دەردەخات و دەست بە خەبات دەکات. کە ڕێکخراوی داعش دروستبوو و پەلاماری سوپای سوریا و عێراقی دا، سوپاکانی سوریا و عێراق خۆیان لەبەر هێرشەکانی داعش ڕانەگرت، بەڵام کە داعش پەلاماری ڕۆژئاوای کوردستان و باکوری سوریای دا، بەرخودانی ڕێکخستنە سەربازییەکانی کچان و کوڕانی کورد لە ڕۆژئاوای کوردستان، سەرنجی جیهانی بە لای خۆیدا ڕاکێشا. لۆجیکی سەربازیی باڵادەست دەیگوت داعش کۆبانێ داگیردەکات و ئەزموونی کورد لە ڕۆژئاوای کوردستان کۆتاییدێت، بەڵام شەڕڤانەکان لۆجیکیان ڕاستکردەوە، بەرگرییانکرد و داعشیان تێکشکاند، ڕۆژئاوای کوردستانیان پاراست.

لە شەڕی شکستپێهێنانی داعشدا، شانبەشانی کوڕە شەڕڤانەکان، کچانی کورد شەڕیاندەکرد، قوربانییاندەدا. ئەمە یەکەم جار بوو لە مێژوی مرۆڤایەتییدا، ژن بەو شێوەیە لە بواری سەربازییدا چالاک و ڕێکخراو بێت و سەرکەوتن مسۆگەربکات*١٢.

بەو شێوەیە ژنی کورد جارێکی تر دوای سەردەمی سەرەتایی کۆمەڵگەی نیولۆتیک، بە ئایدۆلۆژیای عەبدوڵڵا ئۆج ئالان هاتەوە مەیدان و کۆمەڵگەی کوردستانی چالاک و کاریگەر کردەوە. کوردی خستەوە ناو هاوکێشە سیاسییەکانی ناوچەکە و جیهان.

دەسەڵاتدارانی هەرێم بە سەرۆکایەتیی مەسعود بەرزانیی لە ٧/ ٦/ ٢٠١٧دا، بڕیاری ڕاپرسیی باشووری کوردستانیان دا. لە ڕاپرسییەکەدا داوا لە خەڵکی کوردستان دەکرا لەگەڵ ئەوەدایت باشووری کوردستان سەربەخۆیی وەربگرێت، یان لە چوارچێوەی عێراقدا بمێنێتەوە. ڕۆژی ١٥/ ٩/ ٢٠١٧ ڕاپرسییەکە لە هەرێمی کوردستان و لە ناوچە دابڕاوەکان (سنووری مادەی ١٤٠) ئەنجامدرا و ٨٥٪ خەڵکی باشووری کوردستان دەنگی بۆ سەربەخۆیی کوردستان دا.

له سەروبەندی ڕاپرسییەکەدا جارێکی تر کێشەی کورد لەبەر چاوی دۆست و دوژمن هەستایەوە، خەریکبوو کورد لە سەنگەری پاشکۆیەتیی عێراق دەربچێت و وەکو پێکهاتەیەکی چالاک بێتەوە مەیدان.

لەبەرئەوەی لە ئاستی ناوخۆیی و عێراقیی و ناوچەیی و جیهانییدا کار بۆ پشتیوانیی ڕاپرسییەکە نەکرابوو، دەوڵەتانی عێراق و ئێران و تورکیا و ئەمریکا و بەریتانیا دژی ڕاپرسییەکە وەستانەوە. هەڕەشەی ئابڵوقەی ئابوریی و سیاسییان لە هەرێمی کوردستان دەکرد. شەڕی ١٦ی ئۆکتۆبەری ٢٠١٧ بەسەرداهات و هێزە چەکدارەکانی عێراق دەستیان بەسەر کەرکوک و ناوچە دابڕاوەکانی تردا گرتەوە. هێزی پێشمەرگە شکا و بەرەو هەرێمی کوردستان پاشەکشەیکرد. مەسعود بەرزانیی دەستی لە پۆستی سەرۆکی هەرێم کێشایەوە، دەسەڵاتدارانی هەرێم لە ڕاپرسیی پاشگەزبوونەوە و جارێکی تر کوردی باشوور بەرەو پێهاتەیەکی سست و پاشکۆ ملینایەوە*١٣

**سەرچاوەکان:**

١- پێکهاتەی چالاک چەمکی هیگڵی فەیلەسوفی ئەڵمانییە، لە کتێبی کۆمەڵگەی کراوە و دوژمنەکانی بەرگی دووەمی کارڵ پۆپەر وەرگیراوە. وەرگێڕانی لە فارسییەوە، ئیدریس شیخ شەڕەفی ساڵی ٢٠٠٦، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر.

٢- ململانێ و یەکگرتن: چەمکی ماتریالیزمی دیالیکتیکە، لە کتێبی ماتریالیزمی مێژوویی و ماتریالیزمی دیالیکتیکییەوە وەرگیراوە. وەرگێڕانی جەلال دەباغ، ١٩٧٠.

٣- عەبدوڵڵا ئۆج ئالان، لە دەوڵەتی ڕاهیبی سۆمەرەوە بەرەو شارستانیی دیموکراتیی، وەرگێڕانی لە تورکییەوە، لوقمان عەبدوڵڵا. چاپی دووەم، ٢٠٠٤ چاپخانەی ڕەنج، لاپەرە ٣٣. لە بڵاوکراوەکانی پارتی چارەسەری دیموکراتی کوردستان.

٤- عەبدوڵڵا ئۆج ئالان، بەرگرییکردن لە گەلێک، چاپی یەکەم لاپەرە ٤٢، وەرگێڕانی لە تورکییەوە، لوقمان عەبدوڵڵا، چاپخانەی ڕەنج ٢٠٠٥.

٥- عەبدوڵڵا ئۆج ئالان بەرگرییکردن لە گەلێک.

٦- عەبدوڵڵا ئۆج ئالان، بەرگرییکردن لە گەلێک.

٧- میکالوالّتاری، سینوهە پزیشکی تایبەتی فیرعەون، چاپی یەکەم، ٢٠٠٥، چاپەمەنیی هێمن، سلێمانیی، وەرگێڕانی لە فارسییەوە، حەسەن شێخ جەعفەر سەرگەتیی.

٨- کارڵ پۆپەر، کۆمەڵگەی کراوە و دوژمنەکانی.

٩- عەبدوڵڵا ئۆج ئالان، بەرگرییکردن لە گەلێک.

١٠- گۆڤاری کۆمین، ژمارە.

١١- مێژوویەک لە ئاگر، دیمانەیەک لەگەڵ جەمیل بایک، سازدانی حەسەن جودی، لە بڵاوکراوەکانی کۆمیتەی ڕاگەیاندنی (پ. چ. د. ک)، چاپی یەکەم، ٢٠٠٨.

١٢- شاری کۆبانێ، ڕۆژئاوای کوردستان، لە ١٤/ ٩/ ٢٠١٤ بۆ ماوەی ١٣٣ ڕۆژ لەژێر گەمارۆی داعشدا بوو، لە ٦/ ٢/ ٢٠١٥ داعش تێکشکا و کۆبانێ ئازادکرا.

١٣- مەسعود بەرزانیی، بۆ مێژوو، چاپی یەکەم، ٢٠٢٠، هەولێر، بەڕێوەبەرایەتیی کتێبخانە گشتییەکان، لاپەڕە: ٧٨.

# ٣
# خێڵایەتیی و شۆڕشی نەتەوەیی کورد

بەگوێرەی فەلسەفەی مارکس*١ هەست و هۆشیاریی نەتەوەیی و نەتەوەبوون، لە قۆناغی سەرمایەداریی کۆمەڵگەدا سەرهەڵدەدات. چینی بۆرجوا، کە ڕێبەرایەتیی سیستەمی سەرمایەداریی دەکات، لەپێناو دەسکەوتی مادیی و دەسەڵاتدا، ئایدۆلۆژیای نەتەوەیی و نەتەوەبوون دادەهێنێت. زۆرترین تاک و پێکهاتەی لەیەکچوو، لە ڕووی زمان و کەلتور و مێژووەوە، لە نیشتیمانێکی هاوبەشدا لە دەوری بازاڕێکی هاوبەش کۆدەکاتەوە و زۆرترین سودی مادیی و بەهێزترین دەسەڵات بەدەستدەهێنێت.

چینی بۆرجوازی دەسەڵاتدار بەردەوام لە هەوڵ و تێکۆشاندایە هەتا ناکۆکییە کۆمەڵایەتییەکانی ناو هەناوی کۆمەڵگە لەژێر پەردەی بەرژەوەندیی نەتەوە و مەترسیی دەرەکییدا بخەوێنێت، ئامانجە ئابوریی و دەسەڵاتخوازییەکانی خۆی بە باشترین شێوە، بە سەرکوتکردنی نارەزایی ناوخۆیی و بە شەڕ و داگیرکاریی دەرەکیی بەدیبهێنێت.

لە دوای بەرپابوونی ڕێنسانس و ڕیفۆرمی ئاینیی و پێشکەوتنی زانست و تەکنۆلۆژیا، سیستەمی نەتەوەیی ئەوروپا پێشکەوت، هزری نیشتیمانیی و نەتەوەیی

دیواری نێوان هەرێمە دەرەبەگەکانی دارماند. دەرفەتێک بۆ پێکهاتە چەوساوەکانی کۆمەڵگەی دەرەبەگایەتیی هاتەپێشەوە هەتا ئازادبن و لە یەکتر نزیکببنەوە، پێکەوە بیربکەنەوە و لە چوارچێوەیەکی فراوانتردا خۆیان ڕێکبخەن. ئەم شێوە ڕێکخستنە نوێیە پێویستی بە کەسانی زانا و وریا هەبوو هەتا بەڵگە و پێویستیی ئەم ڕێکخستنە نوێیە بۆ خەڵک بسەلمێنن. ئەو کەسە زانا و وریایانە سەرمایەدارەکان بوون، بە چەمکی هۆشیاریی نەتەوەیی و بنەماکانی نەتەوەبوون و ئامانج و پیرۆزیی نەتەوە و نیشتیمان خەڵکیان پەروەردەدەکرد.

ئاینگەرایی، ئایدۆلۆژیای سیستەمی دەرەبەگایەتیی بوو، بەهۆی ڕینسانس و شۆڕشی زانستییەوە، سکۆلاریزم شوێنی ئاینی گرتەوە و. سکۆلاریزم وەکو ئایدۆلۆژیای سیستەمی سەرمایەداریی لێهات، ئاینی لە دەوڵەت و حوکمڕانیی جیاکردەوە.

لەو کاتەدا ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە خەوی قووڵی سیستەمی دەرەبەگایەتییدا دەژیا، ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی و دەوڵەتی سەفەویی/ قاجاریی ئێرانیی لە ڕێگەی بیروباوەڕی ئاینییەوە حوکمی وڵاتیان دەکرد. بە خەویش بیریان لەوە نەدەکردەوە ڕۆژێک لە ڕۆژان ڕینسانس (مەشروتیەت) لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا پێکبێت و پێگەی دەوڵەتە دەرەبەگەکەیان بلەرزێنێت و دەوڵەتی نەتەوەیی لە شوێنی دروستببێت، بیریان نەدەکردەوە ئایدۆلۆژیای سکۆلاری ئەوروپا لە شوێنی ئایدۆلۆژیای ئاینیی دەربکەوێت و سیستەمێکی نوێی سەرمایەداریی لە شوێنی سیستەمی دەرەبەگایەتیی ڕاستبێتەوە.

# دەوڵەت_نەتەوەکان

## ١- دەوڵەت_نەتەوەی تورک:

ململانێی نێوان ئەورووپای سەرمایەداریی گەنج و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی دەرەبەگایەتیی پیر، لە سەدەی نۆزدەهەمدا لە ڕووی هزریی و کەلتورییەوە دەستپێدەکات. لە سەرەتای سەدەی بیستدا لە جەنگی یەکەمی جیهانییدا ئەم ململانێیە گەیشتە لوتکە و بە شەڕی یەکەمی جیهانیی ململانێکە لە بەرژەوەندیی ئەورووپای سەرمایەداریی کۆتاییهات. بە سەرکەوتنی هاوپەیمانەکان و شکستی ئەڵمانیای هاوپەیمانی دەوڵەتی عوسمانیی، دەوڵەتی عوسمانیی شکستیهێنا و هەڵوەشایەوە. داڕمانی ئەم دەوڵەتە دەرفەتی بۆ هاتنەپێشەوەی پێکهاتەیەکی نوێ خۆشکرد، کە نەتەوەیی و سکۆلارە. حیزبی ئیتحاد ترقی و کەمال ئەتاتۆرک نوێنەرایەتیی ئەو پێکهاتە نوێیەیان دەکرد. دوای ڕوخانی دەوڵەتی عوسمانیی ئەم پێکهاتەیە داوای دەوڵەتی نەتەوەیی تورکیای دەکرد، لە شوێنی ئایدۆلۆژیای ئیسلامیی، ئایدۆلۆژیای سکۆلاریی سیستەمی سەرمایەداریی ئەورووپییان پەیڕەودەکرد.

بەرنامەی ئەم گروپە نوێیەی تورکیا، لە دوو لاوە سودی بە وڵاتانی ئەورووپا دەگەیاند، لە لایەکەوە جوڵانەوە نوێکەی تورک دژی مانەوەی ئایدۆلۆژیای ئیسلامیی بوو، بەو شێوەیە سیستەمی سیاسیی و ئاینیی ئەورووپا لە دوژمنێکی گەورەی سیاسیی و ئایدۆلۆژیی خۆی ڕزگاردەکرد، کە ئایدۆلۆژیی ئسلامیی بوو. لە لایەکی ترەوە جوڵانەوە نوێیەکە چەمک و ئایدۆلۆژیای نەتەوەیی ئەورووپای بۆ دەسەڵات و بەڕێوەبردنی تورکیا و کەلتوری کۆمەڵگە بە بنەما دەگرت، لەبەرئەوە جوڵانەوەی نەتەوەیی تورک بە ڕێبەرایەتیی کەمال ئەتاتورک لە لایەن ئەورووپییەکانەوە پشتیوانیی لێکرا. بۆ ئاواکردنی دەوڵەتێکی نەتەوەیی مۆدێل_ئەورووپیی لە تورکیا، ئەورووپییەکان ڕەزامەندیی و پشتگیریان پیشاندا. بەو شێوەیە دەتوانین بڵێین تورکە بۆرجوازەکان پێش کورد و عەرەب، فریای خۆیان کەوتن، خۆیان لەگەڵ سیستەمی سیاسیی نوێی جیهانییدا گونجاند. هەندێک لە مافەکانی گەلی تورکیان لە وڵاتە ئەورپییەکان وەرگرتەوە.

## ٢- دەوڵەت_نەتەوەی عەرەب:

لە سەدەی شازدەهەمەوە هەتا جەنگی یەکەمی جیهانیی، عەرەب لە ژێردەستی ئیمپراتۆریەتی عوسمانییدا دەژیا. بە چەمک و ئایدۆلۆژیای نەتەوەیی ئەوروپا ئاشنا نەبوو. بە ڕوخانی دەوڵەتی عوسمانیی و هاتنی سوپای ئینگلیز و فەرەنسا بۆ نیشتیمانە دوبارەداگیرکراوەکەی، بە چەمک و ڕێکخستن و سەرکردایەتیی خێڵەکیی و دەرەبەگایەتییەوە لە بزوتنەوەی ڕزگاریی و سەربەخۆیی نزیکدەبوونەوە. ئایدۆلۆژیای بزوتنەوەی ڕزگاریی عەرەب، بنەما هەرە کۆنەکانی خێڵ و ئاینی ئیسلامی تێنەپەراند. کەلتوری کۆمەڵایەتیی و ڕێسای بەڕێوەبردنی عەرەبەکان، لە هزری خێڵەوە سەرچاوەیدەگرت. ئەم ئایدۆلۆژیا و کەلتورەی عەرەب لە کەلتوری نەتەوەیی سکۆلاری ئەوروپاوە دووربوو. سەرکردە عەرەبەکان بە ئارەزوو نەتەوەیی بوون، بەڵام بە هزر و هەڵسوکەوتی سیاسیی خێڵەکیی و دەرەبەگ بوون. ئەمەیش وایکرد کە ئەوروپییەکان لە بەرانبەر بزاڤی ڕزگارییخوازی نەتەوەیی عەرەبدا گومانبکەن، نەک عەرەبەکان بیانەوێت لە ئایندەدا ئیمپراتۆریەتێکی ئیسلامیی لە ناوچەکەدا زیندووبکەنەوە. لەبەرئەوە بزاڤی ڕزگارییخوازی نەتەوەیی عەرەب لە ئاستی نێونەتەوەییدا وەکو بزاڤی نەتەوەیی تورک پشتیوانیی ئەوروپای بەدەستنەهێنا. لە ئاستی ناوخۆییشدا لەبەرئەوەی کۆمەڵگەی عەرەبیی لە ڕووی هزر و ململانێی چینایەتییەوە پێشکەوتنێکی ئەوتۆی بە خۆیەوە نەدیبوو، پێکهاتەی چینایەتیی بورجوازیی بۆ پرسی نەتەوەیی ئامادەنەبوو. عەرەب نەیتوانی هەموو چینوتوێژە کۆمەڵایەتییەکان بە ئایدۆلۆژیای نەتەوەیی بهەژێنێت و ڕێکیانبخات و ئامادەیانبکات.

ئیتر بزاڤی ڕزگارییخوازی عەرەب لە دوای جەنگی یەکەمی جهانییەوە هێندە سەرکەوتن و پێشکەوتنی بە خۆیەوە نەدی، ناوەڕۆکی بزاڤەکەیان پێویستییە سیاسیی و ئابوریی و کۆمەڵایەتییەکانی نەتەوەی عەرەبی تێرنەدەکرد. بزاڤەکەیان لەگەڵ کەلتور و ئایدۆلۆژیای نەتەوەیی ئەوروپادا نەدەگونجا. ئاستەنگیی بۆ بڵاوبوونەوەی سیستەمی سیاسیی سەرمایەداریی پێکدەهێنا، لەبەرئەوە لە دوای ڕوخانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی، ئەگەرچی چەندیین دەوڵەتی عەرەبیی لە نیشتیمانی عەرەبییدا ڕاستکرانەوە و سەربەخۆییان وەرگرت. لەگەڵ ئەوەیشدا کە نیشتیمانی عەرەبیی خاوەنی گەرەترین سەرچاوەی وزەی نەوتی جیهانە، لەگەڵ ئەوەیشدا کە نەتەوەی عەرەب بە ژمارەی دانیشتوان و بە فراوانیی جوگرافیا نەتەوەیەکی گەورەیە، کەچی هەتا ئێستا نەیانتوانیوە کێشە نەتەوەیی و کۆمەڵایەتییەکانی چارەسەربکات. ئابورییەکی تۆکمەی نییە، لە ڕووی زانست و تەکنۆلۆژیاوە پێشنەکەوتیوە.

## ٣- دەوڵەت_نەتەوەی کورد:

لە کاتی دەرکەوتنی سیستەمی سەرمایەداریی لە ئەوروپا و بڵاوبوونەوەی هۆشیاریی نەتەوەیی لە ناو گەلاندا، نەتەوەی کورد وەکو نەتەوەی تورک و فارس خاوەنی دەوڵەت نەبوو. وەکو نەتەوەی عەرەب خاوەنی ئایدۆلۆجیای ئاینیی نەبوو. نیشتیمانی داگیر و دابەشکراوبوو. لە ساڵی ١٥١٤ لە شەڕی چاڵدێرانی نێوان دەوڵەتی عوسمانیی و دەوڵەتی سەفەوییدا، نیشتیمانٰ و نەتەوەی کورد لە نێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانیی و سەفەوییدا دابەشکرا. ئەو دوو دەوڵەتە داگیرکەرە لەژێر سێبەری هاوئاینی کورد و نەتەوە باڵادەستەکانی دەوڵەتی عوسمانیی و سەفەوییدا، کوردیان وەکو پێکهاتەیەکی پلە دووی خزمەتکاری ئیسلام بەڕێوەدەبرد. بۆ خزمەتی سەربازیی و شەڕی دوژمنانی ئیسلام و باج و خەراج ئەرکیان پێدەسپارد.

بەڵام لەو کاتەدا کورد وەکو پێکهاتە نامسوڵمانەکانی دەوڵەتی تورک و فارس بەر هێرشی سیاسەتی تواندنەوە و لەناوبردنی کەلتوریی و جەستەیی نەدەکەوتن. خێڵە کوردەکان لە سەردەمی حوکمڕانیی عوسمانیی و سەفەوییەکاندا زۆربەی کات خاوەنی نیمچە سەربەخۆییەکی ناوچەیی بوون. سەرۆک_خێڵ و ئاغا و شێخ و مەلای کورد سەرکردایەتیی سیاسیی و بەڕێوەبەریی و ئایدۆلۆژیی خێڵ و میرنشینە کوردەکانیان دەکرد. لەسەر بنەمای پێڕەوکردن و پارستنی ئاینی ئیسلام و مانەوەی دەسەڵاتی خۆیان، پەیوەندییەکی باشیان لەگەڵ دەسەڵاتدارانی هەردوو دەوڵەت هەبوو. ئیمارەتەکانی ئەردەڵان و بابان دوو شێوەی ڕێکخستن و ئیداریی ئەو سەردەمانەی میللەتی کوردن، کە لە ڕاپەڕاندنی کاروباری ناوچەکەیاندا نیمچە سەربەخۆیەکیان هەبووە*٢.

لەگەڵ بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕی نەتەوەییدا، چەوسانەوەی سیاسیی و ئابوریی و کۆمەڵایەتیی دەوڵەتە داگیرکەرەکان لەسەر کوردستان پەرەیسەند. وەکو پەرچەکردار (بەرتەک/ کاردانەوە) لە ناو تاکە هۆشیارەکانی میرنشین و خێڵە کوردەکاندا، هەستی نەتەوەیی دەستپێکرد. یاخیبوون و بەرخودانی سیاسیی و چەکداریی لێکەوتەوە.

شۆڕشگێڕانی کورد هەر کە دەرفەتیان بۆ ڕەخسابێت و دیبێتیان دەوڵەتی داگیرکەری عوسمانیی، یان سەفەوی، کێشەی ناوخۆیی و دەرەکیی هەیە. گوشاری زۆرتریان لەسەر داگیرکەر داناوە و داوای مافی نەتەوەییان بۆ گەلی کورد کردووە. بۆ نمونە، لە ناکۆکیی و شەڕی نێوان دەوڵەتی سەفەویی و دەوڵەتی عوسمانیی، یان لە شەڕی نێوان ڕوسیای قەیسەریی و دەوڵەتی عوسمانییدا، هەندێک لە سەرۆکی میرنشینەکان لە دژی دەوڵەتی

داگیرکەر ڕاپەڕیون. داوای مافی نەتەوەیی و سەربەخۆیی گەلی کوردیان کردووە، بەڵام لەبەرئەوەی گەلی کورد (میرنشینی کورد) لەو سەردەمەدا هەموو بنەماکانی نەتەوەبوونی لە خۆیدا بەرجەستەنەدەکرد، خاوەنی ئایدۆلۆژیایەکی نەتەوەیی نەبوو، لایەنی خێڵەکیی و ئاینگەرایی بەسەر دید و بۆچوونی سەرکردەی سەرهەڵدانەکەدا زاڵبوو. ئەنجامی هەموو ڕاپەڕیین و سەرهەڵدان و شەڕەکان شکست و بێئومێدیی و خۆبەدەستەوەدان بووە.

هەندێک جار سەرهەڵدان و ململانێی نێوان میرنشینە کوردەکان و دەسەڵاتدارانی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان، پەرچەکرداری زیادکردنی بڕی باج و ژمارەی سەربازی سەر خێڵ و میرنشینە کوردەکان بووە. ئەم دیاردەی زیادکردنی سەرانە و سەربازانەی سەر میرنشینە کوردەکان زۆربەی کات لە کاتی دروستبوونی شەڕدا بووە، هەر کە سەرانەکە کەمکراوەتەوە، سەرهەڵدانەکەیش نیشتووەتەوە.

هۆکاری هەندێک ڕاپەڕیین و سەرهەڵدانی تری میرنشینە کوردەکان بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە دەستی بێگانەی لە پشتەوە بووە، دوژمنەکانی دەوڵەتی عوسمانیی، یان دوژمنەکانی دەوڵەتی سەفەویی-قاجاریی ئێران، بە نهێنیی پەیوەندییان بە سەرۆک_خێڵەکانی کوردەوە دەکرد، لە دژی دەوڵەتە ڕکابەرەکانیان هانیاندەدان و پشتگیرییاندەکردن هەتا ڕاپەڕیین بکەن و داوای مافی خۆیان بکەن، بەڵام هەر کە پەیوەندیی نێوان داگیرکەرانی کوردستان و دەوڵەتە دوژمنەکانیان ئاساییدەبووەوە، پشتیوانیی و هاوکارییەکانی ڕاپەڕینی کوردان لە لایەن دوژمنەکانی دەوڵەتانی داگیرکەرەوە دەوەستا و سەرهەڵدانەکەیش پاشەکشەی پێدەکرا. لەو سەردەمەدا کە هێشتا کوردستان بۆ چوار پارچە دابەشنەکرابوو، شێوەی دەستپێکردنی ڕاپەڕیین و سەرهەڵدانەکان بەو شێوەیە بووە، چارەنوسی هەموویشیان شکستی سەربازیی و بێئومێدیی و خۆبەدەستەوەدانی سیاسیی بووە. بەم شێوەیە دەبینین لە سەردەمی حوکمڕانیی داگیرکەرانی تورک و فارسدا تێکۆشانی کوردان بەردەوام شکستیدەخوارد. هۆکاری سەرەکیی ئەو شکستانە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە گەلی کورد بە باشیی خۆی بۆ ئەنجامدانی ئەرکی نەتەوەیی ئامادەنەدەکرد.

ئەو پێکهاتەیەی کە نەتەوە و نیشتیمان ڕزگاردەکات، تاک و پێکهاتەی سەرمایەدارە، لە کۆمەڵگەی کوردستاندا زەمینەی دروستبوون و گەشەکردن بۆ چینی سەرمایەدار نەڕەخسا، ئەوەی کە هەبووە پێکهاتەیەکی خێڵەکیی و دەرەبەگیی کورد بوو لە شوێنی سەرمایەدار هەوڵی بەدەستهێنانی ئامانجی نەتەوەیی دەدا. ئەمەیش ناکۆکییەکی لە نێوان هۆکار و ئامانجدا دروستدەکرد. شۆڕشەکانی گەلی کوردی دوچاری شکست دەکرد.

# کوردستان لە جەنگی یەکەمی جیهانییەوە

لە جەنگی یەکەمی جیهانییدا دەوڵەتی عوسمانیی ڕوخا، ڕوخان و هەڵوەشانەوەی دەوڵەتی عوسمانیی بۆ بەریتانیا و فەرەنسا و هاوپەیمانەکانیان، سەرکەوتنێکی سەربازیی و سیاسیی و ئایدۆلۆژیی گەورە بوو. بۆ نەتەوە ژێردەستەکانی یۆنانیی و بولغاریی و عەرەب و کورد و ئەرمەن، جەژنی ئازادیی نەتەوەیی بوو. بۆ تورکەکان و ڕێبازە ئیسلامییە سیاسییەکانی جیهانیش، نەهامەتیی و ژێرکەوتن و شکستێکی هەمەلایەنە بوو.

کورد نەیتوانی سود لەو ڕێککەوتنە نهێنییانەی پێش جەنگی یەکەمی جیهانیی وەربگرێت، کە لە نێوان هاوپەیمانەکاندا دەربارەی چارەنوسی دەوڵەتی عوسمانیی مۆرکرابوو. کورد نەیتوانی سود لە سیاسەتی دوای ڕوخانی دەوڵەتی عوسمانیی هاوپەیمانەکان وەربگرێت. نەیتوانی سود لە پەیمانی سیڤەری ساڵی ١٩٢٠ دوای جەنگی یەکەمی جیهانیی وەربگرێت. وەکو پێکهاتەیەکی نەتەوەیی سست و بێدەوڵەت مایەوە.

لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانیی کوردستان بەسەر چوار دەوڵەتی داگیرکەری نەتەوەپەرستدا دابەشکرا. سیستەمی سیاسیی جیهانیش شانبەشانی داگیرکەرانی کوردستان دژی ماف و ئازادییەکانی گەلی کورد وەستایەوە. لە جەنگی یەکەمی جیهانییدا نەک هەر کێشەی نەتەوەیی کورد چارەسەرنەکرا، بەڵکو کێشەکەی قووڵتربووەوە و ئاستەنگیی زۆرتر بۆ نەتەوەبوونی کورد دروستکرا.

## ١- قووڵبوونەوەی کێشەی کورد:

کورد نەیتوانی سود لە بەندەکانی (٦٢.٦٣.٦٤)ی ڕێککەوتنی سیڤەر وەربگرێت. نەیتوانی دەوڵەتی نەتەوەیی دروستبکات*٣. لە کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانییدا ئەو بەشەی نیشتیمانی کوردان کە لەژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانییدا بوو، بەسەر سێ دەوڵەتی تازەدروستکراودا (تورکیا، عێراق، سوریا) دابەشکرا.

ئەو بەشەی کوردستان کە لەژێر دەسەڵاتی ئێراندا بوو، لە ژێردەستی دەوڵەتی ئێراندا مایەوە، بەم شێوەیە دەبینین لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە ئەو

گۆڕانکارییەی کە لە جوگرافیای سیاسیی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ئەنجامدرا، سودی بۆ نەتەوە ژێردەستەکانی تر هەبوو، بە زیانی گەلی کورد تەواوبوو.

نوێنەرانی کورد نەیانتوانی لە ئاستی سیاسەتی نێونەتەوەیی و دیبلۆماسییدا پشتیوانیی بۆ مافی نەتەوەیی کورد بەدەستبخەن. نیشتیمانی کورد لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە بوو بە چوار پارچەوە. ئەم دابەشکردنەی کوردستان تەنها دابەشکردنێکی سیاسیی و ئیداریی نەبوو، بەڵکو لە هەمان کاتدا داگیرکارییەکی هزریی و کەلتورییش بوو. هزری یەکێتیی خاکی ئەو وڵاتانەی کوردستانیان بە سەردا دابەشکرا، پیرۆزکرا و بەسەر گەلی کوردیشدا سەپێنرا. لە بەرنامەی هەموو هێزە ئایدۆلۆژیی و سیاسیی و کەلتورییەکانی کوردستاندا شوێنی خۆی گرت.

کۆمۆنیست و ئیسلامیی و لیبراڵ و دیموکراتەکانی کوردستان و نەتەوەی سەردەستی کوردستان، ئەگەر لەسەر چەندین بابەت ناکۆکبن، لەسەر ئەوە کۆکدەبن کە ئەو بەشەی کوردستان بە دەوڵەتی تورکیا و ئێران و عێراق و سوریاوە لێکنراوە، دیاردەیەکی سروشتییە، هەر پارچەیەکی داگیرکراوی کوردستان بەشێکی دانەبڕاوی ئەو وڵاتەیە، کە بەسەریدا دابەشکراوە. ئەمەیش زیانێکی گەورەی لە پرۆسەی نەتەوەبوونی گەلی کورد دا. بەو شێوەیە دوای جەنگی یەکەمی جیهانیی نیشتیمانی کورد لە دوو پارچەوە بوو بە چوار پارچە. کوردستانی تورکیا و کوردستانی ئێران و کوردستانی عێراق و کوردستانی سوریا. یەکێتیی خاک و نەتەوەی کوردیان تێکدا و کۆڵەکەیەکی بنەڕەتیی (نیشتیمان)ی نەتەوەی کوردیان قڵیشاند. کاتێک نیشتیمان پارچەکرا و دیاریکردنی سنووری نیشتیمانی کوردان کێشەی تێکەوت، یەک لە پایەکانی نەتەوەییبوونی کوردان لەدەستدەچێت و کورد ناتوانێت وەکو پێکهاتەیەکی نەتەوەیی گەشەی سروشتیی خۆی بکات و بە ئاستی نەتەوەکانی جیهان بگات.

دابەشکردنەوەی کوردستان، دابڕان و دوورکەوتنەوەی گەلی کوردی لێدەکەوێتەوە. پەیوەندیی کورد لەگەڵ گەلانی وڵاتانی سەردەستی کوردستان گەشەدەکات، زمان و کەلتوری گەلە سەردەستەکان، هزر و ڕۆحی گەلی کورد داگیردەکات. کورد زمان و کەلتوری خۆی لەبیردەکات، زمان و کەلتوری بێگانە پەسەنددەکات. بەم شێوەیە دروستبوونی زمان وکەلتوری یەکگرتووی کورد کە کۆڵەکەیەکی تری نەتەوەبوونی کوردە، هێندەی تر ئاستەنگیی بۆ دروستدەبێت.

هەر لە ئەنجامی دابەشکردنی کوردستاندا، پێکهاتنی بازاڕی هاوبەش، کە کۆڵەکەیەکی تری نەتەوەییبوونی گەلانە، ئاستەنگیی بۆ دروستدەبێت. شار و ناوچە جیاوازەکانی کوردستان لە ڕێگەی بازرگانیی و هاتوچۆوە بە شارە گەورەکانی تورکیا و ئێران و عێراق و سوریاوە دەبەسترێنەوە. بازرگانیی و هاتووچۆی نێوان بەشەکانی کوردستان و شارەکانی کوردستان تەنها بە قاچاخیی ئەنجامدەدرێت.

ئەم دابەشکردنەی کوردستان ئەرکێکی تری بۆ تێکۆشانی گەلی کورد زیادکرد، پێش جەنگی یەکەمی جیهانیی تێکۆشانی گەلی کورد بۆ ڕزگارکردنی کوردستان بوو، بەڵام دوای جەنگی یەکەمی جیهانیی، یەکگرتنەوەی کوردستان و ڕزگارکردنی کوردستان لە بەرنامەی کۆمەڵێک حیزبی سیاسیی کوردستاندا دانران. بەم شێوەیە دەبینین کە دابەشکردنی کوردستان چەمک و بنەماکانی نەتەوەییبوونی کوردی لاوازکرد، ئەرکی ڕزگارکردنی کوردستانیشی گرانترکرد.

## ٢- زۆربوونی داگیرکەر:

پێش جەنگی یەکەمی جیهانیی، گەلی کورد دوو داگیرکەری هەبوو، دەوڵەتی عوسمانیی و دەوڵەتی ئێران، بەڵام پاش ئەو جەنگە کاتێک خاکی کوردستان لە نێوان چوار دەوڵەتدا دابەشکرا، گەلی کورد بووە خاوەنی چوار دوژمنی داگیرکەر. بزوتنەوەی ڕزگارییخوازی گەلی کورد لە هەر پارچەیەکی کوردستان دەستپێکردبێت، داگیرکەرانی پارچەکانی تریش بۆ سەر خۆیان بە مەترسییان زانیوە، ئامادەکارییان بۆ سەرکوتکردنی کردووە. لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە هەتا ئەمڕۆ، بۆ سەرکوتکردن و لەباربردنی بزاڤی نەتەوەیی کورد، یەکێتیی لە نێوان داگیرکەرانی کوردستاندا دروستبووە. پەیمانی ئاگری، پەیمانی سەعد ئاباد، پەیمانی بەغدا و پەیمانی سەنتۆ، کۆمەڵێک ڕێککەوتنی سیاسیی نێوان تورکیا و ئێران و عێراق و سوریا و دۆستەکانیانن بۆ ئەوەی کوردستان بە داگیرکراویی و دابەشکراویی لە ژێردەستی ئەو وڵاتانەدا بمێنێتەوە*٤.

ئەمە سەرەڕای ئەوەی چەندیین ڕێککەوتنی سەربازییش لە نێوان داگیرکەرانی کوردستاندا مۆرکراوە، بۆ ئەوەی پێکەوە لە بەرانبەر هێزی پێشمەرگە و گەریلای کوردستاندا سنووری خاکی خۆیان ببەزێنن و هاوکاریی سەربازیی و هەواڵگریی بە

یەکتر بکەن. وەکو پەیمانی جەزائیر ساڵی ١٩٧٥ لە نێوان ئێراق و ئێراندا بەسترا *٥.

ساڵی ١٩٨٣ سوریا و تورکیا پەیمانێکیان بەست، ساڵی ٢٠٠٧ عێراق و تورکیا پەیمانیان دژی تیرۆر ئیمزاکرد *٦. ئەو ئۆپراسیۆنە هاوبەشانەی نێوان تورکیا و ئێران دژی هێزە شۆڕشگێڕەکانی باکوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان کە لە ساڵی ٢٠٠٤ دەستیپێکردووە، نمونەی ئەو گەلەکۆمەیەن کە لە لایەن داگیرکەرانی کوردستانەوە ڕووبەڕووی گەلی کورد دەبێتەوە.

لە بەرانبەر ئەو یەکێتییەی نێوان داگیرکەرانی کوردستان، یەکێتیی نێوان گەلی کورد لە پارچەکانی کوردستان لە ئاستی پێویستدا نییە.

### ٣- دوژمنی نێونەتەوەیی:

پێش جەنگی یەکەمی جیهانیی، دەوڵەتی عوسمانیی و دەوڵەتی ئێران دوژمنی وڵاتانی ئەوروپا بوون، بەردەوام کێشە و ململانێ لە نێوانیاندا هەبوو. لەو سەردەمەدا گەلی کورد دەیتوانی سود لەو ململانێیە وەربگرێت و ئەوروپا وەکو دۆست سەیربکات، یان هەر هیچ نەبێت لە ناکۆکیی نێوان کورد و داگیرکەراندا، وڵاتانی ئەوروپا و جیهان بێلایەن دەبوون.

دوای جەنگی یەکەمی جیهانیی، دەوڵەتی عوسمانیی ڕوخا و دەوڵەتی سەفەوی ئێران لاوازبوو، ناکۆکیی لە نێوان وڵاتانی ئەوروپیی و وڵاتانی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست وەکو جاران نەما. وڵاتانی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست خۆیان ڕادەستی وڵاتە ئەوروپییەکان کرد و خۆیان وەکو بەشێکی سیستەمی سەرمایەداریی جیهانیی ڕاگەیاند. خۆیان وەکو دۆستی ئەو وڵاتانە ڕاگەیاند، کە ڕابەرایەتیی سیستەمی سەرمایەداریی دەکەن. لەبەرئەوە هەر دژایەتییەکی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان لە لایەن کوردەوە، بە دژایەتیی دەوڵەتە ئەوروپییەکان و سیستەمە زاڵەکەیان دەژمێردرا. ئەوانیش دژی کورد هەنگاوی دوژمنکارانەیان هەڵدەگرت.

ئیتر لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە نەک تەنها دەوڵەتەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دوژمنایەتیی کورد دەکەن، وڵاتانی ئەوروپایش لە ڕیزی دوژمنانی کوردا پۆلێندەکرێن. پەیمانی لۆزانی ساڵی ١٩٢٣ لە فەرەنسا کە بەندەکانی پەیمانی سیڤەری

سڕییەوە، گەلەکۆمەی نێوان داگیرکەرانی کوردستان و وڵاتە ئەوروپییەکان بوو دژی گەلی کورد٦.

سیاسەتی دەوڵەتی ئینگلیز بەرانبەر بە شۆڕشی شیخ مەحمودی بەرزنجیی و شۆڕشی بارزان، کە شانبەشانی دەوڵەتی عێراق دژی کورد دەجەنگا، نمونەیەکی تری هاوپەیمانیی نێوان داگیرکەرانی کوردستان و وڵاتانی ئەوروپا دژی کورد پیشاندەدات. سیاسەتی دژەکوردی هێزە نێودەوڵەتییەکان لەو کاتەوە هەتا ئەمڕۆ بەردەوامە. ساڵی ١٩٤٦ وڵاتانی باڵادەستی جیهان و دەوڵەتی ئێران کۆماری کوردستانیان ڕوخاند. ساڵی ١٩٧٥ بە ڕێککەوتنی ئێران و عێراق و ڕەزامەندیی ئەمریکا، کۆتاییان بە شۆڕشی ئەیلول هێنا. لە گەلەکۆمەیەکی نێودەوڵەتییدا ساڵی ١٩٩٨ - ١٩٩٩ عەبدوڵلا ئۆجەلان دەستگیرکرا و ڕادەستی دەوڵەتی تورکیا کرایەوە. ساڵی ٢٠١٨ تورکیا عەفرینی ڕۆژئاوای کوردستانی داگیرکرد. ئەو داگیرکارییەی تورکیا بە ڕەزامەندیی و پشتیوانیی ڕوسیا بوو. ساڵی ٢٠١٩ تورکیا پەلاماری سەرێکانی و دەوروبەری دا و داگیریکرد. ئەو پەلامارە بە ڕەزامەندیی ئەمریکا (ترامپ) بوو.

### ٤- دوژمنی ئاینیی:

لەبەرئەوەی سەلاحەدینی ئەیوبیی کوردە و لە سەدەی ١٢دا لە شەڕی خاچپەرستەکاندا سەرکردایەتیی سوپای ئیسلامی ئەو کاتەی دەکرد، لەو شەڕەدا کریستیانەکان زیانی گەورەیان بەرکەوتووە و شکستی ستراتیژییان خواردووە، گەلی کورد لە لای کریستیانەکانی جیهان خۆشەویست نییە. وڵاتانی ئەوروپییش هەموویان کریستیانن، بەو هۆیەوە لە لای خەڵکی کوردستان بۆچوونێک درووستبووە کە ئەوروپییەکان چەند بۆیانبکرێت دژایەتیی گەلی کورد دەکەن.

لەبەرئەوەی گەلی کورد ئیسلامە، سەربازە کوردەکانی سوپای تورک بە فەرماندەیی سەرکردەکانی ئیتحاد و تەرەقی تورکەکان لە جەنگی یەکەمی جیهانییدا بەشداریی کۆمەڵکوژیی گەلی ئەرمەنیان کرد، ئەرمەنییەکانیش مەسیحیی بوون، ئەمەیش بوو بە لەکەیەکی تر بە ناوچەوانی کوردەوە، کورد وەکو دوژمنی گەلانیی مەسیحیی دەناسرێت، هەتا ئێستایش ئەو تاوانەی لەسەر نەسڕاوەتەوە*٧.

لە ڕۆژهەلاتی کوردستانیش لە جەنگی یەکەمی جیهانییدا سمکۆی شکاک ئەرمەنییە مەسیحییەکانی ڕۆژهەلاتی کوردستانی کۆمەلکوژکرد، هێندەی تر دژبەری گەلانی مەسیحی بە ناوچەوانی گەلی کوردەوە نووسێترا*٨

لە جەنگی یەکەمی جیهانییدا بەریتانییەکان زۆر هەولیاندا لەگەل کوردەکانی عێراق (شیخ مەحمود، بارزانییەکان، پەرپرسانی تر) هەتا ئەو مەسیحییانەی لە جەنگی یەکەمی جیهانییدا پشتیوانیی سوپای بەریتانیایان دەکرد لە باشووری کوردستان نیشتەجێبکرێن، بەلام لایەنی کوردیی بەوە ڕازینەبوو، لەبەرئەوە هێندەی تر نێوان کورد و مەسیحیی درزی تێدەکەوێت *٩.

لە سەردەمی شۆڕشی شیخ مەحمووددا، بە بیانووی ئەوەی کە شێخ پەیوەندیی لەگەل تورکەکان هەیە، بەریتانیا چەندی بۆ کرا دژایەتیی شۆڕشی شێخ مەحمودی کرد.

لە شۆڕشی ئەیلول و شۆڕشی نوێی باشووری کوردستاندا، وە دوای دامەزراندنی دەسەلاتی هەرێمی کوردستان، هەلوێستی کورد بەرانبەر بە مەسیحییەکان و کەمینەکانی تر گۆڕانکاریی بەسەرداهات. ڕێز لە ئازادیی ئاینیی و سیاسیی مەسیحییەکان گیرا و مافەکانیان پارێزرا. لە ناو شۆڕشی باکوری کوردستان و ڕۆژئاوای کوردستاندا بە هەمان شێوە ڕێز لە ئازادیی ئاینیی و سیاسیی مەسیحییەکان و کەمینەکانی تری کوردستان گیرا و مافیان پارێزرا. لە دامودەزگاکانی کوردستاندا نوێنەریان بۆ دەستنیشاندەکرێت و لە بڕیاری سیاسییدا بەشدارییدەکەن. ئەم سیاسەتە نوێیەی گەلی کوردستان بەرانبەر بە مەسیحییەکان، لە لایەن ولاتانی ئەورووپیی و ئەمریکای مەسیحییەوە بە دلخۆشییەوە پێشوازیی لێدەکرێت. هەلوێستی ئەو ولاتانەی بە باشیی بەرەو دۆزی کورد بادایەوە.

دوای ئەوەی کورد لە هەر چوارپارچەی کوردستان وەکو دەسەلات و خەلک، شانبەشانی کۆمەلگەی نێودەولەتیی دژی ڕێکخراوە ئیسلامییە توندڕەوەکانی قاعدە و داعش وەستایەوە، هێندەی تر پەیوەندیی نێوان کورد و مەسیحیی ئاشتەوایی تێکەوت.

پێش جەنگی یەکەمی جیهانیی کورد وەکو گەلێکی مسولمانی ناوچەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دەناسرا. پەیوەندییەکی دۆستانەی لەگەل گەلانی مسولمانی ناوچەکەدا هەبوو، بەلام دوای ئەوەی گەلی کورد داوای ماف و ئازادیی نەتەوەیی خۆی لە

وڵاتە داگیرکەرەکانی کوردستان کرد، ئەو وڵاتانەیش خۆیان بە ئیسلام و پارێزەری ئاینی ئیسلام دەزانن، لەبەرئەوە بە ئاسانیی تاوانی کافر و بێدینییان ڕووبەڕووی گەلی کورد دەکردەوە. ئەمە دەرفەتی بە داگیرکەرانی کوردستان دا هەتا گەلی کورد لە بەرچاوی مسوڵمانانی دونیا بخەن. ڕێکخراوە ئیسلامییەکان و وڵاتە موسڵمانەکان هاوکاریی کورد نەکەن، پشتیوانیی دۆزی ڕەوای گەلی کورد نەکەن. هەتا ئەمڕۆیش وڵات و ڕێکخراوە ئیسلامییەکان هەڵوێستێکی جدییان بەرانبەر بە گەلێکی چەوساوەی مسوڵمانی وەکو کورد پیشاننەداوە. نەک هەر ئەوە، لە بەرانبەر جینۆسایدی گەلی کورددا لە کارەساتی هەڵبجە و ئەنفالی ساڵی ١٩٨٨دا کۆنگرەی یەکێتیی جیهانیی زانایانی ئیسلامیی کە لە کوێت بەسترا، باسێکی ئەو کۆمەڵکوژییەی کوردی نەکرد*١٠.

لە دوای دروستبوونی ڕێکخراوە تیرۆریستییە ئیسلامییەکانی قاعدە و داعش، گەلی کورد لە هەر چوارپارچەی کوردستان، بە شێوەی خەباتی سیاسیی و سەربازیی، شانبەشانی هێزە نێودەوڵەتییەکان، دژی ئەو ڕێکخراوانە وەستانەوە. ئەمە وایکرد ناکۆکیی نێوان وڵاتە ئیسلامییەکان و ڕێکخراوە ئیسلامییەکان و گەلی کورد زیاتر پەرەبسێنێت.

### ٥- نەتەوەپەرستیی داگیرکەران:

لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە چەند دەوڵەتێکی نەتەوەیی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا پێکهاتن، هزری نەتەوەیی دەسەڵاتدارانی نەتەوەی سەردەستی کوردستان لەو وڵاتانەدا قۆناغی ڕزگاریی نیشتیمانیی دەربازکرد و بە قۆناغی نەتەوەپەرستیی گەیشت. دژی مافەکانی گەلانی کورد و ئەرمەن و چەرکەس و هیی تر وەستانەوە. دەوڵەتێکی وەکو تورکیا لە قۆناغی شەڕی دەرکردنی یۆنانییەکاندا پەنای بۆ کورد دەبرد، بەڵام کاتێک تورکیا خۆیگرت و مەترسیی دوژمنە دەرەکییەکانی نەما، دژی کورد و پێکهاتە نەتەوەییەکانی تر سیاسەتێکی شۆڤێنیی دەگرێتەبەر، ناو و زمان و مافی تری کورد قەدەغەدەکات.

وڵاتانی ئەورووپیی ئەم سیاسەتەی تورکیایان دەبینی، بەڵام بۆ پاراستنی بەرژەوەندیی خۆیان پشتگیرییان لەو سیاسەتە نەتەوەپەرستییەی تورک کرد و پشتی نەتەوە ژێردەستەکانیان بەردا. لەو کاتەوە هەتا ئەمڕۆ وڵاتانی ڕۆژئاوایی پشتیوانیی

تورکیا و ئێران و عێراق و سوریا دەکەن، دژایەتیی ئاوات و ئامانجەکانی گەلی کورد دەکەن. بەم شێوەیە پەتای نەتەوەپەرستیی ئەوروپییەکان گەیشتە دەسەڵاتدارانی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، گەلی کورد لەو پەتایە گەورەترین زیانی بەرکەوت.

دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستان لەژێر ڕۆشنایی هزری نەتەوەپەرستیی و پشتیوانیی وڵاتانی ئەورووپادا، بۆ بەهێزکردن و فراوانکردنی نیشتیمان و نەتەوەی خۆیان، سیاسەتی تواندنەوە و قڕکردنی گەلی کورد دەستپێکرد. ئەم سیاسەتە نەتەوەپەرستییە لە لایەن تورکە شۆڤینییەکانەوە دژی کورد لە باکووری کوردستان پەیڕەوکرا. کاتێک حکومەتی ئیتحاد و تەرەقی بە هاوکاریی کوردە سادەکان، ڕاپەڕینی ئەرمەنیان دامرکاندەوە، دوای ئەوەیش بۆ دەرکردنی یۆنانییەکان لە تورکیا هێزی کوردیان بەکارهێنا، سوپای تورکیا بە ئاگر و ئاسن و کۆکوژیی وەڵامی سەرەتاییترین مافی کوردی دایەوە و دەستیان بە سیاسەتی تواندنەوەی گەلی کورد کرد و کۆمەڵکوژیی دەرسیمیان ئەنجامدا١١. دەستەواژەی (تورکی شاخ)یان بۆ گەلی کورد بەکارهێنا. ڕێگەیان لە گەلی کورد گرت بە زمانی دایک (زمانی کوردیی) بدوێت و بخوێنێت. پۆشینی جلوبەرگی کوردییان قەدەغەکرد. دەستووری تورکیایان وا داڕشت کە لە تورکیادا تەنها یەک نەتەوە و یەک زمان هەیە، ئەویش نەتەوە و زمانی تورکە. لە ڕێگەی دامودەزگا دەوڵەتیی و جەماوەرییەکانەوە گەلی تورکیان وا پەروەردەکرد، کە لە تورکیا تەنها نەتەوەی تورک هەیە. هەر لایەنێک باس لە دیاردەی فرەنەتەوەیی و فرەزمانیی تورکیا بکات، بە دوژمنی تورکیا دادەنرێت.

دەوڵەتی شاهەنشاهیی ئێران لەژێر پەردەی نزیکی نەژادی نێوان کورد و فارس، ماوەیەکی زۆر سیاسەتێکی شۆڤینیی نەرمی بەڕێوەدەبرد، وەکو برای بچووک حسابی بۆ کورد دەکرد، هیچ مافێکی پێ ڕەوانەدەبینی، بەڵام ئەم سیاسەتە شۆڤینییەی فارسە سەردەستەکانی ئێران زوو ئاشکرابوو.

بەهۆی ئەوەوە کە عێراق بۆ خۆی هەتا ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانیی وڵایەتێکی دەوڵەتی عوسمانیی بوو، عەرەبیش نەتەوەیەکی ژێردەست بوو، هزر و سیاسەتی نەتەوەپەرستیی عەرەب درەنگ سەریهەڵدا، فریانەکەوت ماف و ئازادییەکانی گەلی کورد لە بنەوە زەوتبکات. لە لایەکی ترەوە لەبەرئەوەی کورد و عەرەب دوو گەلی چەوساوەی ناو عێراق بوون، پەیوەندییەکی دۆستانە لە دژی داگیرکەرانی دەوڵەتی

عوسمانیی و دواتر دەوڵەتی ئینگلیز لە نێوان کور د و عەرەبدا دروستبووبوو. لەبەرئەوە لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە و دوای دروستکردنی دەوڵەتی عێراق، کوردستانی عێراق (باشووری کوردستان) هەندێک مافی ڕۆشنبیریی و سیاسیی دەستدەکەوێت*١٢.

لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە هزری نەتەوەپەرستیی تورک و فارس و عەرەب، وەکو کەلپچە و زنجیر لە مەچەک و گەردنی کورد دەئاڵێت. دەرفەتی سەرکەوتنی تێکۆشانی گەلی کورد بۆ ئازادیی و ڕزگاریی نەتەوەیی ڕادەگرێت. کورد نەک لە دوای ڕوخانی دەوڵەتی عوسمانییەوە وەکو عەرەب و ئەرمەن و فارس و تورک دەوڵەتی نەتەوەیی پێکنەهێنا، لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە ڕووبەڕووی تواندنەوە و لەناوبردنی جەستەیی و کەلتوریی دەبێتەوە. پێش جەنگی یەکەمی جیهانیی دەوڵەتی عوسمانیی و دەوڵەتی سەفەویی، لەبەر هزری هاوئاینیی ئیسلام و پاراستنی وڵاتی مسوڵمانان، سیاسەتی لەناوبردنی جەستەیی و کەلتوریی گەلی کوردیان جێبەجێنەدەکرد. کوردیان دەپارست، تەنها مافی نەتەوەییان بە گەلی کورد ڕەوا نەدەبینی، کە دەوڵەتە نەتەوەییەکان دروستبوون، سیاسەتی دەوڵەتی عوسمانیی و دەوڵەتی سەفەویی بەرانبەر بە کورد کۆتاییهات. تواندنەوە و قڕکردنی بە کۆمەڵی کورد و بنبڕکردنی کەلتوری کورد دەستپێکرد.

## ٦- ئیسلامگەرایی و کوردایەتیی:

ستراتیژی بزاڤی ڕزگارییخوازی گەلی کورد لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانیی لەگەڵ ستراتیژ و بەرژەوەندیی وڵاتانی ئینگلیز و فەرەنسا نەدەگونجا. کوردەکان لە دوای ڕوخانی دەوڵەتی عوسمانیی و شپرزەبوونی دەوڵەتی ئێران، بە شێوەیەکی شپرزەتر و دواکەتووتر لە عەرەبەکان دەستیان بە خەباتی نەتەوەیی کرد. بە ئایدۆلۆژیای ئیسلامیی و بە ڕێکخستنی خێڵەکیی داوای مافی کوردیان دەکرد.

شۆڕشی شێخ مەحمود لە باشووری کوردستان ئەگەرچی لە شێوەدا نەتەوەیی بوو، داوای دەوڵەتی کوردیی دەکرد، بەڵام بەهۆی ئەوەوە کە بە ئایدۆلۆژیای ئیسلامیی سیاسەتیدەکرد، پەیوەندیی لەگەڵ تورکەکان بەردەوامبوو، بۆیە پشتگیریی ئینگلیزی بەدەستنەهێنا*١٣.

لەبەر دەمارگیریی ئاینیی، سمکۆی شکاک دژی مافی ئەرمەن و مەسیحییەکانی ڕۆژهەلاتی کوردستان وەستایەوە و مار شەمعون و هاوڕێکانی کۆمەڵکوژکرد. ئەو کۆمەڵکوژییە دڵی ئەوروپای کریستیانی داخورپاند*١٤. ئەم سیاسەتەی شێخ و سمکۆ ئەوروپییەکانی لە دروستبوونی سەلاحەدینێکی تر وریاکردەوە.

بەشدارییکردنی کوردەکانی باکوور لە کۆمەڵکوژیی گەلی ئەرمەندا، دواتر بەشدارییکردنی کورد لە شەڕی ڕزگاریی تورکیادا دژی یۆنانییەکان، نیشانەی ئەوەیە کە گەلی کورد لە باکووری کوردستانیش پەیوەندییە ئاینییەکانی لە سەرووی پەیوەندییە نەتەوەییەکانی خۆیەوە داناوە.

شۆڕشەکانی شێخ مەحمود لە باشووری کوردستان، سمکۆی شکاک لە ڕۆژهەلات، شیخ سەعیدی پیران لە باکوور، نمونەی ئەو جۆرە سەرهەڵدانانەی گەلی کوردن کە بە ئایدۆلۆژیای ئاینیی و بە ڕێکخستنی خێڵەکیی و دەرەبەگایەتییەوە، تێکۆشانی ڕزگاریی نەتەوەییان بەڕێوەدەبرد. بەرژەوەندیی ئاینی ئیسلامیان لە پێش بەرژەوەندیی نەتەوەیی کوردەوە دادەنا. بەرانبەر بە کەمیینە ئاینییەکانی ناوچەکە دەرماگیر و نادیموکرات بوون. ئەو سیاسەتە وایکرد ئەوروپییەکان پشتگیریی شۆڕشەکانی گەلی کورد نەکەن و دژیان بوەستنەوە. ئەوەیش بە یەکێک لە هۆکارەکانی شکستی شۆڕشەکانی گەلی کورد دەژمێردرێت.

### ٧- لە سێبەری سیستەمی دوو_جەمسەرییدا

لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە دیاردەی دوو_جەمسەریی جیهان هاتەئاراوە. یەکێتیی سۆڤیەت ڕابەرایەتیی کۆمەڵگەی سۆسیالیستیی دەکرد. ئەمریکا ڕابەرایەتیی کۆمەڵگەی سەرمایەداریی دەکرد. هەریەکەیان پێشڕەویی نیوەی جیهانیان دەکرد. هەریەکەیشیان خاوەنی زۆرترین و پێشکەوتووترین تەکنۆلۆجیا و چەکی کلاسیکیی و چەکی ئەتۆمیی بوون. ئەم دوو جەمسەرە بەو بڕوایە گەیشتن کە بە دروستبوونی شەڕ هەردوولا لەناودەچن، لەبەرئەوە بەردەوام خۆیان لە شەڕی گشتیی و جیهانیی دەپاراست، بەلام لە ململانێ و خۆپڕچەکردندا نەدەوەستان و هەوڵیاندەدا دۆست و پشتیوان بۆ خۆیان بەدەستبهێنن.

بەهۆی سیاسەتی ئەڵمانیای هیتلەرییەوە جەنگی دووەمی جیهانیی دروستبوو. لە جەنگی دووەمی جیهانییدا گۆڕانکارییەکی ئەوتۆ بەسەر نەخشەی سیاسیی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا نەهات. وڵاتی ئێران لە لایەن روسیا و ئینگلیزەوە بۆ ماوەیەکی کەم داگیرکرا. لە ساڵانی کۆتایی شەڕدا کۆماری کوردستان لە مەهاباد لەدایکبوو، بەڵام بەهۆی ئەوەوە کە ئەو کۆمارە لە ئەنجامی ناهاوسەنگیی هاوکێشە نێودەوڵەتییەکانەوە دروستبوو، هەر کە هاوکێشەکان گەڕانەوە شوێنی خۆیان، یەکێتیی سۆڤیەت پشتگیریی خۆی بۆ کۆمار ڕاگرت، لە ماوەیەکی کەمدا ڕژێمی شاهنشایی ئێران کۆماری کوردستانی ڕوخاند و سزای مەرگی بەسەر قازی موحەممەدی پێشەوای کۆمار و ژمارەیەک لە هاوڕێکانیدا سەپاند و کۆماری مەهاباد کۆتاییهات.

لە دوای کۆتاییهاتنی جەنگی دووەمی جیهانیی هێندەی تر دیاردەی دوو_جەمسەریی جیهان گرنگیی پەیداکرد. لە شوێنی چەمکی شەڕی کلاسیک، شەڕی سارد هاتەئاراوە. لەژێر سایەی ئەو دوو_جەمسەریی و شەڕە ساردەدا، هیچ گۆڕانکارییەکی جیۆپۆلۆتیکیی گرنگ لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دروستنەبوو هەتا گەلی کورد سودی لێوەربگرێت. زلهێزەکانی جیهان بۆ ئەوەی هاوسەنگیی سیاسەتی نێونەتەوەیی خۆیان بپارێزن، بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدا بوون لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دۆست بۆ خۆیان پەیدابکەن. هیچ مەرجێکیان بۆ ئەو دۆستایەتییە دانەنابوو. عێراق و ئێران و تورکیا و سوریا، سیاسەتی ناوخۆییان بەرانبەر بە کێشەی کورد چۆن بوو بێت؟ بۆ زلهێزەکان (ئەمریکا و سۆڤیەت) گرنگ نەدەبوو، گرنگ ئەوە بوو لە ململانێی نێونەتەوەییدا لایەنگریی یەکێک لەو هێزانە بکەن.

لە لایەکی ترەوە زلهێزەکان و هاوپەیمانەکانیان هێندە سەریان بە کێشە ناوەندییەکانی خۆیانەوە قاڵبوو، کاتی ئەوەیان نەبوو بیر لە کێشە پەراوێزکراوەکان بکەنەوە و خۆیانی پێوە سەرقاڵبکەن. ئەم دیاردەیەیش بە زیانی گەلی کورد تەواوبوو. لەبەرئەوە ئەو دەوڵەتانەی لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە دامەزران و مافی کوردیان فەرامۆشکرد. هەوڵی لەناوبردنی کەلتوریی و جەستەیی کوردیان دەدا. لەژێر سێبەری دونیای دوو_جەمسەریی و شەڕی سارددا، لەسەر ئەو سیاسەتەی بەرانبەر بە کورد پەیڕەویاندەکرد، هیچ هێزێکی نێونەتەوەیی سەرزەنشتی نەدەکردن. هیچ هێزێکی نێونەتەوەیی لای لە کێشەی کورد نەدەکردەوە. هەوڵنەدرا سنوور بۆ سیاسەتە شۆڤێنییەکانی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان دابنێن. تەنها هەڵوێستیکی

باش بۆ دۆزی کورد لەو سەردەمەدا هەڵوێستی کۆماری مەنغۆلیای سەر بە جەمسەری یەکێتیی سۆڤیەت بوو، کە لە ساڵی ١٩٦٣دا پێشنیازی بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان کرد بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد پرۆژەیەک ئامادەبکات، بەڵام لەژێر گوشاری وڵاتانی تردا دوای ١٨ ڕۆژ پێشنیازەکەی کشاندەوە.

## ٨- کوردایەتیی و کۆمۆنیزم:

لە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩١٧، یەکێتیی سۆڤیەت لە شوێنی ڕوسیای قەیسەریی دامەزرا. یەکێتیی سۆڤیەت لە هاوپەیمانیی شەڕی یەکەمی جیهانیی دەرچوو. بەرنامەی وڵاتانی ئەوروپای لەسەر دواڕۆژی دەوڵەتی عوسمانیی و وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئاشکراکرد. دژی ئەو بەرنامەیەی بەریتانیا و فەرەنسا و دۆستەکانیان وەستایەوە.

کە یەکێتیی سۆڤیەت لە شوێنی ئیمپراتۆریەتی ڕوسیای قەیسەریی دامەزرا، گۆڕانکارییەکی ئایدۆلۆژیی و سیاسیی لە جیهاندا دروستبوو. مارکسیزم-لینینزم وەکو ئایدۆلۆژیای ڕزگاریی چینی کریکار و نەتەوە ژێردەستەکان برەوی پەیداکرد و بە سەرتاپای جیهاندا بڵاوبووەوە. لە وڵاتانی جیهاندا چەندیین حیزبی سیاسیی، کرێکاریی، کۆمۆنیستیی، مارکسیی دامەزران و دەستیان بە خەباتی چینایەتیی کرد.

ئەو وڵاتانەی کوردستانیان بەسەردا دابەشکرا، حیزبی کۆمۆنیستیی و کرێکارییان تێدا دامەزرا. ئەگەرچی وەکو بیروباوەڕ مارکسیزم-لینینزم لەگەڵ مافی چارەنوسی گەلاندا بوو، دژی چەوسانەوەی نەتەوەیی بوو، بەڵام ئەم چەمکە مارکسییە لەژێر کاریگەریی و گرنگیی چەمکی یەکێتیی کرێکارانی جیهان و بەرژەوەندیی دەوڵەتی سۆڤیەتدا، هێندە خۆی نەدەگرت، نەدەبووە پێوەری مارکسییبوون. بەهۆی گرێدراویی حیزبە کۆمۆنیستەکانی ئەو وڵاتانەوە بە یەکێتیی سۆڤیەتەوە، بەهۆی ململانێی نێوان سۆڤیەت و ئەمریکاوە، حیزبە کۆمۆنیستەکانی وڵاتانی داگیرکەری کوردستان، بەرژەوەندیی سۆڤیەتیان لە بەرژەوەندیی گەلە ژێردەستەکانی وڵاتانی خۆیان پێ گرنگتربوو. ئەگەر دەسەڵاتی داگیرکەرێکی کوردستان، دژی سیاسەتی ئەمریکا هەڵوێستی پیشانبدایە، ئەم هەڵوێستە دبووە پێوەری پێشکەوتنخوازیی. لە سێبەری ئەو هەڵوێستە، یان لە سێبەری هاوپەیمانیی لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەتدا، ئەگەر گەورەترین

تاوانی بەرانبەر بە گەلی کورد بکردایە، لە لایەن ئەو حیزبە کۆمەنیستانەوە دەبەخشرا و ڕەخنەیشی لێنەدەگیرا.

بەم شێوەیە یەکێتیی ڕیزەکانی کرێکاران و بەرژەوەندیی یەکێتیی سۆڤیەت پێوەرێکی گەورەتر و گرنگتری حیزبە مارکسیی و لینینییەکانی وڵاتانی داگیرکەری کوردستان بوو. ئەو کەسانەی کە بە ڕەچەڵەک کورد بوون و لە حیزبە شیوعییەکانی تورکیا و عێراق و ئێران و سوریا تێدەکۆشان، بۆ ئەوەی بە مارکسیی بناسرێن و تاوانی کۆنەپەرست و پیاوی ئیستعماریان نەخەنەپاڵ، هێندە سەری خۆیان بە کێشەی نەتەوەیی گەلی کوردەوە سەرقاڵنەدەکرد. بەم شێوەیە دەبینین ئەو تاکانەی کۆمەڵگەی کوردستان کە مەیلی سیاسەت و تێکۆشانی دیموکراتیی و وڵاتپارێزییان هەبووە و تەڤلی ڕێکخستنی حیزبە شیوعییەکان دەبوون، لە ڕێگەی چەمکە کۆسمۆپۆلۆتیکەکانی مارکسیزمەوە، ئاستەنگییان بۆ خەباتی نەتەوەیی کورد دروستدەکرد.

پێشخستنی یەکێتیی چینی کرێکار و بەرژەوەندیی یەکێتیی سۆڤیەت، لە لایەن نەتەوەپەرستەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیشەوە کە دزەیان بۆ ناو حیزبە شیوعییەکان دەکرد، بە باشیی بۆ دژایەتییکردنی ماف و ئازادییەکانی گەلی کورد سودی لێوەردەگیرا. بەم شێوەیە دەبینین چەمکی مافی چارەنوسی گەلانی مارکسیزم-لینینیزم نەک هەر لە لایەن کوردەوە سودی لێوەرنەگیرا، بەڵکو بە زیانیش بۆی دەگەڕایەوە و بوو بە هۆکارێک بۆ ئەوەی کێشەی کورد لە شوێنی خۆی بوەستێت، هەنگاو بەرەو چارەسەری نەنێت.

بەڵام دەبێت هەندێک لایەنە باشەکانی حیزبە مارکسیی و شیوعییەکانی وڵاتانی داگیرکەری کوردستان لەبیرنەکەین، کە وەکو چۆن ئاینی ئیسلام لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانییدا ڕێگەی نەدەدا گەلی کورد بێتە خاوەنی ماف و دەسکەوتی نەتەوەیی سەربەخۆ (دەوڵەتی نەتەوەیی)، ڕێگەیشی نەدەدا گەلی کورد جینۆسایدبکرێت. حیزبە شیوعییەکانی دوای جەنگی یەکەمی جیهانیی لەگەڵ سەربەخۆیی کوردستان و دەوڵەتی نەتەوەیی کوردا نەبوون، بەڵام لەگەڵ جینۆساید و لەناوبردنی جەستەیی و کەلتوریی گەلی کوردیشدا نەبوون.

له لایەکی ترەوە ئەگەرچی کورد نەیتوانی لە ڕێگەی فکری سیاسیی مارکسیزم-لینینزمەوە کێشەکانی چارەسەربکات، بەڵام لە ڕێگەی ئاشنابوونیەوە بە تیوری مارکسیزم-لینینیزم، توانی لە ڕووی سیاسییەوە بیرکردنەوەی خۆی فراوانبکات و بۆ تێکۆشانی دیموکراتیی سودی لێوەربگرێت.

## ٩- کورد و هزری خێڵەکیی عەرەب:

لە سەردەمی عەباسییەکانەوە عێراق بۆ ماوەی ٥٠٠ پێنجسەد ساڵ ناوەندی دەسەڵاتداریی و حوکمڕانیی جیهان بوو. مەغۆل و تەتارەکان دەوڵەتی عەباسییان ڕوخاند. ئەو شارستانیەتەی کە دەوڵەتە ئیسلامییەکان لە ماوەی نزیکەی ٧٠٠ حەوتسەد ساڵدا بەدەستیانهێنا، تەیموری لەنگ و هۆلاکۆ لە ماوەی چەند ساڵێکدا هەموویان لەناوبرد. ئەم ڕوداوانە وایانکرد کە جیهانی عەرەبیی و بە تایبەتیی عێراق، لە تارکییدا بژی. لە ڕووی ئابوریی و کۆمەڵایەتیی و شارستانییەوە پێشنەکەوێت.

لە سەرەتای سەدەی شازدەهەمەوە عوسمانییەکان بە ناوی ئوممەی ئیسلامەوە دەوڵەتی عوسمانییان دامەزراند. عێراق یەکێک لە ویلایەتەکانی ئەو دەوڵەتە بوو. بە درێژایی چەندیین سەدە دەوڵەتی عوسمانیی بە شێوەیەک هەڵسوکەوتی لەگەڵ عێراقدا دەکرد، کە ئەو وڵاتە نەبێت لە سەردەمی نیۆلۆتیک و سۆمەر و بابل و ئاشور و عەباسییەکاندا لە ئاواکردن (دروستکردن)ی شارستانیەتی مرۆڤایەتییدا ڕۆڵێکی بنەڕەتیی هەبووە. دەوڵەتی عوسمانیی وا لەگەڵ عێراق و ویلایەتەکانی تردا دەجولایەوە، کە لە دواکەوتووترین باری ئابوریی و کۆمەڵایەتیی و سیاسییدا بژین، دەرفەتیان نەبێت پێشبکەون. دەوڵەتی عوسمانیی بە ڕواڵەت دەوڵەتێکی ئیسلامیی بوو، بەڵام لە ڕاستییدا دەوڵەتێکی قەومگەرا بوو، بەرژەوەندیی تورکی دەپاراست. لە دەوڵەتی عوسمانییدا تورک دەسەڵاتداری یەکەم بوو، هەموو سوڵتان و والییەکانی دەوڵەتی عوسمانیی دەبوو تورک بوونایە، بەردەوام هەوڵی پێشخستنی بەشە تورکەکەی دەوڵەتی عوسمانیی دەدا، ویلایەتەکانی تری فەرامۆشدەکرد. تەنها شتێک کە ئوستانە لە ویلایەتە غەیرە تورکەکانی دەخواست، باج و سەربازی شەڕ بوو. ئیتر هیچ بەرنامەیەکی پێشکەوتنی ئابوریی و کۆمەڵایەتیی و فەرهەنگیی بۆ ئەو ویلایەتانە دانەنابوو. لەبەرئەوە هەموو ویلایەتەکان لە چاو تورکیادا، لە هەموو ڕوویەکەوە دواکەوتووتر بوون، عێراق یەک لە ویلایەتە هەرە دواکەوتووەکانی دەوڵەتی عوسمانیی بوو.

باشووری کوردستان کە پێشتریش بە شێکی ویلایەتی عێراق بوو، دوای جەنگی یەکەمی جیهانیی لە سنووری دەسەڵاتی دەوڵەتی عێراقدا مایەوە، لەبەرئەوە هێندەی تر لە باری سیاسیی و کۆمەڵایەتیی و ئابوریی و فەرهەنگییەوە لە ناو لیتەی پاشکەوتندا داچەقی. کۆمەڵگەی عێراقیی و وڵاتەکانی تری کەنداوی عەرەب، لە بارێکی قووڵی سەردەمی خێڵایەتییدا دەژیان.

ئەگەر کەسێک شارەزایی لە مێژووی عەرەب هەبێت بە ئاسانیی ئەوەی بۆ دەردەکەوێت، کە لە سەردەمی سەرهەڵدانی ئاینی ئیسلامەوە لە کۆمەڵگەی خێڵەکیی عەرەبدا هەتا دوارۆژەکانی دەوڵەتی عوسمانیی، ململانێ و ناکۆکیی لە نێوان ئیسلام و ئەو کۆمەڵگە خێڵەکییەدا هەر هەبووە، سەردارەکانی ئیسلام زۆریان هەوڵدا باری کۆمەڵایەتیی عەرەب لە قۆناغی خێڵایەتییەوە بۆ قۆناغێکی پێشکەوتووتر بگۆڕن، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون.

دوای ڕوخانی دەوڵەتی عەباسیی هێندەی تر دەرفەت بۆ گەڕانەوەی دیاردەی خێڵایەتیی لە ناو عەرەبدا ڕەخسا، لە ناو عەرەبەکانی سعودیە و عێراقدا ئەم دیاردەیە زۆر بە زەقیی دەبینرا. بەم شێوەیە دەتوانین بڵێین کە باشووری کوردستان لکێنرا بە دەوڵەتێکەوە کە کەلتوری خێڵەکیی بە سەریدا زاڵبوو، بەڵام باشووری کوردستانیش لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە هێندە لە بەشە عەرەبییەکەی عێراق پێشکەوتوو نەبوو. لە لایەکەوە کۆمەڵگەی باشووری کوردستانیش یەک لەو بەشانەی وڵاتی میزۆپۆتامیا بووە، کە بە قووڵیی لە قۆناغی خێڵایەتیی ژیاوە، هەر بە هەمان شێوەی عەرەب کوردیش لە لایەن عوسمانییەکانەوە پشتگوێخرابوو، پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیی بە خۆیەوە نەدیبوو. هەندێک لە سەرکردە و پادشا ڕیفۆرمخوازەکانی دەوڵەتی عوسمانیی وەکو مەدحەد پاشای والیی بەغدا هەوڵیدا لە پێکهاتەی خێڵەکیی عێراقدا گۆڕانکارییبکات. بەهۆی ئەو شکستەوە بەسەر ڕیفۆرخوزاەکاندا هات، نەیتوانی ئەو بەرنامەیە جێبەجێبکات. ئەو شتە کەمەیش کە مەدحەت پاشا هەوڵی بۆ دا، پاش داگیرکردنی عێراق لە لایەن ئینگلیز و دەسەڵاتی پادشایی عێراقەوە هەڵوەشێنرایەوە*١٥.

لەبەرئەوە دەتوانین بڵێین پاش جەنگی یەکەمی جیهانیی هەرچەندە گەلی کورد لە ڕووی سیاسییەوە هیچ مافێکی بەدەستنەهێنا، گەلی باشووری کوردستان زیاد لە هەموو پارچەکانی تری کوردستان کەوتەوە ناو هزری کۆمەڵگەی خێڵەکیی، بەم

شێوەیە هەردوو پێکهاتە هەرە خێڵەکییەکەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لە چوارچێوەی دەوڵەتی عێراقدا یەکیانگرت. نمونەیەکی زۆر ناتەندروستی دەوڵەتی فرەنەتەوەییان لە جیهانی نوێدا پێشکەشکرد. گەورەترین پوازی دووبەرەکییان لە ناو قەدی داری یەکێتیی نەتەوەیی گەلی عەرەب و یەکێتیی نەتەوەیی گەلی کورددا دانا. نمونەیەکی کەلتوریی کۆمەڵایەتیی خێڵەکیی و شەڕنگێزییان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا پێشکەش بە جیهان کرد. لە پارچەکانی تری کوردستان بە تایبەتیی باکوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان، گەلی کورد لەگەڵ دوو پێکهاتەی پێشکەوتووتر ژیانی دەکرد، کە تورک و فارس بوون، ئەم دوو پێکهاتەیە سەدان ساڵ بوو بە بەردەوامیی لەگەڵ ڕۆشنبیریی دەوڵەت و یاسا و سیاسەتدا دەژیان، کاریگەرییان لەسەر کوردەکانی ئەو پارچانە دەکرد.

## ١٠- ناکۆکیی شێوە و ناوەڕۆک:

دوای ڕوخانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی، دەوڵەتی ئینگلیز و فەرەنسا ئیمپراتۆریەتی عوسمانییان بەسەر خۆیاندا دابەشکرد. هەموو نەتەوە ژێردەستەکانی ئەو ئیمپراتۆریەتە داوای مافی خۆیانیان کرد. گەلی ئەرمەن کە لە لایەن تورکە فاشییەکانەوە لە جەنگی یەکەمی جیهانییدا کۆمەڵکوژکرا، دەوڵەتی نەتەوەیی بۆ دروستکرا. گەلی عەرەب لە لایەن ئینگلیز و فەرەنساوە نیمچە پشتگیرییەک دەکرا، لەبەر فراوانیی ڕووبەری نیشتیمانی عەرەب و زۆریی ژمارەی دانیشتوانی و پیرۆزیی ئاینی ئیسلام، چەند دەوڵەتێکی بۆ دروستکرا. گەلی کورد یەک لەو گەلانە بوو لە دوای ڕوخانی دەوڵەتی عوسمانیی داوای ماف و ئازادیيە نەتەوەییەکانی خۆی کرد. هەڵوەشانەوەی دەوڵەتی عوسمانیی، ڕاگەیاندنەکەی سەرۆکی ئەمریکا (ولسۆن) بۆ مافی چارەنوسی گەلان، چەند بەندێکی پەیمانی سیڤەر (٦٢، ٦٣، ٦٤) کە باس لە مافی گەلی کورد دەکات. خاڵی باشبوون بۆ ئەوەی گەلی کورد بە مافە نەتەوەییەکانی بگات، بەڵام لەبەرئەوەی لەو کاتانەدا، سەرکردایەتیی شۆڕشەکان و جوڵانەوە سیاسییەکانی کورد لە ئاستی ئەو ئامانجەدا نەبوون، لە ڕووی ئایدۆلۆژیی و کەلتوریی و کۆمەڵایەتیی و هەست و هۆشیاریی نەتەوەییەوە پێنەگەیشتبوون، لەبەرئەوەی بەرژەوەندیی خێڵ لە پێش بەرژەوەندیی نەتەوەوە سەیردەکرا. لەبەرئەوەی ئاینی ئیسلام و پاراستنی ئەو ئاینە بە لای سەرکردەکانی کوردەوە و لە ختابی نەتەوەیی

و بەرژەوەندیی گەلی کورد هەورازتر دەبینرا، لە سەروبەندی جەنگی یەکەمی جیهانیدا کورد نەیتوانی سود لەو قەیرانە سیاسییە وەربگرێت، کە لە نێوان هێزە نێودەوڵەتیی و ناوچەییەکاندا دروستبووبوو.

کۆمەڵگەی خێڵ کۆمەڵگەیەکی داخراوە، بنەما و کەلتوری تایبەتی خۆی هەیە. بیرمەندی گەورەی نەمساویی کارڵ پۆپەر لە کتێبی کۆمەڵگەی کراوە و دوژمنەکانیدا، لە لاپەرە ٤٠٠دا بەم شێوەیە پێناسەی کۆمەڵگەی خێڵ دەکات*١٦:

١- مەرجی یەکەمی کۆمەڵگەی خێڵەکیی پاراستن و پاسەوانییکردنی خێڵە، کە دەبێت دەرگا بە ڕووی هەموو جۆرە کاریگەرییەکی دەرەکییدا دابخەیت، کە ئەگەری ئەوەی هەبێت وشکیی تابۆ خێڵەکییەکان بخاتە مەترسییەوە.

٢- دژایەتییکردنی مرۆڤدۆستیی، بۆ ئەنجامدانی ئەم ئەرکە دەبێت دەرگا بە ڕووی هەموو ئایدۆلۆژیایەکی یەکسانییخواز و دیموکراتیک و تاکگەراییدا دابخەیت.

٣- دەبێت بەردەوام دژایەتیی گشتڕوانی بکەیت و تایبەتڕوانی بە بنەما بگریت، جیاوازیی لە نێوان خێڵی خۆتان و خێڵەکانی تردا دابنێن. لەگەڵ ئەوانەدا تێکەڵ مەبن، کە لە ئێوە نزمترن.

٤- بەسەر دراوسێکاندا زاڵبن و بیانکەن بە کۆیلەی خۆتان.

٥- لە ڕادەبەدەر وڵات فراوان مەکەن.

ئەم پێناس و بنەما خێڵەکیانە ڕێگەی هزر و کەلتوریی و نەتەوەیی دەگرن، لەبەرئەوەی کۆمەڵگەی نەتەوەیی لە چاو کۆمەڵگەی خێڵەکییدا کۆمەڵگەیەکی کراوەترە، بەم شێوەیە کەسانێک بە ناسنامە سەر بە کۆمەڵگەیەکی داخراوبن، هیچ گۆڕانکارییەک لە خۆیاندا پێکنەهێنن، ناتوانن بۆ کۆمەڵگەیەکی فراوانی نەتەوەیی کراوە بن و پێشەنگایەتییبکەن. لەبەرئەوە لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانیی یەک لە کێشەکانی بزاڤی ڕزگارییخوازی گەلی کورد ئەو ناکۆکییە بووە کە لە نێوان پێکهاتەی خێڵەکیی سەرکردەکان و دروشمی سەربەخۆیی شۆڕشەکاندا دروستبووە، ئاستەنگیی بۆ پێشکەوتنی هزری نەتەوەیی و دیموکراتیی بوونی دەسەڵات و شۆڕش و کۆمەڵگە دروستکردووە، خێڵەکییەکان بە قسە کار بۆ نەتەوە دەکەن، بەڵام بە کردەوە دژی نەتەوەبوون و ڕزگاریی نەتەوەیی کورد دەوەستانەوە.

لایەنێکی تری خراپی سەرکردەکانی بزاڤی ڕزگارییخوازی کورد لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانیی کە لەگەڵ هزر و بەرژەوەندیی نەتەوەیی گەلی کورددا ناکۆک بوو. پابەندبوونی سەرکردە کوردەکان بوو بە ئاینی ئیسلامەوە، هزری ئۆممەتی ئیسلام کاریگەریی جدیی لە سەریان هەبوو، ڕێگەی نەدەدا هزرێکی نەتەوەیی بە باشیی لە ناو ئاوەزیاندا ئاوابیێت، ئەمەیش وایکرد تاک و پێکهاتەکانی کۆمەڵگەی کوردیی و سەرکردەکانی بزاڤەکە، لە بارێکی ئایدۆلۆژیی دوولایەنە و ناکۆکدا بژین. نەیاندەزانی کار بۆ دین بکەن، یان کار بۆ نەتەوە بکەن. ئەم ڕاستییە لە لایەن دەسەڵاتدارانی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستانەوە بە باشیی بینرا. بۆ مەبەستی خۆیان کاریپێکرا. بۆ لەڕێلادانی سەرکردایەتیی بزاڤەکە لە ڕێرەوی نەتەوەیی خۆی و بردنی بەو ئاقارەدا کە لە بەرژەوەندیی داگیرکەراندا بێت سودی لێوەردەگیرا.

کەلتوری خێڵایەتیی کورد و ئایدۆلژیای ئیسلامگەرایی سەرکردەکانی کورد، کۆمەڵە چەمکێک بوون کە ئەوروپییەکان هەم پێی دڵخۆشنەبوون هەم لە ئایندەی ئیسلامگەرایی بزاڤەکە مەترسییان هەبوو، بە گومانەوە لێی نیزکدەبوونەوە.

ئەم کەموکووڕیی و ناکۆکییانەی ناو بزاڤی ڕزگارییخوازی گەلی کورد وایکرد کە کورد نەتوانێت سود لە زەمیینە لەبارە نێونەتەوەییەکە وەربگرێت و چارەسەری کێشەکەی خۆی بکات. بە پێچەوانەوە تورکەکان بە ڕێبەرایەتیی کەمال ئەتاتورک بزاڤێکی نەتەوەیی تورکیان دەستپێکرد، لە ڕووی کۆمەڵایەتیی و لە ڕووی ئایدۆلۆژییشەوە لە تێگەیشتنی ئەوروپییەکانەوە نزیککەوتنەوە، شێوە و ناوەڕۆکی بزاڤەکەیشیان لەگەڵ یەکتر گونجاند. ختابی سیاسیی تورکەکان بە ئایدۆلۆژیای نەتەوەیی دارێژرابوو، لە ڕووی کۆمەڵایەتییشەوە کۆمەڵگەی تورکی دەمێک بوو قۆناغی خێڵایەتیی تێپەڕکردبوو. ئەمانە بوون بە هۆکار بۆ ئەوەی ئەتاتورک بتوانێت زەمیینە ناوخۆییە لەبارەکەی بزاڤی تورکایەتیی لە دژی زەمیینە نالەبارە نێونەتەوەییەکەی دژی دەوڵەتی عوسمانیی، بە قازانجی گەلی تورک وەرگێڕێتەوە، کۆماری تورکیا لە شوێنی ئیمپراتوریەتی عوسمانی ئاوابکات (دروستبکات).

بەم شێوەیە دەبینین کە وا گەلی کورد وەکو پێکهاتەیەکی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە، کاتێک سیستەمی سەرمایەداریی

خەریکی جێگیرکردنی خۆی بوو لە ناوچەکەدا، کاتێک هزری نەتەوەیی لە ناو نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا گەشەیدەکرد و زۆربەیان دەوڵەتی نەتەوەییان دروستکرد. کورد وەکو پێکهاتەیەکی سست خۆی نواند. بۆ یەکەم جار بە شێوەیەکی تەواو ڕۆڵی پێکهاتەی چالاکی لەکیسدا. نەک هەر دەوڵەتی نەتەوەیی دروستنەکرد، خاک و گەلەکەی لە نێوان چوار دەوڵەتدا دابەشکرا. پاشکەوتووترین باری ئابووری و کۆمەڵایەتیی و کەلتوریی بەسەریدا سەپێنرا. بۆ ئەنجامدانی پاکتاوکردنی ڕەگەزیی دژی کورد، چەندیین بەرنامە دانران و هەندێکیان جێبەجێکران.

## کورد لە جەنگی دووەمی جیهانییەوە

مێژوو سەلماندوویەتی لە دوای دروستبوونی جەنگەکانەوە، گۆڕانکاریی سیاسیی لە ناوچەی جەنگەکەدا و ناوچەکانی تردا دروستدەبێت. لە جەنگی دووەمی جیهانییدا، دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان (تورکیا و عێراق و سوریا) بەشداریی جەنگیان نەکرد. گۆڕانکاریی سیاسیی لەو سێ وڵاتەدا دروستنەبوو هەتا گەلی کورد سودی لێوەربگرێت، ئەو سێ دەوڵەتە داگیرکەرەی کوردستان وەکو سەردەمی پێش جەنگی دووەمی جیهانیی مانەوە، هیچ لایەنێکی نێودەوڵەتیی دەستی لە کاروباری ناوخۆیی ئەم دەوڵەتانە وەرنـەدا. گەلی کوردیش لەم پارچانەی کوردستان لە بارودۆخێکی بێئۆمێدیی و سستییەکی کەموێنەدا ژیانی سیاسیی بەسەردەبرد. لەبەرئەوە لە سەردەمی ڕوداوەکانی جەنگی دووەمی جیهانییدا لە باکوور و باشوور و ڕۆژئاوای کوردستان، بزاوێکی سیاسیی و سەربازیی کاریگەر تایبەت بۆ ماف و ئازادییەکانی کورد بەدیناکرێت*١٧ ئەمەیش ئەوە دەگەیەنێت کە گەلی کورد لەو سەردەمەدا بڕوای بە هێز و توانای ناوخۆیی خۆی لاوازە بووە بۆ ڕزگاریی کوردستان چاوەڕوانی زەمینەی دەرەکی کردووە. ئەم زهنیەتە هەتا ئەمڕۆیش لە تێڕوانین و هەڵوێستی سیاسەتمەدارانی باشووری کوردستان و حیزبە سیساسییەکانی باشووری کوردستان ماوەتەوە، سیاسەت و حیزبایەتیی پێدەکرێت.

## کاریگەریی کۆماری کوردستان:

لە سەردەمی جەنگی دووەمی جیهانییدا، دەوڵەتی ئێران بۆ ماوەیەک هاوپەیمانی لەگەڵ وڵاتانی ناوەند (ئەڵمانیای نازیی، ئیتالیای فاشیی، یابان) دروستکرد، دژی هاوپەیمانان (یەکێتیی سۆڤیەت و بەریتانیا و فەرەنسا و ئەمریکا) جەنگی ڕاگەیاند. لە ئەنجامی شکستی ئەڵمانیا و یابان و ئیتالیا، هاوپەیمانان لە جەنگی دووەمی جیهانییدا، وڵاتی ئێرانیان داگیرکرد. بۆ ماوەیەک ئێران لە ژێردەستی یەکێتیی سۆڤیەتدا مایەوە، بەهۆی هاوکاری سیاسیی و ئایدۆلۆژیی و سەربازیی سۆڤیەتەوە، کۆماری ئازربایینجان لە تەبرێز و ناوچە ئازەرییەکانی ئێراندا دامەزرا. کۆماری ئازەربایینجان چەندیین گۆڕانکاریی ڕادیکاڵیی لە بواری ئابوریی و سیاسیی و کۆمەڵایەتییدا ئەنجامدا. یەک لە گۆڕانکارییە سیاسییەکانی ئەم کۆمارە جاڕدانی مافی چارەی خۆنوسینی گەلانی ئێران بوو، برایەتیی و یەکێتیی تێکۆشانی نەتەوە ژێردەستەکانی دەوڵەتی ئێران بوو. ئەم هەڵوێستە پێشکەوتووخوازەی کۆماری ئازەربایجان پێش هەموو شوێنێک کاریگەریی لەسەر کوردەکانی ڕۆژهەڵات دانا. کوردەکانی ڕۆژهەڵات کە بینییان ڕژێمی ڕەزاشا بێدەسەڵاتە و کۆماری ئازەربایجان لە تەنیشتیانەوە ڕاگەیەنراوە و یەکێتیی سۆڤیەت پشتگیرییدەکات. ئەوانیش هەوڵیاندا بۆ چارەسەرکردنی کێشە نەتەوەییەکەی خۆیان سود لەو زەمیینە لەبارە وەربگرن.

نیشتیمانپەروەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بە ڕێبەرایەتیی قازی موحەممەد خۆیان ڕێکخست و ئامادەکارییان بۆ ڕاگەیاندنی کۆماری کوردستان کرد. لە لایەکی ترەوە پێشەوا قازی و بەرپرسەکانی تری کۆمار کە بینییان یەکێتیی سۆڤیەت و کۆماری ئازەربایجان و کوردی پارچەکانی تری کوردستان پشتیوانیی لە داخوازیی و مافەکانیان دەکەن. جوڵانەوەکە ناوەڕۆکێکی پێشکەوتنخواز و نەتەوەیی وەرگرت، کاتێک کیانە سەربەخۆکەیان ڕاگەیاندا بە کۆماری کوردستان ناویانهێنا و هەموو چینوتوێژەکانی کۆمەڵگە بەشدارییان لە داموەزگاکانی کۆماردا کرد.

هەندێک گۆڕانکاریی جدیی لە شێوەی دابەشکردنی زەوی بەسەر جوتیاراندا، گرنگییدان بە ڕۆڵی ژن، خوێندن و پەروەردە بە زمانی کوردیی، دابینکردنی خزمەتگوزاریی تەندروستیی لە بەرنامەی حکومەتی کۆماری کوردستان دانرابوون. لایەنێکی تری پرشنگداری کۆماری کوردستان ئەوە بوو گەلی کورد لە پارچەکانی تری

کوردستانەوە بە تایبەتیی لە باشووری کوردستان، لە دامەزراندن و بەڕێوەبردن و پاراستنی کۆماردا بەشدارییانکرد. ڕۆشنبیران و سیاسەتمەدارنی کورد، بارزانییەکان بە ڕابەرایەتیی مەلا مستەفای بەرزانیی، ئەفسەرە کوردەکانی سوپای عێراق، پەیوەندییان بە کۆمارەوە کرد. لە هەموو ڕوویەکەوە هاوکاریی کۆماری کوردستانیان دەکرد. بەم شێوەیە دەردەکەوێت لە سەردەمی جەنگی دووەمی جیهانییدا، بەهۆی ئەوەوە کە ئێران لە جەنگی دووەمی جیهانییدا شکا، گۆڕانکارییەکی ستراتیژیی، ئایدۆلۆژیی و کۆمەلایەتیی لە ڕۆژهەلاتی کوردستان دروستدەبێت، کۆماری کوردستان ڕادەگەیەنرێت، یەکێتیی سۆڤیەت و کۆماری ئازەربایجان بە دۆستی ستراتیژیی گەلی کورد دەژمێردران. مەلا و ئاغا و ڕۆشنبیر و جوتیار و ژن، پێکەوە خەباتی نەتەوەیی و دیموکراتییان بەڕێوەدەبرد. ڕیفۆرمی زەوی و دابەشکردنی زەوی بەسەر جوتیاراندا دەستپێکرد. ئەمانە نیشانەی گۆڕانکاریی و چالاکبونەوەی گەلی کورد بوون، کە لە سەروبەندی جەنگی دووەمی جیهانییدا بۆ ماوەی ١١ یازدە مانگ، لە ١٢/ ١٢/ ١٩٤٥ هەتا ١٥/ ١٠/ ١٩٤٦ی خایاند.

لەبەرئەوەی ئەم گۆڕانکارییانە لە ئەنجامی پرۆسەیەکی ناوخۆیی پلە بە پلەی هەناوی کۆمەڵگەی کوردستانەوە سەریهەڵنەدابوو، لە ئەنجامی دیموکراتبوونی دەوڵەتی ئێرانەوە دروستنەبووبوو، ئەم گۆڕانکارییە لە ئەنجامی لاوازیی ڕژێمی ناوەندیی ئێران و کاریگەریی یەکێتیی سۆڤیەت و بەریتانیا لەسەر خەڵکی ڕۆژهەلاتی کوردستان دروستبوو، ئەو گۆڕانکارییانە بە بڕیاری هێزێکی دەرەکیی لە سەرەوەی کۆمەڵگەی کوردستان و ئێرانەوە دەستپێکرد، ڕێکخستنێکی سیاسیی کوردان ئامادەکاریی بۆ شۆڕش و خەباتی ڕزگاریی نیشتیمانیی و ئازادیی نەتەوەیی نەکردبوو. گەلی کورد خاوەن ئیرادەیەکی سەربەخۆ نەبوو، گۆڕانکارییەکان درێژخایەن نەبوون، لەبەرئەوە هەر کە یەکێتیی سۆڤیەت لە ئێران پاشەکشەیکرد، ڕێککەوتنی نێوان هاوپەیمانان بە قازانجی دەوڵەتی ئێران تەواوبوو. ڕێسەکەی کورد بوەوە بە خوریی و کۆماری مەهاباد تەنها یازدە مانگ ژیا. سوپای ئێران مەهاباد و ناوچەکانی تری کوردستانی داگیرکردەوە. کورد نەیتوانی بەرگریی لە کۆمار بکات. سەرۆککۆمار و بەرپرسەکانی تری دەستگیرکرد و لەسێدارەیدان و کۆماری کوردستان کۆتاییهات*١٨.

ئەو سەردەمەی کۆمار لە مەهاباد ئاواکرا (دروستکرا)، لەژێر کاریگەریی یەکێتیی سۆڤیەت و لەژێر سێبەری ئەو ئازادییەدا کە لە کۆماری کوردستان بەدەستهات، لە

ڕووی سیاسیی و ڕێکخستن و ڕۆشنبیرییەوە پێشکەوتن دروستبوو. حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و پاش ماوەیەک پارتیی دیموکراتی کوردستانی عێراق ئاواکران (دامەزران). بنەماکانی ئاواکردنی ئەم دوو ڕێکخراوە سیاسییە لە تێکەڵکردنی ئایدۆلۆژیی سۆسیالیستیی زانستیی و ئایدۆلۆژیا و کەلتوری خێڵەکیی کوردستان پێکهاتبوو، لە تێکەڵکردنی بەرنامەی چارەسەرکردنی کێشەی کرێکاران و جوتیارانی کوردستان و کێشەی نەتەوەیی گەلی کورد پێکهاتبوو. هەر دوای ئاواکردنی ئەم دوو حیزبە، بە ماوەی جیا جیا، لە باکووری کوردستان و لە ڕۆژئاوای کوردستان بە هەمان ناو و ناوەڕۆکەوە، پارتیی دیموکراتی کوردستانی تورکیا و پارتیی دیموکراتی کوردستانی سوریا ئاواکران. لە دوای ڕوخاندنی کۆماری کوردستان کۆمەڵێک چەمکی سیاسیی لە ناو سیاسەتی گەلی کوردا جێگیربوون، کاریگەرییان لەسەر ستراتیژی سیاسیی نەتەوەیی کورد کرد، کاریگەرییان لەسەر تاک و پێکهاتەی کۆمەڵگەی کوردستان کرد، هەتا ئەمڕۆیش ئەو چەمکانە کاریگەرییان ماوە:

### ١- هاوکاریی دەرەوە:

کۆماری کوردستان بە هاوکاریی و پشتیوانیی یەکێتیی سۆڤیەت و کۆماری ئازەربایجان دامەزرا. گەلی کورد بۆی ڕونبووەوە کە هاوکاریی دەرەکیی بۆ سەرکەوتنی شۆڕش و پاراستنی مافەکانی چەند گرنگن. کاتێکیش سۆڤیەت لە ئێران پاشەکشەیکرد و پشتی لە کۆماری مەهاباد و کۆماری ئازەربایجان کرد، کۆماری کوردستان و کۆماری ئازەربایجان ڕوخان. هێندەی تر کاریگەریی هۆکاری دەرەکیی بۆ سەرکەوتنی شۆڕش، لە ناخی تاک و پێکهاتەکانی گەلی کورددا جێگیربوو.

ئەم ڕوداوە وای لە سەرتاپای چینوتوێژەکانی کۆمەڵگە و سیاسەتمەدارانی کورد کرد، کە بڕوایان بە هۆکاری ناوخۆیی و توانای گەلی خۆیان بۆ سەرخستنی سەرهەڵدان و جولانەوە سیاسییەکانیان کەمبێتەوە. هەموو توانای خۆیان بۆ دابینکردنی پشتیوانیی دەرەکیی وەگەڕبخەن، بۆ ئەوەی مافەکانی خۆیان بەدەستبهێنن.

ئەم گۆڕانکارییە خراپە لە ئەنجامی زوو_ئاوابوون و زوو_ڕوخانی کۆماری کوردستاندا هاتەئاراوە، هەتا ئەمڕۆیش بە زیندوویی لە هزری سیاسیی و لە میکانیزمی تێکۆشانی گەلی کورد و لە بەرنامە و کاری حیزبە سیاسییەکانی باشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا بە زیندوویی ماوەتەوە و کارییێدەکرێت.

## ٢- سەربەخۆیی:

خاڵێکی تری خراپ کە ئەزموونی کۆماری کوردستان لە دوای خۆی بەجێیهێشت، کورد لە ستراتیژ و دروشمی سەربەخۆیی کوردستان دوورکەوتەوە. کوردەکانی دوای کۆماری کوردستان وای بۆ دەچن کە یەک لە هۆکارەکانی شکستی کۆمار، ئەوە بووە زەمینەی دروستکردنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان لەبار نەبووە. بڕوایان وایە هەتا ئەمڕۆیش ئەو زەمینەیە هەر لەبار نییە، لەبەرئەوە سەرهەڵدان و شۆڕشەکانی گەلی کورد لەو کاتەوە هەتا ئەمڕۆ هیچیان دروشمی سەربەخۆیی کوردستانیان بەرزنەکردووەتەوە. لەو کاتەوە ستراتیژی شۆڕش و سەرهەڵدانەکانی کوردستان باس لەوە دەکەن کە کێشەی کورد لە چوارچێوەی وڵاتانی سەردەستدا بە دیموکراتیی چارەسەردەکرێت، لەو کاتەوە ستراتیژی شۆڕشەکان لە سەربەخۆیی کوردستانەوە دووردەکەوێتەوە، بۆ حوکمی زاتیی و فیدراڵیی پەلدەهاوێژێت.

## ٣- یەکێتیی تێکۆشان:

لە جەنگی یەکەمی جیهانییدا لە سەردەمی سەرهەڵدانی شێخ مەحموددا، کوردەکانی ڕۆژهەڵات (سمکۆی شکاک و مەحمود خانی دزڵیی) هاوکاریی شۆڕشی شێخیان کرد. لە جەنگی دووەمی جیهانییدا، کوردەکانی باکوور و کوردەکانی باشوور، هاوکاریی قازی موحەممەد و کۆماری کوردستانیان کرد. بەم شێوەیە دەبینین هەتا ڕوخانی کۆماری کوردستان یەکێتییەکی نەتەوەیی لە نێوان پارچەکانی کوردستاندا هەبووە. شکستی کۆمار و ئەو زەحمەتییەی هێزەکانی باشوور بینییان، ئەو گرفتانەی کە دوای ڕوخانی کۆمار ڕووبەڕووی بەرزانییەکان بووەوە، کاریگەرییەکی خراپی لەسەر یەکێتیی تێکۆشانی گەلی کورد بەجێهێشت. کاتێک بەرزانییەکان گەڕانەوە بۆ باشووری کوردستان ڕژێمی ئەو سەردەمەی عێراق نەک هەر ئامادە نەبوو بیانگرێتەخۆ، بەڵکو هەوڵی ئەوەیشی دەدا دەستگیریانبکات و لێپێچینەویان لەگەڵ بکات.

هێزەکەی مستەفا بەرزانیی بە ناچاریی کوردستانی عێراق و کوردستانی ئێرانی بەجێبهێشت، ڕووی لە یەکێتیی سۆڤیەتی جاران کرد و لەوێ ئاوارەبوون. ڕژێمی پاشایەتیی عێراق سزای مەرگی بەسەر ئەو چوار ئەفسەرە کوردەدا سەپاند، کە بەشدارییان لە کۆماری کوردستاندا کردبوو*١٩.

ئەو زەحمەتەییانەی لە دوای کۆماری کوردستان ڕووبەڕووی کورد بوونەوە، وای لە کورد کرد گۆڕانکارییەک لە بیرکردنەوە و تێڕوانینیاندا دروستببێت. لە چەمکی یەکێتیی نەتەوەیی و پشتیوانیی خەباتی نەتەوەیی پارچەکانی تری کوردستان دووربکەوێتەوە. ئەو گۆڕانکارییە لە شۆڕشی ئەیلولدا لە هزری بەرزانییەکانەوە بۆ هزری زۆرینەی سیاسەتمەدارانی کورد گوێزرایەوە. کاریگەریی خراپی لەسەر تێکۆشانی نەتەوەیی گەلی کورد بەجێبهێشت، وایلێهات کە کوردی باشوور بەبێ هاوکاریی یەکێک لە دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان خەباتی چەکداریی پێنەکرێت.

## ٤- شاخەکان:

کە کۆماری کوردستان کۆتاییهات، ڕێبەری کۆمار و هەڤاڵەکانی بە بەرچاوی جیهانەوە لەسێدارەدران. هیچ هێز و لایەنێکی ناوچەیی و نێونەتەوەیی لەسەریان نەهاتەوەلام و سەرزەنشتی ڕژێمی شای ئێرانیان نەکرد. لەسێدارەدانی قازی موحەممەد و هەڤاڵەکانی بێکەسی و بێپشتیوانیی کوردی پیشاندا. ئەو گیروگرفتانەی لە دوای ڕوخانی کۆماری کوردستان کە ڕووبەڕووی خەڵکی کوردستان بووەوە، کوردی دوچاری شکستی ڕۆحیی کرد. بیری لەوە دەکردەوە لە کاتی تێکۆشاندا بۆ دۆستی تاکتیکیی بگەڕێت هەتا لە کاتی تەنگانەدا بەهانایەوەبێت و بیپارێزێت. ئەوەیش یەک لەو هۆکارانە بوو کە دوای کۆماری کوردستان هەر کە شۆڕشگێڕانی کورد ڕاپەڕیین و سەرهەڵدانی چەکدارییان لە پارچەیەکی کوردستاندا بەرپادەکرد، پەیوەندییان بە ڕژێمە داگیرکەرەکانی تری کوردستانەوە دەکرد، بۆ ئەوەی لە کاتی شکستدا بیانپارێزن، بەلام ئەو پەیوەندییەیش زیانی لە قازانجی زیاتربوو، کە بینییان دۆستە تەکتیکییەکان بەگوێرەی بەرژەوەندیی خۆیان دژی کورد لەگەڵ داگیرکەر ڕێکدەکەون و کورد دەفرۆشن، کە بینییان ئەو هێز و دەوڵەتانەی بە ناوی ئازادیی و مافی مرۆڤەوە قسەدەکەن، قسەکانیان هیچ سودێکی بۆ گەلی کورد نییە، ئیتر کورد ئەم دەستەواژەیەی داهێنا: «تەنها شاخەکان دۆستی کوردن». لەبەرئەوەی تەنها بنبەرد و ئەشکەوتی شاخەکانی کوردستان گەلی کورد لە بوردوومانی تۆپ و فڕۆکەی دوژمن و چەکی کوشندە دەپارێزێت.

## ٦- لەپێناو ئەواندا:

کە یەکێتیی سۆڤیەت مافی پڕۆژەی دەرهێنانی نەوتی لە ئێران وەرگرت، نەک هەر پشتیوانیی خۆی بۆ کۆماری ئازربایجان و کۆماری کوردستان ڕاگرت، داوایشی لێکردن دەست لە مافەکانی خۆیان بەربدەن و ڕێگەبدەن سوپا و حکومەتی ئێران دەستبگرێتەوە بەسەر کوردستان و ئازربایجاندا، بۆ ئەوەی ئەو کارە سەربکەوێت، پێیڕاگەیاندن ئەگەر لەسەر تێکۆشان بەردەوامبن، کۆماری ئازربایجان و کۆماری کوردستان لەسەر پێی خۆیان بمێننەوە جەنگی سێیەمی جیهانیی هەڵدەگیرسێت*٢٠.

لەبەرئەوە قازی موحەممەد و سەرکردەکانی تری کۆمار، لەپێناو ئەوەی ڕێگە لە بەرپابوونی شەڕێکی جیهانیی گەورە بگرن، دەستیان لە خەباتی پاراستنی کۆمار هەڵگرت. ڕێگەیاندا سوپای ئێران بگەڕێتەوە کوردستان، ئێران کوردستانی داگیرکردەوە. لەو کاتەوە لە ناو گەلی کورددا وازهێنان لە تێکۆشان لەپێناو بەرژەوەندیی وڵاتانی تردا بووەتە چەمکێکی باو، زیانی گەورەی لە تێکۆشانی گەلی کورد داوە. ڕێککەوتنی جەزائیری ساڵی ١٩٧٥ لە نێوان شای ئێران و سەدام حوسەینی جێگری سەرۆککۆماری ئەو کاتەی عێراق، لەبەرئەوەی سودی بۆ ئێران تێدابوو، لەپێناو بەرژەوەندیی ئێراندا ڕابەری شۆڕشی ئەیلول مستەفا بەرزانیی دەستی لە خەبات بەردا. داوای لە هێزی پێشمەرگە کرد واز لە تێکۆشان بهێنن.

### سەرچاوەکان:

١- مارکس: فەیلەسوف و ئابووریناس شۆڕشگێڕی کۆمۆنیستی ئەڵمانیی ١٨١٨ – ١٨٨٣.

٢- پەیمانی سیڤەر، ویکیپیدای کورد: پەیماننامەیەکی نێودەوڵەتیی نێوان تورکیا و هاوپەیمانانی جەنگی یەکەمی جیهانیی، ١٠/ ٨/ ١٩٢٠ لە شاری سیڤەر لە فەرنەسا ئیمزاکرا. مادەکانی (٦٢، ٦٣، ٦٤) پەیوەندییان بە ماف و ئازادیی گەلی کوردەوە بوو، نوێنەری گەلی کورد لەو ڕێککەوتنەدا شەڕیف پاشا بوو، دوای سێ ساڵی دەوڵەتی کەمالیی تورکیا بە پەیمانی لۆزان کۆتایی بە پەیمانی سیڤەر هێنا و برگەکانی پەیمانەکەی جێبەجێنەکرد.

٣- عەلادین سەجادی: شۆڕشەکانی کورد و کوردی کۆماری عێراق، چاپخانەی سنە، ١٣٦٥ ئێرانی لاپەڕە: ٥٧ – ٥٨.

٤- ڕێککەوتنی جەزائیر: ساڵی ١٩٧٥ لە شاری جەزائیری پایتەختی وڵاتی جەزائیر، لە پەراوێزی کۆبوونەوەی سەرۆکی وڵاتانی ڕێکخراوی ئۆپێک، بە هاوکاریی سەرۆکی جەزائیر هەواری بۆمیدیان شای ئێران و سەدام حوسەینی جێگری سەرۆکی عێراق کۆبوونەوە و لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە شای ئێران دەست لە هاوکاریی و پشتیوانیی شۆڕشی ئەیلول هەڵبگرێت، لە بەرانبەردا عێراق لە ناوچەی دەریای عەرەب و ناوچە سنوورییەکانی

تر دەست لە کۆمەڵێک مافی خۆی هەڵدەگرێت بۆ ئێران، ئەو ڕێککەوتنی ڕۆژی ٦/ ٣/ ١٩٧٥ بڵاوکرایەوە، شای ئێران داوای لە مەلا مستەفا بەرزانیی کرد کۆتایی بە شۆڕش بهێنێت، مەلا مستەفا کۆتایی بە شۆڕش هێنا و ئاشبەتاڵی بە شۆڕشی ئەیلول کرد.

٥- ڕێککەوتنی ئەمنیی نێوان تورکیا و عێراق ١٩٨٣، ڕێککەوتنی ئەمنیی نێوان سوریا و تورکیا ساڵی ٢٠٠٧.

٦- پەیمانی لۆزان: ویکیپیدیای کوردی، ساڵی ١٩٢٣ لە شاری لۆزانی سویسرا لە نێوان هاوپەیمانان و تورکیادا پەیمانێکی تر ئیمزاکرا، تورکیا لە هەندێک لە بەندەکانی پەیمانی سیڤەر پەشیمانبووەوە، وەکو بەندەکانی (٦٢، ٦٣، ٦٤) کە دانی بە مافی چارەنوسی گەلی کورددا نابوو.

٧- عەلادین سەجادی، شۆڕشەکانی کورد (سمکۆی شکاک سەرکردەیەکی ڕاپەڕینی کورد بوو لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە جەنگی یەکەمی جیهانییدا).

٨- کۆمەڵکوژیی ئەرمەن: ساڵی ١٩٢٤ – ١٩١٥ یەک ملیۆن و نیو ئەرمەنیی لە لایەن سوپای دەوڵەتی عوسمانییەوە بە بڕیاری ئەفسەرەکانی سەر بە ڕێکخراوی ئیتحاد و ترقی تورکیا کۆمەڵکوژکران و شاربەدەرکران. هەتا ئێستا دەوڵەتی تورکیا داوای لێبوردنی لە گەلی ئەرمەن و کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی نەکردووە.

٩- عەلادین سەجادی، هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١٠- ڕێکخراوی یەکێتیی جیهانیی زانایانی ئیسلامیی، ساڵی ١٩٦٩ دامەزراوە، ٥٧ پەنجاوحەوت وڵاتی ئیسلامیی ئەندامی ئەو ڕێکخراوەن، ئامانجی سەرەکیی یەکخستنی سیاسەتی وڵاتانی موسڵمانە، دوای ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجە کۆنگرەیەکی لە کوێت ئەنجامدا، بەرانبەر بە کۆمەلکوژیی گەلی کورد هەڵوێستی پیشاننەدا.

١١- عەلادین سەجادی، هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١٢- عەلادین سەجادی، هەمان سەرچاوەی پیشوو، مافی ڕۆشنبیریی بۆ گەلی کورد لە عێراقدا لە سەردەمی شێخ مەحموددا، شۆڕشەکانی کورد.

١٣- شۆڕشەکانی کورد، عەلادین سەجادی.

١٤- شۆڕشەکانی کورد. عەلادین سەجادی

١٥- عێراق و گەڕان بە شوێن ناسنامەی نەتەوەییدا: لیۆرا لوکیتز، وەرگێڕانی دڵشاد میران.

١٦- کۆمەڵگەی کراوە و دوژمنەکانی، کارل پۆپەر.

١٧- عەلادین سەجادی، شۆڕشەکانی کورد.

١٨- شۆڕشەکانی کورد، عەلادین سەجادی: ئەو ئەفسەرانەی کە لە ڕۆژی ١٩/ ٦/ ١٩٤٧دا ڕژێمی پاشایەتیی عێراق سزای لەسێدارەدانی بەسەردا سەپاندن ئەمانە بوون: عزەت عەبدولعەزیز، مستەفا خۆشناو، خەیروڵا عەبدولکەریم، موحەممەد قودسیی.

١٩- عەلادین سەجادی، شۆڕشەکانی کورد، ڕێککەوتنی قەوام سەڵتەنە و سۆڤیەتیی لەسەر نەوتی ئێران.

٢٠- عەلادین سەجادی، شۆڕشەکانی کورد.

# ٤

# حیزبایەتیی لە کوردستاندا

حیزبی سیاسیی یەکێکە لەو دەزگا کۆمەڵایەتییانەی کە لەپێناو چارەسەرکردنی کێشەیەکی سیاسییدا دادەمەزرێت. بۆ ئەوەی حیزب بتوانێت کێشەکە چارەسەربکات، دەبێت دەسەڵاتی هەبێت. جۆری کێشەکان و قۆناغی گەشەکردنی کۆمەڵگەکە، ناسنامەی حیزبەکە دیاریدەکات.

لە سەرەتادا کۆمەڵگە و تاک کاریگەرییان لەسەر دروستبوون و ئاراستەکردنی حیزب هەیە. دوای دامەزراندن و چالاکبوون، حیزب کاریگەریی لەسەر تەواوی لایەنەکانی ژیانی تاک و کۆمەڵگە دادەنێت و ئاراستەیدەکات.

ئەگەر لە کۆمەڵگەیەکدا کێشەی نەتەوەیی کێشەی سەرەکیی بێت، وەکو کۆمەڵگەی کوردستان، حیزبەکانی حیزبی نەتەوەیی دەبن. ئەگەر کۆمەڵگەیەک کێشەی سەرەکیی کێشەی چینایەتیی بێت، حیزبەکانی حیزبی چینایەتیی دەبن. ئەگەر کۆمەڵگەیەک کێشەی سەرەکیی ململانێی ئایدۆلۆژیی و ئاینیی و ئاینزایی بێت، حیزبەکانی حیزبی ئایدۆلۆژیی و ئاینیی و ئاینزایی دەبن.

بۆ ئەوەی کۆبوونەوەی کۆمەڵە کەسێک لە چوارچێوەیەکی دیاریکراودا پێناسی حیزب وەربگرێت، دەبێت چەند بنەمایەکی هاوبەش لە نێوان ئەو کۆمەڵە خەڵکەدا هەبێت.

# پایەکانی حیزب

## ١- ئایدۆلۆژیا:

ئایدۆلۆژیا بە واتای زانستی بیرکردنەوە و هەڵسەنگاندن و دنیابینیی دێت. ئەو کۆمەڵە خەڵکەی حیزب پێکدەهێنن، دەبێت خاوەنی ئایدۆلۆژیایەکی هاوبەش بن، بۆ ئەوەی دیاردە کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و ئابورییەکانی ناو کۆمەڵگە و دەوروبەر وەکو هەیە بخوێننەوە، ناکۆکیی لە نێوان بۆچوونیاندا دروستنەبێت، لە ڕێگەی ئایدۆلۆژیاوە بەرنامە و ڕێوشوێنی کار و چالاکیی حیزب دادەنرێت، بۆ چارەسەرکردنی هەر کێشەیەک کە دێتە ڕێگەی حیزب، ئایدۆلۆژیا ڕێگەی چارەسەری بۆ دادەنێت.

## ٢- ستراتیژ:

یەکێک لە پێویستییەکانی تری بەحیزببیبوونی هەر کۆمەڵە خەڵکێکە، کە پێکەوە بۆ بەدەسیهێنانی ئامانجێک کۆدەبنەوە، دیاریکردنی ستراتیژ و ئامانجی سەرەکیی سیاسەتی حیزبە لە قۆناغێکی دیاریکراودا. دیاریکردنی میکانیزمی تێکۆشان و گەیشتن بەو ئامانجەیە. بۆ نمونە حیزبی وا هەیە لە قۆناغێکدا بۆ ئازادیی نەتەوەکەی تێدەکۆشێت، بۆ بەدەستهێنانی ئەو ئامانجە، پەنا بۆ خەباتی چەکداریی دەبات، یان پەنا بۆ ڕاپەڕینی جەماوەریی دەبات، یان ڕێگەی هەڵبژاردن و پەرلەمان دەگرێتەبەر.

## ٣- تاکتیک:

یەکێک لە پێویستییەکانی تری حیزببیبوون تاکتیکە، هیچ کارێکی سیاسیی بەبێ تاکتیک بەڕێوەناچێت. ئەگەر بەڕێوەیشبچێت وەکو پێویست سەرکەوتن بەدەستناهێنێت. لینینی گەورە سیاسەتمەداری سەدەی بیستەمی ڕوسیا دەڵێت: سیاسەت بریتییە لە دەستنیشانکردنی ڕەوشی دیاریکراو لە کاتی دیاریکراودا*١. تاکتیک بریتییە لەو هەنگاوە ڕۆژانانەی سەرکردە و کادری حیزب لەپێناو سەرخستنی ئامانجە ستراتیژییەکاندا دەیهاون. تەکتیک ئەو هونەرەیە کە سەرکردە و کادر دەتوانێت بە باشترین شێوە، بە کەمترین قوربانیی، جەماوەر لە حیزبەکەی نزیکبکاتەوە. گفتوگۆی سەرکەوتوو لەگەڵ ڕکابەرەکەیدا بکات. کاری تەکتیکی سەرکەوتوو پێویستی بە تێگەیشتنی ئایدۆلۆژیا و ستراتیژ هەیە، پێویستی بە سەلیقە و هەستیاریی گشتیی کادر هەیە.

### ٤- سەرکردە:

سەرکردە بەڕێوەبەرێکی شارەزا و بەتوانایە، پێشبینیی ڕوداوەکان دەکات. ئایدۆلۆژیا و ستراتیژ و تاکتیک پێکەوە گرێدەدات و کادر پێدەگەیێنێت. کاریگەریی لەسەر جەماوەر هەیە، لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا ئەگەر حیزب سەرکردەی نەبێت، سەرکەوتن بەدەستناهێنێت. لەبەرئەوە سەرکردە بە مەرجێکی گرنگی دروستبوونی حیزب دادەنرێت. لە ولاتانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و کوردستاندا کە سیاسەت بەگوێرەی دەستوور و یاسا بەڕێوەناچێت، تاک و کۆمەلیش ڕۆشنبیریی سیاسییان لاوازە، سەرکردە ڕۆلی یەکلاکەرەوە دەبینێت.

### ٥- دسپلین:

دەبێت بەرپرس و کادر و ئەندامی حیزب ڕێنمایی و بڕیارەکانی حیزب جێبەجێبکات و لێی لانەدات، کادر و ئەندامی بە دسپلین ئەو کەسەیە کە لە پەیڕەوی ناوخۆی حیزب لانادات. دسپلین حیزب لە کێشەی ناوخۆیی دەپارێزێت، کادر و ئەندام و لیژنەکانی حیزب بە یەکەوە دەبەستێتەوە. دسپلین لە کۆنگرەکانی حیزبدا لە چوارچێوەی پەیڕەوی ناوخۆی حیزبدا بڕیاری لەسەر دەدرێت. حیزب لیژنەی تایبەتی دسپلینی هەیە، لێپرسینەوە لەو ئەندامەی حیزب دەکات، کە لە پەیڕەوەی ناوخۆ لادەدات.

### ٦- بۆشایی سیاسیی:

یەک لە پێویستییەکانی تری پێکهێنانی حیزب بۆشایی سیاسییە، بۆشایی سیاسیی واتای ئەوەیە کێشەیەک هەیە، بەلام هیچ حیزبێکی سیاسیی نییە هەولی چارەسەرکردنی کێشەکە بدات، یان هیچ لایەنێکی سیاسیی بەرانبەر بەو کێشەیە خۆی بەبەرپرسیار نابێنێت. ئەگەر حیزبێکی نوێ دابمەزرێت و خۆی بە بەرپرسیاری ئەو کێشەیە بزانێت، دەتوانێت خەلک لە خۆی کۆبکاتەوە و بۆشاییەکە پڕبکاتەوە، لە ڕێگەی پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە سیاسییەوە جەماوەر بە ڕێبازە سیاسییەکەی ئاشنا دەبێت و حیزب گەشەدەکات. ئەگەر چەند حیزبێکی سیاسیی چالاک لە گۆڕەپاندا هەبن، ئەندام و لایەنگر و سەرکردایەتییان هەبێت و هەولی چارەسەری کێشەکان بدەن، ئەوە واتای ئەوەیە کە بۆشایی سیاسیی نییە هەتا حیزبێکی

نوێ دابمەزرێت و پڕیبکاتەوە، ئەگەر حیزبیش دابمەزرێت سەرکەوتن بەدەستناهێنێت. ساڵی ١٩٧٥ سەرکردایەتیی پارتیی و شۆڕشی ئەیلول کۆتایین بە خەبات هێنا. بۆشاییەکی سیاسیی لە کوردستان دروستبوو، کێشەی کورد بە چارەسەرنەکراویی مایەوە. یەکێتیی کە ئەو بۆشاییە سیاسییەی بینی، دامەزراندنی خۆی ڕاگەیاند و بۆشاییەکەی پڕکردەوە. خەڵک پشتیوانیی لە یەکێتیی کرد و یەکێتیی گەشەیکرد.

## ٧- کادیر:

کادر ئەو کەسەیە کە لە نێوان حیزب و جەماوەردا پەیوەندیی دروستدەکات، ڕێبازی سیاسیی حیزب بە جەماوەر دەگەیەنێت، دەنگی جەماوەر بە سەرکردایەتیی حیزب دەگەیەنێت، ئەندام و دۆست بۆ حیزب پەیدادەکات. یەکێک لە پێویستییەکانی تری پێکهێنان و گەشەکردنی حیزب کادرە، کاتێک حیزب دادەمەزرێت دەبێت یەک لە ئەرکە سەرەکییەکانی ئامادەکردن و پێشخستنی کادرەکانی بێت، بۆ ئەوەی ئەو کادرانە بتوانن ڕاوبۆچوون و ڕێبازی سیاسیی حیزب بگەیەننە جەماوەر، لە ناو جەماوەردا ئەندام بۆ حیزب بدۆزنەوە و لە کاتی پێویستدا جەماوەر ڕێکبخەن، چالاکیی سیاسیی و جەماوەریی بکەن. هەر حیزبێک نەتوانێت کادر بۆ خۆی دروستبکات، ناتوانێت ئامانجەکانی بگەیەنێتە خەڵک، ناتوانێت خۆی بە جەماوەر بناسێنێت.

## ٨- جەماوەر:

یەک لە پێویستییەکانی تری حیزب جەماوەرە، واتە دەبێت حیزب لە لایەن خەڵکەوە پشتگیرییبکرێت، لە کاتی هەڵبژاردندا دەنگیپێبدات. ئەو حیزبانەی کە دەتوانن جەماوەر لە دەوری خۆیان کۆبکەنەوە متمانەی جەماوەر بەدەستبێنن، ئەوانەن کە لە بەرنامەیاندا حساب بۆ داواکاریی و مافی گشتیی و تایبەتیی جەماوەر دەکەن. ئامانجەکانیان ڕوونە و جەماوەر بە ئاسانیی لێیتێدەگات. ئەو حیزبانەی جەماوەر بۆ خۆیان قازانجدەکەن، ئەوانەن کە باشترین و زاناترین کادریان هەیە. بە پێوانە لەگەڵ جەماوەردا دەجوڵێنەوە، لە جەماوەرەوە فێردەبن و جەماوەر فێردەکەن.

### ٩- پەروەردە:

پەروەردەی کادر و ئەندامی حیزب یەکێک لە بنەماکانی تری حیزبایەتییە، دەبێت حیزب ئەکادیمیای فێرکردنی سیاسەت و خولی پەروەردەی سیاسیی کادر و ئەندامانی هەبێت. هەم سەرکردەکانی، هەم کادرەکانی، ناوبەناو بەشداریی خولەکانی پەروەردە بکەن، بۆ ئەوەی حیزب لە لادانی سیاسیی بپارێزن، بۆ ئەوەی کادرەکان سیاسەتی حیزب هەرسبکەن و بتوانن بە ڕێکوپێکیی بۆ جەماوەری بگوازنەوە. (ڕێکخستن، پەروەردە، چالاکیی) فەلسەفەی حیزبایەتییەکی دروستە. ئەگەر حیزبێک ڕێکخستنی هەبێت، دەبێت سەرەتا ئەندامەکانی ڕێکخستن پەروەردەبکات پاشان بیانخاتە ناو کار و چالاکییەوە، ئەگەر وانەکرێت، کار و چالاکیی ئەنجامی خۆی ناپێکێت و لادان دروستدەبێت.

## جۆرەکانی حیزب

### ١- حیزبە لیبراڵەکان:

بیرۆکەی حیزبایەتیی و پێکهێنانی حیزب، لەگەڵ سەرهەڵدانی سیستەمی لیبراڵییدا دەستیپێکرد، بۆ یەکەم جار حیزب لە ساڵانی دەوروبەری١٨٥٠ لە وڵاتانی ئەوروپا دامەزرا. سەرەتا حیزب لە لایەن پەرلەمانتارە چالاکەکانەوە دادەمەزرا، ئەو کەسانەی خۆیان بۆ پەرلەمان دەپاڵاوت، پێویستیان بە کۆمەڵە کەسێک هەبوو بەرنامەکەیان بە دەنگدەران بناسێنێت و پڕوپاگەندەی هەڵبژاردنیان بۆ بکات، هەتا لە هەڵبژاردندا سەرکەوتن بەدەستبهێنن. بیرکردنەوە و بڕیاردان بۆ کۆکردنەوەی ئەو کۆمەڵە خەڵکە کە پڕوپاگەندەی هەڵبژاردنی پەرلەمان دەکەن، لە ئەوروپا حیزبی لێدروستبوو*٢.

حیزب لە سیستەمی لیبراڵییدا بچووکە، نوسینگە و ئەندام و کادری کەمە، هەموو کاتێک وەکو یەک چالاک نییە، لە کاتی هەڵبژاردندا حیزب دێتە مەیدان، بەرنامەی سیاسیی و پاڵێوراوەکانی بە خەڵک دەناسێنێت و پڕوپاگەندەیان بۆ دەکات، کە هەڵبژاردن تەواودەبێت، حیزب بۆ قۆناغی متبوون دەگەڕێتەوە، خەریکی پەروەردەی ئەندامەکانی دەبێت هەتا هەڵبژاردنێکی تر دێتەپێشەوە.

## ٢- حیزبە مارکسییەکان:

لە وڵاتانی تردا وەکو ڕوسیای سەردەمی قەیسەر، لە کۆتایی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستدا، حیزب لە بارێکی تری سیاسییدا، بۆ ئامانجێکی تر دامەزرا، پێش ڕوخانی ڕوسیای قەیسەریی لینین و هاوڕێکانی لە دەرەوەی وڵات حیزبێکی سیاسییان دامەزراند. ئامانج لە دامەزراندنی ئەم حیزبە نوێیە، پاڵپشتییکردن و سەرخستنی هەڵمەتەکانی هەڵبژاردنی پەرلەمان نەبوو، ئامانجی ئەم حیزبە ڕوخاندنی ڕژێمی قەیسەری ڕوسیا بوو.

ئامرازی کارکردنی حیزبەکەی لینین وەکو حیزبەکانی ئەوروپای ڕۆژئاوا نەبوو، لە ئەوروپا حیزبی سیاسیی پەنای بۆ خەباتی دیموکراتیی و هەڵبژاردنی پەرلەمانیی دەبرد. حیزبەکەی لینین بەگوێرەی کات و شوێن و هەلومەرجی سیاسیی، پەنای بۆ هەموو شێوازێکی تێکۆشان دەبرد، بە نهێنیی کاریدەکرد. ڕابەرایەتیی خۆپیشاندانی جەماوەریی دەکرد، خەباتی دیبلۆماسیی و خەباتی چەکداریی دەکرد.

ئایدۆلۆژیای حیزبەکەی لینین لە ئایدۆلۆژیای حیزبەکانی وڵاتانی ڕۆژئاوای سەرمایەداریی جیاواز بوو، ئایدۆلۆژیایان مارکسیی بوو. لەپێناو ڕوخاندنی سیستەمی سەرمایەدرییدا تێکۆشانیاندەکرد.

بە سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەر لە ١٧/ ١٠/ ١٩١٧ مۆدێلی حیزبی مارکسیی لە سەرتاسەری جیهاندا ڕەواجی پەیداکرد. لە زۆرێک لە وڵاتاندا، بە تایبەتیی لە ناو هێزە چەپەکاندا، ئەم جۆرە حیزبە دامەزرا. سەدان حیزبی مارکسی-لینینی و کرێکاریی و نەتەوەیی لە سەرتاسەری جیهاندا دامەزران. لە دەیان وڵاتدا دەسەڵاتیان بەدەستەوەگرت. لە وڵاتانی تریشدا وەکو هێزی ئۆپۆزسیۆنی سیستەمی سەرمایەداریی و داگیرکەران و ئیمپریالیزم چالاکبوون، کاریگەریی خۆیان لەسەر سیاسەت بەجێهێشت.حیزبی مارکسی-لینینی بڕوای بە دیاردەی فرەحیزبیی ئەوروپا نەبوو، سیستەمی تاک_حیزبیی پەیڕەودەکرد. لە بەڕێوەبردنی کار و چالاکیی حیزبدا، ناوەندێتیی دیموکراتی بە بنەما دەگرت. دکتاتۆری پرۆلیتاریا، سۆسیالیزم و کۆمۆنیزم، گرنگترین بناغە ئایدۆلژیی و سترارتیژییەکانی حیزبی مارکسی-لینینی بوون.

دوای ڕوخانی روسیای قەیسەریی، یەکێتیی سۆڤیەت پشتگیریی بزاڤی ڕزگاریی نەتەوەیی گەلانی ژێردەستی دەکرد. ئەو نەتەوانەی کە لە لایەن وڵاتە ئیمپریالییەکان

و دەوڵەتە ناوچەییەکانەوە خاکەکەیان داگیرکرابوو، بۆ ئەوەی لە دەستی داگیرکاریی ڕزگاریانبێت، بە ماف و ئازادیی خۆیان بگەن، حیزبی سیاسیی مارکسی-لینینیان دامەزراند. بەم شێوەیە حیزبی مارکسی-لینینی، حیزبی شیوعیی و حیزبی کرێکاریی و حیزبی نەتەوەیی لە سەرتارسەری جیهاندا بە ناوی جیاوازەوە، بەڵام بە ناوەڕۆک مارکسی-لینینی دامەزران. شانبەشانی یەکێتیی سۆڤیەتی جاران و هێزی چەپ و کۆمەنیست، بەرانبەر بەرەی سەرمایەداریی ئەورووپای ڕۆژئاوا و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ململانێ و شەڕی سیاسیی و ئایدۆلۆژیی و کەلتوریی و ئابورییان دەستپێکرد.

پاش جەنگی دووەمی جیهانیی و شکستی ئەڵمانیای نازیی، جوڵانەوەی چەپ و کۆمونیست هێندەی تر گەشەیکرد. یەکێتیی سۆڤیەت لە ڕووی زانست و تەکنۆلۆژیا و ئابوریی و سەربازیی و چوونەناوفەزاوە، لە پێشکەوتنی بەردەوامدا بوو. لە ڕووی بیر و فەلسەفە و کەلتوریی و سیاسییشەوە، لە ناو گەلانی جیهان و کرێکاران و ڕۆشنبیرە چەپەکانی وڵاتانی سەرمایەدارییدا هەتا دەهات پێشدەکەوت.

لەبەرئەوەی کوردستان وڵاتێکی داگیرکراوە، ئایدۆلۆژیای مارکسی-لینینی کاریگەریی زۆری لەسەر حیزبایەتیی کوردستان کرد. ساڵی ١٩٤٦ یەکەم حیزبی کوردیی (پارتیی) لەژێر کاریگەریی سیاسەتی یەکێتیی سۆڤیەتدا لە مەهاباد دامەزرا. لەو کاتەوە کاریگەریی ئەو ئایدۆلۆژیایە لەسەر سیاسەتی کوردستان بەجێماوە. لەم سەردەمەدا حیزبەکانی کوردستان دەیانەوێت وەکو حیزبە لیبراڵەکانی ئەورووپا و ئەمریکا سیاسەت بکەن، بەڵام لەبەرئەوەی ماوەیەکی زۆر بەر کاریگەریی حیزبی مارکسی-لینینی کەوتوون، بەزەحمەت دەتوانن وەکو حیزبە لیبراڵەکان سیاسەت بکەن.

### ٣- حیزبە سۆسیاڵ_دیموکراتەکان:

سیستەمی سەرمایەداریی جیهانیی کە گەشەکردنی جەمسەری چەپ و کۆمەنیستیی بینی، ترسی شکستی لێنیشت. ڕێگە و شوێنی بۆ ڕێگەگرتن لە گەشەکردنی کەلتور و هەژموونی سیاسیی جەمسەری کۆمەنیستیی دانا. یەکێک لەو ڕێگرییانە، دروستکردنی حیزبی سۆسیاڵ_دیموکرات بوو. لە لایەکی ترەوە لەبەرئەوەی سیستەمی کۆمونیستیی جیهانیی لە هەندێک پیوانەی گشتیی خۆی لایدا، لە لایەن ڕۆشنبیرانی وڵاتانی

سەرمایەدارییەوە ڕەخنەکرا. ئیتر زەمینەی پێکهێنانی حیزبی سۆسیاڵ_دیموکرات زیاتر گەشەیدەکرد. ئەم حیزبانە لە ڕووی سیاسییەوە دەستیان بە ڕکابەریی حیزبە کۆمەنیستەکان کرد. سیستەمی سەرمایەدارییان لە ڕزین و داڕوخان پاراست.

بەرنامەی سۆسیاڵ_دیموکراتەکان باس لە مافە سیاسیی و ئابورییەکانی کرێکاران دەکات، بڕوایان وایە کە بەبێ دکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا، لە ڕێگەی هەڵبژاردن و ڕیفۆرمی سیاسییەوە، ژیانێکی بەختەوەر بۆ کرێکاران و توێژە هەژارەکانی کۆمەڵگە و پێکهاتە چەوساوەکان دابیندەکرێت. ئەمڕۆ لە وڵاتانی ئەوروپا و لە هەندێک وڵاتی تر، حیزبە سۆسیاڵ_دیموکراتەکان دەسەڵاتیان بەدەستەوەیە، لە نێوان چەپ و لیبراڵەکانی جیهاندا، سیاسەتی جیهان ئاراستەدەکەن.

## ٤- حیزبە ئیسلامییەکان:

فەلسەفە و زانست و تەکنۆلۆجیا، هزری سەرمایەداریی و کۆمۆنیست و سۆسیاڵ_دیموکراتی لەگەڵ خۆی هێنا، بەڵام لە هەناوی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتییدا، ئایدۆلۆژیای قۆناغەکانی دەرەبەگایەتیی و کۆیلایەتیی و سروشتیی، بە لاوازیی ماوەتەوە. لە ڕێگەی ئاینە ئاسمانییەکان و ئەفسانە و بەهاکانی مرۆڤایەتییەوە، سەرەتاتکێ لەگەڵ هزری سەردەمدا دەکات.

لە جەنگی یەکەمی جیهانییدا دەوڵەتی عوسمانیی ڕوخا. ئەوروپا بە سیاسەت و کەلتوری خۆیەوە پەلاماری جیهانی ئیسلامیی دا. وەکو پەرچەکردارێک حیزبێکی ئیسلامیی بە ناوی برایانی مسوڵمان دامەزرا. لقوپۆپی بە ناو وڵاتە مسوڵمانەکاندا بڵاوبووەوە. لەگەڵ سیستەمی سەرمایەداریی و هزری کۆمەنیستییدا دەستی بە ململانێ کرد.

لە کۆتاییەکانی سەدەی بیست و سەرەتای سەدەی بیستویەکدا، دوای هەڵوەشانەوەی یەکێتیی سۆڤیەت، ناکۆکیی و ململانێ لە نێوان حیزبە ئیسلامییەکان و سیستەمی سەرمایدارییدا پەرەیسەند. حیزبە ئیسلامییەکان دژی سیاسەتی وڵاتە سەرمایەدارەکان وەستانەوە. شێوازی خەباتیشیان گۆڕانکاریی بەسەرداهات. دژی ڕۆژئاواییەکان پەنایان بۆ زەبروزەنگ و تیرۆری بەکۆمەڵ برد.

# حیزبەکانی کوردستان

لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەمەوە (١٨٤٣)، لە ناو پێکهاتە خێڵەکییەکانی گەلی کورددا هەستی نەتەوەیی دەستی بە گەشەکردن کرد. سەرۆک_خێڵەکانی کورد داوای مافی نەتەوەیی کوردیان لە دەوڵەتی عوسمانیی و دەوڵەتی ئێرانی ئەو سەردەمە دەکرد. ئەم جۆرە تێکۆشانە نزیکەی سەدەیەک دەخایەنێت. کاتێک ڕۆشنبیرانی کورد بینییان پێکهاتە ئاینیی و خێڵەکییەکان لە تێکۆشاندا سەرکەوتنیان بەدەستنەهێنا، هەوڵی دامەزراندنی حیزبی سیاسییان دا. کۆمەڵەی خۆیبوون و کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد (ژ. ک)، حیزبی هیوا لە ڕێکخراوە سیاسییە سەرەتاییەکانی کوردستان بوون، کە لە چلەکانی سەدەی بیستدا دامەزران و بۆ ماوەیەک کار و تێکۆشانیان بەڕێوەدەبرد*٣.

لە کاتی جەنگی دووەمی جیهانییدا، هێزە سەربازییەکانی بەریتانیا و یەکێتیی سۆڤیەت ئێرانیان داگیرکرد. دەرفەتێکی سیاسیی لەبار بۆ کورد هاتەپێشەوە هەتا لەژێر سێبەری دەسەڵاتی یەکێتیی سۆڤیەتدا، قوناغێکیی تر حیزبایەتیی بەرەوپێشەوە ببات.

## ١- حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران (حدکا):

ئەم حیزبە لە سەردەمی جەنگی دووەمی جیهانییدا لە شاری مەهابادی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، لە ژێر کاریگەریی پێگەی یەکێتیی سۆڤیەت و ئاواکردن (دروستکردن)ی کۆماری مەهاباتدا ساڵی ١٩٤٦ دامەزرا. لە سەرەتای دامەزراندنیدا بەهێزترین حیزبی کوردیی بوو. دوای ڕوخانی کۆماری کوردستان (حدکا) بڵاوەیلێکرد و چالاکییەکی ئەوتۆی نەما. هەر کاتێک قەیران و گێژاوی سیاسیی ڕووی لە ئێران کردبێت، حدکا گەشاوەتەوە و چالاکیی سیاسیی دەستپێکردووەتەوە، کاتێکیش ڕەوشی سیاسیی ئێران بەرەو باشیی و جێگیربوون چووبێت، چالاکییەکانی حدکا خامۆشبوونەتەوە.

ساڵی ١٩٧٩ شۆڕشی گەلانی ئێران دژی ڕژێمی شاهنشاهیی دەستپێکرد، حدکا هاتەوە مەیدان، خۆی ڕێکخستەوە و دەستی بە کار و چالاکیی سیاسیی کردەوە.

دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامیی ئێران، حدکا لە دژی ڕژێمی کۆماری ئیسلامیی ئێران خەباتی چەکداریی دەستپێکردەوە. لەگەڵ بەهێزبوونەوەی دەسەڵاتی کۆماری ئیسلامیی ئێران، خەباتی حدکا لاوازبووەوە.

له دوای ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ەوە هەتا ئێستا، بنکە و بارەگاکانی حدکا و حیزبەکانی تری ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە هەرێمی کوردستان جێگیربوون، لە ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ بە دواوە، هەندێک چالاکیی سیاسیی سنووردارنەبێت، حدکا کارێکی سیاسیی ئەوتۆی بۆ بەڕێوەنەچووە، ساڵی ٢٠٠٧ لە ڕیزەکانی حدکادا جیابوونەوە ڕوویدا و هێندەی تر حدکا لاوازبوو.

## ٢- پارتیی دیموکراتی کوردستان-عێراق (پارتیی)

پارتیی دیموکراتی کوردستانی عێراق (پارتیی) ساڵی ١٩٤٦ دامەزرا، هەتا ڕوخانی ڕژێمی پاشایەتیی عێراق و سەرکەوتنی شۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ چالاکییەکی ئەوتۆی نەبوو. دوای شۆڕشی چواردەی تەمووز دەرفەت بە چالاکیی حیزبە سیاسییەکانی عێراق درا. پارتیی یەکێک لەو حیزبانە بوو کە سودی لە بڕیاری ئازادیی بیروڕای سیاسیی حکومەتی عەبدولکەریم قاسم وەرگرت، لە شارەکانی باشووری کوردستان و لە بەغدای پایتەخت نوسینگەی کردەوە. لە ناو کورددا دەستی بە چالاکیی سیاسیی و ڕێکخستن کرد. دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ١٤ی تەمووز، مەلا مستەفا بەرزانیی لە یەکێتیی سۆڤیەت گەڕایەوە و بە سەرۆکی پارتیی دیاریکرا.

ساڵی ١٩٦١ لە ئەنجامی ئەو کێشانەی کە لە نێوان سەرکردایەتیی ئەو کاتەی پارتیی و حکومەتی عەبدولکەریم قاسمدا دەرکەوتن، پارتیی پەنای بۆ خەباتی چەکداریی برد و شۆڕشی ئەیلولی هەڵگیرساند. دوای ٣ سێ ساڵ لە خەباتی چەکداریی، ساڵی ١٩٦٤ پارتیی دوچاری جیابوونەوە بوو، زۆربەی خەڵکانی ڕۆشنبیر و سیاسیی ناو سەرکردایەتیی پارتیی کە ئیراهیم ئەحمەد سەرکردایەتیی دەکردن، بە سیاسەتی بارزانیی ڕازینەبوون، خۆیان وەکو باڵی مەکتەبی سیاسیی پارتیی لە سەرکردایەتیی بارزانیی جیاکردەوە. زۆرینەی سەرۆک_خێڵەکانی کوردستان و جەماوەری گوندەکانی باشووری کوردستانیش، پشتیوانییان لە بارزانیی دەکرد.

لە حوزەیرانی ١٩٦٦دا باڵی مەکتەبی سیاسیی پەیوەندییان بە حکومەتی عێراقەوە کرد، بە هاوکاریی حکومەتی عێراق هێزی چەکدارییان پێکهێنا، دژی هێزی پێشمەرگەی باڵی بەرزانیی، خولی یەکەمی شەڕی براکوژییان دەستپێکرد.

سالّی ١٩٧٠ بالّی بەرزانیی و حکومەتی عێراق ڕێککەوتن، بە ڕێککەوتنی ١١ی ئازار ناسرا. حکومەتی عێراق پشتی لە بالّی مەکتەبی سیاسیی کرد، بەشێکی زۆری بالّی مەکتەبی سیاسیی گەڕانەوە بۆ ناو ڕیزەکانی پارتیی.

بەهۆی ناکۆکیی نێوان حکومەتی عێراق و سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلولەوە، بەیانی ١١ی ئازار جێبەجێنەکرا. لە بەهاری ١٩٧٤دا شەڕ لە نێوان شۆڕشی ئەیلول و حکومەتی عێراقدا دەستیپێکردەوە. لە ئازاری ١٩٧٥ شۆڕشی ئەیلول شکستیهێنا، سەرکردایەتیی پارتیی و شۆڕشی ئەیلول پێکەوە کۆلّیان لە خەبات دا. دوای سالّێک سەرکردایەتیی کاتیی پارتیی خۆی ڕاگەیاند و دەستی بە خەباتی چەکداریی کردەوە.

لە سالّی ١٩٧٧ بە دواوە، پارتیی و یەکێتیی دوو هێزی سیاسیی و چەکداریی باشووری کوردستانن، نەیانتوانی ناکۆکییەکانی نێوانیان چارەسەربکەن بەو هۆیەوە خولی دووەمی شەڕی براکوژیی لە نێوانیاندا دروستبوو. هەزاران پێشمەرگەی شۆڕشگێڕ بە ئاگری ئەو شەڕە نارەواییەوە سوتان.

سالّی ١٩٨٦ ڕەفسنجانی سەرۆک_کۆماری ئەو کاتەی ئێران، پارتیی و یەکێتیی ئاشتکردنەوە.

سالّی ١٩٨٨ لە ئاوارەییدا لە ئێران، پارتیی و یەکێتیی حیزبەکانی تری کوردستان بەرەی کوردستانیان دامەزراند، هەتا ماوەیەک ئاشتەوایی لە نێوان پارتیی و حیزبەکانی تردا سەقامگیرکرا.

لە دوای ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ پارتیی و یەکێتیی و حیزبە سیاسییەکانی تر، بەشداریی هەلّبژاردنی پەرلەمانی بەهاری ١٩٩٢یان کرد. لە هەلّبژاردنەکەدا تەنها پارتیی و یەکێتیی دەرچوون، دوای هەلّبژاردن کابینەی یەکەمی حکومەتی هەرێمیان پێکهێنا. لەبەرئەوەی ڕێژەی دەنگەکانیان لە یەکەوە نزیکبوو، حکومڕانیی ئەو سەردەمە ناونرابوو ففتی بە ففتی ( پەنجا بە پەنجا).

لە سالّی ١٩٩٤دا نێوان پارتیی و یەکێتیی تێکچوو، خولی سێیەمی شەڕی براکوژیی لێکەوتەوە، بەهۆی ئەو شەڕەوە، بەشە ڕزگارکراوەکەی باشووری کوردستان لە نێوان پارتیی و یەکێتییدا دابەشکرا، دوو_ئیدارەیی حکومەتی هەرێمی کوردستانی لێکەوتەوە.

ساڵی ١٩٩٨ وەزیری دەرەوەی ئەمریکا مادلین ئۆڵبرایت، مەسعود بەرزانیی و جەلال تاڵەبانیی بانگهێشتی ئەمریکا کرد و ئاشتیکردنەوە. کۆتاییان بەو خولەی شەڕی براکوژیی هێنا.

**لە سەرەتای شەستەکانی سەدەی بیستەوە، بەرزانییەکان دەستیان بەسەر پارتییدا گرتووە.**

**تایبەتمەندییەکانی پارتیی:**

١- حیزبی پاراستنی بەرژەوەندیی و دەسەلاتی بنەماڵەی بەرزانییە، بەرژەوەندییەکانی بنەماڵە و حیزب لە سەرووی بەرژەوەندیی گەلی کوردەوە دادەنێت.

٢- لە چاو حیزبەکانی تری باشووری کوردستان حیزبێکی بە دسپلین و خاوەن_ پێوانەی ڕێکخستنە.

٣- پەیوەندییە نێودەوڵەتیی و ناوچەییەکان لە سەرووی پەیوەندییە ناوخۆییەکانی کوردستانەوە دادەنێت.

٤- لەسەر حسابی ماف و ئازادیی گەلی کوردی پارچەکانی تری کوردستان، بەبێ سڵەمینەوە دۆستایەتیی و هاوپەیمانیی لەگەڵ داگیرکەرانی کوردستاندا دەکات.

٥- هەوڵی بێوچانی هەیە هەموو حیزبەکانی تری کوردستان وەکو خۆی بکات بە حیزبی بنەماڵە، وەکو خۆی هاوکاریی داگیرکەرانی کوردستان بکەن و دوژمنایەتیی پارچەکانی تری کوردستان بکەن.

٦- پارتیی کۆنترین حیزبی باشووری کوردستانە، دوو جار جیابوونەوە تێیدا ڕوویداوە. ساڵی ١٩٦٤ باڵی مەکتەبی سیاسیی لێجیابوەوە، ساڵی ١٩٧٩ پارتی گەلی لێجیابووەوە. لە سەرەتای هەشتاکانی سەدەی بیستەوە مەسعود بەرزانیی سەرۆکی پارتییە، لەو کاتەوە پارتیی نەک هەر ڕووبەڕووی جیابوونەوە نەبووەتەوە، لە حیزبەکانی ترەوە گرورپ و تاک پەیوەندیی بە پارتییەوە دەکەن.

## ٣- حیزبی شیوعیی عێراق و حیزبی شیوعیی کوردستان:

حیزبی شیوعیی عێراقی ساڵی ١٩٣٤ دامەزرا. لە ناو ڕۆشنبیران و هەژارانی

کوردستاندا پێگەیەکی جەماوەریی پەیداکرد. چەندیین سەرکردە و کادری ناسراوی حیزبی شیوعیی عێراق خەڵکی باشووری کوردستانن، حیزبی شیوعیی کاریگەریی ئایدۆلۆژیی و کەلتوریی لەسەر سیاسەتمەدارانی تری کوردستان هەیە. هەتا ئەو کاتەی حیزبی شیوعیی عێراقیی بەهێز بوو، لەگەڵ پارتییدا بەردەوام لە ململانێدا بوو. پارتیی نوێنەرایەتیی هێڵی ڕاستڕەوی سیاسیی کوردستانی دەکرد. بەشی کوردستانی حیزبی شیوعیی عێراق، نوێنەرایەتیی هێڵی چەپڕەوی سیاسیی کوردستانی دەکرد. حیزبی شیوعیی کاریگەریی لەسەر کێشەی کورد و سیستەمی حوکمڕانیی عێراق هەیە:

١- ژمارەیەکی باش لە ڕۆشنبیرانی کورد لە ڕێگەی ئەدەبیاتی مارکسیزم-لینینیزمەوە کە حیزبی شیوعیی بڵاویدەکردەوە، فێری سیاسەت بوون، سیاسەتمەداری پێشکەتوخوازیان لێدەرچوو.

٢- حیزبی شیوعیی عێراقیی ئەندام و کادرەکانی فێری بیرکردنەوە و سیاسەت دەکرد، حیزبە کوردییەکان بە تایبەت (پارتیی) پاش لاوازبوونی حیزبی شیوعیی زۆر سودی لەو کادرە ئامادەکراوانەی ناو حیزبی شیوعیی وەردەگرت. لە ڕیزەکانی پارتییدا جێگەی دەکردنەوە و پلە و پۆستی بەسەردا دابەشدەکردن.

٣- لەبەرئەوەی حیزبی شیوعیی عێراق بە بەشی کوردستانیشەوە، حیزبێکی چینایەتیی بوو. ئامانجی سەرەکیی ڕزگارکردنی کرێکار و زەحمەتکێش بوو. گرنگیی بە هۆشیاریی نەتەوەیی نەدەدا، بۆ ماوەیەک هۆشیاریی نەتەوەیی لە ناو گەلی کورددا لاوازکرد.

٤- زۆربەی کەسایەتیی و لایەنە دیموکراتەکانی عێراق کە هەڵوێستی دیموکراتییان بەرانبەر بە کێشەی کورد هەیە، لەو کەس و لایەنانەن کە ڕۆژانێک لەگەڵ حیزبی شیوعییدا کاریانکردووە.

ساڵی ١٩٩٣ شیوعییەکانی هەرێمی کوردستان، وەکو حیزبی شیوعیی کوردستان خۆیان ڕاگەیاند و لە حیزبی شیوعیی عێراق جیابوونەوە، ئەگەرچی هەڵوێستەکانی حیزبی شیوعیی عێراق و حیزبی شیوعیی کوردستان هاوسەنگ و نیشتیمانیین، بەڵام لەبەر پاشەکشەی حیزبە شیوعییەکانی جیهان و ناوچەکە، ئەمانیش دوچاری پاشەکشە هاتن. کاریگەریی ئەوتۆیان لەسەر سیاسەتی هەرێمی کوردستان و عێراق دەرناکەوێت.

## ٥- یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان (یەکێتیی)

پاش شکستی شۆڕشی ئەیلول لە ٦/ ٣/ ١٩٧٥دا، جەلالییەکان باشترین دەرفەتیان بۆ ڕەخسا هەتا تۆڵەی خۆیان لە مەلا مستەفا و دەوروبەرەکەی بکەنەوە و شکستەکەیان بە سەرکەوتن وەربگێڕنەوە. هەر لەبەرئەوە پاش تێپەڕبوونی سێ مانگ بەسەر ڕێککەوتنی جەزائیر و شکستی شۆڕشی ئەیلول، پاش ئەوەی کە تاڵەبانیی بینی بۆشاییەکی سیاسیی لە باشووری کوردستاندا دروستبووە، ڕەشبینیی بەرچاوی خەڵکی کوردستانی گرتووە، لە دەرەوەی کوردستان و لە وڵاتی شام ڕۆژی ١/ ٦/ ١٩٧٥ لەگەڵ دکتۆر فوئاد مەعسوم، دکتۆر کەمال فوئاد، نەوشیروان مستەفا، عادل موراد و عەبدولرەزاق فەیلیی و عومەر شێخ موس، دامەزراندنی یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستانیان ڕاگەیاند. یەکێتیی لە ڕێکخراوی کۆمەڵە و بزوتنەوەی سۆسیالیست و خەتی گشتیی پێکهاتبوو. داینەمۆی ڕێکخستن و چالاکییەکانی یەکێتیی کۆمەڵە بوو. دوای تێپەڕبوونی ساڵێک بەسەر دامەزراندنی یەکێتییدا، هێزی پێشمەرگەی پێکهێنا و جاڕی دەستپێکردنەوەی شۆڕشی نوێدا.

ساڵی ١٩٧٦ یەکێتیی خەباتی چەکداریی دژی حکومەتی عێراق دەستپێکرد. باری گلاوی گەلی کوردی هەستانەوە. پێگەی جەلالییەکانی لە ناو گەلی کورددا بەهێزکردەوە، تۆڵەی خۆیان لە ڕژێمی بەعسی هاوپەیمانی بێوەفای جاران و مەلا مستەفای بەرزانیی کردەوە.

ئەم بڕیار و کردەوە خێرایانەی یەکێتیی، گەلی کوردی سەرسام و دڵخۆش کرد. گەل بە جۆشوخرۆشەوە پێشوازیی لە دامەزراندنی یەکێتیی و لە دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکداریی کرد. خەڵک لە سیاسەتە هەڵەکانی ساڵانی ١٩٦٦ - ١٩٧٠ جەلالییەکان خۆشبوو و باوەشی بۆ کردنەوە. لە ساڵی ١٩٧٦ هەتا ڕاپەڕیین، لە ڕووی خەباتی چەکداریی و خەباتی جەماوەرییەوە، یەکێتیی حیزبی یەکەمی باشووری کوردستان بوو. دوای ڕاپەڕیین لە ساڵی ١٩٩٢ پەرلەمانی هەرێمی کوردستان هەڵبژێردرا و حکومەتی هەرێم پێکهێنرا، یەکێتیی دەستی بە پاشەکشە کرد.

لە ڕووی ئایدۆلۆژیاوە، سەرەتا یەکێتیی حیزبێکی چەپ و مارکسیی بوو. ئێستا حیزبێکی سۆسیاڵ-دیموکراتە، ئەندامی حیزبە سۆسیاڵ_دیموکراتەکانی جیهانە. لە ڕووی ڕێکخستنەوە دسپلینی لاوازە. خاڵی بەهێزی یەکێتیی مام جەلال و نەوشیروان

مستەفا بوو. مام جەلال پیاوێکی تەکتیکزان بوو، لەپێناو هێشتنەوە و گەشەپێدانی حیزبەکەیدا، مام جەلال جۆرەها تەکتیکی دەکرد.

مام جەلال دەیتوانی دوژمنی هاوبەش لەگەڵ دۆستەکانیدا دروستبکات، لەبەرئەوەی مام جەلال ڕابردووی چەپ بوو، ئێران و ئەمریکا حەزیان بە دۆستایەتیی یەکێتیی نەدەکرد، بەڵام لەبەرئەوەی مام جەلال توانی خەباتی ڕۆژهەڵاتی کوردستان سستبکات، خۆی لە ئێران نزیککردەوە، دەمێکە یەکێتیی دۆستێکی نزیکی ئێرانە، یەکێک لە بەرپرسانی ئێران گوتی:

یەکێتیی درەنگ بەدەممانەوە هات، بەڵام کە بەدەممانەوە هات باش هات. واتە لە نزیکبوونەوە لە ئێران، پێش حیزبەکانی تر کەوت.

ساڵی ٢٠٠٠ مام جەلال جوندیی ئیسلامیی بۆ ناوچەی هەورامان ڕاکێشا و گەورەیکردن. پەیوەندیی ئەو ڕێکخراوەی لەگەڵ ڕێکخراوی قاعدە بۆ ئەمریکییەکان ئاشکراکرد، بە ئەمریکای ڕاگەیاند جوندولئیسلام دوژمنی یەکێتییە. پەیوەندیی بە قاعدەوە هەیە، قاعدەیش دوژمنی ئەمریکایە. کەوابوو جوندولئیسلام دوژمنی هاوبەشی ئەمریکا و یەکێتییە. بەو شێوەیە ئەمریکییەکان چاویان لە ڕابردووە چەپ و مارکسییەکەی مام جەلال پۆشی و دۆستایەتییان لەگەڵ یەکێتییدا دروستکرد.

مام جەلال زۆر هەوڵیدا سەرکردایەتیی (پ. ک. ک) دەستەمۆبکات، بیانخاتە ژێردەستی خۆیەوە و لەگەڵ تورکیا ڕێککەوتنیان لەسەر بکات، بۆ ئەوەی دۆستایەتیی خۆی لەگەڵ تورکیایش پێشبخات و بەرانبەر پارتیی بەکاریبهێنێت، بەڵام لەم لایەنەوە سەرکەوتنی بەدەستنەهێنا. (پ. ک. ک) دەستەمۆنەکرا.

یەکێتیی کە دامەزرا، وەکو هێزێکی سیاسیی چەپی سەربەخۆ دژی بنەماڵەچێتیی خۆی ڕاگەیاند، بەڵام بە تێپەڕبوونی کات، ڕەنگ و بۆنی پارتیی وەردەگرێت. لە دوای کۆچی دوایی مام جەلالەوە، بە تایبەت لە کۆنگرەی چواردا (٢٠١٩) بنەماڵەی مام جەلال پێشمەرگە کۆنەکانیان لە پۆست و پێگە دەرکرد. کوڕ و برازا و پور و خاڵۆزا و خزمەکانی تری مام جەلال، دەستیان بەسەر یەکێتییدا گرت. لە ٨/ ٧/ ٢٠٢١ بە دواوە، منداڵەکانی مام جەلال برازاکانی مام جەلالیان لە سەرکردایەتیی حیزب دورخستەوە. ئێستا کوڕەکانی مام جەلال بە تەواویی دەستیان بەسەر یەکێتییدا گرتووە.

چاودێرانی سیاسیی پێیانوایە یەکێتیی ئامادەیی تێدایە، لە سیاسەتی ناوخۆیی و عێراقیی و ناوچەییدا لاسایی پارتیی بکاتەوە.

لە ژیانی ڕێکخراوەییدا یەکێتیی دوچاری سێ جیابوونەوەی گەورە و چەندین جیابوونەوەی بچووک هاتووە. ساڵی ١٩٧٩ بزوتنەوەی سۆسیالیستی لێجیابووەتەوە. حیزبی سۆسیالیستی کوردستان (حسک)ی لێدروستبوو. ساڵی ١٩٨٥ ئاڵای شۆڕشی لێجیابووەتەوە. ساڵی ٢٠٠٩بزوتنەوی گۆڕانی لێجیابووەوە.

## ٦- پارتی کرێکارانی کوردستان (پ. ک. ک)

گەلی باکووری کوردستان لەگەڵ گەلی تورکیای دەسەڵاتداری چوار سەدەی دوایی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەژی، هەژموونی کەلتوریی تورکیای لەسەرە. لە دوای ڕوخانی دەوڵەتی عوسمانیی و ئاوابوون (دروستبوون)ی کۆماری تورکیای ئەتاتورکیی، گەلی باکووری کوردستان زیاتر لە پارچەکانی تری کوردستان سیاسەتی نکوڵییکردن و تواندنەوەی بەسەردا سەپێنرا. لەو زەمینەیەدا بیرمەندێکی وەکو عەبدوڵڵا ئۆج ئالان دەردەکەوێت و پارتی کرێکارانی کوردستان (پ. ک. ک) دادەمەزرێنێت، بەڵام لە ئایدۆلۆژیا و ستراتیژ و ڕێکخستن و تەکتیکدا، لە پەیوەندیی دیبلۆماسیی و چالاکیی ئابوریی و ناسنامەی کۆمەڵایەتییدا، لە حیزبە سیاسییەکانی تری باکوور و باشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان جیاوازتر دەبێت.

پارتی کرێکارانی کوردستان ساڵی ١٩٧٨ دامەزراوە، لە سەرەتادا خەباتی ئایدۆلۆژیی و ڕێکخستن و سیاسیی بەڕێوەدەبات. ساڵی ١٩٨٤ دەستی بە خەباتی چەکداریی دەکات. لە ساڵی ١٩٩٣وە ئامادەیە لەگەڵ حکومەتی تورکیا گفتوگۆبکات و کێشەی کورد بە ئاشتیی چارەسەربکات.

ساڵی ١٩٩٩ عەبدوڵڵا ئۆج ئالانی سەرۆکی (پ. ک. ک) بە پیلانگێڕییەکی نێودەوڵەتی لە کینیا دەستگیرکرا و ڕادەستی تورکیا کرایەوە. لەو کاتەوە لە زیندانی تاکەکەسیی ئیمرالییدا سزای زیندانیی هەتاهەتایی بەرسەدا سەپێنراوە، بەڵام ئۆج ئالان لە زیندانەوە لە ڕێگەی کتێب و نامەکانیەوە، لە تێکۆشانی سیاسیی و ئایدۆلۆژیی خۆی بەردەوامە.

(پ. ک. ک) له سەرتاسەری کوردستاندا جەماوەر و ئەندام و بەرپرسی هەیە، له ناو گەلانی تری جیهانیشدا جێگەی خۆی کردووەتەوە. چەندیین سەرکردەی تورکی خستووەتە ناو ڕیزەکانی خۆیەوە. ڕۆڵێکی سیاسیی بە ژنان داوە، چەندیین کچ لە سەرکردایەتیی ئەو حیزبەدا جێگەیانگرتووە. (پ. ک. ک) خاوەنی سیستەمێکی نوێی بەڕێوەبردن و پێشخستنی کۆمەڵگەیە، گرنگترین سیماکانی سیستەمی بەڕێوەبردنی (پ. ک. ک) هاوسەرۆکی نێوان ژن و پیاوە. (پ. ک. ک) زۆر گرنگیی بە پەروەردە دەدات، بە پەروەردە دەسەڵاتپەرستیی و پارەپەرستیی لە ناخی کادرەکانیدا کوشتووە.

پارتی یەکێتیی دیموکراتی (pyd) لە سیاسەت و بەڕێوەبردن و بواری سەربازییدا، پشت بە سیستەمی (پ. ک. ک) دەبەستێت، لە ڕاپەڕیینی بەهاری عەرەبیی و ڕاپەڕیینی گەلانی سوریادا (pyd) ڕۆڵی کاریگەری بینی. نزیکەی دە ساڵە ئەو سیستەمە لە سەرپێیە و گەشەدەکات، سەرنجی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیی بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت. ئەو سیستەمە داعشی لە سوریا تێکشکاند، ئازادیی ژن و پێکهاتە نەتەوەیی و ئاینیی و کەلتورییەکانی سوریا مسۆگەردەکا.

ئەزموونی ڕۆژئاوای کوردستان سەلماندی کە سیستەمی (پ. ک. ک) بۆ ئەم سەردەمەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست سودی هەیە، دەتوانێت کێشە هزریی و کۆمەڵایەتیی و سیاسییەکانی ناوچەکە چارەسەربکات.

(پ. ک. ک) خاوەنی ئایدیولۆژیایەکی تایبەت بە خۆیەتی کە کوردێک دایهێناوە، حیزبەکانی تری کوردستان لەسەر ئایدۆلۆژیای ئامادەکراوی بیرمەندانی بێگانە حیزبیان دروستکردووە. (پ. ک. ک) جولانەوەیەکی کوردستانیی سەرتاسەرییە، چالاکییەکانی هەموو پارچەکانی کوردستان دەگرێتەوە، حیزبەکانی تری کوردستان پارتی پارچەیەکی کوردستانن. (پ. ک. ک) بە عەقلیەتی پیاوسالاریی سیاسەت ناکات، تەنها جولانەوەی سیاسیی پیاوان نییە، ژنیش تێیدا پێگە و دەسەڵات و هەژموونی هەیە، حیزبەکانی تری کوردستان بە هزری پیاوسالاریی کاردەکەن و ژن پەراوێزدەخەن. (پ. ک. ک) لە ڕووی ئابورییەوە سەربەخۆیە و سیستەمی ئابوریی تایبەت بە خۆی هەیە، حیزبەکانی تری کوردستان لە ڕووی ئابورییەوە سەربەخۆ نین. (پ. ک. ک) زیاتر لە حیزبە سیاسییەکانی تری کوردستان گرنگیی بە پەروەردە و دروستکردنی تاک و کۆمەڵگەی تایبەت بە خۆی دەدات. حیزبەکانی تری کوردستان لەسەر ئەو تاک

و پێکهاتە کۆمەڵایەتییانە دەژین، کە ئێستا لە کوردستاندا هەن و زۆربەیان سیستەمی سیاسیی و هزری داگیرکەران ئامادەیکردوون. لەبەرئەوە لەو ڕۆژەوە (پ. ک. ک) دامەزراوە هەتا ئەمڕۆ، ململانێ لە نێوان (پ. ک. ک) لە لایەک و هەموو حیزبەکانی تری کوردستان لە لایەکی ترەوە دروستبووە و ئەو ململانێیە بەردەوامە.

## پەکەکە لە باشووری کوردستاندا

لە دوای ڕاپەڕینی ١٩٩١ لەژێر هەژموونی سیاسیی (پ. ک. ک) و هزری عەبدوڵڵا ئۆجەلاندا، چەندین ڕێکخراوی سیاسیی لە باشووری کوردستاندا دامـەزراون. دەتوانین تایبەتمەندیی ئەو ڕێکخراوانە بەم شێوەیە داڕێژین:

١- ئەو حیزبانەی دادەمەزرێن، تەمەنیان کورتە، زوو هەڵدەوەشێنرێنەوە و دوای ماوەیەک حیزبێکی تر لە شوێنیان دادەمەزرێت.

٢- ئەو حیزبانە لە ڕووی سیاسیی و هزرییەوە ڕێبازی (پ. ک. ک) پەیڕەودەکەن، بڕیاری دامەزراندن و هەڵوەشانەوەیان لە سەرکردایەتیی (پ. ک. ک)وە دەردەچێت.

٣- خەڵکی باشووری کوردستان بە ئامانجی جێگرەوە (بەدیل)ی پارتیی و یەکێتیی پەیوەندیی بەم حیزبانەوە دەکەن، بەڵام لە لای (پ. ک. ک) ئامانجی ئەو حیزبانە ئەوە نییە لە هەرێمی کوردستاندا دەسەڵات وەربگرن، ئامانجیان ئەوەیە باشووری کوردستان وەکو گۆڕەپانێکی چالاک بۆ پشتیوانیی بزاڤی ئازادییخوازی گەلی کوردی پارچەکانی تری کوردستان بەکاربهێنن.

٤- هەموو ئـەو حیزبانە لە لایـەن حیزبەکانی باشوور و حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە وەکو حیزبێکی نایاسایی دەناسرێن، وەکو لقی (پ. ک. ک) دادەنرێن، مۆڵەتی فەرمییان نادەن، ڕێگەی کار و چالاکیی یاسایی و سیاسییان پێنادەن.

٥- حکومەتی هەرێمی کوردستان (پارتیی و یەکێتیی) مۆڵەت بە هەموو حیزبێک دەدەن، تەنها مۆڵەت بەو حیزبانە نادەن کە لە (پ. ک. ک) و هزری ئاپۆوە نزیکن، ئەم هەڵوێستەی پارتیی و یەکێتیی و حیزبەکانی تری باشوور، سیاسەتی نادیموکراتیی و نانەتەوەیی سیستەمی باشوور پیشاندەدات. ئەو حیزبانە لە شارەکانی ژێر دەسەڵاتی حکومەتی عێراق وەکو کەرکوک، موسڵ و بەغدا بە ئازادیی کاردەکەن و لە هەرێمی کوردستاندا قەدەخەدەکرێن.

ساڵی ١٩٩٢ پارتی ئازادیی کوردستان (پاک) دامەزرا، بەڵام پاش ئەوەی کێشە لە نێوان (پ. ک. ک) و پارتیی و یەکێتییدا دروستبوو، (پاک) هەڵوەشایەوە.

ساڵی ١٩٩٥یەکێتیی نەتەوەیی دیموکراتی کوردستان (ی. ن. د. ک) دامەزرا. پاش ماوەیەک ئەو ڕێکخراوە بوو بە سێ بەشەوە، بەشێکی لە هەولێر لە نزیک پارتییەوە خۆی ڕێکخستەوە، بەشێکی لە سلێمانیی لە نزیک یەکێتییەوە خۆی کۆکردەوە، ئەوەی مایەوە پەیوەندیی بە (پ. ک. ک) کردەوە. لە یادی ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١دا، ساڵی ٢٠٠٢بە نهێنیی و دوور لە چاودێریی پارتیی و یەکێتیی، پارتی چارەسەری دیموکراتی کوردستان (پچدک) لە ئەشکەوتێکی دۆڵی ڕەزگە(دۆڵی شەهید هارون) ی چیاکانی قەندیل دامـەزرا. (پ. چ. د. ک) ماوەی دوازدە ساڵ بەبێ جیابوونەوە خەباتیکرد، شەش کۆنگرەی بەست، لەژێر دەسەڵاتی حکومەتی عێراقدا حیزبێکی فەرمیی دانپێنراو بوو، لە هەرێمی کوردستاندا حیزبێکی نایاسایی بوو، حکومەتی هەرێم مۆڵەتی کارکردنی پێنەدا.لە ساڵی ٢٠٠٤ بە دواوە (پ. چ. د. ک) زۆرترین چالاکیی مەدەنیی و مانگرتن و ڕێپێوانی ئەنجامدەدا. هیچ لایەنێکی تری سیاسیی باشووری کوردستان، بەرپرس و کادرەکانی وەکو (پ. چ. د. ک) لە لایەن هێزەکانی ئاسایشی حکومەتی هەرێمەوە زیندانیی نەدەکران و مافیان پێشێلنەدەکرا. چەندیین جار نوسینگە و نوێنەرایەتییەکانی (پ. ج. د. ک) لە شارەکانی هەولێر و دهۆک و بەغدا و سلێمانیی و مەخمور دەستیبەسەرداگیرا.

دوای (پ. چ. د. ک) لەسەر هێڵی سیاسیی (پ. ک. ک) لە باشوور، تەڤگەری ئازادیی کۆمەڵگەی کوردستان دامەزرا. (پ. چ. د. ک) بە ئەندام و ڕێکخستنەکانیەوە، بەشداریی لە دامەزراندن و کار و چالاکیی تەڤگەردا کرد. بەو شێوەیە لە ساڵی ٢٠١٥ تەڤگەر وەکو ڕێکخراوێکی سیاسیی سەر بە هێڵی سیاسیی (پ. ک. ک) خەباتی نەتەوەیی و دیموکراتیی دەستپێکردووە، بەڵام حکومەتی هەرێم مۆڵەتی کاری بە تەڤگەریش نەداوە.

## ٧– حیزبە ئیسلامییەکانی کوردستان

لە جەنگی یەکەمی جیهانییدا دەوڵەتی عوسمانیی ڕوخا. ئەوروپا هێرشی سەربازیی و سیاسیی و کەلتوریی بۆ سەر ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و جیهانی ئیسلامیی دەستپێکرد.

بۆ وەڵامدانەوەی هێرشی هەمەلایەنەی ئەوروپا و سکۆلارەکان، لە بیستەکانی سەدەی بیستدا لە میسر، بزوتنەوەی برایانی مسوڵمانی ئیسلامیی دامەزرا. ئەم بزوتنەوەیە بە سەرتاسەری وڵاتانی ئیسلامییدا بڵاوبووەوە، بەڵام زۆر گەشەینەکرد.

لە ململانێ و شەڕەکانی نێوان عەرەب و ئیسرائیلدا، دەوڵەتە سکۆلار و نەتەوەییەکانی عەرەب دوچاری شکست هاتن. بەرانبەر بە ئیسرائیل هیچیان پێنەکرا. بیرمەند و سیاسەتمەدارانی عەرەب بیریان لەوە کردەوە چەکی ڕووبەڕووبوونەوەی خۆیان بەرانبەر ڕۆژئاوا و ئیسرائیل بگۆڕن و فراوانیبکەن، گەلانی تریش لە دژی ئیسرائیل و هاوپەیمانەکانی هانبدەن.

کە بینییان ئیسرائیل لە ئاستی نێونەتەوەییدا سودی لە دۆست و هاوپەیمانیی وەرگرتووە. عەرەبیش بە بیریدا هات لە ئاستی ناوچەیی و نێونەتەوەییدا هاوپەیمان بۆ خۆیان بدۆزنەوە، بۆ ئەوەی لە جاران باشتر شەڕی ئیسرائیل بکات.

هەربۆیە عەرەبەکان پەنایان بۆ ئاینی ئیسلام و ئەزموونی برایانی مسوڵمانی میسر بردەوە، دەستیان بە دامەزراندنی حیزب و ڕێکخراوی سیاسیی ئیسلامیی کرد. ئەم بۆچوونەیان بە ناو گەلانی مسوڵمانی جیهاندا بڵاودەکردەوە. لە ڕێگەی ئاینی ئیسلام و حیزبی ئیسلامییەوە، خۆیان بە گەلان و وڵاتانی مسوڵمانەوە گرێدەدا. تەوژمی ئەو پرۆژە سیاسییە لە پەنجاکانی سەدەی بیستدا بە عێراق و هەرێمی کوردستانیش دەگات.

بەڵام بیرمەندانی عەرەبی مسوڵمان نەیانتوانی ڕیفۆرمی ئاینیی بکەن. نەیانتوانی ئەو کەلتورە دەوڵەمەندەی ئیسلام بۆی بەجێهێشتبوون لەگەڵ پێشکەوتنەکانی سەردەم تێکەڵیبکەن و ئایدۆلۆژیایەکی هاوچەرخی پێدروستبکەن، ڕێکخستنی سیاسیی پێدروستبکەن و بەو ڕێکخستنە سیاسەت بکەن، بۆ بنەما سەرەتاییەکانی ئاینی ئیسلام گەڕانەوە. لێکدانەوەیەکی توندڕەوانەیان بۆ ئاینی ئیسلام کرد. ئیسلامیان دژی جوو و مەسیحیی بەگەڕخست. ململانێ نەتەوەییەکەی عەرەب ئیسرائیلیان بۆ ململانێیەکی توندڕەوی ئاینیی گۆڕی.

سیستەمی سەرمایەداریی ڕۆژئاوایش، دژی دروستبوون و گەشەکردنی حیزبی ئیسلامی سیاسیی نەبوو، دەیویست حیزب و جوڵانەوە ئاینییەکان دژی پێگە و هەژموونی یەکێتیی سۆڤیەت و کۆمۆنیزم بەکاربهێنێت.

لە کۆتایی هەشتاکانی سەدەی بیستدا موجاهیدە ئیسلامییەکان حکومەتە کۆمۆنیستەکەی ئەفغانستانیان ڕوخاند، حکومەتێکی ئیسلامییان لە ئەفغانستان دامەزراند. ئەمە ورەی ئیسلامییەکانی بەرزکردەوە.

ساڵی ١٩٩١ کاتێک سوپای عێراق کوێتی داگیرکرد، سەدام هەڕەشەی داگیرکردنی سعودیەیشی دەکرد. ئوسامە بنلادن کە ڕۆڵێکی گرنگی لە شکستپێهێنانی حکومەتە کۆمۆنیستەکەی ئەفغانستاندا هەبوو، داوای لە دەوڵەتی سعودیە کرد ڕێگەیبدەن دژی سەدام شەڕبکات و بە دەردی حکومەتی ئەفغانستانی بەرێت. سعودیە نەک هەر بۆچوونەکەی بنلادنی پشتگوێخست، دەرگای بۆ سوپای ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی کردەوە هەتا سوپای عێیراق لە کوێت دەربکەن و سعودیەیش بپارێزن. شەڕی سەدام و هاوپەیمانان وایکرد، کە ئەمریکا کۆنترۆڵی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بکات، ئیسلامی سیاسیی دژی ئەو کۆنترۆڵ و هەژموونەی ئەمریکا وەستایەوە. ڕێکخراوی قاعیدە خۆی چالاککردەوە و دەستی بە دژایەتییکردنی ئەمریکا کرد *٤.

دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام، نەتەوەپەرستیی عەرەب لە چوارچێوەی ڕێکخراوی ئیسلامیی داعشدا (دەوڵەتی ئیسلامیی لە عێراق و شام) سەریهەڵدا.

ڕابوونی ئیسلامیی و جوڵانەوی ئیسلامی سیاسیی، گەلی کوردی مسوڵمانیشی گرتەوە. چەندیین ڕێکخراو و حیزبی ئیسلامیی لە کوردستان دروستبوون. تایبەتمەندیی هەرە دیاری حیزبە ئیسلامییەکانی کوردستان و جیاکەرەوەیان لە حیزبە ئیسلامیەکانی عەرەب و وڵاتانی تری مسوڵمان ئەوەیە:

١- حیزبە ئیسلامییەکانی کوردستان چەوسانەوەی ئیسلام و ئیسلامییەکان لە لایەن ئاینەکانی تر و کافرەکانەوە لە سەروو و لە پێش چەوسانەوەی نەتەوەیی گەلی کوردەوە دادەنێن. کادر و جەماوەری حیزبە ئیسلامییەکانی کوردستان، چەوسانەوەی نەتەوەیی و چەوسانەوەی ئاینیی بە دوو تێگەیشتنی دژ بە یەک و پێچەوانەی یەکتر دەبینن، جاری وا هەیە ئیسلامییەکانی کوردستان دەڵێن من ئیسلامم هەقم بەسەر کورد و کوردایەتییەوە نییە.

عەرەبەکان بۆ چارەسەری کێشەی نەتەوەیی حیزبی ئیسلامیی دروستدەکەن، حیزبە ئیسلامییەکانی عەرەب، لە حیزبە سکۆلار و نەتەوەییەکانی عەرەب نەتەوەییترن، زۆرتر داکۆکیی لە مافە نەتەوەییەکانی عەرەب و فەلەستین دەکەن.

٢- ڕێکخراو و حیزبە ئیسلامییەکانی عەرەب دەیانەوێت هەموو ئوممەی ئیسلامی لەپێناو ئازادکردنی فەلەستیندا بەکاربهێنن، حیزبە ئیسلامییەکانی کوردستان دەیانەوێت هەموو توانای گەلی کورد لە خزمەتی ئیسلامدا دابنێن.

٣- کەسایەتیی سیاسیی و کادرانی حیزبە ئیسلامییەکان، هێندە دۆستایەتیی وڵاتانی ئیسلامیی داگیرکەر و داپڵۆسێنەری کورد دەکەن، نیو هێندە سۆزیان بە لای چەوسانەوەی نەتەوەیی گەلی کورددا ناشکێتەوە. ڕۆژانە زوڵم و زۆری تورکیای بەناو_ئسیلامیی دژی گەلی کورد لە باکور و لە ڕۆژئاوا و باشووری کوردستان دەبینن، نەک هەر دەنگیان لێوەنایەت، بەردەوام بە مسوڵمانبوونی ئەردۆغان و ئاکپارتیدا هەڵدەدەن. کۆمەلکوژییەکانی دژ بە گەلی کوردی بۆ دەشارنەوە. کەسایەتییەکی کورد وەکو د. عەلی قەرەداخیی، کە پۆستی ئەمینداری گشتیی زانایانی جیهانی ئیسلامیی هەیە، وا هەڵسوکەوت دەکات و هەڵوێست پیشاندەدات، کە گەلی کورد نە مسوڵمانە و نە کێشەی نەتەوەیی هەیە و نە جینۆساید دەکرێت، هەمیشە بیری لای پاراستنی وڵاتێکی ئیسلامیی وەکو تورکیایە، قەت بیری لە لای تاوانەکانی دەوڵەتی تورکیا نییە، کە دەرهەق بە گەلی کورد دەیانکات. لە سیوسێیەمین ساڵیادی کیمیابارانی هەڵەبجە و ئەنفالدا، قەرەداخیی داوا لە مسوڵمانان دەکات فەلەستینیان لەبیرنەچێتەوە. هەمیشە بیری لە لای ئازادکردنی فەلەستینە و قەت بیر لە ئازدکردنی کوردستان ناکاتەوە. دەڵێی کیمیابارانی هەڵەبجە و گوندەکانی ساڵی ١٩٨٨ی لەبیرنەماوە *٥.

٤- حیزبە ئیسلامییەکانی کوردستان نەک هەر هەوڵدەدەن لە سێبەری چەوسانەوەی ئیسلامدا کێشەی کورد بشارنەوە و خزمەتی وڵاتە ئیسلامییە داگیرکەرەکانی کوردستان بکەن، لە بڵاوکردنەوەی کەلتور و هزری نەتەوە سەردەستەکانی کوردستانیش دریغیی ناکەن. باڵاپۆشیی ژن و ڕیشدرێژیی پیاوانی کۆمەڵگەی دورگەی عەرەب وەکو کەلتوری ئیسلام بە ناو خەڵکی کوردستاندا بڵاودەکەنەوە. چەند بتوانن دژایەتیی هێما و بۆنە و جەژنی نەتەوەیی و سرودە نەتەوەییەکانی گەلی کورد دەکەن.

٥- هەموو جیهان دەزانێت کە دەسەڵاتدارە ئیسلامییەکانی ناوچەکە و وڵاتە ئیسلامییەکان، بەربوونەتە گیانی خەڵکی مسوڵمانی وڵاتانی خۆیان و ئازادیی سیاسییان لیزەوتدەکەن. لە دواکەوتووترین باری کۆمەڵایەتیی و ئابورییدا دەیانهێڵنەوە. بە پەتی سێدارە وەڵامی کەس و لایەنە ناڕازییەکانی سیستەمەکەیان دەدەنەوە.

باڵی ئیسلامی سیاسیی توندڕەویی ئۆپۆزسیۆنی وڵاتە مسوڵمانەکانیش، لەبریی ئەوەی هەوڵی گۆڕینی سیستەمی ئیسلامی سیاسیی ناوچەکە بدات، خەڵکی سڤیلی ئەورووپیی و ئەمریکیی و وڵاتانی مسوڵمان تیرۆردەکەن.

بەو شیوەیە بۆمان ڕوندەبێتەوە کە ئیسلامی سیاسیی ئەوەی لە دەسەڵاتدایە، یان ئەوەی لە ئۆپۆزسیۆندایە، هەر یەک بە شیوەیەک دژی ئازادیی و مافی مرۆڤ دەوەستێتەوە. ئەم سیاسەتەی هەردوو باڵی ئیسلامی سیاسیی، دەسەڵاتدار و ئۆپۆزسیۆن، نەک هەر سیاسەتێکی نادیموکراتیی و دژەمرۆڤایەتییە، بەڵکو زیانێکی گەورەیشی بە گەلانی مسوڵمان و ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست گەیاندووە. ئەم هەڵوێستانەی ئیسلامی سیاسیی ناوچەکە، زیانی زۆری بە حیزبە ئیسلامییەکانی کوردستانیش گەیاندوە.

٦- کێشەیەکی تری حیزبە ئیسلامییەکان و ئاراستە سیاسییەکانی ئیسلامیی لە کوردستاندا ئەوەیە، لێکدانەوەی جیاواز و دژبەیەک بۆ ئایەتەکانی قورئان و فەرمودەکانی پێغەمبەر(د. خ) دەکەن. هەر کەس و لایەنی سیاسیی بەگوێرەی بەرژەوەندیی خۆی لێکدانەوە بۆ ئایەت و فەرمودەکان دەکات. بەوەیش کۆمەڵگەی کوردستانیان دوچاری ڕەشبینیی و دڵەراوکێی ئاینیی کردووە.

٧- حیزبە ئیسلامییەکانی کوردستان لەم کاتەدا دەسەڵاتداری هەرێمی کوردستان نین، ئۆپۆزسیۆنێکی چالاکیش نین، هاوپەیمانییان لەگەڵ دەسەڵاتدارانی هەرێمدا هەیە.

٨- ئەو سەردەمانەی حیزبە ئیسلامییەکانی کوردستان هێزی چەکدارییان هەبوو، دژی بزوتنەوەی ڕزگارییخوازی گەلی کورد لە پارچەکانی تری کورستاندا شەڕیان نەدەکرد، داوای چارەسەری ئاشتییانەی کێشەی کوردیان دەکرد.

٩- حیزبە ئیسلامییەکان هاوکاریی خەڵکی هەژار دەکەن، دەزگای کۆکردنەوە و دابەشکردنی هاوکارییان هەیە، لە تالانکردنی سامانی کوردستاندا بەشدارییان نەکردووە.

## ٨- بزوتنەوەی گۆڕان

ساڵی ٢٠٠٦ ژمارەیەک ئەندامی مەکتەب_سیاسیی و سەرکردایەتیی یەکێتیی، بە سەرکردایەتیی نەوشیروان مستەفا لە یەکێتیی جیابوونەوە. هەزاران کادری یەکێتیی

و خەڵکی بێلایەن لێیان کۆبوونەوە. وەکو لیستی بزوتنەوەی گۆڕان بەشداریی هەڵبژاردنی پەرلەمانی هەرێمی کوردستانی ٢٥/ ٧/ ٢٠٠٩ کرد و بیستوپێنج کورسیی پەرلەمانی هەرێمی کوردستانی بەدەستهێنا.

ڕۆژی ٣١/ ٥/ ٢٠١٠ بزوتنەوەی گۆڕان وەکو قەوارەیەکی سیاسیی مۆڵەتی فەرمیی وەزارەتی ناوخۆی حکومەتی هەرێمی کوردستانی وەرگرت و وەکو حیزبێکی سیاسیی دەستی بە خەبات کرد.

ساڵی ٢٠٠٩ لەگەڵ لیستی یەکگرتووی ئیسلامیی و کۆمەڵی ئیسلامیی، لە پەرلەمانی هەرێمی کوردستاندا بەرەی ئۆپۆزسیۆنیان پێکهێنا و لە پێکهێنانی حکومەتدا بەشدارییان نەکرد. بەو شێوەیە بزوتنەوەی گۆڕان لە دروستکردنی ئۆپۆزسیۆنی سیاسییدا ڕۆڵی سەرەکیی دەگێڕێت. کاتێک بزوتنەوەی گۆڕان دامەزرا، ناڕەزایی خەڵک بەرانبەر بە هەردوو حیزبی دەسەڵاتدار لە لوتکەدا بوو. سەرکردایەتیی بزوتنەوەی گۆڕان سودی لە ناڕەزایی خەڵک وەرگرت و بەشێکی زۆری خەڵکە ناڕازییەکە لە ناو ڕیزەکانیدا ڕێکخست.

پەیامی سەرەکیی بزوتنەوەی گۆڕان، گۆڕینی سیستەمی حوکمڕانیی هەرێمی کوردستان بوو. خاڵی بەهێزی بزوتنەوەکە جەماوەری ناڕازیی باشووری کوردستان بوو. خاڵی لاوازی بزوتنەوەکە، وەکو حیزبە ڕکابەرەکانی هێزی چەکداری سەربەخۆی نەبوو. داهاتی ئابوریی سەربەخۆی نەبوو. پەیوەندیی کوردستانیی و عێراقیی و ناوچەیی و جیهانیی لاوازبوو.

پێش ئەوەی سیستەمی حوکمڕانیی هەرێم هیچ گۆڕانکارییەکی بەسەردابێت، ساڵی ٢٠١٣ گۆڕان بەشداریی پێکهێنانی کابینەی حکومەتی هەرێمی کرد و دەستی لە ئۆپزسیۆنبوون بەردا. جەماوەری ناڕازیی و ژمارەیەک لە کادر و دۆستی بزوتنەوەی گۆڕان دەستیان بە ڕەخنەکردنی ئەو سیاسەتەی گۆڕان کرد، گۆڕان بە ئاشکرا و بە نهێنیی و بە توندیی ڕووبەڕووی ڕەخنەگرەکانی بووەوە.

لە هەڵبژاردنی ساڵی ٢٠١٩ پەرلەمانی هەرێمدا، ژمارەی کورسییەکانی گۆڕان لە ٢٥ بۆ ١٢ کورسیی دابەزی. لە هەڵبژاردنی پێشوەختەی پەرلەمانی عێراقدا کە ١٠/ ١٠/ ٢٠٢١ بەڕێوەچوو، گۆڕان یەک کورسییشی نەهێنا. لە خولی پێشووتردا گۆڕان چوار کورسیی پەرلەمانی عێراقی هەبوو.

بەو شێوەیە دەبینین ئەو جەماوەرە نارازییەی کوردستان کە ساڵی ٢٠٠٩ گۆڕانی کرد بە حیزبی دووەمی باشووری کوردستان، کە بینی گۆڕان پابەندی ئامانجەکانی خۆی نابێت و ئیرادەی گۆڕینی سیستەمی هەرێمی کوردستانی نەماوە، لەسەر سندوقی دەنگدان گەورەترین سزای بزوتنەوەی گۆڕان دەدات.

## هۆکاری پاشەکشەی بزوتنەوەی گۆڕان:

١- بزوتنەوەی گۆڕان سەر بە هێڵێکی سیاسیی تایبەت و عەقڵیەتێکی سیاسیی تایبەت نەبوو، بە هەمان هێڵی سیاسیی یەکێتیی و هەمان عەقڵیەت، کار و چالاکیی بەڕێوەدەبرد.

٢- نە لە باشووری کوردستان نە لە سەرتاسەری کوردستاندا گرنگیی بە کێشە نەتەوەییەکانی کورد نەدەدا، کێشەی ناوچە دابڕێنراوەکانی باشووری کوردستانی فەرامۆشدەکرد، تەنها باسی گەندەڵیی و دەستبەسەراگرتنی داهاتی کوردستانی دەکرد.

٣- سەرکردەکانی بزوتنەوەکە بەشداریی پێکهێنانی پەرلەمان و حکومەتیان نەدەکرد، لە دوورەوە دەوەستان و کاری پەرلەمان و حکومەتیان بە ژمارەیەک گەنجی کەمئەزموون دەسپارد. حیزبە دەسەڵاتدارەکان بە ئاسانیی ئەو گەنجانەیان سەرکوت و بێکاریگەر دەکرد.

٤- بزوتنەوەکە نەیتوانی سنووری پاریزگای سلێمانیی و ناوچەی سۆران تێبپەڕێنێت، ڕێکخستنەکانی لە سنووری زۆنی سەوزدا قەتیسکرد.

٥- هێرشەکانی داعش بۆ سەر هەرێمی کوردستان و عێراق، پێگەی ئەو حیزبانەی بەرزکردەوە کە هێزی چەکداریان هەبوو، پێگەی ئەو حیزبانەشی سنووردارکرد کە هێزی چەکداری نەبوو، بزوتنەوەی گۆڕان هێزی چەکداری نەبوو.

٦- بزوتنەوەی گۆڕان لە حیزبە دەسەڵاتدارەکان زیاتر دژی حیزبە بچووکەکان و حیزبە نوێیەکان دەوەستایەوە. هەوڵیدەدا ڕێگە لە دروستبوونی حیزبی نوێ بگرێت. هەر کەسێک ڕەخنەی لە بزوتنەوەی گۆڕان بگرتایە، بە دروستکردنی سیناریۆی دوور لە ئاکاری کۆمەڵایەتیی وەڵامیاندەدایەوە.

٦- کۆچی دوایی نەوشیروان مستەفا و تاپۆکردنی موڵک وماڵی بزوتنەوەکە بە ناوی کوڕەکانیەوە، ناکۆکییەکی توندی لە نێوان بەرپرسان و کادرەکانی بزوتنەوەی گۆڕاندا دروستکرد، ژمارەیەکیان گۆڕانیان بەجێهێشت.

٧- ڕێککەوتنی گۆڕان و پارتیی، هەزاران ئەندام و کادر و دۆستی گۆڕانی لە بزوتنەوەکە دوورخستەوە و پێگەی جەماوەریی و سیاسیی گۆڕانی لاوازکرد. ڕێککەوتنی گۆڕان لەگەڵ یەکێتیی، بە تایبەت لە هەڵبژاردنی پێشوەختەی پەرلەمانی عێراقدا (٢٠٢١) هێندەی تر گۆڕانی بەلاداخست. خەڵکی کوردستان دەڵێن گۆڕان لە هەولێر خۆی خستووەتە باوەشی پارتییەوە. لە سلێمانیی خۆی خستووەتە باوەشی یەکێتییەوە. ئەمە لە کاتێکدایە کە گۆڕان لە بنەڕەتدا بۆ دژایەتییکردنی حوکمڕانیی پارتیی و یەکێتیی دامەزراوە.

## ٩- نەوەی نوێ

نەوەی نوێ نوێترین حیزبی باشووری کوردستانە، ساڵی ٢٠١٨ دامەزراوە. لەو کاتەوە هەتا ئەمڕۆ(٢٠٢٢) ئۆپۆزسیۆنی هەرێمی کوردستانە. بەشداریی هەڵبژاردنەکانی هەرێم و عێراق دەکات و لە گەشەکردنی بەردەوامدایە. سەرۆکی حیزبەکە شاسوار عەبدولواحیدە، یەکێکە لە بازرگانەکانی باشووری کوردستان.

پێش ئەوەی شاسوار حیزبەکەی دابمەزرێنێت، خاوەنی سەرمایە بوو، خاوەنی چەندین کەناڵی ڕاگەیاندنی وەکو تەلەفزیۆنی NRT بوو. ئەو کادر و بەرپرسانەیشی کە لە کار و چالاکیی نەوەی نوێدا بەشدارییدەکەن، گەنجن و پێشتر لە دەسەڵاتدا نەبوون و تامی دەسەڵاتیان نەچەشتووە، بە لایانەوە ئاساییە لە دەرەوەی دەسەڵاتدا بمێننەوە و کار و چالاکیی ئەنجامبدەن.

ئەمانە هۆکاری گەشەکردن و بەردەوامی نەوەی نوێن.

دامەزرێنەرانی نەوەی نوێ لە سەردەمی خەباتی چەکدارییدا ڕۆڵیان نەبووە، ئەم خاڵە هۆکارە بۆ ئەوەی لە لایەن دەسەڵاتەوە بە ئاسانیی بەر پەلامار و هێرش بکەون و تۆمەتیان بۆ دروستبکەن.

**ئەو سەرچاوانەی بۆ ئەم نوسینە سودی لێوەرگیراوە:**

١- لینین: هەنگاوێک بۆ پێشەوە دوو هەنگاو بۆ دواوە ساڵی ١٩٠٤ نوسراوە، ساڵی ١٩٥٨ لە داردیمەشق لە ڕوسییەوە بۆ زمانی عەرەبیی وەرگێڕدراوە.

٢- د. فوئاد مرسی سەرمایەداری خۆی نوێدەکاتەوە، (الراسمالیه تجدد نفسها) زنجیرە ١٤٧ جیهانی زانست، ساڵی ١٩٩٠ کوێت.

٣- سەرهەڵدان و بەردەوامیی حیزبە سیاسییەکانی ڕۆژئاوا، د. حوجەتوڵڵا ئەیوبیی، وەرگێڕانی ئازاد وەڵەدبەگیی.

٤- پێشەکییەک لەسەر کۆمەڵناسیی سیاسیی، د. ئەحمەد نەقیبزادە، وەرگێڕانی مەسعود ڕەواندۆست.

٥- الاحیزب السیاسیه والتحول الدیموقراگی، د. بلقیس احمد مەنسور.

٦- بنلادن، جیهانە پڕ نهێنییەکەی بنلادن لە زاری نەجوای هاوسەری و عومەری کوڕیەوە، نوسینی جین ساسۆن، وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە د. نەوزاد ساڵەح ڕەفعەت ساڵی ٢٠٢٠

٧- عەلی قەرەداخیی، پەیجی تایبەتی سۆشیال_میدیای عەلی قەرەداخیی، بەهاری ٢٠٢١.

٨- گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییەکان.

٥

# ئاوەزمەندیی کۆمەڵگەی کوردستان

عەقڵیەت، یان ئاوەزمەندیی ئەو کۆمەڵە چەمک و تێگەیشتنانەیە، کە شێوازی بیرکردنەوە و هەڵوێستی خەڵک دیاریدەکات. لە زمانی ئینگلیزییدا (mentality) و لە زمانی عەرەبییدا (العقلیە)ی بۆ بەکاردێت. ئاوەزمەندیی هەر کۆمەڵگەیەک بریتییە لە کۆی ئەو بۆچوونانە، کە بە درێژایی مێژوو لە هزری تاکەکانیدا جێگیربوون. بەبێ کاریگەریی بڕیاری سیاسیی و یاسا، ژیانی پێدەبینێت و هەڵوێستی پێوەردەگرێت. ئاوەزمەندیی کۆمەڵگە کاریگەریی لەسەر سیستەمی سیاسیی و بڕیاری سیاسیی هەیە. سیستەمی سیاسییش کاریگەریی لەسەر ئاوەزمەندیی بەجێدەهێڵێت. ئاوەزمەندیی بەگوێرەی کات و شوێن و قۆناغی گەشەکردنی کۆمەڵگە، گۆڕانکاریی بەسەردادێت.

لە کۆمەڵگە ڕۆژئاواییەکانی ئەمڕۆی جیهاندا، هزرێکی زانستیی کراوەی مرۆڤدۆستیی جێگیربووە و کارییپێدەکرێت. باڵی بەسەر بیرکردنەوە و بڕیار و ڕەفتار و کرداری تاک و پێکهاتەکانی کۆمەڵگەدا کێشاوە. لە کۆمەڵگە دواکەوتووەکاندا، هزرێکی ئەفسانەیی، نازانستیی و خێڵەکیی، لە ناخی مرۆڤەکاندا جێگیربووە و باڵی بەسەر بیرکردنەوە و ڕەفتار و کردارییاندا کێشاوە. لە هەندێک کۆمەڵگەیشدا تێکەڵەیەکی لەو دوو جۆرە، لە ناخی تاک و پێکهاتەکانیدا جێگیربووە.

کۆمەڵگەی کوردستان لە دێرزەمانەوە هەتا ئەمڕۆ ژێردەست و داگیرکراوی کۆمەڵگە دواکەوتووەکانی جیهان بووە، ئەو دەسەڵاتەی بەسەر کوردستاندا زاڵبووە، نەک هەر هزراندنی کۆمەڵگەی کوردستانی لە قۆناغی خێڵەکییدا ڕاگرتووە، ڕێگەینەداوە وەکو پێویست سود لە فەلسەفە و زانست وەربگرێت هەتا ئاوەزمەندییەکی گەشەکردووتر بەدەستبهێنێت.

## ناكۆكیی لە ئاوەزمەندیی و سیاسەتی کورددا

### ١- ئاوەزمەندیی خێڵەکیی و ئاینیی و نەتەوەیی

لە ناوەڕاستی سەدەی بیستدا، حیزبە سیاسییەکانی باشووری کوردستان، بە لاساییکردنەوەی حیزبە سیاسییەکانی تری جیهان، لەپێناو ڕزگاریی کوردستاندا دامەزران، بەڵام ئەو هزرەی بەسەر دید و بۆچوونی کۆمەڵگەی کوردستان و تاکە دامەزرێنەرەکانی حیزبدا زاڵبوو، زەمینەی بۆ بەدەستهێنانی ڕزگاریی نەتەوەیی نەدەڕەخساند. لەبەرئەوەی هزری باوی کۆمەڵگەی ئەو کات لەگەڵ ڕزگاریی نیشتیمانیی و ئازادییدا ناکۆک بوو. ئاوەزمەندیی باوی کۆمەڵگە خێڵەکیی و ئاینیی بوو. نەتەوەیی و دیموکرات نەبوو، بەرژەوەندیی خێڵ و بنەماڵە لە سەرووی بەرژەوەندیی گەل و نیشتیمانەوە دەبینرا. لە کاتی خەباتی نەتەوەییدا کە مەترسیی لەسەر بەرژەوەندیی بنەماڵە دروستدەبوو، ڕابەری نەتەوە، خێڵی کورد، لە خەباتی نیشتیمانیی و نەتەوەییدا پاشەکشەیدەکرد هەتا بەرژەوەندیی خێڵ بپارێزێت. لە کاتی خەباتی سیاسیی و دیبلۆماسییدا کە ناکۆکیی ئاینیی دروستدەبوو، ڕابەری نەتەوە، ئاینی کورد، بەلای ئایندا دایدەشکاندەوە و پرسە نەتەوەییەکەی فەرامۆشدەکرد.

### ٢- ئاوەزمەندیی خێڵ و ڕۆشنبیر

توێژی ڕۆشنبیری کوردستان کاریان بۆ ئەوە دەکرد گەلی کورد وەکو هەموو نەتەوەکانی جیهان ماف و پێگەی نەتەوەیی هەبێت، بۆ ئەوەی لە خەباتدا سەرکەوتن بەدەستبهێنن، دەبوو زۆرترین خەڵکی کوردستان لە ناو حیزبەکاندا کۆبکەنەوە. خەڵکی کوردستانیش هەڵگری ئاوەزمەندیی قوناغی پێش نەتەوە بوون، بەگوێرەی ئاموژگاریی و ڕێنوێنیی سەرۆک_خێڵەکانیان دەجوڵانەوە.

ئیتر ڕۆشنبیرانی کوردستان پەنایان بۆ ئاغا و خێڵ و پیاوی ئاینیی دەبرد، بۆ ئەوەی خۆیان و عەشرەتەکەیان بەشداریی تێکۆشان بکەن. ئاغا و سەرۆک_خێڵ و پیاوی ئاینیی کوردستان بە مەرج بەشداریی خەباتیان دەکرد، بە مەرج هاوخەباتیی ڕۆشنبیرانی کوردستانیان دەکرد. مەرجەکان هێندە گران بوون، بەرنامەی نەتەوەیی

و هزری سکۆلاریی و ئازادیی لاوازدەکرد و بەرنامە نەتەوەییەکەی بەلاڕێدادەبرد. بەرژەوەندیی خێڵ، بەسەر بەرژەوەندیی نەتەوەدا دەسەپاند. ڕۆشنبیر و سیاسەتمەدار بەزەحمەت لەژێر باریدا دەردەچوون. لە کۆتاییدا ئامانجی ڕۆشنبیران و حیزبە نەتەوەیی و دیموکراتەکان لە چوراچێوەیەکی خێڵەکییدا دەمایەوە، ئیتر کەلتوری کۆمەڵایەتیی خێڵ و ئایدۆلۆژیای کۆمەڵگەی کلاسیکیی کوردستان، خۆی بەسەر سیاسەتی حیزب و خەباتی نەتەوەیی و دیموکراتیی کوردستاندا زاڵدەکرد و ئاستەنگیی بۆ خەباتی ڕەوای گەلی کورد دروستدەکرد.

خاڵێکی تری گرنگ ئەوەیە کە زۆرێک لە ڕۆشنبیران و سیاسەتمەدارانی کوردستان کاتێک هاتوونەتە مەیدانی تێکۆشانەوە، بە قسە و نوسین باسیان لە کەلتور و سیاسەتی نەتەوەیی کردووە، بەڵام لە ناخدا بە هەمان هزر و کەلتوری خێڵ کاریانکردووە، کە لەو سەردەمەدا باوبووە. ئەو هزر و کەلتورە لە ئاستی ناوخۆییدا کۆمەڵگەی کلاسیک (سەرۆک_خێڵ و ئاغا و شێخ) و ئاراستەیکردووە. لە ئاستی دەرەوەیشدا ئەو کەلتور و هزرە باوە خێڵەکییە لە لایەن داگیرکەر و دوژمنانی گەلی کوردەوە بە دەزگا کراوە و ئاراستەکراوە. لەبەرئەوە هزری نەتەوەیی لە بەرانبەر هزری خێڵەکیی کۆمەڵگەی کلاسیکدا، پاش ململانێیەکی کورتخایەن، شکستدەهێنێت و پاشەکشەدەکات. جیابوونەوەی ساڵی ١٩٦٤ پارتیی لە ململنێی نێوان ئاوەزمەندیی خێڵەکیی و ئاوەزمەندیی نەتەوەییەوە سەرچاوەیگرت. باڵی مەکتەبی سیاسیی (باڵی ڕۆشنبیرانی نەتەوەیی) لە بەرانبەر باڵی مەلا مستەفا (باڵی خێڵایەتیی) شکستیهێنا. بەو شێوەیە باڵە ڕۆشنبیرەکەی شۆڕشی ئەیلول، لە بەرانبەر باڵە خێڵەکییەکەی شۆڕشی ئەیلولدا شکست دەخوارد.

لە دوای شکستی شۆڕشی ئەیلولی ١٩٧٥ سەرکردایەتیی کاتیی پارتیی دیموکراتی کوردستان دامەزرا. زۆرینەی دامەزرێنەران و دەسەڵاتبەدەستەکانی لە ڕۆشنبیرە سیاسییەکانی ناو پارتیی بوون، بەڵام پاش ململانێیەکی چەند ساڵە، جارێکی تر باڵی خێڵەکیی ناو پارتیی، جڵەوی سیاسەتی حیزبەکەی بەدەستەوەگرتەوە. ڕۆشنبیرەکانی سەرکوت و پەرتەوازەکرد، بەو هۆیەوە جیابوونەوەی ساڵی ١٩٧٩ لە ناو پارتییدا دروستبوو. دوای دوو ساڵ جیابووەوەکان پارتی گەلی دیموکراتی کوردستان (پارتی گەل)یان دروستکرد، بەڵام پارتی گەل هێندە خۆی پێڕانەگیرا، خۆی ڕادەستی پارتیی خێڵی بەرزانییەکان کردەوە.

لە ساڵی ١٩٧٦وە یەکێتیی بە بەرنامەیەکی نیشتیمانیی و نەتەوەییەوە خەباتی کوردایەتیی دەستپێکردەوە، بە تێپەڕبوونی کات یەکێتیی لە بەرنامە و ئایدۆلۆژیا پێشکەوتنخواز و نەتەوەییەکەی لایدا، دەستی بە لاساییکردنەوەی پارتیی کرد، هەتا لە کۆنگرەی ٤ ساڵی ٢٠١٩دا، یەکێتییش بۆ ناو حیزبی خێڵ و بنەماڵە ملی ڕێیگرت.

ئەم ئاوەزمەندییەی ئەمڕۆ حیزبەکانی کوردستان کاری سیاسیی پێدەکەن و هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەی کوردی پێدەدەن، هزری کۆمەڵگەی پێش نەتەوەیە، ئاوەزمەندیی نەتەوەیی نییە، کێشەکانی نەتەوەی پێ چارەسەرنەکرێت، لەبەرئەوە ئەو حیزبە سیاسییانەی لەپێناو بەرژەوەندیی گشتییدا تێکۆشاندەکەن، کار و تێکۆشانیان وەکو پێویست ئەنجامی نابێت، شکست دوبارەدەکەنەوە و سەرکەوتن بەدەستناهێنن.

ئەگەر دەستەی پێشەنگی تێکۆشان، هەوڵی گۆڕینی ئاوەزمەندیی ئەندام و کادرانی حیزبی سیاسیی نەدات، لە شوێنی هزر و کەلتوری خێڵ، هزر و کەلتوری نەتەوە نەچێنێت، لەوێوە هزری کۆمەڵگەیش نەگۆڕن، ڕەنج و قوربانییەکانی تێکۆشانی گەلی کورد بەفیڕۆدەچێت. کورد گوتەنی ئاسنی سارد دەکوتین.

لە دروستبوونی دەوڵەتی عێراقەوە هەتا ئەمڕۆ، گەلی کورد لە باشووری کوردستان سەری بۆ سیاسەتی حکومەتە ناوەندییەکانی عێراقی ناوەندیی دانەنەواندووە. لەپێناو ماف و ئازادییەکانیدا تێکۆشانی هەمەجۆری ئەنجامداوە، قوربانیی زۆری داوە، بەڵام لەبەرئەوەی ئەو تێکۆشانە بە ڕابەرایەتیی سەرکردایەتییەکی خێڵەکیی بووە، کارەسات و شکستی لێکەوتووەتەوە.

## ٣- سیاسەت و ئاوەزمەندیی بنەماڵەیی و ناوچەیی:

یەک لە دیاردەکانی تری کۆمەڵگەی کوردستان، خزمخزمێنە و ناوچەگەریی و شارچێتییە، ئەمەیش ئاوەزمەندیی کۆمەڵگەی خێڵەکیی و دەرەبەگایەتییە، لەبەرئەوەی لە کۆمەڵگەی کوردستاندا قۆناغەکانی گۆڕان و گەشەکردنی کۆمەڵ وەکو کۆمەڵگە پێشکەوتووەکان ڕێڕەوی خۆی وەرنەگرتووە، هەتا ئەمڕۆیش کەلتوری کۆمەڵگە کۆنەکان کە بە خێڵ و ناوچەوە بەستراوەتەوە، نەسڕاوەتەوە و درێژەی هەیە.

بەهۆی جیهانگیریی و لاوازبوونی سنوورەکانی کوردستانەوە، ئاوەزمەندیی کۆمەڵگەی نوێی جیهان و ئاوەزمەندیی (پ. ک. ک) لەگەڵ ئاوەزمەندیی کۆمەڵگەی باشووری کوردستان تێکەڵبووە. هزرێکی دەرەبەگایەتیی و لیبراڵیی و نەتەوەیی و دیموکرات ئاوێتەی یەکتر بوون، بەڵام هەتا ئێستا ئەو هاوکێشە تێکەڵەیە بە قازانجی هزری خێڵەکیی تەواوبووە.

هیچ هێزێکی سیاسیی و هیچ دەسەڵاتێکی ئیداریی باشووری کوردستان، نەیویستووە بنەما و چەمکە کۆنەکانی کۆمەڵگەی کوردستان وەکو ناوچەگەرێتیی و خزمخزمێنە تێبپەرێنێت و لە شوێنیدا بنەما و چەمکی هاوڵاتیی و نیشتیمانیی سەردەم ئاوابکات، لەبەرئەوە ئاوەزمەندیی کۆن هەتا ئەمڕۆیش کۆنترۆڵی کۆمەڵگەی کوردستانی کردووە و لەسەر ئەو بنەمایە سیاسەتی باشووری کوردستان ئاراستەدەکات.

لەگەڵ دروستبوونی هەر ڕێکخراوێکی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی باشووری کوردستان، بەرپرسی یەکەمی ئەو ڕێکخراوە، پلە و پۆست بەسەر خزمەکانی خۆیدا دابەشدەکات، چونکە بڕوای بە یەکێتیی بیروباوەڕ و یەکێتیی تێکۆشان لەگەڵ کەسانی دەرەوەی بنەماڵە و خێزاندا نییە، لە لای سەرکردەکانی باشوور، یەکێتیی خێڵ و بنەماڵە لە یەکێتیی نەتەوە و بیروباوەڕ بەهێزترە.

لە دامەزراندنی پارتییەوە هەتا ئەمڕۆ کە نیو سەدە زیاتری تێپەڕکردووە، دەسەڵاتی پارتیی بە دەست بنەماڵەی مەلا مستەفای بەرزانییەوەیە. پێشبینییەکان پیشانیدەدەن نە ئەو بنەماڵەیە ئامادەیی ئەوەی تێدایە ڕیفۆرمی سیاسیی بکات و دەسەڵاتی حیزب لەگەڵ سەرکردەکانی تردا دابەشبکات، نە بڕوایان بە دەستاودەستکردنی دەسەڵات هەیە، نە لە ناو ئەندام و کادر و جەماوەری پارتییدا، بیرکردنەوەیەکی وا گەڵاڵەبووە کە داوای ڕیفۆرمی سیاسیی بکەن و ئەندامانی بنەماڵەی بەرزانیی وەکو هەر ئەندامێکی تری ئەو حیزبە ئەرک و مافەکانی خۆیان ئەنجامبدەن.

حیزبەکانی دەرەوەی پارتیی، ئەوانەی لافی حیزبی نەتەوەیی و سۆسیالیست_ دیموکراتیی لێدەدن، نەک هەر لەو بوارەدا ململانێی پارتیی ناکەن، بەڵکو خۆیان ڕادەستی هێڵی خێڵەکیی پارتیی دەکەن. سەرکردەکانی ئەو حیزبانە دەیانەوێت بە خۆیان و بنەماڵەکانیانەوە وەکو بنەماڵەی بەرزانیی بچنە کوڵی حیزبەکانیان و هەتا ئەبەد لە کورسیی دەسەڵاتی حیزب دانەبەزن.

لە کۆنگرەی سێی ساڵی ٢٠١٠ یەکێتییدا، چەندیین کەس لە بنەماڵەی مام جەلال بە ئەندامی سەرکردایەتیی هەڵبژێردران، چونکە خزمی مام جەلال بوون. لە کۆنگرەی چواری ساڵی ٢٠١٩دا کوڕ و برازای مام جەلال، وەکو هاوسەرۆکی یەکێتیی هەڵبژێردران، یەکێتییش بە بنەماڵەیی کرا. ئەو پاشەکشە ئاوەزمەندییەکانی یەکێتیی ئەو بۆچوونەی پشتڕاستکردەوە کە حیزبە سیاسییەکانی تری باشووری کوردستان نەک نایانەوێت سیاسەتێکی نەتەوەیی و شارستانیی پەیڕەوبکەن، بەڵکو دەیانەوێت لاسایی حیزبە خێڵەکییەکانی تری باشووری کوردستان بکەنەوە.

یەکێک لە لایەنە هەرە خراپەکانی بزوتنەوەی گۆڕانیش ئەوەیە، دوای کۆچی دوایی نەوشیروان مستەفا، سامانی کۆماپانیای وشە و بزوتنەوەی گۆڕان لەسەر کوڕەکانی نەوشیروان ناونوسکرا، ئەمەیش هەنگاوی یەکەمە بۆ بەبنەماڵەییکردنی گۆڕان.

لایەنێکی تری نادروستیی حیزبایەتیی باشووری کورستان ئەوەیە، هەر حیزبە و لە ناوچەیەکدا باڵادەستە. لە شەستەکانی سەدەی بیستەوە پارتیی حیزبی باڵادەستی ناوچەی بادینانە، یەکێتیی حیزبی باڵادەستی ناوچەی سۆرانە. لەم ساڵانەی دواییدا بزوتنەوەی گۆڕان دروستبوو، خەڵکی کوردستان بە هیوابوون بزوتنەوەی گۆڕان حیزبی هەموو باشووری کوردستان بێت، کەچی بزوتنەوەکە لە سنووری پارێزگای سلێمانییدا قەتیسمایەوە، لە کەرکوک و هەولێریش کارێکی ئەوتۆی پێنەکرا.

بەڵام ئەگەر سەیری حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران (حدکا) بکەین، لە سەردەمی قازی موحەممەدەوە هەتا ئەمڕۆ، چەندیین کەسایەتیی سیاسیی ڕۆژهەڵاتی کوردستان وەکو ئەحمەد تەوفیق، عەبدولڕەحمان قاسملۆ، سەعید شەرەفکەندیی و مەلا عەبدوڵڵای حەسەنزادە و مستەفای هجریی، پۆستی بەرپرسی یەکەمی ئەو حیزبەیان وەرگرتووە، لە یەک بنەماڵە نەبوون و خەڵکی یەک ناوچە نەبوون.

لە کۆتایی حەفتاکاندا لە باکووری کوردستاندا، جولانەوەی (پ. ک. ک) دروستبوو، ماوەی پەنجا ساڵێکە تێکۆشانی سیاسیی و گەریلایی و جەماوەریی بەڕێوەدەبات. عەبدوڵڵا ئۆج ئالانی سەرۆکی (پ. ک. ک) سەر بە خێزانێکی هەژاری باکووری کوردستانە، بەگوێرەی توانا و لێوەشاوەیی خۆی وەکو ڕێبەر و کەسی یەکەمی ئەو جولانەوەیە دەستنیشاندەکرێت، بەڵام دوای ئەو، کەسەکانی تر کە پۆستی دەسەڵاتیان

له حیزب و شۆڕشدا وەرگرتووە لە بنەماڵەی ئۆج ئالان نین، خەڵکی شار و دێهاتی ئۆج ئالان نین. ئەگەر هزری خێڵەکیی و ناوچەگەریی کۆمەڵگەی کوردستان لە ناو خانە و دەزگاکانی (پ. ک. ک) ناوبەناو سەریهەڵدابێت، سەرکردایەتیی جوڵانەوەی پەکەکە ڕێگەی گەشەکردن و بڵاوبوونەوەی ئەو هزرەی نەداوە و ڕکابەریی لەگەڵ کردووە.

ساڵی ۱۹۹۹ کاتێک عەبدوڵڵا ئۆج ئالان دەستگیرکرا و ڕادەستی حکومەتی تورکیا کرایەوە، دادگای ئەو وڵاتە سزای زیندانیی هەتاهەتایی بەسەردا سەپاند. ئاوەزمەندیی بنەماڵەگەریی باشووری کوردستان بە دوای یەک لە ئەندامانی بنەماڵەی عەبدوڵڵا ئۆج ئالاندا دەگەڕا هەتا لە شوێنی ئەو بەرپرسیارێتیی جوڵانەوەی (پ. ک. ک) پێبسپێرێت و (پ. ک. ک)یش وەکو خۆیان لێبکات. باشترین کەسیش بۆ ئەو پۆستە عوسمان ئۆج ئالانی برای عەبدوڵڵا ئوج ئالان بوو، بەڵام ئەوەی بینیمان وا دەرنەچوو، ڕوداوەکە بەگوێرەی تێڕوانین و هزری خێڵەکیی باشووری کوردستان نەبوو. نە سەرکردایەتیی (پ. ک. ک) عوسمانی بۆ ئەو کارە دەستنیشانکرد، نە عوسمان ئەو کەسە بنەماڵەچییە بوو کە بەگوێرەی بۆچوونی برا گەورەکەی سیاسەت بکات.

ئەو هزر و سیستەمە بنەماڵەییەی ئەمڕۆی باشووری کوردستان ئاستەنگییەکی جدیی بۆ کار و تێکۆشانی حیزبایەتیی و سیاسیی و بەڕێوەبەرایەتیی دروستکردووە، نە کێشە ناوخۆییەکانی خەڵکی کوردستانی پێ چارەسەردەکرێت، نە کەموکووڕییە سیاسیی و دیبلۆماسییەکانی دۆزی کوردی پێ پردەکرێتەوە. لە پای ئەو هەموو دەرفەتە ناوخۆیی و ناوچەیی و نێودەوڵەتییە لەبارە، لە پای ئەو هەموو توانا مادیی و ڕاگەیاندنە ئامادەکراوە، لە پای پێویستیی گەلی کورد بە گۆڕانکاریی هزریی، دەسەڵاتی باشوور ئامادە نین سیستەمی بنەماڵەیی خۆیان بگۆڕن و دیدگایەکی نوێ بە ڕووی گەلی کورد و کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییدا بکەنەوە. پابەندبوونی خەڵک بە حیزبی بنەماڵەییەوە پیشانیدەدات کە ئاوەزمەندیی خەڵکی کوردستان دژی حیزبی بنەماڵە و حوکمی بنەماڵە نییە.

ئەمە لە کاتێکدایە زۆرینەی خەڵکی باشووری کوردستان لە ڕێگەی تەکنۆلۆجیای پەیوەندییەوە ئاگایان لە جۆرەکانی باوەڕ و حوکمڕانیی وڵاتانی ترە، حەزدەکەن دەسەڵاتدارانی باشووری کوردستانیش بە هزرێکی نوێوە سیاسەت بکەن، بەڵام بە کرداریش بەرانبەر بە ئاوەزمەندیی بنەماڵەیی و خزمخزێنە و ناوچەگەریی ناوەستنەوە.

ئەو واقیعە تاڵە دەیسەلمێنێت کە گەلی کورد لە جاران زیاتر پێویستی بە هێزێکی ئایدۆلۆژیی هەیە، هەتا کار لەسەر گۆڕین و پێشخستنی ئاوەزمەندیی کۆمەڵگەی کوردستان بکات، چەمک و تێگەیشتنە هەڵەکانیان بۆ ڕاستبکاتەوە و هزری بنەماڵەچێتیی تێبپەڕێنێت.

## ٤- جیاوازیی ئاوەزمەندیی شار و ناوچەکان:

بەهۆی ئەوەوە کە هێزە دەسەڵاتدارەکانی عێراق کاریان بۆ دابڕینی هزر و کەلتوری گەلی کورد کردووە، ئاستەنگیان بۆ یەکێتیی نەتەوەیی باشووری کوردستان دروستکردووە، ناوچە جیاجیاکانی باشووری کوردستان، شارەکانی باشوور، لە ئاستی ئاوەزمەندیی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی جیاوازدا دەژین، ئەم جیاوازییەیش چەندیین کێشەی سیاسیی لە ناوخۆی هەرێمدا لێکەوتووەتەوە، هێندەی تر سیاسەتی باشووری کوردستانی دوچاری قەیران کردووە.

بۆ ئەو جیاوازییە هۆکاری بابەتیی هەیە پەیوەندیی بە مێژووی دروستبوونی شارەکانی کوردستانەوە هەیە. هۆکاری سیاسیی هەیە پەیوەندیی بە سیاسەتی حکومەتە ناوەندییەکانی عێراقەوە هەیە. هۆکاری کۆمەڵایەتیی هەیە پەیوەندیی بە هزری خێڵەکیی و ناوچەگەریی دەسەڵاتدارانی هەرێمەوە هەیە. هۆکاری ئایدۆلۆژیی هەیە پەیوەندیی بە کەمتەرخەمیی دەسەڵاتدارانی باشووری کوردستانەوە هەیە، کە کاریان بۆ یەکێتیی نەتەوەیی و تێکەڵیەکی کۆمەڵایەتیی خەڵکی کوردستان نەکردووە.

### هەولێر:

شاری هەولێر گەورەترین و کۆنترین شاری باشووری کوردستانە، لە پێش زاینەوە هەتا ئەمڕۆ ئاوەدانە، بە درێژایی ئەو سەردەمە زۆر بە هێواشیی گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتیی و سیاسیی بنچینەیی بەسەرداهاتووە.

یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی هەولێر ئەوەیە کە سەرمایەدارەکانی شاری هەولێر لەو کەسانە پێکهاتوون، کە پێشتر دەرەبەگ بوون، یان سەرۆک_خێڵی بەناوبانگی دەوروبەری هەولێر بوون.

دەرەبەگەکان بەبێ ڕیفۆرمی زەویوزار، گوندیان بەجێهێشتووە و ڕوویان لە شار کردووە. لە شار دەستیان بە شێوە بەرهەمهێنانێکی نوێ کردووە، بەڵام زەوییەکانی گوندیشیان هەر بەدەستەوە ماوە، لەبەرئەوە دەتوانین بڵێین ئەو پێکهاتەیەی دەسەڵاتی ئابوریی و کۆمەڵایەتیی هەولێری بەدەستەوەیە، لە یەک کاتدا سەرمایەدار و دەرەبەگە. خاوەنی ئاوەزمەندیی تێکەڵەی دەرەبەگایەتیی و سەرمایەدارییە. لەبەرئەوەی بەرهەمهێنان پێش ئاوەزمەندیی گۆڕانی بەسەردادێت، دەتوانینین بڵێین سەرمایەدارەکانی هەولێر بە بەرهەمی ئابوریی سەرمایەدارن، بەڵام بە کەلتور و هزری کۆمەڵایەتیی دەرەبەگن، بەو شێوەیە دەرەبەگەکانی هەولێر بەبێ گۆڕانکاریی ئاوەزمەندیی، پۆستی سەرمایەدارییان وەرگرتووە. ئاوەزمەندیی و کەلتوری قۆناغی خێڵ و دەرەبەگیان لەگەڵ بەرهەمهێنانی سەرمایەداریی تێکەڵکردووە، دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیی تایبەتیان بۆ شاری هەولێر دروستکردووە.

لە دوای ڕاپەڕیین دەسەڵاتدارانی پارتیی (بنەماڵەی بارزانیی) لە شاری هەولێر پێگەی ئابوریی خۆیان بەهێزکرد، جارێکی تر دەربەگ و سەرۆک_خێڵی دەرەوەی هەولێر، بە ئاوەزمەندیی ئاغایەتیی و دەربەگایەتییەوە دەستیان بەسەر ئابوریی شاری هەولێردا گرتووە، سیستەمی دەرەبەگایەتیی و سەرمایەدارییان ئاوێتەکردەوە. ئەگەر چاوێک بە پێگەی کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و ئیداریی ژنانی شاری هەولێردا بگێڕین، ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەکەوێت، کە لە شاری هەولێر بەشدارییکردنی ژن لە چالاکیی و کاری کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و ئیدارییدا لە چاو شاری سلێمانییدا لاوازە. ئەمە لە کاتێکدایە کە شاری هەولێر لە سلێمانیی کۆنتر و گەورەترە. هۆکارەکەی ئەوەیە کە ئاوەزمەندیی باڵادەستی دەرەبەگایەتیی شاری هەولێر، ڕێگە لە چالاکیی ژن دەگرێت. ڕێژەی ژنانی شاری هەولێر لە دەستەی باڵای حیزبە سیاسییەکانی باشووری کوردستاندا، لە چاو ڕێژەی ژنانی سلێمانییدا کەمە. لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ٢٠١٠دا یەکێتیی کۆنگرەی سێیەمی بەست، لەو کۆنگرەیەدا ١٠ ژن بە ئەندامی سەرکردایەتیی ئەو حیزبە هەڵبژێردران. لەو ١٠ ژنە هیچ کەسیان خەڵکی شاری هەولێر نەبوون.

لەم ساڵانەی دواییدا دەسەڵات هەوڵی گۆڕینی ژیانی ژنانی کوردستان دەدات، دەیانەوێت ژنی کورد لاسایی ژنانی کۆمەڵگەی ڕۆژئاوایی بکاتەوە. ئەم هەوڵە لە هەولێر زۆر چڕکراوەتەوە، ئەو مۆدێلە ژیانەی ژنان کە دەسەڵات پشتگیرییدەکات،

به کۆمەڵگەی کوردستان نامۆیە. شۆڕشی ئاوەزمەندیی نییە، لاسایکردنەوەی ژیانی لیبراڵیزمی سەرمایەداریی ئەوروپییە. ئەم هەوڵەی دەسەڵات لە لایەن کۆمەڵگەی کلاسیکییەوە بە ڕابەرایەتیی پیاوانی ئاینیی و حیزبە ئیسلامییەکان، دژایەتییەکی توندی دەکرێت. بەرانبەر بە ژنە مۆدێلەکانی دەسەڵات، حیزبە ئیسلامییەکان ژنانی کورد باڵاپۆشدەکەن و وێنە و ڤیدیۆکانیان بڵاودەکەنەوە. ئەمەی ئیسلامییەکانیش نەک شۆڕش و گۆڕانکاریی نییە، گەڕاندنەوەی کۆمەڵگەیە بۆ دواوە.

پێگەی شێخ و پیاوی ئاینیی لە شاری هەولێر و سلێمانیی جیاوازیی هەیە. ساڵی ١٩٨١ لە نەخۆشخانەکانی شاری هەولێر پزیشکی خولاو بووم، ڕۆژێکیان لە پەنجەرەی ژووری چارەسەری نەخۆشەکانەوە سەیری حەوشەی نەخۆشخانەم دەکرد، لەو کاتەدا دکتۆر مستەفا عالەمیی سەرۆکی فەرمانگەی تەندروستیی شاری هەولێرم بینی، سڵاوی لە پیاوێکی جلوبەرگ_کوردیی دەکرد، دکتۆر مستەفا دەستی بە سنگییەوە دەگرت و سەری بۆ دەچەماندەوە. بەو دیمەنە سەرمسوڕما! دەبێت ئەو پیاوە کێبێت هێندە گەورەبێت پزیشکێکی بەرپرسی بەدەسەڵات سوجدەی بۆ ببات. کەوتمە پرسیارکردن، بە دوای ناسنامەی ئەو پیاوەی دکتۆر مستەفا عالەم سوجدەی بۆ بردبوو گەڕام، دەرکەوت ئەو پیاوە ناوی شێخ لەتیفە، ئاغایەک و سەرمایەدارێکی گەورەی هەولێرە! بۆم ڕونبووەوە کە تێڕوانینی خەڵکی هەولێر و خەڵکی سلێمانیی بۆ شێخانی نەقشبەندیی زۆر جیاوازە. شێخانی نەقشبەندیی لە شاری هەولێر وەکو پێکهاتەیەکی گرنگی کۆمەڵایەتیی سەیردەکرێن، بەڵام خەڵکی شاری سلێمانیی بەو شێوەیە و بە گرنگییەوە سەیری شێخانی نەقشبەندیی ناکەن.ئاستەنگیی بۆ چالاکیی ژن و بەگرنگبینینی ڕۆڵی شێخان لە کۆمەڵگەدا، کە لە شاری هەولێر و دهۆک و دەوروبەریاندا باڵادەستە، لە هزری خێڵ و دەرەبەگەوە سەرچاوەیانگرتووە.

ئەو ڕەوشەی کۆمەڵگەی باشووری کوردستان (هەولێر)ی تێدا دەژی، زەمینەی ڕەخساندووە بۆ ئەوەی دەسەڵاتی خێڵ و بنەماڵەی بەرزانییەکان بە باشیی لەخۆبگرێت، وەکو سەرمایەدار و دەرەبەگ، قبوڵیان بکات.

**سلێمانیی:**

شاری سلێمانیی لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا بە بڕیاری دەوڵەتی عوسمانیی دروستکراوە. سلێمانیی کاتێک دروستکراوە کە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیی لە ئەوروپا لە

قۆناغی سەرمایەدارییدا دەبێت، ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە کوردستانیشەوە لە قۆناغی خێڵایەتیی و دەرەبەگایەتییدا دەبێت.

کاتێک بڕیاری دروستکردنی شاری سلێمانیی دەدرێت، دەرەبەگ و سەرۆک_خێڵەکانی کورد حەزناکەن لە ئاواکردنیدا بەشدارییبکەن. ئەو کەسایەتیی و بنەماڵانەی لە ئاواکردنی شاری سلێمانییدا بەشدارییانکردووە، خەڵکی هەژار و مامناوەندی کۆمەڵگەی کوردستان دەبن. لەو خەڵکانە دەبن کە لە گوندەکانی دەوروبەری سلێمانیی زەوی و کێڵگەی کشتوکاڵییان نییە. بە واتایەکی تر ئەو کەسانەی لە ئاواکردنی سلێمانییدا بەشدارییدەکەن، ئەو خەڵکانە بوون لە لایەن سەرۆک_خێڵ و دەرەبەگەکانی کوردستانەوە دەچەوسێنرێنەوە، بۆ دەرفەتێک دەگەڕێن خۆیان لە چەوسانەوە ڕزگاربکەن و پێگەیەک بۆ خۆیان دروستبکەن. کاتێک ئەو جۆرە خەڵکە دێنە ناو شاری سلێمانیی، بە کاری بازرگانیی و پیشەی دەستییەوە خەریکدەبن، بەڵام بارودۆخی سیاسیی کوردستان ڕێگەینەدا ئاواکەرانی سلێمانیی لە ڕووی ئابوورییەوە گەشەبکەن، بەرهەمهێنانی سەرمایەدریی لە سلێمانیی پێشبخەن و خۆیشیان ببن بە سەرمایەداری نیشتیمانیی. لە نێوان ئاوەزمەندیی خێڵ و دەرەبەگی دەرەوەی سلێمانیی و لە نێوان هزری سەرمایەدارانی عێراق و وڵاتانی تردا وێڵدەبن، نابن بە چینێکی سەربەخۆ، لە ڕووی بەرهەمهێنان و هزری سیاسیی و کۆمەڵایەتییەوە جێگیرنابن، لە نێوان سەرمایەدار و دەرەبەگدا دەمێننەوە.

ئەو پێکهاتەیەی شاری سلێمانیی ئاواکرد، سەرمایەداری بچووکی پێدەگوترێت، لە ڕووی ئابووریی و سیاسییەوە سەربەخۆ نییە، لە یەک کاتدا وابەستەی دەرەبەگی کوردستان و وابەستەی سەرمایەداری عێراق و وڵاتانی تر دەبێت، کاتێک دەربەگ و خێڵ لە کوردستاندا باڵادەستدەبێت، وەکو لە ڕاپەڕیین و شۆڕشە چەکدارییەکاندا، خەڵکی سلێمانیی لەگەڵ شۆڕش دەبن. کاتێکیش سەرمایەداری عێراق و حکومەتی عێراق لە کوردستاندا باڵادەستدەبێت، خەڵکەکە لەگەڵ عێراقی ناوەندیی دەبن، لەبەرئەوە زۆرێک لە خۆشگوزەرانەکانی سلێمانیی شار بەجێدەهێڵن و لە بەغدا نیشتەجێدەبن.

لە سەردەمی ڕاگواستن و ئەنفال و کیمیابارانی کوردستاندا شارۆچکە و گوند و ناوچەکانی پارێزگای سلێمانیی دوچاری زۆرترین وێرانکاریی و ڕاگواستنی زۆرەملێ هاتن. خەڵکی گوندەکان لە ئۆردوگاکانی نزیک شار و لە ناو شاردا نیشتەجێدەبن.

بەو شێوەیە ژمارەیەکی زۆر لە گوندنشینانی کوردستان دێنە سلێمانیی، جارێکی تر خووڕەوشتی جوتیاریی و خێڵەکیی لە سلێمانیی بەهێزدەکەن، کەلتور و ئاوەزمەندیی گوند لە ناو شاردا باڵادەستدەکەن.

دوای ئەوەی دەرگای گەشتی ئەوروپا و وڵاتانی تر بە ڕووی کوردستاندا کرایەوە، خەڵکی ناو شاری سلێمانیی لە خەڵکی شار و شارۆچکە و ناوچەکانی تری کوردستان زووتر و زۆرتر کوردستان بەجێدەهێڵن و ئاوارەی هەندەران دەبن، شوێنەکەیشیان بە خەڵکی گوند و شارۆچکەکانی دەوروبەری سلێمانیی پڕدەکرێتەوە. ئەم دیاردەیەیش هێندەی تر سلێمانیی گونداویی دەکات.

**دهۆک:**

هەتا ساڵی ١٩٦٨ دهۆک قەزایەکی شاری موسڵ بوو، ئەمە وایکرد پارێزگای دهۆک بۆ ماوەیەکی زۆرتر لە شارەکانی تری باشووری کوردستان لەژێر کاریگەریی کەلتور و ئاوەزمەندیی عەرەبی عێراقدا بژی. ئەم پەیوەندییە ئیداریی و ئابورییەی دهۆک لەگەڵ عەرەبدا، تایبەتمەندییەکی بۆ خەڵکی ئەو شارە دروستکرد، کەمێک لە شارەکانی تری کوردستانی دوورخستەوە. لەبەرئەوەی گەلی کورد زمانی یەکگرتووی نییە، خەڵکی پارێزگای دهۆک بە شێوەزاری کرمانجیی سەروو دەدوێن، شێوەزاری سۆرانیی بۆ نوسین بەکارناهێنن. ئەو پارێزگایە لە خوێندن و نوسیندا زۆرتر پشتیان بە زمانی عەرەبیی دەبەست. بەو شێوەیە جارێکی تر پەیوەندیی ڕۆشنبیریی لە نێوان پارێزگای دهۆک و عەرەبی عێراق فراوانتر دەبێت، پەیوەندییەکانی نێوان دهۆک و هەولێر و سلێمانیی لاوازتر دەبێت. تایبەتمەندییەکی تری پارێزگای دهۆک ئەوەیە کە لە دهۆکدا نەک تەنها هزر و کەلتوری خێڵ زاڵە، بەڵکو خێڵ لەسەر سیستەمی بەڕێوەبەرایەتییش حاکمە. کەسایەتیی و هونەرمەند و مامۆستای زانکۆ نابینیت لەقەبی خێڵەکەی خۆی هەڵنەگرتبێت و سەرۆک_خێڵ مەرجەعی نەبێت.

لایەنێکی تری گرنگی شاری دهۆک ئەوەیە کە هاوسنوورە لەگەڵ باکووری کوردستان، باکووری کوردستانیش وا نزیکەی چل ساڵە سەرقاڵی شۆڕشی نەتەوەیی و ڕەگەزیی و دیموکراتیی و ژینگەییە. ئەم شۆڕشەیش کاریگەریی لەسەر ئاوەزمەندیی خەڵکی پارێزگای دهۆک بەجێهێشتووە.

له دوای ڕاپەڕیین و ڕوخانی ڕژێمی سەدام، کاریگەریی شاری موسڵ و کەلتوری سیاسیی و کۆمەڵایەتیی عەرەب لەسەر شاری دهۆک لاواز دەبێت، لە جاران زیاتر دەبەسترێتەوە بە حوکمڕانیی هەرێم و شارەکانی تری باشووری کوردستانەوە.

**کەرکوک:**

شاری کەرکوک شارێکی دێرینی کوردستانە. لەو شارەدا کورد و عەرەب و تورکمان و نەتەوەکانی سەر بە ئاینی کریتسیانیی دەژین. هەموو پێکەوە ئاوەزمەندیی شاری کەرکوکیان پێکەوەناوە. لەبەرئەوە دەبینین لە هزری گەلی کورددا لە شاری کەرکوک و ناوچە دابڕاوەکانی تری باشووری کوردستان، برایەتیی گەلان و پێکەوەژیان لەگەڵ نەتەوەکانی تری عێراق و ناوچەکەدا دیاردەیەکی سروشتییە.

بەڵام ڕژێمە نەژادپەرستەکانی عێراق دژی ئەم دیاردە سروشتییە کاریانکردووە، دژی گەلی کورد و نەتەوەکانی تری سنووری پارێزگای کەرکوک سیاسەتی ڕەگەزپەرستیی و توانەوەی نەتەوەییان بەکارهێناوە. کوردیان لە کەرکوک و خانەقین و شار و شارۆچکەکانی تری باشوور ڕاگواستووە. ئەو کوردانەی لەو ناوچانەدا ماونەتەوە لە مافەکانیان بێبەشکراون، بەو هۆیەوە گەلی کورد لەو ناوچەیەدا متمانەی بە یەکێتیی گەلان و پێکهاتە نەتەوەیی و ئاینیی و مەزهەبییەکانی کەرکوک و بە تایبەت گەلی عەرەب لاوازبووە. دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام، پەیوەندیی ڕاستەوخۆ لە نێوان حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشووری کوردستان و خەڵکی ناوچە دابڕاوەکاندا دروستدەبێت، بەڵام بەهۆی سیاسەتی نادیموکراتیی و حیزبچێتیی و گەندەڵیی حیزبە کوردییەکانەوە، نەتەوەکانی تری کەرکوک لە ناوچە دابڕاوەکاندا بڕوایان بە پێکەوەژیان لەگەڵ کورد لاوازدەبێت، بەرانبەر بە گەڕانەوەی کەرکوک و ناوچە دابڕاوەکانی کوردستان بۆ سەر هەرێمی کوردستان، دوچاری نیگەرانیی و ڕەشبینیی و دڵەراوکێ دەبن.

جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ دەستووری عێراق دوادەکەوێت، هێزە ناوچەیی و جیهانییەکان دەستدەخەنە ناو کاروباری کەرکوکەوە. دەسەڵاتدارانی هەرێم و نوێنەرانی کورد لە عێراق، بەرانبەر بە جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ و ڕەوشی تایبەتەی کەرکوک کەمتەرخەمدەبن، بەو هۆیەوە کوردستانیبوونی کەرکوک و ناوچە دابڕوەکان گومانی

تێدەکەوت. ئەمە بێباوەڕییەکی لە لای خەڵکی ئەو ناوچانەی کوردستان دروستدەکات، کە بە ڕوونیی ناسنامەی نەتەوەیی و چارەنوسی سیاسیی خۆیان نابیننەوە.

بەهۆی سیاسەتی ناکۆک و نانەتەوەیی پارتیی و یەکێتییەوە، لە ١٦ ئۆکتۆبەری ساڵی ٢٠١٧دا هێزی چەکداریی عێراق دەستی بەسەر کەرکوکدا گرتەوە. کۆتایی بە ١٤ ساڵ دەسەڵاتی کورد لە کەرکوک هێنا. چەوسانەوەی کورد و بەعەرەبکردنی کەرکوک لە لایەن دەسەڵاتی عێراقی ناوەندییەوە دەستیپێکردەوە، ئیتر کوردی کەرکوک هیندەی تر دوچاری ڕەشبینیی و بێباوەڕیی دەبنەوە.

## ٥- ئاوەزمەندیی پێکهاتە کەلتورییەکانی کوردستان:

### فەیلیی و شەبەک و ئێزیدیی:

هەتا ڕوخانی ڕژێمی سەدام، گومان لەسەر کوردبوونی فەیلیی و شەبەک و ئێزیدیی نەبوو. فەیلیی لە سنووری پارێزگای بەغدا و شەبەک لە سنووری پارێزگای نەینەوا بە دوو پێکهاتەی سەر بە نەتەوەی کورد ئەژماردەکران. فەیلیی و شەبەک بە شێوە دیالێکتێکی تایبەتی خۆیان دەدوێن، لە هەورامیی و لوڕییەوە نزیکن. ئێزیدیی ئاینی تایبەتی خۆیان هەیە و بە زمانی کرمانجیی دەدوێن.

لەبەرئەوەی دەسەڵاتی کوردیی لە باشووری کوردستان پرۆژەی بەنەتەوەییکردنی کوردی فەرامۆشکرد، هەر خەریکی قووڵکردنەوەی بەخێڵکردنی کورد بوو، ناسنامەی ئاینزای شیعە بەسەر ناسنامەی نەتەوەیی فەیلیی و شەبەکدا زاڵبوو. فەیلیی لە بورای سیاسییدا وەکو پێکهاتەیەکی گشتیی عێراق لە هێزە شیعەکانەوە نزیکبووەوە، وەکو شیعە هەڵوێست وەردەگرن و چالاکیی دەنوێنن، لە کوردبوون دوورکەونەوە.

لە ناو شەبەکیشدا چەند مەیلێک دروستبووە، مەیلێک وای بۆ دەچێت کە شەبەک پێکهاتەیەکی ئاینزای شیعەیە، خۆیان بە پێکهاتەیەکی شیعەیی پیشاندەدەن. لە ڕووی نەتەوەییەوە وەکو عەرەب هەڵسوکەوتدەکەن. مەیلی دووەم لە ناو شەبەکدا ئەوەیە کە خۆیان بە کورد دەزانن، ئەم مەیلە بەرەو لاوازیی دەچێت.

لە ناو ئێزیدییەکاندا چەند مەیلێک هەیە، هەندێکیان خۆیان بە کورد دەزانن، مەیلێکی تریش هەیە باس لەوە دەکەن کە ئێزیدیی لە ڕووی نەتەوەییەوە کورد نین. ئێزیدییەکان

لە مێژوودا چەندیین جار کۆمەڵکوژکراون، بەڵام خۆیان بە دەست دوژمنەوە نەداوە، داکۆکییان لە خۆیان کردووە. لەسەر پەیڕەوکردنی ئایینی خۆیان بەردەامبوون. لە هاوینی ساڵی ٢٠١٤دا، داعش پەلاماریدان و کۆمەڵکوژیکردن. ئەو کۆمەڵکوژییەی داعش جارێکی تر کوردبوون و کوردنەبوونی ئێزیدییەکانی زیندووکردەوە، دوای ئەو کۆمەڵکوژییە ئێزیدییەکان زیاتر وەکو پێکهاتەیەکی ئاینیی زوڵملێکراو دەناسرێن، لەبەرئەوەی داعش وەکو کەمینەی ئاینیی پەلاماریدان. بەو شێوەیە فەیلیی و شەبەک و ئێزیدیی لە کوردبوون دووردەکەونەوە، ئاوەزمەندیی کوردنەبوون لە ناویاندا پێشدەکەوێت، زیانێکی گەورەیش نەتەوەبوونی کورد دەگەیەنن.

### ناوچەی هەورامان:

بەشی ڕۆژهەڵاتی باشووری کوردستان و ڕۆژئاوای ڕۆژهەڵاتی کوردستان، ناوچەی هەورامانە. دەمێکە لە ناوچەی هەوراماندا قوناغی خێڵایەتیی و بنەماڵەگەریی کۆتاییهاتووە. هەر هەورامییەک خاوەنی ئیرادەی خۆیەتی و ئینتمای بۆ بۆ نەتەوە و نیشتیمانەکەی هەیە.

هەورامییەکان کێشەکانیان لە ڕێگەی خێڵ و بنەماڵەوە چارەسەرناکەن، بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانیان پەنا بۆ یاسا دەبەن. لە هەورامان لە بواری کۆمەڵایەتییدا دیاردەی فرەژنیی و گەورە بە بچووک هەر نەبووە. لە باخداریی و سەوزکردنی شاخەکاندا هۆنەریان نواندووە و حەزی زۆریان بۆ کارکردن هەبووە.

لە ناو خەڵکی کوردستاندا زیرەکیی هەورامییەکان بەناوبانگە. ئەو لایەنە باشانەی ژیانی کۆمەڵایەتیی و ئاوەزمەندیی خەڵکی هەورامان، لە ئەنجامی ئەوەوە هاتووە کە خەڵکی هەورامان بە قووڵیی و بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لەژێر کاریگەریی ئاوەزمەندیی زەردەشتدا (بیری چاک، وتنی چاک، کرداری چاک) ژیاوە و شوێنی ئاوەزمەندیی خێڵی گرتووەتەوە. زانیارییە مێژوویی و ئاسەوارناسییەکان ئەوەیان پشتڕاستکردووەتەوە، کە نزرگاکانی زەردەشت و سۆفییەکانی لە چەندیین گوندی ناوچەی هەوراماندا چالاکبوون. لە گوندی گوڵپ کانییەک هەیە پێیدەڵێن: کانیی پیرشالیاری زەردەشتیی. لە نزیک ناحیەی بیارە شوێنێک هەیە پێیدەگوترێت: ئاتەشگا.

گاتەکانی زەردەشت بە زمانێک نوسراوەتەوە کە لە زاراوەی هەورامیی ئەمڕۆوە نزیکە. ئەگەرچی ئاینی زەردەشتیی لە هەوراماندا نەماوە، بەڵام باوەڕ و کەلتوری ئاینی زەردەشت و کەلتوری ڕەسەنی ناوچەکە هەتا ئێستایش بە زیندوویی ماوەتەوە و بەربەرەکانێی ئاوەزمەندیی خێڵ دەکەن. لەبەرئەوەی ناوچەی هەورامان ناوەڕاستی کوردستانە و لە ڕووی تۆپۆگرافییەوە ناوچەیەکی سەختە، دوژمنانی کورد هەتا گەیشتوونەتە ئەو ناوچەیە هێندە شەڕیان لەگەڵ کراوە ماندووبوون، پێیاننەکراوە ناوچەی هەورامان داگیربکەن و کەلتورەکەی تاڵانبکەن. سەختیی شاخەکانی ناوچەی هەورامانیش دەرفەتی بۆ خەڵکی ناوچەکە ڕەخساندووە خۆیان لە هێرشە جەستەیی و هزرییەکانی دوژمن بپارێزن.

ئەو ئاوەزمەندیی و کەلتورە تایبەتەی ناوچەی هەورامان بە بەردەوامیی لەژێر هێرشی هزر و کەلتوری خێڵەکیی ناوچەکانی تری باشووری کوردستاندا بووە، ئەو هێرشە بە شێوەی جیاجیا لە لایەن کۆمەڵگەی خێڵەکیی و وردەبۆرجوازی ناوچە هاوسنوورەکانی هەرورامانەوە بەڕێوەدەچێت. پاش هەرەسی شۆڕشی ئەیلول، گوندەکانی ناوچەی هەرورامان گوازرانەوە، لە ئوردوگا زۆرەملێکانی ناوچەی شارەزوور نیشتەجێکران. کۆمەڵگەی هەورامان لەگەڵ کۆمەڵگەی خێڵەکیی ناوچەی شارەزوور تێکەڵبوو، بەڵام ئاوەزمەندیی خێڵەکیی شارەزوور چەندە هەوڵیدا، نەیتوانی بەسەر ئاوەزمەندیی ناوچەی هەوراماندا سەربکەوێت. هزری ئاشتییخوازیی و جولانەوەی نەرمیی پیاو لەگەڵ ژندا، بەکارهێنانی یاسا بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان و عەشق و دڵسۆزیی هەورامییەکان بۆ کار و پیشە، بەرگریی لە پاراستنی ئاوەزمەندیی هەورامییەکان دەکات و هێرشی ئاوەزمەندیی خێڵەکیی تێکدەشکێنێت.

بەرانبەر بەو جیاوازییە ئاوەزمەندیی و ناکۆکانەی کۆمەڵگەی باشووری کوردستان، هێزە سیاسییەکانی باشوور و حکومەتی هەرێم، نەک هەر بەرنامەیەکیان بۆ نزیککردنەوەی ئەو ئاوەزمەندییە جیاوازەی خەڵکی باشووری کوردستان دانەنا، سیاسەتیان لەسەر ئەو واقیعە هزریی و کۆمەڵایەتییە ناکۆکانە درێژەپێدا. زۆر جاریش بۆ بەرژەوەندیی خۆیان جیاوازیی و ناکۆکیی لە ئاوەزمەندیی کۆمەڵگەی کوردستاندا دروستدەکەن.

دوای ڕاپەڕیین دەرفەتێکی لەبار بۆ حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشوور ڕەخسا هەتا دیاردەی خێڵایەتیی لە باشووری کوردستان لاوازبکەن، پرۆژەی بەنەتەوەکردنی کورد پێشبخەن، ئاوەزمەندیی شار و ناوچە و پێکهاتە کەلتورییەکانی کوردستان لە یەکتر نزیکبکەنەوە و یەکیانبخەن، بەڵام ئەوەی حیزبە دەسەڵاتدارەکانی هەرێم و پەرلەمان و حکومەت بە لایدا نەچوون ئەمە بوو.

لە سەردەمی ڕژێمی سەدامدا دیاردەی جاشایەتیی لە ڕێگەی سەرۆک_خێڵەکانەوە بەڕێوەدەبرا. ڕاپەڕیینی بەهاری ١٩٩١ هێزەکانی ڕژێمی بەعس لە باشووری کوردستان ڕاماڵی، ئەو سەرۆک_خێڵانەی چەکداری ڕژێمی سەدام بوون، خۆیان ڕادەستی سەرکردایەتیی ڕاپەڕینەکە کرد. دەرفەتێکی زێڕیین بۆ کۆتاییپێهێنانی کۆمەڵگەی خێڵەکیی کوردستان و بۆ بەنەتەوەییکردنی کورد هاتەپێشەوە، دەکرا لە ڕێگەی چەککردن و کەمکرنەوەی دەسەڵاتی سەرۆک_جاشەکانی کوردستانەوە، دەسەڵاتی سەرۆک_خێڵەکانی باشووری کوردستانیش کەمبکرێتەوە. ئاوەزمەندیی خێڵایەتیی لاوازبکرێت و لەناوببرێت، بەڵام نە حیزبە دەسەڵاتدارەکان، نە حکومەتی هەرێم، نە پەرلەمانی کوردستان، هیچ هەنگاوێکیان بۆ ئەو مەبەستە هەڵنەهێنا. وەکو ڕژێمی سەدام لەسەر سیاسەتی گرێدانی خەڵکی کوردستان بە خۆیانەوە لەسەر بنەمای خێڵ و بنەماڵە بەردەوامبوون.

لەبەرئەوەی پارتیی حیزبێکی خێڵەکیی و بنەماڵەییە، دژی دیاردەی خێڵایەتیی کارناکات، پارتیی و یەکێتیی لەسەر دەسەڵات ململانێیان هەیە، دەبوو یەکێتیی دژی ئاوەزمەندیی خێڵایەتیی کاریبکردایە، کەچی یەکێتیی سیاسەتێکی ستراتیژیی پەیڕەونەکرد. ئەگەر بیویستایە پارتیی لاوازبکات، دەبوو کاری بۆ لاوازکردنی دیاردەی خێڵایەتیی باشووری کوردستان بکردایە، بەڵام یەکێتیی بۆ لاوازکردنی پارتیی سیاسەتێکی تاکتیکیی پەیڕەودەکات. ئەو خێڵانەی باشووری کوردستانی بەهێزدەکات کە دژی خێڵی بەرزان و بنەماڵەی بارزانیی دەوەستنەوە و دوژمنایەتییاندەکەن. بەم شێوەیە ململانێ و ناکۆکییەکانی نێوان پارتیی و یەکێتیی هێندەی تر ئاوەزمەندیی خێڵایەتیی لە باشووری کوردستان بەهێزدەکات، ڕێگەی نەتەوەییبوون و شارستانییبوونی کۆمەڵگەی کوردستان بەرتەسکتر دەکەنەوە.

لە دوای ڕاپەڕینەوە حیزبە دەسەڵاتدارەکانی ناو حکومەتی هەرێمی کوردستان،

بەرنامەیەکی نەتەوەییان لە بەرانبەر هێرشەکانی سەر نەتەوەبوونی گەلی کورد پەیڕەونەکرد. ئاوەزمەندیی یەکێتیی نەتەویی کوردیان نەخستە شوێنی ئاوەزمەندیی ناوچەگەریی و خێڵایەتیی. کاریگەریی کەلتوری عەرەبیان لەسەر شارەکانی دهۆک و کەرکوک و ناوچە دابڕاوەکانی تر کەمنەکردەوە. فەیلیی و شەبەک و ئێزیدییەکانیان لە نەتەوەی کورد نزیکنەخستەوە. هزر و کەلتوری ناوچەی هەورامانیان پەرەپێنەدا.

بە شێوەیەکی گشتیی دەسەڵاتی کوردیی لە دوای ڕاپەڕیین کاری بۆ ئەوە نەکرد کۆمەڵگەی کوردستان لە کۆمەڵگەیەکی پچڕپچڕی ئاوەزمەندیی و کەلتوریی جیاوە، بۆ کۆمەڵگەیەکی لەیەکەوەنزیک و هاوسەنگ بگۆڕێت. ئەمەیش یەکێک لەو هۆکارانەیە کە سیاسەت و بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات، هەتا ئێستا سکەی سروشتیی پێشکەوتنی وەرنەگرتووە.

## ٦- ئاوەزمەندیی پارچەکانی تری کوردستان و باشور

گەلی کورد لە باشووری کوردستان لە چاو پارچەکانی تری کوردستاندا، لەژێر نزمترین ئاستی هزر و تەرزی تێکۆشانی نەتەوەیی و دیموکراتییدا پۆلێندەکرێت. هۆکارەکەی ئەوەیە کە کوردی عێراق لەژێر کاریگەریی دەسەڵات و کۆمەڵگەی عەرەبی عێراقدا دەژی. عەرەبی عێراقیش نزیکەی ٦٠٠ ساڵ زیاترە کۆمەڵگەیەکی ژێردەست و داگیرکرابوو، ژێردەستەی دەوڵەتی عوسمانیی و دەوڵەتی ئێران بووە.

هزری کۆمەڵگەی تەریقەتیی تورکیا و هزری کۆمەڵگەی شیعەگەریی ئێران، دوو ئاراستەی ناکۆک و دژبەیەکیان هەیە، کۆمەڵگەی عێراقیان داڕماندووە. ئیتر باشووری کوردستان لەژێر کاریگەریی کۆمەڵگەیەکی داگیرکراو و ناکۆکبەیەکی عێراقیدا ژیاوە. کەوابوو کورد لە باشووری کوردستان، دوو جار داگیرکراوە، جارێک لە لایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە، جارێک لە لایەن ویلایەتی عێراقی عەرەبی سەر بە دەوڵەتی عوسمانییەوە، بەڵام کۆمەڵگەی ڕۆژهەڵات و باکووری کوردستان تەنها یەک جار لە لایەن دەوڵەتی ئێران و دەوڵەتی عوسمانیی و کەلتوری کۆمەڵگەکەیانەوە داگیرکراون.

پارچەکانی تری کوردستان بە تایبەت باکوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان، بە شێوەیەکی ڕاستەخۆ بۆ ماوەی سەدان ساڵ لە لایەن هەردوو دەوڵەتی عوسمانیی

و ئێرانەوە حوکمکراون. ئەو دوو دەوڵەتە، بە دەسەڵات و کۆمەڵگەوە، لە ئاستی کەلتوریی و سیاسیی و ئابورییەوە، لە داگیرکەرانی باشووری کوردستان گەشەکردووتر بوون. بەم شێوەیە دەبینین کە کۆمەڵگەی باشووری کوردستان کەمتر چاوی بە پێشکەوتن و شارستانیەتی دەوڵەت و کۆمەڵگەی شارستانیی کراوەتەوە، کەمتر گۆڕان و گەشەکردن لە هزریدا دروستبووە. سالانی ١٩٨٢ - ١٩٩١ لە شاخ و دەشتەکانی باشووری کوردستان پێشمەرگە بووم، لە هەندێک شوێن بارەگای پێشمەرگەی باشوور و پێشمەرگەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە یەک نزیکدەبوونەوە، جارجارەیش هاتوچۆ و تێکەڵبوون دروستدەبوو. هەڵسوکەوتی پێشمەرگەکانی خۆمانم (باشووری کوردستان) لەگەڵ هەڵسوکەوتی پێشمەرگەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا بەراورددەکرد، هەستمدەکرد هەڵسوکەوت و شێوازی ڕاپەڕاندنی کاری حیزبایەتیی و پێشمەرگایەتیی لە ناو هێزەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان لەگەڵ هەڵسوکەوت و ڕاپەڕاندنی کاری حیزبایەتیی و پێشمەرگایەتیی هێزەکانی باشووردا جیاوازە. پێوانەی هەڵسوکەوت و کارکردنی ڕۆژهەڵاتییەکان لە چاو باشوورییەکاندا گەلێک شارستانییتر دەردەکەوت.

بۆ نمونە لە چەندیین گوندی ئازادکراوی باشووری کوردستاندا، پزیشکانی باشووری سەر بە حیزبەکانی باشوور و پزیشکانی ڕۆژهەڵاتی سەر بە حیزبەکانی ڕۆژهەڵات بنکەی تەندروستییان دروستدەکرد. تیماری برین و نەخۆشیی جەماوەری ناوچەکە و پێشمەرگەیان دەکرد. ئێمەی پزیشکەکانی شۆڕشی کورد لە باشوور، بیستوچوار کاتژمێر بەبێ پشوو، کاری بێبەرنامە و ناڕێکوپێکمان دەکرد. پێشمەرگە و خەڵکی ناوچە ڕزگارکراوەکانی کوردستان بەبێ دیاریکردنی کات و شوێن، لە نەخۆشخانە، لە بارەگا، لە ناو ماڵدا، سەردانی پزیشکیان دەکرد و داوای چارەسەری نەخۆشییان دەکرد. نەشماندەوێرا بچینە ناو دانیشتنێکی گشتیی پێشمەرگەوە، کادر و بەرپرسەکان بە برسیاری هەمەجۆر دەربارەی باری تەندروستیی و جۆری دەرمان و جۆری خواردن و هیی تر، بە پرسیار دایاندەگرتینەوە. هەندێک لە پزیشکان لەبەر ئەو بێسەروبەرییەی کاری پزیشکیی لە ناو شۆڕشدا، دەستیان لە کاری پێشمەرگایەتیی هەڵگرت و گەڕانەوە بۆ عێراق، یان ئاوارەی هەندەران بوون*١.

بەڵام کاتێک سەردانی نەخۆشخانەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و کۆمەڵەمان دەکرد، دەمانبینی کە لە ڕۆژێکدا چەند کاتژمێرێکی دیاریکراویان بۆ کار

داناوە. لەو کاتانە زیاتر مەگەر ڕوداوی ئاوارتە (دۆخی تایبەت) هەبێت، ئەگینا پزیشکان و کارمەندانی تەندروستیی لە باری پشوودان و خۆپەروەردەکردندا دەمانەوە.

پاش کارەساتی ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجە، هێزی پێشمەرگە بەرەو سنووری نێوان عێراق و ئێران پاشەکشەیکرد. ئەو پێشمەرگانەیش خاوەنی خێزان بوون لە شار و شارۆچکەکانی ئێران لە سنووری ڕۆژهەڵاتی کوردستان نیشتەجێبوون، من ماوەی دوو ساڵ زیاتر لە شاری سنە و سەقزی ڕۆژهەڵاتی کوردستان مامەوە. ئەو کاتانەی لەوێ مامەوە، سەردانی چەندیین شار و ناوچەی تری ئێرانم دەکرد. بۆم دەرکەوت کە جیاوازیی ئاوەزمەندیی خەڵکی ڕۆژهەڵاتی کوردستان و خەڵکی باشوور، جیاوازیی هەڵسوکەوت و ڕاپەڕاندنی کارەکانی پێشمەرگەکانی باشوور و ڕۆژهەڵاتیان دروستکردووە. ئاوەزمەندیی و ڕەفتاری خەڵکی ڕۆژهەڵات لە ئاستێکی شارستانیی پێشکەوتووتردا بوو. جۆری لێدوان و هەڵسوکەوتیان لەگەڵ پزیشک و نەخۆش و دەرمان و ئاو و کارەبا و سواربوونی پاس و سەرەگرتنی نانەوادا، بە بەراورد لەگەڵ خەڵکی باشووری کوردستان شارستانییتر و پێشکەوتووتر بوو. ڕۆژانی هەینیی هەموو بازاڕەکانی شاری سنە دادەخران و خەڵکی شار بە تەواویی پشوویان وەردەگرت.

هۆکاری ئەو جیاوازییەیش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە خەڵکی ڕۆژهەڵاتی کوردستان لەگەڵ سیستەمێکی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی پێشکەوتووتردا ژیاوە. خەڵکی باشووری کوردستان لەگەڵ سیستەمێکی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی دواکەوتووتردا ژیاوە.

پێش ئەوەی بچمە ڕیزی هێزی پێشمەرگەی کوردستانەوە، لە نێوان ڕێکخستنی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان کارمدەکرد. لە ناو ڕیزەکانی کۆمەڵەدا لە باشووری کوردستان، گفتوگۆیەکی چڕوپڕ هەبوو، لەسەر ئەوەی کە ئایا کورد نەتەوەیە، یان نەتەوە نییە؟ ئایا کوردستان لە لایەن دەوڵەتانی عێراق و ئێران و تورکیاوە داگیرکراوە، یان نا؟ ئەم گفتوگۆ ناکۆکە لە ناو سەرتاپای ڕۆشنبیر و سیاسەتمەدارانی باشووری کوردستاندا بڵاوبوو. لە سەردەمی خەباتی پێشمەرگایەتییدا، لە شاخەکانی کوردستان ئەم مشتومڕە هەر بەردەوامبوو، ساخنەکرابوویەوە.

لە سەرەتای هەشتاکانی سەدەی بیستدا کاتێک حیزبە سیاسییەکانی باکووری کوردستان (ئاڵای ڕزگاریی، کاوە، پ. ک. ک) هاتنە سنووری باشووری کوردستان

و تێکەڵاوییان لەگەڵ حیزبەکانی باشووردا پەیداکرد. ئەدەبیاتی ئەو حیزبانەمان بەرچاوکەوت و بینیمان هەموو لایەنە سیاسییەکانی باکووری کوردستان هیچ گومانیان لەوە نییە کە کورد نەتەوەیە و کوردستان داگیرکراوە. ئەم بەرچاوڕوونییە هزرییەی بزاڤی ئازادیخوازی گەلی کورد لە باکووری کوردستان، هاوکارییەکی مەزنی ئاوەزمەندیی سیاسیی باشووری کوردستانی کرد و گەلێک کێشەی ڕێکخستن و ئایدۆلۆژیی و سیاسیی بۆ چارەسەرکردین.

## ٧- ئاوەزمەندیی جیهانیی و ئاوەزمەندیی کورد

لە زۆربەی کۆمەڵگەکانی جیهاندا، کۆمەڵگە لە قۆناغی نیۆلۆتیک بۆ کۆمەڵگەی کۆیلەداریی، لە کۆیلەداریی بۆ دەرەبەگایەتیی، لە دەرەبەگایەتیی بۆ کۆمەڵگەی سەرمایەداریی، گۆڕانی ئابوریی و هزریی و سیاسیی بەسەرداهاتووە. لە نیشتیمانی کوردان و لە کۆمەڵگەی کۆن و نوێی کوردستاندا ئەم گۆڕانکارییانە بە ڕوونیی نابینرێن. ئەو گۆڕانکارییانەی لە کۆمەڵگەی کوردستاندا دروستبوون، بچووک و سەرەتایی و نیوەناچڵ بوون. پێیاننەکراوە هزر و سیستەمی کۆمەڵگەی سەرەتایی و خێڵەکیی کوردستان بگۆڕن.

زەردەشت و مانیی دوو بیرمەندی گەورەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و کوردستان بوون. لە سەردەمی پیربوونی کۆمەڵگەی کۆیلایەتییدا دەرکەوتوون و هەوڵی گۆڕانکارییان داوە، بەڵام بەرنامەکەیان سەرکەوتنی ئەوتۆی بەدەستنەهێناوە، هزر و فەلسەفەیان کاریگەرییەکی کەمی لەسەر کۆمەڵگەی کوردستان بەجێهێشتووە*٢.

هەر سێ ئاینە ئاسمانییەکانی یەهودیی و مەسیحیی و ئیسلام، لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەدایکبوون، بەڵام ئەو ئاینانە پێکهاتەکانی باپیرانی کوردیان ئازادنەکرد، کاریگەرییان بۆ سەر گەشەپێدانی هزری خەڵکی کوردستان نەبوو. خەڵکی کوردستانی نەکرد بە پێکهاتەیەکی چالاک. کوردی بە پێکهاتە چالاکەکانی ئەو ئاینانەوە گرێدا. کورد وەکو پێکهاتەیەکی ناسەرەکیی و خزمەتکاری ئاینی ئیسلام و لەوێشەوە خزمەتکاری دەوڵەتە ئیسلامییەکانی ئەو سەردەمە دەرکەوت.

لە سەدەی ١٢ زاینیی بە دواوە، ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە شێوەیەکی گشتیی

دەرگای کرانەوە و گۆڕانکاریی لەسەر هزری خۆی داخست*٣. سەلجوقییەکان و فاتمییەکان و دەوڵەتی عوسمانیی و دەوڵەتی ئێران، کە بوونە میراتگری دەوڵەتی عەباسیی، ئامانجیان گۆڕینی کۆمەڵگە و وەرچەرخانی هزری کۆمەڵگە نەبوو، ئامانجیان دەستبەسەراگرتنی وڵاتانی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بوو، بۆ ئەوەی بتوانن بە ئاسانیی وڵاتانی ناوچەکە داگیربکەن. بۆ پاراستنی دەسەڵاتیان دەبوو ئاوەزمەندیی گەلانی ناوچەکە بەبێ گۆڕانکاریی لە شوێنی خۆی بمێنێتەوە و گەشەنەکات.

زۆربەی پێکهاتە نەتەوەییەکانی سەر بە ئیسلام، بەگوێرەی بەرژەوەندییە نەتەوەییەکانی خۆیان هەڵسوکەوتیان لەگەڵ ئاینی ئیسلامدا دەکرد، لە ڕێگەی ئاینزا و ڕێگەی ئاینییەوە، ئاین و نەتەوەی خۆیان لە نەتەوە سەردەستەکان جیاکرووەدەتەوە. فارس لە ڕێگەی شیعەگەراییەوە، تورک لە ڕێگەی برەودان بە ڕێگەی ئاینی نەقشبەندیی و بەکداشییەوە، ئیسلامی تایبەتی خۆیانیان دروستکردووە و لە ئیسلامی عەرەب جیایانکردووەتەوە. ڕێگەیاننەداوە عەرەب لە ڕێگەی ئاینەوە باڵادەستیی خۆی بەسەریاندا بسەپێنێت و تایبەتمەندیی نەتەوەییان بسڕێتەوە.

گەلی کوردی مسوڵمان زۆر کەم بیری لەوە کردووەتەوە ئاینزایەکی تایبەتی خۆی هەبێت، زۆربینەی کات توانای خۆی بۆ داکۆکیی لە ڕێگە ئاینە باو و باڵادەستەکە بەکارهێناوە. بەو شێوەیە کورد نەیتوانی ببێتە خاوەنی ئاوەزمەندییەکی ئاینیی تایبەت بە خۆی هەتا بە شێوەیەکی هاوسەنگ ئەرک و مافە نەتەوەیی و ئاینییەکانی بەڕێوەببات.

لە کاتی ڕێنسانس و ڕۆشنگەریی و ڕیفۆرمی ئەورووپای سەدەکانی شازدە و حەڤدەی زایینیدا، گۆڕانکارییەکی جدیی لە ئاوەزمەندیی تاک و پێکهاتەکانی کۆمەڵگەی ئەورووپا بەدیهات. سکۆلاریزم و مرۆڤدۆستیی و ئازادیی تاک لەدایکبوون و شوێنی چەمکە کۆنەکانیان گرتەوە. شۆڕشەکانی ئینگلتەرا و ئەمریکا و فەرەنسا و ڕووسیا، ڕژێمە دەربەگەکانی وڵاتانی ئەورووپایان ڕوخاند. لەگەڵ لەناوبردنی فەرمانڕەوا دەرەبەگەکانی ئەو وڵاتانەدا، شەڕی جدییان دژی ئاوەزمەندیی کۆمەڵگەی دەرەبەگایەتیی دەستپێکرد.

ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست وەکو ئەورووپا بە قۆناغی ڕێنیسانس و ڕۆشنگەریی و ڕیفۆرمدا تێنەپەڕی. کاتێک ئایدۆلۆژیا و سیستەم و هزری کۆمەڵگەی سەرمایەداریی

ئەوروپا ڕێگەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستی گرتەبەر، لەبریی ئەوەی دەوڵەتانی عوسمانیی و ئێرانیی بەسەر یەکدا بڕوخێنێت و لە شوێنیان سیستەمێکی نوێی سەرمایەداریی ئاوابکات، سیستەمی سەرمایەداریی جیهانیی ئەو دەوڵەتانەی داگیرکرد و دەستەمۆیکردن. بەو شێوەیە بۆ ماوەی چەندین ساڵ تەمەنی سیستەمی وڵاتانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستی درێژکرد و ڕێگەی ڕوخان و دارمانی کۆمەڵگەی کۆنی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستی دواخست.

لە جەنگی یەکەمی جیهانییدا کاتێک دەوڵەتی عوسمانیی ڕوخا و دەوڵەتی ئێران لاوازبوو، دەوڵەتە سەرمایەدارەکانی جیهان ڕێگەیاننەدا گۆڕانکاریی لە ئاستی هزردا بەسەر دیدی دانیشتوانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا بێت*٤، بە واتایەکی تر گۆڕانکارییەکانی سەردەمی جەنگی یەکەمی جیهانیی لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا ڕوکەش بوون. ئاوەزمەندیی کۆمەڵگە گۆڕانێکی ئەوتۆی بەسەردانەهات. ئەمەیش وایکرد لە جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانییدا کۆمەڵگەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و لە ناویشیدا کۆمەڵگەی کوردستان لە ئاستی ئاوەزمەندیی و ژیاندا گۆڕانکارییەکی ئەوتۆی بەسەردانەیەت.

ئەگەر هەڵسوکەوتی تاکێکی عێراقیی لەگەڵ هەڵسوکەوتی تاکێکی ئینگلیزیی لە بەرانبەر ڕوداوێکدا بەراودبکەین، جیاوازیی هەڵسوکەوتی ئەو تاکانەمان بۆ دەردەکەوێت و جیاوازیی نێوان بیرکردنەوەی تاکەکان دەبینین. کۆمەڵناس و بیرمەدی گەورەی عێراقیی دکتۆر عەلی وەردیی لە یەکێک لە شاکارەکانیدا وا دەنوسێت: «لە لەندەن لای منداڵێکی بۆیاخچیی پێڵاوەکانم بۆیاخدەکرد، پیاوێکی کەشخەی چاکەتوپانتۆڵ لەبەر لە منداڵەکە نزیکبووەوە و پێکەوە دەستیان بە قسەکردن کرد. لە هەڵسوکەوت و قسەکانیاندا هەستمکرد ئەم دوو کەسە زۆر لە یەکەوە نزیکن، بەڵام جیاوازیی تەمەنی نێوانیان و جیاوازیی جلوبەرگەکەیان وایلێکردم کە بەو پەیوەندییەی نێوان ئەو دوو کەسە سەرمسوڕبمێنێت، لەبەرئەوە پرسیارم لە بۆیاخچییەکە کرد و گوتم: ئەو پیاوە کێیە؟ بۆیاخچییەکە بە ئاسانیی و بەبێ هیچ زەحمەتییەک گوتی: ئەوە برادەرمە. گوتم: پیشەی چییە؟ گوتی: وەزیرە *٥.

لە ئاوەزمەندیی دکتۆر عەلی وەردییدا گونجاو نییە بۆیاخچییەک و وەزیرێک پەیوەندیی هاوڕێیەتییان هەبێت. لەبەرئەوە ئەو پرسیارەی بە سەرسوڕمانەوە لە

بۆیاخچییەکە کردووە، بە ئاوەزمەندیی بۆیاخچییەکەیش ئەوە کارێکی ئاساییە کە وەزیرێک و بۆیاخچییەک هاورێبن.

ئەو چەمکەی کە لە پشت هزری ئاسایی بینینی هاورێیەتیی نێوان وەزیر و بۆیاخچییەوە وەستاوە، چەمکی ئاشتیی کۆمەڵایەتییە، کە لە کۆمەڵگەی بەریتانییدا بە ئاسایی کارپێدەکرێت. ئەو چەمکەیش کە لە پشتی هزری بە نائاسایی و بە سەرسوڕمان بینینی هاورێیەتیی نێوان وەزیر و بۆیاخچییەوە وەستاوە، ناکۆکیی چینایەتیی و کۆمەڵایەتییە، کە لە کۆمەڵگەی عێراق و کوردستاندا بڵاوە و کارپێدەکرێت و کێشەی هەمەجۆری لێدەکەوێتەوە.

هاوینی ساڵی ١٩٨٤ لە سەردەمی گفتوگۆی یەکێتیی و حکومەتی عێراقدا لە شاری سلێمانیی پرسیاری نرخی شوتییم لە شوتییفرۆشێکی منداڵ کرد و گوتم: شوتیی کیلۆی بە چەندە؟ منداڵەکە زۆر بە ئاسایی وەڵامیدامەوە و گوتی: کیلۆی بە سێ پەنجایی، خوێنی سێ هەورامییە*٦. دە بزانە لە شارێکی وەکو سلێمانییدا ڕق بەرانبەر بە هەورامیی هێندە ئەستوورە گەیشتووەتە ڕادەیەک کە خوێنی هەورامییەک بە پەنجا فلس بێت. بە دڵنیاییەوە منداڵێکی هەولێر هەمان بۆچوونی بەرانبەر بە خوێنی خۆشناوییەک هەیە. منداڵێکی موسڵاویی هەمان بۆچوونی بەرانبەر بە خوێنی کابرایەکی تەلعەفەریی هەیە. بەغدادییەکیش هەمان بۆچوونی بەرانبەر بە خوێنی کابرایەکی خەڵکی ڕومادیی هەیە.

ساڵی ٢٠٠٢ سەیری بەرنامەی بەرنامەی تەلەفزیۆنی کوردساتم دەکرد، یەکێک لە بڕگەکانی ئەو بەرنامەیە ئەوە بوو کە بە گورانییەوە ئەو پەندە زۆر کۆنەی کوردی دەگوتەوە: «بێوەرژنەکان دەیان بە مریشکێ، یاخوا ئەو مریشکە قاچێکی بشکێ». ئەوە بۆچوونی هونەرمەندی کوردە بەرانبەر بە پێگە و مافی ژن! لە ناو کۆمەڵگەی کوردستاندا هەتا ئەمڕۆیش چەندیین پێکهاتەی کەلتوریی و ناوچەیی و ڕەگەزیی و تەمەنیی هەن، بە ئاشکرا لە لایەن خەڵکی سادە و خەڵکی ڕۆشنبیرەوە گاڵتەیان پێدەکرێت و بە سوک سەیردەکرێن.

گەلی کورد نەک هەر سودی لە گۆڕنکارییە سیاسییەکانی جیهان و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست وەرنەگرت، بەڵکو ئەو گۆڕانکارییانە کێشەی کوردیان قووڵتر کردەوە.

ئاوەزمەندیی کوردی بە گۆڕان و گەشەکردن هێندەی تر لاوازکرد. بەرانبەر ئەو سیاسەتەی دەوڵەتانی دەستڕۆیشتووی ئەو کاتەی ئەوروپا و دەسەڵاتدارانی وڵاتانی تورکیا و عێراق و ئێران و سوریا، کە دژی مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد پەیڕەویانکرد، ڕەشبینیی بەرانبەر کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیی باڵی بەسەر ئاوەزمەندیی سیاسیی خەڵکی کوردستاندا کێشا. هۆنراوە بە ناوبانگەکەی شاعیری گەورەی کورد فایەق بێکەس (بیستوحەوت ساڵە) کە ڕوودەکاتە ئینگلیز و گلەیی لێدەکات، بەم شێوەیە باس لەو بارە دەروونیی و هزرییەی ئەو سەردەمەی گەلی کورد دەکات:

**«بیستوحەوت ساڵە من ڕەنجبەری تۆم**

**بە نان و ئاو و جلوبەرگی خۆم**

**خزمەتم کردی لە ئێران و ڕۆم**

**لە پێناوی تۆ شکاوە ئەستۆم**

**کەچی هێشتا هەر دیل و ڕەنجەڕۆم**

**گوناهم چی بوو بەم دەردەت بردم؟!**

**بۆچی بە ناهەق وا سوکت کردم؟!** «٧».

لە دوای جەنگی دووەمی جیهانییەوە، لە نێوان ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵاتدا شەڕی سارد دروستبوو، ململانێی نێوان سیستەمی سۆسیالیستیی بە ڕابەرایەتیی یەکێتیی سۆڤیەت و سیستەمی سەرمایەداریی بە ڕابەرایەتیی ئەمریکا دەستیپێکرد. ململانێکە شێوازی هەمەجۆری لەخۆگرت و هەر جەمسەرێک هەوڵیدەدا ئایدۆلۆژیا و کەلتور و هزری سیاسیی و کۆمەلایەتیی خۆی لە ناوچە جیاجیاکانی جیهاندا جێگیربکات. دامەزراندنی حیزب و ڕێکخراوی چەپ و کۆمەنیست و بڵاوکردنەوەی فەلسەفەی مادیی و ئایدۆلۆژیای مارکسیزم-لینینیزم لە لایەن جەمسەری سۆسیالیستەوە پەرەپێدرا. پێکهێنانی حیزبی ڕاستڕەو بڵاوکردنەوەی فەلسەفەی مسالیی و سیاسەتی بۆرجوازیی و ئابوریی لیبراڵ، لە لایەن سیستەمی سەرمایەداریی ڕۆژئاواوە

درێژەپێدرا. ململانێی ئەم دوو جەمسەرە جیاوازە، کاریگەرییەکی زۆری لەسەر هزری کۆمەڵگە جیاوازەکانی جیهان بەجێهێشت، ئەو کۆمەڵگەیانەی کە زۆر بە کەمیی کەوتنە ژێر کاریگەریی ئەم ململانێ و گۆڕانکارییانەوە، کۆمەڵگەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بوون، ئەگەرچی دەسەڵاتدارانی کوردستان بەگوێرەی بەرژەوەندییان، خۆیان بە بۆرژوازیی و دیموکرات، یان بە چەپی مارکسیی نواندووە، بەڵام لە ناخدا هەر هەڵگری هزری سەردەمی خێڵایەتیی و کەلتوریی و دەرەبەگایەتیی بوون، نە هزر و کەلتوری سەرمایەداریی و نە هزر و کەلتوری سۆسیالیست کاریگەریی لەسەر ئاوەزمەندیی تاک و پێکهاتەکانی کۆمەڵگەی کوردستان بەجێنەهێشت. ئاوەزمەندیی کۆمەڵگەی کوردستان وەکو ئاوەزمەندیی کۆمەڵگەکانی تری جیهان پێشنەکەوت.

## ٨ ـ ئاوەزمەندیی سیاسیی عێراق و کوردستان

دوای دروستبوونی دەوڵەتی عێراق، چەندان جۆر ئاوەزمەندیی سیاسیی ڕوویان لە کۆمەڵگەی عێراق و باشووری کوردستان کردووە:

١- ئاوەزمەندیی سیستەمی لیبراڵیی سەرمایەداریی ئەوروپا، لە ڕێگەی ئینگیلیزەکانەوە کە لەو کاتەدا حوکمی عێراقیان دەکرد، بە ناو دەسەڵات و کۆمەڵگەی عێراقدا بڵاوبووەوە، بە دەستووری عێراقی ئەو سەردەمە و لە ڕێگەی بنەماڵەی پاشایەتییەوە هەوڵی پێشخستنی دەدرا. یەکەم دەستووری عێراقی سەردەمی پاشایەتیی، باس لە هاوڵاتیبوونی تاک و پێکهاتەکانی عێراق دەکات، باس لە پێکهاتەی نەتەوەیی و ئاینزای جیاواز ناکات. ڕوداوە سیاسییەکانی دوای حوکمی ئینگلیز لە عێراق و کوردستان، ئەوەی سەلماند کە ئاوەزمەندیی ئەوروپای سەرمایەداریی نەیتوانیوە لە ناو هزری تاک و پێکهاتەکانی عێراقدا جێگەی خۆی بکاتەوە.

٢- ئاوەزمەندیی ئیسلامی سیاسیی، کە لە ڕێگەی ڕێکخستنەکانی برایانی مسوڵمانەوە ئاراستەدەکرا، ئەم ئاوەزمەندییە سەرەتا لە وڵاتی میسر سەریهەڵدا، دوای ئەوە بە وڵاتانی تری مسوڵماندا بڵاوکرایەوە، دژی لیبراڵیزمی ئەوروپیی

و کۆمۆنیزم دەوەستایەوە. ئەو دوو ڕێبازە هزرییەی بە نامۆ بە کۆمەڵگەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەبینی. ئەم هێڵە سیاسییە نەیتوانی کاریگەرییەکی ئەوتۆی لەسەر دەسەڵات و حوکمڕانیی عێراق هەبێت، بەڵام کاریگەریی هزریی لەسەر خەڵک بەجێهێشت. ئاوەزمەندییەکی لە ناو پێکهاتەی سوننەی عێراق و کوردستاندا دروستکرد، کە جیهانی مەسیحیی و جوو سیستەمی سەرمایەداریی زۆڵمێکی گەورەیان لە مسوڵمانان کردووە، دەبێت مسوڵمانان کار بۆ لادانی ئەو زوڵمە بکەن و پێگەی ئیسلام بۆ شوێنی خۆی بگێڕنەوە.

لە ساڵانی دواییدا چەندیین حیزب و ڕێکخراوی سیاسیی لەسەر بنەما هزرییەکانی ئەم هێڵە سیاسییە دامەزران و چالاکییان دەستپێکرد.

٣- ئاوەزمەندیی سیاسیی کۆمۆنیزم، لە جەنگی یەکەمی جیهانییدا یەکێتیی سۆڤیەت دروستبوو، لە جەنگی دووەمی جیهانییدا یەکێتیی سۆڤیەت و هاوپەیمانەکانی سەرکەوتنیان بەسەر بەرەی فاشیزمدا بەدەستهێنا. ئەمە وایکرد تاک و پێکهاتە چەوساوەکانی جیهان چاوببڕنە ئەو ئایدۆلۆژیا و ئاوەزمەندییە سیاسییەی کە یەکێتیی سۆڤیەتی دامەزراند و لە ڕووی سەربازیی و ئابوریی و زانستییەوە گەشەیپێدا. لەسەر ئەم بنەمایە فەلسەفە و سیاسەتی سۆڤیەتیی، یان فەلسەفە و سیاسەتی مارکسیزم-لینینیزم بۆ ئازادیی و چارەسەری کێشەکان بە سەرتاسەری جیهاندا بڵاوکرایەوە. لە چلەکانی سەدەی بیستەوە ئەم ئاوەزمەندییە نوێیە ڕووی لە عێراق و باشووری کوردستان کرد، لەگەڵ ئەوەیشدا کە نەیتوانی بە دەسەڵات بگات، بەڵام کاریگەریی لەسەر هزری کۆمەڵگە کرد. ئاوەزمەندییەکی لە ناو خەڵکی عێراق و کوردستاندا دروستکرد، کە جیاوازیی ئاینیی و ئاینزایی و ناکۆکیی نەتەوەیی، دەستکردی سیستەمی سەرمایەداریی و سیستەمە چەوسێنەرەکانی تری کۆمەڵگەن، ئەم ناکۆکییانە بۆ ئەوە دروستکراون هەتا دەسەڵات بتوانێت ناکۆکیی چینایەتیی لە بیری خەڵک بباتەوە، بۆ ئەوە دروستکراون هەتا دەسەڵات خەڵک بەو ئاوەزمەندییانەوە سەرقاڵبکات و خۆی خوێنی خەڵک بمژێت و گەورەترین سەرمایە کۆبکاتەوە.

٤- ئاوەزمەندیی نەتەوەپەرستیی عەرەب، ئەم ئاوەزمەندییە سیاسییە لە شەستەکانی سەدەی بیستدا بە شێوەی حیزبی سیاسیی و کەسایەتیی سیاسیی،

لەژێر کاریگەریی هزری نەتەوەیی جەمال عەبدولناسر و حیزبی بەعسی عەرەبییدا دەستیپێکرد. لە ناو گەنج و ڕۆشنبیرانی عەرەبدا، بە تایبەتیی لە ناو ئەفسەرەکانی سوپای عێراقدا بڵاوکرایەوە. لە ڕێگەی چەندیین کۆدەتای سەربازییەوە، دەستیان بەسەر حوکمڕانیی عێراقدا گرت. کۆتا دەسەڵاتداری ئەم ئاوەزمەندییە ڕژێمی بەعسی عێراق بوو، کە ساڵی ۲۰۰۳ بە دەستی ئەمریکا و ئێران و هێزەکانی باشووری کوردستان و ئۆپۆزیۆنی عێراق ڕوخا.

ئەم ئاراستە سیاسییە جۆرە ئاوەزمەندییەکی لە ناو عەرەبی عێراقدا دروستکرد، کە هەوڵیدەدا عێراق بکات بە دەوڵەتێکی یەک_نەتەوە، بەرانبەر بە نەتەوەی دووەمی عێراق (کورد) سیاسەتی بەعەرەبکردن و ڕاگواستن و بەبەعسیکردن و ڕاگواستنی گوندە سنوورییەکانی کوردستان و ئەنفال و کیمیابارانی بەکارهێنا و هەوڵی تواندنەوە و لەناوبردنی کوردی دەدا، بۆ ئەوەی هەموو عێراق بکات بە عەرەب و لەوێوە خەونە شۆڤییەکانی بەدەستبهێنێت.

دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام ئەم ئاوەزمەندییە لە ناو کۆمەڵگەی عێراقدا مایەوە، چەندیین ڕێکخراوی توندڕەوی ئیسلامییان پێکهێنا. دژی کورد و ئەمریکا و شیعە دەستیان بە کاری تیرۆریستیی کرد، دواترییني ئەو ڕێکخراوانە ڕێکخراوی داعش بوو.

٥- ساڵی ۲۰۰۳ دوای ڕوخانی ڕژێمی بەعسی عێراق، ئەمریکا وەکو ئینگلیزی ساڵانی دوای جەنگی یەکەمی جیهانیی، دەستی بە بڵاوکردنەوەی ئاوەزمەندیی لیبراڵیزمی سەرمایەداریی کردەوە، بەرنامەکەی ئەمریکا بە دەستووری عێراق و ئەو بەرپرسە عێراقییانەی کە جێی متمانەی ئەمریکا بوون ئاراستەدەکرا.

ئەو هزرە سیاسییەی ئەمریکا لە عێراق و هەرێمی کوردستاندا ئاراستەیدەکات، لە ئاستی دەسەڵات و کۆمەڵگەدا سەرکەوتنێکی نیوەناچڵی بەدەستهێنا. کاریگەریی لەسەر شەقامی شیعەی عێراق کرد، لە پەیامی خۆپیشادانەکانی ساڵی ۲۰۲۰ شارە شیعەنشینەکانی عێراقدا دەرکەوت، لە هەڵبژاردنی پێشوەختەی ساڵی ۲۰۲۱دا ئەو کاریگەرییەی ئەمریکا لەسەر شیعە بە ڕوونیی دەبینرێت. بێجگە لە ئاوەزمەندییە گشتییەکانی سیستەمی لیبراڵیی، ئەمریکا دەیەوێت لە ناو شیعەکانی عێراقدا ئاوەزمەندییەک دروستبکات کە پەیڕەوکردنی بنەماکانی شیعایەتیی لە سیاسەت

و ئایندا یەکسان نییە بە وەلا بۆ سیاسەتی ئێران. دەبێت شیعەکانی عێراق سەربەخۆیی عێراق بپارێزن. لە ناو هەندێک پێکهاتەی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی شیعەدا ئاوەزمەندیی و مەیلێک دروستبووە، کە پابەندی سیاسەتی ئێران نابن، وەکو هێزێکی سەربەخۆی عێراقیی سیاسەتدەکەن و لەگەڵ ئەو مەیلە شیعەیەدا ململانێدەکەن کە پابەندیی لە سیاسەتی ئێران دەکات.

٦- ئاوەزمەندیی شیعایەتیی، ئەگەرچی زۆرینەی عەرەبی عێراق سەر بە ئاینزای شیعەن، بەڵام هەتا شۆڕشی کۆماری ئیسلامیی ئێرانی ساڵی ١٩٧٩ بە سەرکردایەتیی ئیمام خۆمەینیی بەرپانەبوو، شیعایەتیی وەکو بزوتنەوەیەکی سیاسیی و وەکو ئاوەزمەندییەکی چالاک دەرنەکەوتەوە. لەو کاتەوە شیعایەتیی وەکو ئاوەزمەندییەک بە ناو کۆمەڵگە و دەسەڵاتی ئەو وڵاتانەدا بڵاونەکرایەوە کە هەڵگری ئاینزای شیعەن.

عێراق یەکێک لەو وڵاتانە بوو کە کەوتە ژێر کاریگەریی سیاسەتی شیعایەتیی شۆڕشی کۆماری ئیسلامیی ئێرانەوە، لە ناو کۆمەڵگەی عێراقدا شیعایەتیی وەکو ڕێکخستنی سیاسیی و وەکو ئاوەزمەندیی کۆمەڵایەتیی قۆناغی گەشەکردنی خۆی بڕیوە. لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام لە ساڵی ٢٠٠٣ شیعەکانی عێراق حوکمی عێراق دەکەن. ئاوەزمەندیی شیعایەتیی ئەوەیە کە بنەماڵەی پێغەمبەر (د.خ) زۆڵمێکی گەورەی لێکراوە. شیعە لەپێناو لادانی ئەو زۆڵمە و گەڕاندنەوەی پێگەکەیان لە تێکۆشاندایە. شیعەگەرایی پێیوایە ئەو زوڵمەی سوننە لە حەسەن و حوسەینی کرد، هەتا ئەمڕۆیش بەردەوامە. مەسیحیی و جوو سیستەمە سیاسییەکەیان لەو تاوانەدا هاوکاریی سوننە دەکەن.

٧- هێزی سیاسیی عەبدوڵڵا ئوج ئالان (ئاپۆ): ئاپۆ سەبارەت بە مێژوو، ململانێی کۆمەڵایەتیی، دەوڵەتی نەتەوەیی، ماف و ئازادیی ژن، دەسەڵات و دیموکراسیی، بۆچوونی تایبەتی خۆی هەیە. بۆچوونەکانی لەژێر ناوی سیستەمی کۆنفیدراڵیی دیموکراتییدا کۆکردووەتەوە. هێزی سیاسیی ئاپۆ لە ساڵی ١٩٧٨ دوای دروستبوونی پارتی کرێکارانی کوردستان لە ناو کۆمەڵگەی کوردستان و لە ناو تاکە ڕۆشنبیرەکانی گەلانی تری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بڵاوکراوەتەوە. دوای ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ هێزی سیاسیی ئاپۆ لە هەرێمی کوردستاندا تەکانێکی بە

خۆی دا. لە لایەن گەنجانی باشووری کوردستانەوە وەکو بەدیلی حیزبە سکۆلار و نەتەوەییەکانی باشوور دەبینرێت.

جوڵانەوەی ئاپۆچیی لە باشوور لە ئاستی دەسەڵات و حوکمڕانییدا سەرکەوتنی بەدەستنەهێنا، بەڵام لە ئاستی کۆمەڵگەدا، کەلتور و هزری ئاپۆچیی جێگەی خۆی کردووەتەوە و ئاوەزمەندییەکی تایبەتی لە ناو لایەنگرانیدا دروستکردووە.

**ململانێی ئاوەزمەندیی لە عێراق:**

ئەو هێڵە سیاسییانەی کە لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە پەلاماری عێراقیان داوە، لە ناو خۆیاندا ناکۆکبوون، لەگەڵ ئاوەزمەندیی کۆمەڵگەی خێڵەکیی کوردستان و عێراقیشدا ناکۆکییان دەستپێکرد. ئیتر کۆمەڵگەی عێراق و باشووری کوردستانیان بە ململانێ و ناکۆکیی سیاسیی و تێکدانی ئاشتیی کۆمەڵایەتیی و کودەتای سەربازیی و شەڕی ناوخۆوە سەرقاڵکرد.

لە دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقەوە هەتا ڕوخانی ڕژێمی پاشایەتیی، هزری سیاسیی ئینگلیز باڵادەستبوو، لەو سەردەمەدا هزری نەتەوەپەرستیی و شەڕ و کودەتا و هەڕەشەکردن لە کورد سنوورداربوون. لە کۆتایی پەنجاکانی سەدەی بیستدا شۆڕشی چواردەی تەموز بەرپاکرا. بۆ ماوەی چەند ساڵێک ئازادیی سیاسیی و هاوسەنگیی لە مافی پێکهاتە نەتەوەییەکاندا بە مافی گەلی کوردیشەوە دروستبوو. لە شەستەکانی سەدەی بیستدا لە ڕێگەی چەندیین کودەتای سەربازییەوە هەتا ساڵی ٢٠٠٣، هزری نەتەوەپەرستیی عەرەب باڵی بەسەر حوکمڕانیی عێراقدا کێشا. یەکێک لە کێشەکانی نەتەوەپەرستەکانی عێراق ماف و ئازادیی گەلی کورد بوو. بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە، پەنایان بۆ چەندیین ڕێگەی جیاواز و ناکۆک دەبرد، پەنایان بۆ شەڕی کۆمەڵکوژیی و گفتوگۆ و ڕێککەوتن دەبرد.

لە بەرانبەردا گەلی کوردیش حیزب و ڕێکخراوی سیاسیی دروستدەکرد. بە پەرچەکردار وەڵامی سیاسەتی نەتەوەپەرستەکانی عێراقی دەدایەوە. بە شەڕ وەڵامی هێرشەکانی سوپای عێراقی دەدایەوە. بە دیبلۆماسیەتێکی حیزبیی و خێڵەکیی پێشوازیی لە گفتوگۆ و ڕێککەوتنەکانی نەتەوەپەرستەکانی عەرەب دەکرد. بەو شێوەیە کوردیش ئاوەزمەندیی نەتەوەیی لە لای گەڵاڵەدەبوو.

لەبەرئەوەی زۆرینەی گەلی کورد لە باشووری کوردستان سەر بە ئاینزای سوننەن، کۆمەڵگەی کوردستان نەک هەر خۆی لە قەرەی هزری شیعایەتیی نەداوە، بەڵکو هەتا بۆی کرابێت دژایەتییکردووە. ئەمە وایکردووە کە گەلی کورد ئاوەزمەندییەکی ئاینزایی سوننەش هەڵبگرێت.

لە باشووری کوردستاندا لیبراڵیزم و کوردایەتیی و ئیسلامی سیاسیی، لەگەڵ سیستەمی خێڵایەتیی و بنەماڵەچێتییدا تێکەڵکراوە، ئاویتەیەکی ئاوەزمەندیی ناکۆک و ناهاوسەنگی لێدەرچووە.

## کاریگەریی ئاوەزمەندیی کوردستان

### عێراقێکی کراوە، هەرێمێکی داخراو

لە ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی ١٩٩١ هەتا ڕوخانی ڕژێمی سەدام، باشووری کوردستان وەکو قەبارەیەکی سەربەخۆ وابوو، حکومەتی هەرێم پەیوەندیی باشی لەگەڵ وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژئاوادا هەبوو. ڕژێمی سەدام بۆ ماوەی ١٢ ساڵ دەسەڵاتی بەسەر کوردستاندا نەما. ئەم زەمینەیە دەرفەتی بۆ گەشەپێدانی بنەماکانی نەتەوەییبوونی کورد و سیستەم و ئاوەزمەندیی دیموکراتیی ڕەخساند. زۆر کەس پێیانوابوو کە هەرێمی کوردستان لە ئاستی دەسەڵات و کۆمەڵگەدا وەرچەرخانی دیموکراتیی و هزریی و مرۆڤدۆستیی تێدا پێشدەکەوێت. کاریگەریی باشیشی لەسەر کۆمەڵگەی عێراقیش دەبێت.

زۆر کەس پێیانوابوو کە باشووری کوردستان بۆ ماف و ئازادیی سیاسیی پشتیوانیی پارچەکانی تری کوردستان دەکات، وەکو ناوەندی چارەسەرکردنی کێشەی گەلی کوردی لێدێت، بەڵام لەبەرئەوەی هەشتا ساڵ زیاترە کوردستان لە لایەن عێراقی ناوەندییەوە داگیرکراوە، یەکێک لە کارەکانی داگیرکەریش دواخستنی هزری کۆمەڵگە دەبێت، لەبەرئەوەی لە هزری دەسەڵاتدارانی باشووری کوردستاندا چەمکی پێشکەوتن جێگەی نەگرتووە، دەسەڵاتی کوردیی بەرنامەی پێشخستنی هزری خۆی و هزری کۆمەڵگەی بە بەرپرسیارێتیی خۆی نەزانی، هیچ هێزێکی تریش لە دەرەوەی ئەم دەسەڵاتە نەیتوانی ئەو بۆشاییە پڕبکاتەوە.

بەو شیوەیە دەسەڵات و کۆمەڵگەی کوردستان نەیتوانی بەو دوازدە ساڵەی دابڕان لە ڕژێمی سەدام و پەیوەندییکردن لەگەڵ ڕۆژئاوا، کاریگەرییەکانی هەزاران ساڵی کۆمەڵگە سەرەتاییەکان و کاریگەرییەکانی هەشتا ساڵی ڕابردووی ڕژێمە ناوەندییەکانی عێراق، لەسەر هزری تاک و پێکهاتەکانی سوکبکات و بە ئاوەزمەندییەکی نوێوە ژیان بخوێنێتەوە.

لەبەرئەوەی کۆمەڵگەی عێراقی عەرەبیی لە ئاستی هزری سیاسییدا لە کۆمەڵگەی باشووری کوردستان پێشکەتووتر بوو. لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام بە کاتێکی کورتتر و بە ماندووبوونێکی کەمتر، دەسەڵاتدارانی عێراقی نوێ توانییان خۆیان لە پرۆسەی سیاسیی و ئاوەزمەندیی باوی سەردەم نزیکبکەنەوە. پەرلەمانی عێراق و حکومەتی عێراق و دەسەڵاتی دادوەریی عێراق، لە چاو پەرلەمان و حکومەت و دادگاکانی باشووری کوردستاندا، لە پیادەکردنی بنەما و چەمکەکانی سیستەمی دیموکراسییدا، لە پاراستنی سەربەخۆیی خۆیاندا، هەنگاوی باشیان بەرەو پێشەوە ناوە. ئەو گفتوگۆ ئاشکرا و ڕەخنە و ڕەخنەلەخۆگرتنانەی لە پەرلەمانی عێراقدا دەبینرێت، لە پەرلەمانی هەرێمی کوردستاندا نابینرێت.

لە ڕوخاندنی ڕژێمی سەدامەوە هەتا پێنج ساڵ دوای هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتیمانیی عێراق، لە عێراق دوو هەڵبژاردنی پەرلەمان ئەنجامدرا. لە هەرێمی کوردستاندا بە ١٧ ساڵ دوو جار هەڵبژاردنی پەرلەمانی هەرێمی کوردستان ئەنجامدرا.

لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدامەوە هەتا ساڵی ٢٠٠٨ دوو جار هەڵبژاردنی ئەنجومەنی شارەوانییەکانی پارێزگاکانی عێراق ئەنجامدراوە. لە هەرێمی کوردستان حیزبە دەسەڵاتدارەکان ئاستەنگیی بۆ هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگاکان دروستدەکەن. بەگوێرەی بەرژەوەندیی خۆیان گۆڕانکاریی لە پۆستی نوێنەرە هەڵبژێردراوەکاندا دەکەن و لە شوێنیان کەسانی سەر بە حیزب دادەنێن. لە ساڵی ٢٠٠٥وە چەندیین جار سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی عێراقی ناوەندیی گۆڕاوە، لە دوای ڕوخاندنی ڕژێمی سەدام چەندیین حیزبی سیاسیی نوێ لە عێراقی عەرەبییدا پێکهاتوون و بەشداریی پرۆسەی سیاسیی عێراقیان کردووە، یان وەکو ئۆپۆزسیۆن درێژەیان بە تێکۆشان داوە.

ئەم کرانەوەیەی عێراقی عەرەبیی بە ڕووی بنەماکانی سیستەمی دیموکراسییدا و ئەو داخراوییەی دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان بە ڕووی ئازادیی سیاسیی و بنەماکانی سیستەمی دیموکراسیی و هەڵبژاردندا، ئەوە پیشاندەدات کە ئاوەزمەندیی دەسەڵاتدارانی باشووری کوردستان، وەکو ئاوەزمەندیی عەرەبەکانی عێراق بۆ سیاسەتی نوێ کراوە نییە.

لە ڕیپۆرتاژێکی کۆنسڵی ئەمریکیی (هاوارد کیگن) لە کەرکوک کە ڕۆژنامەی ئاسۆ دەربارەی کێشەی کەرکوک لەگەڵی ئەنجامیداوە، دەربارەی عەرەبەکانی عێراق دەڵێت:

ئەگەر سەیری نەتەوەی عەرەب بکەیت ئێستا ئەوان ئێتجاهیان گۆڕاوە و لە نیزامی عەشایەریی دەرچوون و لەوەیش دەرچوون کە نیزامی عەشایەریی بکەن بە سیاسەت*٨.

دیارە کۆنسڵی ئەمریکیی مەبەستێکی شاراوەیشی لە دەربڕینەکانیدا هەیە، ئەویش ئەوەیە کە دەیەوێت بڵێت عەرەب لە نیزامی عەشایەریی دەرچوون و سیاسەتی مودرێن دەکەن و ئەمریکا پشتگیرییاندەکات، بەڵام کورد هێشتا لە نیزامی عەشایەرییدا دەژین. نازانێت بەگوێرەی سەردەم سیاسەت بکات. لەبەرئەوەیە ئەمریکا پشتگیریی لە سیاسەتی دەسەڵاتی کوردیی ناکات. ئەمەیش ئەوە دەگەیەنێت کە هزری عەرەبە عێراقییەکان بۆ کرانەوە و ڕێککەوتن لەگەڵ سیاسەتی سەردەمدا لە چاو ئاوەزمەندیی دەسەڵاتدارانی کوردستاندا توکمەتر و پێگەیشتووترە.

لە ١٦ ئۆکتۆبەری ٢٠١٧دا، بۆ گەڕانەوەی هێزە عێراقییەکان بۆ شاری کەرکوک، ئەمریکییەکان بە ئاشکرا پشتیوانیی حکومەتی عێراقیان کرد، گڵۆپی سەوزیان بۆ هێزە چەکدارەکانی عێراق هەڵکرد هەتا دەست بەسەر کەرکوکدا بگرنەوە.

کرانەوەی هێزە کوردییەکان و دەسەڵاتی کوردیی بە ڕووی ئاوەزمەندیی و سیستەمی وڵاتە باڵادەستەکانی جیهاندا (ئەوروپا و ئەمریکا) بۆ چارەسەرکردنی دۆزی کورد بە مەرجێکی گرنگ دەبینرێت. لە سەردەمی دەسەڵاتی ئینگلیزدا لە عێراق، هزری سیاسیی شیخ مەحمود و شۆڕشەکەی لە چوارچێوەیەکی خێڵەکیی و ئایینیی دەرنەچوو، بە ڕووی هزری سیاسیی ئینگلیز و سەرمایەداریی ئەوروپادا نەکرایەوە، لەبەرئەوە لە ناکۆکییەکانی نێوان کورد و عێراقدا، ئینگلیز پشتیوانیی دەسەڵاتی ناوەندیی عێراقی کرد.

لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدامەوە هەتا ئەمڕۆ، لە ناکۆکییەکانی نێوان هەرێم و عێراقی ناوەندییدا، ئەمریکا پشتیوانیی عێراق دەکات. لەبەرئەوەی لە ڕووی هزری سیاسیی و کلتورییەوە، عەرەبەکان زیاتر لە کورد بە ڕووی هزر و سیستەمی سیاسیی ئەمریکادا کرانەوە، بۆیە ئەمریکا عێراقی ناوەندیی لە خۆی نزیکتر دەبینێت.

## تێگەیشتنە هەڵەکانی کوردستان

لێرەدا هەندێک لەو ئاوەزمەندیی و بیرکردنەوە هەڵانەی دەسەڵاتداران و جەماوەری گەلی کوردستان دەخەینە بەرچاو، کە ئاستەنگیان بۆ پەیڕەوکردنی سیاسەتێکی ڕاستی شارستانیی پێکهێناوە و سیاسەتی هەڵە و کاری حیزبایەتیی نیوەناچڵ و کارەساتبار دروستدەکەن.

### ١- بەحیزبییکردنی کۆمەڵگە:

لە بەشی دووەمی کتێبی «لە دەوڵەتی ڕاهیبی سۆمەرەوە بەرەو شارستانیەتی دیموکراسییانە»، بیرمەندی کورد عەبدوڵڵا ئۆج ئالان بەم شێوەیە کۆمەڵگە پۆلێندەکات*٩:

١- کۆمەڵگەی فەرمیی: گوزراشت لە کۆبوونەوەی ئەو مرۆڤانە دەکات کە لە چواردەوری دەوڵەت و بەگوێرەی یاسا و ڕێساکانی دەزگاکانی دەوڵەت پێکهاتووە، (ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە کارمەندی دەوڵەتن و بە مانگانەی دەوڵەت دەژین)، لە بەرزترین ئاستی بەرپرسیارێتیی هەتا دەگاتە باخەوان، لە کارکەرەکانەوە هەتا زەحەمتکێشان، تەواوی ئەو توێژانەی کۆمەڵگە کە گرێدراوی فەرمان و ڕێساکانی دەوڵەتن، هەموویان دەکەونە چوارچێوەی کۆمەڵگەی فەرمییەوە.

ئەم بەشەی کۆمەڵگە، ئاوەزمەندیی فەرمانبەرێتیی بەسەریدا زاڵە. دەوڵەت بە هەموو شتێک دادەنێت، لە چەرخە سەرەتاییەکاندا کۆیلەی دەوڵەت بوون، لە هەلومەرجە هاوچەرخەکاندا خاوەنی ئازادییەکی سنووردارە، لەبەرئەوەی خۆیان لەگەڵ دەوڵەت هاوتا دەبینن، خۆیان لە سەرووی توێژەکانی ترەوە دەبینن. لەبەرئەوەی ژیانیان گەرەنتییکراوە، هەتا دوارادە ڕێسا پەیڕەودەکەن و لە داهێنان بێبەشن.

٢- کۆمەڵگەی باو (خێڵەکیی): هەموو ئەو ئەندامانەی کۆمەڵگەی کۆن دەگرێتەوە کە لە دەرەوەی دەوڵەت ماونەتەوە، گوزارشت لە کۆمەڵگەی ڕێکنەخراو و بڵاو دەکات. ئەم جۆرە کۆمەڵگەیە لە ناو ئاوەزمەندییەکی تێکەڵاوی کۆیلایەتیی و دەرەبەگایەتیی و خۆڕسکییدا دەژی. دەزگای دیموکراسیی هاوچەرخ و ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤی نییە. ژیانیان بەگوێرەی فەرمودەکانی هەزاران ساڵی پێش ئێستای ئاین و دەوڵەت ڕێکخراوە، ملکەچکردن و خۆبەدەستەوەدان بۆ ئەو واقیعە (کەتوار)ەی خۆیان بە قەدەری ناودەبەن، چەمکی سەرەکیی ژیانیانە. بەو بەشەی خۆی ڕازییە و ئامادەی هیچ گۆڕانکارییەک نییە.

٣- کۆمەڵگەی مەدەنیی: لە سەرەتادا کۆمەڵگەی مەدەنیی گوزارشت لە کۆمەڵگەی بورجوازیی دەکات، کە لە دەرەوەی دەوڵەتی دەرەبەگایەتیی ئازادانە پێشدەکەوێت، بەڵام دواتر کاتێک بورجوازیی بووە کۆمەڵگەی فەرمیی دەوڵەت چوارچێوەکەی گۆڕا، کۆمەڵگەی مەدەنیی کەوتە دەرەوەی کۆمەڵگەی فەرمیی بورجوا.

لە ڕۆژگـاری ئەمڕۆماندا تـەواوی ئەو توێژانەی کۆمەڵگە دەگرێتەوە، کە لە دەرەوەی دەوڵەتدان، وەکو حیزبی ئۆپۆزسیۆن و ڕێکخراوی مەدەنیی و سەندیکاکان، بەڵام بە مەرجێک گرێدراوبن بە ڕێساکانی مافەوە و خاوەنی ئاوەزمەندییەکی ئازاد و پرۆگرامێکی بەرجەستەی کۆمەڵگە بن.

ئـەم کۆمەڵگەیە پێبەپێ لـە دەرەوەی کۆمەڵگەی فەرمیی و کۆمەڵگەی باو پێشدەکەوێت، دەبێت بە کۆمەڵگەیەک کە ڕۆڵی دیاریکراوی دەبێت. سەرچاوەی هێزی خۆی لەو بۆشاییەدا وەردەگرێت، کە کۆمەڵگەی فەرمیی و کۆمەڵگەی باو دەیخوڵقێنن. کۆمەڵگەی مەدەنیی ئەو دەرفەتە دەقۆزێتەوە و دەبێتە سیستەمێکی بەهاداری چارەسەری کێشەکانی کۆمەڵگە.

ئەگەر ئەو پۆلێنکردنەی کۆمەڵگە لەبەرچاوبێت و سەیری نەخشەی کۆمەڵایەتیی جیهان و کوردستان بکەین، بۆمان دەردەکەوێت کە کۆمەڵگەی کوردستان پێش ڕاپەڕیین لە کۆمەڵگەی باو (کلاسیک) بەشی شێری بەردەکەوێت. دوای ڕاپەڕیینیش حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشوور کۆمەڵگەیەکی فەرمییان لە تەنشتی کۆمەڵگەی باوەوە ڕاستکردووەتەوە. بە هەردووکیانەوە ڕێگەی گەشەکردنی کۆمەڵگەی مەدەنیی کوردستان دەگرن. لە کوردستاندا کۆمەڵگەی مەدەنیی هەوڵی خۆدروستکردنی

داوه، بەڵام هەتا ئێستا بە قۆناغی خۆڕێکخستن و گەشەکردنی تەواو نەگەیشتووە. ئەو ڕێکخراوە پیشەیی و سەندیکاییانەی دروستدەبن هەموویان لە لایەن حیزبەوە کۆنترۆڵدەکرێن و بەحیزبییدەکرێن. حیزبە دەسەڵاتدارەکانی هەرێمی کوردستان ڕۆڵی کۆمەڵگەی مەدەنیی نابینن، ڕۆڵی مۆتەکەی سەرسنگی خەڵک و سەرسنگی دەزگاکانی دەوڵەت دەبینن. بەگوێرەی بۆچوونەکانی عەبدوڵڵا ئۆج ئالان و بیرمەندانی تری بواری کۆمەڵناسیی*١٠، کۆمەڵگەی مەدەنیی لە ڕووی ئاوەزمەندییەوە ئامادەکاریی و توانایی هەیە بۆ گۆڕانکاریی و چارەسەری کێشەکانی کۆمەڵگە بە گشتیی، بەڵام هزری دوو کۆمەڵگەکەی تر (باو و فەرمیی) خۆی داوەتە دەستی قەدەر و دەسەڵات، سەرکێشیی گۆڕانکاریی ناکەن و ئامادە نین لەپێناو بەرژەوەندیی گشتییدا خۆیان ماندووبکەن و قوربانییبدەن.

لە کاتی شەڕی ئێران و عێراق، لە سەردەمی شەڕی عێراق و کوێتدا و لە کاتی سەپاندنی ئابڵوقەی ئابوریی بەسەر عێراقدا، ژمارەیەک لە گەنج و ڕۆشنبیرانی کورد عێراقیان بەجێهێشت و ئاوارەی وڵاتانی ئەورووپا بوون. کۆمەڵێک لەو ڕۆشنبیرانە بەرانبەر بە دەسەڵاتی هەرێمی کوردستانی دوای ڕاپەڕیین، هەڵوێستی ئۆپۆزسیۆنیان پیشاندا و چەندیین وتار و هۆنراوەی ڕەخنەئامێزیان ئاراستەی سیاسەتە هەڵەکانی حیزبەکانی باشوور و حکومەتی هەرێمی کوردستان کرد. مرۆڤ لە دوورەوە ئۆمێدی لێدەکردن کە بتوانن ببنە بەشێکی ڕاستەقینەی کۆمەڵگەی مەدەنیی باشووری کوردستان و ئاوەزمەندیی باوی کۆمەڵگەی کوردستان بگۆڕن، بەڵام لەبەرئەوەی خاوەنی ئایدۆلۆژیا نەبوون، نەیانتوانی ببنە خاوەن_ناسنامەی کۆمەڵگەی مەدەنیی، زۆربەیان یەک یەک و دوو دوو لەژێر کاریگەریی بڕێک گوشار و هەندێک دەستکەوتی مادییدا خۆیان بە ناو ماڵی کۆمەڵگەی فەرمیی حکومەتی هەرێمی کوردستاندا کردەوە. ئەوانەیشی کە لە دەرەوەی دەسەڵات ماونەتەوە، لەبریی بەرنامەی سیاسیی و میکانیزمی گونجاو بۆ چارەسەری کێشەکان، تەنها تانە و تەشەر لە دەسەڵات دەدەن و هێندەی تر دەسەڵات شێتگیردەکەن.

لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام پارتی چارەسەری (پ. چ. د. ک) وەکو حیزبێکی سیاسیی تژیی بە ئاوەزمەندیی نوێ، لە دەرەوەی کۆمەڵگەی فەرمیی، دەستی بە کار و خەبات کرد، لەبەرئەوەی حکومەتی هەرێم مۆڵەتی یاسایی پێنەدا، نەیتوانی درێژە بە کار و چالاکیی بدات، کاریگەرییەکی ئەوتۆی لەسەر گۆڕینی ئاوەزمەندیی خەڵک

نەبوو. لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠٦وە نەوشیروان مستەفا لە یەکێتیی جیابووەوە. جەوهەر نامیق لە پارتیی دوورکەوتەوە. ناوبەناو قسە و وتاری ڕەخنەگرانەیان ئاراستەی دەسەڵاتی پارتیی و یەکێتیی دەکرد. نەوشیروان مستەفا بزوتنەوەی گۆڕانی دامەزراند و لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی هەرێمی کوردستان و عێراقدا بەشدارییکرد. لە ڕێگەی ئەو چالاکییە سیاسییانەی بزوتنەوەی گۆڕان و پارتی چارەسەر و جەوهەر نامیق و سەدان ڕۆشنبیر و ڕۆژنامەنوسی باشووری کوردستانەوە، گەلی کورد ئیرادەی گۆڕانکاریی لە لا دروستبوو، بەڵام لەبەرئەوەی بزوتنەوەی گۆڕان و زۆرێک لە کەسایەتەییەکانی تر بۆ ماوەیەکی زۆر لە ناو کەلتور و ئاوەزمەندیی کۆمەڵگەی فەرمییدا ژیابوون، هەندێک گۆڕانکاریی ڕوکەشییان کرد. ئاوەزمەندیی گۆڕانخوازیی بەرپرسەکانی ئەو بزوتنەوەیە، بەشی گۆڕینی ئاوەزمەندیی خەڵک و ئاوەزمەندیی سیستەمی هەرێمی کوردستانی نەکرد و نەیتوانی پێگەی کۆمەڵگەی مەدەنیی باشووری کوردستان بەهێزبکات.

چالاکییەکانی ڕۆشنبیران و سیاسەتمەدارانی دەرەوەی دەسەڵاتی هەرێم و جەماوەری کوردستان، کە ساڵی ٢٠١٠ بەرانبەر بە ڕفاندن و شەهیدکردنی ڕۆژنامەنوس سەردەشت عوسمان پیشانیاندا، نیشانەی ئەوە بوو کۆمەڵگەی مەدەنیی لە باشووری کوردستان سەریهەڵداوە و بەرەوپێشەوە دەڕوات*١١.

دەسەڵاتی هەرێم بە تەنها دژایەتیی ئاوەزمەندیی و ڕێکخستنی کۆمەڵگەی مەدەنیی ناکات، هەوڵی جدیی داوە کۆمەڵگەی مەدەنیی لە ڕووی چەندایەتییشەوە گەشەنەکات. ئەو ڕێکخراو و حیزبانەی دادەمەزرێن، یان مۆڵەتی کارکردنیان پێنادات، یان دەستەمۆ و بێکاریگەریان دەکات. لەولایشەوە هەوڵی جدیی دەدات کۆمەڵگەی کلاسیک و کۆمەڵگەی فەرمیی فراوانتر و بەهێزتر بکات هەتا شەڕی کۆمەڵگەی مەدەنییان پێبکات. دەسەڵات نەک هەر دژایەتیی ئاوەزمەندیی کۆمەڵگەی خێڵەکیی ناکات، پشتگیریی مادییشی دەکات، بە یاسا و ڕێسا دەیپارێزێت.

یەکێک لە کارە بەردەوامەکانی دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان لە دوای ڕاپەڕینەوە هەتا ئەمڕۆ، فراوانکردنی کۆمەڵگەی فەرمیی کوردستان بووە. هەزاران کەسی بە پێشمەرگە دامەزراندووە بەبێ ئەوەی پێشمەرگایەتیان کردبێت. هەزاران کەسی خانەنشینکردووە بەبێ ئەوەی کارمەندبووبێت و ڕۆژێک لە دەزگایەکدا کاریکردبێت.

هەموو وەزیر و ئەندامپەرلەمانەکانی هەرێمی کوردستانی خانەنشیندەکات، زۆرینەی یاسای خانەنشینیی نایگرێتەوە. ئامانجی ئەو سیاسەتە ئەوەیە زۆرترین خەڵکی کوردستان بە دەسەڵاتەوە گرێبدات و لە ناو کۆمەڵگەدا برەو بەو ئاوەزمەندییە بدات، کە چارەنوسی خەڵک بە مانەوەی دەسەڵاتەوە بەندە. بەو شێوەیە زۆرترینی خەڵکی کوردستان داکۆکیی لە مانەوەی ئەو دەسەڵاتە دەکات، دەسەڵاتیشی بە حیزبەوە گریداوە. ئیتر خەڵکی کوردستان و دەزگاکانی دەوڵەت لە کوردستان بە هەموویانەوە بەحیزبییکراون و کار بۆ حیزب دەکەن.

## ٢– پشبەستن بە پەندی پێشینان:

کۆمەڵگەی باوی کوردستان هەڵگری ئاوەزمەندیی ڕەشبینیی و بێئۆمێدییە. فەلسەفەی ئاوەزمەندیی ئەم بەشەی کۆمەڵگە، پەندی پێشینان و کەلتوری گوێی ئاگردانە. پەندی پێشینان، بریتییە لە کۆمەڵێک قسەی نەستەق کە بە شێوەی زارەکیی لە باووباپیرانەوە بۆ وەچەکانی دوای خۆیان ماوەتەوە. ئەم قسە نەستەقانەی ئێمە لە ناو گەلانی تری جیهانیشدا هەن و کاریگەرییان لەسەر ئاوەزمەندیی ئەو گەلانەیش هەیە، بەڵام هێزە دەسەڵاتدارەکانی ئەو گەلانە پەندەکانیان پاڵاوتووە، ئەو پەندانەی کاتیان بەسەرچووە و سودیان نەماوە، لە پەندە باشەکان جیاکراونەتەوە و قەدەغەکراون. ئەو پەندانەی سودبەخشن لە ناو کەلتور و زماندا دەپارێزرێن.

دەسەڵاتی کوردیی دەستکاریی پەندە کوردییەکانی نەکرد، لە کوردستان پەندەکان وەکو خۆیان مانەوە، زۆربەی ئەو پەندانە هیی سەردەمێکی کۆنن بۆ ئەم سەردەمە سودیان نییە. زۆربەی ئەو پەندە پێشینانەی کورد باسی بێباوەڕیی دەکەن. بۆ نمونە پەندی پێشینان دەڵێت: (قسە هەزارە و دوانی بەکارە). ئەم پەندە هانی خەڵک دەدات کە بڕوای بە قسە نەبێت، قسەبکات و ئاسایی بێت جێبەجێینەکات. دیارە ئەم پەندە لە ئەنجامی شکست و بێباوەڕیی مرۆڤێکەوە، یان شکست و بێباوەڕیی پێکهاتەیەکەوە گوتراوە. لەو کاتەوە هەتا ئەمڕۆ بە زیندوویی ماوەتەوە و کاریگەریی خراپی لەسەر ئاوەزمەندیی گەلی کورد بەجێهێشتووە. ئەم پەندە وا لە تاکی کورد دەکات بۆ هەڵسەنگاندن و چارەسەرکردنی کێشەیەک هێندە گوێ بە قسەکردن و ڕاگۆڕینەوە نەدات، گوێ بە وەرگرتنی ڕای بەرانبەر نەدات، بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان تەنها لایەنی کرداریی ڕەچاوبکات.

لەسەر بنەمای ئەو جۆرە پەندی پێشینانەیە کە حیزبەکانی باشووری کوردستان پابەندی پەیڕەو و پرۆگرامەکانی خۆیان نابن، لە کۆنگرەکاندا گفتوگۆ لەسەر پەیڕەو و پرۆگرام دەکەن، بە زۆرینەی دەنگ لەسەری ڕێکدەکەون، بەڵام دوای کۆنگرە بەگوێرەی پەیڕەو و پرۆگرام کارناکەن، گرنگیی بە قسەکانی خۆیان نادەن. ئەمەیش هۆکارێکە بۆ ئەو گیروگرفتە سیاسییانەی لە ناوخۆی حیزبەکانی باشووری کوردستاندا دروستدەبن.

هەر لەسەر فەلسەفەی ئەو پەندە کە حکومەتی هەرێمی کوردستان ئەو یاسایانە جێبەجێناکات کە پەرلەمانی کوردستان دەنگی لەسەر دەدات، ئەو بڕیارانە جێبەجێناکەن کە ئەنجومەنی وەزیران لەسەری ڕێککەوتندەکات.

پەندێکی تری پێشینان هەیە دەڵێت: (دەستێک نەتوانیت بیبڕیت دەبێت، ماچیبکەیت). ئەم پەندە فێرتدەکات کە چۆن بە ڕەشوسپیی سەیری دیاردەکانی ژیان بکەیت، بە تایبەتیی چۆن سەیری دۆست و دوژمنی سیاسیی خۆت بکەیت. پێتدەڵێت ئەگەر نەتوانیت دوژمن لەناوببیەت، دەبێت کۆیلەی دوژمن بیت. فەلسەفەی نێگەتیڤی ئەم پەندە کاریگەریی قووڵ و فراوانی لەسەر ژیانی سیاسیی گەلی کورد بەجێهێشتووە. یەکێک لە چەمکە سیاسییەکانی سیاسەت کە لە باشووری کوردستان بە ئاشکرا دیارە و کارپێدەکرێت، چەمکی توندوتیژیی بێبنەما و خۆبەدەستەوەدانی بێبنەمایە. ساڵی ١٩٧٤ گفتوگۆی نێوان سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول و حکومەتی عێراق شکستیهێنا، جارێکی تر شەڕ دەستیپێکردەوە، ئەو کات سەرکردایەتیی کورد هیچ نەرمییەکی نەنواند هەتا گفتووگۆ بەردەوامبێت و شەڕ دروستنەبێتەوە. دوای ساڵێک کە ئێران پشتی لە بزوتنەوەی گەلی کورد کرد، سەرکردایەتیی ئەو کاتەی شۆڕش، داوای لێبوردنی لە حکومەتی عێراق کرد و داوایکرد کە تەنها ڕێگەیبدەن بگەڕێنەوە عێراق و پارتیی وەکو حیزبێکی ڕێگەپێدروا چالاکییبکات. بەم شێوەیە لە ماوەی ساڵێکدا دوو لایەنی ناکۆکی سیاسەتی کورد بە ئاشکرا دەرکەوت، کە سەرچاوەکەی لە فەلسەفەی هەڵەی کۆمەڵگەی کوردستانەوە سەردەگرێت، یان دەبێت دەست ببڕیت، یان دەبێت دەست ماچبکەیت.

لە گفتوگۆی ١٩٨٤ – ١٩٨٥ی نێوان یەکێتیی و حکومەتی عێراق، گفتوگۆ کۆتاییهات و ڕێکنەکەوتن و شەڕ دەستیپێکردەوە. یەکێتیی لەگەڵ دوژمنە سەرسەختەکەی

عێراق (ئێران) ڕێککەوت و چالاکی سەربازیی هاوبەشیان دژی عێراق ئەنجامدا، کە حکومەتی عێراق ساڵی ١٩٨٨ ئەنفال و کیمیابارانی کوردستانی کرد و یەکێتیی شکستێکیهێنا. یەکێتیی داوای گفتوگۆی بێمەرجی لە حکومەتی عێراق کرد، حکومەتی عێراق ئامادە نەبوو گفتوگۆی لەگەڵ بکات.

ئەگەر ژیانی سیاسیی ئەو هەزاران کەسە بخوێنینەوە کە لە کاتی شۆڕشەکانی کورددا خەباتی پێشمەرگایەتییان هەڵدەبژارد، بەڵام کە کێشەی سادە لە نیوان پێشمەرگە و بەرپرسدا دروستدەبوو، دونیایان لە بەرچاو دەهاتەوەیەک و بێئۆمێددەبوون و خۆیان ڕادەستی ڕژێمی داگیرکەری عێراق دەکردەوە. لەبریی چەکی شەرەفی پێشمەرگایەتیی، چەکی جاشایەتییان لەشاندەکرد. دەبینین لە سەرەتا ئەو پێشمەرگانە ویستوویانە بە چەکی شانیان دەستی ڕژێم ببڕن، بەڵام دوای ماوەیەک و لە ئەنجامی دروستبوونی کێشەی بچووکدا، ئاراستەی چەکیان گۆڕیوە، بەو چەکە دەستی ئەو دوژمنەیان ماچکردووە کە هەتا دوێنێ دەیانویست هەمان دەست ببڕنەوە. بەو شێوەیە دەبینی کە چۆن ئاوەزمەندیی دواکەوتووی کورد بە شێوەیەکی خراپ کاریگەریی لەسەر خەبات و تێکۆشان دەکات و بێباوەڕیی دروستدەکات. لە ناو فۆلکلۆری گەلی کورددا چەندیین پەندی پێشینان هەن کە کاریگەریی نێگەتیڤیان لەسەر ئاوەزمەندیی کورد هەیە، بەڵام ژمارەیەک پەندی پێشینان هەیە، بۆ پێشخستنی هزر و کەسێتیی کورد بەسودن. بۆ نمونە، پەندێکی کوردیی دەڵێت: (چەم زاڵەبەرا دەست هەرمان کەرا). ئەم پەندە بۆ ئەو کەسانە گوتراوە، کە ڕێگەیەکی دووریان لە پێش بووە، ترسی ئەویان هەبووە نەتوانن ڕێگەکە ببڕن، یان کارێکی گرانیان لە سەرشان بووە، ترسیان هەبووە نەتوانن کارەکە ئەنجامبدەن. بەم پەندە ورەیان بەرزبووەتەوە و ئەرکی سەرشانی خۆیان ئەنجامداوە.

دەبایە یەکێک لە ئەرکە سەرەکییەکانی حیزبە سیاسییەکانی باشووری کوردستان و حکومەتی هەرێم، بە گژ ئەو پەند و فەلسەفە نێگەتیڤانەدا بچوونایەتەوە کە ڕۆڵی خراپیان لەسەر بێباوەڕیی کورد بینیوە. ئەو پەندانەیشی بپاراستایە کە هزری بەئیرادبوون و ئومێدی سەرکەوتنی گەلی کورد پێشدەخەن، بەڵام حیزبەکانی باشوور و شۆڕشەکان، نەک هەر هەستیان بە گرنگیی ئەم لایەنە ئاوەزمەندییەی کۆمەڵگەی کوردستان نەکردووە، بەڵکو هەر لەسەر هەمان هزر و کەلتوری جاران بە ئاوەزمەندیی کۆنەوە بۆ بەرنامەیەکی نوێ سیاسەت دەکەن.

## ٣- ڕەشبینیی و بێباوەڕیی

لە سەرەتای سەدەی نۆزدەدا چەندیین میرنشین و خانەدانی کورد هەوڵی ئازادکردنی کوردستان و دامەزراندنی دەوڵەتی کوردیان دا، بەڵام هەموو هەوڵ و تێکۆشانەکان شکستیانهێنا. ڕابەرانی شۆڕش وازیاندەهێنا و خۆیان ڕادەستی دوژمن دەکرد، یان بە فرۆفێڵ دەستگیردەکران و شەهیددەکران. لە جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانییدا زۆربەی نەتەوە ژێردەستەکان بە ماف و ئازادیی خۆیان گەیشتن، بەڵام نیشتیمان و نەتەوەی کورد جارێکی تر داگیر و دابەشکرایەوە. ئەو دیاردە ڕەش و کارەساتانەی لە شکستی تێکۆشانەوە دروستبوون، وایانکردووە بیری سەرکەوتن لە هزری کورددا لاوازبێت. هزری شکست و خۆڕادەستکردن پانتاییەکی زۆری بیرکردنەوەی کورد داگیربکات. ئەم کارەساتانە وایان لە کورد کردووە کە بڕوای بە ئایندەی سیاسیی نەبێت، بەرنامەی بۆ شۆڕشی ڕزگاریی نیشتیمانیی نەبێت.

هێزە نێودەوڵەتییەکانیش وەکو بەشێکی سیستەمی سیاسیی جیهانیی دژی کورد، شانبەشانی داگیرکەرانی کوردستان گەلەکۆمەیان لە گەلی کورد کردووە، وەکو گەلەکۆمەی ساڵانی (١٩٤٦، ١٩٧٥، ١٩٩٩).

ئیتر ئەو خەباتەی گەلی کورد کردوویەتی بۆ سەرکەوتن نەبووە، پەرچەکرداری سیاسەتی ڕەگەزپەرستیی دەوڵەتە داگیرکەرەکان بووە، یان سیاسەتی ئەو وڵاتانە بووە کە بەرژەوەندییان لە شەڕی نێوان کورد و دەوڵەتانی داگیرکەردا هەبووە، یان هەردوو هۆکارەکە پێکەوە ڕۆڵیان لە بەرپاکردن و درێژەکێشانی شۆڕشی چەکدارییدا بینیوە. پاش ئەوەی شۆڕش بەبێ ئامانج دامرکاوەتەوە، یان کۆتاییپێهێنراوە. بێئۆمێدیی لە سەرکەوتن، بڕوانەبوون بە تواناکانی گەل، باڵی بەسەر ئاوەزمەندیی خەڵکدا کێشاوە و هزری بێباوەڕیی لە ناخی گەلی کورددا قووڵتر کردووەتەوە.

لە لایەکی ترەوە کە دوژمنەکانی کورد بینیویانە شۆڕش پەرچەکردارە و بەرنامە و ستراتیژی نییە، بە ئاسانیی دەستیان لە کاروباری وەرداوە. چییان ویستبێت بە شۆڕشیان کردووە. ڕێگەیاننەداوە لە دوای هەڵگیرسانی شۆڕش، لە کاتی خەباتی چەکدارییدا بەرنامە و ستراتیژ بۆ شۆڕش دابڕێژرێت. ڕێگەیاننەداوە باوەڕ و دوارۆژی گەش، هیوای سەرکەوتن، لە ئاوەزمەندیی تاک و پێکهاتەکانی گەلی کوردستاندا گەشەبکات. لەبریی ستراتیژ و بەرنامە، بەرپرسانی شۆڕش پشتیان بە

هێزە دەرەکییەکان بەستووە و ئەوانیان بە دەمڕاستی خۆیان داناوە. ئەو هێزانەیش هەتا توانیویانە سودیان لە جوڵانەوەی سیاسیی و چەکداریی کورد وەرگرتووە. کاتێکیش کاریان پێینەماوە، پشتیان بەرداوە و ڕووبەڕووی شکستیان کردووەتەوە.

موحەممەد حسنین هەیکەلی ڕۆژنامەنوسی بەناوبانگی میسریی، پرسیاری لە شای ئێران دەکات، چەند بیرت لێکردەوە کە دەستت لە هاوکاریی شۆڕشی ئەیلول هەڵگرت؟ شا دەڵێت: کەمتر لە خولەکێک*١٢.

لە شۆڕشی ئەیلولدا پێش ئەوەی پارتیی بە سەرۆکایەتیی مەلا مستەفا جاڕی شۆڕشی چەکداریی دژی حکومەتەکەی عەبدولکەریم قاسم بدات، هیچ پڕۆژەیەکی سیاسیی نەبووە پێشکەشی حکومەتی بکات هەتا بزانن حکومەتەکەی قاسم پێی ڕازیدەبێت، یان پێی ڕازینابێت. لە درێژەی تێکۆشانی چەکداریی شۆڕشدا، سەرکردایەتیی شۆڕشەکە پڕۆژەیەکی سیاسیی بۆ چارەسەری کێشەی کورد ئامادەنەکرد. پێش بەیانی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ بەرزانیی نوێنەری خۆی (دارا تەوفیق)ی نارد بۆ بەغدا هەتا چاوی بە وەفدی حکومەتی عێراق بکەوێت، سەدام حوسەین سەرۆکی وەفدی عێراق بە نوێنەرەکەی بەرزانیی گوتبوو:

چیتان دەوێت؟ دارا تەوفیق گوتبووی: هاتووم گفتوگۆبکەین. سەدام حوسەین گوتبووی: لەسەر چی گفتوگۆبکەین؟ هیچ پڕۆژەیەکتان هەیە؟ دارا تەوفیق بێدەنگ بووبوو. سەدام گوتبووی: بۆچی داوای حوکمی زاتیی ناکەن هەتا لەسەر حوکمی زاتیی گفتوگۆبکەین*١٣.

لە ساڵی ١٩٧٦وە یەکێتیی دەستی بە خەباتی چەکداریی کردەوە. لە کۆتایی ساڵی١٩٨٣ گفتوگۆی نێوان یەکێتیی و حکومەتی عێراق دەستیپێکرد. چەند ڕۆژێک مام جەلال و نەوشیروان مستەفا و فوئاد مەعسوم و ملازم عومەر کۆبوونەوەیاندەکرد، بۆ ئەوەی لە کاتی دانیشتنی وەفدەکەیان لەگەڵ وەفدی حکومەتدا پڕۆژەیەکیان هەبێت گفتوگۆی لەسەر بکەن، هەتا ئەو کاتە یەکێتیی هیچ پڕۆژەیەکیان ئامادەنەکردبوو هەتا لەگەڵ حکومەتی عێراقدا گفتوگۆی لەسەر بکەن. ئەو چەند ڕۆژەیش کە من خۆم ئاگاداری گفتووگۆکانیان بووم، هیچیان پێ ئامادەنەکرا. لەبەرئەوە بڕیاریاندا، کە چوون بۆ گفتوگۆ بڵێن، حوکمی زاتیی پێشکەوتوو (حوکمی زاتیی متتەور)مان دەوێت*١٤.

ئەم بێپرۆژەییەی پارتیی و یەکێتیی لە کاتی خەباتی چەکدارییدا لە ئەنجامی بێبڕوایی بە سەرکەوتن سەریهەڵداوە. ئەم دیاردەیە هەتا ئەمڕۆیش بەردەوامە، لەبەرئەوەی بێباوەڕیی بە سەرکەوتن ئاوەزمەندیی کۆمەڵگەی باشووری کوردستانە.

ئەگەر لە ڕابردوودا شکستەکانی شۆڕشی کورد و خیانەتی وڵاتان بەرانبەر بە دۆزی کورد هۆکاری ڕەشبینیی و بێباوەڕیی خەڵکی کوردستان بووبێت، لە دوای ڕاپەڕینەوە ئەدای نادیمکراتیی و گەندەڵیی و ناداپەروەریی حوکمڕانیی دەسەڵاتی کوردیی لە هەرێم، هۆکاری سەرەکیی بێباوەڕیی و سەرهەڵگرتنی گەلی کورد بووە. هۆکاری سەرەکیی کۆچکردنی خەڵکی کوردستان بۆ ئەورووپا بێباوەڕیی خەڵکە بە دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان. لە ساڵانی ڕابردوودا کۆچی خەڵک سنووردداربوو، بەڵام لە ساڵی ٢٠٢١ ئەو کۆچکردنە سنووری بەزاندووە، ئەوە پیشانیدەدات کە خەڵکی کوردستان بڕوای بە حوکمڕانیی کورد نەماوە. ئەو کەسایەتییە خێڵەکیی و ئاینیی و سیاسییانەی کوردستان کە لە ڕابردوودا ئامادەکارییان بۆ بەرپاکردن و بەڕێوەبردنی شۆڕشەکان کردووە، بە وریایی و هەستیارییەوە سەیری ئەم بارە سایکۆلۆژیی و هزرییەی گەلی کوردیان نەکردووە، نەهاتوون پێش شۆڕش و لە کاتی شۆڕشدا ئەو کەسێتییە بێباوەڕییەی کورد بە بەرنامەیەکی سیاسی دروستبکەنەوە و بەرەو کەسێتییەکی باوەڕداری ببەن.

حیزبێکی سیاسیی کوردستان، کە لە هەموو پارچەکانی کوردستاندا هەستی بەم بارە بێباوەڕییەی گەلی کورد کردووە. کاری بۆ ڕاستکردنەوەی کەسێتیی شکاوی کورد کردووە، (پ. ک. ک) بووە، کە بەردەوام ڕایگەیاندووە ئەو ئاوەزمەندییەی تاک و پێکهاتەکانی کۆمەڵگەی کوردستان هەڵیانگرتووە، لە لایەن داگیرکەرانەوە بەسەریاندا سەپێنراوە. ئەگەر بمانەوێت شۆڕشبکەین، دەبێت لە پێشەوە شەڕی ئەو ئاوەزمەندییە بکەین، کە داگیرکەر لە ناخی گەلی کورددا دروستیکردووە. پەکەکە دەڵێت ئەگەر بەو کەسێتییەی داگیرکەر بۆ کوردی دروستکردووە دژی داگیرکەر شۆڕشبکەین، شۆڕشمان پێناکرێت، ئەگەر شۆڕشبکەین، سەرکەوتن بەدەستناهێنین*١٥.

## ٤- دژایەتیی دەزگاکانی دەوڵەت:

لە قۆناغەکانی گۆڕان و گەشەکردنی کۆمەڵگەدا، کورد سەرکەوتنی سیاسیی بەدەستنەهێناوە، دەوڵەتی دروستنەکردووە. لە لایەن دەوڵەتانی سەردەستی

کوردستانەوە دوچاری چەوسانەوە و نکوڵییکردن و جینۆساید هاتووە. لەبەرئەوەی کورد دەوڵەتی نەبووە، لە لایەن دەوڵەتانی ترەوە مافی پێشێلکراوە و کۆمەڵکوژ کراوە. کورد واتەنی: "خەیری لە دەوڵەت و دەزگاکانی نەدیوە". ئیتر وایلێهاتووە ڕقی لە دەوڵەت و دامودەزگای دەوڵەت ببێتەوە. دەستوور و یاسای دەوڵەت بە دوژمنی خۆی دەزانێت. کوێرانە دژی دامودەزگاکانی دەوڵەت دەوەستێتەوە. دەزگای سەرکوتکەر و دەزگای خزمەتگوزاری دەوڵەت لە یەکتر جیانەکاتەوە. دژی هەموو دەوڵەتێک دەوەستێتەوە، با دەوڵەتی خۆیشی بێت. ئەم نزیکبوونەوەیەی کورد لە دەوڵەت لە چەندیین قۆناغی هەستیاردا بە ئاشکرا دەردەکەوێت، کاریگەریی خراپی لەسەر سیاسەت و بەڕێوەبردنی هەرێمی کوردستان و عێراقی فیدراڵیی بەجێهێشتووە.

لەبەرئەوەی خەڵکی کوردستان ستەمێکی زۆری بە دەستی دەوڵەتی عێراقەوە دیوە، ڕقێکی ئەستووری بەرانبەر بە دەوڵەتی عێراق کۆکردووەتەوە، بۆیە لە ڕاپەڕیینی ساڵی ١٩٩١دا، هەرچی دامودەزگای خزمەتگوزاریی و سەرکوتکەری ئەو دەوڵەتە هەبوو، هەمووی پێکەوە کەوتە بەر هێرشی خەڵکی ڕاپەڕیو و بە سەریەکدا تێکدران و تاڵانکران و لەناوبران. خەڵکی کوردستان هێندە قینلەدڵ بوو لە حکومەتی بەعسی عێراق، جیاوازیی لە نێوان دەزگا خزمەتگوزارییەکانی وەکو نەخۆشخانە و دەزگا سەرکوتکەرەکانی وەکو ئاسایش نەدەکرد. هونەرمەندان و ڕۆشنبیرانی کوردیش، بە هەمان شێوەی جەماوەری کوردستان هەڵسوکەوت لەگەڵ دامودەزگا و یاسا و ڕێساکانی دەوڵەتدا دەکەن، ڕقیان لە یاسا دەبوو، دژایەتیی ئەو پێکهاتانەیان دەکرد کە یاسا دەپارێزن، ئەو تاک و پێکهاتانەیشیان خۆشویستووە کە لە یاسا یاخیبوون.

لە دوای ڕاپەڕیین هونەرمەندانی سلێمانیی بەوپەڕی شانازییەوە یەکەم فلیمی کوردییان لەسەر خولە پیزە دەرکرد. هۆکاری سەرەکیی ئەوەیە کە ئاوەزمەندیی دژایەتیی دەزگای دەوڵەت و ئاوەزمەندیی دژەیاسایی لە لای هونەرمەندانی کوردستانیش بەهێزە. لەبەرئەوەی خولە پیزە لە حکومەتی عێراق یاخیی بووە، لە لای هونەرمەندان وەکو پاڵەوان حسابی بۆ دەکرێت. خولە پیزە، هیچ ئامانجێکی سیاسیی هانینەدابوو ئەو یاخیبوونە بگرێتەبەر، تەنها دژی یاسایەکی حکومەتی پاشایەتیی عێراق وەستابووەوە، کە مەرج نەبوو ئەو یاسایە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆیش دژی گەلی کورد بووبێت.

ئەم ئاوەزمەندییەی هونەرمەندانی کوردستان بەرانبەر بە خولە پیزە. ئەو ئاوەزمەندییە زاڵەی کۆمەڵگەی کوردستان پیشاندەدات کە هەر کەسێک دژی یاسای دەوڵەت بوەستێتەوە بە پاڵەوان پیشاندەدرێت. لەبەرئەوەی دەوڵەت زۆر زیانی لە کورد داوە، هەر کەسێک زیان بە دەوڵەت بگەیەنێت، با زیان بە لایەنە باشەکەی دەوڵەتیش بگەیەنێت، ئەو کەسە بە دۆست و دڵسۆزی گەلی کورد دەژمێردرێت و پێویستە خەڵاتبکرێت.

یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان یەکێکە لە حیزبە دەسەڵاتدارەکانی کوردستان و عێراق، لە بەهاری ساڵی ١٩٩١ بە دواوە هەتا ئێستا حوکمی بەشێکی هەرێمی کوردستان دەکات، لە دەزگاکانی یاسادانان و ڕاپەڕاندن و دادوەریی و سەربازیی هەرێمی کوردستان و عێراقدا بەشدارە. لە پارێزگای سلێمانییدا دامودەزگا و وەزارەتەکان بە دەست یەکێتییەوەیە، بەڵام بەرپرس و کادرەکانی ئەو حیزبە، زۆر ڕقیان لە یاسا و دەزگای حکومەت و پەرلەمان و دادوەریی دەبێتەوە و بە هەموو شێوەیەک دژایەتییاندەکەن. لە لایەکەوە دەستی حیزب لەسەر بینەقاقەی ئەو دامودەزگا دەوڵەتییانە دادەنێت، کە خۆی بەڕێوەیاندەبات، لە لایەکی ترەوە بەرانبەر بە دەزگا هەستیارەکانی دەوڵەت دەزگایەکی سێبەری حیزبیی قوتدەکاتەوە، هێندەی تر کێشەکان قووڵدەکاتەوە. یەکێتیی لە بەرانبەر دەسەڵاتی دادوەریی هەرێمی کوردستاندا، مەکتەبی کاروباری کۆمەڵایەتیی دامەزراندووە و بەگوێرەی ڕێسا خێڵەکییەکان لە کێشەکانی خەڵک دەکۆڵێتەوە و مۆدێلی چارەسەری خێڵەکییان بۆ دەستنیشاندەکات و دەسەڵاتی دادوەریی و یاساکان پەراوێزدەخات.

یەکێتیی لە بەرانبەر وەزارەتی تەندروستیی حکومەتی هەرێمی کوردستاندا نەخۆشخانەکانی شۆڕش قوتدەکاتەوە و گێژاوی بەڕێوەبردن و خزمەتگوزاریی تەندروستیی بۆ خەڵکی کوردستان زیاددەکات. یەکێتیی لە بەرانبەر وەزارەتی ئابووریی حکومەتەکەی خۆیدا دەزگای ئیدارەی گشتیی دروستکردووە. لە بەرانبەر وەزارەتی پێشمەرگەدا فەرماندەیی گشتیی هێزی پێشمەرگەی دروستکردووە.

ئەم دامودەزگا حیزبییانەی حیزبێکی دەسەڵاتداری سۆسیاڵ_دیموکرات لەوانەیە هۆکاری سیاسییشی لە پشتەوە بێت، بەڵام ئاوەزمەندیی ڕقلێبوونەوە لە دامودەزگای دەوڵەت و یاسا و دەستوور، زەمینەی لەباری بۆ دامەزراندن و هێشتنەوەی ئەو

دامودەزگا ناحکومیی و ناشارستانیی و دژەیاسا و دژەدەزگا دەوڵەتییانە خۆشکردووە.

لەوەتەی حکومەتی هەرێمی کوردستان پێکهاتووە هەتا ئێستا دەستووری نییە. یەکێک لە پێویستییەکانی مانەوە و پێشکەوتنی هەر قەوارەیەکی سیاسیی دەستوورە، کە تیایدا پەیوەندیی نێوان دەسەڵات و خەڵک ڕێکدەخرێت و دەسەڵاتەکان لە یەکتر جیادەکاتەوە و سنووری دەسەڵاتی دەسەڵاتداران دیاریدەکات، بەڵام سەرەڕای ئەوەی هەر لە سەرەتای هەڵبژاردنی پەرلەمان و پێکهێنانی حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە پارێزەران و مافناسانی هەرێمی کوردستان دارشتنی دەستووری هەرێمیان بە پێویست بینی و ڕەشنوسی پرۆژەی دەستووریان ئامادەکرد، کەچی دەسەڵاتی کوردیی ئەو پرۆژانەی دەستووری بە پێویست نەبینیوە و گەلیش سەبارەت بە بێدەستووریی هەرێمی کوردستان هەڵوێستی پیشاننەداوە*١٦.

لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام، یەکێک لە کارە بەپەلەکانی حکومەتی عێراق و نوێنەری ئەمریکا لە عێراق ئەوە بوو کە بە زووترین کات پرۆژەی دەستووری عێراق ئامادەبکرێت و ڕاپرسیی لەسەر بکرێت. ئەم کارەیشیان بە بەرچاوی حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە کرد. لە مادەیەکی دەستووری عێراقدا هاتووە کە دەبێت هەرێمی کوردستانیش دەستووری تایبەتی خۆی هەبێت *١٧، کەچی هەتا ئێستایش حکومەتی هەرێمی کوردستان و خەڵکی باشووری کوردستان هێند بە تەنگی دەستووری هەرێمەوە نایەن و هێند بە پێویستی نابینن.

دیارە هۆکارگەلی تر لە پشتی فەرامۆشکردنی دەستووری هەرێمەوە هەن، بەڵام هۆکارێکی گرنگی فەرامۆشکردنی دەستوور لە لایەن گەل و دەسەڵاتی کوردەوە بۆ ئەو ئاوەزمەندییە زاڵەی کۆمەڵگەی کوردستان دەگەڕێتەوە، کە ڕقی لە دەستوور دەبێتەوە، لەبەرئەوەی بە داهێنانێکی تری دەوڵەت و دەسەڵاتی چەوسێنەری دەزانێت.

لە دوای ڕاپەڕیین حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشوور لە هەرێمی کوردستاندا دەسەڵاتیان وەرگرت، چەندیین مەکتەبی کاروباری کۆمەڵایەتییان بۆ چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتییەکانی خەڵکی کوردستان دامەزراند. بەرانبەر بەم کردارەی حیزبە دەسەڵاتدارەکان، خەڵک و دادوەر و مافناسەکانی کوردستان بێدەنگییان هەڵبژارد. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە هزری ڕقلێبوونەوە و فەرامۆشکردنی یاسا لە ناو مێشکی هەموو پێکهاتەکانی کۆمەڵگەی کوردستاندا زاڵە و کاریپێدەکرێت.

ئەو ڕقلێبوونەوەی خەڵک و دەسەڵات لە دەزگاکانی دەوڵەت، بە بەرنامە لە لایەن دوژمنانی کوردەوە پاڵپشتییدەکریت و برەوی پێدەدرێت. داگیرکەرانی کوردستان چاویان بە پەرلەمان و بە حکومەتی هەرێم هەڵنایەت، نایانەوێت پەیوەندییان لەگەڵ دەزگا دەوڵەتییەکانی هەرێمدا هەبێت. ئەگەر ناچاربوون پەیوەندیی لەگەڵ هەرێمدا دروستبکەن، ئەو پەیوەندییە لە ڕێگەی حیزبەوە دروستدەکەن.

ڕۆژی ٢٣/ ٩/ ٢٠٠٨ لە دادگای شاری سلێمانیی لە کاتی دادگاییکردنی تاوانبارێکدا، دوژمنی تاوانبارەکە بە دزییەوە دەمانچەیەکی بردبووە ناو دادگاکەوە و بە بەرچاوی ئامادەبوانەوە تاوانبارەکەی دایە بەر گوللە و کوشتی. لە لایەن ڕاگەیاندن و یاسا و سیاسەتمەدارانەوە بە گرنگیی سەیری ئەو ڕوداوە نەکرا. ئەم کردەوەیە و هەڵوێستی ڕاگەیاندن و یاسا و سیاسەت ئەوە پیشاندەدات کە هزری بەبچووکبینینی یاسا لە چارەسەرکردنی کێشەکاندا لە مێشکی هەموو پێکهاتەکانی کۆمەڵگەدا زاڵە. ئەم هزرە ناشارستانییە هۆکارێکی سەرەکییە کە لە داڕشتنی دەستوور و یاساکانی عێراقدا ڕۆڵی دادوەر و یاساناسان فەرمۆشکراوە. لەوێیشەوە کورد زیانی سیاسیی گەورەی بەرکەوتووە.

### ٥- ناوەندگەرایی:

گوتەیەکی بەناوبانگی جیهانیی هەیە دەڵێت: «خۆزگە لە ئەوروپا منداڵ بوومایە، لە ڕوسیا سەگ بوومایە، لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیش پاشا بوومایە». ئەو کەسە لە خۆیەوە ئەو ڕستانەی ڕیزنەکردووە، دیارە بەو بڕوایە گەیشتووە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا پاشا بە خۆشترین شێواز دەژی و دەسەڵاتی بێسنووری هەیە. هەموو کەس هەوڵدەدات ببێتە پاشا، بۆیە ئەویش ئاواتی بە پاشایەتیی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست خواستووە.

پاشایەتیی لە ئاستی بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتدا، ئاغایەتیی لە ئاستی بەڕێوەبردنی خێڵ و شار و ناوچەی ژێردەسەڵاتدا، پیاویی لە ئاستی سەرپەرشتیی ماڵ و منداڵدا، سەرۆکی حیزب لە ئاستی بەڕێوەبردنی حیزبدا، هەمووی لە چەمکی ناوەندگەراییەوە سەرچاوەدەگرێت و لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا زیاتر لە هەر شوێنیکی تر، ئاوەزمەندیی خەڵکی داگیرکردووە و پەیڕەودەکرێت.

ناوەندگەرایی بە واتای ئەوە دێت هەر کەسێک لە جێگەیەکی تایبەتدا دەسەڵاتێکی هەبێت، بەرپرسیارێتیی پێکهاتەیەک لەئەستۆبگرێت و قسە لە قسەیدا نەکرێت. دەبێت بڕیار و کار و چالاکییەکان بە دڵی ئەو بن و لە بەرژەوەندیی ئەودا بن. ئەمە بەو واتایە دێت ئەو کەسە لە هەموو شتێکدا لە دەوروبەرەکەی زیاتر دەزانێت، دەبێت دەوروبەری گوێرایەڵی قسە و بڕیارەکانی بن و جێبەجێیبکەن.

زۆربەی ئەفسانەکان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست سەریانهەڵداوە، هەر سێ ئاینە ئاسمانییەکانی (جوو، کریستیانیی، ئیسلام) لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست سەریانهەڵداوە، لە دێرزەمانەوە ئەفسانە و ئاین باس لە هێزێکی گەورەی خاوەن_دەسەڵاتی نەبینراو و نەناسراو دەکەن، کە مرۆڤی دروستکردووە، دەبێت مرۆڤ بە هەموو شێوەیەک ملکەچی ئەو هێزە خوڵقێنەرە گەورەیە بێت.

لە ئەفسانەدا ئەو هێزە پاشایە، لە ئاینداا ئەو هێزە خودای نەبینراوە کە پێغەمبەر و ئەولیاکان لەسەر زەی نوێنەرایەتییدەکەن، لە هەردوو حاڵەتدا مرۆڤەکان ناچارن گوێڕایەڵیی کوێرانەی هێزە خولقێنەرە باڵادەستەکەی سەرووی خۆیان بن. کۆمەڵگەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە قووڵیی و بۆ ماوەیەکی درێژ لەژێر کاریگەریی ئەم هێزە ئایدۆلۆژییە ناوەندییەدا ژیاون، ئەو هێزە ئایدۆلۆژییە ناوەندگەرییە بە مۆڵکی خۆیان دەزانن و دەستی لێبەرنادەن.

لە کۆمەڵگەی ڕۆژئـاوادا، مێژووی ئایدۆلۆژیا و فەلسەفە، وەکو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست نەبووە، ئەفسانە و ئاینەکان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا لەدایکبوون و لەوێوە بەرەو ڕۆژئاوا بڵاوبوونەتەوە، هێندە کاریگەرییان لەسەر کۆمەڵگەکانی تری جیهان و ڕۆژئـاوا دانەناوە. ئەمە وادەکات ڕۆژئـاوا کەمتر لەگەڵ ئەفسانە و ئایندا ژیابێت و کەمتر مەیلی بۆیان هەبێت و بە مولکی خۆی و نەزانێت کەمتر حەزی لە ناوەندگەریی بێت. ئەم جیاوازییە مێژووییە جوگرافییە وادەکات کە ڕۆژهەڵاتییەکان لە چاو ڕۆژئاواییەکاندا، زیاتر ئاوەزمەندیی ناوەندگەرایی لە هەڵسوکەوت و بڕیاریاندا ڕەنگبداتەوە و بە ئاسانیی وازیلێنەهێنن.

ئێمەی کورد کە گیرۆدەی هزری ناوەندگەرایی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستین و کار بۆ دەستخستنی ئاوەزمەندیی کۆمەڵگەی ڕۆژئاوا دەکەین، وەکو ماف و ئازادیی نەتەوەیی، سیستەمی دیموکراسیی و مافی مرۆڤ، کاتێک دەچینە قۆناغی کاری پراکتیکەوە،

دەبینین ئاوەزمەندیی ئێمە لەگەڵ ئەو ئامانجانەی کاری بۆ دەکەین نایەتەوە و ناکۆکە، لەبەرئەوە لە کاتی تێکۆشاندا دوچاری تەنگەنەفەسیی و سەرلێشێواویی دەبین.

لە سەرتاسەری جیهاندا، لە بەڕێوەبردنی کاروباری سیاسیی و ئابوریی کۆمەڵایەتییدا، هیچ ناوچەیەک هێندەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست چەمکی ناوەندگەرایی تێیدا کاریپێناکرێت. لە ناو گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیشدا، گەلی کورد زۆر بە جدییەوە چەمکی ناوەندگەریی گرتووە. لە لای دەسەڵاتدارانی گەلی کورد ناوەندگەرایی بۆ ئاستی بنەماڵە و خێڵیش شۆڕدەبێتەوە، بووەتە ئاوەزمەندیی کۆمەڵگە و بە دیاردەیەکی ئاسایی دەبینرێت. دەسەڵاتداری کورد هەر بەوەوە ناوەستن کە هەتا لە ژیاندان هەرچی دەسەڵاتی سیاسیی و ئابوریی هەیە لەژێر چنگی خۆیاندا بێت، بەڵکو ئەوپەڕی هەوڵیش دەدەن کە لە ناو حیزب و دامودەزگاکانی وڵاتەکەیاندا، بێجگە لە خێزان و بنەماڵەکانی خۆیان کەسی تر فێری هونەری سیاسەت و بەڕێوەبردن نەبێت، بۆ ئەوەی لە دوای مردنی خۆیان دەسەڵاتی وڵات لە دەست نەوەکانیاندا بمێنێتەوە.

لە ئەوروپا و وڵاتانی تری سەر بە سیستەمی سەرمایەدارییدا، ئاوەزمەندیی دژی ناوەندگەرایی وەکو دیموکراسیی و دەستاودەستکردنی دەسەڵات، لە ناو حیزب و لە ناو دەوڵەت و لە بوارەکانی تری ژیاندا بە شێوەیەکی بەرچاو پەیڕەودەکرێت. لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ئەو ئاوەزمەندییە هێندە بە گرنگ وەرنەگیراوە و کاریپێناکرێت. لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و لە ناو گەلانی کورد و عەرەبدا ئەو کەسانەی دەبنە سەرۆکی حیزب و سەرۆکی وڵات، ئاساییە هەتا مردن لەو پۆستەدا بمێننەوە، لە دوای مردنیشان دەسەڵاتەکەیان بۆ نەوەکانی دوای خۆیان بگوازرێتەوە.

زاڵبوونی هزری ناوەندگەرایی لە ئاوەزمەندیی مرۆڤی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بە شێوەیەکی گشتیی و لە ئاوەزمەندیی مرۆڤی کورددا بە شێوەیەکی تایبەتیی، وا لە زۆربەی مرۆڤەکان دەکات کە تەنها بڕوایان بە کەس و تاقمی دەسەڵاتدار بێت، بڕوایان بەهێز و لێهاتوویی زۆرینەی گەل نەبێت، ئەمەیش دەبێتە هۆکار بۆ ئەوەی جەماوەر لە پرۆسەی بەرهەمهێنان و پێشخستنی کۆمەڵگەدا ڕۆڵی نەبێت، وڵات سود لە توانای گەلی خۆی نەبینێت و کۆمەڵگە بە دواکەوتوویی بمێنێتەوە.

لە هەرێمی کوردستان ئاوەزمەندیی ناوندگەرایی و قورخکردنی دەسەڵاتی وڵات لە دەستی کەس و بنەماڵە و خێزاندا هەتا ئەمڕۆیش ڕەواجی هەیە، دەسەڵاتدارانی

سەر بە پارتیی و ئەو جەماوەرەی پشتیوانیی لەو حیزبە دەکەن، هەتا ئێستایش ناوەندگەرایی بە دیاردەیەکی سروشتیی و ئاسایی دەبینن، کە هەموو دەسەڵاتی حیزب و حکومەت لە ناو دەستی بنەماڵەی مەلا مستەفای بەرزانییدا بێت.

یەکێتیی نیشتیمانیی، لایەنی دووەمی دەسەڵاتداری باشووری کوردستان کە جاران بە پێچەوانەی چەمکی ناوەندگەرایی و بنەماڵەگەرێتییەوە خۆی دەنواند، لەم ساڵانەی دواییدا کە زانییان ئاوەزمەندیی کۆمەڵگە لەگەڵ چەمکی ناوەندگەرایی دەڕوات، ئەوانیش دەسەڵاتیان قورخکرد و حیزبیان لەسەر خێزانی تاڵەبانیی تاپۆکرد. لە کۆنگرەی سێیەمی یەکێتییدا کە لە حوزەیرانی ٢٠١٠دا لە شاری سلێمانیی بەسترا، کۆنگرە دەسەڵاتەکانی مام جەلالی زۆر کرد. لە کۆنگرەی سێدا دەسەڵات درا بە مام جەلال ١٥٪ ئەندامانی کۆنگرە دیاریبکات، لە کۆنگرەدا کەسێکی تر وەکو ڕکابەر خۆی بۆ پۆستی سکرتێری گشتیی نەپاڵاوت، هەموو ئەندامانی کۆنگرە مام جەلال-یان بە سکرتێری کۆنگرە هەڵبژارد، مام جەلال هەر لەو کۆنگرەیەدا دوو جێگری بۆ خۆی دانا و مافی ئەوەی پێدرا هەتا کۆنگرەی ئایندە پێنج ئەندامی مەکتەبی سیاسیی بۆ حیزبەکەی دابنێت، مافی ئەوەی پێدرا بیست ئەندام بۆ ئەنجومەنی حیزبەکەی دابنێت.

ئەو دەسەڵاتانە لە کۆنگرەی سێی یەکێتیی لە لایەن ١٧٠٠ هەزار و حەوتسەد ئەندامی حیزبەوە بە مام جەلال بەخشرا. لە پەیڕەوی ناوخۆی هیچ حیزبێکی شمولییدا وێنەی نییە، نەک لە پەیڕەوی ناوخۆی حیزبێکی سۆسیاڵ_دیموکراتدا. ئەم دەسەڵاتفراوانکردنەی مام جەلال لە کاتێکدایە، کە سەرۆککۆماری عێراقە، عێراقیش لە چاو وڵاتانی تردا خاوەنی گەورەترین کێشەی ناوخۆیی و ناوچەیی و جیهانییە. دەبوو مام جەلال وازی لە حیزب بهێنایە و خەریکی کاروباری سەرۆککۆمارییەکەی بێت، بەڵام ئەوەی جێی نیگەرانیی زۆرتر بوو ئەوە بوو لە ناو حیزب و لە دەرەوەی حیزب، هیچ تاک و پێکهاتەیەک بەرانبەر بە گەورەکردن و گەشەپێدانی ناوەندگەرایی و بەفراوانکردنی دەسەڵاتی مام جەلال هەڵوێستی پیشاننەدا، ئەو ڕوداوەیان بە کارێکی ئاسایی بینی*١٨.

ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە ئاوەزمەندیی و هەوەسی ناوەندگەرایی، لە ناو گەلی کورددا دیاردەیەکی ئاسایییە و کەس ڕووبەڕووی ناوەستێتەوە، کەچی لە ئاستی نێونەتەوەییدا، ئاوەزمەندیی ناوەندگەرایی بێزراوە، دژایەتییدەکرێت و لە شوێنیدا ئاوەزمەندیی

دیموکراتیی جێگیردەکرێت. لە کۆتایی ساڵی ٢٠١٠دا پارتیی دیموکراتی کوردستان کۆنگرەی ١٣ی بەست. مەسعود بەرزانیی بە سەرۆکی حیزب هەڵبژێردرایەوە. ١١ کەس لە برا و کوڕ و برازای بەرزانیی بە جێگری سەرۆک و ئەندامی مەکتەبی سیاسیی پارتیی هەڵبژێردرانەوە. ئەمە لە کاتێکدایە کە لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلولدا تەنها دوو کوری مستەفا بەرزانیی لە ناو سەرکردایەتیی حیزبدا دەسەڵاتدار بوون. بەو شێوەیە دەبینین کە دیاردەی ناوەندگەرایی لە ئاستی تاک و لە ئاستی خێڵ و بنەماڵە خانەدانەکاندا هەتا ئەمڕۆیش لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و کوردستاندا بە دیاردەیەکی سروشتیی سەیردەکرێت و پێشدەکەوێت.

پاراستن و گەشەپێدانی ئاوەزمەندیی ناوەندگەرایی لە لایەن دەسەڵاتی هەرێمی کوردستانەوە لە کاتێکدایە، کە ئەو ئامانجانەی گەلی کورد و دەسەڵاتداران خۆیان تێکۆشانی بۆ دەکەن، بە ئاوەزمەندیی ناوەندگەرایی نایەنەدی. ئەو ئامانجانە بە هزری دیموکراتیی دێنەدی، کە دژبەری هزری ناوەندگەراییە. کاتێک مرۆڤ باس لە ئازادیی نەتەوە دەکات، بەو واتایە دێت کە هەموو تاک و پێکهاتەیەکی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی ئەو نەتەوەیە مافی هەبێت لە بڕیاردا بەشدارییبکات، ئاستەنگیی بۆ چالاکیە سیاسیی و ئابوریی و کەلتورییەکانی دروستنەکرێت، لەبەرئەوە پاراستن و گەشەپێدانی ئاوەزمەندیی ناوەندگەرایی لە هەرێمی کوردستان، ئەو ئامانجە نەتەوەیی و دیموکراتییانە بەتاڵدەکاتەوە، کە هەردوو حیزبی دەسەڵاتدار خەڵکی کوردستانی پێ سەرقاڵدەکەن.

### ٦- ئاوەزمەندیی عیشق

ئەسکەندەری مەقدۆنیی دەڵێت: «حەوت عاشقم پێبدەن، جیهان داگیردەکەم»١٩.

بەختیار عەلی لە ڕۆمانی غەزەلنوس و باخەکانی خەیاڵدا بەم شێوەیە باس لە عەشق دەکات:

"زۆر کەمن ئەو مرۆڤانەی ئەو ساتە دەژین کە تیایدا عاشقدەبن، عاشقبوون بە واتا مرۆڤانە سادەکەی نا، وەکو ئەوەی کتوپڕ هەستبکەیت دیلی مرۆڤێکی تریت و ناتوانیت لێیدەربازبیت و بیری لێنەکەیتەوە. بە واتا سۆفیست و دینییەکەیشی نا، کە عەشق

جۆرە پەیوەندییەکی قووڵە بە خالق و وێنە جیاوازەکانیەوە، بەڵکو بە واتای ئەو هێزە گەورەیە دێت کە مرۆڤ والێدەکات خەمخۆری مرۆڤ بێت. مرۆڤ بەرەو پەیوەندییەکی قووڵ لەگەڵ ژیاندا بەرێت. وا لە مرۆڤ بکات بۆ مرۆڤەکانی تر بگری*٢٠.

عەبدوڵڵا ئۆج ئالان لە کتێبی بەرگرییکردن لە گەلێک بەم شێوەیە باس لە خۆشەویستیی و عەشقی مرۆڤی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەکات:

"شانازییکردن بە ڕابردوو و ئومێد بە ئایندە لەمێژە لە ڕۆژهەڵاتی ناویین ونبووە و نەماوە، عەشق دوورە لەوەی واتا بە ژیان ببەخشێت. لە هیچ چالاکیی و تواناکارییەکی ژیاندا خاوەنی بانگەشە نییە، داخوازیی تێگەیشتن و درکپێکردنی کزبووە. ئەوەی بە هەموو هێز و توانای خۆیەوە پێداگریی لەسەر دەکات، تەواوکردن و بەسەربردنی ڕۆژە. خۆشەویستییەکی قووڵی مرۆڤ و مرۆڤدۆستیی و مرۆڤپەروەریی بوونی نییە. پێناسەی مرۆڤبوونی پێنییە، هەتا مرۆڤی خۆشیبوێت*٢١.

سەیربکەن چۆن سەرکردەیەکی مێژوویی جیهانیی وەکو ئەسکەندەر بەو شێوەیە لە گرنگیی عەشق دەڕوانێت. چۆن بۆ تێکۆشان و سەرکەوتن و پێشکەوتن عەشق بە پاڵنەرێکی گەورە دەبینێت. چۆن ئەدیبێک و بیرمەندێکی سیاسیی کوردیش باس لە ئەزمەی عەشقی کۆمەڵگەی کوردستان دەکەن. بەختیار عەلی دەڵێت: "لە خەیاڵیشدا ئەو کەسانە زۆر کەمن کە خەمخۆری مرۆڤی تر بن". عەبدوڵڵا ئۆج ئالانیش لە هەمان کات و شوێنی بەختیار عەلیدا دەڵێت: "لە ناوچەکەدا خۆشەویستییەکی قووڵی مرۆڤدۆستیی و مرۆڤپەروەریی بوونی نییە". دەتوانین بڵێین کۆمەڵگەی ئەمڕۆی کوردستان لە عیشق بێبەرییە، داری عیشقی زڕبووە و بەرناگرێت. هەر لە هەمان سەرچاوەی پێشوودا عەبدوڵڵا ئۆج ئالان دەڵێت: "لە کۆمەڵگەی دەرەبەگایەتییدا عیشق نییە". کۆمەڵگەی ئەمڕۆی کوردستانیش بە سەرخانی قۆناغی دەرەبەگایەتیی پەروەردەکراوە. ئەو عیشقەیش کە هەیە هەمووی ساختەیە و بۆ چەوسانەوە و ژێردەستکردنی بەرانبەرە. مرۆڤ گەورەناکات و کۆمەڵگە پێشناخات. ئەو عیشقەی کە لە نێوان نێر و مێی کۆمەڵگەی ئێمەدا هەیە، عیشقێک نییە پێویستییە مۆراڵیی و ئیعتیبارییەکانی کوڕ و کچ، ژن و مێرد، دابینبکات و لە ئاستی ڕۆحیی و هزرییەوە پێشیانبخات و لە ڕێگەی ئەوانیشەوە کۆمەڵگە پێشبکەوێت.

ئامانجی پەیوەندییەکانی نێوان کوڕ و کچ، ژن و مێرد، هاوکاریی و گەورەکردن و ئازادکردنی یەکتر نییە، ئامانج کۆیلەکردنی یەکترییە. یەکیان هەوڵدەدات لە ڕێگەی

پەیوەندییەکەوە ئەوی تر دیلبکات و بیخاتە ژێر کاریگەریی خۆیەوە. بەو شێوەیە هەردووکیان دەبنە کۆیلە و کۆمەڵگەیش بە دواکەوتوویی و بە کۆیلەیی دەمێنێتەوە و پێشناکەوێت. لە ساڵانی خەباتی چەکدارییدا، عیشقی نێوان کوڕی پێشمەرگە و کچانی شار، زۆربەی کات بە خستنی کوڕە پێشمەرگە عاشقەکە تەواودەبوو، کچانی کوردستان مەرجیان بۆ شوکردن بە پێشمەرگە خۆرادەستکردنەوەی دەبوو بە ڕژێم، یان وازهێنان لە پێشمەرگایەتیی و کۆچکردن بۆ ئەورووپا بوو، بۆ ئەوەی ژیانێکی خێزانیی کلاسیکیی خۆپەرستانە بژین. زۆر کەم بوون ئەو کچانەی هانی خۆشەویستەکانیان دابێت داکۆکیی لە ماف و ئازادیی گەلەکەیان بکەن.

هەرچی پیاو و گەنجی کوردی شۆڕشگێڕیش هەبوو، هزری دیموکراتیی و ژندۆستییان بەو ئاستە نەگەیشتبوو ڕێگەبدەن خۆشەویستەکانیان خەباتی سیاسیی بکەن. باش قسەی برادەرە پێشمەرگەکەمم بە بیردێتەوە، کە دەیگوت: "من لە هەموو شتێکدا مارکسییم بێجگە لە مەسەلەی ژن". بەو شێوەیە دەردەکەوێت کە شۆڕشگێڕانی کوردستان، عەشقی کوڕ و کچیان لە گەڵ عیشقی ئازادیی مرۆڤ و عەشقی ڕزگاریی و ئازادیی کوردستان جیاکردووەتەوە. بە عیشقێکی غەریزەبازیی و کۆیلایەتییەکی سیاسیی ڕازیبوون. پێشمەرگەکانیش لە شاخ فێری عیشقی ڕاستەقینە نەکران، هەتا بتوانن ئاوەزمەندیی کچەکان بگۆڕن، بۆیە چەندیین پێشمەرگەی خاوەن_هەڵوێست لەژێر گوشاری خۆشەویستەکانیاندا چەکی تێکۆشانیان فڕێدەدا و خۆیان ڕادەستی ڕژێم دەکردەوە و خۆیان دەشکاند.

ئەو پێشمەرگانەی کە بۆ بەرگریی لە ماف و کەرامەتی گەلی کورد دژی سیاسەتی ڕژێمە ڕەگەزپەرستەکانی عێراق چەکی پێشمەرگایەتییان لەشاندەکرد، شەهید و بریندارەدەبوون. ئەوانە عاشقی گەل و نیشتیمانی کوردستان بوون. لە شۆڕشی ئەیلولدا دەیانی وەکو مەحمود کاوانیی و حەمە گوڵپیی هەن. لە شۆڕشی نوێدا دەیانی وەکو شەهید ئارام و مەلا عەلی هەن، کە گیانی خۆیان بۆ ئازادیی گەل بەخشی و سەریان بۆ دوژمن شۆڕنەکرد.

شەڕی براکوژیی خۆشەویستەکەی پێشمەرگەی ناشیرینکرد، عەشقی پێشمەرگەی بۆ گەل و نیشتیمان لاوازکرد. لە دوای ڕاپەڕیین عەشقی گەل و نیشتیمان نەما، عشقی پارە و دەسەڵات و خۆسەپاندن، شوێنی عەشقی گەل و نیشتیمانی گرتەوە.

بەو شێوەیە دەبینین عەشقی کورد وەکو ئەو عەشقە نەبووە کە ئەسکەندەری مەقدۆنیی باسیدەکات، عەشقی کورد مرۆڤی کوردی بەهێزنەکردووە، عەشقی کورد لە چوارچێوەی خێزانی کلاسیکدا، مرۆڤی کوردی شکاندوە و بێبەرهەمیکردووە و دوچاری خیانەتی کردووە. خۆشەویستیی نیشتیمان و نەتەوە لە باشووری کورستان وشەگەلێکن بۆ بەرژەوەندیی بەکاردەهێنرێن. کاتێک عەشقی نیشتیمان لەگەڵ هزری دەسەڵات و مادەپەرستیی و بازرگانییکردن دەکەوێتە ململانێ. هەر زوو عەشقی نیشتیمان و نەتەوە پاشەکشێدەکات، دەسەڵات و دەسکەوت سەنگەر بە عەشق چۆڵدەکەن. ساڵانێکی دوورودرێژ، حیزبە سیاسییەکانی باشووری کوردستان پارێزگای کەرکوکی باشووری کوردستانیان بە دڵ و قودسی کوردستان ناودەبرد، بەڵام پاش ڕوخانی ڕژێمی سەدام و بەشدارییکردنی کورد لە دەسەڵاتدا، کاتێک بینییان قودس و دڵی کوردستان لەگەڵ بەرژەوەندییە دەسەڵاتخوازیی و مادییەکانیاندا ناکۆکە، زمانی خۆیان گەست و چیتر باس لە دڵ و قودسی کوردستان ناکەن.

کاتێکیش بینییان فرۆشتنی کەرکوکی قودس و دڵی کوردستان کاڵایەکی گرانبەهایە و دەکرێت بازرگانیی پێوەبکەن، هەوڵی جدییان بۆ جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ دەستووری عێراق نەدا و لە ١٦ی ئۆکتۆبەری ٢٠١٧ هەڕاجیانکرد. بەم شێوەیە دەتوانین بڵێین هزری خۆشەویستییەکی ڕاستەقینەی هەمەجۆر، لە دوای ڕاپەڕینەوە لە ناو کۆمەڵگەی باشووری کوردستاندا ونبووە و نادۆزرێتەوە. نەبوونی عەشقی ڕاستەقینە یەکێک لە هۆکارەکانی شکستی شۆڕشەکانی کورد بووە، هۆکارێکی گرنگی بڵاوبوونەوەی دیاردەی گەندەڵیی ناو دەسەڵاتی باشووری کوردستانە.

ئەو عیشقەی لە نێوان تاکە ئیماندارەکانی کۆمەڵگەی کوردستان و ئاین و خوداکەیاندا هەیە، گومانی لێدەکرێت. هەڵسوکەوتی ئەو کەسانەی کە دەچنە حەج و ڕۆژوودەگرن و نوێژدەکەن و ڕابەرایەتیی ئاینی ئیسلام دەکەن، بە حساب لە کەسانی تر ئیماندارترن، کردارەکانیان ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەخات، کە ناکۆکییەکی فراوان لە نێوان قسە و کرداریاندا هەیە، بە کردار هێندەی عاشقی غەریزە و مادەن نیو هێندە عاشقی خودا و ئاینی خۆیان نین.

لەم ساڵانەی دواییدا لە ناو بزوتنەوەی سیاسیی کوردستاندا چەندیین حیزب و ڕێکخراوی سیاسیی ئیسلامیی پێکهاتن، هەموویان لەژێر سێبەری ئاینی ئیسلام و

لە ڕێگەی ئیسلامبوونی خەڵکی کوردستانەوە، هەوڵی بەهێزکردنی پێگەی سیاسیی خۆیان دەدەن، بەڵام هەموویان بەگوێرەی بەرژەوەندیی حیزبیی خۆیان تەفسیری ئایەت و فەرمودەکانی پێغەمبەر (د. خ) و ئەولیاکان دەکەن، ئیسلام بۆ بەرژەوەندیی خۆیان بەکاردەهێنن.

حیزبە سکۆلارەکانی کوردستانیش دەزانن خەڵکی کوردستان زۆر پابەندی بنەماکانی ئاینی ئیسلامە، بۆ ئەوەی پێگەی جەماوەریی خۆیان لەدەستنەدەن، ڕێکخراوی زانایانی ئاینیی دروستدەکەن. تەریقەتەکانی ئاین زیندوودەکەنەوە. سەلفیەت و سۆفیگەریی و دەروێشیی پەرەپێدەدەن، نەک بۆ خۆشەویستیی ئاین، بۆ ئەوەی ڕکابەریی حیزبە ئیسلامییەکانی پێبکەن.

عیشقی هونەر لە لایەن هونەرمەند و هونەردۆستانەوە، لە دوای ڕاپەڕینەوە بە تەواویی لاوازبووە. لە سەردەمی ڕژێمی بەعسدا لە شارەکانی سلێمانیی و هەولێر و کەرکوک، چەندین دەقی ئەدەبیی بێگانە وەردەگێڕانە سەر زمانی کوردیی، لە شێوەی زنجیرە نواندنی کوردیی و شانۆی کوردییدا لە لایەن هونەرمەندانی کوردەوە پێشکەشدەکران. کاریگەرییان لەسەر ئاسودەیی ڕۆحیی خەڵک و پێشخستنی هزری مرۆڤی کورد دادەنا. ڕۆحی بەرگریی گەلی کوردیان لە ڕووی سیاسەتی شۆڤێنیی بەعسدا بەرزدەکردەوە.

لە سەردەمی خەباتی چەکدارییدا شاعیر و چیرۆکنوسانی باشووری کوردستان، چەندین بەرهەمی جوانی ئەدەبیی و هونەریی و شۆڕشگێڕییان لە گۆڤارەکانی عێراق و لە گۆڤار و هەفتەنامەکانی پێشمەرگەدا بڵاودەکردەوە، بەڵام دوای ڕاپەڕین سیاسەتی پەنجا بە پەنجا و حیزبحیزبێنە و شەڕی براکوژیی و گەندەڵیی، عەشقی ڕاستەقینەی هونەرمەند و ئەدیبانی باشووری کوردستانی کوشت و بێبەرهەمی کردن. لەوێیشەوە کۆمەڵگەی کوردستان هێندەی تر لە عەشقی ڕاستەقینە دووردەکەوێتەوە.

زانست و فێربوون لە زانکۆ و پەیمانگاکانی باشووری کوردستان، پێشکەوتنی ئەوتۆ بەدەستناهێنێت. هۆکاری سەرەکیی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە تاکی کورد بە مامۆستا و فێرخوازەوە، عەشق و خۆشەویستییان بۆ زانست نەماوە. فێرکردن و فێربوون تەنها لەپێناو پەیداکردنی بژێویی ژیاندایە. پێش ڕاپەڕین فێربوونی زانست و چالاکیی زانستیی لە زانکۆکانی کوردستان لە لایەن ڕژێمی بەعسەوە کۆت و زنجیرکرابوو،

دوای ڕاپەڕیین زانکۆ بووە شوێنی ململانێی حیزبایەتیی. چالاکیی کۆمیتە و ناوچەکانی زانکۆی یەکێتیی و پارتیی عەشقی فێربوونی پەراوێزخست. دوای دابەشکردنی باشووری کوردستان هەر حیزبێکی دەسەڵاتدار دەستی بەسەر زانکۆکانی سنووری دەسەڵاتی خۆیدا گرت، مەرجی حیزبیبوونی بۆ دامەزراندنی سەرۆکی زانکۆ و ڕاگری کۆلێژ و مامۆستا سەپاند. حیزبەکان هەر بە بەحیزبییکردنی بەرپرسان و مامۆستیانی زانکۆوە نەوەستان، مەرجی ئەوەیشیان بۆ دادەنـان کە دەبێت ئەو خوێندکارانەی وانەیان پێدەگوترێتەوە بۆ حیزب پەروەردبکرێن و لە کۆمیتە و ناوچەکاندا ڕێکبخرێن. ساڵی ٢٠٠١ مەکتەب_سیاسیی یەکێتیی و سەرۆکی حکومەتی هەرێمی لە سلێمانیی بانگیانکردم، داوایانلێکردم لە فەرمانگەکانی حکومەتدا پۆستێک وەربگرم، گوتیان دەتکەین بە ڕاگری پەیمانگای تەکنیکیی بەختیاریی، یان بە ڕاگری کۆلێژی پزیشکیی ددان، بە مەرجێک هەموو خوێندکارەکان بکەیت بە ئەندامی یەکێتیی*٢٢.

## ٧- بێباوەڕیی بە ڕۆڵی خەڵک:

جۆرێکی تری ئاوەزمەندیی هەڵەی خەڵکی کوردستان ئەوەیە کە ڕۆڵی دەوڵەت و دەسەڵات قەبەدەکات، ڕۆڵی تاک و پێکهاتەکانی گەل بچووکدەکاتەوە. لەگەڵ ئەوەیشدا خەڵکی باشـووری کوردستان ڕقیان لە یاسا و دامـودەزگـای دەوڵـەت دەبێتەوە، بەرانبەری یاخییدەبن، بەڵام لە هەمان کاتدا دەسەڵات و دامودەزگاکانی دەوڵەت بە هێزێکی زۆر گەورە دەبینن، وای بۆ دەچن تەنها دەوڵەت دەتوانێت پێویستییەکانی کۆمەڵگە دابینبکات.

خەڵکی باشووری کوردستان بڕوایان بەوە نییە گەل بتوانێت لە دەرەوەی دەوڵەت خۆی ڕێکبخات و کارێکی پێبکرێت و بڕێک لە ئامانج و پێویستییەکانی خۆی دابینبکات. ئەم شێوە بیرکردنەوەیە کاریگەریی خراپی لەسەر ژیانی سیاسیی و ئابوریی کوردستان بەجێهێشتووە.

ئەم ئاوەزمەندییە بوو وایدەکرد لە سەردەمی خەباتی چەکدارییدا ژمارەی چـەکدارە کوردەکـانی سـەر بـە دەوڵـەتی عـێراق، لـە ژمـارەی پێشمەرگەکانی کوردستان زۆر زیاتر بێت. ئەم ئاوەزمەندییە چەوتە وای لە خەڵکی باشووری

کوردستان کردووە بۆ دابینکردنی ژیان، پشت بە موچەی دەوڵەت و بەخششی حیزبە دەسەلاتدارەکانی باشووری کوردستان ببەستن، لە کارکردن و بەرهەمهێنان دووربکەونەوە و بە ژیانی مشەخۆریی ڕازیبن. ئەم ئاوەزمەندییە وای لە خەڵک کردووە دەست لەو حیزبە دەسەلاتدارانە پانبکەنەوە کە سامانی گەلی کوردستانیان بەتاڵانبردووە.

ئەم ئاوەزمەندییە چەوتەیە مافی بە حیزبە دەسەلاتدارەکانی باشووری کوردستان داوە سامانی وڵات بخەنە ژێردەستیانەوە و بۆ بەرژەوەندیی خۆیان بەکاریبهێنن و کەس دەنگنەکات. ئەم ئاوەزمەندییە وای لە خەڵکی کوردستان کردووە واتێبگات کە لە وڵاتی خۆیدا خاوەنی سامان نییە، ئەو سامانەی لە وڵاتدا هەیە موڵکی حیزبە دەسەلاتدارەکانی کوردستانە. بە خێری خۆیان بەشێکی کەمی دەدەنە خەڵکی کوردستان. ئەم جۆرە تێگەیشتنە هەڵەیەیە کە وایکردووە بەرانبەر بە پاشەکەوتی موچە و لێبڕینی ڕێژەیەکی موچەی کارمەندانی دەوڵەت، خەڵک بێدەنگیی هەڵبژێرێت.

ئەم ئاوەزمەندییە وایکردووە کە خەڵکی باشووری کوردستان واتێبگەن ئەگەر حیزبێکی سیاسیی، یان ڕێکخراوێکی کۆمەڵایەتیی دامەزرا. دەوڵەتێک، یان لایەنێکی دەسەلاتداری لە پشتەوە نەبێت، هەڵوەشانەوە و ژێرکەوتنی مسۆگەرە. ئەم ئاوەزمەندییە چەوتەیە وایکردووە کە خەڵکی باشووری کوردستان وابزانن ئەگەر حیزبێکی سیاسیی دامەزرا و حکومەت مۆڵەتی فەرمیی بەو حیزبە نەدا، چارەنوسی ئەو حیزبە شکست و هەڵوەشانەوە دەبێت.

ئەم چەمکە هەڵەیە وای لە حیزبەکانی باشووری کوردستان کرد بەبێ پێوانەی نەتەوەیی و ئەخلاقیی، پەیوەندیی نهێنیی و ئاشکرا لەگەڵ وڵاتانی ناوچەیی و جیهانییدا دروستبکەن. ئەو پەیوەندییە بە یەکێک لە پێویستییەکانی کاری سیاسیی و چالاکیی ڕێکخراوەیی و سەرکەوتنی شۆڕش دابنێن. ئەم چەمکە چەوتە بوو پاڵی بە حیزبە سیاسییەکانی باشووری کوردستانەوە نا لە کاتی تێکۆشانی چەکدارییدا گفتوگۆ و ڕێککەوتن لەگەڵ ڕژێمەکانی عێراق بە ستراتیژ بزانن و کەناڵی پەیوەندیی نهێنیی لەگەڵ ڕژێمی عێراقدا دروستبکەن.

ئەگەر تەنها دەسەڵات و دەوڵەت بە گرنگ ببینیت و ڕۆڵی خەڵک فەرامۆشبکەیت، هەڵەی تر دەکەیت. لە ناو سیاسەتی باشووری کوردستاندا مۆدێلێکی سیاسیی دروستبووە کە هۆکاری دەرەکیی بۆ چارەسەری کێشە و بۆ پشتیوانیی دۆزی کورد، لە ڕۆڵی ناوخۆیی گەلی کوردستان بە گرنگتر دەبینێت. وایکردووە کە لە سیاسەتی باشووردا پشتبەستن بە وڵاتێکی بێگانە بۆ پشتیوانیی شۆڕشی کورد، لە پشتبەستن بە گەل و پێکهێنانی ڕێکخستن و ئامادەکاریی بۆ شۆڕش گرنگتر بێت.

ئەم باوەڕە هەڵەیە، ستراتیژی هەڵەی لەگەڵ خۆی هێناوە. ڕەوایی بە پەیوەندییە نهێنییەکانی بەرپرسانی حیزبەکان لەگەڵ وڵاتانی ئێران و تورکیا و عێراق و سوریا داوە، کە لەسەر حسابی بەرژەوندیی و بەهاکانی گەلی کورد تەواودەبێت. لە لای گەلانی تری جیهان باوەڕ بە ڕۆڵی خەڵک و بە بەرژەوەندیی خەڵک گرنگییپێدراوە، لە هزری خەڵکدا جێگیربووە و کاریپێدەکرێت.

لە پارچەکانی تری کوردستان، گەورەبینینی ڕۆڵی دەوڵەت وەکو باشووری کوردستان بەرچاوناکەوێت. یەکێک لە بنەما گرنگەکانی سیستەمی سیاسیی پارتی کرێکارانی کوردستان پشتبەستنە بە تواناکانی گەلی کورد. ساڵی ٢٠٠٢ لە کۆنگرەی ٨ی پەکەکەدا ئەندامێکی کۆنگرە لەسەر سەرچاوەی دارایی حیزبەکەی پرسیاریکرد. ئەندامی دیوانی کۆنگرە، جەمیل بایک وەڵامی پرسیاری ئەو ئەندامەی دایەوە و گوتی:

سەرچاوەی دارایی ئێمە هاوکاریی گەلە. من گوێم لە وەڵامەکەی جەمیل بایک گرت، بەڵام بڕوام بە قسەکانی نەدەکرد. لە دڵی خۆمدا گوتم: ئەویش وەکو بەرپرسە سیاسییەکانی باشووری کوردستان ڕاستناکات، لەگەڵ ئەندامەکەی کۆنگرە سیاسەتدەکات*٢٣.

لە مانگی نۆڤەمبەری ٢٠٠٤دا سەردانی ئەوروپام کرد، لە سەرەتادا چوومە پاریس، لە ماڵی کوردێکی باکوور میوانداریکرام. پاش گفتوگۆی ئاسایی پرسیارمکرد خەریکی چین؟ گوتیان: لەم کاتەدا خەریکی کۆکردنەوەی هاوکاریین بۆ شۆڕش. کە زیاتر پرسیارمکرد و چەند وڵاتێکی تری ئەوروپا گەڕام و بینیم لەو کاتەدا هاوکاریی بۆ شۆڕش کۆدەکەنەوە، بۆم دەرکەوت وەڵامەکەی جەمیل بایک ڕاستە. پەکەکە لە لایەن گەلەوە بەخێودەکرێت. ئەم تایبەتمەندییەی پەکەکە یەکێک لە هۆکارەکانی سەرکەوتنی ئەو جوڵانەوە سیاسییەی باکووری کوردستانە.

لەسەر چالاکییەکانی کۆمەڵگەیش بەپێی ئاوەزمەندیی هەموو شتێک بە دەستی دەوڵەت و دەسەڵاتە و خەڵک ڕۆڵی نییە، کاریگەریی خراپی بەجێهێشتووە، ئەگەرچی ڕەخنە و گلەیی لە دەسەڵات هەیە، بەڵام هەڵوێستی زۆرینەی خەڵک هەر لەگەڵ دەسەڵاتدایە. ئەو نارەزایی و خۆپیشاندانەی خەڵکی کوردستان کە لە ساڵانی رابردوودا بەرانبەر دەسەڵات ئەنجامدرا، سەرکەوتنی بەدەستنەهێنا، لەبەرئەوەی زۆرینەی خەڵک بڕوای بەوە نییە خەڵک دەرەقەتی دەسەڵات دێت و چاریدەکات.

دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان باش سودی لە بێباوەڕیی خەڵک بە ڕۆڵی گەل و گەورەکردنی توانای دەسەڵات و دەوڵەت وەرگرتووە. لەسەر ئەم بنەمایە، حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشوور پەرە بە سیاسەتی دەسەڵاتخوازیی خۆیان دەدەن. داواکاریی خەڵک فەرامۆشدەکەن و ئاستەنگیی بۆ بەشداریی سیاسیی تاک و کۆمەڵگە دروستدەکەن.

## ٨- بەرژەوەندیی تایبەت، بەرژەوەندیی گشتیی:

یەکێک لە ئاوەزمەندییە هەڵەکانی تر کە ژیانی سیاسیی تاک و پێکهاتەکانی کۆمەڵگەی باشووری کوردستانی لە کێشە و گێژاودا نوقمکردووە، ئەو ناکۆکییەیە کە لە نێوان بەرژەوەندیی گشتیی و بەرژەوەندیی تایبەتدا هەیە، هاوکێشەکە بە لای بەرژەوەندیی تایبەتدا لاسەنگبووە. تاک و پێکهاتە سیاسیی و کۆمەڵایەتییەکانی باشووری کوردستان، بەرژەوەندیی تایبەت بەسەر بەرژەوەندیی گشتییدا زاڵدەکەن. هەر تاکێکی کۆمەڵگەی کوردستان زیاد لە تاک و پێکهاتەی کۆمەڵگەکانی تر، گرێدراوی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیەتی و بەرژەوەندیی گشتیی فەرامۆشدەکات.

لە ناو خێزاندا باوکەکانی باشووری کوردستان بەرژەوەندیی تایبەتی خۆیان لە پێش بەرژەوەندیی ژن و منداڵەکانیانەوە دادەنێن. لە ناو خێڵەکانی کوردستاندا، بەرژەوەندیی خێزان و بنەماڵە لە پێش بەرژەوەندیی خێڵەوە دادەنێن. لە ناو کۆمەڵگەدا بەرژەوەندیی بنەماڵە لە پێش بەرژەوەندیی کۆمەڵگە دادەنێن. بەرژەوەندیی حیزب لە پێش بەرژەوەندیی نەتەوە و دەستکەوتی نەتەوەییەوە دادەنێن. لە کۆمەڵگە پێشکەوتووەکانی جیهاندا گرنگییدان بە بەرژەوەندییەکان بە پێچەوانەوەی باشووری کوردستانەوەیە. بەرژەوەندیی مۆرڤایەتیی، یان بەرژەوەندیی نەتەوەیی

لە پێش بەرژەوەندییە حیزبیی و ئایدۆلۆژیی و ناوچەیی و بنەماڵەیی و خێزانیی و کەسێتییەکانەوە دێت. ساڵی ٢٠٠٦ برادەرێکم سەردانی وڵاتێکی ڕۆژهەڵاتی ئاسیای کردبوو، گوتی کە چوومە ناو پایتەختی ئەو وڵاتەوە، یەکەم تابلۆ کە بەرچاومکەوت لێینوسرابوو: یەکەم، بەرژەوەندیی وڵاتەکەم. دووەم، پێوانەی بیروباوەڕەکەم. سێیەم خێزانەکەم. چوارەم خۆم*٢٤. لەو وڵاتانەدا وەکو لای خۆمان هێندە ناکۆکیی لە نێوان نوسین و قسە و کرداردا نییە، لە وڵاتی ئێمەدا نەک نوسینی بەو شێوەیە نابینرێت، ئەگەر لە بۆنەکاندا لافیتەی وا بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک هەڵبواسرێت، ئەوە بۆ فریودانی خەڵکە و نوسینەکان نابنە کردار. لە باشووری کوردستاندا ئاوەزمەندیی باو ئەوەیە هەر کەس مافی هەمەجۆری خۆی وەربگرێت و دەوروبەرەکەی فەرامۆشبکات، دەوروبەریش بە هەمان تێگەیشتن لەوانی تر نزیکدەبێتەوە. ئەم جۆرە ئاوەزمەندییە بەگوێرەی ئەو پەندە کوردییە ڕێکخراوە کە دەڵێت: «هیی خۆم بۆ خۆم، هیی تۆیش دەخۆم».

هزری خۆپەرستیی بە یەکێک لە هۆکارەکانی گەشەنەکردنی کۆمەڵگەی کوردستان دادەنرێت، لەبەرئەوەیە تاک و پێکهاتەکان نایەنە لای یەک و پێکەوە کار بۆ بەرنامە گشتییەکان ناکەن. ئەگەر بێنە لای یەکتر و کاربکەن، کارکردنەکەیان بە جدیی نییە، لەبەرئەوەی باوەڕیان بە هەست و بەرژەوەندیی تایبەتیی داگیرکراوە. ڕاستکردنەوەی ئەم چەمکە هەڵەیە پێویستی بەوە هەیە کە خەڵکی کوردستان بەوە پەروەردەبکرێت کاتێک بەرژەوەندیی تایبەت بە باشیی جێبەجێدەکرێت، کە بەرژەوەندیی گشتیی بە باشیی پێشخرابێت. لە سایەی دەستوور و یاسا و ئازادیی و خزمەتگوزاریی و ئاسایشی وڵاتەوە، تاکەکان مافەکانی خۆیان بەدەستدەهێنن و بەرژەوەندییە تایبەتییەکانیان دەپارێزرێت.

کاتێک نمونەی وڵاتانی ئەوروپیی بۆ گەلی کورد پیشانبدەیت، کە چۆن کاری جدیی بۆ وڵات و گەل و دەسەڵات دەکەن، چۆن بەرژەوەندیی گشتیی لە سەرووی بەرژەوەندیی تایبەتییەوە دادەنێن. پیشانیبدەیت کە لە سایەی ئەو سیستەمەی وڵاتانی ئەوروپاوە چۆن مافی تاکەکان بە تاکی ئاوارەی کوردیشەوە پارێزراوە. ئەو کات خەڵک بڕوا بە پاراستنی بەرژەوەندیی گشتیی دەهێنێت، لە خۆپەرستیی دوردەکەوێتەوە.

بە خەڵکی باشووری کوردستانی پیشانبدەیت لە سایەی سیستەمێکدا کە خۆپەرستیی بنیاتینابێت، تاک ناتوانێت بەرژەوەندییەکانی خۆی گەرەنتیببکات، پیشانی خەڵکی باشووری کوردستانی بدەیت لەو وڵاتانەدا کە تاکەکان لەپێناو بەرژەوەندیی گشتییدا ماندووبوون و قوربانییانداوە، کۆمەڵگە پێشکەوتووە و تاک بەرژەوەندیی خۆی بە باشیی دەستکەوتووە. لەو کۆمەڵگەیەیشدا کە کار بۆ بەرژەوەندیی گشتیی نەکراوە. کۆمەڵگە پێشنەکەوتووە و تاک و پێکهاتەکان بە تەواویی و بە بەردەوامیی مافەکانی خۆیان وەرنەگرتووە و نەیانتوانیوە بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆیان بپارێزن، کەوابوو تێگەیشتنی ڕاست ئەوەیە کە بەرژەوەندیی گشتیی لە پێش بەرژەوەندیی تایبەتییەوە بێت. لەم سەردەمەدا کە گەلی کورد خاوەنی دۆزێکی نەتەوەییە و وڵاتانی داگیرکەری کوردستان لەسەر سیاسەتی سەرکوتکردنی گەلی کورد بەردەوامن و کێشە بۆ دۆزی کورد دروستدەکەن، کارکردنی تاک و پێکهاتەکانی باشووری کوردستان بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە، بە بەرزترین بەرژەوەندیی گشتیی گەلی کورد دەژمێردرێت. لەم سەردەمەدا پاراستنی دامودەزگا نەتەوەیی و دیموکراتییەکانی گەلی کورد بە بەرژەوەندیی گشتیی دەژمێردرێت. هەوڵدان بۆ گەشەپێدانی چەمکی یەکسانیی نەتەوەیی گەلی کورد لەگەڵ نەتەوەکانی تری ناوچەکە و جیهاندا، بە گرنگترین بەرژەوەندیی باڵا و بەرژەوەندیی گشتیی هەموو تاک و پێکهاتەکانی باشووری کوردستان دەژمێردرێت.

یەکێک لە هەڵە گەورەکانی حیزبە سیاسییەکانی باشووری کوردستان ئەوەیە، کە لە کاتی تێکۆشانی ڕزگاریی نیشتیمانییدا، بەحساب کاریان بۆ ڕزگارکردنی کوردستان کردووە، بەڵام لەبەرئەوەی تەنها بیریان لە بەرژەوەندیی خۆیان و حیزبەکەیان کرووەدتەوە، بە چەمکی حیزبپەرستیی کاریانکردووە، دوچاری هەڵەی گەورە و خیانەتی نەتەوەیی هاتوون. لەبریی ئازادکردنی کوردستان، کوردستانیان دوچاری کارەساتی گەورە کردووە و چارەسەرکردنی کێشەی کوردیان دوورخستووەتەوە و کوردستانیان دابەشکردووە.

حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشووری کوردستان لەپێناو بەرژەوەندیی تەسکی خۆیاندا هەموو سنوورێکیان بەزاندووە. بۆ سەرکەوتن بەسەر حیزبە ڕکابەرەکەیاندا پەلی سوپای داگیرکەرانیان گرتووە و هێناویانەتە سەر خاکی کوردستان و شانبەشانی دوژمنی کورد شەڕی پێشمەرگەی حیزبەکانی تر و پارچەکانی تری کوردستان و گەلی

کورد و دەسکەوتەکانی گەلی کوردیان کردووە. کارەساتی ١٩٦٦ کە باڵی مەکتەبی سیاسیی پارتیی سەنگەری پێشمەرگەیان بەجێهێشت و ڕوویانکردە بەغدا و بۆ ماوەی چوار ساڵ شانبەشانی سوپای عێراق شەڕی هێزی پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلولیان کرد. نمونەی هەڵەیەکی سیاسیی گەورەیە کە لە ئەنجامی ئەوەوە هات باڵی مەکتەبی سیاسیی پارتیی بەرژەوەندیی گروپەکەی خۆیان لە سەرووی بەرژەوەندیی گەلی کوردەوە دانا.

کارەساتی ٣١ی ئابی ساڵی ١٩٩٦ کە سەرکردایەتیی پارتیی داوای هاوکاریی سەربازیی لە ڕژێمی بەعس کرد، بۆ دەستەبەسەراگرتنی شاری هەولێر، سەرکردایەتیی پارتیی بەرژەوەندیی حیزبیی لە سەرووی بەرژەوەندیی گەلەوە دانا.

لە ١٦ی ئۆکتۆبەری ٢٠١٧دا باڵێکی ناو یەکێتیی کارئاسانیی بۆ هێزە چەکدارەکانی سوپای عێراقی ناوەندیی کرد و شاری کەرکوک و ناوچەکانی سنووری مادەی ١٤٠ بگرێتەوە، نمونەیەکی ترە کە بەرژەوەندیی حیزبیی بەسەر بەرژەوەندیی گشتییدا زاڵدەبێت.

لە سەردەمی خەباتی چەکدارییدا، بەهۆی نەبینینی ڕاستینەی پەیوەندیی لە نێوان بەرژەوەندیی گشتیی و بەرژەوەندیی تایبەتدا، چەندیین کەموکووڕیی و لەڕێلادان لەسەر دەستی تاک و پێکهاتە خێڵەکییەکاندا دروستبوو. ئاراستەی خەباتی بە سودی داگیرکەر وەرچەرخاند. یەکێک لە هۆکارەکانی ئەو لەڕێلادانە ئەوە بووە کە ئەو کەس و تاقمانەی بەشداریی شۆڕشیان دەکرد، بە باشیی گرنگیی بەرژەوەندیی گشتییان نەدەزانی، کە دوچاری ساردترین گرفت دەهاتن. لەپێناو بەرژەوەندیی تایبەتدا، بەرژەوەندیی گشتییان فەرامۆشدەکرد و دوچاری لادان و خیانەت دەهاتن.

چەندیین پێشمەرگەی شۆڕشگێڕ و نیشتیمانپەروەر لەبەرئەوەی لە لایەن کەسێکی بەرپرسەوە بێرێزییان پێکراوە، یان بەرژەوەندیی خێزانیی و بنەماڵییان کەوتووەتە مەترسییەوە، یەکسەر لە بەرەی بەرگریی گەلەوە سەنگەریان بۆ بەرەی دوژمنی گەل گواستووەتەوە، دوچاری خیانەت هاتوون، چەندیین کەس بۆ ماوەیەک چەکی پێشمەرگایەتیی لەشانکردووە و دژی سوپای داگیرکەر خەباتیکردووە، بەڵام لەبەر هۆکاری بچووکی تایبەت و خێزانیی و بنەماڵەیی، لە ماوەی شەو و ڕۆژێکدا هەر

بەو چەکەی کە بەرگریی گەلی پێکردووە، بەربووەتە گیانی نیشتیمانپەروەران و هاوسەونگەرەکانی دوێنێی و سەنگەری جاشایەتیی لێگرتوون.

دوای ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی ١٩٩١ و دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام کاتێک ئەرشیفی دامودەزگا جاسوسییەکانی ڕژێمی بەعس بەردەستکەوت، هەزاران کەسی بەرپرسی ناو حیزبەکان و ناو هێزی پێشمەرگەی کوردستان، سیخوڕی ڕژێمی داگیرکەر و ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجە بوون. بە ڕواڵەتیش کەس لەوان شۆڕشگێڕتر نەبوو. ئەو کەسانە ئەو کارەیان لەپێناو دەستکەوتی مادییدا ئەنجامداوە، یان لە قۆناغێکی تێکۆشاندا باوەڕیان بە سەرکەوتنی شۆڕشی کورد نەماوە و خۆیان ڕادەستی دەزگا جاسیوسییەکانی ڕژێم کردووە، بۆ ئەوەی لە کاتی تەنگانە و داڕوخانی شۆڕشدا، ژیانی خۆی بپارێزێت.

ئەم دیاردەیە بە تەنها لە ناو شۆڕشگێڕ و کاربەدەستانی بەڕێوەبردنی دامودەزگا حیزبیەکانی گەلی کورددا بڵاو نییە، دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیی و سیاسیی وڵاتان و کۆمەڵگە دواکەتووەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ناوچەکانی تری جیهانە. هەر کەسێک کتێبی موسادی ئیسرائیلی *٢٥ بخوێنێتەوە، بۆی دەردەکەوێت کە ئیسرائیلییەکان چۆن لە ڕێگەی پارەوە توانیویانە لە دەزگا هەرە هەستیارەکانی شۆڕشی فەلەستینیی و حکومەتەکانی عێراق و سوریادا سیخوڕی خۆیان جێگیربکەن. ئەو سیخوڕانە بەرانبەر بە هەندێک دەستکەوتی مادیی، زانیاریی هەستیاریان بە دوژمن داوە و گەورەترین زیانیان بە بەرژەوەندیی باڵای گەل و نیشتیمانی خۆیان گەیاندووە.

یەکێک لە هۆکارەکانی بڵاوبوونەوەی دیاردەی گەندەڵیی لە سنووری هەرێمی کوردستان و لە ناو دەسەڵاتی حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشووری کوردستان، بۆ ئەو ئاوەزمەندییە دەگەڕێتەوە کە بەرژەوەندیی تایبەتیی تاکەکان لە پێش بەرژەوەندیی گشتییەوە کارپێدەکرێت. لەبریی ئەوەی پێشەنگە سیاسییەکانی گەلی کورد و دەسەڵاتدارانی حیزبیی و حکومیی هەرێمی کوردستان لە ڕێگەی پەروەردە و دەستوور و یاسا و چاودێرییەوە، هەوڵی لاوازکردن و بنبڕکردنی ئەم هەڵە کوشندەیە بدەن، بۆ خۆیشیان دوچاری ئەو دەردە هاتوون، هەوڵی چارەسەرکردنی ئەم کەلتورە ناپەسەند و زیانبەخشە نادەن.

## ٩- داگیرکردنی پیشە و پێگە:

لە کۆمەڵگەی کوردستان چەواشەکردن و بەلاڕێدابردن تەنها بە قسە و لە دوتوێی نوسیندا نییە، درۆکردن هێندە بە قووڵیی ڕەگیداکۆتاوە، بە کردەوەیش درۆدەکرێت، دەسەلآت و پێکهاتەکانی کۆمەڵگەیش درۆ بە ئاسایی وەردەگرن.

هەر کەسێک لە شۆڕشەکانی باشووری کوردستان ڕۆژێک پێشمەرگایەتیی کردبێت، یان لە سەردەمی خەباتی پێشمەرگایەتییدا لە لادێیەکی کوردستاندا ژیابێت، لە نزیکەوە شێخ و مەلا و دکتۆری ساختەی پێشمەرگە و لادێی ناسیوە. چەندیین بەرپرسی دیوە کە بە شێخ فلان و مەلا فلان و دکتۆر فلان بانگکراون، بەلام لە ڕاستییدا شیخ و مەلا و دکتۆر نەبوون.

ئەم دیاردەیە بە زۆریی لە ناو حیزبەکانی باشووری کوردستاندا بلاّبووەوە. کەسانێکی چەپ و مارکسیی هەبوون کە لە ڕووی فەلسەفییەوە مادیی بوون، بڕوایان بە ئاین و مەلا و شیخ نەبوو، بەلآم بۆ ئەوەی لە ناو جەماوەری گوندنشینی مسوڵمانی باشووری کوردستان ڕێزی خۆیان زیادبکەن، جەماوەر والێبکەن گوێ لە قسەکانیان بگرن، لە ماڵی گوندییەکاندا باش خزمەتبکرێن، لەقەبی مەلا و شێخ، یان دکتۆریان لە خۆیان دەنا. گوێیان بەو درۆ گەورەیە نەدەدا کە ئەوان نە مەلا و نە شێخ و نە دکتۆرن.ئەم دیاردەی درۆکردنە لە لایەن پێشەنگی کوردەوە هەنگاوی بۆ نراوە، لە لایەن تاکە شۆڕشگێڕەکانی کۆمەڵگەوە بە کردەوە ئەنجامدراوە. بە شێوازی جیاجیا بە ناو توێژەکانی کۆمەڵگەی کوردستاندا بلاّبووەتەوە. درۆکردن بوو بە کەلتور و کاریگەرییەکی خراپی لەسەر ژیانی کۆمەلآیەتیی و سیاسیی و ڕۆشنبیریی گەلی کورد بەجێهێشت. بێمتمانەییەکی گەورەی لە ناو تاک و پێکهاتە کۆمەلآیەتیی و سیاسییەکانی کورددا بەرانبەر بە شێخ و مەلا و دکتۆر دروستکرد.

ساڵی ١٩٧٨ لە گەرمەی شەڕی براکوژیی نێوان پارتیی و یەکێتییدا، کاتێک کارەساتی هەکاریی ڕوویدا، ڕادیۆی (ب ب سی) بە زمانی عەرەبیی هەواڵی شەڕەکەی ڕاگەیاند و گوتی:

یەکێک لەو کەسانەی کە لە شەڕەکەدا کوژراوە سەرکردەیەکی یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستانە، کە پێیدەڵێن دکتۆر خالید. کوردەکان بەو کەسانە دەڵێن دکتۆر، کە لە وەزارەتی تەندروستیی عێراقدا کاردەکەن*٢٦.

ساڵی ١٩٨١ – ١٩٨٢ لە نەخۆشخانەی فێرکاریی سلێمانیی پزیشکی نیشتەجێ و خولاو بووم، ناوبەناو برینپێچێک دەهاتەلام و بەوپەڕی دڵخۆشییەوە دەیگوت: دکتۆر پاش ماوەیەکی تر دەچمە دەرەوە و دەبم بە پێشمەرگە. منیش دەمپرسی بۆ هێندە حەزدەکەیت ببیت بە پێشمەرگە؟ ئەویش دەیگوت: دکتۆر گیان، هەر کە چوومە دەرەوە یەکسەر دەبم بە دکتۆر. ڕۆژان هاتن و ڕۆژان چوون، من چوومە دەرەوە و بووم بە پێشمەرگە. پاش چەند مانگێک ڕۆژێک هەواڵێکیان هێنا کە دکتۆرێکی تر پەیوەندیی بە هێزی پێشمەرگەوە کردووە. پاش ماوەیەک بۆم دەرکەوت کە شێرکۆی برینپێچ بووە بە پێشمەرگە و لەوێیشەوە وەکو خۆی دەیگوت یەکسەر بووە بە دکتۆر!

لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٢دا پەیوەندییم بە هێزی پێشمەرگەی کوردستانەوە کرد، کاتێک سەردانی سەرکردایەتیی کۆمەڵەم کرد، بەرپرسەکەمان کە خۆی بە مارکسیی دەزانی و شانازیی بەوەوە دەکرد بڕوای بە ئاین نییە و مەلا نییە، لەقەبی مەلای بۆ خۆی هەڵبژاردبوو. منیشی وەکو دکتۆر بە سکرتێری کۆمەڵە ناساند. سکرتێر یەکسەر پرسیاری ئەوەی کرد کە ئایا من بە ڕاستیی پزیشکم، یان ناوی پزیشکم داوەتە پاڵ خۆم. گوتی: دکتۆری ڕاستەقینەیت، یان نا؟ یان وەکو ئەوانی تر خۆتت لێکردووین بە دکتۆر؟

یەکێک لە ڕەفتارە ناحاڵییەکانی کۆمەڵگەی لادێنشینی باشووری کوردستان ئەوەیە کە هەر کەسێک دەرزییەک لە نەخۆشێک بدات پێیدەڵێن دکتۆر. پێشمەرگەکانی باشووری کوردستان زۆر باش سودیان لەم ئاوەزمەندییە هەڵەیەی خەڵکی لادێنشینی باشووری کوردستان وەرگرتبوو، ژمارەیەک لەو برینپێچانەی دەبوونە پێشمەرگە، یەکسەر لەقەبی دکتۆریان وەردەگرت. هەندێک پێشمەرگەی خوێندەواریش خولی فێربوونی دەرزییلێدان و تەداویی برینیان بۆ دەکرایەوە، ئیتر ئەوانیش یەکسەر پلەی پزیشکییان وەردەگرت.

ئاشکرایە کە ئەم ناولێنانە لە بنەڕەتدا لە لایەن لادێنشینەکانی کوردستانەوە دەستپێکردووە، بەڵام پێشەنگ و شۆڕشگێڕەکانی کوردستان لەبریی ئەوەی ئەو هەڵەیە بۆ لادێییەکان ڕاستبکەنەوە، لەبەر باوەڕی پۆپۆلیستییان و لەبەر بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆیان، شوێن هەڵەی لادێییەکان دەکەون، لەقەبی دکتۆر بە سەرخۆیاندا دادەبڕن.

له كاتی شه‌ڕی (ئێراق – ئێران)دا هه‌ندێک له سه‌ربازه هه‌ڵهاتووه‌كانیش له گونده‌كانی كوردستان خۆیان فێری ده‌رزیلێدان ده‌كرد و له‌قه‌بی دكتوریان بۆ خۆیان هه‌ڵده‌بژارد. ساڵی ١٩٨٨ دوای ئه‌نفال و كیمیاباران ئاواره‌ی ڕۆژهه‌ڵاتی كوردستان بووم، له شاری سنه گیرسامه‌وه. چه‌ند پزیشكێكی گه‌نجی باشووری كوردستانم بینی، كه له نه‌خۆشخانه‌كانی شاری سنه دامه‌زرابوون. پاش ئه‌وه‌ی بووم به هاوڕێیان، پرسیارم لێكردن ئێوه چۆن دامه‌زران؟ گوتیان: له ڕێگه‌ی دكتۆر عه‌بدولڕه‌حانه‌وه. گوتم: ئه‌و دكتۆره خه‌ڵكی كوێیه؟ ده‌رچووی كام زانكۆیه؟ له عێراق له كوێ كاریكردووه؟ پزیشكه گه‌نجه‌كان زانیارییان له‌سه‌ر دكتۆر عه‌بدولڕه‌حمان نه‌بوو. پاش ماوه‌یه‌ک كه پێشمه‌رگه‌كانی سنووری دوكان و چه‌مچه‌ماڵم بینی و باسی ئه‌و دكتۆر عه‌بدولڕه‌حمانه‌م بۆ كردن، پێیانگوتم كه ئه‌و كه‌سه دكتۆر نییه. له سه‌ره‌تای شۆڕشی ئه‌یلولدا پێشمه‌رگه بووه و دوچاری نه‌خۆشیی سیل هاتووه. له كاتی نه‌خۆشییه‌كه‌یدا فێری ده‌رزیلێدان بووه و ئیتر له‌قه‌بی دكتۆری به‌سه‌ردا براوه و بووه به دكتۆر عه‌بدولڕه‌حمان. ته‌نها كوردیی زانیوه و به زمانی كوردیی ده‌رمانی بۆ نه‌خۆش نوسیوه. كاتێک خه‌ڵک لێیانپرسیوه بۆچی دكتۆره‌كانی تر به ئینگلیزیی ڕه‌چه‌ته‌ی ده‌رمان ده‌نوسن، ته‌نها تۆ به كوردیی ڕه‌چه‌ته‌ی ده‌رمان ده‌نوسیت؟ وه‌ڵامیداوه‌ته‌وه و گوتوویه‌تی:

ئه‌و دكتۆرانه‌ی به زمانی كوردیی ڕه‌چه‌ته نانوسن خائینن، من نامه‌وێت تاوانی خیانه‌ت بخه‌مه سه‌ر خۆم.

دیارده‌ی شیخ و مه‌لا و دكتۆری ساخته كه كه‌لتورێكی دواكه‌وتووی كۆمه‌ڵگه‌ی كلاسیكیی گوندنشینی كوردستانه، شۆڕشی كورد ته‌كانێک بردیه پێشه‌وه و كردی به كه‌لتوری هه‌موو خه‌ڵكی كوردستان، خه‌ڵه‌تاندنی خه‌ڵكی فراوانتر كرد.

ئامانج له ناونانی كادر و پێشمه‌رگه به ناوی توێژێكه‌وه كه هه‌ڵگری ئایدۆلۆژیی و پیشه‌یه‌كن له لایه‌ن خه‌ڵكی كوردستانه‌وه ڕێزی لێده‌گیرێت، پێگه‌ی كۆمه‌ڵایه‌تییان هه‌یه، بۆ ئه‌وه‌یه كه سه‌رنجی خه‌ڵكی كوردستان بۆ لای حیزب و شۆڕش ڕابكێشرێت، گوێ له قسه‌ی كادره‌كانی پێشمه‌رگه بگیرێت، له‌وانه‌یه له ڕووی سیاسییه‌وه ئه‌م بۆچوونه بۆ ماوه‌یه‌كی كورتخایه‌ن هه‌ندێک سه‌ركه‌وتنی به‌ده‌ستهێنابێت، به‌ڵام له ڕووی ئاوه‌زمه‌ندیی و كه‌لتوری كۆمه‌ڵایه‌تییه‌وه زیانی زۆری به گه‌لی كورد گه‌یاندووه.

ئه‌م دیارده كۆمه‌ڵایه‌تییه وای له خه‌ڵكی كوردستان كرد، كه به لایه‌وه ئاسایی بێت

لەپێناو بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆیدا لاسایی هەر توێژ و کەسێک بکاتەوە و دەست بەسەر پیشەکەیدا بگرێت. بەو شێوەیە هزری دزین و دەستبەرسەرداگرتنی پێگەی خەڵک لە لایەن کەسانی ترەوە، لە کوردستان ئاسایی دەبێت. لە کۆمەڵگەی ئەمڕۆی کوردستاندا لە سایەی دەسەڵاتی باشووری کوردستانەوە، دیاردەی مەلا و شێخ و دکتۆری ساختە هەر بەردەوامە. کێشەی کەلتوریی و زانستیی و کۆمەڵایەتیی بۆ خەڵکی کوردستان دروستدەکات، ئاستەنگیی بۆ پێشخستنی کۆمەڵگەی کوردستان دروستدەکات.

ئەگەر بە دیوێکی تردا سەیری ئەو چەواشەکارییە بکەین کە شۆڕشی کورد پەرەیپێدا، هەستدەکەین تاکی کورد هەست بە کەمیی دەکات ئەگەر دکتۆر و مەلا و شێخ نەبێت، لەبەرئەوە ئێستایش لە دوای ڕاپەڕیین و هەڵبژاردنی پەرلەمان و پێکهێنانی حکومەت و سازکردنی چەندیین دامودەزگای یاسایی و مەدەنیی و زانستیی، زۆرێک لە خەڵکی کوردستان هێشتا هەر بە دوای پۆستی شێخ و مەلا و دکتۆردا دەگەڕێن. هەندێک کەس هەن لە ناوچەکەی خۆیان دووردەکەونەوە، بە دکتۆر و مەلا و شێخ خۆی بە خەڵکی ناوچەکانی تری کوردستان دەناسێنێت. بە شێوازی جیاجیا دەستی خەڵک دەبڕێت.

لە ڕووی سیاسییەوە خەڵکانێکی زۆر هەن سودیان لە کەلتوری درۆکردنی کرداریی وەرگرتووە، لەبەرئەوەی بۆ کەسێکی ئاسایی سروشتییە ببێتە شێخ و مەلا و دکتۆر، بۆ کەسانی تریش ئاساییە پێشمەرگە نەبووبن و پلەی پێشمەرگایەتیی وەربگرن.

دوای ڕاپەڕیین و سەرکەوتنی ئیرادەی کورد بەسەر ڕژێمی بەعسدا، پێگەی پێشمەرگە بەرزبووەوە. هەر خەڵک بوو خەوی بەوەوە دەبینی وەکو پێشمەرگە بە خەڵک بناسرێت. پێش ڕاپەڕیین ژمارەی پێشمەرگە زۆر کەم بوو، بەڵام دوای ڕاپەڕیین ژمارەی پێشمەرگە بە لێشاو زیادیکرد.

ئەو کەسانەی لە شەڕی (ئێران – عێراق)دا ڕیزەکانی سوپای عێراقیان بەجێهێشتبوو و لە سنووری ناوچە ڕزگارکراوەکانی کوردستان نیشتەجێدەبوون، داوایان لێدەکرا چەکی پێشمەرگایەتیی هەڵبگرن، بەڵام ئەو کات ئامادەنەبوون چەکی پێشمەرگایەتیی هەڵبگرن و بۆ دەرفەتێک دەگەڕان ڕژێم لێبوردنیان بۆ دەربکات و بگەڕێنەوە سەر ماڵ و حاڵی خۆیان. کەچی لە دوای ڕاپەڕیینەوە هەموو سەربازە هەڵهاتووەکان، ئەوانەی

گەڕانەوە بۆ باوەشی ڕژێم، ئەوانەیش ئاوارەی ئێران بوون، ئەوپەڕی هەوڵدەدەن هەتا وەکو پێشمەرگە حسابیان بۆ بکرێت. بەرپرسەکانی حیزب و پێشمەرگەیش بە ئاسانیی ئەو کارەیان بۆ ئەنجامدەدەن. لەبەرئەوەی ئاوەزمەندیی دزین و دەستبەسەرداگرتنی پیشە و پێگەی توێژە سەرکەوتووەکانی کۆمەڵگە، لە لایەن تاک و توێژی ترەوە بە کار و ئاکارێکی ئاسایی و سروشتیی دەزانن.

ئەو کەسانەی کە بۆ ماوەیەک پێشمەرگە بوون و دوایی ڕیزەکانی هێزی پێشمەرگەیان بەجێهێشت و گەڕانەوە باوەشی ڕژێم، لە دوای ڕاپەڕین پەیوەندییان بەو حیزبانەوە کرد کە کاتی خۆی لەگەڵیان بوون، داوایان لێکردن کە وەکو پێشمەرگە حسابیان بۆ بکەن. حیزبەکانیش بەبێ هیچ دڵەڕاوکێیەک وەکو پێشمەرگە ناویان نوسینەوە، بەڵام ئەم پێکهاتەیە لە لایەن پێشمەرگە ڕاستەقینەکانەوە وەڵامدرانەوە. پێشمەرگە کرا بە دوو بەشەوە، پێشمەرگەی دابڕاو (ئەوانەی تەسلیمبوونەتەوە)، پێشمەرگەی دانەبڕاو ئەوانەی هەتا ڕاپەڕین پێشمەرگە بوون و تەسلیمی ڕژێم نەبوونەتەوە.

دزین و دەستبەسەرداگرتنی پێگە و خەباتی پێشمەرگە، تەنها لە لایەن سەربازی هەڵهاتوو و پێشمەرگەی دابڕاوەوە نەبووە، دوای ڕاپەڕین زۆربەی ئەو کەسانەی لە ڕیزی فەوجەکانی بەرگریی نیشتیمانیی عێراقدا وەکو جاش چەکیان بۆ ڕژێمی بەعس هەڵگرتبوو، لە لایەن حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشووری کوردستانەوە وەکو پێشمەرگە ناویان نوسرا. زۆرێک لەو سەرۆک_جاشانەی کە دژی گەلی کورد و دژی هێزی پێشمەرگەی ڕاستەقینە تاوانیان ئەنجامدەدا، ئێستا شانبەشانی شەهیدانی پیشمەرگە، ناویان لە لیستی پێشمەرگەی شەهیدی وەزارەتی ئەنفال و شەهیدانی حکومەتی هەرێمدا تۆمارکراوە.

کێشەیەکی تری کەلتوریی و ئەخلاقیی ئەوەیە کە پاش ڕاپەڕین ئەو هێزە چەکدارەی حیزبە سیاسییەکانی باشووری کوردستان دروستیانکرد، ناوی هەمان هێزی پێشمەرگەی پێش ڕاپەڕینی وەرگرتووە. لە دوای ڕاپەڕینەوە هێزی پێشمەرگەی حیزبە دەسەڵاتدارەکان وەکو کارمەندی هێزێکی سەربازی موچە و دەرماڵە و پێویستیی تری ژیانی بۆ دابیندەکرێت، زۆربەی ئەو خەڵکانەی پەیوەندیی بە هێزی پێشمەرگەوە دەکەن هیچ بنەمایەکی فکریی و سیاسییان نییە بۆ ئەوەی پاڵیانپێوەبنێت چەک هەڵبگرن، بۆ پەیداکردنی بژێویی و بۆ حەزکردن لە چەک بەشداریی لە هێزە

چەکدارییەکەدا دەکەن، ئەمە لە کاتێکدا پێشمەرگە ئەو کەسە بوو عاشقی کورد و کوردستان بوو، بەبێ موچە و بەرژەوەندیی تر چەکی هەڵدەگرت، کە پێشمەرگە چەکی هەڵدەگرت بنەماڵەکەی دەستگیردەکرا و زیانی ڕۆحیی و مادیی دەکرد. لەبەرئەوە زۆر زۆڵمە بەو هێزە چەکدارەی دوای ڕاپەڕیین بگوترێت پێشمەرگە. ڕاستتر ئەوەیە ناوێکی تری بۆ بدۆزرێتەوە کە لەگەڵ کات و شوێن و چۆنیەتیی هێزەکەدا بگونجێت.

لە کۆمەڵگەیەکدا مارکسیی مەلا بێت، گاوان شێخ بێت، نەخوێندەوار دکتۆر ببێت، جاش پێشمەرگە بێت، دەسەڵات بەم ڕەوشە ڕازیبێت و ڕێگریی لێنەکات، دەبێت چارەنوسی ئەو کۆمەڵگەیە لەژێر سایەی دەسەڵاتێکی وادا بەرەو کوێ بڕوات؟

### ١٠- بێگانەپەرستیی:

لە کۆمەڵگەی کوردەوارییدا ئەم دەستەواژەیە بۆ ئەو کەسانە بەکاردێت کە پشت لە میللەتی خۆیان دەکەن و خزمەتی بێگانە دەکەن. ئەم ڕەفتارە لە سەرەتا لە هزری باوی توێژی دەسەڵاتداری خەڵکی کوردستانەوە سەریهەڵداوە. زۆربەی سەرۆک_خێڵەکانی کوردستان پەیوەندییەکی دۆستانەی باشیان لەگەڵ بەرپرس و نوێنەرانی دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستان هەبووە، بەردەوام خزمەتیانکردوون. لە هەمان کاتدا سەرۆک_خێڵەکانی کوردستان پەیوەندییەکی خراپیان لەگەڵ خێڵەکانی تری کوردستان و ڕەشوڕووتی گەلی کورددا هەبووە، خێڵەکانی کوردستان بەردەوام لە شەڕدا بوون و هەژارانی گەلەکەی خۆیانیان چەوساندووەتەوە. کوردەواریی ئەم ئاوەزمەندییەی پەسەندنەکردووە، بە پەندی پێشینانی "هەر کەس بگات بێگانەپەرستیی لە کۆتاییدا دێنێت نوشستیی"، ڕەخنەیکردووە. توێژە دەسەڵاتدارەکانی لە ئاکامە خراپەکانی ئەو جۆرە ئاوەزمەندییە ئاگادارکردووەتەوە. شۆڕشگێڕان و پێشەنگە سیاسییەکانی کورد لە باشووری کوردستان، وەکو کوردەواریی سەیری ئەم ئاوەزمەندییە خراپە ناکەن، ئاوەزمەندیی بێگانەپەرستییان لە باپیرانیانەوە وەرگرتووە و بەریناداەن.

لە کاتی شۆڕشدا گرنگییان بە کۆمەڵگەی کوردستان نەدا، خەڵکی کوردستانیان پەروەردەنەکرد، بەها و پیرۆزیی خەڵکی کوردستانیان پشتگوێخست، ڕێگەیاننەدا خەڵکی کوردستان لە شۆڕشدا بڕیاربەدەست بێت. گرنگییان بە دۆستایەتیی بێگانە و

داگیرکەرانی کوردستان دا، ئەو لایەنەی بڕیاری شۆڕشی بەدەستبوو، بێگانەکان بوون. مام جەلال بە شێوەیەکی چڕوپڕ ئاوەزمەندیی بێگانەپەرستیی لە ناخیدا جێگیربووبوو. لە بیرکردنەوە و بڕیار و کارەکانیدا پەیڕەویدەکرد. ساڵی ١٩٨٢ لە نەخۆشخانەی شەهید دکتۆر بەختیار لە گوندی قوڵەهەرمێ لە بناری شاخی مامەندەی ناوچەی مەنگوڕایەتیی، لەگەڵ چەند پزیشکێکی کورد و یەک پزیشکی عەرەبدا کارماندەکرد. چەند پزیشکێک پێیانڕاگەیاندم کە بە مام جەلال بڵێم کارئاسانییان بۆ بکات بۆ خوێندن سەردانی دەرەوەی وڵات بکەن. کاتێک مام جەلال سەردانی نەخۆشخانەی کرد، داواکاریی پزیشکەکانم پێگەیاند و مام جەلال گوتی:

باشە هاوکاریی عەرەبەکە دەکەین گەشتی ئەورووپا بکات، بەڵام بۆ کوردەکان کارئاسانیی ناکەین. لەوانەیە ئەم بڕیارەی مام جەلال دیبلۆماسیی و سیاسیی بووبێت، بۆ ئەوەی پیشانیبدات شۆڕشی کورد دژی گەلی عەرەب نییە و هاوکاریی ئۆپۆزسیۆنی عێراقیی دەکات، یان وای بۆ چووبێت کە تەنها ئەرکی پزیشکە کوردەکانە لە کوردستان بمێننەوە و خزمەتی پێشمەرگە و خەڵکی گوندنشینی کوردستان بکەن، بەڵام هەڵەتێگەیشتنەکە ئەوەیە ئەی بۆ ئەرکی پزیشکێکی عەرەب نییە لە شاخەکانی کوردستان بمێنێتەوە، ئەو نەخۆش و برینداارنە چارەسەربکات کە سوپای ڕژێمێکی عەرەبی شۆڤێنیی برینداریاندەکات؟ سیاسەتی نادایەروەریی ڕژێمە شۆڤێنییەکانی عێراقی عەرەبیی ناچاریاندەکات چەکی پێشمەرگایەتیی هەڵبگرن؟

لە خولی دووەمی شەڕی براکوژییدا (١٩٧٧ - ١٩٨٦)، زیانێکی گەورە بە گەلی کورد و دۆزە ڕەواکەی گەیشت. گەلی کورد بە تاک و کۆ لە سەرکردەکانی پارتیی و یەکێتیی دەپاڕایەوە شەڕی براکوژیی ڕابگرن، ئەو دوو حیزبە گوێیان بە قسەی کورد نەدەدا، بەڵام کە دەوڵەتی ئێران بینی ئاشتیی لە نێوان پارتیی و یەکێتیی و هێزەکانی تری باشووری کوردستان لە بەرژەوەندیی خۆیدایە، بە ئاشتەوایی نێوان پارتیی و یەکێتیی ئێران دەتوانێت بەرەیەکی تری شەڕی (ئێران – عێراق) لە کوردستاندا دژی سوپای عێراق بکاتەوە، دەتوانێت گەلی باشووری کوردستان دژی ڕژێمی سەدام کۆبکاتەوە، ساڵی ١٩٨٦ ڕەفسنجانیی سەرۆککۆماری ئەو کاتەی ئێران، مام جەلال و ئیدریس بەرزانیی بانگهێشتی تاران کرد و تەوقەی پێکردن و یەکێتیی و پارتیی ئاشتکردەوە*٢٧.

مام جەلال بە ئاواتەوە بووە خزمەتێکی تورکیا بکات، بۆ بەشداریی لە کۆبوونەوەی سۆسیاڵ ئینتەرناشوناڵ سەردانی تورکیا دەکات، هەوڵدەدات سەرۆککۆماری تورکیا ببینێت و خەڵاتێکی پێشکەشبکات. لەو بارەیەوە جەنگیز چاندار نوسەری تورک لە کتێبی شەمەندەفەری میزۆپۆتامیادا لە لاپەڕە ٨٦دا دەڵێت: "تاڵەبانیی لە مانگی حوزەیرانی ١٩٩١دا بۆ بەشداریی لە کۆبوونەوەی سۆشیاڵ ئینتەرناشوناڵ هاتبووە ئیستەمبوڵ، دەیویست سەرۆکوەزیرانی تورکیا تورکوت ئوزال ببینێت. لە ئوتێل لەگەڵ سەرچڵ قەزاز و بەرهەم ساڵەح بینیمن. لە بەشێکی کۆبوونەوەکەدا هەم جەلال تاڵەبانیی و هەم بەرهەم ساڵەح ڕاپۆرتەکەی کۆمەڵەی گەلانیان لە جانتاکەیان دەرهێنا، باسی حەقی تورکیایان لە باکووری عێراق کرد. تاڵەبانیی گوتی ئەگەر پشتگیریی ئێمە بکەن، هەڵوێست و پێگەی ئێمەیش لەگەڵ ئێوەدا هەماهەنگ و گونجاو دەبێت *٢٨

لە خولی سێیەمی شەڕی براکوژییدا (١٩٩٤ – ١٩٩٨) کاتێک پارتیی و یەکێتیی بەربووبوونە گیانی پێشمەرگەکانی یەکتر و گەورەترین زیانی مرۆیی و سیاسیی و ئابوریان بە گەلی کورد گەیاند. ڕۆڵەکانی گەلی کورد بە تاک و بە کۆ لێیاندەپاڕانەوە، بۆ ئەوەی شەڕ ڕابگرن و بە ئاشتیی کێشەکانیان چارەسەربکەن. سەرانی ئەو دوو حیزبە بەشەڕهاتووە، گوێیان لە ئاهونالەی دایکی شەهیدانی شەڕی براکوژیی و هەوڵ و تێکۆشانی نیشتیمانپەروەرانی کوردستان نەدەگرت، لەسەر داوای ڕۆڵەکانی کورد کۆتاییان بە شەڕی براکوژیی نەدەهێنا. کاتێک لە لایەن بێگانەوە داوای ڕاگرتنی شەڕیان لێدەکرا، یەکسەر بە گوێی هێزە بێگانەکانیان دەکرد، لەپێناو بەرژەوەندیی وڵاتانی بێگانەدا شەڕی ناوخۆییان ڕادەگرت. ساڵی ١٩٩٨ ئەمریکا تالەبانیی و بەرزانیی بانگی واشنتۆن کرد، تەوقەی پێکردن و شەڕی پارتیی و یەکێتیی پێڕاگرتن و یەکیخستنەوە، هەتا هەرێمی کوردستان لە دژی حکومەتی عێراق بەکاربهێنێت. ئیتر ئەمریکا شەڕی نێوان پارتیی و یەکێتیی ڕاگرت، کوردستانی بۆ ڕوخاندنی ڕژێمی بەعس بەکارهێنا*٢٩.

لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام، مام جەلال وەکو سەرکردەیەکی کورد و دواتر وەکو سەرۆککۆماری عێراق، خزمەتێکی زۆری عەرەبی کرد. ساڵی ٢٠٠٥ بە تەلەفۆنێکی عەمرۆ موسای سەرۆکی کۆمکاری عەرەبیی، مام جەلال بڕگەیەکی ڕەشنوسی دەستووری عێراقیی هەڵگرت، کە بۆ دابینکردنی مافەکانی گەلی کورد زۆر گرنگ بوو*٣٠.

سەیربکەن چۆن باوەڕی بێگانەپەرستیی پاڵ بە سەرۆککۆمارێکی کوردی عێراقیی دوای ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجەوە دەنێت، سۆزی بۆ نەتەوەپەرستەکانی عەرەب بجوڵێت و خزمەتی شۆڤینیزمی عەرەب بکات. بەو شێوەیە هەڵسوکەوت لەگەڵ عەرەبدا بکات وەکو ئەوەی ئەوان لە لایەن کوردەوە ئەنفال و کیمیاباران کرابن، نەک ڕژێمی بەعسی شۆڤینیی عەرەب جینۆسایدی کوردی کردبێت. سەیربکەن چۆن بۆ ڕازیکردنی عەرەب مافێکی نەتەوەیی گەلی کورد ژێرپێدەخات. دەسەڵاتدارانی کورد زۆر حەزیان لێیە بێبەرانبەر خزمەتی تورک و فارس و گەلانی تر بکەن، بەڵام بەرانبەر بە خزمەتی دۆزی ڕەوای گەلی کورد کەمتەرخەم و سست دەبینرێن. سەرۆککۆماری عێراق و نوێنەرانی تری کورد لە عێراق و دەسەڵاتدارانی هەرێم، لە جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ دەستووری عێراقدا ڕۆڵیان نەبینی.

مام جەلال لە ئاشتەوایی نێوان عەرەبی سوننە و عەرەبی شیعەدا ڕۆڵی سەرەکیی دەبینی. مام جەلال لە پشتیوانیی سیاسیی و مادیی بۆ تورکمانی عێراق وێنەی نییە، بەڵام کە دەهاتەوە کوردستان هەرچی بشێ و نەشێت بە حیزبە کوردییەکانی دەکرد. لە مانگی ئۆگوستی ٢٠١٠دا گەڕایەوە کوردستان و لەسەر ڕەخنەی ئۆپۆزسیۆن بۆ بەقاچاخبردنی نەوتی هەرێمی کوردستان، لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەنوسییدا لایەنە ڕەخنەگرەکانی بە نەزان و قینلەدڵ و پیاوی بێگانە ناوهێنا.

کاتێک مام جەلال بە نەسریەی تایبەتی خۆی هاوکاریی تورکمان و مەسیحییەکانی دەکرد، لەو کاتەدا بە فەرمانی خۆی موچەی ئەو کەسانەی دەبڕی کە پشتیوانیی لیستی گۆڕانیان دەکرد.

مام جەلال و مەسعود بەرزانیی بۆ خزمەتکردنی تورکیا و ئێران و ئەمریکا وێنەیان نییە. چەند لە توانایاندا بێت بۆیان دەکەن، بەڵام لە دژایەتییکردنی مافەکانی گەلی کورد لە باکوور و لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، چییان پێکراوە درێغییان نەکردووە. بەم شێوەیە دەردەکەوێت کە چۆن بەرپرسانی هەرێم بە قووڵیی لە باوەڕی بێگانەپەرستییدا ژیاون و کارییێدەکەن. ئەو باوەڕەیش لە ناو هزری کۆمەڵگەی کوردستاندا دەڕوێنن و ئاویدەدەن. لە کێشەی نێوان گەلی کورد لە باکووری کوردستان و دەوڵەتی تورکیادا، هێزەکانی باشووری کوردستان بە بەردەوامیی بە شێوەی سەربازیی و سیاسیی، پشتگیریی ڕژێمی تورکیا دەکەن، دژایەتیی بزاڤی

ئازادیخوازی گەلی باکوری کوردستان دەکەن، زۆرێک لە سیاسەتمەداران وای بۆ دەچن ئەگەر کوردەکانی باشوور لە بەرانبەر کێشەی کورد هەڵوێستێکی کوردانەیان هەبایە و نەکەوتنایەتە ژێر کاریگەریی سیاسەتی داگیرکەرانەوە، کوردیان بە بچووک نەدیبایە و دوژمنیان بە گەورە وێنانەکردایە، دەمێک بوو کێشەی کورد لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا چارەسەرکرابوو.

هێزە سیاسییەکانی باکوری کوردستان کە سەردانی باشووری کوردستان دەکەن، داوا لە دەسەڵاتدارانی باشوور دەکەن لە شەڕ و ململانێی نێوان کورد و تورکیادا، پشتگیریی کورد بکەن، بەڵام دەسەڵاتدارانی باشوور گوێ لە قسەی کوردانی باکور ناگرن، بەردەوام پشتگیریی دەوڵەتی تورکیا دەکەن. لە مانگی تەموزی ساڵی ٢٠١٥ مەسعود بەرزانیی سەردانی تورکیای کرد، لە لیدوانێکدا ڕایگەیاند لە ئایندەدا ناوچەکە گۆڕانکاریی بەخۆیەوە دەبینێت و دەبێت ئێمە لەم گۆڕانکارییانەدا پشتگیریی تورکیا بکەین. گۆڕانکارییەکان بریتیبوون لەوە، سوپای تورکیا هێرشی بۆ سەر شارەکانی ڕۆژئاوای کوردستان دەستپێکرد. لە جەرابلوسەوە هەتا عەفرین داگیرکران. کوردی لەو ناوچانە ڕاگواست و عەرەبی لە شوێنیان نیشتەجێکرد.

باوەڕی بێگانەپەرستیی لە لای بەرپرسە باڵاکانی باشووری کوردستان، زیانی سیاسیی مەزنی بە جوڵانەوەی ئازادیخوازی گەلی کورد گەیاندووە. پەیوەندیی نێوان گەل و شۆڕش و دەسەڵاتی لاسەنگکردووە، لە ئاستی کۆمەڵگەیشدا بڵاوبووەتەوە. زیانی بە پەیوەندییە ناوخۆیی و ناوچەیی و جیهانییەکانی گەلی کورد گەیاندووە و هەستی خۆ_بەبچووکبینینی گەلی کوردی زیاتر پێشخستووە.

## ١١- پابەندنەبوون و کەمتەرخەمیی:

ئەگەر بە بڕیارەکانی حکومەتی هەرێم و یاساکانی پەرلەمانی کوردستان و بەڵێن و هەڵوێستی سیاسییەکانی کورددا بچینەوە، ئەو پەندە کوردییەمان دێتەبەرچاو کە دەڵێت: «قسە هەزارە، دوانی بەکارە». قسەی زۆر دەکرێت، بڕیاری زۆر دەدرێت، بەڵام ڕێژەیەکی زۆر کەمیان جێبەجێدەکرێن، یان پێچەوانەکەیان جێبەجێدەکرێت.

له ئاستی کۆمەڵگەیشدا هیچ جۆرە خۆبەستنەوەیەک بە پەیمانەکانەوە بەدیناکرێت. گەلی کورد لە ئاست جێبەجێکردنی بڕیاردا سارد و بێدەربەستە و خۆی بە بەرپرسیار نابینێت. لە راپەڕاندنی کاروباری ڕۆژانەی خەڵکدا چەندیین جار پەیمان و بڕیاردان دەبینین، بەڵام یان پەیمانەکان جێبەجێناکرێن، یان دوور لە کات و چۆنیەتیی پەیمان و بڕیارەکە کارەکە ئەنجامدەدرێت.

ئەگەر پەیمانی بەرپرسی حیزبیی و حکومیی هەرێمی کوردستان بێنینەوە بەرچاو کە چۆن پەیمان بە ئەندامانی حیزب و خەڵک دەدەن، چۆن دواتر پابەندی جێبەجێکردنی بڕیارەکان نابن، بۆمان ڕوندەبێتەوە کە یەکێک لە کێشە گەورەکانی باشووری کوردستان ئەوەیە پابەندی جێبەجێکردنی قسە و بڕیار نییە. ئەم جۆرە باوەڕە دیاردەیەکی باوە، لە دیرزەمانەوە لە باووباپیرانەوە بۆمان ماوتەوە، ئێمەیش داهێنانی تێدا دەکەین.

دەسەڵات و کۆمەڵگەی کوردستان ئەم باوەڕەی شەرمەزارنەکردووە، بە پێچەوانەوە کاتێک پەندی پێشینان دەڵێت: «قسە هەزارە، دوانی بەکارە»، ئیتر لە کەلتوری خەڵکی کوردستاندا باوەڕی پابەندنەبوون بە قسە و پەیمان و بڕیارەوە بە لوتکە دەگات.

کاتێک حیزبەکانی باشووری کوردستان بە بیانووی نالەباری بارودۆخەوە لە جێبەجێکردنی پەیمان و بڕیارەکانی حیزب و حکومەت دووردەکەونەوە، دیاردەی پەیمانشکێنیی و پابەندنەبوون بە بڕیارەوە لە ناو کۆمەڵگەدا بڵاودەکەنەوە، لەوێیشەوە بێبروایی لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵدا، لە نێوان خەڵک و دەسەڵاتدا قووڵتر دەبێتەوە.

دەسەڵات و حوکمڕانیی لە هەر وڵاتێکدا، دەزگای هەمەجۆری هەیە، دەزگای خزمەتگوزاریی و پەروەردەیی هەیە. ڕاستە دەوڵەتە داگیرکەرەکان لە ڕێگەی دامودەزگا سەرکوتکەرەکانیانەوە نیشتیمانی ئێمەیان داگیر و دابەشکردووە و ماف و ئازادیی گەلی کوردیان ژێرپێخستووە، بەڵام چەندیین دامودەزگای تریان هەیە کورد دەتوانێت بۆ گەشەپێدانی کەسێتیی خۆی و بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵەکانی سودی لێوەربگرێت، کەچی لە لای کورد دەزگا باش و خراپەکانی دەوڵەتی عێراق بە یەک چاو سەیردەکرێن، پێکەوە دژایەتییدەکرێن، سود لە دەزگا باشەکانی حکومەتی عێراق وەرناگرێت هەتا هەڵەکانی خۆی ڕاستبکاتەوە.

یەکێک لەو لایەنە باشانەی دامودەزگا حکومییەکان ئەوەیە تاک و کۆمەڵگە فێری دسپلین دەکات، فێریدەکات چۆن گوێڕایەڵی فەرمان و بڕیاری سەرەوەی خۆی بێت و چۆن گرێدراوی کات و شوێنی کارەکانی بێت.

گەلی کورد لە مێژووی نوێی خۆیدا خاوەنی دامودەزگای دەوڵەت نەبووە، لەو کاتەوە هەست و هۆشیاریی نەتەوەیی لە ناو گەلی کورددا سەریهەڵداوە، لە ڕێگەی دامودەزگاکانی حکومەتە داگیرکەرەکانی کوردستانەوە دەچەوسێتەوە. دەکرێت لە شارستانیەتی شار و دامودەزگا و دسپلینی دەوڵەت دووردەکەوێتەوە.

لەبەرەئەوەی خەباتی چەکداریی کورد لە باشووری کوردستان نزیکەی سەدەیەک درێژەیکێشاوە، لەو ماوەیەدا زۆر بە کەمیی تاکی کورد ڕووی لە سوپای عێراق کردووە، هەندێکی چەکی پێشمەرگایەتیی هەڵگرتووە، هەندێکی تری لەبریی خزمەتی سەربازیی وەکو چەکداری ڕژێم (جاش) چەکی هەڵگرتووە، ئەمە وایکردووە کورد دسپلینی سەربازیی فێرنەبێت.

ئەو پێکهاتەیەی کورد کە پێشمەرگایەتیی هەڵبژاردووە، فێری دسپلینی سەربازیی نەکراوە، فیری پابەندبوون بە کات و شوێنی کار نەبووە. حیزبە سیاسییەکانی باشوور کەوتنە ناو تەڵەی کەلتوری دەرەبەگایەتیی لادێکانی کوردستانەوە. بێدەربەستیی و ساردیی جوتیاری کوردستانیان بەسەر خۆیاندا سەپاند. کادر و پێشمەرگەیان لە کەلتوری بێسەروبەریی جوتیار و دەرەبەگدا مەستکرد.

ڕۆشنبیر و شارنشینەکانی کوردستان لەبەر هۆکاری سیاسیی ڕیزەکانی سوپا و پۆلیس و دامودەزگاکانی تری حکومەتی عێراقیان بەجێدەهێشت. لە شاخ و گوندە سنوورییەکانی کوردستاندا دەگیرسانەوە، لەوێ کەلتوری ئاغا و جوتیاری داوکەوتووی کوردستانیان وەردەگرت، پابەندبوون و دسپلینی دەوڵەتیان لەبیردەچوویەوە.

هۆکاری سەرەکیی لە پێشکەوتنی ئەم ئاوەزمەندییە لە شۆڕشی کورددا، ئەوە بوو کە سەرکردایەتیی شۆڕش بە دەست ئاغا و شێخ و دەرەبەگی کوردەوە بوو، ڕێگەیان لە گۆڕانکاریی و پێشکەوتنی ئاوەزمەندیی نوێ دەگرت.

ئەو پێکهاتەیەی کورستان کە چەکی بۆ ڕژێمەکانی عێراق هەڵدەگرت و شەڕی پێشمەرگەی دەکرد، هەم دەرەبەگ و شێخ و ئاغا سەرکردایەتی دەکرد، هەم حکومەتی

عێراق پاداشتی دەکرد، یەکێک لە پاداشتەکان ئەوەبوو کە فەوجەکانی سوارەی سەلاحەدین و فەوجە سوکەکان، پەروەردەی گرانی سەربازیان پێنەدەکرا، ئەوانیش فێری دسپلینی سەربازی نەدەبوون.

پێشمەرگایەتیی و جاشایەتیی و هەڵهاتن لە سەربازیی، هۆکاری گەورەن کە کۆمەڵگەی باشووری کوردستان پابەندبوونی بە کات و شوێن و قسەوە (دسپلینەوە) زۆر لاوازبووە. ساڵانی شەست و حەفتاکانی سەدەی بیست ماڵمان لە گوند بوو، دەمبینی ئەو پیاوانەی لە گوندەکەماندا پێگەی کۆمەڵایەتیی و باری ئابوریی و ئاستی رۆشنبیرییان بەرزە، ئەو کەسانە بوون کە خزمەتی سەربازییان کردبوو، یان ئەو کەسانە بوون کە پۆلیسی خانەشین بوون. دایکم و نەنکم چەندیین جار پێیاندەگوتم ئەو پیاوانە کە ئێستا دەوڵەمەند و دەمڕاستی گوندەکەمانن، کاتی خۆی زۆر هەژار و نەدار بوون، لەبەرئەوەی لە گوند کاریان دەستنەدەکەوت، کانیاو و ئاژەڵیان نەبوو، بۆ دابینکردنی بژێوییان پەیوەندییان بە سوپای عێراقەوە دەکرد. لە سوپادا مانەوە هەتا فێری خوێندەواریی بوون، فێربوون چۆن پابەندی کات و شوێن و بڕیار بن. ئێستا خاوەنی سەرمایەن، پێگەی کۆمەڵایەتییان هەیە و کێشەی خەڵکیش چارەسەردەکەن.

ساڵی ١٩٧٦ - ١٩٨١ خوێندکاری کۆلێژی پزیشکیی زانکۆی موسڵ بووم، لە قۆناغی پێنجەمدا لەوانەی سایکۆلۆژییدا مامۆستای وانەکە پرۆفیسۆر فەخری دەباغ پرسیارێکی لە هەموو خوێندکارەکان کرد و گوتی:

کێ دەزانێت قوتابخانەی دووەمی کۆمەڵگە چییە، کە خەڵک تێیدا فێردەبێت؟ کەس دەستی بەرزنەکردەوە. من لەو کاتەدا بیرم بۆ گوندەکەمان و پیاوە سەرکەوتووەکانی گوند گەڕایەوە، قسەکانی دایکم و نەنکم بیرکەوتەوە و دەستم هەڵبری. مامۆستا گوتی بڵێ. گوتم:

سەربازیی بە دووەم قوتابخانەی فێربوون دەژمێردرێت. مامۆستا گوتی: ڕاستە، زۆر باشە. خوێندکارەکان هەموو بە سەرسوڕمانەوە سەیریاندەکردم.

کاتێک ئەو هەموو پابەندنەبوون و بێدەبەربەستیی و گوێنەدانە لە ناو ڕیزی خەڵکی کوردستاندا دەبینم، هۆکارێکی گرنگی بۆ ئەوە دەگێڕمەوە کە زۆربەی کورد لە سەرەتای شەستەکانەوە هەتا ئەمڕۆ، خزمەتی سەربازییان نەکردووە. لەبریی خزمەتی سەربازیی، جاشایەتیی و پێشمەرگایەتییان کردووە، فێری دسپلین و ڕێکخستنی سەربازیی نەبوون. جاشایەتیی و پێشمەرگایەتییش نەک شتی باشی دەربارەی دسپلین

و ڕێزگرتنی یاسا فێرنەکردین، زۆربەی کات ڕێسا و کەلتوری خێڵەکیی کۆمەڵگەی کوردستانی فێرکردووین کە دژی بنەما و ڕێنماییەکانی دسپڵینە.

لە دوای ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی ١٩٩١ حکومەتی هەرێم پێکهات، لەکاتەوە گەنجانی کورد خزمەتی سەربازیی حکومەتی عێراق ناکەن، حکومەتی هەرێمیش خزمەتی سەربازیی بە گەنجان ناکات. بەم شێوەیە گەنجانی دوای ڕاپەڕینیش لە فێربوونی خووڕەوشتی قوتابخانەی دووەمی کۆمەڵگە بێبەشدەبن، هێندەی تر کەلتوری فەرامۆشکردنی پابەندبوون لە ئاوەزمەندیی تاک و پێکهاتەکانی گەلی کورددا جێگەی خۆی دەگرێت و داوکەوتنی زیاتری کۆمەڵگەی کوردستانی لێدەکەوێتەوە.

لە دوای ڕاپەڕیین سەربازیی نەما، حیزب دەستی بەسەر قوتابخانە و پەیمانگا و زانکۆکاندا گرت. قۆتابخانە و پەیمانگا و زانکۆکان لە ئەرکی پەروەردەی کۆمەڵگە دوورخرانەوە. ململانێی حیزبایەتیی و حیزبچێتیی ئەو دەزگایانەیشی گرتەوە، لەبریی ئەوەی مامۆستا قوتابیی فێربکات، لەگەڵ قوتابیی و مامۆستاکانی هاوکاریدا دەستی بە ململانێی حیزبیی کرد. پەروەردەکردنی نەوەی نوێیان فەرامۆشکرد.

کاتێک هەرێمی کوردستان لە نێوان هەردوو حیزبی دەسەڵاتداردا دابەشکرا، لەو کاتەوە حیزب بە تەواویی خۆی بەسەر دامودەزگا پەروەردەیی و زانستییەکاندا سەپاندووە. کاری سەرەکیی بەرپرسانی پەروەردە، پێشخستنی کەلتوری حیزبە کە کەلتوری خێڵە. کەلتوری خێڵیش هێندەی تر کورد لە پابەندبوون بە بڕیار و قسە و کات، دووردەخاتەوە.

لە دوای ڕاپەڕیین نەتەوە یەکگرتووەکان ئابلۆقەی ئابوریی خستە سەر عێراق، عێراقیش ئابلۆقەی ئابوریی خستە سەر هەرێمی کوردستان. بەهۆی شەڕی ناوخۆی نێوان حیزبەکانی کوردستانەوە، بەهۆی ئەو گەندەڵییەی لە هەرێمی کوردستان گەشەدەکات، گوزەرانی خەڵکی کوردستان هێندەی تر خراپ بوو.

یەکێک لەو توێژانەی کۆمەڵگەی کوردستان کە زیانی بەرکەوت مامۆستا بوو، پێش ڕاپەڕیین موچەی مامۆستایەتیی ژیانی مامۆستاکانی دابینەدەکرد، بەڵام پاش ڕاپەڕیین بە ماوەیەک، بەو هۆیانەوە کە ئاماژەم پێدان، گوزەرانی مامۆستا زۆر خراپ بوو. ئەمە مامۆستای ناچارکرد دەست بۆ کرێکاریی و وردەفرۆشیی ببات و لە پیشەکەی خۆی دووربکەوێتەوە. لە لایەکی تریشەوە زۆر لە مامۆستاکان بە تایبەت ئەوانەی

زمانی ئینگلیزییان دەزانی لەبریی ئەوەی هەوڵی خۆدامەزراندن بدەن، پەیوەندییان بە ڕێکخراوە بیانییەکانەوە دەکرد، وەکو وەرگێڕ کاریاندەکرد. بەو شێوەیە سەرقاڵبوونی مامۆستا بە کاری لابەلاوە بۆ دابینکردنی بژێویی، دوورکەوتنەوەی مامۆستا لە پیشەکەی، لە ڕووی چۆنایەتیی و چەندایەتییەوە ژمارەی مامۆستای کەمکردەوە. ئاژاوەی لە ناو دەزگاکانی پەروەردە و قوتابخانەکاندا دروستکرد، زیانی بە پەروەردە و فێرکردنی خەڵکی کوردستان گەیاند.

ئەگەر سەیری پەیڕەوی ناوخۆی حیزبەکانی باشووری کوردستان بکەین، بۆمان ئاشکرادەبێت کە بڕگەکانی ئەو پەیڕەوە، زۆر بە کەمیی جێبەجێدەکرێن، هەندێک جار حیزبەکانی باشوور بە پێچەوانەی پەیڕەوی ناوخۆوە کار و چالاکیی خۆیان بەڕێوەدەبەن. لە کاتێکدا خەریکی ئامادەکردنی چاپی دووەمی ئەم کتێبە بووم، ڕۆژی ٨/ ٧/ ٢٠٢١ کێشەی نێوان هاوسەرۆکانی یەکێتیی دروستبوو. باڤڵ تاڵەبانیی بەبێ گەڕانەوە بۆ پەیڕەوی ناوخۆ، بەبێ حسابکردن بۆ کۆنگرەی چوارەمی یەکێتیی، بەبێ پرسکردن بە سەرکردایەتیی یەکێتیی، خۆی بە سەرۆکی یەکێتیی ڕاگەیاند و لاهور شێخ جەنگیی هاوسەرۆکەکەی تری یەکێتیی، لە هاوسەرۆکیی لادا. هەموو ئەندام و بەرپرس و لایەنگرانی یەکێتییش ئەو ڕوداوەیان بە ئاسایی وەرگرت و پابەندی بڕیارە خێڵەکییەکانی باڤڵ تاڵەبانیی بوون. بەو شێوەیە دەبینین کە بەربژێری سیاسیی باشووری کوردستانیش گوێ بە دسپلین و پێوانەی کار و چالاکیی حیزبیی نادەن.

یاساکانی پەرلەمانی هەرێمی کوردستان سەرۆکی هەرێمی کوردستانیش ئیمزای لەسەر کردوون، بەڵام حکومەت جێبەجێیاننناکات. پەرلەمان و خەڵکیش بێدەنگ دەوەستن، ئەوەیشمان بۆ ئاشکرادەبێت کە دەسەڵاتی کوردیی و خەڵکی کوردستان دەیانەوێت هەتا ماوین لە باوەڕی فەرامۆشکردنی قسە و پەیمان و یاسا و بڕیارەکانماندا بژین. ئەگەر سەیری ئەو پەیمانانە بکەین کە بەرپرسانی هەرێمی کوردستان بە خەڵکی کوردستانیان داوە و جێبەجێیاننەکردووە، شێوەیەکی تری پابەندنەبوونی تاک و کۆمەڵی کوردستان بە پەیمان و بڕیارەکانی خۆیانەوە دەبینین.

بەو شێوەیە دەبینین هزری فەرامۆشکردنی بڕیار و پەیمان و یاسا لە باپیرانەوە بۆمان بەجێماوە، زەمینەی سیاسیی باشووری کوردستان وایکردووە ئەو باوەڕە هەتا بێت قووڵببێتەوە.

## ١٢- ڕەخنە و داوای لێبوردن:

یەکێک لە چەمکە باوەکانی سیاسەتی سەردەم، ڕەخنە و داوای لێبوردن و بەخۆداچوونەوەیە، بۆ سیاسەتمەداران و بەرپرسان ئاساییە بەرانبەر بە هەڵە و کەموکوڕییەکانیان ڕەخنە لە خۆیان بگرن و داوای لێبوردن بکەن. لە پەیڕەوی ناوخۆی هەموو حیزبە سیاسییەکانی باشووری کوردستاندا، چەندین برگە و لێکدانەوەی باش بۆ ڕەخنە تەرخانکراوە، بەڵام بە کردەوە زۆر بەزەحمەت کار بەو بڕگانە دەکرێت. ڕەخنەلەخۆگرتن و خۆبەهەڵەزانین و پەیماندان کە ئەو هەڵانە دوبارەنەبنەوە، لە ئاستی ناوخۆی حیزبدا، لە ئاستی کۆمەڵگەدا، لە ئاستی حوکمڕانیی باشووری کوردستاندا، گرنگیی پێنەدراوە و کاریپێناکرێت.

لە کۆمەڵگەی کوردستان و لە ناو دەسەڵاتی هەرێمدا، ڕەخنەلەخۆگرتن بە لاوازیی کەسێتیی و بێباوەڕیی لێکدەدرێتەوە، بۆیە بەرپرسەکان ئامادە نین لەسەر کارە هەڵەکانیان ڕەخنە لە خۆیان بگرن و بڵێن هەڵەمانکردووە.

ئەو کەسەی کە ڕەخنە لە کەسێک، لە حیزبێک، لە دەزگایەکی حکومەت دەگرێت، وەکو دوژمن سەیریدەکرێت، وەکو دوژمن هەوڵی سزادانی دەدرێت، بۆیە لە ماوەی حوکمڕانیی دەسەڵاتی هەرێمدا، ڕەخنەگرانی وەکو ڕۆژنامەنوسان و چالاکانی کۆمەڵگەی مەدەنیی لە لایەن حیزب و دەسەڵاتەوە ڕووبەڕووی سزای دادگاکان و تیرۆری جەستەیی و تیرۆری دەرونیی دەبنەوە.

ڕەخنە و ڕەخنەلەخۆگرتن و بەخۆداچوونەوە و داوای لێبوردن، بناغەی فەلسەفیی هەیە. مرۆڤ ئەو زیندەوەرەیە کە لە سەرەتای ژیانیەوە هەتا مردن، بە قۆناغی گۆڕان و گەشەکردندا تێدەپەڕێت، بە بەردەوامیی فێردەبێت، مرۆڤی تەواو لە هیچ شوێنێکی جیهاندا نییە، بۆیە ئاساییە مرۆڤ کەموکووڕیی هەبێت و هەڵەبکات. کەوابوو هەڵەکردن لە ئەنجامی کەمئەزموونیی و کەمگەشەکردنەوە دێت، کە مرۆڤی پێدا تێدەپەڕێت. گوێگرتن لە کەسانی تر وەکو ڕەخنەگر، کەموکورتییت بۆ ڕاستدەکەنەوە و تێگەیشتنت فراواندەکەن و گەشەکردنت مسۆگەردەکەن.

لە ڕەخنەقبوولکردندا چەمکی دیموکراتیی و یەکسانیی نێوان مرۆڤەکان دێتەپێشەوە. ئەو مرۆڤەی بە ڕەخنەی بەرانبەر ڕازیدەبێت، ڕێز و پێگە بۆ مرۆڤەکانی تر و بۆ کۆمەڵگە دادەنێت. تەنها خۆی بە زیرەک و زانا نازانێت، خەڵکی تریش بە زانا و دانا

دەزانێت. لایەنێکی تری گرنگیی ڕەخنەدان ئەوەیە کە لە هەر دەزگایەکی سیاسیی و بەڕێوەبەرییدا ڕەخنە هەبێت، لەو دەزگایەدا باوەڕی سەرکردایەتیی بەکۆمەڵ بەرجەستەدەبێت. ڕەخنە و لێبوردن پەیوەندیی نێوان دەسەڵات و گەل خۆشدەکات و متمانەی گەل بە دەسەڵات پێشدەخات، ئاشتیی کۆمەڵایەتیی و پێکەوژیان پێشدەخات.

ئەگەر هەر کەس و لایەنێک لە ڕابردوودا هەڵەی بەرانبەر بە خەڵک کردبێت، مەترسیی هەیە ئەو کەس و لایەنە هەڵەکانی ڕابردووی دژی خەڵک دوبارەبکاتەوە، بەڵام ئەگەر دەسەڵاتداران لە بۆنەیەکدا ڕەخنە لە خۆیان بگرن و داوای لێبوردن لە خەڵک بکەن، هۆکار و ئەنجامی هەڵەکان دەستنیشانبکەن، ڕێوشوێنی تایبەت بۆ ڕێگرتن لە دوبارەبوونەوەی ئەو هەڵانە دابنێن، ئەگەری دوبارەبوونەوەی هەڵەکان لە ئارادا نامێنێت. لەوێوە پەیوەندیی نێوان گەل و دەسەڵات لە پەیوەندییەکی بێمتمانەیی و دوژمنکارانەوە بۆ بڕواپێکردن و دۆستایەتیی گۆڕانکاریی بەسەردا دێت.

لە سەرهەڵدانی شۆڕشی ئەیلولەوە هەتا ئەمڕۆ، حیزبە سیاسییەکانی باشووری کوردستان، سەرکردەکانی شۆڕش، کادر و ئەندامانی حیزبەکان، لە کاتی تێکۆشاندا چەندیین زیانی مادیی و بەهاییان بە تاک و پێکهاتە و کۆی نەتەوەی کورد گەیاندووە، بەڵام ئەوەی بەرچاومان نەکەوتووە، ئەوەی گوێمان لێنەبووە، ڕەخنە و پێداچوونەوەی بەرپرس و هێزە سیاسییەکانی باشووری کوردستانە بەرانبەر بەو هەڵانەی کە لە چەندیین کات و شوێنی دیاریکراودا بەرانبەر بە دۆزی ڕەوای گەلی کورد و بەرانبەر بە تاک و پێکهاتەکانی گەلی کورد ئەنجامیانداوە.

خولی یەکەمی شەڕی براکوژیی کە لە ساڵی ١٩٦٤دا لە نێوان باڵی شۆڕشی ئەیلول و باڵی مەکتەب_سیاسیی بزوتنەوی ڕزگارییخوازی گەلی کورددا دروستبوو، بە شێوازی جیاجیا هەتا ساڵی ١٩٧٠ بەردەوامبوو. لەو شەڕەدا هەزارن پێشمەرگە شەهیدبوون، دەیان هەزار برینداربوون. دۆزی ڕەوای گەلی کورد لەکەدارکرا و پاشەکشێی پێکرا. لە بەرانبەر ئەو هەموو زیانەدا، هیچ کام لە لایەنە بەشەڕهاتووەکان ڕەخنەیان لە خۆیان نەگرت و بە خۆیاندا نەچوونەوە.

سیاسەتی هەڵەی سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول، هەرەسی شۆڕشی ئەیلولی ١٩٧٥ لێکەوتەوە، کەچی هەتا ئەمڕۆیش ئەو سەرکردایەتییە خۆی بە هەڵە نەزانیوە و داوای لێبوردنی لە گەلی کورد نەکردووە. سیاسەتمەدار و کۆمەڵناسانی کوردستانیش

به شێوەیەکی زانستیی ئەو هەڵە و تاوانانەی دەسەڵاتدارانی باشووری کوردستانیان هەڵنەسەنگاندووە، ڕێوشێنی وایان دانەناوە ئەو کارەساتانەی دەسەڵات بەسەر گەلی کورددا هێناویانە دوبارەنەبێتەوە.

خولی دووەمی شەڕی براکوژیی لە سالانی ١٩٧٧ – ١٩٨٦ لە نێوان هێزی پێشمەرگەی یەکێتیی و پارتیی و حسک و پاسۆک و حیزبی شیوعیی عێراق (حشع) دەستپێکردەوە، قۆناغێکی تری سەختی شەڕی براکوژیی باشووری کوردستان بوو، لەو شەڕەدا جارێکی تر هەزاران پێشمەرگە شەهیدبوون، شۆڕش لەکەدارکرا و پاشەکشەیکرد. هەتا ئەمڕۆیش هیچ لایەنێکی سیاسیی بە شێوەیەکی فەرمیی لە کۆنگرە و کۆنفرانسێکدا باسی لەو تاوانانەی شەڕی براکوژیی نەکردووە. هیچ لایەنێک ڕەخنەی لە خۆی نەگرتووە و داوای لێبوردنی لە لایەنەکەی تر و لە خەڵکی کوردستان نەکردووە.

تاوانی ئەنفال و کیمیابارنی هەڵەبجەی ساڵی ١٩٨٨ ڕاستەوخۆ لە لایەن ڕژێمی سەدامەوە ئەنجامدرا، ڕۆڵی لایەنە سیاسییەکانی باشووری کوردستانیشی تێدایە، لەبەرئەوەی لە کاتی شەڕی (عێراق – ئێران)دا تایبەتمەندیی و ڕەوایی دۆزی کوردیان ڕانەگرت. شۆڕشی ڕەوای گەلی کوردیان تێکەڵی شەڕی ناڕەوای (عێراق- ئێران) کرد. شانبەشانی سوپای پاسدارانی ئێران، هێزی پێشمەرگەی کوردستان شەڕی سوپای عێراقی دەستپێکرد. ئەمە هەڵەیەکی ستراتیژیی شۆڕشی کوردە، بەهۆی ئەوەوە سوپای عێراق بە چەکی کیمیاویی پەلاماری ناوچە ڕزگارکراوەکانی کوردستانی دا و ئەنفالی دروستکرد. لەبەرئەوەی شۆڕشی کورد بووە بەشێک لە شەڕی (عێراق – ئێران). بە ڕاگرتنی شەڕی نێوان ئەو دوو وڵاتە لە ٨/ ٨/ ١٩٨٨ شۆڕشی کوردیش شکستێکی گەورەی سیاسیی و سەربازیی و جەماوەریی بەسەرداهات. بەرانبەر بەو هەڵە کۆشندە ستراتیژییە، نەمابینیی هیچ کام لە حیزبەکانی باشووری کوردستان، یان هەموویان پێکەوە دان بە هەڵەی خۆیاندا بنێن و داوای لێبوردن لە گەلی کورد بکەن.

لە دوای ڕاپەڕیین لە ساڵی ١٩٩٤ - ٢٠٠٣ خولی سێیەمی شەڕی براکوژیی، لە نێوان هێزە سیاسییەکانی باشووری کوردستاندا دوبارەبووەوە و جارێکی تر هەزاران کەس لە هەموو لایەنەکان شەهیدبوون. خەڵکی باشووری کوردستان دوچاری چەندیین زیانی مرۆیی و مادیی هات. هێندەی تر ڕووی کورد لە لای دۆست و دوژمن ناشیرین بوو. دۆزەکەمان پاشەکشەیکرد و لە چارەسەر دوورکەوتەوە.

ساڵی ١٩٩٦ شەڕ و پێکدادانی نێوان پارتیی و یەکێتیی بە لوتکە گەیشت. خۆیان توانای شەڕیان نەما، پەنایان بۆ هێزی وڵاتانی داگیرکەری کوردستان بردەوە. لە ٢٩/ ٧/ ١٩٩٦ یەکێتیی دەستی سوپای پاسداری ئێرانی هەتا کۆیە ڕاکێشا، سوپای پاسداران بۆردوومانی هێزە ئاوارەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران (حدکا) کرد، یەکێتیی خۆی کرد بە کەواسووری بەرلەشکری داگیرکەران بەو مەرجەی ئێران، لە شەڕی یەکێتیی و پارتییدا، هاوکاریی یەکێتیی بکات.

لە ٣١ ئابی ١٩٩٦دا، سەرۆکی پارتیی داوای هاوکاریی سەربازیی لە سەدام حوسەین کرد، بۆ ئەوەی هێزی سەربازیی بۆ بنێرێت هەتا هەولێری پێبگرێتەوە و یەکێتیی لە هەولێر دەربکات. سەدام بە داواکەی بەرزانیی ڕازیبوو، بەو مەرجەی ئەوانیش لارییان نەبێت سوپاکەی سەدام چی لە ئۆپۆزسیۆنی عێراق بکات با بیکات، بەرزانییش بەو مەرجەی سەدام ڕازیبوو. سوپای عێراق هات، یەکێتیی دەرکرد و هەولێری بۆ پارتیی وەرگرتەوە. ئۆپۆزسیۆنی عێراقیشی بۆ خۆی لەکۆڵکردەوە. لە ئۆکتۆبەری هەمان ساڵدا فڕۆکە جەنگییەکانی سوپای تورکیا لە شەڕی نێوان پارتیی و یەکێتییدا هاوکاریی پێشمەرگەکانی پارتییان کرد.

دوای تاوانی پەلکێشکردنی سوپای داگیرکەرانی کوردستان بۆ سەر خاکی کوردستان، دوای کارکردن بە هێزی داگیرکەر بۆ سڕینەوەی هێزی ڕکابەری کوردستان، دوای لێدانی ئۆپۆزسیۆنی ئێران و عێراق، لە لایەن سوپای پاسداران و سوپای عێراق و دەسەڵاتی باشوورەوە، لەپای ئەم تاوانە بێوێنانەدا، نەمانبینی هیچ یەکێک لە پارتیی و یەکێتیی، لەسەر ئەو هەڵە ستراتیژییە و لەسەر ئەو تاوانە گەورانە، بە شێوەیەکی فەرمیی قسەبکەن و دان بە هەڵەکانی خۆیاندا بنێن، داوای لێبوردن لە خەڵکی کوردستان و لە بنەماڵەی شەهیدانی شەڕی ناوخۆ و لە ئۆپۆزسیۆنی ئێران و عێراق بکەن.

شۆڕشی باشووری کوردستان دەرهەق بە بزاڤی ئازادییخوازی گەلی کورد لە پارچەکانی تری کوردستاندا تاوانی گەورەی ئەنجامداوە، بە بڕیاری سەرکردایەتیی شۆڕش، کادر و پێشمەرگەی باشوور بەردەوام لە سەنگەری داگیرکەراندا دژی پێشمەرگە و گەریلای پارچەکانی تری کوردستان شەڕدەکات، شۆڕشی پارچەکانی تری کوردستان سەرکوتدەکات. چەندیین سەرکردەی ڕۆژهەڵات و باکووری

کوردستان بە بڕیاری بەرپرسانی باشوور شەهیدکروان، دەستگیرکراون و ڕادەستی ڕژێمی ئێران و تورکیا کراونەتەوە. ئەمانە تاوانی گەورەی نەتەوەیی و مرۆڤایەتیین، بەرپرسانی باشوور هیچ گرنگییەک بەو تاوانانە نادەن، بە بیریاندا نایەت لەو بارەیەوە قسەبکەن و بە خۆیاندا بچنەوە و داوای لێبوردن لە نەتەوەی کورد و مرۆڤایەتیی بکەن. لەسەر ئاستی تاک و پێکهاتەی کوردستان، لە کاتی تێکۆشان و بەرخوداندا، حیزبە سیاسییەکان و بەرپرسەکانی هێزی پێشمەرگەی لایەنەکان، چەندین کەسیان بەبێ دادگایی شەهیدکردووە، چەندین کەسیان تیرۆرکردووە و هێرشیانکردووەتە سەر چەندین خێڵ و بنەماڵەی کوردستان، پاڵیان پێوەناون چەکی خیانەت هەڵبگرن.

ئەم هەڵە و تاوانە مرۆڤایەتیی و نەتەوەییانەی کە هێزە دەسەڵاتدارەکانی باشووری کوردستان لە ڕابردوودا ئەنجامیانداون، ناوبەناو هەتا ئەمڕۆیش ئەنجامیدەدەن، دڵی گەلی کوردستانی لە کوردبوون کرمێکردووە. گەلی کورد باوەڕی پێیان نییە. گەلی کورد لەسەر دووڕیانێکە، یان ڕەخنە و پێداچوونەوە و داوای لیبوردنی هێزە سیاسییەکانی ئەمڕۆی کوردستان و ئاشتبوونەوە لەگەڵ نەتەوەی کورد و خەڵکی باشووری کوردستاندا، یان دادگاییکردنی هێزە دەسەڵاتدارە تاوانکارەکان لە لایەن گەلەوە و سزادانیان.

ساڵی ٢٠٠٨ - ٢٠٠٩ ململانێکانی ناو یەکێتیی پەرەیانسەند. ژمارەیەک لە بەرپرسە دیارەکانی ئەو حیزبە بە ڕابەرایەتیی نەوشیروان مستەفا یەکێتییان بەجێهێشت و بزوتنەوی گۆڕانیان دروستکرد. لەبەرئەوەی دەستەی بەڕێوەبەری بزوتنەوەی گۆڕان لە ساڵانی ڕابردوودا لە ناو یەکێتییدا بەرپرسیارێتیی گرنگیان لە دەستدا بووە، لە دروستکردنی بڕیاری هەڵە و هەڵوێست و کردارە هەڵەکانی یەکێتییدا بەشدارییانکردووە، خەڵکی باشووری کوردستان بە گشتیی و ڕۆشنبیر و سیاسەتمەدارانی باشووری کوردستان بە شێوەیەکی تایبەتیی، داوایان لە سەرانی گۆڕان دەکرد، سەبارەت بە هەڵەکانی ڕابردوویان کە لە ناو حیزبی دەسەڵاتداردا ئەنجامیانداوە، ڕونکردنەوە بدەن، لەو شوێنەدا کە پێویستە ڕەخنە لە خۆیان بگرن و داوای لێبوردن لە خەڵکی کوردستان بکەن، بەڵام سەرانی بزوتنەوەی گۆڕان وەکو پارتیی و یەکێتیی لەسەر ئەو بابەتە وەڵامی خەڵکی کوردستانیان نەدایەوە، هەتا ئێستا داوای لێبوردنیان لە کەس نەکردووە. ئەمەیش یەکێک لە کەموکوڕییە سەرەکییەکانی بزوتنەوەی گۆڕانە، کە پێشانیدەدات بڕوای بەوە نییە هەڵەبکات، بۆیە خەڵکی کوردستان بە چاوی گومانەوە سەیری

ئایندەی ئەو جولانەوە سیاسییەیش دەکات. نەوەی نوێ، کە نوێترین حیزبی باشووری کوردستانە، ڕەخنە لە سەرۆکەکەی دەگیرێت کە قەرزاری حکومەت ناگەڕێنێتەوە و پارەی کارەبا نادات، لەبریی ئەوەی ڕەخنە لە خۆی بگرێت و پەیمانبدات کۆتایی بە هەڵەکانی بهێنێت، لە مانگی شوباتی ٢٠٢٢ لە (NRT) گوتی: بە هەوەس (ئارەزوو) پارەی کارەبا نادەم و قەرزەکان نادەمەوە.

یەکێک لەو پێویستییە گرنگانەی ئەمڕۆی سیاسەتی باشووری کوردستان ڕەخنەگرتن و پێداچوونەوەیە بۆ ئەوەی هەڵەکانی ڕابردوو دووبارەنەبنەوە. یەکێک لەو پێویستییانەی تری سیاسەتی ئەمڕۆی باشووری کوردستان داوای لێبوردنی لایەنە سیاسییەکانی باشووری کوردستانە لە خەڵکی کوردستان. داوای لێبوردنی لایەنە بەرپرس و زاڵمەکانە لەو لایەنەی هەڵە و تاوانی بەرانبەر کراوە، بۆ ئەوەی گەل و دەسەڵات ئاشتببنەوە، بۆ ئەوەی لایەنە بەشەڕهاتووەکان بە ڕاستیی ئاشتببنەوە، هەموو پێکەوە لە پاراستن و پێشخستنی دەستکەوتی تێکۆشانی گەلەکەماندا کەمتەرخەمیی نەکەن.

### ١٣– ڕەش و سپیی:

پەندی پێشینان دەڵێت: "دەستێک نەتوانیت بیبڕێت، دەبێت ماچیبکەیت". ئەم پەندە ئەوەمان پیشاندەدات کە لە دێرزەمانەوە کۆمەڵگەی کوردستان بە ئاوەزمەندیی ڕەش و سپیی ئاشنابووە، یان بە تەواویی لەگەڵیدایە، یان بە تەواویی لە دژی دەوەستێتەوە. ئاوەزمەندیی ڕەش و سپیی لەگەڵ پەیدابوونی کۆمەڵگەی پلەداریی و کۆمەڵگەی چینایەتییدا دروستبووە و گەشەیکردووە، هەتا ئەمڕۆیش لە زۆرێک لە کۆمەڵگەکانی جیهاندا بە کۆمەڵگەی کوردستانیشەوە بڕیاری پێدەدرێت و کاریپێدەکرێت.

ئاوەزمەندیی ڕەش و سپیی بە واتای ئەوە دێت جیهان و دیاردەکانی، بە دوو چاو سەیربکەیت، بەشێکیان بە ڕەش ببینیت و دژی بوەستیتەوە و هەوڵی لەناوبردنی بدەیت، بەشەکەی تری بە سپیی ببینیت و بە باشیی لێکبدەیتەوە و قبوڵیبکەیت.

ئاوەزمەندیی ڕەش و سپیی لە ناوخۆی وڵاتدا دکتاتۆریەتی بەرهەمهێناوە، لە دەرەوەی وڵاتدا داگیرکاریی و شەڕی بەردەوامی بەرهەمهێناوە. لە دوای پەرەسندنی هزری مرۆڤدۆستی، چەمکی مافەکانی مرۆڤ و بنەماکانی سیستەمی دیموکراسیی

سەریهەڵدا و پەرەیسەند. ئاوەزمەندیی ڕەش و سپیی لە زۆرینەی کۆمەڵگەکانی جیهاندا پاشەکشەیکرد، بەڵام لە هەرێمی کوردستان ئاوەزمەندیی ڕەش و سپیی لە شوێنی خۆی ماوەتەوە. لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلولەوە ئاوەزمەندیی ڕەش و سپیی وەکو پێویست لە سیاسەتی باشووری کوردستاندا جێگیرنەبووبوو. دوای دەستپێکردنی خەباتی چەکداریی، چەندین جار لە نێوان حکومەتی عێراق و سەرکردایەتیی شۆڕشدا شەڕ ڕادەگیرا و گفتوگۆ دەستیپێدەکرد، بەڵام لەبەرئەوەی گفتوگۆکان ئەنجامێکی باشیان بۆ کورد لێنەدەکەوتەوە، هێزە ناوچەیی و جیهانییەکانیش کاریگەرییان لەسەر بڕیاری سیاسیی سەرکردایەتیی شۆڕش دەکرد، وردە وردە ئاوەزمەندیی ڕەش و سپیی لە ناو سیاسەتی شۆڕشی ئەیلول و شۆڕشی نوێدا گەشەیکرد.

لە گفتوگۆی نێوان حکومەتی عێراق و شۆڕشی ئەیلولدا، چەمکی ڕەش و سپیی لە لای بەرپرسانی شۆڕش گەشەیدەکرد، وەکو بڕیاری سیاسیی کارییپێدەکرا. لە بەرانبەریشدا حکومەتی عێراق بە هەمان ئاوەزمەندییەوە بەرانبەر بە کێشەی کورد بڕیاری وەردەگرت. لە ئەنجامدا ساڵی ١٩٧٤ جارێکی تر شەڕ لە نێوان گەلی کورد و حکومەتی عێراقدا دروستبووەوە. دوای ساڵێک ڕێککەوتنی جەزائیر و بڵاوەپێکردنی شۆڕشی لەگەڵ خۆی هێنا. لە کاتی گفتوگۆدا لایەنی کوردیی پێی لەسەر چەند بابەتێک دادەگرت و حکومەتی عێراقیش بەو داوایانەی شۆڕش ڕازینەدەبوو. ئەو کەسانەی لە سەرکردایەتیی شۆڕشی کورددا دەیانویست هەڵوێستێکی مامناوەندی پیشانبدەن و داوا لە سەرکردایەتیی جوڵانەوەکە بکەن کەمێک نەرمیی بنوێنێت، بە کەسانی لاواز و خائین ناوزەددەکران.

ئەو کاتەی شای ئێران داوای لە مەلا مستەفا کرد کۆتایی بە بزوتنەوە چەکدارییەکەی بهێنێت، مەلا مستەفا لە لایەکەوە بە گوێی شای ئێرانی کرد و جاڕی بڵاوەپێکردنی شۆڕشی دا، لەولایشەوە پەیوەندیی بە حکومەتی عێراقەوە کرد، کە بیانبەخشێت. لێرەدا دەبینین لە ماوەی کەمتر لە ساڵێکدا سیاسەتەکانی بەرزانیی گۆڕانکارییان بەسەردادێت. لە ئازاری ١٩٧٤ بەبێ کەرکوک و دەسەڵاتێکی زۆرتر بۆ ناوچەی حوکمی زاتیی ڕازینەدەبوو، بەڵام دوای ساڵێک وازی لە تێکۆشان هێنا، داوایکرد ڕژێمی سەدام وەکو عێراقییەک ڕێگەیبدات بگەڕێتەوە. سیاسەتی شای ئێران و سەدام حوسەینیش بەرانبەر بە دۆزی کورد، لە هەمان کاتدا سیاسەتێکی ڕەش و سپیی بوو، لەبەرئەوە نەیانتوانی کێشەکە چارەسەربکەن.

ساڵی ١٩٨٣ گفتوگۆ لە نێوان حکومەتی بەعس و سەرکردایەتیی یەکێتییدا دەستپێکرد، هێندەی نەمابوو ڕێککەوتنیش ئیمزابکرێت، بەڵام لە ١٥/ ٢/ ١٩٨٥دا جارێکی تر شەڕ دەستپێکردەوە. هەر یەک لە یەکێتیی و عێراق بە شێوەیەک پەلاماری یەکیان دایەوە، ئاوەزمەندیی ڕەش و سپییان تێپەڕاند. لە هەر ناوچەیەکی کوردستان پێشمەرگە پەلاماری سوپای عێراقی بدابایە، حکومەتی عێراق گوندەکانی دەوروبەری شەڕەکەی دەڕوخاند. خەڵکی گوندەکانی دەستگیردەکرد و ڕەوانەی ئۆردوگای دەکردن. یەکێتییش لە لای خۆیەوە پەیمانێکی لەگەڵ قەرارگای ڕەمەزانی سوپای پاسدارانی ئێراندا بەست، خۆی وەکو هێزێکی ناو شەڕی (ئێران – عێراق) ڕاگەیاند. بەو شێوەیە بە چەمکە ڕەش و سپییەکانیان کوردستانیان وێرانکرد.

لە دوای ئەنفال و کیمیابارانی کوردستان شەڕی (ئێران – عێراق) ڕاگیرا، لەبەرئەوە یەکێتیی دوچاری شکست بووەوە، بەرەی ئێرانی بەجێهێشت و داوای گفتوگۆی لە حکومەتی عێراق کرد، لەسەر بنەمای ڕەش و سپیی حکومەتی عێراق بە داواکەی یەکێتیی ڕازینەبوو. لە مانگی شەشی ساڵی ٢٠١٧دا مەسعود بەرزانیی سەرۆکی هەرێم، بڕیاری ڕاپرسیی بۆ سەربەخۆیی باشووری کوردستان و جیابوونەوە لە عێراق دەرکرد. پێش ڕاپرسییەکە لە ئاستی ناوخۆ و دەرەوەدا تکا و ڕجای دونیا لە بەرزانیی کرا هەتا بڕیاری ڕاپرسیی نەدات و دوایبخات، مەسعود بەرزانیی گوێی لە کەس نەگرت و ڕۆژی ٢٥/ ٩/ ٢٠١٧ ڕاپرسیی ئەنجامدرا. زۆرینەی خەڵکی کوردستان بە دانیشتوانی کەرکوک و ناوچە دابڕاوەکانی ترەوە دەنگیان بۆ ڕاپرسیی دا. کاتێک عێراق و وڵاتانی دەوروبەر دژی ڕاپرسیی هەڵوێستیان پیشاندا و دەستیان بە هەڕەشە کرد، بەرزانیی و حیزبەکەی لە ڕاپرسیی پەشیمانبوونەوە و پەیوەندییان بە حکومەتی عێراقەوە کردەوە و کۆتاییان بە سیاسەتی ڕاپرسیی هێنا.

ئەم ئاوەزمەندییە ڕەش و سپییەی بەرزانیی و بەرپرسانی تری هەرێم، کە لە ماوەی چەند مانگێکدا دوو هەڵوێستی ستراتیژیی جیاواز و ناکۆکیان پیشاندا، زیانی گەورەی بە گەلی کوردستان گەیاند. بەو شێوەیە دەبینین کە سیاسەتمەدارانی کورد لە کاتی تێکۆشاندا، یان ئەمسەر، یان ئەوسەری سیاسەتیان گرتووە، یان سەرە سپییەکە، یان سەرە ڕەشەکەیان گرتووە، بەڵام لە ڕاستیدا چۆن لە نێوان ڕەنگی ڕەش و ڕەنگی سپییدا چەندیین ڕەنگی تر هەن نێوانی ئەو دوو ڕەنگەیان داپۆشیوە، لە سیاسەتیشدا

بە پانیی و بە قووڵیی، ڕووبەرێکی زۆر هەیە هەتا مرۆڤ لە نێوانیاندا، لە نێوان شەڕ و پێکدادانی بێبنەما و خۆبەدەستوەدانی بێبنەمادا سیاسەتبکات.

ئامادەکردنی پڕۆژەی سیاسیی، کرانەوەی دیموکراسیی، بڕواهێنان بەوەی تێگەیاندنی بەرانبەر و گوێگرتن لە بەرانبەر، لە سیاسەتدا ئەنجامی باشی لێدەکەوێتەوە. هەنگاوی سەرەتایین بۆ ئەوەی هزری ڕەش و سپیی و سیاسەتی توندوتیژیی بێبنەما و سیاسەتی خۆبەدەستەوەدان کۆتاییپێبێت.

ئاوەزمەندیی ڕەش و سپیی تەنها لە ناو دەسەڵاتی هەرێمدا بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری سیاسیی بە بنەما ناگیرێت، لە ئاستی کۆمەڵگەیشدا، وەکو چەمکێکی زاڵی کۆمەڵایەتیی و سیاسیی کاریپێدەکرێت.

لە سەردەمی خەباتی چەکدارییدا، چەندیین پێشمەرگەی قارەمان، بەهۆی کێشەی بچووک و لاوەکییەوە، لە ماوەی شەو و ڕۆژێکدا، سەنگەری پێشمەرگایەتییان چۆڵدەکرد و سەنگەری جاشایەتیی و خیانەتیان ئاوەداندەکردەوە.

ئەو کێشە کۆمەڵایەتییانەی لە ناو خێزاندا لە نێوان ژن و مێرددا ڕوودەدات کە بە هاوسەرگیریی دەستپێدەکات و پاش ماوەیەک بە جیابوونەوە و تەڵاقدان کۆتاییدێت، لە زاڵبوونی ئاوەزمەندیی ڕەش و سپییەوە بەسەر هزری خەڵکدا سەرچاوەیگرتووە. سەرەتا ژن و مێردەکە بە هەموو شتێکی یەکتر ڕازین، دوای ماوەیەک لەسەر هەندێک بابەت ناکۆکیی لە نێوانیاندا دروستدەبێت، هیچیان بەرگەی هەڵوێستی بەرانبەرەکەیان ناگرن، بڕیاری دوورکەوتنەوە و جیابوونەوە دەدەن و کێشەیەکی کۆمەڵایەتیی بۆ منداڵ و بنەماڵەکانیان دروستدەکەن.

## ١٤- دەمارگیریی حیزبیی:

حیزب هۆکارە بۆ بەدەستهێنانی ئامانجی سیاسیی، لە سیستەمی سەرمایەداریی وڵاتانی ڕۆژئاواییدا، حیزب بۆ پڕوپاگەندەی هەڵبژاردن درورستدەکرێت. لە ناو نەتەوە ژێردەستەکانی وەکو کورددا، حیزب بۆ بەدەستهێنانی ماف و ئازادییە نەتەوەییەکان دروستدەکرێت.

لە هەموو جیهاندا کاتێک حیزب ئامانجەکانی خۆی بەدەستدەهێنێت، وەکو کۆتاییهاتنی هەڵبژاردن، یان گۆڕینی دەسەڵات، یان ڕزگارکردنی نەتەوە، قەبارە و چالاکییەکانی سنووردراردەکرێت، هەتا کاتی هەڵبژاردن، یان دروستبوونی کێشەیەک، دەچێتە خولی متبوونەوە. حکومەت بەرنامەکەی حیزب جێبەجێدەکات، بەڵام لای کورد حیزب گرێدراوی جێبەجێکردنی ئامانج نییە، حیزب دەزگایەکی پیرۆزە، دەبێت گەل و نیشتیمان و دەوڵەت خزمەتیبکات.

لە سەردەمی خەباتی پێشمەرگایەتییدا، حیزب ئەو ئامرازە بوو کە کاروباری سیاسیی و سەربازیی و ئابوریی و کۆمەڵایەتیی لەئەستۆدەگرت. کورد ماوەیەکی درێژ لەو بارودۆخەدا ژیاوە کە حیزب بەرپرسی هەموو بوارەکانی ژیان بووە. واتە حیزب بۆ کورد وەکو دەوڵەتی نەتەوەیی وا بووە. ئەمە وایکردووە خەڵکی کوردستان بە قووڵیی گیرۆدەی حیزب و حیزبایەتیی ببێت. حیزبیان زۆر خۆشبوێت و بەزەحمەت بەبێ حیزب بژین.

دوای ڕاپەڕیین و هەڵبژاردنی پەرلەمان و پێکهێنانی حکومەتی هەرێم، دامودەزگای دەوڵەتداریی (پەرلەمان، حکومەت، دادوەریی) لە هەرێمی کوردستاندا دەستیان بە کاری خۆیان کرد، بەڵام ئەوەی بینیمان ئەوە بوو کە حیزب دەستی لە دەسەڵاتی خۆی بۆ ئەو دەزگایانە بەرنەدا، ئەو دەزگایانەی خستە ژێر کاریگەریی و بڕیاری خۆیەوە. بەبێ ڕەزامەندیی حیزب، ئەو دامودەزگایانە نەیانتوانی دەست بە ئاودا بکەن. حیزب لەوە زیاتریش چوو، بوارەکانی ئابوریی و ڕاگەیاندن و کاروباری کۆمەڵایەتییشی کۆنترۆڵکرد. ئەمەیش وایکرد کە دەزگا دەوڵەتییەکانی هەرێمی کوردستان بێکاریگەر بن و پەراوێزبخرێن و گەشەنەکەن.

حیزب دەزگاکانی دەوڵەت بۆ بەهێزکردن و فراوانکردنی خۆی بەکاردەهێنێت. کاتێک حیزب پۆستێکی پەرلەمانیی، یان حکومیی بۆ پاڵێوراوێکی دیاریدەکات، مەرج بۆ ئەو پاڵێوراوە دادەنێت کە دەبێت پێگە دەوڵەتییەکەی بۆ دەستکەوتی مادیی حیزب و بۆ زۆرکردنی ئەندام و لایەنگیری حیزب بەکاربهێنێت، ئەگینا حیزب ئامادە نییە ئەو پۆستەی پێبدات.

حیزب حکومەت و پەرلەمان و دادگاکان بۆ هێرشکردنە سەر حیزبەکانی تر بەکاردەهێنێت. ئەو بەرپرسە حیزبییانەی پۆستی حکومیی وەردەگرن، هێندە بە

قووڵیی لەگەڵ حیزبایەتییدا ژیاون و هێندە دەمارگیریی حیزبییان بەهێزە، کە یادی شەڕ و ململانێ حیزبییەکان دێتەپێشەوە، لە پێش بەرپرسە حیزبییەکانی ترەوە، لە پۆستە حکومییەکانەوە پەلاماری حیزبە ڕکابەرەکەی دەدات. ڕۆژی ١٦/ ١٠/ ٢٠٢٠ لە ساڵیادی ١٦ی ئۆکتۆبەری ٢٠١٧ کەرکوکدا، مەسرور بەرزانیی سەرۆکی حکومەتی هەرێم هێرشیکردە سەر باڵێکی یەکێتیی و بە خائینی ناوبردن. ئەمە لە کاتێکدایە جێگری سەرۆکی حکومەتی هەرێم و ژمارەیەک وەزیری کابینەکەی لە بەرپرسەکانی یەکێتیی پێکهاتووە*٣١.

لە دوای ڕاپەڕینەوە وەکو درێژەدان بە شەڕ و ململانێی سەردەمی شاخ، حیزب ئەندام و دۆستەکانی بە دژایەتیی حیزبەکانی تری کوردستان پەروەردەدەکات. ئەندامەکانی بە دژایەتیی سیاسەتی دەوڵەتانی داگیرکەر و دوژمنانی ئازادیی پەروەردەناکات. بۆیە کە لەگەڵ ئەندامێکی حیزبیی دادەنیشیت و گفتوگۆدەکەیت، باسی کێشەی کورد و مافی گەلی کوردت بۆ ناکات، باسی ململانێی پارتیی و یەکێتییت بۆ دەکات. خۆشەویسترین بەرپرسی حیزب لای ئەندام و کادرەکانی ئەو کەسەیە کە بە توندیی دژایەتیی حیزبەکانی تری کوردستان دەکات و تەشیریاندەکات.

تایبەتمەندییەکی تری حیزبی هەرێمی کوردستان ئەوەیە، حیزب حیزبی بنەماڵەیە. هەر بنەماڵەیەکیش پەیوەندیی سیاسیی ناهاوسەنگی لەگەڵ یەکێک لە دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستاندا هەیە. ئەو دەوڵەتانە لە ڕێگەی ئەو بنەماڵانەوە دەستیان بەسەر حیزبدا گرتووە. حیزب بۆ بەرژەوەندیی خۆیان ئاراستەدەکەن. یەکێک لە کارەکانی ئەو دەوڵەتانە ئەوەیە دەمارگیریی حیزبیی بەهێزبکەن، وەکو مێردەزمەی دەزگا دەوڵەتییەکانی هەرێمی کوردستانی لێبکەن.

بۆیە دەتوانین بڵێین وەکو چۆن نەتەوەپەرستیی دەوڵەتی تورکیای گیرۆدەی هەزار دەرد کردووە، شیعەگەرایی توند ئێرانی لە جیهان دابڕیوە و دوچاری کێشەی گەورەی کردووە، دەمارگیریی حیزبییش هەرێمی کوردستانی ئیفلیجکردووە. حیزبایەتیی تەسک بووە بە زنجیری دەست و پێی کۆمەڵگە و حوکمڕانیی هەرێمی کوردستان، ڕێگەی گەشەکردنی لێگرتووە.

## ١٥- لاساییکردنەوە:

لە باشووری کوردستاندا ئاوەزمەندیی لاساییکردنەوە ڕێگەی داهێنانی سیاسیی گرتووە. حیزبەکانی باشووری کوردستان بۆ چارەسەری کێشەی کورد دروستبوون. لە کاتی خەباتدا داهێنان ناکەن، لاسایی سیاسەتە خراپەکانی خۆیان و دەسەڵاتدارە خراپەکانی ناوچەکە و جیهان دەکەنەوە و لاسایی شۆڕشی وڵاتە پێشکەوتووەکانی جیهان ناکەنەوە.

لە سەرەتای خەباتی چەکدارییدا جیابوونەوەی ساڵی ١٩٦٤ پارتیی ڕوویدا، باڵی مەکتەبی سیاسیی (جەلالیی) پاڵیان بە حکومەتی عێراقەوە دا. باڵی مەلامستەفایش (مەلایی) پاڵیان بە حکومەتی ئێرانەوە دا. لە کات و شوێنی جیاوازدا هەردوولا شکستیانهێنا. لەبریی ئەوەی بیر لە هۆکاری شکست بکەنەوە، ڕێگە لە دووبارەبوونەوەی شکست بگرن، هاتن لاسایی یەکترییان کردەوە. یەکێتیی (جەلالیی) وا بیریدەکردەوە هۆکاری شکستی ساڵی ١٩٧٠ بەهۆی ئەوەوە بووە پاڵی بە حکومەتی عێراقەوە داوە و لەگەڵ حکومەتی ئێران ڕێکنەکەتووە، بۆیە هەموو توانای خۆی کۆکردەوە هەتا پەیوەندییەکی باش لەگەڵ ئێراندا دروستبکات. ئەم هەوڵەی لە ساڵی ١٩٨٦ سەریگرت و هەتا ئێستا بەردەوامە، ئەوپەڕی هەوڵدەدات پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئێران پێش پارتیی بخاتەوە.

یەکێک لە کارە خراپەکانی خەباتی چەکداریی شۆڕشی ئەیلول، ساڵی ١٩٦٧ چاڵەنەوتەکانی کەرکوکی بۆردوومانکرد. بە لای یەکێتییەوە ئەوە کارێکی سەرکەوتووی شۆڕشی ئەیلول بوو، بۆیە دەبێت شۆڕشی نوێ بە زیاترەوە ئەو ئەزموونە دووبارەبکاتەوە هەتا خەڵک بیری بۆردوومانەکەی شۆڕشی ئەیلولی نەمێنێت. ساڵی ١٩٨٦ بە چاوساغیی هێزی پێشمەرگەی یەکێتیی، سوپای پاسدارانی ئێران بیرە نەوتەکانی کەرکوکیان بۆردوومانکرد و گڕیان تێبەردا.

هەرچی پارتییە وای بۆدەچێت ئاشبەتاڵی ساڵی ١٩٧٥ بەهۆی دۆستایەتیی ئێرانەوە بووە، ئەگەر پارتیی هێندە دۆستایەتیی ئێرانی نەکردایە و پەیوەندیی لەگەڵ عێراقدا باشبایە، دوچاری ئەو شکستە نەدەهات. بۆیە ئەوپەڕی هەوڵیداوە پەیوەندییەکانی لەگەڵ عێراق باشبکات. هەوڵەکانی پارتیی بۆ دەستەبەرکردنی پشتیوانیی حکومەتی عێراق لە ٣١ی ئابی ١٩٩٦دا بە لوتکە گەیشت.

یەکێتیی زۆر داخی ٣١ی ئابی لە دڵدا بوو، لەبەرئەوەی بەو هاوکارییەی سوپای عێراق بۆ پارتیی، یەکێتیی هەولێری لەکیسچوو، بۆیە کە بینی وا خەریکە دەسەڵاتی پارتیی لە کەرکوک پەرەدەسێنێت، لە ١٦ی ئۆکتۆبەری ٢٠١٧دا یەکێتیی هاوکاریی هێزە چەکدارەکانی سوپای عێراقی کرد، دەستبەسەر کەرکوکدا بگرێتەوە هەتا پارتیی لە کەرکوک دەربکات. لە دوای ڕاپەڕینەوە پەیوەندیی ناهاوسەنگی پارتیی و تورکیا هەتا دێت پەرەدەسێنێت، بەگوێرەی بارودۆخی جیوپۆلەتیکیی تورکیا و دووریی تورکیا لە حوکمڕانیی یەکێتییەوە، یەکێتیی بۆی ناکرێت بە باشیی لە تورکیا نزیکببێتەوە و ئەوەی پارتیی بۆ تورکیای دەکات یەکێتییش بۆی بکات.

دوای ڕاپەڕیین مام جەلال سەردانی تورکیای کرد. مافی تورکیای لە باکووری عێراق بەگوێرەی بڕیاری کۆمەڵەی نەتەوەکانی ساڵی ١٩٢٥ بە گوێی دەسەڵاتدارانی تورکیادا دا. بە تورکەکانی گوت هاوکارییتاندەکەین بۆ ئەوەی مافەکانی خۆتان لە عێراق بەدەستبهێنن. ساڵی ١٩٩٦ کاتێک یەکێتیی دەسەڵاتداری هەولێر بوو، مۆڵەتی فەرمیی بە بەرەی تورکمانیی دا بۆ ئەوەی پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ تورکیا پێشبخات.

یەکێتیی زۆر هەوڵیداوە لە نیوان تورکیا و حوکمڕانیی خۆیدا لە ناوچەی برادۆست خاڵێکی گومرگیی بکاتەوە، هەتا لە پەیوەندییکردن بە تورکیاوە پیش پارتیی بکەوێتەوە، بەڵام لەوەیشدا سەرکەوتوو نەبوو. بۆیە یەکێک لە گرێکانی سەر دڵی یەکێتیی ئەوەیە کە هەتا ئێستا نەیتوانیوە وەکو پارتیی خزمەتی تورکیا بکات و لاسایی پارتی بکاتەوە.

لە ناو مێژووی نوێی گەلی کورددا، مەلا مستەفا بەرزانیی و مام جەلال تاڵەبانیی سەرکەوتنی سیاسییان بەدەستهێناوە، بەڵام ئەو سەرکەوتنەیان ڕادەسەتی خەڵکی کوردستان نەکرد. بەرانبەر بەو سەرکەوتنانە بنەماڵەکەی خۆیان بە حوکمڕانیی کوردستان دانا. لە شێوازی حوکمڕانییدا لاسایی حوکمڕانیی وڵاتە عەربەکان دەکەنەوە، لاسایی تورکیا و ئێران و وڵاتانی تر ناکەنەوە. کەمال ئەتاتورک کە تورکیای نوێی دامەزراندەوە، دوای خۆی حوکمڕانیی تورکیای ڕادەستی بنەماڵەکەی نەکرد، حوکمڕانیی تورکیای ڕادەستی هەموو خەڵکی تورکیا کرد، بۆیە خەڵکی تورکیا کەمال ئەتاتورک بە باوکی خۆیان دەزانن و تورکیایش بە وڵاتی خۆیان دەزانن.

ئیمام خومەینیی کە ڕابەرایەتیی شۆڕشی ساڵی ١٩٧٩ ئێرانی کرد و کۆتایی بە حوکمی شاهنشایی ئێران هێنا، دوای خۆی حوکمڕانیی ئێرانی ڕادەستی بنەماڵەکەی

نەکرد، ئێرانی ڕادەستی هەموو ئێرانییەکان کرد. ئێرانیەکان ئیمام خۆمەینیی بە باوکی خۆیان دەزانن، ئیرانیش بە وڵاتی خۆیان دەزانن و داکۆکیی لێدەکەن و پێشیدەخەن.

مستەفا بەرزانیی لاسایی سەرکردە عەرەبەکانی کردەوە، حوکمڕانیی هەرێمی کوردستانی ڕادەستی بنەماڵەکەی کرد. پاش ماوەیەک مام جەلال لاسایی بەرزانیی کردەوە، حوکمڕانیی یەکێتیی لە زۆنی سەوز ڕادەستی بنەماڵەی تاڵەبانیی کرد. حیزبەکانی تری هەرێم، لاسایی پارتیی و یەکێتیی دەکەنەوە، بەرەو حیزبی بنەماڵە هەنگاودەنێن. خەڵکی کوردستان مەلا مستەفا و مام جەلال بە باوک و برای خۆیان نازانن، تەنها باوکی کوڕ و نەوەکانی خۆیانن، کوردستانیش بە وڵاتی خۆیان نازانن، بە وڵاتی بنەماڵەی بەرزانیی و تاڵەبانیی و بنەماڵەکانی تری دەزانن، بۆیە داکۆکیی لێناکەن و پێشیناخەن.

لاساییکردنەوەی حیزبە دەسەڵاتدارەکان، کۆمەڵی کوردستانیشی گرتووەتەوە، ئەگەر ڕەخنە لە کار و هەڵوێستێکی نەشیاوی حیزبێک بگریت، بەوە وەڵامدەدەنەوە کە فڵان حیزبیش کاری وایکردووە، بۆ ئەو بیکات و بۆ من نەیکەم. دیاردەی جاشایەتیی لە هەرێمی کورستان زۆر بڵاونەبوو، بەڵام کاتێک خەڵک بینی بە ناوی کوردپەروەرییەوە حیزبەکان شانبەشانی سوپای عێراق و سوپای ئێران شەڕی پێشمەرگە دەکەن، سەرۆک_خێڵەکانیش بەبێ سڵکردنەوە لاسایی حیزبەکانیان کردەوە و چەکیان بۆ حکومەتی عێراق هەڵدەگرت و شەڕی پێشمەرگەیان دەکرد. ئەم لاساییکردنەوەیە وایکرد دوای ڕاپەڕیین خێڵایەتیی بەهێز ببێت، حوکمی یاسا پێشنەکەوێت و دیموکراسیی باڵادەست نەبێت. دوای ڕاپەڕیین بە لاساییکردنەوەی پارتیی، خێڵ و بنەماڵە سەرکردایەتیی هەموو حیزبە سیاسییەکانی بەدەستەوەگرت. ئیتر نەک هەر خێڵایەتیی لاواز نەبوو، خێڵگەرایی پەرەیسەندەوە. ئەو کەسانەیشی کە سەر بە خێڵ نەبوون، بە دوای ناسنامەی خێڵایەتیی خۆیاندا دەگەڕێن. لە کاتی ڕاپەڕییندا دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام، کۆمەڵێک بەڵگەی هەواڵگریی دەست هێزی پێشمەرگە و خەڵکی کوردستان کەوتن، باسی ئەو کەسانەی دەکرد کە سیخوڕییان بۆ حکومەتی عێراق کردووە. کاتێک لێکۆڵینەوە لەگەڵ هەندێک لەو فایلچییانە کرا و پرسیاریان لێکرا بۆ ئەو کارەتان کردووە، زۆرینەی گوتبوویان بۆچی بۆ بەرپرسەکانمان ڕەوایە پەیوەندییان هەبێت، بۆچی بۆ ئێمە ناڕەوایە. لێکۆڵینەوەکان هیچ ئەنجامێکیان نەبوو، لەبەرئەوەی ماسیی گەورەی پێوەدەبوو.

**سەرچاوەکان :**

١- د. فایەق گوڵپیی، کە لێرەوە سەیری ژیای خۆم دەکەم، تارق جاف بۆ ماوەی چەند مانگێک پێشمەرگە بوو، دوایی وازیهێنا، پێش ئەوەی ریزەکانی پێشمەرگە بەجێبهێڵێت و بگەڕێتەوە عێراق نامەیەکی بۆ ناردبووم تیایدا باس لەو بێرێکخستنییەی ناو شۆڕش و کاری پزیشکان دەکات.

٢- عەبدوڵلا ئوج ئالان، لە دەوڵەتی ڕاهبی سۆمەرەوە بەرەو شارستانیی دیموکراتیی.

٣- عەبدوڵلا ئۆج ئالان، بەرگرییکردن لە گەلێک.

٤- عێراق و گەڕان بە شوێن ناسنامەی نیشتیمانییدا، لیورا کولینتز، وەرگێڕانی دڵشاد میران.

٥- عەلی وەردی، کورتە باسێکی مێژووی عێراقی هاوچەرخ.

٦- کە لێرەوە سەیری ژیانی خۆم دەکەم.

٧- دیوانی بێکەس.

٨- ڕۆژنامەی ئاسۆ.

٩- لە دەوڵەتی ڕاهیبی سۆمەرەوە بەرەو شارستانیەتی دیموکراتیی، عەبدوڵلا ئوج ئالان.

١٠- کارڵ پۆپەر، کۆمەڵگەی کراوە و دوژمنەکانی.

١١- ڕۆژنامەی هاوڵاتیی.

١٢- حسنێن هەیکەل، مدافع ئایەتوڵلا.

١٣- تارق عەزیز، پیاو و دۆز، چاوپێکەوتنی حەمیدە نەعنەع.

١٤- کە لێرەوە سەیری ژیانی خۆم دەکەم.

١٥- جەمیل بایک، شۆڕشێک لە ئاگر، چاوپێکەوتنی حەسەن جودی.

١٦- پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان، لە لایەن دکتور نوری تاڵەبانیی ئامادەکرابوو، ناردبووی بۆ لێژنەی یاسایی پەرلەمان.

١٧- برگەی ١٢٠ دەستووری عێراق، دەبێت هەرێمی کوردستان دەستووری هەبێت.

١٨- کۆنگرەی سێیەمی یەکێتیی لە سلێمانیی، ساڵی ٢٠١٠ بەسترا.

١٩- ئەسکەندەری مەزن، ماری رنولیت، وەرگێڕانی عومەر ڕەسوڵ خدر.

٢٠- غەزەلنوس و باخەکانی خەیاڵ، بەختیار عەلی.

٢١- بەرگرییکردن لە گەلێک، عەبدوڵلا ئوج ئالان.

٢٢- دکتور فایەق گوڵپیی، کە لێرەوە سەیری ژیانی خۆم دەکەم، بەشی دووەم.

٢٣- کۆنگرەی ٨ی (پ. ک. ک).

٢٤- مۆسادی ئیسرائیلیی لە ڕێگەی هەڵخەڵەتاندنەوە، نوسینی ڤکتۆر ئۆستروفسکی، وەرگێڕانی هێرش هەورامیی.

٢٥- زایری کەریمە ڕەش، یەکێک لە بازرگانەکانی شاری سلێمانییە.

٢٦- ڕادیۆی (ب ب س) عەرەبیی.

٢٧- ڕێککەوتنی نێوان (ی. ن. ک) و (پ. د. ک) بە سەرپەرشتیی سەرۆککۆماری ئێران ئاغای ڕەفسنجانی ١٩٨٦.

٢٨- جەنگیز چاندار شەفەند و فەری میزۆپۆتامیا، وەرگێڕانی زریان ڕۆژهەڵاتیی، لە بڵاوکراوەکانی کوردستانی نوێ.

٢٩- ڕێککەوتنی پارتیی و یەکێتیی لە واشنتۆن، بە سەرپەرشتیی مادلین ئۆڵبرایت وەزیری دەرەوەی ئەمریکا ١٩٩٨.

٣٠ - کەناڵی تەلەفزیۆنی جزیرە.

٣١- لە ١٦ی ئۆکتۆبەر ٢٠١٧ باڵێکی ناو یەکێتیی بەبێ ئاگاداریی باڵەکەی تر هاوکاریی هێزە چەکدارەکانی عێراقیان کرد، بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە کەرکوک، پارتیی دەڵێت من ئاگادار نیم.

# ٦
# شۆڕشی ئەیلول چی بۆ بەجێهێشتین؟

## ١– ناکۆکیی لە ڕیزەکانی شۆڕشدا:

هەر لە سەرەتای شۆڕشەوە ئاشکرابوو، باڵی سەربازیی جوڵانەوەکە بەسەر باڵی سیاسییدا زاڵبوو، هەر گوندێک دەگەڕایت بنکەی هێزی پێشمەرگە و مەفرەزەی گەڕۆکی پێشمەرگەی لێبوو، بەڵام لە هیچ گوندێک ڕێکخراو و ناوچەی حیزب بارەگای نەبوو. ئەگەر لە هەندێک شوێن بنکەی ڕێکخراوەیی حیزبیش هەبایە، ئەو بنکەیە چالاک نەبوو، ئەو بنکەیە نە خەڵکی هۆشیاردەکردەوە، نە پێشمەرگەی پەروەردەدەکرد، کاری سەرەکیی کادرە حیزبییەکان کۆکردنەوەی ئابوونە و پیتاک بوو.

هەر لە سەرەتاوە ئاشکرابوو ڕێز و پێگەی پێشمەرگە سەربازییەکان لە ڕێز و پێگەی کادرە حیزبییەکانی ناوچە ڕزگارکراوەکانی کوردستان زۆرترە. لە ناو شۆڕشدا پێگە و دەسەڵاتی ئاغا و سەرۆک_خێڵەکان لە پێگەی ڕۆشنبیران و جوتیارانی ناو شۆڕش بەهێزترە. دەسەڵاتی ناو هێزی پێشمەرگە و دەسەڵاتی ناو حیزب و دەسەڵاتی کۆمەڵایەتیی، بە دەستی ئەو سەرۆک_خێڵانەوە بوو کە لە ناو شۆڕشدا بەرپرسیارێتییان هەبوو.

ئەو کەسانەی کە پەیوەندییان بە شۆڕشەوە دەکرد و چەکیان هەڵدەگرت، خولی پەروەردەی سیاسییان بۆ نەدەکرایەوە، هەر یەکە بە ئاوەزمەندیی تایبەتی خۆیەوە پەیوەندیی بە شۆڕشەوە دەکرد. بەو ئاوەزمەندییەوە، کە لە ناو ماڵ و بنەماڵە و ناوچە و پێگەی چینایەتیی خۆیەوە وەریگرتبوو، لە ناو شۆڕش و لە ناو ڕێکخراوەکانی پارتییدا هەڵسوکەوتیدەکرد.

بەهۆی نەبوونی بەرنامەیەکی سیاسیی یەکگرتووی شۆڕشەوە، ململانێ لە نێوان جوتیار و بۆرجوازی بچووکی شار و دەرەبەگدا دەستیپێدەکرد، لەبەرئەوەی بنەماڵەی مەلا مستەفای بارزانیی کە ڕابەرایەتیی پارتیی و شۆڕشیی ئەیلولیان دەکرد، دەرەبەگی کوردستان بوون، ململانێکە بە سەرکەوتنی دەرەبەگ کۆتاییدەهات.

بەو شێوەیە شۆڕشی ئەیلول دیاردەیەکی نامۆ و ناکۆکی لەگەڵ شۆڕشەکانی تری جیهاندا دروستکرد. لە شۆڕشی ڕزگارییخوازی گەلاندا چینی بۆرجوازیی و ڕۆشنبیران ڕابەرایەتیی شۆڕش دەکەن، بەڵام لە شۆڕشی ئەیلولدا، دەرەبەگ جڵەوی شۆڕشی بەدەستەوەگرت. هزری خێڵایەتیی و دەرەبەگایەتیی وەکو ناسنامەی ئایدۆلۆژیی و سیاسیی و کۆمەڵایەتیی شۆڕشی ئەیلولی دەناسرا.

لە شۆڕشی ڕزگاریی نیشتیمانیی و ئازادیی گەلاندا، چینی سەرمایەدار، یان پێکهاتەیەک بە هزری چینی سەرمایەدارەوە ڕابەرایەتیی شۆڕشی ڕزگاریی نیشتیمانیی دەکات، بەڵام لە شۆڕشی گەلی کورددا لە باشووری کوردستان، هەر لە سەرەتاوە چینی بورجوا شکستیهێنا، چینی دەرەبەگ ڕابەرایەتیی شۆڕشی بەدەستەوەگرت و لە درێژەی تێکۆشانی شۆڕشیشدا، ئەو چینە خێڵەکییە/ دەرەبەگە ناسنامەی کۆمەڵایەتیی و ئایدۆلۆژیی خۆی نەگۆڕی. هاوکێشەیەکی نامۆ و ناهاوسەنگی لە بزاڤی ڕزگارییخوازیی و ئازادییخوازیی گەلی کورد دروستکرد.

لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلولدا، لەبەرئەوەی هزری پێکهاتەی خێڵایەتیی و چینی دەرەبەگی کورد، باڵی بەسەر بیرکردنەوە و هۆشیاریی گەلی کورددا کێشا، کۆمەڵگەی کوردستان بۆ پاشەوە گەڕایەوە، ڕێگەی گەشەکردنی ئابووریی و ڕۆشنبیریی و سیاسیی لە گەلی کورد گیرا.

گەلی کورد مافەکانی خۆی لە پێشکەوتنی ڕۆشنبیریی و کۆمەڵایەتیی و ئابووریی کوردستاندا دەبینییەوە. دەسەڵاتدارانی شۆڕش و حیزبیش ئایندەی خۆیان لە

ڕاگرتن و گێڕانەدواوەی پرۆسەی پێشکەوتنی ڕۆشنبیریی و کۆمەڵایەتیی و ئابوریی کوردستاندا دەبینییەوە، بۆیە لە بەردەوامبوونی شۆڕشدا، ململانێ لە نێوان گەل و لە نێوان سەرکردەکانی شۆڕشدا دروستدەبوو.

مەسعود بەرزانیی سەرۆکی دووەمی پارتیی دیموکراتی کوردستان دەڵێت: "ئەم شۆڕشە دایکی هەموو شۆڕشەکانی کوردە، چونکە نەخشەی ڕێڕەوێکی مێژوویی نوێی بۆ گەلی کورد کێشا *١.

بە لای منەوە بەشی یەکەمی هەڵسەنگاندنی مەسعود بەرزانیی لەسەر شۆڕشی ئەیلول کە دەڵێت: "ئەم شۆڕشە دایکی هەموو شۆڕشەکانی کوردە"، ڕاستە. لەبەرئەوەی دوای دروستبوونی دەوڵەتی عێراق ئەوە یەکەم شۆڕشی کورد بوو هەموو باشووری کوردستانی کۆکردبوویەوە. ساڵی ١٩٧٤ نزیکەی ١٠٠ هەزار پێشمەرگەی هەبوو، چواردە ساڵ خەباتیکرد و دۆزی کوردی بە گەلان و دەسەڵاتدارانی عێراق و ناوچەکە و جیهان ناساند، بەڵام بەشی دووەمی هەڵسەنگاندنی مەسعود بەرزانیی کە دەڵێت: "ڕێڕەوێکی مێژوویی نوێی بۆ گەلی کورد کێشا"، ڕاست نییە. لەبەرئەوەی لەو شۆڕشەدا نەخشەی ڕێڕەوێکی مێژوویی نوێ نەکێشرا. لەو شۆڕشەدا نەخشەی ڕاگرتن و بۆ دواوە و گێڕانەوەی مێژووی کورد کێشرا. ڕێگەنەدرا ڕۆشنبیران و بورجوازی بچووک و زەحمەتکێشان جڵەوی شۆڕش بەدەستەوەبگرن، وەکو لە شۆڕشی وڵاتانی تردا باوبووە. جڵەوی شۆڕش کەوتە دەست سەرۆک_خێڵ و دەرەبەگی کوردستان. ناسنامەی چینایەتیی ئەوانیش لەگەڵ چەمکی نوێ و مێژووی نوێدا ناکۆکە. بەرژەوەندیی و هزری خێڵەکیی دەرەبەگی کوردستان وا دەخوزاێت کە کۆمەڵگەی کوردستان و شۆڕشی کوردستان لە ئاستی کۆمەڵایەتیی و ئابوریی و هزریی و کەلتورییەوە پێشنەکەوێت و گەلی کورد خاوەنی نەخشەی ڕێڕەوێکی نوێی مێژوویی نەبێت.

تێکۆشانی نەتەوەیی گەلی کورد لە باشووری کوردستاندا بە ئایدۆلۆژیایەکی نەتەوەیی و چینایەتیی پڕنەکرایەوە، وەکو لە شۆڕشی گەلانی تری جیهاندا کراوە. چوارچێوەی خەباتی نەتەوەیی گەلی کورد بە چەمکە کۆنەکانی کۆمەڵگەی کلاسیکیی خێڵەکیی و دەرەبەگایەتیی کوردستان پڕکرایەوە. ئەندێشەی سیاسیی خەڵکی کوردستان ڕزگاریی نیشتیمانیی و ئازادیی گەلی کورد بوو. ئەو ئامانجانە کاتێک

دەهاتنەدی، کە لەگەڵ جولانەوە سیاسییەکەدا کۆمەڵگەی کوردستان گۆڕان و گەشەکردنی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی بە خۆیەوە ببینێت و لە ئەرکەکانی قۆناغ تێبگات، بەڵام سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول دەرفەتی گەشەکردنی کۆمەڵگەی کوردستانی نەدا، لەبەرئەوە لە شۆڕشی ئەیلولدا هاوکێشەیەکی ناکۆک و ناهاوسەنگ لە نێوان ئامانجە نەتەوەییەکانی خەڵکی کوردستان و ناسنامە کۆمەڵایەتیی و هزرییەکانی بەرپرسانی شۆڕشدا دروستبوو.

ئەو ناکۆکییە هۆکاری سەرەکیی دوبەرەکیی سیاسیی و دواکەوتنی کۆمەڵایەتیی و ئابوریی کوردستان و شکستی شۆڕش بوو. خانەدانەکانی خێڵی بەرزان کە سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلولیان دەکرد، لە سێبەری پێگە و دەسەڵاتی شۆڕشدا کۆنترۆڵی زۆربەی ناوچەکانی تری کوردستانیان کرد و دەسەڵاتی خۆیان لە سنووری خێڵی بەرزاندا دەربازکرد. دەسەڵاتی خێڵی بەرزان لە قۆناغی خێڵایەتییەوە گواستیەوە بۆ قۆناغی دەرەبەگایەتیی و ئامانجە نەتەوەییەکان فەرامۆشکران. ئامانجی بنەڕەتیی خانەدانەکانی خێڵی بەرزان لە شۆڕشی ئەیلولدا ئەوە بوو، لە ڕێگەی دەسەڵاتی سیاسیی و هێزی پێشمەرگەوە، خێڵ و پێکهاتەکانی تری کوردستان لە چوارچێوەی ئەو فۆڕمە نوێیەی دەرەبەگایەتیی بەرزاندا بتوێننەوە.

ئەگەر بەرزانییەکان ببوونایە بە خاوەنی ئایدۆلۆژیایەکی نەتەوەیی، دەیانتوانی باز بەسەر گەشەکردنی قۆناغی دەرەبەگایەتییدا بدەن و یەکسەر بچنە ناو هزری قۆناغی سەرمایەداریی و ناسنەمەی نەتەوەیی وەربگرن و لەوێوە دەست بۆ چارەسەری دۆزی کورد ببەن، بەڵام لەبەرئەوەی نە بەرزانییەکان بۆ خۆیان خاوەنی ئەو داهێنانە نوێیە بوون، نە ڕۆشنبیر و بۆرجوای بچووکی کورد توانی کاریگەریی ئایدۆلۆژیی لەسەر بەرزانییەکان هەبێت، ئەو گەشەکردنە خێرایە دروستنەبوو.

## ٢- سیاسەتی جیاواز:

ئەو پێکهاتە کۆمەڵایەتییانەی بەشداریی شۆڕشی ئەیلولیان دەکرد، یان ئەو هێزانەی لە پشتی شۆڕشەکەوە بوون، هەر یەکە و بەرنامەیەکی هەبوو، بەگوێرەی بەرنامەی خۆی دروشمی دەدا و خەباتیدەکرد. کاتێک پێشمەرگەکانی شۆڕشی ئەیلول نامەیان دەنوسی، دروشمی نامەکەیان (کوردستان، یان نەمان) بوو. ئەمەیش بەو

واتایە دێت کە پێشمەرگە وا تێگەیشتبوو، شۆڕش لە پێناو ڕزگاریی کوردستان و ئازادیی تاکی کورددا دەستپێکردووە، بۆیە پێشمەرگە بە هەستی بەخشینی گیانی خۆی لەپێناو ئازادیی کورد و کوردستاندا خەباتیدەکرد.

هەرچی سەرۆک_خێڵ و دەرەبەگی کورد بوو، لە دژی پرۆسەی چاکسازیی کشتوکاڵیی حکومەتەکەی قاسم چەکی پێشمەرگایەتیی لەشاندەکرد. پۆستە گرنگەکانی هێزی پێشمەرگەیان قۆرخدەکرد، بۆ ئەوەی بەرنامەی چاکسازیی کشتووکاڵیی حکومەتەکەی قاسم هەڵبوەشێننەوە و زەوی و زارەکانیان لە ژێردەستی خۆیان بمێنێتەوە.

ئەم پێکهاتەیە بۆ بەرژەوەندیی ئابوریی خۆی چەکی پێشمەرگایەتیی لەشانکردبوو، لە کاتی خەباتی پێشمەرگایەتییشدا ئامانجی سەرەکیی دەسکەوتی مادیی بوو، کاری بۆ دەوڵەندبوون و پێکەوەنانی سەرمایە دەکرد. لە هەر شوێنێک پارەی زۆری دەستبکەوتایە لەگەڵ ئەو لایەنەدا دەبوو. هەندێک لەم پێکهاتەیە پەیوەندیی نهێنییان لەگەڵ دامودەزگا هەواڵگرییەکانی عێراق و وڵاتانی تری ناوچەکەدا دروستدەکرد. پەیوەندییەکە لەپێناو قازانجی مادییدا بوو. ئەم پێکهاتەیە ئەگەر بیدیایە بەرژەوەندییە مادییەکانی لە ناو شۆڕشی ئەیلوولدا بۆ ناپارێزرێت، بەبێ سێ و دوو ڕیزەکانی هێزی پێشمەرگەی بەجێدەهێشت، لە سەنگەری پێشمەرگایەتییەوە بازی بۆ سەنگەری جاشایەتیی دەدا.

هەرچی بەرپرسە سیاسیی و ڕۆشنبیرەکانی پارتیی دیموکراتی کوردستان بوون، بڕوایان بە خۆیان و بە هێزی گەلەکەیان نەبوو. سەرەتا لەژێر کاریگەریی پێکهاتەی خێڵەکیی کۆمەڵگەی کوردستاندا بوون. ماوەیەک لەژێر کاریگەریی ساواکی ئێراندا بوون، بە نهێنیی پەیوەندییان بە حکومەتی ئێرانەوە دەکرد. بە نهێنیی نوێنەریان سەردانی تارانی دەکرد. چاویان بە بەرپرسانی ئێران دەکەوت، بۆ دژایەتییکردن و لاوازکردن و ڕوخاندنی حکومەتی قاسم لە عێراقدا، هاوکارییان لە ئێران وەردەگرت. کاتێک بینییان ئێران بەرژەوەندییەکانیان ناپارێزێت، پشتیان لە ئێران کرد. ساڵی ١٩٦٦ پەیوەندییان بە حکومەتی عێراقەوە کردەوە، دژی باڵی دەرەبەگی شۆڕش، چەکیان هەڵگرت و خولی یەکەمی شەڕی براکوژییان لە باشووری کوردستان دەستپێکرد.

مەلا مستەفای بەرزانییش کە لە یەک کاتدا سەرۆکی پارتیی و ڕابەری شۆڕشی ئەیلول و دەمڕاستی خێڵی بەرزان بوو، بە قووڵیی لە ناو دوژمنایەتیی خێڵەکەیان و خێڵەکانی تری باشووری کوردستاندا دەژیا. لە دەرفەتێک دەگەڕا تۆڵە لە دوژمنەکانی بکاتەوە، لە ڕێگەی شۆڕشی کورد و هەستی نەتەوەیی گەلی کوردستانەوە، خێڵە ناحەز و دوژمنەکانی خۆی ببەزێنێت و بیانخەنە ژێر ڕکێفی بەرزانییەکانەوە. هەندێک لە خێڵەکان خۆیان ڕادەستی بارزانییەکان دەکرد، هەندێکیشیان دژی ئەو سیاسەتەی بەرزانیی پەرچەکردارییان پیشاندەدا و لە حکومەتی عێراق نزیکدەبوونەوە و چەکیان بۆ حکومەت هەڵدەگرت و دژایەتیی شۆڕشی ئەیلولیان دەکرد.

بەرژەوەندییەکانی ئێران و هاوپەیمانەکانی لە هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلولدا، بۆ لاوزاکردن و ڕوخاندنی حکومەتی عێراقی ئەو سەردەمە بوو. ستراتیژی ئێران لە شۆڕشی ئەیلولدا ڕزگاریی و ئازادیی کورد و کوردستان نەبوو، دەستکەوتی مادیی ڕاستەوخۆیش نەبوو، ستراتیژی ئێران لە شۆڕشی ئەیلولدا، تێکدانی پەیوەندیی نێوان گەلی کورد و گەلی عەرەب بوو، تێکدانی پەیوەندیی نێوان پارتیی و حکومەتی عەبدولکەریم قاسم بوو. ستراتیژی ئێران لە شۆڕشی ئەیلولدا لاوازکردن و ڕوخاندنی حکومەتی قاسم و پاشەکشەپێکردنی شۆڕشی ئازادیخوازی گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بوو.

پێش دەستپێکردنی شۆڕشی ئەیلول، مەلا مستەفای بارزانیی سەرۆکی پارتیی سەردانێکی مۆسکۆ دەکات، داوای هاوکاریی سەربازیی و مادیی لە حکومەتی سۆڤیت دەکات. یەکێتیی سۆڤیەت بە زۆرێک لە داواکارییەکانی مەلا مستەفا ڕازیدەبێت. سەفیری یەکێتیی سۆڤیەت لە عێراق کرابووە نوێنەری یەکێتیی سۆڤیەت بۆ پەیوەندییکردن بە مەلا مستەفاوە٤. ئەم هەڵوێستەی یەکێتیی سۆڤیەتی جاران پیشانیدەدات کە یەکێتیی سۆڤیەتیش بەرنامەیەک و ستراتیژێکی تایبەتیی لە شۆڕشی ئەیلولدا هەبووە، بەڵام ئەو ستراتیژە بەردەوام و ڕۆشن نەبووە.

دوای بەردەامبوونی شۆڕشی ئەیلوول، هەر یەک لە ئیسرائیل و ئەمریکا پەیوەندیی لەگەڵ سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلوولدا دروستدەکەن، بۆ بەرژەوەندیی خۆیان سود لە شۆڕش وەردەگرن.

بەم شێوەیە دەبینین پێشمەرگە، دەرەبەگی کورد، خێڵی بەرزان، سیاسییەکانی باشوور، ئێران، لە سەرەتا یەکێتیی سۆڤیەت و دواتر ئەمریکا و ئیسرائیل، لەژێر

سێبەری ئەندێشەی سیاسیی جیاواز و ستراتیژی ناکۆکدا، شۆڕشی ئەیلولیان هەڵدەگیرسێن و هەتا کارەساتی ١٩٧٥ بەڕێوەیدەبەن. ئەو ئەندێشە جیاواز و ناکۆکانە هەر یەک لە لایەکەوە کار و چالاکیی شۆڕشیان بۆ بەرژەوەندیی خۆیان ئاراستەدەکرد.

زۆربەی خەڵکی کوردستان و پێشمەرگەکانی کوردستان بەوپەڕی دڵسۆزییەوە لەپێناو ڕزگاریی کورد و کوردستاندا، لەژێر سێبەری دروشمی (کوردستان یان نەمان)دا، درێژەیان بە خەبات دەدا، یان شەهیددەبوون. سەرکردەکانی شۆڕش و بەرزانییەکانیش مەبەستی سەرەکییان لە شۆڕشدا وەرگرتنی دەسەڵاتی زیاتر و پاراستن و سەرخستنی خێڵەکەیان بوو. ئێران و ئەمریکا و ئیسرائیل و یەکێتیی سۆڤیەت بەرنامەی تایبەتیی خۆیان لەسەر عێراق هەبوو، دەیانویست لە ڕێگەی شۆڕشی ئەیلولەوە بەو بەرنامە و ئامانجانەی خۆیان بگەن.

شۆڕشی ئەیلول نەیتوانی ببێتە خاوەنی ستڕتیژێکی سیاسیی نەتەوەیی یەکگرتوو، ململانێ لە نێوان پێکهاتە بەشدارەکانی شۆڕشدا دروستبوو. بە پشتبەستن بە هاوکاریی ئێران و کەلتوری کلاسیکیی باشووری کوردستان، بەرزانییەکان لە ململانێ ناوخۆییەکانی شۆڕشی ئەیلولدا سەرکەوتنیان بەدەستهێنا. ڕۆشنبیر و پێشمەرگە و جوتیارانی کوردستان سەرکوتکران و خێڵی بەرزان سەرکەوتنی گەورەی بەسەر خێڵەکانی تری کوردستاندا بەدەستهێنا. قۆناغی خێڵایەتیی تەسکی تێپەڕاند.

## ٣- سەرکردایەتیی شۆڕش و عێراق و ئێران

دوای هەڵگیرسانی شەڕی نێوان سوپای عێراق و هێزی پێشمەرگەی کوردستان، هەر کاتێک سەرکردایەتیی شۆڕش دەیبینی مەترسیی لەسەر ناوچەی بەرزان و خێڵی بەرزان دروستدەبێت، بەبێ ئەوەی حکومەتی عێراق هیچ ماف و ئازادییەکی گەلی کورد گەرەنتیبکات، داوای ئاگربەستی دەکرد و گفتوگۆیان لەگەڵ حکومەتی عێراق دەستپێدەکرد. ئەمەیش پیشانیدەدات ستراتیژی ئەو شۆڕشە ڕزگاریی کورد و کوردستان نەبووە، ستراتیژی شۆڕش پاراستنی پێگەی سیاسیی و دەستڕۆیشتوویی بەرزانییەکان بووە.

لەبەر نەبوونی ستراتژێکی تۆکمەی شۆڕش، بۆ پاراستنی دەسەڵاتی بەرزانییەکان، شۆڕشی ئەیلول چەندیین گفتوگۆی بێبنەمای بە خۆیەوە دیوە. گفتوگۆ (مفاوەزاتە) یەک لە دوای یەکە بێئەنجامەکان بوونە دیاردەیەکی باوی شۆڕشی ئەیلول، هەتا ئێستایش لە هزری سیاسیی گەلی کوردستاندا ماونەتەوە و کاریانپێدەکرێت. یەکێک لە هۆکارەکانی لێکترازان و جیابوونەوەی باڵی مەکتەبی سیاسیی پارتیی ساڵی ١٩٦٤ ئەو ئاگربەست و گفتوگۆیانە بوو.

ڕژێمی شاهنشایی ئەو کاتەی ئێران و دۆستە ناوچەیی و جیهانییەکانی، چاویان بە کۆماری عێراقی سەردەمی عەبدولکەریم قاسم هەڵنەدەهات، ترسیان هەبوو پەتای شۆڕشگێڕیی ئێران و وڵاتەکانی تری ناوچەکە بگرێتەوە و ڕژێمە کۆنەکان بەلاوەبنرێن. ئێران هەوڵیدەدا بە سودوەرگرتن لە شیعە و کوردی عێراق، ڕژێمی کۆماری قاسم لاوازبکات و بیڕوخێنێت. بۆ ئەو مەبەستە عیسا پژمانی گەورە ئەفسەری ساواک وەکو ملحەقی سەربازیی باڵوێزخانەی ئێران لە عێراق دانرا. کاری سەرەکیی ئەوە بوو پەیوەندیی بە سەرکردایەتیی پارتیی و شۆڕشی ئەیلولەوە بکات، بۆ ئەوەی باوەڕ بە سەرکردەکانی کورد بهێنێت ئەگەر لە دژی عەبدولکەریم قاسم شۆڕشبکەن، ئێران هاوکاریی شۆڕش دەکات و حکومەتی قاسم دەڕوخێت و کورد مافەکانی خۆی وەردەگرێت. لە ڕێگەی شۆڕشی ئەیلولەوە ئێران توانی هاوکارێکی جدیی بێت بۆ ڕوخانی حکومەتی عەبدولکەریم قاسم.

بەرنامەی ئێران لەگەڵ بەرنامەکەی خەڵکی کوردستان ناکۆکبوو، هەندێک جار بەرنامەکانی ئێرانیش لەگەڵ بەرژەوەندیی بەرزانییەکانیش ناکۆکبوو. ئێران دژی هەر ئاگربەست و ڕێککەوتنێکی نێوان بەرپرسانی شۆڕشی ئەیلول و حکومەتی عێراقی دەوەستایەوە. کاریدەکرد هەتا پەیوەندیی نێوان شۆڕشی کورد و حکومەتە یەک لە دوای یەکەکانی عێراق تێکبدات. عێراق دان بە مافی گەلی کورددا نەنێت، هەتا کورد وەکو مەقاشێک دژی عێراق بەکاربهێنێت. بەهۆی کاریگەریی سیاسەتی ئێرانەوە لەسەر سۆڕشی ئەیلول، سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول لە نێوان سیاسەتی عێراق و ئێران و بەرژەوەندیی خۆیاندا ئەمسەر و ئەوسەریان دەکردو، بە هیچ ئەنجامێک نەدەگەیشت.

## ٤- ئایدۆلۆژیای شۆڕش

پێکهاتەکانی ناو شۆڕشی ئەیلول هەڵگری باوەڕ و ئایدۆلۆژیای جیاواز بوون، مەلامستەفا بەرزانیی پیاوێکی ئاینیی و خێڵەکیی بوو. دوازدە ساڵ لە یەکێتیی سۆڤیەت ژیابوو، خەڵک وایدەزانی یەکێتیی سۆڤیەت کاریگەریی لەسەر بەرزانیی هەبووە. هەندێک بە مەلای سوور ناویاندەهێنا، بەڵام وا دەرنەچوو. بەرزانیی دژی مارکسیزم و پێوانەکانی کۆمۆنیزم دەوەستایەوە، حەزی بە سیستەمی لیبراڵیی ڕۆژئاوایی دەکرد.

سەرکردەکانی تری پارتیی و شۆڕشی ئەیلول، لە دەرەبەگ و ڕۆشنبیری چەپ و کۆلکە مەلا پێکهاتبوون. ئیتر لە ناو ڕیزەکانی پارتیی و شۆڕشی ئەیلولدا ئەوەی باڵادەست بوو ئایدۆلۆژیایەکی تایبەت نەبوو، بۆچوون و ئایدۆلۆژیای جیاواز و ناکۆک باڵادەست بوون. شۆڕش ئایدۆلۆژیایەکی دیاریکراوی نەبوو، بۆیە ستراتیژی جێگیر و سیاسەتی تەبا میوانی شۆڕشی ئەیلول نەدەبوو. ناکۆکیی و جیابوونەوە باڵی بەسەر سیاسەتی ناوخۆی شۆڕشدا کێشا. بەهۆی ئایدۆلۆژیای جیاواز و ستراتیژی ناکۆکی شۆڕشی ئەیلولەوە، بەهۆی بێئایدۆلۆژیی سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلولەوە، ئاوەزمەندیی بێئایدۆلۆژیی باڵی بەسەر سیاسەتی شۆڕشدا کێشا. شۆڕشکردن بەبێ ئایدۆلۆژیا، خەباتکردن بەبێ ستراتژی یەکگرتوو، لە ئاوەزمەندیی سیاسیی کورددا جێگیربوو، هەتا ئەمڕۆیش لە کۆڵی سیاسەتی باشووری کوردستان نابێتەوە.

بەهۆی نەبوونی ئایدۆلۆژیایەکی دیاریکراوەوە، حیزب و شۆڕش نەیدەزانی لەسەر چی و بۆ کام ئامانج کادر و ئەندامان پەروەردەبکات، ئەمەیش وایکرد کە بەشدارییکردنی خەڵکی باشووری کوردستان لە خەباتی سیاسیی و پێشمەرگایەتییدا، ڕوکەش و بێپێوانە و ڕۆژانە بێت. ئەم دیاردەیە بوو بە پەتا و بە ناو شۆڕشگێڕان و ئەندامانی ڕێکخستەنەکانی باشووردا بڵاوبووەوە. وایلێهات کەس گوێ بە ئایدۆلۆژیای سیاسیی نەدات و خۆیان پەروەردەنەکەن و لە سیاسەتدا قووڵنەبنەوە.

هەرچی ڕۆشنبیرانی ناو شۆڕش بوون بەرانبەر بە ئایدۆلۆژیای شۆڕش بوون بە دوو بەشەوە: بەشێکیان لەگەڵ مەلا مستەفا بەرزانیی مانەوە و خۆیان ڕادەستی سیاسەتی بەرزانیی کرد. بەشەکەی تریان جیابوونەوە و وەکو باڵی مەکتەبی سیاسیی هەڵوێستی خۆیان دژی سیاسەتی بەرزانیی ڕاگەیاند. ئەم ئەرکە فەرامۆشکراوەی ئەندام و کادر و پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلول، وەکو کەلتوری سیاسیی باڵی بەسەر

باشووری کوردستاندا کێشاوە، بۆیە سیاسەتمەدار و تێکۆشەرانی باشوور، هەتا ئەمڕۆیش هێندە بە سۆز و هەڵچوونەوە سیاسەتدەکەن، نیو هێندە گرنگیی بە هزری سیاسیی نادەن، تێکۆشانێکی نیوەناچڵ و ناهاوسەنگ بەڕێوەدەبەن.

## ٥- جاشایەتیی:

لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلولدا، پێشمەرگە و خەڵکی کوردستان ناوی جاشیان بەسەر ئەو کۆمەڵە خەڵکەدا دابڕی کە چەکیان بۆ ڕژێمی عێراق هەڵدەگرت و شانبەشانی سوپای عێراق دژی هێزی پێشمەرگە شەڕیاندەکرد.

پێش دروستبوونی شۆڕشی ئەیلوول حکومەتی عێراق جاشی نەبوو، کاتێک خەباتی چەکداریی شۆڕشی ئەیلول دەستیپێکرد، بۆ بەگژداچوونەوەی شۆڕش، حکومەتی عێراق لە ناو خێڵەکانی باشووری کوردستاندا هێزی چەکداریی دروستکرد.

دیاردەی جاشایەتیی تەنها لە کاتی شۆڕشی گەلی کورددا سەریهەڵنەداوە، دیاردەیەکی جیهان یە و لەو وڵاتانەدا کە بزوتنەوەی ڕزگاریی نیشتیمانیی تێیدا بەرپادەبێت، ڕژێمە داگیرکەرەکان هەوڵدەدەن دەستە و تاقمی چەکداری ناڕێکخراو (میلیشیا)ی سەر بە نەتەوە ژێردەستەکە پێکبهێنن، بۆ ئەوەی لە ڕووبەڕووبوونەوەی شۆڕشدا هاوکاریی هێزە سەربازییەکەی بکەن.

ئامانجی دروستکردنی ئەو هێزە چەکدارە لە لایەن ڕژێمی عێراقەوە، سیاسیی و هەواڵگریی و سەربازیی بوو. لە ڕووی سیاسییەوە بە بەشدارییکردنی هەندێک لە خێڵەکانی کوردستان لە چەکهەڵگرتن بۆ ڕژێمی عێراق و بەشدارییکردنی ئەو چەکدارانە لە شەڕی دژی پێشمەرگەدا لەگەڵ سوپای عێراق، واتای ئەوەی بۆ ڕژێمی عێراق دەبەخشی کە زۆربەی پێکهاتەکانی گەلی کوردستان لەگەڵ حکومەتی ناوەندیین و دژ بە یاخییبوان چەکیان هەڵگرتووە و داکۆکیی لە دەوڵەتی عێراق دەکەن. لەبەرئەوەی بەردەوام ژمارەی جاش لە ژمارەی پێشمەرگە زۆرتر بووە، جاشایەتیی واتای ئەوە بووە ئەوانەی چەکیان دژی حکومەتی عێراق هەڵگرتووە کەمینەی خەڵکی کوردستانن، لە لایەن دوژمنانی عێراقەوە هاندراون، هیچ ئامانجێکی سیاسییان نییە و زۆرینەی خەڵکی کوردستان لەگەڵ حکومەتی ناوەندیین. لە ئاستی

دیبلۆماسیی و سیاسەتی نێودەوڵەتییشدا، دەوڵەتی عێراق زۆر سودی لە دیاردەی جاشایەتیی وەردەگرت. جاشایەتیی وەکو چەکێکی سیاسیی دژی داوا ڕەواکانی گەلی کورد بەکاردەهێنا.

هەر چالاکییەکی دیبلۆماسیی شۆڕشی کورد لە ئاستی نێونەتەوەیی و ناوچەییدا ڕووبەڕووی شکست دەبووەوە کاتێک دیبلۆماتەکانی عێراق زانیارییان بە دۆستەکانی کورد دەدا کە زۆرینەی خەڵکی کوردستان لەگەڵ حکومەتی عێراقدایە و دژی سیاسەتی یاخییبوان چەکیان هەڵگرتووە.

ئامانجێکی تری درێژخایەنی حکومەتی عێراق لە دروستکردنی جاشدا ئەوە بوو کە بەهۆی شەڕی نێوان جاش و پێشمەرگەوە، ناکۆکیی بەردەوام لە نێوان تاک و بنەماڵە و خێڵەکانی کورستاندا دروستبکات، بۆ ئەوەی کۆمەڵگەی کوردستان بەردەوام لە ناکۆکیی و ململانێدا بژیت، تەبا و سەقامگیر نەبێت. لەبریی ئاشتیی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگەی کوردستان دوچاری شەڕ و پێکدادانی خوێناویی ببێت، بۆ ئەوەی خەڵکی کوردستان هەردەم پێویستی بە هاوکاریی بێگانە بێت، هەتا داگیرکەران بە ئاسانیی دەستبخەنە ناو کاروباری ناوخۆی خەڵکەوە و بۆ بەرژەوەندیی خۆیان سودی لێوەربگرن.

لە ڕووی جێبەجێکردنی ستراتیژی نەتەوەپەرستیی ڕژێمەکانی عێراقەوە، حکومەتە یەک لە دوای یەکەکانی عێراق زۆر بە لایانەوە گرنگبوو زۆرترین کەس لە کورد بکوژرێت و ژمارەی دانیشتوانی کوردی عێراق لە چاو ژمارەی دانیشتوانی عەرەبی عێراقدا کەمببێتەوە، بۆ ئەوەی سیاسەتی بەعەرەبکردنی کوردستان سەرکەوتوو بێت. لەم حاڵەتەدا حکومەتی عێراق جیاوازیی لە نێوان کوردی پێشمەرگە و کوردی جاشدا نەدەکرد. گرنگ ئەوە بوو ژمارەی کورد لە عێراقدا کەمبێتەوە، بۆ ئەوەی عێراق وەکو وڵاتێکی عەرەبی پاکی لێبێت و نەتەوە و کەمە نەتەوەی تری وەکو کورد و تورکمان و ئاشوریی و کلدانیی تێدا نەمێنێت.

لەبەرئەوەی جاشەکان خەڵکی کوردستان بوون، بە ئاسانیی لە کوردستاندا هاتووچۆیاندەکرد، بە ئاسانیی پەیوەندییان لەگەڵ کەسوکار و ناسروای خۆیاندا پێکدەهێنا. بە کوردیی دەدوان و لە زمانی کوردیی تێدەگەیشتن. بە درێژایی شەڕ و ململانێی نێوان شۆڕش و حکومەتەکانی عێراق، جاشایەتیی سەرچاوەیەکی گرنگی

هەواڵ و زانیاریی ناو شۆڕش بوو، خزمەتی باشی دەزگا هەواڵگرییەکانی عێراقی دەکرد. لەبەرئەوەی جاشەکان شارەزای ڕێگەوبان و کەشوهەوای کوردستان بوون، هەندێکیشیان بۆ ماوەیەک پێشمەرگایەتییان کردبوو، بۆ شەڕی پارتیزانیی و بۆ کەوتنەپێش سوپای عێراق، لە هێرشەکانی سوپای عێراقدا بۆ سەر هێزی پێشمەرگە و ناوچە ڕزگارکاوەکان، سودیان لێوەردەگیرا.

لە لایەکی ترەوە حیزبە سیاسییەکان و شۆڕش سودی لە جاشەیەتیی وەردەگرت، لە لایەن هەندێک لە سەرۆک_جاش و کەسی باوڕپێکرای شۆڕشەوە هەواڵی بەرنامەی هێرشەکانی سوپای عێراق بۆ سەر هێزی پێسمەرگە دزەیدەکرد و بە پێشمەرگە دەگەیشت. بەو زانیارییانە پێشمەرگە خۆی لە پەلامار و زیانەکانی هێرشی سوپای عێراق دەپاراست. لە شۆڕشی ئەیلولدا دیاردەی جاشایەتیی زۆر فراوانبوو، کاریگەریی خراپی لەسەر خەباتی ڕەوای گەلی کورد بەجێهێشت. باشترین خزمەتی بە دوژمنی گەلی کورد کرد. ئاسەوارە خراپەکانی درێژەیانکێشا و هەتا ئەمڕۆیش ماونەتەوە. ئەگەر ئەو هۆکارانە نەخەینە بەرچاومان کە وایانکرد ئەم دیاردەیە لە کوردستاندا بەو شێوەیە پێشبکەوێت و زیانی گەورە لە پرسی ڕەوای گەلی کورد بدات، دوبارەبوونەوەی دیاردەکە بە شێوازی تر، لە کاتی جیاوازدا کارێکی مەحاڵ نییە.

دواکەوتوویی کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و ئابوریی باشووری کوردستان، زەمینەی ناوخۆیی بۆ دروستبوونی جاشایەتیی دەڕەخساند، زەمینەی دەرەکیی بۆ دروستبوونی ئەو دیاردەیە سیاسەتی فاشییانەی ڕژێمەکانی عێراق بوو، دەیانویست بە کەمترین زیانی خۆیان زۆرترین زیان بە گەلی کورد بگەیەنن. گەلی کورد و شۆڕشەکەی لەناوببەن، بەڵام کۆمەڵێک هۆکاری تریش کە تایبەتمەندیی شۆڕشی ئەیلول بوون، هۆکاری ڕاستەوخۆی گەورەبوون و فراوانبوونی دیاردەی جاشایەتیی بوون. گرنگترینیان ئەمانەن:

### ١- ئامادەکارییەکانی شۆڕش:

بەرنامەیەکی تێروتەسەل بۆ دەستپێکردنی شۆڕشی ئەیلول ئامادەنەکرابوو، مەسعود بەرزانیی سەرۆکی پارتیی لە کتێبی بەرزانیی و بزوتنەوەی ڕزگارییخوازی کورددا دەڵێت:

«له ناخی دەرونمەوە ئاواتی ئەوەم دەخواست شۆڕشی ئەیلول له سەردەمی عەبدولکەریم قاسمدا هەڵنەگیرسایە، لەبەرئەوەی عەبدولکەریم بۆ کورد و بۆ بەرزانییەکان باش بوو. شێخ ئەحمەدی لە زیندان ئازادکرد و بە پێداگریی خۆی بەندی سێیەمی دەستووری کاتیی عێراقی چەسپاند، کە دەڵێت کورد و عەرەب لە عێراقدا دوو نەتەوەن»٥.

هەتا ئەمڕۆیش زۆربەی گەلی کورد لەگەڵ ئەم بۆچوونەی مەسعود بەرزانییدایە، دەڵێن هەق نەبوو کورد دژی حکومەتی قاسم چەکی هەڵبگرتایە. ئەم بۆچوونە نیشانەی ئەوەیە کە پشتیوانییەکی جەماوەریی بۆ بەرپابوونی شۆڕشی ئەیلول لەئارادا نەبووە. زەمینەی ناوخۆیی بۆ هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول لەبار نەبووە. ڕاڕایی و گومان لە بەرپابوونی شۆڕش و درێژەپێدانی شۆڕش لەئارادا بووە. ئەم بۆچوونەی بەرزانیی کە بۆچوونی زۆرێک لە سیاسەتمەدار و ڕۆشنبیرانی تری باشووری کوردستانە، بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دەیسەلمێنێت کە لە ڕووی سیاسییەوە ئامادەکاریی بۆ شۆڕش نەکراوە، بۆیە هەر کەسێک پەیوەندیی بە هێزی پێشمەرگەوە دەکرد، بەگوێرەی تێڕوانینی خۆی و بەگوێرەی بەرژەوەندیی چین و بنەماڵە و خێڵەکەی لێکدانەوەی بۆ شۆڕش دەکرد و کاری لە ناو شۆڕشدا دەکرد. بەو شێوەیە یەکێتیی بیروبۆچوون و یەکێتیی وتاری سیاسیی لە سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلولدا پێکنەهات. لە ناو شۆڕشدا هێندە باس لە بەرژەوەندیی گشتیی و مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد نەدەکرا. پێشمەرگە و ئەندامی حیزب پەروەدەنەدەکران، فێری سیاسەت و دسپلینی شۆڕشگێڕیی نەدەکران.

کاتێک بە یەکڕیزیی ڕێکخستن و یەکێتیی بیرباوەڕ لە دامودەزگاکانی شۆڕشدا لاوزابوو، لەگەڵ دروستبوونی بچووکترین کێشەدا، ناکۆکیی گەورە لە نێوان پێشمەرگە و بەرپرسدا، لە نێوان پێشمەرگە و پێشمەرگەدا، لە نێوان خەڵک و بەرپرس و پێشمەرگەدا دروستدەبوو. پێشمەرگە ڕیزەکانی شۆڕشی بەجێدەهێشت، پەیوەندیی بە ڕژێمەوە دەکرد و چەکی جاشایەتیی هەڵدەگرت.

### ب- سەرکردایەتیی خێڵەکیی:

هۆکارێکی تری تایبەت کە لە شۆڕشی ئەیلولدا ڕێگەی بۆ دروستبوونی دیاردەی جاشایەتیی خۆشکرد، ئەوە بوو کە سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول و سەرکردایەتیی پارتیی بە دەستی خێڵێکی کوردستانەوە بوو. ئەمەیش وای لە خێڵەکانی تری کوردستان کردبوو کە بە چاوی گومانەوە سەیری شۆڕش بکەن. گەشەکردنی شۆڕش بە گەشەکردنی خێڵی بەرزان بزانن، وەکو مەترسییەکی گەورە بۆ سەر چارەنوسی خۆیان سەیریبکەن، هەر لە سەرەتاوە دژایەتیی شۆڕش بکەن.

لەبەرئەوەی بارزانییەکان لە ڕابردوودا لەگەڵ چەندیین خێڵی تری باشووری کوردستاندا لە شەڕ و ناکۆکییدا بوون، چەندیین جار پێکدادانی خوێناویی لە نێوانیان ڕویدابوو. ئەو خێڵانەی کە لەگەڵ بەرزانییەکاندا دوژمنایەییتان هەبوو، بەبێ لێکدانەوە و ڕەچاوکردنی پرسی نەتەوەیی و قۆناغی نوێی کۆمەڵگەی کوردستان، پەیوەندییان بە شۆڕشەوە نەدەکرد. لەسەر دوژمنایەتیی کۆنیان لەگەڵ خێڵی بەرزاندا بەردەوامبوون، کە بینییان مستەفا بەرزانیی ڕابەرایەتیی شۆڕشی ئەیلول دەکات، نەک ئامادەنەبوون چەکی پێشمەرگایەتیی هەڵبگرن، زۆربەیان پەیوەندییان بە حکومەتی ناوەندیی عێراقەوە دەکرد و ئامادەیی خۆیانیان بۆ دژایەتییکردنی بەرزانییەکان و بۆ دژایەتیی شۆڕشی ئەیلول پیشاندەدا و چەکی جاشایەتییان هەڵگرت.

مستەفا بەرزانییش لە لای خۆیەوە حسابێکی ئەوتۆی بۆ قۆناغی نوێی کوردستان و بۆ شۆڕشی نەتەوەیی کوردستان نەدەکرد. بەرنامەیەکی دانەنا بۆ ئەوەی کێشە و دوژمنایەتیی خێڵەکەی لەگەڵ خێڵەکانی تری کوردستاندا چارەسەربکات، لەسەر دژایەتییکردنی خێڵەکانی تری کوردستان بەردەوامبوو.

بەرپرسەکانی تری پارتیی و شۆڕشی ئەیلول ئەو هەژموونەیان لەسەر مەلا مستەفا نەبوو هەتا هەڵوێستی بگۆڕن، بە شێوازێکی نوێ لەگەڵ خێڵەکانی تری کوردستاندا بجوڵێتەوە. سەرکردە غەیرە بەرزانییەکانی شۆڕشیش نەتەوەییانە بیریان لەو قۆناغە نوێیە نەدەکردەوە، کاریگەرییشیان لەسەر دوژمنەکانی خێڵی بەرزان نەبوو، هەتا بڕوایان بەرانبەر بە شۆڕش و قۆناغی نوێ و ڕۆڵی بەرزانییەکان بگۆڕن. سیاسەتمەدارە نابەرزانییەکانی شۆڕشی ئەیلول، نەیانتوانی متمانەی سەرۆک_خێڵەکانی کوردستان بەدەستبهێنن، نەیانتوانی ئاشتیانبکەنەوە و لەپێناو بەرژەوەندیی گشتیی گەلی کورددا

دەستیان لە ناکۆکیی خێڵەکیی پێبەربدەن، ئاشتەواییەکی کۆمەڵایەتییان لەگەڵدا بکەن و هەموو هێزی گەلی کورد لە چوارچێوەی شۆڕشدا کۆبکەنەوە.

## ج- جیابوونەوەی پارتیی:

هۆکارێکی تری دروستبوون و گەشەکردنی دیاردەی جاشەیەتیی لە شۆڕشی ئەیلولدا، جیابوونەوەی ساڵی ١٩٦٤ پارتیی بوو. دوبەرەکیی لە نێوان سەرکردایەتیی مەلا مستەفا و باڵی مەکتەبی سیاسیی پارتییدا (جەلالیی) دروستبوو. کاتێک خەڵکی کوردستان دەیانبینی سەرکردە سیاسییەکانی کورد بەسەر دوو بەرەی جیاوازدا دابەشبوون، شەڕی براکوژیی دەکەن و دوژمنیان لەبیرچووەتەوە، هەر لایەکیش خۆی بە ڕرست دەزانێت و لایەنەکەی تر بە خائین دەزانێت، ئۆمێدی خەڵکی کوردستان بە ئایندەی شۆڕش لاوزادەبوو. لە پێشمەرگایەتیی دووردەکەوتنەوە، بۆ دابینکردنی ژیان و گوزەرانیان لەگەڵ سوپای عێراق چەکیان هەڵدەگرت.لە گەرمەی ناکۆکییەکانی باڵی مەلایی و و باڵی جەلالییدا، کاتێک خەڵکی کوردستان دەیانبینی ئەو دوو لایەنە هەموو هاوکارییەکی ئێران و عێراق دەکەن، بەبێ ئەوەی ئەو دوو دەوڵەتە دانیان بە مافەکانی گەلی کورددا نابێت، لە ناخی دڵی خۆیاندا بڕیاریاندەدا کە ئەوانیش لاسایی ئەو دوو باڵە سیاسییەی شۆڕشی ئەیلول بکەنەوە، وەکو ئەوان لە خیانەت و لە لۆمەی خەڵکی کوردستان بێباک بن.

## د- هەڵوێستی نەرم:

سەرکردایەتیی شۆڕش هەڵوێستی بەرانبەر بە جاشایەتیی نەرمبوو، ڕسوای نەدەکرد. لە ساڵی ١٩٦٦ - ١٩٧٠ باڵی مەلا مستەفا بە هەموو شێوەیەک باڵی جەلالییان بە جاش وەسفدەکرد. هەموو خەڵکی کوردستانیان بەو بۆچوونەی خۆیان پەروەردەکرد، بەڵام پاش ڕێککەوتنی ١١ی ئازار، مەلا مستەفا و جەلالییەکان ڕێککەوتنەوە. جەلالییەکان وەکو پێشمەرگە و ئەندام و کادری حیزب لە ڕیزەکانی هێزی پێشمەرگە و پارتییدا وەرگیرانەوە.

هێزی پێشمەرگەی کوردستان وەکو سەرچاوەیەکی زانیاریی لەسەر سیاسەت و چالاکیی هێزە چەکدارەکانی عێراق سودی لە جاشەکان وەردەگرت.

بۆ چارەسەرکردنی بیرندار و نەخۆشیی پێشمەرگە، سودی لە سەرۆک_جاشەکان وەردەگرت. پێشمەرگەی نەخۆش و برینداری پێشمەرگە وەرەقەی جاشیان بۆ دەکرا و بە نهێنیی دەنێردرانەوە بۆ ناو شارەکان. چارەسەری برین و نەخۆشییەکانیان دەکرا. ئەو سەرۆک_جاشانەیش کەم نەبوون کە هەوڵی ئازادکردنی کەسوکاری پێشمەرگەیان دەدا. لە دوای ڕاپەڕیین و لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام، لە ڕێگەی کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە چەندیین ڕاوێژکاری فەوجە سوکەکانی سەر بە حکومەتی عێراق ڕایاندەگەیاند کە لەسەر داوای بەرزانیی و تاڵەبانیی و بەرپرسەکانی تری شۆڕش، چەکی جاشایەتییان هەڵگرتووە، یان باسی ئەوەیان دەگێڕایەوە کاتێک حکومەتی عێراق داوای لێکردوون چەکی بۆ هەڵبگرن، بەو کارە ڕازینەبوون هەتا پرسیان بە یەکێتیی، یان بە پارتیی نەکردبێت و ڕەزامەندیی ئەوانیان وەرنەگرتبێت.

بەم شێوەیە بۆمان ڕوندەبێتەوە کە دیاردەی جاشایەتیی لە سیاسەتی شۆڕش و لە سیاسەتی حیزبە شۆڕشگێڕەکانی کوردستاندا بە کردارێکی ناشیرین و خیانەتبار سەیرنەکراوە، کارنەکراوە بۆ ئەوەی خەڵکی کوردستان ئەو دیاردەیە بە دیاردەیەکی قێزەون سەیربکات و لێی دووربکەوێتەوە، هێڵی سوور و سنوورێکی ئەستوور لە نێوان جاش و پێشمەرگەدا نەکێشراوە.

### هـ- ئازادیی ڕادەربڕین:

ئازادیی ڕادەربڕین و بنەمای دیموکراسیی لە ناو ڕیزەکانی هێزی پێشمەرگەدا نەبوو، ئەگەر پێشمەرگەیەک تێڕوانینێکی تایبەتی لەسەر بابەتێک هەبایە، ئەو تێڕوانینەی خۆی بۆ سەرەوەی خۆی و بۆ دەوروبەری خۆی باسبکردایە، لەگەڵ تێڕوانینی بەرپرسەکانیدا ناکۆکبایە، گوێی لێنەدەگیرا و دژایەتییدەکرا و سزادەدرا. بۆ نمونە: لە سەرەتای ساڵانی شەستەکاندا لە ناوچەی هەورامان عەبدولوەهاب ئەتروشیی فەرماندەی هێزی پێشمەرگە بوو، بەرانبەر بە پێشمەرگە و بەرانبەر بە بەرپرسەکانی ناوچەی هەورامان و بەرانبەر خەڵکی ناوچەکە ڕەفتار و کرداری دزێو و ناشیرین و دکتاتۆرانەی دەنواند.

ئەو کات (کەمالی ئەحە ڕووش) سەرلق بوو، لەگەڵ پێشمەرگەکانیدا نارەزاییان بەرانبەر بە هەڵسوکەوت و کردارەکانی عەبدولوەهاب ئەتروشیی پیشاندا. عەبدولوەهاب ئەتروشیی گوێی لە قسەکانیان نەگرت، هەوڵیدا دەستگیریانبکات. کەمالی دەستگیرکرد و کوشتی. هاوڕێکانی کەمال خۆیان بەدەستەوەنەدا و لە عەبدولوەهاب یاخیی بوون. پاش ماوەیەک چەکی جاشایەتییان هەڵگرت*٢. هەڵسوکەوتی پێشمەرگە و بەرپرسەکانی شۆڕشی ئەیلول لەگەڵ گوندنشینەکانی کوردستاندا هەڵسوکەوتێکی نایاسایی و نادیموکراتیی بوو. هیچ یاسایەک نەبوو پەیوەندیی نێوان خەڵک و دەسەڵاتدارانی شۆڕشی ئەیلول ڕێکبخات. هەست و تێڕوانینی بەرپرسەکان بەرانبەر بە هەر کێشەیەک بڕیاری یەکلاکەرەوە بوو. ئەگەر لە گوندێکدا کەسێک چەکی جاشایەتیی هەڵبگرتایە پێشمەرگە دەچوونە سەر گوند، هەموو ماڵەکانیان تالاندەکرد و خانووەکانیان دەسوتاند. جاری وا هەبوو گوندێکیان بە یەک جار ئاگر تێبەردەدا. ئەگەر پێشمەرگەیەک بیخواستایە هاوسەرگیریبکات و ماڵی باوکی کچەکە ڕازینەبوونایە، بەرپرسی پێشمەرگەکە بە هەڕەشە و بە ترساندن، باوک و برای کچەکەیان ناچاردەکرد ڕەزامەندیی پیشانبدەن.

ع- ئەو هۆکارانەی بۆ گەشەکردنی دیاردەی جاشایەتیی ئاماژەم پێدان، هەموویان هۆکاری یاریدەدەری دروستبوونی دیاردەکە بوون. دەبوو ئەو هۆکارانە کاریان لەسەر کەسێتیی لاوازیی تاک و پێکهاتە خێڵەکییەکانی کۆمەڵگەی کوردستان بکردایە، بۆ ئەوەی دیاردەکە دروستبێت، بەڵام هەر کەسێک خاوەنی کەسێتییەکی بەهێز بووبێت، ئامادەنەبووبێت لەپێناو دەستکەوتی مادیی و بۆ دژایەتییکردنی ناحەزی خۆی چەکی خیانەتی جاشایەتیی لەشانبکات، چەند زەمینەی لەباریش هەبووبێت چەکی جاشایەتیی لەشاننەدەکرد. بە حوکمی ئەوەی گەلی کورد لە دێرزەمانەوە خاوەنی دەوڵەت نەبووە، بڕوابەخۆنەبوون و کەسێتیی لاواز، لە ناو تاک و پێکهاتەکانی گەلی کورددا هەتا ڕادەیەک بڵاوبوو، حیزبە سیاسییەکانی باشووری کوردستان و دامودەزگاکانی شۆڕش، کاریان بۆ بەهێزکردنی کەسێتیی تاک و پێکهاتە خێڵەکییەکانی کورد نەکرد، هەر لەسەر ئەو کەسێتییە لاوازە شۆڕشیانکرد، بۆیە دیاردەی جاشایەتیی بەو شێوەیە گەشەیکرد و بڵاوبووەوە.

## ٦- سەرکوتکردنی شۆڕشی پارچەکانی تر:

شۆڕشی ئەیلول داوای ماف و ئازادیی بۆ گەلی باشووری کوردستان دەکرد، لەو پێناوەدا بەرخۆدانیدەکرد و قوربانییدەدا. لە هەمان کاتدا سەرکردە و فەرماندە مەیدانییەکانی ئەو شۆڕشە، جەلادی شۆڕشگێرانی پارچەکانی تری کوردستان بوون. ئەگەر لە هەر پارچەیەکی کوردستاندا بزوتنەوەیەکی کوردایەتیی سەریهەڵبدایە، بەرپرسەکانی شۆڕشی ئەیلول وەکو پۆلیسی ئێران و تورکیا، لە دەرەوەی سنووری ئەو وڵاتانەدا، لە ناوجەرگەی شار و گوندەکانی باشووری کوردستان و لە سنووری نێوان عێراق و ئێران و تورکیادا، شۆڕشگێرانی ڕۆژهەڵات و باکووری کوردستانیان دەستگیردەکرد و بە زیندوویی، یان بە مردوویی تەسلیمی ئێران و تورکیایان دەکردنەوە.

ڕێگەگرتن لە دروستبوونی شۆڕشی گەلی کورد لە پارچەکانی تری کوردستان، ئەرکێکی سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول بوو. بڕیارەکە لە نێوان سەرکردایەتیی ئەو شۆڕشە و هەر یەک لە هەواڵگریی ئێران و تورکیادا وەردەگیرا. هەر گروپێکی سیاسی و یان تاکە کەسێک لە ڕژێمی ئێران، یان لە ڕژێمی تورکیا یاخیببایە، پێی لە باشووری کوردستان بخستایە، سەرکردایەتیی شۆڕش و فەرماندە مەیدانییەکانی هێزی پێشمەرگە شوێنیدەکەوتن و شەهیدیاندەکرد، یان دەستگیریاندەکرد، بە زیندویی، یان بە مردویی ڕادەستی ئێران و تورکیایان دەکردنەوە. ئەگەر ئەو کارەیان بۆ ئەنجامنەدرایە، مەفرەزەی تیرۆرکردنیان بۆ دەناردن، لە پەنای دیوارێکدا شەهیدیاندەکردن.

ئەمە لە کاتێکدا بوو کە خەڵکی پارچەکانی تری کوردستان بەشدارییەکی کاریگەریان لە شۆڕشی ئەیلولدا دەکرد. بە گیان و بە سامان شۆڕشیان دەپاراست. لەپێناو ڕزگاریی باشووری کوردستاندا خوێنیان دەدا. لە کاتێکدا عسمەت شەریف وانلی خەڵکی باکوری کوردستان بوو، ئەندامی پایەبەرزی پارتیی و نوێنەری پارتیی بوو لە ئەوروپا، لەو کاتەدا دکتور شوان و سەعید ئاڵچیی و چەند هەڤاڵێکی تریان لە ڕژێمی تورکیا یاخیی بوون، پەنایان بۆ باشووری کوردستان هێنا. پێشمەرگەکانی شۆڕشی ئەیلول بە فەرماندەیی عیسا سوار، ئەو سەرکردانەی پارتیی دیموکراتی

کوردستانی تورکیایان دەستگیرکرد و شەهیدیانکردن. لەسەر شەهیدکردنی ئەو سەرکردانەی باکوری کوردستان پارتیی سینارۆیۆی کێشەی ناوخۆیی دروستدەکات، گوایە دکتور شوان و سەعید ئاڵچیی کێشەی ناوخۆیی حیزبییان هەبووە، دکتور شوان سەعید ئاڵچیی کوشتووە. سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلولیش بڕیاری کوشتنی دکتور شوانی داوە.

هەزاران کەس لە خەڵکی ڕۆژهەڵاتی کوردستان پەیوەندییان بە شۆڕشی ئەیلولەوە دەکرد، شۆڕشیان بە هیی تەواوی گەلی کورد دەزانی، لەو پێناوەدا خەباتیاندەکرد، چەندیین کادری سەربازییان تێدا هەڵکەوتن و هەندیکیشیان شەهیدبوون. بۆ نمونە: حوسەین بەگی وەکێل، عەبە پاوەیی، مەنوچەر بەگ، نوری هەجیجیی و ...هتد، لەو ناوانەن کە من لەبیرمماون و لە کوردستانی ڕۆژهەڵاتەوە هاتبوون وەکو پێشمەرگە لە ڕیزەکانی شۆڕشی ئەیلولدا خەباتیاندەکرد، کەچی لەولاوە هەر جوڵانەوەیەکی شۆڕشگێڕیی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانەوە سەریهەڵدایە، بە بڕیاری سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول، سەرکردەکانیان دەستگیردەکران و دەدرانەوە دەستی حکومەتی ئێران، یان لەژێر دەسەڵاتی خۆیاندا لەناودەبران.

هەموو خەڵکی کوردستان ئاگادارە کە لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلولدا کە سلێمانی موعینی و مەلا ئاوارە و قادر شەریف چۆن شەهیدکران، سلێمانی موعینیی بە بڕیاری سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول لە لایەن پێشمەرگەوە شەهیدکرا، تەرمەکەی ڕادەستی دەوڵەتی ئێران کرایەوە. قادر شەریف یەکێک لە سەرکردەکانی تری سەرهەڵدانەکەی ساڵی ١٩٦٧ی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بوو، لەژێر دەستی پێشمەرگە ڕزگاریبووبوو، بە بڕیاری عەبدولوەهاب ئەتروشیی فەرماندەی هێزی خەبات لە شاری سلێمانیی تیرۆریانکرد.

هەڵوێستی سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول بەرانبەر بە بزاڤی ڕزگارییخوازی گەلی باکوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان، هەروا کارێکی سادە و سەرپێیی نییە، بەبێ لێکۆڵینەوە و پێداچوونەوە تێبپەڕێت، بەڵام هەتا ئەمڕۆ هیچ کەس و لایەنێکی کوردستانی لە باشوور و لە پارچەکانی تری کوردستان، بە جدیی لایان لەم بابەتە هەستیارە نەکردووەتەوە. ئەو کەسانەی لە مەلا مستەفا و لە شۆڕشی ئەیلولەوە نزیکبوون، کاتێک لەسەر ئەو هەڵوێست و کردارە نانەتەوەییانە ڕووبەڕووی

ڕەخنە دەبوونەوە، بەوە داکۆکییاندەکرد کە لەپێناو پارستنی شۆڕشی ئەیلولدا ئەو کارانەیان کردووە. ئەگەر ئەو چەند کەسەیان شەهیدنەکردایە، یان ڕادەستی ئێران و تورکیایان نەکردایەتەوە، یان بە خۆیان لەبریی ئێران و تورکیا لەناویاننەبردنایە، ئەو کات ئەو دوو وڵاتە هێرشیاندەکردە سەر سەرکردە و پێشمەرگەکانی شۆڕش و لەناویاندەبردن. بەڵام ئایا بۆچی سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول تەنها ڕادەستکردنەوە و لەناوبردنی ئەو سەرکردە کوردانەی پارچەکانی تری کوردستانی بەبیرداهاتووە؟ هەر ئەوەی جێبەجێکردووە و پەنای بۆ ڕێچارەی تر نەبردووە؟ خۆ دەیانتوانی شەهیدیاننەکەن و گفتوگۆیان لەگەڵ بکەن و ڕۆژەڤی ناسکی شۆڕشی ئەیلولیان تێبگەیەنن. پەیوەندییە ناوچەیی و جیهانییەکانی شۆڕشیان بۆ ڕونبکەنەوە و قەناعەتیان پێبکەن کە بۆ ماوەیەک خەباتی چەکداریی و سیاسیی خۆیان ڕابگرن هەتا ڕەوشی باشووری کوردستان باشتر دەبێت. ئەی هەر ئەو ئێرانە نەبوو کە حسابی بۆ ئەو سیاسەتە نانەتەوەییەی سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول نەکرد و ساڵی ١٩٧٥ ئاشبەتاڵی بە شۆڕشی ئەیلول کرد.

سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول دوچاری وەهمێکی سیاسیی بووبوو، باوەڕیان بەوە هێنابوو کە ئێران و تورکیا دۆستی شۆڕشی باشووری کوردستانن. کوردەکانی ڕۆژهەڵات و باکوور دوژمنی شۆڕشی باشووری کوردستانن. ئەمە لە کاتێکدا بوو ئەو وڵاتانە دوژمنایەتیی گەلی باشووری کوردستانیان دەکرد دوژمنایەتییەکی زۆری خێڵی بەرزانییشیان کردووە، بەڵام کوردەکانی ڕۆژهەڵات و باکووری کوردستان دۆستی ڕاستەقینەی گەلی باشوور و شۆڕشی ئەیلول بوون، دۆستی ڕاستەقینەی بەرزانییەکانیش بوون.

ئەو بۆچوونە نالۆژیکییەی سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول بە عەقڵی کورددا نەدەچوو، ئەو ڕاستییەیش ساڵی ١٩٧٥ سەلمێنرا. شای ئێران پشتی لە شۆڕشی ئەیلول کرد، داوای کۆتاییهێنانی شۆڕشی لە بەرزانیی کرد. ئاشکرابوو کە ئێران دۆستی گەلی کورد نییە. دەوڵەتی ئێران شۆڕش ئەیلولی وەکو چەکێک دژی تێکۆشانی نەتەوەیی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بەرکارهێناوە، کاتێکیش کە زانی کاری بەو شۆڕشە نەماوە بڵاوەپێکرد.

ئەو سیاسەتە نانەتەوەییەی سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول کە دژی کوردەکانی ڕۆژهەڵات و باکوور ئەنجامیدا، ئەو خۆخستنەباوەشەی ئێران لە لایەن سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلولەوە، ئەو ئەنجامەی لێکەوتەوە کە شۆڕش ئاشبەتاڵی کرد.

سەرکوتکردنی شۆڕشی پارچەکانی تری کوردستان کە لە شۆڕشی ئەیلولەوە دەستپێیکرد، هەتا ئەمڕۆیش بە شێوازی جیاواز بەردەوامە. دوای ڕاپەڕینی گەلانی ئێرانی ساڵی ١٩٧٩ کۆماری ئیسلامیی ئێران دژی مافەکانی گەلی کورد وەستایەوە. جارێکی تر کوردەکانی ڕۆژهـەڵات دەستیـان بـە خەباتی چـەکداریـی کـردەوە. جارێکی تریش سەرکردەکانی شۆڕشی ئەیلول لە چوارچێوەی شۆڕشی گوڵان و سەرکردایەتیی کاتیی پارتییدا، شانبەشانی هێزەکانی سوپای پاسدارانی ئێران، دژی شۆڕشی ڕۆژهەڵاتی کوردستان وەستانەوە و شەڕی پێشمەرگەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستانیان دەستپێکردەوە.

## ٧- دیموکراتیی، یان دکتاتۆریی:

پارتیی دیموکراتی کوردستان ڕابەرایەتیی شۆڕشی ئەیلولی دەکرد، ئەو پارتە بەگوێرەی ئەدەبیات و لێدوانی بەرپرسەکانی، حیزبێکی سکۆلاری دیموکرات بوو، بەڵام لە بـواری کردارییدا، لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلولدا کەس پریشکێکی ئەو دیموکراتییەی پارتیی بەرنەکەوت.

سەرکردەکانی پارتیی و شۆڕشی ئەیلول، کە باس لە تێکۆشانی خۆیان و سەروەرییەکانی شۆڕش دەکەن، دەڵێن: گەلی کورد لە سایەی شۆڕشدا هەستی بە ئازادیی و دیموکراتیی کردووە، بەڵام ئەگەر لە نزیکەوە لە سیاسەتی ناوخۆیی شۆڕش و سیاسەتی ناو حیزب و پەیوەندییەکانی گەل و شۆڕش و پەیوەندییەکانی خێڵی بەرزان و خێڵەکانی تری کوردستان وردببینەوە، بێجگە لە سیاسەت و هەڵوێست و کرداری دکتاتۆرانە هیچی تر بەدیناکەیت.

ئەگەر بڵێین لە ناو دامودەزگاکانی شۆڕشی ئەیلولدا دەرفەتی سەرتاییترین ڕەخنە و ڕادەربڕینی ئازاد نەبووە، زوڵممان لە کەس نەکردووە. هۆکارێکی سەرەکیی یەکەم جیابوونەوەی پارتیی لە بەهاری ساڵی ١٩٦٤دا، بۆ ئەوە

دەگەڕێتەوە کە ئەندامانی مەکتەبی سیاسیی ئەو کاتە بە سەرۆکایەتیی ئیبراهیم ئەحمەد، هەندێک تێبینییان لەسەر ڕێککەوتنی شوباتی ١٩٦٤ی نێوان بەرزانیی و حکومەتی ناوەندیی عێراق هەبووە و تێبینییەکانیان بۆ بەرزانیی ناردووە، بەڵام مەلا مستەفا گوێی لە تێبینییەکان نەگرتووە و بە توندیی وەڵامیداونەتەوە. مەسعود بەرزانیی لە کتێبی بارزانیی و بزوتنەوەی ڕزگارییخوازی کورد، بەشی یەکەم، لاپەرە ١٦٧دا دەڵێت:

عەزیز موحەممەد بە بەزرانیی گوتووە: مەسڵەحەت لەوەدایە تۆ و ئیبراهیم ئەحمەد سوڵحتان بکەوێتە بەین و ئەم دوبەرەکییە نەهێڵرێت و ڕێ لە ڕودانی شەڕ لە نێوانتاندا بگیرێت. بارزانییش وەڵامیدابووە و گوتبووی: بۆ ئەوان هەن، هەتا شەڕبکەن*٣

ئەمە پیشانیدەدات کە مەلا مستەفا هیچ نرخێکی بۆ عەزیز موحەممەد و ئیراهیم ئەحمەد دانەناوە. ئەم کەمسەیرکردنەی بەرانبەر، سیاسەتێکی نادیموکراتیی بەرزانیی ڕابەری شۆڕشی ئەیلول بوو. پەیوەندیی نێوان خێڵی دەسەڵاتداری بەرزان و خێڵەکانی تری کوردستان وەکو زێباریی و هەرکیی و سورکیی و کۆچەر و برادۆست، بە بەردەوامیی پەیوەندییەکی دوژمنکارانە بووە. دەرفەت بە گفتوگۆ و چارەسەری کێشە خێڵەکییەکانی نێوان ئەم پێکهاتانەی کۆمەڵگەی کوردستان نەدراوە، لەبەرئەوەی خێڵی بەرزان بەهێزترین و بەدەسەڵاتترینی ئەو خێڵانە بووە.

لەبەرئەوەی خانەدانەکانی بەرزان ڕابەرایەتیی بزوتنەوەی ڕزگارییخوازی گەلی کوردیان کردووە، دەبوو دیموکراتبوونایە، ئەرکی سەرشانیان بووە هەڵوێستێکی دیموکراتییان بەرانبەر بە سەرۆک_خێڵەکانی تر پیشانبدایە، داوای چارەسەرێکی ئاشتییانەی کێشەی نێوان خێڵەکانی کوردستانیان بکردایە، بەڵام بەرزانییەکان نەک هەر ئەو هەنگاوەیان نەهاویشت، بە درێژایی تەمەنی دەسەڵاتیان بە شێوازی هەمەجۆر ناوی خێڵەکانی تری کوردستانیان زڕاند و سەرکوتیانکردن، هەتا ئەمڕۆیش ئەم سیاسەتە نادیموکراتەی خێڵی دەسەڵاتدار بەرانبەر بە خێڵەکانی تری باشووری کوردستان بەردەوامە و بە یەکێک لە گیروگرفتەکانی کێشەی کورد دەژمێردرێت.

لە ئاستی تاکدا هەر پێشمەرگەیەک، یان هەر فەرماندەیەک ڕۆژێک لە ڕۆژان بووبێتە خاوەنی بۆچوونێک، لە بۆچوونی گشتیی سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول

جیابوو‌بێت، سزادراوە، یان لەژێر گوشار و ترسی لەناوبردندا هەڵهاتووە. فاخر مێرگەسووریی لە ڕۆژە کۆتاییەکانی شۆڕشی ئەیلولی ساڵی ١٩٧٥دا بە بڕیاری سەرکردایەتیی شۆڕش شەهیدکرا، پیشانیدەدات کە سەرکردەکانی شۆڕشی ئەیلول بەرانبەر بە هەر بۆچوونێکی جیاواز لەگەڵ بۆچوونەکەی خۆیاندا، توندترین شێوازی ڕووبەڕووبوونەوەیان بەکارهێناوە.

کوڕەکانی مەلا مستەفا (سابر و لوقمان) و عەزیز عەقراویی، لەسەر گفتوگۆی نێوان شۆڕش و حکومەتی عێراق بۆچوونی جیاوازیان هەبووە، نەک هەر ڕێگەیاننەدان بە ئازادیی بۆچوونی خۆیان بڵێن، بەڵکو گەورەترین دژایەتیی کران و ئەگەری لەناوبردنیشیان لەئارادابوو، بۆیە ڕیزەکانی شۆڕشیان بەجێهێشت و خۆیان ڕادەستی عێراق کردەوە.

هەڵوێستی بەرپرسانی شۆڕشی ئەیلول لەگەڵ خەڵکی سادەی کوردستاندا، بەردەوام هەڵوێستێکی نادیموکراتیی بووە. جوتیارانی کوردستان نان و شوێنی حەوانەوەیان بۆ پێشمەرگە دابیندەکرد، کوڕەکانیشیان چەکی پێشمەرگایەتییان لەشاندەکرد و شەهیددەبوون. وەکو هاوڵاتییەکی ئەم نیشتیمانەیش مافیان بەسەر شۆڕشەوە هەبوو، بەڵام لەگەڵ ڕودانی بچووکترین کێشەدا، بڕیاری دکتاتۆرانەی نایاسایی بەرانبەر بە خەڵکی ئاسایی کوردستان جێبەجێدەکرا. ئەگەر منداڵی هاوڵاتییەکی کوردستان دوچاری هەڵەیەک ببایەوە، دژی پێشمەرگە کردارێکی ئەنجامبدایە، بەرپرسەکانی شۆڕشی ئەیلول نەک هەر کەسە تاوانبارەکەیان وەکو گەورە سزادەدا، بنەماڵەی ئەو کەسەشیان سزادەدا. من لەبیرمە لە بیارەی ناوچەی هەورامان مێرمنداڵێک لە لایەن هەندێک بەکرێگیراوی حکومەتی عێراقەوە هەڵخەڵەتێنرابوو، نارنجۆکی دەستی (ڕومانەی) خستە ناو ماڵی بەرپرسێکی پێشمەرگەوە و چەند کەسێک کوژران و بریندار‌بوون. عەبدولوەهاب ئەتروشیی باوک و مامی منداڵەکەی دەستگیرکردن و هەردوکیانی کوشت *٤ .

کەوابوو فەلسەفە و تێڕوانین و هەڵوێست و بڕیارەکانی سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول بەرانبەر بە خەڵک و بەرانبەر بە خێڵەکانی کوردستان و بەرانبەر بە پێشمەرگە و بەرانبەر بە سیاسەتمەدارانی پارتیی و شۆڕش دیموکراتیی نەبوو. ئەو سیاسەتە

نادیموکراتە هەتا ئێستایش درێژەی هەیە و کاریگەریی لەسەر کەلتوری سیاسیی حیزب و تاک و خێڵەکانی کوردستان کردووە.

## ٨- تیرۆر لە شۆڕشی ئەیلولەوە:

بەرپرسە باڵاکانی پارتیی و شۆڕشی ئەیلول دەڵێن کە ڕۆژێک لە ڕۆژان شۆڕشی ئەیلول کردەیەکی تیرۆریی دژی نەتەوەی عەرەب ئەنجامنەداوە، دوور لە ڕێوشوێنی باوی شەڕ، عەرەبێکیان نەکوشتووە، ئەمە ڕەنگە ڕاستبێت و مافی خۆیانە بەو شێوەیە باس لە مرۆڤدۆستیی شۆڕشی ئەیلول و سەرکردایەتیی ئەو شۆڕشە بەرانبەر بە عەرەبەکان بکەن، بەڵام ئەگەر هەر کەسێک لە مێژووی شۆڕشی ئەیلول وردببێتەوە بۆی دەردەکەوێت، کە لە درێژەی تەمەنیدا هەزاران کەسی کوردی بێتاوانی دوور لە یاسا و ڕێسای کوردەواریی و مرۆڤایەتیی تیرۆرکردووە. ساڵی ١٩٦٣ لە گوندی کانیی ماسیی نزیک سلێمانیی، دەستەکانی تیرۆی پارتیی، ژمارەیەک کادر و بەرپرسی حیزبی شیوعیی عیراقیان تیرۆرکرد. ساڵی ١٩٧٠ چەرمەگایەکان لە لایەن بارەگای بەرزانییەوە دەعوتکران، بۆ ئەوەی سەردانی بارزانیی بکەن و کێشەکەیان لەگەڵ بەرزانییەکان چارەسەربکەن، لە نیوەی ڕێگەدا کەمینیان بۆ دانان و لەناویانبردن. عەبدولوەهاب ئەتروشیی باوکی کەمالی ئەحە پووشی بەبێ تاوان کوشت، نەک تۆڵەی کوڕەکەی بکاتەوە. ساڵی ١٩٧٤ لە زاخۆ عیسا سواری فەرماندەی لەشکری زاخۆ، دوازدە کادیری حیزبی شیوعیی عێراقی شەهیدکرد، ئەمانە چەند نمونەیەکی ئاشکرای تیرۆری دەسەڵاتدارانی شۆڕشی ئەیلول بوو، کە بەرانبەر بە ڕۆڵە دڵسۆزەکانی گەلی کورد ئەنجامیانداوە، کەچی لە ئاستی دوژمنانی کورددا زۆر دڵنەرم و ئاشتییخوز بوون. شانازیی بەوەوە دەکەن کەسیان تیرۆرنەکردووە. دەبێت گەلی کورد لە سەرانی شۆڕشی ئەیلول بپرسن بۆچی هێندە لە ئاستی کوشتنی ڕۆڵەکانی کورددا دەستتانکراوەبووە و لە ئاستی کوشتنی سەرکردە شۆڤینیی و فەرماندە سەربازییەکانی عێراقدا دەستتان نوقاوبووە؟ بۆچی تەها شەکرچیی و زەعیم سدیقتان تیرۆرنەکرد؟ کە مردن بروسکەی ماتەمینییتان بۆ بنەماڵەکانیان نارد؟ بۆچی بڕیاری تیررۆکردنی سەدان کوردی حیزبەکانی تر و خەڵکی ناڕازیتان دەدا؟

ئەم جۆرە سیاسەتە کە سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول هێنایە ناو شۆڕشی کوردەوە، هەتا ئەمڕۆیش بەردەوامە و کار بۆ سڕینەوەی ناکرێت، بووە بە پەتایەک و چووەتە ناو خوێنی حیزبە سیاسییەکانی تری کوردستانیشەوە. لە سەردەمی شۆڕشی نوێ و لە دوای ڕاپەڕیین چەندیین کەسایەتیی سیاسیی و ڕۆشنبیری باشووری کوردستان بە ئاشکرا و بە نهێنیی لە لایەن حیزبە دەسەڵاتدارەکانەوە تیرۆرکران، بەڵام هەر ئەو حیزبانە گەورەترین ڕێزیان لە تاوانبارانی ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجە گرت، لە زیندان ئازدیانکردن و لە دادگاییکردن پاراستیانن. بروسکەی ماتەمینیی بۆ مردنی تەها شەکەرچیی و زەعیم سدیق دەنێرن و نزار خەزرەجیی لە دادگای دانیمارک دەپارێزن و عزەت دوریی و ماهر عەبدولڕەشید لە هەولێر و سلێمانیی نیشتەجێدەکەن. ئیمزای سزای لەسێدارەدانی سەدام حوسەین و عەلی حەسەن مەجید ناکەن.

## ٩- لە ١١ی ئازارەوە بۆ ٦ی ئازار

پاش ئەوەی حکومەتی عێراق تێگەیشت کە بە خۆیان و جەلالییەکان ناتوانن کۆتایی بە باڵی بەرزانیی بهێنن، لە کۆتاییەکان ساڵی ١٩٦٩وە حکومەتی عێراق لەگەڵ سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول دەستی بە گفتوگۆ کرد.

سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول هیچ پرۆژەیەکی بۆ گفتوگۆ و ڕێککەوتن لەگەڵ عێراق ئامادەنەکردبوو، کە نوێنەری بەرزانیی (دارا تەوفیق) سەردانی بەغدا دەکات و لەگەڵ سەدام حوسەینی جێگری سەرۆککۆماری ئەو کاتەی عێراق کۆدەبێتەوە، سەدام پێیدەڵێت: لەسەر چی ڕێکبکەوین؟ دارا تەوفیق دەڵێت: من هاتووم بۆ گفتوگۆ. سەدام دەڵێت: باشە لەسەر چی گفتوگۆبکەین، خۆ دەبێت پرۆژەیەکتان هەبێت؟ دارا تەوفیق وەڵامی پێنابێت. سەدام پێیدەڵێت: بۆچی داوای حوکمی زاتیی ناکەن؟ دارا تەوفیق بە پێشنیازەکەی سەدام دڵخۆشدەبێت و بەرزانیی ئاگاداردەکاتەوە، بەرزانییش پێشنیازەکەی سەدامی پێ باشدەبێت. ئیتر گفتوگۆ درێژەدەکێشێت و لە ١١ی ئازاری ١٩٧٠ ڕێککەوتنەکە ڕاگەیەنرا، بە ناوی بەیانی ١١ی ئازارەوە ناویدەرکرد* ٥.

چاودێرانی سیاسیی و سیاسەتمەدارانی کورد ئەو ڕێککەوتنە بە ڕێککەوتنێکی مێژوویی دەنرخێنن، بە دەستکەوتێکی گرنگی سیاسیی گەلی کوردی دەزانن. ساڵی

١٩٨٤ له گوندی ئاوەژێی نزیک مەرگە لە کاتی گفتوگۆی یەکێتیی و حکومەتی عێراقدا، نەوشیروان مستەفا گوتی: بەیانی ١١ی ئازار گەورەترین دەستکەوتی گەلی کورد بووە *٦.

لە دووتوێی بەرگەکانی بەیانی ١١ی ئـازاردا، گەلی کـورد بە فەرمیی وەکو نەتەوەیەکی وڵاتی عێراق ناسرا. لە سنووری جوگرافیی باشووری کوردستاندا حوکمی زاتیی (بەڕێوەبەرێتیی خۆجێیی) بۆ دابینکرا. حکومەتی بەعس ڕێکخستنی هێزی چەکداریی جاشە کوردەکانی ئەو کاتەی هەڵوەشاندەوە، هێزی چەکداریی و ڕێکخستنی سیاسیی باڵی مەکتەبی سیاسیی (ئیبراهیم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانیی) هەڵوەشاندەوە، کە لە ساڵی ١٩٦٦وە هاوپەیمانیی سیاسیی و سەربازیی حکومەتی عێراق بوون، لە باشووری کوردستاندا تەنها هێزی پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلول بە فەرمیی مایەوە. دامودەزگاکانی حوکمی زاتیی لە هەرێمی کوردستاندا دامەزران، چەندیین بەرپرسی کورد لە حکومەتی عێراقدا پلەی وەزیریان وەرگرت. حکومەتی عێراق بـەردەوام داوایـدەکـرد یەکێک لە کوڕەکانی مـەلا مستەفا پۆستی جێگری سەرۆککۆماری عێراق وەربگرن. حکومەتی بەعس هەوڵیدەدا لە هەرێمی کوردستاندا پرۆسەی ڕیفۆرمی کشتوکاڵ و ئاودێریی پێشبخات.

فراوانکردنی ناوچەی حوکمی زاتیی بۆ ئەوەی کەرکوک و خانەقین و چەندیین شوێنی تریش بگرێتەوە. یەکێک لەو بابەتانە بوو کە چارەسەرنەکرابوو، گفتوگۆی لەسەر دەکرا.

لە تەنیشت ئەم گۆڕانکارییە سیاسییانەدا، ڕۆژانە کێشەی بچووک ڕوویدەدا و گومان و ناکۆکیی لە نێوان سەرکردایەتیی شۆڕش و حکومەتی عێراقدا دروستدەبوو. ساڵی ١٩٧٣ وەفدێکی زانایانی ئاینیی عێراق سەردانی بەرزانییان کرد و خۆیان بە بەرزانییدا تەقاندەوە، لەو کاتەوە متمانە لە نێوان کورد و حکومەتی عێراقدا نەما.

داڕێژەری ئەو بەرنامەیە کێ بوو؟ هەتا ئێستایش بە تەواویی ئاشکرانەبووە، بـەڵام حکومەتی عێراق ئەو تاوانەی خستە ئەستۆی نـازم گزار، کە لەو کاتەدا بەرپرسی ئاسایشی گشتیی عێراق بوو. دواتر نازم گزار بە تاوانی ئامادەکاریی بۆ کودەتایەکی سەربازیی دژی حکومەتی عێراق، لە لایەن سەدام حوسەینەوە دەستگیرکرا و کوژرا. ململانێ و ناکۆکیی نێوان سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول و

حکومەتی ئەو کاتەی عێراق چوار ساڵ بەردەوامبوو، سەرکردایەتیی شۆڕش بەو پرۆژەیەی ساڵی ١٩٧٤ حکومەتی عێراق ئامادەیکردبوو ڕازینەبوو، ڕێککەوتنی ١١ی ئازار هەڵوەشایەوە و شەڕ لە نێوان هێزە چەکدارەکانی حکومەتی عێراق و هێزی پێشمەرگەدا هەڵگیرسایەوە.

دوای ساڵێک لە شەڕی نێوان سوپای بەعس و هێزی پێشمەرگە، لە ٦ی ئازاری ١٩٧٥دا شای ئێران و سەدام حوسەینی جێگری سەرۆککۆماری عێراق، لە جەزائیری پایتەختی وڵاتی جەزائیر لە پەراوێزی کۆبوونەوەکانی وڵاتانی سەر بە ڕێکخراوی ئۆپێکدا، لەسەر حسابی شۆڕشی کورد ڕێککەوتنیانکرد. بەپێی ئەو ڕێککەوتنە دەبوو شای ئێران دەست لە پشتیوانیی و هاوکاریی شۆڕشی ئەیلول بەربدات و ڕێگەی تێکۆشان لە شۆڕشی گەلی کورد بگرێت، بەرانبەر بەوەی سەدام حوسەین لە کەنداوی عەرەبدا چەندیین ناوچە و دورگەی عێراقیی بخاتە سەر خاکی ئێران.

شا بە زووترین کات بڕیارەکەی جێبەجێکرد و داوای لە مەلا مستەفا بەرزانیی کرد کە دەست لە تێکۆشان بەربدات و هێزەکەی بڵاوەپێبکات. مەلا مستەفایش ملی بۆ داواکەی شا دا، داوای لە هێزە ١٠٠ سەد هەزار کەسییەکەی پێشمەرگە کرد چەکدابنێن. لە ئێران پەناهندەیی وەربگرن، یان خۆیان ڕادەستی عێراق بکەنەوە. خەڵکی کوردستان بڵاوەپێکردنی شۆڕشی ئەیلولیان ناونا ئاشبەتاڵ.

کۆتاییهێنان بە شۆڕشی ئەیلول کاریگەرییەکی زۆر خراپی لە دڵ و دەرونی خەڵکی کوردستاندا بەجێهێشت، بووە جێگەی سەرنجی زۆرێک لە ڕۆژنامەنوسانی ناوچەکە و جیهان. وایلێهات موحەممەد حەسنێن هەیکەلی بیرمەند و ڕۆژنامەنوسی میسر لەسەر ڕێککەوتنی جەزائیر و پشتکردنە شۆڕشی ئەیلوول، پرسیار لە شای ئێران بکات و بڵێت: چەندە بیرتکردەوە کاتێک بڕیارتدا هاوکاریی و پشتیوانیی شۆڕشی ئەیلول بوەستێنیت و بڕیاری کۆتاییهێنانی شۆڕش بدەیت؟ شای ئێران لە وەڵامدا دەڵێت: تەنها نزیکەی نێو خولەک بیرم لێکردەوە *٧

لە بەیانی ١١ی ئازارەوە هەتا هەرەس، لەو پێنج ساڵەدا کۆمەڵێک دیاردەی سیاسیی گرنگ و لەبیرنەکراو دروستبوون، هەتا ئەمڕۆیش ئەو دیاردانە دەنگ و ڕەنگیان لەسەر شێوازی بیرکردنەوە و هەڵسوکەوتی تاک و کۆی گەلی باشووری کوردستان نەسڕاوەتەوە.

### ١- ناکۆکیی و بێمتمانەیی:

سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول و حکومەتی عێراق متمانەیان بە یەکتر نەدەکرد، پەیوەندییان لەگەڵ ڕکابەرەکانی یەکتردا نەپچڕاند. مەلا مستەفا پەیوەندییەکانی لەگەڵ شای ئێران و ئیسرائیلدا بەردەوامدەکرد. ئەو وڵاتانەیش هەرچییان لەدەستبهاتایە بۆ پەکخستنی ڕێککەوتنی ١١ی ئازار دریغییان نەدەکرد. حکومەتی عێراقیش کە دەیبینی هێشتا مەلا مستەفا لەگەڵ ئەو وڵاتانەدا پەیوەندیی هەیە، کە دژایەتیی عێراق دەکەن، لە لای خۆیەوە گومانی لە مەلا مستەفا دەکرد، گەیشتبوویە ئەو باوەڕە کە ئەو وڵاتانە بۆ دژایەتیی عێراق و حیزبی بەعس شۆڕشی کورد بەکاردەهێنن. ئەو خێڵانەی دوژمنی بەرزانییەکان بوون لای حکومەتی عێراق مابوونەوە و دەسەڵاتیان هەبوو، بۆیە کاتێک حکومەتی عێراق داوای لە مەلا مستەفا کرد یەکێک لە کوڕەکانی پۆستی جێگری سەرۆککۆماری عێراق وەربگرێت و لە بەغدا نیشتەجێببێت، مەلا مستەفا گومانی لەو داوایەی عێراق هەبوو، لەوە دەترسا پیلانگێڕیی بێت بۆ ئەوەی کوڕەکەی بکوژن.

لە سەردانێکی ئیدریس بەرزانیی کوڕی مەلا مستەفادا بۆ بەغدا، ئیدریس بەر پەلامارێکی تیرۆریستیی کەوت و برینداربوو، گومانەکەی مەلا مستەفا هاتەدی. حکومەتی عێراق زیبارییەکانی بە تیرۆرەکەوە گلاند، بەڵام ئەو تێوەگلانەی زیبارییەکان بە هەوڵی تیرۆرکردنی ئیدریس بەرزانییەوە، متمانەی مستەفا بەرزانیی بە حکومەتی عێراق نەگەڕاندەوە جێگەی خۆی. لەو باوەڕەدا بوو کە ئەو پەلامارە بە پشتیوانیی و هاوکاریی حوکمەتی عێراق بووە.

ئەگەرچی بەیانی ١١ی ئازار بە فەرمیی گەلی کوردی لە عێراقدا ناسی، لە بەندێکی بەڵگەکەی حوکمی زاتییدا نوسرابوو ئەگەر هەر شار و شارۆچکەیەک لە سەرژمێرییدا زۆرینەی کورد دەرچوو، ئەو ناوچەیە دەخرێتە سەر سنووری حوکمی زاتیی، بەڵام بە شێوەیەکی کرداریی حکومەتی عێراق هەڵمەتی بەعەرەبکردنی کەرکوک و خانەقین و شەنگال و شارۆچکەکانی تری ناوچە دابڕەوەکانی کوردستانی دەستپێکرد و هەزاران کرێکار و کارمەندی کوردی لەسەر کار لادا و بەرەو پارێزگاکانی هەولێر و سلێمانیی و دهۆک ڕایگواستن. لە شوێنی کار و نیشتەجێبوونی کوردەکان، عەرەبی خوارووی عێراقی دەهێنایە کەرکوک و خانەقین و نیشتەجێیدەکردن.

ڕۆژانە لایەنگرانی هەردوولا، لە سنووری دەسەڵاتیاندا بە شێوازی دوژمنکارانە لەگەڵ یەکتر دەجوڵانەوە. بەم شێوەیە دەبینین لەبریی ئەوەی لایەنە ڕێککەوتووەکانی بەیانی ١١ی ئازار زەمینەی ڕێککەوتن و جێبەجێکردنی برگەکانی ئەو بەیاننامەیە ئامادەبکەن، میکانیزمی جێبەجێکردنی بۆ بدۆزنەوە، زەمینەی دوورکەوتنەوە و لێکدابڕانی کورد و حکومەتی عێراقیان خۆشدەکرد، زەمینەی هەڵوەشاندنەوەی ڕێککەوتنی ١١ی ئازاریان خۆشدەکرد. ئەو بێبڕوایی و گومانەی لەو کاتەوە لە نێوان حکومەتی ناوەندیی عێراق و شۆڕشی ئەیلودا دروستبووە، هەتا ئەمڕۆیش نەسڕاوەتەوە.

## ٢- ساڵ بە ساڵ خۆزگەم بە پار:

زۆرینەی سیاسەتمەداری سەردەمی شۆڕشی ئەیلول لەو باوەڕەدان کە حکومەتی عەبدولکەریم قاسم و کەسی قاسم خۆی، تێڕوانین و هەڵوێستی لەسەر دۆزی کورد لە تێڕوانین و هەڵوێستی سەدام حوسەین دیموکراتییتر بووە.

ساڵی ١٩٧٠ لە سەرەتای گفتوگۆی حکومەتی عێراق و سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلولدا، سەدام حوسەین بە ئەندازیاری حوکمی زاتیی کوردستان ناویدەرکرد، کەچی هەر ئەو سەدام حوسەینە ساڵی ١٩٨٨ کوردستانی کیمیاباران و ئەنفال کرد.

دەبوو لە دوای ١١ی ئازارەوە پاراستن و گەشەپێدانی ئەو دەستکەوتە، سیاسەتی هەموو گەلی کورد بایە، دەبوو کورد لە جێبەجێکردنی ئەو ئەرکەدا درێغیی نەکردایە، بەڵام سەرکردایەتیی سیاسیی ئەو کاتەی شۆڕشی ئەیلول، هێندە بەرژەوەندیی و دەستکەوتی گەلی کوردی لەبەرچاو نەبوو، لەبریی ئەوەی گوێ لە ڕاوبۆچوونی خەڵکی کوردستان بگرێت، پەیوەندییەکانی نێوان شۆڕشی ئەیلول و حکومەتی عێراق پێشبخات، گوێڕایەڵی داواکارییەکانی ئەو وڵاتانە بوو، کە لەگەڵ حکومەتی عێراقدا ناکۆکییان هەبوو، بەرژەوەندییان لە جێگیربوونی سیستەمی سیاسیی عێراقدا نەبوو. ساڵی ١٩٧١ مەلا مستەفا سەردانی تارانی کرد، لەگەڵ شای ئێران کۆبووەوە. ئامانج لە کۆبوونەوەکە ئامادەکاریی حکومەتی ئێران بوو بۆ هاوکارییکردنی گروپێک ئەفسەری سوپای عێراق هەتا دژی ڕژێمی بەعس کودەتا بکەن*٨.

پەیوەندییەکانی مەلا مستەفا لەگەڵ دەوڵەتی ئسیرائیل، قسەکردن لەسەر ئەوەی کە ئەگەر سوپای عێراق دژی ئیسرائیل لە شەڕی حوزەیرانی ١٩٧٣دا بەشدارییبکات، لە کوردستان پێشمەرگە پەلاماری سوپای عێراق بدات*٩. یەکێک لەو سیاسەتە هەڵانەی سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول بوو کە تیایدا بەرژەوەندیی گەلی کورد نەدەبینرا. ڕێککەوتنی ١١ی ئازار وەکو دەستکەوتێکی گەلی کورد نەبینرا.

لە نێوان ١١ی ئازاری ١٩٧٠ هەتا ١١ی ئازاری ١٩٧٤ بەڵگەی وامان دەستناکەوێت کە سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول بە گرنگییەوە سەیری ئەو ڕێککەوتنەیان کردبێت و کاریان بۆ پاراستن و جێبەجێکردنی کردبێت. لە ڕۆژانی کۆتایی وادەی جێبەجێکردنی ڕێککەوتنەکەدا، مەلا مستەفا بە پڕۆژەی کۆتایی ڕێککەوتنەکە ڕازینەبوو، یەکسەر بڕیاری دەستپێکردنەوەی شەڕی دەرکرد. مەلا مستەفا وەکو کەسێک کە خاوەنی هێزێکی هەرە گەورە بێت دوو پێشنیاز دەخاتە بەردەم ئیدارەی ئەمریکا. ١٨٠ ملیۆن دۆلار بۆ ئۆتۆنۆمیی کوردستان، یان ٣٦٠ ملیۆن دۆلار بۆ ڕاگەیاندنی حکومەتی سەربەخۆی کوردستان*١٠.

ئەم پێشنیاز و داواکارییانەی مەلا مستەفا بۆ ئەمریکا لە کاتێکدا بوو کە ئەمریکا لە سیاسەتی دەرەوەیدا لە ڤێتنام شکستیخواردبوو، لە ئاستی ناوخۆیی ئەمریکایشدا بەهۆی گەندەڵیی و ئابڕووچوونەکەی (واتەرگێتەوە) حیزبی کۆماری دەسەڵاتدار گەورەترین شکستی هێنابوو، پەرلەمانی ئەمریکیی دەستی لە قورگی حکومەتی ئەمریکا توندکردبوو، دەرفەت نەبوو حکومەتی ئەمریکا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا خۆی بە کێشەی کوردەوە خەریکبکات و خۆی دوچاری تەنگژەیەکی تری وەکو ڤێتنام بکات. دوای ڕاگەیاندنی پڕۆژەکەی حکومەتی عێراق لەمەڕ ڕێککەوتنی ١١ی ئازار، سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول بەبێ دودڵیی، بەبێ ئەوەی بیر لەوە بکاتەوە پێش هەڵگیرسانی شەڕ لە نێوان شەڕ و ئاشتییدا مەسافەیەکی فراوان بۆ تێکۆشانی دیبلۆماسیی هەیە، خەباتی پێشمەرگانەی بەرانبەر بە سوپای عێراق دەستپێکردەوە و بە پڕۆژەکەی حکومەتی عیراق ڕازینەبوو. دەرفەتێکی بۆ تێکۆشانی دیبلۆماسیی نەهێشتەوە، بەڵام دوای ساڵێک لە دەستپێکردنەوەی شەڕ، لە ئەنجامی ڕێککەتنی

٦ی ئازاری ١٩٧٥ جەزائیر لە نێوان شای ئێران و سەدام حوسەیندا، لە ماوەی چەند کاتژمێرێکدا شەڕی پێشمەرگانە ڕاگیرا و سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول داواکاریی خۆبەدەستەوەدانی پێشکەش بە حکومەتی عێراق کرد و حکومەتی عێراق پێی ڕازینەبوو.

بەو شێوەیە جارێکی تر کورد ناچاربوو سەیری دواوەی خۆی بکات و ناچاربوو بڵێت ساڵ بە ساڵ خۆزگەم بە پار.

### ٣- گەندەڵیی:

لە هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلولەوە هەتا ڕێککەوتنی ١١ی ئازار، لە لای پێشمەرگە و کادر و بەرپرسانی شۆڕش، هزری نیشتیمانپەروەریی و شۆڕشگێڕیی ئاستێکی سەرەتایی بە خۆیەوە بینی، ئامانجی سەرەکیی پێکهاتە ڕۆشنبیر و چەوساوەکانی ناو شۆڕش، ڕزگاربوونی کوردستان بوو. دوای بەیانی ١١ی ئازار، کاتێک شۆڕشگێڕەکانی دوێنێ دەستیان لە دەسەڵاتی ئەمڕۆ گیربوو، کاتێک برسییەکانی ماڵە جوتیارەکانی گوندەکانی کوردستان، ئارەزوویان بە خواردنە چەورەکانی ئۆتێلەکانی هەولێر و سلێمانیی و بەغدا کرایەوە، هەڵوێستی ڕاستەقینە کەوتە بەر تاقیکردنەوە.

دەسەڵات و دەستکەوتی مادیی یەکێک لە کێشە سەرەکییەکانی سیاسەتە، لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بەرنامەیەک بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە دانەنراوە، کاتێک لایەنێکی سیاسیی نیشتیمانیی دەگاتە دەسەڵات، هەڵوێست و بەرنامەکانی ڕابردوو و بەرژەوەندیی نیشتیمان فەرامۆشدەکات، بە هەموو لایەکدا پەلاماری دەسەڵاتی زیاتر و دەستکەوتی مادیی زیاتر دەدات.

کاتێک تاک و کۆی سیاسیی کورد لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٠دا بەشداریی دەسەڵاتی بەڕێوەبردن و سیاسەتی عێراقی کرد، وەکو هەر تاک و پێکهاتە سیاسییەکانی تری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، کەوتە داوی دەسەڵات و لەوێشەوە کەوتە دۆزینەوەی دۆست و هاوپەیمانی نوێ. پرسی کورد و ماندبوونی جوتیارانی کوردستان و خوێنی شەهیدانی کوردستانیان لەبیرچووەوە. دەسەڵات و دەستکەوتی مادیی هاتەپێشەوە و شوێنی دۆزی کوردی گرتەوە، هاوپەیمانی نوێ هاتەپێشەوە، دۆستایەتیی جوتیار و

بنەماڵەی شەهیدان لەبیرچووەوە. بەگوێرەی ڕێککەوتنی ١١ی ئازار، لە هەر شارێکی کوردستان حکومەتی عێراق سەدان هەتا هەزران خانووی بۆ بنەماڵەی شەهیدانی شۆڕشی ئەیلول دروستکرد. ئەو خانووانە بە شێوەیەکی نادادپەروەرانە بەسەر خێزانی شەهیداندا دابەشدەکران. چەندین کەسی سەرمایەدار و ئاغا و دۆستی بەرپرسەکانی پێشمەرگە، بەبێ ئەوەی شەهیدی هەبێت، خانووی شەهیدانی پێبەخشرا. سەدان خێزان و بنەماڵەی شەهیدانیش لە مافی خانوو_وەرگرتن بێبەشکران*١١. لە سەروبەندی بەیانی ١١ی ئازاردا، حکومەتی عێراق یاسای ژمارە ٩٠ی بۆ چاکسازیی کشتوکاڵ دەرکرد. ئەم یاسایە لە قازانجی جوتیاراندا بوو، بەڵام دەرەبەرگە دەستڕۆیشتووەکانی ناو شۆڕش، جارێکی تر ڕێگرییان لە جێبەجێبکردنی یاساکە گرت. بەو شێوەیە لە دوای بەیانی ١١ی ئازار بنەماڵەی شەهیدان و جوتیارانی کوردستان دڵیان لە شۆڕشی ئەیلول ڕەنجا و بڕوایان بە شۆڕش نەما.

دوای دەستپێکردنەوەی شەڕی نێوان هێزی پێشمەرگە و سوپای عێراق، لەبەرئەوەی شەڕ لە قۆناغی پارتیزانییەوە بەرەو قۆناغی بەرەیی چوو. بەشێکی زۆر لە خەڵکی باشووری کوردستان سنووری دەسەڵاتی حکومەتی عێراقی بەجهێشت و لە ئوردوگاکانی ئێراندا نیشتەجێکران. لە سەرسنوور و لە ناو ئوردوگای ئاوارەکاندا، چەندین بازار دروستکران. بازرگانیی گەشەیکرد، دەرفەتی گەندەڵیی و دەستبەسەرداگرتنی سامانی شۆڕش لە لایەن بەرپرسانەوە دەستیپێکرد، وایلێهات زۆر کەس لەپێناو دەستکەوتی مادییدا چەکی پێشمەرگایەتیی هەڵدەگرت.

لە کاتی هەرەسهێنانی شۆڕشدا خەڵکی کوردستان بەو کارەساتە زۆر نیگەران بوون، بەڵام لە تەنیشتی ئەو کارەساتەدا ئەوەیشیان لەبیرنەدەچوو و دەیانگێڕایەوە کە چۆن بەرپرسەکان لە ڕۆژانی کۆتایی شۆڕشدا دەستیان بەسەر پارە و شتومەکی فرۆشگاکاندا گرتووە.

پاش چەند ڕۆژێک لە کارەساتەکە، ڕۆژێک وەکو نەفەر لە ناو قەمەرەیەکدا لە هەڵەبجەوە بۆ سلێمانیی دەچووم، چەند نەفەرێکی تر لە قەمەرەکەدا بوون، دوو لە سەرنشینانی ناو قەمەرەکە باسیان لە ڕۆژانی کارەساتەکە دەکرد و باسەکەیان تەنها دەربارەی تاڵانیی بوو. یەکێکیان گوتی: ئەگەر کارەساتەکە دوو ڕۆژی تر دوابکەوتایە دەبوومە ملیۆنێر. لە دوای بەیانی ١١ی ئازار، لە دوای هەڵگیرسانەوەی

شەڕی ١٩٧٤ - ١٩٧٥، بەرپرسانی پێشمەرگە لە سایەی خەباتی پێشمەرگایەتییدا سامانێکی زۆریان پێکەوەنا. لەو کاتەوە پێشمەرگایەتیی بووەتە پیشەیەک بۆ دزیی و دەستبەسەرداگرتنی سامانی وڵات و دەوڵەمەندبوون. لەو کاتەوە دەوڵەمەندبوونی ناڕەوا یەک لەو شتانەیە کە پاڵی بە خەڵکەوە ناوە چەکی پێشمەرگایەتیی هەڵبگرێت، بۆ ئەوەی لە سایەی دەسەڵاتی تفەنگدا، سامان کۆبکاتەوە و دەوڵەمەندببێت.

## ٤- گەشانەوەی چەپڕەویی:

باشووری کوردستان وەکو هەر ناوچەیەکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە لەسەر بیروباوەڕی لیبراڵیی ئەورووپیی و مافی نەتەوەیی ئاشنایەتییەکی سەرەتایی پەیداکرد. لە جەنگی دووەمی جیهانییەوە ئاشنایەتیی لەگەڵ چەپ و کۆمۆنیزم پەیداکرد. بەو بیروباوەڕە ناکۆک و دژبەیەکانەوە، ڕێکخستنی سیاسیی دەهێنا و چالاکیی سیاسیی ئەنجامدەدا. هەر یەک لەو دوو تێزە سیاسییە باشتر خزمەتی بە دۆزی ڕەوای گەلی کورد بکردایە، جەماوەری کوردستان و ڕۆشنبیر و سیاسەتمەداری کورد، لەو بیروباڕوەرە نزیکدەبووەوە و سیاسەتی پێدەکرد و خزمەتیدەکرد.

لە چلەکانی سەدەی بیستەوە، باشووری کوردستان لە هزری چەپڕەویی نزیکبووەوە. ڕێکخراوی سیاسیی وەکو هیوا، شۆڕش، هەتا پارتیی دیموکراتی کوردستانی عێراقی پێدامەزراند. هەزاران کوردی باشووری کوردستان، ئەندام و کادر و بەرپرسی حیزبی شیوعیی عێراق بوون.

لە دوای هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلولەوە، کاریگەریی ئایدۆلۆژیای ڕاستڕەو و لیبراڵ کۆنترۆڵی چالاکیی پارتیی و شۆڕشی ئەیلولی کرد. هۆکاری وەرچەرخانی ئایدۆلۆژیای سیاسیی باشووری کوردستان لە چەپڕەوییەوە بەرەو ڕاستڕەویی، دەگەڕێتەوە بۆ:

١- شۆڕشی ئەیلول دژ بە حکومەتی عەبولکەریم قاسم بەرپابوو، ئەو حکومەتە ناسنامەی ڕژێمێکی چەپی لە خۆی دابوو.

٢- دەوڵەتی ئێران پشتگیریی شۆڕشی ئەیلولی دەکرد، ئێران ڕژێمێکی ڕاسترەوی پادشایەتیی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بوو.

٣- مەلا مستەفا سەرۆکی پارتیی بوو، لە یەکێتیی سۆڤیەت گەڕابووەوە، دژی سۆڤیەتیی و کۆمۆنیزم هەڵوێستی پیشاندەدا. باسی لایەنە خراپەکانی سیستەمی سۆڤیەتی دەکرد، بە پێچەوانەوە بە شان و باڵی ئەمریکا و ڕۆژئاوا و سیستەمی سیاسیی ڕاسترەودا هەڵیدەدا.

٤- لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٤دا چەپەکانی پارتیی (جەلالییەکان) جیابوونەوە، خۆیان ڕادەستی ڕژێمی عێراق کردەوە. ئایدۆلۆژیا و سیاسەتی چەپ هێندەی تر لەبەرچاوی خەڵکی کوردستان کەوت.

٥- لە ساڵی ١٩٧٣وە حیزبی شیوعیی عێراق لەگەڵ حکومەتی بەعسدا بەرەیەکیان دروستکرد. لە ساڵی ١٩٧٤ - ١٩٧٥ شیوعییەکانی عێراق شانبەشانی سوپای عێراق، شەڕی هێزی پێشمەرگە و شۆڕشی ئەیلولیان دەکرد.

٦- لە ساڵی ١٩٥٩وە ڕێکخراوێکی سیاسیی نهێنیی بە ناوی کۆمەڵەی ئازادیی و ژیانەوەی یەکێتیی کورد (کاژیک) لە ناو ڕیزەکانی پێشمەرگە و ڕۆشنبیرانی شۆڕشی ئەیلولدا دروستبوو، یەکێتیی سۆڤیەت و شیوعیەتی بە یەکەم دوژمنی دۆزی کورد دادەنا.

بەو شێوەیە لە ساڵی ١٩٦١ - ١٩٧٥ لە باشووری کوردستاندا چەپگەرێتیی لاوازبووبوو، جەماوەری کوردستان لێیدووردەکەوتەوە. خەڵکی کوردستان بە سەری مەلا مستەفا سوێندیاندەخوارد. ئێران و ئیسرائیل و ئەمریکایان بە دۆستی ڕاستەقینەی گەلی کورد دادەنا.

دوای ڕێککەوتنی جەزائیر شای ئێران مەلا مستەفای بانگکرد، داوایلێکرد کۆتایی بە شۆڕشەکەی بهێنێت. مەلا مستەفایش داوای لە هێزی پێشمەرگەی کوردستان کرد، کۆتایی بە شۆڕش بهێنن و خۆیان ڕادەستی حکومەتی عێراق بکەنەوە، یان لە ئێران وەکو ئاوارە بمێننەوە. لە ئەنجامی ئەو بڕیارەی مەلا مستەفاوە، دەیان هەزار پێشمەرگە و زۆرێک لە سەرکردەکانی شۆڕشی ئەیلول خۆیان ڕادەستی ڕژێمی سەدام کردەوە. ئەوانی تر لە ئێران و لە وڵاتانی ئەورپا ئاوارەبوون.

گەورەترین شۆڕشی گەلی کورد، کە بە دەیان هەزار پێشمەرگەی هەبوو، پشتگیرییەکی فراوانی جەماوەری کوردستانی هەبوو. هەزران پارچە چەکی هەمەجۆری ئەو سەردەمەی هەبوو. بودجەیەکی قەبەی لەبەردەستدا بوو. بە داوای شای ئێران، لەسەر بنەمای ڕێککەوتنی جەزائیری عێراق و ئێران، لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا دەستی لە خەباتی سیاسیی و پێشمەرگایەتیی هەڵگرت.

ڕێککەوتنی ٦ی ئازاری ١٩٧٥ی جەزائیر، لۆزانێکی تر بوو، ئەوەی لە هەمووی کارەساتاوییتر بوو، سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول گوێی لە داخوازیی گەلی کورد نەگرت و دژی ڕێککەوتنی جەزائیر بەرخودانی نەکرد، بەبێ مەرج و بەبێ ترس لە حوکمی مێژوو، بە گوێی شای ئێرانی کرد و کۆتایی بە شۆڕش هێنا.

بە کۆتاییهێنانی شۆڕشی ئەیلول لە لایەن سەرکردایەتیی ڕاستڕەوی کوردەوە، بە دەرکەوتنی ئەو ڕاستییە تاڵە کە ئێران و ئیسرائیل و ئەمریکا دۆستی کورد نین، بە ئاشکرابوونی ئەو پیلانگێڕییەی کە ئەمریکا و ئێران و ئیسرائیل لە شۆڕشی کوردیان کرد، گەلی کورد لە ناخیەوە ڕقی لە هزر و ئایدۆلۆژیای ڕاستڕەو هەڵگرت، جارێکی تر بە لای چەپگەرییدا بایدایەوە.

ئەو کەسانەی کە ئەندامی کاژیک بوون، زۆربەیان ئەوەیان بۆ ڕونبووەوە کە ئەمریکا و ئیسرائیل و سیستەمی سەرمایەداریی وەکو یەکێتیی سۆڤیەت دژی دۆزی ڕەوای گەلی کوردە، ڕوویان لە بیروباوەڕ و فەلسەفەی چەپ کرد. ئەو پارتییانەی بە سەری مەلا مستەفا سوێندیاندەخوارد، ڕۆژانە دەیان جار قسە و ناووناتۆرەی ناشیرینیان بە مەلا مستەفاوە دەنا. بیروباوەڕی ڕاستڕەو لە ناو کورددا ڕسوابوو. خەڵکی کوردستان جارێکی تر هەستی بۆ بیروباوەڕی چەپی مارکسیی بزواو لەگەڵیدا ئاشتبووەوە.

**سەرچاوەکان:**

١- مەسعود بەرزانیی، بارزانیی و بزوتنەوەی ڕزگارییخوازی کورد، ١٩٦١ – ١٩٧٥.

٢- د. فایەق گوڵپیی، کە لێرەوە سەیری ژیانی خۆم دەکەم، چاپی یەکەم، ٢٠١٨.

٣- مەسعود بەرزانیی، بارزانیی و بزوتنەوەی ڕزگارییخوازی کورد.

٤- د. فایەق گوڵپیی: کە لێرەوە سەیری ژیانی خۆم دەکەم.

٥- تارق عەزیز: پیاو و دۆز، چاوپێکەوتنی حەمیدە نەعنع.

٦- د. فایەق گوڵپیی: کە لێرەوە سەیری ژیانی خۆم دەکەم.

٧- موحەممەد حسنێن هەیکەل، مدافع ئایەتۆڵلا خۆمەینیی.

٨- مەسعود بەرزانیی، بەرزانیی و بزوتنەوەی ڕزگارییخوازی کورد ١٩٦١ - ١٩٧٥.

٩- مەسعود بەرزانیی، بەرزانیی و بزوتنەوەی ڕزگارییخوازی کورد.

١٠- بریان رۆبەرت گیبسن، ئەرێ کورد بوونە بەردەباز؟ وەرگێڕانی شەفیقی حاجی خدر.

١١- د. فایەق گوڵپیی: کە لێرەوە سەیری ژیانی خۆم دەکەم.

# ٧

# یەکێتیی (یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان) و شۆڕشی نوێ

دوای دەستپێکردنی شۆڕشی ئەیلول بە سێ ساڵ، ململانێ لە نێوان باڵی مەکتەبی سیاسیی پارتیی بە سەرۆکایەتیی ئیبراهیم ئەحمەد سکرتێری پارتیی و باڵی مەلا مستەفای بارزانیی سەرۆکی پارتیی دەستیپێکرد، زۆرینەی کادری ڕۆشنبیر و خەڵکی ناوچەی سۆران لەگەڵ باڵی مەکتەبی سیاسیی بوون. زۆرینەی سەرۆک_خێڵ و گوندنشین و خەڵکی ناوچەی بادینان لەگەڵ بارزانیی بوون. لە حوزەیرانی ١٩٦٤ باڵی مەکتەبی سیاسیی لە پارتیی و شۆڕشی ئەیلول جیابوونەوە.

مەلا مستەفا بەو جیابوونەوەیە ڕازینەبوو، بە هێزی پێشمەرگە پەلاماری بنکەکانی باڵی مەکتەبی سیاسیی دا. لە سنووری ناحیەی ماوەتەوە هەتا سنووری ئێران ڕاوینان. باڵی مەکتەبی سیاسیی بۆ ماوەی دوو ساڵێک وەکو ئاوارە لە ئێران و لە ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی بەرزانییدا مانەوە. ساڵی ١٩٦٦ باڵی مەکتەبی سیاسیی لەگەڵ حکومەتی عێراقدا ڕێککەوتن، بنکە و بارەگایان لە ناو شارەکانی کوردستان و عێراقدا کردەوە. لێرەوە ناکۆکیی لە نێوان هەردوولادا قووڵبوویەوە. خولی یەکەمی شەڕی براکوژیی باشووری کوردستانی لێکەوتەوە.

به پشتیوانیی تۆپ و تەیارە و هێزی چەکداری سوپای عێراق، باڵی مەکتەبی سیاسیی (جەلالییەکان) بۆ ماوەی چوار ساڵ دژی هێزی پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلول شەڕیانکرد. هێزی پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلولیش بە پشتیوانیی تۆپخانە و چریکی ئێران، وەڵامی هێرشی باڵی مەکتەبی سیاسیی دەدایەوە و گوند و شارەکانی ژێر دەسەڵاتی جەلالییەکانی بۆردوومانددەکرد.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٩ و سەرەتای ساڵی ١٩٧٠، شەڕ بە قازانجی باڵی بەرزانیی شکایەوە. حکومەتی ئەحمەد حەسەن بەکر ناچاربوو لەگەڵ باڵی بەرزانییدا ڕێکبکەوێت. لە ئەنجامدا بەیانی ١١ی ئازار دەرچوو. یەکێک لە مەرجەکانی باڵی بەرزانیی بۆ ئەو ڕێککەوتنە ئەوە بوو دەبێت حکومەتی عێراق چیتر هاوکاریی باڵی مەکتەبی سیاسیی نەکات، هێزی چەکدارییان هەڵبوەشێنێتەوە، ڕێکخستنە سیاسییەکەیان قەدەغەبکات.

حکومەتی عێراق بەو مەرجەی بەرزانیی ڕازیبوو، لە ماوەیەکی کەمدا هێزی چەکداریی جەلالییەکانی هەڵوەشاندەوە، ڕێکخستنەکەیانی قەدەغەکرد و ڕێگەی چالاکیی سیاسیی لێگرتن. لە ئەنجامدا باڵی مەکتەبی سیاسیی لە ڕووی سیاسیی و سەربازیی و جەماوەرییەوە شکستیهێنا و بڵاوەیلێکرد. هەندێکیان پەیوەندییان بە باڵی بەرزانییەوە کردەوە و لە ناو دەزگاکانی پارتیی و شۆڕشی ئەیلولدا وەرگیرانەوە و دەستیان بە کار و چالاکیی سیاسیی کردەوە. هەندێکیان وڵاتیان بەجێهێشت و ئاوارەی هەندەران بوون، هەندێکی تریان بە نهێنیی ڕێکخراوی سیاسییان دروستکرد. ئەو گروپەی بە نهێنیی کاریدەکرد لەگەڵ چەندیین کەسانی تری ڕۆشنبیر و چەپ و نیشتیمانپەروەردا، ڕێکخراوی کۆمەڵەی مارکسی-لینینی کوردستانیان دامەزراند.

هەموو گروپەکان لەوەدا یەکیاندەگرتەوە کە ئەو شکستەنەیان لەبیرنەچێتەوە، لە ساڵی ١٩٦٤ بە دواوە لەسەر دەستی باڵی بارزانییدا بەسەریاندا هات. ئەو شکستانە بوونە گرێکوێرەی ناو دڵ و دەرونیان، بە دوای تۆڵە و مافی خۆیاندا دەگەڕان. بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدا بوون دەرفەتێک بێتەپێشەوە هەتا لە لای خەڵکی کوردستان خۆیان بکرنەوە و تۆڵەی شکستەکانیان بکەنەوە.

ڕێکەوتنی ٦ی ئازاری ساڵی ١٩٧٥ نێوان شای ئێران و سەدام حوسەین، کۆتایی بە شۆڕشی ئەیلول هێنا. خەڵک ناوی ئاشبەتاڵیان لێنا. ئاشبەتاڵ باشترین دەرفەت بوو بۆ ئەوەی باڵی مەکتەبی سیاسیی پێگەی سیاسیی خۆیان بگێڕنەوە و تۆڵەی خۆیان لە مەلا مستەفا بکەنەوە، وەکو هێزێکی فریادڕەسی گەلی کورد دەست بە خەبات بکەنەوە.

کاتێک مەلا مستەفا بە گوێی شای ئێرانی کرد و بڕیاری ڕاگرتنی شەڕی پێشمەرگەی ڕاگەیاند، هێزی پێشمەرگە و دام ودەزگاکانی تری شۆڕشی ئەیلوولی هەڵوەشاندەوە. جەلالییەکان لە هەموو بەرەکانەوە هەستانە سەرپێ و بە خەڵکیان ڕاگەیاند:

وا بۆچوون و تێگەیشتنەکانمان لەسەر بەرزانیی و شۆڕشی ئەیلول ڕاست دەرچوو، کە چەندیین ساڵ لەمەوبەر ڕاماندەگەیاند، ئاشبەتاڵ سەلماندی مەلا مستەفا پیاوی شای ئێران و ئیسرائیل بووە. ئەم پڕۆپاگەندانەیان گەیاندە گوێی گەورە و بچووکی خەڵکی کوردستان، داوایان لە خەڵک دەکرد گوێ لە قسەی بەرزانیی نەگرن و وەکو سەرکردەی کورد سەیرینەکەن. پڕۆپاگەندەی باڵی جەلالیی بە سەرکەوتوویی کۆتاییهات. مەلا مستەفا و سەرکردەکانی شۆڕشی ئەیلولیان لەبەرچاوی خەڵکی کوردستان خست. پێش ڕێککەوتنی ٦ی ئازاری ١٩٧٥ی جەزائیر و بڵاوەپێکردنی شۆڕشی ئەیلوول، زۆرینەی خەڵکی کوردستان بە گیانی مەلا مستەفا سوێندیدەخوارد، بەڵام دوای ڕێککەوتنی ٦ ئازاری جەزائیر و بڵاوەپێکردنی شۆڕشی ئەیلوول، زۆرینەی خەڵکی کوردستان مەلا مستەفایان لەبەرچاو کەوت و قسەیان پێدەگوت. ڕێککەوتنی ٦ی ئازار و شکستی شۆڕشی ئەیلول، کەسێتیی سیاسیی جەلالییەکانی لە ناو خەڵکی کوردستاندا هەستاندەوە، لەوێشەوە هەوڵیاندا پێگەی سیاسییان بەهێزبکەنەوە.

ئەو کاتەی مەلا مستەفا جاڕی ڕاگرتنی تێکۆشانی سیاسیی و پێشمەرگانەی شۆڕشی ئەیلولی دا، ئەو کاتەی مەلا مستەفا داوای لە پێشمەرگە دەکرد چەک فڕێبدات و تەسلیمی عێراق ببێتەوە، یان لە ئێران وەکو پەناهندە بمێنێتەوە، بەعس لە عێراق و لە هەرێمی کوردستاندا ئاهەنگی سەرکەوتنی دەگێڕا، جاڕی کۆتاییهاتنی گیرفانی بەکرێگیراوی (شۆڕشی ئەیلول)ی دەدا، لەو کاتەدا ڕۆڵە دڵسۆزەکانی گەلی کورد لەو

باوەڕەدا نەبوون کە بەم نزیکانە هیچ هێزێکی کوردیی بتوانێت ئەو بۆشاییە سیاسییە پڕبکاتەوە، کە شۆڕشی ئەیلول لە ماوەیەکی کورتدا دروستیکرد.

لەو کاتەدا پاش ٣ مانگ لە کۆتاییهاتنی شۆڕشی ئەیلول، ژمارەیەک لە جەلالییەکان و چەند کەسێکی تری نیشتیمانپەروەر، دامەزراندنی یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستانیان (ی. ن. ک) لە ١/ ٦/ ١٩٧٥دا بە ڕابەرایەتیی مام جەلال تاڵەبانیی ڕاگەیاند. ساڵێک دوای ئەو ڕێکەوتە لە ١/ ٦/ ١٩٧٦ خەباتی چەکداریی (شۆڕشی نوێ) دەستپێکرد. هێزی پێشمەرگەی شۆڕشی نوێ هێرشی بۆ سەر سوپای عێراق و دامودەزگا سەرکوتکەرەکانی دەستپێکرد. دامەزراندنی حیزبێکی سیاسیی بۆ بەرەنگاربوونەوەی سیاسەتی تواندنەوەی کورد دوای سێ مانگ لە ئاشبەتاڵ، هیوای بۆ گەلی کورد گەڕاندەوە. ئەو بۆشاییە سیاسییەی پڕکردەوە، کە ئاشبەتاڵ بەجێیهێشتبوو. جاڕدانی خەباتی چەکداریی دوای ساڵێک لە دامەزراندنی یەکێتیی، کوردی توشی سەرسوڕمان کرد. خەڵکی کوردستان بڕوای نەدەکرد هەتا پەنجا ساڵی تر هیچ هێزێک بتوانێت خەباتی چەکداریی دژی ڕژێمی بەعس دەستپێبکاتەوە، کە یەکێتیی ئەو موعجزەیەی کرد، کۆمەڵگەی کوردستان باوەشی بۆ کردەوە، بە گەرمیی پێشوازییان لە دامەزراندنی یەکێتیی و لە شۆڕشی نوێ کرد*١.

ئەو پێکهاتەیە کە بە باڵی مەکتەبی سیاسیی، یان بە جەلالیی دەناسران، هاوکێشە سیاسییە خراپەکانی کۆمەڵگەی کوردستانی سەرەوبن کرد، ڕێز و پێگەی سیاسیی و جەماوەریی بۆ خۆی گێڕایەوە. لەگەڵ دەستپێکردنی شۆڕشی نوێ لە لایەن یەکێتییەوە سەرکردایەتیی کاتیی پارتیی دیموکراتی کوردستانیش (قیادە موقەتە) شۆڕشی گوڵانی وەکو بەردەوامی شۆڕشی ئەیلول ڕاگەیاند، بەڵام شۆڕشی گوڵان نەیتوانی لە پارێزگاکانی هەولێر و سلێمانیی و کەرکوک کاریگەریی لەسەر ڕوداوەکان هەبێت، شۆڕشی گوڵان کاریگەریی لەسەر پارێزگای دهۆک هەبوو.

ئەگەر بمانەوێت لە سیاسەتی سالانی ١٩٧٦ - ١٩٩١ شۆڕشی باشووری کوردستان تێبگەین، دەبێت قەڵەم لەسەر فەلسەفە و خەبات و تێکۆشانی یەکێتیی دابنێین.

### ١- یەکێتیی نیمچە_بەرەیە:

کاتێک یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان دامەزرا، خەڵکی کوردستان وایدەزانی حیزبێکی نوێ دامەزراوە، بەڵام لە ڕاستییدا یەکێتیی حیزب نەبوو، کۆبوونەوە و یەکگرتنی چەند حیزبێک و دەیان کەسایەتیی بوو.

پێش کۆتاییهاتنی شۆڕشی ئەیلول، کۆمەڵەی مارکسی-لینینی دامەزرابوو، بە نهێنیی چالاکیی دەکرد، کە یەکێتیی دامەزرا کۆمەلە پەیوەندیی بە یەکێتییەوە کرد.

دوای کۆتاییهاتنی شۆڕشی ئەیلول ژمارەیەک لە سیاسەتمەداران کە لە ناو پارتیی و شۆڕشی ئەیلودا پلەیان هەبوو، بزوتنەوەی سۆسیالیستیان دامەزراند. بزوتنەوەیش وەکو پێکهاتەیەکی تری سیاسیی ناو یەکێتیی، دەستی بە خەبات کرد.

لە ناو یەکێتییدا جێگەیەک بۆ کەسایەتیی سەربەخۆ و خەڵکی نیشتیمانپەروەر دانرابوو، ئەگەر ئەندامی ئەو دوو حیزبەیش نەبن دەیانتوانی لە ناو ڕیزەکانی یەکێتییدا وەکو خەتی گشتیی خەباتبکەن.

بەو شێوەیە یەکێتیی لە سەرەتا ڕێکخراوێکی سیاسیی نیمچە_بەرەیی بوو، لە کۆمەڵە و بزوتنەوە و خەتی گشتیی پێکهاتبوو. ئەم سێ لایەنە سیاسییە لە هەڵگیرساندنی شۆڕشی نوێدا بەشدارییانکرد.

ئەم شێوە ڕێکخستنە سیاسییە نوێیە، تەکتیکی مام جەلال بوو، بۆ ئەوە بوو ئەو کەسە نارەزاییانەی ناو پارتیی لەخۆبگرێت کە دوای ساڵی ١٩٧٥ دژی سیاسەتی سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول دەوەستانەوە. بۆ ئەوە بوو جەلالییەکان و مەلاییەکان لە چوارچێوەی ڕێکخستنێکی نوێدا کۆبکاتەوە و یەکیانبخاتەوە. بۆ ئەوە بوو مارکسیی و لیبراڵ و سەرۆک_خێڵەکانی کوردستان پێکەوە کۆبکاتەوە و ئاشتیی کۆمەڵایەتییان پێدروستبکات. بۆ ئەوە بوو زۆرینەی خەڵکی کوردستان لە ڕیزەکانی یەکێتییدا کۆبکاتەوە، یەکێتیی بکاتە هێزێکی سیاسیی جەماوەریی و لە کوردستانی دوای ئاشبەتاڵدا باڵادەستیی خۆی بسەلمێنێت. بۆ ئەوە بوو ناسنامەی یەک جۆر ئایدۆلۆژیا بەسەر یەکێتییدا ساخنەبێتەوە، بۆ ئەوەی جوڵەی دیبلوماسیی و مراوەغە سیاسییەکانی مام جەلال سنووردارنەکرێت.

ئەو ئامانجانەی کە مام جەلال دەیویست بەو شێوە ڕێکخستنە بەدەستیبهێنێت، سەرکەوتنێکی ئەوتۆی بەدەستنەهێنا، لەبەرئەوەی پەروەردەی سیاسیی لە ناو یەکێتییدا زۆر لاوازبوو، تەنها مام جەلال و چەند کەسێکی تر لە فەلسەفەی شێوە ڕێکخستنی یەکێتیی تێگەیشتبوون، مام جەلال هەوڵینەدەدا کادر و ئەندامەکانی لە گرنگیی ئەم شێوە ڕێکخستنەی یەکێتیی تێبگەیەنێت. هەوڵینەدەدا میکانیزمی بەردەوامبوونی ئەو شێوە ڕێکخستنە بدۆزێتەوە، ئەمە وایکرد ناکۆکیی لە ناو باڵەکانی یەکێتییدا پەرەبسێنێت، ناکۆکیی و دورکەتنەوە، هەڕەشە لە تەبایی و یەکگرتنی یەکێتیی بکات. یەکێتیی ڕووبەڕووی جیابوونەوە و لێکترازان بکات. بەو هۆیەیشەوە شۆڕشی نوێ ڕووبەڕووی شەڕی ناوخۆ بووەوە.

## ٢- پێکهاتە ناکۆکەکانی یەکێتی و شۆڕشی نوێ

شۆڕشی نوێ چەند پێکهاتەیەک بوو، پێکهاتەی یەکەم ئەو باڵەی مەکتەبی سیاسیی جاران بوو، کە بە جەلالیی ناسرابوون. ئەوان بۆ دەرفەتێک دەگەڕان هەتا ڕاستیی بۆچوونەکانیان دەربارەی سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول بخەنە بەرچاوی خەڵکی کوردستان و دڵسۆزیی خۆیان بۆ گەلی کورد پیشانبدەن. هەر لە هەمان کاتدا ئەم پێکهاتەیە کاریان بۆ ئەوە دەکرد تۆڵەی خۆیان لە باڵی بەرزانیی بکەنەوە، کە لە ساڵانی ١٩٦٤ - ١٩٧٠ شکستی گەورەی بەسەردا هێنابوون.

پێکهاتەی دووەمی شۆڕشی نوێ لە خەڵکی نیشتیمانپەروەر پێکهاتبوو، زۆربەیان گەنج بوون، پێشتر سیاسەتیان نەکردبوو. تەنها نیشتیمانپەروەر بوون، ئامادەبوون هاوکاریی هەر هێزێکی سیاسیی بکەن کە دژی سیاسەتی شۆڤینیی و فاشیی ڕژێمی عێراق بوەستێتەوە. ئەم پێکهاتەیە لەگەڵ ئەوەدا بوو کە نابێت ئەو هێزە سیاسییە نوێیە پشت بە ئێران و وڵاتانی تری داگیرکەری کوردستان ببەستێت، ئەم پێکهاتەیە زۆرینەی ئەندام و کادری کۆمەڵەی پێکدەهێنا.

پێکهاتەی سێیەم ئەو کادر و بەرپرسانەی پێش کارەساتی ١٩٧٥ پارتیی و شۆڕشی ئەیلول بوون، بڕوایان وابوو هێزێکی سیاسیی کوردستانی سەربەخۆ دوور لە کاریگەریی دامودەزگاکانی دەوڵەتی ئێران و دۆستەکانی بۆ بەرگرییکردن لە هەڵمەتی شۆڤینیستی ڕژێمی سەدام بۆ پاراستنی گەلی کورد پێویستییە و دەبێت

لەدایکببێت. ئەم پێکهاتەیە ڕەخنەی لە باڵی بەرزانیی دەگرت لەبەرئەوەی لە دوای ڕێککەوتنی جەزائیر بەبێ هیچ بەرخودانێک بە سوک و ئاسانیی دەستی لە تێکۆشان بەردا و کۆتایی بە شۆڕشی ئەیلول هێنا. ئەم پێکهاتەیە ڕەخنەی لە ڕابردووی سیاسیی باڵی مەکتەبی سیاسیی هەبوو، کە دژی شۆڕشی ئەیلول وەستان و هاوکاریی ڕژێمی عێراقیان کرد. ئەم پێکهاتەیە بە زۆریی لە ناو بزوتنەوەی سۆسیالیستی کوردستاندا بوون.

یەکێک لە داواکارییەکانی پێکهاتەی دووەم و سێیەم ئەوە بوو، کە دەبێت جەلالییەکانی ناو یەکێتیی و شۆڕشی نوێ، ڕەخنە لەو هەڵە سیاسییانەی ڕابردوویان بگرن و جارێکی تر بەسەر هەڵەکانیاندا نەچنەوە. لە سەرەتا مام جەلال و هاوڕێکانی بەو داوایە ڕازیبوون و گوتیان ڕەخنە لە خۆمان دەگرین، بەڵام بە شێوەیەکی فەرمیی هەتا ئەمڕۆ هیچ بەڵگەیەک نییە پیشانیبدات کە جەلالییەکان ڕەخنەیان لە هەڵەکانی خۆیان گرتووە. بەو شێوەیە جەلالییەکان ئەو پێکهاتە سیاسییانەیان هەڵخەڵەتاند و سودیان لە هێز و توانایان وەرگرت. ئەو پێکهاتنەیش کە هەستیانکرد ڕاوبۆچوونیان بە هەند وەرناگیرێت، دوچاری ساردبوونەوە هاتن و زۆریان لە یەکێتیی دوورکەوتنەوە.

### ٣- ناکۆکییە ئایدۆلۆژییەکان:

لە ڕووی ئایدۆلۆژییەوە یەکێتیی سێ گروپ بوو، کۆمەڵەی مارکسی-لینینی کوردستان، کە دوای چەند ساڵێک ناوی بۆ کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان گۆڕدرا. ئەم ڕێکخراوە لە خەڵکانی چەپی ڕۆشنبیر و خوێندەواری باڵی مەکتەبی سیاسیی و گەنجەکان پێکهاتبوو. بڕوایان وابوو بە ڕێکخراوێکی مارکسی-لینینی وەکو کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان (کۆڕەک) کێشەی نەتەوەیی گەلی کوردستان و کێشەی چەوسانەوەی چینایەتیی هەژارانی کوردستان چارەسەردەکرێت. کەسایەتیی دیار و سکرتێری ئەم ڕێکخراوە شەهید شەهاب و شەهید ئارام و نەوشیروان مستەفا بوون. پاش لەسێدارەدانی شەهاب لە ساڵی ١٩٧٦دا ئارام کەسی یەکەمی کۆمەڵە بوو. ساڵی ١٩٧٨ ئەویش شەهیدکرا. لەو کاتەوە هەتا کۆنگرەی یەکەمی یەکێتیی (١٩٩٢) کە کۆمەڵەی تێدا هەڵوەشایەوە، نەوشیروان

مستەفا سکرتێری کۆمەڵە بوو.ساڵی ١٩٨٤ لە کۆنگرەی سێیەمی کۆمەڵەدا کە لە مێرگەپان بەسترا، نەوشیروان مستەفا ڕایگەیاندا کۆمۆنیزم و مارکسیەت لە ئەورووپا گەڕ و گول بوون، پێویستە کۆمەڵە باز بەسەر هێڵی فکریی و سیاسیی مارکسیزمدا بدات و تێیپەڕێنێت. ئەم لێدوانەی سکرتێری کۆمەڵە، مارکسییەکانی ناو کۆمەڵەی نیگەرانکرد، هێندەی تر زەمینەی جیابوونەوەی ئالای شۆڕشی خۆشکرد.

ساڵی ١٩٨٥ ئالای شۆڕش لە کۆمەڵە جیابووەوە. ئیتر هزر و هەڵسوکەوتی مارکسییانە بە بڕیار و کرداری کۆمەڵەوە نەما. باڵەکانی تری ناو یەکێتیی بەم گۆڕانکارییە هزرییەی کۆمەڵە دڵخۆشبوون. ئەم هەڵوێست و لێدوانانەی نەوشیروان مستەفا ڕێگەی بۆ قایمکردنی بنەماکانی سیاسەتی مام جەلال خۆشکرد.

بزوتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان کە بە بزوتنەوە دەناسرا، ڕێکخراوێکی میانڕەوی نەتەوەیی سکۆلاری خێڵەکیی بوو. لەو کەسانە پێکدەهات کە پێشتر لە ناو پارتیی و شۆڕشی ئەیلولدا (باڵی مەلایی و جەلالیی) خەباتیانکردبوو. لای جەماوەری کوردستان ناسراوبوون. سەیدا ساڵەح یوسفیی و دکتۆر مەحمود عوسمان و ڕەسوڵ مامەند، کە پێشتر بەرپرسی دیاری شۆڕشی ئەیلول بوون لە دامەزرێنەرانی بزوتنەوە بوون. عەلی عەسکەریی و دکتۆر خالد سەعید و حسەین بابا شێخ کە پێشتر جەلالیی بوون لە ناو بزوتنەوەدا پێگەی بەهێزیان هەبوو. بەرپرسانی ئەم گروپەی ناو یەکێتیی وەکو سەرکردایەتیی کۆمەڵە بڕوایان بە ئایدۆلۆژیای مارکسی–لینینی نەبوو، لەگەڵ کۆمەڵەدا ناکۆکییان هەبوو. بڕوایشیان بە سەرکردایەتیی مەلا مستەفا نەمابوو، زۆرێک لە سیاسەتەکانی مەلا مستەفایان ڕەخنەدەکرد.

دەتوانین بڵێین ئەم گروپە لە یەک کاتدا باڵی لیبراڵ و باڵی خێڵەکیی یەکێتیی بوو. لەگەڵ ئەوەیشدا کە زۆرترین جەماوەری گوندنشینی کوردستانی لەگەڵ بوو، بەڵام لەبەرئەوەی ئەم باڵە خاوەنی ڕێکخستنێکی پتەو نەبوو، سکرتێرەکەی (سەیدا ساڵح یوسفیی) لە ناو شۆڕشدا نەبوو، زوو شەهیدبوو*٢. لە نێوان جەلالیی و مەلاییدا دەهاتن و دەچوون، نەیانتوانی کاریگەریی لەسەر سیاسەتی یەکێتیی دابنێن. ساڵی ١٩٧٩ زۆربەیان ڕیزەکانی یەکێتییان بەجێهێشت و حیزبی سۆسیالیستی کوردستان (حسک)یان دامەزراند. دوای ئەو جیابوونەوەیە، شەڕی براکوژیی لە نێوان حسک و یەکێتییدا دروستبوو. لە زۆربەی شەڕەکاندا حسک شکستیهێنا. بە ناچاریی حسک

پاڵی بە پارتیی دیموکراتی کوردستانەوە دا. لە بەرەی جود لەگەڵ پارتیی و شیوعیی و حیزبەکانی تردا درێژەی بە خەبات دا.

گرووپی سێیەمی پێکهێنەری یەکێتیی کە بە خەتی گشتیی دەناسرا، لەو کەسانە پێکهاتبوون کە ئەندامی ئەو دوو ڕێکخراوە (کۆمەڵە و بزوتنەوە) نەبوون. وەکو کەسایەتیی سەربەخۆ لە ناو یەکێتییدا کاریاندەکرد. ئەم جۆرە کەسانە لە سەرۆک_ خێڵ و کەسە ناودار و ئەکادیمییەکانی کوردستان پێکهاتبوون، کە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە لایەن سکرتێری گشتیی یەکێتییەوە سەرپەرشتییدەکران. دکتۆر فواد مەعسوم و دکتۆر کەمال فواد ئەندامی دیاری خەتی گشتیی بوون. ئەمانە بە تەواویی گرێدراوی سیاسەتی مام جەلال تاڵەبانیی بوون.

دروستبوونی یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان پاش سێ مانگ لە ڕێککەوتنی جەزائیر، بەو پێکهاتە کۆمەڵایەتیی و ئایدۆلۆژییە جیاوازەوە، دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکداریی پاش ساڵێک لە دامەزراندنی یەکێتیی، کاتێکی یەکجار کورت بوو، بۆ ئەوەی کادر و ئەندامانی ئەو سێ پێکهاتەیە و پێشمەرگە و ئەندامە نوێیەکان پێش دەستپێکردنی خەبات، تێگەیشتنێکی سیاسیی نزیک لە یەکیان هەبێت، بەرنامە و ستراتیژی هاوبەشیان هەبێت.

ئامانجی سەرکردایەتیی شۆڕشی نوێ ئەوە نەبوو پێکهاتەکانی ناو یەکێتیی لە یەک نزیکبکەنەوە و سیاسەتی قۆناغەکە هەڵبسەنگێنن و بەرنامەیەکی یەکگرتوو دابنێن. ئامانجی سەرەکیی سەرکردایەتیی شۆڕشی نوێ ئەوە بوو، بەپەلە چەند مەفرەزەیەکی پێشمەرگە بنێرنە شاخەکانی کوردستان، بۆ ئەوەی نیشتیمانپەروەریی و شۆڕشگێڕیی خۆیان بۆ خەڵکی کوردستان بسەلمێنن. بە پڕۆپاگەندەی پارتیزانیی بۆشاییە سیاسییەکە پڕبکەنەوە. ڕێگەنەدەن پارتیی خۆی کۆبکاتەوە و پێشمەرگە بنێرنەوە ناو خاکی کوردستان و جارێکی تر دەست بەسەر باشووری کوردستاندا بگرێتەوە.

ئەم هۆکارانە وایانکرد شۆڕشی نوێ سەرەتایەکی بەهێزی ئایدۆلۆژیی سیاسیی و ستراتیژی یەکگرتووی نەبێت، بێبەرنامەیی و بێپەروەردەیی کادر و پێشمەرگە هەر لە سەرەتای شۆڕشدا باڵ بەسەر چالاکییەکانی شۆڕشی نوێ و ڕێکخستنی یەکێتییدا بکێشێت، کاریگەرییە خراپەکانی بێستراتیژیی شۆڕشی ئەیلول، لە شۆڕشی نوێیشدا دووبارەببێتەوە.

### ٤- پەروەردەی سیاسیی و سەربازیی:

کاتێک ئەندامێکی ڕێکخستنی یەکێتیی پەیوەندیی بە هێزی پێشمەرگەوە دەکرد، یەکێک لە ئاواتەکانی ئەوە بوو کە لە کەشوهەوایەکی ئازاددا ئاستی سیاسیی و ئایدۆلۆژیی خۆی پێشبخات. لە سەرکردەکانیەوە فێری سیاسەت ببێت و گەشە بە خۆی بدات، بەڵام کاتێک ئەندام و کاردەکانی کۆمەڵە و ڕێکخراوەکانی تری یەکێتیی لە شار دەردەچوون و پەیوەندییان بە هێزی پێشمەرگەوە دەکرد، دەیانبینی ئەو بەڵگەنامە و پەرتوک و بەیان و وتارانەی لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی سەردەمی شۆڕشدا بڵاودەکرێنەوە، بەشی پەروەردە و فێرکردنی ئەندام و کادری سیاسیی ناکات، سەرکردەکانی شۆڕش و حیزب هێندە گرنگیی بە پەروەردە و پێوانەی ڕێکخستن نادەن، کۆڕ و کۆبوونەوە و سمیناریان بۆ ناگرن، پرتەوبۆڵە و ساردبوونەوە و گیروگرفتی ئایدۆلۆژیی و سیاسیی لە ناو ڕیزەکانی یەکێتییدا دروستدەبوو.

سەرکردایەتیی یەکێتیی تەنها گرنگیی بە خەباتی چەکداریی دەدا، کادری سیاسیی و ڕێکخستنی پشتگوێدەخست. پشتگیریی کادرە سەربازییەکانی دەکرد، بەڵام خەباتی پێشمەرگایەتییش سەرەتایی و خێڵەکیی بوو. ڕۆشنبیری سەربازیی و هونەری شەڕ لە کاری پێشمەرگایەتییدا گرنگیی پێنەدەدرا. لە سەرەتا هەندێک کادری سەربازیی یەکێتیی سەردانی سوریا و لوبنانیان کرد، خولێکی پەروەردەیی سەربازییان لە لای فەلەستینییەکان بینی. هەندێک لەو کادرانە هەوڵیان هەبوو بۆ ئەوەی پەروەردەیەکی زانستیی بۆ شەڕی پارتیزانیی لە ناو هێزی پێشمەرگەدا پەرەپێبدەن، بەڵام ئەو کادرانە لە لایەن سەرکردەکانی یەکێتییەوە پشتگیرینەکران، پەراوێزدەخران و کارەکانیان بە کەم و بێبایەخ سەیردەکرا. هەردوو خوالێخۆشبوو مامۆستا ئەنوەر (ڕەفیق) و (غەریب عەسکەریی)، بۆ شارەزاکردنی پێشمەرگە بە چەکەکانی شانیان، بۆ پەیڕەوکردنی پێوانە و بنەماکانی ڕەوشت و خەباتی پێشمەرگایەتیی،ناملکەیان نوسی و خولی پەروەردەیان کردەوە، بەڵام سەرکردایەتیی شۆڕشی نوێ لاقرتیی (گاڵتەیان) بە کارەکانیان دەکرد، حەزیاننەدەکرد پێشمەرگە گرنگیی بە وانەکانیان بدات *٣

بۆیە دەتوانین بڵێین لە ناو شۆڕشی نوێدا گرنگیی بە بەرنامەی سیاسیی و پەروەردەکردنی پێشمەرگە و گۆڕینی کەسێتیی مرۆڤی کورد نەدرا. بەرنامەیەک نەبوو پێشمەرگە فێری سیاسەت بکرێت و خەباتی پێشمەرگایەتیی پێشبخات. ئەمە وایکرد شۆڕشی نوێ وەکو شۆڕشی ئەیلول بەرنامە و ستراتیژی نەبێت، بەڵام وەکو شۆڕشی ئەیلول هەوڵی پاشەکشێپێکردنی تاک و کۆمەڵگەی کوردستانی نەدەدا، هەوڵیدەدا تاک و کۆمەڵگەی کوردستان پێشنەکەوێت و لە شوێنی خۆیدا بوەستێت، بۆیە ڕیزەکانی بۆ مانەوەی هزری خێڵەکیی و هزری ڕاپایی بۆرژوازی بچووکی کوردستان دەگونجا. ئیتر هزر و کەلتوری پێکهاتە کۆمەڵایەتییە باوەکانی کوردستان کە بە ژەهری داگیرکەران ئاودەدرا، باڵی بەسەر هزر و کەلتوری سەرکردە و کادر و پێشمەرگەی شۆڕشی نوێدا دەکێشا. لە شۆڕشی نوێیشدا گۆڕان و پێشکەوتنی هزریی دروستنەدەبوو.

### ٥- سیاسەتی نانەتەوەیی

لە دەستپێکردنەوەی شۆڕشی نوێدا، یەکێتیی باسی لە کۆمەڵێک بنەما و پێوانەی نەتەوەیی و شۆڕشگێڕیی دەکرد، پشتبەستن بە هێزی گەل، شوێننەکەوتنی سیاسەتی وڵاتانی داگیرکەری کوردستان، گرنگیدان بە یەکێتیی نەتەوەیی گەلی کورد، هەندێک لە بنەماکانی سیاسەتی یەکێتیی بوون.

ئەو چەمکە نەتەوەیی و سیاسییانەی یەکێتیی باسی لێوەدەکرد، هێندەی تر یەکێتیی و شۆڕشی نوێی لە خەڵکی کوردستان نزیکدەکردەوە، لە ئاستی باشووری کوردستاندا شۆڕشی نوێ پێگەیەکی جەماوەریی پەیداکرد، خەڵکی کوردستان بە گیان و بە سامان هاوکاریی شۆڕشی نوێیان دەکرد. خەڵکی ڕۆژهەڵاتی کوردستان و باکووری کوردستانیش باوەشیان بۆ یەکێتیی دەکردەوە، هاوکاریی مادییان دەکرد. چەک و تەقەمەنیان بۆ پەیدادەکرد، پڕۆپاگەندەی سیاسییان بۆ دەکرد و پێگەی شۆڕشی نوێیان قایمتر دەکرد.

دوای ماوەیەک پارتیی بە ناوی شۆڕشی گوڵانەوە سەری بە کوردستاندا کردەوە، وڵاتانی ناوچەکە پشتیوانیی پارتییان دەکرد. لە شەڕی براکوژیی هەکارییدا، یەکێتیی شکستێکی گەورەی بەسەردا هات *٤. ململانێی نێوان یەکێتیی و پارتیی تاویسەند،

لەبریی ئەوەی بۆ ململانێی پارتیی، یەکێتیی پەنا بۆ میکانیزمی تایبەتی خۆی ببات، دەستیدایە ئەو میکانیزمانە کە ساڵانێک بوو پارتیی بەکاریدەهێنان. وردە وردە لە پێوانە و بنەما نەتەوەیی و شۆڕشگێڕییەکانی دوورکەوتەوە، هەوڵیدەدا لە ململانێی نێوان پارتیی و یەکێتییدا ئێران و تورکیا و عێراق بێلایەنبکات، یان پشتیوانیی ئەو وڵاتانە بۆ خۆی دژی پارتیی دەستەبەربکات. بەو هیوایە دەستی بە دروستکردنی پەیوەندیی ناهاوسەنگ لەگەڵ ئەو وڵاتانەدا کرد. ئەو پەیوەندییانەیش لەسەر حسابی گەلی کورد و شۆڕشی نەتەوەیی تەواودەبوون.

لە سەرەتای دروستبوونی شۆڕشی نوێدا، یەکێتیی پشتی بە هاوکاریی کوردەکانی باکوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان دەبەست، بە چەندیین شێوە هاوکاریی شۆڕشی نوێیان کرد، بەڵام کاتێک بینی هاوکارییەکانی باکوور و ڕۆژهەڵات لەو قۆناغەدا پێویستییەکانی تێرناکات، ئەو جۆرە پەیوەندییانەی نێوان گەلی پارچەکانی تری کوردستان و نێوان یەکێتیی ئاستەنگیی بۆ پەیوەندیی لە نێوان وڵاتانی وەکو ئێران و تورکیا دروستدەکات، لەگەڵ هاوپەیمانە کوردستانییەکانی ڕۆژهەڵات و باکووری کوردستان پەیوەندییەکانی ساردکردەوە. لە ڕێگەی نوێنەری ئاشکرا و نهێنییەوە خۆی لە حکومەتەکانی عێراق و ئێران و تورکیا نزیکدەکردەوە. لەسەر حسابی کێشەی نەتەوەیی گەلی کوردستان، سەودا و مامەڵەی لەگەڵ ئەو وڵاتانەدا دەستپێکرد.

پشتی لە گەلی کوردستان و کێشە ڕەواکەی کرد، بەڵام وەکو سەردەمی شۆڕشی ئەیلول سەرکردەکانی شۆڕشی باکوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستانی دەستگیرنەدەکرد، ڕادەستی ڕژێمەکانی تورکیا و ئێرانی نەدەکردنەوە، هەوڵیدەدا لە ڕووی سیاسییەوە هاوکاریی ڕژێمە داگیرکەرەکانی کوردستان بکات. لەپێناو ڕازیکردنی وڵاتانی داگیرکەری کوردستان هەوڵیدەدا حیزب و ڕێکخراوە سیاسییەکانی پارچەکانی تری کوردستان لە ڕێبازی نەتەوەیی لابدات، فێری ژیانی بێتێکۆشانیان بکات، هەتا لە ڕێبازی نەتەوەیی و دیموکراتیی دووربکەونەوە و ڕێبازێکی خۆبەدەستەوەدەر پەیرەوبکەن. لەوێیشەوە تێکۆشان سستببێت و گەل لە تێکۆشان ساردبکەنەوە و کێشەی کورد لە شوێنی خۆیدا بوەستێت.

### ٦- جاشایەتیی بەردەوامدەبێت:

بۆ سنووردارکردنی دیاردەی جاشایەتیی و ڕێگەگرتن لە گەشەکردنی، شۆڕشی نوێ هیچ بەرنامەیەکی نەبوو، نەک هەر ئەوە، بەڵکو زۆرێک لە سیاسەتە ناوخۆییەکانی شۆڕشی نوێ، هانی دیاردەی جاشایەتیی دەدا. شۆڕشی نوێیش وەکو شۆڕشی ئەیلول دیموکراسیی نەبوو، بەگوێرەی یاسا و پێوانەی حیزبیی لێکۆڵینەوە لەسەر کێشە ناوخۆییەکان نەدەکرا. کادر و پێشمەرگە هەڕەمەکیی سزادەدران. بە بنەماگرتنی پێوانەی دۆستایەتیی و خزمایەتیی و ناوچەگەرێتیی لە پشتگیریی و پشتبەردانی کادر و پێشمەرگەدا بە ڕوونیی دەبینرا. تووڕەبوونی بەرپرسەکان و قسەی سوێر، پێشمەرگە و کادری لە تێکۆشان سارددەکردەوە. پشتیان لە خەبات دەکرد و پەیوەندییان بە ڕیزی هێزە چەکدارەکانی ڕژێمی عێراقەوە دەکرد، چەکی پێشمەرگایەتییان بە چەکی جاشایەتیی دەگۆڕییەوە. لە دوای ڕاپەڕین و ڕوخانی ڕژێمی سەدام چەندین مستەشار و فەرماندەی سریە لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە هاواریاندەکرد، کە لەسەر پێشنیاز و داواکاریی و ڕازیبوونی پارتیی و یەکێتیی چەکی جاشایەتییان بۆ حکومەتی عیراق هەڵگرتووە. هیچ یەکێک لە بەرپرسانی پارتیی و یەکێتیی لێدوانی ئەو سەرۆک_جاشانەی ڕەتنەکردەوە.

هەتا ئێستا لەسەر پشتگیرییکردنی دیاردەی جاشایەتیی لێکۆڵینەوە نەکراوە، کە بۆچی سەرکردەکانی شۆڕش داوایان لە پێشمەرگە و سەرۆک_خێڵ کردووە چەکی جاشایەتیی هەڵبگرن، سەرکردەکانی شۆڕشی نوێ و شۆڕشی گوڵان هەر بیانوویەک بۆ ئەم سیاسەتە هەڵەیە بهێننەوە ناتوانن بڕوا بە خەڵکی کوردستان بهێنن، کە لەپێناو دەستکەوتی گەلی کورددا بڕیارێکی وایان داوە. لەبەرئەوەی دیاردەی جاشایەتیی یەکێک لەو ئاستەنگییە سەرەکییانە بوو کە ناسین و چارەسەرکردنی کێشەی کوردی دوادەخست، لە ڕووی ئەخلاقی کۆمەڵایەتیی و سیاسییشەوە، تاک و کۆمەڵگەی کوردستانی دەخست و کەسێتیی کوردی دەشکاند.

هەر کە شۆڕشی نوێ دستپێکرد، شۆڕشی گوڵان سەریهەڵدا. ملاملانێی دەسەڵاتخوازیی و پاوانکردنی ناوچە ڕزگارکراوەکانی کوردستان، لە نێوان پارتیی و یەکێتییدا دەستپێکرد. لەبەرئەوەی هەردوو لایەنەکە بە شێوەیەکی دیموکراتیی لەگەڵ یەکتر هەڵسوکەوتیان نەدەکرد و هەوڵی لەناوبردنی یەکتریان دەدا. لەو ناوچانەی پارتیی خۆی دەسەپاند، لایەنگرانی یەکێتیی بۆ خۆپاراستن لە شەڕی

ناگەهان، لە حکومەت نزیکدەبوونەوە و چەکیان بۆ ڕژێم هەڵدەگرت. وەکو ئەوەی کە لە شەڕی هەکاریی ساڵی ١٩٧٨دا ڕویدا. لەو ناوچانەیشدا کە یەکێتیی خۆی دەسەپاند، لایەنگرانی پارتیی بۆ خۆپاراستن لە شەڕی ناگەهان، لە حکومەتی عێراق نزیکدەبوونەوە و چەکیان هەڵدەگرت. لە هەندێک ناوچەی وەکو گەرمیان لە ئەنجامی شەڕی بەردەوامی نێوان پێشمەرگەی پارتیی و یەکێتییدا، پێشمەرگەکانی پارتیی خۆیان پێڕانەگیرا و تەسلیمی حکومەتی عێراق بوونەوە، چەکی جاشەیەتییان بۆ حکومەت هەڵگرت و وەکو ڕێکخستنی پارتیی کاریاندەکرد.

### ٧- شەڕی براکوژیی:

شەڕی براکوژیی بە تایبەتمەندییەکی سیاسەتی باشووری کوردستان دەژمێردرێت. لە ساڵی ١٩٦٤ -٢٠٠٣ شەڕی براکوژیی خەباتی باشووری کوردستانی لەکەدارکردووە، ئاشتیی کۆمەڵایەتیی کوردستانی تێکدا، تێکۆشانی ئازادیی گەلی کوردی دواخست. بە شێوەیەکی گشتیی شەڕی براکوژیی باشووری کوردستان چوار خولی سەرەکیی بە خۆیەوە دیوە.

### ا- خولی یەکەم:

ساڵی ١٩٦٤ دەستپێکرد، ساڵی ١٩٧٠ کۆتاییهات. ئەو شەڕە کاتێک دروستبوو کە دوبەرەکیی و جیابوونەوەی ساڵی ١٩٦٤ پارتیی و شۆڕشی ئەیلول ڕویدا. باڵی مەکتەبی سیاسیی ڕەخنەیان لە سیاسەتی سەرۆکی پارتیی و ڕابەری شۆڕشی ئەیلول مستەفا بەرزانیی دەگرت. مستەفا بەرزانیی بە هەڕەشە وەڵامی ڕەخنەکانی دەدانەوە. ئەوانیش دژی بەرزانیی وەستانەوە. بەشێکی حیزب و هێزی پێشمەرگەی کوردستانیان لە بەرزانیی دابڕی، بەرزانیی ئەو دابڕانەی پێ هەرسنەکرا، پەلاماریدان و یەکەم خولی شەڕی براکوژیی دەستپێکرد. هەوڵێکی زۆردرا بۆ ئەوەی شەڕەکە لەوە زیاتر تەشەنەنەکات، بەڵام لایەنە ناکۆکەکان ئاشتنەبوونەوە و ڕێکنەکەوتن. دوای دوو ساڵ لە چەخماخەی یەکەمی شەڕی براکوژیی ساڵی ١٩٦٦ شەڕی براکوژیی قوناخێکی مەترسییداری بە خۆیەوە بینی. باڵی مەکتەبی سیاسیی خۆیان

ڕادەستی حکومەتی عێراق کردەوە. لەگەڵ حکومەتی عێراقدا ڕێککەوتن بۆ ئەوەی شەڕی باڵی مەلا مستەفا بکەن. لەم قوناغەدا شەڕی براکوژیی بە شەڕی جەلالیی و مەلایی دەناسرا. باڵی مەکتەب سیاسیی (جەلالیی) هاوکاریی سەربازییان لە حکومەتی عێراق وەردەگرت. بێجگە لە چەک و تەقەمەنییەکانی دەستیان، هەندێک جار سوپای عێراق بە تۆپ و دەبابە و بە فڕۆکەی جەنگییش هاوکارییدەکردن. مەلاییەکانیش لە لایەن ئێرانەوە بە چەک و تەقەمەنیی و تۆپخانە و چریک هاوکارییدەکران، بۆ ماوەی چوار ساڵ پێشمەرگەکان دوژمنی کوردیان لەبیرکرد، هەزاران ڕۆڵەی کورد کوژران و بیرنداربوون، کۆمەڵگەی کوردستان بەسەر دوو پێکهاتەی شەڕکەردا دابەشبوو، ئاشتیی کۆمەڵایەتیی کوردستان تێکچوو، چارەسەری کێشەی کورد دواکەوت.

ساڵی ١٩٧٠ بەبێ ئاگادریی جەلالییەکان، گفتوگۆی نێوان حکومەتی عێراق و شۆڕشی ئەیلول دەستپێکرد، لە ١١ی ئازاری ئەو ساڵەدا عێراق و بەرزانیی لەسەر بەیانی ١١ی ئازار ڕێککەوتن. بەندێکی بەیانی ١١ی ئازار چەککردن و کۆتاییهێنانی جەلالییەکان بوو، حکومەتی عێراق لە ماوەیەکی کورتدا ئەو بەندەی جێبەجێکرد، ئاشبەتاڵی بە جەلالییەکان کرد و خولی یەکەمی شەڕی براکوژیی کۆتاییهات.

### ب- خولی دووەمی شەڕی براکوژیی:

خولی دووەمی شەڕی براکوژیی لە ساڵی ١٩٧٦ دەستپێکرد، هەتا ساڵی ١٩٨٦ بەردەوامبوو. لەم خولەی شەڕدا پارتیی دەستپێشخەرییدەکرد، سەرەتا بە تەنها شەڕ لە نێوان پێشمەرگەی پارتیی و پێشمەرگەی یەکێتییدا دروستدەبوو. گرنگترینی ئەو شەڕانە، شەڕی ئەشکەوتی پاڤێ و شەڕی کارساتی هەکارییە، کە لە ساڵانی ١٩٧٧ - ١٩٨٧ لە ناوچەی بادینان لە نێوان پێشمەرگەی شۆڕشی گوڵان و پێشمەرگەی شۆڕشی نوێدا دروستبوو، شەڕەکان بە سەرکەوتنی پارتیی کۆتاییهات*٤.

لە ساڵانی دواتردا کە حسک لە یەکێتیی جیابووەوە، ناکۆکیی لە نێوان پاسۆک و یەکێتییدا دروستبوو. حیزبی شیوعیی عێراق لە دژی ڕژێمی عێراق دەستی بە خەباتی چەکداریی کرد. شەڕی براکوژیی لە نێوان و یەکێتیی و حسک و پاسۆک

و شیوعیی و پارتییدا دروستبوو. لەم شەڕانەدا یەکێتیی دەستپێشخەریی شەڕی دەکرد. گرنگترین ئەو شەڕانە، شەڕی شەهیدکردنی شێرکۆی شیخ عەلی فەرماندەی هێزی سەربازیی حسک بوو، کە ساڵی ١٩٨١ لە نێوان یەکێتیی و حسکدا لە دۆڵی جافایەتیی ڕویدا. شەڕی گوندی گەڕەدێی ناوچەی شارباژێڕ کە لە نێوان پێشمەرگەی یەکێتیی و پیشمەرگەی پاسۆک روویدا. شەڕی قرناقە و پشتئاشانی قەندیل کە لە نێوان پێشمەرگەی یەکێتیی و پێشمەرگەی بەرەی جوددا بوو. لەم شەڕانەدا یەکێتیی سەرکەوتنی بەسەر لایەنەکانی تردا بەدەستهێنا.

ساڵی ١٩٨٦ سەرۆک_کۆماری ئەو سەردەمەی ئێران ڕەفسنجانیی، کەوتە نێوان پارتیی و یەکێتییەوە، ئاشتیکردنەوە و داوایلێکردن کۆتایی بە شەڕی ناوخۆ بهێین. مام جەلال و ئیدریس بەرزانیی نوێنەری یەکێتیی و پارتیی بوون، بە پێشنیازەکەی ڕەفسنجانیی ڕازیبوون و کۆتاییان بە خولی دووەمی شەڕی براکوژیی هێنا.

## ج- خولی سێیەمی شەڕی براکوژیی:

ئەم خولە ساڵی ١٩٩٤ دەستیپێکرد، ساڵی ٢٠٠٣ کۆتاییهات. ئەم خولە دوای ڕاپەڕیین و هەڵبژاردنی پەرلەمان و پێکهێنانی حکومەتی هەرێم دەستیپێکرد. لەو کاتەدا بوو کە پارتیی و یەکێتیی نیو بە نیو لە پەرلەمان و لە حکومەتدا حوکمڕانی هەرێمی کوردستان بوون. بزوتنەوەی ئیسلامیی، حسک، حیزبی شیوعیی کوردستان، لە دەرەوەی دەسەڵاتدا بوون. سەرەتا لە ناو شاری سلێمانیی شەڕێکی کورتخایەن لە نێوان حسک و پارتییدا دروستبوو، ئەو شەڕە زوو کۆتاییهات و حسک و پارتیی ئاشتبوونەوە. پاش ماوەیەک شەڕی یەکێتیی و بزوتنەوەی ئیسلامیی دەستیپیکرد، شەڕەکە شاری ڕانیە و سلێمانیی و کەلار و هەڵەبجەی گرتەوە، لەو شەڕەدا بارەگای سەرکردایەتیی بزوتنەوە لە لایەن پێشمەرگەکانی یەکێتییەوە دەستی بەسەردا گیرا. بزوتنەوەی ئیسلامیی هێزەکانی خۆی کۆکردەوە و لە ناوچەی هەورامان و هەڵەبجە جێگیریکردن، هەتا ساڵی ٢٠٠٣ دەسەڵاتداری ئەو دەڤەرە بوو.لە ١/ ٥/ ١٩٩٤ لە سلێمانیی و دهۆک شەڕی نێوان پارتیی و یەکێتیی دەستیپێکرد. یەکێتیی پارتیی لە سلێمانیی دەرکرد، پارتییش یەکێتیی لە دهۆک دەرکرد. دواتر ئاگری شەڕەکە بەرەو هەولێر کشا. پاش چەندیین شەڕی خوێناویی، یەکێتیی پارتیی لە هەولێر دەرکرد و کۆنترۆڵی شارەکەی کرد. هەتا ٣١ی

ئابی ١٩٩٦ هەولێر بە دەستی یەکێتییەوە مایەوە. ڕۆژی ٣١ی ئاب بە هاوکاریی سوپای عێراق پارتیی یەکێتیی لە شاری هەولێر دەرکرد*٥.

خولەکانی تری شەڕی براکوژیی، لە شاخ و دەشتی گوندەکانی کوردستاندا دەکران. خولی سێیەم لە ناو شارەکانی کوردستاندا دەستپێکرد. خولی سێیەم کاتیک دەستپیکرد ماوەی هەشت ساڵ بوو پارتیی و یەکێتیی شەڕیان نەکردبوو، لە بەرەی کوردستانیی و لە پەرلەمانی کوردستان و لە حکومەتی هەرێمدا هاوپەیمان بوون. لە کاتێکدا دەستپێکرد کە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیی پشتگیریی دۆزی کوردی دەکرد، ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتیی بۆ پاراستنی هەرێمی کوردستان بڕیاری ٦٨٨ دەرکردبوو. ڕێکخراوە خێرخوازەکان کوردستانیان ئاوەداندەکردەوە. وڵاتە باڵادەستەکانی جیهان بڕیاری کردنەوەی قونسڵی خۆیان لە هەرێمی کوردستان دابوو، کەچی هەردوو حیزبی دەسەڵاتدار نابەرپرسانە دژی یەکتر بۆ بەرژەوەندیی دەسەڵاتی خۆیان دەستیان بە خولێکی تری شەڕی براکوژیی کردەوە.

شەڕی ئەم جارە لە کاتێکدا بوو هێزی پێشمەرگە چەک و جبەخانە و چەکی قورسی زۆرتری هەبوو، کەچی هێزە بەشەڕهاتووەکان بە چەکە قورسەکانی دەستی خۆیانەوە دڵیان ئاوینەخواردەوە شەڕی یەکتر بکەن، بۆ لابەلاکردنەوەی شەڕەکە سوپای ئێران و عێراق و تورکیا و ئەمریکایان بانگهێشتدەکرد، هێندەی تر شەڕیان قورسدەکرد و ڕۆڵەی زۆرتری کوردیان دەکوشت و کوردستانیان زیاتر وێراندەکرد.

ساڵی ١٩٩٨ مادلین ئۆلبرایتی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا، مەسعود بەرزانیی و مام جەلالی بانگهێشتی ئەمریکا کرد و ئاشتیکردنەوە و شەڕی پارتیی و یەکێتیی پێراگرتن، بەڵام شەڕی یەکیتیی و ئیسلامییەکان لە هەڵەبجە هەتا ساڵی ٢٠٠٣ درێژەیکێشا. ساڵی ٢٠٠٣ ئەمریکا پەلاماری عێراقی دا و ڕژێمی عێراقی ڕوخاند. بە بیانووی ئەوەوە کە هەندێک ڕێکخراوی توندڕەوی ئیسلامیی دەڤەری هەورامان، پەیوەندییان لەگەڵ ڕێکخراوی قاعدە هەیە، سوپای ئەمریکا بۆردوومانی بارەگا و بنکەکانی حیزبە ئیسلامییەکانی کرد. پێشمەرگەیش هێرشی زەمینی بۆ کردن و ئسلامییەکان شکان و ناوچەی هەورامانیان چۆڵکرد و خولی سێیەمی شەڕی براکوژیی کۆتاییهات.

## ٤- خولی چوارەمی شەڕی براکوژیی:

خولی چوارەمی شەڕی براکوژیی لە نێوان پێشمەرگەی پارتیی و یەکێتیی و گەریلاکانی باکوری کوردستاندا روویداوە، ساڵی ۱۹۹۲ دەستپێکرد و ساڵی ۲۰۰۳ کۆتاییهات. سەرەتا لە پایزی ساڵی ۱۹۹۲ هێزێکی هاوبەشی پێشمەرگەی پارتیی و یەکێتیی بە پشتیوانیی سیاسیی و مادیی و سەربازیی تورکیا پەلاماری گەریلاکانی پارتی کریکارانی کوردستانیان دا. ئامانجی ئەو شەڕە سەرکۆتکردن و بەدیلگرتنی گەریلاکانی کوردستان بوو. لەو شەڕەدا لە ڕووی سەربازییەوە گەریلای (پ. ک. ک) شکان، بەڵام لە ڕووی سیاسیی و جەماوەرییەوە پارتیی و یەکێتیی خراپ تێکشکان، بە تایبەت کاتێک پێشمەرگەکانی باشوور داویان لە کچە گەریلا بێریتان کرد خۆی بەدەستەوەبدات، لەبریی ئـەوەی خۆی بەدەستی پێشمەرگەکانەوە بدات، لەسەر شاخەکە خۆی خستە خـوارەوە و شەهیدبوو. دوای ئەو ڕوداوە هـەزارن منداڵی کورد ناویاننرا بێریتان. کە خولی سێیەمی شەڕی براکوژیی نێوان پارتیی و یەکێتیی دەستپێکرد، یەکێتیی لە شەڕی دژی (پ. ک. ک) دوورکەوتەوە هەتا ساڵی ۲۰۰۰ پارتیی بەتەنها بەبێ یەکێتیی لەگەڵ سوپای تورکیا شەڕی گەریلای دەکرد. لەو شەڕانەدا گەریلاکان سەرکەوتنیان بەسەر پێشمەرگەی پارتییدا بەدەستدەهێنا.

ساڵی ۲۰۰۱ یەکێتیی خۆی بەتەنها بەبێ پارتیی بە پاڵپشتیی و هاوکاریی تورکیا، شـەڕی گەریلاکانی پەکەکەی دەستپێکرد. ئامانجی شەڕەکەی یەکێتیی سیاسیی و سەربازیی بوو. ژمارەیەک لە سەرکردەکانی (پ. ک. ک) ڕیزەکانی گەریلایان بەجێهێشتبوو. پەیوەندییان بە یەکێتییەوە کردبوو، وایان لە یەکێتیی گەیاندبوو بەهۆی دەستگیرکردنی عەبدوڵڵا ئۆجەلانەوە بارودۆخی ناوخۆیی (پ. ک. ک) زۆر خراپبووە. ئەگەر پەلاماربدرێن خۆیان بەدەستەوەدەدەن و ئاشبەتاڵدەکەن.

مام جەلالیش زۆر حەزیدەکرد ئاشبەتاڵپێکردنی شۆڕشی باکور بەر خۆی بکەوێت و لە دۆستایەتیی تورکیادا بۆڕی پارتیی بداتەوە، بەڵام خەونی هەڵهاتووەکانی ناو (پ. ک. ک) و مام جەلال نەک هەر نەهاتەدی، لەو شـەڕەدا یەکێتیی ڕووبـەڕووی شکستێکی گەورە بووەوە. گەریلاکانی باکور نەک هەر بەرانبەر بە هێرشەکەی یەکێتیی وەستانەوە، سەدان گوندی سنووری دەسەڵاتی یەکێتییان لە دەست پێشمەرگەکانی یەکێتیی دەرهێنا و کۆنترۆڵیانکرد.

مام جەلال بۆ ئاشبەتاڵپێکردنی (پ. ک. ک) لە هەر پارچەیەکی کوردستان چەند کەسێکی دانابوو، بۆ باکور دکتۆر سلێمان و هاوریێ خەجۆی دانابوو. حیزبۆکەیەکێشی بۆ دروستکردن، بۆ ئەوەی هەر ئەندام و کادرێکی (پ. ک. ک) خەڵکی باکور بڕواتە لای ئەوان. بۆ ڕۆژهەڵات عەبدوڵڵای موهتەدیی و سەلاحی موهتەدیی دانابوو، بۆ ئەوەی کادر و بەرپرسەکانی پەکەکەی ڕۆژهـەڵات لە ڕێگەی ئەو دوو کەسەوە پەیوەندیی بە کۆمەڵەی ئێرانەوە بکەن. بۆ ڕۆژئاوای کوردستان عومەر شێخ موس و دکتۆر بەرازی دانابوو، هەتا خەڵکی ڕۆژئاوای کوردستانی ناو (پ. ک. ک) وەربگرن و حیزبی سیاسییان بۆ دروستبکەن. دوای شکستی سەربازیی یەکێتیی، بەرنامەکانی مام جەلال بۆ کۆتاییهێنان بە (پ. ک. ک) شکستیهێنا.

لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام، هێزەکانی ئەمریکا لە عێراق و هەرێمی کوردستان جێگیربوون، لەو کاتەوە ئەمریکا ڕێگەنادات پارتیی و یەکێتیی خولیکی تری شەڕی براکوژیی دەستپێبکەنەوە. ڕێگەنادات پارتیی و یەکێتیی و (پ. ک. ک) ڕووبەڕووی یەکتر ببنەوە.

## ٧- لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە:

شۆڕشی ئەیلول و پارتیی ڕێگەیان لە گەشەکردنی کۆمەڵگەی کوردستان دەگرت، بە باوەڕی دەرەبەگایەتییەوە ڕێگەیان لە گەشەکردنی سیستەمی سەرمایەداریی کوردستان دەگرت. کۆمەڵگەی کوردستانیان بۆ دواوە دەبردەوە. یەکێتیی و شۆڕشی نوێ بەرنامەی گەشەپێدانی کۆمەڵایەتیی هەرێمی کوردستانیان نەبوو، هەوڵیاندەدا کۆمەڵگەی کوردستان لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە لە شوێنی خۆیدا بمێنێتەوە.

لەگەڵ ئەوەدا یەکێتیی ڕێکخراوێکی چەپ بوو، بەڵام سەرکردەکانی یەکێتی زۆر حەزی بە دۆستایەتیی سەرۆک_خێڵەکانی کوردستان و کۆمەڵگەی خێڵەکیی دەکرد، دەیویست فیدراسیۆنی خێڵە دژبەرەکانی خێڵی بەرزان پێکبهێنێت و دژایەتیی خێڵی بەرزانیی پێبکات. بۆیە یەکێک لە سیاسەتە نەگۆڕ و بەردەوامەکانی شۆڕشی نوێ، هێشتنەوەی پەیوەندیی خێڵایەتیی کۆمەڵگەی کوردستان بوو، بۆ ئەوەی لە ڕێگەی خێڵایەتیی و فیدراسیۆنی نێوان خێڵەکانەوە، پێگەی سیاسیی خێڵی بەرزان لاوازبکات.

ئەو کاتانەی پێشمەرگە بووم، ئاگام لەوە بوو کە جەلال تاڵەبانیی و نەوشیروان مستەفا چۆن پشتگیریی سەرۆک_خێڵ و بنەماڵەکانی کوردستان دەکەن، بەخشیشیان بۆ دەنێرن، ئەگەر کێشەیەک لە نێوان کادرێک و سەرۆکی بنەماڵەیەکدا دروستبایە، بەبێ لێکۆڵینەوە و ساغبوونەوەی ناکۆکییەکە، بۆ ڕازیکردنی دڵی ئاغا و سەرۆکی خێڵ، سەرکردایەتیی یەکێتیی یەکسەر سزای کادرەکەیان دەدا.

شۆڕشی ئەیلول دەرفەتی نەدا ژن بەشداریی تێکۆشان بکات، شۆڕشی نوێ بەرانبەر بە ژن و بەشدارییکردنی ژن لە شۆڕشدا، جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ شۆڕشی ئەیلولدا نەبوو. شۆڕشی نوێ نەک هەر بەرنامەیەکی بۆ بەشداریی ژنان لە خەباتدا نەبوو، دژایەتیی ئەو ژنانەیشی دەکرد کە داوای بەرنامەیەکی لەو شێوەیەیان دەکرد. ژمارەیەک لە ژنان و کچانی باشووری کوردستان لە ناو شار و شارۆچکەکانی کوردستان پەیوەندییان بە ڕێکخستنەکانی یەکێتییەوە دەکرد. وەکو ئەندام و کادر چالاکییان ئەنجامدەدا. هەندێک لەوانە لە لایەن دامودەزگا سیخوڕییەکانی ڕژێمی بەعسەوە ئاشکرادەبوون، بۆ ئەوەی دەستگیرنەکرێن دەهاتنە شاخ و دەبوونە پێشمەرگە. هەندێک ژن لەگەڵ مێردەکانیاندا دەهاتنە شاخ و دەبوونە پێشمەرگە. ئەو دوو جۆرە پێکهاتەیەی ژنان داوایان هەبوو شانبەشانی پێشمەرگە پیاوەکان، خەباتی سیاسیی و سەربازیی بکەن، بەڵام سەرکردایەتیی ئەو کاتەی یەکێتیی هێندە گرێدراوی بنەما و پێوانە خێڵەکییەکانی کۆمەڵگەی کوردستان بوو، ڕێگەی بەشدارییکردنی ژنانی ڕێکخستن و خێزانی پێشمەرگەی نەدەکردەوە، هەتا وایلێهات زۆرێک لەو کچانەی ناو ڕێکخستنەکانی کۆرەک کە لە دەستی ڕژێمی بەعس هەڵهاتبوون، خۆیان ڕادەستی ڕژێم دەکردەوە، یان شوویان بە پێشمەرگە دەکرد، یان دەچوونە دەرەوەی وڵات و لە تێکۆشانی سیاسیی دادەبڕان.

ئەم هەڵوێستەی سەرکردایەتیی یەکێتیی لەگەڵ ئایدۆلۆژیا مارکسیی و چەپگەرییدا نەدەگونجا. ئەو هەڵوێستەی یەکێتیی بەرانبەر بە بەشداریی ژن لە خەباتدا، لە کاتێکدا بوو کە لە ناو حیزبەکانی تری باشوور (حشع) و ڕۆژهەڵات و باکوری کوردستاندا ژن بەشداریی چالاکیی سیاسیی دەکرد.

### ٨- گۆڕینی داگیرکەران:

ئەو سیاسەتانەی کە سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول دژی حکومەت و خاک و سامانی عێراق ئەنجامیدەدان و دڵی ئێران و ئیسرائیلی پێ خۆشدەکرد، پاش دەیان ساڵ لە شۆڕشی نوێدا بە زیادەوە دوبارەدەکرانەوە. لە ساڵی ١٩٦٧دا حکومەتی ئێران داوا لە مەلا مستەفا بەرزانیی دەکات کە بە هاوکاریی سوپای ئێران هێزی پێشمەرگە شاری ڕەواندز و بەرزایی سپیلک ڕزگاربکەن، مەلا مستەفا ڕازینابێت*٦.

ساڵی ١٩٧٣ حکومەتی ئیسرائیل داوا لە مەلا مستەفا دەکات، لە کاتی گەرمبوونی شەڕی نێوان ئیسرائیل و عەرەبەکاندا، هێزی پێشمەرگە پەلاماری سوپای عێراق بدات. مەلا لامستەفا پێش ئەوەی ئەو داوایەی ئیسرائیل جێبەجێبکات، پرس بە شای ئێران و ئەمریکا دەکات. ئەو دوو لایەنە بە پێشنیازەکەی ئیسرائیل ڕازینابن و دەڵێن ئەگەر پێشمەرگە کارێکی وا بکات زیانێکی گەورەی بۆ کورد دەبێت و ئەگەری ئەوە هەیە کورد لە لایەن وڵاتانی عەرەب و عێراقەوە ڕووبەڕووی کۆمەڵکوژیی ببێتەوە*٧. بەو شێوەیە بە ئامۆژگاریی ئێران و ئەمریکا مەلا مستەفا واز لە پێشنیازەکەی ئیسرائیل دەهێنێت. ساڵی ١٩٦٩ هێزی پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلول، بە پشتیوانیی ئێران، کێڵگە نەوتییەکانی نزیک شاری کەرکوکی بۆردوومانکرد و ئاگری تێبەردان. لێرەدا دەردەکەوێت کە پەیوەندیی شۆڕشی ئەیلول و ئێران و ئیسرائیل، هەندێک پێوانەی هەبووە، مەلا مستەفا قسەی لە قسەی دۆستەکانیدا کردووە، پرسی بە گەورەکانی خۆیشی کردووە، ئەوە لە کاتێدا بووە حکومەتی عێراق لە لایەن ئەمریکا و ئەورووپاوە دژایەتییدەکرا.

دوای چەندیین ساڵ لە سیاسەتە هەڵەکانی شۆڕشی ئەیلول، دوای ئەوەی کە یەکێتیی بۆ ئەوە دروستبوو هەڵە سیاسییەکانی پارتیی و شۆڕشی ئەیلول دوبارەنەکاتەوە، دوای ئەوەی کە لە سەردەمی شۆڕشی نوێدا، کۆماری ئیسلامیی ئێران نەک تەنها لە لایەن حکومەتی عێراقەوە، بەڵکو لە لایەن سەرتاپای جیهان و وڵاتانی ناوچەکەوە دژایەتییدەکرا و پەروایێزخرابوو. یەکێتیی هاوپەیمانیی سەربازیی لەگەڵ ئێران بەست. شۆڕشی کوردی کرد بە بەشێک لە شەڕی ناڕەوای (عێراق – ئێران). لە ساڵی ١٩٨٦ بە دواوە، بەبێ گوێدانە یاسای نێودەوڵەتیی و پێوانەی سیاسیی باوی سەردەم، یەکێتیی و شۆڕشی نوێ، وەکو بەرەیەکی مەترسییداری شەڕی (عێراق – ئێران)

ڕۆڵی کەواسووری بەرلەشکری ئێرانی دەبینی، دژی سوپا و دامودەزگاکانی دەوڵەتی عێراق، دەستی بە چالاکیی سەربازیی هاوبەشیی پیشمەرگە و پاسدار کرد.

لە ساڵانی ١٩٨٦ - ١٩٨٨دا کاتێک یەکێتیی شێری مەیدانی ناوچە ڕزگارکراوەکانی باشووری کوردستان بوو، شانبەشانی سوپای پاسدارانی ئێران لە چەندین ئۆپراسیۆنی هاوبەشدا پەلاماری سوپای عێراقیان دا. لە شەوی ٦/ ١٠/ ١٩٨٦دا تۆپخانەکانی سوپای پاسداران بە چاوساغیی هێزی پێشمەرگەی کوردستان، کێڵگە نەوتییەکانی بابەگوڕگوڕ و جەبەل بۆر و زەمبوری دەوروبەری شاری کەرکوکیان بۆردوومانکرد و ئاگریان لە کێڵگەیەکی بابەگوڕگوڕ و کێڵگەی زەمبور بەردا.لە شەوی ١٣/ ٤/ ١٩٨٧ لە شەڕی داستانی ڕزگارییدا، هێزی پێشمەرگەی کوردستان و چەند هێزێکی بچووکی سوپای پاسداران پەلاماری ڕەبایەکانی شاخەکانی ئەزمەڕ و گۆیژە و گردەکانی تری دەوروبەری شاری سلێمانییان دا. وا لەگەڵ سوپای پاسدرانی ئێراندا ڕێککەوتنکرابوو کە لە هەمان شەودا ئەوانیش هێرشی خۆیان بۆ سەر ناوچەی شارباژێڕ ئەنجامبدەن و قەزای چوراتا و ناحیەکانی دەوروبەری بگرن، بۆ ئەوەی لە قۆناغی دووەمی شەڕی داستانی ڕزگارییدا، شاری سلێمانیی ئازادبکرێت.

لە بەختی شاری سلێمانییدا، سوپای پاسداران هێرشەکەی سەر ناوچەی شارباژێڕی ئەنجامنەدا، شاری سلێمانیی بەر هێرشی چەکی کیمیایی سوپای عێراق نەکەوت. بەرنامەی یەکێتیی هەبوو لەگەڵ سوپای پاسدارانی ئێراندا قەلادزێ و دوکان و هەڵەبجە بگرن. لە ١٤/ ٣/ ١٩٨٨دا هێزی پێشمەرگەی کوردستان و هێزەکانی سوپای پاسدارانی ئێران، شاری هەڵەبجە و ناوچەی هەورامان و بەشێک لە دەشتی شارەزووریان لە هێزەکانی ڕژێمی بەعس پاککردەوە. ڕژێمی بەعس بە کیمیابارانی هەڵەبجە و درێژدان بە پرۆسەکانی ئەنفال وەڵامی هێرشە هاوبەشەکانی سوپای پاسدار و هێزی پێشمەرگەی دایەوە. دوای سێ مانگ لە کارەساتی هەڵەبجە، سوپای (ئەرتەشی) ئێران دەستی بەسەر هەڵەبجەدا گرت و پێشمەرگەکانی یەکێتیی لە سنوورەکەدا دەرکرد، کە یەکێتیی گلەیی لە ئێران کرد، ئێرانییەکان گوتیان ئێوە لەگەڵ سوپای پاسداراندا ڕێککەوتنتانکردووە، هیچ ڕێککەوتنتان لەگەڵ ئەرتەشی ئێراندا نییە. پاسدار هەڵەبجەی چۆڵکردووە، دەبێت ئێوەیش هەڵەبجە چۆڵبکەن. خەڵکی کوردستان لەسەر ئەو پێشهاتانە دەیگوت: نابێت سوپای داگیرکەرێک بگۆڕیت بە داگیرکەرێکی تر.

ئەم سیاسەتە هەڵانەی شۆڕشی نوێ، لە شۆڕشی ئەیلولدا سنووردداربوون، بەڵام لە ئەنجامی ئەو هەڵانەوە شۆڕشی ئەیلول شکستیهێنا، نەدەبوو شۆڕشی نوێ هەڵەکانی شۆڕشی ئەیلول بە لوتکە بگەیەنێت و لە ساڵی ١٩٨٨دا ئاشبەتاڵی ١٩٧٥ دوبارەبکاتەوە. لە کاتی ئەنفالی دوودا لە قۆپی قەرەداغ لەگەڵ شێرکۆ جدیی، بەهادین نوریمان بینی. شێرکۆ بە بەهادین نوری گوت:

بۆچوونت لەسەر ئەم ئەنفالانە چییە؟ بەهادین نووری لە وەڵامدا گوتی: ساڵی ١٩٧٥ تەنها پێشمەرگە ئاشبەتاڵیکرد، بەڵام ئەم جارە پێشمەرگە و جەماوەر پێکەوە ئاشبەتاڵیانکرد*٨. لە درێژەی سیاسەتی گۆڕینی داگیرکەراندا لە دوای ڕاپەڕینەوە پارتیی و یەکێتیی ڕێگەیانداوە سوپای تورکیا سەدان پێگەی سەربازیی و هەواڵگریی لە هەرێمی کوردستان و هەندێک ناوچەی تردا دابنێت، ئەمەیش جۆریکە لە گۆڕینی داگیرکەر بە داگیرکەرێکی تر.

## ٩- شۆڕشی نوێ و دیموکراسیی:

ژمارەیەکی زۆر لە سەرکردەکانی یەکێتیی، قوربانیی دەستی هزری ناوەندگەرایی و تاکڕەویی مەلا مستەفا بوون. هەر لە سەرەتای شۆڕشدا مەلا مستەفا گوێی لە بۆچوون و پێشنیازی نەدەگرتن، بۆیە ڕیزەکانی پارتییان بەجێبهێشت و لە شۆڕشی ئەیلول دووركەوتنەوە. سەرکردەکانی شۆڕشی نوێ بە قسە نوێ بوون، بەڵام لە بەڕێوەبردنی کار و چالاکییدا بەگوێرەی چەمکی ناوەندگەریی سەرانی شۆڕشی ئەیلول دەجوڵانەوە. جەلال تاڵەبانیی و نەوشیروان مستەفا لە دیاریکردنی بڕیار و ڕەنگڕشتنی ستراتیژی سیاسیی و سەربازیی یەکێتییدا ڕۆڵی سەرەکییان دەبینی. کۆنترۆڵی سیاسەتی یەکێتییان دەکرد و دەرفەتیان نەدەدا کەسانی دەرەوەی پێکهاتەی جەلالیی کۆن، ڕۆڵی سەرکردایەتیی ڕاستەقینە ببینن.

ئەگەرچی یەکێتیی بە ڕواڵەت سێ پێکهاتەی سیاسیی بوو، بەڵام لە ڕاستییدا تەنها یەکێک لەو پێکهاتانە ئەوانەی کە کاتی خۆی جەلالیی بوون، بەرپرسیار و بڕیاربەدەستبوون. لێرەدا دەبینین ناوەندگەرایی لە شۆڕشی نوێدا هەر ماوە. لە شۆڕشی ئەیلولدا ناوەندگەرایی بنەماڵەی بەرزانیی هەبوو، لە شۆڕشی نوێدا ناوەندگەرایی

جەلالییەکان هەبوو. شۆڕشی نوێ بوو بە شۆڕشی جەلالییەکان، لە کەسی نوێ و چەمکی نوێ ڕوتبووەوە. بەو شێوەیە لەبەر نەبوونی پێوانە و بنەمای دیموکراتیی لە ناو ڕیزەکانی یەکێتیی و شۆڕشی نوێدا، جیابوونەوە و وازهێنانی گروپ و تاک دەستپێکرد. ساڵی ١٩٧٩ لەسەر بۆچوونی جیاواز بزوتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان لە یەکێتیی جیابووەوە. هەر لەسەر بیروبۆچوونی جیاواز تەکەتولی هەرێمەکان بە نهێنیی لە ناو ڕیزەکانی کۆمەڵەدا ڕێکخراوێکیان بە ناوی ئاڵای شۆڕش دروستکرد، دواتر ساڵی ١٩٥٨ لە یەکێتیی جیابوونەوە. ساڵی ٢٠٠٦ بزووتنەوەی گۆڕان لە یەکێتی جیابۆوە.

## ١٠- تاکتیکەکانی مام جەلال:

لە سەرەتای شەستەکانەوە هەتا ئەو کاتەی کۆچی دواییکرد، مام جەلال سەرکردەیەکی سیاسیی ناو بزوتنەوەی ئازادیخوازی گەلی کوردستان بوو. لە دوای ڕاپەڕین و ڕوخانی ڕژێمی سەدامەوە، وەکو سەرکردەیەکی عێراقیی و کەسایەتییەکی گرنگی جیهانیی ناویدەرکرد. مام جەلال لە ڕێگەی خێڵ و بنەماڵەوە دەستی بە پلە و پۆست نەگەیشتبووە، لە ڕێگەی سیاسەت و تاکتیکە تایبەتەکانی خۆیەوە، وەکو سەرکردەیەکی باڵادەستی باشووری کوردستان و عێراق ناسرا. تەنها سەرکردەی کورد بووە کە لەگەڵ بنەماڵەی مەلا مستەفا ململانێیکردووە و لەو ململانێیەدا سەرکەوتنی بەدەستهێناوە. کاتێک ئەندامی مەکتەبی سیاسیی پارتیی بوو، وەکو ئەندامی مەکتەب سیاسیی هەڵسوکەوتینەدەکرد، هەر کاتێک دەرفەتی بۆ ڕەخسابێت وەکو کەسی یەکەمی پارتیی و کەسی یەکەمی شۆڕشی ئەیلول هەڵسوکەوتیدەکرد و بڕیاریدەدا. زۆر لە چاودێرانی سیاسیی سەردەمی شۆڕشی ئەیلول وای بۆ دەچن کە لە هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلوولدا، مام جەلال ڕۆڵی سەرەکیی بینیوە.

کە باڵی مەکتەبی سیاسیی جیابوونەوە، سکرتیری پارتیی ئیبراهی ئەحمەد بوو، مام جەلال ئەندامی مەکتەبی سیاسیی بوو، لەبەرئەوەی زۆر چالاک بوو، ناوی جەلالیی بەسەر ئەو هێڵە سیاسییەدا برا.

کاتێک یەکێتیی دامەزرا، مام جەلال بە سکرتێری حیزب هەڵبژێردرا، هەتا کۆچی دواییکرد لەو پۆستەدا مایەوە. لەو کاتەوە جەلال تاڵەبانیی سکرتێری حیزب و

فەرماندەی گشتیی هێزی پێشمەرگەی یەکێتیی بوو. لەو کاتەوە جەلال تاڵەبانیی دەرفەتی بۆ ڕەخسا بە باشترین شێوە بۆچوونەکانی خۆی لە بڕیار و کاری سیاسیی و تەکتیکیدا دابڕێژێت و جێبەجێیانبکات.

ئیتر لە دروستبوونی شۆڕشی نوێوە جەلالیەت وەکو چەمک و پراکتیک، لە تێکۆشانی سیاسیی گەلی کورددا قۆناغێکی تر پێشکەوت، لە ڕێگەی حیزب و شۆڕشەوە جەلالیەت کاریگەریی لەسەر هزری خەڵکی کوردستان بەجێهێشت.

ئەگەر کەسێک بیەوێت لە پایەکانی سیاسەتی مام جەلال (جەلالیزم) تێبگات، دەبێت لە نزیکەوە شارەزای بیرکردنەوە و هەڵسوکەوت و بڕیار و کارەکانی بێت، ئاگای لە قسە و هەڵسوکەوت و بۆچوونەکانی بێت، مام جەلال خاوەنی فەلسەفەیەکی تایبەت بە خۆی نییە، باس لەو قۆتابخانە فەلسەفییانەیش ناکات کە دەیانکاتە سەرچاوەی بیرکردنەوە و تێکۆشانی خۆی. چاودێران پێیانوایە مام جەلال پیاوێکی تەکتیکییە، تاکتیک لە لای ئەو بیروباوەڕ و ستراتیژە، بەگوێرەی ڕۆژ بڕیاردەدات و کارەکانی ئەنجامدەدات، گرنگ نییە لە ئایندەدا چی دەبێت. فەلسەفەی مام جەلال لەو پەندەی پێشینانەوە نزیکە کە دەڵێت: «نان ئەو نانەیە ئەمڕۆ لە خوانە».

یەکێک لە بنەما سەرەکییەکانی سیاسەتی مام جەلال تاڵەبانیی ئەوە بوو، کە پابەندی سیستەمی ڕێکخستنی حیزب نەدەبوو، لەگەڵ ئەوەیشدا کە بەرپرسی یەکەمی یەکێتیی بوو، لە زۆربینەی بڕیار و چالاکییەکانیدا پرسی بە دەزگاکانی حیزبەکەی نەدەکرد. مام جەلال ڕاوێژکاری نەبوو، هەر کە زانیارییەکی پێدەگەیشت، بەگوێرەی زانیارییەکە خۆبەخۆ بڕیاریدەردەکرد و جێبەجێیدەکرد.

یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی تری سیاسەتی مام جەلال ئەوە بوو، ئامانج و دۆست و دوژمنەکانی زوو زوو دەگۆڕی. لە گۆڕینی ئامانجدا خۆی بە پەیمان و بیروباوەڕەوە نەدەبەستەوە. چۆن و کەی و بە کام شێوە بەرژەوەندیی بخوازێت، ئامانجەکانی، دۆستەکانی، دوژمنەکانی و تاکتیکەکانی دەگۆڕی. ئەوانەی لەگەڵ مام جەلالدا کاریاندەکرد، لەو بارەیەوە باش لێیتێگەیشتوون، بەڵام ڕەخنەی مام جەلالیان نەدەکرد، یان کاتێک ڕەخنەیاندەکرد کە مام جەلال تاڵەبانیی عاجزیدەکردن و سزایدەدان.

لە ناو شۆڕشدا مام جەلال زۆر جار کادر و بەرپرسەکانی سزاداوە، لە دوای ڕاپەڕیین جارێکی تر سزای ئەبوو شەهاب دەدات، پۆستی پارێزگاری کەرکوکی لێوەردەگرێتەوە، ئەم جارەیان ئەبو شەهاب زۆر دڵگران دەبێت و ڕقی لە مام جەلال هەڵدەستێت. لەو کاتەدا دایکی پێشمەرگەیەکی کۆن ئەبو شەهاب دەبینێت و پێیدەڵێت: ئەبو شەهاب تۆ دوای سێ ڕۆژی تر میوانی منیت، خواردنی کفتەی سابونکەرانت بۆ دروستدەکەم. دوای کەمێک ئەبو شەهاب جەبار یاوەر دەبینێت، جەبار یاوەر لەو کاتەدا جێگری بەرپرسی دەزگای زانیاریی یەکێتی دەبێت، دەڵێت: جەبار، دایکی حەمەی تەیب بکەن بە سکرتێری خۆتان، لەبەرئەوەی دایکی حەمەی تەیب هەتا سێ ڕۆژی تر بەرنامەی خۆی داناوە، بەڵام سکرتێرەکەی ئێوە بەرنامەی سێ سەعاتی ئایندەی تری نییە*٩.

سیاسییە ڕکابەرەکانی مام جەلال دەڵێن: مام جەلال توانای تێکدانی لە توانای دروستکردن بەهێزترە. سامی عەبدولڕەحمان دوو بۆچوونی لەسەر مام جەلال هەبوو، دەیگوت ئێمە لە قۆناغی ڕزگاریی نیشتیمانییدا خەباتدەکەین، جەلال وەکو پیاوی دەوڵەت هەڵسوکەوتدەکات. جارێکی تر سامی عەبدولڕەحمان باسی مام جەلالی کرد و گوتی: جەلال وزەی تێکدانی لە وزەی دروستکردن (بیناکردن) زیاترە*١٠.

لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٢دا لە چاوپێکەوتنێکی کەناڵی (ڕۆژ تی ڤی)دا گوێم لە قسەی فەرهاد ئۆج ئالان گرتبوو، کە هاتە سەر باسکردنی مام جەلال هەمان بۆچوونی سامی عەبدولڕەحامنی دوبارەکردەوە و گوتی: جەلال تاڵەبانیی توانای تێکدانی زۆرە، زۆربەی کارەکانی تێکدانی ڕیزەکانی بزاڤی ئازادیخوازی گەلی کوردستان بووە. باشتر وایە ئەو تەمەنەی ماویەتی بۆ یەکخستن و یەکڕیزیی تێکۆشانی گەلی کورد بەکاربهێنێت*١١.

مام جەلال بە کەسێکی پەلەکەر ناسراوە، لە زوو_بەرپاکردنی شۆڕشی ئەیلولدا لۆمەکراوە. ساڵی ١٩٦١ لە کوردستانەوە نامەیەک بۆ مەکتەبی سیاسیی پارتیی لە بەغدا دەنێرێت، لە نامەکەیدا دەنوسێت: زەمینەی زاتیی و مەزوعیی بۆ بەرپاکردنی شۆڕش لەبارە١٢.

خەڵکی کوردستان وای بۆ دەچن کە مام جەلال لە جیابوونەوەی ساڵی ١٩٦٤ی باڵی مەکتەبی سیاسییدا ڕۆڵی سەرەکیی هەبووە، بەڵام مام جەلال داکۆکیی لە خۆی دەکات و جیابوونەوەی باڵی مەکتەبی سیاسیی پارتیی بە پیلانگێڕیی حشع دەزانێت*١٣.

زۆرێک لە چاودێرانی سیاسیی وای بۆ دەچوون کە بڕیاری هەڵگیرسانی شۆڕشی نوێ بە ڕابەرایەتیی یەکێتیی، لێکۆڵینەوە و کاتی زۆرتری پێویستبووە، بەڵام مام جەلال بۆچوونی وانەبووە، بۆیە دوای تێپەڕبوونی ساڵێک بەسەر دامەزراندنی یەکێتییدا بڕیاری شۆڕشی نوێی دەدا. کە شۆڕشی نوێ لە لایەن خەڵکی کوردستانەوە پێشوازیی لێکرا و سەرکەوتنی بەدەستهێنا. مام جەلال بڕوای بە خۆی و بە بۆچوونەکانی پتەوتر بوو، خۆی ئامادەکرد بۆ ئەوەی لە ئاستی سیاسەتی باشووردا بۆچوونەکانی بکاتە چەمکی باوی سیاسەت. لە شێوازی بەڕێوەبردنی کاری ڕێکخستنی حیزبدا، مام جەلال خۆی بە پەیڕەو و پرۆگرامی حیزبەوە نەدەبەستەوە. لەو کاتەوە سکرتێری یەکێتییە یەکێک لە کارە سەرکییەکانی ئەوەیە کە لە ناو حیزبەکەیدا تەکەتول دروسستدەکات و تەکەتولەکان دژی یەکتر بەکاردەهێنێت. دیارە ئامانجی سەرەکیی لەم تەکتیکەدا ئەوەیە، بەرپرسەکانی یەکێتیی هەر خەریکی کێشە ناوخۆییەکانی ناو حیزب بن، خۆیان پەروەردەنەکەن و فێری سیاسەت نەبن و بیر لەوە نەکەنەوە شوێنەکەی مام جەلال بگرنەوە. کە تەکەتولەکانی ناو یەکێتیی بەردەوام لە ململانێی و ناکۆکییدا بن، هەموویان پێویستیان بە مام جەلال دەبێت بۆ ئەوەی کێشەکانیان بۆ چارەسەربکات و ڕێکیانبخاتەوە.

بەو شێوەیە دەتوانین بڵێین یەکێک لەو چەمکانەی مام جەلال بڕوای پێ هەبوو و کاریپێکرد بۆ ئەوەی هەتا لە ژیاندا ماوە سکرتێر بێت و دوای خۆیشی سکرتێریی بۆ منداڵەکانی بمێنێتەوە، سیاسەتی پەرتکە و زاڵبەی ناو حیزبەکەی بوو.

مام جەلال لە ئاستی بەڕێوەبردنی حیزب و شۆڕشدا، بەرنامەی پەروەردە و فێرکردنی کادرانی نەبوو، نەیدەویست کادرەکانی فێری سیاسەت ببن، حەزیدەکرد ئەو کەسانەی لە نزیکیەوەبن تەنها توانای کاری پراکتیکییان هەبێت، نەیدەویست کەسێک لە نزیکیەوەبێت توانای بیرکردنەوەی هەبێت و موناقەشەی لەگەڵ بکات. تەنها ئەو کەسانەی دەویست کە کاردەکەن و بڕیارەکانی ئەو جێبەجێدەکەن و موناقەشەی ناکەن.

یەکێک لە تایبەتمەنییەکانی تری مام جەلال ئەوە بوو لە کاتی خۆیدا ڕەخنەی لە ئەندام و کادرەکانی حیزبەکەی نەدەگرت، لە کاتی خۆیدا سزاینەدەدان، ئەرکی بەسەردا دابەشدەکردن و چاودێرییدەکردن. ئەگەر هەڵەیان کردبا ڕەخنەی نەدەکردن، هەڵەکانی بۆ کۆدەکردنەوە. هەر کاتێک ئەو کادرە، یان ئەو بەرپرسە ویستبێتی

ڕەخنە لە بڕیارێکی، یان ڕەخنە لە کارێکی مام جەلال بگرێت، مام جەلال هەڵە و کەموکووڕییەکانی ئەو کادرەی لە بەردەمی حیزب و جەماوەردا هەڵدەڕشت.

لە ئاستی پەیوەندیی و خەباتی دیبلۆماسییدا، زۆر کەس مام جەلال بە سیاسەتمەدارێکی سەرکەوتوو دەبینن، کەسانی تریش بە کەسێکی لاوازی دەبینن. کاتێک مام جەلال لە بۆنەیەکی سیاسییدا ئامادەدەبێت، هەموو توانای خۆی بۆ بەرزراگرتنی ئەو بۆنەیە بەکاردەهێنێت و بیروباوەڕی خۆی لە بیردەچێتەوە. کاتێک دەچێتە یادی دامەزراندنی حیزبی شیوعیی، لە شیوعییەکان زیاتر بە شان و باڵی حیزبی شیوعییدا هەڵدەدات. کاتێک دەچێتە ئێران وەکو شیعەیەک دەچێتە سەر گۆڕی ئیمام خومەینیی، لەو کاتەوە سەرۆک_کۆماری عێراقە، خۆی لە ناو عەرەبی عێراقدا تواندووەتەوە. کاتێک سەردانی تورکیا دەکات دەچێتە سەر گۆڕی کەمال ئەتاتورک و دەڵێت: دەوڵەتی کوردی خەونی شاعیرانە.

هەتا بڵێیت مام جەلال بێگانەپەرستە، بە پەندێکی پێشینان کاردەکات کە دەڵێت: «پادار بگرن و بیپاماڵی وێمانە». هەتا عەرەب وەستابێت لای لە کورد نەدەکردەوە، هەتا ئەندامێکی پارتیی وەستابێت چارەی ئەندامێکی یەکێتیی نەدەویست.

مام جەلال سامان و پارەی بۆ سیاسەت و بۆ دەستەمۆکردنی کادر و بەرپرسان بەکاردەهێنا. لە پەیداکردنی پارەدا بێپێوانە و بەتوانا بوو. بە ڕێگەی ڕەوا و ناڕەوا پارەی کۆدەکردەوە. بەبێ پێوانە و بنەمای دارایی پارەکەی بەسەر کەسە نزیکەکانیدا دابەشدەکرد، لە هەمان کاتدا چاودێریی دەخاتە سەر ئەو کەسانەی پارەکەیان پێدەبەخشێت، بۆ ئەوەی لە شێوازی خەرجکردنی پارەکەدا خاڵی لاوازیان بگرێت و بیانخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە و بە تەواویی تەسلیمی بین.

یەکێک لە تەکتیکە سیاسییەکانی تری مام جەلال ئەوە بوو، کە بازرگانیی سیاسیی بە حیزبی سیاسییەوە دەکرد. پەیوەندیی لە گەڵ حیزبی سیاسییدا دروستکرد، دواتر لەپێناو دەستکەوتی سیاسیی و مادییدا پەیوەندیی لەگەڵ دوژمنی ئەو حیزبانەدا دروستکرد و دەیانفرۆشتن. ساڵی ١٩٨٠ پەیوەندیی لەگەڵ حیزبی ڕزگارییدا دروستکرد. حیزبی ڕزگاریی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان دژی کۆماری ئیسلامیی ئێران خەباتیدەکرد، لە لایەن کوڕەکانی شێخ عوسمانی نەقشبەندییەوە ڕابەرایەتییدەکرا. حکومەتی عێراق پشتیوانیی لێدەکرد. بۆ ماوەیەک مام جەلال خۆی کرد بە دۆستی حیزبی ڕزگاریی و هاوپەیمانیی

لەگەڵ دروستکرد. دواتر دەستی خستە ناویانەوە بۆ پێشخستنی پەیوەندیی خۆی و ئێران و دۆستەکانی تری بڵاوەی بە حیزبی ڕزگاریی کرد*١٣. ساڵی ١٩٨١ لەگەڵ حکومەتی ئێراندا حیزبێکیان بە ناوی لەشکری ئیسلامیی کوردستان دروستکرد. ژمارەیەک کادری سیاسیی یەکێتیی بۆ ناو ڕیزەکانی لەشکری ئیسلامیی نێردران. مام جەلال لەژێرەوە پەیوەندیی بە ڕژێمی سەدامەوە کرد و پێیڕاگەیاند: ئەگەر سەدام هاوکاریی نەکات و گفتوگۆی لەگەڵ نەکات، ئێران لە ڕێگەی لەشکری ئیسلامییەوە عێراق داگیردەکات. بەو شێوەیە حکومەتی عێراق کڵاوی چووە سەر و لە یەکێتیی نزیکبووەوە و گفتوگۆی ساڵی ١٩٨٣ نێوان یەکێتیی و حکومەتی عێراق دەستیپێکرد. هەر کە سکرتێری یەکێتیی ئامانجی خۆی لە دروستکردنی لەشکری ئیسلامییدا بەدەستخست، هێزی پێشمەرگەی یەکێتیی لە تەمووز ١٩٨٢ پەلاماری بنکەکانی لەشکری ئیسلامییان دا و لە ماوەیەکی کەمدا چەکیانکردن و ڕێکخستنەکەیانی هەڵوەشاندەوە*١٤.

لە دوای ڕاپەڕینەوە هەتا ئەمڕۆ مام جەلال دەستی بەسەر حیزبەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا گرتووە، لە کەمپدا دایناون و بەردەوام وەکو کارتی گوشار لەگەڵ ئێران ساسیەتیان پێدەکات. چەندین جار لە بەرپرسانی باڵای یەکێتیم بیستووە کە گوتوویانە ئەگەر پەیوەندییمان لەگەڵ ئێراندا تێکبچێت، حیزبەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بەردەدەینە گیانی ئێران. لە دوای دەستگیرکردنی عەبدوڵڵا ئۆج ئالانی سەرۆکی (پ. ک. ک) مام جەلال هەوڵی زۆری دا (پ. ک. ک) وەکو حیزبەکانی ڕۆژهەڵات لێبکات، لە تێکۆشان دووریانبخاتەوە و لە ئۆردوگا نیشتەجێیانبکات و لەگەڵ تورکیادا سیاسەتیان پێبکات، بەڵام (پ. ک. ک) خۆی بەدەستیەوەنەدا.ساڵی ٢٠٠١ پشتگیریی لە حەرەکەی تەوحیدی ئیسلامیی کرد (جوندی ئیسلام) کە باڵی توندڕەوی ئیسلامیی سیاسیی باشووری کوردستان بوو. لە ناوچەی هەورامان جێگیریکردن و خەڵکی نارده ناویانەوە و گەورەیکردن. لەسەر دژایەتییکردنی تیرۆر مام جەلال بۆ ئەمریکای سەلماند، کە گرووپی جوندی ئیسلام پەیوەندییان بە ڕێکخراوی قاعدەوە هەیە، ئامادەیی خۆی پیشاندا بۆ لەناوبردنی ئەو گرووپە و بۆ دژایەتییکردنی تیرۆر هاوکاریی ئەمریکا بکات. بەو شێوەیە جوندولئیسلامی بەخێوکرد و فرۆشتنی بە ئەمریکا. لە ڕێگەی ئەو سەفقە سیاسییەوە، پەیوەندیی مام جەلال و یەکێتیی لەگەڵ ئەمریکا بە بەرزترین ئاست گەیشت و هەتا ئێستا ئەو پەیوەندییە لە پێشکەوتندایە.

هەندێک لە چاودێرانی سیاسیی پێیانوایە مام جەلال بەو تەکتیکە سیاسییانەی توانیویەتی سەرکەوتن بۆ خۆی و بۆ حیزبەکەی بەدەستبهێنێت. لە ڕێگەی تەکتیکەکاینەوە، توانیویەتی لە کوردستان ڕکابەری بنەماڵەی مەلا مستەفای بەرزانیی بکات و تۆڵەی شکستەکانی خۆی لەو بنەماڵەیە بکاتەوە.

هەر لە ڕێگەی تەکتیکەکانیەوە مام جەلال کاریکردووە بۆ ئەوەی جیابووەکانی ناو یەکێتیی پێیشینەکەونەوە. ئەگەرچی لە ماوەی سیوپێنج ساڵی ڕابردوودا یەکێتیی سێ جار دوچاری جیابوونەوەی گەورە هاتووە (حسک ١٩٧٩، ئاڵای شۆڕش ١٩٨٥، گۆڕان ٢٠٠٩)، بەڵام توانیویەتی جیابووەکان پەرواێزبخات و ڕێگەیاننەدات پێشیبکەون.لە هەوڵی گەڕاندنەوەی جیابووەکانیشدا سەرکەوتنی بەدەستهێناوە.ئەو سیاسەتەی کە لە ماوەی چل ساڵی ڕابردوودا لە باشووری کوردستان و عێراق و ناوچەکەدا مام جەلال پەیڕەویدەکرد، سودی بۆ کەسی خۆی و بۆ حیزبەکەی هەبووە، بەڵام لەبەرئەوەی سیاسەتەکانی مام جەلال لەپێناو دەسەڵاتی خۆی و حیزبەکەی و بنەماڵەکەیدا بووە، ڕەهەندێکی نەتەوەیی و دیموکراتیی نەبووە و کاریگەرییشی لەسەر هزری تاک و پێکهاتەکانی کوردستان کردووە. لە ڕێگەی چەمکە تەکتیکییەکانی جەلالیزمەوە، کۆمەڵگەی کوردستان هێندەی تر دوچاری لادانی سیاسیی هاتووە. هەر کەس و لایەنێکی سیاسیی بیەوێت تاک و کۆمەڵگەی کوردستان بگۆڕێت و بیخاتەوە سەر سکەی سروشتیی، دەبێت یەکێک لە ئەرکەکانی بەگژداچوونەوەی ئەو چەمکە هەڵانە بێت کە جەلالیزم لە سیاسەتی خەڵکی کوردستاندا جێگیریکردوون.

### ١١– یەکێتیی دوای ڕاپەڕین:

لە دوای ڕاپەڕینەوە لادانێکی سیاسیی گەورە لە سیاسەتی نەتەوەیی یەکێتییدا دروستدەبێت، یەکێتیی دەست بە لاسایکردنەوەی پارتیی و شۆڕشی ئەیلول دەکات، یەکێتیی و پارتیی لە ڕێگەی حکومەتی هەرێمەوە وەکو سەردەمی شۆڕشی ئەیلول، هەوڵی جدییان دەدا بۆ ئەوەی هێزە شۆڕشگێڕەکانی باکوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان دەست لە خەبات هەڵبگرن، لە کەمپی ئاوارەیی باشووری کوردستاندا نیشتەجێبن و چالاکیی نەکەن، هەتا پشتگیریی تورکیا و ئێران بەدەستبهێنن. لەو کارەیاندا بەرانبەر

به هێزەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان سەرکەوتنیان بەدەستهێنا، بەڵام بەرانبەر بە هێزەکانی باکووری کوردستان کورتیانهێنا و سەرکەوتوو نەبوون.

بۆ ڕازیکردنی دەوڵەتی ئێران، لە زۆنی سەوزدا چەندیین سەرکردە و بەرپرسی حیزبەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان وەکو سەعیدی یەزدان پەنا و مەنسوری ڕەشە هەورامیی و شیخ مەنسور تیرۆرکران، چەندیین کەسی ناڕازیی کۆماری ئیسلامیی ئێران ڕادەستی دەوڵەتی ئێران کرانەوە. لە ناوەڕاستی نەوەدەکانی سەدەی بیستدا، پەیوەندییەکانی کۆماری ئیسلامیی ئێران و یەکێتیی بۆ دژایەتییکردنی هێزەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان زیاتر پەرەیسەند، هەنگاوی خێراتر و مەترسییدارتری بە خۆیەوە بینی. سوپای پاسداران و یەکێتیی بەرنامەیان دانا پەلاماری هێزەکانی حدکا بدەن. لە ٢٩/ ٧/ ١٩٩٦دا هێزی پێشمەرگەی یەکێتیی لە ڕێگەی (پێنجوێن – سلێمانیی – کۆیە)وە، هێزێکی سوپای پاسدارانی ئێرانی لە شارۆچکەی تەقتەق نزیکخستەوە، لەوێوە بە تۆپی گەورە و هاوەن کەمپی ئاوارە و بنکەکانی (حدکا) یان بۆردوومانکرد. لایەنگرانی یەکێتیی شانازیی بەوەوە دەکەن کە پێش ئەوەی بردوومانەکەی ئێران بۆ سەرکەمپی تەقتەق دەستپێبکات، یەکێتیی حدکای لەو هێرشە ئاگادارکردەوە، بۆ ئەوەی خۆیان لە هێرشەکان بپارێزن و زیانیان بەرنەکەوێت.

هێزەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە هەرێمی کوردستاندا تاقیگەی سیاسەتی نانەتەوەیی یەکێتیین، بەردەوام بنکە و نوسینگەکانی حیزبی دیموکرات و کۆمەڵە و خەبات و کۆمەڵەی یەکسانیی کوردستان، بەر هێرشی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی سوپای ئێران دەکەون، چەندیین کەسایەتییان تیرۆرکرا، ئاستەنگیی بۆ چالاکیی سیاسیی و پیشمەرگانەیان دانرا.

بەو شێوەیە یەکێتیی پاش ٣٠ ساڵ بە شێوازێکی نهێنیی و نیمچە نهێنیی هەڵخەڵەتێنەر، هەمان سیاسەتی نانەتەوەیی ئاشکرای پارتیی و شۆڕشی ئەیلولی دژی شۆڕشی ڕۆژهەڵاتی کوردستان دووبارەکردەوە. یەکێتیی زۆر هەوڵیدا لەسەر شۆڕشی باکوری کوردستان سیاسەتبکات، لەسەر حسابی گەلی باکوری کوردستان پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ تورکیا پێشبخات، تورکیایش دژی پارتیی

بەکاربهێنێت. لە لایەکەوە جەلال تاڵەبانیی ڕەزامەندیی خۆی پیشاندەدا بۆ مافەکانی تورکیا لە باکوری عێراق بەگویرەی بڕیاری عسبە ئومەمی ساڵی ١٩٢٥، لە لایەکی ترەوە ساڵی ١٩٩٥ کاتێک یەکێتیی حوکمڕانیی هەولێری دەکرد. حکومەتی هەرێم مۆڵەتی فەرمیی بەرەی تورکمانی دا وەکو حیزبێکی سیاسیی دۆستی تورکیا لە عێراق و هەرێمی کوردستاندا چالاکییبکات، ئەو بەرەیەی کە ئیعتراف بە کوردستان ناکات. ساڵی ١٩٩٦ یەکێتیی زۆر پێداگرییکرد کە هێزی (پمف) سەر بە تورکیا بێنە کوردستان و چاودێریی ناکۆکیی و شەڕی نێوان یەکێتیی و پارتیی بکەن.

ساڵی ٢٠٠٠ هێزی پێشمەرگەی یەکێتیی پەلاماری قەندیلی دا، بە مەبەستی کۆتاییپێهینانی (پ. ک. ک)، بەڵام ئەنجامی شەڕەکە پێچەوانەبووەوە، پێشمەرگەی یەکێتیی شکا و دەیان گوندی بناری قەندیل کە پێشتر لەژێر دەسەڵاتی یەکێتییدا بوون، کەوتنە ژێر دەسەڵاتی هێزەکانی گەریلا.

یەکێتیی سێ جار هەوڵی دوبەرەکیی ناو ڕیزەکانی (پ. ک. ک)ی داوە، ساڵی ٢٠٠١ پشتگیریی جیابوونەوەی دکتۆر سلێمان و هاوەڵەکانی دەکرد. شەڕی ٢٠٠١ دژی گەریلا دەستپێکرد. ساڵی ٢٠٠٣ لە ڕێگەی دروستکردنی ڕێکخراوی (کاک) بە سەرۆکایەتیی وریا ڕەواندزیی، هەوڵی تواندنەوەی (پ. ک. ک) باشووری دا. ساڵی ٢٠٠٤ پشتیوانیی جیابوونەوەی عوسمان ئوج ئالان و بۆتانی دەکرد، بەڵام یەکێتیی لە هەموو بەرنامەکانیدا دژی شۆڕشی باکوری کوردستان سەرنەکەوت.

ئەو سیاسەتەی یەکێتیی کە دژی شۆڕشی باکوری کوردستان بەڕێوەیدەبرد، بۆ ئەوە بوو تورکیا بکاتە دۆستی خۆی و بۆ تورکیای بسەلمێنێت کە یەکێتیی لە پارتیی زیاتر دلسۆزی تورکیایە، بەڵام سیاسەتە نانەتەوەییەکەی یەکێتیی سەرینەگرت و هەتا ئەمڕۆیش پەیوەندییەکانی تورکیا و پارتیی لە پەیوەندیی نێوان تورکیا و یەکیتیی باشترن.

لە دوای ڕاپەڕیین و هەڵبژاردنی پەرلەمان و پێکهێنانی حکومەتی هەرێم، پارتیی و یەکێتیی بە نهێنیی و دوور لە چاوی خەڵکی کوردستان، پەیوەندییان لەگەڵ ڕژێمی سەدام بەستەوە، سیاسەتی حکومەتی عێراق کاریگەریی لەسەر سیاسەتی هەرێم دەکرد، لە دامودەزگاکانی هەرێمدا چەندیین بەرپرسی کۆنی

ڕژێمی بەعس پۆستی ئیداریی و سەربازییان بەسەردا دابەشکرا، ئەو کەسانەی تاوانیان ئەنجامدابوو لێپێچینەوەیان لەگەڵ نەکرا.

دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام، ژمارەیەکی زۆر سەرکردەی سوپای عێراق و سەرکردەی حیزبی بەعس لە هەرێمی کوردستان داڵدەدران، لە لێکۆڵینەوە و سزا قوتارکران. ئەم سیاسەتەی پارتیی و یەکێتیی نەک تەنها دڵی خەڵکی کوردستان و بنەماڵەی شەهیدان و ئەنفال و کیمیاباران و زیندانییانی سیاسیی لە دەسەڵاتداران ڕەنجاند، دۆستەکانی کوردیشی نیگەرانکرد.

**سەرچاوەکان:**

١- دکتۆر فایەق گوڵپیی، کە لێرەوە سەیری ژیانی خۆم دەکەم.

٢- ساڵح یوسفیی، یەکێک لە سەرکردەکانی پارتیی و شۆڕشی ئەیلول بوو، ساڵی ١٩٧٥ لە پارتیی جیابووەوە، ساڵی ١٩٧٦ لە عێراق بە نهێنیی لەگەڵ ژمارەیەک سەرکردەی تردا بزوتنەوەی سوسیالیستیان دامەزراند، ساڵی ١٩٨١ لە بەغدا نامەیەکی لوغمکراوی پێدا تەقییەوە و شەهیدبوو.

٣- پێشمەرگە، بە نامیلکەی غەریب عەسکەریی.

٤.ئار بی جی، نامیلکەی مامۆستا ئەنوەر.

٥- کارەساتی ئەشکەوتی باڤێ و کارەساتی هەکاریی.

٦- لە ٣١ی ئاب ١٩٩٦ لەسەر داوای مەسعود بەرزانی سەرۆکی پ د ک سوپای عێراق پەلاماری شاری هەولێری دا دەستیبەسردا گرتەوە، پێشمەرگەکانی (ی. ن. ک) دەرکرد و ڕادەستی (پ. د. ک) کردەوە.

٧- هینری کیسنجەر، یادەوەریی، بەرگی پێنجەم.

٨- بەهادین نوری، سەرکردەیەکی حیزبی شیوعیی عێراقە، خەڵکی گوندی تەکیەی ناوچەی قەرەداغە.

٩- ئەبو شەهاب، کادرێکی کۆنی یەکێتییە، لە ساڵی ١٩٧٦ پێشمەرگەیە.

١٠- سامی عەبدولڕەحمان، ئەندامی مەکتەبی سیاسیی پارتیی، لە ساڵانی ١٩٨١ – ١٩٩٢ سکرتێری پارتی گەلی دیموکراتی کوردستان بوو.

١١- عوسمان ئۆج ئالان، برای عەبدوڵڵا ئۆج ئالانی سەرۆکی (پ. ک. ک) بۆ ماوەیەک ئەندامی کۆنسەی (پ. ک. ک) بووە.

١٢- کوردۆ حەمەئەمین لاپەڕەیەک لە مێژووی کورد.

١٣- سەلاح ڕەشید، دیداری تەمەن، چاوپێکەوتن لەگەڵ مام جەلال.

١٤- کە لێرەوە سەیری ژیانی خۆم دەکەم.

١٥- حیزبی ڕزگاریی کوردستان.

١٦- کە لێرەوە سەیری ژیانی خۆم دەکەم. لەشکری ئیسلامیی کوردستان.

# ٨

# سیاسەتی عێراق بەرانبەر بە کورد

**سەرەتا:**

کێشەی کورد یەکێکە لە کێشە هەرە ئاڵۆزەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، کێشەی کورد لە کێشەی فەلستین ئاڵۆزترە، بەڵام لەبەر بێکەسیی کورد لە ئاستی نێودەوڵەتیی و ناوچەییدا، لە دوای کێشەی فەلەستینەوە دێت. کێشەی کورد لە باشووری کوردستان، بە بەراورد لەگەڵ کێشەی کورد لە پارچەکانی تری کوردستان، کێشەیەکی ئاسانترە. تورکیا و ئێران و سوریا، نکوڵیی لە هەبوونی باکور و ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای کوردستان و گەلی کورد دەکەن، دان بە مافەکانیدا نانێن. لە دروستبوونی

دەوڵەتی عێراقەوە هەتا ئەمڕۆ، هەموو حکومەتەکانی عێراق لە چوارچێوەی عێراقی یەکگرتوودا، دانیان بە ناسنامەی نەتەوەیی گەلی باشووری کوردستاندا ناوە و نکوڵییان لە بوونی کورد نەکردووە.

کێشەی گەلی کورد لە عێرقدا دوو ڕەهەندی سەرەکیی هەیە، یەکەم: دیاریکردنی سنووری باشووری کوردستانە. دووەم: دەسەڵاتی کوردە لە عێراقدا. لە دروستبوونی دەوڵەتی عێراقەوە هەتا ئەمڕۆ هۆکاری سەرەکیی ململانێی نێوان کورد و دەوڵەتی عێراق، دیاریکردنی سنووری هەرێمی کوردستانە، لە دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقەوە

سنووری هەر سێ پارێزگای سلێمانیی و هەولێر و دهۆک لە لایەن دەوڵەتی عێراقەوە دانیانپێدانراوە، کە ناوچەیەکی کوردیین، لەو سنوورەدا کورد مافی ئەوەی هەیە زمانی خۆی بەکاربهێنێت و کاروباری خۆی بەڕێوەببات.

لە دەستووری کاتی کۆماری عێراقی سەردەمی عەبدولکەریم قاسمدا کورد وەکو پێکهاتەیەکی کۆماری عێراق دانیپێدانراوە. لە بەیانی ١١ی ئازاری ١٩٧٠دا، حکومەتی عێراق هەر سێ پارێزگای سلێمانیی و هەولێر و دهۆکی وەکو ناوچەی حوکمی زاتیی کوردستان بە فەرمیی ناساند. ئاماژەیشی پێداوە هەر ناوچەیەک لە ڕاپرسییدا زۆرینەی کورد بێت دەخرێتە سەر سنووری حوکمی زاتیی. دەستووری ساڵی ٢٠٠٥ی عێراق، هەرێمی کوردستانی بە فەرمیی ناساندووە، وەکو هەرێمێکی فیدراڵیی عێراق هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکات. لە دەزگاکانی دەوڵەتی عێراقیشدا کورد بەشداریی حوکمڕانیی دەوڵەتی عێراق دەکات. کێشەی سەرەکیی نێوان کورد و دەوڵەتی عێراق لەسەر ئەو ناوچانەیە کە کورد بە ناوچە دابڕاوەکانی کوردستانی ناودەبات و دەوڵەتی عێراقیش بە ناوچە جێناکۆکەکانی ناویدەبات. ئەو ناوچەیە نزیکەی ٤٧٪ خاکی باشووری کوردستان پێکدەهێنێت، یەک لەسەر سێی دانیشتوانی کوردستان پێکدەهێنێت. لە ڕووی ئابوورییەوە خاوەنی سامانێکی ژێرزەمینیی زۆری نەوتە، پارێزگای کەرکوک و قەزاکانی خانەقین و شەنگاڵ و ناوچە دابڕاوەکانی تری کوردستان دەگرێتەوە کە لە مادەی ١٤٠ی دەستووری هەمیشەیی عێراقی فیدراڵیی ساڵی ٢٠٠٥دا ئاماژەی پێدراوە. لە دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقەوە، ئەو ناوچانەی کە دەوڵەتی عێراق بە کوردستانی ناساندووە، هەتا دێت دەسەڵاتی کورد تیایدا فراواندەبێت، بەڵام لەو ناوچانەی کە دەوڵەتی عێراق بە جێناکۆکی دەزانێت، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ دەسەڵاتی کورد پاشەکشەدەکات.

بەشێکی تری ململانێی نێوان کورد و دەوڵەتی عێراق لەسەر جۆری پەیوەندیی نێوان کورد و حکومەتی عێراقی ناوەندییە، لەسەر ئەوەیە دەسەڵاتی کورد لە عێراقدا چەندبێت و چۆنبێت، عێراق دەوڵەتێکی ناوەندیی بێت، کوردستان لە عێراقدا حوکمی زاتیی هەبێت، کوردستان لە عێراقی دیموکراتییدا هەرێمێکی فیدراڵیی هەبێت، یان کوردستان سەربەخۆیی وەربگرێت؟

لە دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقەوە هەتا ئەمڕۆ، گەلی کورد بە شێوازی جیاجیا داوای زۆرکردن و گەرەنتییکردنی مافەکانی خۆی لە دەوڵەتی عێراق دەکات، لەپێناو دیاریکردنی سنووری نیشتیمانەکەیدا تێکۆشانی بەردەوام دەکات.

شۆڕشی شێخ مەحمود، شۆڕشی ئەیلول، شۆڕشی نوێ، حکومەتی هەرێمی کوردستانی دوای ڕاپەڕیین، حکومەتی هەرێمی کوردستانی دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام، نوێنەرانی کورد لە عێراقی نوێی دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام، یەکێک لە ئامانجە سەرەکییەکانیان دیاریکردنی سنووری هەرێمی کوردستان و زۆرکردنی مافەکانی تری گەلی کوردە لە عێراقدا.

هەڵوێستی دەسەڵاتدارانی عێراق بەرانبەر بە ماف و ئازادییەکانی گەلی کورد بە چەندیین قۆناغدا تێپەڕیوە. گرنگترینیان ئەمانەن:

## ١- قۆناغی هاوسەنگیی نەتەوەیی:

ئەم قۆناغە لە دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقەوە دەستپێدەکات و هەتا کۆتایی شەستەکانی سەدەی بیستەم بەردەوامدەبێت. لەو سەردەمەدا سیاسەتێکی نەرم بەرانبەر بە کورد پەیڕەوکراوە. نەتەوەپەرستیی و پەراوێزخستنی کورد سنووردرابووە. هۆکاری ئەم هەڵوێستە نەرمەی دەوڵەتی عێراق بەرانبەر بە کورد بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە:

١- دەوڵەتی عێراق لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانیی کە لە لایەن وڵاتی بەریتانیاوە دامەزرا لە سەرەتادا لاوازبوو، باش جێپێی خۆی قایمنەکردووە، بۆ خۆگرتن و خۆبەهێزکردنی دەوڵەت، پێویستی بە پشتیوانیی هەموو پێکهاتەکانی عێراق بووە، بۆیە بەرانبەر بە دۆزی کورد هەڵوێستێکی نەرمی نواندووە، بۆ ئەوەی گەلی کورد وای لێبکات پشتیوانیی دەوڵەتی عێراق بکات و بیپارێزێت.

٢- ساڵی ١٩٢٥ بەریتانیا یاسای بنەڕەتیی (دەستووریی) بۆ دەوڵەتی عێراق داڕشتووە، لە دەستووری یەکەمی عێراقدا، باس لە پێکهاتە نەتەوەییەکانی عێراق (کورد و عەرەب) نەکراوە. باس لە ماف و ئەرکی هاوڵاتیی عێراقی کراوە. لە داڕشتنی

دەستووردا، بەریتانیا ویستوویەتی کەلتوری سیاسیی خۆی لە عێراقدا جێگیربکات. هەوڵیداوە هەموو پێکهاتەکانی عێراق وەکو هاوڵاتیی بەشداریی لە بڕیاری سیاسییدا بکەن، نەک وەکو پێکهاتەی نەتەوەیی، بۆیە لەو سەردەمەدا بە شێوەیەکی فەرمیی سیاسەتی جیاوازیی نەتەوەیی باڵادەستنەبووە.

٣- چەندیین سیاسەتمەداری کورد لە دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق و بەڕێوەبردنی حکومەتی عێراقدا بەشدارییانکردووە*١.

٤- سیاسەتی چەپ و دیموکراتیی لە عێراقدا لەسەر دەستی حیزبی شیوعیی عێراقیدا پێشکەوتنی بە خۆیەوە بینیوە، شیوعییەکان یەکێک لەو پێکهاتە سیاسییەی عێراق بوون کە دژی نەتەوەپەرستیی دەوەستانەوە. حکومەتی عەبدولکەریم قاسم هەڵوێستێکی دیموکراتیی بەرانبەر بە کێشەی کورد پیشانداوە.

٥- لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە لە ناو گەلی باشووری کوردستاندا هۆشیاریی نەتەوەیی و خەباتی نەتەوەیی سەریهەڵداوە، تێکۆشانی سیاسیی گەلی کورد حکومەتە ناوەندییەکانی عێراقی ناچارکردووە بەرانبەر بە دۆزی کورد هەڵوێستی نکوڵییکردن پیشاننەدەن.

٦- هۆکارێکی هەرە گرنگی سیاسەتی نەرمی حکومەتە ناوەندییەکانی عێراق بەرانبەر بە دۆزی کورد، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە سەرهەڵدان و پێشکەوتنی هەست و هۆشیاریی نەتەوەیی عەرەب، لە ساڵانی دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقەوە هەتا کۆتایی پەنجاکانی سەدەی بیستەم لە قۆناغی نەتەوەبووندا بووە، بە قوناغی نەتەوەپەرستیی نەگەیشتووە، بەشی ئەوەی نەکردووە سیاسەتی جینۆساید و تواندنەوە و نکوڵییکردنی گەلی کورد پەیڕەوبکات.

٧- هۆکارێکی تری سیاسەتی نەرمی دەوڵەتی عێراق بەرانبەر بە دۆزی کورد، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە شیعەکانی عێراق بە بەردەوامیی لەگەڵ سوننەکانی عێراقدا ناکۆکیی ئاینزاییان هەبووە، سیاسەتی شۆڤینیستی عەرەب بە دەست کەمینەی سوننەوە بووە، ناکۆکیی ناوخۆیی نێوان ئەو دوو پێکهاتەیەی عێراق، حکومەتە شۆڤینییەکانی عێراقی لاوازکردووە، نەیانتوانیوە هەموو هێزی گەلی عێراق لە دەوری سیاسەتە شۆڤینییەکەیان کۆبکەنەوە و دژی گەلی کورد بەکارییبهێنن*٢.

## ٢- قۆناغی نەتەوەپەرستیی:

### ا- بەعەرەبکردن:

لە سییەکانی سەدەی بیستدا، حکومەتی یاسین هاشمیی، سیاسەتی بەعەرەبکردنی کوردستانی بە شێنەیی دەستپێکردووە. بە بیانووی دوژمنایەتیی لەگەڵ خێڵی عزە لە پارێزگای دیالە، هانی خێڵە عەرەبەکانی عوبێدی داوە لە دیالەوە بەرەو کەرکوک کۆچبکەن. دواتر خێڵی گەڕۆکی جبوریی لەسەر پرۆژەی ئاودێریی حەویجە نیشتەجێکردووە. زەوی بەسەر خێزانەکاندا دابەشکردووە و پەرەی بە سیاسەتی بەعەرەبکردنی باشووری کوردستان داوە*٣. ئەم سیاسەتەی بەرپرسانی ئەو کاتەی عێراق کاتیی بووە، لە سنوورێکی دیاریکراودا بووە.

کە هزری نەتەوەپەرستیی عەرەب لە عێراقدا پێشدەکەوێت، بە تایبەتیی پاش ئەوەی حیزبی بەعسی عەرەبیی لە کۆتایی شەستەکاندا لە ڕێگەی کوودەتای ١٧/ ٣٠ی تەموزی ١٩٦٨دا کۆنترۆڵی حوکمی عێراق دەکات. پرۆژەی نەتەوەپەرستیی عەرەبیی لە عێراق بە ڕاستەوخۆ دەستپێدەکات. لەو پرۆژەیەدا دەبێت نیشتیمانی عەرەبی و گەلی عەرەب یەکبگرێتەوە، نەتەوەی عەرەب و فەلەستین لە داگیرکاریی و زوڵمی جوو ڕزگاربکرێت.

کێشەی پرۆژەی نەتەوەیی عەرەب ئەوەیە ئەو پرۆسەیە لە عێراقەوە دەستپێدەکات، کە دەرفەتی سەرکەوتن و گەشەکردنی نەتەوەپەرستیی عەرەب تیایدا لەبار نییە، چونکە عێراق وڵاتێکی فرەنەتەوەیە، بێجگە لە عەرەب، کورد و تورکمان و ئاشوریی و کلدانیی تێدا دەژین، ئەو نەتەوانە ئامادەنین کار بۆ سەرخستن و بڵاوکردنەوەی نەتەوەپەرستیی عەرەب بکەن.

عێراق وڵاتێکی فرەئاین و ئاینزایە، عەرەبە شیعەکانی عێراق کە زۆرینەی دانیشتوانی عێراق پێکدەهێنن، هێندەی لەژێر کاریگەریی هزری ئاینزایی شیعەدا ژیاندەکەن، نیو هێندە گرێدراوی ئایدۆلۆژیای نەتەوەیی عەرەب نین. تاکە پێکهاتە کە لە عێراقدا پێشوازیی لە ئایدۆلۆژیای بەعسی عەرەبیی سۆسیالیستی دەکرد، عەرەبی سوننە دەبێ، بەو شێوەیە دەبینیت زۆرینەی گەلی عێراق لەگەڵ ئایدۆلۆژیای حیزبی بەعسدا نییە. بۆیە یەکێک لە کارەکانی حیزبی بەعس ئەوەبوو لە ڕێگەی دامودەزگاکانی حیزب و حکومەتەوە، چەندایەتیی و چۆنایەتیی ئەو پێکهاتەیەی عێراق زۆر بکات

کە بە بیروباوەڕی نەتەوەیی عەرەب ڕازیدەبێت. بۆ زیادکردنی پێکهاتەی نەتەوەیی عەرەبی عێراقیی، سیاسەتی بەعەرەبکردنی کورد و تورکمان و ئاشوریی و کلدانیی دەستپێکرد. سیاسەتی بەبەعسیکردنی شیعە و کورد و تورکمان و پێکهاتەکانی تری عێراقی دەستپێکرد. هەوڵی جدیی دا هەتا کەلتوری فرەپێکهاتەیی عێراق لە بنەوە هەڵبکەنێت و بە کەلتورێکی یەک_نەتەوەیی شوێنەکەی پڕبکاتەوە.

حیزبی بەعس زۆر هەوڵیدەدا لە کاتی سەرژمێرییەکاندا، ناسنامەی نەتەوەیی خەڵک بگۆڕێت، بە تایبەت ناسنامەی نەتەوەی کورد بە عەرەب بگۆڕێت. چەندیین ئیمتیازاتیان بەو کوردانە دەدا، کە ناسنامەی نەتەوەیی خۆیانیان لە کوردەوە بە ناسنامەی عەرەب دەگۆڕی. ئامانجی دەسەڵاتی بەعس ئەوە بوو پرۆسەی بەعەربکردنی کورد و کوردستان سەربخات و عێراق بکاتە وڵاتێکی یەک_نەتەوە.

جۆرێکی تری سیاسەتی بەعەرەبکردنی کوردستان گۆڕینی ناوی گوند و شارۆچکە و شار و شوێنە کۆنەکانی هەرێمی کوردستان بوو، ناوە کوردییەکانی بە ناوی عەرەبیی دەگۆڕی. بۆ نمونە: ڕژێمی بەعس ناوی گەڕەکە کوردییەکانی شاری کەرکوکی گۆڕی بە ناوی عەرەبیی. ناوی گەڕەکی ڕەحیمئاوای شاری کەرکوکی گۆڕی بە (حی ئەندەلوس).

یەکێک لە سیاسەتە شۆڤینییەکانی تری ڕژێمەکانی عێراقی عەرەبیی ئەوە بوو کە ئەو مافەی بە کورد درابوو بە زمانی خۆی بخوێنێت لێیدەسەندەوە.

لە دوای شکستی ساڵی ١٩٧٥ شۆڕشی ئەیلول، حکومەتی بەعس لە هەرێمی کوردستاندا دەستی بە کردنەوەی خوێندنگەی عەرەبیی کردەوە. هانی خەڵکی دەدا بە عەرەبیی بخوێنن. یەکێک لە کارە سەرەکییەکانی کوردە بەعسییەکان ئەوە بوو داوایان لە خەڵک دەکرد منداڵەکانیان بنێرنە قوتابخانەی عەرەبیی و لە قوتابخانە عەرەبییەکاندا فێری عەرەبییان بکەن. دەیانگوت هەر کەسێک عەرەبیی بزانێت بۆ دواڕۆژی باشە. ئەوەی عەرەبیی نەزانێت بەزەحمەت لە عێراقدا کاری دەستدەکەوێت.

ڕژێمی بەعس لە ناوچە دابڕاوەکانی دەرەوەی سنووری حوکمی زاتیی خوێندنی بە زمانی کوردیی قەدەغەکرد. لە قوتابخانەی ناوچە دابڕاوەکاندا تەنها بە زمانی عەرەبیی دەخوێنرا. بەو شێوەیە زمانی کوردیی لە قوتابخانە و لە دامودەزگا حکومییەکانی ناوچەکانی دەرەوەی حوکمی زاتییدا قەدەغەدەکرا.

له ساڵانی ۱۹۷۷ – ۱۹۷۸ پیاوەکانی ڕژێم و دامودەزگا سەرکوتکەرەکانی هەوڵیاندا بەرنامەی خوێندنی کوردیی نەک هەر لە ناوچە کوردستانییەکانی دەرەوەی سنووری حوکمی زاتیی هەڵبوەشێننەوە، پڕۆژەی خوێندن و نوسینی عەرەبیی لە هەموو باشووری کوردستاندا جێبەجێبکەن. هەوڵیاندا ئەو سیاسەتە لە شارەکانی سلێمانیی و قەزا و ناحیەکانیدا جێبەجێبکەن، بەڵام بەهۆی نارەزایی و چالاکیی خۆپیشاندانی خوێندکارانەوە، سیاسەتی بەعەرەبکردنی خوێندن لە پارێزگای سلێمانییدا سەرینەگرت.

یەکێک لە سیاسەتە شۆڤینییەکانی تری ڕژێمی بەعس لە ساڵانی حەفتا و هەشتاکاندا ئەوە بوو، هانی کوڕی عەرەبی دەدا لەگەڵ کچی کورددا خێزان پێکبهێنێت. ئەو خێزانە هاوکارییدەکرا بە مەرجێک زمانی خێزانەکەیان عەرەبیی بایە. واتە منداڵی ئەو خێزانە نوێیە تەنها بە عەرەبیی قسەیبکردایە. ئەمەش هەنگاوێکی تری قەدەغەکردنی زمانی کوردیی بوو، بەڵام ئەم سیاسەتە شۆڤینییەی ڕژێمی بەعس سەرکەوتنێکی ئەوتۆی بەدەستنەهێنا.

دوای کۆتاییهاتنی شۆڕشی ئەیلول، حکومەتی عێراق هانی خێڵە کۆچەرەکانی عەرەبی دەدا، بۆ ئاژەڵداریی لە کوردستان نیشتەجێببن. ئەو شوانانە نەک هەر مەترسییەکی گەورە بوون بۆ بەعەرەبکردنی کوردستان، هەموویان چەکدار بوون، دەستدرێژییاندەکردە سەر هاوڵاتییانی هەرێمی کوردستان و بە ئارەزووی خۆیان خەڵکی کوردیان دەکوشت. خێڵە کۆچەرەکانی عەرەب لە ساڵانی ۱۹۷٦ - ۱۹۷۷دا لە هەرێمی کوردستان خەڵکی کوردستانیان شپرزەدەکرد. ئەگەر ئەو چالاکییانەی هێزی پێشمەرگەی کوردستان نەبایە کە لە گەرمیان پەلاماری ئەو خێڵانەیان دا و تەمێیانکردن، بەعەرەبکردن سلێمانییشی دەگرتەوە.

قەدەغەکردنی زمانی کوردیی، پێکەوەنانی خێزانی عەرەب، هێرشی خێڵە کۆچەرەکانی عەرەب بۆ پارێزگاکانی سلێمانیی و هەولێر و دهۆک، لەگەڵ سیاسەتی گۆڕینی ناسنامەی نەتەوەیی، پایەی سیاسەتی بەعەرەبکردنی باشووری کوردستان بوون.

ئامانجی سیاسەتی بەعەرەبکردن ئەوە بوو، ژمارەی کورد لە عێراق کەمببێتەوە، ڕووبەری جوگرافیی هەرێمی کوردستان بچووکببێتەوە، عێراقی فرەنەتەوە بەرەو عێراقی یەک_نەتەوە ببات.

## ب- ڕاگواستن:

یەکێک لە سیاسەتە شۆڤینییەکانی دەسەڵاتدارنی نەتەوەپەرستیی عێراق، بەعەرەبکردنی ناوچە دابڕاوەکانی هەرێمی کوردستان بووە. لە شوێنە هەستیارەکانی وەکو کەرکوک و خانەقین و شەنگاڵ، کوردی ڕادەگواست. شوێنەکانی ئەو کوردانەی بە عەرەبی هێنراو لە ناوچە عەرەبنشینەکانی عێراقەوە پڕدەکردەوە. پشتگیریی مادیی و مەعنەویی ئەو عەرەبە هێنراوانەی دەکرد بۆ ئەوەی سیاسەتی بەعەرەبکردنی کوردستان جێبەجێبکەن.

جۆرێکی تری سیاسەتی نەتەوەپەرستیی عێراقی شۆڤینیی، کە دوای کۆتاییهاتنی شۆڕشی ئەیلول بە چڕیی دەستیپێکرد، ڕاگواستنی گوندە سنوورییەکانی باشووری کوردستان بوو. ئامانجی نزیکی پرۆسەی ڕاگواستنی گوندەکان و نیشتەجێکردنی خەڵکەکەی لە ئوردوگای زۆرەملیدا، بۆ ئەوە بوو خەڵک لە پێشمەرگە داببڕێت، هەتا ڕێگە لە دروستبوونەوەی خەباتی چەکداریی گەلی کورد بگرێت، بۆ ئەوە بوو گوندییەکانی کوردستان هاوکاریی شۆڕشی گەلی کورد نەکەن. شۆڕش شکستبخوات و کورد نەتوانێت دژی سیاسەتی نەتەوەپەرستیی ڕژێمی بەعسی عێراق خەباتبکات.

ئامانجیکی تری سیاسەتی ڕاگواستنی گوندەکانی باشووری کوردستان، بۆ ئەوە بوو کەلتوری گەلی کورد بتوێتەوە و پێگەیەکی نەتەوەبوونی گەلی کورد کۆتاییپێبهێنێت. کەلتوری هەر گەلێک لە گوندەوە دروستدەبێت و لە گون دەمێنێتەوە، شارەکان بەردەوام بەر هێرشی کەلتورە زاڵەکان دەکەون، کەلتور لە شاردا زوو دەتوێتەوە، بەڵام لەبەرئەوەی گوندەکان، بە تایبەتیی گوندی ناوچە شاخاوییەکان، دوورەدەستن و کەمتر بەر شاڵاوی کەلتورە زاڵەکە دەکەون، ئەگەری تواندنەوە و لەناوچوونی کەمە و زۆرتر بەرگە دەگرێت و دەمێنێتەوە.

کاتێک ڕژێمی بەعس گوندێکی بە خەڵک چۆڵدەکرد، خانووەکانیشی دەڕوخاند، ڕێگەکانی کوێردەکردەوە، کانییەکانی دەتەقاندەوە، لە ئوردوگایەکدا خەڵکی گوندەکەی نیشتەجێدەکرد، تەلەفزیۆنێکی ڕەشوسپیی دەدایە، پارەی خانوو و ڕەز و باخە سوتاو و ڕوخاوەکەی دەدایە، سەرۆکی خیزانەکەی وەکو کارگوزار لە

نەخۆشخانە و قوتابخانە و بەڕێوەبەرایەتییەکانی تری حکومەتدا دادەمەزراند. بەبێ ئەوەی کاربکات موچەیەکی مانگانەی پێدەدان و پیاندەگوت موچەی بەتاڵە. لەبەرئەوەی کارگوزارەکە بەتاڵ بوو، کارینەدەکرد تەنها موچەی وەردەگرت. ئەم هەموو ئیمتیازاتە بۆ ئەوە بوو جوتیاری کوردستان گوند و ڕەز و باخ و یادەوەریی و کەلتوری هەزار ساڵەی باووباپیرانی لەبیربچێتەوە و لە ناوجەرگەی کەلتورە نوێیەکەی بەعسدا بتوێتەوە.

ئامانجێکی تری ڕاگواستنی گوندەکانی کوردستان ئابوریی بوو. ڕژێمی بەعس دەیویست لە ڕووی ئابورییەوە کۆمەڵگەی کوردستان و هەموو عێراق بە خۆیەوە ببەستێتەوە. سەربەخۆیی ئابوریی چینوتێوژەکانی کوردستان نەمێنێت، بۆ ئەوەی بۆ دابینکردنی بژێوییان دەست لە ڕژێم پانبکەنەوە. ئەگەر بە گوێی ڕژێم بکەن نانیان پێدەدات، ئەگەر بە گوێی نەکەن برسییاندەکات هەتا دەمرن.

دوای دەستپێکردنەوەی شۆڕشی کورد، ڕژێمی بەعس سودی زۆری لەو جوتیارە بێزەوییانە وەرگرت، زۆریانی لە فەوجە سوکەکانی بەرگریی نیشتیمانیی (جاش) ڕێکخست، شەڕی پێشمەرگەی شۆڕشی نویی پێکردن.

ڕاگواستنی گوندەکانی کوردستان باری ئابوریی کوردستانی نزمکردەوە، بەروبومی کشتوکاڵیی کوردستان زۆر کەمیکرد. ئەو جوتیارانەی بە بەتاڵە دانەمەزرابوون، بۆ دابینکردنی ژیانیان وەکو کرێکار ڕوویان لە شارەکانی عێراق دەکرد، لەوێیشەوە بەر شاڵاوی بەعەربکردن و بەبەعسیکردن دەکەوتنەوە.

ئەو سیاسەتەی ڕژێمی بەعس کە لە گواستنەوەی گوندە سنوورییەکاندا دژی گەلی کورد بەکاریهێنا، سەرکەوتنێکی ئەوتۆی بەدەستنەهێنا، بۆیە بیری لە ڕاگواستن و وێرانکردن و لەناوبردنی فراوانتر و قووڵتری گەلی کورد و کەلتور و ئابورییەکەی دەکردەوە. ساڵانی ١٩٨٧ – ١٩٨٨ دەرفەتی زێڕیین بۆ ڕژێمی شۆڤێنیی سەدام هاتەپێشەوە هەتا لە ڕێگەی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی و پرۆسەکانی ئەنفالەوە، تاوانی کۆمەڵکوژیی و قەلاچۆکردنی گەلی کورد ئەنجامبدات. بڕیاری قەدەغەی ژیان و هاتوچۆ لە هەموو گوندە وێرانکراوەکانی کوردستان بدات، جوتیارەکانیش بکوژێت.

### ج– بەبەعسییکردن:

یەکێکی تر لە سیاسەتەکانی ڕژێمی بەعس، بەبەعسییکردنی خەڵکی کوردستان بوو، حیزبی بەعس ناوی (حیزبی بەعسی عەرەبیی ئیشتراکیی) بوو، بەگوێرەی ناو و بەرنامە و ئامانجەکانی، نەدەبوو کەسێکی غەیرە عەرەب وەکو ئەندام لە ڕیزەکانیدا وەربگرێت، بەڵام هەزاران ئەندامی کوردی لە ڕیزەکانیدا وەرگرتبوو. هەوڵیدەدا ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ژمارەی ئەندامە کوردەکانی زیاتر بکات.

ئەو کەسانەی دەبوونە ئەندامی حیزبی بەعس لە ناو خەڵکی کوردستاندا پڕوپاگەندەیان بۆ حیزبی بەعس و سیاسەتەکانی دەکرد، پشتیوانیی سیاسەتی بەعەرەبکردن و ڕاگواستنی کوردستانیان دەکرد، بەگژ ئەو کوردانەدا دەچوونەوە کە داوای ماف و ئازادییان بۆ گەلی کورد دەکرد. دژی نەتەوەبوونی گەلی کورد پڕوپاگەندەیاندەکرد. هەوڵی شکاندنی ئیرادەی خەڵکی کوردستانیان دەدا. بەرانبەر بە دۆزی کورد خەڵکیان ڕەشبیندەکرد و تێکۆشانی سیاسیی خەڵکی کوردستانیان لاوازدەکرد. هەوڵیاندەدا گەلی کورد بەو بڕوایە بگات خەباتی نەتەوەیی بۆ ڕزگاریی گەلی کورد سودی نییە و باشترە بۆ کورد بێدەنگیی هەڵبژێریت. کورد وەکو ژێردەست بژیت و ڕاوبۆچوونی نەبێت. بەردەوام بۆ مەبەست و ئامانجی سیاسیی دەسەڵاتدارانی عێراق و ناوچەکە و جیهان بەکاربهێنرێت.

ئیتر ئەو کوردەی دەبوو بە بەعسیی و ئێرادەی کوردبوونی لەدەستدەدا. ئەو سەرۆک_خێڵانەی کە چەکی جاشایەتییان بۆ ڕژێمی بەعس هەڵدەگرت، هەمان بۆچوونی بەعسییەکانیان هەبوو، خۆیشیان هەر بەعسیی بوون. دەیانگوت کورد هیچی پێناکرێت، باشترە وەکو عێراقی لەگەڵ حکومەتدا بژین و داکۆکیی لێبکەین. ئەو کوردەی دەبوو بە ئەندامی ئەنجومەنی حوکمی زاتیی هەرێم، هەمان هەڵوێستی بەرانبەر بە کوردبوون و مافی گەلی کورد هەبوو، ئەو کوردەی لە حکومەتی عێراقدا پۆستی وەردەگرت، وەکو پێکهاتەیەکی نەتەوەیی تایبەت حسابی بۆ نەدکرا، وەکو عێراقییەکی پلە دوو و پلە سێ بەشداریی حوکمڕانیی عێراقی دەکرد.

بۆ بەبەعسییکردنی خەڵکی کوردستان حیزبی بەعس ڕێوشوێنی جۆراوجۆری بەکاردەهێنا، سودی لە ناکۆکییە خێڵایەتیی و ناوچەییەکانی کۆمەڵگەی کوردستان وەردەگرت، خەڵکی دەترساند و ئیمتیازاتی بە خەڵکی تر دەدا.

## د. ئەنجام:

سیاسەتی نەتەوەپەرستیی ڕژێمی عێراق وەکو سیاسەتی نەتەوەپەرستیی جەنگی یەکەمی جیهانیی تورکیا و سیاسەتی نەتەوەپەرستیی جەنگی دووەمی جیهانیی ئەڵمانیا سەرکەوتنی بەدەستنەهێنا. بەهۆی سیاسەتی نەتەوەپەرستیی دەسەڵاتدارانی عێراقەوە، عێراق دوچاری چەندیین شەڕی ناوخۆیی و ناوچەیی و جیهانیی بوو.

لەگەڵ کوردا لە ساڵی ١٩٦١ - ٢٠٠٣ لە شەڕ و ململانێی بەردەوامدا بوو. ڕێککەوتنی جەزائیری ساڵی ١٩٧٥ کە لەسەر حسابی گەلی کورد کرا، ئەنجامەکەی بە قازانجی عێراق نەشکایەوە. دوای ساڵێک لەو ڕێککەوتنە شومە، شۆڕشی گەلی کورد لە شاخەکانی کوردستان هەڵگیرسایەوە. ڕێککەوتنی جەزائیر شەڕی وێرانکاریی (عێراق – ئێران)ی ساڵانی ١٩٨١ - ١٩٨٨ لێکەوتەوە. ئەو شەڕەیش شەڕی داگیرکردنی کوێتی لێکەوتەوە. ئەو شەڕەیش شەڕی هێزەکانی هاوپەیمانیی نێودەوڵەتیی و ڕژێمی عێراقی ساڵی ١٩٩١ لێکەوتەوە، کە ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ لەگەڵ خۆی هێنا و زۆربینەی خاکی کودستان ئازادکرا. لە کۆتاییشدا ساڵی ٢٠٠٣ شەڕی ڕوخاندنی ڕژێمی سەدامی لێکەوتەوە. ڕوخانی ڕژێمی سەدامیش جۆرەها ڕێکخراوی توندڕەوی وەکو داعشی لێکەوتەوە، کە ماوەی هەژدە ساڵە گەلی عێراقی ڕووبەڕووی تیرۆر کردووەتەوە.

بەو شێوەیە دەبینین سیاسەتی نەتەوەپەرستیی پێکهاتەیەکی عەرەبیی لە عێراق، زیانی بە گەلی کورد گەیاند، بەڵام بۆی نەکرا کورد بتوێنێتەوە، گەورەترین کارەسات و نەهامەتیی بۆ خەڵکی عێراق دروستکرد.

## ٣- هەڵەی کورد و پەرچەکردار (بەرتەک)ی عەرەب:

لە دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقەوە هەتا ئەمڕۆ، بۆ دیاریکردنی سنووری هەرێمی کوردستان و بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی تر لە عێراق، دەسەڵاتدارانی کورد و دەسەڵاتدارانی عێراق هەر یەک لە لای خۆیەوە بەرانبەر بەو کێشانە سیاسەتێکی هەڵە پەیڕەودەکەن. سیاسەتی هەر لایەک لەگەڵ سیاسەتی لایەنەکەی تر ناکۆک و دژبەرە و یەکتری تەواوناکەن، خزمەتی چارەسەری کێشەکە ناکەن.

دەسەڵاتدارانی عەرەبی عێراق هەموو توانای خۆیان بۆ بچووککردنەوەی کورد و کوردستان تەرخاندەکەن، بۆ ئەوەی لە کاتی گونجاودا لە چوارچێوەی عەرەبی عێراقدا قووتیبدەن. گەلی کوردیش بەو سیاسەتە شۆڤینییەی ڕژێمەکانی عێراق ڕازینەبووە، خەباتی سیاسیی و چەکداریی دەستپێکردووە، پەرچەکرداری توندی خێڵەکیی پیشانداوە.

سیاسەتمەداری کورد وا هەڵسوکەوتی نەکردووە کە نوێنەرایەتیی دۆزێکی نەتەوەیی ڕەوای ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەکات، بەرپرسانی کورد بیریان لای ئەوە نەماوە کە ئامانجی سەرەکیی شۆڕش و خەباتی سیاسیی گەلی کورد، ماف و ئازادییەکانی گەلی کورد بووە. بەرپرسەکانی کورد لە کاتی خەباتدا بڕیاری وایان دەرکردووە، هاوپەیمانیی وایان لەگەڵ دوژمنەکانی عێراقدا دروستکردووە، پیشانیدادات نوێنەری گەلێکی زوڵملێکراوی وەکو کورد بن. سیاسەت و بڕیار و کردە سەربازیی و هاوپەیمانییە نهێنییەکانی سەرکردە کوردەکان، لەگەڵ دوژمنەکانی عێراقدا وەکو ئیسرائیل و ئێران و تورکیا، مۆرک و ناسنامەی هێزێکی نابەرپرسیار بە شۆڕشەکانی کورد دەبەخشێت، ئەو سیاسەتە هەڵانەی کە سەرکردەکانی کورد لە قۆناغە جیاجیاکانی شۆڕشدا، دژی عێراق و لەپێناو بەرژەوەندیی وڵاتانی تردا ئەنجامیانداوە، کێشەی کوردی پێ چارەسەرنەکراوە، شۆڤینیزمی عەرەبیی پێبەهێزکراوە. هەڵوێست و سیاسەتی بەرپرسەکانی شۆڕشی کورد پەرچەکرداری سیاسەتی شۆڤینیی حکومەتی عێراق بووە، بەڵام ئەو سیاسەتە نەک هەر بەشی ئەوەی نەکردووە مل بە حکومەتی عێراق کەچبکات و بە سیاسەتی شۆڤینیی خۆیدا بچێتەوە و دەست لەو سیاسەتە هەڵبگرێت، ئەو سیاسەتە هەڵانەی سەرانی شۆڕشی کورد، هەر بەشی ئەوەیان کردووە سەرانی دەسەڵاتداری عێراقی ناوەندیی هێندەی تر دوچاری هستریای نەتەوەپەرستیی بکەن، پەرچەکردارێکی توندتر بەرانبەر بە گەلی کورد پیشانبدەن، هەڵمەتێکی شۆڤینیی و دکتاتۆریی تر ئەنجامبدەن.

هاوپەیمانیی ساڵی ١٩٨٦ ئێران و حیزبەکانی باشووری کوردستان (بە تایبەت یەکێتیی)، نەک هەر بۆی نەکرا ڕژێمی بەعس لاوزابکات هەتا مل بۆ داواکارییەکانی گەلی کورد بدات، بەڵکو هاوپەیمانیی و کردە سەربازییەکانی کورد و ئێران، لە ڕووی سیاسیی و سەربازییەوە هێندە هێزیان هەبوو ڕژێمی بەعس شێت و هارتر بکات. ڕژێمی بەعس پشتیوانییەکی ناوخۆیی و ناوچەیی و جیهانیی دژی کورد کۆکردەوە و بە هێزێکی گەورەترەوە سیاسەتی نەتەوەپەرستیی دژی گەلی کورد ئەنجامدا.

له بەرانبەر هێرشە سەربازییە هاوبەشەکانی سوپای پاسدارانی ئێران و هێزی پێشمەرگە بۆ سەر شاری هەڵەبجە، ڕژێمی بەعس ئەو شارەی بە چەکی کیمیاویی بۆردوومانکرد و پێنج هەزار کەسی شەهیدکرد، دەیان هەزار بریندابوون و شارەکە وێرانکرا و چۆڵکرا. هەر لە پەرچەکرداری ئەو ڕێککەوتنەدا، لە ڕێگەی پرۆسەکانی ئەنفالەوە هەڵمەتی کوکوژیی و قەلاچۆکردنی خەڵکی کوردستان و وێرانکردن و چۆڵکردنی گوندەکانی کوردستانی دەستپێکرد، نزیکەی سەدوهەشتا هەزار کەسی ئەنفالکرد، زۆربەی گوند و ناحیە و قەزاکانی پارێزگای سلێمانیی و پاریزگاکانی هەولێر و دهۆک وێرانکران. ئەو سیاسەتە هەڵانەی سەرانی کورد بەرانبەر بە خاک و گەل و سەروەریی عێراق، لە ئاستی عێراق و کوردستان و ناوچەکە و لە جیهانی عەرەبیی و ئیسلامییدا، دەرفەتی چالاکیی دیبلۆماسیی بۆ تێکۆشانی گەلی کورد بەرتەسککردەوە، هێندەی تر کێشەی کوردی پەراوێزخست. ئەگەر هەڵە مێژوویی و چارەنوسسازەکانی سەدام نەبایە، شەڕی کوێت و شەڕی کەنداوی دووەمی نەقەوماندایە، زۆر زەحمەتدەبوو بەو زووانە دەسەڵاتدارانی باشووری کوردستان لە ڕاپەڕیندا بە کوردستان شادبوونایەتەوە.

دەسەڵاتدارانی کورد لە کاتێکدا هاوپەیمانیی دوژمنەکانی عێراقیان دەکرد و لە دژی حکومەتی ناوەندیی دەچوونە سەنگەرەوە، لەگەڵ سوپای دەوڵەتاندا پێکەوە هێرشیان بۆ سەر عێراق دەکرد، هیچ کام لەو دەوڵەتانە هێندەی عێراق مافی بە گەلی کورد نەدابوو و نەداوە. لە هیچ پەیمان و ڕێککەوتنێکدا دانیان بە ماف و ئازادیی گەلی کورددا نەناوە. ئامادەنەبوون لە کاتی تەنگانەدا هاوکاریی گەلی کورد و شۆڕشەکانی بکەن. چەندیین جاریش ئەو وڵاتانە دەستی کوردیان بریوە و لەوپەڕی چارەڕەشییدا بە جێیانهێشتووە، بۆیە ئەو سیاسەتە هەڵانەی سەرانی باشووری کوردستان لە لایەن زۆرییینەی گەلی کوردەوە لە باشوور و لە پارچەکانی تری کوردستاندا شەرمەزاردەکرێت، ناکۆکیی لە نێوان دەسەڵاتی کوردیی و خەڵکی کوردستاندا دروستدەکات، بەرەی خەباتی ناوخۆی کوردستانی لاوازدەکات.

لە دوای ڕاپەڕینەوە دەسەڵاتدارانی هەرێمی کوردستان لەگەڵ دەوڵەتی تورکیا ڕێککەوتوون، سوپای تورکیا و کۆمپانیاکانی تورکیا پەلکێشی هەرێمی کوردستان دەکەن. ئەم ڕێککەوتنە لەسەر حسابی سەروەریی عێراق و هەرێمی کوردستان تەواودەبێت. لە لایەکەوە سوپای تورکیا لە باشووری کوردستاندا دەیان پێگەی سەربازیی و هەواڵگریی داناوە، دژایەتیی عێراقی پێدەکات و سەروەریی خاکی عێراق پێشێلدەکات. بە

بیانووی شەڕی گەریلاکانی (پ. ک. ک) ڕۆژانە بە چەکی هەمەجۆر ماڵ و حاڵی خەڵکی کوردستان تێکدەدات و ژیانیان لێدەسێنێتەوە. لەولایشەوە ڕقی دەسەڵاتدارانی عێراق لە کورد ئەستوورتر دەکات. ئەگەری زۆرە لە ئایندەدا بە پەرچەکرداری توند، وەڵامی ئەو سیاسەتەی دەسەڵاتی هەرێم بدەنەوە. ناسنامەی خۆفرۆش و ناپاک بەسەر گەلی کورددا ببەخشنەوە.

ساڵی ٢٠١٤ بەبێ ئاگاداریی و ڕەزامەندیی حکومەتی عێراق، حکومەتی هەرێم لەگەڵ کۆمپانیاکانی تورکیا گرێبەستی دەرهێنان و هەناردەکردنی نەوتی ئیمزاکرد. دوای ئەوە بەرپرسانی هەرێم باسیان لە ئابوریی سەربەخۆی هەرێمی کوردستان دەستپێکرد. ئەم سیاسەتە ئابورییەی هەرێم حکومەتی عێراقی ناوەندیی نیگەرانکرد. وەڵامی سیاسەتی ئابوریی سەربەخۆی هەرێمی بە بڕینی بەشە بودجەی کارمەندانی هەرێم دایەوە. ئیتر لەو کاتەوە و بە تایبەت لە ساڵی ٢٠١٦ بە دواوە، کێشەی موچەی خەڵکی کوردستان لە کاتی خۆیدا و بە بڕی خۆی نادرێت. لە لایەکی تریشەوە کێشەیەکی گەورەی لە نێوان هەرێم و عێراقی ناوەندییدا دروستکردووە. سیاسەتی هەڵەی سەرکردایەتیی سیاسیی باشووری کوردستان بەرانبەر بە خاک و دەوڵەتی عێراق، هێندەی تر کێشە و ململانێ نەتەوەییەکانی نێوان گەل و دەسەڵاتدارانی کورد و دەسەڵاتدارانی عەرەبی عێراقی ئاڵۆزدەکات. بێبڕوایی و گومان لە نێوان عەرەب و کوردی عێراقدا دروستدەکات. ئەگەری ئەوە هەیە ئەو بێبڕوایی و لەیەکحاڵێینەبوون و ناکۆکییە نەتەوەییانە جارێکی تر گەلانی عێراق دوچاری شەڕ وماڵوێرانیی بکاتەوە.

### ٤- خۆسەپاندن، یان ئازادیی:

باوەڕ (قەناعەتی) پێکهاتەکانی وڵاتانی فرەنەتەوە بۆ پێکەوەژیانی ئاشتییانە، پایەیەکی گرنگی ئاشتیی کۆمەڵایەتیی و جێگیریی سیاسیی ئەو وڵاتانەیە. کاتێک ئاشتیی لە وڵاتی فرەنەتەوەدا جێگیردەبێت کە کەمینە و زۆرینەکانی وڵات بڕوا بە گرنگیی پێکەوە ژیانی ئاشتییانە بهێنن، بە ئازادیی ئەو مۆدیلە سیاسییە هەڵبژێرن کە یەکێتیی خاکی وڵات و ئاشتیی کۆمەڵگە دەپارێزێت. ئەگەر بە زەبروزەنگ مۆدێلی سیاسیی پێکەوەژیان بەسەر نەتەوەکانی وڵاتی فرەنەتەوەدا بسەپێنرێت، هەموو نەتەوەکان ئەو مۆدێلەیان پێ قبوڵناکرێت. پایەکانی پێکەوەژیان لەقدەبن و دەڕمێن. لەگەڵ لاوازبوونی دەسەڵاتی

ناوەندییدا، پێکهاتەکان هەوڵی سەربەخۆیی و خۆرزگارکردن لە دەسەڵاتی ناوەندیی دەدەن.

ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ باشووری کوردستان، پیشانیدا کە گەلی باشووری کوردستان بە ئارەزووی خۆیان تێکەڵی وڵاتی عێراق نەبوون، بە حوکمڕانی ئەو کاتەی دەوڵەتی عێراق ڕازینەبوون، هەر کە بینییان ناوەند لاوازبـووە، یەکسەر ڕزگاریی و سەربەخۆیی خۆیانیان لە عێراقی ناوەندیی ڕاگەیاند و باشوری کوردستانیان لە دەسەڵاتی عێراق پاک کردەوە..

ڕیفراندۆمی ساڵی ٢٠٠٥ باشووری کوردستان کە لە نێوان خەڵکی کوردساندا ئەنجامدرا، لەسەر جۆری پەیوەندیی نێوان گەلی باشووری کوردستان و حکومەتی ناوەندیی عێراق پرسیاردەکرا، ئایا پێتباشە کورد لە عێراقدا بمێنێتەوە؟ یان سەربەخۆیی وەربگرێت؟ ئەنجامی ڕیفراندۆم بە ڕێژەی ٩٨٪ لەگەڵ ئەوەدا بوو کە کوردستان سەربەخۆیی وەربگرێت و لە عێراق جیاببێتەوە. ئەو ڕیفراندۆمە دەریخست کە خەڵکی باشووری کوردستان سەربەخۆییان پێباشە هەتا مانەوەیان لە چوارچێوەی دەوڵەتی عێراقدا. ڕیفراندۆمی خەڵکی کوردستان لە لایەن حکومەتی ئەو کاتەی عێراق و دەسەڵاتدارانی ئەمریکاوە قبوڵنەکرا، نوێنەرانی کوردیش لە دەوڵەتی عێراقی ناوەندییدا داکۆکییان لە ئیرادەی خەڵکی کوردستان نەکرد. ڕیفراندۆمی پایزی ٢٠١٧ کە لە لایەن دەسەڵاتی هەرێمەوە بڕیاری لەسەر درا، جارێکی تر پیشانیدایەوە کە گەلی کورد بە ئیرادەی خۆی لەگەڵ دەوڵەتی عێراقدا تێکەڵنەبووە، بەزۆر، یان بە هەڵخەڵەتاندنی سیاسیی ئەو بڕیارەی بەسەردا سەپێنراوە، هەر کاتێک دەرفەتی هەبێت لە زنجیر و کەلەپچەی عێراق خۆی ڕادەوەشێنێت. دەوڵەتی عێراق و هاوپەیمانەکانی وەڵامێکی شۆڤێنین بە ئازادیی خەڵکی کوردستانیان دایەوە، ئیرادەی عێراقی ناوەندیی و وڵاتانی داگیرکەری تری کوردستانیان بەسەر ئیرادەی ئازادیی گەلی کوردستاندا سەپاند. لە ١٦ی ئۆکتۆبەری ٢٠١٧دا بە هێرش و پەلاماری سەربازیی وەڵامی کوردیان دایەوە، بە ئابڵوقەی ئابوریی و سەربازیی وەڵامی ئازادیی کوردیان دایەوە.

ئەگەر هەر هێز و لایەنێکی کوردستانیی، عێراقیی، ئەمریکیی، چارەنوسی ئاشتییانە و پێکەوەژیانی گەلی کورد و عەرەبی عێراقی بە لاوە گرنگبێت، جێگیریی سیاسیی عێراقی بە لاوە گرنگبێت، دەبێت گرنگیی بەو بارە دەروونییەی خەڵکی باشووری کوردستان

بدات، كە دژی سەپاندنی سیاسەتی ناوەندیی عێراق دەوەستێتەوە. ئەگەر بیانەوێت گەلی کورد لە عێراقێکی یەکگرتوودا بمێنێتەوە، دەبێت هەستی کۆی گشتیی خەڵکی کوردستان والێبکەن کە لەگەڵ گەلی عەرەبی عێراقدا حەز بە پێکەوەژیانی ئاشتییانە بکەن.

### ٥- ئایندەی کورد لە عێراقدا:

هەتا ئەمڕۆیش هزری نەتەوەیی بەسەر دید و بۆچوونی زۆرینەی کورد و عەرەب و نەتەوەکانی تری عێرقدا زاڵە. کورد خەون بە گەڕانەوەی کەرکوک و ناوچە دابڕاوەکانی تری کوردستانەوە دەبینێت، خەون بە سەربەخۆیی باشووری کوردستانەوە دەبینێت. لە ڕاپرسیی ئەیلولی ٢٠١٧ ئەو ئەندێشە سیاسییەی خۆی پیشاندا.

لە بەرانبەردا عەرەبی عێراق خەون بە عێراقێکی یەک_نەتەوەوە دەبینێت. زۆرینەی عەرەب حەزی بە شتێک نییە ناوی کوردستان بێت، ئەگەر هەیشبێت لەو هەرێمە فیدراڵییەی ئەمڕۆی باشووری کوردستان زیاتر نەبێت. لە ١٦ی ئۆکتۆبەری ٢٠١٧ و ڕۆژانی تردا عیراق هەڵوێستی نادیموکراتیی خۆی پیشاندا.

لە عێراقی ئەمڕۆدا کە هێشتا دامودەزگاکانی سوپا و ئاسایش و هەواڵگریی و پەیوەندییەکانی دەرەوە و ژێرخانی ئابوریی ئاساییەبوونەتەوە و عێراق بە لاواز دبینرێت، کورد لە ناخەوە بەو لاوازییەی حکومەتی ناوەندیی عێراق دڵخۆشە و کار بۆ بەهێزکردنەوەی ناکات، لەبەرئەوەی لە عێراقێکی بەهێز دەترسێت، گومان دەکات کە حکومەتی عێراق خۆیگرتەوە، پرۆسەکانی بەعەرەبکردن و ڕاگواستن و زیندانیی و لەسێدارەدان و ئەنفال و کیمیاباران دەستپێبکاتەوە، بۆیە کورد بە دەسەڵات و بە گەلەوە عێراقێکی بەهێزی وەکو مۆتەکە دێتە بەرچاو و کاری بۆ ناکات. عەرەبی عێراقیش بە گەل و بە دەسەڵاتەوە ترسی ئەوەی هەیە هەرێمی کوردستانێکی بەهێز پشت لە عێراق بکات، سەربەخۆیی ڕابگەیەنێت و عێراق پارچە پارچە بکات، یان وەکو جاران لە لایەن وڵاتانی ناوچەکەوە بۆ دژایەتیی عێراق بەکاربهێنرێت. عەرەبەکان بە مافی ڕەوای خۆیانی دەزانن لە بیست دەوڵەت زیاتریان هەبێت، خاوەنی گەورەترین نیشتیمان بن، بەڵام ئامادە نین ئەو مافە بە گەلی کورد بدەن، کە خاوەنی دامودەزگای یەک_دەوڵەتی سەربەخۆی خۆی بێت، بۆیە دەوڵەتی عێراق ئامادە نییە دەستوری عێراق مادەی ١٤٠ جێبەجێبکات و هەوڵی بەهێزکردنی هەرێمی کوردستان نادات.

ئەگەر ئەزموونی تاڵی شەڕە ماڵوێرانکەرەکانی ڕابردووی نێوان دەوڵەتی عێراق و شۆڕشی کورد نەبایە، ئەگەر هەڵوێستی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیی و بڕیاری ٦٨٨ی ئەنجومەنی ئاسایش نەبایە، ئەگەر دەستووری عێراق و هاوبەشیی کورد و عەرەب لە پێکهێنانەوەی عێراقی نوێدا نەبایە، دەمێک بوو کورد و عەرەب دوچاری شەڕ و ململانێی تری خویناویی دەهاتنەوە و هێندەی تر برینەکانی خەڵکی عێراق قووڵدەبوونەوە.

دەسەڵاتدارنی جیهان و سیستەمی سیاسیی باوی جیهان پشتگیریی ئەم سیستەمەی ئەمڕۆی عێراق دەکەن، کورد لە هەرێمی کوردستاندا دەسەڵاتی هەبێت، لە حوکمڕانیی عێراقدا هاوبەشبێت، عێراق وڵاتێکی فیدراڵیی بێت. کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیی لەگەڵ ئەوەدا نییە کورد لەوە زیاتر بڕوات، لەگەڵ ئەوەدا نییە عێراق بەرەو ناوەندێتیی و شۆڤێنیزم بڕوات. ئەگەرچی ئەمریکا ڕۆڵی سەرەکیی هەبوو لە داڕشتنی دەستووری ساڵی ٢٠٠٥ عێراقدا، بەڵام ئەمریکا لەگەڵ ئەوەدا نییە مادەی ١٤٠ دەستووری عێراق جێبەجێبکرێت و کەرکوک لەسەر هەرێمی کوردستان بێت.

لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠٦دا ڕاپۆرتی بەیکەر هاملتۆن ئاماژەی بەوە دا، کە جێبەجێکردنی ئەو مادەیە بە واتای هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆی عێراق دێت٤. کاتێک ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوک ئامادەکارییدەکرد بۆ ئەوەی داوایەک بۆ دەوڵەتی عێراقی ناوەندیی بەرزبکاتەوە، کە ڕەزامەندیی پیشانبدەن پارێزگای کەرکوک بخرێتە سەر هەرێمی کوردستان، وەزیری دەرەوەی ئەمریکا (کۆندیلیسا رایس) سێ ڕۆژ پێش ٣١/ ١٢/ ٢٠٠٧ وادەی کۆتاییهاتنی جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ سەردانی کەرکوکی کرد و داوای لە ئەنجومەنی شاری کەرکوک کرد بڕیارێکی وا نەدەن کە کەرکوک بخرێتە سەر سنووری هەرێمی کوردستان. ساڵی ٢٠١٧ گەلی کورد لە باشووری کوردستان لەسەر مافی سەربەخۆیی ڕاپرسییکرد، ئەمریکا و هێزە نێودەوڵەتییەکان لەگەڵ ڕاپرسی نەبوون. دوای ١٦ی ئۆکتۆبەری ٢٠١٧ هەندێک وڵاتی ناوچەیی داوایان لە عێراق کرد سیستەمی سیاسیی عێراق بەرەو سیستەمێکی ناوەندیی بگێڕنەوە، ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی دژی ئەو داوایە وەستانەوە و هەڵوێستی سیاسیی خۆیان لەسەر عێراق و هەرێم ڕاگەیاند و گوتیان: پشتیوانیی لە عێراقێکی فیدراڵیی دیموکرات و هەرێمی کوردستانی بەهێز دەکەین.

بابەتی هەرە گرنگ کە ئایندەی عێراق دەخاتە مەترسییەوە، ئەو بێمتمانەییە لە نێوان هەرێمی کوردستان و عێراقدا هەیە. ئەمریکییەکان هەست بە ناکۆکیی و بێمتمانەیی

نێوان کورد و عەرەبی عێراق دەکەن، دەزانن ئەگەر ئەو ناکۆکییە سنووری بۆ دانەنرێت، بەرژەوەندیی ئەوانیش دەخاتە مەترسییەوە، لەبەرئەوە بە حسابی خۆیان کار بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە دەکەن.

ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ لە ژمارە ٤٩٩٧ ڕۆژی ١٣/ ١٠/ ٢٠٠٩دا لە لاپەڕە دوویدا بە مانشێتی:

«ململانێی کورد و عەرەب مەترسیی یەکەمی ئایندەی عێراقە» هەواڵێک بڵاودەکاتەوە (ناکۆکییەکانی نێوان عەرەب و کورد لەسەر ناوچە جێناکۆکەکان، مەترسیی سەرەکییە لەبەردەم سەقامگیریی عێراقدا. ئەمریکا هەموو هەوڵێک دەدات کە هێزە عێراقییەکان لەپێناو چەسپاندنی ئاشتییدا لە یەکتر نزیکبکاتەوە).

بەرژەوەندیی ئەمریکا وا دەخوازێت کە ئاشتیی لە عێراقدا سەقامگیر بێت، عێراق دیموکرات بێت و هەرێمی کوردستان بەهێز بێت، کورد و عەرەب و نەتەوەکانی تر بە ئاشتیی پێکەوە لە چوارچێوەی عێراقێکی دیموکراتدا بژین، سیستەمێکی سیاسیی لە عێراقدا پێشبخرێت کە لەگەڵ سیستەمی سیاسیی ئەمریکادا ناکۆک نەبێت.

بۆ ئەوەی سیاسەتی ئەمریکا لە عێراق و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا شکستنەهێنێت، لە مانگی ئابی ٢٠١٠دا جەنەراڵ رایمۆند ئۆدێرنۆ بەرپرسی هێزەکانی ئەمریکا لە عێراق، پێشنیازیکرد کۆمیتەیەکی سێ قۆڵیی (ئەمریکیی و کوردیی و عەرەبی عێراق) لە سنووری ناوچە جێناکۆکەکانی پارێزگاکانی موسڵ و کەرکوک و سەلاحەدین و دیالەدا پێکبهێنرێت، بۆ ئەوەی پێکهاتە ناکۆکەکان لە یەکتر نزیکبکاتەوە و هەوڵی چارسەری کێشەکانیان بدات. ئەم کۆمیتەیە بۆ ئەوەیە بۆ ئەوەیە هەر کێشەیەک لە نێوان عەرەب و کورددا ڕووبدات، ئەو هێزە کار بۆ ڕێگریی بکات، لەو ناوچانەدا ئاشتیی و تەبایی لە نێوان کورد و عەرەب و نەتەوەکانی تردا بپارێزێت.

ئەو پێشنیازەی ئەمریکا لە لایەن حکومەتی هەرێمی کوردستان و لە لایەن سەرۆکی حکومەتی عێراقی ناوەندییەوە، بە باش بینرا و بڕیاریاندا کار بۆ جێبەجێبکردنی بکەن. کارکردنی هێزێکی وەکو ئەمریکا بۆ سەقامگیریی ئاشتیی لە عێراقدا، بۆ نزیکبوونەوەی کورد و عەرەب لە یەکتر، بۆ گفتوگۆکردن لەسەر چارەسەرکردنی ناکۆکییەکانی سنووری نێوان باشووری کوردستان و عێراقی عەرەبیی، گرنگیی خۆی هەیە، بەڵام ئەو

کارانەی ئەمریکا هەموو شتێک نییە، ئەو کارەی ئەمریکا هاوکاریی پێشکەوتنی ئاشتیی و تەبایی نێوان کورد و عەرەب دەکات، بەڵام چارەسەری بنەڕەتیی ئەو کێشەیە، بە پێشخستنی ڕۆشنبیریی دیموکراتیی و بنەماکانی تری سیستەمی دیموکراتیی دێتەدی کە لە ناو تاک و کۆمەڵگە و دەسەڵاتی کورد و عەرەبی عێراقدا لاوازە.

## چارەسەری کێشەی کورد لە عێراقدا

پێش ئەوەی ڕژێمی سەدام بڕوخێنرێت و عێراق نوێبکرێتەوە، کێشەی سەرەکیی کورد لەگەڵ عێراق، سنووری باشووری کوردستان بوو. بەگوێرەی بڕیاری ٦٨٨ی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان کە لە بەهاری ساڵی ١٩٩١ دەرچوو، بەشە ڕزگارکراوەکەی باشووری کوردستان کە دهۆک و هەولێر و سلێمانیی هەڵەبجە و کفریی و کەلار دەگرێتەوە، لە لایەن کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییەوە لە هێرشی ڕژێمی سەدام دەپارێزرا. خەڵکی کوردستان چاوەڕوانبوو کە ڕژێمی سەدام ڕوخا، کەرکوک و خانەقین و ناوچە دابڕاوەکانی تر، بخرێنەوە سەر سنووری هەرێمی کوردستان و کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیی بیانپارێزێت.

لە ڕاپەڕینەوە هەتا ڕوخانی ڕژێمی سەدام، لەبەرئەوەی هەرێم بە فەرمیی پەیوەندیی لەگەڵ دەوڵەتی عێراقدا نەمابوو، هیچ کێشەیەکی ئابوریی لەگەڵ دەوڵەتی عێراقدا نەبوو. بۆ ڕوخانی ڕژێمی سەدام کورد هاوکاریی ئەمریکا و ئێرانی کرد، ڕژێمی سەدام ڕوخا، عێراقی نوێ دروستکرایەوە، بەڵام ناوچە دابڕاوەکان نەگەڕانەوە بۆ سەر سنووری هەرێمی کوردستان، کێشەی ئابوریی و کێشەی دەسەڵاتداریی لە نیوان هەرێم و عێراقی نوێدا دەستیپێکرد.

گەورەترین هەڵەی دەسەڵاتدارانی کورد ئەوە بوو بەبێ ئەوەی هیچ ڕێککەوتنێکی سیاسیی لەگەڵ ئەمریکا و ئێران و ئۆپۆزسیۆنی عێراق لەسەر گەڕانەوەی ناوچە دابڕاوەکان بکەن، بەشداریی پرۆسەی ڕوخاندنی ڕژێمی سەدام و نوێکردنەوەی دەوڵەتی عێراقیان کرد.

لەبەرئەوەی بەبێ ڕێککەوتنی سیاسیی، کورد لە ڕوخاندن و نوێکردنەوەی عێراقدا بەشدارییکرد، کێشەکانی کورد لە عێراقدا نوێبوونەوە و زۆرتر بوون.

**چارسەرکردنی ئەو کێشانەلەسەر ئەم بنەمایانە دەبێت:**

## ١- ئەورپای دیموکرات و ڕۆژهەڵاتی نەتەوەپەرست

لە سەرەتای سەدەی بیستدا لە ئەورووپا هزری نەتەوەپەرستیی زیاد لە ڕادەی خۆی بڵاوبووەوە، وڵاتانی ئەورووپای دوچاری دوو شەڕی گەورەی جیهانیی کرد. وڵاتانی ئەورووپا لە بواری مرۆیی و ئابوریی و زانستیی و کەلتورییەوە گەورەترین زیانیان بەرکەوت. ئەو زیانە گەورانە وای لە تاک و کۆمەڵ و دەسەڵاتی ئەو وڵاتانە کرد، بە چاوێکی ڕەخنەگرانەوە سەیری ئەو شەڕانە بکەن و سنوور بۆ دوبارەبوونەوەی شەڕ و ماڵوێرانیی دابنێن. لەبریی شەڕ بە ئاشتیی و دیموکراتیی کێشەکانیان چارەسەربکەن، کار بۆ ئاشتییەکی دێژخایەن و هەتاهەتایی بکەن. لەبریی کارەسات و ماڵوێرانیی، ئاوەدانیی و بەختیاریی بە بنەما بگرن، پاش بەدواداچوون و لێکۆڵینەوە، ئەورووپییەکان بەو ئەنجامە گەیشتن کە هۆکاری ئەو شەڕ و ناکۆکیی و ماڵوێرانییانەی ئەورووپا بە شێوەیەکی سەرەکیی بۆ فراوانبوون و ئەستووربوونی کینەی نەتەوەیی نەتەوەکانی ئەورووپا بەرانبەر بە یەکتر دەگەڕێتەوە.

یەکێک لە کارەکانی دوای جەنگی دووەمی جیهانیی گەلانی ئەورووپا لە هەموو ئاستەکاندا، لە ڕەگەوە هەڵکێشانی چەمکی نەتەوەپەرستیی بوو، لە شوێنیدا هزری دیموکراتیی و مرۆڤدۆستیان چاند، بۆ ئەوەی گەلانی ئەورووپا یەکتریان خۆشبوێت و ڕێزی ئیرادە و ویستی یەکتر بگرن و لایەنە دەسەڵاتدارەکانیش لەژێر سێبەری ئەو ڕێز و خۆشەویستییەی نێوان نەتەوەکاندا هەوڵی چارەسەری دیموکراتییانەی کێشەکان بدەن، هەتا ئاشتیی و ئارامیی لە ئەورووپادا جێگیربکرێت.

ئەو سیاسەتە نوێیەی ئەورووپا سەرکەوتنی بەدەستهێنا، چارەسەری دیموکراتییانەی کیشە نەتەوەییەکانی ئەورووپا و کێشەکانی تری خستە سەر سکەی سروشتیی خۆی و ئاشتیی و پێکەوەژیانی نەتەوەکان لە چوارچێوەی یەک دەوڵەتدا، یان لە چوارچێوەی ئەورووپایەکی ئارمی کۆنفیدراڵدا، پێشکەوتنی گرنگی بە خۆیەوە بینی و بەرەو جێگیربوون ڕۆیشت.

لە دوای هەڵوەشانەوەی یەکێتیی سۆڤیەتی جاران، بەبێ دروستبوونی شەڕ و پێکدادانی خوێناوی، چەندین دەوڵەتی نەتەوەیی لە ئەورووپا و لە ئاسیای ناوەڕاست لەدایکبوون، پێکەوە بە تەبایی لەگەڵ وڵاتانی دایک و وڵاتانی دەروجیراندا دەژین. ئەگەر

له ناو ناخی تاک و کۆمەڵگە و دەسەڵاتی ئەوروپادا هزری دیموکراتیەت پێشنەکەوتایە، بە هەڵوەشانەوەی یەکێتیی سۆڤیەت و یۆگوسلاڤیا، دامەزراندنی چەندیین دەوڵەتی نەتەوەیی نەدەهاتەئاراوە، ئەگەری زۆر ئەوە بوو لە هەوڵی دامەزراندنی ئەو دەوڵەتە نوێیانەدا جارێکی تر شەڕێکی جیهانیی بەرۆکی ئەوروپای بگرتایە.

لەبەرئەوەی چەمکەکانی پێکەوەژیانی نەتەوەیی و ڕێزگرتن لە نەتەوە بێدەوڵەتەکان و مافدان بە هەر نەتەوەیەک بۆ ئەوەی مافی چارەنوسی خۆی دیاریبکات، لە ئەوروپای نەوەدەکانی کۆتایی سەدەی بیستەم پێشکەوتبوو، هەندێک ناکۆکیی کاتیی و سنووردار لە کۆمارەکانی جارانی یوگوسلافیا و چیچان نەبێت، ڕوداوی ئەوتۆ و کارەسات دەرنەکەوتن. هەڵسەنگاندنێکی ڕاست بۆ دروستبوونی ئەو دەوڵەتانە بە شێوازێکی ئاشتییانە بێجگە لە گەشەکردنی ڕۆشنبیریی دیموکراتیی و سیستەمی دیموکراتیی شتێکی تر نییە.

ئێمەی کورد و نەتەوەکانی تری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، وەکو نەتەوەکانی ئەوروپای دوای جەنگی دووەمی جیهانیی پێویستمان بە ئاوەزمەندیی دیموکراتیی هەیە. ئێمەی کورد لە هەموو پێکهاتەکانی تری ناوچەکە زیاتر پێویستمان بە هزر و سیستەمی دیموکراتیی هەیە، لەبەرئەوەی کورد خاوەنی کێشەیەکی نەتەوەییە. لەم سەردەمەدا بە دیموکراتبوون نەبێت کێشەی کورد بە هیچ شێوازێکی تری تێکۆشان چارەسەرناکرێت، بۆیە گرنگە پێش هەر پێکهاتەیەکی تری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کورد خۆی دیموکراتیزە بکات، لە هەر شوێنێکی ئەم جیهانە دیموکراتبوون هەبێت، دەبێت کورد باوەشی خۆی بۆ بکاتەوە و لەئامێزیبگرێت و باش لێیتێبگات و کاریپێبکات. پێکهاتەکانی تری ناوچەکە و دەسەڵاتدارانی وڵاتانی سەردەست هانبدات، ناچاریانبکات هەتا بە باشیی لە سیستەمی دیموکراتیی تێبگەن و بە باشیی کاریپێبکەن.

جەنگی یەکەمی جیهانیی سنووری ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی گرتەوە، دەوڵەتی عوسمانیی هەڵوەشاندەوە، لەبەر تایبەتمەندیی دۆگماتیکی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لەبەرئەوەی چەمکی نەتەوەپەرستیی تازە لە ئەوروپاوە گەیشتبووە تورکیا، گەلی تورک لە جەنگی یەکەمی جیهانییدا بە لەدەستدانی

ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی هەستی بە ژێرکەوتن و دۆڕاندن دەکرد، لە جەنگی یەکەمی جیهانییدا و لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانیی لە تورکیا ئایدۆلۆژیای نەتەوەپەرستیی بە زیادەوە پێشکەوت. جینۆسایدی ئەرمەن و نکوڵییکردن لە ناسنامەی گەلی کورد و نەتەوەکانی تری ناو تورکیای لێکەوتەوە.

لە جەنگی دووەمی جیهانییدا، ئێران کەوتە ناو شەڕەوە و لە لایەن هاوپەیمانانەوە داگیرکرا، بەڵام حکومەتی شاهنشایی ئەو کاتە، هەموو سازشێکی لەگەڵ داگیرکەراندا کرد لەپێناو خنکاندنی ئەو دەوڵەتەی کە لە مەهاباد و ئازەربایجاندا بۆ گەلی کورد و گەلی ئازەریی بەدەستهاتبوو.

بەو شێوەیە کۆمەڵگەکان و دەسەڵاتدارانی ئەم ناوچەیە، لە دوای دوو جەنگی ڕەگەزپەرست و وێرانکەری جیهان، نەک هەر خۆیان ڕانەوەشاند و تۆزی نەتەوەپەرستییان لە سیمای خۆیان نەتەکاند، لەبەرئەوەی خاوەنی هزرێکی دۆگمابوون و تازە بە تازە بە چەمکی نەتەوەبوون و نەتەوەپەرستیی ئاشنابووبوون، دەیانویست دەوڵەتی نەتەوەیی ئاوابکەن و پاوانخوازیی نەتەوەی سەردەست پێشبخەن، لاسایی دەوڵەتە نەتەوەپەرستەکانی ئەوروپای پێش جەنگە جیهانییەکان بکەنەوە، هیچ گۆڕانکارییەکیان بەسەردانەهات.

لەبەرئەوەی هەتا جەنگی یەکەمی جیهانیی عەرەبەکان ژێردەستی دەوڵەتی عوسمانیی بوون، لە سیاسەتی نەتەوەپەرستییدا لە پاشەوە بوون، لە دوای جەنگی یەکەمەوە پاش هەڵوەشانەوەی دەوڵەتی عوسمانیی، لە نیشتیمانی عەرەبییدا چەندیین دەوڵەتی عەرەبیی پێکهاتن، بەڵام هەتا کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانیی ئەو دەوڵەتانە لەژێر ڕکێفی دەسەڵاتی سیاسیی و هەژموونی کەلتوریی وڵاتانی ئەوروپادا بوون و بەرەو لیبراڵیزم دەچوون.

لە دوای جەنگی دووەمی جیهانیی بە پشتیوانیی وڵاتانی ئەوروپا، دەوڵەتی ئیسرائیل لەسەر خاکی فەلەستین ئاواکرا. بەوهۆیەوە هەستی نەتەوەپەرستیی لە لای گەلی عەرەب گۆڕانکاریی بەسەرداهات و لە سیاسەتی لیبراڵ و کەلتوری ئەوروپا یاخیبوون. بڕوایان بە دۆستایەتیی و هاوپەیمانیی ئەوروپییەکان لاوازبوو، هەستی نەتەوەپەرستییان دژی جوو و دەوڵەتی ئیسرائیل و دۆستەکانیان پێشکەوت.

لە کۆتایی شەستەکانی سەدەی بیستدا سیاسەتی نەتەوەپەرستیی عەرەبی لە عێراق لەسەر دەستی حیزبی بەعسی عەرەبییدا پێشکەوتنێکی خێرای بە خۆیەوە بینی، هەڕەشەی لە دەوڵەتی ئیسرائیل دەکرد، هەڵمەتی بەعەرەبکردنی باشووری کوردستانی دەستپێکرد. شەڕی (ئێران – عێراق) و شەڕی داگیرکردنی کوێت و شەڕی کەنداوی دووەم و شەڕی ڕوخانی ڕژێمی سەدامی لەگەڵ خۆی هێنا.

بەگوێرەی لۆژیک دەبایە لە دوای شەڕەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و شەڕەکانی عێراق و ئەو دوو شەڕەماڵوێرانکەرەی ڕوخانی ڕژێمی تاڵیبان و ڕژێمی بەعسی عێراق، پێشکەوتنێکی هزریی و سیاسیی لە ئەفغانستان و لە عێراقدا بەرانبەر بە شەڕ و ئاشتیی ببینرایە، چارەسەری ئاشتییانەی کێشەکانی بە بنەما بگرتایە، بەڵام وادەردەکەوێت کە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لۆژیکی نەگۆڕانی تایبەتی خۆی هەیە. پێدراوەکانی ئەمڕۆی عێراق ئەوە پیشاندەدەن کە شەڕەکانی ڕژێمی سەدام لەگەڵ کورد و لەگەڵ ئێران و لەگەڵ کوێت و لە گەڵ ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی، کاریگەرییەکی وای لەسەر بیرکردنەوەی تاک و کۆمەڵگەی عێراق و نەتەوەی عەرەب نەکردووە. ئەو شەڕانەی لە ماوەی سیی ساڵی ڕابردوودا ڕژێمی سەدام لە عێراقدا دژی کورد و خەڵکی عێراق و وڵاتانی جیران و وڵاتانی جیهان ئەنجامیدان، هێندەی شەڕەکانی یەکەم و دووەمی جیهانیی ئەوروپا کاریگەریی خراپیان بۆ سەر بوارەکانی ژیانی خەڵکی عێراق و ناوچەکە هەبووە، کەچی هەتا ئەمڕۆیش هەڵوێستەیەکی جدیی نابینرێت، دەڵێیت عێراق نە بای دیوە و نە باران، ئەمەیش گەورەترین نەهامەتییە و کارەساتی گەورەی لێ چاوەڕواندەکرێت.

دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام، سیاسەتی نەتەوەپەرستیی عەرەب لە ڕێگەی ئیسلامی توندڕەو (ڕێکخراوی داعش)ەوە بە لوتکە گەیشت، سیاسەتی سەرەکیی داعش لە ناوچەکەدا لەناوبردنی دەستکەوتەکانی باشوور و ڕۆژئاوای کوردستان بوو.

ئێمەی کورد ئەگەر لە ناو عێراقدا لەگەڵ عەرەب و پێکهاتەکانی تردا بژین، یان وەکو دەوڵەتێکی سەربەخۆ لە دەرەوەی عێراقدا بژین، هەر پێویستمان بە ئاشتیی و پێکەوەژیان لەگەڵ گەلی عەرەبدا دەبێت، ئەو پێکەوە ژیانە مسۆگەر نابێت

ئەگەر کورد و عەرەب و نەتەوەکانی تری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە سیستەمی دیموکراتیی تێنەگەن و کارپێنەکەن، گرنگترین چەمکی سیستەمی دیموکراتییش لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا پێکەوەژیانی ئازادانەی گەلانە. کەمبوونەوەی هەستی نەتەوەپەرستییە لە ناخی تاک و کۆمەڵگەی کورد و عەرەب و هێزە سیاسییەکانی ناو ئەو نەتەوانەدا.

بەم شێوەیە بۆمان ڕوندەبێتەوە کە گەلی کورد بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی و بۆ پاراستنی ئەو دەسکەوتانەی کە بەدەستیهێناون، زیاتر لە گەلانی تری ناوچەکە پێویستی بە سیستەمی دیموکراتیی و پێکەوەژیانی ئاشتییانە هەیە، بۆیە گرنگە کورد بە گەل و بە دەسەڵاتەوە، بۆ جێگیرکردن و پێشخستنی پایەکانی ئەو سیستەمە، لە هەموو ئاستەکاندا تێکۆشانی جدیی بەڕێوەببات، لەبەرئەوەی ئێمە پێویستمان بەو سیستەمە هەیە، وەکو گوتراوە: «پێویستیی دایکی داهێنانە».

دیموکراتیەت سیستەمێکە بە تێکۆشانی تاک و پێکهاتەکانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیی داهێنراوە، دەبێت لە ئاستی ناوخۆی کوردستاندا بە باشیی کار بۆ دامەزراندنی پایەکانی ئەو سیستەمە بکەین، بە جیهانی پیشانبدەین کە بە پێچەوانەی سیستەمی دیموکراتیی باوی جیهانەوە هەڵسوکەوتناکەین.

## ٢- پەیامی دیبلۆماسیی:

### پێش ڕوخانی ڕژێمی سەدام:

دەبوو دیبلۆماسیەتی کورد گەلی عەرەب لە عێراق و وڵاتانی عەرەبییدا تێبگەیەنێت کە کوردیش نەتەوەیەکە وەکو نەتەوەکانی تری جیهان، مافی ئەوەی هەیە بە یەکسانیی لە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتییدا بژیت. دەبوو دیبلۆمات و سیاسەتمەدارانی کورد لە بڕیار و کارکردندا، هەستی نەتەوەیی عەرەب بریندارنەکەن، پیرۆزییەکانیان نەخنە ژێرپێ. نابێت هەر لایەنێک و هەر وڵاتێک لەگەڵ عێراق و لەگەڵ گەلی عەرەبدا ناکۆکیی هەبێت، کورد بەبێ یەک و دوو، بەبێ پێوانە خۆی بکاتە دۆستی ئەو لایەنە و دژایەتیی عێراق و عەرەب بکات. دەبێت دیبلۆماسیەتی کورد بۆ گەلی عەرەب و گەلانی تری ناوچەکەی بسەلمێنێت،

هەتا کێشەی کورد لە عێراقدا چارەسەرنەکرێت، عێراق و ناوچەکە ئارامیی و ئاشتیی بە خۆیەوە نابینێت.

بەهۆی ئەو ململانێیەوە کە لە دوای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقەوە لە نێوان گەلی کورد و دەوڵەتی عێراقدا سەریهەڵداوە، توندوتیژیی و شەڕ و کاولکاریی دروستبووە. نوێنەران و دەسەڵاتدارانی کورد لە ڕابردوودا بەگوێرەی ئەو پەندەی پێشینان لەگەڵ حکومەتەکانی عێراقدا هەڵسوکەوتیانکردووە، کە دەڵێت: (دوژمنی دوژمنم دۆستمە) ئەمە وایکردووە کورد سیاسەتێکی کورتبینی سۆزدار بەرانبەر بە عێراقی عەرەبیی و بەرانبەر بە تەواویی گەلی عەرەب پەیڕەوبکات، ئەو سیاسەتە پەرچەکردار بووە، پەرچەکرداریش زۆربەی کات زیان بە دوای خۆیدا دەهێنێت.

پێویستبوو سەرکردەکانی گەلی کورد لەو ڕووەوە بە خۆیاندا بچنەوە و دان بە هەڵەکانی خۆیاندا بنێن، کە لە ڕابردوودا لەگەڵ حکومەتی عێراق و لەگەڵ نەتەوەی عەرەبدا کردوویانە. ئەمەیش ڕێگە خۆشدەکات بۆ ئەوەی عەرەبەکان دان بە هەڵەکانی خۆیاندا بنێن، کە بەرانبەر بە گەلی کورد کردوویانە و داوای لێبوردن لە گەلی کورد بکەن. ئەو کات بێمتمانەیی لە نێوان کورد و عەرەب و نەتەوەکانی تری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا کەمدەبێتەوە، هەنگاو بۆ پێکەوەژیانی ئاشتییانەی گەلانی ڕۆژهەڵات دەنرێت.

لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلولدا لەبەرئەوەی ناکۆکیی و شەڕ لە نێوان کورد و حکومەتی عێراقدا هەبووە، حکومەتی عێراقیش لەسەر کێشەی فەلستین لەگەڵ دەوڵەتی ئیسرائیلدا کێشە و ناکۆکیی هەبووە، بۆ دژایەتییکردنی حکومەتی عێراق سەرکردەکانی شۆڕشی ئەیلول بەبێ ڕێککەوتنی سیاسیی پەیوەندییان لەگەڵ ئیسرائیل دروستدەکرد.

لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلول و شۆڕشی نوێدا، لەبەرئەوەی ئێران لەگەڵ عێراقدا لە ململانێ و ناکۆکیی و شەڕدا بوو، سەرکردەکانی کورد بەبێ دڵەڕاوکێ، لایەنگریی ئێرانیان دەکرد، لەگەڵ ئێران دژایەتیی عێراقیان دەکرد. بەبێ ئەوەی هیچ ڕێککەوتنێکی سیاسیی لە نێوان شۆڕشی کورد و ئێراندا هەبووبێت و ئەو سیاسەتە سودی بۆ چارەسەری کێشەی کورد هەبێت.

لە دوای ڕاپەڕینەوە هەتا ئەمڕۆ دەسەڵاتی هەرێم بە چەندین قوناخ، سوپای تورکیای پەلکێشی هەرێمی کوردستان و عێراق کردووە، سوپای تورکیا نەک هەر دژی هێزەکانی گەریلای باکوری کوردستان پێگە سەربازییەکانی ناو هەرێم بەکاردەهێنێت، بەڵکو سەروەریی دەوڵەتی عێراقیش پێشێلدەکات.

ئەم سیاسەتەی دەسەڵاتدارانی هەرێم زۆر جێی نیگەرانیی دەسەڵاتدارانی عێراقە، بە تایبەت دەسەڵاتدارانی شیعە، لە ڕووی ئاینزایی و نەتەوەیی و سیاسییەوە دژی تورکیا دەوەستنەوە. ئەم سیاسەتە هەڵانەی سەرکردەکانی کورد هیچ سودێکی بۆ گەلی کورد تێدا نییە، تێگەیشتنێکی لە لای عەرەبی عێراق و گشت نەتەوەی عەرەب دروستکردووە، کە کورد بەردەوام دژی عەرەبە و لەگەڵ دوژمنەکانی عەرەبدا هاوپەیمانییدەکات. ڕاستکردنەوەی ئەم سیاسەتە هەڵانەی کورد بەرانبەر بە عێراق و نەتەوەی عەرەب، ئەرکی هەموو کوردێکی دڵسۆزە، ئەرکی دبلۆماسییەتی کودە.

## دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام:

لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام، بەرپرسانی کورد لە هەرێمی کوردستان و نوێنەرانی کورد لە حکومەتی عێراقی ناوەندیی، بۆ ڕاستکردنەوەی ئەو هەڵوێستەی کورد بەرانبەر بە عێراق و عەرەب کاری جددیان نەکرد، بۆ کەمکردنەوەی ڕق و هەڵوێستی نەتەوەپەرستانەی عەرەبی عێراق لەسەر گەلی کورد هیچ هەنگاوێکی جدییان نەناوە.

لەبریی ئەوەی ڕەوایی کێشەی کورد بۆ ڕای گشتیی عەرەبی عێراق بسەلمێنن، هەر خەریکی شەڕی پۆست و دەستکەوتی حیزبیین، کێشەی کوردیان لەبیرچووەتەوە، لە هیچ هەواڵێکی دانیشتن و گفتوگۆی نێوان نوێنەرانی کورد و حکومەتی عێراقدا، باسی کێشە نەتەوەییەکانی گەلی کورد بەر گوێ و چاو ناکەوێت.

ئەو هێزانەی ئەمڕۆ لە گۆرەپانی سیاسیی کوردستاندان، لە ڕاپەڕینەوە دەسەڵاتی هەرێمی کوردستانیان قورخکردووە. هێزێکی دۆگمای دەمارگیری خێڵەکیی و حیزبیین. لە ئاستی هاوکێشە جیهانییەکاندا بەهای سیاسیی و دیبلۆماسییان بەشی ئەوە ناکات گەلی کورد وەکو نەتەوەیەکی سەربەخۆی خاوەن_ئیرادە و ناسنامەی

تایبەت بە جیهان بناسن. پۆل بریمەری نوێنەری وڵاتی ئەمریکا لە عێراق لە ساڵانی ٢٠٠٣ - ٢٠٠٤ لە کتێبەکەیدا*٦، باس لە بەهای سەرکردەکانی کورد دەکات، کە چۆن بەبێ مەرج و داواکاریی سەبارەت بە مافەکانی گەلی کورد لە عێراقدا، تەنها لەبەر خاتری پۆل بریمەر بەشداریی لە حکومەتی عێراقی نوێدا دەکەن.

لەبەرئەوەی بەرپرسانی شۆڕشی دوێنێ و دەسەڵاتدارانی ئەمڕۆی هەرێم ئامادە نین ڕەخنە لە ڕابردووی خۆیان بگرن، ناتوانن پەیوەندییەکی باش لە نێوان گەلی کورد و گەلی عەرەبدا ئاوابکەن، بۆ ئەوەی خۆیان لە ڕەخنە بدزنەوە و عەرەبەکانی عێراق لێیاننەگرن کە لە ڕابردوودا چۆن سیاسەتی هەڵەیان کردووە، بە ئیرادەوە داوای مافەکانی گەلی کورد ناکەن، چاوپۆشیی لە زۆرێک لە مافەکانی کورد دەکەن. لەسەر جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ دەستووری عێراق جدیی نین، مادەی ١٤٠ دەستووری عێراق، کێشەی ناوچە دابڕاوەکانی باشووری کوردستانی چارەسەردەکات، بە دواکەوتن و جێبەجێنەکردنی ئەو مادەیەی دەستووری عێراق، کێشەی سەرەکیی گەلی کورد کە سنووری هەرێمی کوردستانە، بە چارەسەرنەکراویی دەمێنێتەوە.

بۆچوونێک هەیە کە عەرەبە عێراقییەکان چاو لە هەڵە کوشندە و ستراتیژییەکانی ڕابردووی سەرکردەکانی کورد دەپۆشن، بەرانبەر بەوەی سەرکردەکانی کورد چاو لە مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد بپۆشن. بەو شێوەیە سەرکردەکانی کورد بەبێ دەستکەوتی نەتەوەیی بۆ گەلی کورد، لەگەڵ سەرکردەکانی ئەمڕۆی عێراق ڕێکدەکەون. لە پەرلەمان و حکومەت و دەسەڵاتی دادوەریی عێراقدا، نوێنەری گەلی کورد هەیە، بەڵام ئەگەر هەر کەسێک بە وردیی سەیری ئەو نوێنەرانە بکات، تێدەگات کە ئەو نوێنەرانە نوێنەرایەتیی کورد ناکەن، نوێنەرایەتیی حیزب و وڵاتانی دەوروبەر دەکەن. زۆرتریش وردببێتەوە تێدەگەیت کە ئەو نوێنەرانە تەنها پارێزەری بەرژەوەندیی و دەسەڵاتی سەرۆکی حیزبەکانن. دەبێت نوێنەرانی گەلی کورد لە بەغدا بە فیلتەری وڵاتانی دراوسێدا تێبپەڕن، تورکیا و ئێران و ئەمریکا ڕەزامەندییان لەسەر بدەن.

هەڵبژاردنی نوێنەرانی کورد بۆ دەزگاکانی دەوڵەتی عێراق و بۆ ڕێکخراوە نێونەتەوەییەکان بەو شێوەیە، لەسەر بنەمای بنەماڵە و خزمخزمێنە و بە ڕەزامەندیی

ولاتانی تر، پیشانیدەدات کە دەسەلاتدارانی کورد کار بۆ ماف و دەستکەوتی حیزب و بنەماڵە و دەوڵەتانی تر دەکەن، کار بۆ ماف و ئازادیی گەلی کورد ناکەن.

ئەم سیستەمە دیبلۆماسییەی کورد، پێگەی دیبلۆماسیەتی کوردی دابەزاندووە. لایەنە پەیوەندییدارەکان وەکو خێڵ، نەک وەکو نەتەوە، وەکو گرێدراوی دەوڵەتان، نەک وەکو کورد هەڵسوکەوت لەگەڵ دەسەلاتداران و نوێنەرانی کورددا دەکەن، ئیتر کێشەکەمان لە کێشەیەکی نەتەوەیی ڕەواوە، بۆ کێشەیەکی خێڵەکیی و بنەماڵەیی و ململانێی دەوڵەتان پاشەکشەدەکات. لەو کاتەوە نوێنەرانی کورد چوونەتە ناو دەوڵەتی عێراقەوە، نەک هەر کاریان بۆ کورد نەکردووە، کاریشیان بۆ عێراق نەکردووە، لە کاتێکدا هەموو خەڵکی عێراق خەو بەوەوە دەبینێت کە هێزەکانی ئەمریکا بە زوترین کات لە عێراقدا پاشەکشەبکەن و عێراق لەژێر بەندی ژمارە ٧ی بڕیاری نەتەوە یەکگرتووەکان بێتەدەرەوە*١٠. هۆشیار زێباریی وەزیری دەرەوە و مام جەلال سەرۆککۆماری عێراق نەک هەر بەو ئاڕاستیە کارناکەن، بەڵکو کار بۆ ئەوە دەکەن هەتاهەتایە ئەمریکا لە عێراقدا بمێنێتەوە، چەندیین دوکیۆمێنت هەیە پیشانیدەدات کە زێباریی و تاڵەبانیی لەبریی ئەوەی کار بۆ کورد و کار بۆ عێراق بکەن، کار بۆ ولاتانی ئەمریکا و تورکیا و ئێران دەکەن. بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی کورد لە عێراقدا، دەبێت نوێنەرانی کورد لە عێراق و نوێنەرانی دیبلۆماسیەتی عێراق سیاسەتی خۆیان بگۆڕن، بۆ پلە و پۆست و دەستکەوتی ماددیی و حیزبیی کارنەکەن، بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی کورد و کێشەکانی عێراق کاربکەن.

### ٣- دەستووری عێراق:

دەستووری عێراق کۆمەڵێک کەموکوورپی جدیی تێدایە، هیچ بڕگەیەکی ڕوونی تێدا نییە کە دان بە فرەنەتەوەیی کۆماری عێراقدا بنێت، لە هیچ بڕگەیەکی دەستووری عێراقدا کورد وەکو پێکهاتەیەکی نەتەوەیی ناوینەهاتووە، لە هیچ بڕگەیەکی دەستووردا باسی ئەوە نەکراوە کە دەبێت گەلی کورد بەردەوام یەکێک لە پۆستە سەرۆکایەتییەکانی وەکو سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران، سەرۆککومار، یان سەرۆکی پەرلەمانی عێراقی بەدەستەوەبێت.

دەستووری عێراقی دوای سەدام، ئەمریکییەکان دایانڕشتبوو، وەکو دەستووری ساڵی ١٩٢٥ عێراقە کە دوای دامەزراندنی عێراق بەریتنیا دایڕشت، هەردوکیان تەنها باس لە ماف و ئەرکی هاوڵاتیی عێراقیی دەکەن، چارەسەری ئەو جیاوازییە ئاینیی و ئاینزایی و نەتەوەییەی عێراق ناکەن، کە ناخی مرۆڤی عێراقیی دەکوڵێنێت.

دەستووری عێراق هەندێک بڕگەی باشیشی تێدایە، دەکرێت کورد بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی سودی لێوەربگرێت، لە دەستووردا عێراق بە کۆمارێکی فیدراڵیی دانراوە، بەڵام لە کرداردا هەتا ئێستا کار بە بڕگەکانی فیدراڵییکردنی عێراق نەکراوە، ئەگەری ئەوەیش هەیە لە پێداچوونەوەی دەستووردا، بڕگەکانی تایبەت بە فیدراڵیی عێراق لە دەستووری ئایندەدا هەڵبگیرێت. لە دوای ڕاپرسیی ٢٠١٧، تورکیا و ئێران و نەتەوەپەرستەکانی عێراق، هەوڵی زۆریان دا سیستەمی فیدراڵیی عێراق هەڵبوەشێننەوە، بەڵام ئەمریکییەکان بەو هەوڵانە ڕازینەبوون و سەرینەگرت.

لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام مادەی ١٤٠ دەستووری عێراق بۆ گەلی کورد گرنگترین دەستکەوت بوو، کەموکووڕیی بڕگەکە لەوەدا بوو کە کات بۆ جێبەجێکردنی دانرابوو، کە کاتی جێبەجێکردنی مانگی ١٢ ٢٠٠٧ بوو، ناڕازییەکانی مادەی ١٤٠ گوتیان ئەو مادەیەی دەستووری عێراق کۆتاییهاتووە و کارپێناکرێت.

ئەگەری ئەوە هەیە لە کاتی پێداچوونەوەی دەستووری عێراقدا، مادەی ١٤٠ هەڵبگیرێت و کارپێنەکرێت، بۆیە ئەگەر گۆڕانکاریی دیموکراتیی لە دەستووری عێراقدا نەکرێت، یان بە لانی کەمەوە مادەی ١٤٠ وەکو خۆی نەمێنێتەوە، پایەکانی ئاشتیی و جێگیریی سیاسیی لە عێراقدا لەقدەبێت، جارێکی تر ناکۆکیی و شەڕی بێواتا، لە نێوان کورد و عەرەبدا، لەو عێراقەی کورد بەشداریی دروستکردنەوەی کرد سەرهەڵدەداتەوە. بڕگەیەکی تری دەستووری عێراق کە کورد دەتوانێت سودی لێوەربگرێت، ئەنجومەنی فیدراڵیی پەرلەمانی عێراقە، بڕگەی ٤٨ی دەستووری عێراق دەڵێت:

دەسەڵاتی یاسادانان لە دوو ئەنجومەن پێکدێت، ئەنجومەنی نوێنەران و ئەنجومەنی فیدراڵیی. لە ساڵی ٢٠٠٥ هەتا ساڵی ٢٠٢١ دەسەڵاتی یاسادانان هەر یەک ئەنجومەنە، تەنها لە ئەنجومەنی نوێنەران پێکهاتووە، لە ئەنجومەنی نوێنەرانیشدا

کورد کەمینەیە. نزیکەی ٥٠ - ٦٠ نوێنەری هەیە، ئەمە وایکردووە لە کاتی کێشەی ستراتیژییدا، کورد لاوازدەربکەوێت، بۆ بەدەستهێنانی مافەکانی سازشبکات.

بڕگەی ٦٥ی دەستووری عێراق باس لە یاسای ئەنجومەنی فیدراڵیی دەکات، کە نوێنەری هەرێمەکان و ئەو پاریزگایانەی تێدایە کە لە سنووری هەرێمدا نین. هەتا ئێستا کورد لە هەرێمی کوردستان و نوێنەرانی کورد لە عێراق، گرنگییان بەم دوو بڕگەیە (٤٨، ٦٥) نەداوە، هەوڵیاننەداوە لە ئەنجومەنی نوێنەران یاسایەک بۆ ئەنجومەنی فیدراڵیی دەربکرێت.

دەرکردنی یاسایەکی دیموکراتیی بۆ ئەنجومەنی فیدراڵیی، کارکردن بەو ئەنجومەنە بە یەکێک لە پایەکانی جێگیریی سیاسیی عێراق دەژمێردرێت، ئەنجومەنێکە مافی کەمینە نەتەوەیی و ئاینییەکانی عێراق دەپارێزێت، ئاشتیی ناو کۆمەڵگەی عێراق جێگیردەکات.

بەگوێرەی دەستووری عێراق دەبێت پەرلەمانی عێراق لە دوو ئەنجومەن پێکبێت، ئەنجومەنی نوێنەران نوێنەری تاکەکانی سەرتاپای عێراق بێت، کات و تواناکانی بۆ ئەو یاسا و بڕیارانە تەرخانبکات کە پەیوەندیی بە بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتەوە هەیە، ئەو ئەنجومەنە لە ڕێگەی خەڵکەوە بە هەڵبژاردنی ئازاد ژمارەی دیاریدەکرێت، بڕیارەکانی بە زۆرینەی دەنگی نوێنەران دەردەکرێن.

ئەنجومەنی نەتەوەکان (فیدراڵیی) ئەم ئەنجومەنە کات و توانای خۆی بۆ ئەو یاسا و بڕیارانە تەرخاندەکات کە پەیوەندیی بە پێکهاتە نەتەوەیی و ئاینییەکانی ناوخۆی عێراقەوە هەیە، نەتەوە و ئاین و ئاینزاکان بە گەورە و بچووکەوە لە ئەنجومەنی نەتەوەکاندا وەکو یەک نوێنەریان هەیە، بڕیارەکانیش بە ڕێککەوتن دەنگیان لەسەر دەدرێت. لەو کاتەدا بڕیارە هەستیارەکانی وەکو کەرکوک و سنووری هەرێمی کوردستان و شێوەی پەیوەندیی نێوان حکومەتی عێراقی ناوەندیی و حکومەتی هەرێمی کوردستان و بودجەی هەرێمی کوردستان و نەوت، لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقدا باسناکرێت، بە زۆرینە و کەمینە دەنگی لەسەر نادرێت، لەبەرئەوەی ڕێژەی کورسییەکانی نوێنەرانی گەلی کورد ٢٠٪ تێپەڕناکات، ئەگەر هەر بڕیارێکی چارەنوسساز بخرێتە دەنگەوە، کورد تێیدا سەرکەوتوونابێت، بەڵام لە ئەنجومەنی نەتەوەکاندا (ئەنجومەنی فیدراڵیی) کە نوێنەری کورد و عەرەب

و تورکمان وەکو یەکە، دەنگدان نییە ڕێککەوتن هەیە، کێشە چارەنوسسازەکانی تێدا گفتوگۆدەکرێت و بڕیاری هاوسەنگیی لەبارەوە دەدرێت.

حیزبە دەسەڵاتدارەکانی کوردستان لەبریی ئەوەی لە ڕێگەی نوێنەرەکانیانەوە لە عێراق کار بۆ دروستکردنی ئەم ئەنجومەنە بکەن، باسی ڕێککەوتنی هاوبەش و شەڕاکەتی سیاسیی لە نێوان خۆیان و حیزبە عێراقییەکاندا دەکەن.

## ٤- دەزگای کۆمەڵایەتیی

کێشە کۆن و ئالۆزەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، هێندە بەیەکداچوون و لێکترازانیان لێبووەتەوە، زەحمەتە بەتەنها لە ڕێگەی دامودەزگاکانی دەوڵەتەوە چارەسەربکرێن، لە لایەکەوە دامودەزگاکانی دەوڵەت بەتەنها دەرەقەتی ئەو کێشە گرانانە نایەن، لە لایەکی تریشەوە دلسۆزیی بەرپرسانی دەوڵەت بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان جێی گومانە. ئەگەری ئەوە هەیە بەرژەوەندیی تایبەتی دەسەڵاتداران و پاراستنی دەسەڵات، وا لە دەسەڵاتداران بکات چارەسەری کێشەکان فەرامۆشبکەن. دەزگای فرەنەتەوەیی و فرەئاین و ئاینزایی، بۆ پەروەردەی دیموکراتیی و یەکسانیی نەتەوەیی و ئاینیی، بۆ زەمینەخۆشکردنی پێکەوەژیان لە ناوکۆمەڵگەدا، بۆ چاودێرییکردنی دەسەڵات هەتا لە بنەماکانی فرەپێکهاتەیی و یەکسانیی لانەدات، بە یەکێک لە پایەکانی سیاسەتی ئاشتییخوزانەی عێراق دەژمێردرێت. ئەو دەزگا دیموکراتییانە چەندیین ئەرکی گرنگ ئەنجامدەدەن، یەکێک لەو ئەرکانە ئەوەیە کە بۆ ڕای گشتیی عێراق و بۆ هێزە سیاسییەکانی بسەلمێنن، دیاردەی فرەڕەنگیی و فرەدەنگیی دیاردەیەکی سروشتیی و سودمەندە. ئەرکێکی تری ئەو دەزگایانە ئەوەیە، کەلتوری ئاشتیی و پێکەوەژیانی ئازدانەی گەلان بەرزبنرخێنێت، لە ناخی تاک و پێکهاتەکانی عێراقدا جێگیرییبکات. یەکێک لە کارە گرنگەکانی تری ئەو دەزگایانە ئەوەیە کە لە ڕێگەی چالاکیی دیموکراتیی و چاودێریی بڕیار و کارەکانی حکومەتەوە، پێشنیاز و گوشاری جەماوەرەوە، سیاسەتی گشتیی حوکمڕانیی عێراق و هەرێمی کوردستان لە لادان و هەڵگەڕانەوە بپارێزن.

دوای کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا لە عێراق، دەزگای دیموکراتیی بۆ گەلانی عێراق پێویستترە، بۆ گەلی کوردیش لە گەلانی تری عێراق و ناوچەکە پێویستترە. بۆ گەشەپێدانی دیموکراسیی و پێکەوەژیانی نەتەوە و ئاینەکان، دەبایە چەندین حیزب و ڕێکخراوی فرەنەتەوەیی و فرەئاینیی دابمەزرایە، بۆ ئەوەی کەلتوری لەیەکتێگەیشتن و یەکترقبوڵکردن لە ناو پێکهاتە ناکۆکەکاندا پێشبکەوێت. لە تورکیا حیزبی گەلانی دیموکراتی تورکیا (HDP) لە هەموو پێکهاتە نەتەوەیی و ئاینیی و ئاینزاکانی تورکیا پێکهاتووە، کار بۆ پێکەوەژیانی گەلانی تورکیا دەکات، کار بۆ نەهێشتنی دەمارگیریی نەتەوەیی و ئاینیی نێوان پێهاتەکانی تورکیا دەکات. لەبەرئەوەی لە عێراقی دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدامدا، کار بۆ دیموکراسییکردنی کۆمەڵگەی عێراق نەکرا، چەندیین حیزب و ڕێکخراوی ئاینیی و ئاینزایی و نەتەوەپەرستیی توندڕەو دروستبوون، ڕێخکراوی داعش نمونەی ئەو هێزە توندڕەوانەیە کە ئێزیدییەکانی جینۆساید کرد، مەسیحەییەکانی کوشت و بڕکرد و کۆچی پێکردن، هێرشی بۆ سەر دەستکەوتەکانی گەلی کورد لە باشوور و لە ڕۆژئاوای کوردستان دەستپێکرد و هەوڵی لەناوبردنی ئەو دەستکەوتانە دەدات.

## ٥- سیاسەتی نێودەوڵەتیی:

سیاسەتی هەرێم دەبێت لە سێ ئاستدا تەبا و هاوسەنگ بێت، لە ئاستی ناوخۆییدا پەیوەندیی گەل و دەسەلات کۆک و تەبابێت. لە ئاستی عێراقدا پەیوەندیی دەسەلاتی کورد و دەوڵەتی عێراق لەسەر بنەمای دەستوور و بەرژەوەندیی هاوبەش بێت. لە ئاستی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییدا، دەبێت لە سیستەمی سیاسیی سەردەم و بەرژەوەندییەکانی هێزە باڵادەستەکان تێبگەین.

لەم قوناغەدا دەبێت کورد باش لە ستراتیژی ئەمریکا لە عێراق و ناوچەکەدا تێبگات، بە پێچەوانەی سیاسەتی ئەمریکاوە نەجوڵێتەوە. لە سیاسەتی ئەمریکادا کۆمەڵێک بنەمای جێگیری سیاسیی و ستراتیژی هەن، ڕەنگدانەوەیشیان لەسەر سیاسەتی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیی و ئەوروپا هەیە.

ا- ئەمریکا وڵاتیکی فرەنەتەوەییە، حەزی بە وڵاتی یەک_نەتەوەیی نییە، پێکەوەژیانی گەلان لە ناو وڵاتێکدا بە بنەمایەکی گرنگی ستراتیژیی خۆی دەزانێت،

بۆ بڵاوکردنەوە و جێگیرکردنی ئەو ستراتیژە لە هەموو کونج و کەلەبەرێکی دونیادا تێکۆشاندەکات. ئەمریکا دەبینێت عێراق وڵاتیکی فرەنەتەوە و فرەئاین و ئاینزایە، کاردەکات بۆ ئەوەی هەموو پێکهاتەکانی عێراق، لە چوارچێوەی عێراقی دیموکراتدا بژین. ئەمریکا لەگەڵ جیابوونەوەی کورددا نییە، لە ڕاپرسیی ساڵی ٢٠٠٥دا پۆل بریمەری حاکمی ئەمریکا لە عێراق، دژی ڕاپرسیی وەستایەوە، ڕەخنەی لە بەرپرسانی کورد گرت کە کارئاسانییان بۆ ئەو ڕاپرسیە کردووە. ئەمریکا لە گەڵ ڕاپرسیی ساڵی ٢٠١٧ باشووری کوردستاندا نەبوو، دژی وەستایەوە. بەو هۆیەوە هاوکاریی سوپای عێراقیشی کرد هەتا دەست بەسەر کەرکوک و ناوچە جێناکۆکەکاندا بگرێتەوە.

ب- ئەمریکا بەرنامەی ستراتیژی بۆ ناوچەیەکی جیۆپۆلۆتیکی تایبەت دادەڕێژێت، ستراتیژ بۆ سنووری یەک دەوڵەت و یەک نەتەوە دانارێژێت، ستراتیژێکی تایبەتی بۆ نەتەوەی کورد نییە. ئەمریکا ستراتیژێکی تایبەتی بۆ سەرووی ئەفریقا هەیە، ستراتیژێکی تایبەتی بۆ ڕۆژهەڵاتی ئاسیا هەیە. دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام، ئەمریکا باسی لە ستراتیژی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی دیموکراتی دەکرد، ستراتیژی ئەوە بوو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دیموکراتیی بکات. ئەمریکا کورد بە پێکهاتەیەکی ژێردەستی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەزانێت، دەیەوێت وەکو پێکهاتەیەکی نەتەوەیی بە کەمێک مافەوە لە چوارچێوەی ئەو وڵاتانەدا بەسەریدا دابەشبووە بمێنێتەوە، هەوڵی دیموکراتییکردنی ئەو وڵاتانەیش دەدات.

ج- ئەمریکا و دۆستەکانی دەیانەوێت کەلتوری سیاسیی و کۆمەڵایەتیی و بەرهەمهێنانی وڵاتە سەرمایەدارەکانی جیهان، بە ناو گەلانی تردا بڵاوبکەنەوە، چاویان بە کەلتوری سیاسیی چەپ و ئیسلامی سیاسیی و هزری خێڵەکیی هەڵنایەت.

ئەگەر کورد بە پێچەوانەی ئەو پێوانە ستراتیژییانەی ئەمریکاوە سیاسەتبکات، ناتوانێت پشتیوانیی دیبلۆماسیی بۆ کێشەی کورد بەدەستبخات. وایلیدێت ئەمریکا دژایەتیی مافەکانی گەلی کوردیش بکات. بۆیە یەکێک لە میکانیزمەکانی چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە عێراقدا، دوورنەکەوتنەوەیە لەو بنەما ستراتیژییانەی کە ئەمریکا لە سیاسەتی دەرەوەی خۆیدا پەیڕەویدەکات.

## ٦- ستراتیژی هەرێم لە عێراق:

لەم سەردەمەدا هەر هێزێکی سیاسیی سیاسیی ئیرادەی چارەسەری کێشەیەکی هەبێت، پێویستە ستراتیژی سیاسیی ڕوون و ئاشکرا و دیاریکراوی هەبێت، پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ گەلی خۆیدا هەبێت، سیاسەتی لەگەڵ سیاسەتی باوی سەردەمدا ناکۆک نەبێت.

ئەگەر لە ستراتیژی سیاسیی دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان لەمەڕ چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە عێراقدا وردببینەوە، ستراتیژێکی ناڕوون و ناکۆک و لاواز دەبینین. لەسەر مەسەلەی ڕاپرسیی ساڵی ٢٠٠٥ کە ٩٨٪ زیاتری خەڵکی کوردستان داوای سەربەخۆیی کوردستانی دەکرد، حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشووری کوردستان لەبەر پێگەی دەسەڵاتیان لە عێراقدا، هەر باسی ڕاپرسییان نەکرد و داکۆکییان لێنەکرد.

ئەمە لە کاتێکدا بوو کە پێش ئەنجامدانی ڕاپرسییەکە هەردوو حیزبی دەسەڵاتدار پشتگیرییان لە پرۆسەی ڕاپرسیی دەکرد. لێرەدا ستراتیژی دەسەڵاتی کوردیی لە عێراقدا ناکۆک و دوڕوویییە، لە کوردستان پشتگیریی ڕاپرسیی دەکەن، لە عێراق دژی ئەنجامی ڕاپرسیی و دژی ئیرادەی گەلی کورد دەوەستنەوە. لە هەمان کاتدا ئەو ڕاپرسییە ئاشکرایکرد کە لە نێوان ستراتیژی گەل و ستراتیژی دەسەڵاتدا ناکۆکیی هەیە، گەل ئامانجێکی هەیە و دەسەڵات ئامانجێکی تری هەیە.

هەمان سیناریۆی ڕاپرسیی ٢٠٠٥ لە ڕاپرسیی ساڵی ٢٠١٧ دووبارەبووەوە، ڕاپرسییان بە خەڵکی کوردستان کرد، دوای گوشاری عێراقیی و جیهانیی لە ئەنجامی ڕاپرسییەکە پەشیمانبوونەوە. سەبارەت بە جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ دەستووری عێراق، چەندین جار حکومەتی عێراق (جەعفەریی و مالیکیی) ڕایانگەیاندووە بۆ جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ ئەو ئەرکەی لە ئەستۆی حکومەتی عێراقدایە جێبەجێیکردووە، ئەو ئەرکەی کە ماوەتەوە بۆ جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ پەیوەندیی بە ئەنجومەنی سەرۆکایەتیی کۆماری عێراقەوە هەیە. ئەمە لە کاتێکدایە کە مام جەلال تاڵەبانیی سکرتێری یەکێتیی سەرۆککۆماری عێراق بوو، دوای کۆچی دوایی ئەویش، سەرۆککۆمار هەر کوردە و لە حیزبەکی تاڵەبانییە.

لەگەڵ ئەوەدا کە هەردوو حیزبی دەسەڵاتدار ڕێککەوتنی ستراتیژییان لە نێواندا هەیە، بەڵام پارتیی و یەکێتیی بەردەوام بەوە یەکتر تاوانباردەکەن کە لە جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ کەمتەرخەمن. پارتیی کەمتەرخەمیی سەرۆککۆمار وەکو بەڵگەی کەمتەرخەمیی یەکێتیی پیشاندەدات. یەکێتییش دەڵێن لەبەرئەوەی لە پارێزگای کەرکوکدا پێگەی سیاسیی یەکێتیی بەهێزترە، پارتیی جۆرەها ئاستەنگیی بۆ جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ و گەڕانەوەی کەرکوک و ناوچەدابڕاوەکانی کوردستان دروستدەکات، نەک بە گەڕانەوەی کەرکوک بۆ سەر سنووری هەرێم، دەسەڵاتی یەکێتیی پێش پارتیی بکەوێت.

هۆکاری جیاوازیی بۆچوونی پارتیی و یەکێتیی لەسەر مادەی ١٤٠ هەرچییەک بێت، بە قەد ئەوە گرنگ نییە کە وایکردووە دەسەڵاتی کوردیی لەسەر بابەتێکی ستراتیژیی بۆچوونی جیاواز و ناکۆکیی هەبێت.

لە دوای هەڵبژاردنی ٧/ ٣/ ٢٠١٠ ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق، پێکهێنانی حکومەتی عێراق دواکەوت، لایەنی کوردیی نەک هەر دەنگ و ڕەنگێکی دیاری لەسەر ئایندەی عێراق و مافەکانی گەلی کورد دەرنەکەوت، هەڵوێستی جیاواز و ناکۆکییان لەسەر پێکهێنانی حکومەتی ئایندەی عێراق پیشاندا. بۆ پێکهێنانی حکومەتی عێراقی نوێ، سکرتێری یەکێتیی بە ئاشکرا پشتگیریی لە مالکیی و شیعەکانی عێراق دەکرد. سەرۆکی پارتیی بۆ پێکهێنانی حکومەتی عێراقی نوێ، پشتگیریی لە ئەیاد عەلاویی دەکرد. لە هەڵبژاردنی پایزی ٢٠٢١ پەرلەمانی عێراقدا، پارتیی لەگەڵ ڕەوتی سەدر هاوپەیمانیی پێکهێناوە. یەکێتیی لەگەڵ هاوپەیمانیی فەتح هاوپەیمانیی پێکهێناوە، بەڵام هیچ هاوپەیمانییەکی کوردستانیی بۆ هەڵبژاردنەکانی عێراق لە ناو حیزبە دەسەڵاتدارەکاندا بەدیناکرێت. ئەم بۆچوون و هەڵوێستە جیاواز و ناکۆکانەی دەسەڵات، لەسەر بابەتە ستراتیژییەکانی کورد لە باشووری کوردستان، نەک هەر بەرەی دەسەڵاتی هەرێمی کوردستانی لە عێراقدا لاواز و پارچە پارچە کردووە، بەڵکو ئەو دیاردەیە بۆ ناو ناخی کۆمەڵگە و تاکی کوردیش شۆڕبووەتەوە و تاک و پێکهاتەکانی کۆمەڵگەی کوردستانیشی لەسەر ئەو بابەتە ستراتیژییانە پەرتکردووە. بەو شێوەیە پێکهاتەکانی دەسەڵات

و کۆمەڵگەی کوردستان لەسەر ستراتیژی سیاسیی گەلی کوردستان لە عێراقدا یەکدەنگ نین، ئەمەیش لاوازیی لە بەرەی گەلی کورددا دروستدەکات و ناتوانێت وەکو پێویست ئامانجە سیاسییەکان بەدەستبخات.

بۆ ئەوەی کورد بتوانێت کێشەکەی لە عێراقدا چارسەربکات، دەبێت ستراتیژێکی سیاسیی یەکگرتووی هەبێت، نەک وەکو ئێستا هەر حیزبە و سیاسەتێکی حیزبیی بەڕێوەدەبات، هەر حیزبە لە هێزێکی سیاسیی عێراقیی و ناوچەیی نزیکدەبێت، بەهۆی ناکۆکییەکانی ئەوانەوە، یەکڕیزیی کورد لە عێراقدا تێکبچێت.

## ٧- ڕاستکردنەوەی سیاسەتی هەرێم:

پەیوەندیی نێوان خەڵک و دەسەڵات یەکێک لە بنەما گرنگەکانی بەهێزکردن، یان لاوازکردنی هەر دەسەڵاتێکە، ئەگەر پەیوەندیی نێوان ئەو دوو پێکهاتەیە بە ئاشتیی و دۆستایەتیی پێکبێت، گەل و دەسەڵات دەبنە یەک گیان لە دوو جەستەدا، پێکەوە بیردەکەنەوە، بڕیاردەدەن و کاردەکەن و ئامانجەکانیان بەدیدەهێنن. ئەگەر ئەو دوو پێکهاتەیەیش ناتەبا و ناکۆکبن، هەر یەک بە لایەکدا ڕایکێشێت، ئاڵۆزیی و بێمتمانەیی دروستدەبێت. هەر یەک بەرەو ئامانجێک دەڕوات و ستراتیژ لەبیردەچێتەوە.

لە دوای ڕاپەڕینەوە هەتا ئەمڕۆ حوکمڕانیی هەرێمی کوردستان بە دڵی خەڵکی کوردستان نەبووە، بە شێوازی جیاجیا ڕەخنەی لێگیراوە. بنەماکانی سیستەمی دیموکراتیی وەکو دەستوور و پێکهێنانی ئازادانەی حیزبی سیاسیی و هەڵبژاردنی ئازاد و بازاڕی ئازاد و پاراستنی مافی مرۆڤ و پەیڕەوکردنی یاسا و دەستاودەستکردنی دەسەڵات، لە حوکمڕانیی هەرێمدا بزرن. بنەماکانی دادپەروەریی کۆمەڵایەتیی وەکو مافی کار بۆ هەموو هاوڵاتییەک و موچەی مانگانەی هاوسەنگ بۆ هاوڵاتییان و بەشدارییکردنی هەموو هاوڵاتییەک لە بڕیاری سیاسییدا و بەشدارییکردنی هاوڵاتییان لە بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتدا، ئەو کۆمەڵە بنەمایانەن کە لە لایەن حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە بەلاوەنراون و بە حیزبایەتیی و خزمایەتیی و بنەما خێڵەکییەکانی تر شوێنیان پڕکراوەتەوە.

ئەگەر دەسەڵاتی کوردیی بیەوێت خۆی بۆ ئەرکی گەڕاندنەوەی ناوچە دابڕاوەکانی باشووری کوردستان ئامادەبکات، پێویستە زۆربەی خەڵکی کوردستان پشتگیریی لە سیاسەتەکەی بکەن و بەهێزیبکەن، ئەو کاتە دەتوانێت لە عێراقدا سیاسەتێکی سەرکەوتوو پەیڕەوبکات، بەڵام ئەگەر بەو ستراتیژە ناڕوونەوە لە عێراقدا کار بۆ مافەکانی کورد بکات، بەو سیاسەتە نادیموکراسییەوە حوکمی هەرێمی کوردستان بکات، بێهێزتر دەبێت و نەک هەر ناتوانێت مافەکانی گەلی کورد لە عێراق بەدەستبهێنێت، سەربەخۆیی هەرێمیشی لەکیسدەچێت و هەرێم پارچەپارچە دەکرێت.

لە دوای پەیڕەوکردنی سیستەمی لێبڕین و دواخستنی موچەی فەرمانبەران لە لایەن حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە، دەنگی ناڕەزایی لەو بڕیارەی حکومەت بەرزدەبێتەوە. چاودێران پێیانوایە کە داهاتی هەرێمی کوردستان بەبێ لێبڕین و دواخستنی، بەشی موچەخۆران دەکات. ئەوەی حکومەت دەیکات هیچ بنەمایەکی ئابوریی و یاسایی نییە. دوای ئەوەی حکومەتی هەرێم حسابی بۆ ناڕەزایی خەڵک نەکرد، خەڵکی کوردستان داوای لە حکومەتی ناوەندیی عێراق کرد ڕاستەوخۆ موچەی فەرمانبەرانی هەرێمی کوردستان بنێرێت. ئەگەر ئەم داوایە سەربگرێت، سەروەریی و خۆبەڕێوەبەریی هەرێمی کوردستان پاشەکشەدەکات.

بەهۆی سیاسەتی ناسەرکەوتوو و نادیموکراتیی دەسەڵاتی هەرێمەوە، جوڵانەوەی شارچێتیی و ناوچەگەریی زۆر پەرەیسەندووە. وایلێهاتووە گروپێک بۆ بەهەرێمکردنی شاری سلێمانیی و هەڵەبجە و گەرمیان و ڕاپەڕیین دروستببێت، داوا لە حکومەتی عێراقی ناوەندیی بکات ئەو ناوچەیە وەکو هەرێمێکی سەربەخۆ ڕابگەیەنرێت و لە هەولێر و دهۆک جیابکرێتەوە.

بەو شیوەیە دەردەکەوێت کە بەهۆی خراپ_حوکمکردنی دەسەڵاتی هەرێمەوە، نەک هەر ناتوانین دەستەکەوتەکانی ترمان لە عێراق بەدەستبهێنین، خەریکە هەرێمی فیدراڵیی باشووری کوردستانیش لەکیسدەدەین.

گرنگترین ئامراز بۆ ئەوەی سیاسەتی باشووری کوردستان قۆناغی ناڕونیی ستراتیژیی و نادیموکراتیی دەسەڵات تێبپەڕێنێت، ڕاپرسی دەستوورێکی

دیموکراتییه بۆ هەرێمی کوردستان بکرێت. لەو دەستوورەدا ستراتیژی هەرێم کوردیی ئاشکرابکرێت، ماف و ئەرکەکانی هاوڵاتیی تێدا دیارییبکرێت، ماف و ئەرک و دەسەڵاتی دەزگاکانی هەرێم و دەسەڵاتی بەرپرسەکانی هەرێمی تێدا دیارییبکریت. بەو شێوەیە دەکرێت کەموکوڕییەکانی سیاسەتی هەرێمی کوردستان پڕبکرێتەوە و کاری جدیی بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە عێراقدا بکرێت.

مادەی ۱۲۰ی دەستووری عێراق دەڵێت: «دەبێت هەرێمی کوردستان دەستووری هەبێت، بۆ ئەوەی سیاسەتی هەرێم دیارییبکات و میکانیزمی بەڕێوەبردنی کارەکانی دیارییبکات». دەسەڵاتدرانی هەرێم نەک هەر نایانەوێت سیاسەتی خۆیان بۆ خەڵک و بۆ دەوڵەتی عێراق ڕونبکەنەوە، ئەو بڕگەیەی دەستووری عێراقیشیان فەرامۆشکردووە کە بەرژەوەندیی گەلی کوردی تێدایە.

**سەرچاوەکان:**


١- جەعفەر عەسکەریی و جەمیل سدقی، وەزیری بەرگریی عێراق و سەرۆک_ئەرکانی سوپای عێراق و چەندیین وەزیر و سیاسەتمەداری عێراق کورد بوون.

٢- عێراق، گەڕان بە شوێن ناسنامەی نیشتیمانییدا، لیورا لوکیتز، وەرگێڕانی، دڵشاد میران.

٣- کەرکوک شاری دەمبەپێکەنین بە گڕ و ڕوناکیی، عەونی داودیی.

٤- ڕاپۆرتی بەیکەر هاملتون کوردستانی نوێ، ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانەیە (ی. ن. ک) دەریدەکات،ژمارە ٤٩٩٧، ١٣-١-٢٠٠٩

٦- پۆلبریمەر ساڵێکم لە عێراقدا تێپەڕاند، (عام قزیتە فی العراق) لاپەڕە ١٢٣.

٧- عسام سلێمان، فیدراڵیی و کۆمەڵگە فرەنەتەوە و تائیفییەکان وەکو لوبنان.

٨- بەندی ژمارە (٧) نەتەوە یەکگرتووەکان، هەر وڵاتێک بچێتە ژێر ئەو بەندەوە واتای ئەوەیە مەترسیی لەسەر ئاسایشی جیهان دروستدەکات، جۆرەها گوشاری لەسەر دادنرێت و ئابلۆقەی ئابوریی لەسەر دادەنرێت.

٩

# تێکدانی پایەکانی نەتەوەبوونی کورد

لە سەدەی هەژدەی زایینییەوە هەتا ئەمڕۆ، سەرەکییترین شێوازی ململانێ لە نێوان پێکهاتەکانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتییدا، ململانێی نیشتیمانیی و نەتەوەییە. لە درێژەی گەشەکردنی سیستەمی سەرمایەداریی و سەرکەوتنی پرۆسەی ڕێنسانسدا لە ئەوروپا، هەست و هۆشیاری نەتەوەبوون لە نێوان ئەو پێکهاتانەدا سەریهەڵدا، کە لە ڕووی مێژوو و زمان و کەلتور و هەستەوە لە یەکەوە نزیکبوون و لە سنوورێکی جوگرافیی دیاریکراودا دەژیان. کۆبوونەوەی ئەو پێکهاتانە لەو بازنەیەدا بازاڕێکی هاوبەشی ئابوریی دروست دەکرد، بۆ پاراستنی ئەو پێکهاتە نوێیە دەوڵەتی نەتەوەیی دروستبوو.

چینی سەرمایەدار لە یەک کاتدا ڕابەرایەتیی دیاردەی نەتەوەبوون و بازاڕی ئابوریی هاوبەشی بەدەستەوەگرت و کاری جدیی بۆ دەوڵەتی نەتەوەیی کرد. کۆبوونەوە و ڕێککەوتنی ئەو پێکهاتانە لە چوارچێوەی نەتەوە و دەوڵەتی نەتەوەدا، پێشکەوتنی ئابوریی و کۆمەڵایەتیی لەگەڵ خۆیدا هێنا، لەو کاتەوە ئایدۆلۆژیای نەتەوەبوون مۆدێلێکی نوێی سیاسییە، لە سەرتاسەری جیهاندا بڵاوبووەتەوە.

لە سەدەی نۆزدەهەمدا ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیش پریشکی ئایدۆلۆژیای نەتەوەبوونی ئەورووپای بەرکەوت، لە سەروبەندی جەنگی یەکەمی جیهانییدا و پاش ڕوخانی دەوڵەتی عوسمانیی، هەستی نەتەوەیی لە ناو گەلی کوردیشدا پێشکەوت. لەو کاتەوە هەتا ئەمڕۆ نەتەوەبوون و ڕزگاریی نەتەوەیی و مافی نەتەوەیی، سەرتاپای ژیانی سیاسیی گەلی کوردیان گرتووەتەوە.

گەلی کورد پێکهاتەیەکی نەتەوەیی تایبەتی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە، پایەی نەتەوەبوونی وەکو مێژوو، نیشتیمان، زمان و کەلتور و هەستی هاوبەشی هەیە، بەڵام بەهۆی داگیرکاریی و دابەشکردنی کوردستانەوە، هەتا ئەمڕۆیش کورد بازاڕێکی سەربەخۆی ئابوریی دەوڵەتێکی نەتەوەیی نییە. ئەگەرچی زمانی کوردیی زمانێکی دەوڵەمەندە، بەڵام لەبەرئەوەی لە چەند دیالێکتێکی جیاواز پێکهاتووە، کورد زمانی یەکگرتووی نییە. کوردبوونی هەورامیی و ئێزیدیی و فەیلیی و شەبەک و هەندێک لە مەسیحییەکانی کوردستان، مشتومڕی لەسەرە. هەندێک لایەن و کەسایەتیی لەو پێکهاتانە خۆیان بە کورد نازانن، هەندێک کەس و گروپی تر لەو پێکهاتانە خۆیان بە کورد دەزانن. دوژمنانی کورد و دەوڵەتە نەتەوەپەرستەکانی ناوچەکەیش، هەتا بۆیان کرابێت هەوڵی ڕوخاندنی پایەکانی نەتەوەبوونی کوردیان داوە. سیاسەتی تواندنەوەی کەلتوریی و کۆمەڵکوژیی جەستەیی گەلی کوردیان ئەنجامداوە.

لە ململانێی نێوان گەلی کورد و دوژمناندا، بۆ لەناوبردنی کورد دوژمنان سەرکەوتنیان بەدەستنەهێناوە، لە پای قوربانییەکی زۆر و تێکۆشانێکی دووروودرێژدا، گەلی کوردیش سەرکەوتنێکی ئەوتۆی بەدەستنەهێناوە و لە مەترسیی لەناوبردن و تواندنەوە قوتارینەبووە.

لە دوای ڕاپەڕینی ١٩٩١ باشوری کوردستان لە سایەی دەسەڵاتی هەرێمی کوردستاندا، دەرفەتی ئەوە ڕەخسا پایەکانی نەتەوەبوونی کورد بەهێزبکرێن و جێگیربکرێن، کەچی ڕابەران و سیاسەتمەدارانی باشووری کوردستان، نەک هەر گرنگییان بە بەهێزکردن و جێگیرکردنی پایەکانی نەتەوەبوونی کورد نەدا، بەڵکو ئەو سیاسەتەی لە دوای ڕاپەڕینەوە هەتا ئەمڕۆ پەیڕەویدەکات، خزمەتی قایمکردنی پایەکانی نەتەوەبوونی کوردی نەکردووە، پایەکانی نەتەوەبوونی گەلی کوردی بێهێزکردووە.

## ١- فەرامۆشکردنی مێژووی کورد:

مێژوو گێڕانەوەی ژیانی هەمەلایەنەی پێکهاتەکانە، یەکێک لە بنەماکانی هەر پێکهاتەیەک بۆ ئەوەی ناسنامەی نەتەوە وەربگرێت، مێژوی هاوبەشی ئەو پێکهاتەیە، ئەو مێژووە دەیسەلمێنێت کە ئەو پێکهاتەیە لە قۆناغەکانی گۆڕان و گەشەکردنی کۆمەڵگەدا پێکەوەژیاوە، لە ئاواکردنی شارستانیەت ڕۆڵیبنیوە و هەتا ئەمڕۆ هاتووە.

زانستی ئاسەوارناسیی و زمانناسیی و کەلتورناسیی سەلماندوویەتی کە نیشتیمانی ئەمڕۆی کوردان (میزۆپۆتامیا) لە سەردەمی نیۆلۆتیکدا باوەشی بۆ کۆنترین و دووروودرێژترین و کاریگەرترین شارستانیەتی مرۆڤایەتیی کردووەتەوە. ئەو پێکهاتەیەی ئەو مێژووەی دروستکردووە، قۆناغەکانی گۆڕان و گەشەکردنی کۆمەڵگەی بڕیوە و هەتا ئەمڕۆ لە گۆڕەپانی تێکۆشانی مرۆڤایەتییدا ماوەتەوە. گەلی کورد و نەتەوەکانی تری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی لێکەوتووەتەوە.

بەو شێوەیە دەتوانین بڵێین کە کورد وەکو نەتەوەیەکی ئەمڕۆی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست مێژوویەکی دێرینی هەیە، ئەو مێژووە پایەیەکی پتەوی نەتەوەبوونی کورد دروسستدەکات، بەڵام دەسەڵاتدارە شۆڤینییەکانی ناوچەکە هەردەم لە هەوڵی ئەوەدا بوون بەرانبەر بە مێژووی کورد چەواشەکارییبکەن و بڵێن کورد مێژووی نییە، بۆ ئەوەی بڵێن کورد نەتەوە نییە و لە ناو بۆتەی نەتەوەکانی خۆیاندا بیتوێننەوە.

دوای تێپەڕبوونی نزیکەی ٣٠ ساڵ بەسەر حوکمڕانیی هەرێمی کوردستاندا، بەبێ ئەوەی هیچ ئاستەنگییەک لە ڕێگەی دامەزراندنی دەزگای مێژووی نەتەوەیی گەلی کورددا ڕاستبووبێتەوە، دەسەڵاتداران بیریان بە لای دەزگای مێژووی گەلی کورددا نەچووە، هەوڵیاننەدا بە شێوەیەکی زانستییانە کار بۆ لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندنی مێژووی دوور و نزیکی نەتەوەکەیان بکەن و وەڵامی سیاسەت و نزیکایەتییە شۆڤینییەکانی داگیرکەرانی کوردستان و نەتەوەپەرستانی تر بدەنەوە.

ساڵی ٢٠٠٦ ڕەشنوسی دەستووری هەرێمی کوردستان کەوتە بەردەستی خەڵکی کوردستان، دیباجەی ڕەشنوسی دەستوورەکە وای پیشاندەدا کە گەلی کورد لە چلەکانی سەدەی بیستەوە لەدایکبووە. ئەمەیش دەیسەلمێنێت کە لە هەرێمی کوردستاندا چەمکی حیزبایەتیی تەسک و بنەماڵەگەرایی لە سەرووی نەتەوە و

مێژووی نەتەوەوە دێن. دەبێت نەتەوە لە خزمەتی حیزب و بنەماڵە و دەسەڵاتێکی تایبەتدا بێت.

لە دەرەوەی دەسەڵاتی کوردیبدا لە ناو توێژی ڕۆشنبیر و سیاسەتمەدارانی باشووری کورستاندا، بۆ توێژینەوە و نوسینەوەی مێژووی دێرینی کورد، هەوڵ و تێکۆشانێکی جدیی بەدیناکرێت، لە باکووری کوردستان لەسەر دەستی بیرمەند و سیاسەتمەداری گەلی کورد عەبدوڵڵا ئۆج ئالاندا، لە پەرتوکی دووەمی لە دەوڵەتی ڕاهیبی سۆمەرەوە بەرەو شارستانیی دیموکراتیی، مێژووی کۆمەڵایەتیی و سیاسیی کورد، بە شێوازێکی زانستیی نوسراوە. ئەم بەشەی کتێبەکە پایەیەکی گرنگی نەتەوەبوونی گەلی کورد پیشاندەدات. هەر کوردێک بیخوێنێتەوە مێژووی داپیرە و باپیرەی خۆی دێتەبەرچاو. هەست بە بوونی نەتەوەیی خۆی دەکات و دەبینێت کە کورد چەند خزمەتی مرۆڤایەتیی کردووە*١.

## ٢- بە حزبییکردنی زمانی کوردیی:

یەکێک لە کێشە سەرەکییەکانی زمانی کوردیی دیاردەی فرەدیالۆگییە، لەبەرئەوەی کورد لە مێژووی نزیکدا دەوڵەتی نەبووە، دامودەزگای سیاسیی و ڕۆشنبیریی یەکگرتووی نەبووە، نەیتوانیوە زمانی یەکگرتوو پێکبهێنێت. دامەزراندنی حکومەتی هەرێمی کوردستان، فراوانبوونی پەیوەندیی لە نێوان ڕۆشنبیرانی باشووری کوردستاندا، فروانبوونی کەناڵی ڕاگەیاندن، دەوڵەمەندیی زمانی کوردیی، دەرفەتی بۆ پێکهێنانی زمانی یەکگرتووی کورد ی ڕەخساند، بەڵام لەبەرئەوەی زمانی یەکگرتووی کوردیی لە بەرنامەی دەسەڵاتی باشووری کوردستاندا نەبوو، سود لەو زەمینە لەبارانە وەرنەگیرا، کار بۆ پێشخستنی زمانی یەکگرتووی کوردیی نەکرا.

دەسەڵاتی کوردیی نەک هەر کاری بۆ زمانی یەکگرتووی کوردیی نەکرد، ئەو زمانەیش کە هەبوو تێکیدا. لە سەردەمی دەسەڵاتی کوردییدا لە شاخ و لە شار، زمانی حیزب شوێنی زمانی نەتەوەی گرتەوە. بۆ ناونانی دەزگایەکی سیاسیی حیزبێکی تایبەت، بۆ ئەوەی دەزگاکەیان لە دەزگای حیزبە ڕکابەرەکەیان جیابکرێتەوە، چەندیین ناوی حیزبیی دادەتاشن، یان هەر حیزبەو وشەی ناوچەیەک، یان وشەی دیالێکتێکی

تر بۆ ناوێکی دیاریکراو بەکاردەهێنێت، بۆ ئەوەی خۆی لە حیزبەکەی تر جیابکاتەوە. بەو شێوەیە حیزبە دەسەڵاتدارەکان هێندەی تر بڵاوەیان بە زمانی کوردیی کرد، لە قۆناغی زمانی یەکگرتوو دووریانخستەوە.

ساڵی ١٩٧٦ کە یەکێتیی ڕێکخراوی تایبەتی بە قوتابییانی دامەزراند، ناوی خوێندکاریان لە شوێنی قوتابیی دانا و ڕێکخراوەکەیان ناونا یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان، بۆ ئەوەی لە یەکێتیی قوتابییانی کوردستانی سەر بە پارتیی جیابکرێتەوە.

ساڵی ١٩٨٩ کاتێک یەکێتیی ڕێکخراوی تایبەت بە ژنانی خۆی دامەزراند، بۆ ئەوەی ڕێکخراوە حیزبییەکەی لە ڕێکخراوی ئافرەتانی پارتیی (حیزبە ڕکابەرەکەی) جیابکاتەوە، ناوی یەکێتیی ژنانی کوردستانی لێنا.

هەتا ئەمڕۆیش هەر کەسێک لە کوردستان بە کوردیی بدوێت و ناوی ژن بۆ مێیینە و ناوی خوێندکار بۆ قوتابیی بەکاربهێنێت، ئەوە یان ئەندامی یەکێتییە، یان لەژێر کاریگەریی کەلتوری حیزبی یەکێتییدا دەژی. هەر کەسێکیش ناوی ئافرەت بۆ مێیینە و ناوی قوتابیی بۆ قوتابیی بەکاربهێنێت، ئەو کەسە ئەندامی پارتییە، یان لەژێر کاریگەریی کەلتوری پارتییدا دەژی.

ئاشتبوونەوەی پارتیی و یەکێتیی و ڕێککەوتنی ستراتیژیی ئەو دوو حیزبە، چارەسەری ئەو کێشانەی نەکرد کە بەهۆی شەڕی براکوژیی چەندیین ساڵی ڕابردوویانەوە زمانی کوردییان بەو دەردە بردووە. دوای ڕێککەوتنی ئەو دوو حیزبە، لە دەزگا سیاسیی و فەرمییەکاندا، بۆ ڕەگەزی مێیینە دوو وشەی (ژن و ئافرەت) بە شوێن یەکتردا بەکاردەهێنرێت. هەتا ئێستا ناوێکیان نەکراوەتە ناوی فەرمیی و ناوەکەی تر فەرامۆشبکرێت. بەکارهێنانی دوو ناو لە یەک کاتدا بۆ یەک مەبەست و بۆ یەک شت، وەکو ژن و ئافرەت، قوتابیی و خوێندکار، لاو و گەنج، زمانی کوردیی قورس و قەبەکردووە. ئەمەیش جۆرێکە لە تێکدانی زمانی کوردیی کە بەهۆی ململانێی حیزبییەوە دروستبووە.

ساڵی ٢٠٠٥ ڕۆژنامەنوسێک لێکۆڵینەوەیەکی لەسەر زمانی کەناڵی تەلەفزیۆنەکانی حیزبەکانی باشووری کوردستان کرد، هەر بە سەرپێوە بۆی دەرکەوت کە ١٣٧ وشەی جیاواز بۆ یەک مەبەست و بۆ یەک شت لە نێوان کەناڵی تەلەفزیۆنی

کوردساتی (یەکێتیی) و کوردستان تی ڤی (پارتیی)دا بەکاردێت. لە وڵاتانی تردا کەناڵەکانی ڕاگەیاندن زمانی نەتەوە یەکدەخەن، کەچی لە هەرێمی کوردستاندا یەکێک لە کارەکانی کەناڵە تەلەفزیۆنییەکانی حیزب، تێکدانی زمانی نەتەوەیە.

لە دوای ڕاپەڕین حیزبە دەسەڵاتدارەکان زمانی کوردییان وەکو زمانی فەرمیی دەزگاکانی هەرێمی کوردستان بەکارنەهێنا، دەستەواژە ئیداریی و سیاسیی و زانستیی و پزیشکیی و یاساییە عەرەبییەکانیان بۆ سەر زمانی کوردیی وەرنەگێڕا. زمانی کوردییان بە ناو و دەستەواژە و داهێنانی نوێ دەوڵەمەندنەکرد. زمانی دەزگا فەرمییەکانی هەرێمی کوردستان لە نێوان عەرەبیی و کوردیی و ناوچەیی و تێکەڵەی کوردیی و عەرەبییدا مایەوە.

یەکێک لە کێشەکانی تری زمانی کوردیی کاریگەریی زمانەکانی ترە. لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانییدا باشووری کوردستان لەژێر کاریگەریی زمان و کەلتوری تورکدا بووە و هەزارن گوند و ناوچەی کوردستان ناوی تورکییان بەسەردا دابڕاوە. دوای ڕوخانی دەوڵەی عوسمانیی دەوڵەتی عێراق دروستکرا. باشووری کوردستان لە لایەن زمان و کەلتوری عەرەبەوە پەلاماردرا. باشووری کوردستان هەوڵی بەعەرەبکردنی درا. دەسەڵاتی کوردیی دوای ڕاپەڕیین و دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام، نەک هەر هەوڵی سڕینەوەی کاریگەرییەکانی زمان و کەلتوری تورک و عەرەبی نەدا، نەک هەر ناوێکی گوندی تورکیی و عەرەبیی نەگۆڕی، زمان و کەلتوری ئینگلیزیی بەسەر زمان و کەلتوری کوردییدا سەپاند، ئیتر وشە و دەستەواژە تورکیی و عەرەبیی و ئینگلیزییەکان ناونیشان و ناوی بواری سیاسیی و ڕۆشنبیریی و ئابوریی کوردستانی داپۆشیوە. هەر دەسەڵاتێک وا بە ئاسانیی خۆی بۆ پەلاماری زمان و کەلتوری نەتەوەکانی تر شلبکات، بە دەسەڵاتێکی نەتەوەیی ناژمێردرێت با خۆشی بە نەتەوەیی بزانێت و لافی نەتەوەیی لێبدات.

### ٣- دابەشکردنی نیشتیمان:

یەکێک لە پایە گرنگەکانی تری نەتەوەبوونی هەر میلەتێک، سنووری نیشتیمان و یەکێتیی خاکی ئەو نەتەوەیەیە. بۆ ئەوەی بە نەتەوەبوونی گەلی کورد سەرکەوتوو نەبێت، بۆ ئەوەی تواندنەوەی کورد لە بۆتەی نەتەوەکانی تری ڕۆژهەڵاتی

ناوەڕاستدا ئاسانتر بێت، یەکێک لە سیاسەتە شۆڤینییەکانی داگیرکەرانی کوردستان و هاوپەیمانەکانیان، دابەشکردنی خاکی کوردستان بووە.

لە شەڕی چالدێرانی نێوان دەوڵەتی عوسمانیی و دەوڵەتی سەفەویی ساڵی ١٥١٤دا، کوردستان لە نێوان ئەو دوو دەوڵەتەدا دابەشکرا. لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانیی جارێکی تر داگیرکەرانی کوردستان و هاوپەیمانەکانیان، کوردستانیان وردتر بەسەر تورکیا و ئێران و سوریا و عێراقدا دابەشکردەوە.

داگیرکەرانی کوردستان و هاوپەیمانەکانیان، هەر بەشێکی کوردستانیان بە ناوی ئەو وڵاتەوە ناونا کە بەسەریدا دابەشکرابوو: کوردستانی تورکیا، کوردستانی ئێران، کوردستانی عێراق و کوردستانی سوریا. بەو شێوەیە دابەشکردنی کوردستان بووە ڕاستییەکی تاڵ و بەسەر گەلی کورددا سەپێنرا.

کاتێک خەبات و تێکۆشانی گەلی کورد لە باشووری کوردستان دەستیپێکرد، لە دروستبوونی شۆڕشی شێخ مەحمود و شۆڕشی ئەیلول و شۆڕشی نوێوە، بە شێوەیەکی بنەڕەتیی و گشتگیرانە دەستیان بە خەبات نەکرد، کەسایەتیيە شۆڕشگێڕەکانی باشووری کوردستان و حیزبە سیاسییەکانی باشووری کوردستان، کەوتنە ژێر کاریگەریی هزر و چەمکی سیاسەتی داگیرکەرانی کوردستان، بە کرداریی دانیان بە دابەشکردنی خاکی کوردستاندا نا.

بەکارهێنانی کوردستان عێراق، کوردستانی تورکیا و کوردستانی ئێران و ...هتد، لە لایەن سیاسەتمەدارانی باشوورەوە، لە ئەدەبیاتی حیزب و شۆڕشدا، پیشانیدەدات دەسەڵاتی باشووری کوردستان بە پارچەکردن و داگیرکردنی کوردستان ڕازین. ئەو ڕازیبوونەی دەسەڵاتداران بە پارچەکردنی کوردستان، بۆ ناو کۆمەڵگەی کوردستانیش هاتەخوارەوە. بەو شێوەیە سیاسەتی پارچەکردنی کوردستان وەکو دیاردەیەکی ئاسایی خزێنرایە ناو مێشکی خەڵکی کوردستانەوە، لەوێشەوە سیاسەتێکی شۆڤینیی داگیرکەران لە دژی گەلی کورد سەرکەوتنی بەدەستهێنا، هێزی نەتەوەیی گەلی کورد لاوازبوو، پایەیەکی نەتەوەبوونی گەلی کورد بە داڕوخاویی مایەوە.

دوای ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی ١٩٩١ نیوەی زیاتری خاکی باشووری کوردستان ئازادکرا، ئەم جارە ڕزگارکەرانی کوردستان بەشە ڕزگارکراوەکەی کوردستانیان

دابەشکرد، جارێکی تر ئەو خاکە ڕزگارکراوەی باشووری کوردستان بەسەر حیزب و خێڵ و بنەماڵەی کوردی دۆستی داگیرکەرانی کوردستاندا دابەشکرایەوە.

یەکێتیی دەسەڵاتی خۆی بەسەر هەرێمی سلێمانیی و گەرمیاندا سەپاند، ئەندام و لایەنگرانی پارتیی لەو دەڤەرە دەرکرد. پارتیی دەسەڵاتی خۆی بەسەر هەولێر و دهۆکدا سەپاند، لایەنگرانی یەکێتیی لەو دەڤەرە دەرکرد. ئیتر بەشە ڕزگارکراوەکەی باشووری کورستان لە نێوان پارتیی و یەکێتییدا دابەشکرا. کوردستانی چوار پارچە بوو بە شەش پارچە. ئەگەرچی بە هەوڵی ئەمریکا و وڵاتانی تر لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدامەوە ئەو دوو پارچەیەی باشووری کوردستان بە فەرمیی یەکیگرتەوە، بەڵام بە شێوەیەکی کرداری هەتا ئێستایش ئەو دوو بەشەی کوردستان یەکیاننەگرتووەتەوە، هەر ناوچەیەک لەژێر دەسەڵاتی بنەماڵەیەکدا درێژە بە ژیانی دابەشکراوی دەدات. بەم شێوەیە جەستەی نیشتیمانی کورد هێندەی تر هیلاک بوو، ئاستەنگیی زیاتر بۆ یەکێتیی خاک و نەتەوەی کورد دروستکرا، کورد لە نەتەوەبوون دوورخرایەوە.

بۆ یەکەم جار لە مێژوی نەتەوەکاندا نیشتیمانی نەتەوەیەک بە دەستی دەسەڵاتداری نەتەوەکەی خۆی دابەشدەکرێت، لە لایەن دەسەڵاتی کوردیی خۆیەوە بەشە ڕزگارکراوەکەی باشووری کوردستان دابەشکرا. بەمەیش هێزەکانی باشووری کوردستان لە ئاستەنگیی دروستکردن بۆ نەتەوەبوونی کورد هاوکاریی داگیرکەرانی کوردستانیان کرد، هێندەی تر یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان و یەکێتیی نەتەوەیی کوردیان پارچەکرد و پایەیەکی تری نەتەوەبوونی گەلی کوردیان لاوازکرد.

دەسەڵاتدارانی هەرێم ڕێز لە پیرۆزیی خاکی کوردستان ناگرن، بۆ لابەلاکردنەوەی ناکۆکییە حیزبییەکانی خۆیان پێش سوپای وڵاتانی داگیرکەری کوردستان دەکەون، لەپێناو سەرکوتکردنی ڕکابەرە حیزبییەکەیاندا ئامادەن سوپای وڵاتانی داگیرکەر لە کوردستاندا جێگیربکەن.

ساڵی ١٩٩٦ لە گەرمەی شەڕی براکوژیی نێوان پارتیی و یەکێتییدا، یەکێتیی لە ٢٩/ ٧/ ١٩٩٦دا بۆ لێدانی بارەگاکانی حدکا، سوپای پاسدارانی پەلکێشی کۆیە و تەقتەق کرد، بەو مەرجەی بۆ لەناوبردنی پارتیی، ئێران هاوکاریی یەکێتیی بکات.

لە ١٦ی ئابی ١٩٩٦دا، بۆ لەناوبردنی یەکێتیی لە هەولێر، پارتیی سوپای ڕژێمی

بەعسی پەلکێشی هەولێر کرد، بە مەرجێک سوپای بەعس لە قەلاچۆکردنی ئۆپۆزسیۆنی عێراقدا لە هەولێر دەستکراوەبێت.

حیزبە دەسەلاتدارەکانی باشووری کوردستان هیچ کات سڵیان لەوە نەکردووەتەوە، بۆ سەرکۆتکردنی (پ. ک. ک) ڕێگە بە سوپای تورکیا بدەن بەشێک لە خاکی کوردستان داگیربکات و پێگەی سەربازیی تێدا دابنێت. حیزبە دەسەلاتدارەکان هەموو کاتێک ئامادەن لەپێناو مانەوەیاندا لە دەسەلاتدا وەکو بەرتیل بەشێکی کوردستان پێشکەش بە داگیرکەرانی کوردستان بکەن.

## ٤- لاوازکردنی هەست و هۆشیاریی نەتەوەیی:

لە سەردەمی خەباتی شاخ و لە دوای ڕاپەڕیین و ئاواکردنی حکومەتی هەرێم، حیزبە دەسەلاتدارەکانی باشووری کوردستان، خەڵکی کوردستانیان بە گرنگیی پایەکانی نەتەوەبوونی گەلی کورد پەروەردەنەکردووە، بە کردەوەیش پایەکانی نەتەوەبوونی کوردیان پێشنەخستووە، کاریاننەکرد بۆ ئەوەی لە ناخی تاکی باشووری کوردستان و پارچەکانی تری کوردستاندا هەست و هووشیاری نەتەوەیی پتەوبکەن، لەبریی هەستی نەتەوەیی هەستی حیزبایەتیی و خێڵگەرایی و ناوچەگەریی و پارچەگەریان پێشخست.

کاتێک باشووری کوردستان لە ژێردەستی دەسەلاتی عێراقدا بوو، لەبەرئەوەی ئەو ڕژێمە سیاسەتی سەرکوتکردن و تواندنەوەی نەژادیی بەرانبەر بە گەلی کورد بەڕێوەدەبرد، هەستی نەتەوەیی و ڕۆحی یاخیبوون، هەڵوێستی نەتەوەیی و بەرگرییکردن لە کورد، لە ناو گەلی باشووری کورستاندا لە ئاستێکی بەرزدا بوو، تاک و پێکهاتەی نەتەوەی کورد خۆی ڕێکدەخست و بە چالاکیی هەمەجۆر خۆی لە هێرشی دوژمن دەپاراست، ڕێکخستنی سیاسیی دروستدەکرد، بە خەباتی نەتەوەیی وەلامی ڕژێمی دەدایەوە، یان چەکی پێشمەرگایەتیی لەشاندەکرد و داوای مافە نەتەوەییەکانی خۆی دەکرد.

لە سەردەمی خەباتی پێشمەرگایەتییدا ناکۆکیی حیزبایەتیی و ململانێی دەسەلات و شەڕی ناوخۆ، ڕێڕەوەی سیاسەتی نەتەوەیی بەلارێدادەبرد، شەڕی براکوژیی

نێوان حیزبە سیاسییەکانی باشووری کوردستان وای لە خەڵکی کوردستان دەکرد، بەرانبەر تێکۆشانی نەتەوەیی ساردببنەوە و دوورەپەرێز بوەستن.

لە دوای ڕاپەڕین، خولێکی تری شەڕی براکوژیی لە نێوان حیزبەکانی باشووری کوردستاندا دەستپێکردەوە، بەهۆی دابەشکردنی هەرێمی کوردستان لەژێر دەسەڵاتی حیزب و بنەماڵە و خێزاندا، بەهۆی ئەوەوە کە حیزبە دەسەڵاتدارەکانی دوای ڕاپەڕین جیاوازییان لە نێوان پێشمەرگە و چەکداری حکومەتی عێراقدا نەهێشت، جیاوازییان لە نێوان ڕێکخستنی نهێنیی حیزبی کوردیی و جاسوسی حکومەتی بەعسدا نەهێشت، بەهۆی ئەوەوە کە حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشووری کوردستان ئەو ئەندام و کادر و بەرپرسانەی خۆیانیان سزانەدا، کە لە کاتی خەباتی پێشمەرگایەتییدا پەیوەندییان بە ڕژێمی بەعسەوە کردبوو، فایلی جاسوسییان هەبوو. لە دوای ڕاپەڕین کوردایەتیی و پێشمەرگایەتیی و حیزبایەتیی و هەستی نەتەوەیی لە بەرچاوی خەڵک کەوت. هەستی نەتەوەیی خەڵکی کوردستان لاوزابوو، ئیتر تاکی کورد شانازیی بە کوردبوونی خۆیەوە ناکات، خۆی بە ئەندامێکی کۆمەڵگەی کوردستان دانانێت، گرنگیی بە ناسنامەی نەتەوەیی نادات.

لە دوای ڕاپەڕین حیزبەکانی باشوور و حکومەتی هەرێمی کوردستان، دەزگای نەتەوەیی و چالاکیی نەتەوەییان پێشنەخست، دەزگای حیزبییان برەوپێدا و دەزگای خێڵیان زیندووکردەوە. بەو شێوەیە هەستی حیزبایەتیی و هەستی خێڵایەتیی و ناوچەگەریی گەشەیکرد و شوێنی هەست و هۆشیاریی نەتەوەییان گرتەوە. بۆیە پایەیەکی تری نەتەوەبوونی کورد کە هەستی نەتەوەبوون و شانازییکردنە بە نەتەوەکەیەوە و بە ناسنامەی نەتەوەییەوە لاوازبوو.

لە ساڵانی ١٩٩٤ - ١٩٩٨دا، کاتێک شەڕی براکوژیی لە نێوان پارتیی و یەکێتییدا بەرپابوو، خەڵکی سلێمانیی و هەولێر و دهۆک لە نێوان شارەکانی کوردستاندا هاتوچۆیاندەکرد، بەسەر خاڵی پشکنینی ئەو دوو دەسەڵاتە و خاڵی پشکنینی حکومەتی بەعسدا تێدەپەڕین، هاتوچۆکەران دەیانگوت لە خاڵی پشکنینی پارتیی و یەکێتییدا زۆرتر ڕووبەڕووی ئازاردان و سوکایەتیی دەبینەوە هەتا خاڵی پشکنینی ڕژێمی بەعس. ئەم جۆرە بەراوردکردنەی خەڵکی کوردستان لە نێوان خاڵەکانی پشکنینی دەسەڵاتی کوردیی و ڕژێمی بەعسدا، پیشانیدەدات کە خەڵکی کوردستان لە سیاسەتی

حیزبە دەسەڵاتدارەکانی کوردستان ناڕازین و ئاوات بە دەسەڵاتی داگیرکەرانی کوردستان دەخوازن.

لە ساڵانی ٢٠٠٦ - ٢٠٠٩ کاتێک ئێران و تورکیا بوردوومانی شاخەکانی قەندیلیان دەکرد، پەیامنێری کەناڵی تەلەفزیۆنی ڕۆژ (ڕۆژ تی ڤی) چاوپێکەوتنی لەگەڵ ژمارەیەک هاوڵاتیی کرد هەتا بۆچوونیان دەربارەی ئەو بوردوومانە بزانێت. ژمارەیەکی بەرچاو لە خەڵک گوتبوویان حەزدەکەین ئێران و تورکیا هەرێمی کوردستان داگیربکەن، بۆ ئەوەی لە دەسەڵاتی پارتیی و یەکێتیی ڕزگارمانبێت*٣.

ساڵی ٢٠١٧ بەهۆی سیاسەتی حیزبایەتیی تەسکی پارتیی و یەکێتییەوە، سوپای عێراق دەستی بەسەر کەرکوکدا گرتەوە. پێشمەرگەکانی پارتیی و یەکێتیی بەرگرییەکیان نەکرد. ئەمە بۆ خۆی شکستێکی نەتەوەیی گەورە بوو. دەسەڵاتی پارتیی و یەکێتیی لەو شارە ڕامالرا. حوکمی دوو_ئیدارەیی ئەو دوو حیزبە لە کەرکوک کۆتاییپێهات. پاریزگارێکی عەرەب لە شوێنی پاریزگارە کوردەکە دانرا. ناوبەناو کەناڵەکانی تەلەفزیۆن چاوپێکەوتن لەگەڵ خەڵکی کەرکوک دەکەن، پرسیاری حوکمی ئێستای کەرکوک دەکەن. هاوڵاتییەکان دەڵێن حوکمی حکومەتی عێراقی عەرەبیی لە حوکمی جووت_حیزبی کوردستان باشترە. باشبوو لە زوڵم و زۆری پارتیی و یەکێتیی ڕزگارمانبوو. دەڵێن باشبوو کەرکوک نەگەڕایەوە سەر هەرێمی کوردستان.

ئەم جۆرە بەراوردکردنەی خەڵک لە نێوان حوکمی پارتیی و یەکێتیی و عێراق و ئێران و تورکیادا، پیشانیدەدات دەسەڵاتی کوردیی چەندە دژی ناسنامەی نەتەوەیی کورد کاریکردووە. حیزبە دەسەڵاتدارەکان چەند بەرانبەر بە لاوازکردنی هەستی نەتەوەیی کورد بەرپرسیارن. پیشانیدەدات کە دەسەڵاتی هەرێم ڕۆحی نەتەوەیی و ئیرادەی نەتەوەیی خەڵکی کوردستانی بەرز ڕانەگرتووە. پیشانیدەدات کە حیزبە دەسەڵاتدارەکانی کوردستان هێندە سیاسەتی گەندەڵیی و نادادپەروەرییان بەرانبەر بە خەڵکی کوردستان بەڕێوەبردووە، هێندە خەڵکی کوردستانیان چەوساندووەتەوە خەڵکی کوردستان ئاوات بە داگیرکەرانی کوردستان دەخوازێت.

لە سەردەمی ڕژێمی بەعسدا، لە بواری هونەر و ڕۆشنبیرییدا، نیمچە ئازادییەک هەبوو، شاعیر و چیرۆکنوس و هونەرمەندانی باشووری کوردستان ئەو دەرفەتەیان دەقۆستەوە، بە هۆنراوە و تابلۆ و چیرۆک و نمایشی شانۆیی هەستی نەتەوەیی خۆیان

دەردەبڕی. لە ڕێگەی ڕۆژنامە و ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەوە، عشقی خۆیان بۆ نیشتیمان و ئازادیی و مافی نەتەوەکەیان دەردەبڕی. خەڵکیان بە گیانی نیشتیمانپەروەریی و شۆڕشگێڕیی پەروەردەدەکرد. لە دوای ڕاپەڕیین و شەڕی براکوژیی و کۆچکردنی گەنج و ڕۆشنبیرانی باشوور بۆ هەندەران، چرای هونەر و ئەدەبی نیشتیمانیی و نەتەوەیی زۆر کزبووە، لەبەرئەوەی ئەو پێکهاتە هەستیارەی کۆمەڵگەی کوردستان کە سیاسەتی نانەتەوەیی و نادایپەروەریی دەسەڵاتدارانی باشووری کوردستان دەبینێت، هەستی نەتەوەیی لاوازدەبێت و وەکو جاران گرنگیی بە ناسنامەی نەتەوەیی نادات و بە ئەرکی خۆی نازانێت بەرهەمی نەتەوەیی و عیشقی ئازادیی بۆ خەڵکی کوردستان بەرهەمبهێنێت.

بۆیە لە دوای ڕاپەڕینەوە شانبەشانی لاوازبوونی پایەکانی تری نەتەوەبوونی کورد، هەستی نەتەوەیی و ناسنامەی نەتەوەیی و ڕۆحی نەتەوەیی، لە لای سەرتاپای خەڵکی کوردستان و لە لای هونەرمەندان و نوسەرانی کوردستان هەتا ڕادەیەکی زۆر لاوازبووە و پاشەکشەیکردووە.

## ٥- بازاڕی هاوبەشی کوردستان:

لە دوای ڕاپەڕینەوە دەسەڵاتی کوردیی دوور لە کارەکتەری نیشتیمانپەروەریی چینی سەرمایەداریی نەتەوەکانی تر، بە تەنگ بازاڕ و ئابووریی کوردستانەوە نەهات، هەوڵینەدا لە هەرێمی کوردستاندا بنەمای بازاڕێکی سەربەخۆی ئابووریی ئامادەبکات و ژێرخانی ئابووریی کوردستان ڕاستبکاتەوە.

ئەو ئامێر و دەزگایانەی کە لە کاتی ئازادکردنی باشووری کوردستاندا لە حکومەتی عێراق بەجێمابوون، بۆ ڕاستکردنەوەی ژێرخانی ئابووریی هەرێمی کوردستان بەسود بوون، لەبریی ئەوەی بۆ گەشەپێدانی ئابووریی هەرێمی کوردستان بەکاریبهێنن، لە لایەن دەسەڵاتدارانەوە دەستیبەسەرداگیرا و بە تاڵانفرۆشیی ئاودیوی وڵاتانی دراوسێ کران. دەسەڵاتدارانی باشوور و سەرمایەدارە هاوپەیمانەکانیان، بڕوایان بە خۆیان نەبوو ئابووریی کوردستان ببوژێننەوە، هەوڵیاننەدا لە باشووری کوردستاندا بازاڕێکی ئابووریی سەربەخۆ پێکبهێنن، لەسەر بنەمای یاسا و ڕێسای ئابووریی نێودەوڵەتیی پەیوەندیی لەگەڵ بازاڕەکانی ناوچەکە و جیهاندا ببەستن.

دەسەڵاتدارانی باشوور دەستیان بەسەر بازاڕی ئابوریی هەرێمدا گرت، لە ناوەوەی کوردستان هەموو چالاکییەکی ئابورییان بۆ خۆیان قۆرخکرد. سەرمایەی کوردستانیان لە کوردستاندا بەگەڕنەخست، بەرەو بانقەکانی دەرەوە بەڕێیانکرد. دەرفەتی گەشەکردنی ئابوریی کوردستانیان لەباربرد، لەگەڵ سەرمایەدارانی ناوچەکە و جیهانیش وەکو بۆرجوازییەکی کۆمبرادۆری*٤، وڵاتێکی ژێردەست هەڵسوکەوتیانکرد. خۆیان ڕادەستی سەرمایەدارانی وڵاتانی داگیرکەری کوردستان کرد. باشووری کوردستانیان کردە بازاڕی ساغکردنەوەی کاڵاکانی کۆمپانیای وڵاتانی تر. کۆمەڵگەی کوردستانیان لە بەرهەمهێنان دوورخستەوە. دوای ڕاپەڕین دەسەڵاتی کوردیی گوندەکانی ئاوەداننەکردەوە، جۆگەی ئاودێریی بۆ کێڵگەکان نەبردەوە، پرۆسەی کشتوکاڵ و ئاژەڵداریی و گەشتوگوزاری کوردستانی نەبوژاندەوە. بۆ گلدانەوەی ئاو و ئاودێریی بەربەستی دروستنەکرد. لەبریی ئەوەی ئامێری نوێ بۆ کرێکار و جوتیاری کورد دابینبکات هەتا بەرهەمی خۆماڵیی زیادبکەن، چەکی پێشمەرگە و ئاسایش و پۆلیسی لەشانکردن، شەڕی ناوخۆیی پێکردن و لەو ڕێگەیەیشەوە هێندەی تر ئابوریی کوردستانی دواخست.

بۆ گەشەپێدانی پیشەسازیی و زیادکردنی بەرهەمی ئابوریی کوردستان، دەسەڵاتی باشووری کوردستان سودی لە توانای زانستیی ئەندازیارانی کوردستان و توانای فیزیکیی وەستا و کرێکارانی کوردستان وەرنەگرت. پشتیوانیی کارگە و پیشە ناوخۆییەکانی کوردستانی نەکرد. هەموو پێویستییەکی خەڵکی کوردستانی لە دەرەوەی وڵات دەهێنا. کۆمەڵگەی کوردستانی کردە کۆمەڵگەیەکی بێبەرهەم و بەکارهێنەر. لە ماوەی چەند ساڵی ڕابردوودا لە هەرێمی کوردستان نزیکەی ١٥٠٠٠ کارگە لە هەرێمی کوردستان داخراون*٥.

دەسەڵاتی کوردیی نەک هەر بۆ چالاکیی ئابوریی و بۆ زیادکردنی بەرهەم هانی خەڵکی نەداوە، لە تەمەڵکردن و لە مشەخۆرکردنی تاک و کۆمەڵدا، ڕۆڵی سەرەکیی بینیوە. دەسەڵات دەستی بەسەر سامانی وڵاتدا گرتووە، بە مەرجی ئەندامبوون لە حیزبدا، بە مەرجی کارنەکردن لە کۆمەڵگەدا، بەشێکی سامانە دەستبەسەرگیراوەکەی بە جیرە بەسەر خەڵکدا دابەشدەکات، بەڵام بە شێوەیەک دابەشیکردووە هەتا خەڵکی کوردستان نەژی و نەمرێت، بۆ ئەوەی بە بەردەوامیی خەڵک بە دوای حیزب و حکومەتەوە بێت.

بەگوێرەی زانیاریی چاودێرانی بواری ئابوریی، زۆربەی سەرمایەی هەرێمی کوردستان بە دەستی بەرپرسە سیاسییەکانی هەرێمی کوردستانەوەیە و ئەوانیش ئەو سەرمایەیەیان لە بانکەکانی دەرەوەی هەرێم داناوە و خەڵکی کوردستان سودی لێوەرناگرێت. لە سایەی تاڵانکردنی سامانی وڵاتدا، سەرمایەداریی باشووری کوردستانی دەرەوەی دەسەڵات، نەیتوانی سود لە سەرمایەی کوردستان وەربگرێت و بازارێکی نەتەوەیی پێپێکبهێنێت.

لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام، بەتاڵانبردنی سامانی ژێرزەمینی هەرێمی کوردستان بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش دەستیپێکردووە، دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان چەندین پەیمانی دەرهێنان و فرۆشتنی گاز و نەوتیان لەگەڵ کۆمپانیا بێگانەکاندا واژۆکردووە، بە شێوەیەکە کە ئەگەری ئەوە هەیە لە ماوەی چەند ساڵی ئایندەدا، سامانی ژێرزەمینی هەرێم وشکبکات و نەوەکانی ئایندە سودی لێوەرنەگرن.

دەسەڵاتی باشوور لە لایەکەوە هەوڵی جدیی دەدات بۆ ئەوەی هێزی پێشمەرگەی کوردستان موچەکەی لە عێراقی ناوەندیی وەربگرێت و گرێدراوی عێراق بێت، لەولایشەوە هەرچی نەوتی باشووری کوردستان هەیە بە ئاشکرا و بە نهێنیی دەریدەهێنێت و بە قاچاخ دەیفرۆشێت، کەس نازانێت پارەی فرۆشی نەوت دەچێتە گیرفانی کێوە؟ ڕۆژی ١٦/ ٧/ ٢٠١٠ بەقاچاخفرۆشتنی نەوتی هەرێمی کوردستان لە ڕێگەی خاڵی گومرگی پەروێزخان و باشماخەوە، لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە بڵاوبووەوە، لەژێر گوشاری حکومەتی ئەمریکا و حکومەتی عێراق و خەڵکی کوردستاندا، حکومەتی هەرێم بڕیاری فرۆشتنی نەوتی قاچاخی ڕاگرت*٦.

بەم شێوەیە دەبینین دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان لەبریی ڕێکخستن و بەهێزکردن و یەکخستنی ئابوریی کوردستان، تاڵانکردنی سامانی سەرزەوی و ژێرزەوی کوردستانی بە بنەما گرتووە. هەرێمی کوردستانی کردووەتە بەشێکی بەرخۆری بازاڕی وڵاتانی تری جیهان. پایەیەکی تری نەتەوەبوونی کوردی تێکداوە و پرۆسەی نەتەوەبوونی کوردی ئاستەنگکردووە.

## ٦- دەزگای نەتەوەیی:

دەسەڵاتدارانی باشووری کوردستان و نوێنەرانی کورد لە عێراق، لەبریی ئەوەی باس لە زوڵم و زۆری سەر گەلی کورد بکەن، دەزگای نەتەوەیی بۆ کورد ئاوابکەن، لە زۆر بۆنەدا ناوێرن خۆیان وەکو کورد بناسن، لە هەوڵی ئەودان خۆیان وەکو بەندەی دڵسۆزی وڵاتان و نەتەوەکانی تری ناوچەکە و جیهان پیشانبدەن. لەگەڵ عەرەب و تورک و فارسدا کۆنگرە و کۆنفرانس و دەزگای عێراقیی و عەرەبیی و تورکیی و ناوچەیی دەبەستن، بەڵام ئامادە نین لەگەڵ کوردانی پارچەکانی تری کوردستان، لە کۆنگرەیەکی نەتەوەییدا ستراتیژی نەتەوەیی گەلی کورد دابڕێژن.

لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدامەوە، دوور لە ئیرادەی گەلی کوردستان، لە هەولێر و شارەکانی تری باشووری کوردستان، دەیان کۆنگرە و کۆنفرانسی عێراقیی و عەرەبیی و ئیسلامیی و ناوچەیی بەستراون، بەڵام لەسەر ڕەوشی کورد و لەسەر یەکێتیی نێوان نەتەوەی کورد، هیچ کۆنگرەیەک نەبستراوە. سەرکردە کوردەکانی عێراق لە ڕاگەیاندنەکانی ناوچەکە و جیهاندا خۆیان وەکو عێراقیی و ئیسلامیی و خزمەتکاری فارس و تورک و ئەمریکیی دەناسێنن. دۆستەکانی کوردیش دەکەنە دۆستی عێراق، بەڵام زۆر بە ترس و لەرزەوە وەکو کوردێک خۆیان دەردەخەن.

پێش ڕوخانی ڕژێمی بەعس چەندین کەسایەتیی ئەورووپیی سەردانی کوردستانیان دەکرد، وەکو دۆستی کورد دەناسران، لەو کاتەوە جەلال تاڵەبانیی پۆستی سەرۆککۆماری عێراقی وەرگرتووە، هەرچی دۆستی دێرینی کوردە دەعوەتیاندەکات بۆ بەغدا و وەکو دۆستی عێراق بە کەناڵەکانی ڕاگەیاندنیان دەناسێنێت، بەبێ ئەوەی بڵێت ئەم دۆستە نوێیانەی عێراق، دۆستی دێرینی گەلی کورد بوون و لە کاتی تەنگانەدا هاوکاریی شۆڕشی کوردیان کردووە. ئان کلۆید ژنە پەرلەمانتاری بەریتانیی نمونەیەکی ئەو کەسانەیە کە دۆستی دێرینی گەلی کوردە، لەم ساڵانەی دواییدا لە بەغدا مام جەلال پێشوازیی لێکرد و وەکو دۆستی عێراق بە خەڵکی ناساند*٧.

لە ڕاگەیاندنە عەرەبییەکانی پارتییدا کە باس لە چالاکیی و کارەکانی مەسعود بەرزانیی سەرۆکی هەرێم دەکەن، لە ترسان ناوێرن بڵێن سەرۆکی کوردستان و دەڵێن سەرۆکی هەرێمی کوردستانی عێراق، بەڵام لە ڕاگەیاندنە کوردییەکانی پارتییدا

ناوی مەسعود بەرزانیی بە سەرۆکی کوردستان دەهێنن. ئەم سیاسەتە کۆسمۆپۆلیتیی و ترسنۆکەی دەسەڵاتی کوردیی لە کاتێکدایە کە هێشتا کێشەی کورد لە باشووری کوردستانیش چارەسەرنەکراوە، بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە یەکێتیی نەتەوەیی و کۆنفرانسی نەتەوەیی و ناساندنی ڕەوایی کێشەی کورد و ئازایەتیی و لیاقەی دیبلۆماسیی سەرکردەی کورد پێویستە.

لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٩ تەنها جارێک باسیان لە کۆنگرەی نەتەوەیی کوردستان کرد، بەڵام مەرجەکانی بەستنی ئەو کۆنگرەیەیش وڵاتانی داگیرکەری کوردستان دایاننابوون، کە خۆبەدەستەوەدان و شکستپێهێنانی شۆڕشی پارچەکانی تری کوردستانی لە گەڵ خۆی دەهێنا.

لە دوای ڕاپەڕینەوە هەتا ئەمڕۆ ئاوارەکانی باکووری کوردستان لە کەمپی ئاوارەییدا دەژین و لە لایەن دەسەڵاتی باشوورەوە مافی هاوڵاتیی کوردستانیان پێڕەوانەبینراوە، کەچی دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان ئامادەیی تێدایە بەبێ هیچ مەرجێک سەدان هەزار فەلەستینیی وەکو هاوڵاتیی کوردستان لە هەرێمی کوردستان نیشتەجێبکات *٨.

ئەم سیاسەتە نانەتەوەییەی دەسەڵاتی باشووری کوردستان لە ماوەی سیی ساڵی ڕابوردوودا، پایەکانی نەتەوەبوونی کوردیی زیاتر لاوازکردووە، وای لە تاک و پێکهاتەی کۆمەڵگەی کوردستان کردووە کە لە باری سەرگەردانیی نەتەوەیی و ونکردنی ناسنامەی نەتەوەییدا بژیت، لە ئاستی نێونەتەوەییدا هەست بە نامۆبوونی خۆی بکات، بۆیە کۆمەڵگە و تاکی کورد مۆراڵی لاوازبووە و زوو خۆی دەداتە دەستی بێگانە و لە بێئۆمێدییەکی قووڵدا دەژیت، ناتوانێت وەکو پێکهاتەیەکی چالاکی سەردەم کاریگەریی لەسەر ڕوداوەکان هەبێت.

## ٧- پێکهاتە تایبەتەکان

فەیلیی و هەورامیی و ئێزیدیی و شەبەک، چوار پێکهاتەی گەلی کوردن، لە ڕووی ئاین و ئاینزا و دیالۆگی قسەکردن و سنووری جوگرافیی و هێرشی بەعەرەبکردنەوە، تایبەتمەندییان هەیە. لەبەرئەوەی فەیلییەکان نیشتەجێی بەغدا بوون، خاوەن_سەرمایە بوون، شیعە بوون، لە حەفتاکانی سەدەی بیستدا پێش هەموو پێکهاتەکانی تری

باشووری کوردستان، بەر شاڵاوی ڕاگواستن و بەعەرەبکردنی ڕژێمی بەعس کەوتن.

لە بەرانبەردا کوردە فەیلییەکان لە سەنگەری پێشەوەی کوردایەتیی و خەباتی سیاسییدا سەنگەریاندەگرت، حەبیب موحەممەد کەریم کە لە حەفتاکانی سەدەی بیستدا سکرتێری پارتیی بوو، فەیلیی بوو، عادل موردا و عەبدولرەزاق فەیلیی لە دامەزرێنەرانی یەکێتیی فەیلیی بوون، لە شۆڕشی ئەیلول و شۆڕشی نوێدا، فەیلییەکان سەرچۆپیی کوردایەتییان دەگێڕا.

ئەگەر لە دوای ڕاپەڕینەوە هەتا ئەمڕۆ سەیری هەڵوێستی سیاسیی و ناسنامەی نەتەوەیی و ئاینزایی کوردە فەیلییەکان بکەین، بۆمان ڕوندەبێتەوە کە کوردە فەیلییەکان ناسنامەی مەزهەبییان بە لاوە گرنگترە هەتا ناسنامەی نەتەوەیی، لە دوای ڕاپەڕینەوە چالاکیی فەیلییەکان لە ناو حیزبە کوردستانییەکاندا بە لاوازیی دەبینرێت، بەڵام چالاکیی فەیلییەکان لە ناو حیزبە ئاینییەکانی عێراقدا بەهێزبووە. لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدامەوە ناسنامەی مەزهەبیی بەسەر ناسنامەی نەتەوەیی فەیلییەکاندا زاڵبووە. هۆکاری سەرەکیی گۆڕینی پێگەی سیاسیی فەیلییەکان، بۆ سیاسەتی نانەتەوەیی دەسەڵاتدارانی باشووری کوردستان دەگەڕێتەوە. دەسەڵاتدارانی باشوور وایان لە خەڵک کردووە شەرمبکات بڵێت من کوردم. کوردە ئێزیدییەکان یەکێک لە پێکهاتە هەرە دێرین و چالاکەکانی گەلی کوردستانن، بە درێژایی ڕۆژگار نەک هەر ناسنامەی نەتەوەیی خۆیان پاراستووە، ناسنامەی ئاینیی خۆیشیان پاراستووە، دوژمنانی گەلی کورد و عەرەبە شۆڤینییەکان، سیاسەتی تواندنەوە و بەعەرەبکردنی سەر ئێزیدییەکانیان زۆر بە خەستیی بەڕێوەبردووە، هەوڵی سڕینەوەی ناسنامەی کوردبوونی ئێزیدییەکانیان داوە، بەڵام سەرکەوتنیان بەدەسنەهێناوە.

لە دوای ڕاپەڕین لە ناو ئێزیدییەکاندا هەندێک مەیلی سیاسیی دژ بە کوردبوونیان سەریهەڵدا، هۆکاری سەرەکیی ئەم سیاسەتە نوێیە بۆ سیاسەتی نانەتەوەیی دەسەڵاتدارانی باشوور دەگەڕێتەوە، بۆ سیاسەتی نادیموکراتیی دەسەڵات بەرانبەر بە ئاین و ئاینزا جیاکانی باشووری کوردستان دەگەڕێتەوە.

بە هێرشی ٢/ ٨/ ٢٠١٤ داعش بۆ سەر شەنگاڵ و دەوروبەری، خولێکی تری جینۆسایدی ئێزیدییەکان دەستیپێکرد، هێزی پێشمەرگەی سنوورەکە داکۆکیی لە

ئێزیدییەکان نەکرد، کە هێرشی داعش بۆ سەر شەنگاڵ و دەوروبەر دەستیپێکرد، پێشمەرگەکانی پارتیی و بەرپرسانی سەربازیی و سیاسیی دەڤەرەکە، بەرگرییان لە شەنگاڵ نەکرد، پاشەکشەیانکرد و ناوچەی ئێزیدییەنشینیان بۆ هێرشی هێزەکانی داعش بەجێهێشت. خۆ ئەگەر ئەو چەند گەریلایەی (پ. ک. ک) و یەکینەکانی پاراستنی ڕۆژئاوای کوردستان زوو فریانەکەوتنایە، داعش ئێزیدییەکانی بە تەواویی لەناودەبرد و کۆتاییانپێدەهێنان.

هۆکاری سەرەکیی بۆ ئەو سیاسەتەی دەسەڵاتی کوردیی کە ئامادەنەبوو ئێزیدییەکان لە هێرشی داعش بپارێزێت ئەوەیە، دەسەڵاتی هەرێم هێزێکی نەتەوەیی نییە، هێزێکی حیزبیی و خێڵەکییە، بەرژەوەندیی حیزب و خێڵ چۆن بخوازێت بەو شێوەیە دەجوڵێتەوە. چاودێرانی سیاسیی وای بۆدەچن کە ڕێککەوتنی ژێربەژێر لە نێوان داعش و دەسەڵاتدا هەبوویێت بۆ ئەوەی جینۆسایدی پێکهاتەیەکی تایبەتی ئاینی کورد بکرێت بەرانبەر بە هەندێک دەستکەوت.

لە باشووری کوردستاندا شەبەک و زەنگەنە و هەورامیی و باجەڵان و کاکەیی، بە شێوە دیالێکتیکی گۆران دەدوێن، لە ڕووی زمان و کەلتورەوە زۆر لە یەکەوە نزیکن، بەڵام ئەو پێکهاتە دیالۆگییانە لە ڕووی جوگرافییەوە لە یەکتر دابڕاون.

دەسەڵاتی باشووری کوردستانی دوای ڕاپەڕیین لەبەر شەڕی براکوژیی و هەڵپەی دەسەڵات و لاوازیی ئیرادەی نەتەوەیی، کارینەکرد بۆ ئەوەی یەکێتییەکی کەلتوریی و زمانەوانیی لە نێوان ئەو پێکهاتەنەدا دروستبکات، ئەو پێکهاتە دیالێکتییانە بە کوردەوە گرێبدات.دووریی دیالێکتیکی شەبەک لە سۆرانیی و بادینیی (کرمانجیی خواروو و کرمانجیی سەروو)، نزیکبوونی شوێنی نیشتەجێی شەبەک لە گەلی عەرەب، لەبەرئەوەی زۆرینەی شەبەک سەر بە ئاینزای شیعەن، لەگەڵ سیاسەتە نانەتەوەیی و نادیموکراتەکانی دەسەڵاتی باشوور، زەمیینەی بۆ ئەوە خۆشکرد کە لە ناو شەبەکدا مەیلێک سەرهەڵبدات و ڕاپگەیەنێت شەبەک کورد نییە و شەبەک عەرەبن.

لە ساڵی ٢٠٠٥ بە دواوە لە ناو کۆمەڵێک ڕۆشنبیری ناوچەی هەوراماندا مەیلێکی تر سەریهەڵدا، کە کار بۆ ئەوە دەکات بیسەلمێنێت هەورامیی کورد نین و پێکهاتەیەکی جیاوازن. دروستبوونی ئەو مەیل و ئاڕاستە سیاسییانە لە ناو کوردانی فەیلیی و

ئێزیدیی و شەبەک و هەورامییدا، لە لایەکەوە بۆ لاوازیی پایەکانی نەتەوەبوونی گەلی کورد دەگەڕێتەوە، لە لایەکی ترەوە بۆ سیاسەتی شۆڤینیی وڵاتانی داگیرکەری کوردستان دەگەڕێتەوە کە دەیانەوێت لە ناو ئەو پێکهاتە تایبەتانەی گەلی کوردستان کار لەسەر خاڵە لاوازەکانی نەتەوەبوونی کورد بکەن و لە کوردبوون دووریانبخەنەوە.

دەسەڵاتی باشووری کوردستان نەک هەر ئیرادەی نەبووە بۆ ئەوەی بنەماکانی نەتەوەبوونی کورد لە ناو ئەو پێکهاتانەدا بە باشیی دابکوتێت و ڕووبەڕووی سیاسەتی شۆڤینیی داگیرکەران ببێتەوە، بە سیاسەتە نانەتەوەییە نادیموکراتەکەی هێندەی تر پایەکانی نەتەوەبوونی کوردی لە ناو ئەو پێکهاتانەدا لاوازکردووە و زەمینەی سەرکەوتنی سیاسەتی شۆڤینیی داگیرکەرانی کوردستانی خۆشتر کردووە.

باشترین چارەسەری بۆ کێشەی پێکهاتە کەلتوریی و ئاینیی و زمانەوانییەکانی ناو کوردستان، سیستەمی نەتەوەی دیموکراتە، کە لە چوارچێوەی سیستەمی نەتەوەبووندا ماف و ئەرکی ئەو پێکهاتانە دیاریدەکات. سیستەمی یەک_زمان و یەک_کەلتور و یەک_ئاینی نەتەوەیی کلاسیک تێدەپەڕێنێت و سیستەمی فرەڕەنگی ناو نەتەوە ڕەنگرێژدەکات.

## ٨- پایەکانی نەتەوەبوون لە لای (پ. ک. ک)

بە پێچەوانەی دەسەڵاتدارانی باشووری کوردستانەوە، لەو کاتەوە پارتی کرێکارانی کوردستان دامەزراوە، یەکێک لە ئەرکە بنەڕەتییەکانی پتەوکردنی پایەکانی نەتەوەبوونی گەلی کوردستانە.

(پ. ک. ک) گرنگیی بە مێژووی نەتەوەی کورد داوە، عەبدوڵڵا ئۆج ئالان لەسەر مێژوو بە گشتیی و مێژووی کوردستان بە تایبەتیی، لێکۆڵینەوەی ئەنجامداوە. کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی (پ. ک. ک) لەسەر مێژووی کورد بەرنامەی بەردەوامیان هەیە. وێنەی سەرکردە مێژووییەکانی کورد لە هۆڵی کۆبوونەوەی کۆنگرەی نەتەوەیی کوردستاندا دادەنێت، ئەوە پیشانیدەدات کە جوڵانەوەی (پ. ک. ک) زیاتر لە هەر لایەنێکی تری کوردستان گرنگیی بە مێژووی کورد دەدات.

لە ڕووی زمانەوە (پ. ک. ک) هەوڵیداوە دیالێکتەکانی زمانی کوردیی زیندووبکاتەوە، کرمانجیی و سۆرانیی لە یەکتری نزیکبکاتەوە. بۆ پێکهێنانی زمانی یەکگرتووی کوردیی هەوڵی جدیی داوە، چەندیین پەیمانگای زمانی کوردیی لە ئەورپا و لە کوردستان دامەزراندووە، کەناڵی ڕاگەیاندنی بینراو بیستراوی بە زمانی کوردیی لە وڵاتانی ئەورووپیی کردووەتەوە. لە باکوری کوردستان، خولی پەروەردەی زمانی کوردیی کردووەتەوە، ساڵانە کۆنگرەی نەتەوەیی کوردستان لەسەر زمانی کوردیی کۆنگرە دەبەستێت لە ١٥/ ١١/ ٢٠٠٩ لە برۆکسل یەکێک لەو کۆنگرانە لە هۆڵی پەرلەمانی ئەوروپا بەڕێوەچوو. ئەوە پیشانیدەدات کە جوڵانەوەی باکووری کوردستان بە ڕابەرایەتیی (پ. ک. ک) پێش ئەوەی دەسەڵاتیش وەربگرێت گرنگیی بە بوژانەوە و یەکخستنی زمانی کوردیی دەدات، وەکو پایەیەکی نەتەوەبوونی کورد سەیریدەکات.

(پ. ک. ک) کاری جدیی بۆ دەزگای نەتەوەیی و یەک_وتاریی گەلی کورد کردووە. (پ. ک. ک) پیشانیداوە پێش ئەوەی دەسەڵات وەربگرێت، لە کاتی شۆڕشدا گرنگیی بە یەکێتیی گەلی کوردستان دەدات. خەباتی (پ. ک. ک) خێڵایەتیی و ناوچەگەریی و پارچەگەریی تێپەڕاندووە، بەشداریی هەموو خەڵکی کوردستان لە پرۆژەی نەتەوەییدا بە پایەیەکی گرنگی نەتەوەبوونی گەلی کورد و بە مەرجێکی گرنگی ڕزگاربوونی گەلی کورد دەبینێت. ئەمە لە کاتێکدایە (پ. ک. ک) ماوەی سیی ساڵ زیاترە سەرقاڵی خەباتی چەکدارییە، بەڵام هەرگیز خەباتی سیاسیی و خەباتی قایمکردنی پایەکانی نەتەوەبوونی گەلی کوردی فەرامۆشنەکردووە.

ئەگەر بەراوردی باری سیاسیی و ئابوریی و ئاسایشی (پ. ک. ک) و دەسەڵاتدارانی باشووری کوردستان بکەیت، بۆت ڕوندەبێتەوە کە دەسەڵاتدارانی باشوور لە چاو (پ. ک. ک)دا لە هەموو ڕوویەکەوە توانایان زیاترە. ئیتر دەگەیتە ئەو باوەڕە کە دەسەڵاتدارانی باشوور بە ویستی خۆیان نایانەوێت خزمەتی گەلی کورد بکەن، نایانەوێت پایەکانی نەتەوەبوونی کورد قایمبکەن.

بەو شێوەیە سیاسەتی نەتەوەیی (پ. ک. ک) پایەکانی نەتەوەبوونی کورد قایمتر دەکات، وا لە تاکی کورد دەکات شانازیی بە ناسنامەی نەتەوەیی خۆیەوە بکات.

## سیاسەتی نانەتەوەیی

### ١- حیزبی پێش خەباتی نەتەوەیی

دەسەڵاتدارانی باشووری کوردستان لە ڕێگەی حیزبەکانی باشووری کوردستان و دامودەزگاکانی حکومەتی هەرێمەوە، ڕایدەگەیەنن کە ئەندیشە و ئامانجی نەتەوەییان هەیە، کار بۆ چارەسەری پرسی نەتەوەیی کورد دەکەن، بەڵام نەک هەر بە تەنگ بنەماکانی نەتەوەبوونی گەلی کوردەوە نەهاتوون، بەڵکو هەوڵی لاوازکردنی ئەو بنەما و پایانەیشیان داوە کە بینای نەتەوەبوونی گەلی کوردی لەسەر دامەزراوە.

حیزبی کوردیی بۆ چارەسەری کێشەی نەتەوەیی گەلی کورد پێکهێنراوە، حیزب کاریگەریی لەسەر هەست و هۆشیاریی و خەباتی نەتەوەیی هەیە. سەرکردە سیاسییەکانی گەلی کورد حیزبی سیاسیی کوردیان لە ڕێڕەوی ئاسایی خۆی لاداوە، وایانلێکردووە کە لە ئامانجەکانی دروستبوونی دووربکەوێتەوە.

حیزب و حیزبایەتیی دیاردەی سەردەمی سیاسەتی خێڵایەتیی نییە، حیزب سەرخانی کۆمەڵگەی سیاسیی دیوکراتیی و نەتەوەییە. سەرکردەکانی باشووری کوردستان حیزبیان گێڕاوەتەوە بۆ سەردەمی خێڵ و خێڵگەرایی. سەرکردەی حیزبە دەسەڵاتدارەکان سەرۆکی بنەماڵە و خێڵەکانن، بەرپرسە باڵاکانی حیزب و حکومەت لە ڕیزی بنەماڵە و خێزانە دەسەڵاتدارەکانەوە هەڵدەبژێرن، ماف بە گەل نادەن نوێنەر و بەڕێوەبەری ڕاستەقینەی خۆی هەڵبژێرێت، دەرفەتنادەن سود لە کەسانی بەتوانا و شارەزای ناو کۆمەڵگە وەربگیرێت. ئەم سیاسەتەی ناو حیزب، کە لە لایەن دەسەڵاتدارانی هەردوو حیزبی دەسەڵاتداری باشووری کوردستانەوە پەیڕەودەکرێت، حیزبەکانی تریشی گرتووەتەوە، سیاسەتێکی نانەتەوەییە، لەبەرئەوەی بەرژەوەندیی بنەماڵە و خێزان دەخرێتە سەرووی بەرژەوەندیی نەتەوەوە، هەموو تاک و پێکهاتەکانی گەلی کورد بۆیان نییە لە بڕیاری سیاسیی و بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتدا بەشدارییبکەن.

له هەرێمی کوردستان تەنها توێژێکی خێڵەکیی مافی سیاسیی و ئابوریی و بەڕێوەبردنی هەیە، بۆیە دەتوانین بڵێین حوکمڕانیی باشووری کوردستان بە قۆناغی حوکمڕانیی نەتەوەیی نەگەیشتووە، دەتوانین حوکمڕانیی باشووری کوردستان بە قۆناغی دەوڵەت_شارەکانی یۆنانی کۆنی پێش سیستەمی کۆیلایەتیی، پێش قوناغی نەتەوەبوونی گەلان بچوێنین. له دەوڵەت_شارەکانی یۆنانی کۆندا بیرکردنەوە و بڕیاردان و دەسەڵاتداری مافی هەموو تاک و پێکهاتەیەکی کۆمەڵگەی یۆنان نەبووە، حوکمڕانیی تەنها بۆ پێکهاتەی خانەدان بووە، له ناو خانەدانیشدا، تەنها پیاو مافی خۆپاڵاوتن و دەنگدان و بەڕێوەبردنی وڵاتی هەبووە. له ناو پیاوانیشدا تەنها خاوەن_کۆیلە و دەسەڵاتدار و شازادەکان ئەو مافەیان پێدراوە. ژنان مافی خۆپاڵاوتن و دەنگدانیان نەبووە. کۆیلەکان مافی دەنگدان و خۆپاڵاوتنیان نەبووە. ئەو کەسانەیش کە نیشتەجێی یۆنان بوون و بە ڕەچەڵەک یۆنانیی نەبوون، مافی سیاسییان نەبووە. له یۆنانی کۆندا تەنها پێکهاتەیەکی نێری خاوەن_کۆیلە، یۆنانی بەڕێوەبردووە. تەنها له ناو ئەو پێکهاتەیەدا بڕیاردراوە و دەسەڵات دەستاودستکراوە. ژنان و کۆیلە و خەڵکی دەرەوەی یۆنان مافی ئەوەیان نەبووە وەکو هاوڵاتییەکی پلە یەک له بڕیاردان و بەڕێوەبردنی وڵاتەکەیاندا بەشدارییبکەن. ئەگەر سیستەمی سیاسیی سەردەمی کۆیلایەتیی ئەو کاتەی یۆنان لەگەڵ سیستەمی سیاسیی هەرێمدا بەراوردیبکەین، لایەنی لەیەکچوونی زۆر له نێوانیاندا دەبینین.پارتیی دیموکراتی کوردستان (پارتیی) ساڵی ١٩٤٦ وەکو حیزبێکی سیاسیی بۆ ڕابەرایەتییکردنی بزوتنەوەی کوردایەتیی دامەزراوە، بەڵام ئەو حیزبە له پێوانەی کوردایەتیی لایداوە و ئێستا حیزبی بنەماڵەی بەرزانییەکانە.

پارتیی بە شێوەیەکی گشتیی حیزبی پیاوانە، ئەگەر ڕۆژێک له ڕۆژان ئەندامێکی ژنیش پلەیەکی حیزبیی تێیدا بەدەستخستبێت، نەک دەبێت وەکو پیاوان و بۆ پیاو بیربکاتەوە و بڕیاربدات، دەبێت بۆ بنەماڵە و خێزانی نێرینەی باڵادەست بیربکاتەوە و کاربکات. بەو واتایە ئەو ژنە له جەوهەری ژنێتیی دووردەکەوێتەوە و کار بۆ ماف و ئازادیی ژن ناکات.

له ناو پیاوانیشدا دەسەڵاتداران پۆلێنکراون، بەرپرسە پلە یەکەکانی حیزب له خێزانی بنەماڵەی دەسەڵاتدارن. ئەم پێکهاتە دەسەڵاتدارە سودیان له مێژووی

تێکۆشانی باووباپیرانیان وەرگرتووە. جڵەوی پارتیی و شۆڕشی کورد و حکومەتی هەرێمیان بەدەستەوەگرتووە. تاک و پێکهاتەکانی تری نەتەوەی کوردیان لە مافی سیاسیی دوورخستووەتەوە. دەسەڵاتداریتیی بنەماڵەی بارزان کە لە سێکوچکەی باب و کوڕ و برازا تێپەڕناکات، بڕیار لەسەر سیاسەتەکانی پارتیی و کارەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان دەدات. ئەو سێکۆچکەیە کاروباری وڵات بەڕێوەدەبات، بەگوێرەی سیاسەتی سەردەم دەبێت ئەو سێکوچکەیە ملکەچی ڕەخنە و چاودێریی و لێپێچینەوە بن، بەڵام مافی پادشا خواوەندی کوردستانیان بە خۆیان داوە و کەس بۆی نییە لێیابپرسێتەوە. ڕۆڵی شازادە دەسەڵاتدارەکانی دەوڵەت_شارەکانی سەردەمی یۆنانی کۆن دەگێڕن، کە لە سیاسەت و بەڕێوەبردنی وڵاتدا هەموو شتێک هەر خۆیان بوون.

دیاردەی بنەماڵەگەریی دەسەڵات هەتا دێت قووڵ و فراوانتر دەبێت. لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلولدا تەنها مەلا مستەفا و دوو لە کوڕەکانی ئەندامی مەکتەبی سیاسیی پارتیی و سەرکردەی شۆڕشی ئەیلول بوون، بەڵام لە دوای کۆنگرەی ١٣ی پارتیی (٢٠١٦ ) ١١ بەرزانیی پلە و پۆستی مەکتەب_سیاسیی و سەرکردایەتیی و شوێنە هەستیارەکانی حیزب و حکومەتیان بەدەستەوەگرتووە.

لە مێژووی خەباتی پارتییدا، لە کاتی شۆڕشی ئەیلول و شۆڕشی گوڵاندا، لە سەردەمی حکومەتی هەرێمی کوردستاندا، بنەماڵەی بەرزانیی چەندیین هەڵەی ستراتیژییان کردووە، چەندیین جار سەنگەری بەرگریی گەلی کوردیان بۆ دوژمن چۆڵکردووە، بەڵام هەتا ئێستا ڕووبەڕووی ڕەخنەوە لێپێچینەوە نەبوونەتەوە.

لە دوای دەسەڵاتی خێزانی بەرزانییەوە کۆمەڵێک کادر و بەرپرسی حیزبیی نابەرزانیی پارتیی دێن، کە تێکۆشانی سیاسییان لە ناو پارتییدا دەستپێکردووە و هەتا ئێستایش لە تێکۆشاندا بەردەوامن. ئەمانە لە ڕووی ماف و دەسەڵاتەوە پێکهاتەی پلە دووی حیزبن. سنوور بۆ کار و چالاکییە سیاسییەکانیان دانراوە، مافی سیاسیی و دەسەڵاتیان لە لایەن پێکهاتەی یەکەمەوە دیاریدەکرێت، بۆیان نییە داهێنانبکەن، بۆیان نییە دەست لەو بابەتانە وەربدەن کە ماف و ئەرکی بەرزانییەکانە، ئەم توێژە بۆی نییە پۆستی سەرۆکی پارتیی وەربگرێت. ئەم توێژە

دەسەڵاتدارەی ناو پارتیی لەو توێژە کۆمەڵایەتییەی دەوڵەت_شارەکانی سەردەمی یۆنانی کۆن دەچن کە لە بنەڕەتدا هاوڵاتیی یۆنانیی نەبوون، بەڵام لە یۆنان دەژیان و بۆیان نەبوو لە بڕیاری سیاسییدا بەشدارییبکەن و تەنها بازرگانییاندەکرد.

لە دوای ئەمانیشەوە پێکهاتەیەکی تر دێن کە بە پێکهاتەی پلە سێی ناو پارتیی دەژمێردرێن، ئەمانە لەو کەسانە پێکدێن کە یەکەم جار تێکۆشانیان لە دەرەوەی پارتییدا دەستپێکردووە. سەرەتا ئەندام و کادری حیزبی شیوعیی عێراق و یەکێتیی و (پ. ک. ک) بزوتنەوەی گۆڕان و حیزبەکانی تر بوون، ئەم پێکهاتەیەی ناو پارتیی ئەرکیان پاراستنی پێکهاتەی یەکەمی پارتییە (بەرزانییەکان)، مافی ئەوەیان نییە دەست لە کاروباری بەرپرسە پلە یەک و پلە دووەکانی ناو حیزبەکەیان وەربدەن. خاوەنی بەرهەم و داهێنان نین، ئەو ئەرکانەی بۆیان دیاریدەکرێت جێبەجێیدەکەن و ناتوانن لێیلابدەن. ئەم پێکهاتەیە زۆربەیان وەکو ڕاوێژکاری بەرپرسەکانی بنەماڵەی بەرزانیی کاردەکەن. ئەگەر ئەم دیمەنە پلەدارییەی ناو ڕیزەکانی پارتیی بخەینە بەرچاوی خۆمان، لەوێوە سەیری دیمەنی کۆمەڵایەتیی حیزبەکانی تری باشووری کوردستان بکەین، دەبینین ئەو حیزبانەش لەژێر هەژموونی سیاسەتی پلەداری پارتییدا دا دەژین، لە هەوڵی ئەوەدان پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی و ڕێکخراوەیی خۆیان لەسەر شێوازی پارتیی دابڕێژنەوە. هێندەی تر ڕەوڕەوەی مێژوو بۆ دواوە بگەڕێنەوە و لە ڕێکخستنێکی پێش نەتەوەیی قۆناغی کۆیلایەتیی نزیکببنەوە.

یەکێتیی نیشتیمانیی کە لە دوای کارەساتی ١٩٧٥ شۆڕشی ئەیلول، وەکو ڕێکخراوێکی چەپی مۆدرێن دامەزرا. سەرەتا دژی بنەماڵەگەریی دەوەستایەوە، باسی لە سۆسیالیستیی و یەکێتیی نەتەوەیی دەکرد، پاش ماوەیەک لەو ئەندێشە و ئامانجانەی دوورکەوتەوە، خۆی بە باوەشی سیستەمی کۆمەڵایەتیی خێڵ و بنەماڵەدا کردەوە. هەرچەندە ئێستا یەکێتیی ئەندامی سۆسیاڵ_دیموکراتی جیهانە، بەڵام مام جەلال تاڵەبانیی سکرتێر، فریای ئەوە نەکەوت بنەماڵەکەی خۆی وەکو بنەماڵەی بەرزانیی ڕێکبخات و پۆستەکانیان بەسەردا دابەشبکات. لە دەوروبەری خۆی بنەماڵەیەکی دەسەڵاتداری ناگونجاوی پێکهێنا. لە ڕێگەی خزمایەتیی و ژن و

ژنخوازیی و برادەرایەتیی و هەندێک بنەمای ترەوە، مام جەلال بە پەلەپەل بنەماڵەیەکی ناکامڵی دەسەڵاتداری پێکهێنا، بۆ ئەوەی لە مۆدێلی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی بنەماڵەی بارزانیی و سەردەمی یۆنانی کۆن نزیکببێتەوە. دیارە مام جەلال بۆی دەرکەوتووە ئەو جۆرە حیزبە لە لای داگیرکەرانی کوردستان و هێزە کۆنەپەرستە باڵادەستەکانی جیهان ڕەواجی هەیە، بۆیە دەیەوێت حیزبی بنەماڵەیی پلەداریی، لە شێوەی پارتیی دروستبکات، بۆ ئەوەی بتوانێت کێبڕکێ لەگەڵ پارتییدا بکات.

لە کۆنگرەی سێی یەکێتییدا ژمارەیەکی زۆر تاڵەبانیی بە ئەندامی سەرکردایەتیی یەکێتیی هەڵبژێردران، دوای کۆچی دوایی مام جەلال، لە کۆنگرەی چواری یەکێتییدا کە لە کۆتایی ساڵی ٢٠١٩ لە شاری سلێمانیی بەسترا، بنەماڵەی تاڵەبانیی کودەتایەکی بنەماڵەیی بەسەر بەرپرسە کۆنەکانی یەکێتییدا کرد و کوڕ و برازاکەی مام جەلال وەکو هاوسەرۆک شوێنی مام جەلالیان گرتەوە. ئیتر یەکێتییش وەکو پارتیی بوو بە حیزبی بنەماڵە و خەونەکەی مام جەلال هاتەدی. لە ٨/ ٧/ ٢٠٢١ کوڕەکانی تاڵەبانیی بە بڕیارێکی سەرپێیی پلەی هاوسەرۆکییان لە ئامۆزاکەی خۆیان سەندەوە. کوڕە گەورەی مام جەلال وەکو سەرۆکی یەکێتیی خۆی ڕاگەیاند. بنەماڵەی دەسەڵاتداری تاڵەبانیی هەنگاوێکی تری بەرەو تەکامولی بنەماڵەیی هاویشت. حیزبەکانی تری باشووری کوردستان هەر هەموویان کار بۆ ئەوە دەکەن سیستەمی سیاسیی و پێکهاتەی ڕێکخستنی خۆیان لەسەر مۆدێلی پارتیی دابڕێژنەوە.

لێرەدا پرسیار ئەوەیە ئایا ئەم دیاردەی حیزبایەتیی و حوکمڕانییەی باشووری کوردستان، کە بنەماڵە و خێزان حیزب بەڕێوەدەبەن و حیزبیش حکومەت بەڕێوەدەبات، دیاردەیەکی ئاسایی و سروشتییە؟ بۆ چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوەیی سودی هەیە؟ یان ئەم جۆرە سیستەمە لە ڕێڕەوی گەشەکردنی سروشتی کۆمەڵگە و سیاسەت لایداوە و دەبێت ڕاستبکرێتەوە، لەبەرئەوەی کێشەکانی کورد بە سیاسەتی نەتەوەیی چارسەردەکرێن بە سیاسەتی بنەماڵەیی پێش نەتەوە چارسەرناکرێن.

ئەم سیستەمە سیاسییەی باشووری کوردستان سروشتیی نییە، لە ڕێڕەوی سیاسەت لایداوە، لەبەرئەوەی ئەم شێوازە حیزبایەتییەی باشووری کوردستان،

لەگەڵ سەردەمدا ناگونجێت. ئەم مۆدێلە سیاسییە تایبەتەی باشووری کوردستان لە بەرژەوەندیی نەتەوەدا نییە، ناتوانین لە ڕێگەی ئەم سیستەمە بنەماڵەییە حیزبییەوە، کێشە نەتەوەییەکانمان چارەسەربکەین.

## ٢- خێڵ و یەکێتیی نەتەوەیی

لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلولدا، بەرپرسانی پارتیی و شۆڕش، خێڵی بەرزانییان بەسەر خێڵەکانی تری کوردستاندا زاڵکرد، ئەم سیاسەتە لە شۆڕشی گوڵانیشدا بەردەوام بوو، لە دوای ڕاپەڕینیشەوە هەتا ئەمڕۆ هەر درێژەی هەیە.

دوای ڕاپەڕین خێڵە ڕکابەرەکانی بەرزان دۆستایەتییان لەگەڵ یەکیتییدا پەیداکرد، هیواداربوون یەکێتیی لە دوژمنکاریی پارتیی بیانپارێزێت، ئەمەیش پارتیی و بارزانییەکانی نیگەرانکرد، کە خولی سێیەمی شەڕی براکوژیی دوای ڕاپەڕینی نێوان پارتیی و یەکێتیی دەستپێکرد. پارتیی بۆ دەرفەتێک دەگەڕا لە یەک کاتدا شەڕی پێشمەرگەی یەکێتیی و شەڕی خێڵە ڕکابەرەکانی بکات. بەو بیانووەی حوسەین ئاغای سورکیی هاوپەیمانی لەگەڵ یەکێتیی کردووە، لە هاوینی ساڵی ١٩٩٦ لەشکری سۆرانیی هێزی پێشمەرگەی پارتیی، پەلاماری گوندی کەلکینی ناوچەی سورکایەتییان دا، حوسەین ئاغای سورکییان کوشت، گوندەکەیان ئەنفالکرد، جارێکی تر یەکێک لە خێڵە دژبەرەکانی بنەماڵی بەرزانییان سەرکوتکردەوە.

لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدامەمەوە هەتا ئەمڕۆ، دەسەلاتدارانی پارتیی و حکومەتی هەرێم، لە شاری هەولێر چەندین کۆڕ و کۆبوونەوە و کۆنفرانسی ئاشتبوونەوە و ڕێککەوتنی سیاسیی و کۆمەلایەتیی بۆ پێکهاتەکانی عێراق و ناوچەکە دەبەستن و ئاشتیاندەکەنەوە، لەو ماوانەدا شیعە و سوننە، عەرەب و تورکمان، مەسیحیی و ئیسلام لە هەولێر ئاشتبوونەوە، بەلام دەسەلاتدارانی پارتیی بیر لە ئاشتیی کۆمەلایەتیی و یەکێتیی نێوان خێڵ و پێکهاتەکانی باشووری کوردستان ناکەنەوە و کاری بۆ ناکەن. لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدامەوە، دەسەلاتدارانی پارتیی (بارزانییەکان) لەگەڵ چەندین بەرپرسی گەورەی ڕژێمی

بەعس ئاشتبوونەتەوە، داکۆکییان لە چەندیین تاوانباری ئەنفال و جینۆسایدی گەلی کورد وەکو نزار خەزرەجیی کردووە، کەچی ئامادە نین لەگەڵ خێڵەکانی برادۆست و سورچیی و زێباریی و هەرکیی و ئەوانی تر دابنیشن و گوێ لە یەکتری بگرن و لەپێناو بەرژەوەندیی نەتەوەییدا کێشە خێڵەکیەکانی خۆیان چارەسەربکەن.

لە مانگی یەکیساڵی ٢٠٠٥دا لە کاتی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگاکانی عێراقدا، لیستێکی عێراقیی شاری موسڵ سەردانی بارەگای پارتیی چارەسەری دیموکراتیی کوردستانیان کرد. من لە گەڵیاندا دانیشتم، یەک لە کاندیدەکانی ئەو لیستە کوردێکی شاری موسڵ بوو، سەرۆکی لیست و کاندیدە کوردەکە داوایان ئەوە بوو، کە دۆست و لایەنگرانی (پ. چ. د. ک) لە شاری موسڵ دەنگی خۆیان بەو لیستە بدەن. من پرسیارم لە کوردە پاڵێوراوەکەی ئەو لیستە کرد کە بەرنامەی چییە؟ لە وەڵامدا گوتی: بەرنامەم ئەوەیە دەمەوێت خزمەتی کوردەکانی شاری موسڵ و دەوروبەری بکەم. گوتم: ئەی لیستی کوردستانیی هەمان ئامانجیان نییە؟ گوتی: لیستی کوردستانی و بە تایبەتیی پارتیی کوردەکانی موسڵی فەرامۆشکردووە، تەنها هاوکاریی مەسیحییەکان دەکات. ئەگەر بۆچوونەکەی ئەو برا کوردە ڕاستبێت کە خۆی سەر بە خێڵی گۆران بوو، ئەوە بەو واتایە دێت کە هەتا ئێستایش پارتیی وەکو کورد سەیری کوردەکانی شاری موسڵ ناکەن و خۆشیاننناوێن، لەبەرئەوەی زۆربەی ئەو کوردانە سەر بە خێڵە ڕکابەرەکانی بەرزانییەکانن.

ناکۆکیی نێوان خێڵەکانی برادۆست و زێباریی و هەرکیی و سورکیی گوران لەگەڵ بنەماڵەی بەرزانییدا، کاریگەریی لەسەر یەکڕیزیی گەلی کورد و سیاسەتی نەتەوەیی کورد کردووە، لە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگای موسڵدا، کوردەکانی سەر بەو خێڵانە دەنگیان بە لیستی برایەتیی (کوردستانیی) نەدا، دەنگیان بە لیستی حەدبای عەرەبیی دا، بۆیە دڵشاد زێباریی سەر بە لیستی حەدبا بە جێگری پارێزگاری موسڵ هەڵبژێردرا. بەو شێوەیە ناکۆکیی خێڵەکیی نێوان دەسەڵاتدارانی پارتیی لەگەڵ خێڵەکانی تری کوردستاندا لە هەڵبژاردنەکانی پارێزگای موسڵدا، ڕیزەکانی کۆمەڵگەی کوردستان دوولەتدەکات، پێگەی کورد لە پارێزگای موسڵ لاوازدەکات، لیستی برایەتیی لە بەڕێوەبردنی کاروباری پارێزگای موسڵ دوورخستەوە.

یەکێتیی بە ناو حیزبێکی چەپ و سۆسیال_دیموکراتە، بەڵام بە کردەوە خێڵایەتیی و بنەماڵییەکەی کەمێک لە خوار پارتییەوەیە، پارتیی و یەکێتیی لەسەر دەسەڵات و پێگەی جەماوەریی بەردەوام لە کێبڕکێدان، ئەو میکانیزمانەی یەکێتیی بۆ ململانێ لەگەڵ پارتییدا بەکاریدەهێنێت، لەگەڵ ئایدۆلۆژیا و ستراتیژی سۆسیاڵ_دیموکراتدا ناگونجێت، لەبریی ئەوەی هەوڵی بێکاریگەرکردنی خێڵایەتیی هەرێمی کوردستان بدات، دێت ختوکەی خێڵایەتیی کۆمەڵگەی کوردستان دەدات. خێڵەکانی هەرێم کۆدەکاتەوە و هانیاندەدات دژی پارتیی و بەرزانییەکان بوەستنەوە. ئەم سیاسەتە ئیتهازییەی یەکێتیی لە بادینان و لە پشدەر بە ڕوونیی دەردەکەوێت، بەڵام یەکێتیی لەم سیاسەتەدا سەرکەوتوو نەبووە و چاری پارتیی نەکردووە. لە سیاسەتی بەگژدانی خێڵەکاندا، یەکیتیی هەر ئەوەندەی پێکراوە خێڵایەتیی زیندووبکاتەوە و خێڵایەتیی لە شوێنی یەکێتیی نەتەوەیی دابنێت و هەڕەشە لە ئاشتیی کۆمەڵایەتیی بکات.

### ٣- سیاسەتی نانەتەوەیی لە کەرکوک

پارتیی و یەکێتیی پێش ئەوەی لە عێراق دەسەڵات وەربگرن، کەرکوکیان وەکو دڵ و قودسی کوردستان وێنادەکرد. کاتێک دەسەڵاتیان بەدەستەوەگرت، بەگوێرەی بەرژەوەندیی و پاراستنی دەسەڵاتیان، لەگەڵ کەرکوکدا جوڵانەوە.

پێش ئەوەی ڕژێمی سەدام بڕوخێت، سیاسەتێکی ڕوونی ئەو دوو حیزبە دەسەڵاتدارەی باشووری کوردستان بەرانبەر بە چارەنوسی کەرکوک بەرچاوناکەوێت، هیچ ڕێککەوتنێکیان لەگەڵ ئۆپۆزسیۆنی عێراق و هاوپەیمانە ناوچەیی و جیهانییەکان نەکردووە دەربارەی چارەنوسی کەرکوک و گەڕانەوەی کەرکوک بۆ سەر هەرێمی کوردستان.

لە کاتی ڕوخانی ڕژێمی سەدامدا هێزی پێشمەرگەی هەردوو حیزبەکە بەبێ ئاگاداریی و هاوئاهەنگیی لەگەڵ یەکتردا پەلاماری شاری کەرکوکیان دا. هەر هێزەو بە جیا کۆنترۆڵی ناوچەیەکی ئەو شارەی کرد، دەستی بەسەر دامودەزاگاکانی حکومەت و حیزبی بەعسدا گرت و تاڵانیکرد.

دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام پارتیی و یەکێتیی ئیدارەی شاری کەرکوکیان وەرگرت، بەڕێوەبەرییەکی حیزبییان بەسەر کەرکوکدا سەپاند. هەردوو حیزبی دەسەڵاتدار لە کەرکوک سیاسەتێکی یەکگرتوویان نەبوو، هەر حیزبەو ئاسایشی تایبەتی حیزبیی خۆی لە کەرکوک دانا، هاویکاریی لەگەڵ ئاسایشی حیزبەکەی تردا نەدەکرد و بە جیا کار و چالاکییان ئەنجامدەدا. بەبێ ئەوەی شەرمبکەن لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە بە ناوی ئاسایشی پارتیی و ئاسایشی یەکێتییەوە لێدوانیان دەدا. ڕۆژی ١١/ ٩/ ٢٠١٠ کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی یەکێتیی (کەناڵی تەلەفزیۆنی کوردسات و کەناڵی تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان) بە شانازییەوە هەواڵێکیان بڵاوکردەوە کە لە شاری کەرکوکدا هێزی دژەتیرۆری حیزبەکەیان چالاکییەکی ئەنجامداوە و سێ گەنجی لە دەستی تیرۆریستان ئازادکردووە. ئەو قوتابخانە کوردییانەی لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام لە کەرکوک کرانەوە، لە لایەن هەردوو حیزبی دەسەڵاتدارەوە بەسەر خۆیاندا دابەشکران. هەر یەکێک لەو قوتابخانانە کتێب و بەرنامەی خوێندنی حیزبیی تایبەتی خۆیانی تێدا دەخوێنرا. هەر حیزبەو ئەو کتێبانەی پەروەردە بەسەر قوتابخانەکاندا دابەشدەکات کە لە سەردەمی دوو_ئیدارەیی کوردستاندا بۆ وەزارەتی پەروەردەی هەولێر و وەزارەتی پەروەردەی سلێمانیی چاپیانکردبوون.

پارتیی و یەکێتیی لەسەر چارەنوسی کەرکوک و کێشە هەستیارەکانی تری نێوان هەرێم و عێراقی ناوەندی بۆچوونی جیاوازییان هەیە، بۆ نمونە ڕۆژی ١٨/ ١١/ ٢٠٠٩ یاسای هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق لە لایەن ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقەوە بڕیاری لەسەر درا. سەرۆککۆماری عێراق ئیمزایکرد، کەچی سەرۆکی هەرێمی کوردستان دژی ئەو یاسایە وەستایەوە.

ئەم بۆچوونە جیاوازە حیزبییانەی نێوان ئەو دوو حیزبە دەسەڵاتدارە زیانێکی گەورەی بە دۆزی ڕەوای گەلی کورد گەیاندووە، لە لایەکەوە دەرفەت بە دوژمنان دەدرێت لەو کونوکەلەبەرانەی نێوان پارتیی و یەکێتییەوە بێنە ناو کێشەکەوە و تای تەرازووەکە بە لای خۆیاندا ڕابکێشن. لە لایەکی ترەوە دوو_هەڵوێستیی و دووڕوویی لە سیاسەتی نەتەوەییدا، باری سەرشانیی گەلی کورد گراندەکات، سەر لە خەڵک تێکدەدات و ئیرادەی گەڕاندنەوەی کەرکوک بۆ سەر هەرێمی کوردستان

لاواز و پەرتەوازەدەکات. سیاسەتێکی تری حیزبیی و نانەتەوەیی کە بە شێوەیەکی سەرەکیی لە لایەن یەکێتییەوە لە کەرکوک بەڕێوەدەبرێت و زیاتر لە سیاسەتە خێڵەکییەکەی موسڵی پارتیی زیانی بە دۆزی نەتەوەیی کورد گەیاندووە، ئەوەیە ئەو قەزا و ناحیانەی کاتی خۆی بۆ بەعەرەبکردنی شاری کەرکوک لە پارێزگای کەرکوک دابڕێنران و خرانە سەر پارێزگای سلێمانیی وەکو چەمچەماڵ و کەلار و کفریی، بەگوێرەی مادەی ١٤٠ دەستووری عێراق بۆ ئاساییکردنەوەی بارودۆخی کەرکوک، دەبێت ئەو شارانە بگەڕێنەوە سەر پارێزگای کەرکوک، بەڵام لەبەرئەوەی لەم کاتەدا ئەو قەزا و ناحیانە لەژێر دەسەڵاتی یەکێتییدان، نوێنەرانی کورد لە پەرلەمان و لە حکومەتی عێراق هەوڵیانندداوە بۆ ئەوەی ئەو بڕیارەی ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی سەردەمی سەدام هەڵبوەشێنێتەوە، کە ساڵی ١٩٧٦ دەرچووە. بەگوێرەی بڕیارەکە ئەو قەزا و ناحیانەی لە کەرکوک دابڕیوە و خستوونیەتە سەر پارێزگاکانی سلێمانیی و دیالە و تکریت و هەولێر*٩.

ساڵی ٢٠٠٧ حکومەتی عێراقی فیدراڵ داوای لە پارێزگاکانی سلێمانیی و دیالە و تکریت کرد، ئەو شار و شارۆچکانە بخەنەوە سەر پارێزگای کەرکوک کە لەسەردەمی ڕژێمی سەدامدا لە کەرکوک دابڕێنراون، هەموو پارێزگاکان ئامادەییان پیشاندابوو کە داواکاریی حکومەتی ناوەندیی عێراق جێبەجێبکەن، بەڵام پارێزگاری سلێمانیی ئەو کاتە (دانای ئەحمەد مەجید) ئامادەیی پیشاننەدا کار بۆ گەڕاندنەوەی ئەو شارانە بکات، وەڵامەکەی حکومەتی عێراقی ڕەوانەی مەکتەبی سیاسیی یەکێتیی کرد، مەکتەبی سیاسییش وەڵامی حکومەتی عێراقی نەدایەوە*١٠، ئەو هەڵوێستەی یەکێتیی ئاستەنگیی بۆ ئاساییکردنەوەی ڕەوشی کەرکو ک دروستکرد، جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ دواخست.

## ٤- باشوور و پارچەکانی تری کوردستان

لە دوای ڕاپەڕینەوە هەتا ئەمڕۆ هێزە دەسەڵاتدارەکانی باشووری کوردستان بە شێوازی سیاسیی و سەربازیی و هەواڵگریی و ڕاگەیاندن، دژی تێکۆشانی ئازادیخوازی گەلی باکوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان وەستاونەتەوە، لەگەڵ

تورکیا و ئێران هاوپەیمانیی ئابوریی و سیاسیی و هەواڵگریی دروستدەکەن، دژی تێکۆشانی گەلی کورد کردەی سەربازیی و هەواڵگریی هاوبەش ئەنجامدەدەن. ئەم سیاسەتە نانەتەوەییە درێژکراوەی سیاسەتی شۆڕشی ئەیلولە.

لە دوای ڕاپەڕینی ١٩٩١ باشووری کوردستانەوە، لەسەر داوای حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشووری کوردستان، حیزبەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان دەستیان لە خەباتی چەکداریی هەڵگرت، لە ئوردوگا و شارۆچکەکانی باشووری کوردستان جێگیربوون، حکومەتی هەرێم و هەردوو حیزبی دەسەڵاتدار و ئەو حیزبانەی تری باشوور کە دۆستی ئێران بوون، بە هەموو شێوەیەک کاریاندەکرد بۆ ئەوەی دەوڵەتی ئێران لە هەڵمەتی سیاسیی و سەربازیی هێزەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بپارێزن، ئەمە لە کاتێکدایە کە حکومەتی ئێران هیچ هەنگاوێکی بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد نەناوە. دەسەڵاتی باشووری کوردستان، ئێران لە پەلاماری حیزبە سیاسییەکانی ڕۆژهەڵات دەپارێزێت، بەڵام حیزبەکانی ڕۆژهەڵاتی لە پەلاماری ئێران ناپارێزێت. لە نەوەدەکانی سەدەی بیستدا لە شارەکانی باشووری کوردستان، چەندیین شۆڕشگێڕی ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە لایەن چەکداری نەناسراوەوە تیرۆرکران. هیچ دەزگایەکی ئاسایشی هەرێمی کوردستان شوێن ئەو کردە تیرۆرستانە نەکەوت، ئەو هێزەی ئاشکرانەکرد کە لە پشتی تیرۆریساتنەوە وەستاوە. ساڵی ١٩٩٥ لە شاری سلێمانیی کلینیکی پزیشکییم هەبوو، هەڵسوڕاوێکی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران (حدکا) بە ڕۆژنامە بەسەریدەکردمەوە، بەردەوام نارەزایی پیشاندەدا کە حکومەتی هەرێم لە سلێمانیی ئاسایشی کادر و بەرپرسەکانیان ناپارێزێت و تیرۆردەکرێن. منیش گوتم: ئەی بۆچی ڕوو ناکەنە هەولێر و لەوێ باشتر ناپارێزرێن؟ گوتی لەوێیش وەکو ئێرە وایە.

لە مانگی ئایاری ٢٠١٠ حکومەتی ئێران چوار سیاسەتمەداری ڕۆژهەڵاتی کوردستانی لەسێدارەدا، ئۆپۆزسیۆنی ئێران، یەکێتیی ئەوروپا، گەلی کورد لە هەرچوار پارچەی کوردستان، ئیدانەی ئەو سزا نارەوایەی کۆماری ئیسلامیی ئێرانیان کرد. حکومەتی هەرێم و حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشوور، نەک هەر ئیدانەی ئەو تاوانەیان نەکرد، کاتێک کۆمەڵێک ڕێکخراوی جەماوەریی و کەسایەتیی لە شاری سلێمانیی ویستیان نارەزایی بەرانبەر بەو تاوانە دەرببرن، ئاسایش بە شەق

و قۆناغە تفەنگ بەربوونە گیانی ئامادەبوان و ژمارەیەکیان لێ دەستگیرکردن*١١.

لە دوای ڕاپەڕینەوە هێزەکانی باکووری کوردستان لە باشوور نزیکبوونەوە، باشووری کوردستان بە قووڵایی ستراتیژی شۆڕشی باکوور دەبینن، کاریان بۆ یەکێتیی نەتەوەیی کورد دەکرد، بەڵام هێزەکانی باشوور بوونە هاوپەیمانی ستراتیژی حکومەتی تورکیا و لە چەندیین ڕێککەوتنی سیاسیی و هەواڵگریی و سەربازییدا، دژی شۆڕشگێڕانی باکوور وەستانەوە. لە ساڵی ١٩٩٢ بە دواوە هێزی پێشمەرگەی پارتیی و یەکێتیی لە چەندیین ئۆپراسیۆنی سەربازییدا، شانبەشانی سوپای تورکیا لە یەک سەنگەردا دژی گەریلاکانی پارتی کرێکارانی کوردستان شەڕیانکردووە.

لە ١٦/ ٥/ ١٩٩٧دا، لە هەولێر هێزێکی پێشمەرگەی پارتیی، پەلەماری بارەگای ڕێکخراوی میزۆپۆتامیا و شوێنی حەوانەوەی بریندار و ڕۆژنامەنوسانی سەر بە (پ. ک. ک)دا، لە ماوەیەکی کەمدا ٥٢ کەسی لێ شەهیدکردن، هەتا ئێستا کەس نازانێت گۆڕی ئەو شەهیدانە لەکوێیە؟ شەهیدەکان خەڵکی هەر چوار پارچەی کوردستان بوون، ژمارەیەک لە شەهیدەکان خەڵکی باشووری کوردستان بوون و لەو کاتەوە بە تایبەت لە ساڵیادی کۆمەڵکوژییەکەدا، کەسوکاری شەهیدەکان سەردانی دامودەزگاکانی حکومەتی هەرێم و پەرلەمان و لایەنە پەیوەندییدارەکانی تر دەکەن، هەتا سۆراغی گۆڕی شەهیدەکانیان بزانن، بەڵام هەتا ئێستا کەس وەڵامیاننەداتەوە.

ساڵی ٢٠٠٧ حکومەتی تورکیا داوای لە پارتیی و یەکێتیی کرد جارێکی تر هاوکاریی سوپای تورکیا بکەن بۆ لێدانی هێزەکانی پارستنی گەل، بەڵام ئەم جارەیان لە ترسی ئەمریکا بەرپرسانی ئەو دوو حیزبە بە داواکەی تورکیا ڕازینەبوون. جەلال تاڵەبانیی سکرتێری (ی. ن. ک) لە چاوپێکەوتنێکی کەناڵی تەلفزیۆنی عەربیەدا ڕایگەیاند، ئەوان لە ڕابردوودا شانبەشانی سوپای تورکیا شەڕی گەریلاکانی (پ. ک. ک)یان کردووە، بەڵام نەیانتوانیوە سەرکەوتن بەدەستبهێنن، بۆیە ئامادە نین جارێکی تر خۆیان لە شەڕێکی دۆڕاو بدەن و لەگەڵ سوپای تورکدا شەڕی گەریلا بکەن.

له هەمان ساڵدا و له سالآنی دواتردا، چەندین جار نێچیرڤان بەرزانیی سەرۆکی حکومەتی هەرێم ڕایگەیاندووه که نزیکەی سێ هەزار پێشمەرگەیان له شەڕی (پ. ک. ک)دا بۆ تورکیا بەکوشتداوه*١٢.

له هێرشێکی سوپای تورکیادا بۆ سەر هێزەکانی پاراستنی گەل ژمارەیەک سەربازی تورک و گەریلا گیانیانلەدەستدا. بەرپرسەکانی باشووری کوردستان به بەرچاوی خەڵکی کوردستانەوه، پرسه و سەرەخۆشییان له دەوڵەتی تورکیا و بنەماڵەی سەربازه کوژراوەکان کرد، بەڵام سەرخۆشییان له کەسوکاری گەریلاکانی کوردستان نەکرد*١٣.

له بەهاری عەرەبییدا گەلی کورد له ڕۆژئاوای کوردستان بەشداریی شۆڕشی گەلانی سوریای کرد، له ئەنجامی سەرکەوتنی خەباتی کوردی ڕۆژئاوادا ئەزموونی ڕۆژئاوای کوردستان بەدەستهات، لەو کاتەوه پارتیی له ڕێگەی حکومەتی هەرێم و دۆستەکانی ناوخۆی سوریا و دەوڵەتی تورکیا و دۆستەکانی تریەوه دژایەتیی ئەزموونی ڕۆژئاوای کوردستان دەکات. له ڕووی ئابوریی و دیبلۆماسییەوه ئاستەنگیی جدیی بۆ ڕۆژئاوای کوردستان دروستدەکات.

هێزەکانی باشووری کوردستان هەتا ئەمڕۆیش لەسەر سیاسەتی پارچەگەرێتیی بەردەوامن، بڕوایان وایه که داگیرکەرانی پارچەکانی تری کوردستان دۆستی ستراتیژی باشووری کوردستانن و بڕوایان وایه که کێشەی کورد له پارچەکانی کوردستاندا پەیوەنییان پێکەوه نییه و سەرکەوتنی پارچەیەک نابێته پشتیوان بۆ سەرکەوتنی پارچەیەکی تر. بەو شێوەیه دەبینین که دەسەڵاتدارانی باشووری کوردستان له هەرێمی کوردستان و له عێراق، خاوەنی کۆمەڵێک چەمکی هەڵەن و ئەو چەمکانه خزمەتی چارەسەرکردنی کێشەی کورد ناکەن.

چەمکی ڕاست له سیاسەتی نەتەوەییدا ئەوەیه که کێشەی کورد له هەموو پارچەکانی کوردستاندا یەک ناوەڕۆکی هەیه و سەرکەوتنی دۆزی کورد له هەر پارچەیەکی کوردستان سەرکەوتنه بۆ پارچەکانی تر. یەکێتیی نەتەوەیی و ڕێکخستنی نەتەوەیی دەبێته بنەما بۆ هێزی نەتەوەیی، تەنها به هێزی نەتەوەییش کێشەی کورد چارەسەردەکرێت.

**سەرچاوەکان:**

١- لە دەوڵەتی ڕاهبی سۆمەرەوە بەرەو شارستانیی دیموکراتیی، بەشی دووم، عەبدوڵڵا ئۆج ئالان.

٢- شەڕی چاڵدێران.

٣- ڕۆژ تی ڤی، کەناڵێکی کوردیی ستەلایتە لە برۆکسل پەخشدەکرێت.

٤- بۆرجوازی کۆمبرادۆر، سەرمایەداری وڵاتانی ژێردەست دەبنە خزمەتکاری سەرمایەدارانی وڵاتانی سەردەست.

٥- کەناڵی تەلەفزیۆنی ڕوداو، بەرنامەی لەگەڵ ڕەنج.

٦- ژنە پەرلەمانتاری ئینگلیز، دۆستی دێرینی گەلی کورد، چەندین چالاکیی سیاسیی بە سودی گەلی کورد ئەنجامداوە.

٧- کۆبوونەوەی مەسعود بەرزانیی و مەحمود عەباس ساڵی ٢٠٠٩ لە هاوینەهەواری سەلاحەدین.

٨- بڕیارێکی ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی حیزبی بەعسە، ساڵی ١٩٧٦ دەرچووە.

٩- وەڵامی پارێزگاری سلێمانیی بۆ ئەنجومەنی وەزیرانی عێراق، لە ڕۆژنەمەکانی باشووری کوردستاندا بڵاوکرایەوە.

١٠- ئەو هەواڵانە لە کەناڵەکانی تەلەفزیۆنی باشووری کوردستاندا (گەلی کوردستان و کوردستان تی ڤی)دا بڵاوکرایەوە

١١- ڕۆژی ٧/ ٥/ ٢٠١٠ زیکەی٥٠٠ کەس لە بەردەرکی سەرای سلێمانیی کۆبووینەوە، بۆ ئەوەی لەسەر سزای لەسێدارەدانی چالاکوانانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، وتار بخوێنینەوە، ئاسایشی سلێمانیی نەک هەر ڕێگەی وتارخوێندنەوەی نەدا، بە قوناغە تفەنگ و شەق و بۆکس بەربووە گیانی ئامادەبوان و ژمارەیەکی لێ دەستگیرکردن.

١٢- لێدوانی تاڵەبانیی و نێچیرڤان بەرزانیی بۆ کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی عەرەبیی و کوردیی و تورکیی لە کەناڵی العربیه بینیم.

١٣- پرسە و سەرەخۆشیی سەربازەکانی تورک لە ڕێگەی کەناڵەکانی باشووری کوردستانەوە بڵاوکرانەوە.

# ١٠
# کەرکوک دڵ و قودسی کوردستان

ئەگەر کێشەی کورد و کێشەی فەلەستین بە دوو کێشەی سیاسیی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بژمێردرێن، کورتکراوەی ئەو دوو کێشەیە لە شاری کەرکوک و شاری قودسدا خۆی چڕدەکاتەوە.

کەرکوک لە ڕووی ئابورییەوە پارێزگایەکی دەوڵەمەندە، سامانێکی ژێرزەمینی زۆری نەوتی هەیە، ئەو دەوڵەمەندییەی کەرکوک وای لە دەسەڵاتدارانی عێراق و هەرێمی کوردستان کردووە وابیربکەنەوە ئەگەر کەرکوک لەژێر دەسەڵاتی هەر لایەکدا بێت، ئەو لایەنە براوەدەبێت.

کەرکوک یەکێک لەو شارانەی کوردستانە کە تایبەتمەندیی فرەنەتەوەیی هەیە، بێجگە لە کورد، عەرەب و تورکمان و کلد و ئاشوریی تێدا دەژین.

کەرکوک شارێکی فرەئاینیی و ئاینزایە، پێکهاتەی ئیسلام و کریستیانیی تێدا دەژین، لە ناو ئیسلامیشدا ئاینزای شیعە و سوننەی تێدا دەژین. هەر یەکێک لەو پێکهاتە نەتەوەیی و ئاینیی و ئاینزایانە، دونیابینییەکی تایبەت و ئەندێشەیەکی سیاسیی جیاوازی بۆ کەرکوک هەیە، هەر یەکێک لەو پێکهاتانە پەیوەندیی نەتەوەیی و ئاینیی و

ئاینزایی جیاوازیان هەیە. دیاردەی فرەئاینیی و فرەنەتەوەیی وای لە کەرکوک کردووە، شوێنی دەستێوەردانی کاروباری ناوخۆی هەرێمی کوردستان و عێراق بێت. بە بیانووی داکۆکییکردن لە تورکمان، تورکیا خۆی دەخاتە ناو هاوکێشە سیاسییەکانی هەرێم و عێراقەوە، کار بۆ بەرنامەی خۆی دەکات. لە ڕێگەی داکۆکییکردن لە کریستیانەکان، ئەورووپا و ئەمریکا خۆیان دەهاوێژنە ناو هاوکێشە سیاسییەکانی کوردستان و عێراق و کار بۆ بەرنامەکانی خۆیان دەکەن. لە ڕێگەی پاراستنی مافی شیعەکانی کەرکوکەوە، ئێران خۆی دەکات بە کەرکوکدا و کار بۆ بەرنامەکانی خۆی دەکات. وڵاتانی تری ئیسلامیی لە ڕێگەی پاراستنی ئیسلامی سوننەوە، هەمان ڕێگەی تورکیا و ئێران و ئەورپا و ئەمریکا دەگرنەبەر. هیچ کام لەو هێزە ناوچەیی و جیهانییانەیش لە بەرژەوەندییاندا نییە کێشەی کەرکوک چارەسەر بکرێت، لەبەرئەوەی بە چارەسەرکردنی کێشەی کەرکوک ڕێگەی دەستتێوەردانی ئەو وڵاتانە لە کاروباری ناوخۆی عێراق سنووردارەکرێت. ئەو تایبەتمەندییانەی کەرکوک و سیاسەتی تەماعکاری وڵاتانی ناوچەیی و جیهانیی لە سامانی عێراق، وایانکردووە کە چەندیین ئەندێشەی سیاسیی و پڕۆژەی سیاسیی جیاواز بۆ چارەنوسی شاری کەرکوک دابڕێژرێت، چەندیین شێوازی جیاواز بۆ جێبەجێکردنی ئەو پڕۆژانە پەیڕەوبکرێت.

### ١- هەڵوێستی گەلی کورد

کورد پێکهاتەیەکی دێرینی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە، کاتێک عەرەب لە جزیرەی عەرەب و لە خوارووی عێراق ژیاوە، کاتێک تورک نیشتەجیی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا بووە و هێشتا بەرەو ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کۆچینەکردووە، کورد و کلد و ئاشوریی نیشتەجێی کەرکوک بوون.

کەرکوک سەردەمانێک پایتەختی ویلایەتی شارەزوور بووە، بەڵگەنامەکانی دەوڵەتی عوسمانیی دەیسەلمێنن کەرکوک شارێکی کوردستانییە، بەڵام لە دوای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقەوە، حکومەتە یەک لە دوای یەکەکانی عێراق، هەوڵی بەعەرەبکردنی ئەو شارەیان داوە. یەکێک لە ئامانجە سەرەکییەکانی شۆڕشەکانی گەلی کورد، بۆ ئەوە بووە ئاسەوارەکانی بەعەرەبکردنی کەرکوک بسڕنەوە، کەرکوک و ناوچە دابڕاوەکانی تری کوردستان بۆ باوەشی هەرێمی کوردستان بگێڕنەوە.

دوور لە بەرژەوەندیی سیاسیی و ئابوریی، کوردستانییبوونی کەرکوک و گەڕانەوەی بۆ سەر سنووری هەرێمی کوردستان لە ڕۆحی گەلی کورددا چێنراوە و بەشێک لە کەلتوری سیاسیی خەڵکی کوردستان پێکدەهێنێت. ئەگەر سەرکردەکانی کورد ویتسبێتیان خۆیان بە دڵسۆزی کورد و کێشە ڕەواکەی پیشانبدەن، لە بەرانبەر دوژمندا بەرخۆدان پیشانبدەن و لە ناو گەلی کورددا خۆیان شیرینبکەن، باسیان لە کەرکوک و کوردستانییبوونی کەرکوک کردووە. مەلا مستەفای بەرزانیی سەرۆکی پارتیی و ڕابەری شۆڕشی ئەیلول دەڵێت: کەرکوک دڵی کوردستانە. ئەمە واتای ئەوەیە کورد ناتوانێت بەبێ کەرکوک بژی. خەڵکی کوردستان ئەم وتەیەی بەرزانییان بەرزنرخاندووە.

مام جەلال سکرتێری یەکێتیی و ڕابەری شۆڕشی نوێ دەڵێت:

کەرکوک قودسی کوردستانە. ئەم قسەیەی مام جەلال ئەوە دەگەیەنێت کە کەرکوک شارێکی پیرۆزی کوردستانە. لە بۆنەی تردا چەندین جار مام جەلال گوتوویەتی: یان کەرکوک و خانەقین، یا هەتا ماوین دەجەنگین. کەوابوو مام جەلال بڕوای وایە دەبێت کەرکوک بگەڕێتەوە سەر سنووری هەرێمی کوردستان، ئەگینا شەڕی نێوان کورد و دەوڵەتی عێراق کۆتایینایەت. خەڵکی کوردستان ئەو ڕاوبۆچوونەی مام جەلالیشی بەرزنرخاندووە. هەر کوردێکی دڵسۆز بدوێنیت دەڵێت: ئێمە چەند ساڵە شەڕ بۆ ئازادکردنی کەرکوک دەکەین، دەیان هەزار شەهیدمان داوە و ٣٤٠٠ گوندی سەرسنوورمان ڕاگوێزراوە. ئەنفال و کیمیابارانکراوین. هەمووی لەپێناو گەڕانەوەی کەرکوکدا بووە. ساڵی ٢٠٠٤ لە گفتوگۆیەکی ئەنجومەنی حوکمی عێراقدا لەسەر کەرکوک، مام جەلال لە کۆبوونەوەیەکدا هەستایە سەرپێ و بەڵگەنامەیەکی سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیی پیشانی ئەندامانی کۆبوونەوەکە دا، لەو بەڵگەنامەیەدا کەرکوک بە شارێکی کوردستانی عێراق ناسراوە. بەهۆی ئەو هەڵوێستەی مام جەلالەوە لەسەر پشتگیرییکردنی کوردستانییبوونی کەرکوک، لە ناو جەماوەری کوردستاندا پێگەی مام جەلال زۆر بەرزبووەوە. دەزگای ڕاگەیاندنی یەکێتیی ئەو وێنەیەی مام جەلالی کۆپییکرد کە لە ئەنجومەنی حوکم بەڵگەنامەکەی بەرزکردەوە، لە نوسینگەکانی حیزبدا و لە شوێنە گشتییەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیدا هەڵیواسی*١.

یەکێتیی سودی لەو هەڵوێستەی مام جەلال وەرگرت، بۆ ماوەیەک لە ناو خەڵکی کوردستاندا پێگەی خۆی قایمکرد، ئەمە پیشانیدەدات کە کوردستانییبوونی کەرکوک بۆ نەتەوەی کورد ستراتیژە، هەر کەس و لایەنێک لەگەڵ کوردستانییبوونی کەرکوکدا بێت ئەو لایەنە لە لای خەڵکی کوردستان ڕێزدارە.

هەندێک جار گەلی کورد و دەسەڵاتدارانی کوردستان پێکەوە دەچنە سەنگەری کوردستانییبوونی کەرکوکەوە، هەمووی لەسەر کوردستانییبوونی کەرکوک و لەسەر گەڕانەوەی کەرکوک بۆ سەر سنووری هەرێمی کوردستان یەک بۆچوون و یەک هەڵوێستیان هەیە. لە مانگی ئۆکتۆبەری ٢٠٠٩دا لە پەرلەمانی عێراق مشتومڕێکی زۆر لەسەر یاسای هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق کرا، نوێنەرانی عەرەب و تورکمان و هەندێک کەسی تر دەترسان کە نوێنەری کورد لە شاری کەرکوک دەنگی زۆر بهێنن و کوردستانییبوونی کەرکوک بە شێوەیەکی دیموکراتیی و یاسایی بۆ ئەو لایەنانە بسەلمێنرێت، کە نکوڵیی لە کوردستانییبوونی دەکەن، بۆیە پێشنیازیانکرد کەرکوک بۆ چوار ناوچەی هەڵبژاردن دابەشبکرێت: ناوچەی عەرەب و ناوچەی کورد و ناوچەی تورکمان و مەسیحیی. ئەم پێشنیازە بۆ ئەوە بوو شاری کەرکوک بکەن بە چوار بەش و بڵێن چوار نەتەوەی تێدا دەژی و تەنها نەتەوەی کوردی تێدا نییە و کورستانییبوونی کەرکوک بسڕنەوە، بەڵام لایەنە کوردستانییەکانی ناو ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق بە لیستی کوردستانیی و لیستی یەکگرتووی ئیسلامییەوە، دژی ئەو پێشنیازە هەڵوێستیان پیشاندا و لە کۆبوونەوەی پەرلەمان کشانەوە و ئامادە نەبوون بەشداریی کۆبوونەوەکانی پەرلەمان بکەن. نەک ئەو پێشنیازە وەکو بەندێکی یاسای هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق دەنگی لەسەر بدرێت.

هەر لە هەمان کاتدا پەرلەمانی هەرێمی کوردبستان بە لیستی دەسەڵات و لیستی ئۆپۆزسیۆنەوە، بە هەموو دەنگەوە دژی ئەو پێشنیازەی کوتلەکانی پەرلەمانی عێراق وەستانەوە. گەلی کوردیش لە باشوور و لە پارچەکانی تری کوردستاندا دژی ئەو جۆرە بۆچوونەن کە شاری کەرکوک بکرێتە چوار ناوچەی هەڵبژاردن بۆ چوار پێکهاتەی نەتەوەیی و ئاینیی. بەو شێوەیە بۆمان ئاشکرادەبێت کە پرۆژەی ستراتیژی نەتەوەیی کورد، کوردستانییبوونی شاری کەرکوکە.

## ٢- هەڵوێستی دەسەڵاتی کوردیی

ئەگەرچی دەسەڵاتدارانی کورد بە قسە لەسەر کوردستانیبوونی کەرکوک کەمیان نەگوتووە، بەڵام بۆ گێڕانەوەی کەرکوک بۆ سەر سنووری هەرێم، نەک هیچیان نەکردووە، ئاستەنگیی جدییان دروستکردووە، قسە هەزارە و دوانی بە کارەیش نەبوون. لە سەردەمی خەباتی چەکدارییدا، سەرکردەکانی کورد بەردەوام باسیان لە ڕزگاکردنی کەرکوک دەکرد، بە دروشمی کەرکوک دڵ و قودسی کوردستانە، خەڵکی کوردستانیان بە کوردستانیبوونی کەرکوک جۆشدەدا، خەڵکی کوردستانیان بۆ خەباتی چەکداریی هاندەدا، لەژێر کاریگەریی ئەو دروشمەدا گەلی کورد هەزاران شەهیدی دا. گفتوگۆی ١١ی ئازار لە ساڵانی ١٩٧٠ - ١٩٧٤ی نێوان حکومەتی بەعس و شۆڕشی ئەیلول، لەسەر کوردستانیبوونی کەرکوک تێکچوو. حکومەتی عێراق ڕازینەبوو پارێزگای کەرکوک لەسەر سنووری ناوچەی حوکمی زاتیی بێت، بەو هۆیەوە ساڵی ١٩٧٤ - ١٩٧٥ شەڕ لە نێوان کورد و حکومەتی بەعس دەستپێکردەوە.

لە ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١دا، جەماوەری ڕاپەڕیو و هێزی پێشمەرگەی کوردستان شاری کەرکوکیان ئازادکرد. ڕۆژی ٢١/ ٣/ ١٩٩١ کردە ڕۆژی ئازادکردنی کەرکوک، بەڵام پاش چەند ڕۆژێک لە ئازادکردنی کەرکوک، سوپای عێراق خۆی کۆکردەوە و هێزە نێودەوڵەتییەکان گڵۆپی سەوزیان بۆ سوپاکەی عێراق هەڵکرد، پاش چەند ڕۆژێک کەرکوک لە لایەن سوپای عێراقەوە داگیرکرایەوە.

پاش هەڵبژاردنی پەرلەمان و پێکهێنانی حکومەتی هەرێم، پەرلەمانی کوردستان لە ٤/ ١٠/ ٢٠٠٤دا، بە ئامادەبوونی نوێنەری ئۆپۆزسیۆنی عێراق (ئەحمەد چەلەبیی و هاوڕێکانی) بڕیاریدا سیستەمی ئایندەی عێراق سیستەمێکی فیدراڵیی بێت. هەرێمی کوردستان لە عێراقدا، هەرێمیکی فیدراڵیی بێت. لە سیاغی بڕیارەکەدا باس لە سنووری هەرێمی کوردستانی فیدراڵ و کەرکوک و ناوچە دابڕاوەکان نەکرا. ئاماژە بەوە نەکرا کە ئەو هەرێمە فیدراڵە کەرکوکیش دەگرێتەوە*٢.

مێژوو پیشانیداوە لە پێش دروستبوونی شەڕە گەورەکانەوە، لایەنە هاوپەیمانەکان لە نێوان خۆیاندا لەسەر ئەنجامی شەڕەکە ڕێکدەکەون، بۆ ئەوەی لە دوای شەڕ و لە کاتی سەرکەوتندا مافی هەموو پێکهاتە شەڕکەرەکان بپارێزرێت، هیچ لایەک زیانی بەرنەکەوێت. هەتا ئێستا بەڵگەیەک دەستنەکەوتووە بیسەلمێنێت پێش ڕوخانی ڕژێمی

سەدام، بەرپرسانی حکومەتی هەرێم و لایەنە سیاسییەکانی تری کوردستان، لەسەر کوردستانییبوونی کەرکوک و چارەسەری کێشەی کەرکوک، لەگەڵ هەر یەک لە ئۆپۆزسیۆنی عێراقیی و لەگەڵ وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکادا گفتوگۆیانکردبێت و ڕێککەوتن کرابێت.

لە کاتی ڕوخانی ڕژێمی سەدامدا، هێزی پێشمەرگەی حیزبەکانی کوردستان، هەر یەک لە لای خۆیەوە، بەبێ ئەوەی بەرنامەیەکی سەربازیی و سیاسەتێکی نەتەوەییان هەبێت، پەلاماری شاری کەرکوکیان دا و خستیانە ژێردەستی خۆیانەوە. هیچ بەڵگەیەک دەستناکەوێت بۆ ئازادکردنی کەرکوک هاوکاریی لە نێوان پێشمەرگاکانی پارتیی و یەکێتیی و حیزبەکانی تردا هەبووبێت. کاتێک پێشمەرگە کۆنترۆڵی شارەکەیان کرد، ئامانجی سیاسیی و نەتەوەیی لە پشتی کۆترۆڵکردنی شارەکەوە نەبینرا. هەر هێزەو لە لای خۆیەوە پەلاماری دامودەزگا حکومیی و حیزبییەکانی شاری کەرکوکی دا و تاڵانیکرد. دەست بەسەر ئەو بەڵگانەدا نەگیرا کە ڕژێمی بەعس تەعریبی کەرکوکی پێکردووە.

دوای تاڵانکردنی شاری کەرکوک، حیزبە دەسەڵاتدارەکانی هەرێم لە کەرکوک و شارە تازە ئازادکراوەکانی تردا، هەمان سیاسەتی حیزبایەتیی تەسکی هەرێمی کوردستانیان دوبارەکردەوە، کەرکوکیان لەژێر دەسەڵات و هەژموونی یەکێتیی و پارتییدا دابەشکرکرد. لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدامەوە هەتا ١٦ی ئۆکتۆبەری ٢٠١٧، کەرکوک لەژێر دەسەڵاتی کورددا بوو، پارێزگار کورد بوو، ئاسایش بە دەست کوردەوە بوو، بەڵام کاری جدیی بۆ خزمەتگوزاریی و ئاوەدانکردنەوەی کەرکوک نەکرا. دەسەڵاتی کوردی لەگەڵ پێکهاتەکانی تری کەرکوکدا دیموکرات نەبوو، ئەو سیاسەتە وای لە کورد و تورکمان و عەرەبی کەرکوک کرد، دەسەڵاتی کوردیی لەبەرچاوبکەوێت، حەزنەکەن کەرکوک بگەڕێتەوە سەر سنووری هەرێمی کوردستان، حەزبکەن کەرکوک وەکو پارێزگایەک هەر لەسەر عێراقی ناوەندیی بێت.

لە سەردەمی حوکمی یەک ساڵی پۆل بریمەری نوێنەری حکومەتی ئەمریکا لە عێراق، گفتوگۆیەکی جدیی لەسەر کوردستانییبوونی کەرکوک لە نێوان پۆل بریمەر و نوێنەرانی کورددا بەدیناکرێت. لە سەردەمی حوکمی کاتیی حکومەتی عێراقدا لە حوزیرانی ٢٠٠٤ هەتا ئۆکتۆبەری ٢٠٠٥ لە یاسای ئەو کاتەدا بڕگەی ٥٨ بۆ

چارەسەرکردنی کێشەی کەرکوک جێگیرکرا. پاش ئەوەی خەڵکی عێراق لە ئۆکتۆبەری ۲۰۰۵دا دەنگیان بە دەستووری عێراق دا، بڕگەی ٥٨ لە یاسای حوکمی کاتیی بووە مادەی ١٤٠ دەستووری عێراقی فیدراڵ. ئەو مادەیە لە سێ بەشی سەرەکیی پێکهاتووە:

١- ئاساییکردنەوەی بارودۆخی کەرکوک و ناوچە جێناکۆکەکانی تر.

٢- سەرژمێریی نوێ لە کەرکوک و لە ناوچە جێناکۆکەکانی تردا.

٣- دوای ئەوە ڕاپرسیی لە پارێزگای کەرکوک ئەنجامبدرێت، بۆ ئەوەی چارەنوسی کەرکوک لە چوارچێوەی عێراقی فیدراڵییدا دیاریبکرێت*٣.

لە مانگی نۆڤەمبەری ساڵی ۲۰۰٦دا ڕاپۆرتی بەیکەر هاملتۆن وەکو ستراتیژی نوێی حکومەتی ئەمریکا لە عێراق و ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئامادەکرا و پێشکەشی ڕای گشتیی کرا. لە ڕاپۆرتەکەدا کێشەی کەرکوک و جێبەجێیکردنی مادەی ١٤٠ دەستووری عێراق، وەکو تەقینەوەی بەرمیلی بەنزین و شەڕی سوتێنەری عێراق دەستنیشانکراوە. لە ڕاپۆرتەکەدا ئاستەنگیی جدیی بۆ جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ دروستکراوە*٤.

بەرانبەر بە ڕاپۆرتەکە گەلی کورد بە شێوازی مەدەنیی نارەزایی پیشاندا، بەڵام دەسەڵاتی کوردیی لە هەرێم و لە عێراق، بەرانبەر بە ڕاپۆرتەکە هەڵوێستی نەبوو، نارەزایی پیشانەدا و بێدەنگیی هەڵبژارد. کاتێک ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوک هەستیکرد ئاستەنگیی جدیی بۆ جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ دەستووری عێراق دروستدەکرێت، لە ناوەڕاستی ساڵی ۲۰۰۷دا بە زۆرینەی دەنگی ئەنجومەن، بڕیاردرا ئەگەر مادەی ١٤٠ لە کاتی خۆیدا جێبەجێ نەکرێت، بە بڕیاری ئەنجومەنی پارێزگا، کەرکوک بخرێتە سەر سنووری هەرێمی کوردستان. پێش کۆتاییهاتنی ساڵی ۲۰۰۷ بە چەند ڕۆژێک، کۆندیلیسا ڕایزی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا سەردانی کەرکوکی کرد و داوای لە ئەنجومەنی شاری کەرکوک و پەرلەمانی هەرێمی کوردستان و تەواوی خەڵکی کوردستان کرد، ئامادەکاریی بۆ دواخستنی جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ بکەن. بڕیارەکەی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوک هەڵبوەشێننەوە. بەرپرسەکانی کورد بە داواکەی کۆندیلیسا ڕایز ڕازیبوون و بڕیاری ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوک کارپێنەکرا. پەرلەمانی هەرێمی کوردستان بە دواخستنی جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ دەستووری عێراق ڕازیبوو.

پاش ماوەیەک کێشەی کەرکوک خرایە بەردەم نەتەوە یەکگرتووەکان. بەم شێوەیە بۆمان ڕوندەبێتەوە کە دەسەڵاتدارانی کورد دەربارەی کوردستانیبوونی کەرکوک و چارەسەرکردنی کێشەی کەرکوک، هەموو کاتێک لەگەڵ ڕاوبۆچوونی گەلی کورددا نەبوون. هەندێک جار لەگەڵ بۆچوونی گەلی کورددا بوون، هەندێک جار لەگەڵ بۆچوونی دەسەڵاتدارانی عێراق و هێزە ناوچەیی و نێودەوڵەتییەکاندا بوون. دژی هەڵوێستی گەلی کورد وەستاونەتەوە. دەسەڵاتداران کاتێک دەبینن کۆڵەکەی دەسەڵاتیان لەسەر ڕەزامەندیی جەماوەری کوردستان دادەتکوترێت، دەڵێن کەرکوک دڵ و قودسی کوردستانە. کاتێکیش پێویستیان بە پشتیوانیی عێراق و ناوچەکە و جیهان هەیە، لەگەڵ دواخستنی مادەی ١٤٠ دەستووری عێراقدان.

بە لای زۆرینەی خەڵکی کوردستانەوە، مادەی ١٤٠ چارەسەری کێشەی کەرکوک و ناوچە دابڕاوەکانی تر دەکات، بەڵام لە ڕاستییدا بڕگەکە کەموکووڕیی تێدایە، جێبەجێکردنی بە کاتێکی دیاریکراوە بەستراوەتەوە، لە پەرگرافی کۆتایی مادەی ١٤٠دا هاتووە: دەبێت ئەو بڕگەیە هەتا کۆتایی ساڵی ٢٠٠٧ جێبەجێبکرێت، لە کاتێکدا کە بڕگەکە لە کاتی خۆیدا جێبەجێنەکرێت، وەکو ئەوەی بینیمان. ناحەزانی بڕگەکە کار بە ڕەگەزی کات دەکەن، بۆ ئەوەی نرخی بڕگەکە نەمێنێت و پوچەڵبکرێتەوە. بۆیە کاتێک بڕگەکە هەتا کۆتایی ئەو ساڵە جێبەجێنەکرا و دواخرا، نوێنەرانی عەرەب و تورکمان لە عێراقدا کەوتنە پروپاگەندە بڵاوکردنەوە کە مادەی ١٤٠ نرخی دەستووریی نەماوە.

لە ڕاستییدا ئەو بڕگەیە هەتا ئەمڕۆیش بەردەوام کارییێدەکرێت. بەشی یەکەمی مادەی ١٤٠ بریتییە لە ئاساییکردنەوەی بارودۆخی کەرکو ک و کۆتاییهێنان بە بەعەرەبکردنی ئەو شارە. ڕۆژی ٢٦/ ١/ ٢٠٠٩ تەلەفزیۆنی کوردستان لە هەواڵێکدا ڕایگەیاندا کە لە ماوەی ٣٠ ساڵی دەسەڵاتی ڕژێمی ڕوخاودا ٩٧٠٠٠ هەزار خێزان لە شاری کەرکوک دەرکراون*٥.

هەر لە هەمان ڕۆژدا حەسەن تۆرانیی جێگری سەرۆکی حیزبی عەدالەی تورکمانیی لە بەرنامەیەکی تایبەتی کەناڵی تەلەفزیۆنی جزیرەوە ڕایگەیاند، بەگوێرەی مادەی ١٤٠ دەستوور هەتا ئێستا ٩٢ نەوەدو دوو هەزار خێزانی کۆچپێکراوی کوردی کەرکوک داوایانکردووە بگەڕێنەوە شاری کەرکوک، هەتا ئێستا کار بۆ گەڕانەوەی ٥٠ هەزار خێزان کراوە، ٤٢ هەزار خێزان چاوەڕوانن بەگوێرەی مادەی ١٤٠ بگەڕێنەوە بۆ شوێنی

خۆیان لە شاری کەرکوک. لە هەمان بەرنامەدا حەسەن توران ڕایگەیاند کە لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدامەوە هەتا ئێستا ١٠٠ هەزار عەرەبی هاوردە کە لە سەردەمی ڕژێمی سەدامدا لە شارەکانی خوارووی عێراقەوە بۆ بەعەرەبکردنی کەرکوک هێنرابوون، بەگوێرەی مادەی ١٤٠ کەرکوکیان بەجێهێشتووە و گەڕاونەتەوە شوێنەکانی جارانیان*٦.

ئەمە پیشانیدەدات کە مادەی ١٤٠ دەستووری عێراق هەتا ئێستایش کارییێدەکرێت، لە ئایندەیشدا چالاکتر دەبێتەوە و ئەگەری ئەوە هەیە جێبەجێبکرێت. بەو شێوەیە ڕوندەبێتەوە کە بەعەرەبکردنی کەرکوک و جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ بۆ ئاساییکردنەوەی بارودۆخی کەرکوک، واقیعێکی سیاسییە و ئەگەر بڕگەکە پوچەڵببێتەوە، کێشەی کەرکوک و ناوچە دابڕاوەکان چارەسەرناکرێت، ئەو کات چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە پێویستی بە بڕگەیەکی تری دەستووریی و ئیرادەی سیاسیی دیموکراتییتر دەبێت. لە هەڵبژاردنی ٧/ ٣/ ٢٠٠٧ی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقدا، حیزبە کوردییەکان بە لیستی جیاواز لە کەرکوک و ناوچە دابڕاوەکانی تری باشووری کوردستان بەشداریی هەڵبژاردنیانکرد. لە ئەنجامدا دەنگێکی زۆری کورد فەوتا و لیستی عێراقیی پێش لیستی کوردستانی کەوت. لیستەکانی گۆڕان و یەکگرتوو و کۆمەڵ، دەنگی پێویستیان نەهێنا. کورد نەیتوانی لە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقدا سەرکەوتن بەسەر نوێنەری پێکهاتەکانی تردا بەدەستبهێنێت. ئەگەر لایەنە کوردستانییەکان لە سنووری ناوچە دابڕاوەکانی کوردستاندا بە یەک لیست بەشداریی هەڵبژاردنیان بکردایە، ئەگەری زۆر ئەوە بوو کە نوێنەرانی کورد لە پارێزگای کەرکوک لە نوێنەری پێکهاتەکانی تری کەرکوک زۆرتر بایە. بەو شێوەیە بۆ دۆست و دوژمن دەسەلمێنرا، کە هەتا ئێستایش کەرکوک شارێکی کوردستانییە، بەڵام حیزبە سیاسییەکانی باشووری کوردستان لەبەر بەرژەوەندیی حیزبایەتیی و بۆ پیشاندانی هێزی جەماوەریی خۆیان، بە یەک لیست بەشداریی هەڵبژاردنیان نەکرد و کوردستانیبوونی کەرکوکیان فەرامۆشکرد. بەو شێوەیە دەتوانین بڵێین هێزەکانی باشووری کوردستان، بە دەسەڵاتدار و ئۆپۆزسیۆنەوە، هەڵوێستی نەتەوەییان کاڵبووەتەوە و گرنگیی بە کوردستانیبوونی کەرکوک نادەن. بە جدیی کار بۆ گەڕاندنەوەی کەرکوک و ناوچە دابڕێنراوەکانی تر ناکەن. دەسەڵاتدارانی باشووری کوردستان نایانەوێت مادەی ١٤٠ دەستووری عێراق جێبەجێبکرێت. ساڵی ٢٠٠٦ سەرۆکوەزیرانی عێراق ئیبراهیم جەعفەریی سەردانی هەرێمی کوردستانی کرد، لە شاری سلێمانیی لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەنوسییدا،

ڕۆژنامەنوسان دەربارەی چارەنوسی مادەی١٤٠ و کەرکوک پرسیاریان لێکرد و لە وەڵامدا ئیبراهیم جەعەفەریی گوتی:

بەرپرسانی کورد خۆیان مادەی١٤٠ دەستووری عێراق جێبەجێناکەن. هیچ کەس لە نوێنەرانی کورد لە عێراق لێداونەکەی جەعفەریی بەدرۆنەخستەوە*٧.

چەند ڕۆژێک پێش هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق ٧/ ٣/ ٢٠١٠ کەناڵی تەلەفزیۆنی العربیە، لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ نوری مالیکیی سەرۆکوەزیرانی عێراق، پرسیاری مادەی١٤٠ و کەرکوکی لێکرد، بۆچی جێبەجێکردنی ئەو بڕگەیە دواکەوتووە؟ لە وەڵامدا نوری مالکیی گوتی: ئەوەی ئەرکی ئێمە بووە وەکو ئەنجومەنی وەزیران، جێبەجێمانکردووە، ئەو کارانەی بۆ جێبەجێکردنی بڕگەکە ماوەتەوە، پەیوەندیی بە ئەنجومەنی سەرۆکایەتیی عێراقەوە هەیە*٨.

ئەمە لە کاتێکدایە کە سەرۆککۆماری عێراق جەلال تاڵەبانیی کوردە و لەو پۆستەدا نوێنەرایەتیی کورد دەکات. ئامانجی گەلی کورد ئەوەیە کە کەرکوک وەکو شارەکانی هەولێر و دهۆک و سلێمانیی ببێتە پارێزگایەکی هەرێمی کوردستان، بەڵام دەسەڵاتدارانی ئەمڕۆی کوردستان لەبەرئەوەی لەژێر گوشاری دەسەڵاتدارانی عێراق و ئەمریکا و وڵاتانی ناوچەکەدان، لە لایەکەوە زۆر بە تەنگی جێبەجێکردنی مادەی١٤٠ نایەن، لە لایەکی ترەوە جارجار باس لەوە دەکەن کە باشترە کەرکوک بۆ ماوەیەک وەکو هەرێمێکی سەربەخۆی فیدراڵ هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکرێت. ئەم هەڵوێستە نوێیەی دەسەڵاتدارانی کورد کە بە پاشەکشەی دەسەڵاتی کوردیی لەسەر کوردستانیبوونی کەرکوک ناوزەددەکرێت، بۆ یەکەم جار لە کۆبوونەوەی ساڵانەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا لە نیۆیۆرک ساڵی ٢٠٠٨ لە لایەن مام جەلال تاڵەبانیی سەرۆککۆماری عێراقەوە خرایەڕوو، بەڵام مەسعود بەرزانیی سەرۆکی هەرێمی کوردستان دژی ئەو بیرۆکەیەی مام جەلال هەڵوێستی پیشاننەدا. مالکی سەرۆکوەزیرانی عێراق بە بیرۆکەکەی تاڵەبانیی ڕازیبوو. کاتێک ڕەجەب تەیب ئەردۆغانی سەرۆکوەزیرانی تورکیا سەردانی عێراقی کرد، ئەویش باسی لەوە کرد کە باشترە کەرکوک وەکو هەرێمێکی فیدراڵیی سەربەخۆ لە چوارچێوەی عێراقدا بێت. ئەمەیش پیشانیدەدات کە بۆچوونی دەسەڵاتدارانی کورد لەگەڵ بۆچوونی گەلی کورددا نییە. پیشانیدەدات کە دەسەڵاتدارانی باشووری کوردستان سەبارەت بە

کێشەی کەرکوک و ناوچە دابڕاوەکانی تری کوردستان، لەگەڵ هەڵوێستی تورکیا و عێراقدان. دەسەڵاتدارانی هەرێم ڕازی نین قەزاکانی چەمچەماڵ و کەلار و کفریی و شارۆچکەکانی تر بگەڕێنەوە سەر پارێزگای کەرکوک. نوێنەرانی کورد لە پەرلەمانی عێراق کارناکەن بۆ ئەوەی ئەو بڕیار و یاسایانە هەڵبوەشێننەوە کە لە سەردەمی ڕژێمی بەعسدا بۆ بەعەرەبکردن و بۆ بچووککردنەوەی پارێزگای کەرکوک دەرچوون.

بە بۆچوونی چاودێرانی سیاسیی هۆکاری سەرەکیی بۆ کەمتەرخەمیی نوێنەرانی کورد لە عێراقدا سەبارەت بە جێبەجێکردنی مادەی١٤٠ و گەڕاندنەوەی کەرکوک و ناوچەکانی تر بۆ سەر سنووری هەرێمی کوردستان ئەمانەی خوارەوەن:

* بەرژەوەندیی حیزبایەتیی تەسک، ژمارەیەک شار و شارۆچکەی سەر بە پارێزگای کەرکوک لەژێر دەسەڵاتی (ی. ن. ک) دان، بە گەڕاندنەوەی ئەو شار و شارۆچکانە بۆ سەر پارێزگای کەرکوک، یەکێتیی حوکمڕانیی ئەو شوێنانەی لەکیسدەچێت.

* تورکیا و ئێران و شۆڤینییەکانی عەرەب دژی جێبەجێکردنی مادەی١٤٠ دەستووری عێراق دەوەستنەوە.

* هەردوو حیزبی دەسەڵاتدار بازرگانیی بە کەرکوک و مادەی١٤٠وە دەکەن، لە ئاستی ناوخۆی کوردستاندا دەیانەوێت بەڵگەی مانەوە و پاراستنی دەسەڵاتیان ببەستنەوە بە کێشەی کەرکوکەوە، لەبەرئەوەی ئەو دوو حیزبە دەسەڵاتدارە هیچ پرۆژەیەکی سیاسییان نییە، ناتوانن لە ئایندەیشدا پرۆژە پێشکەشبکەن، دەیانەوێت پرسی کەرکوک بکەنە پرۆژەی خۆیان، ئەگەر زوو هەوڵی چارەسەرکردنی بدەن، ئەو کات پرۆژەیان نامێنێت، هەر هێزێکی سیاسییش پرۆژەی سیاسیی نەما، بەڵگەی مانەوەی نامێنێت، ئیتر بە درێژەکێشانی کێشەی کەرکوک تەمەنی دەسەڵاتی پارتیی و یەکێتیی درێژدەبێتەوە.

* لە ئاستی عێراق و ناوچەکەدا دەسەڵاتدارانی باشووری کوردستان کێشەی کەرکوک وەکو گوشارێک بۆ سەر دەسەڵاتدارانی عێراق و ناوچەکە بەکاردەهێنن، بۆ ئەوەی دەسکەوتی پێ دەستبخەن. ڕۆژی ٢٠/ ٩/ ٢٠١٠ مام جەلال تاڵەبانیی لێدوانێکی دەربارەی ئەگەری دووبارە_وەرگرتنی پۆستی سەرۆککۆماری عێراق دا، گوتی: لەوانەیە پۆستی سەرۆککۆماری عێراق بەر کورد نەکەوێت، ئێمە لەوانەیە واز لەو پۆستە بهێنین، بەڵام قەت واز لە کەرکوک ناهێنین*٩. گرێدانی کەرکوک بە

پۆستی سەرۆككۆمارەوە، بە واتای ئەوە دێت ئەگەر پۆستی سەرۆككۆماریمان بۆ دانەنێن، وەكو گوشار باس لە كوردستانیبوونی كەركوك دەكەین. دوای ئەوەی مام جەلال بە سەرۆككۆمار هەڵبژێردرا، چیتر باسی كەركوكی نەكرد.

* خاڵێكی تری گرنگ لەسەر مادەی ١٤٠ ئەوەیە، جێبەجێكردنی بەو واتایە نایەت كە كەركوك و ناوچەكانی تر لە سەداسەد دەگەڕێنەوە سەر سنووری هەرێمی كوردستان، پاش ئاساییكردنەوەی ڕەوشی كەركوك ڕاپرسیی لەسەر سێ پڕۆژە دەكرێت، پڕۆژەی كورد گەڕانەوەی كەركووك بۆ سەر هەرێمی كوردستان، پڕۆژەی ئەمریكا و هەندێك لە وڵاتانی ناوچەكە كەركوك هەرێمێكی فیدرڵیی سەربەخۆ بێت، پڕۆژەی عەرەب، كەركوك شارێكی عێراقیی بێت و گرێدراوی حكومەتی عێراقی ناوەندیی بێت. كێشەكە لێرەدایە كە هەندێك لە لایەنە سیاسییەكانی باشووری كوردستان لەگەڵ پڕۆژەی ئەمریكادان.

* لایەنێكی تری هەستیار كە ئەگەری گەڕانەوەی كەركوك بۆ سەر هەرێمی كوردستان لاوازدەكات، یەكگرتنی عەرەب و توركمانە دژی كورد لە كاتی ڕاپرسییدا. بەو شێوەیە لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدامەوە گەلی كورد بە مادەی ١٤٠سەرقاڵكراوە، هەموو ئامانجێكی گەلی كورد بە جێبەجێكردنی ئەو بڕگەیەوە گرێدراوە، بەڵام بە جێبەجێكردنی ئەو بڕگەیە، مەرج نییە كەركوك بگەڕێتەوە سەر سنووری هەرێمی كوردستان.

حیزبەكانی تری باشووری كوردستان لەسەر كەركوك و ناوچە دابڕاوەكانی تر، شوێن سیاسەتی پارتیی و یەكێتیی دەكەون و ئەوان چی بڵێن دەڵێن باشە، تەنها لایەنی باشووری كوردستان كە لەسەر بابەتی كێشەی كەركوك و ناوچە دابڕاوەكانی تری كوردستان بۆچوونی لە پارتیی و یەكێتیی جیاوازە و بە تێڕوانینێكی نەتەوەیی دیموكرات سەیری كێشەی كەركوك دەكات. پارتی چارەسەری دیموكراتی كوردستان (پ. چ. د. ك) كە لە ڕۆژی ١٠/ ١٠/ ٢٠٠٨دا لە شاری كەركوك بە ئامادەبوونی ٣٠٠ كەسایەتیی سیاسیی و ڕۆشنبیری كوردستانی كۆنفرانسێكی لەسەر كێشەی كەركوك بەست، لە كۆنفرانسەكەدا پڕۆژەیەكی چارەسەری پێشنیازكرد، ئەندامانی كۆنفرانسەكە دەنگیان لەسەر دا. گرنگترین خاڵی جەوهەری پڕۆژەكەی (پ. چ. د. ك) ئەوەیە كە لە ڕێگەی جێبەجێكردنی مادەی ١٤٠ و میكانیزمی ترەوە، كەركوك بگەڕێتەوە سەر

سنووری هەرێمی کوردستان. لەبەر تایبەتمەندێتیی دیاردەی فرەنەتەوەیی کەرکوک، لە ناو هەرێمی کوردستان کەرکوک ناوچەیەکی ئۆتۆنۆم بێت. بەڕێوەبردنی کاروباری ناوخۆیی و دەرەکیی کەرکوک لەسەر بنەمای سیستەمی کۆنفدراڵیی دیموکراتیی بێت*١٠.

### ٣- ١٦ی ئۆکتۆبەری ٢٠١٧

ڕۆژی ١٦/ ١٠/ ٢٠١٧ ڕۆژێکی ڕەشی تری مێژووی گەلی کوردە، ئەو ڕۆژەیە کە هێزە چەکدارەکانی عێراق، پەلاماری شاری کەرکوک و ناوچە دابڕاوەکانی تری کوردستانیان دا و لە ماوەیەکی کەمدا دەستیان بەسەردا گرتەوە و کۆتاییان بە حوکمڕانیی ١٥ ساڵی کورد، لە شاری کەرکوک و ناوچە دابڕاوەکانی تر هێنا.

لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام کەرکوک و خانەقین و شەنگاڵ و مەخمور و شارۆچکەکانی تری سنووری مادەی ١٤٠ دەستووری عێراق، لە لایەن دەسەڵاتدارانی کوردەوە کاروباری کارگێڕییان بەڕێوەدەبرا. هێزی پێشمەرگە و سوپای عێراق لە دەرەوەی شارەکانی سنوورەکە بوون، ساڵی ٢٠١٤ کە داعش هێرشی بۆ سەر سنوورەکە کرد، سوپای عێراق شکا، پێشمەرگە شەڕی داعشی کرد و لە زۆربەی شوێنەکاندا داعشی شکاند. پێشمەرگە دەستی بەسەر زۆربەی ناوچەکانی سنووری مادەی ١٤٠دا گرت. ئیتر کەرکوک و ناوچە دابڕاوەکانی تر لە ڕووی ئیداریی و سەربازییەوە لەژێر دەسەڵاتی کورددا بوون.

بەبێ ئاگاداریی و ڕەزامەندیی یەکێتیی، هێزێکی پێشمەرگەی سەر بە پارتیی، کۆنترۆڵی چاڵە نەوتەکانی بای حەسەنی کرد، وەزارەتی سامەن سروشتییەکانی هەرێم لە ڕێگەی کۆمپانیای (ڕۆزنەفت)ی ڕوسییەوە لەو چاڵە نەوتانەوە دەستی بە ناردنەدەرەوەی نەوت کرد، بەمەیش بەریتانیایان نیگەرانکرد، کە ساڵانێکی دوورودرێژە بیرە نەوتەکانی کەرکوک لە ژێردەستی کۆمپانیای (BP) بەریتانییدا بوون. دوای ئەوەی حەشدی شەعبیی دروستکرا و هێزە چەکدارەکانی عێراق خۆیانگرتەوە، حکومەتی عێراق داوایکرد هێزی پێشمەرگە بگەڕێتەوە شوێنی پێش هێرشەکانی داعش و ڕێگەبدات سوپای عێراق بگەڕێتەوە شوێنەکانی خۆی.

ئەم داوایەی حکومەتی عێراقی لە لایەن دەسەڵاتدارانی هەرێم و بەرپرسانی پێشمەرگەوە گوێی لێنەگیرا، پێشمەرگە شوێنەکانی سوپای عێراقی ڕادەستنەکردەوە. بەرپرس و کادرەکانی پارتیی لە چەندیین بۆنە و بەرنامەی تەلەفزیۆنییدا دەیانگوت، چیتر پێویستمان بە مادەی١٤٠ دەستووری عێراق نەماوە، ناوچە دابڕاوەکان لە ژێردەستی خۆماندایە.

لە بەهاری ٢٠١٧دا پارێزگاری کەرکوک بەبێ ئاگاداریی و ڕەزامەندیی دەوڵەتی عێراق، بەبێ ئاگاداریی و ڕەزامەندیی پێکهاتەکانی عەرەب و تورکمان و کلد و ئاشوریی، لەگەڵ ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوک، ئاڵای کوردستانی لەسەر دامودەزگاکانی پارێزگای کەرکوک هەڵدا. ئەو سیاسەتەی کورد لە کەرکوکدا دژی دەستووری عێراق بوو، دژی ڕێککەوتنی نێوان لایەنە سیاسییەکانی عێراق و هەرێمی کوردستان بوو، حکومەت و پەرلەمان و حیزبە عێراقەییەکان لە چەندیین بڕیار و هەڵوێستدا، دژی ئەو سیاسەتانە وەستانەوە و دەستیان بە هەڕەشە کرد. پەیوەندییەکانی نێوان پارێزگاری کەرکوک لەگەڵ حیزبەکەیدا (یەکێتیی) ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەرەو خراپیی دەچوو. پەیوەندییەکانی پاریزگار لەگەڵ پارتییدا ڕۆژ لە دوای ڕۆژ گەشەیدەکرد و بەرەو باشیی دەچوو. ئەم جۆرە پەیوەندییەی پارێزگار بەرپرسانی یەکێتیی نیگەراندەکرد، بۆ دەرفەتێک دەگەڕان تۆڵە لە پارێزگار بکەنەوە. ڕاپرسیی سەربەخۆیی هەرێمی کوردستان و ناوچە دابڕاوەکان بە کەرکوکیشەوە، ڕۆژی ٢٥/ ٩/ ٢٠١٧ ئەنجامدرا، ڕاپرسییەکە نەک هەر ڕقی شۆڤێنییەکانی عەرەبی بەرانبەر بە هەرێم و پاریزگاری کەرکوک ئەستوورتر دەکرد. وڵاتانی داگیرکەری کوردستان و ئەمریکا و بەریتانیایش هاتنە سەر خەت و دژی ڕاپرسیی هەڵوێستیان پیشاندا و تێکەڵی ململانێکە بوون.

ئەو هەنگاوانەی پیشمەرگە و پارتیی و پاریزگاری کەرکوک هاویشتیان، لەگەڵ سیاسەتی عێراق و ئەمریکادا ناکۆکبوون، ئەمریکییەکانیش داکۆکییان لە حکومەتی عێراقی فیدراڵیی دەکرد، ئیتر بەرەی عێراقیی لە کوردستان و عێراق و ناوچەکە و جیهاندا بەهێز دەبوو. ئەم هۆکارانە وایانکرد کە لە ناو دەسەڵاتادارانی هەرێم و عێراقدا لەسەر کەرکوک، دوو بەرەی دژبەیەک دروستببێت، پارتیی و پارێزگاری کەرکوک لە لایەکەوە، هەندێک لە بەرپرسەکانی یەکێتیی و حکومەتی عێراق و دۆستەکانی لە لایەکی ترەوە، بەرانبەر بە یەکتر وەستانەوە.

## شەڕ دەستپێدەکات:

سوپای عێراق و ئەمریکا ئاگاداری هێزی پێشمەرگە دەکەن کە دەبێت سەربازگەی K۱ و هەندێک پێگەی تر چۆڵبکەن، سوپای عێراق لەو شوێنانە جێگیربکرێت، لایەنی کوردیی ملی بۆ داواکارییەکانی عێراق نەدا.

ڕۆژی ١٥/ ١٠/ ٢٠١٧ لە هاوینەهەواری دوکان، سەرکردایەتیی پارتیی و یەکێتیی بە ئامادەبوونی دکتۆر فوئاد مەعسوم سەرۆککۆماری عێراق کۆبوونەوەیەک دەکەن، لەو کۆبوونەوەیەدا باسی جێبەجێکردنی داواکارییەکانی عێراق و پاشەکشەی هێزی پێشمەرگە دەکرێت. پارتیی و یەکێتیی هەریەکەو بە جۆرێکی ناکۆک لە یەکتر باسی بڕیارەکانی ئەو کۆبوونەوەیە دەکات.ڕۆژی ١٦/ ١٠/ ٢٠١٧ هێزە چەکدارەکانی سوپای عێراق و حەشدی شەعبیی، لە دەوروبەری کەرکوک و ناوچەکانی تر، پەلاماری سەنگەرەکانی هێزی پێشمەرگە دەدەن، پەلامارەکە ڕووبەڕووی هێزی پێشمەرگەی یەکێتیی بووەوە، بەشێک لە هێزەکەی یەکێتیی بەرگرییدەکەن، بەشێکی تری هێزەکە بەرگریی نەکرد و ڕێگەی لە سوپا و حەشدی شەعبیی نەگرت، هێزەکانی سوپای عێراق پشتی ئەو هێزەی یەکێتیی دەگرن کە بەرگرییان لە شاری کەرکوک دەکرد. هێزە شەڕکەرەکەی یەکێتیی بە چەندیین شەهید و بریندار ئابلۆقەی هێزەکانی عێراقی دەشکێنێت و پاشەکشەدەکات، هێزی پێشمەرگەی پارتیی بەشداریی شەڕی کەرکوکی نەکرد.

چەند فەرماندەیەکی هێزە چەکدارەکانی عێراق کە لە گرتنەوەی شاری کەرکوکدا بەشدارییانکرد کورد بوون، فەرماندەی هێزی ئالتونیی دژەتیرۆری عێراق کورد بوو، فەرماندەی لیوایەکی حەشدی شەعبیی کورد بوو. هەر ئەو ڕۆژە حکومەتی عێراق دەستی بەسەر کەرکوک و خانەقین و مەخمور و ناوچە دابڕاوەکانی تردا گرتەوە، هێزی پێشمەرگەی هەرێم و بەرپرسانی کوردی کەرکوک بەرەو هەولێر و سلێمانیی گەڕانەوە. پارێزگاری کەرکوک لەگەڵ ئەوەیشدا ئەندامی مەکتەبی سیاسیی یەکێتیی بوو، بەرەو هەولێر ڕۆیشت.

## دوای شەڕەکە:

حکومەتی عێراق بە ئیمزای سەرۆککۆمار فوئاد مەعسوم، لە شوێنی پارێزگارە کوردەکە، ڕاکان جبوریی جێگری پارێزگاری کەرکوکی بە ڕەچەڵەک عەرەبی وەکو پارێزگاری کەرکوک دیاریکرد.

دادگای عێراق بڕیاری دەستگیرکردنی بۆ کۆسرەت ڕەسوڵی جێگری سەرۆکی هەرێم و جێگری سکرتێری یەکێتیی دەرکرد، لەبەرئەوەی لە شەڕی دەستبەسەرداگرتنەوەی کەرکوکدا بەرگرییکردووە. هێرشی هێزە چەکدارەکانی عێراق بەرەو هەولێر کشا، ئەگەرچی زۆر کەس لە دژە پارتییەکانی یەکێتیی و دەرەوەی یەکێتیی حەزیاندەکرد عێراق هەولێریش داگیربکاتەوە، بەڵام گەڕانەوەی سوپای عێراق و دەسەڵاتی عێراقی ناوەندیی بە دەستی عێراق نەبوو، بە دەستی ئەمریکا بوو. ئەمریکا بەگوێرەی بڕیاری ٦٨٨ی ئەنجومەنی ئاسایشی ١٩٩١ لەگەڵ هەولێردا دەجوڵایەوە، کە دەبێت هەولێر لە هێرشی سوپای عێراق پارێزراوبێت.

لە هەمان کاتدا هێزی پێشمەرگەی پارتیی دژی هێرشەکانی سوپای عێراق و حەشدی شەعبیی شەڕیدەکرد، لە پردێی نێوان هەولێر و کەرکوک پێشمەرگە پێشڕەویی هێزە چەکدارەکانی سوپای عێراقی ڕاگرت، بە چەکی میلان دەبابەیەکیان تێکشکاند، لە سحێلانیش پێشمەرگەکانی پارتیی بەرانبەر بە هێزە چەکدارەکانی عێراق وەستانەوە و هێرشەکەی سوپای عێراقیان ڕاگرت. بەو شێوەیە هەڵوێستی ئەمریکییەکان و شەڕی پێشمەرگە هەولێر و دەوروبەریان لە گەڕانەوەی سوپای عێراق و دەسەڵاتی ناوەندیی پاراست. دوای ئەو شەڕە حکومەتی ناوەندیی دەستی بەسەر کەرکوک و ناوچە دابڕاوەکاندا گرتەوە، هەریەک لە پارتیی و یەکێتیی دەستیان بە تاوانبارکردنی یەکتر کرد. پارتیی ناوی خیانەتکارانی ١٦ی ئۆکتۆبەری بەسەر ئەو کوڕ و برازایانەی مام جەلالدا سەپاند، کە لە شەڕی دەستبەسەرداگرتنەوەی کەرکوکدا هاوکاریی سوپای عێراقیان کرد.

یەکێتیی گوێی خەڵکی کوردستانی بەوە پڕدەکرد کە گەڕانەوەی عێراق بۆ کەرکوک بەهۆی ڕیفراندۆمەکەی بەرزانییەوە بوو، یەکێتیی دەیگوت ئەگەر یەکێتیی لە کەرکوک شەڕی بکردایە، خەڵکی کەرکوک کومەڵکوژ دەکرا. یەکێتیی دەیگوت ژیانی خەڵکی کەرکوکمان لە ئاڵای کوردستان بە لاوە گرنگتر بووە. دوای ئەوەی پارتیی و پارێزگارە کوردەکەی سەر بە یەکێتیی لە کەرکوک دەرکران، یەکێتیی دەستی بە هەوڵدان کرد هەتا پارێزگارێکی کوردی سەر بە خۆی لە شوێنی ڕاکان جبوریی دابنێت، بەڵام لەبەرئەوەی زۆرینەی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوک لەژێر کاریگەریی سیاسەتی پارتییدا بوون، هەوڵەکانی یەکێتیی شکستیانهێنا.

وا نزیکەی چوار ساڵە کەرکوک بە دەستی حکومەتی فیدراڵییەوەیە، یەکێتیی ئەمیشی چوو، ئەویشی چوو.

## ئەنجامەکان:

دوای گەڕانەوەی سوپا و دەسەڵاتی عێراقی فیدراڵیی بۆ کەرکوک و ناوچە دابڕاوەکان، چەند ڕاستییەکی تاڵ بەرانبەر گەلی کورد ڕاستدەبنەوە:

١- لە ماوەی کەمتر لە ٢٤ سەعاتدا هێزە چەکدارەکانی عێراق دەستیان بەسەر نیوەی خاکی باشووری کوردستاندا گرتەوە. هێزی پێشمەرگەی لە ناوچە دابڕاوەکان ڕامالّی. دەسەڵاتی کوردیی لەو سنوورەدا کۆتاییپێهات. ئەمە ڕۆژێکی ڕەشی مێژووی گەلی کوردە کە بەهۆی هەڵە و نابەرپرسیارێتیی دەسەڵاتدارانی باشووری کوردستانەوە توشی گەلی کورد بوو.

٢- کارەساتی شازدەی ئۆکتۆبەر پیشانیدا، پارتیی و یەکێتیی حیزبی نەتەوەیی نین، بەرنامەی نەتەوەییان نییە، لەپێناو یەکترخستندا ئامادەن خاکی کوردستان ڕادەستبکەن و بیفرۆش، سوپای وڵاتان بهێننە سەر خاکی کوردستان وەکو لە ڕابردوودا کردوویانە.

١٦ی ئۆکتۆبەر پیشانیدا زەمەن کاری لە هزری سیاسیی پارتیی و یەکێتیی نەکردووە، ڕەخنە و نارەزایی خەڵکی کوردستان، ئامۆژگاریی و ڕێنمایی دۆستانی کورد، کاری لەسەر بڕیاری دەمارگیرانەی خێڵەکیی و حیزبیی ئەو دوو حیزبە نەکردووە. بۆ گەلی کورد دەرکەوت دوژمنی سەرەکیی ئەو دوو حیزبە داگیرکەری کوردستان نییە، هەریەک ئەوی تر بە دوژمنی سەرەکیی دەزانێت، هەریەک کار بۆ لەناوبردنی ئەوی تر دەکات، بە لایانەوە ئاساییە چەندین شەستوشەش و حەفتاوپێنج و ٣١ی ئاب و ١٦ی ئۆکتۆبەری تر تۆماربکەن.

٣- ١٦ی ئۆکتۆبەر پیشانیدا هێزی پێشەرگەی کوردستان جێی متمانە نییە، بەرگەی هێرشێکی چەند سەعاتیی هێزە چەکدارەکانی عێراقی نەگرت. بەرگرییان لە پێگەی سیاسیی و سەربازیی خۆیان نەکرد. ئەم ڕوداوە کوردی بەرانبەر بە پێشمەرگە دوچاری ڕەشبینیی کرد.

٤- ١٦ی ئۆکتۆبەر پیشانیدا هاوپەیمانیی نێودەوڵەتیی دژی داعش، لەگەڵ سیاسەتی دەسەڵاتی هەرێمی کوردستاندا نییە، پشتگیریی لە سیاسەتی حکومەتی

عێراق دەکات. ئەو هێزە ناوچەیی و جیهانییانەی بە دۆستی کورد دەژمێردران، لە ١٦ی ئۆکتۆبەردا هیچ هەڵوێستیان پیشاننەدا، دیسان کورد بەرانبەر بە دۆستەکانی ڕەشبینیی دایگرت، دەرکەوت دەسەڵاتی کوردیی لە ڕووی دیبلۆماسییەوە زۆر کەمتەرخەم و بێکاریگەرە.

**جیاوازیی ٣١ی ئاب و ١٦ی ئۆکتۆبەر:**

ئەوەی یەکێتیی لە ١٦ی ئۆکتۆبەری ٢٠١٧دا کردی، لە شێوەدا لە ٣١ی ئابی ١٩٩٦ پارتیی دەچوو، بەڵام لە ناوەڕۆک و ئەنجامدا ئەو دوو ڕوداوە جیاوازییان هەیە.

١- لە ٣١ی ئابدا یەکێتیی تەنگی بە پارتیی هەڵچنیبوو، دەیویست بە هاوکاریی سوپای پاسدارانی ئێران پشتی پارتیی بگرێت و لە حەوزەی شەقڵاوە و حەریردا بیخنکێنێت.

پارتیی داوای هاوکاریی سەربازیی لە حکومەتی عێراق کرد، ئەو حکومەتەی ئەنفال و کیمیابارانی دژی گەلی کورد ئەنجامدابوو.

لە ١٦ی ئۆکتۆبەردا پارتیی و هەندێک لە بەرپرسانی یەکێتیی، تەنگیان بە باڵی بنەماڵەی مام جەلال و عێراقییەکان هەڵچنیبوو، یەکێتیی داوای هاوکاریی لە هێزە چەکدارەکانی حکومەتی عێراق کرد، بۆ ئەوەی پارتیی لە کەرکوک دەرپەڕێنێت، هێزی چەکداریی ئەو حکومەتەی کۆنترۆڵی کەرکوکی کرد، هێزی ئەو حکومەتە بوو کە ڕژێمی ئەنفالی ڕوخاند. ئەو حکومەتە یەکێتیی و پارتیی و حیزبە عێراقییەکانی دوای سەدام پێکیانهێنا، سەرۆکی عێراقی فیدراڵ کورد بوو، جێگری سەرۆکی پەرلەمان کورد بوو، چەندین وەزیری کورد لەو حکومەتەی عێراقدا پۆستیان هەبوو. چەندین فەرماندەی سوپای عێراق و حەشدی شەعبیی کە بەشداریی هێرشەکەیانکرد کورد بوون.

٢- ٣١ی ئاب دژی بڕیاری ٦٨٨ی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان بوو کە بۆ پاراستنی گەلی کورد دەرکرابوو، دژی سیاسەتی ئەمریکا و هاوپەیمانە نێودەوڵەتییەکان بوو کە دوژمنی ڕژێمی سەدام بوون. ١٦ی ئۆکتۆبەر دژی دەستووری عێراق و بڕیاری ٦٨٨ نەبوو، دژی سیاسەتی ئەمریکا و هاوپەیمانی دژی

داعش نەبوو، ئەمریکا گڵۆپی سەوزی بۆ سوپای عێراق و حەشدی شەعبیی هەڵکرد هەتا دەست بەسەر سنووری مادەی ١٤٠ دەستووری عێراقدا بگرنەوە.

٣- لە ٣١ی ئابدا سوپای عێراق بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک لە هەولێر مایەوە، دوای ئەوە چۆڵیکرد و ڕادەستی پارتیی کرد، یەکێتیی لە هەولێر پاشەکشەیکرد و پارتیی کۆنترۆڵی هەولێری کردەوە.

یەکێتیی لە هەولێر دەرکرا و دەسەڵاتی لەو دەڤەرە نەما. لەو کاتەوە پارتیی دەستی بەسەر هەولێردا گرتووەتەوە. لە ١٦ی ئۆکتۆبەردا پارتی و یەکێتیی لە کەرکوک دەرکران، سوپای عێراق لە کەرکوک مایەوە، حکومەتی عێراقی فیدراڵیی دەستی بەسەر کەرکوکدا گرتەوە، حکومەتی عێراق کەرکوکی ڕادەستی یەکێتی نەکردەوە، یەکێتیی کەرکوکی لەدەستچوو.

٤- لە ڕووی ئەنجامەوە ٣١ی ئاب و ١٦ی ئۆکتۆبەر بۆ یەکێتیی وەکو یەک بوون، لەبەرئەوەی لە هەردوو پرۆسەکەدا یەکێتیی هەولێر و کەرکوکی لەدەستچوو، بەڵام پارتیی لە هەردوو شەڕەکەدا وەکو حیزب قازانجیکرد، هەولێری دەستکەوتەوە، ڕکابەرەکەیشی لە کەرکوک دەرکرا.

٥- دوای ٣١ی ئاب مەسعود بەرزانیی سەرۆکی پارتیی، لە کۆبوونەوەیەکی پەرلەماندا بەرپرسارێتیی بانگکردنی سوپای عێراقی لەئەستۆگرت، هۆکاری ئەو هەنگاوەی ڕونکردەوە. دوای ١٦ی ئۆکتۆبەر هەندێک لە بەرپرسانی یەکێتیی دەڵێن ئەگەر لەگەڵ سوپای عێراق و حەشدی شەعبییدا شەڕمان بکردایە، خەڵکی کەرکوک زیانێکی گەورەی دەکرد و کۆمەڵکوژ دەکرا.

٣١ی ئاب و ١٦ی ئۆکتۆبەر، دوو هەڵەی ستراتیژیی بوون، دژی گەلی کورد و پیرۆزییەکانی ئەنجامدران. دەسەڵات و گەلی کوردیان لە بەرچاوی گەلان و دەسەڵاتدارانی جیهان سوککرد. لاپەڕەیەکی ڕەشی مێژووی گەلی کورد پێکدەهێنن. لە هەردوو ڕوداوەکەدا پارتیی و یەکێتیی تاوانبارن. جۆرە سیاسەتێکە کە لەپێناو بەرژەوەندیی حیزب و بنەماڵەدا، دەستکەوت و خاکی کوردستان هەڕاجدەکرێت.

### ٤- هەڵوێستی عێراق لەسەر کەرکوک

**پێش ڕژێمی سەدام:**

لە جەنگی یەکەمی جیهانییدا، عێراق لە دەوڵەتی عوسمانیی جیاکرایەوە، بەریتانیا دەوڵەتی عێراقی دامەزراند، هەتا ساڵی ١٩٥٨ بە شێوەی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ بەریتانیا حوکمی عێراقی دەکرد.

لەو سەردەمەدا سیاسەتی نەتەوەیی عەرەب سەرەتایی بوو، بە قۆناغی نەتەوەپەرستیی نەگەیشتبوو، بەشی بەعەرەبکردنی کەرکوک و کوردستانی نەدەکرد.

سیاسەتی بەریتانیایش ڕێگەی بە گۆڕینی دیمۆگرافیی عێراق نەدەدا، دوای ئەوەی عێراق سەربەخۆیی وەرگرت، هەستی نەتەوەپەرستیی دەسەڵاتدارانی عێراق گەشەیکرد. لە ساڵی١٩٦٣ سیاسەتی شۆڤینیی دژی گەلی باشووری کوردستان دەستپێکرد.

**ڕژێمی سەدام:**

سیاسەتی حیزبی بەعس لە عێراقدا پێشکەوت، لە ڕێگەی کودەتای ١٧/ ٣٠ تەمووزی ساڵی ١٩٦٨وە دەستی بەسەر حوکمی عێراقدا گرت، ئەو دەسەڵاتە شۆڤینییە هەتا ساڵی ٢٠٠٣ بەردەوامبوو، لەو قۆناغەدا سیاسەتی نەتەوەپەرستیی عەرەب دژی گەلی کورد بە شێوەیەکی ڕێکخراو جێبەجێکرا، سیاسەتی بەعەربکردنی کوردستان و تواندنەوەی نەتەوەیی و کەلتوری گەلی کورد دەستپێکرد، (تەعریب و تەرحیل و تەبعیس) واتە بەعەرەبکردن، ڕاگواستن و بەبەعسکردن، سێکۆچکەی سیاسەتی نەتەوەپەرستیی بەعس بوو کە دژی گەلی کورد ئەنجامیدەدا.

لەو سیاسەتە نەتەوەپەرستییەدا کەرکوک و ناوچە دابڕوەکانی تری باشووری کوردستان بەشی شێریان بەرکەوت. سەرەکییترین سیاسەتی نەتەوەپەرستانەی دەسەڵاتی عێراقی ناوەندیی لە ساڵانی ١٩٦٨ - ٢٠٠٣ ڕووبەڕووی شاری کەرکوک و خانەقین و ناوچە دابڕاوەکانی باشووری کوردستان بووەوە. دەیان هەزار کورد لە کەرکوک و ناوچە دابڕاوەکان ڕاگوێزران، لە شارەکانی سلێمانیی و هەولێر نیشتەجێکران. لە شوێنی کوردەکان عەرەبی لە شارەکانی تری عێراقەوە دەهێنا و لە شوێنی کورد نیشتەجێیدەکردن.

ڕژێمی بەعس لە ڕێگەی دەزگاکانی حکومەت و کادرە حیزبییەکانیەوە، هەوڵیدەدا ناسنامەی نەتەوەیی خەڵکی کوردی ناوچە دابڕاوەکان بگۆڕێت، ناسنامەی نەتەوەی عەرەبیان بەسەردا بسەپێنێت، بۆ ئەوەی زۆرینەی دانیشتوانی ئەو ناوچانە ببنە عەرەب و لە سەرژمێریدا دەرکەوێت کەرکوک و ناوچەکانی تری خاکی باشووری کوردستان بە گوێرەی ژمارەی زۆرینەی دانیشتوان پارچەیەکی خاکی عێراقی عەرەبیین.

سێکوچکەی سیاسەتی ڕاگواستن و بەعەرەبکردن و بەبەعسکردنی کوردستان، لە لایەن ڕژێمی بەعسەوە لە سەرتاسەری کوردستاندا پەیڕەودەکرا، بەڵام لە کەرکوک و ناوچە دابڕاوەکانی تردا بە شێوەیەکی چڕوپڕ دەستپێکردبوو، ئامانجی داڕشتن و جێبەجێکردنی ئەو سیاسەتە شۆڤێنییەی بەعس لە کەرکوک و دەوروبەریدا ئەوە بوو، کە بە زووترین کات ئەو ناوچانە لە هەرێمی کوردستان داببڕێت و بیکاتە بە شێک لە خاکی عێراقی عەربیی.

**دوای ڕژێمی سەدام:**

ئەو سیاسەتە شۆڤێنییەی ڕژێمی سەدام هەتا ساڵی ٢٠٠٣ درێژەیکێشا، لەگەڵ ڕوخانی ڕژێمی سەدامدا بۆ ماوەیەک بەرنامەی سیاسەتی بەعەربکردنی کەرکوک و ناوچەکانی تری کوردستان ڕاگیرا. هەوڵدرا سیاسەتی بەعەربەکردنی کوردستان و کاریگەرییەکانی لەسەر گەلی کورد بسڕدرێتەوە و کۆتاییپێبهێنرێت. بۆ ئەم مەبەستە بڕگەی ٥٨ی یاسای حوکمی کاتی عێراق و مادەی١٤٠ دەستووری هەمیشەیی عێراق جێگیرکران.

لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام پرسیارماندەکرد کە ئایا لە پاش ئەو هەموو شەڕە ناڕەوا و ماڵوێرانکەرانەی ڕژێمی سەدام لەگەڵ کورد و شیعە و ئێران و کوێت و هێزە جیهانییەکان لە ماوەی سیی ساڵی ڕابردوودا بەڕێیکردن، گۆڕانکاریی بەسەر هزری نەتەوەپەرستیی و چەمکی دیکتاتۆریی و فراونخوازیی تاک و پێکهاتەکانی گەلی عەرەبی عێراقدا دێت؟ لەبەرئەوەی ئەو جۆرە هزرە شۆڤێنییە هۆکاری دروستبوونی ئەو هەموو شەڕ و ماڵوێرانییانە بووە کە بەسەر گەلانی عێراق و گەلانی ناوچەکەدا هاتووە، هەتا عەرەبەکانی عێراق خۆیان ڕێکنەخستەوە و لە شۆکی ڕوخانی ڕژێمی سەدام ڕانەبوون، بۆمان دەرنەکەوت کە گۆڕاون، یان وەکو جاران ماونەتەوە.

پاش ئەوەی مادەی١٤٠ لە ناو دەستووری هەمیشەیی عێراقدا بە دەنگی گەلانی عێراق جێگیرکرا، عەرەبە نەتەوەپەرەستەکان بینییان جێبەجێکردنی ئەو بڕگەیە بە واتای هەڵوەشانەوەی سیاسەتی بەعەرەبکردنی کەرکوک دێت. ئەگەری ئەوە هەیە کە شاری کەرکوک و ناوچە دابڕاوەکانی کوردستان بچنە سەر سنووری هەرێمی کوردستان و هەرێم بەهێز ببێت، هەڵوێستەیانکرد و دەستیانکرد بە پیشاندانی نارەزایی بەرانبەر بە مادەی١٤٠ دەستووری عێراق، هەوڵیاندا ئاستەنگیی بۆ جێبەجێکردنی مادەی١٤٠ دەستووری عێراق دروستبکەن.

عەرەبە شۆڤینییەکانی عێراق کاریگەرییان لەسەر ڕاپۆرتی بەیکەر - هاملتۆنی ساڵی ٢٠٠٦ هەبوو، نێردەکانی ئەمریکا بۆ هەڵسەنگاندنی ڕەوشی عێراق (بەیکەر و هەملتۆن) بە پشتبەستن بە تێگەیشتنی کەسانی شۆڤینیی عێراقیی لە ڕاپۆرتە بە ناوبانگەکەی خۆیاندا داویان لە ئەمریکا کرد لەپێناو پاراستنی ئاشتیی عێراقدا، کار بۆ دواخستنی جێبەجێکردنی مـادەی١٤٠ی دەستووری عێراق بکات. ئەم کارەی عەربەکانی عێراق لە لایەن تورکمانەکان و وڵاتانی ناوچەکەوە پشتگیریی لێکرا. لەسەر پێشنیاز و داواکاریی ئەمریکا، ڕەزامەندیی دەسەڵاتدارانی کورد، جێبەجێکردنی مادەی١٤٠ دواخرا.

نوێنەرانی عەرەب لە پەرلەمانی عێراق، لە ٢٢ی تەمووزی ساڵی ٢٠٠٨دا، لە کاتی دەنگدان لەسەر یاسای هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگاکانی عێراق، بڕگەی ٢٣ لە یاسای هەڵبژاردنی پارێزگاکانی عێراقدا پێشنیازکرد، ئامانجی ئەو بڕگەیە ئەوە بوو دەنگی دەنگدەرانی شاری کەرکوک بەسەر کورد و عەرەب و تورکماندا بەشبکەن. ئەو سێ پێکهاتەیە وەکو یەک نوێنەریان لە ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوکدا هەبێت، هەریەک ٣٢ نوێنەر و مەسیحییەکانیش چوار نوێنەریان هەبێت، ئەم پێشنیازەی ئەندامانی ئەنجومەنی عێراق کە تورکمانیش پشتگیرییان لێکرد، بۆ ئەوە بوو لە ئایندەدا کار بە مادەی ١٤٠ نەکرێت، کەرکوک بەسەر چوار نەتەوەدا دابەشبکرێت و وەکو خاکی کوردستان نەمێنێتەوە.

لە ١٥/ ١٠ هەتا ٨/ ١١ی ٢٠٠٩ گفتوگۆی توند لە نێوان ئەندامان و لیستەکانی پەرلەماندا دەربـارەی یاسای هەڵبژاردنی ئایندەی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق دەستپێکرد و درێژەیکێشا. لایەنە عەرەب و تورکمانەکان دەیانەویست لە یاسای

هەڵبژاردنی پەرلەمانی ئایندەی عێراقدا هەڵبژاردنی کەرکوک ڕەوشێکی تایبەتی هەبێت، وەکو هەڵبژاردنی پارێزگاکانی تری عێراق نەبێت. دەیانەویست کەرکوک بەسەر چوار ناوچەی هەڵبژاردندا دابەشبکرێت و هەر نەتەوەیەک کۆتای بۆ دابنرێت بۆ ئەوەی عەرەب و کورد و تورکمانی کەرکوک لە پەرلەمانی عێراقدا نوێنەریان وەکو یەک بێت، لەو ڕێگەیەوە هەوڵبدرێت ناسنامەی کوردستانیی لە شاری کەرکوک بسەنرێتەوە.

خاڵێکی تری خراپ کە مەترسیی بۆ گەڕانەوەی کەرکوک و ناوچە دابڕاوەکانی تری کوردستان دروستدەکات، پێداچوونەوەیە بە دەستووری هەمیشەیی عێراقدا، شۆڤینیی و ناوەندگەراکانی عێراق هەوڵی لابردنی مادەی١٤٠ و سیستەمی فیدراڵیی عێراق لە دەستووری هەمیشەیی عێراقدا دەدەن. ئەمەیش مەترسییەکی گەورە بۆ سەر دەستکەوتی گەلی کورد دروستدەکات و ئەگەری پێکەوەژیانی ئاشتییانەی کورد و عەرەب دەخاتە مەترسییەوە. لە بەهاری ساڵی ٢٠١٧دا پارێزگاری کەرکوک و ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوک، بڕیاری هەڵکردنی ئاڵای کوردستانیان لەسەر دامودەزگاکانی پاریزگای کەرکوک دەرکرد، شانبەشانی ئاڵای عێراق، ئاڵای هەرێمی کوردستانیشیان لەسەر نوسینگەی دەزگاکانی پاریزگاکە هەڵکرد. عەرەب و تورکمانی ئەنجومەنی پاریزگای کەرکوک دژی بڕیارەکە وەستانەوە و دەنگیان پێنەدا. حکومەتی عێراقی ناوەندیی دژی بڕیارەکە وەستایەوە. ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق کۆبوونەوەیەکی تایبەتی لەسەر هەڵکردنی ئاڵاکە کرد، بڕیاریدا نابێت ئاڵای کوردستان لە کەرکوک هەڵبکرێت، دەبێت تەنها ئاڵای عێراق لەسەر نوسینگەی دامودەزگاکانی کەرکوک هەڵبکرێت. فراکسیۆنە کوردییەکانی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق، دژی ئەو بڕیارەی پەرلەمانی عێراق بوون، بایکۆتی دانیشتنەکەیان کرد.

ڕاپرسیی مافی هەر پێهاتەیەکی سیاسیی، کۆمەڵایەتیی، نەتەوەییە، جۆرێکە لە پرۆسەی دیموکراسیی ڕاستەوخۆ، ڕاپرسیی باشووری کوردستان لە ٢٥/ ٩/ ٢٠١٧ ئەنجامدرا، ناوچە دابڕاوەکانی کوردستانیشی گرتەوە. نزیکەی ٨٠٪ خەڵکی کوردستان دەنگیان بۆ سەربەخۆیی باشووری کوردستان دا.

دەوڵەتی عێراق بە پەرلەمان و حکومەت و دەسەڵاتی دادوەرییەوە، پەرچەکرداری نەتەوەپەرستیی نادەستووریی پیشاندا. ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق بەبێ ئامادەبوونی فراکسیۆنە کوردستانییەکان، چەندین بڕیاری نادەستووریی و شۆڤینیی دژی ڕاپرسیی

و ناوچە دابڕاوەکان و هەرێم دەرکرد، دەستی عەبادیی سەرۆکوەزیرانی ئاوەڵاکرد، بۆ ئەوەی بە هێزی چەکدار پەلاماری کەرکوک بدات، ئابلوقەی ئابوریی دژی هەرێم پەیڕەوبکات. هەرێم لە جیهان دابڕێت، داوای هەڵوەشانەوەی ئەنجامی ڕاپرسییبکات.

مانگێک بەسەر ڕاپرسییدا تێنەپەڕی، بە پێشێلکردنی بەندی ٩ی دەستووری عێراق کە نابێت سوپا بۆ لابەلاکردنەوەی ناکۆکییە ناوخۆییەکان بەکاربهێنرێت، هێزە چەکدارەکانی عێراق لە ١٦ی ئۆکتۆبەری ٢٠١٧دا پەلاماری کەرکوکیان دا و دەستیان بەسەردا گرتەوە، هێزی پێشمەرگە دەرکرا، دەسەڵاتی عێراقی بۆ سنووری مادەی١٤٠ گەڕایەوە، حوکمی کوردی لە کەرکوک و لە ناوچە دابڕێنراوەکان کۆتاییهات. ئەو ڕوداوانە هەڵوێستی نەتەوەپەرستیی دەسەڵاتدارانی عێراقی ئاشکراکرد، پێشانیدا گۆڕانکاریی دیموکراتیی بەسەریاندا نەهاتووە، مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد قبوڵناکەن، ئامادە نین مادەی١٤٠ دەستووری عێراق جێبجێبکەن، ئەگەر توانایان هەبێت ئەو کەمە مافەی لە سنووری هەرێمیشدا هەمانە لێماندەسێننەوە.

## ٥- هەڵوێستی وڵاتانی ناوچەکە

کەرکوک سامانێکی زۆری نەوت و غازی هەیە، شارێکی فرەنەتەوە و فرەئاین و ئاینزایە. ئەم دوو تایبەتمەندییەی کەرکوک جێگەی گرنگیپێدانی وڵاتانی ناوچەکە و جیهانە، دەرفەتی خۆتێهەڵقورتانی ئەو هێزانەی لە عێراقدا ئاسانکردووە.

هێزە عێراقیی و ناوچەیی و جیهانییەکان، هەوڵیانداوە فرەڕەنگیی کەرکوک نەهێڵن، هەریەکەو بەگوێرەی بەرژەوەندیی خۆی یەک ڕەنگی بکات، کە ئەوەیان بۆ ئەنجامنەدراوە، ڕێگەیان لە چارەسەری کێشەی کەرکوک گرتووە، بۆ ئەوەی کێشەی کەرکوک هەروا بمێنێتەوە و لەپەنای کێشەکەدا زیاتر دەستبخەنە ناو کاروباری کەرکوک و عێراقەوە، بۆیە بەرژەوەندییان لەگەڵ ئارامیی و جێگیریی سیاسیی کەرکوکدا نییە. چارسەرنەکردنی کێشەکە وایکردووە، هەر وڵاتە بە ناوی داکۆکییکردن لە دۆستەکانی، تورکیا داکۆکیی لە تورکمان دەکات، ئەوروپا داکۆکیی لە مەسیحیی دەکات، زیاتر دەستبخەنە ناو کاروباری ناوخۆیی کەرکوک و عێراق و هەرێمی کوردستانەوە. زیانی زیاتر بە ئاسایشی نیشتیمانیی و ئابوریی عێراق بگەیەنن. لەسەر حسابی گەلانی کەرکوک و عێراق بەرژەوەندییەکانی خۆیان بپارێزن.

## توركیا:

دەوڵەتی تورکیا خۆی بە میراتگری ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی دەزانێت، دەیەوێت دەوڵەتی عوسمانیی زیندووبکاتەوە، بەرنامەی هەیە نەک هەر کەرکوک، هەموو ویلایەتی موسڵ داگیربکاتەوە. ئەم خەیاڵەی تورکیا لەگەڵ سیاسەتی سەردەم ناگونجێت، کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیی ڕێگە بە داگیرکاریی لەو شیوەیە نادات.

عێراق بە تەنها یەک خاوەنی نییە، بێجگە لەوەی عێراق بە خەڵک و دەسەڵاتەوە دژی ئەو سیاسەتەی تورکیا دەوەستێتەوە، ئەو وڵاتانەیش کە سەدامیان ڕوخاند و عێراقی نوێیان پێکهێنایەوە، عێراق بە کوڕی خۆیان دەزانن، بەرانبەر بە سیاسەتی داگیرکاریی تورکیا بێدەنگنابن.

دەوڵەتی تورکیا ئابوریی لاوازە، بەردەوام هەوڵی بەهێزکردنی ئابوریی خۆی دەدات، کەرکوک شارێکی دەوڵەمەندە، بڕێکی زۆر نەوتی هەیە، تورکیا تەماعی لە نەوتەکەی کەرکوک کردووە، لەژێر سێبەری داکۆکیکردن لە تورکمانی کەرکوک، دەیەوێت نەوتی کەرکوکی دەستبکەوێت، یان بە گوشارە سیاسییەکانی وا لە حکومەتی خۆجێیی کەرکوک و حکومەتی عێراق بکات، بڕیک لە نەوتی کەرکوکی دەستبکەوێت و باری ئابوریی خۆی پێباشبکات.

یەکێک لە بنەماکانی سیاسەتی دەرەوەی دەوڵەتی تورکیا پاراستنی تورکمانەکانی عێراق و وڵاتانی ترە، لە شاری کەرکوک و لە ناوچە دابڕاوەکاندا تورکمان دەژین، تورکیا بە بەردەوامیی باس لەوە دەکات کە تورکمان زوڵمی لێدەکرێت، تورکیا لەسەر تورکمان دێتەوەڵام و دەیانپارێزێت. بۆیە ناو بە ناو لەژێر سێبەری پاراستنی تورکماندا، هەڕەشە لە هەرێمی کوردستان دەکات و داوای کەرکوک دەکات. بەو هەڕەشانە پشتیوانیی تورکمان و تورک، لە ناو تورکیا و لە دەرەوەی تورکیا بۆ خۆی بەدەستدەهێنێت.

نەتەوەپەرستیی و دژایەتیی کورد، هزری گەل و دەسەڵاتی تورکیای داگیرکردووە، تورکیا مافی گەلی کورد ناناسێت، ئەو دەستەکەوتانەی هەرێمی کوردستان کە دەستووری عێراق دانیپێداناون، تورکیا ئیعترافی پێناکات و بە هەرێمی کوردستان دەڵێت باکوری عێراق. ئەو کۆمپانیا و نوینەرایەتییانەی تورکیا لە هەرێمی کوردستاندان، زمانی کوردیی بە زمانێکی فەرمیی عێراق ناناسن و دانی پێدانانێن، بۆ ڕاپەڕاندنی

کارەکانیان زمانی تورکیی و عەرەبیی بەکاردەهێنن. تورکیا دەیەوێت دەستبخاتە ناو کاروباری کەرکوکەوە بۆ ئەوەی لەوێوە دەستکەوتەکانی گەلی کورد لەباربەرێت و کۆتاییپێبهێنێت.

بۆیە یەکێک لە سیاسەتە نەگۆڕەکانی دەوڵەتی تورکیا ئەوەیە کە بەردەوام هەوڵدەدات کەرکوک نەگەڕێتەوە سەر سنووری هەرێمی کوردستان و وەکو بەشێکی عێراقی عەرەبیی بمێنێتەوە، یان هەرێمێکی تایبەتی فیدراڵیی بێت، بۆ ئەوەی بە نەوتی کەرکوک ئابورییە لاوازەکەی بەهێزبکات، بۆ ئەوەی ڕێگە لە یەکگرتوویی خاکی کوردستان بگرێت، غەریزە شۆڤینییەکەی تێربکات و هەرێمی کوردستان بە لاوازیی بمێنێتەوە، تورکمانەکانی کەرکوک بە خۆیەوە گرێبدات و کەرکوک بە شارێکی تورکمانی بناسێت. تورکیا دژی جێبەجێکردنی مادەی١٤٠ دەستووری عێراقە، چەندیین جار دژی جێبەجێکردنی ئەو بڕگەیەی دەستووری عێراق هەڵوێستی پیشانداوە، لەسەر لایەنە پەیوەندییدارەکان گوشاری خۆی داناوە.

ساڵی ٢٠١٧ دەوڵەتی تورکیا دژی هەڵکردنی ئاڵای کوردستان لە کەرکوک نارەزایی پیشاندا و هەڕەشەیکرد، داوایکرد ئاڵای کوردستان لەسەر دامودەزگاکانی کەرکوک دابگرن. تورکیا یەکێک لەو وڵاتانە بوو دژی ڕاپرسیی باشووری کوردستان وەستایەوە، ئابلۆقەی ئابوریی و فڕۆکەوانیی بەسەر هەرێمی کوردستاندا سەپاند، داوای هەڵوەشاندنەوەی ڕاپرسیی کرد، داوای لە دەسەڵاتدارانی عێراق کرد سیستەمی فیدراڵیی عێراق هەڵبوەشێننەوە، بۆ ئەوەی ستاتۆی هەرێمی کوردستان کۆتاییپێبێت.

هەڵوێستی تورکیا لەسەر کەرکوک لە دەمی بەرپرسانی تورکمانی کەرکوکیشەوە دەبیسترێت، لە نۆڤەمبەری ٢٠٢١دا یەکێک لە بەرپرسەکانی بەرەی تورکمانیی دوای هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراق گوتی: کەمال ئەتاتورک پاراستنی کەرکوکی لە ئەستۆی ئێمە داناوە. بەرپرسێکی تریان گوتی: کەرکوک شارێکی تورکمانییە.

**ئێران:**

دەوڵەتی ئێران وەکو تورکیا ستراتیژی فراوانخوازیی هەیە، بەڵام وەکو تورکیا بە هاتوهاوار و هەڕەشە سیاسەت ناکات، ئێران دەیەوێت بە سیاسەتێکی نەرم و بە ئایدۆلۆژیای ئاینزایی شیعە، خۆی بکات بە هێزێکی گەورەی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و لەگەڵ زلهێزەکانی ناوچەکە و جیهان ململانێبکات.

له ڕابردوودا ئێران و عێراق، لەسەر ئاوی کەنداو و هێڵی بازرگانیی ئاویی، لەسەر سنووری نێودەڵەتیی کێشەیان هەبوو، چەندین جۆر ململانێ و پەیمان و شەڕی سنووردار بۆ چارەسەری ئەو کێشانە لە نێوان ئێران و عێراقدا دروستبووە.

دوای شۆڕشی کۆماری ئیسلامیی ئێرانی ١٩٧٩ کێشەی ئایدۆلۆژیی و سیاسییش لە نێوان ئێران و عێراقدا دروستبوو، عێراق شیعەکانی بەغدا و ناوچە هەستیارەکانی تری وەکو کەرکوکی لە عێراق دەرکرد، ئێران داکۆکیی لە شیعەی عێراق بە کەرکوکیشەوە دەکرد، قووڵبوونەوەی کێشەکان شەڕی ئێران و عێراقی لێکەوتەوە، کە ماوەی هەشت ساڵ (١٩٨٠ - ١٩٨٨) درێژەیکێشا.

لە سەردەمی حوکمڕانیی حیزبی بەعسدا، ئێران یەکێک لەو وڵاتانە بوو کە پشتگیریی ئۆپۆزسیۆنی شیعە و کوردی عێراقی دەکرد، دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام، شیعەی عێراق حوکمی جومگە سەرەکییەکانی عێراقی بەدەستەوەگرت. لەو کاتەوە ئێران عێراق بە منداڵی خۆی دەزانێت، دەستیبەسەردادەگرێت و دەیپارێزێت. ئەگەر هەوڵێک بۆ لاوازکردنی عێراق بدرێت، یان خاکی عێراق دابەشبکرێت، ئێران بە توندیی دژی دەوەستێتەوە. لە ڕووی ئایدۆلۆژییەوە چەندین حیزب و ڕێکخراوی سیاسیی و چەکداری عێراقی هەن، تەبەنی هێڵی ئایدۆلۆژیی و سیاسیی ئێران دەکەن، هێڵی سیاسیی و پێگەی سیاسیی ئێران لە ناو عێرقدا پێشدەخەن و دەیپارێزن.

دوای ڕاپرسیی باشووری کوردستانی ساڵی ٢٠١٧ بۆ سەربەخۆیی، ئێران هەستی بە مەترسیی لاوازبوون و بچووکردنەوەی عێراق دەکرد، لەپێناو سەرنەکەوتنی ڕاپرسییدا هەموو توانای خۆی بەکارهێنا. دۆستە کوردستانیی و عێراقیی و ناوچەییەکانی بۆ دەستبەسەرداگرتنەوەی کەرکوک و ناوچە دابڕاوەکانی باشووری کوردستان بەکارهێنا. بەگوێرەی زانیارییەکانی مەسعود بەرزانیی سەرۆکی هەرێمی ئەو کاتە، لە ١٦ی ئۆکتۆبەردا جەنەڕاڵێکی ئێرانیی بە ناوی ( ئیقبالپور) فەرماندەی هێزە چەکدارەکانی عێراقی بۆ گرتنەوەی کەرکوک دەکرد، لە شەڕی سحێلادا جەنەڕاڵیکی تری ئێرانیی (سەید موختار) فەرماندەی شەڕی حەشدی شەعبیی دژی هێزی پێشمەرگە کردووە و لەو شەڕەدا بریندار بووە *٨ بەگوێرەی یادەوەرییەکانی فوئاد مەعسومی سەرۆککۆماری عێراق، قاسم سلێمانیی بە فوئاد مەعسومی گوتووە: ئێران دژی ڕاپرسیی سەربەخۆیی کوردستانە.

ئێران یەکێک لەو وڵاتانەی ترە کە دژی گەڕانەوەی کەرکوک و ناوچە دابڕاوەکانی تری کوردستانە بۆ سەر هەرێمی کوردستان. لە ڕووی ئابورییەوە باسی پڕۆژەی ناردنەدەرەوەی نەوتی کەرکوک دەکرێت لە سنووری پارێزگای سلێمانییەوە بۆ ناو خاکی ئێران، ئەمەیش وادەکات کە لەمەودوا دەوڵەتی ئێران گرنگیی زۆرتر بە شاری کەرکوک و بەشەکانی تری باشووری کوردستان بدات، هەوڵبدات ئەو ناوچانە بە توندیی بە عێراقی ناوەندیی زۆرینە شیعەوە گرێبدات.

**ئەمریکا و ڕۆژئاواییەکان:**

بنەمایەکی بنەڕەتیی سیاسەتی ئەمریکا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، مافی کەمینە ئاینییەکان دەپارێزێت، بە تایبەت داکۆکیی لە مەسیحییەکانی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەکات. لە کەرکوک مەسیحیی دەژین، ئەمریکا و وڵاتە ڕۆژئاواییەکانی تر، بە ئەرکی ئاینیی و ئینسانیی خۆیانی دەزانن ماف و ژیانی مەسیحییەکانی کەرکوک بپارێزن، لە هەمان کاتدا بۆچوونی مەسیحییەکان لەسەر شێوازی حوکمی کەرکوک و عێراق و هەرێم وەردەگرن و کارپێیدەکەن. لە جەنگی یەکەمی جیهانییدا ئەمریکا و ڕۆژئاواییەکان ڕەخنەی زۆریان لە هەڵوێستی کورد هەبووە، لەبەرئەوەی کورد بە شێوەیەکی دیموکراتیی لەگەڵ مەسیحییەکاندا نەجوڵاوەتەوە، ڕوداوەکانی کەرکوک ساڵی ١٩٥٩ گاورباخیی یەکێکی تری ئەو ڕوداوە تراژیدییانەیە کە گومان و دڵەڕاوکێی لای مەسیحییەکانی کەرکوک و وڵاتە مەسیحییەکان دروستدەکات *٩.

بوونی مەسیحیی لە کەرکوکدا، دەرگا بۆ ئەمریکا و هاوشێوەکانی دەکاتەوە، کەی بیانەوێت خۆیان بکەن بە کەرکوک و عێراق و هەرێمی کوردستاندا، هەتا لە کاتی خۆیدا دەست لە کاروباری کەرکوک و دەوروبەری وەربدەن و بەرژەوەندییەکانیان بپارێزن، بە تایبەتیی بەرژەوەندییە ئابورییەکانیان.

بۆیە ئەمریکییەکانیش دەیانەوێت کەرکوک فیدراڵییەکی تایبەتی هەبێت، نەگەڕێتەوە سەر هەرێمی کوردستان، هەتا مافی مەسیحییەکان باشتر بپارێزرێت، هەتا پەیوەندییەکی توندوتۆڵیان لەگەڵ کەرکوکدا هەبێت و کەی بیانەوێت دەست لە کاروباری ناوخۆی عێراق و هەرێمی کوردستانیش وەربدەن.

پاش تێپەڕبوونی ساڵێک بەسەر دەنگادان لەسەر دەستوور، لەژێر گوشاری دیبلۆماسیەتی عەرەب و تورک و وڵاتانی ناوچەکدا، ئەمریکا لە هەڵویستەکەی بەرانبەر بە مادەی١٤٠ دەستوور پەشیمانبووەوە، ئاستەنگیی بۆ جێبەجێکردنی مادەی١٤٠ دەستووری عێراق دروستکرد. لە ڕێگەی ڕاپۆرتەکەی بەیکەر – هاملتۆن (٢٠٠٦) و سەردانی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا کۆندالیسا ڕای بۆ کەرکوک ( ٢٠٠٧) داوای ڕاگرتنی جێبەجێکردنی مادەی١٤٠ دەستووری عێراقی کرد. ڕێککەوتنی ستراتیژیی نێوان عێراق و ئەمریکا ساڵی ٢٠٠٨، باسی کورد و هەرێمی کوردستانی تێدا نییە *١٠.

لە ١٦ی ئۆکتۆبەری ٢٠١٧دا، ئەمریکا گڵۆپی سەوزی بۆ هێزە چەکدارەکانی عێراق هەڵکرد هەتا دەست بەسەر کەرکوکدا بگرنەوە. کونسوڵی ئەمریکیی لە کەرکوک لە چەندیین بۆنەدا باسیکردووە باشترین چارەسەر بۆ کێشەی کەرکوک، کەرکوک هەرێمێکی فیدراڵیی سەربەخۆ بێت. بەو شێوەیە ڕوندەبێتەوە کە ئەمریکا لەگەڵ ئەوەدا نییە کەرکوک بگەڕێتەوە بۆ سەر سنووری هەرێمی کوردستان.

لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠٢دا پێش ڕوخانی ڕژێمی سەدام، دۆستی گەلی کورد نوسەری هۆلەندیی (یۆست هیلتەرمان) ئیمەیلێکی بۆ ناردبووم، لە ئیمەیڵەکەدا دەربارەی کەرکوک باسێکی بۆ ناردبووم:

کورتەی باسەکەی ئەوە بوو کە دەڵێت دەبێت لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام بزانن چۆن لەگەڵ کێشەی کەرکوکدا هەڵسوکەوتبکەن، دەبێت کار بۆ ئەوە نەکەن شاری کەرکوک بخەنە سەر سنووری هەرێم. لە ڕابردوودا لە ساڵی ١٩٧٠ – ١٩٧٤ کارتان بۆ کوردستانیبوونی کەرکوک کرد، بۆیە ئەمریکا پشتیبەردان و واتان بەسەرهات و بۆ دواوە گەڕانەوە. ئەگەر ساڵی ١٩٩١ لە کاتی ڕاپەڕیندا، پێشمەرگە شاری کەرکوکی ئازادنەکردایە، ئەمریکا گڵۆپی سەوزی بۆ سوپای عێراق هەڵنەدەکرد هەتا لە دژی هێزی پێشمەرگە هەلیکۆپتەر بەکاربهێنێت، هێزی پێشمەرگە شکستبهێنێت و کۆڕەو دروستببێت. ئەگەر ئەم جارەیش لە کاتی ڕوخانی ڕژێمی سەدامدا جارێکی تر هەوڵی ئازادکردنی کەرکوک و گەڕانەوەی کەرکوک بۆ سەر سنووری هەرێمی کوردستان بدەن، کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیی و ئەمریکا دەستتان لێبەردەدن، لەبەرئەوەی سیاسەتی باو و باڵای جیهانی ئەمڕۆ، کەرکوک بە شارێکی فرەنەتەوەیی دەزانێت و ڕێگەنادات ببێتە شارێکی یەک_نەتەوە *١١.

# پرۆژەی چارەسەر بۆ کێشەی کەرکوک

دیاریکردنی سنووری هەرێمە فیدراڵەکان لە چوارچێوەی وڵاتی فرەنەتەوەدا، مەرجێکی بنەڕەتیی پێکەوەژیانی ئاشتییانەی پێکهاتەکانی ئەو وڵاتەیە. ئەگەر هەر پێکهاتەیەک سنووری تایبەتی خۆی بزانێت، بزانێت ماڵ و حەوشەی خۆی هەتا کوێیە، ناکۆکیی لە نێوان پێکهاتەکاندا لەسەر سنووری جوگرافیی نامێنێت. بۆیە گرنگە دەسەڵاتدارانی عێراقی ناوەند و هەرێم، بە تەواویی لە گرنگیی ئەم بنەمایە تێبگەن و بە وردیی کاری بۆ بکەن. ئەو ناوچانەی ناکۆکییان لەسەرە بە شێوازێکی دیموکراتیی و یاسایی بەم میکانیزمانە سنووری جوگرافییان دیاریبکرێت.

## ١- ئەنجومەنی فیدراڵیی:

بۆ ئەوەی کێشەکانی نێوان هەرێمی کوردستان و عێراقی ناوەندیی بە شێوەیەکی داپەروەرانە چارەسەربکرێن، دەبێت پەرلەمانی عێراق وەکو پەرلەمانی زۆرییینەی وڵاتە فرەنەتەوەکان، لە دوو ئەنجومەن پێکبێت: یەکەم، ئەنجومەنی نوێنەران کە لە ڕێگەی هەڵبژاردنەوە نوێنەرایەتیی هەموو تاکەکانی عێراق دەکات، یاسا و بڕیار بە زۆرییینەی دەنگ دەردەکات، چاودێریی بەڕێوەبردنی سیاسەتی حکومەت دەکات.

دووەم، ئەنجومەنی نەتەوەکان (ئەنجومەنی فیدراڵیی) کە نوێنەرایەتیی پێکهاتەکانی عێراق دەکات، لەو ئەنجومەنەدا کورد و عەرەب و نەتەوەکانی تر بە شێوەیەکی یەکسان نوێنەریان دەبێت، لەو ئەنجومەنەدا ئەو بابەتە چارەنوسسازانە باسدەکرێن کە پەیوەندییان بە فیدرلیی هەرێمەکان و یەکێتیی خاکی عێراق و هەرێمی کوردستان و عێراقی فیدراڵییەوە هەیە. بڕیارەکانی ئەنجومەنی نەتەوەکان بە زۆریی و کەمیی دەنگ دەرناچن، بڕیارەکان بە ڕێککەوتنی نێوان نوێنەرانی پێکهاتەکان دەدرێن.

لەبەرئەوەی زۆرییینەی خەڵکی عێراق عەرەبن، لە ئەنجومەنی نوێنەراندا نوێنەریان زۆرە، نابێت لە ئەنجومەنی نوێنەران گفتوگۆی کێشەی کەرکوک و مادەی ١٤٠ بکرێت، بە زۆرییینە و کەمیینە دەنگی لەسەر بدرێت، وەکو ئەوەی لە هاوینی ٢٠٠٨ لە دەرکردنی بڕیاری ٢٣ یاسای هەڵبژاردنی پارێزگاکانی عێراقدا ڕویدا، یان ئەوەی لە ئۆکتۆبەری

٢٠٠٩دا لەسەر یاسای هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقدا دەربارەی کەرکوک بینیمان. لەو دوو کۆبوونەوەیەی ئەنجومەنی نوێنەراندا، عەرەب دەستی خستبووە بینەقاقای کورد، هەوڵیدەدا لە ڕێگەی دەنگی زۆرینەی خۆیەوە، کوردستانییبوونی کەرکوک بسڕێتەوە.

ئەو وڵاتانەی زیاد لە پێکهاتەیەکی نەتەوەیی و ئاینیی لەخۆدەگرن، پێویستیان بە پەرلەمانی دوو_ئەنجومەن هەیە. د. عسام سلێمان یەکێک لە ڕۆشنبیرە ئەکادیمییەکانی لوبنان لە کتێبی (فیدراڵیی و کۆمەڵگە فرەنەتەوە و تائیفییەکان)*١٢دا، چەند بنەمایەک بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی ناوەند و هەرێمەکان دیاریدەکات، یەکێک لەو بنەمایانە پەرلەمانی دوو_ئەنجومەنە.

ئەگەرچی بڕگەی ٤٨ی دەستووری هەمیشەیی عێراق دەڵێت دەسەڵاتی یاسادانان لە ئەنجومەنی نوێنەران و ئەنجومەنی فیدراڵیی پێکدێت، بەڵام کاری بۆ پێکهێنانی ئەنجومەنی فیدراڵیی نەکردووە هەتا کێشە چارەنووسسازەکانی پێبسپێرێت*١٣.

## ٢- دەسەڵاتی دادوەریی:

لەو هەوڵانەی بۆ جێبەجێکردنی مادەی١٤٠ دراوە، ڕۆڵی دەسەڵاتی دادوەریی عێراقی ناوەندیی و دەسەڵاتی دادوەریی هەرێمی کوردستان دیار نییە. دوورخستنەوەی ئەم دەسەڵاتە لە بڕگەیەکی دەستووریی، هەوڵێکە بۆ ئەوەی بڕگەکە جێبەجێنەکرێت، لە هەمان کاتدا پێشێلکردنی دەستوور و سەروەریی عێراقە. لەبەرئەوەی مادەی١٤٠ بڕگەیەکی سیاسیی و دەستوورییە، لە ئەنجامی کێشەیەکی سیاسییەوە دروستبووە، بۆ چارەسەرکردنی کێشەیەکی سیاسیی داڕێژراوە، بەڵام کاتێک بوو بەبڕگەیەکی دەستووریی، دەسەڵاتی دادوەریی وەکو دەسەڵاتی سیاسیی مافی هەیە لە جێبەجێکردن و بەداوچوونیدا بەشدارییبکات. نابێت دەسەڵاتی دادوەریی ڕێگەبدات لایەنی تر لە شوێنی ئەو، ئەو کارانە بکات کە کاری دەسەڵاتی دادوەریین. بڕگەی ٩٣ی دەستووری عێراقیش ئاماژەی بەوە کردووە کە یەکێک لە کارەکانی دەسەڵاتی دادوەریی چارەسەرکردنی کێشەکانی نێوان هەرێمەکان و ناوەندە.

٣- دوای جێبەجێکردنی مادەی١٤٠ ئەگەر پارێزگای کەرکوک گەڕایەوە سەر سنووری هەرێمی کوردستان، لەبەرئەوەی کەرکوک پاریزگایەکی فرەنەتەوەیە، دەبێت پارێزگای کەرکوک وەکو ناوچەیەکی حوکمی زاتیی هەرێمی کوردستان بناسرێت.

٤- بۆ پارستنی مافی نەتەوەکانی پارێزگای کەرکوک و ناوچەکانی تری کوردستان، پەرلەمانی هەرێم لە دوو ئەنجومەن پێکبێت، ئەنجومەنی نوێنەران و ئەنجومەنی نەتەوە و ئاین و مەزهەبەکانی کوردستان. نوێنەرانی ئەنجومەنی نەتەوەکان بۆ هەر نەتەوە و ئاینێک وەکو یەک بێت و بڕیارەکانیان بە ڕێککەوتن بێت.

**پەراوێزەکان:**

- دەقی مادەی١٤٠ دەستووری عێراق:

بڕگەی پەنجاوهەشتی یاسای حکومەتی ڕاگوزاری عێراق لە دەستووری عێراقدا بووە بە مادەی١٤٠ دەستووری عێراق کە ئەمە دەقەکەیتی:

ا- حکومەتی کاتیی عێراقیی، بە تایبەتیی ئەنجومەنی باڵا، هەڵدەسێت بە چارەسەرکردنی کێشەکانی خاوەندارێتیی خانووبەروە و زەوی و ئەو شتانەی پەیوەندیی بەوانەوە هەیە، بە زووترین کات هەنگاودەنێن بۆ ئەوەی ئەو زوڵم و زۆرە لەسەر خەڵکی ناوچەکە هەڵبگرن کە ڕژێمی پێشوو دژیان ئەنجامیدابوو، کە خۆی لە گۆڕینی باری نیشتەجێبوونی دانیشتوان دەبینێتەوە و شوێنی وەکو کەرکوکی گرتبووەوە. لە ڕێگەی کۆچپێکردن و دوورخستنەوەی خەڵکی ناوچەکە لە شوێنی نیشتەجێبوونیان و لە ڕێگەی کۆچی زۆرەملێ لە ناو ئەو ناوچەیەدا و لە دەرەوەی ناوچەکەدا، نیشتەجێکردنی خەڵکی غەریب لە شوێنی ئەوانەی دەرکراون، بێبەشکردنی خەڵکی ئەو ناوچەیە لە مافی کارکردن، گۆڕینی ناسنامەی نەتەوەیی خەڵکی ناوچەکە. بۆ چارەسەرکردنی ئەو زوڵم و زۆریە پێویستە حکومەتی قوناغی ڕاگواستنی عێراقی ئەم هەنگاوانە بنێت:

١- ئەوەی پەیوەندیی بەو کەسانەوە بێت کە کۆچیان پێکراوە و دوورخراونەتەوە و ڕاونراون و هێنراون، بەگوێرەی یاسای ئەنجومەنی باڵای چارەسەری کێشەی خاوەندارێتیی ماڵ و موڵک و بڕیاری یاسایی تردا، پێویستە لەسەر حکومەت لە کاتێکی دیاریکراوی گونجاودا کۆچپێکراوەکان بگێڕێتەوە بۆ سەر شوێن و بۆ سەر موڵکەکانیان. ئەگەر ئەوەی پێنەکرا، دەبێت حکومەت بە شێوەیەکی دادپەروەرانە قەرەبوویانبکاتەوە.

٢- ئەوەی پەیوەندیی بەو کەسانەوە هەیە کە گواستراونەتەوە بۆ ناوچەیەکی دیاریکراو، کاری حکومەتە کە بەگوێرەی برگەی ژمارە ١٠ی یاسای ئەنجومەنی باڵای چارەسەری کێشەکانی موڵک و ماڵ، بیانگێڕێتەوە شوێنی نیشتەجێبوونی جارانیان، یان دەوڵەت قەرەبوویانبکاتەوە، یان لە نزیک شوێنی نیشتەجێی جارانیان لەو شارانەوە کە هاتوون زەوییان بەسەردا دابەشبکرێت، یان قەرەبووی ئەو خەرجەییەیان پێبدرێتەوە کە لە کاتی گواستنەوەیاندا بۆ ئەو شوێنە نوێیانە خەرجیانکردووە.

٣- ئەو کەسانەی کە لە کاتی ڕژێمدا مافی دامەزراندنیان لێ زەوتکراوە، یان مافی شێوازی تری بژێوییان لێ قەدەغەکراوە، بۆ ئەوەی ناچاریانبکەن شوێنی نیشتەجێی خۆیان لەو ناوچەیەدا بەجێبهێڵن، لەسەر حکومەت پێویستە کە لەو شێوینەی خۆیاندا دەرفەتی کار و بژێوییان بۆ دابینبکات.

٤- دەربارەی گۆڕینی ناسنامەی نەتەوەیی، لەسەر حکومەت پێویستە هەموو ئەو بڕیارانە هەڵبوەشێنێتەوە کە پەیوەندیی بە گۆڕینی ناسنامەی نەتەوەیی ئەو پێکهاتە نەتەوەییانەوە هەیە ڕێگەبدات بەو کەسە زیانلێکەوتوانە بەبێ گوشار ناسنامەی نیشتیمانیی و نەتەوەیی خۆیان دیاریبکەن.

ب- لەپێناو ئامانجی سیاسییدا، ڕژێمی پێشوو یاریی بە سنووری ئیدارەی ناوچەکە کردووە، لەسەر سەرۆکایەتیی وڵات و حکومەتی عێراقیی بۆ قۆناغی ڕاگواست پێویستە، ڕێنمایی بۆ ئەنجومەنی نیشتیمانیی دەربکەن بۆ چارەسەرکردنی ئەو گۆڕانکارییە نادادپەروەرییە. ئەگەر سەرۆکایەتیی وڵات نەگەیشتە ئەنجامێک بۆ درەکردنی ڕێنمایی پێویست، لەسەر ئەنجومەنی سەرۆکایەتیی پێویستە دادگایەکی بێلایەن پێکبهێنێت بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر بابەتەکە و دەرکردن و پێشنیازکردنی ڕێنمایی. ئەگەر ئەنجومەنی سەرۆکایەتیی نەیتوانی دادگا پێکبهێنێت، دەبێت ئەنجومەنی سەرۆکایەتیی داوا لە سکرتێری نەتەوە یەکگرتووەکان بکات کەسێکی ناوداری جیهانیی دیاریبکات، بۆ ئەوەی لە شوێنی ئەو دادگایە کاربکات.

ج- چارەسەرکردنی کۆتایی کێشەکانی زەوی داودەخرێت، بە کێشەکانی کەرکوکیشەوە هەتا ئەو کارانەی سەرەوە ئەنجامدەدرێن، هەتا سەرژمێرییەکی دادپەروەر و ڕوونی دانیشتوان دەکرێت، هەتا ڕیفراندۆم لەسەر دەستووری عێراق دەکرێت. دەبێت بنەمای دادپەروەریی لە چارەسەرکردنی ئەو کێشەیەدا ڕەچاوبکرێت، ئیرادەی خەڵکی ئەو ناوچەیی بخرێتە بەرچاو.

* دەقی پرۆژەی چارەسەرکردنی کێشەی کەرکوک (پ. چ. د. ک)، ٢٠٠٨.

پرۆژەی چارەسەری کێشەی کەرکوک و ناوچەکانی تر.

**پێشەکیی:**

بێگومان کێشەی کەرکوک و ئەو ناوچانەی هەمان کێشەی کەرکوکیان هەیە، کە ناوچەکانی «شەنگاڵ، زومار، تەلعەفەر، شێخان، حەمدانییە، مەخمور، دوزخورماتوو، خانەقین، شارەبان، مەندەلیی، بەدرە و جەسان و ...هتد» لەخۆیدەگرێت بوونەتە مایەی ناکۆکیی و ململانێ و لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدامەوە بووتە ڕۆژەڤی سەرەکیی ئەمرۆی گەلی کوردستان و ئێراق و جیهان. چونکە هەتا ئێستا ئەم کێشەیە وەکو کێشەیەکی هەرە بنچینەیی و ڕەوا تاوتوێنەکراوە و سیاسەت و پرۆژەیەکی چارەسەرئامێزیشی بۆ دانەڕێژراوە، بەڵکو بە هەمان ئەو زیهنیەت و سیاسەتەی کێشەکەیان دروستکردووە هەڵسوکەوت لەگەڵ کێشەکەدا کراوە و هەوڵی چارەسەرکردنی دراوە، کە خۆی لە زیهنیەتی نەتەوەپەرستیی و سیاسەتی نکۆڵییکردن و قڕکردن و توانەوەی نەتەوەیی و سیاسەتی پەرتکە و زاڵبەی دەسەڵاتداراندا دەبینێتەوە. ئەمەیش لەگەڵ خۆیدا نائارامیی و ناهاوسەنگیی و ناکۆکیی و ململانێییەکی بەردەوام و کوشندەی هێناوە، کە زۆربەی کات بە شەڕ و پێکدادان و تراژیدیای گەورە گەیشتووەتە خاڵی بێچارەیی و بنبەستبوون. ئەم ڕاستییە هەتا ڕۆژگاری ئەمرۆیشمان بەردەوامە.

بۆیە پێویستدەکات هەموو ئەو گەل و نەتەوە و ئەتنیکانەی خاوەنی ئەم کێشەیەن، هەروەها ئەو هێز و لایەنانەی بەو کێشەیەوە پەیوەندییدارن پێداچوونەوەیەکی جدیی و بابەتییانە بە زیهنیەت و سیاسەت و پرۆژەکانی خۆیان سەبارەت بەم کێشەیە ئەنجامبدەن و دەستبەرداری ئەو چەمک و لۆژیکە ببن کە خۆسەپاندن، نکۆڵیی لە بەرانبەر و گیانی تۆڵەسەندنەوە لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت، یان پێیوایە هەموو ڕەوایەتیی و ڕاستییەک لە لای ئەوە.

هەروەها پێویستدەکات لەو ڕاستییەیش تێبگەین کە وەکو چۆن یەک کلیل ناتوانێت هەموو دەرگاکان بکاتەوە، ئەوا یەک دەرگایش بە هەموو کلیلێک ناکرێتەوە. کەواتە هەر کلیلە و بۆ دەرگایەک و هەر دەرگایەک بە کلیلێک دەکرێتەوە. ئەمەیش بەو واتایە دێت کە سووربوون لەسەر ئەو شێوازە چارەسەرییانەی کە لەگەڵ گەوهەر و ناوەڕۆکی خودی کێشەکەدا یەکانگیر نابێتەوە و نابێتە ڕێگەیەک بۆ چارەسەر، جگە لە بێچارەیی و بنبەستبوون هیچی تر لەگەڵ خۆیدا ناهێنێت. کەواتە پێویستە گەوهەر و سروشت و تایبەتمەندییەکانی کێشەکە بناسین و بەگوێرەی ئەمەیش بە دوای ڕێگە و شێواز و میکانیزمی گونجاو بۆ چارەسەرییەکی ڕەوا و دادپەروەر و هەمیشەییدا بگەڕێین، کە ماف و ئازادیی و بەیەکەوەژیانی دیموکراتییانەی نێوان گەلان زامندەکات.

لەسەر ئەو بنەمایە، ئێمە وەکو ئەندامانی کۆنفرانسی جەماوەری کەرکوک کە لە ١٧/ ١٠/ ٢٠٠٨ لە شاری کەرکوک بەسترا، لە ڕوانگەی بەرپرسیارێتییەکی نیشتیمانیی و دیموکراتییەوە ئەم پرۆژە پێشنیازە بۆ چارەسەری کێشەی کەرکوک و ئەو ناوچانەی هەمان کێشەیان هەیە پێشکەشدەکەین، بە مەبەستی گفتوگۆ و گەیشتن بە چارەسەرییەکی ڕەوا و دادپەروەر و هەمیشەیی. لەو باوەڕەیشداین کە ئەم پرۆژەیە بەبێ کەموکووڕیی نییە و دەکرێت لە میانەی گفتوگۆیەکی بابەتییانە و دڵسۆزانەوە بگەیەندرێتە ئاستی پرۆژەیەکی تەواو و چارەسەرئامێزی ئەوتۆ کە ماف و ئازادیی و بەیەکەوەژیانی دیموکراتییانەی نێوان هەموو گەلانی کەرکوک و ناوچەکانی تر زامنبکات.

### بنچینە و تایبەتمەندییەکانی کێشەی کەرکوک و ناوچەکانی تر:

کەرکوک یەکێکە لە شارە دێرینەکانی مێژوو و لە دێرزەمانەوە خێڵ و بنەماڵە لۆلۆییەکان، سۆبارییەکان، گۆتییەکان، میتانییەکان کە نەژاد و ڕەچەڵەکی ئەمڕۆی گەلی کورد پێکدەهێنن، لەگەڵ پێکهاتە خێڵەکیی و بنەماڵەکانی سامییەکان و بابلیی، سوورییانیی، کە ڕەچەڵەکی گەلانی ئاشوریی و کلدانیی پێکدەهێنن. تێیدا نیشتەجێبوون و لە ڕووی کەلتور و شارستانیەتەوە پەیوەندییەکی بەهێز و تۆکمە لە نێوانیاندا هەبووە، تەنانەت وێڕای کەلتور و شارستانیەتی تایبەت بە خۆیان، ئەوا لە میانەی پەیوەندیی و تێکەڵاوبوون و بەیەکەوەژیانی هەزاران ساڵەیانەوە بوونەتە خاوەنی کەلتور و

شارستانیەتی هاوبەشیش. هەروەها لە دوای بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلامەوە گەلی عەرەب و نەژادەکانی گەلی تورکمانیش، لە کەرکوک و دەوروبەریدا نیشتەجێبوون. لە ئاکامدا دەکرێت لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا سەرجەم ئەو پێکهاتانە لە ڕاستیینەی کۆمەڵگەی کەرکوک و دەوروبەری و ناوچە دابڕاوەکاندا ببینرێت.

بێگومان هەرچەندە بە درێژایی مێژووی شاری کەرکوک، کورد زۆرینەی پێکهاتەی کۆمەڵگەی شارەکەیان پێکهێناوە و لە ڕووی چەندایەتیی و چۆنایەتییەوە قورسایی نیشتەجێ (سەکەن) و کەلتوریی و شارستانیی خۆی هەبووە و ڕۆڵێکی سەرەکیی لە دروستبوونی مێژوو و شارستانیەتی شارەکەدا هەبووە، بەڵام ئەم ڕاستییە هەرگیز سروشتی هەمەڕەنگیی و مۆزایکی شارەکەی تێکنەداوە و ناهاوسەنگی نەکردووە، بەڵکو تەواو بە پێچەوانەوە بە شێوەیەکی گشتیی سەرجەم ئەو پێکهاتە جیاوازانەی سەدان و هەزاران ساڵە لە کەرکوک و دەوروبەریدا بەیەکەوەژیاون و ئەو هەمەڕەنگییەی هەبووە، وەکو دەوڵەمەندییەکی کەلتوریی و شارستانیی بینراوە و زۆر کەم بووەتە سەرچاوەیەک بۆ گرفت و کێشە و ناکۆکیی لە نێوانیاندا. تەنانەت ئەو هەمەڕەنگییە کەلتورییەی شارەکە بووەتە فاکتەر و زەمینەیەک بۆ پێشکەوتن و گۆڕان و بەردەوامیی ژیان و گوزەرانی هەموو پێکهاتەکانی شارەکە و تەواوی ناوچەکەیش. ئەم ڕاستییە هەتا هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی و چربوونەوەی دەستێوەردانە دەرەکییەکان و دامەزراندنی قەوارەیەک بە ناوی عێراقەوە بەردەوامبوو. کاتێک کە پەترۆڵ لە شارەکە دۆزرایەوە و پیلان و ستراتیژی داگیرکارییانەی ئینگلیزیش لە ناوچەکە بە گشتیی و عێراق بە تایبەتیی پراکتیزەکرا، ئەوا لە چوارچێوەی سیاسەتی پەرتکە و زاڵبەدا هەم دەوڵەمەندێتییە کەلتورییەکەی و هەمیش دەوڵەمەندێتییە سروشتییەکەی بووە سەرچاوەی کێشە و ناکۆکیی و ململانێیەکی بەردەوام و هەتا ڕۆژگاری ئەمڕۆیش بەردەوامە.

لەم چوارچێوەیەیشدا ڕژێمە یەک لە دوای یەکەکانی عێراقیش لە میانەی ئەقڵیەتێکی میللیگەرایی - فاشیستی دەسەڵاتگەراوە هەوڵی گۆڕینی ڕاستیینەی دیموگرافیی، مێژوویی و جوگرافیی و ئیداریی چەندیین شار و شارۆچکەی کوردستانیان داوە. لەم ڕووەوە شاری کەرکوک لە هەموو شوێنەکانی تر زیاتر بەر سیاسەتی تەرحیل - تەعریب و تێکدانی ناسنامەی ڕەسەنی شارەکە کەوتووە. ڕژێمی بەعسیش ئەو سیاسەتەی گەیاندە لوتکەی هەرە مەترسییداری خۆی و هەتا ڕادەیەکی زۆر

دیموگرافیا سروشتییەکەی ئەم شارەی گۆڕی و تێکیدا. زۆربەی هەرە زۆری دانیشتوانە کوردنشینییەکەی کە زۆرینەی شارەکەیان پێکدەهێنا بە زۆرداری دەرکرد. هەروەها گەلی تورکمانیش هەتا ڕادەیەک بەر شاڵاوی ڕاگواستن کەوت. لە جێگەی ئەمە لە میانەی سیاسەتی بەعەرەبکردنەوە خەڵکێکی زۆری لە عەرەب بە ئیمتیازاتێکی زۆرەوە لەم شارە و دەوروبەری نیشتەجێکرد.

بێگومان گەلەکەیشمان بە درێژایی سەدەی بیستەم لە میانەی تێکۆشانی ئازادیخوازانەی خۆیەوە ڕووبەڕووی ئەو سیاسەتە شۆڤێنیستیی و فاشیستییە بووەتەوە و قوربانییەکی زۆریشی لەم پێناوە داوە و بە دەیان هەزار لە خەڵکی شارەکەیش ئاوارە و دەربەدەر بوون، بەڵام گەلەکەمان وەکو چۆن دەستبەرداری سروشت و ناسنامەی جوگرافیی و مێژوویی و دیمۆگرافیی ئەو شارە نەبووە و پێداگریی لەسەر کوردستانییبوونی ئەو شارە کردووەتەوە، ئەوا هەمیشە پێداگریی لەسەر پاراستنی ڕاستیینەی پێکهاتەی هەمەڕەنگ و مۆزایکییانەی شارەکەش کردووە.

دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام لە ٩ی نیسانی ٢٠٠٣دا هەلومەرجێکی سیاسیی، مەیدانی لەبار ڕەخسا بۆ ئەوەی گەلە ڕەسەنەکانی شاری کەرکوک لە ئاوارەیی و دەربەدەریی بگەڕێنەوە سەر زێدی خۆیان و لە ڕەگەوە نادادوەریی سەر شارەکە و دێهاتە ڕوخاوەکانی هەڵبگیرێت و خزمەتگوزاریی تایبەتی بۆ بکرێت و باری ئابوریی و گوزەرانی بەرەو پێشەوە ببرێت. هەروەها عەرەبە هاوردەکانیش بە ڕەزامەندیی و قەرەبووکردنەوەوە ڕەوانەی شوێنی کۆنی خۆیان بکرێنەوە. سنووری ئیدارییەکەیشی وەکو پێش ساڵی ١٩٦٨ لێبکرێتەوە، هەرچی ناوچە و شارۆچکە دابڕاوەکانی ئەو شارەیش هەیە بخرێنەوە سەر ئیدارەکەی و ڕۆحی یەکێتیی دیموکراتیی و پێکەوەژیانی نێوان پێکهاتەکانی کەرکوک بەهێزبکرێتەوە، بەڵام لەم ڕووەوە نە لە ئاستی دەسەڵاتی نوێی عێراق و هێزە هاوپەیمانەکانەوە، نە لە ئاستی دەسەڵاتی هەرێمی کوردستاندا هیچ هەنگاوێکی بەرچاو و ئیجابییانە نەهاوێژرا و هەر لایەنە و کێشەی ئەم شارەی وەکو مەیدانێکی ململانێی دەسەڵاتخوازانە، یان وەکو کارتێکی سیاسیی و سەرچاوەیەک بۆ خۆتوکمە و بەهێزکردن بەکارهێنا. لەم چوارچێوەیەدا هێزە هەرێمییەکان بەهۆی عەقڵیەتی دەمارگیریی و دەستبەردارنەبوونیان لە سیاسەتی نکوڵیی و قڕکردن و توانەوەی گەلی کورد، سروشتی کێشەی شارەکە و بارودۆخی ئاڵۆزی عێراقیان وەکو دەرفەتێک زانیوە بۆ دەستێوەردان و کردنی بە مەیدانێکی ململانێیان لەگەڵ

گەلی کورد لە لایەک و لەگەڵ ئەمریکا و هاوپەیمانانی لە لایەکی ترەوە. هەڵبەتە ئەمریکایش بە هەمان شێوە هەڵسوکەوتیکردووە و لە میانەی سیاسەتی ئیدارەکردنی کێشە و ناکۆکییەکان و سیاسەتی پەرتکە و زاڵبەدا ستراتیژی قۆرخکردن و تالانکردنی سامانە پەترۆڵییەکەی شارەکەی بە بنچینە وەرگرتووە. بۆ ئەم مەبەستە چەندیین پرۆژەی وەکو «پرۆژەی بیکەر - هاملتۆن، پرۆژەکەی دیمستۆرا»ی پێشخستووە. لە لایەکی ترەوە لە ماوەی پێنج ساڵی رابردوودا هەوڵدراوە لە رێگەی چەندیین برگەی دەستووریی و یاساییەوە ئەو کێشەیە ئیحتیوابکرێت و کۆتاییپێبهێنرێت، وەکو برگەی (٥٨) لە یاسای کاتیی بەرێوەبردنی دەوڵەتی عێراق، مادەی (١٤٠)ی دەستووری هەمیشەیی عێراق، برگەی (٢٤)ی یاسای هەڵبژاردنی پارێزگاکان، بەڵام هیچ یەکێک لەو پرۆژە و پیلان و برگە یاسایی و دەستوورییانە نەیانتوانیوە کێشەکە چارەسەربکەن، بەڵکو تەواو بە پێچەوانەوە زیاتر بە ئاراستەی بێچارەیی و بنبەستن و لێکەوتنەوەی توندوتیژیی ئاراستەکراوە، چونکە هیچ یەکێکیان راستیینەی مێژوویی و جوگرافیی و پێکهاتەی کەلتوریی شارەکەیان بەهەندوەرنەگرتووە و بنەماکانی ماف و دادوەریی و یەکسانییشیان پشتگوێخستووە.

ئیدی دوای ساڵانێکی زۆر لە ململانێ و ناکۆکیی، بێچارەیی و بنبەستبوون، کاتی ئەوە هاتووە کێشەکە وەکو خۆی ببینرێت و ئەو شێوازە چارەسەرییەی کێشەکە چارەسەردەکات پێشبخرێت، نەک ئەو شێوازەی لەگەڵ بەرژەوەندیی یەکلایەن یەکانگیردەبێتەوە، چونکە ئەو کێشەیە گوزارشت لە قووڵایی و ناوەڕۆکی کێشەی گەلی کوردستان و سەرجەم کێشەکانی تری عێراق و ناوچەکە دەکات. لە راستییدا ئەو کێشەیە رەگ و ریشەیەکی مێژوویی قووڵی خۆی هەیە و قۆناغ بە قۆناغ هەتا هاتووە قووڵتر بووەتەوە و لەگەڵ خۆیدا ئێش و ئازار و تراژیدیای مەزنی هێناوە، کە لە ئاکامدا بووەتە گرێکوێرەیەکی مەزن. ئەمەیش ئەو راستییە دەخاتەروو کە کێشەی کەرکوک و ناوچەکانی هاوشێوەی، کێشەیەکی ساتەوەختیی و کاتیی نییە، تەنانەت هەر تەنها کێشەیەکی سیاسیی، یان ئابوورییش نییە، بەڵکو کێشەیەکی فرەلایەنە و لە گەوهەری خۆیدا گوزارشت لە کێشەی ناسنامە و ئیرادەی گەلی کورد دەکات. بێگومان ئەم راستییە بۆ گەل و نەتەوە و ئەتنیکە رەسەنەکانی تری کەرکوک و ناوچەکانی تریش هەر راستە. واتە وەکو چۆن کێشەی کەرکوک بۆ گەلی کورد کێشەی ناسنامە و ئیرادەیە ئەوا مسۆگەر بۆ گەلی

تورکمان و ئاشوریی و کلدانیی و سریانییش کێشەی ناسنامە و ئیرادەیە. تەنانەت بۆ گەلی عەرەبیش، ئەوانەی لە دەرەوەی سیاسەتی بەعەرەبکردن و ڕاگوازستنی ڕژێمی بەعس و ڕژێمەکانی تر، لە دێرزەمانەوە لە کەرکوک و ناوچەکانی تر نیشتەجێبوون، کێشەی ناسنامە و ئیرادەیە. ڕاستتر بڵێین، کێشەی کەرکوک و ناوچە هاوشێوەکانی، کێشەی هەموو گەلی کوردستانە، بە کورد و تورکمان و ئاشوریی، کلدانیی، سریانیی و عەرەبیشەوە. بۆیە ئەگەر کێشەی کەرکوک بە کێشەی تەواوی گەلی کوردستان ناوزەدبکرێت و لێیبڕوانرێت تێڕوانینێکی هەرە ڕاستە. ئەمە نکوڵیی لەو ڕاستییە ناکات کە گەلی کورد لە کەرکوک و ناوچەکانی هاوشێوەیدا، بە درێژایی سەدساڵی ڕابردوو، ئامانجی سەرەکیی و یەکەمی سیاسەتی بەعەرەبکردن و ڕاگواستن بووە و بەردەوام ڕووبەڕووی کۆمەڵکوژیی کەلتوریی و کۆمەڵکوژیی جەستەیی (سوور) بووەتەوە. هۆکاری سەرەکیی ئەو بەئامانجگرتنەی کوردیش لەو سیاسەت و کۆمەڵکوژییانە لەبەرئەوە بووە کە کورد زۆرینەی دانیشتوانەکەی پێکهێناوە و پێکدەهێنێت و هەتا کورد لەم شارە و ناوچەکانی هاوشێوەی ڕانەگوێزرێت و کۆمەڵکوژنەکرێت و سیمای کوردانەیان نەسڕدرێتەوە، ئەوا هەرگیز ناتوانرێت تورکمان و ئاشوریی، کلدانیی، سریانیی ڕاگوێزرێن و کۆمەڵکوژبکرێن و سیمایان لە شارەکە و ناوچەکانی هاوشێوەیدا بسڕدرێتەوە. هەروەها گەلی تورکمان و گەلانی تری شارەکەیش ئەگەر بە ڕادەی گەلی کوردیش نەبێت ئەوا کەم تا زۆر ڕووبەڕووی سیاسەتی تەعریب و تەرحیل و کۆمەڵکوژیی بوونەتەوە. واتە جێبەجێکردن و سەرخستنی سیاسەتی تەعریب – تەرحیل و کۆمەڵکوژییەکان لە بەرانبەر گەلی کورددا، هەنگاوی یەکەمیش بووە بۆ جێبەجێکردن و سەرخستنی هەمان سیاسەت و کۆمەڵکوژیی لەسەر گەل و نەتەوەکانی تر.

لێرەدا پێویستدەکات ئەو ڕاستییەیش ببینرێت کە گەلی کورد وەکو چۆن بووەتە قوربانیی یەکەم و سەرەکیی سیاسەتی شێواندن و تێکدانی مێژوو و جوگرافیا و دیمۆگرافیای کەرکوک و ناوچە هاوشێوەکانی، ئەوا گەلی کوردیش زۆرترین خەبات و تێکۆشانی بۆ پاراستنی سروشتی مۆزایکیی و فرەکەلتوریی ئەم شارە کردووە و هیچ کاتێک خوازیاری ئەوە نەبووە ڕاستیینەی مێژوویی و جوگرافیی و دیمۆگرافییەکەی کەرکوک و ناوچە هاوشێوەکانی بشێوێت و تێکبدرێت. گەلی کورد

هەر تەنها لە کەرکوک و ئەو ناوچانەدا وا هەڵسوکەوتینەکردووە، بەڵکو لە قووڵایی جوگرافیای کوردستاندا خاوەنی هەمان تێڕوانین و هەڵسوکەوت بووە. مانەوە و خۆپاراستنی ئەو گەل و نەتەوە و ئەتنیکانە لە کوردستان و بەیەکەوەژیانی هەزاران ساڵەیان لەگەڵ کورددا بە تەبایی و ئاشتییانە، سەلمێنەری ئەو ڕاستییەیە کە گەلی کورد فرەکەلتوریی و فرەئەتنیکی لە کوردستاندا بۆ خۆی بە سیمای دەوڵەمەندێتیی کەلتوری کوردستان و سەرچاوەیەکی هێز و توانستی بینیوە. هەر بۆیە بەردەوام لە میانەی بەرگرییکردنی لە ناسنامە و ئیرادەی نەتەوەیی خۆی بەرگریی لە ناسنامە و ئیرادەی گەل و نەتەوەکانی تریش کردووە و لەم ڕووەوە بووەتە قەڵغان و پارێزوانی ئەوانیش. هەڵبەتە ئەمەیش بەو ڕادەیەی هێز و وزەی بەو گەل و نەتەوانە بەخشیوە ئەوا بە هەمان ڕادەیش زەمینەی تەبایی و بەیەکەوەژیانی لە نێوانیاندا زیاتر کردووە و هەتا ڕادەیەکی زۆر هاوچارەنوس و هاوخەبات و هاوئامانجیشی لە نێوانیان خوڵقاندووە. بۆیە دەبێت هەموو لایەک بە وردیی لەو ڕاستییە تێبگەین کە کێشەی گەلی کورد پەیوەست و ئاوێتەی کێشەی گەل و نەتەوەکانی تری کوردستانە. هەر وەکو چۆن چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە ئاستی کەرکوک و ئەو ناوچانە و عێراقدا بەبێ چارەسەرکردنی کێشەی ئەو گەل و نەتەوانە نایەتەدی، ئەوا مسۆگەر بەبێ چارەسەرکردنی کێشەی کورد کێشەی ئەو گەل و نەتەوانەیش چارەسەرناکرێت. ئەمە بەو واتایە نایەت کە کێشەی هەر گەل و نەتەوەیەک خاوەنی تایبەتمەندیی و جیاوازیی خۆی نییە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا بە حوکمی ئەوەی لەگەڵ گەلی کورددا خاوەن و شەریکن لە هەمان خاک و نیشتیماندا و هەزاران ساڵە بە یەکەوە لەسەر هەمان خاک و نیشتیماندا دەژین، ئەوا بەو ڕادەیەی خاوەنی کێشەی تایبەتی خۆیانن، مسۆگەر خاوەنی کێشەیەکی هاوبەشیشن لەگەڵ گەلی کورددا. هەر بۆیە چارەسەرکردنی کێشەی گەلی کورد و عەرەب و تورکمان و ئاشوریی و کلدانیی و سریانیی هەمووی بە یەکەوە پەیوەستدارن، چونکە وەکو چۆن بە یەکەوە خاوەنی وڵات و کەلتور و ناسنامەیەکی هاوبەشن، ئەوا دەبێت بە ئیرادە و تێکۆشانێکی هاوبەشیش چارەسەری کێشەکان بکرێت و ڕێک پێچەوانەی سیاسەتی پەرتکە و زاڵبەی هێزە دەرەکیی و دەسەڵاتە شۆڤێنیستەکان هەڵسوکەوتبکرێت. بێگومان ئەمەیش تەنها بە پشتبەستن بە زیهنیەتێکی کراوەی دیموکراتیی کە تێیدا بە یەکەوە ژیانی ئازادانە و یەکسان بە بنەما دەگرێت دێتەدی.

لە کاتێکدا کە کێشەکە گەیشتووەتە ئاستێکی مەترسییداری ئەوتۆ کە چیدی بێچارەیی و بنبەستبوون پەسندناکات، ئەوا دەخوازین پرۆژەیەکی نوێ پێشکەشی ڕای گشتیی و گەلی کورد، تورکمان، عەرەب، ئاشوریی، کلدانیی، سریانیی و لایەنە پەیوەندییدارەکان بکەین، هەتا بتوانین لە ڕێگەی ئەم پرۆژەیەوە بە بەشدارییەکی چالاکانەی جەماوەر ئەم کێشەیە چارەسەربکەین.

## ئەو بنەما گشتییانەی بۆ چارەسەری کێشەکە پێویستن:

١- کێشەی کەرکوک و ناوچەکانی تر کێشەیەکی ڕواڵەتیی و کاتیی، یان هەر تەنها سیاسیی و ئابوریی نییە، بەڵکو خاوەنی ڕاستیینەیەکی مێژوویی، جوگرافیی، دیموگرافیی و ئیدارییە، کە پێویستە ڕەهەندە جۆراوجۆرەکانی بزانرێت. بۆیە پێویستە هەر پرۆژە و ڕێوشوێنێکی چارەسەر بە لەبەرچاوگرتنی ئەو بنەمایانە پێشبکەوێت. بە تایبەتیی کێشەی کەرکوک بۆ گەلی کورد و پێکهاتە ڕەسەنەکانی تری ئەم شارە و ناوچەکانی تر دەربڕی ناسنامە و ئیرادەیە.

٢- بەر لە هەموو شتێک ئەم کێشەیە کێشەیەکی ناوخۆیی باشووری کوردستان و عێراقە، تەنها گەلانی ئەو شار و ناوچانە دەتوانن بە یەکەوە بڕیار لەسەر چارەنوسی هاوبەشی خۆیان بدەن. بۆیە پێویستە کۆتایی بە سیاسەتی بەرژەوەندییپەرست، وابەستەیی بە دەرەوە، بێچارەهێشتنەوە، هەر شێوە دەستێوەردانی هێزە جیهانیی و هەرێمییەکان بهێنرێت، بە تایبەتیی تورکیا، ئێران، سوریا کە خۆیان خاوەنی هەمان کێشەن لەگەڵ گەلی کورد و پێکهاتەکانی تردا.

٣- دەستبەرداربوون لە زیهنیەتی دەوڵەت_نەتەوە، چەمکە شۆڤێنیستیی، دەمارگیریی، پاوانخوازیی، ناوەندگەرێتیی و قووڵکردنەوەی ناکۆکییەکان، پێویستییەکی ژیانییە بۆ چارەسەرییەکی هەمیشەیی و دادوەریی و دیموکراتییانە. بۆیە هەڵسوکەوتکردن بە زیهنیەتێکی دیموکراتیی و ڕۆحێکی تەبایی و ئاشتییانە و پەرەپێدانی زەمینەیەک بۆ بەیەکەوەژیانی ئازادانەی گەلان مەرجی بنچینەیی چارەسەری کێشە و ناکۆکییەکانە.

٤- بە شێواز و میکانیزمی چارەسەردا پێویستە دەستبەرداریی لەو چەمکانە بکرێت کە پێداگریی لەسەر زۆرینە و کەمینە، بەهێزیی و لاوازیی، گەورەیی و بچووکیی پێکهاتەکان بەرانبەر یەکتر دەکات، چونکە ئەمە ڕێگە لەبەردەم بێچارەیی و بنبەستیی و وابەستەبوون بە دەرەوە دەکاتەوە. لەبریی ئەمە چەمکی دەرفەتی بەشداریی دیموکراتییانەی گەلان و هاوڵاتیبوونی ئازاد و یەکسان بە بنەما وەربگیردرێت و هەر پێکهاتەیەک وەکو دەوڵەمەندییەکی کەلتوریی و شارستانیی سەیربکرێت و لە چوارچێوەی پێوانەی دیموکراتیی و دادوەریی و یەکسانییدا ماف و ئازادییەکان لە دەستوور و کرداردا گەرەنتییبکرێت. پێویستە هەموو پێکهاتەکان بەم شێوەیە ڕێز لە ناسنامە و ماف و ئازادییەکانی یەکتر بگرن.

٥- پێویستە هەموو ئەو خەڵکانەی لە چوارچێوەی سیاسەتی تەعریب - تەرحیل و کۆمەڵکوژیی کەلتوریی و بەدەر لە خواست و ئیرادەی خۆیان لەو ناوچانە کۆچبەرکراون، یان هاوردەی ئەو ناوچانە کراون، هەروەها ئەوانەیش کە لە شوێنی کاری خۆیان دەرکراون، یان ناچاری دەستبەرداربوون لە کاری خۆیان کراون بگەڕێندرێنەوە زێد و وار و سەر کاری خۆیان، لە ڕووی مادیی و مەعنەوییەوە قەرەبووبکرێنەوە. هەروەها سەرجەم ئەو ئیجرائات و گۆڕانکارییە ئیدارییانەی بە مەبەستی شێواندن و لاوازکردنی پێگەی پێکهاتەکان ئەنجامدراوە هەڵبوەشێنرێتەوە و بگەڕێندرێتەوە دۆخی ئاسایی خۆی.

٦- وەکو پرەنسیپێکی بنچینەیی دیموکراتییانە بۆ چارەسەری کێشەی ئەو ناوچانە، مافی بڕیاردانی گەل و پێکهاتەکان سەبارەت بە چارەنوس و شێوەی ژیانی هاوبەشی خۆی میکانیزمی «ڕیفراندۆم» و شێوازەکانی تری دیموکراتیەتی ڕاستەوخۆ بە بنچینە وەربگیردرێت.

٧- لە ئاستی عێراقدا «عێراقییبوون» و لە ئاستی کوردستاندا «کوردستانییبوون» وەکو ناسنامەی باڵا و هاوبەش پەسندبکرێت. بە مەرجێک ناسنامە باڵا و هاوبەشەکان نکوڵیی لە ناسنامە تایبەتەکان نەکات و هەوڵی سڕینەوەیان نەدات. لەسەر ئەو بنەمایە، ناسنامە باڵاکان (عێراقییبوون، کوردستانییبوون) و ناسنامە تایبەتەکان (ناسنامەی نەتەوەیی، ئاینیی، ئایزایی، کەلتوریی) پارێزراوبێت و لە دەستووری هەرێمی کوردستان و کۆماری عێراقی فیدراڵیی گەرەنتییبکرێت. بەمەیش پێویستە خەڵکی

کەرکوک و هەموو ئەو شار و شارۆچکە و گوندانەی هەمان کێشەیان هەیە، ئازادانە پشتگیریی خۆیان بۆ ئەو ناسنامانە دەرببڕن.

٨- لەسەر بنەمای پرەنسیپەکانی «هەموو هاولاتییان خاوەنی یەکسان و هاوبەشی سەرجەم داهاتی ولاتن» و «خۆتێری اکتفاو الژاتی» و «پێداویستیی» داهاتەکانی ولات بە شێوەیەکی دادپەروەر و یەکسان دابەشبکرێت. بە مەرجێک هەر هەرێم و شار و ناوچەیەک بە ڕێژەی (...٪)ی لەو داهاتەی لێیەوە دەستدەکەوێت پێببەخشرێت.

## چەند میکانیزمێک بۆ چارەسەری کێشەکە:

١- هەر سێ پرۆسەی دەستنیشانکراوی ناو مادەی (١٤٠) «ئاساییکردنەوە، سەرژمێرییکردن، ڕیفراندۆم» لە کەرکوک و سەرجەم ناوچەکانی تر وەکو هەنگاوێکی بنچینەیی جێبەجێبکرێت میکانیزمێکی هەرە ڕاستە، چونکە ئەمە خۆی لە خۆیدا گەڕانەوەیە بۆ ڕای گەل و ڕێگەگرتنە لە دەستتێوەردانی دەرەکیی. ئەگەر هەر بڕگەیەک لە دەستووردا شوێنی مادەی (١٤٠) بگرێتەوە، ئەوا دەبێت ئەو سێ پرۆسەیە لەخۆبگرێت.

٢- پێویستە دەسەلاتی عێراق و لایەنە دەسەلاتدارەکان بە گومانەوە سەیری کورد و مەسەلەی کەرکوک نەکەن و تەنها لە ڕوانگەی ئابوورییەوە مامەڵە لەگەڵ ئەم کێشەیەدا نەکەن، دەسەلاتی کورد و لایەنە دەسەلاتدارەکانی کوردستانیش هەڵوێستێکی وا پیشانبدەن کە کوردستان ولاتی هەموو گەلانی دانیشتووی کوردستانە، نەک تەنها ولاتی کوردە و کورد دەخوازێت ئەو گەلانەی تر لە بۆتەی خۆیدا بتوێنێتەوە، یان بێئیرادەیان بکات.

٣- کەرکوک و ناوچەکانی تر خاوەنی پێکهاتەیەکی فرەنەتەوەیی و فرەکەلتوریی و فرەئاینیی و فرەمەزهەبییە. چارەسەری هەرە گونجاو کە بتوانێت پێکەوەژیانی ئەو پێکهاتە دەوڵەمەندە بە شێوەیەکی ئاشتیی و دیموکراتیی و ئازادانە مسۆگەربکات، چارەسەری کۆنفیدراڵیزمی دیموکراتییە، کە لەسەر بنەمای دیموکراتیەتی ڕاستەوخۆ و ناسنامە و ئیرادەی سەربەخۆ گەل و نەتەوەکان دەتوانن خۆیان بە ڕێکخستە بکەن و گوزارشت لە خۆیان بکەن. واتە هەر گەل و نەتەوە و کەلتورێکی جیاواز

لەسەر بنەمای ناسنامە و ئیرادەی سەربەخۆ «ئەنجومەن» و دەزگای تایبەتی خۆیان دادەمەزرێنن. بەمەیش بناغەی کۆمەڵگەیەکی دیموکراتیی و ئازاد دادەرێژرێت.

٤- لەبەرئەوەی زۆربەی دانیشتوانی کەرکوک و ئەو ناوچانەی کێشەیان هەیە کورد و تورکمان و ئاشوریی، کلدانیی، سریانیین و ئەم گەلانەیش پێکهاتەی سەرەکیی هەرێمی کوردستانن، لەبەر ئەمە ئەگەر بێت و ئەم هەرێمانە نەکەونە سەر هەرێمی کوردستان، ئەوا ئەو گەلانە پارچەدەبن و بەشێکیان لە هەرێم دەبن و بەشەکەی تریشیان لە دەرەوەی ئەو هەرێمە دەبن. ئەمەیش بە زیان بۆ ئەو گەلانە دەشکێتەوە. مانەوەی ئەم هەرێمانە لە دەرەوەی هەرێمی کوردستان کێشەکانیان چارەسەرناکات، بەڵکو پەرتەوازەیاندەکات. هەر بۆیە چارەسەری هەرە ڕاست و بەسود بۆ پێکهاتەکانی کەرکوک و ناوچەکانی تر ئەوەیە کەرکوک بگەڕێتەوە سەر هەرێمی کوردستان و لە ناو هەرێمی کوردستاندا خاوەنی پێگەیەکی ئۆتۆنۆمیی دیموکراتیی بێت و عەقڵیەتی دیموکراتیی و پێکەوەژیان بکرێتە بنەمای خۆرێکخستن و بەڕێوەبردن. ئەو پێگە تایبەتییەی کەرکوک لە دەستووری هەرێمی کوردستان و دەستووری هەمیشەیی عێراقدا و لە چوارچێوەی یاسا و پرنسیپدا دانی پێدابنرێت. واتە دان بەوەدا بنرێت کە کەرکوک شارێکە خاوەنی پێگەیەکی ئۆتۆنۆمیی دیموکراتییە لە ناو هەرێمی کوردستانی عێراقدا.

٥- لە سنووری ئیدارەی ئۆتۆنۆمیی دیموکراتیی کەرکوکدا، شانبەشانی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوک ئەنجومەنێکی نەتەوەکان هەبێت کە نوێنەری نەتەوەکان بە ژمارەیەکی یەکسان جێگەی خۆیانی تێدا بگرن، ئەم ئەنجومەنە سەرۆکایەتییەکەی دەوری بێت و ئەو کێشانەی کە لە ڕووی نەتەوەیی و کەلتوریی و پەروەردەییەوە دەردەکەون هەڵوێستەی لەسەر بکات. ئەم ئەنجومەنە بە تەوافوقی دیموکراتیی بڕیاربدات، بە مەرجێک هەر نەتەوە و گەلێک سەبارەت بە چارەنوس و کێشەکانی تایبەت بە خۆی خاوەنی مافی ڤیتۆ بێت.

٦- ئەو مۆدیلەی بۆ پارێزگای کەرکوک بە بنەما وەردەگیرێت بۆ قەزاکانی سەر بە کەرکوک و ئەو شارانەی تریش کە کێشەیان هەیە بە بنەما وەربگیرێت. ئەمەیش لە چوارچێوەی دەستووری هەرێمی کوردستان و یاسای پارێزگانی هەرێمدا جێگیربکرێت.

٧- کورد، تورکمان، ئاشوریی، کلدانیی، سریانیی و عەرەب کە گەلان و هاوڵاتیی سەرەکیین لە هەرێمی کوردستاندا، پێویستە زمانیان وەکو زمانی سەرەکیی و فەرمیی و پەروەردە پەسندبکرێت، کەلتوریان وەکو بەشێک لە دەوڵەمەندێتیی کەلتوری کوردستان ببینرێت. هەروەها ئەم گەلانە بە خاوەنی هاوبەشی هەرێمی کوردستان بناسرێن، مافیان هەبێت لە خۆبەڕێوەبردن و خوێندن بە زمانی خۆی. ئەمەیش لە دەستووری هەرێمی کوردستاندا جێگیربکرێت. واتە لە دەستوور و لە دەسەڵاتی جێبەجێکردندا ئەوە بسەلمێنرێت کە کوردستان لە مێژوودا و لە ئەمڕۆیشدا تەنها وڵاتی کورد نەبووە، بەڵکو وڵاتی هەموو ئەو گەلانەیە کە تێیدا دەژین.

٨- لە ئاستی هەرێمی کوردستانیشدا پەرلەمانی کوردستان لە دوو ئەنجومەن پێکبێت، شانبەشانی ئەنجومەنی نوێنەران ئەنجومەنێکی نەتەوەکان دروستبکرێت، لە ئەنجومەنی نەتەوەکاندا نوێنەری نەتەوەکانی کوردستان بە شێوەیەکی یەکسان بەشداربن و ئەنجومەن بتوانێت ماف و سەربەخۆیی و بەشداریی دیموکراتییانەی هەموو پێکهاتەکانی کوردستان لە بەڕێوەبردندا گەرەنتیبکات. ئەم ئەنجومەنە بە تەوافوقی دیموکراتیی بڕیاربدات، بە مەرجێک هەر نەتەوە و گەلێک سەبارەت بە چارەنوس و کێشەکانی تایبەت بە خۆی خاوەنی مافی ڤیتۆ بێت. لەگەڵ ئەمەدا هەر گەل و نەتەوەیەکیش ئەنجومەنی تایبەت بە خۆی دابمەزرێنێت، کە لە ئاستی ئەو پێکهاتەیەدا سەبارەت بە زمان و کەلتور و پەروەردە و بوارەکانی تردا خاوەنی هێزی بڕیاروەرگرتن بێت. لەگەڵ ئەمەدا هەر گەلێک مافی گەرەنتییبکرێت کە خاوەنی ئەنجومەنی نەتەوەیی تایبەت بە خۆی بێت، کە گوزارشت لە ئیرادە و مەرجەعیەتی دیموکراتییانەی بکات و لە دەستووری هەرێمی کوردستاندا ببێتە بڕگەیەکی یاسایی. ئەمەیش ئەو گەل و نەتەوانە لە پارچەبوون و پەرتەوازەیی دەپارێزێت و یەکێتییان گەرەنتییدەکات.

٩- پێویستە لە ئاستی دەوڵەتی فیدراڵیی عێراقیشدا ئەنجومەنی نەتەوەکان دابمەزرێت، کە گەل و نەتەوەکان بە شێوەیەکی یەکسان و دیموکراتییانە نوێنەرایەتیی خۆیان بنێرنە ئەم ئەنجومەنە. کێشەکانی نێوان گەل و نەتەوەکان بە تەوافوقی دیموکراتیی چارەسەربکرێت، بە مەرجێک هەر نەتەوە و گەلێک سەبارەت بە چارەنوس و کێشەکانی تایبەت بە خۆی خاوەنی مافی ڤیتۆ بێت.

١٠- پێکهاتەی کەلتوریی، ئەتنیکی کۆمەڵگەی کوردستان خاوەنی تایبەتمەندییەکی هەمەڕەنگی مۆزایکی دەوڵەمەندە. ئەو پرەنسیپ و بڕگانەی کە بۆ چارەسەری کێشەی کەرکوک دەستنیشانکراوە، دەکرێت بۆ چارەسەری کێشەی هەر ناوچەیەکی تری کوردستان، یان ئەو پێکهاتانەی دەکەونە ناو سنووری کوردستانەوە بە لەبەرچاوگرتنی تایبەتمەندێتیەکانیان سودی لێوەربگیرێت. بە تایبەتیی کێشەی ناوچەکانی «شەنگاڵ، زومار، تەلعەفەر، شێخان، حەمدانییە، مەخمور، دوزخورماتوو، خانەقین، شارەبان، مەندەلیی، بەدرە و جەسان»، هەروەها ئێزیدیی، شەبەک و کوردی فەیلییش دەتوانرێت بەم میکانیزمە و پرەنسیپانە چارەسەربکرێن.

کۆنفرانسی جەماوەریی کەرکوک ٧/ ١٠/ ٢٠٠٨

**پەراوێز:**

١- مادەی ١٤٠ دەستووری عێراق.

٢- راپۆرتی بەیکەر هاملتۆن.

٣- کەناڵی تەلەفزیۆنی کوردستان تی ڤی سەر بە (پ. د. ک).

٤- چاوپێکەوتنی کەناڵی تەلەفزیۆنی جزیرە لەگەڵ حەسەن توران.

٥- ئیبراهیم جەعفەریی، یەکەم سەرۆکوەزیری هەڵبژێردراوی عێراق.

٦- نوری مالکیی، دووەم سەرۆکوەزیری هەڵبژێراوی عێراق.

٧- کەناڵی تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان، لێدوانی جەلال تاڵەبانیی سەرۆککۆماری عێراقی بڵاوکردەوە.

٨- مەسعود بەرزانیی، بۆ مێژوو.

٩. رێککەوتنی ستراتیژیی لە نێوان عێراق و ئەمریکادا.

١٠. یۆست هیڵتەرمان، کەسایەتییەکی هۆڵەندییە، لە بواری مافی مرۆڤ و کێشە نێودەوڵەتییەکاندا کاردەکات، ئێستا ئەندامی گروپی کێشە نێونەتەوەییەکانی جیهانە ((international group crises)) دوو کتێبی لەسەر کێشەی کورد (ئەنفال و هەڵبجە) نوسیوە.

١١. د. عسام سلێمان (فیدراڵیی و کۆمەڵگە فرەنەتەوە و تائیەفەکان)، لوبنان.

١٢.دەستووری عێراق.

# ١١

# ئەنفال و کیمیابارانی کوردستان

**پرۆسەکانی ئەنفال:**

هەر کەسێک، یان هەر هێزێکی سیاسیی، کوردستانیی، عێراقیی، ناوچەیی، یان جیهانیی، ئەگەر گرنگیی بە کێشەی کورد بدات، بەرژەوەندیی لەگەڵ خەڵکی کوردستاندا هەبێت، دەبێت شارەزایی و تێگەیشتنی لەسەر ئەنفالی کوردستان و کیمیابارانی هەڵەبجە هەبێت، بەبێ شارەزایی و تێگەیشتن لە ئەنفال و کیمیاباران، هیچ هێزێکی سیاسیی لە چەوسانەوەی کورد تێناگات، لە ناسنامەی شۆڤێنیی و فاشیستیی ڕژێمی بەعسی عێراق تێناگات.

بەبێ شارەزایی و تێگەیشتنی ڕاست لەسەر ئەنفال و کیمیاباران، هیچ تاک و پێکهاتەیەکی سیاسیی، ناوەڕۆکی سیاسەتی چەوتی دەسەڵاتدارانی هەرێمی کوردستانی بۆ دەرناکەوێت. بەبێ تێگەیشتن لە پرۆسەکانی ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجە، شاعیر گوتەنی هیچ کەس ئەوەی بۆ دەرناکەوێت کە (مافی مرۆڤ درۆیەک بوو لە سەردەمی هەڵەوەڕی مێژوو دەرچوو)*١.

ئەنفالی کوردستان و کیمیابارانی هەڵەبجە، مێژووی کارەساتباری گەلی کوردە، پێویستە سەرتاپای گەلی کورد بە باشیی لەو مێژووە خەمناکە تێبگەن، ئەزموونی لێوەربگرن و ڕێگە لە دوبارەبوونەوەی بگرن.

ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجە سیاسەتی لەناوبردنی جەستەیی و کەلتوریی و ژینگەیی کورد و کوردستان بوو، لە بەرنامەی حیزبی بەعسی عێراقدا بوو، کاتێک دەرفەتی لەباری بۆ هاتەپێشەوە، ئەنجامیدا.

هەڵمەتەکانی ئەنفال لە مانگی شوباتی ١٩٨٨ دەستپێکرد، لە مانگی ئابی هەمان ساڵدا کۆتاییهات. هێزی چەکداری عێراق، بە چەکی کیمیاویی و بە چەکی کلاسیک، پەلاماری ناوچە ئازادکراوەکانی ژێر دەسەڵاتی هێزی پێشمەرگەی دا، هێزی پێشمەرگە شکا و ناوچەکەیان چۆڵکرد و بەرەو سنووری ئێران پاشەکشەیانکرد. سوپای پاسدارانی ئێرانی هاوپەیمانی پێشمەرگە، نەیتوانی هاوکاریی هێزی پێشمەرگە بکات و لە شکستی سەربازیی بیپارێزێت.

بەشێک لە خەڵکی ناوچە ڕزگارکراوەکان و بەشێک لە پێشمەرگە، بە تایبەتیی لە ناوچەی گەرمیان لە لایەن هێزە چەکدارەکانی عێراقەوە دەستگیرکران و ئەنفالکران. بەشێکی تری خەڵکی کوردستان، بە تایبەت خەڵکی ناوچە شاخاویی و سەرسنوورییەکان، لەگەڵ زۆربەی هێزی پێشمەرگەدا بەرەو سنووری ئێران هەڵهاتن و وەکو ئاوارە لە ئێران نیشەجێبوون. دوای ئەنفالەکان و کیمیابارانی هەڵەبجە، حکومەتی بەعس ناوچە ڕزگارکراوەکانی بە ناوچەی محەرەمە (قەدەغەکراو) ڕاگەیاند، دەبوو لەو ناوچانەدا مرۆڤ و ئاژەڵ و پەلەوەر نەژین، لەو بەشەی کوردستاندا ژیان قەدەغەکرا.

هەتا ڕاپەڕیین دۆخی ئەو ناوچانە وا مایەوە، دوای ڕاپەڕیین ناوچە قەدەغەکراوەکان ئاوەدانکرانەوە، ڕژێمی بەعس ڕوخا، سەرانی ڕژێم لەسەر ئەنفال و کیمیاباران دادگاییکران، دادگای باڵای تاوانەکانی عێراقی دوای ڕژێمی سەدام، ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجەی بە جینۆسایدی گەلی کورد ناساند.

**ئەنفالی یەک:**

ڕۆژ ٢٣/ ٢/ ١٩٨٨ لە سنووری ناوچەی جافایەتیی باکووری سلێمانیی، لە دەوروبەری قەزای دوکان دەستپێکرد، ڕۆژی ١٨/ ٣/ ١٩٨٨ کۆتاییهات. بارەگاکانی سەرکردایەتیی یەکێتیی لە سەرگەڵوو و بەرگەڵوو و گوندەکانی تری دۆڵی جافایەتیی بەر شاڵاوی ئەنفالی یەک کەوتن. لە هەڵمەتەکانی ئەنفالی یەکدا، سوپای عێراق هەموو

جۆره چەکێکی زەمینیی و ئاسمانیی، کیماویی و کلاسیکی بەکارهێنا. فەیلەقی یەکی سوپای عێراق بە فەرماندەیی نزار خەزرەجیی، پەلاماری سەرگەڵوو و بەرگەڵوو و هەڵەدن و یاخسمەر و کانی توو و شوێنەکانی تری دا. گوندەکانی ئەو ناوچەیە و گوندی شاناخسێی ناوچەی شارباژێڕ، لەگەڵ سەنگەرەکانی پێشمەرگە بەر شاڵاوی چەکی کیمیاویی کەوتن. دوای نزیکەی مانگێک شەڕی بەرگریی، هێزی پێشمەرگە شکاو بەرەو سنووری ئێران پاشەکشەیکرد.

**کیمیابارانی هەڵەبجە:**

لە ڕۆژانی کۆتایی هەڵمەتی ئەنفالی یەکدا، هێزی پێشمەرگەی کوردستان (یەکێتیی، پارتیی، بزوتنەوەی ئیسلامیی و حسک) لەگەڵ سوپای پاسدارانی ئێراندا، پەلاماری شاری هەڵەبجە و ناوچەی هەورامانیان دا و هێزەکانی سوپای عێراقیان شکاند. دوای ئەوەی سوپای عێراق دڵنیابوو سوپاکەی لەوێ شکاوە و هەڵەبجەی لەدەستچووە، لە ڕۆژی ١٦/ ٣ هەتا ڕۆژی ١٨/ ٣/ ١٩٨٨ لە ڕێگەی هێزی ئاسمانییەوە، هەڵەبجە و دەوروبەری بە چەکی کیمیاویی گازی خەردەل و گازی دەمارەکان بوردوومانکرد. پێنج هەزار کەس شەهیدبوون، دەیان هەزار کەس بریندابوون، خەڵکەکەی تری هەڵەبجە هەندێکی لەگەڵ هێزە چەکدارەکانی عێراق بەرەو سلێمانیی هەڵهات، هەندێکی لەگەڵ بریندارەکاندا بەرەو ئێران هەڵهات و لەوێ وەکو ئاوارە نیشتەجێبوون.

**ئەنفالی دوو:**

هەڵمەتی ئەنفالی دوو لە ٢٢/ ٣/ ١٩٨٨ دەستپێکرد و ڕۆژی ٣١/ ٣ کۆتاییهات. ئەنفالی دوو ناوچەی قەرەداخی گرتەوە، بارەگاکانی مەڵبەندی یەکی یەکێتیی و بارەگای حیزبە کوردستانییەکانی تر و بارەگای گروپە ئۆپۆزسیۆنە شیعەکانی عێراق لە ناوچەی قەردەداخ بەر هێرشی ئەنفالی دوو کەوتن. گوندەکانی ناوچەی قەرەداخ بەر هێرشی چەکی کیمیاویی کەوتن و ئەنفالکران.

لە ئەنفالی دوودا سەرەتا سوپای عێراق لە پێگە سەربازییەکانی خۆیەوە لە نزیک دەربەندیخان و سلێمانیی، بە سارووخی کیمیاویی گوندەکانی سێوسێنان، دوکان،

مەسۆیی و بەلەکجاڕ و تەکیە و بەڵخە و جافەران و چەمی سمۆر و ئەوانی تری بۆردوومانکرد. سەدان کەس شەهیدبوون و هەزارنیش برینداربوون.

دوای ئەوە هێزە چەکدارەکانی عێراق لە بناری شارەزوور و دەربەندیخانەوە پەلاماری ناوچەی قەرەداخیان دا. دوای حەفتەیەک لە بەرگریی پێشمەرگەکانی کوردستان، سوپای عێراق و جاشەکان ناوچەی قەرەداخیان داگیرکرد. پێشمەرگە قەرەداخی جێهێشت و بەرەو قۆپیی قەرەداخ و گەرمیان پاشەکشەیکرد. خەڵکی ناوچەی قەرەداخ بوو بە دوو بەشەوە، بەشێکی بەرەو سلێمانیی هەڵهات، بەشەکەی تری بەرەو گەرمیان هەڵهات.

**ئەنفالی سێ:**

ڕۆژی ٧/ ٤/ ١٩٨٨ دەستپێکرد و لە ٢٠/ ٤/ ١٩٨٨ کۆتاییهات. ناوچەی گەرمیانی نێوان کەلار و کفریی و چەمچەماڵی گرتەوە. هێزی مەڵبەندی یەکی یەکێتیی لەگەڵ هێزێکی حیزبی شیوعیی عێراق لە گەرمیان مابوونەوە. لە ئەنفالی سێدا ژمارەیەکی زۆر پێشمەرگە لە شەڕەکەدا شەهیدبوون و ژمارەیەک ئەنفالکران. زۆرینەی خەڵکی ناوچەی گەرمیان بەر ئەنفال کەوتن. ڕۆژی ١٤/ ٤/ ١٩٨٨ زۆرترین خەڵکی ناوچەی گەرمیان ئەنفالکران، بۆیە دوای ڕاپەڕیین ١٤/ ٤ وەکو ڕۆژی ئەنفالی کوردستان ناسرا.

**ئەنفالی چوار:**

ڕۆژی ٢/ ٥/ ١٩٨٨ دەستپێکرد، لە ماوەی کەمتر لە ڕۆژێکدا کۆتاییهات. ناوچەی شوان و قەڵاسێوکە و دەشتی کۆیە و گوندەکانی عەسکەر و گۆپتەپەی گرتەوە. گوندەکانی ناوچەکە ئاوەدانبوون، ناوچەکە سنووری پێشمەرگەی مەڵبەندی دوو بوو، هێزی پێشمەرگەی مەڵبەندی یەکیش کە لە ئەنفالی سێدا پاشەکشەیکردبوو، لەگەڵ هێزەکانی مەڵبەندی دوو بوون. ئێوارەی ٢-٣/ ٥/ ١٩٨٨ فڕۆکەکانی سوپای عێراق بە چەکی کیمیاویی گوندەکانی عەسکەر و گوپتەپە و ناوچەکەیان بۆردوومانکرد. ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی مەدەنیی شەهید و بریندار بوون. بۆ ڕۆژی دوایی هێزە چەکدارەکانی عێراق هێرشیان دەستپێکرد، تیپی ٥٥ی قەردەداخی مەڵبەندی یەک لە سنووری دەشتی کۆیە

بوون، بەرگرییەکی چاکیان کرد، شەڕی دەستەویەخەیان لەگەڵ سوپای عێراق کرد و ١١ پێشمەرگەی شەهیدبوون. هێزەکەی تری مەڵبەندی یەک و مەڵبەندی دووی یەکێتیی، بەبێ بەرگریی بەرەو دەشتی کۆیە و ناوچەی خۆشناوەتیی پاشەکشەیکرد، هەندێک لە هێزەکەی مەڵبەندی یەک بەرەو گەرمیان گەڕانەوە. لە ئەنفالی چواردا وەکو ئەنفالی سێ زۆرینەی خەڵکی ناوچەکە لە لایەن سوپای ڕژێمی بەعسەوە ئەنفالکرا.

## ئەنفالی پێنج:

ڕۆژی ١٥/ ٥/ ١٩٨٨ دەستیپێکرد، هەتا ڕۆژی ٧ی حوزەیران بەردەوامبوو، ناوچەی خۆشناوەتیی پارێزگای هەولێری گرتەوە. هێزی پێشمەرگەی مەڵبەندی ٣ سێی یەکێتیی و لقی دووی پارتیی لێبوو. پێش ئەوەی ئەنفال دەستپێبکات، مەڵبەندی سێ و مەکتەبی عەسکەریی یەکێتیی، خەڵکی ناوچەکەیان ئاگادارکردەوە گوندەکانی خۆیان چۆڵبکەن و بەرەو ئێران بڕۆن، یان بۆ ڕانیە و هەولێر و شارۆچکەکانی تری ژێر دەسەڵاتی ڕژێمی عێراق بڕۆن، بۆ ئەوەی وەکو خەڵکی گەرمیان بەر شاڵاوی ئەنفال نەکەون.

ڕۆژێک پێش هێرشەکانی ئەنفال، فڕۆکە جەنگییەکانی سوپای عێراق، بە چەکی کیمیاویی گوندەکانی وەرێ و گوڵان و هیران و نازەنین و وەرتێیان بۆردوومانکرد، لەبەرئەوەی گوندی وەرێ و گوڵان لەژێر دەسەڵاتی ڕژێمدا بوون گوندەکانیان چۆڵنەکردبوو، ژمارەیەکی زۆر خەڵکی مەدەنیی شەهید و برینداربوون.

کە هێرشی سوپای عێراق لە ئەنفالی (٥) دەستیپێکرد، پێشمەرگەکانی یەکێتیی لە شاخەکانی سەر دۆڵی سماقوڵیی و بالیسان و مەلەکان و بەرزاییەکانی نزیک ڕەواندوز بەرگرییەکی باشیان کرد، بەو هۆیەوە ئەنفالی ٥ درێژەیکێشا. شەهید و بریندار هەبوو، بەڵام لە چاو ئەنفالەکانی تردا کەمبوون.

ئەنفالی شەش، لە مانگی تەموزی ١٩٨٨ دەستیپێکرد، ناوچەی خواکوڕک و دەروبەری گرتەوە. ئەنفالی حەوت و هەشت لە مانگی ئابی ١٩٨٨ دەستیپێکرد و سنووری ناوچەی بادینانی گرتەوە. لەو سنوورەدا پێشمەرگەی پارتیی هێزی باڵادەست بوو، هەتا دوای ڕاوەستانی شەڕی ئێران – عێراق لە ڕێککەوتی ٨-٨-١٩٨٨ ئەنفالی هەشت بەردەوامبوو.

**چارەنوسی ئەنفالکراوەکان:**

لە سەرەتای هەموو هەڵمەتێکی ئەنفالدا، سوپای عێراق بە چەکی کیمیاویی بۆردوومانی گوندە گەورەکانی سنوورەکەی دەکرد. لە ئەنفالی یەکدا گوندی سەرگەڵوو و سەنگەرەکانی پێشمەرگە و گوندی شاناخسێی ناوچەی شاربازێڕ و شاری هەڵەبجەی بە خەستیی بە چەکی کیمیاویی بۆردوومانکرد.

لە ئەنفالی دوودا گوندەکانی سێوسێنان و دوکان و مچەکوێر و مەسۆیی و چەمی سمۆر و جافەران و تەکیە و بەلەکجاڕ و بەڵخە و عەلیاوای ناوچەی قەرەداخی بە خەستیی کیمیابارنکرد. لە ئەنفالی سێدا، گوندەکانی تووکن و عەزیز قادر و گوندەکانی تری گەرمیانی بە چەکی کیماویی بۆردوومانکرد. لە ئەنفالی چواردا، گوندەکانی عەسکەر و گوپتەپە و کانیی هەنجیری بە چەکی کیمیاویی بۆردوومانکرد. لە ئەنفالی پێنجدا، گوندەکانی هیران و نازەنین و وەرتێ و گوڵان و وەرێی بە چەکی کیمیاویی بۆردوومانکرد.

ئامانج لەم بۆردوومانە کیمیاوییە ئەوە بوو، زۆرترین زیانی گیانیی بە خەڵک بگەیەنێت. کۆمەڵکوژیی ئەنجامبدات. ئەو ناوچەیەی بەر هەڵمەتی کیمیاویی دەکەوت، ئاووهەوا و خواردنی بە چەکی کیماویی ئالودەدەبوو، بە کەڵکی ژیان نەدەهات. لە لایەن خەڵک و پێشمەرگەوە چۆڵدەکرا. کاتێک خەڵکی ناوچە ڕزگارکاوەکان و هێزی پێشمەرگەی کوردستان ئەو کۆمەڵکوژییەی گوندەکانیان دەبینی، ورەیان دەڕوخا و ئیرادەی بەرگرییکردنیان دادەبەزی. دوای هەڵمەتە کیمیاوییەکە، سوپای عێراق و جاشەکان هێرشیان بۆ سەر ناوچەکە دەستپێدەکرد.

کیمیابارن سەرەتای ئەنفالەکان بوو، سەرەتای ڕاگەیاندنی ئەو ناوچانە بوو بە ناوچەی قەدەغەکراو، تەڕ و وشکی پێکەوە دەسوتاند. قوربانییەکان ژن و منداڵ و گەورە و بچووکی خەڵکی مەدەنیی گوندەکان بوون، بە کەسوکار و بنەماڵەی ئەو کەسانەیشەوە کە لەو کاتەدا سەرباز و چەکداری ڕژێمی بەعس بوون. لە ناو شەهیدانی کیمیاباراندا ژمارەی منداڵ و ژن زۆر بوو، لەبەرئەوەی لە چاو پیاواندا توانای ڕاکردن و خۆشاردنەوەیان کەمتر بوو.

ئەو کەسانەی لە هەڵمەتی چەکی کیمیاویی و هێرشە زەمینییەکانی هێزە چەکدارەکانی عێراقدا شەهیدنەبوون، هەندێکیان کەوتنە دەست سوپای عێراق، ئەوانە بەر شاڵاوی ئەنفال کەوتن، دەبرانە خوارووی عێراق و لەوێ کۆمەڵکوژدەکران و لە

گۆڕی بە کۆمەڵدا تەرمەکانیان دەشاردنەوە. نزیکەی ١٨٠ هەزار کەس لە هەڵمەتەکانی کیمیاباران و هێرشە زەمینییەکان و ئەنفالدا شەهیدبوون.

چەکدارە کوردەکانی سوپای عێراق (جاشەکان) لە چەندیین شوێن هاوکاریی خەڵکی مەدەنیی و پێشمەرگەیان دەکرد، ئەو کەسانەی بەردەستیان دەکەوتن دەیانشاردنەوە و ڕادەستی سوپای عێراقیان نەدەکردن. وەکو چەکداری خۆیان دەیانناساندن و پێناسیان بۆ دروستدەکردن، یان وەکو خزم و کەسوکاری خۆیان پەنایاندەدان و لە ئەنفال و بێسەروشوێنکردن ڕزگاریاندەکردن.

سەدان پێشمەرگە و خێزانی پێشمەرگە و هاولاتیی لە لایەن چەکدارەکانی فەوجە سوکەکانەوە لە ئەنفالکردن ڕزگارکران، سەدان کەس لە ڕێگەی خزم و دۆستیانەوە کە لە ناو هێزە چەکدارەکانی سوپای عێراق و حکومەتی عێراقدا بوون، بە نهێنیی لە سنووری ناوچەی ئەنفالدا دەربازکران و لە مەرگ و لە ئەنفال ڕزگاریانبوو. هەندێک لە پێشمەرگە و خەڵکی ناوچە ڕزگارکراوەکان خۆیان ڕادەستی حکومەتی عێراق کردەوە، زۆربەی ئەو کەسانە ئەنفالکران، ژمارەیەکیان ئازادکران و ژیانیان پارێزرا.

زۆرینەی هێزی پێشمەرگە و خەڵکی ناوچە سنوورییەکانی هەرێمی کوردستان، بەرەو سنووری ئێران ڕەویانکرد، وەکو ئاوارە لە ئێران نیشتەجێبوون، بۆ ماوەی چەند ساڵێک لە ئێران لە ئاوارەییدا مانەوە. لە هەندێک ناوچەدا پێش دەستپێکردنی شاڵاوی ئەنفال خەڵکی گوندەکان ناوچەکەیان چۆڵدەکرد، لە شار و شارۆچکە نزیکەکانی ناوچەکە نیشتەجێدەبوون، ئەو خەڵکانەیش لە مەرگ و ئەنفال ڕزگاریاندەبوو.

لە ئەنفال و کیمیاباراندا خەڵکی کوردستان تەنها گیانیلەدەستنەدەدا، بەڵکو خەڵک بەسەر وماڵەوە تیادەچوو، ماڵی گوندییەکان دەڕوخا، کێڵگەکانیان سوتان و مەڕ و ماڵاتیان لەگەڵ خۆیاندا تێداچوون، ئەوانەیشی مانەوە لە شوێنی ژیان و بەرهەمهێنانی خۆیان دابڕان. پاش کارەساتی کیمیابارانی هەڵەبجە، سامانی خەڵکەکە کەوتە ژێر دەستی هێزەکانی عێراق و هێزی پێشمەرگە و سوپای پاسداران، خانووەکانیان بە سەریەکدا ڕوخێنران و لەگەڵ شەقامەکاندا تەختکران. بە کورتیی لە کارەساتی ئەنفال و کیمیابارانی کوردستاندا خەڵکی بەرکوتوو بەسەر و ماڵوە تیاچوو.

پێش ڕاپەڕیین ناوبەناو ژمارەیەک لە ئاوارەکانی ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجە دەگەڕانەوە بۆ عێراق، جارێکی تر ژمارەیەک لەو گەڕاوانە ئەنفالدەکرانەوە. ئەو

کەسانەی لە هەڵمەتی کیمیابارانی هەڵەبجە ڕزگاریانبوو، ئاوارەی ئێران نەبوون و بەرەو سلێمانیی هەڵهاتن. حکومەتی عێراق لە شارەزوور شارۆچکەیەکی نوێی بە ناوی سەدامیە/ هەڵەبجەی بۆ دروسکردن و لەو شارۆچکەیەدا نیشتەجێیکردن. دوای ڕاپەڕیین ناوی سەدامیە/ هەڵەبجە گۆڕا بۆ هەڵەبجەی تازە، واتە قەزای شارەزوور.

## فەلسەفەی ئەنفال و کیمیاباران

### ١- نەتەوەپەرستیی عەرەب:

ئەگەر سەیری لاپەڕەکانی مێژووی مرۆڤایەتیی بکەین، شەڕ یەکێکە لە ڕوداوە کارەساتبار و چارەنوسسازەکانی مێژووی مرۆڤایەتیی، لە شەڕدا تاوانی گەورە بەرانبەر بە مرۆڤ ئەنجامدەدرێت، هەندێک جاریش شەڕ مرۆڤ و مرۆڤایەتیی لە ژێردەستیی و چەوسانەوە ڕزگاردەکات.

لە کاتی شەڕە گەورەکاندا بە تایبەتیی لە شەڕە ناڕەواکاندا، زۆر جار گەلێک، یان پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتیی دەبێتە قوربانیی و کۆمەڵکوژدەکرێت، لە جەنگی یەکەمی جیهانییدا دەوڵەتی عوسمانیی و حیزبی ئیتحاد و تەرەقیی، لەژێر سێبەری داکۆکییکردن لە ئیسلام و لە دەوڵەتی عوسمانیی، گەلی ئەرمەنیان کۆمەڵکوژکرد.

لە ساڵانی ١٩١٤ - ١٩١٥دا، نزیکەی ملیۆنێک ئەرمەنیی بە دەستی سوپای تورک کوژران، سەدان هەزار ئەرمەنیی لە زێدی خۆیان دەرکران، سەدان هەزار لە دەستی جەندرمەی تورک دەربازبوون و ئاوارەی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ڕوسیا و ئەوروپا بوون، بەو هۆیەوە گەلی ئەرمەنیی لە تورکیادا بووە کەمیینە، ئامانجی تورانییەکان لە کۆمەڵکوژیی گەلی ئەرمەندا هاتەدی*٢.

لە جەنگی دووەمی جیهانییدا، لەژێر پەردەی زیانگەیاندنی جوو بە بەرژەوەندیی ئەڵمان و ڕابەرایەتییکردنی جووەکان بۆ جوڵانەوەی کۆمۆنسیتی جیهانیی، سوپای ئەڵمانیای نازیی، جووەکانی ئەڵمانیا و جووەکانی هەندێک لە وڵاتانی تری ئەوروپای کۆمەڵکوژکرد*٣.

لە کۆتایی ساڵانی سەدەی بیستدا، لە ئەفریقا و لە ئاسیا لە کاتی گەرمبوونی شەڕی ناوچەییدا، کۆمەڵکوژیی پێکهاتە نەتەوەیی و ئەتنیکییەکان ڕویداوە، وەکو

کۆمەڵکوژیی توتسیی و هیتیی لە ئەفریقا. لە ساڵانی کۆتایی شەڕی نێوان عێراق - ئێران، لە کارەساتی ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجەدا، کۆمەڵکوژیی و جینۆسایدی گەلی کورد لە باشووری کوردستان لە لایەن ڕژێمی بەعسەوە ئەنجامدرا*٤.

لە شەستەکانی سەدەی بیستدا سیاسەتی نەتەوەپەرستیی لە ناو عەرەبی عێراقدا پەرەیسەند و دەستی بەسەر حوکمڕانیی دەوڵەتی عێراقدا گرت، ئامانجی ستراتیژی سیاسەتی نەتەوەپەرستیی عەرەبی عێراق ئەوە بوو، لە ڕێگەی دەوڵەتی عێراقەوە هەموو عەرەب ئازادبکات، ئیسرائیل لەناوببات، ئێران و وڵاتانی تری ڕکابەری ناوچەیی عێراق زەلیلبکات. حیزبی بەعس سێ مەترسیی بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەیی عێراق دیاریدەکرد: ئیسرائیل، ئێران، کورد. ئیسرائیل لەبەرئەوەی فەلستینی داگیرکردووە و هەموو عەرەب دەرەقەتینایەت. ئێران لەبەرئەوەی بەردەوام لەسەر سنوور ناکۆکیی لە نێوان عێراق و ئێراندا هەبووە. لەبەرئەوەی ئێران کاریگەریی لەسەر زۆرینەی عەرەبی شیعەی عێراق هەیە، ئەگەر هەیە هەموو کات درز بخاتە ناو کۆمەڵگەی عێراق و ئاستەنگیی بۆ بەرنامەکانی بەعس دروستبکات. کورد لەبەرئەوەیە لە ڕووی نەتەوەییەوە عەرەب نییە، جێگەی باوەڕ نییە، گومانی لێدەکرێت لە پشتەوە خەنجەر لە عروبەی بەعس بدات.

بۆ سنووردارکردن و سەرکەوتن بەسەر ئاستەنگیی شیعەدا، ڕژێمی بەعسی عێراق ڕێگە و شوێنی هەمەجۆری پەیڕەوکرد، شیعەکانی لە عێراق دەردەکرد، چالاکە سیاسییەکانی شیعەی دەستگیردەکرد و دەیکوشتن، ساڵی ١٩٨١ دژی ئێران، شەڕی عێراق - ئێرانیشی هەڵگیرساند.

بەرانبەر بە کورد بەعس چەندیین سیناریۆی هەبوو، دەیویست کورد وەکو پێکهاتەیەکی لاوزای بێئیرادە بۆ ئامانجە سیاسییەکانی خۆی بەکاربهێنێت، ئەم بەرنامەیەی لە ڕێگەی بەعسییکردنی تاکی کوردەوە، لە ڕێگەی پێکهێنانی حیزبی کارتۆنی و دامودەزگای حوکمی زاتیی و فەوجە سوکەکانی بەرگریی نیشتیمانییەوە ئەنجامدەدرا، دەیویست کورد بکاتە پێکهاتەیەکی پلە دووی عێراق، مافی ئابوریی و ئیداریی هەبێت، مافی نەتەوەیی نەبێت، لە سیاسەتی نەتەوەییدا دۆستایەتیی حیزبی بەعس بکات و خزمەتی عەرەب بکات. لەسەر ئەو بنەمایە سەدام حوسەین دەیگوت کوردەکان گەلی ئێمەن، کەس نییە بە قەدەر ئێمە دڵسۆزی کورد بێت.

کاتیک ڕژێمی بەعس دەبینی بە سیناریۆی یەکەم ئامانجەکانی خۆی ناپێکێت، هەندێک مافی زیاتری بە گەلی کورد دەبەخشی، ڕێککەوتنی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ لەگەڵ مەلا مستەفا و گفتوگۆی ساڵی ١٩٨٤ لەگەڵ یەکێتی لەسەر ئەو بنەمایە بوو. ڕژێمی بەعسی عێراق سیناریۆی تریشی بۆ کورد هەبوو. شانبەشانی ئەو سیاسەتە دۆستانەیەی بەرانبەر بە کورد، سیاسەتێکی دوژمنکارانەیشی هەبوو، ئەو سیاسەتە بۆ کاتێک بوو ئەگەر بزانێت کوردەکان بەو مافە سنووردارانە ڕازینابن، وەکو هەر نەتەوەیەکی تری جیهان هەموو مافێکی نەتەوەییان دەوێت، دەسەڵاتی بەعسیش لەوپەڕی بەهێزییدا بێت، یان کاتێک دەسەڵاتدارانی باشووری کوردستان هاوسەنگەری دوژمنی ستراتیژی دەوڵەتی عێراق بن، سیناریۆی سێیەم بەکاردەهێنێت، سیناریۆی سێیەم بەعەرەبکردنی کورد و کوردستان دەگرێتەوە، ڕاگواستنی کورد دەگرێتەوە، لە ئەنفال و کیمیاباراندا لەناوبردنی جەستەیی و کەلتوریی گەلی کوردیشی گرتەوە. ڕژێمی بەعس سیاسەتی ئاشکرا و سیاسەتی نهێنیی بەرانبەر بە کورد هەبوو، بە ئاشکرا بە کوردی دەگوت ئەگەر بەو دەستکەوتە کەمانە ڕازیت و لەگەڵمدا دەبیت باشە، ئەگەر ڕازینابیت بە نهێنیی پێیدەگوت لەناوتدەبەم، بە نهێنیی هەوڵی بێهێزکردنی کوردی دەدا، هەر کاتێکیش دەرفەتی بۆ هاتبێتە پێشەوە، کۆمەڵکوژیی و توانەوەی نەتەوەیی بەسەردا دەسەپاند.

## ٢– هەڵەی کورد:

یەکێک لە هەڵە ستراتیژییەکانی شۆڕشی کورد ئەوەیە، کاتێک لە عێراقدا داوای ماف و ئازادیی خۆی دەکات، تێکۆشانی دیپلۆماسیی واناکات بیسەلمێنێت کورد مەترسیی لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی عەرەب دروستناکات، بە پێچەوانەوە لەگەڵ دەسپێکردنی خەباتی چەکدارییدا، هێندە سیاسەتی بێبنەما پەیڕەودەکات، دەکەوێتە ئەو داوەوە کە نەتەوەپەرستیی عەرەب بۆیداناوە، لەبریی ئەوەی کورد خۆی لە ڕیزی دوژمنەکانی ئاسایشی نەتەوەی عەرەب دووربخاتەوە، هەردەم خۆی کردووە بە ناو ڕیزی ئەو هێزانەدا کە دەوڵەتی عێراق وەکو دوژمنی ئاسایشی نەتەوەیی عەرەب پۆلێنیاندەکات.لە بەرانبەر هیچدا شۆڕشی ئەیلول هێزێکی یەدەکی ئیسرائیل و ئێران و ئەمریکا بوو، هەتا ئەو کاتەی کاریانپێیبوو لە سەرێ ڕایانگرت و دژایەتیی عێراقیان پێدەکرد، کە کاریانپێنەما، پشتیانبەردا و ئاشبەتاڵیان پێکرد. لە گەرمەی شەڕی عێراق

– ئێراندا لە ساڵی ١٩٨٦ بە دواوە، هەموو هێزەکانی باشووری کوردستان لەگەڵ سوپای پاسدارانی ئێراندا، هاوپەیمانیی سەربازییان دروستکرد، لە چەندین شەڕی کاریگەردا دژی سوپای عێراق شەڕیان دەکرد. لە ناوچە ڕزگارکراوەکانی باشووری کوردستاندا بە نهێنیی و بە ئاشکرا بنکەی سوپای پاسدارانی ئێران کرایەوە.

لە ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٨٦دا، هێزێکی سوپای پاسدرانی ئێران بە چاوساغیی هێزی پێشمەرگەی یەکێتیی، بۆردوومانی چاڵە نەوتەکانی زمبور و جەبەل بۆر و باباگوڕگوری دەوروبەری کەرکویان کرد*٥.

لە ١٣/ ٤/ ١٩٨٧دا هێزێکی هاوبەشی پێشمەرگە و پاسدار، لە قۆناغی یەکەمی شەڕی داستانی ڕزگارییدا، پەلاماری بەرزاییەکانی ئەزمەڕ و گویژە و قەیوانی دەوروبەری شاری سلێمانیی دا، بۆ ئەوەی سەرەتا ناوچەی شارباژێڕ ئازادبکرێت و لە قۆناغی دووەمی شەڕکەدا، شاری سلێمانیی ئازادبکرێت. چەندین پاسدار لە بورجەکەی ئەزمەڕ کوژران، سوپای عێراق دەستی بەسەر تەرمەکاندا گرت. ئیتر بۆ عێراق ئاشکرابوو کە ئێران و یەکێتیی دەیانەوێت سلێمانیی داگیربکەن*٦.

لە ساڵی ١٩٨٨دا پێشمەرگە و سوپای پاسداران بەرنامەیان دانابوو، قەڵادزێ، دوکـان، هەڵەبجە ئازادبکەن*٧. هۆکاری پوچەڵبوونەوەی هێرشە هاوبەشەکانی پێشمەرگە و پاسدار بۆ ئـەوە دەگـەڕایـەوە کە سوپای پاسدارانی ئێران و هێزی چەکداری ئێران ئێرادەی شکابوو، لە شەڕەکانی تردا شکستیخواردبوو.

لایەنە سیاسییەکانی باشووری کوردستان کاتێک هاوپەیمانیی سەربازیی لەگەڵ سوپای پاسدارانی ئێران دەکرد، کە ئێران لە ئاستی نێودەوڵەتییدا پەراوێزخرابوو، جیهان دژی سیاسەتی ئێران بوو. عێراق بە نوێنەرایەتیی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیی شەڕی ئێرانی دەکرد. ئەمریکا پشتیوانیی لە عێراق دەکرد.

ئیتر ڕژێمی بەعس دەرفەتی بۆ لوا بەرنامە دوژمنکارانەکەی بەرانبەر بە کورد ئەنجامبدات، لەژێر سێبەری هێزەکانی سوپای پاسدارانی ئێران لە ناو خاکی عێراقدا دەردەکەین، سەروەریی بۆ دەوڵەتی عێراق دەگێڕینەوە، بەکرێگیراوەکانی ئێران ڕادەماڵین. بە پشتیوانیی خەڵکی عێراق و وڵاتانی عەرەبیی و ئەورووپا و ئەمریکا، هەڵمەتی ئەنفال و کیمیابارانی کوردستانی دەستپێکرد.

### ٣- بەرژەوەندیی زلهێزەکان:

هەندێک لە چاودێرانی سیاسیی وەکو یۆست هیڵتەرمان پێیانوایە گواستنەوەی شەڕی (عێراق -ئێران) لە ناوچەی کەنداوەوە بۆ کوردستان، لە بەرژەوەندیی وڵاتانی ئەورووپا و ئەمریکادا بووە *٨ لەبەرئەوەی ئەو وڵاتانە بۆ دابینکردنی وزە، پشتیان بە نەوتی کەنداوی عەرەبیی دەبەست. لە سەرەتای شەڕەکەدا، ئێران ئاستەنگیی جدیی بۆ هاتوچۆی کەشتییە نەوتهەڵگرەکانی کەنداو دروستدەکرد، هەڕەشەی داخستنی تەنگەی هورمزی دەکرد. ئەم هەڕەشانەی ئێران وڵاتانی ڕۆژئاوایی و ئەمریکیی نیگەراندەکرد. بۆ سنووردارکردن و کۆتاییهێنان بەو هەڕەشانەی ئێران، هەوڵیاندەدا شەڕی (ئێران- عێراق) ڕابگرن، بەڵام ئیمام خومەینیی ڕازینەدەبوو.

بۆ کەمکردنەوەی ئاسەوارە خراپەکانی شەڕی کەنداو بۆ سەر بەرژەوەندیی زلهێزەکان، لە بەرژەوەندیی ئەو وڵاتانەدا بوو، ئەگەر شەڕ نەوەستێت، شەڕ لە ناوچەی کەنداو سوکبکرێت، یان شەڕەکە بگوازرێتەوە بۆ شوێنێکی تر، باشترین شوێنیش بۆ ئەوەی شەڕەکەی بۆ بگوێزرێتەوە، باشووری کوردستان بوو.

لەبەرئەوەی لەو کاتەدا سوپای عێراق و هێزی پێشمەرگە لە شەڕدا بوون، ڕێککەوتنی نێوان ئێران و هێزە سیاسییەکانی باشووری کوردستان کارێکی ئاسان بوو. شەڕی نێوان حکومەتی ئێران و عێراق لە کوردستاندا زیانی بە بەرژەوەندیی وڵاتانی ڕۆژئاوایی نەدەگەیاند. شەڕی نێوان ئێران و عێراق لە کوردستان شیعەی خوارووی عێراقی سەر بە ئێران بەهێزناکات. گواستنەوەی شەڕ لە باشووری عێراقی هەرە هەستیارەوە بۆ باکووری عێراق، لە بەرژوەندیی ڕۆژئاوادا بوو، بەڵام هەتا چ ڕادەیەک دەسەڵاتدارانی باشووری کوردستان و ئێران و عێراق ئاگایان لەم پلانە هەیە و هەر یەک لە لای خۆیەوە چەند هاوکاریی گواستنەوەی شەڕەکەیان کردووە، چۆن ئاگریان لە ماڵی کورد بەردا؟ هەتا ئێستا بە بەڵگە نەسەلمێنراوە.

هەتا ئێستا نەزانراوە ئایا دەسەڵاتدارانی کورد لەبەر بەرژەوەندیی وڵاتانی ڕۆژئاوا شەڕیان گواستەوە کوردستان و ئاگریان لە ماڵی کورد بەردا، یان تەنها وەڵامی سیاسەتە شۆڤینییەکانی ڕژێمی عێراقیان دەدایەوە، لە ڕقان هاوپەیمانییان لەگەڵ سوپای پاسدارانی کۆماری ئیسلامیی ئێراندا دەکرد، یان بەرنامەی وڵاتە ڕۆژئاواییەکانیان جێبەجێدەکرد؟

بۆچوونێکی تر هەیە کیمیابارانی هەڵەبجە بۆ ترساندنی ئێران و ئیمام خومەینیی بووە، بۆ ئەوەی ناچاریبکەن بڕیاری ڕاگرتنی شەڕ بدات. لە دوای دروستبوونی شەڕی عێراق - ئێران بە ماوەیەک، کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیی هەوڵی زۆری دەدا شەڕی ئێران - عێراق ڕابگیرێت، بەڵام ئێرانییەکان بە ڕاگرتنی شەڕ ڕازینەدەبوون، مەرجی گرانیان بۆ ڕاگرتنی شەڕەکە دادەنا. سوپای عێراق چەندین جار چەکی کیمیاویی دژی سوپای پاسدارانی ئێران بەکارهێنا، بەڵام زیانەکان هێندە نەبوون کاریگەریی لەسەر دابەزاندنی ورەی ئێران بکات. ئەنفال و کیمیاباران لە کاتێکدا بوو ڕژێمی عێراق ڕۆژ لە دوای ڕۆژ چەکی پێشکەوتوو و ساروخی دوورهاوێژی بەرهەمدەهێنا. کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیی پشتیوانیی زۆرتری دەکرد. ئێرانیش پاشەکشەی سەربازیی دەکرد، هیچ چەکێکی نوێی بەرهەمنەدەهێنا، بۆ ئەوەی هەڕەشە لە عێراق بکات. بە کیمیابارانی هەڵەبجە و کۆمەلکوژیی کورد هەڕەشەیان لە ئێران دەکرد. ئەگەر شەڕ ڕانەگرن، شارەکانی ئێران وەکو هەڵەبجە بە چەکی کیمیاویی دەخنکێنین. بۆچوونێکی تر لەسەر بەکارهێنانی چەکی کیمیاویی لە ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجە هەیە، گوایە چەکی کیمیاویی دەمارەکان (تابۆن، زارین، زۆمان) لە جەنگی دووەمی جیهانییەوە دروستکراوە، بەڵام هەتا ئێستا بەکارنەهاتووە، ڕێگە بە ڕژێمی بەعس دراوە ئەو چەکە بەکاربهێنێت، بۆ ئەوەی ڕێژەی کاریگەریی چەکەکە بزانرێت.

### ٤- بەکارهێنانی ئاین:

ساڵی ۱۹۷۹ شۆڕشی ئیسلامیی ئێران سەرکەوتنی بەدەستهێنا و کۆتایی بە دەسەڵاتی شاهنشاهیی ئێرانی سەر بە وڵاتانی رۆژئاوایی هێنا. وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و هێزە سیاسییەکان، بەرانبەر بەو گۆڕانکارییە هەڵوێستەیانکرد، لە لایەکەوە بینییان دەکرێت بە ئاین سیاسەت بکرێت، لە لایەکی تریشەوە لە ستراتیژی فراوانخوزیی ئیسلامیی ئێران ترسیان لێنیشت. بۆ دەوڵەتی عێراق زۆرینە شیعە و ڕکابەری ئێران، کاریگەریی ئاین لەسەر سیاسەت جدیتر وەردەگیرا، بۆیە حیزبی بەعسی سکوّلاری نەتەوەپەرست بە لای ئاینی ئیسلامدا بایدایەوە و دەستی بەو پڕوپاگەندانە کرد کە دینی ئیسلام دینی عەرەبە و هەر عەرەب دەتوانێت بەرگریی لێبکات و بیپارێزێت و پێشیبخات.

بەرانبەر بە سەرهەڵدانەوەی ئاینزای شیعەگەریی لە ئێران، بەعس ئاینزای سوننەگەریی لە عێراق دەمەزەرددەکردەوە و دەستی بە دژایەتیی شیعەگەریی کرد. یەکەم هەنگاو (ئەڵلاهوئەکبەر)ی بۆ عەلەمی عێراقی زیادکرد، بۆ ئەوەی پیشانیبدا عێراق وڵاتێکی ئیسلامییە. ناوی شەڕ و چالاکییەکانی سوپای عێراقی بە ناوی شەڕەکانی ئیسلام و سەرکردەکانی ئیسلامەوە ناودەنا، وەکو قادسیەی سەدام و قەعقاع و ئەوانی تر. لە هەمان کاتدا حیزبی بەعسی دەسەڵاتداری عێراق هەوڵیدەدا سود لە ئایەتەکانی قورئان و فەرمودەکانی پێغەمبەر (د. خ) و ئەولیاکان وەربگرێت بۆ ئەنجامدانی بەرنامە نەتەوەپەرستیی و شەڕەنگێزییەکانی.

بۆ قەڵاچۆکردنی گەلی کورد و تۆڵەکردنەوە لە خەڵکی کوردستان، لە پرۆسەکانی ئەنفال و کیمیاباراندا پەنای بۆ ئایەتی ئەنفال برد. لەبەرئەوەی ئەم ئایەتە لە کاتی شەڕەکانی ئیسلامدا بەرانبەر بە کافرەکان هاتووەتە خوارەوە. ئەمڕۆیش لە کاتێکدا عێراقی ئیسلامیی داکۆکیی لە ئیسلام دەکات، مەترسیی لەسەر عێراق دروستبووە، بەو ئاراستەیە سوپا و کادر و بەرپرسەکانی بەعسی پەروەردەدەکرد، تێیگەیاندن کە گەلی کورد و شۆڕشی کورد لە دین لایداوە و پشتگیریی شیعە دەکەن. بەگوێرەی ئایەتەکانی ئەنفال لەناوبردن و تاڵانکردنی کورد وەکو لەناوبردن و تاڵانکردنی کافرەکانی سەردەمی هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتە حەڵاڵە. ئیتر لەژێر ڕێنمایی ئایەتەکانی ئەنفالدا پرۆسەکانی کیمیاباران و ئەنفالی کوردستان دەستیپێکرد و گەلی کورد جینۆسایدکرا.

**هەڵوێست**

**(ئیتر لەمەودوا**

**لە هەڵەبجەوە دەڕوانینە خەڵک،**

**دەڕوانینە خوا)** *٩

### ١- عێراق:

یەکەم جارە لە مێژوودا سوپای دەوڵەتێک بە چەکی کیمیاویی هێرش بۆ سەر خەڵکی مەدەنیی وڵاتەکەی خۆی بکات و هەزارانی لێ شەهیدبکات، دەیان هەزاری لێ بریندار بکات، سەدان هەزاری ئاوارەی وڵاتان بکات، تاوانەکەیش ئەستۆی وڵاتانی تر دابنێت.

لە جەنگی یەکەمی جیهانییدا سوپا شەڕکەرەکان چەکی کیمیاویی خەردەلیان دژی یەکتر بەکارهێنا، بەڵام هیچ سوپایەک چەکی کیمیاویی دژی خەڵکی مەدەنیی وڵاتەکانی بەرانبەری بەکارنەهێنا. لە شەڕی (عێراق – ئێران)دا ١٩٨٠- ١٩٨٨ سوپای عێراق چەندیین جار چەکی کیمیاویی دژی سوپای ئێران و خەڵکی مەدەنیی شار و گوندەکانی ئێران بەکارهێنا. لە پرۆسەکانی ئەنفالدا سوپای عێراق چەکی کیمیاویی دژی هێزی پێشمەرگە و خەڵکی مەدەنیی عێراق لە هەڵەبجە و لە چەندیین گوندی کوردستاندا بەکارهێنا.

گازی دەمارەکان یەکێک لە چەکە کۆکوژەکانە، لە کاتی جەنگی دووەمی جیهانییدا ئەڵمانیا و ئەمریکا و وڵاتە بەشەڕهاتووەکانی تر ئەو چەکەیان دروستکرد، لەبەر کوشندەیی چەکەکە و لەبەرئەوەی هەموو وڵاتە بەشەڕهاتووەکان چەکەکەیان هەبوو، هیچ وڵاتێک دژی ئەوی تر ئەو چەکەی بەکارنەهێنا. لەو کاتەوە گازی دەمارەکان ئەمبارکراوە و بەکارنەهاتووە. بۆ یەکەم جار لە مێژوودا گازی دەمارەکان لە لایەن سوپای عێراقەوە دژی هێزی پێشمەرگە و خەڵکی مەدەنیی کورد بەکارهات، کاریگەرییەکانی تاقیکرانەوە. دوای کارەساتی کیمیابارانی هەڵەبجە، حکومەتی عێراق گوێی جیهانی بەوە کەڕکرد، کە ئێران کیمیابارانی هەڵەبجەی کردووە. ساڵی ٢٠٠٢ پێش ئەوەی ڕژێمی عێراق بڕوخێت، یوست هیڵتەرمان لە ئەورووپاوە سەردانی سلێمانیی کرد، چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ کردم، ئامانجی چاوپێکەوتنەکە ئەوە بوو بزانێت عێراق، یان ئێران هەڵەبجەی کیمیابارانکردووە؟ من بەگوێرەی زانیاریی و بەڵگە بۆم سەلماند کە فڕۆکە جەنگییەکانی سوپای عێراق بە کیمیاویی هەڵەبجەیان بۆردوومانکرد. یوست گوتی:

لە ئوردون چاوپێکەوتنم لەگەڵ چەند ئەفسەرێکی سوپای عێراق کرد، ئەوانیش سەلمندیان کە عێراق بە چەکی کیمیاویی هەڵەبجەی بۆردوومانکردووە. گوتی: ئێمە

سەرەتا کەوتینە ژێر کاریگەریی پڕوپاگەندەی حکومەتی عێراقەوە، واماندەزانی ڕاستدەکات کە دەڵێت ئیران هەڵەبجەی کیمیابارانکردووە.

## ٢- حیزبە کوردییەکان:

حیزبە کوردییەکان دەستیان بە هاوکاریی سوپای پاسدارانی ئێران کرد، پێکەوە دژی سوپای عێراق و دامەزراوە گرنگەکانی عێراق دەستیان بە چالاکیی سەربازیی کرد و حسابیان بۆ پەرچەکرداری حکومەتی عێراق نەکرد، بەرنامەیان بۆ پاراستنی خەڵک لە کۆمەڵکوژیی دانەنا.

یەکێتیی و پارتیی و بزوتنەوەی ئیسلامیی و حسک لەگەڵ سوپای پاسدارانی ئێران، ڕۆژی ١٤/ ٣/ ١٩٨٨ پەلاماری هەڵەبجەیان دا. سوپای عێراق لە هەڵەبجە شکا و بەشێکی سوپای عێراق خۆی ڕادەستکرد و بەشێکی بەرەو سلێمانیی هەڵهات. پیشمەرگەی حیزبەکان گرنگییان بە پاراستنی سەر و ماڵی خەڵکی هەڵەبجە نەدا. لە کاتی شەڕەکەدا خەڵکی شارەکەیان نەپاراست، هاوکاریی بریندارەکانیان نەکرد، بەو هەڵوێستەیان حیزبەکان لە بەرچاوی خەڵکی کوردستان کەوتن و پێگەیان دابەزی.

کاتێک خەڵکی هەڵەبجە ئاوارەی ئێران بوون، حیزبەکانی باشووری کوردستان لە خەڵکیان نەدەپرسییەوە. حیزبەکانی باشووری کوردستان گرنگیی بە ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجە و جینۆسایدی گەلی کورد نادەن.

## ٣- ئێران:

ئێران هاوکاریی بریندارەکانی کیمیابارانی هەڵەبجەی کرد، یارمەتیی ئاوارەکانی دا و کەمپی بۆ کردنەوە و نیشتەجێیکردن. ڕێگەی بە کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی ئێرانیی و جیهانیی دا ڕوماڵی کارەساتی هەڵەبجە بکەن. لەپەنای شەڕی هەڵەبجەدا، ئێران پەلاماری بنکەکانی کۆمەڵە و حدکای دا، ژمارەیەکی زۆر لە پێشمەرگەکانی کۆمەڵە لەو شەڕەدا شەهیدبوون.

### ٤- وڵاتانی عەرەبیی و کۆنگرەی ئیسلامیی جیهانیی:

هیچ وڵاتێکی عەرەبیی لەسەر کیمیابارانی هەڵەبجە هەڵوێستی نەبوو، هەموویان بێدەنگییان هەڵبژارد. لەو کاتەدا کۆنگرەی ئیسلامیی جیهانیی لە کوێت دەبەسترا، کۆنگرە لەسەر کۆمەڵکوژیی هەڵەبجە و ئەنفال هەڵوێستی پیشاننەدا.

### ٥- ئەمریکا:

لەسەر کیمیابارانی هەڵەبجە و ئەنفال، ئەمریکا هیچ هەڵوێستێکی نەبوو، ئەوە لە کاتێکدایە کە ئەمریکا ئاگاداری کارەساتەکانی ئەنفال و کیمیابران بوو. جۆنۆسن ڕاندڵی ڕۆژنامەنوسی ئەمریکیی و دۆستی کورد لە کتێبی کڵۆڵیی نەتەوەیەکدا، دەنوسێت: "عەبدولڕەحمان قاسملۆ، سکرتێری حدکا هەموو تاوانەکانی ڕژێمی سەدامی بەرانبەر بە کوردی عێراق، بۆ ئەمریکییەکان باسکردووە".

### ٦- فەرەنسا:

هەڵوێستی فەرەنسا هەڵوێستێکی مرۆڤدۆستانە بوو، دوای ماوەیەکی کورت لە کیمیابارانی هەڵەبجە، لە پاریس کۆنگرەیەک لەسەر بەکارهێنانی چەکی کیمیاویی و کیمیابارانی هەڵەبجە بەسترا. نوێنەری حیزبە کوردییەکان لەو کۆنگرەیەدا ئامادەبوون. فەرەنسییەکان عێراقیان بە بۆردومانی کیمیاویی هەڵەبجە بەرپرسیارکرد و شەرمەزاریانکرد.

### ٧- نەتەوە یەکگرتووەکان:

لە بەهاری ١٩٨٩ لەژێر چاودێریی نەتەوە یەکگرتووەکاندا لە شاری بێرنی سویسرا، لەسەر چەکی کیمیاویی و کیمیابارانی هەڵەبجە ڕۆژانی ٢٤ – ٢٥/ ٥/ ١٩٨٩ کۆنگرەیەک بەسترا. وەکو نوێنەری ئۆپۆزسیۆنی عێراق من بۆ ئەو کۆنگرەیە بانگهێشتکرابووم، بەڵام لەبەر هۆکاری تەکنیکیی ئاستەنگیی بۆ بەشدارییکردنم دروستبوو.

### ٨- هەڵوێستی کەسایەتیی و ڕۆژنامەنوس و ئەدیب و هونەرمەندان:

نوسەرێکی عەرەب بە نوسینێکی کاریگەر باسی کیمیابارنی هەڵەبجەی کرد، ڕەخنەی توندی لە هزری نەتەوەپەرستیی ڕژێمی عێراق گرت. داوای لێبوردونی لە گەلی کورد کرد. خەڵکی کوردستان و بنەماڵەی کیمیابارانی هەڵەبجە بەو نوسینە سەبورییانهات. ڕۆژنامەنوسێکی ئێرانیی، وێنەی عومەری خاوەری گرت کە منداڵەکەی لەباوەشگرتبوو، هەردووکیان پێکەوە لە کیمیابارانی هەڵەبجەدا شەهیدبووبوون. ئەو وێنەیە کاریگەریی زۆری لەسەر ڕای گشتیی و ناوخۆیی و ناوچەیی جیهانیی دروستکرد. وێنەکە وەکو هێمای تاوانی کێمیابارانی هەڵەبجەی لێهات. ڕەفیق سابیری شاعیر، هۆنراوەی (بە تەنیا جێمەهێڵە)ی لەسەر کیمیابارانی هەڵەبجە نوسی. هونەرمەندێکی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بە گورانیی ئەو هۆنراوەیەی گوت و ئەو گورانییەیش دەنگیدایەوە. حەسیب قەرەداخیی شاعیر، هۆنراوەی (هەلەبشیما)ی نوسی و باسی کیمیابارانی هەڵەبجە و سێوسێنان دەکات. شیوەن بۆ کورد و شەهید و برینداراني چەکی کیمیاویی دەکات. دەڵێت: "ئیتر لەومەودوا لە هەڵەبجەوە دەڕوانینە خەڵک، دەڕوانینە خودا".

## پێش ئەنفال و کیمیاباران

### ١-کەواسوری بەرلەشکری داگیرکەران:

هێزە سیاسییەکانی باشووری کوردستان بە لایانەوە ئاسییە پێش سوپای وڵاتان بکەون و پەلکێشی نیشتیمانی خۆیانی بکەن، چەندیین جار داوایان لە سوپای ئەو وڵاتانە کردووە سنووری کوردستان و عێراق ببەزێن و لە بەشێکی خاکی عێراقدا بمێننەوە. ئەو سیاسەتە سەرووەریی عێراق پێشێلدەکات، یاسای نێودەوڵەتیی پێشێلدەکات، هێندەی تر دەماری نەتەوەپەرستیی عەرەب دژی گەلی کورد ئەستووردەکات.

کە گفتوگۆی ساڵی ١٩٨٤ نیوان حکومەتی عێراق و یەکێتیی سەرنەکەوت، یەکێتیی خۆی بەبێ پشتیوان بینییەوە، لەو کاتەدا حیزبەکانی تری باشووری کوردستان دۆستی ئێران بوون، یەکێتیی ویستی بە زووترین کات خۆی لە ئێران نزیکبکاتەوە

و دۆستایەتیی ئێران مسۆگەربکات و لە دۆستایەتیی ئێراندا پێش حیزبەکانی تر بکەوێتەوە. ئەمە پاڵی بە یەکێتییەوە نا بەپەلە لەگەڵ سوپای پاسدارانی ئێران ڕێکبکەوت و بەرەی شەڕی هاوبەش دژی سوپای عێراق بکاتەوە.

ئیتر یەکێتیی لە ساڵی ١٩٨٦ بوو بە کەواسووری بەرلەشکری ئێران، خۆی کرد بە بەشێک لە هێزی چەکداریی وڵاتێک کە لە لایەن کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییەوە پشتگوێخرابوو و دژایەتییدەکرا، بەرپرسە ئێرانییەکان لەسەر ئەو پێوەندییەی یەکێتیی بە ئێرانەوە دەیانگوت: یەکێتیی درەنگ هات، بەڵام کە هات باش هات.

ئەو چالاکییە سەربازییە هاوبەشانەی یەکێتیی و حیزبەکانی تر و ئێران، کە لە قووڵایی خاکی عێراقدا دژی سوپای عێراق و پێگە ئابورییەکانی دەوڵەتی عێراق ئەنجامدەدرا، ئاگری لە ڕژێمی سەدام بەردابوو، ئەو ئاگرە ئاوی بەسەردا نەکرا و نەکوژایەوە هەتا ئەنفال و کیمیابارانی کوردستانی نەکرد.

## ٢- کورتبینیی سیاسیی:

هێزە سیاسییەکانی باشوور دەیانزانی پرۆسەیەکی دوورودرێژی ئەنفال و کیمیاباران بۆ سەر ناوچە ڕزگارکراوەکانی کوردستان بەڕێوەیە*١٠، ئەگەر هەیە هەموو شوێنیکی کوردستان بگرێتەوە. سەرکردایەتیی یەکێتیی کە بینی گوشار لەسەر بنکە و بارەگاکانی سەرکردایەتییان زیاتر دەبێت، ناتوانن بەرگریی لە بارەگاکانیان بکەن، هەوڵیاندا لە ناوچەیەکی ترەوە شەڕێک دروستبکەن، هەتا گوشاری سەر بارەگاکانیان کەمدەبێتەوە و خۆیان دەگرنەوە، یان هەوڵبدەن ناوچەیەکی تری کوردستان ئازادبکەن و بارەگاکانی سەرکردایەتیی بۆ ئەو ناوچەیە بگوێزنەوە. وای بۆدەچوون ئەگەر بارەگاکانی سنووری دۆڵی جافایەتیی لەدەستبدەن، هەڵەبجە ئازادبکرێت، بارەگاکانیان بۆ سنووری هەورامان و هەڵەبجە دەگوێزنەوە و لەوێوە درێژە بە شۆڕش دەدەن.

ئەم بۆچوونە سادە و کورتبینە، بۆ ئەو سەردەمە ڕاست نەبوو، لەبەرئەوەی بە دەعوەتی یەکێتیی و هێزەکانی تر، ئێران و عێراق بەرەیەکی گەرمی شەڕیان لە باشووری کوردستان کردبوویەوە، هەموو شوێنیکی کوردستان لەژێر ئاگری

چەکی کیمیاویی و چەکی کلاسیکیی سوپای عێراقدا بوو. ناوچە ڕزگارکراوەکان بە دەستی ئێرانەوە بوون، توانای سەربازیی ئێران بەشی شەڕی عێراقی نەدەکرد، توانای پاراستنی ناوچە ڕزگارکراوەکانی نەبوو، یان نەیدەویست بەرگریی لێبکات، ئێران تەنها توانای لاوازکردنی دەسەڵاتی هیزە کوردییەکانی ناوچە ڕزگارکراوەکانی هەبوو، هەر وایش دەرچوو کە پێشمەرگە و ئێران پێکەوە هەڵەبجەیان گرت، یەکێتیی هیچ سودی لە هەڵەبجە نەبینی. وەکو شاعیر دەڵێت: «ئەمیشم چوو ئەویشم چوو، بە جارێ ماڵی وێرانم».

ئەوەی بە بیری سەرکردایەتیی یەکێتییدا نەدەهات ئەوە بوو، ئەگەر هەڵەبجە و ناوچەی هەورامان و شارەزوور ئێران دەستی بەسەردا بگرێت، هێزەکانی باشووری کوردستان هیچ مافێکی حوکمڕانیی ئەو سنوورەیان نامێنێت، هەر وایش دەرچوو. پاش جێگیربوونی بارودۆخی هەڵەبجە، سوپای (ئەرتەشیی) ئێران لە هەڵەبجە شوێنی سوپای پاسدارانی گرتەوە، کش مەلیکی لە هێزی پێشمەرگە کرد. سوپا گوتی: دەبێت بە زووترین کات ئەم ناوە چۆڵبکەن، دەبێت لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا بارەگاکانتان لە ناوچەی هەورامان و گوندەگانی دەوروبەری هەڵەبجە بەرەو سەرسنوور بگوێزنەوە*١١.

یەکێتیی و حیزبەکانی تر ناچارکران کە هەڵەبجە و دەوروبەری چۆڵبکەن و لەسەر سنووری ئێران - عێراق بارەگا بکەنەوە.

### ٣- ئاگر لە ماڵی خۆم بەردەدەم:

یەکێک لە هەڵە کوشندەکانی تری یەکێتیی و هێزەکانی تر ئەوە بوو، شەڕی عێراق ئێرانیان بۆ ناو کوردستان ڕاکێشا. ساڵی ١٩٨٦ هێزی پێشمەرگەی کوردستان ناوچەیەکی فراوانی ڕزگارکراوی کوردستانی لە ژێردەستدا بوو، لە پارێزگای سلێمانیی و کەرکوک، گەرمیان و قەرداغ و بەشێکی سارباژێڕ و جافایەتیی لە ژێردەستدا بوو. لە پاریزگای هەولێر بەشیکی دەشتی هەولێر و ناوچەی خۆشناوەتیی و قەراج و کەندیناوای لە ژێردەستدا بوو، خواکوڕک و بەشێکی ناوچەی بادینانیش هەر ناوچەی ئازادکراو بوو.

بەگوێرەی ئەو ڕێککەوتنەی هێزە کوردییەکان لەگەڵ سوپای پاسداراندا کردیان، بارەگای سوپای پاسداران و ئۆپۆزسیۆنی عێراقیی سەر بە ئێران لە ناوچە ڕزگارکراوەکاندا کرایەوە. ئیتر ئەو ناوچە ڕزگارکراوانە لە لایەن حکومەتی عێراقەوە وەکو ناوچەیەکی داگیرکراو مامەڵەی لەگەڵدا دەکرا. وەکو مولگەی هێزە چەکدارەکانی ئێران هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکرا. بوو بە بەرەیەکی شەڕی ئێران – عێراق و ئارامیی و ئاسایشی تێکچوو.

بەگوێرەی قسەی دانیشتوانی هەڵەبجە و ئەو پێشمەرگانەی لە دەوروبەری شاری هەڵەبجە چالاکییاندەکرد، هەڵەبجە تەنها بە فەرمیی لە لایەن عێراقەوە حوکمدەکرا، هەر بە شێوە ڕژێمی بەعس لە هەڵەبجەدا دەسەڵاتی هەبوو. شاری هەڵەبجە و دەوروبەری بە شەو بە دەستی هێزی پێشمەرگەوە بوو، بە ڕۆژیش شوێنی حەوانەوەی پێشمەرگە بوو، شوێنی کۆبوونەوەی پێشمەرگە و ڕێکخستنی حیزبە سیاسییەکانی باشوور بوو. ئیتر بۆ پێویستبوو ناوچەیەک، شارێک، کە لەژێر دەسەڵاتی خۆتدا بێت و ئازاد و نیمچە ئازاد بێت، بیکەیتە مەیدانی شەڕی عێراق – ئێران و بە دەستی خۆت ئاگر لەماڵی خۆت بەربدەیت؟

### لە کاتی ئەنفال و کیمیاباراندا:

### ١- تەنها خۆم و خزمەکانم:

هەڵەیەکی تری کوشندەی هێزە دەسەڵاتدارەکانی باشووری کوردستان ئەوە بوو، خەڵکی کوردستانیان خۆشنەدەویست، بە لایانەوە گرنگ نەبووە چەند شەهیددەبێت و چۆن شەهیددەبێت، چەند بریندار‌دەبێت و چەند ئاوارەدەبێت، چەند هەتیودەکەون و چەند بێوەژندەکەون.

سەرکردە و بەرپرسی حیزبەکان تەنها بیریان لە خزم و کەسوکارەکانی خۆیان دەکردەوە. پێش هێرشی پێشمەرگە و پاسدار بۆ سەر هەڵەبجە، بەرپرسەکانی هەموو حیزبە بەشداربووەکانی شەڕەکە، کەسوکار و بنەماڵەکانی خۆیانیان ئاگادارکردبووەوە کە هەڵەبجە چۆڵبکەن، بڕۆن بۆ سلێمانیی، یان بڕۆن بۆ ئێران، بۆ ئەوەی سەر و ماڵیان تێدانەچێت.دوای کارەساتی کیمیاباران دەرکەوت کە خزم و کەسی نزیکی بەرپرسە

هەڵەبجەییەکانی حیزبەکان، هەمووی پارێزراون، لەبەرئەوەی پێش کارەساتەکە ئاگادارکرابوونەوە هەڵەبجە بەجێبهێڵن.

لە ئەنفال ڕزگارم بوو، لە شارۆچکە و ئوردوگاکانی ئێراندا بە شوێن کەسوکارمدا دەگەڕام، لە شاری پاوە ڕێمکەوتە ماڵی بەرپرسێکی یەکێتیی، بڕێکی زۆر کەلوپەلی ناوماڵم لە ماڵیان بینی، ئەو جۆرە کەلوپەلانە لە هیی ماڵی پێشمەرگە نەدەچوو. گوتم مامۆستا، ئەم کەلوپەلە چییە؟ هیی کێیە؟ گوتی: ئەوە کەلوپەلی ماڵی باوکمە، چەند ڕۆژێک پێش ئەوەی هەڵەبجە بگیرێت ئاگادارمکردن هەڵەبجە چۆڵبکەن و بێن بۆ لای خۆم، ئەوانیش بە ناوماڵەکەیانەوە بەرەو لای ئێمە هاتن. دوای چەند ڕۆژێکی تر سەردانی دەوروبەری مەریوانم کرد، خزمێکی خۆمم بینی، پیشمەرگەی پارتیی بوو، هەواڵی برا و کەسوکاریم لێپرسی، گوتی: هەموویان سەلامەتن، چەند ڕۆژێک پێش گرتنی هەڵەبجە، ئاگادارمکردن کە هەڵەبجە بەجێبهێڵن و بەرەو سلێمانیی بڕۆن.

### ٢- هەڵەبجە نەپارێزرا:

لە کاتی شەڕی هەڵەبجەدا هیچ ئامادەکارییەک بۆ پاراستنی خەڵکی هەڵەبجە نەکرا، فڕۆکەکانی سوپای عێراق بە ئازادیی بۆردوومانی هەڵەبجەیان دەکرد، هیچ بەرگرییەکی زەوی بۆ ئاسمان، یان هیچ بەرگرییەکی ئاسمانیی لە سنووری هەڵەبجە و ئاسمانی هەڵەبجەدا بەگەڕنەخرابوو.

چەکی دژی فڕۆکە، یان ساروخی دژەفڕۆکە لەسەر لوتکەی شاخەکانی ناوچەی شەڕەکەدا دانەمەزرابوو هەتا ڕووبەڕووی هێرشی فڕۆکە جەنگییەکانی سوپای عێراق ببێتەوە، لە ڕۆژانی شەڕەکەدا یەک فڕۆکەی جەنگیی ئێران لە ئاسمانی ناوچەکەدا نەبینراوە هەتا ڕووبەڕووی فڕۆکە جەنگییەکانی سوپای عێراق ببێتەوە.

فەرامۆشکردنەی ئاسایشی هەڵەبجە لە کاتێکدا بووە کە لە بەهاری ساڵی ١٩٨٧ بە دواوە، ئەگەر پێشمەرگە دەستی بەسەر ڕەبایەیەکی سوپای عێراقدا بگرتایە، سوپای عێراق بە چەکی کیمیاویی بۆردوومانی ئەو ناوچەیەی دەکرد، کەچی هێزی پێشمەرگەی کوردستان بەرنامەی ڕزگارکردنی هەڵەبجەی دانا، بەبێ ئەوەی هێزی بەرگریی ئامادەبکات.

### ٣- بریندارەکان فەرامۆشکران:

ئەو هێزەی حیزبە سیاسییەکانی باشووری کوردستان کە پەلاماری هەڵەبجەیان دا، پزیشک و دەرمانی پێویستیان لەگەڵ خۆیان نەبردبوو. قناعی غاز و دەرمانی چەکی کیمیاوییان بۆ پاراستنی خەڵکی هەڵەبجە نەبردبووز هیچ ئامادەکارییان بۆ چارەسەری بریندار نەکردبوو. پێشمەرگە و پاسدار بڕێکی باشی قناعی غاز و جلوبەرگی خۆپاراستنی چەکی کیمیاوییان لەبەرکردبوو. خەڵکیش بە جلوبەرگی ئاساییەوە غازی کیمیاویی بەسەریدا دەباری. بەو شێوەیە لە شەڕی هەڵەبجەدا تەنها خەڵکی مەدەنیی پێوەبوو و سەر و ماڵی تێداچوو. خزمی بەرپرسەکان و هێزی پێشمەرگە، بەبێ زیانی مادیی و گیانیی، بە دەستکەوتەوە بۆی دەرچوون.

### ٤- نرخی هاوڵاتیی:

لە کاتی ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجەدا، بەرپرسەکانی هێزی پێشمەرگە بیریان لە ڕۆحی خەڵکی کوردستان نەدەکردەوە، بەرنامەیەکیان بۆ پاراستنی گیانی خەڵکی کوردستان دانەنابوو، لە بیری گیان و سامانی خەڵکی کوردستادا نەدەژیان، بەبێ پێوانە بڕیاریاندەدا. لە ئەنفالی سێدا بە گوێی خۆم بیستم کە بەرپرسێکی باڵای هێزی پێشمەرگە داوای لە بەرپرسانی پێشمەرگە دەکرد ڕێگەنەدەن خەڵکی ناوچە ڕزگارکاوەکان ناوچەکە چۆڵبکەن و خۆیان ڕادەستی ڕژێم بکەنەوە. بەرپرسی پێشمەرگەیەک گوتی: ئەی ئەگەر خەڵکەکە بەگوێینەکردین و هەر ڕۆیشتن چی بکەین؟ بەرپرسەکە گوتی: ئەگەر هەر سووربوون لەسەر ڕۆیشتن تەقەیان لێبکەن و هەتا چوار کەسیان لێبکوژن. لە ئەنفالی چواردا، بەرپرسێکی هێزی پێشمەرگە زۆر دژی ئەوە بوو کە پێش هێرشی ئەنفال خەڵک ناوچەکە چۆڵبکات، بەڵام هەر ئەو بەرپرسە پێش ئەوەی هەڵمەتی ئەنفالی چوار دەستپێبکات، لە ڕێگەی سەرۆکجاشێکەوە ماڵ و منداڵەکانی خۆی ناردەوە بۆ ناو شار. ژمارەیەک لە ڕزگاربوانی هەڵەبجە دەیگێرنەوە، پێش کیمیاباران خەڵکی هەڵەبجە هەوڵیانداوە هەڵەبجە چۆڵبکەن و بەرەو ئێران بڕۆن، پێشمەرگە ڕێگەی دەرچوونی لێگرتوون، یەکێک لەو کەسانەی باسیدەکرێت کە لە شارەکە دەرچووە و پێشمەرگە ڕێگەینەداوە دەرچێت و گەڕاندوویانەوە، تۆفیقی کارەبا بووە، دوای گەڕانەوەی بۆ ناو شارەکە بە چەکی کیمیاویی شەهیدەکرێت.

### ٥- ڕاووڕوت (تاڵانیی):

دوای کارەساتی کیمیابارانی هەڵەبجە، یەکێک لە دیاردە هەرە ناشیرینەکان، تاڵانیی شاری هەڵەبجە بوو. ئەوانەی مابوونەوە و بریندارنەبووبوون زۆربەی پێشمەرگە بوون، لەبریی ئەوەی هاوکاریی بریندار و کۆستکەوتەکانی هەڵەبجە بکەن، دەستیان بە تاڵان و بڕۆی خەڵکی هەڵەبجە کرد. لە دوای کیمیابارانی هەڵەبجە پەنجەی تاوان بۆ چەندیین کادر و بەرپرسی هێزی پێشمەرگە ڕاکێشرا کە دەستی بەسەر سامانی شەهیدەکانی هەڵەبجەدا گرتووە. هەندێک لەو کەسانە لە لایەن حیزبەکانی خۆیانەوە سزادران. دیاردەی تاڵانیی و فەرامۆشکردنی شەهید و بریندارانی چەکی کیمیاویی لە لایەن هێزی پێشمەرگەوە، داتەپینێکی ئەخلاقیی زەقی ناخی ئەو مرۆڤانە بوو، کە خۆیان بە ڕزگارکەری خەڵکی کوردستان دادەنا، بۆ ئازادیی گەلی کورد چەکی هەڵدەگرت، بەڵام کارەساتی کیمیابارانی هەڵەبجە و تاڵانییماڵی خەڵک، ئەوەی سەلماند پێشمەرگە چەندە بە سوکیی سەیری گەلەکەی خۆی دەکات، ئەم پەیوەندییە ناکۆک و نائەخلاقییە بوو دۆستایەتیی نێوان خەڵک و پێشمەرگەی تێکدا.

### ٦- ئۆپۆزسیۆنی ئێران:

لە سنووری قەزای هەڵەبجە و ناوچەی هەورامان چەند بنکەیەکی هێزی پێشمەرگەی ڕۆژهەڵاتی کوردستانی لێبوو، لەگەڵ هێرشی هاوبەش سوپای پاسداران و هێزی پێشمەرگەی کوردستاندا بۆ سەر هەڵەبجە، هێزێکی تایبەتی سوپای پاسدارانی ئێران پەلاماری بنکە و بارەگای حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران (حدکا) و کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێرانیان دا. هێزەکانی حدکا هاوکارییان لە هێزی پێشمەرگەی یەکێتیی وەرگرت و فریای خۆیان کەوتن و زیانی کەمیان بەرکەوت، بەڵام هێزەکانی کۆمەڵە زیانێکی گەورەیان بەرکەوت. باس لەوە دەکرا ٩٠ پێشمەرگەیان شەهیدبوون.

دوای ئەنفال ئاوارەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بووین و لە نزیکەوە هەستمان بە ئازاری بنەماڵەی شەهیدان و خەڵکی ڕۆژهەڵاتی کوردستان دەکرد، ئەو کات هەستمان بە قورسایی ئەو هەڵانە دەکرد، کە یەکێتیی نەتەوەیی نێوان گەلی کوردی پارچە پارچە کردووە.

### ٧- ئاشبەتاڵی جەماوەریی و سەربازیی:

بەکارهێنانی چەکی کیمیاویی لە لایەن سوپای عێراقەوە، ئامانجی خۆی بەدەستهێنا، بە شەهیدبوون و ئەنفالکران و ئاوارەبوون، جەماوەر ناوچە ئازادکراوەکانی چۆڵکرد. هێزی پێشمەرگە شەهیدی دا، ئەنفالکرا، یان ئاوارەبوو، ناوچە ئازادکراوەکانی کوردستانی بەجێهێشت، شۆڕشی کورد ڕووبەڕووی ئاشبەتاڵی جەماوەریی و ئاشبەتاڵی سەربازیی بوویەوە.

لەبەرئەوەی شۆڕش خۆی کردبووە بەشێکی شەڕی ئێران - عێراق، هەر کە شەڕەکە لە ٨/ ٨/ ١٩٨٨ ڕاگیرا، شۆڕشی باشووری کوردستانیش خامۆشکرا. ڕۆژانە پێشمەرگە دەستی لە چەک بەردەدا و خۆی ڕادەستی ڕژێمی بەعس دەکردەوە. بێبڕوایی و ڕەشبینیی لە نێوان خەڵکی کوردستاندا بەرانبەر بە دۆزی گەلی کورد هەتا دەهات قووڵتر دەبوویەوە. ئەو کادر و پێشمەرگانەی لە ناو شۆڕشدا مانەوە، بارەگایان لە سنووری ئێران - عێرق دانا، ئەو پێشمەرگانەیش خاوەنی خێزان بوون لە شار و شارۆچکە سنوورییەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا نیشتەجێبوون.

تەنها کارێکی سیاسیی کە لە دوای ئەنفال هەتا ڕاپەڕین حیزبە سیاسییەکان ئەنجامیاندەدا، ناوبەناو لە سنووری کار و چالاکیی خۆیاندا بە نهێنیی مەفرەزەی پارتیزانییان دەکرد، لەگەڵ ڕێکخستنەکانی ناو شاری حیزبەکاندا پەیوەندییاندەبەست و پێکەوە چالاکیی سیاسیی سنوورداریان ئەنجامدەدا.

## دوای ئەنفال و کیمیاباران

### ١- شەهیدەکان:

خەڵکی مەدەنیی کوردستان و پێشمەرگە بەهۆی ئەنفال و کیمیبارانەوە لە سێ قۆناغی جیاوازدا شەهیدکران، قۆناغی یەکەم لە گۆڕەپانی شەڕەکەدا بوو، قۆناغی دووەم ئەو کەسانە بوون کە لە لایەن هێزە چەکدارەکانی عێراقەوە دەستگیردەکران و ڕەوانەی خوارووی عێراق دەکران، بە کۆمەڵ دەکوژران و لە گۆڕی بەکۆمەڵدا دەنێژران. قۆناغی سێیەم ئەو بریندارانەی کیمیاباران بوون کە لە نەخۆشخانەکانی ئێران چارەسەریان وەردەگرت، بەهۆی قووڵیی برینەکانیانەوە شەهیددەبوون.

### ٢- بریندارەکان:

ئەوانەی بەر چەکی کیمیاویی گازی دەمارەکان کەتبوون برینەکەیان سوک بوو، چاکبوونەوە و ئاسەواری چەکی کیمیاویی بە جەستەیانەوە نەما. ئەوانەی بەر چەکی کیمیاویی گازی خەردەل کەوتبوون و مابوونەوە هەتا ئێستایش (٢٠٢٢) بە برینەکەیانەوە دەناڵێنن چاکنەبوونەتەوە. بریندارەکانی گازی خەردەل دوچاری برینی درێژخایەنی چاو، سی، پێست هاتوون. لەو کاتەوە چارەسەردەکرێن برینەکانیان چاکنابێتەوە، لەبەرئەوەی هەتا ئێستا دەرمانێکی تایبەتی دژی گازی خەردەل دروستنەکراوە، دەرمانێک بۆ سارێژکردنی برینەکانی گازی خەردەل دروستنەکراوە.

بریندارەکانی گازی خەردەل بەرگریی جەستەیان کەمدەبێتەوە، ژمارەی خڕۆکە سپییەکانی جەستەیان کەمدەبێتەوە، لە چاو خەڵکی بەرنەکەوتوودا زۆرتر دوچاری نەخۆشییە درمییەکان دەبن. بریندارەکانی گازی خەردەل ئەگەری توشبوونیان بە شیرپەنجەی خوێن و شیرپەنجەکانی تر لە چاو کەسانی بەرنەکەوتوودا زیاترە. ژنانی بەرکەوتووی گازی خەردەل لە چاو کەسانی بەرنەکەوتوودا ئەگەری لە بارچوونی منداڵ و نەخۆشیی زکماکی منداڵەکانیان زۆرترە.

هەتا ئەمڕۆیش سەدان پێشمەرگەی کوردستان و هەزاران هاوڵاتیی بە تایبەت هاوڵاتیی شاری هەڵەبجە، برینی جەستەیان سارێژنەبووە، بەهۆی قورسیی و درێژخایەنیی برینەکانیانەوە توانای کاری ئاساییان نییە و لە ڕیزی کەمئەندامانداا دانراون.

ئەو بریندارانەی لە دەرەوەی وڵاتن و ئەوانەیشی لە کوردستانن، بەردەوام بە شوێن چارەسەری برینەکانیانەوەن و سەردانی پزیشک دەکەن. پزیشکانی ئێرانیی زۆرترین و باشترین شارەزاییان لەسەر چارەسەرکردنی چەکی کیمیاویی هەیە، لەبەرئەوەی لە شەڕی ئێران - عێراقدا سوپای عێراق بە چەکی کیمیاویی بۆردوومانی هێزە چەکدارەکانی ئێران و خەڵکی مەدەنیی ئێرانی دەکرد. بریندارەکانی پێشمەرگە و خەڵکی کوردستانیش لە ئێران چارەسەردەکران. بەڵام هەتا ئەمڕۆیش پزیشکە ئێرانییەکان و کۆمپانیاکانی دەرمانی ئێرانیی دەرمانێکی تایبەتیان بۆ چاکبوونەوەی برینی گازی خەردەل نەدۆزیوەتەوە، ئەو دەرمانانەی بۆ چارەسەری برینی چەکە کیمیاوییەکە بەکاردێت تەنها نیشانەی برینەکە کەمدەکاتەوە.

### ٣- ئاوارەکان:

ئەوانەی لە کیمیابارانی هەڵەبجە و ئەنفالەکان ڕزگاریان بوو، بەشێکیان بەرەو سنووری ئێران هەڵهاتن، حکومەتی ئێران ڕێگەی بۆ کردنەوە بچنە ناو خاکی ئێرانەوە، لە سنووری پارێزگاکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان کەمپی بۆ کردنەوە و نیشتەجێیکردن.

دوای ئەنفال و کیمیاباران و ئاوارەبوون، سەدام حوسەینی سەرۆککۆماری عێراق، ناو بە ناو عەفوو (لێبوردن)ی بۆ پێشمەرگە و ئاوارەکان دەردەکرد. لەگەڵ هەر لێبوردنێکی حکومەتی عێراقدا، ژمارەیەک ئاوارە و پێشمەرگە خۆیان ڕادەستدەکردەوە. لەگەڵ ئەوەیشدا هەتا ڕاپەڕین دەیان هەزار پێشمەرگە و ئاوارەی ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجە لە ئێران مانەوە. پاش ڕاپەڕینیش ژمارەیەک ئاوارەی باشووری کوردستان لە ئێران مانەوە. دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام، خەڵکی ئاوارەی باشووری کوردستان زۆربەی گەڕانەوە و لە زێدی جارانی خۆیان نیشتەجێبوونەوە.

بەشێکی تری ڕزگاربوەکانی ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجە، ئاوارەی شار و شارۆچکەکانی باشووری کوردستان بوون. ئەوانەی بەر ئەنفال نەکەوتن، حکومەتی عێراق ئوردوگای بۆ کردنەوە و نیشتەجێیکردن. حکومەتی عێراق شارێکی نوێی بە ناوی سەدامیە/ هەڵەبجە لە شارەزوور بۆ ڕزگاربووەکانی کیمیابارانی هەڵەبجە دروستکرد. ئەو هەڵەبجەییانەی لە کیمیاویی ڕزگاریان بوو ئاوارەی ئێران نەبوون، لەو شارەدا نیشتەجێکران. لە دوای ڕاپەڕینەوە بەو شارە دەڵێن: هەڵەبجەی تازە.

ژمارەیەکی زۆر لە خێزانەکانی ئەنفال و کیمیاباران پێکەوە شەهیدبوون، تەنها کەسێک، دوو کەس لە خێزانەکەیان لە ژیاندا ماوەتەوە. ئەو کەسە زیندووانە لە کاتی ئەنفال و کیمیاباراندا لە ماڵەوە نەبوون و پێشمەرگە بوون، سەربازی سوپای عێراق بوون، خوێندکاری زانکۆ بوون. چەند کەسێکیش وەکو تەیموری ئەنفال لە گۆڕە بەکۆمەڵەکانی خوارووی عێراق ڕزگاریان بووە و خێڵە عەرەبەکان لای خۆیان پاراستبوویان هەتا ڕاپەڕین و ڕوخانی ڕژێمی سەدام، ئینجا ئاشکرایانکرد و ناردیانەوە بۆ کوردستان.

ژمارەیەکی تر لە منداڵانی کیمیابارانی هەڵەبجە هەتا ئێستا بێسەرشوێنن، هەندێکیان خەڵکی ئێرانی لەخۆیگرتوون و بەخێویاندەکەن. لەم ساڵانەی دواییدا چەند کەسێک لەو منداڵانەی هەڵەبجە دۆزرانەوە، دوای ئەوەی پشکنینی (DNA)یان بۆ کرا و ڕادەستی بنەماڵەکانیان کرانەوە.

### ٤- ڕسوابوونی ڕژێمی سەدام:

شاڵاوەکانی ئەنفال بەبێ ڕومالّی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن بەڕێوەچوون، بەبێ ئاگاداریی ڕاگەیاندنەکان و چاودێریی وڵاتـان و ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤ ئەنجامدران. تەنها لەسەر ئەنفالی یەک لە ڕادیۆی (بی بی سی) هەندێک زانیاریی بڵاوکرایەوە، لەبەرئەوە بوو لە ئەنفالی یەکدا سەرکردایەتیی یەکێتیی بۆ ناوچە سنوورییەکانی نێوان عێراق - ئێران پاشەکشەیکرد. لەبەرئەوەی کارەساتی هەڵەبجە زۆر گەورە بوو، سنووری ئێران بۆ بریندار و ئاوارەکانی هەڵەبجە کرایەوە، ئێرانیش پێیباشبوو لە ڕێگەی کارەساتی کیمیابارانی هەڵەبجەوە ڕژێمی بەعس تاوانباربکات، لە بەرچاوی کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی ئابڕوییببات، هانی ڕۆژنامەنوسانی ئێرانیی و بیانیی دا، بۆ ئەوەی ڕوداوەکانی کیمیابارانی هەڵەبجە ڕومالّبکەن. بەو شێوەیە لە ڕێگەی ڕۆژنامەنوسە ئێرانیی و بیانییەکانەوە، کارەساتی کیمیابارانی هەڵەبجە بۆ بەرچاوی جیهان گوێزرایەوە و بە جیهاندا بڵاوکرایەوە. لاپەڕەیەک لە سیاسەتە ڕەگەزپەرستەکانی ڕژێمی سەدام بەرانبەر بە گەلی کورد لە لای کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیی ئاشکرابوو.

بە شێوەیەکی گشتیی کارەساتی هەڵەبجە و ئەنفال لە ئاستی نێونەتەوەییدا وەکو دیوەزمەیەکی سەر سنگی ڕژێمی سەدامی لێهات. ئەگەرچی شۆڕشی کورد بەهۆی ئەنفال و کیمیابارانەوە لە ڕووی سەربازییەوە شکستیهێنا و پاشەکشەیکرد، بەڵام هەڵەبجە و ئەنفال بوون بە سەفیری کورد و لە ڕووی دیبلۆماسییەوە کێشەی کوردی بە جیهان ناساند*١٢.

## ئەنفال و کیمیاباران لە ڕاپەڕینەوە

### ١- سیاسەت بە ئەنفال و کیمیابارانەوە دەکرێت:

لە دوای ڕاپەڕین و هەڵبژاردنی پەرلەمان و پێکهێنانی حکومەتی هەرێم، ئەنفال و هەڵەبجە نەک هەر وەکو کارەساتێکی نەتەوەیی سەیرنەکرا، بەڵکو چەندیین جۆر سیاسەتی پێوەکرا، وەکو پردەبازێک بۆ گەیشتن بە ئامانجی حیزبیی و دەسەڵاتقایمکردن و کۆکردنەوەی سامان بەکارهێنرا.

ئەگەر پەیوەندییەکانی دەسەڵاتی هەرێم لەگەڵ ڕژێمی بەعسدا ئاساییبایە، ئەو

ساڵانە یادی ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجە و ڕاپەڕینیش نەدەکرایەوە و یادەکان فەرامۆشدەکران. ئەگەر پەیوەندیی دەسەڵاتدارانی هەرێم لەگەڵ حکومەتی ئێران لە ئاستێکی باشدا بایە، ئەو ساڵە یادی ئەنفال و هەڵەبجە و ڕاپەڕین بەرزڕادەگیرا و ڕۆڵی کۆماری ئیسلامیی ئێران لە پاراستنی گەلی کورددا لە بەرانبەر هێرشەکانی ڕژێمی سەدامدا، دەخرایە سەر یادەکان. پێش ڕوخانی ڕژێمی سەدام، کاتێک پەیوەندیی نێوان دەسەڵاتی باشووری کوردستان و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پێشکەوت، ئەمریکا شەڕی بە ڕژێمی سەدام دەفرۆشت، دەسەڵاتی کوردیی یادی کارەساتەکانی ئەنفال و هەڵەبجەی دەکردەوە، وەکو گوشار دژی ڕژێمی سەدام بەکاریدەهێنا.

پاش ڕاپەڕین و هەڵبژاردنی پەرلەمان و پێکهێنانی حکومەتی هەرێم، وڵاتان و ڕێکخراوە جیهانییەکان پەیوەندییان لەگەڵ هەرێمی کوردستاندا دروستکرد. بە درێژایی ئەو چەند ساڵە لە ئاستی دیبلۆماسییدا کارێکی جدیی بۆ ناساندنی کارەساتی ئەنفال و کیمیاباران نەکرا. لە سەرەتا یەکێتیی هەندێک کاریکرد، ئەو فایلە هەواڵگرییانەی پەیوەندییان بە ئەنفال و هەڵەبجەوە هەبوو، لە دامودەزگا سەرکوتکەرەکانی ڕژێم دەستیکەوتبوون، بۆ ڕێکخراوی ئەمنستی ئنتەر ناسیۆناڵ - میدل ئیست وۆچ و دامودەزگاکانی وڵاتانی زلهێزی نارد. لە فایلەکاندا زانیاریی لەسەر ئەنفال و کیمیابارنی هەڵەبجە و کوشتنی هەڕەمەکیی کورد دەست ڕێکخراوی مافی مرۆڤ (هیومان رایتس وۆچ) کەوت. ڕیکخراوی ئەمنستی ئینتەرناسیۆناڵ کتێبێکی بە ناوی: (تاوانی جینۆسایدی عێراق، پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کورد) *١٢، لەسەر بڵاوکردەوە. ساڵی ٢٠٠٨ یۆست هیڵتەرمان بە ناوی: (کارێکی ژەهراویی، ئەمریکا و عێراق و گازبارانی هەڵەبجە) کتێبێکی لەسەر کیمیابارانی هەڵەبجە بڵاوکردەوە.

کە ناکۆکییەکانی نێوان پارتیی و یەکێتیی فراوانبوون، لەبەرئەوەی لەو ناکۆکییەدا حکومەتی عێراق پشتیوانیی لە پارتیی دەکرد، یەکێتیی هەوڵیدا حکومەتی عێراق لە پارتیی دووربخاتەوە، لەبەرئەوە لەو سیاسەتەی خۆی دژی عێراق پاشگەزبووەوە. ئیتر گرنگیی بە ئەنفال و کیمیاباران و ناوزڕاندنی ڕژێمی سەدام نەدەدا، بۆ ئەوەی لەگەڵ ڕژێمی سەدامدا ئاشتبێتەوە و لە ململانێی نێوان پارتیی و یەکێتییدا عێراق هێندە لایەنگیریی پارتیی نەکات، یان لە ململانێی نێوان پارتیی و یەکێتییدا ڕژێمی سەدام بێلایەن بمێنێتەوە.

جارێکیان بەرپرسێکی هاوڕێم لەو بارەیەوە قسەی بۆ کردم و گوتی: جارێک لەگەڵ نوێنەرانی ڕژێمی سەدامدا دانیشتین و گلەیی زۆریان لێکردین، لەبەرئەوەی نهێنییەکانی ئەوانمان ڕادەستی ڕێکخراوی ئەمنستی ئنتەرناسیۆناڵ کردبوو.

لە دوای ڕاپەڕین هەتا ڕوخانی ڕژێمی سەدام، پەیوەندییەکانی پارتیی و ڕژێمی بەعس دۆستانە بوو، شانبەشانی پەیوەندیی سیاسیی پەیوەندیی ئابووریش هەبوو، بۆیە لە دوای ڕاپەڕین و لە دوای شەڕی براکوژیی و دابەشکردنی بەشە ڕزگارکراوەکەی باشووری کوردستان، لە ئاستی حیزب و حکومەتدا تێکۆشانێکی نەتەوەیی - دیبلۆماسیی لە چالاکییەکانی دەسەڵاتی پارتییدا نابینرێت.

## ٢- ئەنفالچییەکان دەپارێزرێن:

حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشووری کوردستان زۆر بە دڵفراوانییەوە باوەشیان بۆ بکەرانی تاوانی ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجە دەکردەوە. ئەو سەرکردانەی ڕژێمی بەعس دەستیان لە تاوانەکاندا هەبوو، کە لە ڕژێم جیادەبوونەوە و بەرەو هەندەران سەری خۆیان هەڵدەگرت. لە لایەن دەسەڵاتی باشووری کوردستانەوە وەکو دۆست و ئەندامی حیزبەکانیان هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکرا. لەبریی ئەوەی دەستگیریانبکەن و بیاندەنە دادگا، هاوکاریی مادیی و لۆجستییان دەکردن. میوانداریاندەکردن و ڕەوانەی درەوەی وڵاتیان دەکردن. نزار خەزرەجیی تاوانبار کە لە سەردەمی ئەنفالی یەکدا فەرماندەی فەیلەقی یەکی سوپای عێراق بوو، لە کاتی ئەنفالی یەکدا بەو شێوەیە فەرماندە مەیدانییەکانی فەیلەقەکەی ئاڕاستەدەکات: (اموالهم و اعرازهم و نسائهم حلال لکم)*١٣. دوای ڕاپەڕین بۆی نەکرا لە عێراق بمێنێتەوە، لە ڕێگەی پارتیی و یەکێتییەوە ڕەوانەی دەرەوەی وڵات کرا و لە دانیمارک نیشتەجێبوو.

پێش ڕوخانی ڕژێمی سەدام چالاکوانانی کورد بە شوێنی خەزرەجییان زانی، لەسەر تاوانی ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجە، لە دادگای دانیمارک سکاڵایان لەسەر تۆمارکرد. حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشووری کوردستان کە لەسەر بەرژەوەندییەکانی گەلی کورد ناکۆکبوون، لەسەر داکۆکیکردن لە خەزرەجیی کۆکبوون، پارتیی و یەکێتیی و بزوتنەوەی ئیسلامیی پێکەوە، نامەی ئەستۆپاکیی خەزرەجییان بۆ دادگای دانیمارک نارد، داکۆکییان لە خەزرەجیی ئەنفالچیی کرد، کە لە ئەنجامدانی تاوانی

ئەنفال و كیمیابارانی هەڵەبجەدا بێتاوانە*١٤. لە نامەی بەرگرییكردنی خەزرەجییدا نوسیویانە خەزرەجیی ئەندامی حیزبەكەی ئەوانە.

PATRIOTIC UNION OF KURDISTAN

FOREIGN BUREAU

یەكێتیی نیشتمانیی كوردستان

مەكتەبی دەرەوە

لندن [illegible]

السيد وزير العدل في حكومة الدانمارك - كوبنهاكن المحترم .

الفريق الأول الركن نزار الخزرجي معروف لدينا كشخصية عسكرية وطنية مرموقة، وذو سمعة طيبة.

وحسب معلوماتنا فانه لم يكن له دور في ضرب حلبجة بالأسلحة الكيمياوية. كما لم يشارك في عمليات الأنفال في كردستان العراق التي ذهب ضحيتها حوالي [illegible] مواطن كردي عراقي. ولم يكن معروفاً عنه انه ضد جرائم الحرب، وهو شخصية جديرة بالتقدير والاحترام .

وشكراً.

[illegible]

د. فؤاد معصوم
عضو المكتب السياسي للاتحاد الوطني الكردستاني
مسؤول مكتب الخارج

حركة الوحدة الاسلامية في
كردستان العراق
مكتب العلاقات الخارجية

بسم الله الرحمن الرحيم

« و تعاونوا على البر و التقوى »

العدد: ٨١٤

التاريخ: ٢٠٠١/٣/١٩

## الى من يهمه الأمر

نود أن نؤكد بأن الفريق.أول ركن نزار الخزرجي رئيس أركان الجيش العراقي الأسبق صديق لحركتنا الإسلامية في كردستان العراق و يتمتع بسمعة طيبة بين جماهير شعب كردستان و بما إننا من مدينة حلبجة و نحن شاهد عيان على جريمة حلبجة و عمليات الأنفال في كردستان العراق و أن الشيخ علي عبدالعزيز مرشدنا و قائدنا العام هو الشاهد ضد النظام العراقي في الأمم المتحدة في جنيف و أعطى شهادته عام ١٩٨٨ و لحد الآن فإن المقر العام للشيخ علي عبدالعزيز و مكتبنا السياسي متواجد داخل مدينة حلبجة لذا نؤكد فإن صدام حسين و علي حسن مجيد التكريتي هما المسؤلان عن جميع الجرائم التي حصلت في كردستان أنذاك و كذلك المسؤلان عن جرائم حلبجة و عمليات الأنفال. نحن نعمل جاهداً من أجل محاكمتهما دولياً كمجرمي حرب و لنا إتصالات واسعة مع منظمة (أندايت) في بريطانيا و الحكومة البريطانية و الأمريكية و الفرنسية من أجل ذلك. لذا فإننا نؤكد لكم بأن السيد الخزرجي بريء من هذين العمليتين و أنه وطني شريف لما سنح له فرصة أعلن عن معارضته للنظام و أنشق عنهم بالرغم من كل الإمتيازات المتاحة له و نحن بإسم حركتنا نطلب من جميع الحكومات الصديقة للشعب العراقي الإهتمام اللازم و الحماية الكافية لحياته و عائلته لأن النظام العراقي نظام إرهابي لا يعمل بالقوانين الدولية و ليس له أي إحترام لحقوق الإنسان.

لأي إيضاحات أو إستفسارات عن السيد الخزرجي لا ترددوا بالإتصالات بنا.

إحسان عبدالعزيز
مسؤول العلاقات الخارجية

P.O. Box 1029, London W2, 6ZT. Tel: 020 7266 4442 Fax: 020 7266 5264




# KURDISTAN DEMOCRATIC PARTY
International Relations Bureau

10 October 2001

"CONFIDENTIAL"

Honorable Frank Jensen
The Minister of Justice
Copenhagen
Denmark

Dear Mr. Jansen

We in the Kurdistan Democratic Party in Iraq would like to confirm that Staff Lieutenant General Mr. Nizar El Khazraji is a well known Ex Iraqi army commander and a recognized political figure in Iraq.

Mr. El Khazraji had a distinguished record in the Iraqi army and held the post of the Chief of the General Staff. In March 1996 he deserted Iraq through the Kurdish region and joined the Iraqi opposition movement against the Iraqi regime dictatorship. His defection was a major blow to the regime. Since then he has enjoyed cordial and friendly relations with us and other Kurdish political parties as well as with other Iraqi opposition groups.

Recently he has been the target of a campaign in Denmark to indict him for war crimes against the Kurdish people including the gas attack on Halabja and the Anfal genocidal operations in 1988.

We would like to affirm that these orders were given and issued by the President of Iraq and Ali Hassan Al Majeed and those orders are documented by independent human rights organizations.

We strongly believe that these attempts to undermine the reputation of Gen El Khazraji play into the hands of Saddam Hussien regime to discourage other Iraqi officials to defect and join the Iraqi democratic opposition.

We hope that this testimony would help to clarify the nature of charges made against Gen El Khazraji.

Please accept our highest regards

Sincerely,

Dilshad Miran
KDP International Relations Bureau



P.O. Box 7725, London SW1 3ZE UK
Tel 020 7498 2664 Fax 020 7498 2531 E mail. kdpeurope@aol.com

هەڵەبجە و هەورامان، ئەو هەموو هێزانە و هێزەکانی سوپای ئەمریکایش بەشداریی تێداکرد. سارووخە زیرەکەکانی ئەمریکا لە دەریای سوور و لە دەریای سپیی ناوەڕاستەوە، ئاراستەی خانووی گوندەکانی هەورامان و سەرچاوەی کانییەکانی هەورامان دەکران.

ئەگەر ناوچەکانی تری کوردستان لەژێر ئابڵوقەی ئابوریی نێودەوڵەتیی و عێراقییدا ناڵاندبێتیان، شاری هەڵەبجە و گوندەکانی دەوروبەری لە دوای ڕاپەڕین لەژێر ئابڵوقەی نێودەوڵەتیی و عێراقیی و دەسەڵاتی کوردییدا دەیناڵاند.

بە کوردیی و بە کورتیی دەسەڵاتی کوردیی نەک هەر هەستی بە گەورەیی کیمیابارانی هەڵەبجە نەدەکرد و بە شارێکی پیرۆز و گرنگ و بریندار سەیرینەدەکرد، بەڵکو وەکو شارێک و ناوچەیەکی دوژمن سەیریدەکرد. دەسەڵاتی کوردیی وا لەگەڵ هەڵەبجەدا دەجوڵایەوە، تۆڵەی شتێکی لێبکاتەوە. یەکێتیی حیزبی دەسەڵاتداری ئەو ناوچەیە بوو، هێندە زوڵمی لە هەڵەبجە و ژن و پزیشک دەکرد، من دەمگوت: نابێت هەڵەجەیی و ژن و پزیشک ئەندام و کادری یەکێتیی بن.

### ٤- بازرگانیی بە ئەنفال و هەڵەبجەوە دەکرێت:

دەسەڵاتدارانی باشووری کوردستان بازرگانیی زۆریان بە ئەنفال و هەڵەبجەوە کرد. زۆر کەس باس لەوە دەکەن کە حیزبەکانی باشووری کوردستان لە دەرەوەی وڵات چەندیین جار بە ناوی لێقەوماوانی هەڵەبجەوە، لە حکومەتەکانی ئەورووپا و ڕێکخراو و کەسایەتیی ناوداری جیهانییەوە، هاوکاریی ماددییان کۆکردووەتەوە، بەڵام هەرگیز ئەو هاوکارییانە بە خەڵکی هەڵەبجە نەگەیشتوون، تەنها باخەڵی بەرپرسانیان پڕکردووە.

حەمەی فەرەج یەکێک لە بەرپرسە دێرینەکانی هێزی پێشمەرگەی یەکێتییە، خەڵکی شاری هەڵەبجەیە. بەهۆی ئەوەوە کە لە شەڕێکدا برینداربوو و لاقێکی لەدەستدا، لە هەشتاکانی سەدەی بیستەوە لە ئەورووپا دەژی. ئەو ئاگاداری ئەوەیە کە بە ناوی هەڵەبجەوە چەند جارێک هاوکاریی کۆکراوەتەوە، بەڵام ئەو هاوکارییانە بە خەڵکی هەڵەبجە نەگەیشتوون، بۆ ئاوەدانکردنەوەی هەڵەبجە بەکارنەهاتوون. لە

کۆبوونەوەیەکی حیزبەکەیدا لە گەڕەکی بەختیاریی شاری سلێمانیی و لە کۆبوونەوەی خەڵکی هەڵەبجەدا لە مزگەوتی ئیبراهیم پاشا لە سلێمانیی، هەستایە سەرپێ و هاواریکرد: ئەو پارانەی بە ناوی هەڵەبجەوە لە ئەوروپا کۆکرانەوە چییان بەسەرهات؟

ساڵی ١٩٩٩ – ٢٠٠٠ بە سەرپەرشتیی پرۆفیسۆرێکی زانکۆی لیڤەرپولی بەریتانیی لەسەر کاریگەرییەکانی چەکی کیمیاویی لەسەر خەڵکی هەڵەبجە، هەوڵی لێکۆڵینەوەیەکی زانستیی درا. لە کۆمیتەی لێکۆڵینەوەکەدا وەزارەتی تەندروستیی هەرێم، ڕاگری کۆلێژە پزیشکییەکانی زانکۆکانی هەرێم، قائیمقامی هەڵەبجە، نوێنەری پارتیی، یەکێتیی و بزوتنەوەی ئیسلامیی بەشداربوون. پزیشکێکی پسپۆڕی ئەو کۆمیتەیە ناوەندێکی بە ناوی پەیمانگای هەڵەبجە دروستکرد. لە ڕێگەی ئەو ناوەندەوە سەرپەرشتیی لێکۆڵینەوەکەی دەکرد. بەگوێرەی قسەی بەرپرسێکی وەزارەتی تەندروستیی، بۆ ئەو لێکۆڵینەوەیە بڕی دووسەدو پەنجا ملیۆن دۆلار تەرخانکراوە. پاش هاتن و چوون و ماندووکردنی بریندارانی چەکی کیمیاویی، ئەو لێکۆڵینەوەیە هیچ ئەنجامێکی بەدەستەوەنەدا. تەنها کارێک کە کرا پەیمانگای هەڵەبجە چەند نوسینگەیەکی وەهمیی دانا، نوسینگەی هەڵەبجە، نوسینگەی سلێمانیی، نوسینگەی هەولێر و دهۆک، نوسینگەی کەرکوک، هەر نوسینگەیەک مانگانە بڕێک پارەی بۆ بەرپرس و کارمەند و خزمەتگوزاریی تەرخانکردبوو. ئەو پارەیە سودی بە هەڵەبجە نەگەیاند، هەمووی چووە گیرفانی ئەو کەسانە و بەرپرسەکانی ترەوە کە پەیوەندییان بەو کارەوە هەبوو.

جارێکیان ڕۆژنامەیەک داوای بەڵگەی لەسەر دزیی و جەردەیی دەسەڵات کرد لە هەڵەبجە، بەڵگەیەکی دزیی و تاڵانییەکانی نوسینگەکانی پەیمانگای هەڵەبجەم بۆ ڕۆژنامەکە نارد، دوای چاوەڕوانییەکی زۆر بڵاویاننەکردەوە. کە پرسیارم لە سەرنوسەری ڕۆژنامەکە کرد بۆ بەڵگەکەتان بڵاونەکردەوە؟ گوتی: حەزماننەکرد هەندێک کەسی وەکو فلان و فڵان لەسەر ئەو بابەتە توشی کێشە ببن. گوتم: باشە بەڵگەکەم بۆ بگێڕنەوە. گوتی: بە خودا لێمانونبووە نایدۆزینەوە!

ئامانجی ئەو پەیمانگایە بازرگانیی بوو، هەندێک لە چاودێرانی سیاسیی وای بۆ دەچن ئامانجێکی تری ئەو پەیمانگایە جاسوسیی بووە بۆ زانینی کاریگەریی چەکی کیمیاویی لەسەر خەڵکی هەڵەبجە بۆ ئەوەی دەزگای ئیستخباراتی ئەمریکا سودی لێوەربگرێت*١٥.

سالی ٢٠٠٤ دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام، پۆل بریمەری نوێنەری ئەمریکا لە عێراق، لە یادی کیمیابارانی هەڵەبجەدا سەردانی هەڵەبجەی کرد، بڕی یەک ملیۆن دۆلاری ئەمریکیی پێشکەش بە خەڵکی هەڵەبجە کرد. ئەو بڕە پارەیە نەچووە گیرفانی خەڵکی لێقەوماوی هەڵەبجەوە، هیچ پڕۆژەیەکیشی لە هەڵەبجە پێدروستنەکرا دەسەڵاتدارانی باشوور دەستیان بەسەر ئەو بڕە پارەیشەدا گرت.

## ئەنفال و هەڵەبجە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام

### ١- دادگای باڵای تاوانەکان و دەسەڵاتدارانی کورد:

کە ڕژێمی سەدام ڕوخا، ئەمریکییەکان و حکومەتی عێراقی نوێ، بۆ دادگاییکردنی سەرانی پێشووی ڕژێمی عێراق، دادگای باڵای تاوانەکانی عێراقیان دامەزراند. ئەو دادگایە میکانیزمێکی باشبوو بۆ ئەوەی سەرانی ڕژێمی پێشوو لەسەر کەیسی ئەنفال و کیمیاباران دادگاییبکرێن و ئەنفال و کیمیاباران وەکو جینۆسایدی گەلی کورد بناسرێت.

ئەمریکییەکان تینووبوون بە دادگاییکردنی سەرانی ڕژێمی سەدام، بۆ ئەوەی ڕەوایی بە شەڕی ڕوخانی ڕژێمی سەدام و داگیرکردنی عێراق بدەن، بۆ ئەوەی بە ڕای گشتیی ئەمریکیی و جیهانیی بڵێن، سوپای ئەمریکا ئەو سوپایەیە کە ڕژێمێکی ڕوخاند جینۆسایدی گەلی خۆی دەکرد. ئەوە دەرفەتێکی باشبوو کارەساتی ئەنفال و کیمیاباران وەکو جینۆسایدی گەلی کورد دانیپێدابنرێت. ئۆپۆزسیۆنی شیعەی عێراق و کۆماری ئیسلامیی ئێرانیش زۆر بە تەنگی دادگاییکردنی سەرانی ڕژێمی سەدامەوە بوون. ئامانجی ئەوانیش ئەوە بوو ڕژێمی بەعس وەکو تاوانبار بە جیهان بناسێنن و حیزبی بەعس لە ڕەگ و ڕیشەوە دەربهێنن. پەیوەندییەکی ستراتیژیی لە نێوان کورد و شیعەدا درروستبکەن. بەمەیش هێزێکی تر بوو بە هاوپەیمانی کورد، دەرفەتێکی تر بۆ بەجینۆسایدناساندنی ئەنفال و کیمیاباران هاتەپێشەوە.

بەڵام دەسەڵاتی باشووری کوردستان بۆ ناساندنی ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجە وەکو جینۆسایدی گەلی کورد ڕۆڵێکی ئاشکرا و جدیی نەگێڕا. نەک هەر ئەوە، هەندێک هەڵوێست و بڕیاری بەرپرسانی باڵای دەسەڵاتی کوردیی هەیە، پیشانیدەدات

دەسەڵاتدارانی کورد، لەگەڵ ئەوەدا نین لەسەر ئەنفال و هەڵەبجە دادگایی سەرانی ڕژێم بکرێت، لەگەڵ ئەوەدا نین ئەنفال و هەڵەبجە وەکو جینۆسایدی گەلی کورد بناسرێت. کاتێک دادگای باڵای تاوانەکانی عێراق لەسەر تاوانی ئەنفال داوای تاوانبار نزار خەزرەجیی دەکرد، دەسەڵاتدارانی باشووری کوردستان کە شوێنی نیشتەجێبوونی دەزانن، بۆ بەدەستەوەدانی ئەو تاوانبارە بە دادگا، هاوکاریی دادگایان نەکرد و نزار خەزرەجیی دادگایینەکرا.

کە مام جەلال پۆستی سەرۆککۆماری عێراقی وەرگرت، وەفیق سامەڕایی سەرۆکی هەواڵگریی ڕژێمی سەدامی بە ڕاوێژکاری خۆی دانا. کە وەفیق سامەڕایی لەسەر دۆسیەی ئەنفال لە دادگای باڵای تاوانەکانی عێراق داواکرا، لەو ڕۆژەوە وەفیق سامەڕایی دیارنەما و نەدۆزرایەوە و لەسەر ئەنفال دادگایینەکرا.

یەکێک لەو فڕۆکەوانانەی ساڵی ١٩٨٨ بە چەکی کیمیاویی بۆردوومانی هەڵەبجەی کرد، ناوی تاریق ڕەمەزان بوو. دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام لە سنووری پارێزگای کەرکوک دەستگیرکرا، لە ئاسایشی سلێمانیی زیندانکرابوو. ساڵی ٢٠٠٨ دادگای باڵای تاوانەکانی عێراق داوای ئەو تاوانبارەی کرد هەتا دادگاییبکرێت، دەرکەوت پێش داواکەی داداگا، سەرۆککۆماری عێراق (مام جەلال) داوای لە ئاسایشی سلێمانیی کردووە تاریق ڕەمەزان ئازادبکەن. ئیتر فڕۆکەوانی کیمیابارانی هەڵەبجە لە زیندانی ئاسایشی سلێمانییدا ئازادکرا، ڕەوانەی دەرەوەی وڵات کرا و دادگایینەکرا.

لەم ساڵانەی دواییدا هەواڵی مردنی ماهیر عەبدولڕەشید فەرماندەی فەیلەقی سوپای عێراق لە سلێمانیی بڵاوبووەوە، ئەویش یەکێک لە تاوانبارەکانی ئەنفال و شەڕەکانی تری کوردستان بوو. دوایی دەرکەوت ماهیر لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدامەوە لە سلێمانیی داڵدەدراوە، بەبێ لێپرسینەوە و دادگاییکردن وەکو هاوڵاتییەکی ئاسایی ژیاوە.

مام جەلال سەرۆککۆماری عێراق و نوێنەری کورد لە حکومەتی عێراقی نوێدا، ئیمزای بڕیاری دادگای باڵای تاوانەکانی عێراقی نەکرد، کە بۆ لەسێدارەدانی سەدام حوسەین دەرچوو. ئیتر ئیرادەی دەسەڵاتدارانی کورد بۆ ئەوەی داکۆکیی لە تاوانبارانی ئەنفال و کیمیاباران بکەن، بە لوتکە گەیشت.

ساڵی ٢٠٢١ هەواڵی کۆچی دوایی عزەت دوریی بڵاوبووەوە، زۆر کەس دەیانگوت عزەت دوریی پیاوی دووەمی ڕژێمی بەعس، لە هەولێر داڵدەدراوە. ئەو قسانە جێگەی گومان بوون هەتا حەسەن عەلەویی کەسایەتیی بەناوبانگی عیراقیی لە ڤیدیۆیەکدا باسیکرد و گوتی: پێش مردنی لە هەولێر چاوی بە عزەت دوریی کەوتووە.

لە کاتی هەڵمەتی هەڵبژاردنی پێشوەختەی ساڵی ٢٠٢١ پەرلەمانی عێراقدا بەرپرسێکی باڵای پارتییش دانی بەوەدا نا، کە سەرانی بەعس و ئەنفالچییەکان ئێستا لە هەولێر دەژین، پەشیمانیی خۆیان بەرانبەر بە تاوانەکانیان پیشانداوە.

## ٢- دژی کورد و شیعە و ئەمریکا:

ئەو سیاسەتەی دەسەڵاتدارانی هەرێم بۆ پاراستنی سەرانی ڕژێم گرتیانەبەر و ڕێگریان لە دادگاییکردنیان کرد، تەنها تووڕەبوون و ناڕەزایی گەلی کوردی لێنەکەوتەوە. زۆرینەی خەڵکی عێراق دژی ئەو هەڵوێستەی حیزبە دەسەڵاتدارەکانی کوردستان وەستانەوە، لەبەرئەوەی ڕژێمی بەعس چەندین کۆمەڵکوژیی دژی شیعەکان ئەنجامدابوو، بە پەت و سێدارە وەڵامی چالاکوانەکانی حیزبی دەعوەی ئیسلامیی عێراقی دابوویەوە. چەپ و شیوعییەکانی عێراق بەو سیاسەتەی دەسەڵاتی کوردیی ڕازینەبوون، لەبەرئەوەی ڕژێمی بەعس تاوانی گەورەی بەرانبەر ئەوانیش ئەنجامدابوو.

ئێرانییەکان بە خوێنی بەرپرسانی بەعس تینووبوون، دەیانویست ڕەگ و ڕیشەی بەعس لە عێراقدا هەڵبکێشن، کە دەیانبینی دەسەڵاتی کوردیی بەو شێوەیە هەڵسوکەوت لەگەڵ بەرپرسانی ڕژێمی پێشوودا دەکات، هەم نیگەراندەبوون هەم کوردیان لەبەرچاودەکەوت.

ئەمریکا هۆکاری سەرەکیی ڕوخانی ڕژێمی سەدام بوو، لەبەرئەوەی سەدام سوکایەتیی زۆری بە ئەمریکا کرد. کاتێک بینی دەسەڵاتدارانی کورد لە دەرەوەی یاسا، بە پێچەوانەی هاوپەیمانیاکانەوە لەگەڵ بەرپرسانی ڕژێمی پێشوودا دەجوڵێنەوە، هەم نیگەراندەبوون هەم ئەوانیش کوردیان لەبەرچاودەکەوت.

ئەو چەند نمونەیەی سەرەوە پیشانیدەدات کە دەسەڵاتدارانی باشووری کوردستان نەک هەر لەگەڵ ئێش و ئازاری ئەنفال و کیمیابارانەدا ناژین و بە کارەساتێکی نەتەوەیی سەیرینەکەن، ڕێز بۆ بنەماڵەی شەهیدانی کیمیاباران و ئەنفالیش دانانێن، دڵی دۆستەکانی کوردیش دەشکێنن.

کار بۆ ونکردن و سڕینەوەی دۆسیەی ئەنفال و کیمیاباران دەکەن، هەتا بۆیان بکرێت تاوانبارانی ئەنفال و کیمیاباران لە دادگاییکردن و سزاوەرگرتن دەپارێزن، هەتا بۆیان بکرێت سزای خەڵکی کوردستان بە گشتیی و خەڵکی سنووری ئەنفال و کیمیاباران دەدەن. بەو کارانەیان هەستی زۆرینەی خەڵکی عێراق بریندارەدەکەن، حسابیان بۆ هەڵوێستی ئەمریکییەکان و ئێرانییەکانیش نەکرد.لە ئاستی ناوخۆیی کوردستاندا، دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان سزای ئەو کەسانەی نەداوە کە لە شاڵاوەکانی ئەنفال و کیمیاباراندا بەشدارییانکردووە، دەسەڵات ڕازی نییە تاونبارانی شاڵاوەکانی ئەنفال (موستەشارەکان) لە لایەن دادگای باڵای تاوانەکانی عێراقەوە دادگاییبکرێن. نەک هەر ئەوە، بەڵکو دەسەڵاتی باشوور هەزاران کەسی لە تاوانبارانی هەڵمەتەکانی ئەنفالی لە لای خۆی داڵدەداوە و ژیانێکی زۆر خۆشی بۆ دابینکردوون و پلە و پۆستی بەسەردا دابەشکردوون.

دەسەڵاتدارانی باشوور لە ئاست پشتگوێخستنی تاوانی ئەنفال و کیمیاباراندا ڕێککەوتنی ستراتیژییان هەیە، کە سەرۆککۆماری عێراق بڕیاری دادگای باڵای تاوانەکانی عێراقی بۆ بەسزاگەیاندنی سەدام حوسەین ئیمزانەکرد، نزار خەزرەجیی و تاریق ڕەمەزانی پاراست، سوڵتان هاشمیی وەزیری بەرگریی حکومەتی سەدامی لە سزای هەڵواسین ڕزگارکرد. بە تەواوی بۆمان دەردەکەوێت کە دەسەڵاتدارانی باشوور نەک هەر لەگەڵ ئەوەدا نین ئەنفال و هەڵەبجە بە جینۆسایدی گەلی کورد بناسرێت، بەڵکو کاردەکەن بۆ ئەوەی بە نەوەکانی ئایندە بڵێن لە مێژووی کورددا کارەساتێک بە ناوی ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجەوە نەبووە.

### ٣– کۆمپانیاکانی چەکی کیمیاویی:

دەسەڵاتی باشووری کوردستان سۆراغی ئەو کۆمپانیا بێگانانەی نەکرد کە چەکی کیمیاوییان بە ڕژێمی بەعس دەفرۆشت. لە دوای ڕاپەڕینەوە حکومەتی هەرێمی

کوردستان و حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشوور کوردستان لە زۆربەی وڵاتانی ئەوروپادا نوێنەریان هەیە، بەڵام هیچ چالاکییەکی ئەو نوێنەرانە لەسەر دۆزینەوە و بەسزاگەیاندنی ئەو کەس و کۆمپانیانە دیارنییە، کە چەکی کیمیاوییان بە ڕژێمی سەدام فرۆشتووە.

ساڵی ٢٠٠٥ - ٢٠٠٦ کاتێک ڕێکخراوی چاک گەورە بازرگانی چەکی کیمیاویی فرانک ئانراختی لە هۆڵەندە دایە دادگا، لەسەر ئەوەی چەکی کیمیاویی بە ڕژێمی سەدام فرۆشتووە، دەسەڵاتدارانی باشووری کوردستان نەک هەر پشتیوانیی و دەستخۆشییان لە ڕێکخراوی چاک نەکرد، لە سەرەتادا دژایەتیی ڕێکخراوەکەیان دەکرد. دواتر کە زانییان لەو کارەدا دەرەقەتنایەن، هەوڵیاندا خۆیان وەکو بەشداری دادگاییکردنی ئانراخت بناسێنن، بەڵام لەو بوارەدا سەرکەوتنیان بەدەستنەهێنا.

هەندێک زانیاریی دەماودەم هەن باس لەوە دەکەن کە حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشوور بەرتیلیان لەو کۆمپانیایانە وەرگرتووە، کە چەکی کیمیاوییان بە ڕژێمی سەدام فرۆشتووە، بۆ ئەوەی دادگایینەکرێن و قەرەبووی خەڵکی کوردستان نەکەنەوە.

### ٤- بنەماڵەی ئەنفال و کیمیاباران:

دەسەڵاتی کوردیی و بە تایبەتیی حیزبی دەڤەری زۆنی سەوز، هیچ ڕێزێکی بۆ کیمیابارانی هەڵەبجە دانەناوە. ساڵی ١٩٩٣ من ئەندامی خولی یەکەمی پەرلەمانی کوردستان بووم لەسەر لیستی سەوز. فراکسیۆنی پارتیی پرۆژەی ڕۆژی شەهیدی کوردستانی پێشکەش بە پەرلەمان کرد. لە پرۆژەکەدا هاتبوو ڕۆژی ١٦/ ٣ ڕۆژی کیمیابارانی هەڵەبجە بە ڕۆژی شەهیدی کوردستان دابنرێت. فراکسیۆنی سەوز دژی ئەو پرۆژەیە وەستایەوە، ئەندامانی فراکسیۆنی سەوز شەوکەتی حاجی موشیر (خەڵکی هەڵەبجە) مام ڕۆستەم و دکتۆر جەلال شفیق هەستانەوە دژی ئەوە قسەیانکرد، کە ڕۆژی کیمیابارانی هەڵەبجە بە ڕۆژی شەهیدی کوردستان دابنرێت. من و سیروان نەورۆڵیی هەردووکمان ئەندامی فراکسیۆنی سەوز بووین دژی ئەو سێ ئەندامپەرلەمانەی فراکسیۆنی سەوز قسەمانکرد، لەگەڵ ئەوە بووین ڕۆژی کیمیابارانی هەڵەبجە بە ڕۆژی شەهیدی کوردستان دابنرێت. پرۆژەکە خرایە دەنگەوە من و سیروان نەورۆڵیی دەنگمان بە پرۆژەکە دا، پرۆژەکە دەنگیهێنا و ڕۆژی کیمیابارانی هەڵەبجە بوو بە ڕۆژی شەهیدی کوردستان. لەو

کاتەوە یەکێتیی من و سیروان نەورۆڵیی لە لیستی ڕەشی خۆی دانا. بنەماڵەی قوربانییانی ئەنفال و کیمیاباران لە ژیانێکی کوڵڵەمەرگییدا دەژین. بەرپرسە باڵاکانی باشوور ڕۆژێک لە نزیکەوە لەگەڵ ئازار و یادەکانی ئەنفال و کیمیاباراندا نەژیاون، لە بۆنەی ئەنفال و کیمیاباراندا سەردانی قوربانییانی ناوچەکەیان نەکردووە، لەگەڵ بەرپرسانی عێراقیی و ئەمریکییدا نەبووبێت سەردانی بۆنەکانی هەڵەبجە و ئەنفال ناکەن. ڕۆژنامەی هاوڵاتیی ڕۆژی ٢٨/ ٧/ ٢٠١٠ لە مانشێتیدا نوسیویەتی: ماوەی پێنج ساڵە سەرۆکی هەرێم سەردانی گەرمیانی نەکردووە.

لە بواری ئاوەدانیی و دابینکردنی خزمەتگوزارییەوە، ناوچەکانی ئەنفال و هەڵەبجە نەک هەر لە سەردەمی شەڕی کورد و شەڕی عێراق و ئێراندا زۆرترین وێرانکاریی و زیانی گیانییان بەرکەوت، لە سەردەمی شەڕی ناوخۆی دوای ڕاپەڕیینی حیزبەکانی باشووری کوردستاندا، زۆرترین شەڕ و قورسترین وێرانکارییان بە خۆیانەوە بینی. ئەگەرچی بەگوێرەی بڕگەی ١١٢ دەستووری عێراقی فیدراڵیی دەبێت بڕێک لە داهاتی نەوت بۆ ناوچە زیانلێکەوتووەکان بۆ ماوەیەکی دیاریکراو تەرخانبکرێت. پرۆسەی ئاوادانکردنەوە لەو ناوچانەوە دەستپێبکات کە زۆرترین وێرانکارییان بە خۆیەوە بینیوە. بەڵام دەسەڵاتدارانی باشووری کوردستان بەپێی ئەو بڕگەی دەستووری عێراق لەگەڵ هەڵەبجە و گەرمیان و هەوراماندا نەجوڵاونەتەوە، هیچ بودجەیەکی تایبەتیان بۆ ئاوەدانکردنەوەی ناوچە زیانلێکەوتووەکان تەرخاننەکردووە. لە دوای ڕاپەڕیینەوە هەتا ئەمڕۆ هیچ پۆستێکی حکومیی بە بنەماڵەی قوربانییانی ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجە نەدراوە، مەگەر ئەو کەسە پلە حیزبییەکەی زۆر بەرزبووبێت.

## ٥- ناساندنی جینۆساید:

لە حوزەیران ساڵی ٢٠٠٧دا، دادگای باڵای تاوانەکانی عێراق ئەنفالی بە جینۆسایدی گەلی کورد پەسەندکرد. لە مانگی یەکی ٢٠١٠دا هەمان دادگا بڕیاریدا کە کیمیابارانی شاری هەڵەبجە تاوانی مرۆڤایەتییە، خەڵکی هەڵەبجە بە بڕیاری دادگا ڕازینەبوون و لە دادگای پێداچوونەوە سکاڵایان تۆمارکرد. دواتر دادگای باڵای تاوانەکانی عێراق بڕیاریدا کە کیمیابارانی هەڵەبجەیش جینۆسایدی گەلی کورد بووە.

دوای ماوەیەک پەرلەمانی عێراق بڕیاری دادگای باڵای تاوانەکانی عێراقی پەسەندکرد، بەڵام وا دە ساڵ زیاتر بەسەر بڕیاری دادگای باڵای تاوانەکانی عێراقدا تێپەڕی، نە دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان، نە نوێنەرانی کورد لە عێراق کاریان بۆ ئەوە نەکردووە حکومەتی عێراق بڕیاری جینۆسایدی دادگای باڵای تاوانەکان پەسەندبکات و لێکەوتەکانی ئەو بڕیارە جێبەجێبکات.

لە ئاستی نێونەتەوەییدا دەسەڵاتی کوردی لە هەرێم و عێراق، هیچ چالاکییەکی دیارنییە کار بۆ بەجینۆسایدناساندی هەڵەبجە و ئەنفال بکات.

## چارەسەری لێکەوتەکانی ئەنفال و هەڵەبجە

١- تاوانبارانی ئەنفال، ئەوانەی کە لە دادگای باڵای تاوانەکانی عێراقەوە داواکراون، بدرێنە دادگا و دادگا حوکمی خۆی لەسەریان بدات.

٢- دادگایەکی تایبەت بۆ سەرانی دەسەڵاتداری کورد پێکبێت، بۆ ئەوەی باش لەوە بکۆڵێتەوە کە بۆچی تاوانبارانی ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجە ئازاددەکەن و ڕێگەنادەن دادگا کارەکانی خۆی بە ئاسایی بەڕێوەببات.

٣- ئەو کۆمپانیا و وڵاتانەی هاوکاریی ڕژێمی سەدامیان کردووە بۆ بەدەستهێنانی چەکی کیمیاویی، بدۆزرێنەوە و بدرێنە دادگا و زیانەکانی خەڵکی هەڵەبجە و ئەنفال ببژێرن.

٤- لەسەر ڕۆشنایی بڕیاری دادگای باڵای تاوانەکانی عێراق کە ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجەی بە جینۆسایدی گەلی کورد داناوە، هەوڵبدرێت جینۆسایدی گەلی کورد بە جیهان بناسرێت، بۆ ناساندن و چارەسەرکردنی کێشەی کورد سودی لێوەربگرێت.

٥- لە ڕێگەی بژاردنی زیانەکانی جینۆسایدەوە، لە ڕێگەی دەستووری کۆماری عێراقی فیدراڵەوە، هەوڵێکی جدیی بدرێت بۆ ئاوەدانکردنەوەی ناوچە ئەنفالکراوەکان و هەڵەبجە. کەلار و هەڵەبجە بکرێن بە دوو پارێزگای هەرێمی کوردستان.

٦- خەڵکی دەڤەری ناوچە ئەنفالکراو و کیمیابارنکراوەکان لە باجی کار و کاسپیی ببوردرێن، وەکو چۆن لە ئەڵمانیا جووەکان لە باجی کار و کاسپیی بووردراون.

**سەرچاوەکان**

١- دێڕێک شیعری شێرکۆ بێکەسە.

٢- جینۆسایدی گەلی ئەرمەن، ملفات ترکیە یوسف ئیبراهیم الجهمانی ساڵی ٢٠٠٠ دمشق، دار الحورانی.

٣- جینۆسایدی گەلی جوو لە جەنگی دووەمی جیهانییدا بە دەستی نازییەکانی ئەڵمانیا.

٤- بڕیاری دادگای باڵای تاوانەکانی عێراق ٢٠١٠.

٥- دکتور فایەق گوڵپیی، کە لێرەوە سەیری ژیانی خۆم دەکەم، یادەوەریی، ٢٠١٨.

٦- دکتور فایەق گوڵپیی، کە لێرەوە سەیری ژیانی خۆم دەکەم، یادەوەریی، ٢٠١٨.

٧- شەوکەتی حاجی موشیر، کارەساتی کیمیابارانی هەڵەبجە، بەهاری ١٩٨٨.

٨- یۆست هیلتەرمان، ئەمریکا و عێراق و گازبارانی هەڵەبجە، موحەممەد حەمە ساڵەح، لە ئینگلیزییەوە کردوویەتی بە کوردیی، ساڵی ٢٠٠٨ کۆمپانیای ئاوێنە.

٩- شەوکەتی حاجی موشیر، کارەساتی کیمیابارانی هەڵەبجە، بەهاری ١٩٨٨، لاپەڕە ١٨٨.

١٠- لە ١٨/ ٢/ ١٩٨٨ نەوشیروان مستەفا، بروسکەیەکی بۆ پزیشکەکانی شۆڕش کردبوو، وێنەیەکی بە من گەیشت، لەو بروسکەیەدا دەڵێت: ڕژێمی بەعس بەرنامەیداناوە هەموو کوردستان کیمیابارانبکات، ئێوە ئاگاتان لێبێت و بەگوێرەی ڕێنمایی پزیشکیی چارەسەری بریندارەکانی چەکی کیمیاویی بکەن.

١١- حەسیب قەرەداغیی، شاعر بە بۆنەی کیمیابارانی هەڵەبجە و کیمیابارانی گوندی سێوسێنانەوە، هۆنراوەی بە ناوبانگی هەڵەبشیمای نوسی لە دێڕێکیدا دەڵێت: ئیتر لەمەودوا لە هەڵەبجەوە دەڕوانینە خەڵک، دەڕوانینە خودا. شاعرێکی ڕۆژهەڵاتی کوردستان خۆی دا بە ئاودا.

١٢- جینۆسایدی عێراق، ئەنفال بۆ سەر کورد ساڵی ١٩٩٣ ڕێکخراوی مافی مرۆڤی جیهانیی (هیومان رایتسۆچ) بڵاویکردەوە.

١٣- التیارات السیاسیه فی کردستان العراق، ١٩٤٠ - ٢٠٠٤ سلاح الخرسان، صفحه ٤٣٩.

١٤- نامەی پشتیوانیی پارتیی و یەکێتیی و بزوتنەوە بۆ خەزرەجیی.

١٥- وێنەیەک لە ئۆفیسە وەهمییەکانی پەیمانگای هەڵەبجە.

١٦- جونوسن: راندل کلۆڵی نەتەوەیەک.

# ١٢

# دیبلۆماسیەتی باشوری کوردستان

ئاشتیی و پێکەوەژیانی کۆمەڵگەکان، پێویستی بە پەیوەندیی بەردەوامی نێوان دەوڵەتان و پێکهاتە نەتەوەیی و ئاینیی و کۆمەڵایەتییەکان هەیە. تاک و پێکهاتە کۆمەڵایەتیی و سیاسییەکان، پێویستیی و بەرژەوەندیی هەمەجۆریان هەیە، هیچ پێکهاتەیەک بۆی ناکرێت بە تەنها بەبێ ئەوانی تر بەرژەوەندییەکانی بپارێزێت و پێوسیتییەکانی بەدەستبهێنێت و بە ئاسودەیی بژی، بۆ بەدەستهێنانی ئەو ئامانجانە، دەبێت دەوڵەتان و پێکهاتەکان لە پەیوەندیی بەردەوامدابن. ئەو پەیوەندییە سیاسیی و نێودەوڵەتییانە، بە پەیوەندیی دیبلۆماسیی دەناسرێن.

سیستەمەی باڵادەستی سیاسیی جیهان سیستەمی دەوڵەتەکانە، ئەو نەتەوانەی دەوڵەتیان نییە، لە پێگەی دبلۆماسنییدا پەراوێزدەخرێن. ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان نوێنەری هەموو نەتەوەکان نییە، تەنها نوێنەرایەتیی ئەو نەتەوانە دەکات، کە دەوڵەتیان هەیە. لەبەرئەوەی کورد دەوڵەتی نییە، لە مەیدانی دبلۆماسییدا پێگەیەکی ئەوتۆی نییە. دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام، عێراق بوو بە دەوڵەتێکی فرەنەتەوە، لەو کاتەوە دبلۆماسیەتی عێراق بە دەستی کوردەوەیە، ئەمە دەرفەتێکی باشی بۆ خەباتی دبلۆماسیی کورد ڕەخساند.

لە ئەنجامی گەشەکردنی زانستی تەکنۆلۆژیا و ئامێرەکانی پەیوەندییدا، سیستەمی جیهانگیریی دروستبووە، ئیتر تاک و پێکهاتەکان زۆرتر تێکەڵی یەکتر دەبن، گرنگیی چالاکیی دیبلۆماسییش زیاتر دەبێت. بەهۆی بەرژەوەندیی جیاوازیی وڵاتانەوە، بەهۆی ناکۆکیی ناوخۆیی و دەرەکیی وڵاتانەوە، هەتا دێت کێشە نێودەوڵەتییەکان و کێشە ناوخۆییەکان زۆرتر دەبن، بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشانە، لایەنە پەیوەندییدارەکان پەنا بۆ گفتوگۆ و رێککەوتن دەبەن، گفتوگۆ و رێککەوتن پێویستی بە پەیوەندیی و تێکەڵبوون و دیبلۆماسییەت هەیە.

ئەگەر پەیوەندیی دیبلۆماسیی نێوان گەلانی خاوەن_دەوڵەت بۆ یەکترناسین و لێتێگەیشتن و بۆ چارەسەری کێشەکانیان گرنگ بێت، پەیوەندیی نێوان گەلێکی بێدەوڵەت و مافزەوتکراوی وەکو کورد، لەگەڵ هێز و وڵاتانی تری جیهاندا، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی و بۆ پاراستنی دەستکەوتەکانی گرنگترە. لەبەرئەوەی گەلی کورد دەوڵەتی نییە، پەیوەندیی لەگەڵ کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییدا سنووردارە، دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستانیش بە هەموو شێوەیەک هەوڵدەدەن دەنگی کورد بە جیهان نەگات و خەباتی گەلی کورد لە رووی دیبلۆماسییەوە بە لاوازیی بهێڵنەوە.

لە سەردەمی خەباتی چەکدارییدا هەتا راپەڕین، رێکخراوە سیاسییەکان و بەرپرسە باڵاکانی ئەو رێکخراوانە چالاکیی دیبلۆماسییان ئەنجامدەدا، چالاکییە دیبلۆماسییەکانیش سنووردابوون، لە پەیوەندیی نهێنیی نێوان بەرپرسێکی حیزبیی و بەرپرسی دەزگای هەواڵگریی وڵاتێک تێنەدەپەری. لە پەیوەندیی ئاشکرای نێوان بەرپرسێکی حیزب و رۆژنامەنوسێک، پەرلەمانتارێک، یان کەسایەتییەکی رۆشنبیری وڵاتێکی تر تێنەدەپەڕی. لە دوای راپەڕیین پەرلەمان هەڵبژێردرا و حکومەتی هەرێم پێکهێنرا، دەرفەتکرایەوە بۆ ئەوەی کاری دیبلۆماسیی کورد لە رێگەی دەزگاکانی حکومەتی هەرێمەوە هەنگاوێکی باش بچێتە پێشەوە.

کە رژێمی سەدام روخا، دەوڵەتی عێراقی نوێ پێکهێنرا. بەگوێرەی رێککەوتنی پێکهاتە سیاسییەکانی عێراق، پۆستی سەرۆککۆماری عێراق بەر کورد کەوت. زۆربەی کات پۆستی وەزیری دەرەوەی عێراقیش بەر کورد دەکەوت، دەرفەتێکی باش بۆ کورد هاتەپێشەوە هەتا لە رێگەی حکومەتی عێراقەوە کاری دیبلۆماسیی بکات.

وا چواردە ساڵ بەسەر عێراقی نویدا تێدەپەڕێت، کورد پۆستی باڵای دیبلۆماسیی

عێراقی بەدەستەوەیە، هیچ بەدیناکرێت کە کورد دیبلۆماسیەتێکی سەرکەوتووی بۆ عێراق و بۆ باشووری کوردستان ئەنجامدابێت. بە پێچەوانەوە، زۆربەی کات دیبلۆماتکارە کوردەکان، بەو پێگەیەی هەیانبووە خزمەتی وڵاتە داگیرکەرەکانی کوردستانیان کردووە.

## چەمکە هەڵەکانی دیبلۆماسیەتی کورد

### ١- خۆبەبچووکبینین:

ئامانجی چالاکیی دیبلۆماسیی ئەوەیە، لایەنە بەرانبەرەکان یەکتر بناسن، لە بەرنامەی یەکتر تێبگەن، کار بۆ ڕێککەوتن و هاوپەیمانیی بکەن، بۆ ئەوەی خزمەتی بەرژەوەندیی گەل و وڵاتی هەردوولا بکەن.

لە کاری دیبلۆماسییدا نابێت لایەنێک خۆی بە گەورە بزانێت و بەرانبەرەکەی بە بچووک بزانێت، یان لایەنێک خۆی بە بچووک و بەرانبەرەکەی بە گەورە ببینێت. ئەگەر وابێت پەیوەندییەکی ڕاست و هاوسەنگ لە نێوانیاندا پێکنایەت. خۆسەپاندنی گەورە و خۆبەدەستەوەدانی بچووک دروستدەبێت و خەباتی دیبلۆماسیی هاوسەنگ بەڕێوەنابرێت. گەلی کورد دەوڵەتی نییە، پەیمانگای پێگەیاندنی کادری دیبلۆماسیی نییە، بەڵام خاوەنی دۆزێکی ڕەوای نەتەوەیییە. ڕەوایی دۆزەکەی پارسەنگی نەبوونی دەوڵـەت و دەزگای دیبلۆماسیی بۆ دەکاتەوە. لەبەرئەوەی دەسەڵاتدار و کادری دیبلۆماسیی کورد باش لە گەورەیی و ڕەوایـی دۆزی کورد تێنەگەیشتوون، لە کاری دیبلۆماسییدا هەست بە کەمیی دەکەن، بڕوایان بە خۆیان نییە و لە چالاکیی دیبلۆماسییدا سست دەردەکـەون. ئەو شێوازە دیبلۆماسییەی کوردستان کە لە جەنگی یەکەمی جیهانییەوە دەستیپێکردووە و هەتا ئێستا بەردەوامە، دیبلۆماسییەکی ناهاوسەنگە، لە پەیوەندیی بەرپرسەکانی شۆڕش بە نوێنەرانی دەزگا هەواڵگرییەکانی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان و وڵاتانی زلهێز تێپەڕینەکردووە.

لە کاتی دانیشتن و گفتوگۆدا، لەبەرئەوەی بەرپرسەکانی شۆڕش لەبەردەم نوێنەری ئەو دەزگا هەواڵگرییانەدا خۆیان بە بچووک دەزانن، باسی ڕەوایی دۆزی

کورد ناکەن، باسی گرنگیی پێکەوەژیانی ئاشتییانەی کورد و گەلانی تری ناوچەکە ناکەن، باسی کێشە ڕۆژانەکانی حیزب و شۆڕش دەکەن، بە لایەنی بەرانبەر دەڵێن چیتان دەوێت بۆتان دەکەین بە مەرجێک هاوکاریی حیزب و سەرکردەکانمان بکەن.

نوێنەری دەوڵەتانی داگیرکەر، کە بەو شێوەیە نوێنەری حیزب و شۆڕشی کورد دەبینن باسی کێشەی گەلەکەیان ناکەن، تەنها بە شوێن دەستکەوتی ڕۆژانەی حیزبیی بچووکەوەن، هێندەی تر کوردیان بە لاوە بچووکدەبێتەوە. بەرانبەر هەر هاوکارییەکی مادیی و چەک و تەقەمەنیی، مەرجی دژایەتییکردنی شۆڕشی پارچەکانی تری کوردستان بۆ ئەو هاوکارییە دادەنێن.

نوێنەری گەلی کوردیش بەم بچووکبینینەی خۆی و گەلی کورد و بەگەورەبینینی نوێنەری وڵاتانی داگیرکەر ڕازیدەبێت، سەری بۆ داواکارییە ناڕەواکان دادەنوێنێت. ئیتر خەباتێکی دیبلۆماسیی هاوسەنگ بەڕێوەنابرێت. چەمکی خۆبەبچووکبینین و ئامانج ـ بچوککردنەوە، تەنها لە هزری سیاسیی بەرپرسانی حیزب و شۆڕشدا جێگیرنەبووە، لەوێشەوە بۆ ناو هزری سیاسیی خەڵکی کوردستان دزەیکردووە. بەمەیش دیاردەی سیخوڕییکردن بۆ دوژمن و وڵاتانی تر بە لای توێژەکانی کۆمەڵگەی کوردستانەوە ئاساییدەبێت. لە لایەکی ترەوە بەهۆی ئەو مەرجانەی وڵاتانی داگیرکەر بەسەر حیزب و شۆڕشدا سەپاندوویانە، شەڕ و سەرکوتکردنی خەباتی پارچەکانی تری کوردستان بووە بە کەلتوری سیاسیی باشووری کوردستان و هەموو حیزبەکان پەیڕەویدەکەن. ئەمەش وایکردووە کە یەکێتیی خەباتی گەلی کورد دروستنەبێت و کورد نەتوانێت لە دەرەوەی وڵات و لە وڵاتە کاریگەرەکانی جیهاندا لوبیی دروستبکات.

پێداچوونەوە بە چەمکی بچووکیی کورد و گەورەیی داگیرکەردا، ئەرکێکی دەستلێبەرنەدراوە بۆ ئەوەی دیبلۆماسیەتی کورد گۆڕانکارییەکی چەندایەتیی و چۆنایەتیی بەسەردابێت و لەم چوارچێوەیەی ئێستا دەربچێت، خزمەتی چارەسەرکردنی کێشەی کورد بکات. ئەم کارەیش بەوە دێتەدی کە هێز و لایەنە کوردییەکان پەروەردەیەکی ڕاست لەسەر چەمکەکانی دەوڵەت و دەسەڵات و گەل و شۆڕش و شارستانیەت و مێژوو ببینن، لەوێوە کەسێتیی تێکشکاوی تاک و کۆی کورد ڕاستبکەنەوە.

ئەگەر لایەنە دژەمرۆیی و سەرکوتکەر و تالانکارەکانی دەزگای دەوڵەت و دەسەڵاتخوازیی بێنینە بەرچاوی خۆمان، بۆمان دەردەکەوێت کە گەلی کورد بەختی هەبووە نەیتوانیوە دەوڵەت دروستبکات، چونکە لە چەوساندنەوەی مرۆڤ و داگیرکردنی وڵاتان و جینۆسایدی گەلاندا بەشدارییەکردووە. مێژوو دەیسەلمێنێت گەلی کورد لە سەردەمی دەوڵەتی کۆیلەداریی و دەرەبەگایەتیی و سەرمایەدارییدا، دەوڵەتی نەبووە، بە پێوانەی سەردەمی مرۆڤدۆستیی و فەلسەفەی پۆستمۆدرێنە، کورد گەلێکی شارستانیی و بێوەی بووە و زیانی بۆ مرۆڤایەتیی نەبووە. بەو شێویە دەتوانین گرێی خۆبەچووکبینینی کورد بکەینەوە، پەیوەندیی و خەباتی دیبلۆماسیی هاوسەنگ و تەندروست لە نێوان نوێنەرانی گەلی کورد و نوێنەرانی گەلان و وڵاتانی تردا پێکبهێنین و پێشیبخەین.

## ٢- لاوازیی ستراتیژی سیاسیی:

خەباتی دیبلۆماسیی بە ستراتیژی سیاسیی ڕونەوە گرێدەدرێت، دیبلۆماسیەت هەوڵدەدات ئەو ئامانجانە بهێنیتەدی کە لە ستراتیژدا دیاری دەکرێن. ئایدۆلۆژیا و ستراتیژی سیاسیی لە باشووری کوردستاندا لاوازن، بۆیە بەرژەوەندیی حیزب و بنەماڵە و تاکتیکی ڕۆژانەی تاکە دەسەڵاتدارەکان، مۆرک لە سیاسەتی دیبلۆماسیی دەدات.

ئەو تێکۆشانە دیبلۆماسییەی کە هەبووە، پەیوەندیی نهێنیی و تاکەکەسیی نێوان بەرپرسانی لایەنە سیاسییەکانی باشووری کوردستان و هەواڵگریی وڵاتانی پەیوەندییدار بووە، ئەو جۆرە پەیوەندییە بە شێوەیەکی سەرەکیی خزمەتی بە تاک و پێکهاتە دەسەڵاتدارەکانی باشووری کوردستان کردووە، خزمەتی بە حیزب و بنەماڵە کردووە، خزمەتی زۆری بەو وڵاتانە کردووە کە حیزب پەیوەندیی لەگەڵدا دروستکردوون، بۆ چارەسەری کێشەی کورد سودی لێوەرنەگیراوە.

گەلی کورد سەر و ماڵی لەپێناو سەرخستنی شۆڕشی کورددا بەختدەکات، بەرخودانی بێوچانی دەکات، بەڵام لەبەر لاوازیی دیبلۆماسیەتی کورد و خزمەتنەکردنی ئەو دیبلۆماسییە بە کێشەی کورد، بەردەوام دوژمنەکانمان لە ململانێی سیاسییدا پێشماندەکەون و مەرجەکانی خۆیان بەسەرماندا دەسەپێنن و دوچاری چەندیین

شکست و ماڵوێرانیی گەورەمان دەکەن. لە ناو خەڵکی کوردستاندا ئەوە باوە کە دەڵێن: «لە شەڕدا دوژمن ناتوانێت بەسەرماندا سەربکەوێت، بەڵام لەسەر مێزی گفتوگۆ و دانوستان، بە ئاسانیی دوژمن بەسەرماندا سەردەکەوێت. ئەوەی لە شەڕدا بەدەستمانهێناوە، لە سیاسەتدا لێماندەسێننەوە».

لە سەردەمی خەباتی چەکدارییدا شۆڕشی کورد ئامانجێکی سیاسیی دیاریکراوی بۆ قۆناغێکی دیاریکراو نەبووە، لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلولدا کەس نەیدەزانی کورد داوای چی دەکات، زۆربەی کات حکومەتی عێراق ستراتیژی بۆ تێکۆشانی گەلی کورد دیاریکردووە. لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٣دا حکومەتی عێراق لەسەر بنەمای حوکمی لامەرکەزیی دەرگای گفتوگۆی لەگەڵ بەرپرسانی شۆڕشی کورددا کردەوە، لەبەرئەوەی سەرکردایەتیی شۆڕش ستراتیژ و ئامانجی شۆڕشی دیارینەکردبوو، ناکۆکیی لە نێوان بەرپرس و کادرەکانی پارتیی و شۆڕشی ئەیلولدا لەسەر حوکمی لامەرکەزیی دروستبوو. جیابوونەوەی حوزەیرانی ١٩٦٤ لە ئەنجامی ئەو ناڕوونییە ستراتیژییەوە دروستبوو*١.

ساڵی ١٩٦٩ وەفدی شۆڕشی ئەیلول بۆ ڕێککەوتن لەگەڵ حکومەتی عێراقدا سەردانی بەغدا دەکات، دارا توفیق ئەندامی مەکتەبی سیاسیی پارتیی سەرۆکی وەفدی کورد دەبێت، سەرۆکی وەفدی حکومەتی عێراق سەدام حوسەین دەبێت. سەدام بە دارا دەڵێت: چیتان دەوێت و داوای چی دەکەن؟ دارا تەوفیق دەڵێت: هاتووم بۆ گفتوگۆ. سەدام دەڵێت: لەسەر چی گفتوگۆبکەین؟ دارا لەوە زیاتر ناتوانێت قسەبکات و سەدام حوسەین پێشنیاز بۆ وەفدەکە دەکات، کە باشترە بۆ کورد داوای حوکمی زاتیی بکەن*٢.

ساڵی ١٩٨٣ کاتێک گفتوگۆی نێوان یەکێتیی و حکومەتی عێراق دەستیپێکرد، سەرکردایەتیی یەکێتیی نەیاندەزانی لە کاتی گفتوگۆدا چ داواکارییەک پێشکەش بە وەفدی حکومەتی عێراق بکەن، بۆیە بڕیارێکی سەرپێییان دا، کە باس لە حوکمی زاتیی (متەتەور - پێشکەوتوو) بکەن*٣.

هۆکاری لاوازیی ئایدۆلۆژیا و ستراتیژ بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە شۆڕشەکانی باشووری کوردستان شۆڕش نەبوون، بە قۆناغە سروشتییەکانی شۆڕشدا تێنەپەڕیون، گەل و هێزی پێشمەرگە و ڕێکخستنی سیاسیی و کادر خۆی بۆ ئەرکی شۆڕش و شێوازەکانی خەبات ئامادەنەکردووە. کردارێکی شۆڤێنیی و ناڕەوای دەوڵەتی عێراق،

پاڵی بە پێکهاتەیەکی گەلی کوردەوە دەنا بە پەرچەکردار وەڵامبداتەوە و جەماوەری کوردستان پشتگیریی پەرچەکردارەکە بکات و خەباتی چەکداریی دەستپێبکات.

کە شۆڕش دەستیپێکردووە، شەڕ و پێکدادانی بەردەوام لە نێوان هێزی پێشمەرگە و سوپای عێراقدا دروستبووە. هەموو دەزگاکانی شۆڕش بە خەباتی چەکدارییەوە سەرقاڵکراون، دەرفەتی خۆڕێکخستن و هەڵبژاردنی ئایدۆلۆژیای ڕاست و داڕشتنی ستراتیژی سیاسیی بۆ شۆڕش بەرتەسککراوەتەوە، بێئیرادەیی سەرکردەکانی شۆڕشیش هێندەی تر دەرفەتی پەروەردە و داڕشتنی ستراتیژی لەباربردووە. هۆکارێکی تری لاوازیی ئایدۆلۆژیی و ستراتیژی شۆڕشی کورد بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە سەرکردایەتیی شۆڕشی کورد، بە دەستی تاک و پێکهاتەی خێڵەکیی و دەرەبەگی کوردستانەوە بووە، سروشت و بەرژەوەندیی ئەم توێژەیش، لەگەڵ پێشکەوتنی ئایدۆلۆژیا و ستراتیژی نەتەوەیی و پێشکەوتنی کۆمەڵدا یەکناگرێتەوە. بەو شێوەیە دەبینیت لەبریی ئەوەی ستراتیژی دیبلۆماسیەتی کورد ئاڕاستەبکات، هزری خێڵەکیی و بەرژەوەندیی تاک و پێکهاتە خێڵەکییەکان دیبلۆماسیەتی کورد ئاڕاستەدەکات. هەر ئەو پێکهاتە خێڵەکییە دەستڕۆیشتووەی سەردەمی شاخ، لە دوای ڕاپەڕیین و ڕوخانی ڕژێمی سەدام، وەکو سەرۆکی هەرێم و سەرۆککۆماری عێراق و نوێنەری هەرێم لە وڵاتان، درێژە بە دیبلۆماسیەتی خێڵەکیی و حیزبیی دەدات، لە سەردەمی خەباتی شاخدا پیوەندیی لەگەڵ وڵاتانی داگیرکەری کوردستاندا دروستکردووە، هەتا ئێستا ئەو پەیوەندییە بەردەوامە و هەژموونی داگیرکەرانی کوردستان لەسەر دیبلوماسیەتی کورد دیارە، ئەو هەژموونە ڕێگەنادات هەرێمی کوردستان دەستووری هەبێت و دیبلۆماسیەتێکی سەربەخۆی بەڕێوەببات.

## ٣- دۆست و دوژمنی ستراتیژیی:

داگیرکەرانی کوردستان بە یەکەوە دوژمنایەتیی گەلی کورد دەکەن، کێشەی کورد بە یەک کێشە دەزانن، ئەگەر ناکۆکیی و ململانێی گەورەیش لە نێوانیاندا هەبێت، لەسەر دژایەتییکردنی دۆزی کورد ئاشتدەبنەوە و یەکدەگرن.

دۆستەکانی گەلی کوردیش لە ناوەڕۆکدا کێشەی کورد بە یەک کێشە دەبینن، وەکو یەک پشتگیریی لە دۆزی ڕەوای هەموو پارچەکانی کوردستان دەکەن. گەلی

کوردیش کێشەی کوردی هەر چوارپارچەی کوردستان بە کێشەی خۆی سەیرکردووە، نەتەوەییانە هەڵوێست پیشاندەدا.

دەسەڵاتدارانی باشووری کوردستان، نەک هەر وەکو پێویست ڕاستیینەی کێشەی کورد لە بەرنامە و کاریاندا ڕەچاوناکەن، سود لە بۆچوونی نەتەوەیی گەلی کورد و پشتیوانیی دۆستەکانی کورد وەرناگرن، هەڵەی کوشندەش دەکەن، دۆستی ستراتیژی باشووری کوردستان (کوردی پارچەکانی تر) وەکو دوژمن سەیردەکەن. داگیرکەرانی پارچەکانی تری کوردستان وەکو دۆستی باشووری کوردستان سەیردەکەن. ئەم تێگەیشتنە هەڵەیە لە چالاکیی دیبلۆماسیی باشووری کوردستاندا ڕەنگیداوەتەوە، ستراتیژی هەڵە و ناکۆکیی دەسەڵاتی باشوور، دژی ستراتیژی جوڵانەوەی ڕزگارییخوازی گەلی کوردە، سیاسەتی باشووری کوردستان لە ئاوات و ئامانجی گەلی کورد دووردەخاتەوە، وایکردووە کێشەی کورد وەکو کێشەیەکی حیزبیی سەیربکرێت، وەکو کێشەیەکی نەتەوەیی گەلێکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست سەیرنەکرێت. بەو شێوەیە دەبینین سیاسەتی پارەچەگەرێتیی و حیزبچێتیی و خۆگرێدان بە دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستانەوە، ناکۆکییەکی لە نێوان سیاسەتی دەسەڵاتی باشووری کوردستان و سیاسەتی گەلی کورددا دروستکردووە، ئەمەیش هۆکارێکی سەرەکییە کە خەباتی دیبلۆماسیی باشووری کوردستان، لە ئاستی نەتەوەیی و نێونەتەوەییدا پێشناکەوێت.

ئەگەر کوردی هەموو پارچەکانی کوردستان لە هەندەران لە چوارچێوەی یەکێتییەکی نەتەوەییدا تێکۆشانێکی دیبلۆماسییان پێشبخستایە، کورد دەیتوانی لە ئەوروپا و ئەمریکا و وڵاتانی تر لۆبییەکی کاریگەر دروستبکات، ئەو لوبییە خزمەتی چارەسەرکردنی کێشەی کوردی دەکرد. بەو شێوەیە دەبینین کە سیاسەتی پارچەگەرێتیی و نانەتەوەیی حیزبە سیاسییەکانی باشووری کوردستان، دیبلۆماسیەتی کوردی بەهێز نەکردووە، دیبلۆماسیەتی کوردی پەکخستووە و زیانێکی گەورەی بە کێشەی کورد گەیاندووە.

بەرپرسانی باشووری کوردستان لەپێناو هەندێک دەستکەوتی کاتیی و لەپێناو پێشخستنی پەیوەندیی حیزبیی و بنەماڵەییدا، پەیوندییان لەگەڵ وڵاتانی داگیرکەردا دروستکردووە. ئەم جۆرە پەیوەندییانە زیانی مەزنیان بە دۆزی کورد گەیاندووە.

ساڵی ١٩٩٣ لە پاریس کۆبوونەوەیەکی گرنگ لە نێوان فرانسۆ میترانی سەرۆککۆماری فەرەنسا و نوێنەرانی کوردی باشووردا ئەنجامدرا، لەو کۆبوونەوەیەدا بە جدیی باس لە ئایندەی سیاسیی گەلی کورد و پشتیوانیی فەرەنسا بۆ چارەسەری دۆزی کورد کرا، بەڵام پاش چەند ڕۆژێک دەقی گفتوگۆی کۆبوونەوەکە بە دەستی حکومەتی تورکیا گەیشت، حکومەتی تورکیایش بە هەوڵی دیبلۆماسیی خۆی، پێش ئەوەی ڕێککەوتنی نێوان کورد و فەرەنسا پێی بکەوێتە سەر زەوی، ڕێککەوتنەکەی نێوان کورد و فەرەنسای هەڵوەشاندەوە*٤.

ڕۆژی ٢٦/ ١١/ ٢٠٢١ پەرلەمانی فەرەنسا گفتوگۆی لەسەر پڕۆژەی بەجینۆسایدناساندنی گەلی باشووری کوردستان لە پرۆسەکانی ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجەدا دەستپێکرد، هیچ دەنگێکی دیبلۆماسیی کورد بۆ پشتیوانیی ئەو پڕۆژەیە نەبیسترا، وەکو ئەوە وابوو ئەو پڕۆژەیە هیچ پەیوەندییەکی بە کوردەوە نەبێت، لە ئەنجامدا پڕۆژەکە دەنگی پێویستی نەهێنا. ئەمە پیشانیدەدات کورد دیبلۆماسیەت و لۆبیی فەرەنسای زۆر لاوازە و گرنگیی پێنادات.

وڵاتانی خاوەن_پێگە، کیشەی هەموو پارچەکانی کوردستان وەکو یەک دەبینن، سیاسەتی دەرەوەی ئەو وڵاتانەیش، بۆ ناوچەیەکی جیوپۆلەتیک دادەڕێژێت، تەنها بۆ دەوڵەتێک، یان بۆ نەتەوەیەک دادەڕێژرێت، بۆیە بۆ کورد گونجاوە لە ئاستی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا سیاسەتێکی یەکگرتووی هەبێت، وەکو نەتەوەیەکی خاوەن_دۆز، وەکو هێزێکی ئاشتیخواز، هەموو پارچەکانی کوردستان پێکەوە خەباتی دیبلۆماسیی بکەن. ئەم جۆرە خەباتە لە چاو ئەو خەباتەی لەگەڵ داگیرکەرانی کوردستاندا دەکرێت، ڕەواتر و ئەگەری سەرکەوتنی زۆرتر دەبێت.

دەسەڵاتدارانی باشووری کوردستان نەک هەر دیبلۆماسییەکی نەتەوەیی پەیڕەوناکەن، ئەگەر دەرفەتی خەباتی دیبلۆماسییان بۆ بڕەخسێت، دژی نەتەوەی خۆیان بەکاریدەهێنن. ساڵی ١٩٩٩ کاتێک عەبدوڵڵا ئۆج ئالان لە سوریا دەرکرا و ئاوارەی ئەورووپا بوو، وەزارەتی دادی هەرێمی کوردستان، ڕاپۆرتێکی زۆر خراپی لەسەر (پ. ک. ک) نوسی و ڕەوانەی حکومەتی ئیتالیای کرد. داوای لە ئیتالیا کردبوو مافی پەنابەریی بە عەبدوڵڵا ئۆج ئالان نەدا*٥.

یەکەم بڕیاری حکومەتی نوێی عێراق دوای ڕوخانی ڕژێمی بەعس، (پ. ک. ک)ی بە ڕێکخراوێکی تیرۆریستیی ناساند. هەڤاڵانی (پ. ک. ک) دەستیان بە خەباتی دیبلۆماسیی کرد، بۆ ئەوەی ئەو بڕیارە هەڵبوەشێننەوە، توانییان بڕیارەکە هەڵبوەشێننەوە، بەڵام لە کاتی گفتوگۆکاندا عەرەبەکان پێیانگوتبوون ئەو بڕیارە لەسەر داوای کوردە دەسەڵاتدارەکانی باشوور بووە، ئێمە لەگەڵ بڕیاری وادا نەبووین، قسەی عەرەبەکان ڕاستبوو، من دەمزانی پێش چەند ڕۆژێک لە دەرچوونی بڕیارەکە، هۆشیار زێباریی و بەرهەم ساڵەح سەردانی تورکیایان کردبوو، لەسەر داوای تورکیا ئەو دوو برادەرە ئەو بڕیارەیان بەسەر حکومەتی عێراقی نوێدا سەپاندبوو.

هۆشیار زێباریی ئەندامی مەکتەبی سیاسیی پارتیی لە ٢٠٠٥ - ٢٠١٦ وەزیری دەرەوەی عێراق بوو، ئەو ماوەیەی لەو پۆستەدا بوو، نەک هەر هیچ کارێکی دیبلۆماسیی بۆ کورد نەکرد، بۆ دڵخۆشکردنی تورکیا و ئێران، لە کۆبوونەوەیەکی پەرلەمانی عێراقدا گوتی: (پ. ک. ک) و پەژاک دوو هێزی تیرۆریستیین. ئەم لێدوانەی زێباریی لە پەرلەمانی عێراق پێشوازیی لێنەکرا، ڕووبەڕووی ڕەخنەی توند بوویەوە، حکومەتی عێراق و ئەمریکییەکانیش لێدوانەکەی زێبارییان فەرامۆشکرد.

بەو شێوەیە بۆمان دەردەکەوێت کە دیبلۆماسیەتی کورد لە هەرێم و لە عێراقیش، قۆناغی سەردەمی خەباتی چەکداریی تێنەپەڕاندووە، خزمەتی گەلی کوردی نەکردووە. نەک هەر ئەوەیش، دۆزی کوردی پێ لەکەدارکراوە. بۆیە لەسەر سیاسەتمەدارانی کورد پێویستە بە سیاسەتی دیبلۆماسیی خۆیاندا بچنەوە، وەکو کوردێکی نەتەوەیی و دیموکرات هەڵوێست پیشانبدەن، بە ناوی تێکڕای کوردەوە لەگەڵ دۆست و ڕکابەراندا گفتوگۆبکەن، لەپێناو دەستکەوتی کاتییدا مافی گشتیی نەتەوەی کورد فەرامۆشنەکەن.

### ٤- دیبلۆماسیەتی سەردانەواندن:

لە دوای ڕاپەڕیین و هەڵبژاردنی پەرلەمان و پێکهێنانی حکومەتی هەرێم، دۆزی کورد لە باشووری کوردستان قۆناغێکی نوێی بە خۆیەوە بینی. ڕۆژی٥/ ٤/ ١٩٩١ نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیاری ژمارە ٦٨٨ بۆ پاراستنی هەرێمی کوردستان دەرکرد.

ڕۆژی ٤/ ٩/ ١٩٩٢ نوێنەری ئۆپۆزسیۆنی عێراق سەردانی پەرلەمانی هەرێمی کرد، هەر ئەو ڕۆژە بە ئامادەبوونی نوێنەری ئۆپۆزسیۆنی عێراق پەرلەمان بڕیاری فیدراڵیی بۆ باشووری کوردستان دەرکرد*٦.

نوێنەری حکومەتی هەرێم لە چەندیین وڵاتی ئەورووپیی و لە ئەمریکا دانرا، ئامادەکاریی دەکرا بۆ ئەوەی لە ئایندەیەکی نزیکدا نووسینگەی کۆنوسڵیەتی ئەو وڵاتانە لە هەولێر بکرێتەوە. بەڵام وڵاتانی داگیرکەری کوردساتان، ئامادەنەبوون بە هیچ شێوەیەک نە پەرلەمان و نە حکومەتی هەرێم بناسن، پەیوەندییەکانیان لەگەڵ هەرێمدا لە چوارچێوەی نوێنەری حیزب و کەسایەتییەکاندا هێشتەوە، دەسەڵاتدارانی باشووری کوردستانیش بەم هەڵوێستەی داگیرکەران ڕازیبوون.

خاڵێکی تری لاوزایی دیبلۆماسیەتی کورد لەگەڵ داگیرکەرانی کوردستاندا ئەوە بوو، پەیوەندییە سنووردارەکەی داگیرکەران لەگەڵ حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشووری کوردستاندا مەرجداربوو، مەرجەکەیش ئەوە بوو دەبێت حیزبە دەسەڵاتدارەکان بەردەوام بۆ لاوازکردن و شکستپێهێنانی بزاڤی ئازادیخوازی گەلی کورد لە پارچەکانی تری کوردستاندا کاربکەن. ئەم مەرجەی داگیرکەران، چەندیین شەڕی براکوژیی گەورەی لێکەوتەوە، یەکێتیی ڕیزەکانی گەلی کوردی تێکدا، زیانی مەزنی بە دۆزی ڕەوای گەلی کورد گەیاند، بۆ ماوەیەک کێشە ڕەواکەی گەلی کوردی لە چارەسەرکردن دوورخستەوە.

لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام، دەوڵەتی عێراق و کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیی دانیان بە دەستکەوتەکانی گەلی کورددا نا. لە ئۆکتۆبەری ساڵی ٢٠٠٥ بە دواوە، دەستکەوتەکانی باشووری کوردستان بە دەستووری عێراق گەرەنتییکران. لە دەستووردا ڕێوشوێنی یاسایی بۆ پەیوەندیی نێوان حکومەتی هەرێم و دەوڵەتانی بیانیی دانـراوە، کەچی حیزبەکانی باشووری کوردستان دوور لەو پشتیوانییە دەستووریی و سیاسییە عێراقییە نێودەوڵەتییە، دوور لە بەرژەوەندیی گەلی کورد، هەتا ئەمڕۆیش لە ڕێگەی نوێنەری حیزبەکانیانەوە، لە پایتەختی وڵاتانی داگیرکەردا، ئەو پەیوەندییە ناوهاوسەنگەی جارانیان بەردەوامدەکەن. لە دوای ڕاپەڕیین جەلال تاڵەبانیی سەردانی تورکیا دەکات و دەیەوێت تورکوت ئوزالی سەرۆکوەزیران ببینێت، پێش ئەوەی چاوی بە ئۆزال بکەوێت کۆمەڵێک بەڵگەی ڕێککەوتنی ساڵی ١٩٢٥ کۆمەڵەی گەلان لەگەڵ خۆی دەبات و پیشانی سکرتێری ڕۆژنامەوانیی ئۆزاڵی دەدات و دەڵێت: ئایا سەرۆک دەزانێت بەو بەڵگانە

تورکیا هێندە و هێندە مافی لە باکوری عێراقدا هەیە، ئەگەر ڕێکبکەوین بۆ بەبەستهێنانی دەستکەوتەکانتان هاوکاریی جدییتان دەکەین*٧.

لە ئەپریلی ساڵی ٢٠١٠دا، نێچیرڤان بەرزانیی بەبێ ئەوەی هیچ پۆستێکی فەرمیی لە حکومەتی هەرێمی کوردستان و لە عێراق و لە پەرلەمان و لە دەزگا حیزبییەکانی تردا هەبێت، سەردانێکی وڵاتی تورکیای کرد، لە لایەن سەرۆککۆمار و سەرۆکوەزیران و وەزیری دەرەوەی تورکیاوە پێشوازیی لێکرا، کەچی لە ماوەی چوار ساڵی ڕابردوودا کاتێک نێچیرڤان بەرزانیی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران بوو، حکومەتی تورکیا پێشوازیی لێنەکرد، ئەو کاتەی نێچیرڤان سەردانی تورکیای کرد، بەرهەم ساڵح سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران بوو، حکومەتی تورکیا ئامادەنەبوو پێشوازیی لە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی هەرێم بکات، لەبەرئەوەی ئامادە نییە حکومەتی هەرێمی کوردستان بە فەرمیی بناسێت.

ئەو کۆمپانیا و پێگە هەواڵگرییانەی تورکیا کە لە هەرێمی کوردستان نوسینگەیان هەیە، ناونیشانەکانیان تەنها بە تورکیی و بە عەرەبیی دەنوسن، زمانی کوردیی بە زمانی فەرمیی عێراق ناناسن. ئەمە پێشێلکاریی دەستووری عێراقە، لەبەرئەوەی لە دەستووری عێراقدا زمانی کوردیی بە فەرمیی ناسراوە، دەبێت زمانی فەرمیی هەرێم کوردیی بێت. حکومەتی هەرێم ئەم هەڵوێست و کردەوە شۆڤینیی و نادەستوورییەی تورکەکان قبوڵدەکات و سەری بۆ دادەنەوێنێت. ئەمە دیبلۆماسیەتێکی خۆبەدەستوەدەرە، لە هیچ وڵات و هەرێمێکی جیهاندا وێنەی نییە. ئەمە سوکایەتییە بە زمان و کەلتوری نەتەوەییمان، سەردانەواندن بۆ ئەو ڕەفتارانەی دەوڵەتی شۆڤینیی تورک بە خیانەت دەژمێردرێت. ساڵی ٢٠١٦ بیناڵی یەلدرم سەرۆکوەزیرانی تورکیا سەردانی بەغدای کرد، دوای ئەوە سەردانی هەولێریشی کرد، لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەنوانیدا یەڵدرم باسی پەیوەندیی تورکیای لەگەڵ باکوری عێراقدا کرد، مەبەستی لە باکوری عێراق هەرێمی کوردستان بوو. بەو شێوەیە دەبینین لە وڵاتی خۆیشمان لە عێراقدا، تورکیا ئامادە نییە دان بەو مافە دەستوورییانەماندا بنێت کە دەستووری عێراق بە فەرمیی دانیپێداناوە و ناویناوین هەرێمی کوردستان. لەو کاتەوە تورکیا بە ناچاریی نووسینگەی قۆنسوڵیەتی لە هەرێمدا کردووەتەوە، قۆنوسڵەیت هەر خەریکی کاری سیخوڕییە، کاری دیبلۆماسیی ناکات.هەتا ئەمڕۆیش حکومەتی تورکیا ڕێگەنادات نوسینگەی نوێنەری حکومەتی هەرێم لە ئەنقەرە بکرێتەوە. ئێران لەم ساڵانەی دواییدا ڕێگەیدا نوسینگەی

حکومەتی هەرێم لە تاران بکرێتەوە. بەهۆی دیبلۆماسیەتی سەردانەواندنەوە، تورکیا و ئیران بە نەرمیی هەرێمی کوردستانیان داگیرکردووە، بۆ لێدانی تێکۆشانی گەلی کورد لە پارچەکانی تری کوردستان و بۆ کێشەنانەوە لە نێوان کورد و دەوڵەتی عێراقدا سودیان لەو سەردانەواندنەی دەسەلاتی باشووری کوردستان وەرگرتووە.

پێگەی هەواڵگریی و سەربازیی تورکیا لە هەرێم ڕۆژ بە ڕۆژ زیاددەکات، پەیوەندیی دەسەلاتدارانی هەرێم و تورکیا ڕۆژ لە ڕۆژ زیاتر لە پەیوەندیی ئاغا و جوتیار نزیکدەبێتەوە، ئەمەیش کاریگەریی خراپی لەسەر پەیوەندییەکانی هەرێم و بەغدا بەجێهێشتووە.

هەندێک جار بەرپرسانی کورد خۆیان لە مەرجەکانی داگیرکەران ڕادەتەکێن و ڕاستیینەی دۆزی کورد باسدەکەن. ساڵی ۲۰۰۱٦ لە کۆبوونەوەی ساڵانەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا لە نیویۆرک، مام جەلال وەکو سەرۆککۆماری عێراق وتاریکی پێشکەشکرد، لە وتارەکەیدا باسی هەرێمی کوردستانی کرد، تورکێک لێیڕاستبووەوە و پرسیاری لێکرد کە مەبەستت لە کوردستان چییە، مام جەلال وەلامێکی جوانی دایەوە و گوتی: کورستان وڵاتی کوردانە. ئەگەر ئێوە لە تورکیا بە فەرمیی نایناسن ئەوە بۆچوونی خۆتانە، عێراق و جیهان بە فەرمیی کوردستان دەناسن.

## ٥- دیبلۆماسیەتی خێڵەکیی - حیزبیی:

ئەو وڵاتانەی کە پشتگیری دۆزی کورد دەکەن، کار بۆ ناساندنی دۆزەکە دەکەن، هاوکاریی چارەسەرکردنی کێشەکانی دەکەن، لە بۆنەکاندا پێشوازیی لە نوێنەرانی گەلی کورد دەکەن، حکومەتەکانیان بە فەرمیی پەیوەندیی لەگەڵ نوێنەری دیبلۆماسیەتی حکومەتی هەرێمدا دەکات، لە وڵاتەکەیاندا نوسینگەی دیبلۆماسیی حکومەتی هەرێم دەکەنەوە.

بەگوێرەی بڕگەی ۱۱۷ی دەستووری عێراق، حکومەتی هەرێم بۆی هەیە لە هەر سەفارەتێکی عێراقدا لە بواری ڕۆشنبیریی و کۆمەلایەتیی و بوژانەوەی ناوچەییدا، نوێنەر و نوسینگەی هەبێت، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە نوێنەرانی کورد لە عێراقدا بۆیان هەیە ڕێژەیەکی باش لە پۆستە دیبلۆماسییەکانی عێراق وەربگرن، شانبەشانی کاری دیبلۆماسیی گشتیی عێراق، کار بۆ ناساندنی دۆزی کورد بکەن.

ئەم دەرفەتە سیاسییە نێودەوڵەتییە و ئەو دەستکەوتە دەستوورییەی عێراق، وەرگرتنی پۆستی سەرۆککۆماری عێراق و وەزیری دەرەوەی عێراق لە لایەن دوو نوێنەری کوردەوە، زەمینەی پێشخستنی خەباتی دیبلۆماسیی بۆ کورد دەڕەخسێنێت، بەڵام ئەوەی لە ماوەی ڕابردوودا بینیمان، بەرپرسان و دەسەڵاتدارانی هەرێم، نوێنەرانی کورد لە عێراق، بەگوێرەی دەرفەتی نوێ و بە هزرێکی نوێوە سەیری ئەو زەمینە لەبارە ناکەن، ناتوانن سود لەو دەرفەتانە وەربگرن، بە هزرێکی خێڵەکیی و بنەماڵەیی و حیزبیی لەو دەرفەتە نزیکدەبنەوە. دیاریکردنی نوێنەری کورد بۆ پڕکردنەوەی پۆستە دیبلۆماسییەکان، لەسەر بنەمای توانا و سەلیقە و دڵسۆزیی نییە، لەسەر بنەمای خێڵایەتیی و خزمایەتیی و حیزبایەتییە. ئەگەر سەیری ئەو کوردانە بکەین کە لە پۆستە دیبلۆماسییەکانی عێراق و هەرێمدا دانراون، دەبینن هەموویان دەستوپێوەندی بنەماڵەی بەرزانیی و تاڵەبانیین. پێش ڕوخانی ڕژێمی سەدام، دڵشاد بەرزانیی و هۆشیار زێباریی لە ئەڵمانیا و لە بەریتانیا نوێنەری حکومەتی هەرێم بوون، دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام هەتا ساڵی ٢٠١٦ هۆشیار زێباریی خاڵی مەسعود بەرزانیی وەزیری دەرەوەی عێراق بوو، ماوەیەکی زۆرە دیندار زێباریی نوێنەری حکومەتی هەرێمی کوردستانە لە نەتەوە یەکگرتووەکان، لەبەرئەوەی خزمی مەسعود بەرزانیی سەرۆکی هەرێمی کوردستانە.

ماوەی چەند ساڵێک قوباد تاڵەبانیی کوڕی جەلال تاڵەبانیی نوێنەری حکومەتی هەرێم بوو لە ئەمریکا، لەبەرئەوەی کوڕی جەلال تاڵەبانییە، ئەو سەفارەت و کۆنوسڵیانەی عێراق کە بەر کورد کەوتوون، هەمووی بە ئەندامانی بنەماڵە و خێزانی بەرزانیی و تاڵەبانیی پڕکراونەتەوە. پێوەری خێڵەکیی و بنەماڵەیی و خزمایەتیی نەبێت هیچ پێوەرێکی تر بۆ هەڵبژاردنی دیبلۆماتیی کورد ڕەچاونەکراوە.

هەر کاتێک دەرفەتی سەردانی وەفدێکی حکومەتی هەرێمی کوردستان بۆ دەرەوەی وڵات بڕەخسێت، لەبریی ئەوەی لە وەفدەکەدا نوێنەری سەرتاپای دامودەزگا و پێکهاتەکانی هەرێم ڕەچاوبکەن، وەفدێکی نەتەوەیی فرەپێکهاتە بنێرن، ئەوپەڕی توانای خۆیان بەکاردەهێنن ئەو وەفدە دیبلۆماتە فەرمییەی کورد، لە چوارچێوەی حیزب و بنەماڵەدا دەرنەچێت. لە سەرەتای ساڵی ٢٠١٠دا سەرۆککۆماری ئەمریکا بانگهێشتی سەرۆکی هەرێمی کوردستانی کرد، لەبریی ئەوەی سەرۆکی هەرێم وەفدێکی سیاسیی

دیبلۆماسیی لە حکومەت و پەرلەمان و دەسەڵاتی دادوەریی و زانکۆ و پێکهاتەکانی کۆمەڵگەی کوردستان پێکبهێنێت و بەو وەفدەوە سەردانی ئەمریکا بکات، وەفدێکی خێڵەکیی بنەماڵەیی لە خۆی و کوڕەکەی و برازاکەی (مەسعود و مەسرور و نێچیر) پێکهێنا و سەردانی ئەمریکای کرد*٨.

لە سەردانەکەی حوزەیرانی٢٠١٠ سەرۆکی هەرێم بۆ تورکیا و ئەڵمانیا و فەرەنسا و ئوردون و میسر، ئەندامانی وەفدی حکومەت بە تەنها لە بەرپرسانی پارتیی پێکهاتبوون، نوێنەری حیزبەکانی تری تێدا نەبوو، بۆیە ئەو کارە دیبلۆماسییە لە لایەن گەلی کورد و ئەو وڵاتانەی وەفدەکە سەردانیان دەکات، وەکو چالاکیی حکومەتی هەرێم ناناسرێن، بە چالاکییەکی حیزبیی و خێڵەکیی وەردەگیرێت*٩.

نوێنەرایەتییکردنی دۆزی کورد لە لایەن حیزب و خێزان و بنەماڵە دەسەڵاتدارەکانی هەرێمی کوردستانەوە، نەک هەر دیبلۆماسیەتی کورد پێشناخات، بەڵکو بۆ دواوەی دەگێڕێتەوە و کێشەی تریش بۆ دۆزی کورد دروستدەکات. ئەگەر نوێنەرانی کورد تەنها لە حیزب و بنەماڵە دەسەڵاتدارەکان بن، ئەو وڵاتانە ئاستی گەشەکردنی عەقڵی سیاسیی کوردستان بە خێڵەکیی و دواکەوتوو پێوانەدەکەن، وادەزانن کوردستان لە قۆناغی خێڵدایە و بە قۆناغی نەتەوەبوون نەگەیشتووە. لەبەرئەوە وەکو خێڵ و بنەماڵە، نەک وەکو نەتەوە هەڵسوکەوت لەگەڵ دۆزی کورددا دەکەن، بۆ چارەسەرکردنی کێشە نەتەوەییەکەی هاوکاریی کورد ناکەن.

دەسەڵاتدارانی هەرێم لەپێناو بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆیاندا، نوێنەری بنەماڵە و خێزانەکانی خۆیان بۆ پۆستە دیبلۆماسییەکان دیاریدەکەن، لەپێناو دەستکەوتی تایبەتدا ئەو جۆرە دیبلۆماسیەتە دروستدەکەن. ئەم جۆرە دەستنیشانکردنەی دیبلۆماتی کورد، زیانی مەزنی بە دۆزی کورد گەیاندووە و وایکردووە کورد نەتوانێت بۆ چارەسەری کێشەکەی بە باشیی سود لەو دەرفەتە لەبارانە وەربگرێت کە لە ئاستی عێراق و جیهاندا هاتوونەتەپێشەوە. لە سەرەتای ساڵی ٢٠٢٢ مەسرور بەرزانیی سەردانی ئیمارات و قەتەر و ئەڵمانیای کرد، کەسی لەگەڵ خۆیدا نەبرد. لە هەمان کاتدا نێچیر بەرزانیی خۆی بە تەنها سەردانی تورکیا و ئەڵمانیای کرد.

### ٦- خەباتی جەماوەریی و دیبلۆماسیەت:

لە چالاکیی دیبلۆماسیی هەر دەوڵەت و پێکهاتەیەکدا، گوشاری جەماوەریی و بڕیاری پەرلەمانیی و هەڵوێستی پێکهاتە سیاسییەکان بۆ بەهێزکردنی ئامانجی دیبلۆمسیی بەکاردێت، بۆ ئەوەی لایەنی بەرانبەر مل بە داخوازییەکانت بدات و لەگەڵت ڕێکبکەوێت.

لەبەرئەوەی دەسەڵاتی کوردیی لە باشووردا بڕوای بە هێزی گەل نییە، بڕوای بە هێزی ناوخۆیی وڵاتەکەی نییە، پەیوەندیی لەگەڵ گەلی خۆیدا لە ئاستێکی باشدا نییە، نایەوێت و ڕێگەنادات گەل خۆی ڕێکبخات و سیاسەتبکات، بۆیە دەسەڵاتی کوردیی وەکو هێزەکانی تری جیهان ناتوانێت سود لە هێز و چالاکیی گەلی خۆی بۆ پێشخستنی کاری دیبلۆماسیی وەربگرێت. کاتێک دەسەڵات لە هێز و بڕیاری گەل دووردەکەوێتەوە، گەلیش ئاگاداری چالاکیی دیبلۆماسیی دەسەڵات نابێت و گرنگییپێنادات، وەکو کۆڵەکەیەکی پتەوی تێکۆشانی سیاسیی سەیریناکات و پشتیوانییناکات. ئەمە وایکردووە خەباتی دیبلۆماسیی کورد لە چوارچێوەی توێژی دەسەڵاتداری باشووردا بە سنوورداریی بمێنێتەوە و گەشەنەکات. هەر تێکۆشانێکی دیبلۆماسیی پشتئەستوور نەبێت بە هێزی جەماوەریی ئەو تێکۆشانە بە سستیی و لاوازیی دەمێنێتەوە. پێش ئەوەی ڕژێمی سەدام بڕوخێت، پەیوەندیی حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشووری کوردستان و ئەمریکا و ئۆپۆزسیۆنی عێراقیی، بۆ بەرژەوەندیی گەلی کوردستان بەکارنەهێنرا، لەو پەیوەندییەدا بۆچوونی خەڵکی کوردستان لەسەر کێشەی کەرکوک و ناوچە دابڕاوەکانی تر وەرنەگیرا. هەڵوێستی خەڵکی کوردستان بە لایەنە بڕیاربەدەستەکانی جیهان و ناوچەکە ڕانەگەیەنرا. بەرپرسانی کورد لەگەڵ ئەمریکا و عێراق لەسەر هەڵوێستی خەڵکی کوردستان و بابەتە هەستیارەکانی کوردستان گفتوگۆ و ڕێککەوتنی سیاسییان نەکرد.

دوای ئەوەی ڕژێمی سەدام ڕوخا، لەگەڵ ئەوەدا کە کورد لە هەموو پێکهاتە سیاسییەکانی تری عێراق بەهێزتر و ڕێکخراوتر بوو، دەسەڵاتی کوردیی ڕێگەینەدا گەلی کورد چالاکیی سیاسیی بکات هەتا لە دەستووری عێراقدا هەموو مافە ڕەواکانی باشووری کوردستان جێگیربکات. لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام لە ناو ڕیزەکانی گەلی کورددا بزوتنەوەی ڕاپرسیی دروستبوو. ئەم بزوتنەوەیە ئامانجی ئەوە بوو لە

ڕێگەی بۆچوون و گوشاری جەماوەری گەلی کوردەوە، لە ڕێگەی هاوپەیمانان و نەتەوە یەکگرتووەکان و حکومەتی ئایندەی عێراقەوە، چارەسەرێکی دیموکراسییانە بۆ دۆزی کورد دابنرێت، هەر کە حیزبە دەسەڵاتدارەکان بە ڕاپرسییان زانی، ئەندام و کادرەکانی خۆیانیان نارده ناو بزوتنەوەکەوە و دەستیانبەسەرداگرت. دواتر ڕاسپاردە و ئامانجەکانی گەلی کوردیان لە دوتوێی ڕاپرسیی بزوتنەوەکەدا فەرامۆشکرد.

لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٤دا کاتێک بزوتنەوەی ڕاپرسیی لە ڕێگەی نوێنەرەکانیەوە ئەنجامی ڕاپرسییەکەی جەماوەری کوردستانی لەسەر شێوازی پەیوەندیی باشووری کوردستان و عێراق گەیاندە بەغدای پایتەخت. بەرپرسانی حیزبە دەسەڵاتدارەکان ئامادەنەبوون پێشوازیی لە نوێنەری بزوتنەوەی ڕاپرسیی بکەن، داوکارییەکانی خەڵکی کوردستانیان بە نوێنەری حکومەتی عێراق و حاکمی ئەمریکا لە عێراق و نوێنەری نەتەوە یەکگرتووەکان نەگەیاند و نەیانگوت ئەمە ڕاوبۆچوونی گەلی کوردە لەسەر چۆنێتیی چارەسەرکردنی کێشەکەی، لەبەر بەرژەوەندیی حیزبیی و تایبەتیی خۆیان، خۆیان لە بەرپرسیارێتیی دزییەوە و داکۆکییان لە ئەنجامەکانی ڕاپرسی نەکرد کە ٩٨٪ خەڵکی کوردستان داوای سەربەخۆیی باشووری کوردستانی دەکرد*١٠.

لە مانگی نۆڤەبەری ساڵی ٢٠٠٦دا، ڕاپۆرتی بەیکەر - هاملتۆن لەسەر چۆنێتیی چارەسەرکردنی کێشەکانی ئەمریکا لە عێراق و لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دەرچوو، ئەو ڕاپۆرتە لە لایەن دوو بەرپرسی کۆنی ئەمریکاوە (جیمس بەیکەر و ڕۆبەرت هاملتۆنەوە) ئامادەکرابوو. لەو ڕاپۆرتەدا پێشنیازکرابوو جێبەجێکردنی مادەی١٤٠ دەستووری عێراق دوابخرێت. بەرانبەر بە ڕاپۆرتی بەیکەر - هاملتۆن، گەلی کورد نارەزایی توندی پیشاندا و ئامادەی ئەوە بوو بە چالاکیی جەماوەریی وەکو ڕێپێوان، وەڵامی ڕاپۆتەکە بداتەوە و گوشارێک لەسەر ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی دروستبکات هەتا لە بەشی تایبەت بە مادەی١٤٠ گۆڕانکاریی لە ڕاپۆرتەکەدا بکات. جارێکی تر دەسەڵاتی باشووری کوردستان هەڵوێستی لاوازی پیشاندا و ڕێگەینەدا گەل لە تەنیشت دەسەڵاتەوە هەڵوێستێکی شارستانیی پیشانبدات و گوشار لەسەر سیاسەتی ئەمریکا دروستبکات.ساڵی ٢٠١٩ جەماوەری قەزای شیلادزێ و دەوروبەری دژی مانەوەی بنکە سەربازییەکانی سوپای تورکیا لەو دەڤەرە خۆپیشاندانیانکرد، داوایاندەکرد سوپای تورک هەرێمی کوردستان چۆڵبکات، دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان لەبریی ئەوەی ئەو گوشارە جەماوەرییە بکاتە پاڵپشت بۆ بڕیاری پەرلەمانی هەرێمی کوردستان و

پەرلەمانی عێراق کە دەربارەی پاشەکشەی سوپای تورکیا دەرچووە، کەچی کەوتە گیانی خۆپیشاندەران و خۆپیشاندانەکەی سەرکوتکرد و ژمارەیەکی لێ دەستگیرکردن. بەو شێوەیە دەبینین یەکێک لە بنەما هەڵەکانی تری دیبلۆماسیەتی کورد لە باشووری کوردستاندا ئەوەیە هێز و گوشاری جەماوەر بۆ پشتیوانیی کارە دیبلۆماسییەکانی بەکارناهێنێت، ئەوەیش یەکێک لەو هۆکارانەیە کە دیبلۆماسیەتی کورد پێشناکەوێت.

### ٧- دوژمنی دوژمنەکەم دۆستمە:

ئەم پەندەی پێشینان کە لە ناو کورددا باوە، تەنها هزری تاک و پێکهاتەکانی کۆمەڵگەی کلاسیکیی داگیرنەکردووە، سیاسەتمەدارانی کوردیش بۆ کاری دیبلۆماسیی بەکاریدەهێنن. لە سەرەتای دروستبوونی شۆڕشی ئەیلولەوە هەتا ئەمڕۆ، دوژمنی دوژمنەکەم دۆستمە، یەکێک لەو چەمکانەیە کە لە خەباتی دیبلۆماسیی کورددا ڕوبەرێکی زۆری داگیرکردووە.

پەیوەندییەکانی شۆڕشی ئەیلول و دەوڵەتی ئێران لەسەر ئەوە پێکهات، ئێران دوژمنی عێراق بوو، شۆڕشی ئەیلول بەرامبەر عێراق بۆ مافی گەلی کورد خەباتی دەکرد، بۆ لایەنی کوردیی ئەمە بەس بوو بۆ ئەوەی سەرکردایەتیی شۆڕشی کورد پەیوەندییەکی ناهاوسەنگ و بەبێ ڕێککەوتنی سیاسیی لەگەڵ ئێراندا دەستپێبکات، کە بە ڕادەستکرنی شۆڕشەکە بە ڕژێمی شای ئێران کۆتاییهات.

هەر لە هەمان کاتدا سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول لەسەر بنەمای دوژمنی دوژمنم دۆستمە، لە دژی عێراق پەیوەندیی لەگەڵ ئیسرائیلدا دروستکرد. ئەم پەیوەندییەیش بە زیانی گەلی کورد کۆتاییهات.

لە شۆڕشی نوێدا تێکۆشانی دیبلۆماسیی کورد گۆڕانکاریی بەسەردانەهات، هێزە سیاسییەکانی باشووری کوردستان نەک هەر لەسەر بنەمای دوژمنی دوژمنم دۆستمە، پەیوەندییان لەگەڵ ئێراندا دروستکرد، بەڵکو لە کاتی شەڕی (عێراق - ئێران)دا، هێزەکانی باشوور لەگەڵ سوپای ئێران یەکیانگرت، دۆزی کوردیان لەگەڵ شەڕی نارەوای (عێراق - ئێران)دا تێکەڵکرد.

دوای ئەوەی لە ۲/ ۸/ ۱۹۹۰دا سوپای عێراق وڵاتی کوێتی داگیرکرد، هێزە سیاسییەکانی باشووری کوردستان هەوڵی زۆریان دا لەسەر بنەمای دوژمنی دوژمنم دۆستەمە، لەگەڵ کوێتدا پەیوەندیی دروستبکەن، بەڵام کوێت ئامادەیی پیشاننەدا و بە یەک چاو سەیری هەموو عێراقییەکانی دەکرد*۱۱.

هەر کاتێک لایەنە کوردییەکانی باشووری کوردستان لەگەڵ دوژمنانی وڵاتەکەی خۆیاندا (عێراق) پەیوەندییان بەستبێت، هاوکاریی ئێران و ئیسرائیلیان کردبێت، دەسەڵاتی ناوەندیی عێراق بە بەکرێگیراوی بێگانە ناویدەبردن، هەموو خەڵک و دەسەڵاتی عێراق و دۆستەکانی خۆی لێهاندەدان.

بەو جۆرە پەیوەندییانە کورد هیچ دەسکەوتێکی بەدەستنەهێنا، لەبەرئەوەی پەیوەندیی لە نێوان شۆڕشی کورد و وڵاتانی دوژمنی عێراقدا، پەیوەندیی سیاسیی نەبوو، لەسەر بنەمای ڕێککەوتنی سیاسیی نەبووە، تەنها کارێکی تەکتیکیی و هەواڵگریی ڕۆژانە بووە، تەنها دوژمنەکانی عێراق بۆ دژایەتییکردنی عێراق سودیان لێوەرگرتووە، بۆ بەرژەوەندیی کورد سودی لێوەرنەگیراوە.

لەبەرئەوەی هێزەکانی باشووری کوردستان هاوکاریی دوژمنانی عێراقیان دەکرد، دەسەڵاتی عێراقی ناوەندیی کوردی وەکو مەترسیی بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەیی عەرەب سەیر دەکردوو، بە هەموو شێوەیەک کاری بۆ لەناوبردنی شۆڕش و گەلی کورد دەکردوو. لەو جۆرە پەیوەندییانەدا بێجگە لە زیادبوونی زیانەکان، گەلی کورد هیچ قازانجینەکردووە. هەر کاتێک دوژمنایەتیی نێوان عێراق و دوژمنەکانی کورد هێوربوو‌بێتەوە، دوژمنەکانی پشتی کوردیان بەرداوە، کارەساتیان بۆ کورد دروستکردووە. لەو بارەیەوە سیاسەتمەداری کورد دکتۆر مەحمود عوسمان، کە لە شۆڕشی ئەیلول و شۆڕشی نوێدا بەرپرسیارێتیی هەبووە دەڵێت:

شای ئێران شۆڕشی ئەیلولی بۆ بەرژەوەندیی خۆی دژی عێراق بەکارهێنا*۱۲.

لە دوای ئەو هەموو کارەسات و شکستانەی شۆڕشی کورد کە بەهۆی سیاسەتی دیبلۆماسیی بێپێوانە و ناهاوسنگیی سەرکردایەتیی شۆڕشەوە بەسەریداهات، بەرپرسانی شۆڕش و حکومەتی هەرێم، سودیان لەو هەڵانە وەرنەگرتووە، هەتا ئێستاش بە چەمکی دوژمنی دوژمنم دۆستمە، کاری دیبلۆماسیی دەکەن.

### ٨- پەیوەندیی دەسەڵات و کۆمەڵگە

دەسەڵات و کۆمەڵگە لە ڕێگەی ماف و ئەرکەوە پەیوەندیی لە نێوانیاندا دروستدەبێت، ئەگەر تاک و پێکهاتەکانی کۆمەڵگە لە سایەی دەسەڵاتدا مافەکانی خۆیان وەربگرن، ئەرکەکانیان بە باشیی ئەنجامدەدەن، ئەو کاتە پەیوەندییەکی هاوسەنگ لە نێوان دەسەڵات و خەڵکدا دروستدەبێت، خەڵک دەسەڵات بە هیی خۆی دەزانێت و بەرگریی لێدەکات.

پەیوەندیی نێوان حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشوور و حیزبە سیاسییەکانی دەرەوەی دەسەڵات و کەسایەتیی و خێڵ و بنەماڵە و ڕۆشنبیر و زانای ئاینیی و لێقەوماوان و توێژەکانی تری کۆمەڵگەی کوردستان، پەیوەندییەکی دروست و هاوسەنگ نییە، دەسەڵاتی کوردیی وەکو دەسەڵاتێکی نادیموکرات و بێپێوانە بە شێوەیەکی تاکتیکیی لەپێناو دەستکەوت و دەسەڵاتدا لە خەڵک و لە تاک و لە پێکهاتەکانی کۆمەڵگە نزیکدەبێتەوە، لەپێناو دەستکەوتێکی تایبەتدا پەیوەندیی لەگەڵیاندا دروستکدەکات، ئامانج لە نزیکبوونەوەی دەسەڵات و تێکەڵبوونی لەگەڵ تاک و پێکهاتەکانی کۆمەڵگەدا بۆ ئەوەیە گەل و پێکهاتە سیاسییەکان لە خزمەتی دەسەڵاتیدا بەکاربهێنێت. ئەو نزیکبوونەوە و هاوپەیمانیی و ڕێککەوتنەی نێوان دەسەڵات و کۆمەڵگە، بنەمای ئەخلاقیی و یاسایی نییە. بەو ئامانجە نییە کە دەسەڵات خزمەتی گەل بکات، بەو ئامانجەیە کە گەل و پێکهاتە سیاسیی و کۆمەڵایەتیی و ئاینیی و کەلتورییەکان خزمەتی دەسەڵات بکەن.

پێش ڕاپەڕیین لە سەردەمی خەباتی چەکدارییدا، پەیوەندیی نێوان حیزب و ڕێکخراوە سیاسییەکانی باشوور لەگەڵ خەڵکدا بەردەوام لە باری ململانێ و ناکۆکیی و شەڕ و پێکدادانداندا بوو. دایکی شەهیدان و سەرتاپای گەلی کورد داوایان لە حیزبە بەشەڕهاتووەکان دەکرد با کۆتایی بە شەڕ بێت و چیتر کورد کورد نەکوژێت، کەچی حیزبە شەڕکەرەکان هیچ نرخێکیان بۆ داواکاریی خەڵکی کوردستان دانەدەنا، بەڵام کە وڵاتان داوایاندەکرد شەڕنەکەن و ڕێبککەون، فزەیان لێوەنەدەهات.

لە دوای ڕاپەڕیین پەرلەمانی کوردستان هەڵبژێردرا، بۆ ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی کارەکانی هەرێم پەرلەمان چەندیین یاسای دەرکرد. یەکێک لەو یاسایەنە، یاسای حیزبە سیاسییەکانی کوردستان بوو، بە شێوەیەکی گشتیی ئەو یاسایە کۆمەڵێک برگەی باشی لەخۆگرتبوو. دەکرا لە ڕێگەی ئەو یاسایەوە پێکهێنان و ڕێکخستن

و چالاکیی سیاسیی و حیزبایەتیی لە هەرێمی کوردستاندا ڕێکبخرێت و سیاسەتی هەرێم سکەی سروشتیی خۆی وەربگرێتەوە*١٣، بەڵام حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشووری کوردستان کاریان بەو یاسایە نەکرد، ڕێگەیاننەدا حکومەتی هەرێم هاوکاریی دارایی حیزبە سیاسییەکانی تر بکات. هەرچی داهاتی هەرێمی کوردستان بوو، هەردوو حیزبی دەسەڵاتدار دەستیانبەسەرداگرت و لە ناو خۆیاندا دابەشیانکرد، هەندێک هاوکاریی حیزبە سیاسییەکانی دەرەوەی دەسەڵاتیشیان دەکرد.

بەو شێوەیە بۆ یەکەم جار دیاردەی هاوکارییکردنی حیزب لە ڕێگەی حیزبەوە دروستبوو و پەرەیسەند. حیزبە دەسەڵاتدارەکان مانگانە و ساڵانە بڕێک هاوکاریی مادییان بۆ بەڕێوەبردنی چالاکیی حیزبەکانی تر تەرخاندەکرد، هاوکارییەکە هەر هێندەبوو ئەو حیزبانە ژیانێکی کولەمەرگیی پێبکەن. هاوکارییەکە بۆ گەشەکردن و پێشکەوتنی ڕێکخستن و هێزی حیزبە سیاسییەکان نەبوو، هەر کاتێک حیزبە دەسەڵاتدارەکان بیاندیبایە وا خەریکە حیزبێکی بچووکی دەرەوەی دەسەڵات گەشەدەکات، هاوکاریی مادیی ئەو حیزبەیان کەمدەکردەوە و لە ڕێگەی گرفتی ئابورییەوە کێشەی ڕێکخستنیان بۆ حیزبەکە دروستدەکرد و ئاستەنگیی جدییان بۆ گەشەکردنی دروستدەکرد. ئەو کێشانەی لە ساڵانی دوای ڕاپەڕیین بۆ حیزبی سۆسیالیستی کوردستان و حیزبی زەحمەتکێشانی کوردستان دروستدەکرا، نمونەی ئەو هەڵسوکەوتە نادیموکراتییەن کە حیزبە دەسەڵاتدارەکان دژی حیزبە بچووکەکان لە ڕێگەی گوشاری مادییەوە ئەنجامیانداوە. حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشوور چەندیین سیناریۆ و بەرنامەی تریان دروستدەکرد هەتا دژی تێکۆشانی ڕێکخراوە سیاسییەکانی باشوور بوەستنەوە و ڕێگەی پێکهێنانی ڕێکخراوی نوێ بگرن و چالاکیی سیاسیی ئۆپۆزسیۆن قەدەغەبکەن. ئەو ڕێکخراوانەی کە بە ڕێبازی نەتەوەیی و دیموکراتیی تێکۆشانیاندەکرد و ڕەخنەیان ئاڕاستەی دەسەڵاتی باشوور دەکرد، دژی سیاسەتی وڵاتانی داگیرکەری کوردستان تێدەکۆشان، دامودەزگاکانی وەزارەتی ناوخۆی هەرێمی سەر بەو حیزبانە، لە ڕێگەی بەفەرمیینەناسینی ئەو حیزبانەوە، لە ڕێگەی سەرکوتکردنی چالاکیی سیاسیی ئەو حیزبانەوە، لە ڕێگەی دەستگیرکردنی کادر و ئەندامی ئەو حیزبانەوە، لە ڕێگەی داخستنی بنکە و بارەگای ئەو حیزبانەوە، بە بیانووی گوشاری وڵاتانی دراوسێ لەسەر حکومەتی هەرێم سیاسەتێکی سەرکوتکار و دژەدیموکراتییان دژی ڕۆڵەکانی گەلی کورد بەڕێوەدەبرد.

ساڵی ٢٠٠٤ - ٢٠١٠ لەژێر پەردەی سیناریۆی گوشاری تورکیا بۆ سەر هەرێمی کوردستان، سیاسەتێکی نادیموکراتییان دژی پارتیی چارەسەری دیموکراتیی کوردستان بەڕێوەدەبرد، ڕێگەی هەموو جۆرە چالاکییەکی ڕێکخستنیی و سیاسیی ئەو حیزبەیان دەگرت. ئەمە لە کاتێکدایە چەندیین حیزبی تورکمانی سەر بە تورکیا کە بە فەرمیی حکومەتی هەرێمی کوردستان ناناسن، بە سەربەخۆ چالاکیی سیاسیی دەکەن و کەس ئاستەنگییان بۆ دروستناکات. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشوور پەیوەندییەکی ئاشکرا و فەرمییان لەگەڵ ئەو حیزبانەی باکووری کوردستاندا هەبوو، کە فکری ئاپۆیان بە بنەما دەگرت و چالاکیی سیاسیی و پشتگیریی زیاتریان لە پارتی کریکارانی کوردستان دەکرد. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە هەردوو حیزبی دەسەڵاتدار بە ئاشکرا و بە نهێنیی پەیوەندییان لەگەڵ پارتی کریکارانی کوردستاندا هەبوو. بەو شێوەیە پەیوەندیی نادیموکراتییانەی نێوان دەسەڵات و حیزب و پێکهاتە سیاسییەکانی کۆمەڵگە لە هەرێمی کوردستاندا لە لوتکەی ناکۆکیی و بێمتمانەییدا بەڕێوەدەچێت.

هەندێک جار حیزبی سیاسیی باڵادەست بۆ مەبەستێکی تایبەت لە حیزبێکی تر، لە بنەماڵە و عەشیرەتێک، یان لە توێژێکی تایبەتی کۆمەڵگە نزیکدەبێتەوە، هاوپەیمانییەکی ناهاوسەنگی لەگەڵدا دروستدەکات، کاتێک ئامانجەکەی خۆی بەدەستدەهێنێت، داوا و مافی ئەو پێکهاتەیە فەرامۆشدەکات. ئەمە دیاردەیەکی باوی سیاسەتی ناوخۆیی حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشووری کوردستانە بەرانبەر بە تاک و پێکهاتەکانی کۆمەڵگەی کوردستان دەیکەن. کاتێک حیزبەکان ئیشیان بە کەسێک، یان پێکهاتەیەک دەبێت بە زووترین کات و بە هەموو شێوەیەک خۆیانی لێنزیکدەکەنەوە، بە تاکتیک و فێڵ پشتیوانیی ئەو پێکهاتەیە بەدەستدەهێنن،بەڵام کاتێک کە ئیشیان بەو پێکهاتەیە نەما، ڕووی خۆیانی لێوەردەگێڕن و مافەکانی فەرامۆشدەکەن. ئەم دیاردەیە وایکردووە پەیوەندیی نێوان حیزب و خەڵک پەیوەندییەکی ناکۆک و دژبەر بێت، لە ئەنجامی ئەو پەیوەندییەدا گەل زیانی بەردەکەوێت.

ئەمەیش بۆ خۆی دیاردەیەکی سیاسیی نامۆی هەرێمی کوردستانە لەگەڵ لۆژیکی سیستەمی دیموکراتییدا ناگونجێت. بۆیە دەبینین پەیوەندیی نێوان دەسەڵات و کۆمەڵگە پڕیەتی لە گومان و بێمتمانەیی، بڕوابەیەکترکردن و تەبایی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی

لە نێوان دەسەڵات و گەلدا هەتا دێت لاوازدەبێت. لەبریی ئەوە بەدگومانیی و ناکۆکیی کۆمەڵایەتیی دروستدەبێت. ئەم ناکۆکیی و بێبڕواییە وایکردووە گەل و دەسەڵات پێکەوە لە یەک سەنگەردا بۆ ئامانجە چارەنوسسازەکان تێکۆشان بەڕێوەنەبەن، هەر یەک بە ئاراستەیەکدا ڕایبکێشێت و هاوکاریی یەکتر نەکەن. ساڵی ٢٠٠٨ دەسەڵاتی کوردیی داوای لە خەڵکی کوردستان کرد بەرانبەر سیاسەتی حکومەتی عێراق لەسەر جێبەجێنەکردنی مادەی١٤٠ دەستووری عێرق خۆپیشاندانبکەن و پشتیوانیی لە کوردستانییبوونی کەرکوک بکەن. داوایکرد لە شارەکانی هەرێمی کوردستاندا ڕێپێوانێک ڕێکبخرێت، وەڵامی گەلی کورد بە هەموو پێکهاتەکانیەوە زۆر لاوزا بوو، بە شێوەیەک کە ڕێپێوانەکە لە شاری هەولێر و سلێمانیی بە ئاشکرا شکستیهێنا و ئەوانەی ئامادەی ڕێپێوانەکە بوون پێنج هەزار کەس نەدەبوون.

لە هەڵبژاردنی پێشوەختەی پەرلەمانی عێراقی ساڵی ٢٠٢١دا، ٦٥-٧٠٪ خەڵکی کوردستان بەشداریی هەڵبژاردنی نەکرد، یان دەنگی خۆی سوتاند. ئەمە پیشانیدەدات کە نیوەی زیاتر لە خەڵکی کوردستان بڕوای بەم دەسەڵاتە نییە و پەیوەندیی نیوان گەل و دەسەڵات لە ئاستێکی زۆر خراپدایە.

بەو شێوەیە بۆمان ئاشکرادەبێت کە سیاسەتی نادیموکراتیی و فریودانی سیاسیی حیزبە دەسەڵاتدارەکان، ناکۆکیی لە نێوان دەسەڵات و کۆمەڵدا دەنێتەوە، ئەو ناکۆکییە سیاسییە وادەکات گەل و پێکهاتە سیاسییەکان پێکەوە تێکۆشانی دیبلۆماسیی ئەنجامنەدەن، بەو هۆیەوە مەترسیی لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی دروستدەبێت.

هەر هێزێکی سیاسیی چارەنوسی گەلی کوردی بە لاوە گرنگبێت، دەبێت چەمکی نادیموکراتیی و فریودەری حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشوور ڕەخنەبکات، هەتا بە هزرێکی دیموکراتیی و نەتەوەیی بگۆڕدرێت. هەتا دەسەڵات بە شێوەیەکی دیموکرات لە تاک و پێکهاتەکانی کوردستان نزیکببێتەوە، هەتا سەرلەنوێ پەیوەندییەکی هاوسەنگ لە نێوان گەل و دەسەڵاتدا پێکببێتەوە، ئەو پەیوەندییە نوێیە نابێت لەسەر بنەمای خەڵەتاندن و فریودانی گەل بێت، دەبێت یاسا و ڕەوشتی سیاسیی و خزمەتکردن و بەئیرادەکردنی گەل، بنەمای ئەو پەیوەندییە نوێیە بێت.

## ٩- وێستگەکانی شکستی دیبلۆماسیی هەرێم

کاری دیبلۆماسیی بە یەکێک لە پێویستییەکانی سەرکەوتنی خەباتی گەلان دەژمێردریت، ئامانجی کاری دیبلۆماسیی ئەوەیە ڕەوایی دۆزی گەلەکەت بە هێزە ناوچەیی و جیهانییەکان بناسێنیت، بۆیان ڕونبکەیتەوە کە وڵاتانی داگیرکەری کوردستان و کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیی زوڵمێکی گەورەیان لە گەلی کورد کردووە، گەلی کورد دوچاری چەندیین جۆر کۆمەڵکوژیی و جینۆسایدی وەکو هەڵەبجە و ئەنفال بووە. دەبێت بەرانبەرەکەت تێبگەیەنیت، هەتا کێشەی کورد چارەسەرنەکرێت، ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئاشتیی و ئارامیی بە خۆیەوە نابینێت. لایەنی بەرانبەر تێبگەن کە خەبات و تێکۆشانی گەلی کورد لە ڕێوشوێنەکانی شەڕ و یاسای نێودەوڵەتیی لاینەداوە و لانادات، دژی تیرۆر و توندوتیژییە. کاربکەیت بۆ ئەوەی داواکارییەکانت بە ڕەوا بزانن، پشتیوانییتبکەن، هاوکاریی چارسەری کێشەکەت بکەن. پەیمانی بلفۆر کە دامەزرندنی ئیسرائیلی لێکەوتەوە، نمونەی کاری دیبلۆماسیی سەرکەوتووی جووەکان بوو. دوای ئەو پەیمانە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیی پشتیوانیی دامەزراندنی دەوڵەتی ئێسرئیلیان کرد. لە ساڵی ١٩٤٨ هەتا ئەمڕۆ عەرەب شەڕی هەمەجۆرەی ئیسرائیل دەکات، بەڵام لەبەرئەوەی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیی پشتگیریی ئیسرائیل دەکات، عەرەبەکان دەرەقەتی نایەن، وا خەریکە وڵاتە عەرەبەکان دان بە ڕەوایی دەوڵەتی ئیسرائیلدا دەنێن. ساڵی ١٩٧٠ لە ئەنجامی خەباتی چەکداریی شۆڕشی ئەیلولەوە، حکومەتی عێراق بەگوێرەی بەیانی ١١ی ئازاری ١٩٧٠، بە فەرمیی دانی بە بەشێکی گرنگی مافەکانی گەلی کورددا نا. ئەمە دەستکەوتێکی دیبلۆماسیی گەورەی کورد بوو بە خەباتی چەکداریی بەدەستیهێنا. بەهۆی وابەستەیی سیاسیی شۆڕشەکەوە، بەهۆی لاوازیی دیبلۆماسیەتی ئەو کاتەی سەرکردایەتیی کوردەوە، لە ٦ی ئازاری ١٩٧٥دا، نەک هەر بەیانی ١١ی ئازار، شۆڕشیشمان لەدەستچوو.

لە دوای ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ جارێکی تر عێراق کوردستانی داگیرکردەوە، گەلی کورد کۆڕەوێکی مەزنی کرد، کۆڕەوەکە ویژدانی جیهانی هەژاند. ئەمە وایکرد فەرەنسا و چەند وڵاتێکی تر لەسەر کۆڕەو بێنەدەنگ، داوای کۆبوونەوەیەکی ئەنجومەنی ئاسایش بکەن. لە ٥/ ٤/ ١٩٩١ کۆبوونەوەکە کرا. بڕیاری ٦٨٨ی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ پاراستنی گەلی کورد دەرچوو.

ئەمە بڕیارێکی دیبلۆماسیی زۆر گرنگ بوو، کە بەهۆی کۆڕەو و زوڵمی سەر گەلی کوردەوە دەرکرا، بەڵام بە داخەوە دەسەڵاتی کوردیی لە هەرێم ڕێزی لەو بڕیارە نەگرت، نەک هەوڵینەدا لە ئەنجومەنی ئاسایش بڕیاری تر بۆ پشتیوانیی گەلی کور دەربچێت، لەژێر سێبەری خولی سێیەمی شەڕی براکوژییدا، پێش سوپای پاسدارانی ئێران کەوتن، تا بەسەر خاکی کوردستاندا پێشڕەوییبکات، لە قووڵایی کوردستاندا پەلاماری شۆڕشگێڕانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بدات. بانگی سوپای عێراقیان کرد کوردستان داگیربکاتەوە، بانگی سوپای تورکیایان کرد لە هەرێمی کوردستاندا پێشڕەوییبکات، لە کوێ دەیەوێت پێگەی سەربازیی و هەواڵگریی دابنێت. بە واتایەکی تر هیچ واتایەکیان بۆ بڕیاری ٦٨٨ی ئەنجومەنی ئاسایش نەهێشتەوە و دژی وەستانەوە. دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام بە ماوەیەک گەلی عێراق دەنگی لەسەر دەستووری عێراقی فیدراڵیی دا. دەستووری عێراق دەستکەوتی بۆ گەلی کورد تێدایە، دەسەڵاتدارانی کورد لە هەرێم و لە عێراق هەوڵیاننەدا ئەو برگە دەستوورییانە بکەنە کار و کردەوە کە سوودی گەلی کوردی تێدایە، هەر خەریکی دەستکەوت و پاراستنی پۆست و پلە حیزبیی و بنەماڵەییەکانیان بوون. لە بەرانبەردا عەرەب و تورکمان دژی مافە دەستوورییەکانی کورد لە دژە خەباتی دیبلۆماسیی بەردەوامدان، خەریکە هەندێک لە دەستکەوتەکانی دەستوورمان لێوەردەگرنەوە. هێزە نێودەوڵەتییەکان دژی ڕاپرسیی سەربەخۆیی باشووری کوردستانی ساڵی ٢٠١٧ وەستانەوە، داوایان لە دەسەڵاتدارانی هەرێم کرد ئەگەر ڕاپرسییەکە دوابخەن لە ئایندەدا لە ئەنجومەنی ئاسایش کێشەی کورد باسدەکەین، بەڵام دەسەڵاتدارانی هەرێم حسابیان بۆ هەڵوێستی ئەو هێزە نێودەوڵەتییانە نەکرد و لەسەر هەڵوێستی خۆیان بەردەوامبوون. ئەمە وایکرد کە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیی لێمان زویرببن، چیتر وەکو جاران پشتگیرییمان نەکەن، لەسەر ڕاپرسیی پشتگیریی حکومەتی عێراقیان کرد. ئەو سیاسەتەی دژی ئازادیی سیاسیی و ڕۆژنامەگەریی پیادەدەکریت، بە تایبەتیی کوشتنی ڕۆژنامەنوسان و سزادانی کەسانی ناڕازیی، لەگەڵ پێوانەکانی ئازادیی و مافی مرۆڤی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییدا ناگونجێت، هێندەی تر پێگەی دیبلۆماسیی گەلی کورد لاوازدەکات. ئەو وڵاتانەی کە لە ناوەندەکانی بڕیاری جیهاندا پێگەیان هەیە، کەلتور و ڕێوشوێنی سیاسیی خۆیان هەیە، وەکو دەستاودەستکردنی دەسەڵات، هەڵبژاردنی پاک، دژایەتیی گەندەڵیی، کەچی هەرێمی کوردستان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ

زیاتر لەو پێوانانە دووردەکەوێتەوە. چەند بنەماڵەیەک حوکمی هەرێم دەکەن، بە ئارەزووی خۆیان یاریی بە قووت و ویستی خەڵک دەکەن و چەوسانەوەی ئابوریی و سیاسیی بەسەر خەڵکدا دەسەپێنن.

هەتا سیستەمی حوکمڕانیی هەرێم بەو شیوەیە بێت، ئەگەری پاشەکشەی دیبلۆماسیی هەرێم زۆرتر دەبێت، ناتوانین دۆست بۆ خۆمان پەیدابکەین، ئەو دۆستانەیش هەمانە لێمان دووردەکەونەوە.

## پایەکانی دیبلۆماسیەتی کوردستان

لە ئاستی ناوخۆی کوردستان و عێراق و ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و جیهاندا، کۆمەڵێک بابەتی گرنگ هەن کە لە دیاریکردنی تێکۆشانی دیبلۆماسیی باشووری کوردستاندا ڕۆڵی کاریگەریان هەیە، تێگەیشتن لە گرنگیی ئەو بوارانە، هەڵسوکەوتی بەسەلیقە لەگەڵیاندا، سەرکەوتنی دیبلۆماسیەتی هەرێمی کوردستان پێشدەخات.

### ١- کوردی دەرەوەی وڵات:

بەهۆی سیاسەتی شۆڤینیی ڕژێمە داگیرکەرەکانی کوردستانەوە، بەهۆی شکست و پاشەکشەی شۆڕشەکانی کوردەوە، ژمارەیەکی زۆر لە کوردانی هەر چوار پارچەی کوردستان، ئاوارەی ئەوروپا و وڵاتانی تر بوون.

دوای ڕاپەڕیین بەهۆی شەڕی براکوژیی نێوان حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشووری کوردستانەوە، بەهۆی سیاسەتی نادیموکراتیی و نادادپەروەریی حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە، ژمارەیەکی تری ڕۆڵەکانی گەلی کورد لە باشووری کوردستان، ئاوارەی وڵاتانی ئەوروپا و ئەمریکا بوون و لەوێ نیشتەجێبوون. کوردەکانی باکوور و ڕۆژئاوای کوردستان بۆ پشتگیریی دۆزی کورد، بە بەردەوامیی ڕێپێوانی هێمنانە و چالاکیی مانگرتن و ئیمزاکۆکردنەوە ئەنجامدەدەن، کەناڵی تەلەفزیۆنی وەکو کەناڵی تەلەفزیۆنی (ڕۆژ، میزۆپۆتامیا، نەورۆز، ستێرک) دەکەنەوە. لە ڕێگەی ئەو کەناڵانەوە، خەڵکی کوردستان بە کێشەی کورد و بە لایەنە جیاکانی ژیانی گەلی کورد پەروەردەدەکەن. لە ڕێگەی ڕاگەیاندنەوە ڕەوایی دۆزی کورد بە جیهان دەناسێنن.

ڕژێمی داگیرکەری تورکیا هەوڵی زۆری داوە کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی کورد دابخات و کورد بێدەنگ و بێڕەنگ بکات، بەڵام سیاسەتە سەرکوتکەرەکانی دەوڵەتی تورکیا لە بەرانبەر ئیرادەی ئازاد و تێکۆشانی جەماوەریی و دیبلۆماسیی گەلی کورددا ڕووبەڕووی شکست دەبێتەوە. کوردەکانی باکوور و ڕۆژئاوای کوردستان بۆ پشتگیریی لە تێکۆشانی شۆڕشی باکور و ڕۆژئاوای کوردستان، لوبیی کوردیان دروستکردەوە، چەندیین ڕێکخراوی کۆمەڵگەی مەدەنییان دروتسکردووە، دامودەزگای دیبلۆماسییان دروستکردووە و چالاکیی دیبلۆماسیی بە ئامانج بەڕێوەدەبەن.

کوردەکانی دەرەوەی وڵات دەزگایەکی نەتەوەیی وەکو کۆنگرەی نەتەوەیی کوردستان (ک. ن. ک)یان پێکهێناوە، نوێنەری هەموو پارچەکانی کوردستان و کەمینەکانی کوردستانی تێدا کۆبووەتەوە. (ک. ن. ک) یەکێتیی نەتەوەیی نێوان کورد بەهێزدەکات، دیبلۆماسیەتی کورد چالاکدەکات، خەریکە دۆزی کورد بە جیهان دەناسێت، دۆست بۆ کورد پەیدادەکات، بە گژ سیاسەتی داگیرکەرانی کوردستاندا دەچێتەوە*١٤.

ساڵی ٢٠١١ لە ساڵیادی کیمیابارانی هەڵەبجەدا، لە بارەگای سەرەکیی پەرلەمانی ئەوروپا، (ک. ن. ک) و پەرلەمانی ئەوروپا، کۆنگرەیەکیان لەسەر جینۆسایدی گەلی کورد بەست، سەرۆکی پەرلەمان و ژمارەیەک ئەندامی پەرلەمانی ئەوروپا ئامادەی کۆنگرەکە بوون. ژمارەیەک پسپۆڕی بواری جینۆساید، ئامادەی کۆنگرەکە بوون. وتار و لێکۆڵینەوەی خۆیان پێشکەشکرد. ژمارەیەک ئەندامپەرلەمانی باشووری کوردستان بەشداریی کۆنگرەکەیان کرد و وتاریان خوێندەوە. ئەنجامنامەی کۆنگرە پیشکەشی لایەنی پەیوەندییدار کرا. (ک. ن. ک) ساڵانە کۆنگرەی هاوشێوە لەسەر کۆمەڵکوژیی و جینۆساید و تاوانەکانی تری داگیرکەرانی کوردستان دەبەستێت. ئەم کارانەی (ک. ن. ک) کاریگەرییەکی باشی بۆ ناساندنی دۆزی کورد هەیە، بەڵام جێگەی داخە حکومەتی هەرێم و حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشووری کوردستان نە خۆیان ئەو چالاکییانە دەکەن، نە وەکو پێویست هاوکاریی (ک. ن. ک) دەکەن.

یەکێک لە کارە هەرە سەرکەوتووەکانی تری کوردە ئاوارەکانی باکووری کوردستان لە ئەوروپا، خەباتی ئابورییە، کۆکردنەوەی هاوکاریی مادییە بۆ ئەوەی کار و چالاکیی دیبلۆماسیی و ڕاگەیاندنی کورد لە دەرەوەی وڵات بەردەوامبێت. کوردە ئاوارەکانی باکوور مانگانە و ساڵانە پارە و داهاتێکی باش بۆ پێویستییەکانی

بەردەوامبوون و گەشەکردنی شۆڕشەکەیان کۆدەکەنەوە، بەو تێکۆشانە شۆڕشی باکوور سەربەخۆیی ئابوریی بەدەستهێناوە، ئابوریی سەربەخۆیش سەربەخۆیی سیاسیی لەگەڵ خۆی دەهێنێت، سەربەخۆیی سیاسییش هێز لەگەڵ خۆی دەهێنێت، هێزیش بە واتای ئەوە دێت سەرکەوتن نزیکدەبێتەوە.

کوردەکانی باشوور پەیوەندییان لەگەڵ حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشووردا باش نییە، ناکۆکیی و ململانێی نێوانیان لە دۆستایەتیی و ڕێککەوتن زۆرترە، کوردەکانی باشوور لەگەڵ کوردەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بۆ ناساندنی ئەنفال و کیمیابارانی کوردستان، بۆ بەدواداچوونی تاوانبارانی ئەنفال و کیمیاباران، ساڵی ٢٠٠٠ لە ئەوروپا ڕێکخراوی چاک-کوردوسایدیان پێکهێنا و هەندێک چالاکییان ئەنجامدا. دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان نەک هەر پشتگیریی نەکرد، دژی کار و چالاکییەکانیان وەستایەوە.

بەهۆی هزری پارچەگەرێتیی و کەلتوری جیاواز و دەمارگیریی حیزبیی و بەربەستی ئایدۆلۆژییەوە، کوردەکانی ئەوروپا وەکو پێویست لە دەوری دۆزی نەتەوەکەیان کۆنەبوونەتەوە، باش خۆیان ڕێکنەخستووە، بۆیە کاری دیبلۆماسییان سەرەتایی و سنووردارە. حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشووری کوردستان و حکومەتی هەرێم لە ئەوروپا و لە ئەمریکا بە فەرمیی ناسراون و کاری دیبلۆماسییان لەگەڵ دەکرێت، توانایەکی مادیی باشیان لەبەردەستدایە، بەهۆی یەکنەگرتن و کارنەکردنی کورد لە ئەوروپا، لوبیی کوردیی دروستنەبووە، بەو هۆیەوە خەباتی دیبلۆماسیی پێشنەکەوتووە. بۆ دەسەڵاتدارانی باشوور و بۆ کوردی ئەوروپا گرنگە هەست بە بەرپرسیارێتیی مێژوویی بکەن، بەرانبەر بە کێشەی گەلەکەیان ئەرکی سەرشانی خۆیان ئەنجامبدەن و کاری جدیی بۆ پێکهێنانی لوبییەکی کوردستانیی بکەن.

## ٢- ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجە:

دوای کارەساتی کیمیابارانی هەڵەبجە، کەناڵەکانی ڕاگەیاندن ئەو تاوانەیان پیشانی ڕای گشتیی جیهاندا، سەرنجی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییان بە لای کێشەی کورددا ڕاکێشا. پێش ڕاپەڕین و دوای ڕاپەڕین، حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشووری کوردستان ئەنفال و کیمیابارانی کوردستانیان بە گرنگ وەرنەگرت، بۆ ناساندی کێشەی کورد سودیان

لێوەرنەگرت، لە بواری خەباتی دیپلۆماسییدا وەکو بابەتێکی سەرەکیی باسیان لێوە نەدەکرد. لە دوای ڕاپەڕین، ئەنفال و کیمیاباران وەکو کارتێکی گوشاری تەکتیکیی بەرانبەر بە عێراق کاریپێدەکرا، هەر کاتێک حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشوور پەیوەندییان لەگەڵ ڕژێمی بەعسدا باشبایە، بە ئاشکرا، یان بە نهێنیی گفتوگۆیان لەگەڵ ڕژێمدا هەبایە، لە کولەکەی تەرپشدا باسی ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجە و ڕاپەڕینیشیان نەدەکرد. ئەگەر لەگەڵ ڕژێمی سەدام پەیوەندییان باش نەبایە، لە ئێران، یان لە ئەمریکا نزیکبوونایەتەوە، باس هەر باسی ئەنفال و کیمیاران و ڕاپەڕین دەبوو.

پێش ڕوخانی ڕژێمی سەدام کاتێک پەیوەندیی نێوان ئەمریکا و عێراق بەرەو تێکچوون دەچوو، پەیوەندیی نێوان دەسەڵاتی کوردیی و ئەمریکا بەرەو باشیی دەڕۆیشت، کەیسی ئەنفال و هەڵەبجە بۆ دژایەتیی ڕژێمی سەدام زیندووکرایەوە.

بەو شێوەیە دەبینین کۆمەڵکوژیی گەلی کورد سیاسەتێکی ناوەندیی و ستراتیژیی حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشووری کوردستان و حکومەتی هەرێم نەبووە، وەکو بابەتێکی تەکتیکیی بۆ بەهێزکردن و هێشتنەوەی دەسەڵاتیان سودیان لەو دۆزە وەردەگرت، چۆن بەرژەوەندیی و گرێدراوی سیاسیی خۆیان ویستبێتی، بەو شێوەیە باسیاندەکرد.

دەسەڵاتدارانی باشوور نەک هەر کاریان بۆ ناسینی ئەنفال و کیمیابارانی کوردستان نەکردووە، ئیرادەیان نەبووە قرکردن و کۆمەڵکوژیی گەلی کورد بە جیهان بناسێنن، کاتێک چالاکوانانی کوردی هەندەران ویستوویانە لە دامودەزگا نێودەوڵەتییەکانی ئەورووپادا باس لە دۆزی ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجە بکەن، کار بۆ دەستگیرکردنی بکەرانی ئەنفال و هەڵەبجە بکەن، دەسەڵاتدارانی باشوور دژی تێکۆشانی جەماوەریی ڕۆڵەکانی کورد وەستاونەتەوە، هەوڵیانداوە کار و چالاکییەکەیان پوچەڵبکەنەوە.

ساڵی ٢٠٠٢ هەڵسوڕاوانی کورد لە دادگای دانیمارک داوایان لە دژی نزار خەزرەجیی گەورە تاوانباری ئەنفال تۆمارکرد، حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشوور (پارتیی و یەکێتیی و بزوتنەوە) بە نوسراوی فەرمیی بە ئیمزای بەرپرسەکانیان داکۆکییان لە نزار خەزرەجیی کرد، نامەیان بۆ وڵاتی دانیمارک نوسی کە نزار خەزرەجیی بێتاوانە، ئەوە لە کاتێکدایە کە نزار خەزرەجیی لە ئەنفالی یەکدا بەرپرسی سەرەکیی سوپای عێراق بووە.

دادگای باڵای تاوانەکانی عێراق لەسەر کەیسی ئەنفال و هەڵەبجە، سکاڵای لەسەر چەندیین سەرۆکجاش هەبوو، داوایکرد لە دادگا لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ بکرێت، دەسەڵاتدارانی هەرێمی کوردستان ڕێگەیاننەدا سەرۆکجاشەکان لە دادگای باڵای تاوانەکان ئامادەببن.

تاریق ڕەمەزان یەکێک لەو فڕۆکەوانانەی ڕژێمی بەعس بوو کە لە کیمیابارانی هەڵەبجەدا بەشدارییکردبوو، لە ئاسایشی سلێمانیی زیندانیکرابوو، ساڵی ٢٠٠٨ دادگای باڵای تاوانەکان داوایکرد، کەچی دەسەڵاتدارانی کورد، ئەو تاوانبارەیشیان ئازادکرد، بە نهێنیی ڕەوانەی دەرەوەی وڵات کرا، هەتا ئێستا ناونیشانی دیار نییە.

ئەم جۆرە هەڵسوکەوتە نائەخلاقیی و نایاسایی و نانەتەوەییەی دەسەڵاتدارانی هەرێم، کە لەگەڵ دۆسییەی ئەنفال و کیمیاباراندا پیشانیدەدەن، دەیسەلمێنێت کە کار بۆ ناسینی جینۆسایدی گەلی کورد ناکەن. ئەنفال و کیمیاباران وەکو کارتێکی دیبلۆماسیی بەکارناهێنن، بە پێچەوانەوە کار بۆ ئازادکردنی تاوانبارانی ئەنفال و کیمیاباران دەکەن، ئاستەنگیی بۆ کارەکانی دادگای باڵای تاوانەکانی عێراق دروستدەکەن.

دادگای باڵای تاوانەکانی عێراق سەرانی ڕژێمی پێشووی عێراقی لەسەر کەیسی ئەنفال و کیمیابارنی هەڵەبجە دادگایی کرد، بەگوێرەی بڕیاری دادگا هەردوو کەیسەکە جینۆسایدی گەلی کورد بوون، ئەو دادگایە لە لایەن ئەمریکییەکان و حکومەتی عێراقی دوای سەدامەوە پێکهێنرا، لەژێر چاودێریی ئەواندا کار و چالاکیی بەڕێوەدەچوو، ڕۆڵی دەسەڵاتدارانی کورد تێیدا زۆر لاواز بوو، ئەگەر ڕۆڵی دەسەڵاتدارانی کوردی تێدا بایە، دادگاییەکە بە تەواویی شکستیدەهێنا و ئەنجامی بەدەستەوەنەدەدا.

لەو کاتەوە دادگای باڵای تاوانەکانی عێراق بڕیاری جینۆسایدی گەلی کوردی لەسەر ئەنفال (٢/ ٦/ ٢٠٠٧) و هەڵەبجە (٢٢/ ١/ ٢٠١٠) داوە، هیچ هەوڵێکی دیبلۆماسیی بۆ ئەوەی حکومەتی ناوەندیی عێراق دان بە تاوانی جینۆسایدی گەلی کورددا بنێت، لە لایەن هەرێمی کوردستان و نوێنەرانی کورد لە عێراق نەدراوە.

هیچ هەوڵێکی ناساندنی جینۆسایدی گەلی کورد لە ئاستی نێودەوڵەتییدا لە لایەن دەسەڵاتدارانی باشووری کوردستانەوە بەرچاوناکەوێت، کەیسەکەیان خەواندووە و کاری لەسەر ناکەن. یەکێک لە ڕێگە هەرە باشەکان بۆ چالاککردنی کاری دیبلۆماسیی لە باشووری کوردستاندا، ئەنفال و هەڵەبجە و تاوانەکانی تری ڕژێمەکانی عێراقە، بەڵام لەوە ناچێت دەسەڵاتی باشووری کوردستان ئەو کارەساتانە بە گرنگ وەربگرێت و بۆ پێشخستنی کاری دیبلۆماسیی و بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد سودیان لێوەربگرێت. ڕۆژی ٢٦/ ١١/ ٢٠٢١ پەرلەمانی فەرەنسا لەسەر جینۆسایدی گەلی کورد لە پرۆسەکانی ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجەدا گفتوگۆیەکی گرنگی کرد، لەبەرئەوەی لوبیی کورد لە فەرەنسا لاوازە، پرۆژەکە دەنگی تەواوی نەهێنا و پێچرایەوە.

بەو شێوەیە دەتوانین بڵێین دەسەڵاتدارانی باشووری کوردستان ئیرادەی ناساندنی ئەنفال و کیمیابارانیان نییە، نەیانویستووە لە ڕێگەی جینۆسایدی گەلی کوردەوە کەناڵی دیبلۆماسیی بۆ دۆزی کورد بکەنەوە، لەوێوە کار بۆ چارەسەری کێشەی کورد بکەن. لە بەرانبەر کەیسی ئەنفال و هەڵەبجەدا، نەک هەر کەمتەرخەم بوون و نەیانویستووە لە بواری دیبلۆماسییدا کاری لەسەر بکەن، بەڵکو دژی باسکردن و ناساندن و بەجینۆسایدکردنی ئەو کەیسە بوون، دەیانەوێت ئەو کەیسە وەکو خۆی بمێنێتەوە، سنووری عێراق تێنەپەڕێنێت. لەبەرئەوەی وەکو تاکتیکی پاراستنی دەسەڵاتیان بەکاریدەهێنن.

### ٣- ئازادیی و سەرکوتکردن:

سیستەمی سیاسیی باوی ئەمڕۆی جیهان، باس لە حوکمی یاسا و مافی مرۆڤ و پێوانەکانی تری دیموکراسیی دەکات، کار بەو بنەمایانە دەکات. هەر دەسەڵاتێک بیەوێت لە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیی گوێی لێبگیرێت و پەیوەندیی لەگەڵدا دروستبکرێت و پەراوێزنەخرێت، دەبێت لە تێڕوانین و هەڵسوکەوت و کرداردا لەو بنەمایانەی سیستەمی جیهانیی دوورنەکەوێتەوە.

لە دوای ڕاپەڕیین کوردی باشوور پەرلەمانی هەڵبژارد، حکومەتی پێکهێنا، هەتا ماوەی دوو ساڵ، پێشێلکاریی زەق لەسەر مافەکانی مرۆڤ ئەنجامنەدرا، بەڵام لەگەڵ دەستپێکردنی خولی سێیەمی شەڕی ناوخۆ لە نێوان حیزبەکانی باشووری کوردستاندا، پێشێلکردنی مافی مرۆڤ دەستیپێکرد. شەڕی ناوخۆیی بەو واتایە دێت کە لە هەرێمی کوردستاندا ئازادیی سیاسیی و دیاردەی فرەڕەنگیی و فرەدەنگیی پەیڕەوناکرێت. لە ساڵی ١٩٩٤ - ١٩٩٨ شەڕ لە نێوان هەموو حیزب و گروپە سیاسییەکانی باشووردا دروستبوو. لە سەردەمی شەڕی ناوخۆییدا چەندیین کەس لە لایەنە جیاجیاکان لە سەنگەری شەڕی براکوژییدا گیانیانلەدەستدا. چەندیین کەس لە لایەنە سیاسییەکان بەدیلگیران و ڕەمییکران. ژمارەیەکی زۆر لە کوژراوەکان هەتا ئێستا تەرمەکەیان دیار نییە. لە تەنشتی شەڕی ئاشکرا و بەرانبەردا، چەندیین کەسی تری سەر بە هێزە سیاسییەکان تیرۆرکران، سێ ئەندامپەرلەمانی هەرێمی کوردستانیش تیرۆرکران.

هەتا ئێستا داواکاری گشتیی هەرێمی کوردستان سکاڵای لەسەر تیرۆری سیاسیی بەرزنەکردووەتەوە، دادگا گوێی لە سکاڵای حیزبە زیانلێکەوتووەکان و بنەماڵەی کوژراو و ونبووەکان نەگرتووە، ڕونکردنەوە و لێکۆڵینەوەی جدیی لەسەر کوژران و دیارنەمانی کەسە تیرۆرکراو و ونبووەکان نەکردووە. لە نیوەی یەکەمی ساڵی ٢٠١٠دا ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنیی باشووری کوردستان، لەگەڵ بنەماڵەی بێسەروشوێنکراوەکان لە ڕێگەی کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە، هەڵمەتێکیان دەستپێکرد و نارەزاییەکەیان گەیاندە ڕێکخراوە مرۆڤدۆستەکانی جیهان و نەتەوە یەکگرتووەکان، ئەم چالاکییەی خەڵکی کوردستان دژی حیزبە دەسەڵاتدارەکان هێندەی تر ناوبانگی دەسەڵاتی باشووری کوردستانی لە لای ڕای گشتیی جیهانیی ناشیرینکرد، دەرفەتی خەباتی دیبلۆماسیی بۆ باشووری کوردستان بەرتەسککردەوە*١٥.

لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام، نارەزایەتیی خەڵکی کوردستان لە ناو گەنجانی هەرێمی کوردستاندا زیادیکرد. لە ساڵانی ٢٠٠٥ - ٢٠٠٧ ئەو نارەزاییە بەرانبەر بە کەمیی خزمەتگوزاریی و بەرتەسککردنەوەی ئازادیی سیاسیی ڕێپێوان و مانگرتنی بە خۆیەوە بینی. دەسەڵات بە توندیی بە گژ ئەو چالاکییەی خەڵکدا چووەوە، بەبێ وەڵامدانەوەی داواکانی جەماوەر، بە هێزی چەک و شەق بڵاوەی بە خەڵکی ناڕازی دەکرد. دەیانی بە گوللە و بۆکس و قۆناغە تفەنگ بریندارکرد. دەیان کەسی

لە گۆڕەپانی چالاکییەکاندا لێ کوشتن. هەزارانی لێ زیندانکردن و بەشێکیشیان هەڵدەهاتن و خۆیان دەشاردەوە.

بەو شێوەیە دەبینین دەسەڵاتی باشووری کوردستان بە جێبەجێنەکردنی داواکاریی خەڵک و گوللە و تێهەڵدان و زیندانییکردن و ڕاونان وەڵامی چالاکوانانی ناڕازیی دەدایەوە *١٥. ئەو هەڵسوکەوتە نادیموکراتەی دەسەڵاتی هەرێم کە لە بەرچاوی ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤی جیهانیی و وڵاتانی زلهێز بەڕێوەدەبران، هێندەی تر دەموچاوی دەسەڵاتی هەرێمی ناشیریندەکرد، زەمینەی چالاکبوونی کاری دیبلۆماسیی بەرتەسکتر دەکردەوە.

چەندیین ڕۆژنامەنوس درانە دادگا، بەگوێرەی یاسای ڕۆژنامەنوسیی ڕژێمی بەعس سزادەدران. چەندیین ڕۆژنامەنوس فڕێنران و لێیاندرا. چەندیین ڕۆژنامەنوس لە لایەن بکەری نادیارەوە کوژران. خەڵک وای بۆ دەچێت دەسەڵات لەو کوشتنانە بەرپرسیارە.

سۆرانی مامە حمە (٢١/ ٧/ ٢٠٠٨) لە کەرکوک تیرۆرکرا و هەتا ئەمڕۆیش هیچ زانیارییەک لەسەر تیرۆرکردنەکەی ڕانەگەیەنراوە و بکوژەکەی نەدۆزراوەتەوە. عەبدولستار تاهیر شەریف لە هەمان ساڵدا دوای سۆران هەر لە کەرکوک تیرۆرکرا و هەتا ئێستا هیچ زانیارییەک لەسەر تیرۆرکردنەکەی ڕانەگەیەنراوە و بکوژەکەی نەدۆزراوەتەوە. سەردەشت عوسمان (٤/ ٥/ ٢٠١٠) لە هەولێر تیرۆرکرا، هەتا ئێستا زانیاریی ڕاست لەسەر تیرۆرکردنەکەی ڕانەگەیەنراوە و بکوژەکەی نەدۆزراوەتەوە. کاوە گەرمیانیی ساڵی ٢٠١٦ لە کەلار تیرۆرکرا، هەتا ئێستا دادگا کەیسەکەی یەکلانەکردووەتەوە. وداد حوسەین ساڵی ٢٠١٨ لە دهۆک تیرۆرکرا، هەتا ئێستا کەس لەسەر تیرۆکردنی دەستگیرنەکراوە.

تیرۆری ئەم ڕۆژنامەنوسانە لە کاتێکدایە کە پێش تیرۆرکردنیان ڕەخنەی جدییان لە دەسەڵاتی باشووری کوردستان گرتووە، لە شوێنێکدا تیرۆرکراون کە کورد تیایدا دەسەڵاتدار بووە. ئەو لایەنەی لە لێکۆڵینەوەی تیرۆرکردن بەرپرسیارە دەسەڵاتی کوردییە، بەڵام هەتا ئێستا هیچ کەس و لایەنێک بە بەرپرسیاری تیرۆرکردنی ڕۆژنامەنوسەکان دەستنیشاننەکراوە، کەس لەسەر تیرۆرکردنیان سزانەدراوە.

ئاسەواری تاوانەکە هەتا دێت وندەکرێت، بۆیە بەگوێرەی لۆجیک و بە بۆچوونی خەڵک و بە بۆچوونی چاودێرانی سیاسیی و ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤی کوردستان و عێراق و جیهان، دەسەڵاتی باشووری کوردستان لە کوشتن و شاردنەوەی جێبەجێی تاوانەکانی ئەو ڕۆژنامەنوسە کوژراوانە بەرپرسیارە. ئامانجی دەسەڵات لە کوشتنی ئەو ڕۆژنامەنوسانەدا ئەوەیە کە ڕۆژنامەنوسەکان بترسێنێت و لە ترسان واز لە ڕەخنەکانیان بهێنن.

کوشتنی ڕۆژنامەنوسان لە هەرێمی کوردستاندا بەو شێوەیە، پێگەی سیاسیی دەسەڵاتی باشووری کوردستانی لە ئاستی کوردستانیی و ناوچەیی و جیهانییدا دابەزاندووە، زەمینەی پێشکەوتنی دیبلۆماسیەتی هەرێمی کوردستانی دواخستووە*١٦.

دەربارەی ئازادیی سیاسیی و مافی پێکهێنانی ڕێکخراوی سیاسیی و چالاکیی سیاسیی، هەردوو حیزبی دەسەڵاتدار کار بەو یاسایانە ناکەن کە لە پەرلەمانی کوردستان بۆ پێکهێنانی حیزبی سیاسیی و ڕێکخراوی کۆمەڵگەی مەدەنیی و کاری ڕۆژنامەنوسیی دەرکراون، حیزبە دەسەڵاتدارەکان دەسەڵاتی یاسادانان و جێبەجێکردن و دادوەریان خستووەتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیان، چۆن بەرژەوەندیی تەسکی تاکەکەسیی و بنەماڵەیی و حیزبیی خۆیان بخوازێت، ئاوا کارپێدەکەن، مافی تاک و پێکهاتە سیاسیی و کۆمەڵایەتییەکانی باشووری کوردستان پێشێلدەکەن، داواکاریی خەڵک فەرامۆشدەکەن.

لە خۆپیشاندانەکانی ١٧ شوبات و ڕۆژانی دوایی ساڵی ٢٠١١دا، لە سنووری دەسەڵاتی زۆنی سەوزدا ١٠ کەس بە گوللەی پێشمەرگەی بارەگاکان و هێزەکانی پۆلیس و ئاسایش شەهیدکران، سەدان کەس بریندارکران، دەیان کەس دەستگیرکران و لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا کرا. لە خۆپێشاندانەکانی کۆتایی ساڵی ٢٠١٧دا، ژمارەیەک چالاکوان شەهید و بریندارکران و سەدان کەس دەستگیرکران. لە خۆپیشاندانی پایزی ساڵی ٢٠٢٠دا ١٠ چالاکوان بە گوللەی پێشمەرگەی بارەگاکان و پۆلیس و ئاسایش شەهیدکران. هیچ کەس لەسەر شەهیدکردنی ئەو چالاکوانانە دەستگیرنەکرا و لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا نەکرا.

بەهاری ساڵی ٢٠٢١ بە سزادانی چالاکوانانی مەدەنیی و ڕۆژنامەنوسانی بادینان دەستیپێکرد، پێنج چالاکی مەدەنیی و ڕۆژنامەنوس کە لە ساڵانی ڕابردوودا جێپەنجەیان لە خەباتی مەدەنیی کوردستاندا دیاربوو، لە لایەن ئاسایشی هەرێمی کوردستانەوە بە تومەتی سیخوڕیی بۆ بێگانە دەستگیرکران و ڕەوانەی دادگا کران، دادگا سزای شەش ساڵ زیندانیی بەسەردا سەپاندن. لەو ڕۆژەوە ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنیی کوردستان و ڕێخراوەکانی مافی مرۆڤی جیهانیی و یەکێتیی ئەورووپا و ئەمریکا و ئەڵمانیا و بەریتانیا و فەرەنسا ڕەخنە لە جۆری دادگاییکردنەکە دەگرن، بڕوایان بە بێلایەنیی و یاسای حوکمی دادگاکانی هەرێم نییە. ئەمەیش کاریگەرییەکی زۆر خراپی لەسەر پێگەی دیبلۆماسیی هەرێمی کوردستان کردووە.

سیاسەتی سەرکوتکردن و زیندانییکردن و تیرۆر، زیانێکی گەورەی لە پێگەی دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان داوە. سەروسیمای دەسەڵاتی هەرێمی ناشیرینکردووە. ڕۆژنامە جیهانییەکان و ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤ و چاودێرانی سیاسیی دژی ئەم سیاسەتە دەوەستنەوە و سەرکۆنەی دەسەڵاتی هەرێم دەکەن، دەرفەتی خەباتی دیبلۆماسیی کورد لاوازدەکەن.

## ٤- ناوچە دابڕاوەکان:

لە دروستبوونی دەوڵەتی عێراقەوە هەتا ئەمڕۆ، کێشەی سەرەکیی لە نێوان گەلی باشووری کوردستان و حکومەتە یەک لە دوای یەکەکانی عێراقدا دیاریکردنی سنووری باشووری کوردستانە، گەڕاندنەوەی کەرکوکە بۆ سەر هەرێمی کوردستان.

لە حەفتاکانی سەدەی بیست بە دواوە، ئامانجی سەرەکیی شۆڕشەکانی کورد ئازادکردنی کەرکوک و ناوچە دابڕاوەکانی تری کوردستان بووە. حیزبە سیاسییەکان کەرکوکیان بە دڵ و قودسی کوردستان چواندووە. ساڵی ١٩٩٢ بە ئامادەبوونی نوێنەری ئۆپۆزسیۆنی عێراق پەرلەمانی هەرێمی کوردستان بڕیاری فیدراڵیی بۆ هەرێمی کوردستان دا، سنووری ناوچە فیدراڵییەکەی دیارینەکرد، لە بڕیارەکەدا ئاماژە بەوە نەکرا کە ناوچەی فیدراڵیی کەرکوک دەگرێتەوە. پێش ڕوخانی ڕژێمی سەدام کاتێک دەسەڵاتی باشووری کوردستان لەگەڵ ئۆپۆزسیۆنی عێراق و ئەمریکا لەپێناو ڕوخاندنی ڕژێمی سەدامدا ڕێککەوتن، هیچ باسێکیان لەسەر چارەنوسی کەرکوک نەکرد.

دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام، کێشەی ناوچە دابڕاوەکانی کوردستان لە مادەی١٤٠ دەستووری عێراقدا چارەسەری بۆ دانرا. ئیتر لەو کاتەوە هەموو ئاوات و ئامانجی سیاسیی گەلی باشووری کوردستان بە جێبەجێکردنی مادەی١٤٠ دەستوورەوە گرێدراوە. دەبێت خاڵی سەرەکیی دیبلۆماسیەتی کورد جێبەجێکردنی مادەی١٤٠ دەستووری عێراق بێت، کەچی هەوڵی جێبەجێکردنی مادەی١٤٠ دەستووری عێراق بە خەباتی دیبلۆماسیی دەسەڵاتی هەرێمەوە دیارنییە، بۆ تێپەڕاندنی بەربەستەکانی بەردەم مادەی ١٤٠ دەبێت دەسەڵاتی کوردیی کەناڵی دیبلۆماسیی بکاتەوە، پەنا بۆ هاوکاریی شەقامی کوردیی ببات هەتا پشتیوانیی تێکۆشانە دیبلۆماسییەکەی بکات، هەتا هێزە ناوچەیی و جیهانییەکان گوێ لە بۆچوون و داواکارییەکانی کورد بگرن، بۆ ئەوەی بەرانبەر بە کەرکوک و ناوچە دابڕاوەکانی تر هەڵوێستیان بگۆڕن.

لە هیچ چالاکییەکی دیبلۆماسیی دەسەڵاتی باشووری کوردستاندا باسی مادەی١٤٠ لەئارادا نییە. ڕۆژی ٩/ ٨/ ٢٠١٠ سەرۆکوەزیرانی عێراق بۆ مەبەستی پێکهێنانی حکومەتی عێراقی نوێ سەردانی هەرێمی کوردستانی کرد، دوای چاوپێکەوتنی لەگەڵ سەرۆکی هەرێمی کوردستان لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەنووسی ڕۆژنامەنوسان پرسیاریان لێکردن کە ئاخۆ لە کۆبوونەوەکەدا باس لە مادەی١٤٠ کراوە؟ لە وەڵامدا مالکیی گوتی: باسی مادەی١٤٠ نەکرا. مەسعود بەرزانیی سەرۆکی هەرێم لە لێدوانە ڕۆژنامەوانییەکەیدا گوتی: لەسەر کاندیدکردنەوەی مالکیی بۆ پۆستی سەرۆکوەزیران هێڵی سوورمان نییە*١٧.

ئەمە واتای ئەوەیە کە لایەنی کوردیی لە پێکهێنانی حکومەتی عێراقی نوێدا کاریگەریی هەیە، بەڵام مەرجی نییە. دەبوو مەرجی هەرێم بۆ پشتیوانیی لە مالکیی جێبەجێکردنی مادەی١٤٠ دەستووری عێراق بایە. باشە ئەگەر لە کاتێکی وادا باس لە جێبەجێکردنی مادەی١٤٠ نەکرێت، ئەی کەی باسدەکرێت؟

لە ڕوخانی ڕژێمی سەدامەوە (٢٠٠٣) هەتا ١٦ی ئۆکتۆبەری ٢٠١٧، کورد حاکمی پارێزگای کەرکوک بوو. پارێزگار و ئاسایش و دەزگا ستراتیژییەکانی تری ئەو پارێزگایە بە دەستی کوردەوە بوون. لەو حوکمڕانییە پانزە ساڵییەدا کورد نەیتوانی سیاسەتێکی دیموکراتیی بەرانبەر بە پێکهاتەکانی کەرکوک پەیڕەوبکات. نەیتوانی

سۆزی پێکهاتەی عەرەب و تورکمان و مەسیحیی بە لای حوکمڕانیی کورددا ڕابکێشێت هەتا لە ڕاپرسیی مادەی ١٤٠ لەگەڵ ئەوەبن کەرکوک لەسەر هەرێمی کوردستان بێت.

بەو شێوەیە دەبینین دەسەڵاتی کوردیی لە هەرێم و لە عێراق و لە کەرکوک لە ئاستی تێگەیشتنی کێشەی کەرکوک و ناوچە دابڕاوەکانی تردا نییە، توانای دیبلۆماسیی ناوخۆیی و عێراقیی و جیهانیی دەسەڵاتی کوردیی، بەشی گێڕانەوەی کەرکوک و ناوچە دابڕاوەکان ناکات.

## ٥- پارچەکانی تری کوردستان:

یەکێک لە هەڵەکانی شۆڕشی باشووری کوردستان ئەوەیە، لە کاتێکدا شۆڕش بۆ ڕزگاریی باشووری کوردستان دەکات، هاوکاریی لە وڵاتانی داگیرکەری پارچەکانی تری کوردستان وەردەگرێت، بەو مەرجەی دژی مافەکانی گەلی کورد لە پارچەکانی تری کوردستاندا شەڕبکات. لە شۆڕشی ئەیلولدا ئێران پشتیوانیی لۆجستیی و سەربازیی هێزی پێشمەرگەی دەکرد، لە بەرانبەردا سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول ئەو شۆڕشگێڕانەی ڕۆژهەڵاتی کوردستانی لەناو دەبرد کە دژی ڕژێمی شای ئێران تێدەکۆشان و داوای مافی گەلی کوردستانیان دەکرد. لە دوای شۆڕشی ئیسلامیی ئێران و دەستپێکردنی شۆڕشی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، لە ساڵانی ١٩٧٩ - ١٩٨٦ جارێکی تر هێزەکانی پارتیی لە ناو خاکی ڕۆژهەڵاتی کوردستان دژی پێشمەرگەی ڕۆژهەڵات، هاوکاریی سوپای پاسدارانی ئێرانیان کرد.

لە دوای کۆتاییهاتنی شەڕی ئێران و عێراق، هێزە سیاسییەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان پاشەکشەی سەربازییان کرد، ئاوارەی باشووری کوردستان بوون، هەتا ڕاپەڕیین لەژێر دەسەڵاتی حکومەتی عێراق بوون، حکومەتی عێراق دەیپاراستن.

دوای ڕاپەڕیین دەسەڵاتدارانی هەرێمی کوردستان هێزەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستانیان ناچارکرد لە ئوردوگای تایبەتدا بمێننەوە و چالاکیی سیاسیی و چەکداریی دژی کۆماری ئیسلامیی ئێران ڕابگرن.

هێزە دەسەڵاتدارەکانی باشووری کوردستان زۆر هاوکاریی سوپا و دامودەزگا هەواڵگرییەکانی دەوڵەتی تورکیان کرد هەتا شۆڕشی باکووری کوردستان سەرکوتبکەن

و کۆتاییپێبهێنن. ئەو سیاسەتە نانەتەوەیی و ناشارستانییەی دەسەڵاتدارانی باشووری کوردستان، لەسەر ئاستی نەتەوەیی و نێونەتەوەیی زیانی مەزن بە تێکۆشانی گەلی کورد دەگەیەنێت، یەکێتیی نەتەوەیی گەلی کورد لاوازدەکات، دۆست و دوژمنەکانی کورد، گەلی کورد وەکو پێکهاتەیەکی پەرتەوازە و لاواز هەدەڵسەنگێنن، لە هاوکێشە سیاسییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا حسابی بۆ ناکەن، لە بواری دیبلۆماسییدا کورد فەرامۆشدەکرێت.

ئەو شەڕ و ناکۆکییانەی دەسەڵاتدارانی باشووری کوردستان دژی شۆڕشی ڕۆژهەڵات و باکوور دەینێنەوە، گەلی کوردی لە دەرەوەی وڵاتیش پەرتەوازەکردووە، ئاستەنگیی جدیی بۆ دروستکردنی لۆبیی کوردیی لە دەرەوەی وڵات دروستدەکات. بەو شێوەیە سیاسەتی نانەتەوەیی و سیاسەتی گرێدراوی وڵاتە داگیرکەرەکانی کوردستانی هێزەکانی باشووری کوردستان، لە چەند ڕوویەکەوە زیانێکی مەزنی بە دیبلۆماسیەتی کورد دەگەیەنێت.

سیاسەتمەداری کورد جەمیل بایک بۆچوونی وایە کە ئەگەر دەسەڵاتدارانی باشووری کوردستان هێندە خۆیان نەدایەتە دەستی داوا ناڕەواکانی دەوڵەتی تورکیا سەبارەت بە دۆزی کورد لە باکووری کوردستان، ئەگەر هەندێک بەرانبەر بە داوا ناڕەواکانی تورکیا بەرگرییان لە خۆیان و لە کورد بکردایە، چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە باکووری کوردستان هێندەی نەدەخایاند*١٨.

خاڵێکی تری گرنگ لە سیاسەتی نێودەوڵەتییدا، هەڵوێستە بەرانبەر بە دۆزی کورد لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، وڵاتانی ئەوروپا و هێزە نێونەتەوەییەکانی تر، بۆچوونێکی گشتگیریان لەسەر دۆزی کورد هەیە. بڕوایان وایە کە دەبێت گەلی کورد لە هەموو پارچەکانی کوردستاندا ماف و ئازادییەکانی بەدەستبهێنێت، بەڵام دەسەڵاتدارانی باشووری کوردستان نەک هەر نزیک لەو بۆچوونەی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیی کاری دیبلۆماسییان نەکردووە، دۆزی کوردیان پارچە پارچە کردووە و دژی بۆچوونی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیی چالاکیی دیبلۆماسیی دەکەن، بەگوێرەی ویستی وڵاتانی داگیرکەری کوردستان کاری دیبلۆماسیی دەکەن. ئەمەیش وایکردووە کە دیبلۆماسیەتی کورد لە باشووردا پێشنەکەوێت، لەبەرئەوەی لەگەڵ ئیرادەی کۆمەڵگەی کوردستان و ئیرادەی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییدا ناکۆکە.

### ٦– کێشەی فەلەستین:

لە جەنگی دووەمی جیهانییەوە بە بڕیارێکی نێودەوڵەتیی پێشووتر، دەوڵەتی ئیسرائیل دامەزرا. عەرەبەکان نەک هەر بە دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیل ڕازینەبوون، بەڵکو هەموو هێز و توانایان لەپێناو لەناوبردنی ئیسرائیل و ئازادکردنی فەلەستین خستەگەڕ، دۆزی فەلەستینیان کردە بابەتی سەرەکیی سیاسەتی وڵاتەکانیان.

گەلی کورد لە ڕێگەی دامودەزگاکانی دەوڵەتی عێراقەوە، لە ڕێگەی چەپ و کومەنیستەکانی کوردستان و عێراقەوە، لە ڕێگەی ئیسلامییەکانی کوردستانەوە، شارەزایی لەسەر کێشەی فەلەستین پەیداکرد، پشتیوانیی کێشەی فەلەستینی کرد و دژی دەوڵەتی ئیسرائیل وەستایەوە. لەبەرئەوەی حکومەتەکانی عێراق گەلی کوردیان دەچەوساندەوە، لەولایشەوە داکۆکییان لە مافی فەلەستینییەکان دەکرد. داوای ئازادکردنی فەلەستین و لەناوبردنی دەوڵەتی ئیسرائیلیان دەکرد. گەلی کورد مەیلی دۆستایەتیی و پشتیوانیی بۆ کێشەی فەلستین لاوازبوو.

شۆڕشی ئەیلول لەسەر بنەمای دوژمنی دوژمنەکەم دۆستەمە، دژی مافی فەلەستینییەکان وەستایەوە و هاوسۆزیی خۆی بۆ دەوڵەتی ئیسرائیل و ئیسرائیلییەکان پیشاندا. پەیوەندیی هەواڵگریی لەگەڵ حکومەتی ئیسرائیل دروستکرد، هاوکاریی لۆجستیی و سەربازیی و مادیی لە دەوڵەتی ئیسرائیل وەردەگرت.

هاوسۆزیی جەماوەری کوردستان بۆ فەلەستین لاوازبوو، سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول پەیوەندیی لەگەڵ دەوڵەتی ئیسرائیل پێشخست. ئەوە هێندەی تر دوژمنایەتیی حکومەتی عێراق و گەلی کورد و شۆڕشی ئەیلولی قووڵکردەوە. ئەو پەیوەندییەی کورد و ئیسرائیل هێندەی تر چالاکیی دیبلۆماسیی کوردی لە وڵاتانی عەرەبیی و ئیسلامیی و سۆسیالیست و کۆمۆنیستدا لاوازکرد.

پەیوەندیی نێوان شۆڕشی ئەیلول و ئیسرائیل بە ڕێککەوتنی سیاسیی نەبوو، پەیوەندییەکی هەواڵگریی ڕۆژانە بوو. پەیوەندییەکە بە شێوەیەکی سەرەکیی لە ڕێگەی ئێرانەوە بوو، هەر کە ئێران پشتی لە شۆڕشی ئەیلول کرد، ئیسرائیلیش کۆتایی بە پەیوەندییەکانی خۆی و شۆڕشی ئەیلول هێنا. بەو شێوەیە دەبینین کە لەو پەیوەندییەی کورد و ئیسرائیلدا، لەبەرئەوەی پەیوەندییەکی تەتیکیی بوو، پەیوەندییەکی

سیاسیی نەبوو، کورد زیانی گەورەی لێکرد، چەند هەنگاوێک دیبلۆماسیەتی باشووری کوردستانی بۆ دواوە گێڕایەوە.

کێشەی فەلەستین و ئیسرائیل لە لایەن کوردەکانی باکووری کوردستانەوە، بە چاوێکی جیاوازتر دەبینرێت، لەبەرئەوەی دەوڵەتی تورکیا پەیوەندیی توندوتۆڵی لەگەڵ دەوڵەتی ئیسرائیل هەیە، دەوڵەتی تورکیایش سیاسەتی نکوڵییکردن و قڕکردنی گەلی کورد بەڕێوەدەبات، ئیسرائیلیش لەو بوارەدا هاوکاریی تورکیا دەکات. کوردی باکور خۆی بە دۆستی ئیسرائیل نازانێت، عەرەب و فەلەستینییەکان بە دۆستی خۆی دەزانێت. ساڵی ١٩٩٩ بۆ فڕاندنی عەبدوڵڵا ئوج ئالان، هەواڵگریی ئیسرائیل هاوکاریی تورکیای کرد، بۆیە خۆپیشاندەرانی کورد لە ئەورووپا، پەلاماری باڵیوزخانەی ئیسرائیلیان دا.

گەلی باکووری کوردستان دژی سیاسەتی دەوڵەتی ئیسرائیل دەوەستنەوە، پشتیوانیی لە دۆزی فەلەستین دەکەن، لە ململانێی عەرەب و ئیسرائیلدا، پشتیوانیی عەرەب دەکەن. شۆڕشی باکووری کوردستان پەیوەندیی لەگەڵ بزاڤی ئازادییخوازی فەلەستین هەیە، پەیوەندیی لەگەڵ وڵاتانی عەرەبدا باشە. جیاوازیی هەڵوێست لە نێوان گەل و دەسەڵاتی باشوور و باکووردا، بەرانبەر بە دۆزی فەلەستین و کێشەی عەرەب و ئیسرائیل، دیبلۆماسیەتی کوردی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا لە یەک دوورخستووەتەوە و لاوازیدەکات. بەو شێوەیە دەبینین کە دۆزی فەلەستین و کێشەی عەرەب و ئیسرائیل، بابەتێکی سیاسیی هەستیارە و لە چەند ڕوویەکەوە کاریگەریی لەسەر دیبلۆماسیەتی کورد دەکات. هاتنەلای_یەکی هێزە کوردستانییەکان و یەکخستنی سیاسەتێکی نەتەوەیی، هۆکارێکی سەرەکییە بۆ ئەوەی کورد بتوانێت هەڵوێستێکی ڕاست بەرانبەر دۆزی فەلەستین و کێشەی عەرەب ئیسرائیل پیشانبدات، برێک لە خاڵە لاوازەکانی دیبلۆماسیەتی بخاتەلاوە.

### ٧- کورد و تیرۆر:

دوای شەڕی ئازادکردنی کوێت (١٩٩١) سوپای عێراق شکستیخوارد، پێگەی سیاسیی و کەلتوریی ئەمریکا و وڵاتە ڕۆژئاواییەکانی تر لە عێراق و ڕۆژهەڵاتی

ناوەڕاستدا بەهێزبوو، گەلی کورد ڕاپەڕینی کرد و بەشێکی خاکی باشووری کوردستانی ئازادکرد و دامودەزگای حوکمڕانیی پێکهێنا.

لە بەرانبەر شکستی پرۆژەی نەتەوەپەرستیی و فراوانخوازیی بەعسدا، سەرکەوتنی پرۆژەی لیبرالیزمی ڕۆژئاوایی و پرۆژەی نەتەوەیی گەلی کورددا، ئیسلامی سیاسیی توندڕەو لە چوارچێوەی ڕێکخراوی «قاعیدە»دا گەشەیکرد، ململانێ لە نێوان لیبرالیزمی ڕۆژئاوا و ئیسلامی سیاسیی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دەستپێکرد.

لە ١١/ ٩/ ٢٠٠١دا ئەو ململانێیە بە لوتکە گەیشت، کارەساتی کۆمەڵکوژیی بورجە بازرگانییەکانی نیۆرکی لێکەوتەوە. دوای ئەوە ئەمریکا شەڕی دژی تیرۆری ڕاگەیاند، گەلی کورد و هێزە سیاسییەکانی کورد لە هەر چوار پارچەی کوردستان لە تیرۆرەوە دووربوون و دژی توندڕەویی دەوەستانەوە.

دوای شکستی بەهاری عەرەبیی، ڕێکخراوی «داعش» دروستبوو، دەستی بە پەلاماردانی کوردستان کرد. گەلی کورد لە باشوور و ڕۆژئاوا و باکور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان، بە هەموو هێزەکانیەوە دژی ڕێکخراوی تیرۆریستیی داعش شەڕی مان و نەمانی دەستپێکرد و قوربانیی زۆری دا و سەرکەوتنی بەدەستهێنا. هەڵوێست بەرانبەر بە تیرۆر و بەشدارییکردن و قوربانییدان لە شەڕی دژی تیرۆردا، خاڵی بەهێزی کوردە کە دەتوانێت وەکو کۆڵەکەیەکی بتەوکردن و سەرخستنی دیبلۆماسیی بەکاربیهێنێت. لە شەڕی دژی داعشدا ئازایەتیی و دیسپلینی کچانی ڕۆژئاوا، سەرنجی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیی بۆ سەر سیستەمی حوکمڕانیی ڕۆژئـاوای کوردستان ڕاکێشا. دەرکـەوت ئەو سیستەمە بە کەڵکی چارەسەری کێشە عاسییبووەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دێت. ئەم سیستەمە هاوسەنگیی لە نێوان ئەرک و مافی نێر و مێدا ڕەچاودەکات. هاوسەنگیی لە نێوان ماف و ئەرکی پێکهاتە نەتەوەیی و کەلتوریی و ئاینیی و ئاینزاکاندا ڕەچاودەکات. ئاشتیی کۆمەڵایەتیی دەخوڵقێنێت. بە جوانترین سیستەمی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگەکان دەناسرێت. ئەمە وایکرد کە تەرازوی هێزی دیبلۆماسیی کورد قورسببێت و کورد بتوانێت خەباتی دیبلۆماسیی خۆی پێ پێشبخات. لە کۆشکی ئەلیزێ لە فەرەنسا پێشوازیی لە گەریلاکان دەکرێت. نوسەران و هونەرمەندانی ئەمریکا لەسەر شەڕی کۆبانێ و ڕۆڵی کچانی جەنگاوەر فلیم دەردەکەن.

لە باشووری کوردستانیش خەڵک و پێشمەرگە دژی تیرۆر وەستانەوە، قەڵایەکی ئاشتییان بۆ هێزە نیودەوڵەتییەکان دروستکرد هەتا خۆیانی تێدا بپارێزن. لە دوای ڕوخانی ڕژیمی سەدامەوە، لە هەرێمی کوردستانەوە هیچ هێزێکی نێودەوڵەتیی بەر هێرشی تیرۆریستیی نەکەوتووە. ئەمە وایکردووە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییش هەرێمی کوردستان بپارێزێت. ئەوەی مایەی نیگەرانییە بەهۆی ناکۆکیی ئایدۆلۆژیی و حیزبییەوە، باشوور و ڕۆژئاوا یەکگرتوو نین، یەک بەرنامەی دیبلۆماسییان نییە. ئەمەیش وایکردووە لە بواری دیبلۆماسییدا وەکو پێویست سود لە هەڵوێست و سیاسەتی دژی تیرۆری کورد وەرنەگیرێت.

**٨- لە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییدا:**

ئەمریکا و وڵاتانی ئەوروپا، هێزی باڵادەستی ئەم سەردەمەن و لە دروستکردنی کێشە و لە چارەسەرکردنی کێشەی ناوچەیی و جیهانییدا ڕۆڵیان هەیە. لەو کاتەوە بزوتنەوەی نەتەوەیی لە کوردستاندا سەریهەڵداوە، لە جەنگی یەکەمی جیهانییدا، لە جەنگی دووەمی جیهانییدا، لە سەردەمی شەڕی سارددا، لە جەنگەکانی عێراق و ئێران و کوێت و کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییدا، ئەمریکا و وڵاتانی تری ئەوروپا هەڵوێستێکی سیاسیی جدیی و ڕوون و ئاشکرایان بەرانبەر بە دۆزی کورد نەبووە.

لە جەنگی یەکەمی جیهانییدا پاش ڕوخانی دەوڵەتی عوسمانیی، وڵاتانی ئەوروپا و ئەمریکا پشتگیریی دەوڵەتی نەتەوەیی عەرەب و تورک و ئەرمەنیان کرد. لە پەیمانی لۆزاندا، ئاواتە نەتەوەییەکانی گەلی کوردیان فەرامۆشکرد، بە بیانووی لاوازەوە دژی شێخ مەحمودی حەفید و سمکۆی شکاک شەڕیانکرد، شۆڕشەکانیان سەرکوتکرد.

لە جەنگی دووەمی جیهانییدا هەڵوێستی یەکێتیی سۆڤیەتی جاران و بەریتانیا و فەرەنسا و ئەمریکا بەرانبەر بە کۆماری کوردستان، پیشانیدا کە هێزە باڵادەستەکانی جیهان هیچ بەرنامەیەکی سیاسییان بۆ پشتوانیی کێشەی کورد نییە و هەردەم ئامادەن بۆ بەرژەوەندیی خۆیان، سازش لەسەر مافەکانی گەلی کورد بکەن. هەڵوێستی حکومەتی ئەمریکا و وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لە هەرەسپێهێنانی شۆڕشی ئەیلول لە ٦/ ٣/ ١٩٧٥دا بۆ جاری سێیەم پیشانیدا کە وڵاتە زلهێزەکانی جیهان دۆزی کورد لەپێناو بەرژەوەندییەکانی خۆیان هەڕاجدەکەن*١٩.

پیلانگێڕیی نێوان تورکیا و ئەمریکا و ئەورووپا و ئیسرائیل دژی سەرۆکی پارتی کرێکارانی کوردستان (عەبدوڵڵا ئۆج ئالان) کە لە هیچ وڵاتێکی ئەورووپیی مافی پەنابەریی سیاسییان نەدا، لە نایرۆبی دەستگیریانکرد و ڕادەستی کۆماندۆی تورکیایان کردەوە. نمونەیەکی تری سیاسەتی وڵاتانی باڵادەستی جیهانە دژی کورد پەیڕەویدەکەن.

ئەو هێزە نێودەوڵەتییانە دژی ڕاپرسیی سەربەخۆیی باشووری کوردستانی ساڵی ٢٠١٧ وەستانەوە، گڵۆپی سەوزیان بۆ سوپای عێراق هەڵکرد هەتا کەرکوک بگرێتەوە، هەر ئەو هێزە نێودەوڵەتییانە ئۆکەیان بە سوپای تورکیا دا هەتا عەفرین داگیربکات، گۆڕنکاریی دیموگرافیی تێدا بکات و سیمای کوردبوونی شارەکە بگۆڕێت و تەعریبیبکات.

ئەو نمونانە دەیسەلمێنێت لە ١٠٠ ساڵی ڕابـردوودا، لە کاتی دروستبوونی هزری نەتەوەیی و بزاڤی ڕزگارییخوازی گەلی کورددا، وڵاتانی باڵادەستی جیهان بە بەردەوامیی دژایەتیی ماف و ئازادییەکانی گەلی کورد دەکەن، لە شکستپێهێنانی شۆڕشەکانی گەلی کورددا ڕۆڵدەبینن.

لە هەمان کاتدا لەم ڕۆژگارەدا هەر هێز و لایەنێک تێکۆشانی دیبلۆماسیی بە گرنگ بزانێت و بیەوێت سیاسەت بکات، دەبێت پەیوەندیی سیاسیی و دیبلۆماسیی لەگەڵ ئەو وڵاتانەدا دروستبکات. دەسەڵاتدارانی باشووری کوردستان بە چەندیین تێڕوانین و مۆدێلی هەڵەوە لەگەڵ هێزە دەسەڵاتدارەکانی جیهان کاری دیبلۆماسیی دەکەن:

١- ڕەخنەی سیاسەتی ١٠٠ ساڵی ڕابردووی ئەو وڵاتانە ناکەن کە دژی ئاوات و ئامانجە ڕەواکانی گەلی کورد بووە، بۆ سەرکوتکردنی شۆڕش و بەرخودانەکانی گەلی کورد هاوکاریی داگیرکەرانی کوردستانیان کردووە.

٢- کاتێک پەیوەندیی و دۆستایەتیی لەگەڵ ئەو وڵاتانەدا دروستدەکەن، زیاد لە ڕادەی خۆی متمانە بەو وڵاتانە دەکەن، وەکو ئەوەی ئەو وڵاتانە نەبووبن کوردستانیان دابەشکردبێت و لە سەرکوتکردنی شۆڕشەکانی گەلی کورددا بەشداریی کاریگەریان کردبێت.

٣- له كاتی چالاكیی دیبلۆماسییدا ڕۆڵی سەرەكیی بۆ چارەسەركردنی كێشەیَ كورد دەخەنە ئەستۆی پشتیوانیی و بڕیاری سیاسیی ئەو وڵاتانە، هێزی ناوخۆیی گەلی كوردستان لە چارەسەركردنی كێشەكاندا بچووكدەكەنەوە، هێزی ئەو وڵاتانە لە چارەسەركردنی كێشەكاندا گەورەدەكەن.

٤- مۆدێلی كاری دیبلۆماسیی دەسەڵاتی باشووری كوردستان لە چاو مۆدێلی چالاكیی دیبلۆماسیی ئەو وڵاتانەدا زۆر سەرەتایی و خێڵەكییە. لە كاتێكدا ئۆبامای ئەفرۆئەمریكیی بووەتە سەرۆككۆماری ئەمریكا. ئێستا تاڵەبانیی كوڕەكەی خۆی دەكاتە نوێنەری حكومەتی هەرێم لە ئەمریكا و مەسعود بەرزانیی و كوڕ و برازەكەی پێكەوە لەبریی كورد سەردانی ئەمریكا دەكەن.

٥- پەیوەندیی نێوان هێزەكانی باشووری كوردستان و ئەمریكا و وڵاتانی ئەوروپیی لەسەر بنەمای ڕێككەوتنی سیاسیی و ستراتیژیی نییە، پەیوەندییەكی تاكتیكیی و كاتییە. بۆ پاراستنی ئاسایشی ئەمریكا و ئەوروپایە، كە تێكدانی زیاتری پەیوەندیی نێوان گەلی كورد و گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی لێدەكەوێتەوە. ئەو خاڵە لاوازانە و چەندیین خاڵی لاوازی تری دیبلۆماسیەتی دەسەڵاتی باشووری كوردستان، وایكردووە كە دەسەڵاتی باشوور نەتوانێت سود لەو دەرفەتە سیاسییە لەبارە وەربگرێت، كە بە هەڵە گەورەكانی سەدام حوسەین بۆ چارەسەركردنی دۆزی كورد دروستبووە.

## پەراوێزەکان:

١- مەسعود بەرزانیی، بەرزانیی و بزوتنەوەی ڕزگارییخوازی گەلی کورد.

٢- ئیبراهیم جەلال، تاریق عەزیز پیاوی دۆزەکە، حمیده نەعنا.

٣- لە پایزی ساڵی ١٩٨٣دا لەو گفتوگۆیەدا ئامادەبووم کە لە گوندی ئاوەژێ لە بناری مەرگە لە نێوان چوار بەرپرسی (ی. ن. ک) لەسەر پرۆژەی گفتوگۆی نێوان (ی. ن. ک) و حکومەتی بەعسدا دەکرا.

٤- دەڵێن نوێنەری (پ. د. ک) لەسەر ئەو کۆبوونەوەیە زانیاریی داوەتە تورکەکان.

٥- کۆپیی نامەی وەزیری دادی حکومەتی هەرێم بۆ ئیتالیا.

٦- بڕیاری پەرلەمانی هەرێمی کوردستان لە ٤/ ٩/ ١٩٩٢ دەرچووە، ئامادەی کۆبوونەوەی پەرلەمان بووم و دەنگم بۆ بڕیارەکە دا.

٧- سەردانی مەسعود بەرزانیی بۆ ئەمریکا.

٨- سەردانی مەسعود بەرزانیی بۆ تورکیا وڵاتانی ئەوروپا و عەرەبیی.

٩- بزوتنەوەی ڕیفراندۆم.

١٠- داگیرکردنی کوێت لە لایەن سوپای عێراقەوە.

١١- ڕۆژنامەی هاوڵاتیی، ژمارە ٦٥٣، ڕۆژی ١١/ ٨/ ٢٠١٠.

١٢- یاسای حیزبە سیاسییەکانی پەرلەمانی هەرێمی کودستان ١٩٩٢.

١٣.کۆمگرەی نەتەوەیی کوردستان( ک ن ک ) و کۆمەڵە کوردییەکان لە ئەوروپا.

١٤. چالاکییە مەدەنییەکانی شار و شارۆچکەکانی خەڵکی کوردستان لە بەرانبەر کەمیی و خراپیی ئاستی خزمەتگوزاریی و ئازادییە سیاسییەکان لە ڕانیە، ئاکرێ، کەلار، کفریی، سلێمانیی، هەڵەبجە، دەربەنیخان و ناوچەکانی تری باشووری کوردستان.

١٥.تیرۆرکردنی سۆرانی مامە حەمە، شێخ ستار، سەردەشت عوسمان.

١٦.کەناڵی تەلەفزیۆنی سپێدە.

١٧. سەردانی مالکیی بۆ هەرێمی کوردستان

١٨. مێژوویەک لە ئاگر، چاوپێکەوتن لەگەڵ جەمیل بایکدا.

١٩. هنری کیسنجەر، یادەوەریی، بەرگی پێنجەم.

# ١٣

# ئابووریی هەرێمی کوردستان

بەرهەمی ئابووریی کوردستان وەکو بەرهەمی ئابووریی هەر وڵاتێکی تر، لە کشتوکاڵ و بازرگانیی و گەشتوگوزار و پیشەسازیی پێکهاتووە، سیستەمی حوکمڕانیی و سەرچاوە سروشتییەکان (ئاو، نەوت، زەوی) و هێزی مرۆیی و توانای زانستیی، ڕادەی پێشکەوتن و دواکەوتنی بەرهەمی ئابووریی دیاریدەکەن.

ئەگەرچی عێراق و هەرێمی کوردستان لە ڕووی سەرچاوەی ئابوورییەوە دەوڵەمەندن، بەڵام لەبەرئەوەی سیستەمی حوکمڕانیی و دامودەزگا ئابوورییەکان بۆ بەرهەمهێنان و پێشکەوتنی ئابووریی ڕۆڵی یەکلاکەرەوە دەبینن، سیستەمی حوکمڕانیی هەرێم و عێراقیش بەردەوام لە قەیران و شەڕ و وێرانکارییدا بووە، هەرێم و عێراق سوودی لە سەرچاوە سروشتیی و مرۆییەکان وەرنەگرتووە. ئابووریی و بەرهەمهێنانی پێشنەخستووە.

لە کاتی خەباتی چەکدارییدا، کشتوکاڵ و ئاودێریی ناوچە ڕزگارکراوەکان و بوارەکانی تری بەرهەمهێنانی باشووری کوردستان، لەژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عێراقدا بوون، بەرپرسانی شۆڕش تەنها باج و خەراجیان لە جوتیارەکانی ناوچە

ڕزگارکراوەکان وەردەگرت، گومرگیان لە قاچاخچییەکانی سنوورەکانی نێوان عێراق و تورکیا و ئێران وەردەگرت.

لە دوای ڕاپەڕینەوە ئەگەرچی دەسەڵاتی هەرێم هەوڵی ئابوریی سەربەخۆ و پێشخستنی ئابوریی داوە، بەڵام لەبەرئەوەی چالاکییە ئابورییەکان لەژێر کاریگەریی سیاسەتی نەختینەیی و سیاسەتی دارایی و سیاسەتی بازرگانییدان، هەرێمی کوردستان خاوەنی دراو و سیاسەتی نەختی نییە، لە ڕووی داراییەوە تەنها دەسەڵاتی کۆکردنەوە و خەرجکردنی هەیە، دەسەڵاتی قەرز و بانکداریی سەربەخۆی نییە و لە ڕووی ئابورییەوە بە عێراقەوە بەستراوەتەوە، لە پێشخستنی ئابوریی کوردستاندا کارێکی جدیی نەکردوە. تەنها لە ڕووی بەرهەمهێنان و ناردنەدەرەوەی نەوت سەرکێشییکردووە، ئەویش بە زیانی ئابوریی و سیاسیی بۆ هەرێمی کوردستان شکاوەتەوە. گرنگیی ئابوریی لە سیاسەتدا ئەوەیە، هەر تاک و پێکهاتەیەک خاوەنی ئابوریی سەربەخۆ بێت، لە سیاسەتیشدا سەربەخۆ دەبێت، هەر تاک و پێکهاتەیەک، سەربەخۆیی ئابوریی نەبێت، سەربەخۆیی سیاسیی لەدەستدەدات.

## ئابوریی شۆڕشەکانی کورد

هەر کەسێک سەیری بەیانی دامەزراندنی حیزبەکانی باشووری کوردستان و بەیانی ڕاگەیاندنی شۆڕشەکانی باشووری کوردستان و بەیانی دامەزراندنی هێزی پێشمەرگە و بەرنامەی حیزب و شۆڕشەکانی کورد بکات، بۆی ئاشکرادەبێت کە لە تێکۆشانی ڕزگارییخوازی باشووری کوردستاندا، گرنگیی بە چالاکیی ئابوریی و بەرهەمهێنان و دابینکردنی پێویستییە مادییەکانی شۆڕش و خەڵکی کوردستان نەدراوە.

**لە کاتی شۆڕشدا بۆ دابینکردنی داهاتی شۆڕش سود لەم سەرچاوانە وەردەگیرا:**

**١- هاوکاریی وڵاتان:**

شۆڕشی گەلی کورد لە ڕووی ئابورییەوە کەموکووڕیی جدیی هەیە، هەوڵی بۆ ئابوریی سەربەخۆی شۆڕش نەدا، سەرچاوەی سەرەکیی ئابوریی شۆڕش، هاوکاریی

مەرجداری وڵاتانی ناوچەیی و جیهانیی بووە. ئەمە وایکردووە شۆڕش نەتوانێت لە سەرپێی خۆی بوەستێت، بۆ دابینکردنی بژێویی پێشمەرگە، بۆ دابینکردنی چەک و تەقەمەنیی، خۆی ڕادەستی سیاسەتی وڵاتە داگیرکەرەکانی کوردستان دەکرد. ئەمەیش دوچاری لادانی سیاسیی و هەلدێری دەکرد.

### ٢- ئابونە:

ئابونەی ئەندامانی حیزب سەرچاوەیەکی گرنگی ئابوریی حیزب و شۆڕش بوو، لە سەردەمی خەباتی چەکداریی شۆڕشی ئەیلولدا ئەم سەرچاوەیە گرنگیپێدەدرا. ئابونەی مانگانە لە ئەندامانی ناوچە ڕزگارکراوەکان کۆدەکرایەوە، وەکو سەرچاوەیەکی دارایی شۆڕش سودی لێوەردەگیرا.

ئابونەوەرگرتن لە ئەندام و لایەنگرانی حیزب لە سەردەمی شۆڕشی نوێدا گرنگیپێنەدرا، لە ساڵانی ١٩٨٢ - ١٩٩١ پزیشک و پێشمەرگە و کادری شۆڕشی نوێ بووم، بڕیاری وامان نەبوو ئابونە لە ئەندامانی حیزب وەربگرین، لە دوای کۆبوونەوەکان هەرگیز ئابونەم لە ئەندامان وەرنەدەگرت.

### ٣- باج و سەرانە:

سەرچاوەیەکی تری ئابوریی شۆڕش ئەو باجە بوو کە لەسەر بەرهەمی جوتیارانی ناوچە ڕزگارکراوەکان دادەنرا، لە شۆڕشی ئەیلولدا باج لەسەر بەرهەمی توتن و گەنم و جۆ دادەنرا، کادرەکانی حیزب ساڵانە ئەو باجەیان کۆدەکردەوە. باج لەسەر نانەواکان و پیشەکانی تر دادەنرا، مانگانە باجەکە لەو کەسانە وەردەگیرا. ئەو کەسانەی سەرپێچیی یاسایی و کۆمەڵایەتیی و سیاسییان دەکرد، بە پارەدان سزادەدران، پارەکە وەردەگیرا و دەخرایە سەر داهاتی شۆڕش. سەرچاوەیەکی تری ناڕاستەوخۆی ئابوریی شۆڕش، ماڵی جوتیاران بوو. لەو شوێنانە، یان ئەو کاتانەی پێشمەرگە بارەگا و بنکەی سەربازیی نەبوو، لەسەر قووتی ماڵە جوتیارەکان دەژیا.

لە هەشتاکانی سەدەی بیستدا، سنووری سەرانەوەرگرتن فروانبوو، سەرمایەدارنی شارەکانیشی گرتەوە، بە بیانووی ئەوەوە کە سەرمایەدارەکانی

کوردستان له شەڕی ئێران - عێرقدا هاوکاریی ڕژێمی سەدامیان دەکرد. سەرکردایەتیی شۆڕشی نوێ داوای له سەرمایەدارەکان دەکرد هاوکاریی پێشمەرگەیش بکەن. هەندێکیان هاوکارییان دەنارد، هەندێکیشیان داواکەیان ڕەتدەکردەوە. زۆربەی ئەوانەی داواکەیان ڕەتدەکردەوە، له لایەن مەفرەزەی تایبەتی پێشمەرگەوە دەستگیردەکران و بەرەو سنووری دەسەڵاتی پێشمەرگە دەفرێنران، زیندانییدەکران هەتا پارەکەیان دەدا.

## ٤- پرۆژەی بەرهەمهێنان:

له شۆڕشی ئەیلول و شۆڕشی نوێدا (١٩٦١ - ١٩٩١) هەرگیز نەبیستراوە کە شۆڕش له ناوخۆی کوردستان، له ناوچە ڕزگارکراوەکان پرۆژەیەکی ئابوریی بەرهەمهێنەری هەبێت. لەگەڵ ئەوەیشدا کە له ڕیزەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستاندا چەندین کادری پیشەیی کشتوکاڵیی هەبوون، ئامادەیی کشتوکاڵ و کۆلێژی کشتوکاڵیان تەواوکردبوو. پیشەی ئەو پێشمەرگانە بۆ ڕۆشنبیرکردنی جوتیاران و بۆ زۆرکردنی بەرهەمی جوتیاران و بۆ پرۆژەی ئابوریی شۆڕش سودی لێوەرنەدەگیرا.

### به داهاتی شۆڕش پرۆژه دروستنەکراوە:

یەکێک له تایبەتمەندییەکانی سەرکردایەتیی شۆڕشەکانی باشوور ئەوەیە له کاتی گفتوگۆدا داوای هاوکاریی مادییان له بەرانبەر دەکرد، ئەو هاوکارییانە نە بۆ شۆڕش خەرجدەکرا، نە بۆ پرۆژەی ئابوریی بەکاردەهێنرا. ئەو توانا مادییە هەمووی له لایەن سەرکردایەتیی و بەرپرسانی شۆڕشەوە دەستیبەسەردادەگیرا، به ناوی خۆیانەوە له بانکی وڵاتاندا دایاندەنا. هەرگیز نەمانبیستووە حیزبە سیاسییەکانی باشووری کوردستان له دەرەوەی وڵات و له عێراق پرۆژەیەکی ئابورییان هەبووبێت.

له دوای ڕاپەڕیین دەسەڵاتی شاخی دوێنێ و دەسەڵاتی شاری ئەمڕۆ، نەک هەر بەرنامەی پێکهێنانی پرۆژەی ئابوریی نەبوو، ئاستەنگیی زۆریشی بۆ گەشەکردنی ئابوریی هەرێمی کوردستان دروستکرد. له درێژەی هەڵە سیاسییەکانیدا، سامانی

ژێرزەمینی نەوت و گازی ڕادەستی کۆمپانیا بیانییەکان کرد، داهاتی نەوت و گازی هەرێم بە ناڕوونیی مایەوە. چاودێران وای بۆ دەچن کە بنەماڵە حوکمڕانەکانی هەرێم، قازانجی دەرهێنان و ناردنەدەرەوەی نەوت و گازی کوردستان بۆ خۆیان دەبەن، لە هەرێمی کوردستانیش وەبەرهێنانی پێناکەن.

## عێراق و ئابوریی هەرێم

### ١- ئابوریی کوردستان و شەڕ:

باشووری کوردستان یەکێک لە ناوچە دەوڵەمەندەکانی عێراق و کوردستانە، بە بەرهەمی کشتوکاڵیی و زەوی بەپیت و ئاوی زۆر و دەستی کاری هەرزان بەناوبانگە. بۆ گەشتوگوزار، ناوچەیەکی دڵگیر و فێنک و پاراوی هەیە، سەرنجی گەشتیارانی عێراق و وڵاتانی کەنداوی عەرەبیی بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت.

باشووری کوردستان لە نێوان سنووری عێراق و ئێران و تورکیا و سوریادایە، ئەو جوگرافیایە وایلێکردووە شوێنی گواستنەوە و تێپەڕبوونی کاڵای دروستکراوی هەر یەکێک لەو وڵاتانە بێت، بە تێپەڕبوونی کاڵای ئەو وڵاتانە بەسەر خاکی کوردستاندا، چالاکیی بازرگانیی دروستدەبێت، لە ڕێگەی کارکردن و خزمەتگوزاریی و باج وەرگرتنەوە، داهاتی کورستان زیاد دەکات.

لە باشووری کوردستان سامانی ژێرزەمینی نەوت و ئاسن و مس و کانزای تر هەیە، دەرفەتی پێشخستنی کەرتی پیشەسازیی و بازرگانیی زۆرتر دەڕەخساند. بەهۆی سیاسەتی داگیرکاریی ڕژێمە یەک لە دوای یەکەکانی عێراقەوە، بەهۆی بەرخودانی گەلی باشووری کوردستانەوە بەرانبەر بە سیاسەتی بەعەرەبکردن و ڕاگواستن و بەبەعسکردن و کۆمەڵکوژیی، هەرێمی کوردستان ئارامیی و جێگیریی سیاسیی وای بە خۆیەوە نەدیوە هەتا ئابوریی هەرێم بە شێوەیەکی سروشتیی گەشەبکات.

لەو کاتەوە دەوڵەتی عێراق دروستبووە، گەلی کورد داوای مافی نەتەوەیی خۆی دەکات، دەوڵەتی عێراق بە شەڕ وەڵامی داخوازیی کورد دەداتەوە. لە ئەنجامی ئەو شەڕانەوە، ڕەز و باخی کوردستان سوتاوە، مەڕ و ماڵاتی کورد لەناوچووە،

جوتیاری کورد دەرفەتی چاندن و بەرهەمهێنانی کەمبووەتەوە. لە ئەنجامی ئەو شەڕانەوە ناوچە گەشتیارییەکانی کوردستان بەگەڕنەخروان، گەشەیاننەکردووە، کورد سودی لە کەرتی گەشتگوزار وەرنەگرتووە. بەهۆی ئەوەوە دەوڵەتی عێراق بە بەردەوامیی شەڕی لەگەڵ کورد و وڵاتانی دەوروبەردا کردووە، بازرگانیی کوردستان گەشەینەکردووە، کوردستان سودی لە چالاکیی بازرگانیی وەرنەگرتووە. لە هەر وڵاتێکدا جێگیریی سیاسیی و ئاشتیی بەرقەرارنەبێت، پیشەسازیی و کەرتەکانی تری بەرهەمهێنان بە لاوازیی و دواکەوتوویی دەمێننەوە، بۆیە لە ڕووی پیشەسازییشەوە کوردستان گەشەینەکردووە. دەتوانین بڵێین بەهۆی شەڕ و سەرکوتکردنی سیاسیی دەوڵەتی عێراقەوە، کوردستان سودی لە سامانە سروشتیی و مرۆیی و زانستییەکان وەرنەگرتووەو لە ڕووی ئابورییەوە پێشنەکەوتووە.

## ٢- زانست و تەکنۆلۆژیا:

ڕژێمە داگیرکەرەکانی عێراق ڕێگەیاننەداوە گەلی کورد سود لە داهێنانی ئابوریی و زانستیی نوێ وەربگرێت و بۆ بوژانەوەی ئابوریی بەکاریبهێنێت، ڕێگەیاننەداوە لە ڕووی زانستییەوە گەلی کوردستان زانستییانە سود لە سەرچاوە سروشتییەکانی خۆی وەربگرێت. دەوڵەتی عێراق کارینەکردووە بۆ ئەوەی ئەو بەرهەمە خۆماڵییانەی لە کوردستاندا هەن پێشبکەون. هەر کوردێک سەیری بەرهەمە سەرەتاییەکانی جلوبەرگ و پێویستییەکانی تری ناو ماڵی ناوچەی هەورامان بکات، سەیری ڕستن و چنین و بەرهەمهێنانی جلوبەرگی ناوچەی مەرگەی قەزای دوکان و ناوچەی خۆشناوەتیی قەزای ڕانیە و ناوچەی بادینان بکات، بۆی دەردەکەوێت گەلی کورد پێویستییە سەرەتاییەکانی ژیانی خۆی بەرهەمهێناوە، بە قۆناغی بەرهەممێنانی مانیفاکتۆرە گەیشتووە، لەو قۆناغەی بەرهەمهێناندا وەستاوە، چیتر گەشەینەکردووە*١.

هۆکاری سەرەکیی بۆ گەشەنەکردنی بەرهەمهێنان لە قۆناغی مانیفاکتۆرەوە بۆ قۆناغی پیشەسازیی، بۆ شەڕی ناوخۆ و سیاسەتی نەتەوەپەرستیی دەوڵەتی عێراق دەگەڕێتەوە. پەیوەندیی بە سیاسەتی ئەو ڕژێمانەوە هەیە کە حوکمی کوردستانیان کردووە. سیاسەتی ئەو ڕژێمانەیش سیاسەتێکی داگیرکاریی بووە، ڕێگەیاننەداوە کۆمەڵگەی کوردستان لە هەموو بوارێکی ژیاندا، بە بواری ئابورییشەوە پێشبکەوێت.

ئەگەر بەرهەمە سەرەتاییەکانی کوردستان بە زانست و تەکنۆلۆژیای سەردم موتوربە بکرانایە، پیشەسازیی جلوبەرگ و پێڵاو پێشکەوتنی بە خۆیەوە دەبینی. پیشەسازیی کاسە و کەوچکی تەختە، گەشەیدەکرد و بازرگانیی پێوەدەکرا. ئاژەڵداریی و بەرهەمی گوشت و شیرەمەنیی زۆر گەشەیدەکرد و بازرگانیی پێوەدەکرا. لەوێیشەوە کەلتور و داهێنانی گەلەکەمان بە جیهان دەناسرا و ئابوریی کوردستان پێشدەکەوت.

## ٣- بەنداوەکانی کوردستان:

لە جەنگی یەکەمی جیهانییدا، باشووری کوردستان بە وڵاتی عێراقەوە لکێنرا. ئینگلیزی داگیرکەری عێراق وەکو دەوڵەتی عوسمانیی، لەگەڵ پێشخستنی ئابوریی کوردستاندا نەبوو، گرنگیی ئەوتۆی بە گەشەپێدانی کشتوکاڵیی کوردستان نەدا.

لە سەردەمی دەسەڵاتی پادشایەتیی عێراقدا، کۆمپانیا ئەوروپییەکان بەنداوی دوکان و دەربەندیخانیان لەسەر خاکی بەپیتی دەشتی بیتوێن و دەشتی شارەزوور دروستکرد. لە دروستکردنی بەنداوەکاندا بەرژەوەندیی خەڵکی کوردستانیان ڕەچاونەکرد. ئەو دوو بەنداوە زیانی مەزنیان بە ئابوریی کوردستان گەیاند، لەبەرئەوەی ڕووبەرێکی فراوانی دەشتەکانی باشووری کوردستانی نوقمی ئاو کرد و لە بەرهەمهێنان دایبڕاند. ئەو ئاوەی لە بەنداوەکاندا کۆدەکرێتەوە، ناوچە دەشتاییەکانی گەرمیانی پێ ئاونادرێت، خەڵکی کوردستان بۆ کشتوکاڵ و ئاودێریی سودی لێوەرناگرێت*٢.

ڕژێمی پاشایەتیی عێراق چەندین جۆگە و بەنداوی وەکو بەنداوی حەویجەی لە ناوچە سنوورییەکانی باشووری کوردستاندا بۆ خێڵە عەرەبە کۆچەرەکان دروستکرد، لەسەر ئەو جۆگانە نیشتەجێیکردن. بەو شێوەیە ڕژێمی پاشایەتیی عێراق بە ئاوی کوردستان ئابوریی عەرەبەکانی عێراقی پێشخست. بە ژێرئاوخستنی دەشتەکانی باشووری کوردستان، ئابوریی کوردستانی دواخست*٣.

ئەگەر بەنداوەکان لە سەرووی دەشتەکانی بیتوێن و شارەزوورەوە دروستبکرانایە، ئاوی کوردستان بۆ ئاودێرییکردنی کشتوکاڵی ئەو دەشتانە سودی لێوەردەگیرا، ئەو کات ئابوریی کوردستان دەبوژایەوە. ئەگەر لە بەنداوی دوکان و دەربەندیخانەوە جۆگە بۆ دەشتەکانی ناوشوان و کۆیە و تەقتەق و گەرمیان ڕاکێشرایە، ئابوریی

کوردستان ئەو دۆخەی ئێستای تێدەپەڕاند. ئەم دوو بەنداوە سەدان گوندی ئەو ناوچانەیان ژێرئاوخست، هەزاران خێزانی ناوچەکەیان ئاوارەی شار و ناوچەکانی تری کوردستان کرد و لە بەرهەمەهێنان دووریخستنەوە.

هەتا ئەمڕۆیش سیاسەتی ئاودزینی باشووری کوردستان بە بەرچاوی گەلی کورد و هەموو دنیاوە بەردەوامە. دەشتەکانی شارەزوور و بیتوێن ژێرئاودەکەون و بەرهەمی کشتوکاڵ و ئاژەڵداریی و گەشتوگوزاریان نامێنێت. دەشتەکانی ناوچەی گەرمیان و ناوشوان و کۆیە و هەولێر لە ئاو و ئاودێریی بەنداوەکانی دەربەندیخان و دوکان بێبەشدەکرێن. دەشتەکانی ناوچە عەرەبنشینەکانی عێراق بە ئاوی بەنداوەکانی باشووری کوردستان ئاودەدرێن و بەرهەمیان زیاددەکات.

ساڵی ٢٠٠٧ شایەتی دۆسیەی ئەنفالی داگای باڵای تاوانەکانی عێراق بووم، لە سلێمانییەوە بەرەو بەغدا بە فڕۆکە گەشتمدەکرد، لە پەنجەرەی فڕۆکەکەوە سەیری سەر زەویم دەکرد، دوو سنوورم بەرچاوکەوت، سنوورێکی قاوەیی و وشک، سنوورێکی سەوز و تەڕ. قاوەیی و وشکەکە کوردستان بوو، سەوز و تەڕەکە عەربستان بوو.

## ٤- ڕاگواستنی گوندە سنوورییەکان:

کە ساڵی ١٩٧٦ شۆڕشی ئەیلول شکستیهێنا، ڕژێمی بەعس دەستی بە وێرانکردنی گوندە سنوورییەکانی باشووری کوردستان کرد. دانیشتوانی گوندەکانی لە ئۆردوگای زۆرەملێ نیشتەجێکرد. ئامانجی ئەو ڕاگواستنە بۆ ئەوە بوو خەڵکی گوند لە پێشمەرگە داببڕێت، ڕێگە لە دروستبوونی شۆڕشێکی تری کورد بگرێت.

ئەو ڕاگواستنە بەندێکی ڕێککەوتنی نێوان سەدام حوسەین و شای ئێران بوو کە لە ٦/ ٣/ ١٩٧٥ لە جەزائیر کرا. دەبوو بە قووڵایی ١٥ کیلۆمەتر، سنووری ئێران - عێراق چۆڵبکرێت. لە ماوەی چەند ساڵێکدا نزیکەی ٤٠٠٠ هەزار گوندی ناوچە سنوورییەکانی نێوان عێراق و ئێرانی ڕاگواست. خەڵکی ئەو گوندانەی لە ئۆردوگای زۆرەملێدا نیشتەجێیکردن. سنووری گوندە چۆڵکراوەکانی لە هەر جۆرە چالاکییەکی ئابوریی قەدەغەکرد*٤.

پاش ڕاگواستن، گوندەکان بە مادەی تەقێنەری (تی ئێن تی) وێرانکران. هاتوچۆی کێڵگەکانیش لە جوتیار قەدەغەکرا. خێزانی گوندەکان لە ئوردوگا زۆرەملێکاندا نیشتەجێکران. ڕژێمی بەعس کەوتە دۆزینەوەی کار بۆ جوتیارە بێکارەکان، جوتیارەکانی وەکو کرێکار لە دەزگا حکومییەکاندا دامەزراند. دامودەزگاکانی سنووری هەرێمی کوردستانی لە کرێکار و خزمەتگوزار هەڵئاوساند، بنکەی تەندروستیی وا هەبوو، یەک کارمەندی تەندروستیی کاری تێدادەکرد، کەچی ١٠ - ١٥ خزمەتگوزار لە جوتیارە بێکارەکان کاری تێدادەکرد*٥.

بەو شێوەیە لە دوای کارەساتی ١٩٧٥جارێکی تر جوتیاری کورد لە بەرهەمهێنان دابڕا، وەکو پێکهاتەیەکی بێبەرهەم بە دەسەڵاتی عێراقی ناوەندییەوە گرێدرا. لەبریی ئەوەی جوتیاری کورد بە هێزی بازوو و ئارەقی ناوچەوان بژێویی خۆی و خێزانەکەی پەیدابکات، بە موچەی مانگانەی بەتاڵەی دەستی حکومەتی بەعس دەژیا. بەو شێوەیە جوتیاری کورد نەک هەر لە بەرهەمهێنان دوورکەوتەوە، بوو بە تاکێکی بێبەرهەمی مشەخۆری دەستی دەسەڵات و تایبەتمەندیی جوتیاری لەدەستدا.

### ٥- ئەنفال و کیمیاباران:

کە گفتوگۆی ساڵی ١٩٨٤ی یەکێتیی و حکومەتی عێراق کۆتاییهات، یەکێتیی پاڵی بە ئێرانەوە دا. شەڕی ئێران - عێراق لە کوردستان کڵپەیسەند، ئەگەر لە هەر ناوچەیەکدا شەڕێک بکرایە، گوندی ئەو ناوچەیەیش بەر هێرشی سوپای عێراق دەکەوت و لەگەڵ زەویدا تەختدەکرا.

گوند ڕوخاندن لە ساڵی ١٩٨٥ دەستیپێکرد، لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٨دا پرۆسەکانی ئەنفال و کیمیابارنی هەڵەبجە دەستپێکرد. ستراتیژی سیاسیی ڕژێمی بەعس بەرانبەر بە کوردستان گۆڕانکارییەکی مەترسیداری بەسەرداهات. شارۆچکەکانی کوردستان و ئەو گوندانەی لە ڕابردوودا بەر ڕاگواستن نەکەوتبوون، بەر هێرشی چەکی کیمیاویی سوپای عێراق و وێرانکردن کەوتن. لە هێرشەکانی ئەنفالدا گوندی کوردستان بەپێوەنەما، زۆربەی قەزا و ناحیەکانی کوردستانیش چۆڵکران و تەقێنرانەوە. ئیتر ئابوریی کوردستان بە جارێک هەرەسیهێنا هەتا ئەمڕۆیش (٢٠٢٢) خۆی نەگرتووەتەوە.

هێرشی کیمیاباران و هەڵمەتەکانی ئەنفال، تەنها تێکدانی ژێرخانی ئابوریی کوردستان نەبوو، جینۆسایدی گەلی کوردیش بوو. بەگوێرەی زانیاریی سەرچاوەکانی شۆڕشی کورد نزیکەی ۱۸۰۰۰۰ هەزار کەسی خەڵکی ناوچە ڕزگارکراوەکانی کوردستان لە ئەنفالەکان و لە کیمیاباراندا گیانیانلەدەستداوە. زۆربینەی ئەو کەسانە جوتیاری ناوچە گوندنشینەکانی باشووری کوردستان بوون. بەمەیش گەلی کورد زیانێکی مرۆیی گەورەی کرد و بەرهەمهێنەرانی کوردستان زۆر کەمبوونەوە.

پاش کۆتاییهاتنی شەڕی ئێران و عێراق، ڕژێمی بەعس چەندین شار و شارۆچکەی هەرێمی کوردستانی چۆڵکرد و تەقاندنیەوە. لە پارێزگای سلێمانییدا قەزای هەڵەبجە، ناحیەی بیارە، ناحیەی سیروان، ناحیەی خورماڵ و سەیدسادق ناوچەی قەدەغەکراو و وێرانکراوبوون. قەزای پێنجوێن و ناحیە و گوندەکانی، قەزای چوارتا و ناحیە و گوندەکانی، قەزای قەڵادزێ ناحیە و گوندەکانی ناوچەی وێرانکراو و قەدەغەکراوبوون.

لەو ناوچانەی پارێزگای سلێمانییدا و لە گوندەکانی تری سەرتاسەری باشووری کوردستاندا، هەتا ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی ۱۹۹۱ واتە هەتا سێ ساڵ، پەلەوەریش بۆی نەبوو بفڕێت. ئەو کەسانەی خەڵکی ئەو ناوچانە کە بە زیندوویی مابوونەوە، لە ئوردوگا زۆرەملێکاندا وەکو زیندان لە ژیانی ئاسایی ئابوریی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی دوورخرابوونەوە و هیچ بەرهەمێکیان نەبوو. بەو شێوەیە بۆمان ڕوندەبێتەوە کە پرۆسەکانی ئەنفال و کیمیاباران شانبەشانی قەڵاچۆکردنی گەلی کورد لەو ناوچانەدا، ژێرخانی ئابوریی کوردستانیشی خاپورکردووە، بەرهەمهێنان و ئابوریی کوردستانی هێندەی تر پاشەکشێ پێکردووە.

## ٧- ڕاگواستن و بەعەرەبکردن:

یەکێک لە سیاسەتە نەگۆڕەکانی حکومەتە یەک لە دوای یەکەکانی عێراق، بە تایبەتیی ڕژێمی بەعس، بچووکردنەوەی سنووری باشووری کوردستان بوو. ئەم پرۆسەیە سەرەتا لەو ناوچانەوە دەستیپێکردووە کە لە سنووری عێراقی عەرەبییەوە نزیکبوون، یان ناوچەیەک بوون عەرەب و کورد پێکەوە تێیدا دەژیان. ناوەڕۆکی پرۆژەکە ئەوە بووە کە ژمارەی دانیشتوانی کورد لە ناوچە سنوورییەکانی کوردستاندا کەمبکرێتەوە،

ژمارەی دانیشتوانی عەرەبی عێراق لەو ناوچانەدا زۆر بکرێت. ڕژێمی شۆڤینیی عێراق لە سەرەتادا هەوڵیدا کوردەکانی پارێزگاکانی کەرکوک و موسڵ و دیالە و تکریت ناسنامەی نەتەوەیی خۆیان بگۆڕن. واتە لە بەشی پێناسی نەتەوەیی خۆیاندا بنوسن سەر بە نەتەوەی عەرەبین. هەر کوردێک ناسنامەی نەتەوەیی خۆی نەگۆڕیبایە، لەو شوێنە ڕادەگوێزرا و بەرەو هەولێر و سلێمانیی و دهۆک باریانپێدەکرد. دەست بەسەر ماڵ و زەویدا دەگیرا و لە کار دووردەخرایەوە. بەو شێوەیە ئەو ناوچە کوردستانییەی عێراق دەبووە ناوچەیەکی عەرەبی عێراقیی. ئەمە ناوەڕۆکی پرۆسەی (تەرحیل) واتە ڕاگواستن بوو. ئەم پرۆسەیە خزمەتی عەقڵیەتی شۆڤینیی عەرەبیی دەکات، لە بنەڕەتدا ئەندێشەیەکی سیاسیی شۆڤینیی بوو، بەڵام کاریگەریی ئابوریيشی هەبوو.

سیاسەتی ڕاگواستن کە لقێکی سیاسەتی بەعەرەبکردنی کوردستانە، لە ناوچە دەوڵەمەندەکانی باشووری کوردستاندا بە ئاشکرا دیارە، هۆکارێکی تری گەشەنەکردنی ئابوریی کوردستانە. ساڵی ١٩٨١ لە نەخۆشخانەی کۆماری هەولێر، پزیشکی نیشتەجێی خولاو بووم، لە خانەی پزیشکان نانماندەخوارد، پیاوێکی قسەخۆش خواردنی بۆ دروستدەکردین، زۆر جار لە کاتی نانخواردندا گفتوگۆم لەگەڵ دەکرد، ناویم لەبیرنەماوە، بەڵام قسەکانیم لەبیرماوە، دەیگوت: من خەڵکی کەرکوکم، لە شەرکەی نەوت دامەزرابووم و لەوێ کارمدەکرد. باری گوزەرانم باش بوو. بەهۆی کوردبوونمەوە لەوێ دەرکرام. ئێستا لە هەولێر دەژیم. ئەمە ژیان نییە من تێیدام. ئاواتی سەرەکیی ئەو پیاوە ئەوە بوو کە جارێکی تر بگەڕێتەوە کەرکوک و بچێتەوە سەر کارەکەی خۆی و لەوێ ژیانی ئاسایی خۆی دەستپێبکاتەوە. چێشتلێنەرەکەی نەخۆشخانەی کۆماری هەولێر یەکێک لەو هەزاران ئاوارانەی کوردی کەرکوک بوو، کە ڕژێمی بەعس لەسەر ماڵ و کاری خۆیان دەریکردبوون. لە شوێنی ئەوان هەزاران عەرەبی خوارووی عێراقی هێنابوویە شوێنەکەیان و نیشتەجێکردبوون. ئەو عەرەبانەی لە شارەکانی تری عێراقەوە گوازرابوونەوە بۆ کەرکوک و شوێنی کار و پیشەی کوردە دەرەکراوەکانیان گرتبووەوە، بە عەرەبی تەعریب و بە عەرەبی هاوردە ناسرابوون. گوزەرانیان لە ئاستێکی بەرزاد بوو. لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام کاتێک پارتی چارەسەری دیموکراتی کوردستان (پ. چ. د. ک) لە شاری بەغدا نوسینگەی کردەوە، چەند کەسێکی عەرەب پەیوەندییان پێوەکردین، یەکێک لەو کەسانە کوڕێکی عەرەبی خەڵکی ناسریە بوو، ناوی عسام بوو، لە سەردەمی بەعسدا لە وەزارەتی ڕاگەیاندن و ڕۆشنبیریی کارمەند بوو. ساڵی ٢٠٠٥

ڕۆژێکیان لە کەرکوک لەگەڵ عسام قسەماندەکرد، عسام گوتی: منیش لە کەرکوک پارچە زەوییەکم هەبوو، فرۆشتم. پرسیارم لێکرد پارچە زەوی چی؟ گوتی: منیش کاتی خۆی عەرەبی هاوردە بووم، حکومەت لە شاری کەرکوک پارچە زەوییەک و دە هەزار دیناری پێبەخشیم، بۆ ئەوەی بیکەم بە خانوو و تێیدا بژیم. فریانەکەوتم بیکەم بە خانوو، دوای ڕوخانی ڕژێمی بەعس زەوییەکەم فرۆشت.

## ٨- فەرامۆشکردنی کەرکوک:

ساڵانی ١٩٧٦ – ١٩٨١ خوێندکاری کۆلێژی پزیشکیی زانکۆی موسڵ بووم، لە ڕێگەی کەرکوک و هەولێرەوە هاتوچۆی شاری موسڵم دەکرد. لە ڕێگەی سلێمانییەوە بە شەقامەکانی باکووری کەرکوکی کوردنشیندا هاتوچۆماندەکرد. شەقا م و کۆڵان و خانووەکانی سەر ڕێگەکەم باش لە بەرچاوە، لەیادمدا ماوەتەوە. بەو هۆیەوە شارەزاییم لەسەر سنوور و گەشەکردنی موسڵ و کەرکوک پەیداکرد. ساڵی ١٩٨٢ بووم بە پێشمەرگە. موسڵ و کەرکوکم نەبینی هەتا ڕژێمی سەدام ڕوخا. دوای ڕوخانی ڕژێم سەردانی هەردوو شارەکەم کرد، لە ناوچە کوردنشینەکانی کەرکوکدا، بێجگە لە نەخۆشخانەی ئازادیی هیچ گۆڕانکارییەکی بیناسازیی و ئاوەدانیی نوێم بەرچاونەکەوت، بەڵام کاتێک سەردانی موسڵم کرد، بیناسازیی نوێ و ڕێگەوبانی نوێ و ئاوەدانیی بێوێنە، سەری لێتێکدابووم، گەڕەکەکانی موسڵم نەدەناسییەوە.

دیاربوو یەکێک لە کارە شۆڤینییەکانی تری ڕژێمی بەعس لەبەر کوردستانییبوونی کەرکوک هیچ گرنگییەکی بە بیناسازیی و پێشخستنی ئابوریی کەرکوک نەدابوو، بەڵام لەبەرئەوەی زۆرینەی شاری موسڵ بە ڕەگەز عەرەبن و موسڵ لە لای ڕژێمی عێراقییەوە کێشەی ناسنەمەی نەتەوەیی نییە، زۆربەی خەڵکی شار لەگەڵ ڕژێم بوون، لە بواری پێشخستنی ئابوریی و ئاوەدانییەوە، حکومەتی عێراق گرنگیی زۆری بە موسڵ دابوو، کەرکوکی فەرامۆشکردبو*٦.

شاری کەرکوک یەکێک لە شارە هەرە دەوڵەمەندەکانی عێراقە، بەڵام هەتا ئەمڕۆیش لە ڕووی ئابوریی و خزمەتگوزاریی و ئاوەدانییەوە، بە دواکەوتووترین شاری عێراق دەژمێردرێت. پارەی نەوتی کەرکوک بۆ پێشخستنی ئابوریی کەرکوک بەکارنەهێنراوە، کەرکوک هەر وا بە دواکەوتوویی ماوەتەوە. بۆ سڕینەوەی کاریگەرییە

خراپەکانی دارمانی ئابوریی و دواخستنی ئاوەدانیی کەرکوک، حکومەتی عێراقی نوێ بڕیاریداوە لە هەر بەرمیلێک نەوتی پارێزگای کەرکوک یەک دۆلاری بۆ پێشخستنی ئابوریی کەرکوک و بۆ ئاوەدانکردنەوەی کەرکوک خەرجبکرێت*٧.

## ٩- ئابلۆقەی ئابوریی:

لەبەرئەوەی ڕۆژی ٢/ ٨/ ١٩٩٠ ڕژێمی بەعس کوێتی داگیرکرد، نەتەوە یەکگرتووەکان عێراقی خستە ژێر بەندی حەوت، چەندیین ئابلۆقەی بەسەردا سەپاند*٨ ئەم بڕیارە کوردستانیشی گرتەوە، جارێکی تر باری ئابوریی کوردستان بەرەو دارمان ڕۆیشت. بەو شێوەیە پایەکانی ئابوریی عێراق بە تەواویی داڕوخا، لەوێیشەوە جارێکی تر ئابوریی هەرێمی کوردستان کەوتەوە ژێر کاریگەریی سیاسەتە هەڵەکانی ڕژێمی عێراق، هێندەی تر پاشەکشەیکرد. کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیی ئابلۆقەی ئابورییان خستە سەر عێراق، ڕژێمی سەدامیش ئابلۆقەی ئابوریی خستە سەر هەرێمی کوردستان، هەتا ڕوخانی ڕژێمی سەدام ئەو ئابلۆقەیە بەردەوامبوو.

# دەسەڵاتی کوردیی و ئابوریی هەرێم

## ١- ئابوریی هەرێم پێش ڕاپەڕیین

لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ئەو لایەنەی خاوەنی هێزی چەکدار بێت، حوکمڕانیی ئەو سنوورە دەکات کە دەسەڵاتی بەسەریدا دەشکێت، بۆیە کە خەباتی چەکداریی شۆڕشی ئەیلول دەستیپێکرد، ئەو ناوچانەی کە لەژێر دەسەڵاتی هێزی پێشمەرگەدا بوون، لە ڕێگەی پێشمەرگە و حیزبەوە، سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول حوکمڕانی دەکرد.

لە ساڵی ١٩٧٦وە شۆڕشی نوێ بە ڕابەرایەتیی یەکێتیی، لە سنووری ناوچە ڕزگارکراوەکانی پارێزگای سلێمانیی و هەولێر و کەرکوک، هەتا ئەنفال و کیمیاباران دەسەڵاتدار بوو، پارتیی لە سنووری پارێزگای دهۆک هەتا ئەنفال و کیمیاباران دەسەڵاتدار بوو.

١- له شۆڕشی ئەیلولدا، ئاغا و دەرەبەگەکانی باشووری کوردستان دژی یاسای چاکسازیی کشتوکاڵیی حکومەتی عەبدولکەریم قاسم ڕاپەڕیین و چەکی پێشمەرگایەتییان هەڵگرت. لەژێر سێبەری چەکی پێشمەرگایەتییدا، ڕێگەیاننەدا یاسای چاکسازیی کشتوکاڵیی عێراق لە کوردستاندا جێبەجێبکرێت. ئیتر یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی شۆڕشی کورد، دژایەتیی مافی جوتیاران و دژایەتیی یاسای چاکسازیی کشتوکاڵ بوو. ئەمە پێچەوانەی هەموو شۆڕشەکانی جیهان بوو.

ئەو زەوییە کشتوکاڵییانەی لەژێر دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندیی عێراقدا بوون، یاسای چاکسازیی گرتنیەوە، زەوی بەسەر جوتیاراندا دابەشکرا. ئەو زەوییانەی کوردستانیش کە لەژێر دەسەڵاتی شۆڕشی کورددا بوون، هیچ چاکسازییەکی بە خۆیەوە نەدی. زەوی بەسەر جوتیاردا دابەشنەکرا، بۆیە بەرهەمی کشتوکاڵیی و داهاتی جوتیاری کورد نەک هەر پێشنەکەوت، پاشەکشەیکرد.

٢- لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلول و شۆڕشی نوێ و شۆڕشی گوڵاندا، لە کاتی تێکۆشانی پێشمەرگایەتییدا، پرۆژەی ئابوریی (کشتوکاڵیی و بازرگانیی) نەبوو. لە دەشت و چیاکانی کوردستاندا دەرفەتی چالاکیی ئابوریی هەبوو، بەڵام لایەنە سیاسییەکان و هێزی پێشمەرگە هیچ پرۆژەیەکی ئابوریيان پێشنەخست، کێڵگەی کشتوکاڵییان دروستنەدەکرد، پرۆژەی ئاژەڵداریی و پرۆژەی پەلەوەریان دروستنەدەکرد. بۆ بژێویی پێشمەرگە و پێویستییەکانی شۆڕشی کورد، پشتیان بە خۆیان نەدەبەست، تەنها پشتیان بە هاوکاریی وڵاتانی دراوسێ و باجی سەر خەڵک دەبەست.

هیچ زانیارییەکیش بەدەستەوە نییە کە شۆڕشگێڕان هانی جوتیاریان دابێت بۆ ئەوەی بەرهەمیان زیادبکەن و جۆری بەرهەمەکانیان باشبکەن و جوتیار والێبکەن کە ئارەزووی بەرهەمهێنان لە ناخیدا گەشەبکات و جێگیرببێت.

٣- لە خەباتی چەکدارییدا، شۆڕش پێویستی بە پێشمەرگە بوو، جوتیارانی کوردستان نزیکترین پێکهاتەی کۆمەڵگەی کوردستان بوون لە هێزی پێشمەرگەوە، بۆیە ژمارەیەکی باشی جوتیاری کوردستان بە درێژایی تەمەنی خەباتی چەکداریی، بەردەوام دەستی لە بەرهەمهێنان هەڵگرتووە و چەکی پێشمەرگایەتیی لەشانکردووە و لە بەرهەمهێنان دوورکەوتووەتەوە.

٤- دوای ڕێککەوتنی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ی نێوان حکومەتی بەعس و شۆڕشی ئەیلول، بۆ ماوەی ٤ ساڵ شەڕی نێوان هێزی پێشمەرگە و سوپای عێراق ڕاگیرا. یەکێک لە بنەما گرنگەکانی ڕێککەوتنی ١١ی ئازار، ئاساییکردنەوەی ڕەوشی هەرێمی کوردستان بوو. لە برگەی ٩ی ڕێککەوتنەکەدا، باسی جێبەجێکردنی یاسای چاکسازیی کشتوکاڵ کراوە. ئەو یاسایە بە شێوەیەک جێبەجێبکرێت کە پەیوەندییە دەرەبەگایەتییەکانی هەرێمی کوردستان هەڵبوەشێنێتەوە. جوتیاران بەشە زەوی خۆیان وەربگرن. لە باج ببەخشرێن. بەڵام لە ماوەی چوار ساڵدا ئەو بەندەی ڕێککەوتنی بەیانی ١١ ی ئازار جێبەجێنەکرا، بارودۆخی کوردستان ئاساییەکرایەوە، ئابوریی ناوچەی ئۆتۆنۆمیی کوردستان پێشنەخرا.

نەک هەر یاسای چاکسازیی ژمارە ٣٠ ساڵی ١٩٥٨ کشتوکاڵیی سەردەمی عەبدولکەریم قاسم جێبەجێنەکرا، یاسای ژمارە ١١٧ ساڵی ١٩٧٠ و یاسای ژمارە ٩٠ ساڵی ١٩٧٥ حکومەتی بەعسی عێراقیش کە پەیوەندیی بە چاکسازیی زەوییەوە هەبوو، لە زۆر شوێنی ژێر دەسەڵاتی شۆڕشی ئەیلولدا جێبەجێنەکرا*٩.

لەسەر ساردیی پەیوەندییەکانی نێوان شۆڕشی ئەیلول و حکومەتی عێراقی ئەو سەردەمە، سەدام حوسەین نامەیەکی گلەیی و ڕەخنەی ئاراستەی مەلا مستەفا کردووە. یەکێک لە ڕەخنەکان ئەوەیە کە ئاغا بەرپرسەکانی کورد لە سنووری حوکمی زاتییدا ڕێگەنادەن یاسای ١١٧ جێبەجێبکرێت. لە نامەکەدا سەدام حوسەین داوا لە مەلا مستەفا دەکات ئەو جۆرە بەرپرسانە سزابدات و لە بەرپرسیارێتیی دووریانبخاتەوە*١٠.

٥- لە ماوەی چوار ساڵدا (١٩٧٠ - ١٩٧٤) گفتوگۆی نێوان حکومەتی عێراق و شۆڕشی ئەیلول بەردەوامبوو، لە ململانێی نێوان سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول و حکومەتی عێراقی ناوەندییدا هیچ پڕۆژەیەکی ئابوریی و هیچ وتارێکی ئابوریی سەرکردایەتیی شۆڕش ئەیلوول بەدیناکرێت. حکومەتی عێراق لە شارەکانی کوردستان خانووی بۆ بنەماڵەی شەهیدانی شۆڕشی ئەیلول دەکردەوە، حکومەتی عێراق موچەی مانگانەی بۆ شەهیدانی شۆڕشی ئەیلول دەبڕییەوە. لەوە زیاتر حکومەتی عێراقی ناوەندییش هیچ پڕۆژەیەکی تری ئابوریی لە هەرێمی کوردستاندا جێبەجێنەکرد.

بەو شێوەیە ڕێککەوتنی ١١ی ئازار برینەکانی ئابوریی باشووری کوردستانی سارێژنەکرد، ژێرخانی ئابوریی دارماوی باشووری کوردستانی ڕاستنەکردەوە،

چالاکیی ئابوریی پێشنەخست، لە هەڵگیرسانەوەی شەڕی نێوان حکومەتی عێراق و شۆڕشدا، هێندەی تر ئابوریی کوردستان پاشەکشەیکرد.

٦- لە ١١/ ٣/ ١٩٧٤دا حکومەتی عێراق پڕۆژەی خۆی سەبارەت بە حوکمی زاتیی باشووری کوردستان خستەڕوو. لە ڕێگەی ڕاگەیاندنەکانەوە بڵاویکردەوە، ماوەی دوو هەفتە مۆڵەتی بە سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول دا هەتا هەڵوێست لەسەر پڕۆژەکە پیشانبدات، سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول پێش ئەوەی دوو هەفتەکە تەواوببێت، وەڵامی حکومەتی عێراقی دایەوە، لە ڕێگەی ڕادیۆی دەنگی کوردستانەوە ناڕەزایی بەرانبەر بە پڕۆژەکەی حکومەتی عێراق پیشاندا و پێی ڕازینەبوو، شەڕی نێوان هێزی پێشمەرگە و سوپای عێراق هەڵگیرسایەوە. شەڕی ئەم جارە قورستربوو، ماڵوێرانیی و سوتانی ڕەز و باخی جوتیارانی زۆرتری لەگەڵ خۆی هێنا، هێندەی تر ئابوریی کوردستان داڕوخا و گوزەرانی خەڵکی کوردستان گرانبوو.

پاش ساڵێک لە شەڕی نێوان هێزی پێشمەرگە و سوپای عێراق، شۆڕشی ئەیلول شکستیهێنا، بەگوێرەی ڕێککەوتننامەی جەزائیری نێوان شای ئێران و سەدام حوسەین، حکومەتی عێراق دەستی بە ڕاگواستنی گوندە سنوورییەکانی باشووری کوردستان کرد.

## ٢- ئابوریی هەرێم دوای ڕاپەڕیین

لە دوای ڕاپەڕیین حیزبە دەسەڵاتدارەکان لە ڕێگەی دەزگاکانی هەرێمی کوردستان (پەرلەمان، حکومەت، دادوەریی)ەوە، لە ڕێگەی ڕێکخستنەکانی حیزب و هێزی پێشمەرگە و دەزگای هەواڵگریی خۆیانەوە، دەستیان بەسەر ئابوریی باشووری کوردستاندا گرت. سروشتی دروستبوون و گەورەبوون و مانەوەی ئەم حیزبە دەسەڵاتدرانە بەجۆرێکە کە بوون و مانەوە و بەهێزبوونی خۆیان لە هەبوونی چەک و هێز و ناوچەی نفوز و قۆرغکاریی ئابوریی و کڕینی دەستوپێوەنددا دەبیننەوە. ڕادەستکردنی چەک و هێز و پێگەی ئابوریی بە حکومەت و دامەزراوەکان بە کۆتایی هێز و هەژموون و بوون و مانەوەی خۆیان دەزانن. ئەم هێزانە کە لە کوردستان لە دوو هێزی سەرەکیی و هێزی بچووکتر پێکهاتون، هیچیان متمانەی ڕادەستکردنی تەواوی هێزە چەکداریی و سیاسیی و ئابورییەکەیان بە حکومەت نییە و کاردەکەن بۆ گەورەترکردنی هێزی خۆیان. دابەشکردنی دەستکەوت و بەرژەوەندییە ئابورییەکان

له نێوانیاندا ڕێگره لەوه کە له هەر ئانوساتێکدا جەنگی ناوخۆیی هەڵبگیرسێننەوە، ئەگەر جەنگیش هەڵبگیرسێننەوە بەو توانا مادییە داکۆکیی لە خۆیان دەکەن. لە سایەی ئەم جۆرە ڕێکخستن و پەیوەندییەدا دامـەزراوە حکومییەکان لاوازن و لەژێر بڕیار و هەژموونی حیزبەکاندان، یاسا سەروەر نییە و هێز و گروپ و کەسە سیاسیی و دەستڕۆیشتوو و خاوەن_چەکەکان سامان و داهاتی وڵات لەپێناو خۆیان ئاڕاستەدەکەن و بەکاردەهێنن.

هـەر کەسێک سەیری بەرنامەی کابینەکانی حکومەتی هەرێم و بەرنامەی وەزارەتەکانی کشتوکاڵ و ئاودێریی و پیشەسازیی و بازرگانیی و دارایی بکات، سەیری بەرنامەی کۆنگرە و کۆنفرانسی دوای ڕاپەڕینی حیزبەکان بکات، بۆی ئاشکرا دەبێت کە دەسەڵاتی هەرێم گرنگیی بە شۆڕشی ئابوریی و زۆرکردنی بەرهەم و دابینکردنی پێویستییە مادییەکانی خەڵکی کوردستان نەداوە.

لە دوای ڕاپەڕینەوە جارێکی تر، لە سەردەمی شۆڕش زیاتر، دەرەبەگایەتیی لە کوردستان زیندووکرایەوە و لە ڕێگەی دەسەڵاتەوە دەرەبەگی نوێیش دروستبوو. جوتیار لە زوڵمی داگیرکەر و دەرەبەگە ناوخۆییەکان ڕزگارینەبوو و شەڕی براکوژیی نەیهێشت گوندەکان ئاوەدانبکرێنەوە.

بازاڕەکانی کوردستان بۆ ساخکردنەوەی شمەکی وڵاتانی دەورووبـەر کرانەوە، پیشەسازیی پێشنەکەوت، گەشتوگوزار سستکرا. دەسـەڵاتی کوردیی هەوڵینەدا کاریگەریی ئابڵوقەی ئابوریی عێراق و کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیی لەسەر کوردستان بسڕێتەوە، هێندەی تر باری ئابوریی باشووری کوردستان تێکچوو. ئەوەی کە دەسەڵاتی باشووری کوردستان لە دوای ڕاپەڕین لە ڕووی ئابورییەوە ئەنجامیداوە ئەمانەن:

### ١- بنەماڵەی سەرمایەدار:

بنەماڵە دەسەڵاتدارەکانی باشووری کوردستان، لە ڕێگەی شەرعیەتی خەباتی چەکدارییانەوە، دەست بەسەر داهاتی باشووری کوردستاندا دەگرن، بەو داهاتە بنەماڵەی سەرمایەداری سیاسیی پێکدەهێنن. لە سەردەمی خەباتی چەکدارییەوە هەتا ڕاپەڕین، دەسەڵاتبەدەستانی باشووری کوردستان، بە بەرنامە بنەماڵەی

سەرمایەداری سیاسیی دروستدەکەن، هەتا ژیانی سیاسیی و ئابوریی کوردستان قۆرخبکەن و درێژە بە دەسەڵاتیان بدەن.

وەکو پێشتر باسمانکرد، لە کاتی کارەساتی شۆڕشی ئەیلولی ساڵی ١٩٧٥دا سەرکردایەتیی شۆڕش بڕێکی زۆر پارەی شۆڕشی ئەیلولیان لە بەردەستدابوو، کاتێک شۆڕشی ئەیلول بڵاوەیپێکرا، کەس نەیزانی چارەنوسی ئەو پارەیە بە کوێ گەیشت. لە هەڵگیرسانی شۆڕشی گوڵاندا سەرکردایەتیی کاتیی پارتیی باسی لە چارەنوسی ئەو بڕەپارەیە نەکردووە، هەتا ئێستایش هیچ لایەنێک باسی لەو بڕەپارەیە نەکردووە، کە بۆ خەڵکی کوردستان، یان بۆ شۆڕشی کوردستان، یان بۆ پارتیی خەرجکرابێت. ئیتر لۆجیکییە بڵێین کە ئەو بڕەپارەیە لە لایەن بنەماڵی بەرزانییەوە دەستیبەسەرداگیرابێت.

یەکێک لە گیروگرفتە بەردەوام و ناوخۆییەکانی یەکێتیی، لەسەر بڕی داهات و چۆنیەتیی خەرجکردنی داهات بووە. نەوشیروان مستەفا و ئەندامانی تری مەکتەبی سیاسیی یەکێتیی، ئاگایان لە سامانی یەکێتیی نەبوو، داهاتی یەکێتیی لە ژێردەستی مام جەلادا بوو. سەرچاوەی داهات و بڕەکەی لە ژێردەستی بنەماڵەی مام جەل و ئیبراهیم ئەحمەددا بوو. ئەگەر داهاتی یەکێتیی لەژێر دەستی بنەماڵەی مام جەلال و ئیبراهیم ئەحمەددا نەبایە، ئەو بنەماڵەیە نەیاندەتوانی کۆنترۆڵی یەکێتیی بکەن، یەکێتیی لە حیزبێکی چەپی سۆشیاڵ_دیموکراتەوە بکەن بە حیزبی بنەماڵە.

لە کاتی ڕاپەڕیین و لە کاتی ڕوخانی ڕژێمی سەدامدا، هەردوو حیزبی دەسەڵاتدار لە سنووری شارەکانی سلێمانیی و هەولێر و دهۆک و کەرکوک و موسڵدا، دەستیان بەسەر هەزاران پارچە ئامێر و پارەی بانکی شارەکاندا گرت. ئەم سامانە نەبووە موڵکی خەڵک و حیزب و حکومەت، وەکو سەرمایەی بنەماڵەکان کردیانە سەرمایە و لە بانکە جیهانییەکان خەواندیان.

لە دوای ڕاپەڕیین هەتا شەڕی ناوخۆی ١٩٩٤ هەردوو حیزبی دەسەڵاتدار ٧٠٪ داهاتی گومرگی ئیبراهیم خەلیل و گومرگەکانی تری سنووری باشووری کوردستانیان لە ناو خۆیاندا دابەشدەکرد. تەنها ٣٠٪ داهاتی گومرکی سنووری هەرێمی کوردستانیان بۆ ڕاپەڕاندنی کاروبارەکانی حکومەتی هەرێم بەکاردەهێنا*١١.

لە دوای ڕاپەڕینەوە هەتا ڕوخانی ڕژێمی سەدام، بەگوێرەی ئەو زانیارییانەی لە زاری خەڵکی کوردستان و لە ڕۆژنامە جیهانییەکانەوە بڵاودەبووەوە. پەیوەندییەکی

بازرگانیی بەهێز بۆ گواستنەوەی نەوت و شتومەکی تر لە سنووری ئیبراهیم خەلیل لە نێوان بنەماڵەی بەرزانیی و کوڕەکانی سەدامدا هەبووە*١٢.

لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام باس لە بڕی چوار ملیار دۆلاری ئەمریکا دەکەن کە لە لایەن حکومەتی ئەمریکاوە بە حکومەتی هەرێمی کوردستان بەخشرابێت، بەڵام هیچ بەڵگەیەک نییە بیسەلمێنێت ئەو بڕەپارەیە خرابێتە سەر بودجەی حکومەتی هەرێمی کوردستان و بۆ ئاوەدانکردنەوەی هەرێمی کوردستان سودی لێوەرگیرابێت*١٣.

لە مانگی نۆی ساڵی ٢٠٠٩دا ڕۆژنامەی هاوڵاتیی و ڕۆژنامەی ئاوێنە، لە چەند ژمارەیەکی ئەو مانگەدا هەواڵی دوو کێشەی داراییان لەسەر حکومەتی هەرێمی کوردستان بڵاوکردەوە. یەکێکیان ئەوە بوو کە جێگری سەرۆکوەزیرانی پێشووی حکومەتی هەرێم (هەژدە ملیۆن و حەوتسەد و پەنجا) هەزار دۆلاری لە بودجەی حکومەتی هەرێم بۆ پرۆژەیەکی خەیاڵیی خەرجکردبوو. لەسەر ئەوە داواکاری گشتیی سلێمانیی دژی جێگری سەرۆکوەزیران سکاڵای بەرزکردەوە. یەکسەر جەلال تاڵەبانیی هاتە ناو کێشەکەوە، داکۆکیی لە جێگری سەرۆکوەزیران کرد و کەیسەکەی داخست. دواتر باسکرا کە ئەو بڕەپارەیە بۆ پرۆژەی یەکێک لە کوڕەکانی تاڵەبانیی خەرجکراوە.

لە هەمان کاتدا باسی فرۆشتنی پشکەکانی حکومەتی هەرێم لە کۆمپانیای DNO بە کۆمپانیای تورکی جەنڵ ئینێرجی کرا، کە لە لایەن وەزیری سامانە سروشتییەکانی حکومەتی هەرێمەوە ئەنجامدراوە. قازانجەکەی بە (سەد ملیۆن) کرۆن مەزندەدەکرا. ئەو بڕەپارەیە نەخرایە سەر بودجەی حکومەتی هەرێم، کەچی سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان نێچیرڤان بەرزانیی داکۆکیی لە وەزیری سەرچاوە سروشتییەکانی حکومەتی هەرێم کرد و لە کابینەی ئانیدەدا جارێکی تر هەمان پۆستی وەزارەتیان پێدایەوە. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو وزیرە ئەو کارەی بۆ خۆی نەکردووە، بۆ بنەماڵەی بەرزانیی کردووە.

ئەم دوو نمونەیە پیشانیدەدات کە حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشووری کوردستان لەپێناو کۆکردنەوەی سامانی زیاتردا، چەند لە توانایاندا بێت دەزگاکانی حکومەت بەکاردەهێنن، بۆ ئەوەی لەسەر حسابی خەڵک سامان کۆبکەنەوە*١٤.

لە تەموزی ٢٠١٠وە، ڕۆژنامەی واشنتۆن پۆست هەواڵی ناردنەدەرەوەی نەوتی هەرێمی کوردستانی بۆ ئێران بڵاوکردەوە. کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی باشوور و خەڵکی

کوردستان غیرەت گرتنی، دەستیان بە نارەزاییدەربڕین کرد، پاش گوشارەکانی ئەمریکا و خەڵکی کوردستان، دەسەڵات لەسەر بەقاچاخبردنی نەوتی هەرێم هاتەوەلام، بەڵام هەر بەرپرسێک گیای کێویکی دەجوو، سەرۆکی حکومەتی هەرێم بە بڕیاری ژمارە (٨١٩٦) ڕۆژی ١٩/ ٧/ ٢٠١٠ بەقاچاخبردنی نەوتی قەدەغەکرد، بەڵام بڕیارەکەی حکومەت جێبەجێنەکرا و فرۆشتنی نەوت بەردەوامبوو. بڕی ئەو نەوتەی ڕۆژانە لە سنوورەکانی هەرێمەوە ئاودیوی ئێران دەکرێت بە سێ ملیۆن دۆلار مەزندەدەکەن. بەو شێوەیە دەردەکەوێت ئەوانەی لە پشتی بەقاچاخبردنی نەوتی هەرێمی کوردستانەوەن تەنها بەرپرسە باڵاکانی هەردوو حیزبی دەسەڵاتداری باشووری کوردستانن*١٥.

لە کۆتایی ساڵی ٢٠٢١دا کۆمپانیان دیلۆت بڕی نەوتی فرۆشراو و بڕی پارەی دەستکەوت و جۆری خەرجکردنی داهاتی نەوتی شەش مانگی بڵاوکردەوە. دەرکەوت ٤٠٪ داهاتی نەوت بۆ حکومەتی هەرێم دەگەڕێتەوە، ئەو زانیارییانە پیشانیدەدا کە ئامانجی دەسەڵاتداران بە شێوەیەکی سەرەکیی کۆکردنەوە و پێکەوونانی سامانێکی زۆرە. ئەم کارە لەژێر سێبەری خەباتی پێشمەرگایەتیی و دەستکەوتەکانی گەلی کورددا ئەنجامدەدەن. ئەم کارە لەژێر سێبەری حکومەتی هەرێمی کوردستان و پەیوەندییەکانی هەرێم و دەسەڵاتدارانی عێراق و جیهاندا ئەنجامدەدەن. لە کۆکردنەوەی سامانی بێپێوانەدا، سامانی ژێرزەمین و سەرزەمینی خەڵکی کوردستان تالاندەکەن. قووتی خەڵکی کوردستان دەگرنەوە و دەیخەنە سەر حسابی بانکەکانیان. کەوابوو ئامانجی کار و چالاکیە ئابورییەکانی دەسەڵاتدارانی باشووری کوردستان پێشخستنی باری ئابوریی وڵات و بەرزرکردنەوەی ئاستی بژێویی خەڵکی کوردستان نییە. کار و چالاکیی ئابوریی دەسەڵاتداران لەپێناو ئەوەدایە کە سامانی ئەم وڵاتە بخەنە سەر حسابی بانکی چەند بنەماڵەیەکی دەسەڵاتداری باشووری کوردستان، بۆ ئەوەی ئەو بنەماڵانە تاهەتایی دەسەڵاتیان بەدەستەوەبێت.

### ٢- تالانیی:

لە کاتی ڕاپەڕیندا هەر دەزگایەکی حکومەت و هەر بنکەیەکی سەربازیی و هەر بارەگایەکی حیزبیی لە بەرپرسانی حکومەتی بەعس پاکدەکرایەوە، لە لایەکەوە لەبەر

ڕقئەستووریی خەڵک بەرانبەر بە دامودەزگا سەرکوتکەرەکانی ڕژێم، زۆربەی شوێنە ئازادکراوەکان وێراندەکران و دەسوتێنران، لە لایەکی تریشەوە لەبەرئەوەی پێش چەند مانگێک ڕژێمی بەعس لە ڕێگەی سوپاکەیەوە کوێتی داگیرکرد و تاڵانیکرد، پێشمەرگە و خەڵکی هەرێم، ئەو ڕەفتارانەی سوپای بەعسیان دوبارەدەکردەوە. زۆربەی شمەکی دامودەزگاکانی حکومەتیان بە تاڵانیی برد. بەو شێوەیە لە کاتی ڕاپەڕییندا زیانێکی زۆر لە دامودەزگا گشتیی و خزمەتگوزارییەکانی سنووری هەرێمی کوردستان کەوت.

لە ڕاپەڕییندا کاتێک هێزی پێشمەرگەی کوردستان و خەڵک دەستیان بەسەر شار و شارۆچکە و گوندەکانی کوردستاندا گرت، بێبڕوایی و شکستە بەردەوامەکانی خەباتی چەکداریی ڕابردوو وای لە خەڵک و لە پێشمەرگە کرد لەو باوەڕەدابن کە بەم زووانە حیزبی بەعس و سوپای عێراق دەگەڕێنەوە. هێزی پێشمەرگە ڕادەماڵن و سزایەکی گرانی خەڵکی کوردستان دەدەن. بۆیە یەکێک لە کارەکانی خەڵک و پێشمەرگە ئەوە بوو کە پەلاماری زۆرترین دەستکەوتی مادیی بدەن و سامان کۆبکەنەوە و هەڵبێن. کاتێک بەرەو ئێران هەڵهاتن ئەو دەستکەوتە لەگەڵ خۆیاندا ببەن.

کە هێزە سەرکوتکەرەکانی ڕژێمی بەعس لە ڕاپەڕیینی باشووری کوردستاندا ڕاماڵران، لەبریی ئەوەی پێشمەرگە سەنگەر لێبدەن و ناوچە ڕزگارکراوەکان لە هێرشی دوژمن بپارێزن. داکۆکیی لە خەڵکی کوردستان بکەن. ئۆتۆمۆبێل و شۆفڵ و ئامێری تریان کۆدەکردەوە، لەسەر سنووری ئێران بە نرخێکی هەرزان بە ئێرانییەکانیان دەفرۆشت.

لە چەندیین شوێن تاڵانکردنی ئەو سامانەی لە دەزگاکانی حکومەت بەجێمابوو سنووری ئۆتۆمۆبێل و ئامێری تری تێپەڕاند. کارگەی بەرهەمهێنانی قیر و کارگەکانی تری گرتەوە. یەکێک لەو کارە هەرە زەقە تاڵانکارییەی حیزبە دەسەڵاتدارەکانی هەرێمی کوردستان، دەستبەسەرداگرتن و فرۆشتنی ئامێرەکانی بەنداوی پێخمە بوو. پارتیی و یەکێتیی پێکەوە دەستیان بەسەر پێویستییەکانی هەڵکەندن و بەستنی بەنداوی پێخمەدا گرت. بە بڕی یەک ملیۆنونیو دینار بە عومەر ئاغای سوورکییان فرۆشت. عومەر ئاغایش یەکسەر شتومەکەکانی بردە سەر سنووری ئێران و بە قازانجێکی کەم بە ئێرانی فرۆشتەوە*١٦.

تالآنکردنی ئەو دەزگا و ئامێرە بەرهەمهێنەرانە لە لایەن حیزبەکانی باشووری کوردستانەوە، زیانێکی گەورەی بە کەرتی خزمەتگوزاریی و بەرهەمهێنانی هەرێمی کوردستان گەیاند. چەندیین دەزگـای خزمەتگوزاریی وەکو نەخۆشخانە، ئاو، کارەبا، بەهۆی تالآنییەوە هەتا ماوەیەکی زۆر لەکارکەوتن، وەکو پێویست خزمەتی خەڵکیان پێنەکرا. ئەو تالآنییە تالآنکردنی ناڕاستەوخۆی داهاتی هەرێمی کوردستان بوو، لەبەرئەوەی ئەو دەزگا و ئامێرانە لەسەر حسابی گیرفانی خەڵکی کوردستان کڕدرانەوە. بەم شێوەیە لە دوای ڕاپەڕیین جارێکی تر بەرپرسەکانی هێزی پێشمەرگە و حیزبە سیاسییەکانی باشووری کوردستان زیانێکی تریان بە ئابوریی هەرێمی کوردستان گەیاند.

## ٣- داهاتی گومرگ:

لە دوای ڕاپەڕیین هەڵبژاردنی پەرلەمان ئەنجامدرا، حکومەتی هەرێمی کوردستان پێکهێنرا، دەسەلآتی دادوەرییش دەستی بە کارکرد، بەلآم ئەو دەزگایانە بەبێ فەرمانی حیزب دەستیان بە ئاودا نەدەکرد. حیزبەکان لە ڕێگەی دەزگاکانی حکومەت و لێژنە حیزبییەکانەوە، دەستیان بە چالاکیی جۆراوجۆری ئابوریی کرد. یەکێک لەو چالاکییانە کۆنترۆڵی خاڵە گومرگییەکانی نێوان هەرێمی کوردستان و ولآتانی دراوسێیان بوو. خاڵی گومرگی ئیبراهیم خەلیلی سنووری تورکیا، شادەماری گومرگی هەرێم بوو، پارتیی دەستیبەسەرداگرت. لە خاڵی گومرگی باشماخ و پەروێزخانیشەوە بازرگانیی لەگەڵ ئێران دەستپێکرد. بە پێچەوانەیشەوە تەنکەری نەوت و شتومەکی تری عێراقیی لەو مەرزانەوە ئاودیوی تورکیا و ئێران و سوریا دەکرا و گومرگدەکرا.

لە ڕێگەی دەزگـای باجی حکومەتەوە، کەلوپەلەکان باجدەکران، بەلآم کەس نەیدەزانی بڕی داهاتی گومرگەکان چەندە. پەرلەمانیش ئاگاداری داهاتی گومرگ نەبوو. ساڵی ١٩٩٣ نەوشیروان مستەفا ڕایگەیاند کە٣٠٪ بڕی داهاتی گومرگی ئیبراهیم بۆ حکومەتی هەرێم خەرجدەکرێت. ٧٠٪ داهاتی ئەو گومرگە پارتیی و یەکێتیی بۆ خۆیانی دەبەن*١٧.

بەرپرسەکانی حیزب دەستیان بەسەر چالاکیی بازرگانیی هەرێمدا دەگرت، لە خاڵە سنوورییەکانەوە کاڵاکانیان بەبێ گومرگکردن، یان بە گومرگێکی کەم تێدەپەڕاند. بەمەیش حکومەتی هەرێم زیانی ئابوریی بەردەکەوت.

دەستبەسەرداگرتنی داهاتی گومرگی هەرێمی کوردستان لە لایەن حیزبەکانەوە و گومرگنەدانی بازرگانە دەسەڵاتدارەکان لە ڕاپەڕینەوە هەتا ئەمڕۆ بەردەوامە. لە کاتی دواکەوتنی موچەی مانگی ئەپریلی ٢٠٢١ کارمەندانی هەرێمدا، پەرلەمانتارانی لیستی پارتیی و یەکێتیی لە پەرلەمانی کوردستان، حیزبە ڕکابەرەکانی خۆیانیان بە دەستبەسەرداگرتنی داهاتی گومرگ تاوانباردەکرد، هەریەکە و ئەوی تری بە هۆکاری دواخستنی موچەی فەرمانبەران تۆمەتباردەکرد. بەو شێوەیە دەبینین کە حیزبە دەسەڵاتدارەکان زۆرینەی داهاتی وڵات بۆ خۆیان دەبەن، لەپێناو بەپێوەهێشتنەوەی حیزبەکانیان و بۆ شەڕی براکوژیی پارەکە خەرجدەکەن. بەرهەمهێنان و چالاکیی ئابوریی کوردستان دەپوکێننەوە.

### ٤- شەڕی براکوژیی:

دوای ڕاپەڕیین کورد پەرلەمانی هەڵبژارد و حکومەتی پێکهێنا، لە مێژوودا کورد سەرکەوتنی وای بە خۆیەوە نەدیبوو. خەڵکی هەموو پارچەکانی کوردستان هیوایان بە پەرلەمان و حکومەتی هەرێمی کوردستان هەبوو، بەڵام سەرەتا حوکمی پەنجا بە پەنجای نێوان پارتیی و یەکێتیی لە حکومەتی هەرێم و پەرلەماندا دەستپێکرد و کارەکانی حکومەت تەگەرەیتێکەوت. دوای ماوەیەک شەڕی براکوژیی لە نێوان پارتیی و حسکدا دروستبوو، شەڕی براکوژی لە نێوان یەکێتیی و بزوتنەوەی ئیسلامییدا دروستبوو. لە یەکی نیسانی ١٩٩٤دا شەڕی براکوژیی لە نێوان یەکێتیی و پارتییدا دەستپێکرد، هەتا ڕێککەوتنی واشنتۆنی ١٩٩٨ درێژەیکێشا. لە هەمان کاتدا شەڕی نێوان (پ. ک. ک) و هێزی پێشمەرگەی پارتیی و یەکێتییدا لە پایزی ساڵی ١٩٩٢ هەتا ساڵی ٢٠٠٠ هەڵدەگیرسا و دادەمرکایەوە.

لە ساڵی ٢٠٠١ شەڕی نێوان یەکێتیی و ئیسلامییە توندڕەوەکان، لە سنووری قەزای هەڵەبجە و شارەزوور و هەورامان جارێکی تر گەشایەوە، هەتا ڕوخانی ڕژێمی سەدام شەڕەکە درێژەیکێشا. لەبەرئەوەی خولی سێیەمی شەڕی براکوژیی (١٩٩٤ -

٢٠٠٣) لە ناو شار و دەشتەکانی کوردستاندا بوو، چەکی زۆرتر و گەورەتری تێدا بەکارهات، سوپای عێراق و ئێران و تورکیا و ئەمریکای بۆ پەلکێشکرا، گەورەترین زیانی بە ژێرخانی ئابوریی هەرێمی کوردستان گەیاند.

شەڕی براکوژیی دوای ڕاپەڕین، دوورودرێژترین و وێرانکەرترین شەڕی براکوژیی باشووری کوردستان بوو. لەو ماوەیەدا زۆرترین سامانی هەرێمی کوردستان کەوتە دەستی حیزبە بەشەڕهاتووەکان. ئەوانیش ئەو سامانەیان بۆ بەڕێوەبردنی شەڕ و بۆ سەرکوتکردنی بەرانبەرەکەیان بەکاردەهێنا و چەک و تەقەمەنییان پێدەکڕی. لە ڕێگەی سیخوڕەکانیانەوە زانیاریی ناو ڕیزەکانی حیزبە ڕکابەرەکانی خۆیان وەردەگرت، لە سێبەری شەڕەکەیشدا بەرپرسەکان بەشی خۆیان لەو سامانە لادەدا. ئیتر سامانی کوردستان بۆ بژێویی ڕۆژانـەی خەڵک و بۆ خزمەتگوزاریی و بۆ بەرهەمهێنان بەکارنەدەهێنرا، بۆ بێبەشکردنی مرۆڤی کورد لە مافەکانی بەکاردەهێنرا.

لە سەردەمی شەڕی براکوژییدا جارێکی تر جوتیاری کورد لە پرۆسەی بەرهەمهێنان و زیادکردنی بەرهەمی نیشتیمانیی دوورکەوتەوە، چەکی پێشمەرگایەتیی کردەوە شان و دژی براکەی خۆی سەنگەریگرت. لەبریی چاندنی گەنم و جۆ و بەرهەمە پێویستییەکانی تری ژیان، چەکی پاکدەکردەوە و گوللەی لە سنگی براکەی دەگرت. لە سەردەمی شەڕی براکوژییدا جارێکی تر چەندین پارچە ڕەز و باخ و لەوەڕگای کوردستان سوتان و هەزاران گوند و خانووی خەڵکی کوردستان وێرانکران.

لە شەڕی براکوژیی دوای ڕاپەڕیندا کوردستان ڕووبەڕووی چەندین جۆری ئابڵوقەی ئابوریی بووەوە، ئابڵوقەی ئابوریی نەتەوە یەکگرتووەکان لەسەر عێراق، ئابڵوقەی ڕژێمی بەعس لەسەر هەرێمی کوردستان، ئابڵوقەی ئابوریی حیزبە دەسەڵاتدارەکان لەسەر ئەو ناوچانەی کە لەژێر دەسەڵاتی خۆیاندا نەبوو. لە سەردەمی شەڕی براکوژیی دوای ڕاپەڕیندا بەرهەمهێنانی سەرەتاییش لە کێڵگەکانی هەرێمی کوردستاندا وەستا و سادەترین پێویستیی کشتوکاڵیی ڕۆژانەی خەڵک لە وڵاتانی دراوسێوە دەهێنرا. لەو کاتەوە هەرێمی کوردستان بوو بە ناوچەیەکی بێبەرهەم و بۆ دابینکردنی پێویستیی ڕۆژانە، پشتی بە ناردەی وڵاتانی دراوسێ بەست، هەتا ئێستایش ئەو دیاردەیە بەردەوامیی هەیە.

له خولی نوێی شەڕی براکوژییدا، ئاوەدانیی و گەشتوگوزار ڕاوەستا، خانوو و تەلار و ئۆتێل ڕوخان. شەقامەکان هەڵوەشانەوە و کارگەکان لەکارکەوتن. هەزارن پسپۆڕی بوارە جیاجیاکانی ئابوریی، لە داخی شەڕی ناوخۆ سەری خۆیانیان هەڵگرت. بۆیە زیانی ئابوریی ئەم خولەی شەڕی ناوخۆ قووڵ و فراوانتر بوو.

### ٥- سەرمایەداریی کۆمبرادۆر:

جاران ئابوریی لە دوو کەرتدا بەرهەمدەهات، کەرتی تایبەت و کەرتی گشتیی. کەرتی تایبەت لە وڵاتانی سەر بە بلۆکی ڕۆژئـاوادا پەیڕەودەکرێت، لەم کەرتەدا خەڵکی سەرمایەدار پرۆسەی بەرهەمهێنانی پیشەسازیی و کشتوکاڵ و بازرگانیی و گەشتوگوزار لەئەستۆدەگرێت، حکومەت و حیزب بە لای پرۆسەی ئابورییدا ناچن، حکومەت چاودێریی چالاکیی ئابوریی دەکات، گومرک لەسەر قازانجی سەرمایەداران دادەنێت، ئەو گومرگە کۆدەکاتەوە و لەگەڵ داهاتی تری وڵاتدا بەگوێرەی جۆری کار و توانا بەپێی یاسا، وەکو موچە بەسەر خەڵکدا دابەشیدەکات.

لە سیستەمی کۆنی یەکێتیی سۆڤیەت و لە هەندێک وڵاتی تردا، کەرتی گشتیی باڵادەست بوو، کەرتی گشتیی واتە حکومەت ئابوریی وڵات بەڕێوەدەبات. لەم کەرتەدا حکومەت کاری بەرهەمهێنانی پیشەسازیی و کشتوکاڵ و بازرگانیی و گەشتوگوزار لەئەستۆدەگرێت. حکومەت قازانجی بەرهەمهێنان کۆدەکاتەوە، بەگوێرەی پێویستیی خەڵک و بە یاسا لە ڕێگەی موچە و ڕێگەی ترەوە بەسەر خەڵکدا دابەشدەکرێت.

لە هەندێک سیستەمی سیاسیی تـردا هـەردوو کەرتەکە، تایبەت و گشتیی پەیڕەودەکرێن. پێوانە و چالاکییەکانی کەرتی گشتیی و کەرتی تایبەت و تێکەڵاو، بەگوێرەی دەستوور و یاسای وڵات ڕێکدەخرێت. لە هەرێمی کوردستاندا سیستەمی بەرهەمهێنان حیزبییە، نە گشتییە و نـە تایبەتە. لـە ڕێگـەی حیزبەوە بنەماڵە دەسەڵاتدارەکان داهاتی هەرێم و چالاکیی ئابوریی هەرێم قورخدەکەن، بازرگان و سەرمایەداری کوردستان بەسەر حیزبدا دابەشدەکرێن و هەر بازرگانێک لە ڕێنمایی و قازانجی حیزب یاخیببێت، پەراوێزیدەخەن و دەست بەسەر سەرمایەکەیدا دەگرن. بۆ خۆیشیان لەگەڵ سەرمایەدارانی وڵاتانی دەوروبەر ڕێککەوتون و دەرگای هەرێمی کوردستان بۆ کاڵاکانی ئەو وڵاتانە دەکەنەوە.

کەوابوو سەرمایەداری سەرەکیی هەرێمی کوردستان بنەماڵە دەسەڵاتدارەکانن. سەرمایەدارەکانی تری هەرێمیان پاشکۆکردووە و خۆیشیان پاشکۆی سەرمایەدارەکانی وڵاتانی داگیرکەری کوردستانن. سەرمایەدارەکانی هەرێمی کوردستان (بنەماڵەکان) خزمەتی کوردستان ناکەن، سەرمایەداری نیشتیمانیی نین، خزمەتی سەرمایەدارانی وڵاتانی داگیرکەری کوردستان دەکەن. ئەم جۆرە سەرمایەدارانە بە سەرمایەداری کۆمبرادۆر ناوزەدەکرێن. هەتا سیستەمی بەرهەمهێنانی کوردستان وابیت، ژێرخانی ئابوریی کوردستان هەڵناسێتەوە.

ئەو وڵاتانەی گەشەی ئابوریی دەکەن، سەرمایەداریی و بەرهەمهێنان پێیوانەی ئابوریی و ئینسانیی و نیشتیمانیی بۆ دانراوە. بەرهەمهێنان لەو پێوانانە لانادات، بەڵام لە هەرێمی کوردستاندا لەبەرئەوەی سەرمایەی کورستان بە دەستی بنەماڵە دەسەڵاتدارەکانەوەیە، بنەماڵە دەسەڵاتدارەکانیش لەژێر دەستی داگیرکەرانی کوردستاندان، بەرهەمەهێنان نیشتیمانیی نییە، سەرمایە بۆ بەهێزکردنی ئابوریی کوردستان وەگەڕناخرێت، بۆیە کەرتی پیشەسازیی هەرێم ئیفلیجبووە. کشتوکاڵ و ئاودێریی و ئاژەڵداریی هەرێمی کوردستان قۆناغی ئەنفال و کیمیابارانی تێنەپەڕاندووە. گەشتوگوزار نەگەیشتووەتەوە ئەو ئاستەی کاتێک ڕژێمی سەدام حوکمی باشووری کوردستانی دەکرد، ئەو چالاکییە ئابورییەی لە باشووری کوردستاندا باڵادەستە سنووردارە.

دەسەڵاتی باشووری کوردستان، بازرگانیی بە نەوتی هەرێمی کوردستانەوە دەکات. هەردوو حیزبی دەسەڵاتدار، دوور لە دەسەڵاتی حکومەتی هەرێمی کوردستان و حکومەتی عێراقی ناوەندیی چەند ساڵێکە بە ئاشکرا و بە نهێنیی بازرگانیی بە نەوتی هەرێمی کوردستانەوە دەکەن. لە مانگی تەموزی ئەمساڵدا دەرکەوت کە پارەی ئەو نەوتەی بە وڵاتانی دراوسێی دەفرۆشن نە حکومەتی هەرێم و نە حکومەتی عێراق ئاگاداری نییە، بۆ موچەی فەرمانبەران و بۆ ئاوەدانکردنەوەی کوردستان خەرجناکرێت*١٨.

## ٦- سیاسیی و بازرگان:

لەبەرئەوەی دەسەڵاتداران لە یەک کاتدا بازرگانییدەکەن و حوکمی هەرێمیش دەکـەن، پێگەی حکومەتی بۆ بـەرژەوەندیی ئابوریی خۆیان بەکاردەهێنن. ئیتر

دەزگاکانی حکومەتی هەرێم لە باش و خراپی بەرهەمەکان ناپرسنەوە. نە حیزب، نە حکومەت چاودێریی بڕ و چۆنیەتیی شتومەک و بەرهەمەکان ناکەن. ئیتر بەرهەمی خراپ بازارەکانی باشووری کوردستان دادەپۆشێت.

لە ئەنجامی ئەوەدا کە دەسەڵاتداران لە یەک کاتدا فەرمانڕەوا و و بازرگانن، بازاڕ لە لایەن پێکهاتەی دەسەڵاتدارەوە قۆرخکراوە، دەرفەتی کار بۆ بازرگانانی تر تەسکبووەتەوە، خەڵکی بێلایەن بازرگانیی و چالاکیی تری ئابوریی بەزەحمەت دەسدەکەوێت. ئەو پرۆژە خزمەتگوزارییانەی لە لایەن کۆمپانیاکانی سەر بە دەسەڵاتەوە بەگەڕدەخرێن، لەژێر چاودێرییدا نین و بەبێ مەرجی چۆنایەتیی لە لایەن حکومەتەوە وەردەگیرێن. کارەساتی ئۆتێل سۆما دەریخست کە ئۆتێل و میوانخانەکانی هەرێم زۆربەیان موڵکی بەرپرسانن و بەبێ مەرجی ژینگەیی و تەندروستیی و بەرگریی شارستانیی لە لایەن دەزگا پەیوەندییدارەکانی حکومەتەوە وەرگیراون*١٩.

## ٧- ڕێکخراوە بیانییەکان:

دوای ڕاپەڕیین ژمارەیەکی بەرچاو لە ڕێکخراوی بیانیی ڕوویان لە باشووری کوردستان کرد، لە سەرەتا خواردن و پێداویستیی پزیشکییان بۆ خەڵکی کوردستان دابیندەکرد، بەرنامەی درێژخایەنی ڕێکخراوەکان ئاوەدانکردنەوەی کوردستان بوو.

ڕێکخراوەکان گرنگییان بە ئاوەدانکردنەوەی گوندەکان دەدا، لە چەندیین گوندی چۆڵکراوی کوردستاندا ڕێگەیان بردەوە، پرۆژەی ئاویان دروستکرد، کارەبایان دابینکرد، بنکەی تەندروستیی و قوتابخانە و مزگەوتیان دروستکرد. هەندێک ڕێکخراو خانوویشیان بۆ گوندییەکان دروستدەکرد. ڕێکخراو هەبوو مەڕومالأت و مریشکی بەسەر جوتیاراندا دابەشدەکرد، تۆوی دانەوێڵەی بەسەر جوتیاراندا دابەشدەکرد، بۆ ئەوەی ئابوریی کوردستان ببوژێتەوە.

شەڕی براکوژیی نێوان هێزەکانی باشووری کوردستان، ئاستەنگیی جدیی بۆ کاری ڕێکخراوەکان دروستکرد، لە هەندێک ناوچەی شەڕی براکوژییدا، لەبەر نەبوونی ئاسایش و ئارامیی، ڕێکخراوەکان هەرێمی کوردستانیان چۆڵکرد.

دوای ڕاپەڕیین جێپەنجەی ڕێکخراوە بیانییەکان لە دابینکردنی پێویستیی خەڵکی

کوردستان، لە ئاوەدانکردنەوەی گوندەکانی کوردستان، لە هەوڵی ڕاستکردنەوەی ژێرخانی ئابوریی کوردستاندا بە ئاشکرا دیاربوو، کە ڕێکخراوەکان پاشەکشەیانکرد جارێکی تر ئابوریی کوردستان پاشەکشەیکرد و بەرەو دۆخی پێش ڕاپەڕیین گەڕایەوە.

### ٨– حیزبایەتیی و ئابوریی:

دوای ڕاپەڕیین بە ماوەیەک سەرتاپای چالاکیی ئابوریی و داهاتی هەرێمی کوردستان لە نێوان پارتیی و یەکێتییدا دابەشکرا، سامانی سنووری دەسەڵاتی دهۆک و هەولێر لە لایەن پارتییەوە دەستیبەسەرداگیرا، سامانی سنووری پارێزگای سلێمانیی و کەرکوک لە لایەن یەکێتییەوە دەستیبەسەرداگیرا.

ئەو سامانەی دەستیاندەکەوت بۆ بەرهەمهێنان و بوژانەوەی ئابوریی کوردستان بەکاریاننەدەهێنا. هەندێک لەو پارانەیان بۆ ئەو کەسانە دەبڕییەوە کە لەگەڵ سیاسەتی حیزبدا بوون، بڕێکی ئەو سامانەیشیان دەدایە ئەو سەرۆک_خێڵانەی پشتیوانیی حیزبەکەیانی دەکرد. شێوازی هەرە سەرەکیی بۆ زیادکردنی ئەندام و لایەنگری حیزب ئەوە بوو کە بە خەڵکیان دەگوت ئەگەر ببنە ئەندامی حیزب، مانگی ئەوەندە پارە وەردەگریت و بۆ خۆت لە ماڵەوە دادەنیشیت و کارناکەیت.

بەم کارەیان بە دوو شێوە زیانیان بە ئابوریی کوردستان دەگەیاند. سەرمایەکەیان لە پڕۆژەی ئابوریی کوردستاندا بەکارنەدەهێنا، هەلی کاریان بۆ خەڵک دابیننەدەکرد. خەڵکی کوردستانیان هاندەدا کە لە کارکردن و بەرهەمهێنان دووربکەوێتەوە، فێری تەمەڵیی ببێت و بە دەسەڵاتەوە گرێبدرێت. ئەمەیش بووە هۆکارێکی تر بۆ ئەوەی دیاردەی مشەخۆریی و کارنەکردن لە ناو تاک و پێکهاتە چالاکەکانی کوردستاندا جێگیرببێت، وەکو کەلتوری لێبێت و ڕێگە لە گەشەکردنی ئابوریی کوردستان بگرێت.

### ٩– ناڕونیی لە کۆکردنەوەی داهاتدا:

ئەگەرچی سەرچاوەکانی داهاتی هەرێمی کوردستان ئاشکران، بەڵام هیچ تاکێکی کوردستان زانیاریی لەسەر بڕی داهاتی هەرێمی کوردستان و جۆری خەرجکردنی نییە. ئاخۆ داهاتی هەرێمی کوردستان چەندە و چۆن خەرجدەکرێت؟ چەندی بۆ

گەشەپێدانی ئابوریی و بەرهەمهێنان دادەنرێت؟ چەندی بۆ خزمەتگوزاریی و موچەی فەرمانبەران دادەنرێت؟ چەندی بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری حیزبە دەسەڵاتدارەکان دادەنرێت؟ ئایا ئەو داهاتەی هەرێم بە شێوەیەکی دادپەروەرانە بەسەر ناوچە جیاوازەکانی کوردستاندا دابەشدەکرێت؟ ئایا ئەو داهاتە بە شێوەیەکی دادپەروەرانە بەسەر کەرتە جیاوازەکانی کۆمەڵگەدا دابەشدەکرێت؟ ئایا حیزبە دەسەڵاتدارەکانی هەرێم مانگانە چەند لە بودجەی هەرێم بۆ خۆیان دادەنێن؟ ئەمانە کۆمەڵێک پرسیار بوون ڕۆژانە لە ناخی خەڵکدا دەهاتن و دەچوون، وەڵامەکەیان تەنها لە لای ئەندامانی مەکتەب_سیاسیی و سەرۆک و سکرتێری حیزبە دەسەڵاتدارەکانی کوردستان دەستدەکەوت.

پێش ڕوخانی ڕژێمی سەدام، سەرچاوەی سەرەکیی داهاتی هەرێمی کوردستان لە گومرگی خاڵە سنوورییەکان و هاوکاریی دۆستانی کورد و باجی ناوخۆیی پێکهاتبوو. وەکو باسمکرد ساڵی ١٩٩٣ نەوشیروان مستەفا ئاشکرایکرد کە داهاتی گومرگی ئیبراهیم خەلیل کراوە بە سێ بەشەوە، بەشیکی بۆ پارتیی، بەشێکی بۆ یەکێتیی، بەشێکی بۆ بودجەی حکومەتی هەرێم خەرجدەکرێت.

لە ساڵی ١٩٩٥ هەرێمی کوردستان مانگانە بڕی ١٣٪ ئەو پارەیەی بۆ دەهات کە بە بڕیاری ژمارە ٩٨٦ی نەتەوە یەکگرتووەکان (نەوت بەرانبەر بە خۆراک) لەسەر فرۆشتنی نەوتی عێراق دەرچوو.

لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدامەوە، هەتا ساڵی ٢٠١٤ هەرێمی کوردستان بە بەردەوامیی ١٧٪ بودجەی عێراقی فیدراڵیی وەردەگرت. پاش لێدەرکردنی خەرجی سیادیی و حاکیمە. ساڵی ٢٠٠٩ ئاشکرابوو کە حیزبە دەسەڵاتدارەکانی هەرێم لەو بودجەیە مانگی ٣٥ ملیۆن دۆلاریان بۆ خۆیان داناوە*٢٠.

بەڵام ئاشکرانەبووە ئەو بودجەیە چۆن خەرجکراوە *٢١. لە ساڵی ٢٠٠٢ گرێبەستی گەڕان بۆ دۆزینەوە و بەرهەمهێنانی نەوت لە هەرێمی سلێمانیی دەستپێکرد. لە ساڵی ٢٠٠٤ لە هەولێر گرێبەستی گەڕان بۆ دۆزینەوە و بەرهەمهێنانی نەوت لەگەڵ کۆمپانیان بیانییەکاندا دەستپێکرد. لە ساڵی ٢٠١٤ بە دواوە هەرێمی کوردستان گرێبەستی هەناردەکردنی نەوتی دەستپێکرد. هەتا ئێستا بڕی پارەی فرۆشتنی نەوت و هەناردەکردنی نەوت بە ناڕونیی ماوەتەوە.

ناڕونیی لە داهات و نەناردنی بودجە بۆ پەرلەمان، بە واتای ئەوە دێت حیزبە دەسەڵاتدارەکانی هەرێم دەستیان بەسەر داهاتی هەرێمی کوردستاندا گرتووە. بۆ بەرژەوەندیی گشتیی و بە شێوەیەکی دادپەروەرانە بەکارینادهێنن. ئابوریی کوردستانی پێ پێشناخەن، گوزەرانی خەڵکی کوردستانی پێ بەرزناکەنەوە، بە واتای ئەوە دێت ئەو داهاتەی هەرێم بۆ مەبەستی تایبەتیی و حیزبیی و بنەماڵەیی بەکاردێت*٢٢. ساڵی ٢٠٢٠ کابینەی نۆیەمی حکومەتی هەرێم ڕایگەیاند، هەرێمی کوردستان ٢٨ بیستوهەشت ملیار دۆلار قەرزارە. هۆکاری ئەم قەرزارییە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە حکومەتی هەرێم بۆ دابینکردنی موچە پشتی بە بەغدا بەستبوو. داهاتە ناوخۆییەکانی پشتگوێخستبوو. کۆنترۆڵی لەسەر داهاتی گومرگی دەروازەکان و داهاتی نەوت لاوازبوو. ئەو داهاتانە لە ژێردەستی هەردوو حیزبی دەسەڵاتردا بوون، بۆیە ساڵی ٢٠١٤ کە بەشە بودجەی هەرێم لە بەغداوە بڕا، هەرێم توشی قەیرانێکی دارایی گەورە بوو، نەیتوانی پارەی پێویست بۆ موچە و خەرجییەکانی تر دابینبکات. لە ماوەی شەش ساڵی ڕابردوودا بەشێکی زۆری موچەی موچەخۆرانی هەرێم خەرجنەکرا و لەژێر ناوی پاشەکەوت بووە بە قەرزی ناوخۆیی لەسەر حکومەتی هەرێم، خەرجکردنی شایستەی بەڵێندەران دواخرا، زۆربەی پڕۆژەکان ڕاگیران.

حکومەتی هەرێم و ڕاپۆرتی دیوانی چاودێریی دارایی باس لەوە دەکەن کە حکومەت لەو ماوەیەدا ٢٨ ملیار دۆلار قەرزار بووە، کە بریتییە لە پاشەکەوتی موچە و هەندێک قەرزی بەرهەمهێنانی کارەبا و شایستەی کۆمپانیا نەوتییەکان و قەرزەکانی بانکی بازرگانیی عێراق و شایستەی بەڵێندەران.

## ١٠- تاڵانفرۆشیی نەوت و غاز:

کە دەوڵەتی عێراقی نوێ دامەزرا، حکومەتی هەرێمی کوردستان بودجەی ساڵانەی لە حکومەتی عێراقی ناوەندیی وەردەگرت. ئەو بودجەیە بەشی موچەی فەرمانبەرانی دەکرد و نزیکەی ٢٥٪ یش بۆ وەبەرهێنان وەگەڕدەخرا. بۆ ماوەی ١٠ ساڵ گوزەرانی خەڵکی هەرێمی کوردستان باشبوو، هەرێمی کوردستان بوژانەوەی ئابوریی بە خۆیەوە

بینی. دوای ئەوە حیزبە دەسەڵاتدارەکانی هەرێم سەرکێشییانکرد، بەبێ ڕەزامەندیی بەغدا هەوڵیاندا هەرچی سامانی ژێرزەمینی هەرێمی کوردستان هەیە بە نەوت و غازەوە لە بنزەوی دەریبهێنن و بیفرۆشن. داهاتی فرۆشتنی نەوت و غازەکەیش دیار نییە. لە ڕاگەیاندنەکانەوە دەڵێن داهاتی فرۆشی نەوتی هەرێم بۆ وەزارەتی دارایی عێراق دەگەڕێنینەوە، هیچ داهاتێکی نەوتیش بۆ وەزارەتی نەوتی عێراق نەگەڕاوەتەوە.

ئەگەر حکومەتی هەرێم کێشەی بودجەی نەبێت، داهاتی فرۆشتنی نەوت نەکەوێتە دەستی حکومەتی هەرێم و بۆ عێراقی ناوەندیی نەگەڕێتەوە، عێراقی فیدراڵیی بە دەرهێنان و بازاڕکردنی نەوتی هەرێم ڕازینەبێت، دەبێت حیزبە دەسەڵاتدارەکانی هەرێمی کوردستان بۆچی لەسەر هەڵکەندنی بیری نەوت و گرێبەستی نەوت و گازی کۆمپانیا بیانییەکان بەردەوامبن و ململانێ لەگەڵ حکومەتی عێراق بکەن؟ دیارە داهاتی فرۆشی نەوت بۆ خۆیان دەبەن. ساڵی ٢٠١٦ لە بۆنەیەکی کۆمەڵایەتییدا ئەندامێکی مەکتەبی سیاسیی یەکێتیم بینی، پرسیاری بودجە و موچە و بەرهەمهێنانی نەوتم لێکرد، ئەو برادەرە گوتی: داهاتی نەوت بۆ موچە نییە. گوتە بەناوبانگەکەی ئاشتی هەورامیی، وەزیری سەرچاوە سروشتییەکان لە ساڵی ٢٠١٥ گوتی: «نرخی بەرمیلێک نەوت (١٠٠) دۆلاریش بێت، گوزەرانی خەڵک باشتر نابێت».

حکومەتی عێراقی فیدراڵ لەسەر گرێبەستی دەرهێنان و هەناردەکردنی نەوتی هەرێم ڕازینەبوو، داوایکرد ئەو سیاسەتەی هەرێم کۆتاییپێبێت، کە بە ئابوریی سەربەخۆی هەرێم ناویدەهات، دەسەڵاتدارانی هەرێم گوێیان لە داواکاریی عێراقی فیدراڵی نەگرت، عێراقی فیدراڵی لە ساڵی ٢٠١٤ بە دواوە برە موچەی هەرێمی کوردستان نانێرێت، یان نیوەناچڵ دەینێرێت.

هەرێمی کوردستان لە سەرەتادا دەیگوت پارەی فرۆشتنی نەوتی هەرێم بۆ وەزارەتـی دارایـی عێراق دەگەڕێنینەوە، بەڵام لەو کاتەوە لەگەڵ ئەوەی چەندیین ڕێککەوتن لە نێوان هەرێم و بەغدا بۆ ئەو مەبەستە کراوە، هەرێم یەک بەرمیل نەوتی بە عێراقی فیدراڵی نەداوە، نە پەرلەمانی هەرێم و نە پەرلەمانی عێراق ئاگای لە داهاتی فرۆشتنی نەوتی هەرێم نییە.

یەکێک لـە کێشـە سـەرەکییەکانی نـێوان حکومـەتی هـەرێمی کوردسـتـان بـە سەرۆکایەتیی نێچیرڤان بەرزانیی لەگەڵ حکومەتی عێراقی فیدراڵی ئەو گرێبەستە

نەوتییانەی نێوان حکومەتی هەرێم و کۆمپانیا بیانییەکانی نەرویج و کوریای باشوور بوو، لە کاتێکدا کە داهاتی فرۆشی ئەو گرێبەستانەیش نەدەخرایە سەر بودجەی هەرێمی کوردستان. هەندێک لە چاودێرانی بواری ئابوریی پێیانوایە ئەو گرێبەستانە تەنها لەپێناو ئەوەدا بوو کە دەسەڵاتدارانی هەرێم کۆمیشن لە کۆمپانیا بیانییەکان وەربگرن و لە گیرفانی خۆیان توندیبکەن.

هەر هێزێکی سیاسیی و هەر دەسەڵاتێک لە جیهاندا حسابی ستراتیژیی بۆ سامانی وڵاتەکەی دەکات، ئەو سامانەی کە هەیەتی بە سامانی نیشتیمانیی و نەتەوەیی دەزانێت و بەگوێرەی بنەمای ئابوریی و بەگوێرەی بەرژەوەندیی گشتیی و پێویستیی دەستی لێدەدات. وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا خاوەنی گەورەترین سامانی ژێرزەمینی نەوتی جیهانە، بەڵام دەمێک ساڵە ئەمریکا بڕێک لە نەوتی پێویستی خۆی لە وڵاتانی ترەوە دەکڕێت و بە وریاییەوە دەست لە نەوتی خۆی دەدات.

وڵاتێکی وەکو سوید گەورەترین سامانی دار و تەختەی هەیە، بەگوێرەی ئەو زانیارییانەی لە سەرچاوەکانی سامانی دار و تەختەی سویدی وەرگیراوە، وڵاتی سوید هەتا ئێستا ٢٪ سامانی دار و تەختەی خۆی لە بازرگانیی و بەرهەمهێناندا بەکارهێناوە.

کەچی دەسەڵاتدارانی هەرێمی کوردستان بەبێ ئەوەی حکومەت پێویستی بە پارە بێت، بەبێ ئەوەی کورد لە فرۆشتنی سامانی ژێرزەمینی کوردستاندا قازانجبکات، نەوت و گازی کوردستان بە ناڕونیی تاڵانفرۆشدەکەن.

هەموو وڵاتێک شانازیی بەوەوە دەکات کە ئابوریی سەربەخۆی هەیە و کۆمپانیای وڵاتانی زلهێز ناتوانن دەستبخەنە ناو کاروباری ناوخۆی وڵاتەکەیانەوە، دەسەڵاتدارانی هەرێمی کوردستان هەموو سامانی ستراتیژیی نەوت و گازی کوردستانیان خستووەتە بەردەستی کۆمپاینا بێگانەکان، بە شانازییەوە باس لەوە دەکەن کە بەهۆی سامانی ژێرزەمینی کوردستانەوە کۆمپانیای بیانیی و وڵاتانی دەرەوە ئامادەن پەیوەندیی لەگەڵ هەرێمی کوردستان ببەستن.

دەرهێنانی سامانی نەتەوەیی و تاڵانفرۆشکردنی بەو شێوەیەی کە ماوەی چەندین ساڵە دەستیپێکردووە، گەورەترین زیان بە ئابوریی کوردستان دەگەیەنێت، لە ماوەیەکی کورتدا هەرێمی کوردستان وەکو ناوچەیەکی زەنگینی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست گرنگیی

خۆی لەدەستدەدات. هیچ بەڵگەیەک نییە ڕەوایی بە فرۆشتنی سامانی کوردستان بدات، لە کاتێکدا داهاتی ئەو فرۆشتنە بۆ بەرهەمهێنان و پیشەسازییکردن و پێشخستنی ئابوریی کوردستان بەکارنەیەت.

## ٩- نەوت و گازی هەرێم

کە لە نوسینی ئەم کتێبە بوومەوە، داوام لە ئابورییناس جیهانگیر گوڵپیی کرد چاوێک بە بەشی ئابوریی کتێبەکەمدا بخشێنێتەوە، بۆ ئەوەی پێوانە ئابورییەکانی بەهێزبکات، لەگەڵ ئەوەی کۆمەڵێک سەرنج و تێبینیی بۆ ناردم و سودم لێوەرگت، بەڵام لەسەر یاسای نەوت و گاز ئەم سەرنجانەی هەبوو بە گرنگم زانی لە کتێبەکەدا وەکو خۆی بینوسمەوە.

### چەند سەرنجێکی گشتیی لەبارەی پرسی نەوت و بودجەوە:

١- هەوڵی دەرهێنان و فرۆشتنی نەوت لە لایەن هەرێمەوە لە خۆیدا هەنگاوێکی هەڵە نییە، بەڵکو هەڵە و تێبینییەکان لەسەر جۆری بەڕێوەبردنی سیاسەتی نەوتی هەرێم و خەرجکردنی داهاتەکانیەتی. هەرێم هەم لە ڕووی مێژوویی و نیشتیمانیی و نەتەوەییەوە مافی خۆیەتی کە ئیدارەی سامانی خۆی بکات و سودی لێوەربگرێت، هەم دەستوری عێراقیش هەتا ڕادەیەکی زۆر ئەو مافەی پێداوە. بەڵام گرفتەکە جگە لەڕەفتاری دەسەڵاتدارانی هەردوولا بۆ بەژەوەندییە تایبەتەکانیان لە چەند خاڵێکی تریشەوە سەرچاوەیگرتووە، کە بوونەتە هۆی ئەوە لێکتێگەیشتنی هەرێم و بەغدا، بەزەحمەت تەواوبێت، بەشی زۆری ئەو لێکتێنەگەیشتنە لەسەر ئەو پرسە بۆ جیاوازیی دونیابینیی هەردوو لایەن دەگەڕێتەوە: لایەنی هەرێم هەموو هەماهەنگیی و گەڕانەوەیەک بۆ بەغدا بە گەڕانەوەی حکومی ناوەندیی دەزانێت، بەغدایش دەستەبەرکردنی مافەکانی هەرێم لە ڕووی ئابورییەوە بە جیابوونەوە دەزانێت. ئەمەیش لەو کەلتورەوە سەرچاوەیگرتووە کە لایەنی کوردستانی باشوور هەمیشە گۆشکراوی کەلتوری ڕاکردن و خۆڕاپسکاندن بووە، لایەنی بەغدایش بە درێژایی دەیان و سەدان ساڵ گۆشکراوی کەلتورێکی ناوەندگەرا و سەردەستەبوون

و کۆنترۆڵکار و هەژموونگەرا بووە. بڕیاردان لە فیدراڵیەتیش خواستێکی پێگەیشتوو و باوەڕپێهێنراوی تەواوی لایەنەکانی عێراق نەبووەوە لە دۆخێکی زۆر تایبەتدا لە پاش ڕوخانی ڕژێمی بەعس و لاوازیی هێزە عێراقییەکاندا بە ناچاریی قبوڵکراوە.

٢- ئەو تێزەی کە پێیوایە واباشترە دەست لە نەوتەکەمان نەدرێت و هەڵبگیرێت بۆ پاشەڕۆژ و نەوەکانی داهاتوو لە جێی خۆیدا نییە، ئەو تێزە چەندیین ساڵە بەسەرچووە و هەر لە سەرەتایشەوە زۆرینەی دەوڵەتان هەوڵی زیادکردنی دەرهێنان و فرۆشتن و سودلێوەرگرتنی نەوتیان داوە، کە ئەوە ڕێگە دروستەکەیە بە مەرجێک لە ڕێگەی پەرەپێدانی ژێرخانی ئابوریی و بوژاندنەوەی سێکتەرە ئابورییەکاندا بەکاربهێنرێت، بۆ ئەوەی نەوەکانی ئێستا و داهاتوویش لێی سودمەندبن. لە چەند دەیەی ڕابردووەوە خەمی دەوڵەتان ئەوە نییە کە نەوتەکەیان تەواوبێت بەڵکو خەمیان ئەوەیە کە بەرلەوەی سودی لێوەربگرن سەردەمی نەوت کۆتاییبێت و ئەڵتەرناتیڤی نەوت بە تەواویی دروستببێت و نەوت بایەخی نەمێنێت. هەر وەکو ئەحمەد زەکی یەمانیی وەزیری پێشووتری نەوتی سعودیە گوتوویەتی: (سەردەمی بەردیین بەهۆی کەمبوونەوەی بەردەوە کۆتایینەهات، بە هەمان شێوە سەردەمی نەوتیش بەهۆی کەمبوونەوەی نەوتەوە کۆتاییناییەت).

٣- هیچ گرنتییەک نییە بۆ ئەوەی کە هەرێمی کوردستان ئەگەر نەوتی بەرهەمنەهێنایە ئیدی وەکو سالانی بەر لە ٢٠١٤ پشکێکی باشی بودجەی لە عێراقەوە بۆ دەهات، هەرێمەکە لە ڕێگەی بودجە و تەمویلکردنەوە بەرتەسکتر نەدەکرایەوە و ناوەندگەرایی نەدەگەڕایەوە. ڕاستە خەڵکی هەرێم بەهۆی خراپئیدارەدانی دۆسیەی نەوتەوە باجی زۆریان دا و ناڕەحەتیی زۆریان چێشت، بەڵام مسۆگەر نییە کە ئەو باجەی لە ئەنجامی بەردەوامبوونی پشتبەستنی تەواو بە بودجەی عێراق دەیاندا لە داهاتوودا زیاتر نەدەبوو، بۆیە هەوڵدان بۆ ڕاستکردنەوەی سیاسەتی بەڕێوەبردنی نەوتی هەرێم و دروستکردنی لێکتێگەیشتن لەگەڵ بەغدا بە پێداگیریی مافەکانی هەرێم و کەمکردنەوەی خەرجییەکانی بواری نەوتی هەرێم و زیادکردنی داهاتەکانی و باشبەکارهێنانی لە خزمەتی خەڵک لەوە باشترە کە هەنگاوەکە بە نەرێنیی دابنرێت و بەنەفرەتبکرێت. ئەوەیش بزانرێت کە تەواوی وڵاتانی پێشنەکەوتوو لە ساڵانی سەرەتای پرۆسەی دەرهێنان و فرۆشتنی نەوتدا دۆخیان لەگەڵ کۆمپانیاکان لە ئێستای هەرێم باشتر نەبووە، بەڵام هیچ پاساوێکی ڕەوا نییە کە بەردەوامیی بەم

جۆرە بەڕێوەبردنە خراپەی نەوت و گازی هەرێم بدرێت. گوشاری هەموان بە ئاراستەی ڕاستکردنەوەی سیاسەت و ئیدارەدانی نەوتی هەرێم بێت لەوە باشترە کە کۆی پرۆسەکە لە بنەڕەتەوە ڕەتبکرێتەوە بە مافی هەرێم نەزانرێت و وابزانرێت ئەگەر ئەوە نەکرێت ئیدی بەغدا بەبێ مەرج بودجەمان بەسەردا دەبارێنێت و بە خۆشگوزەرانیی و شکۆمەندییەوە دەژین، چونکە لە ڕاستییدا تەنها بەشێک لە پاساوی بەغدا بۆ نەناردنی بودجە پرسی نەوتە.

### ١٠- شمەکی بێگانە و شمەکی کوردستان:

حکومەتی هەرێمی کوردستان بە پێچەوانەی هەر حکومەتێکی ترەوە، گومرگ لەسەر ئەو شمەکانە دانانێت کە هاوردەی کوردستان دەکرێن. پشتیوانیی مادیی و زانستیی بەرهەمە ناوخۆییەکانی هەرێم ناکات، لەبەرئەوە بەردەوام شمەکە بێگانەکان نرخیان لە شمەکە ناوخۆییەکان هەرزانترە، خەڵکی کوردستانیش هەمیشە دەست بۆ شمەکە هەرزانەکان دەبات. بەو شێوەیە دەرگای بازاڕی کوردستان لەسەر شمەکی خۆماڵیی دادەخرێت و دەرگای بازاڕی کوردستان لەسەر شمەکی بێگانە دەکرێتەوە.

حکومەتی هەرێم پشتگیریی و هاوکاریی جوتیاری کورد ناکات، بۆ ئەوەی بەرهەمی زیادبکات و بەرهەمەکەی بە هەرزان بفرۆشێت، بۆیە ئەو کەمە بەرهەمەیش کە لە هەندێک شوێنی کوردستاندا جوتیار بەرهەمیدەهێنێت، لە لایەن بەرهەمی وڵاتانی بێگانەوە کێبڕکێی لەگەڵ دەکرێت، بەرهەمە خۆماڵییەکە لە بەرانبەر بەرهەمی بێگانەدا پاشەکشەدەکات. ئەمەیش هۆکارێکی ترە بۆ ئەوەی جوتیاری کوردستان قازانجنەکات و لە جوتیاریی و بەرهەمهێنان دووربکەوێتەوە.

نەبوونی کوالیتیی کۆنترۆڵ لە خاڵە سنوورییەکانی هەرێمدا، ڕێگەیداوە کە خۆراک و دەرمان و شمەکی خراپ و ماوەبەسەرچوو، هاوردەی هەرێمی کوردستان بکرێت. بەو شێوەیە لە لایەکەوە کڕیار زیان لەو شمەک و خواردن و خۆراکە خراپانە دەکات، لە لایەکی ترەوە خەڵک دوچاری نەخۆشیی دەبێت. دەرمانە ماوەبەسەرچووەکان نەخۆشەکان چاکناکەنەوە، ئاستی خزمەتگوزاریی تەندروستیی و چارەسەری نەخۆشیی هێندەی تر دادەبەزێت.

## ١١- بڕیارەكانی عێراق:

لەپێناو باشكردنی بژێویی خەڵكی عێراقدا، ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق چەندین بڕیاری دەركردووە، حكومەتی فیدراڵیی عێراق بڕیارەكانی پەرلەمان جێبەجێدەكات، بەڵام حكومەتی هەرێمی كوردستان ئەو بڕیارانە جێبەجێناكات. پەرلەمانی عێراق بڕیاریداوە هەر كارمەندێک خانەنشینكرا بە ٨٠٪ موچەی خانەنشینی پێبدرێت، حكومەتی هەرێم بە ٧٠٪ موچە فەرمانبەر خانەنشیندەكات.

ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق بڕیاریداوە بۆ هەر زیندانێكی سیاسیی سەردەمی ڕژێمی بەعس بڕی ٥٠٠ هەزار هاوكاریی بكرێن، حكومەتی فیدراڵیی ئەو بڕیارەی وەكو خۆی جێبەجێكردووە، بەڵام حكومەتی هەرێم چەندین بیانووی بۆ جێبەجێنەكردنی ئەو بڕیارە دروستكردووە. حكومەتی عێراقی فیدراڵ بڕیاریداوە بڕی پێنج ملیۆن دیناری عێراقیی بە قەرز بە هەر كارمەندێک بدات، كە ماوەی ساڵێک زیاتر لە فەرمانگەكاندا خزمەتی هەبێت، حكومەتی هەرێمی كوردستان ئەو بڕیارە نادات.

لە دروستبوونی حكومەتی نوێی عێراقەوە، نرخی یەک لیتر بەنزین لە بەنزیخانەكانی سەر بە عێراقی فیدراڵییدا لە خوار ٥٠٠ دینارە، لە هەرێمی كوردستان نرخی بەنزین نزیكەی دوو هێندەیە.

خۆدزینەوەی حكومەتی هەرێمی كوردستان لە جێبەجێكردنی ئەو بڕیارانە كە پەیوەندیی بە خۆشگوزەرانیی خەڵكی كوردستانەوە هەیە، كێشە و ناكۆكیی لە نێوان خەڵک و حكومەتی هەرێمدا دروستدەكات، گوزەرانی خەڵكی كوردستان پێشناخات، ئاستەنگیی بۆ پێشخستنی ئابوریی كوردستان دروستدەكات*٢٣.

## ١٢- سەیرانگا و گرد و دارستان:

لە سەردەمی دەسەڵاتی حكومەتەكانی عێراقدا، لە هەرێمی كوردستان چەندین سەیرانگای جوان هەبوون، چەندین شوێنی كوردستان بە دارستان سەوزكرابوون. دوای ڕاپەڕیین سەیرانگاكان گرنگییەكی وەهایان پێنەدرا، بەهۆی بارودۆخی سیاسیی و ئابورۆی نالەباریی خەڵكی عێراقیشەوە، كەمتر لە جاران گەشتیارانی ناوەڕاست و خوارووی عێراق سەردانی كوردستان دەكەن. كە شەڕی براكوژیی نوێبووەوە،

سەیرانگاکان هەم بەر وێرانکاریی کەوتن، هەم فەرامۆشکران. بەشێک لە شوێنە گەشتیارییەکانیش، وەکو سەلاحەدین و سەری ڕەش و دوکان، لە لایەن حیزبە دەسەڵاتدارەکانەوە دەستیانبەسەرداگیرا.

هەرچی گرد و دارستانی ناو شار و دەوروبەری سلێمانیی هەیە، لە لایەن حیزب و بەرپرسە حیزبییە دەسەڵاتدارەکانەوە دەستیبەسەرداگیراوە، وەکو بارەگای حیزب و گۆڕستان و پڕۆژەی ئابوریی بەکاریانهێنا. سەیرانگا و گرد و دارستانەکان سامانی گشتیین، دەبێت حکومەت بۆ سودی گشتیی وەبەرهێنانیان تێدابکات، یان بیانفرۆشێت و بۆ پڕۆژەی تر بەکاریانبهێنێت، یان وەکو جوانیی ژینگەی کوردستان بیانپارێزێت و گەشەیانپێبدات. حکومەت و پەرلەمان و دەسەڵاتی دادوەریی هەرێم، بەرانبەر بەو دەستدرێژییانەی حیزب بۆ سەر مۆڵکی گشتیی بێدەنگیی هەڵبژاردووە، لێرەیشەوە جارێکی تر ئابوریی هەرێمی کوردستان لە لایەن حیزبەوە تاڵاندەکرێت.

## ١٣- فەرمانبەر و موچەخۆر:

ژمارەی دانیشتوانی هەرێمی کوردستان نزیکەی شەش ملیۆن کەس دەبێت، ملیۆنێک زیاتر موچەخۆری هەیە. ئەم ڕێژە زۆرەی موچەخۆران لە چاو ژمارەی دانیشتواندا لە ستانداره جیهانییەکانەوە دوورە. کێشەی بۆ فەرمانبەران دروستکردووە، حیزبەکان بە شێوەی جیاواز لەسەر حسابی فەرمانبەران ڕێژەی موچەخۆران زیاددەکەن. ژمارەیەک لەو موچەخورانە وەهمیین. واتە بوونیان نییە. ئەو بەرپرسەی ناوەکەی نوسیوە، خۆی موچەکە وەردەگرێت. ژمارەیەک لەو موچەخورانە کادری حیزبەکانن، ئیشوکاری حیزب دەکەن، فەرمانبەر نین، موچەیش لە حکومەت وەردەگرن. ژمارەیەک لەو موچەخورانە لە ژیانیاندا فەرمانبەر نەبوون، لەبەرئەوەی دۆست و لایەنگری حیزبێکن، موچەیان بۆ بڕیونەتەوە. ژمارەیەکی تر لە موچەخۆرەکان دوو موچە و سێ موچەی حکومەتی هەرێمیان هەیە، هەیانە لە حکومەتی هەرێم موچەی هەیە، لە حکومەتی عێراقیش موچەی هەیە، موچەخۆری هەرێم هەیە خەڵکی پارچەکانی تری کوردستانە.

یەکێک لە کێشەکانی هەرێم و بەغدا ژمارەی موچەخۆرانە، بەغدا تەنها حسابی فەرمنابەرانی هەرێم دەکات، کە ساڵی ٢٠١٣، ٦٨٢ کەس بوون، حکومەتی هەرێمیش حسابی ژمارەی موچەخۆران دەکات، کە فەرمانبەر و موچەخۆرانی تریش دەگرێتەوە. لە

ماوەی حەوت ساڵی ڕابردوودا ژمارەی فەرمانبەرانی هەرێم زۆر بووە، گەیشتووەتە ٧٥٠ هەزار کەس، بەڵام حکومەتی عێراق هەر حسابی ژمارەی فەرمانبەرانی ساڵی ٢٠١٣ لەگەڵ حکومەتی هەرێم دەکات. ئەگەر ئەو موچەخۆرانەی تریش بخرێنە سەر کۆی ژمارەی فەرمانبەران، موچەخۆرانی هەرێم خۆی لە ١٢٠٠٠٠٠ یەک ملیۆن و دووسەد هەزار دەدات.

ئەو کێشەیەی نێوان ژمارەی فەرمانبەران و ژمارەی موچەخۆران ململانێیەکی لە نێوان حکومەتی فیدراڵیی و حکومەتی هەرێمدا دروستکردووە، حکومەتی عێراق دەیەوێت بە تەنها موچەی فەرمانبەران بۆ هەرێم خەرجبکات، حکومەتی هەرێمیش هەوڵدەدات موچەی هەموو موچەخۆرانی هەرێم لە بەغدا وەربگرێت. کاتێک حکومەتی فیدراڵیی تەنها موچەی فەرمانبەران دەنێرێت، دەبێت حکومەتی هەرێم لەسەر حسابی فەرمانبەرانی ڕاستەقینە موچەی موچەخۆرەکانی تریش بدات. ئەم پرۆسەیە بە کەمکردنەوەی موچەی فەرمانبەران دەبێت، بۆیە بڕیارەکانی پاشەکەوتی موچە و لێبڕینی موچەی موچەخۆرانی هەرێم لە لایەن حکومەتی هەرێمەوە دەستپێکرد.

## ١٤- پاشەکەوت و لێبڕینی موچە:

لە ٣/ ٢/ ٢٠١٦ حکومەتی هەرێم بڕیاری ٦٤ی دەربارەی پاشەکەوتی موچە دەرکرد، بەگوێرەی بڕیارەکە بڕێک لە موچەی فەرمانبەرانی هەرێم لە لای حکومەت گلدەدرێتەوە، بۆیان دادەنرێت و لە دواڕۆژدا بۆیان دەگێڕدرێتەوە. ناوەڕۆکی ئەم بڕیارە کەمکردنەوەی موچەی فەرمانبەران بوو، بۆ ئەوەی حکومەت بتوانێت مانگانە موچەی موچەخۆران بدات. بۆ نمونە ٥٠٪ موچەی پلەباڵاکانی پاشەکەوتکرد. بەو بڕیارەیش حکومەتی هەرێم هەر نەیتوانی مانگانە موچەی موچەخۆرن بدات.

کابینەی نوێی حکومەتی هەرێم بە سەرۆکایەتیی مەسرور بەرزانیی، ساڵی ٢٠٢٠ ڕایگەیاند کە حکومەتی هەرێم بڕی نۆ ملیار دۆلار قەرزاری موچەی فەرمانبەران و خانەنشینانی هەرێمە. کابینەی نوێەمی حکومەتی هەرێم لە هاوینی ساڵی ٢٠٢٠دا پاشەکەوتی موچەی هەڵوەشاندەوە، لێبڕینی موچەی لە شوێنیدا دانا. ٢١٪ موچەی فەرمانبەرانی کەمکردەوە و ٥٠٪ موچەی پلەباڵاکانیشی کەمکردەوە.

لە لایەکی تـرەوە کابینەی نوێی حکومەتی هەرێم باجی لەسەر پڕۆژە ئابورییە ناوخۆییەکانی هەرێم دانا. باجی زیادکرد و کرێی ئاو و کارەبا و خزمەتگوزاریی تەندروستیی زیادکرد، بۆ ئەوەی داهاتی حکومەت زۆربکرێت و فریابکەویت موچەی موچەخۆرانی بدات. ئەم هەنگاوەیش هێندەی تر بارگرانیی لەسەر خەڵکی کوردستان دروستکرد.

پاشەکەوتی موچە و لێبڕینی موچە بەهۆی ناکۆکیی نێوان حکومەتی هەرێمی کوردستان و حکومەتی عێراقی فیدراڵییەوە دروستبووە، لەبەرئەوەی حکومەتی هەرێم بەبێ ئاگاداریی و ڕەزامەندیی حکومەتی عێراق، گرێبەستی لەگەڵ کۆمپانیا بیانییەکاندا بۆ دەرهێنان و گواستنەوەی نەوت بەست. حکومەتی عێراق ساڵی ٢٠١٤ بودجەی هەرێمی بڕی. حکومەتی عێراق دەڵێت فرۆشی دەرهێنان و ناردنەدەرەوەی نەوتی هەرێم بەشی بودجەی هەرێم دەکات، مادام هەرێم پارەی فرۆشتنی نەوت ڕادەستی وەزارەتی دارایی عێراق ناکات، عێراقیش بودجە نانێرێت.

ئەم بۆچوون و هەڵوێستەی دەوڵەتی عێراق، بە لای زۆرینەی خەڵکی هەرێمەوە ڕاستە، ئۆپۆزسیۆن و خەڵک دەڵێن داهاتی هەرێم لە فرۆشتنی نەوت و گومرگ و باجی ناوخۆیی، بەشی موچەی فەرمانبەران و موچەخۆرانی تریش دەکات و دەیشمێنێتەوە. حکومەتی هەرێم و حیزبە دەسەڵاتدارەکان دەڵێن: وانییە، هۆکاری پاشەکەوت و لێبڕینی موچە، بەهۆی بڕینی بودجەی هەرێمەوە بووە لە لایەن حکومەتی عێراقەوە. دواتر قەیرانی دابەزینی نرخی نەوت و کۆرۆنای هاتەسەر و کێشەکە قووڵتر بووەوە. ناتوانین موچە وەکو جاران دابەشبکەین. خەڵکیش دەڵێت کاریگەریی کۆرۆنا زۆر کەمبووەتەوە، نرخی بەرمیلێک نەوت ٧٠ دۆلاری تێپەڕکرد، نرخی دیناری عێراقیی دابەزی، کەچی حکومەتی هەرێم ئامادە نییە موچەی تەواو بدات. لە ساڵانی ڕابردوودا هەرێم و عێراق چەندین جار لەسەر چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە دانیشتوون و گفتوگۆیانکردووە. لە یاسای بودجەی ساڵانی ٢٠١٩ بە دواوە بڕگەکانی تایبەت بە بودجەی هەرێمەوە ئاماژەی بەوە کردووە کە حکومەتی فیدراڵیی بەشە بودجەی هەرێمی دەنێرێت بەو مەرجەی حکومەتی هەرێم مانگانە ٢٥٠٠٠٠ دووسەدوو پەنجا هەزار بەرمیل نەوت لە ڕێگەی سۆمۆوە ڕادەستی عێراق بکات. لەو کاتەوە حکومەتی هەرێم یەک بەرمیل نەوتیشی ڕادەستی سۆمۆ نەکردووە. ئیتر کێشەی بودجەی هەرێم و موچەی فەرمانبەران بە چارەسەرنەکراوی ماوەتەوە. بۆچی حکومەتی هەرێم هێندە لەسەر بڕیاری خۆی سوورە و نەوت

ڕادەستی بەغدا ناکات و کێشەی موچەی فەرمنبەران چارەسەرناکات؟ هۆکارەکەی چییە؟

ئەو بڕگانەی دەستووری عێراق کە پەیوەندیی بە سامانی نەوت و غازی هەرێم و عێراقەوە هەیە، کۆنکرێتیی نین، هەریەکە و بەگوێرەی بەرژەوەندیی خۆی لێکدانەوەی بۆ دەکات و بە لای خۆیدا ڕایدەکێشێت. بڕگەی ١١١ی دەستووری عێراق دەڵێت: (نەوت و گاز موڵکی هەموو گەلی عێراقە لە هەموو هەرێم و پارێزگاکاندا). لەسەر بنەمای ئەم بڕگەیە دەسەڵاتی هەرێم بە مافی خۆی دەزانێت نەوتی هەرێم دەربهێنێت و بیفرۆشێت و لە گیرفانی خۆی و دۆستەکانی توندیبکات. حکومەتی عێراقیش بە پێچەوانەوە لێکدانەوە بۆ مادەی ١١١ی دەستووری عێراق دەکات و دەڵێت: (نەوت و گازی هەرێم موڵکی هەموو خەڵکی عێراقە، دەبێت بڕێک لەو نەوتەی هەرێم ڕادەستی حکومەتی فیدراڵیی بکرێت، بۆ ئەوەی بەشی ناوچەکانی تری خەڵکی عێراقی لێبدرێت).

مادەی ١١٢ باس لە ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی ئەو کێڵگە نەوتییانە دەکات کە پێش ساڵی ٢٠٠٥ هەبوون، باس لە بەڕێوەبردنی ئەو کێڵگانە ناکات دوای ئەو ڕێککەوتە حکومەتی هەرێم لەگەڵ کۆمپانیاکاندا نەوت و غازیان لێدەردەهێنن و هاوردەیدەکەن، حکومەتی هەرێم ئەمەی کردووەتە بیانوو و دەڵێت ئەو ڕێککەوتنانەی دوای ئەو ڕێککەوتە لەگەڵ کۆمپانیاکان ئەنجامانداوە ئەو بڕگەیەی دەستوور نایگرێتەوە. لێرەدا هەرێم سەرکێشییدەکات، دەسەڵاتی هەرێمە فیدراڵەکان تێپەڕدەکات.

لە هەمان کاتدا بڕگەی ١١٢ی دەستووری عێراق باس لە دەرکردنی یاسای نەوت و غاز دەکات، وا ١٦ ساڵ بەسەر دەستووردا تێپەڕی یاساکە دەرنەچوو. کێ بەرپرسیارە لە دەرنەچوونی یاسای نەوت و گاز؟ ئایا یاسای نەوت و گاز کێشەی گەڕان و بەرهەمهێنان و هەناردەکردنی نەوت و گازی هەرێم چارەسەردەکات؟

قەیرانی نەوت و گاز لە لایەن دەسەڵاتی هەرێمەوە دروستکراوە، بەو هۆیەوە موچەی هەرێم بڕدرا، لە سەرەتاوە خەڵکی کوردستان زیانی لێدەکرد، بەڵام لە ڕووی سیاسییشەوە هەرێمی کوردستانی دوچاری قەیرانێکی گەورە کردووە، لە ئاستی ناوخۆیی کوردستان و لە ئاستی عێراقدا مەترسیی هەڵوەشانەوەی هەرێم لەئارادا هەیە، کەچی حکومەتی هەرێم لەسەر سیاسەتی سەربەخۆی سەرنەکەوتووی ئابوریی خۆی بەردەوامە.

سیاسەتی پاشەکەوت و لێبڕینی موچە، خەڵکی کوردستانی برسییکرد، ئابوریی کوردستانی پاشەکشەپێکرد، سیاسەتی سەرنەکەوتووی ئابوریی حکومەتی هەرێمی ئاشکراکرد. بەرانبەر بەو سیاسەتە سەرنەکەوتوو و برسییکەرە، خەڵکی کوردستان نارەزایی جۆراوجۆری پیشاندا، چەندین خۆپیشاندان و مانگرتنی توێژە جیاجیاکانی خەڵکی لێکەوتەوە، لە خۆپیشاندانەکاندا سەدان چالاکوان شەهید و برینداربوون، سەدان کەس دەستگیرکران.

هەندێک لە لایەنە سیاسییە ڕکابەرەکانی پارتیی و کۆمەڵێک چالاکیی سیاسیی، لە دژی حیزبە دەسەڵاتدارە برسییکەرەکانی هەرێم داوای سیستەمی لامەرکەزیی بۆ هەرێم دەکەن، هەندێک لە کەسایەتیی و ڕۆشنبیری کوردستان داوای هەرێمی سەربەخۆی سلێمانیی و گەرمیان و هەڵەبجە و ڕاپەڕیین دەکەن، بۆ ئەوەی لە داوی برسییکردن ڕزگاریانبێت. بڕیاری دادگای فیدراڵیی عیراق کە لە ڕۆژی ١٥-٢-٢٠٢٢ دەرچوو، سیاسەتی سەربەخۆیی ئابوریی هەرێمی بە نادەستووریی دانا.

### ١٥- تورکیا و ئابوریی هەرێم:

تورکیا لە ڕووی سەرچاوەی وزەوە وڵاتێکی هەژارە، سودی لە شێوازی حوکمڕانیی هەرێم وەرگرتووە بۆ ئەوەی وزەی هەرزان و خۆڕایی دەستبکەوێت. ڕێککەوتنێکی نهێنیی لەگەڵ پەرپرسانی باڵای هەرێم بەستووە هەتا ٥٠ ساڵ نەوتی هەرێم لە ڕێگەی بەندەری جیهانیی تورکیاوە هەناردەی دەرەوە بکرێت.

تورکیا لەو ڕێککەوتنە سودی وەرگرتووە، هەرێمی کوردستان لەو ڕێککەوتنە زیانیکردووە، خەڵکی کوردستان و پەرلەمانی کوردستان و زۆربەی حیزبەکانی باشووری کوردستان، ئاگاداری ئەو ڕێککەوتنە نین. دەوڵەتی عێراق و حیزبە سیاسییەکانی عێراق ئاگاداری ئەو ڕێککەوتنە نین، پەرچەکرداری دەوڵەتی عێراق بەرانبەر بەو ڕێککەوتنە، بڕینی موچەی فەرمانبەرانی هەرێم بوو، بەو شێوەیە تورکیا زیانێکی ئابوریی بە هەرێمی کوردستان گەیاند.

بە بیانووی گەریلاکانی (پ. ک. ک) لە ناوچە شاخاوییەکانی کوردستاندا، چل ساڵ زیاترە تورکیا هێرشی سەربازیی بۆ سەر باشووری کوردستان دەکات، ڕەز

و باخ و گوند و سەر و ماڵی کورد دەسوتێنێت، هێرشەکانی ساڵی ٢٠٢١ سوتاندنی دارستانەکان و بڕینەوەی دارەکانی کوردستانیشی گرتەوە. بەو شێوەیە تورکیا جۆرێکی تر زیانی بە ئابوریی کوردستان دەگەیەنێت.

ئەو بازرگانییەی لە نێوان تورکیا و هەرێمی کوردستاندایە، داگیرکاریی ئابورییە، بازرگانییەکی هاوسەنگ نییە، هەرچی کەلەپەل و بەرهەمی ناپێویستی تورکیایە لە بازاڕەکانی کوردستان ساخدەکرێتەوە. لەو ڕووەشەوە تورکیا ئاستەنگیی جدیی بۆ بیناکردنەوەی ژێرخانی ئابوریی کوردستان دروستدەکات، ئەگەر هەرێمی کوردستان بیەوێت ژێرخانی ئابوریی خۆی ڕاستبکاتەوە، بەرەو سەربەخۆیی ئابوریی بڕوات، دەبێت چاو بە پەیوندییە ئابورییەکانی لەگەڵ تورکیا بخشێنێتەوە و ڕاستیانبکاتەوە.

## لێکەوتەکانی سیاسەتی ئابوریی هەرێم

لە ئەنجامی ئەو سیاسەتە ئابورییە سەرنەکەوتووەی ٣٠ ساڵی ڕابردووی دەسەڵاتی هەرێمەوە، هەرێمی کوردستان دوچاری چەندین کێشەی ئابوریی و سیاسیی و کۆمەڵایەتیی و کەلتوریی هاتووە، سەروەریی و ئاسایشی نەتەوەیی هەرێمی کوردستان لە دارمان نزیکبووەتەوە.

١- لە ڕووی ئابورییەوە، لەبەرئەوەی لە هەرێمی کوردستاندا پێویستییە سەرەتاییەکانی خەڵک بەرهەمناهێنرێن، بۆ دابینکردنی ئەو پێویستییانە، بازاڕەکانی هەرێمی کوردستان بە بەرهەم و کەلوپەلی کۆمپانیاکانی وڵاتانی دراوسێ پڕکراون. بەرهەمی تورکیی و ئێرانیی و سوریی و چینیی لە تەماتەوە هەتا خەیار، لە فانیلەوە هەتا جامانە و جلی کوردیی، هەرێمی کوردستانی داپۆشیوە. بەرهەمی خۆماڵیی لە بازاڕەکانی هەرێمدا بە کەمیی دەبینرێت.

لەبەرئەوەی حکومەتی هەرێم هەتا ماوەیەک لە سنوورەکاندا بنکەی کوالێتیی کۆنترۆڵی شمەکی دانەنابوو، بازاڕی کوردستان شوێنی ساغکردنەوەی خواردن و جلوبەرگ و شمەکە خراپ و بەسەرچووەکانی ئەو کۆمپانیانە بوو، ڕۆژانە دەزگاکانی چاودێریی خۆراک دەستیان بەسەر چەندین تەن شمەکی بەسەرچوودا دەگرت و لەناویاندەبرد. بەو شێوەیە خەڵکی هەرێمی کوردستان بووە بەرخۆرێکی بەرهەمە

خراپ و بەسەرچووەکانی کۆمپانیاکانی وڵاتانی بێگانە. زانیارییەکان پیشانیدەدەن کە بەرهەمی دانەوێڵەی کوردستان ٢٠٪ پێویستییەکانی خەڵکی کوردستان دابیناکات. ٨٠٪ دانەوێڵەی پێویست لە دەرەوەی کوردستان دابیندەکرێت. ٩٥٪ گۆشتی سپیی هەرێمی کوردستان لە درەوەی وڵاتەوە دابیندەکرێت*٢٤.

بەهۆی دەستبەسەرداگرتنی داهاتی هەرێم لە لایەن سیاسەتمەدارانەوە، توێژێکی سیاسیی-بازرگانیی سەرمایەداریی پەیدابووە. ئەم توێژە بە عەقڵی بازرگانیی و لەسەر بنەمای گەشەکردنی ئابوریی وڵات پێنەگەیشتووە، بەڵکو لە ڕێگەی دەستبەسەرداگرتنی سامانی وڵات و پەیوەندیی سیاسیی لەگەڵ وڵاتانی تردا پێگەیشت. ئەم توێژە سیاسییە-ئابوورییە کاتێک لە ڕێگەی کۆمپانیاوە پرۆژەیەکی ئابوریی دەگرێتەدەست، کە بە پێگە سیاسییەکەی بەدەستیدەهێنێت، لەژێر سێبەری دەسەڵاتیشیدا پرۆژەکەی لەسەر بنەمای زانستیی تەواوناکات، پرۆژەکە بە کوالیتیی تەواو و لە کاتی خۆیدا تەواوناکات. دامودەزگا چاودێرەکانی هەرێم ناتوانن لەگەڵ بازرگانی سیاسییدا حەق و حساب بکەن. پرۆژەکە بە چەندایەتیی و چۆنایەتیی خراپەوە وەردەگرن. ئەو جۆرە پرۆژانەیش وەکو پێویست خزمەتی خەڵکیان پێنەکراوە، بۆیە هێندەی تر سامانی وڵات بۆ تازەکردنەوە و پاراستنی پرۆژەکە دەخرێتەوەکار. باشترین نمونە پرۆژەی ڕێگەوبان و قیرتاوکردنی شەقام و ڕێگەی ناو شارەکانی کوردستان و نێوان شارەکانی کوردستانە، کە پاش تەواوبوونی پرۆژەکە لە ماوەیەکی کورتدا قیری شەقام و ڕێگەکان هەڵدەکەنرێن و تاسەیان تێدەکەوێت، جارێکی تر پارە بۆ نوێکردنەوە چاککردنەوەیان تەرخاندەکرێتەوە.

ئەو سەرمایەیەی کە دەسەڵاتدارە گەورەکان دەستیاندەکەوێت، بۆ ئەوەی خۆیان لە ڕەخنەی خەڵک بپارێزن و لەکەدارنەبن لە ناو خۆی کوردستاندا وەبەرهێنان ناکەن، پارەکەیان لە کوردستان ناخەنەگەڕ، کشتوکاڵ و ئاودێریی و گەشتوگوزار و پیشەسازیی هەرێمی پێنابوژێننەوە. لە بانکەکانی ئەوروپا مۆڵیدەدەن و پارەی زۆرتری پێکۆدەکەنەوە.

٣- دەسەڵاتداران بە تەنها سامانی سەرزەمین و ژێرزەمینی کوردستانیان بۆ خۆیان قۆرخنەکردووە، بازاڕ و چالاکیی ئابورییشیان قورخکردووە. بێجگە لەو سامانە زۆر و زەبەندەی بودجە کە حیزبەکانی هەرێم دەستیبەسەردادەگرن و بەگوێرەی

بەرژەوەندیی خۆیان خەرجیدەکەن، هەرچی چالاکیی ئابوریی هەرێمی کوردستانیش هەیە لە رێگەی دەزگا ئابورییەکانی حیزب و دەزگاکانی بەرپرسانەوە قۆرخکراوە و رێگەنادەن سەرمایەداری کوردستان بازرگانییبکات. بنەماڵە دەسەڵاتدارەکان لە دەرەوەی وڵات، خەریکی بازرگانیی گەورەن. بەرپرسەکانی تر لە ناوخۆی کوردستان بازاڕی هێنان و بردنی جگەرە و مەشروب و دەرمان و خۆراکیان قورخکردووە.

کەسێک دۆست و لایەنگریی خۆیان نەبێت و پشکیان لە چالاکییەکەیدا نەبێت، رێگەنادەن لە بازرگانیی و بەرهەمهێناندا بەشدارییبکات. لە سنووری پارێزگای سلێمانیی و ناوچەی سەوزدا ئیدارەی گشتیی یەکێتیی و کۆمپانیاکانی نۆکان و قەیوان، چالاکیی ئابوریی سنووری دەسەلاتی یەکێتییان قۆرخکردووە. لە سنووری پارێزگای هەولێر و دهۆکدا دەزگا ئابورییەکانی سەر بە پارتیی وەکو کار و ستێرک هەمان رۆڵی ئیدارەی گشتیی یەکێتیی دەبینن. لە کاتی سەردانی وەفدی حکومەتی هەرێمی کوردستاندا بۆ ئەمریکا، نێچیرڤان بەرزانیی لەگەڵ کۆمپانیایەکی ئەمریکییدا بۆندێکی بە بڕی ٦ ملیار دۆلار بۆ بەرهەمهێنانی کارەبا ئیمزاکرد. ئەمە لە کاتێکدایە کە نێچیرڤان بەرزانیی نە سەرۆکی وەزیرانە، نە وەزیری بازرگانیی حکومەتی هەرێمە، نە بە فەرمیی بازرگانە.

٤- لە وڵاتانی تردا موچە بۆ ئەو کەسانەیە کە کاردەکەن، لە هەرێمی کوردستاندا موچە بۆ ئەو کەسانە بڕایەوە کە ئەندامی حیزب بوون. لە وڵاتانی تردا ئەندامی حیزب ئابونە بە حیزبەکەی دەدات، لای خۆمان حکومەت پارە بە ئەندامی حیزب دەدات. ئەمە نەک هەر بەهەدەردانی سامانی گشتییە، لە هەمان کاتدا تەمەڵکردن و مشەخۆرکردنی کۆمەڵگەیە. جوتیار تاسەی کشتوکاڵ و ئاودێریی و ئاژەڵداریی ناکات، لە بەرهەمهێنان دووردەکەوێتەوە. کرێکار تاسەی کارناکات و ئەندازیار پیشەکەی خۆی لەبیردەچێتەوە و توانای داهێنانی نامێنێت. لەبریی ئەوەی ئەم توێژە بەرهەمهێنەرانە سەرقاڵی کار و بەرهەمهێنان بن، سەرقاڵی حیزبایەتیین. لە رێگەی داکۆکییکردنی کوێرانە لە حیزبە دەسەڵاتدارەکان بژێویی خۆیان دابیندەکەن. بەو شێوەیە سامانی مرۆیی بەرهەمهێنانی هەرێمی کوردستان لە لایەن دەسەڵاتی باشووری کوردستانەوە لە کار دووردەخرێنەوە و لە بەرهەمهێناندا بەشدارییناکەن، کاری سەرەکییان پاراستنی ئەو دەسەڵاتەیە کە ئەو دیاردەیەی دروستکردووە.

## ٥- کۆچکردنی گەنجان:

یەکێک لە هۆکارە سەرەکییەکانی کۆچکردنی گەنجانی هەرێمی کوردستان، هەژاریی و بێکارییە، بڕی ئەو مانگانەیەی گەنجێک لە ڕێگەی کاری ڕۆژانە و فەرمانبەرییەوە وەریدەگرێت بەشی بژێویی هەفتەیەکی ناکات. لەولایشەوە توێژێکی خۆشگوزەرانی دەسەڵاتدار دەبینێت کە خاوەنی هەموو پێویستییەکانی ژیانی سەردەمە و پارە تەخشان و پەخشان دەکات، هەرێمی کوردستانی لەبەرچاودەکەوێت و کوردستان بەجێدەهێڵێت*٢٥.

کۆچکردنی گەنجان بۆشایی هێزی کاری لە هەرێمی کوردستاندا دروستکردووە، بە زەحمەت شوێنەکەی پڕدەکرێتەوە. یەکێک لە هەوڵەکانی حکومەتی هەرێم بۆ پڕکردنەوەی شوێنی ئەو گەنجانە، هێنانی کرێکاری بیانییە لە وڵاتانی ئاسیا و ئەفریقاوە. ئەم کرێکارانەیش لەبریی کرێی کارەکانیان، ساڵانە سەرمایەیەکی هەرێمی کوردستان دەبەن و ڕەوانەی وڵاتەکانی خۆیانی دەکەن، لەوێیشەوە زیان بە ئابوریی هەرێمی کوردستان دەگەیەنن.

## ٦. چۆڵکردنی گوندەکان:

لە دوای ڕاپەڕیین ڕێکخراوە بیانییەکان پڕۆژەی خزمەتگوزارییان بۆ زۆرێک لە گوندەکانی هەرێمی کوردستان دروستکرد، هاوکاریی ئەو جوتیارانەیان دەکرد کە لە گوندەکانی خۆیان نیشتەجێدەبوونەوە. شەڕی براکوژیی ئاوەدانکردنەوەی گوندەکانی ڕاگرت، بەڵام بەهۆی ئەو سیاسەتە ئابورییەوە کە هەردوو حیزبە دەسەڵاتدارەکە لە کوردستاندا پەیڕەویدەکەن، کشتوکاڵ و ئاودێریی فەرامۆشکرا، خزمەتگوزاریی تەندروستیی و خوێندنگە و ئاو و کارەبا بۆ گوندەکان دابیننەکرا، زۆرێک لە خەڵکی گوندەکان بەرەو شار دەڕۆن، گوندەکان بەرەو چۆڵبوون دەچن. بەو شێوەیە جارێکی تر جوتیار و زەوی لە یەکتر دووردەکەونەوە و بەرهەمهێنان پەکیدەکەوێتەوە.

کۆی مووچە نەدراو پاشکەوتکراوەکانی هەر شەش ساڵەکە
بەختیار ابراهیم رسول /سەرنەشکەوتان 2021 

| | 2015 | 2016 | 2017 | 2018 | 2020 | 2021 |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 | | چ.مووچە | چ.مووچە | بەپاشەکەوت | | 21%بڕین |
| 2 | | چ.مووچە | چ.مووچە | بەپاشەکەوت | 21%بڕین | 21%بڕین |
| 3 | | چ.مووچە | چ.مووچە | بەپاشەکەوت | 21%بڕین | 21%بڕین |
| 4 | | چ.مووچە | چ.مووچە | بەپاشەکەوت | نەدرا | 21%بڕین |
| 5 | | چ.مووچە | چ.مووچە | بەپاشەکەوت | نەدرا | 21%بڕین |
| 6 | | چ.مووچە | چ.مووچە | بەپاشەکەوت | نەدرا | 21%بڕین |
| 7 | | چ.مووچە | چ.مووچە | بەپاشەکەوت | نەدرا | |
| 8 | | چ.مووچە | چ.مووچە | بەپاشەکەوت | نەدرا | |
| 9 | نەدرا | چ.مووچە | چ.مووچە | بەپاشەکەوت | 18%بڕین | |
| 10 | نەدرا | چ.مووچە | چ.مووچە | بەپاشەکەوت | 21%بڕین | |
| 11 | نەدرا | چ.مووچە | چ.مووچە | بەپاشەکەوت | نەدرا | |
| 12 | نەدرا | چ.مووچە | نەدرا | | نەدرا | |
| 10 مووچە [illegible] | | 12 مووچەی تەواوەتی نەدرا | | 34 مووچەش بەپاشەکەوتەوە [illegible] درا [illegible] | | |

## هەوڵی بوژاندنەوەی ئابووریی هەرێم

لەساڵی ١٩٩٤ هەتا ساڵی ١٩٩٨ پارتیی و یەکێتیی خولی سێیەمی شەڕی براکوژییان ئەنجامدا. نەتەوە یەکگرتووەکان ئابڵوقەی ئابووریی لەسەر عێراق دانا، عێراق ئابڵوقەی ئابووریی لەسەر کوردستان دانا. حیزبە دەسەڵاتدارە بەشەڕهاتووەکان ئابڵوقەی ئابوورییان لەسەر سنووری دەسەڵاتی ڕکابەرەکەیان دانا. لەبەر ئەو هۆکارانە بژێویی خەڵکی کوردستان بەرەو خراپترین ئاست ڕۆیشت.

بۆ شلکردنی ئابڵوقەی ئابووریی لەسەر عێراق، ساڵی ١٩٩٥ نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیاری ١٩٨٦ی نەوت بەرانبەر بە خۆراکی دەرکرد. بەگوێرەی ئەو بڕیارە لەژێر چاودێریی نەتەوە یەکگرتووەکاندا حکومەتی سەدام مانگانە بڕێک نەوتی دەفرۆشت، پارەی ئەو نەوتە لەژێر چاودێریی نەتەوە یەکگرتووەکاندا دابەشدەکرا، بەشی کەمی بژێوییەکانی خەڵکی عێراقی پێدابیندەکرا. لەو برە پارەیە ١٣٪ بۆ هەرێمی کوردستان ڕەوانەدەکرا. ئەم بڕیارە بڕێک گوزەرانی خەڵکی کوردستانی باشکرد.

لە ساڵی ١٩٩٨دا بە ناوبژیوانیی ئەمریکا ڕێککەوتنی واشنتۆن لە نێوان پارتیی و یەکێتییدا ڕاگەیەنرا، بەو ڕێککەوتنە شەڕی براکوژیی لە نێوان پارتیی و یەکێتییدا ڕاگیرا. ئەوەش ئابڵوقەی ناوخۆی هەرێمی لەسەر ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی پارتیی و یەکێتیی هەڵگرت، کەمێکی تر باری گوزەرانی خەڵکی کوردستان باشبوو.

بە ڕوخانی ڕژێمی سەدام لە بەهاری ٢٠٠٣دا ئابڵوقەی ئابووریی سەر عێراق بە تەواویی هەڵگیرا، بودجەی هەرێمی کوردستان بۆ ١٧٪ بودجەی عێراق زیادکرا. دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام، بازاڕەکانی عێراق و هەرێمی کوردستان و وڵاتانی ناوچەکە و جیهان بەسەر یەکدا کرانەوە، چالاکیی بازرگانیی دەستیپێکرد و بازاڕی هەرێم بوژایەوە. دوای کۆتاییهاتنی شەڕی براکوژیی و ڕوخانی ڕژێمی سەدام، ئاسایشی هەرێمی کوردستان سەقامگیربوو، کەرتی گەشتوگوزار بوژایەوە، بەڵام

لەبەرئەوەی ئاوەدانکردنەوەی شوێنە گەشتوگوزارییەکانی هەرێمی کوردستان لە لایەن حکومەتی هەرێمەوە گرنگیپێنەدراوە، بوژانەوەی گەشتوگوزار لە ئاستی پێویستدا نییە.

ساڵی ۲۰۰۹ بزوتنەوەی گۆڕان دروستبوو، خۆی وەکو ئۆپۆزسیۆنی دەسەڵات ڕاگەیاند، گوشاری لەسەر دەسەڵات دانا، بۆ ئەوەی چاکسازییبکات، سامانی بەدەستهاتووی هەرێمی ئاشکراکرد، ئەو بڕە پارەیەی ئاشکراکرد کە حیزبە دەسەڵاتدارەکان لە بودجەی هەرێم دەیبەن. لە پەرلەمانی هەرێمدا ئۆپۆزسیۆن ڕۆڵی ڕاستەوخۆی هەبوو، کە حکومەتی هەرێمی کوردستان بۆ یەکەم جار لە کابینەی شەشدا بودجەی هەرێمی ئاشکراکرد. ٣٠٪ بودجەکەی بۆ بەرهەمهێنان تەرخانکرد. دوای کز و لاوازبوونی ئۆپۆزسیۆن و خۆڕادەستکردنی بزوتنەوەی گۆڕان بە دەسەڵات، لێڵیی لە بودجەی هەرێمدا دروستبووەوە. بڕیاری بەرهەمهێنان وەکو خۆی جێبەجێنەکرا. یەکێک لە بڕیارەکانی تری حکومەتی هەرێم کە سودی بۆ گەشەپێدانی ئابوریی کوردستان هەبوو، بڕیاری دروستکردنی ١٤ بەنداوی بچووک بوو لەسەر ئەو ڕوبار و جۆگایانە کە لە زستاندا ئاوی زۆریان پێدا تێدەپەڕێت. دروستکردنی ئەو بەنداوانە بڕێک ئاو بۆ ئاودێریی کشتوکاڵ و بەخێوکردنی ماسیی گلدەداتەوە، دیمەنی کوردستان جوانتر دەکات و گەشتوگوزار پێشدەخات و هاوکاریی ڕاستکردنەوەی ئابوریی کوردستان دەکات، بەڵام بڕیاری دروستکردنی بەنداوەکان جێبجێنەکرا.

کابینەی نۆی حکومەتی هەرێم لە ناوەڕاستی ساڵی ۲۰۲۱دا لێبڕینی موچەی ڕاگرت، بەڵام ئەگەری کۆتاییهێنانی لێبڕێنی موچەی بە ناردنی بڕی ۲۰۰ ملیار دیناری مانگانەی حکومەتی فیدراڵییەوە گرێداوە. ئەگەر حکومەتی عێراق ئەو بڕە پارەیە نەنێرێت ئەگەر هەیە لێبڕینی موچە دەستپێبکاتەوە. کابینەی نۆ کۆمەڵێک پرۆژەی ئابوریی گرنگی دەستپێکردووە، ئەگەر ئەو پرۆژانە ڕاستبێت و ئاستەنگییان بۆ دروستنەبێت، هەرێمی کوردستان لە ڕووی ئابورییەوە هەنگاوێک پێشدەکەوێت*٢٦.

ڕۆشنبیریی گشتیی خەڵک دەربارەی ئابوریی و بەرهەمهێنان بە خاڵێکی گرنگیی پێشخستنی ئابوریی دەژمێردرێت. لەم سەردەمەدا بۆچوونی خەڵکی کوردستان لەسەر بەرهەمهێنان و ژیان و گوزەران بۆچوونێکی وا نییە ڕێگەی گەشەکردنی ئابوریی وڵات و دابەشکردنی دادپەروەرانەی داهات خۆشبکات. لە دوای دۆزینەوە و دەرهێنانی نەوت لە عێراق، پاش ئەو هەموو شەڕ و پێکدادانە عێراقیی و ناوچەیی و جیهانییانە کە لەسەر کێشەکانی عێراق ڕوویانداوە، تاک و پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکانی هەرێمی کوردستان لەسەر دەستپانکردنەوە و کارنەکردن و دەستبەسەرداگرتنی داهاتی خەڵک ڕاهاتوون. تاکی هەرێمی کوردستان وا ڕاهێنراوە هەر کە دەسەڵاتی وەرگرت ئەو دەسەڵاتە بۆ بەرژەوەندیی تایبەت بەکاربهێنێت و دەست بەسەر سامانی وڵاتدا بگرێت و بیر لە بەرژەوەندیی گشتیی و دادپەروەریی کۆمەڵایەتیی نەکاتەوە. مرۆڤی سادەی کورد وا ڕاهاتووە بۆ دابینکردنی بژێویی دەست لە حکومەت و حیزب پانبکاتەوە، لەسەر ڕەنجی خۆی نەژی.

گۆڕینی ئەم جۆرە هزرە پێویستی بە هەڵمەتێکی وریاکردنەوەی ویژدانیی و ئاکاریی و یاسایی و ئابوریی هەیە. ئەو کەناڵانەی ڕاگەیاندن لە ماوەی ڕابردوودا لە لایەن دەسەڵاتدارانی باشووری کوردستانەوە بە سامانی هەرێمی کوردستان کراونەتەوە، تەنها باس لە پایەکانی ژیانێکی بۆرژوازییانە دەکەن، دەکرێت وەرچەرخانێک لە بەرنامەی خۆیاندا ئەنجامبدەن و لە ڕووی ئابوریی و بەرهەمهێنانەوە دەست بە پەروەردەکردنی خەڵک بکەن. یەکێک لەو جۆرە پەروەردانە کە زۆر پێویستە، ڕاستکردنەوەی چەمکە ئابورییە هەڵەکانی تاک و پێکهاتە دەسەڵاتدارەکانی هەرێمی کوردستانە، پەروەردەکردنی خەڵک بەوەی کە دەستکەوتی مادیی هەموو شتێک نییە، پەروەردەکردنی حیزب هەتا دەست لە قورخکردنی ئابوریی کوردستان هەڵبگرێت، ڕادەستکردنەوەی ئابوریی هەرێم بە حکومەت و وەزارەتە پەیوەندییدارەکان، بەرهەمهێنان لەپێناو پێویستیی خەڵکدا بێت، دابەشکردن دادپەروەرانە بێت.

## پەراوێز :

١- مانیفاکتۆرە، دروستکردنی شتومەک بە پشتبەستن بە هێزی بازووی مرۆڤ، تەکنۆلۆژیا لە دروتسکردنیدا بەکارنایەت. پیشەسازیی لە کۆمەڵگەکانی تری جیهاندا بەم قۆناغەدا تێپەڕیوە و گەیشتووەتە قۆناغی پیشەسازیی کە تەکنۆلۆژیای تێیدا بەکارهاتووە، بەڵام بەرهەمهێنانی پیشەسازیی لە کۆمەڵگەی کوردستاندا لەم قۆناغەدا ماوتەوە و گەشەینەکردووە.

٢- لە گوندەکەی خۆمان پیاوێکم دەناسی بە ئینگلیزیی قسەیدەکرد، کاتێک پرسیارمکرد لە کوێ فێری ئینگلیزیی بوویت، گوتی: لەگەڵ ئینگلیزەکان لە بەنداوی دەربەندیخان چەند ساڵ کارمدەکرد. بەنداوی دوکان و دەربەندیخان لە ساڵی ١٩٤٢ بڕیاری دروستکردنیان درا، لە سەرتای شەستەکاندا تەواوکران.

٣- فەرمان عەبدولڕەحمان، پاکتاوکردنی کورد لە کوردستانی عێراق ٢٠٠٦، پرۆژەی ئاودێریی حەویجە، ساڵی ١٩٣٦ – ١٩٤٢ دروستکرا. ٢٧٧٠٥ کەسی لە خێڵە گەڕۆکەکانی عەرەب لە ٢٢٨ گوندی کوردستاندا نیشتەجێکران و زەوییان بەسەردا دابەشکرا.

٤- ڕێککەوتنی جەزائیر ساڵی ١٩٧٥ لە نێوان سەدام حوسەین و شای ئێراندا بۆ کۆتاییپێهێنانی شۆڕشی ئەیلول.

٥- خەڵکی گوندە چۆڵکراوەکانی ناوچە سنوورییەکانی ئێران کە ڕادەگوێزران و لە ئۆردوگاکاندا نیشتەجێدەکران، لە دەزگاکانی حکومەتدا دادەمەزران، هێندە زۆر بوون کاریان نەبوو تەنها موچەی مانگانەیان وەردەگرت، بەو خەڵکە بێکارە دەگوترا بەتاڵە.

٦- پایزی ساڵی ٢٠٠٦ وەکو شایەتی دادگاییکردنی سەرانی ڕژێمی بەعس لەسەر تاوانی ئەنفال لەگەڵ چەند کەسێکی تر لە سلێمانییەوە بە فڕۆکە بۆ بەغدا چووین.

٧- بڕیاری حکومەتی مالکیی بڕی یەک دۆلار لە هەر بەرمیلێکی نەوتی کەرکوک بۆ پارێزگای کەرکوک خەرجبکرێت.

٨- بەندی حەوتی نەتەوە یەکگرتووەکان، عێراق مەترسییە بۆ سەر ئاسایشی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیی.

٩- بارودۆخی سیاسیی کوردستان – عێراق، فەرەیدون عەبدولڕەحیم عەبدوڵڵا، ل: ٢٨٢.

١٠- نامەی سەدام حوسەین بۆ مەلا مستەفا، ڕۆژی ١/ ٨/ ١٩٧٠ لە کتێبی بەرزانیی و بزوتنەوەی ڕزگارییخوازی کورد، مەسعود بەرزانیی بەرگی سێیەم، بەشی یەکەم.

١١- لێدوانی نەوشیروان مستەفا بۆ کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی باشووری کوردستان، ساڵی ١٩٩٣.

١٢- گۆڤاری فۆرین پۆلیسی ئەمریکیی (foreign policy).

١٣- وەزیری سەرچاوە سروشتییەکانی حکومەتی هەرێم لەسەر داوای ئەندامانی لیستی ئۆپۆزسیۆن بۆ چارەنوسی ئەو بڕە پاریە بانگکرایە پەرلەمان، بۆ ئەوەی ڕونکردنەوە بدات، ڕونکردنەوەکانی قەناعەتی بە خەڵک نەکرد.

١٤- ڕۆژنامەی ئاوێنە، ژمارە ١٨٩، ساڵی ٢٠٠٩ و ڕۆژنامەی هاوڵاتیی، ژمارە ٥٦٣، ساڵی ٢٠٠٩.

١٥- کەناڵی تەلەفزیۆنی KNN.

١٦- ساڵی ٢٠٠٩ عومەر ئاغای سورکیی چاوپێکەوتنی لەگەڵ کەناڵی تەلفزیۆنی (ک. ن. ن) کرد و باسی چۆنێتیی کڕین و فرۆشتنی سەدی پێخمەی کرد.

١٧- لێدوانی وەزیری دارایی هەرێمی کوردستان کە ئەو پارەیە لە فرۆشتنی نەوتەوە دەستدەکەوێت نەخراوەتە سەر بودجەی حکومەتی هەرێمی کوردستان. لێدوانی وەزیری نەوتی عێراق کە ئاگایان لە ناردنەدەرەوەی نەوت نییە بێجگە لەو نەوتەی لە ڕێگەی بۆرییەکانی نەوتەوە دەچێتەدەرەوە.

١٨- چەند ئەندامێکی مەکتەبی سیاسیی (ی. ن. ک) ساڵی ٢٠٠٩ ڕیزەکانی (ی. ن. ک) بەجێهێشت و بزوتنەوەی گۆڕانیان دروستکرد. زانیارییان لەسەر چۆنێتیی دابەشکردنی داهاتی هەرێمی کوردستان دا و دایە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن و ئاشکرایانکرد کە پارتیی و یەکێتیی لە بودجەی هەرێمی کوردستان مانگی ٣٥ ملیۆن دۆلار بۆ خۆیان گلدەدەنەوە.

١٩- سوتانی ئۆتێل سۆما، مردنی چل کەس و بریندار بوونی پەنجا کەس لە تەمووزی ٢٠١٠دا.

٢٠- کابینەی شەشەمی حکومەتی هەرێمی کوردستان بە سەرۆکایەتیی بەرهەم ساڵەح یەکەم کابینە بوو کە بودجەی ساڵی ٢٠١٠ی ئاشکراکرد.

٢١- تاڵەبانیی و بەرزانیی وەڵامی ٢٥٥٧ ڕاپۆرتی چاودێریی داراییان نەداوەتەوە. ئەوە مانشێتی لاپەڕە ٣ی ڕۆژنامەی هاوڵاتییە، ڕۆژی ١٣/ ١٢/ ٢٠٠٩ بوو، کە پیشانیدەدات چۆن سامانی ئەم وڵاتە بە نهێنیی دەستیبەسەردادەگیرێت و ئاشکراناکرێت.

٢٢- له ٢٥/ ١/ ٢٠١٠دا وەفدێکی حکومەتی هەرێم بە سەرۆکایەتیی مەسعود بارزانیی سەرۆکی هەرێم سەردانی ئەمریکای کرد، نیچیرڤان بەرزانییش لەگەڵ وەفدە حکومییەکەدایە.

٢٣- هەواڵی ئابوریی کەناڵی تەلەفزیۆنی KNN ساڵی ٢٠١٠.

٢٤- بەنامەیەکی کەناڵی تەلەفزیۆنیی ڕوداو ساڵی ٢٠٢١.

٢٥- بەگوێرەی هەواڵی ڕۆژنامەکانی باشوور لە ساڵی ٢٠٠٩دا تەنها لە ناحیەی تەکیەی سەر بە قەزای چەمچەماڵ ٢٦٧ گەنج کوردستانیان بەجێهێشتوە.

٢٦- کورستان ٢٤، کابینەی نۆ، گرنگیی بە بوژانەوەی کەرتی کشتوکاڵ و پیشەسازیی دەدات، ٢٨/ ٥/ ٢٠٢١.

کۆمبرادۆر : سەرمایەداری نانیشتیمانیی، سەرمایەداری وڵاتێکی ژێردەستە گرێدراوی سەرمایەداری وڵاتانی داگیرکەرە. خزمەتی وڵاتەکەی خۆی ناکات خزمەتی وڵاتانی تر دەکات

# ١٤

# سیستەمی سیاسیی هەرێمی کوردستان

سیستەمی سیاسیی ئەو دەزگا سیاسیی و کۆمەڵایەتیی و کەلتورییانەن، کە لە ڕێگەی دەستوور و یاسا و ئاوەزمەندیی باڵادەستەوە کاروباری وڵات بەڕێوەدەبەن*١.

سیستەمە سیاسییەکانی جیهان و سیستەمی سیاسیی داگیرکەرانی کوردستان، کاریگەرییان لەسەر سیستەمی سیاسیی هەرێمی کوردستان هەیە، بۆ تێگەیشتن لە سیستەمی سیاسیی هەرێمی کوردستان، سەرەتا ئاماژە بە سیستەمی سیاسیی دەکەین و دواتر کارگەریی سیستەمی داگیرکەران و جیهانیی باسدەکەین.

## جۆرەکانی سیستەمی سیاسی

### ١- پاشایەتیی:

حوکمڕانیی پاشایەتیی لە قۆناغی کۆیلایەتیی و دەرەبەگایەتییدا سیستەمێکی باڵادەستبووە، لەو وڵاتانەدا کە سیستەمی پاشایەتیی تێدا ماوەتەوە، هەر بە شێوە ماوەتەوە، لەژێر گوشاری جەماوەر و لەژێر کاریگەریی پێشکەوتنی زانست و

هزری مرۆڤدۆستییدا، گۆڕانکاریی جدیی بەسەر ناوەڕۆکی سیستەمی پاشایەتیی سەرمایەداریی و لیبرالیزمەدا هاتووە. لەگەڵ سەردەمی نوێ و بەرژەوەندیی زۆرینەی خەڵکدا خۆی دەگونجێنێت و درێژە بە مانەوەی خۆی دەدات:

سیستەمی پاشایەتیی ئەم سەردەمەی وڵاتانی ئەوروپا وەکو سیستەمی پاشایەتیی جاران نەماوە، پاشاکانی قۆناغی سەرمایەداریی وەکو پاشاکانی سیستەمی کۆیلایەتیی و دەرەبەگایەتیی دەست لە هەموو بوارێکی ژیانی کۆمەڵگەکەیان وەرنادەن، تەنها وەکو سیمبول ماونەتەوە.

لەو وڵاتانەدا کە سیستەمی پاشایەتیی تێدا نەرمبووە، خەڵک لە ڕێگەی هەڵبژاردنەوە نوێنەری خۆیان بۆ پەرلەمان و حکومەت هەڵدەبژێرن و پێکدەهێنن. لەو وڵاتانەدا پەرلەمان و حکومەت و دەسەڵاتی دادوەریی لە کرداری حوکمڕانییدا ڕۆڵی سەرەکییان هەیە. پاشا ڕۆڵێکی تەشریفاتیی هەیە و خۆی لە بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات بەدووردەگرێت*٢.

## ٢- کۆماریی دکتاتۆریی:

لە سیستەمی سیاسیی قۆناغی سەرمایەدارییدا، لە چەندیین وڵات سیستەمی کوماریی بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات ئاواکراوە. لە هەندێک وڵاتی ئەوروپیی و لە زۆربەی وڵاتە تازەگەشەکردەووەکاندا سیستەمی کۆماریی لە ڕێڕەوی بنەڕەتیی خۆی لادەدات. لە بنەما پێشکەوتنخواز و دیموکراتییەکانی دووردەکەوێتەوە و بەرەو سیستەمێکی سیاسیی توتالیتاریی (شمولیی)، تاکەکەسیی، بنەماڵەیی و دەستەبژێر ملدەنێت. ئەو سیستەمە لادەرە هێندەی سیستەمی پاشایەتیی کۆن زیان بە مرۆڤ و ژینگە و بەهاکانی مرۆڤایەتیی دەگەیەنێت.

ڕژێمی کۆماری تورکیا کە لە دوای ڕوخانی ئیمپراتوری عوسمانیی لە جەنگی یەکەمی جیهانییدا ئاوادەبوو، کۆمەڵکوژیی بەرانبەر بە گەلی ئەرمەن و گەلی کورد ئەنجامدا. ئیپراتوریەتی عوسمانیی مافی سیاسیی بە گەلی کورد و ئەرمەن نەدەدا، بەڵام هەوڵی کۆکوژیی و لەناوبردنی ئەرمەن و کوردی نەدەدا.

کۆمارە شمولییەکەی نازییەکانی ئەڵمانیا بە سەرۆکایەتیی (هتلەر)، کە پێش جەنگی دووەمی جیهانیی لەسەر کەلاکی ڕژێمی پاشایەتیی ئەڵمانیا ئاوابوو. جەنگی دووەمی جیهانیی بەرپاکرد و جینۆسایدی گەلی جووی کرد. بەو شێوەیە ئەو سیستەمە کۆمارییە زیانێکی مەزنی بە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیی و خودی وڵاتی ئەڵمانیش گەیاند. ڕژێمی بەعسی عێراق (ڕژێمی سەدام) کە لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە شوێنی ڕژێمی پاشایەتیی عێراق ئاوابوو، جینۆسایدی گەلی کوردی کرد و شەڕی ئێران و کوێت و شەڕی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیی کرد و زیانێکی گەورەی بە گەلانی عێراق و گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست گەیاند.

**٣- کۆماریی دیموکراتیی:**

لە سیستەمی کۆماریی دیموکراتییدا دەسەڵات بەسەر دامودزگاکانی دەوڵەت و بەرپرسەکاندا دابەشدەکرێت، سەرۆککۆمار و سەرۆکوەزیران و سەرۆکی پەرلەمان لەژێر چاودێرییدان، مافی ئەوەیان نییە لە بڕیاری سیاسییدا تاکڕەوییبکەن. سیستەمی کۆماریی دیموکراتیی دوو جۆری هەیە:

**ا- سیستەمی کوماریی، پەرلەمانیی نوێنەرایەتیی:**

لەم سیستەمەدا خەڵک پەرلەمان هەڵدەبژێرێت، پەرلەمان سەرۆککۆمار و سەرۆکوەزیران هەڵدەبژێرێت. دەسەڵاتی دادوەریی لە لایەن پەرلەمان و حکومەتەوە دیاریدەکرێت. سەرۆککۆمار سەرۆکی دەسەڵاتی ڕاپەڕاندنە، دەسەڵاتەکانی دەوڵەت بەسەر پەرلەمان و حکومەت و دادوەرییدا دابەشدەکرێت. دەسەڵاتی سەرۆککومار لەم سیستەمەدا سیمبولییە و سەرۆککۆمار ڕەمزی یەکێتیی نەتەوەیی و سەروەریی وڵات و دەسەڵاتە. لەم سیستەمەدا بەشەکانی دەسەڵات (پەرلەمان، حکومەت، دادوەریی) سەربەخۆن و لە یەکتر جیاکراونەتەوە.

سەرۆکی حکومەت زۆرترین دەسەڵاتی هەیە، بەڵام لەژێر چاودێریی پەرلەماندایە. لەم سیستەمەدا خەڵک لە ڕێگەی نوێنەرەکانیەوە بەشداریی حکومڕانیی دەکات. نمونەی ئەم سیستەمە لە دەوڵەتی عێراقی نوێدا دەبینرێت.

### ب- سیستەمی کوماریی، پەرلەمانیی، سەرۆکایەتیی:

لەم جۆرە سیستەمەدا گەل بە شێوەیەکی ڕاستەخۆ سەرۆککومار و پەرلەمان هەڵدەبژێرێت. پەرلەمانیش ڕەزامەندیی لەسەر سەرۆکی حکومەت و کابینەی حکومەت دەدات. لەبەرئەوەی سەرۆک لە لایەن گەلەوە هەڵدەبژێرێت، لە چاو سیستەمی کوماری پەرلەمانی نوێنەرایەتییدا، سەرۆک دەسەڵاتی زۆری بەدەستەوەیە و بە تەنها وەکو سیمبول هەڵسوکەوتی لەگەڵ ناکرێت.

سەرۆک لەم جۆرە سیستەمانەدا دەسەڵاتی ڕاپەڕاندنی زۆری بەدەستەوەیە، زۆربەی دەسەڵاتەکانی سەرۆکی کابینەی حکومەت لە دەستی سەرۆککۆماردایە. نمونەی ئەم جورە سیستەمە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و فەرەنسادا دەبینرێت.

### ٤- سیستەمی سۆسیالیستیی:

لە سەروبەندی جەنگی یەکەمی جیهانییدا، بە پشتبەستن بە بۆچوونەکانی مارکس و ئەنگلس، لە چەندیین وڵاتی جیهاندا، بە تایبەت لە ئەوروپا سەدان حیزبی سیاسیی و ڕێکخراوی پیشەیی و سەندیکای سوسیالیستیی و کۆمۆنیستیی دامەزران. ئامانجی ئەم ئاراستە سیاسییە ئەوە بوو، کۆمەڵگەی سەرمایەداریی و سیستەمی سەرمایەداریی تێیەڕێنێت و کۆمەڵگەیەکی بێچین و چەوسانەوە دابمەزرێنێت.

ئەم ئاراستە نوێیە، ساڵی ١٩١٧ شۆڕشی ڕوسیای هەڵگیرساند، ڕژێمی پاشایەتیی ڕوسیای ڕوخاند. لە جێگەی ڕژێمە کۆنەکە، یەکێتیی سۆڤیەتی دامەزراند. یەکێتیی سۆڤیەت دەستی بە دژایەتییکردنی سیستەمی سەرمایەداریی کرد.

لە کۆتایی سەدەی بیستدا، سیستەمی سۆسیالیستیی سۆڤیەتیی شکستیخوارد و خۆی ڕادەستی سیستەمی سەرمایەداریی کردەوە، بەڵام وەکو کەلتور و هزر، هەتا ئێستا لە ناو ناخی تاک و پێکهاتەی سوسیالیستدا ماوەتەوە. لە ڕێگەی جیاوازەوە بەربەرەکانێی سیستەمی سەرمایەداریی دەکات، بە شوین کاتی لەبار و گونجاودا

دەگەڕێت هەتا جارێکی تر خۆی چالاکبکاتەوە. سیستەمی کۆماری چین و کۆریای باکور و هەندێک وڵاتی تر هەتا ئێستایش سۆسیالیستییە. لە سیستەمی سۆسیالیستییدا پێکهاتەیەکی ئایدۆلۆژیی و حیزبیی حوکمیی وڵات بەڕێوەدەبات. سکرتێری حزب سەرۆکی وڵاتە، حزب دەستدەخاتە ناو کاروباری پەرلەمان و دادوەری و ئابووری و ڕاگەیاندن و مافی تاک و پێکهاتەکان گرنگییانپێنادرێت، بەرژەوەندیی گشتیی و بەرژەوەندیی وڵات پێشدەخرێت.

## ٥- سیستەمی ئیسلامیی:

کە جەنگی یەکەمی جیهانیی دروستبوو، ئەورووپا هێرشی هەمەجۆری بۆ سەر ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەستپێکرد، کۆتا ئیمپراتۆریەتی ئیسلامیی ناوچەکەی (دەوڵەتی عوسمانیی) ڕوخاند. لە دروستکردنەوەی تورکیای دوای جەنگی یەکەمی جیهانیی، کەمال ئەتاتورک پشتی لە سیستەمی ئیسلامیی کرد و سیستەمی سیاسیی و کەلتوریی و سەرمایەداریی ئەورووپای بۆ ئاواکردنی کۆماری تورکیا هەڵبژارد.

ئیسلامی سیاسیی تورکیا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست وەکو کەمال ئەتاتورک و شای ئێران خۆیان ڕادەستی سیستەمی سەرمایەداریی نەکرد. لە ململانێی کەلتور و سیاسەتی سەرمایەدارییدا بەردەوامبوو. لە کۆتایی سەدەی بیست و سەرەتای سەدەی بیستویەکدا، ئیسلامی سیاسیی بوژانەوەی بە خۆیەوە بینی. لە ئێران و ئەفغانستان و هەندێک وڵاتی تر، دەسەڵاتی بەدەستەوەگرت و سەرلەنوێ دەستی بە حوکمڕانیی کردەوە. لە هەندێک وڵاتی تریش هەوڵی بەدەستهێنانی دەسەڵات دەدات.

ئیسلامی سیاسیی دەیەوێت کۆمەڵگە و سیاسەت بۆ سەردەمی دەربەگایەتیی بگەڕێنێتەوە، بۆ ئەو سەردەمەی کە ئاین فەلسەفەی حوکمڕانیی بوو، سیاسەتی کۆماری ئیسلامیی ئێران و بزوتنەوەی تاڵیبان بە باشیی سیستەمی ئیسلامی سیاسییمان پیشاندەدەن. لەم سیستەمەدا خەلیفە یان ڕابەری ئاینیی لە ڕێگەی کۆمەڵێک دەزگاوە حوکمی وڵات دەکات، وەک سەردەمی پاشایەتی کۆن وایە، کۆنترۆڵی هەموو بوارەکانی بەڕێوەبردن ئابووری و کۆمەڵایەتی وڵات دەکات.

### ٦- سیستەمی تێکەڵە:

لەو وڵاتانەدا کە ئیسلام دینی سەرەکیی وڵاتە و کاریگەریی لیبراڵیزمی ڕۆژئاواییان لەسەرە، بەرەژەوەندی دەسەڵاتداران وادەخوازێت کە لە یەک کاتدا هاوپەیمانی وڵاتە سەرمایەدارەکان بن و لە ڕێگەی ئاینیشەوە کۆمەڵگە بە سیاسەتی خۆیانەوە پابەندبکەن. دەوڵەتانی وەکو تورکیای سەردەمی ئاکپارتی و تونسی دوای بەهاری عەرەبیی زۆر لەم جۆرە سیستەمەوە نزیکن. لەبەرئەوەی سیستەمی حوکمڕانیی تورکیا لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە سکۆلارە، ئەمریکا و ئەورووپا هانی تورکیایان دا بەرەو ئیسلامی سیاسیی بابیداتەوە، بۆ ئەوەی لە ڕێگەی تورکیاوە ئیسلامی سیاسیی توندڕەوی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئیحتوابکرێت.

### ٢- کاریگەریی سیستەمی سیاسیی داگیرکەران

سیستەمی سیاسیی وڵاتانی داگیرکەر بەشێکە لە جۆرەکانی سیستەمی سیاسیی جیهان، بەڵام بەرانبەر بە دۆزی کورد هەڵوێستێکی تایبەتی هەیە.

### ١- لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە:

لە سەدەی ١٥ زاینییەوە بۆ یەکەم جار سەلجوقییەکان بەفەرمی ناوی کورد و کوردستان دەهێنن.ساڵی ١٥١٤ لە شەڕی چاڵدێراندا کوردستان لە نێوان دەوڵەتی عوسمانیی و دەوڵەتی سەفەوییدا دابەشدەکرێت، هەر بەشێکی دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی یەکێک لەو دەوڵەتانەوە، هەتا جەنگی یەکەمی جیهانیی، بۆ ماوەی پێنج سەدە کورد پێکهاتەیەکی لاوەکیی دەوڵەتی عوسمانیی و دەوڵەتی سەفەویی دەبێت. لەو سەردەمەدا ئەو دوو دەوڵەتە بۆ بەرژەوەندیی خۆیان و بۆ دژایەتییکردنی یەکتر و بۆ سەرکوتکردنی گەلی کورد، لەژێر سێبەری چەمکی (گەلی مسوڵماندا) کوردیان وەکو کارتێک بەکارهێناوە.

گەلی کورد لە ناو سیستەمی ئەو دوو دەوڵەتەدا تەنها مافی ژیانێکی سەرەتایی هەبووە، بەڵام لە پێش هەر پێکهاتەیەکی تری کۆمەڵایەتیی سنووری فەرمانڕەوایی

ئەو دوو دەوڵەتەدا، ئەرکی باجدان و شەڕکردنی بەجێهێناوە. شەڕە بەردەوامەکانی ئەو دوو دەوڵەتە هەم زۆربەیان لەسەر خاکی کوردستان کراون، هەم سوتماکی سەرەکیی شەڕەکان ڕۆڵەکانی گەلی کورد بوون، بۆیە لەو سەردەمەدا کوردستان پێشکەوتنی ئابوریی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی بە خۆیەوە نەبینیوە.

گەلی کورد لە لایەن فەرمانڕەوایانی ئەو وڵاتانەوە، بە هاوڵاتیی پلە دوو و پلە سێ هەڵسوکەوتی لەگەڵ کراوە، شایانی ئەوە نەبینراوە نە لە فەرمانڕەوایی عوسمانیی و نە لە فەرمانڕەوایی سەفەویی و دەوڵەتەکانی تری ئێراندا پلە و پایەی ئەوتۆی هەبێت.

لەژێر سایەی سیستەمی داگیرکەراندا، گەلی کورد ڕاهێنراوە کە بۆ خۆی بیرنەکاتەوە و بڕیارنەدات، بەڵکو تەنها بیر لە بەرژەوەندیی داگیرکەران بکاتەوە، بۆ ئەوان بڕیاربدات و بژی. لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەدا لەگەڵ پەرەسەندنی هۆشیاریی نەتەوەیی لە ناو نەتەوەکانی ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانیی و دەوڵەتی ئێراندا، چەندیین ڕاپەڕیینی نەتەوەیی هەڵگیرسان، گەلی کوردیش بە ڕابەرایەتیی چەندیین سەرۆک_خێڵ و شێخی کوردستان، دژی دەوڵەتی عوسمانیی و دەوڵەتی ئێران ڕاپەڕیینی کرد، بەڵام هیچ یەکێک لە ڕاپەڕیینەکان بۆ ماوەیەکی درێژ نەمانەوە، سەرکەوتنیان بەدەستنەهێنا، گەلی کوردیان لە چنگی داگیرکەران ڕزگارنەکرد.

## ٢- لە جەنگی یەکەمی جیهانییەوە:

لە جەنگی یەکەمی جیهانییدا (١٩١٤ – ١٩١٨) کە دەوڵەتانی هاوپەیمان (بەریتانیا، فەرنسا، ڕوسیا، ئەمریکا) پەلاماری دەوڵەتی عوسمانییان دا و دەوڵەتی عوسمانیی هەڵوەشایەوە. لەسەر کەلاکی دەوڵەتی عوسمانیی چەندیین دەوڵەتی تر لە تورکیا و سوریا و میسر و عێراق و ناوچەکانی تر ئاوابوون (دروستبوون)، بەڵام لە هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانییدا، گەلی کورد نەک هەر دەستکەوتی نەبوو، جارێکی تر کوردستان بە ڕەزامەندیی دەوڵەتانی هاوپەیمان دابەشکرایەوە. تورکیا و عێراق و ئێران و سوریا وەکو داگیرکەری نوێ درێژەیان بە چەوسانەوەی گەلی کورد دا.

لە جەنگی یەکەمی جیهانییەوە چەمکی نەتەوەپەرستیی لە نێوان دەسەڵاتدارانی نەتەوە سەردەستەکانی کوردستاندا بڵاوبووەوە، ئەو دەوڵەتانەی کە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانیی دروستبوون، لەسەر بنەمای دەوڵەتی یەک_نەتەوە پێکهاتن، تورکیا بۆ تورک، عێراق و سوریا بۆ عەرەب، ئێران بۆ فارس. کاتێک دەسەڵاتدارانی ئەو وڵاتانە بینییان وا لە تەنیشتی نەتەوە سەردەستەکەی خۆیانەوە نەتەوەیەکی تر بە ناوی کوردەوە هەیە، هەموویان بەبێ سێ و دوو، بەڵام لە کاتی جیاجیادا و بەگوێرەی توانایان، سیاسەتی لەناوبردن و تواندنەوەی گەلی کوردیان دەستپێکرد.

لەبەرئەوەی هزری نەتەوەپەرستیی لە ناو دەسەڵاتدارانی تورکیادا زووتر پێشکەوت، دەوڵەتی تورکیا لەساڵی ١٩٢٣ بە دواوە، سیاسەتی نکوڵییکردنی گەلی کوردی پێڕەوکرد. هەموو هەوڵێکی دا بۆ ئەوەی گەلی کورد لە بۆتەی نەتەوەی تورکدا بتوێنێتەوە. لە بەرانبەر هەر تێکۆشانێکی نەتەوەیی کورددا، لە کورتترین کاتدا زۆرترین توندوتیژیی بەکاردەهێنا. ڕاپەڕیین و سەرهەڵدانەکانی کوردی سەرکوتدەکرد. وتەیەکی بەناوبانگی سەرانی تورک هەیە کە دەڵێت: «دژی هەر دەستکەوتێکی نەتەوەیی کورد دەوەستینەوە ئەگەر لە ئەفریقایش بێت».

کەلتوری سیاسیی و کۆمەڵایەتیی دەسەڵاتدارنی نەتەوەی فارس بە شێوەیەکی گشتیی نەرمیی و دیبلۆماسیەتی پێوەدیارە، بەڵام لە ناوەڕۆکدا دەسەڵاتدارانی فارس بە هیچ مافێکی گەلی کورد ڕازینابن. لەگەڵ بەرپابوونی هەر ڕاپەڕیین و سەرهەڵدانێکی گەلی کورددا، بەبێ دڵەراوکێ، پەنایان بۆ دژایەتییکردن و سەرکوتکردنی گەلی کورد و شۆڕشەکانی بردووە. لە جەنگی یەکەمی جیهانییدا لە دژی سەرهەڵدانی سمکۆی شکاک وەستانەوە. لە جەنگی دووەمی جیهانییدا لە دژی کۆماری کوردستان هەموو جۆرە چەکێکی سیاسیی و دیبلۆماسیی و سەربازییان بۆ دامرکاندنەوەی شۆڕش و بۆ پاکتاوکردنی دەسکەوتەکان بەکارهێنا.

لەبەرئەوەی عەرەبەکان هەتا جەنگی یەکەمی جیهانیی ژێردەستەی دەوڵەتی عوسمانیی بوون، کورد و عەرەب پێکەوە دژی دەوڵەتی عوسمانیی بۆ ماوەیەک خەباتیان دەکرد، لە عێراق و سوریا جۆرە هاوپەیمانییەک لە نێوان کورد و عەرەبدا هەبووە، بەو هۆیەوە باشووری کوردستان هەتا ماوەیەک سیاسەتی نیکوڵییکردن و قڕکردنی بەسەردا جێبەجێنەکرا، بۆیە لە دوای دامەزراندنی عێراق کورد هەندێک مافی

سیاسیی و کەلتوریی دەستکەوت. لەبەرئەوەی نەتەوەی عەرەب لە عێراقدا ژێردەستی دەوڵەتی عوسمانیی بوو، هەستی نەتەوەپەرستیی عەرەب درەنگ گەشەیکرد، هەتا ماوەیەک کورد لە سێبەری لاوازیی هەستی نەتەوەپەرستیی عەرەبدا پشوویەکی دا، لە شەستەکانی سەدەی بیستدا تا ڕوخانی ڕژێمی سەدام، نەتەوەپەرستیی عەرەبی عێراقی دەستیکرد بەتواندەوە و لەناوبردنی کورد ئەنجامدرا.

ئەو سیاسەتەی وڵاتانی داگیرکەر لە لایەن گەلی کوردەوە بێوەڵام نەماوەتەوە، بە سەرهەڵدان و ڕاپەڕیین و خەباتی چەکداریی وەڵامیدراوەتەوە. کێشەی بنەڕەتیی گەلی کورد لە تێکۆشاندا ئەوەیە، بەو چەمک و بنەمایانە خەباتدەکات کە سیستەمی داگیرکەرانی کوردستان و سیستەمی سەرمایەداریی دەستنیشانیدەکەن، سیستەمی پاشایەتی خۆی نەبووە.

### ٣- لە یازدەی سێپتەمبەری ٢٠٠١

لە دوای جەنگی دووەمی جیهانییەوە سیستەمی دووجەمسەری باڵی بەسەر جیهاندا کێشا، کورد گۆڕانکاریی ئەوتۆی نەبوو. تا لە کارەساتی ١١ی ئەیلولی ساڵی ٢٠٠١ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا، هەزارن هاوڵاتیی ئەمریکیی کوژران، بورج و باڵەخانە بازرگانییەکانی نیۆیۆرک وێرانکران، ڕێکخراوی قاعیدە بەرپرسیارێتیی کارەساتەکەی لەئەستۆگرت.

ئەو ڕوداوە نەخشەی سیاسیی جیهان و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی هێنایە لەرزین، ئەو لەرزینە ڕژێمی تاڵەبانی ئەفغانستان و ڕژێمی بەعسی عێراقی ڕوخاند. لە سێبەری ئەو گۆڕانکارییە سیاسیی و سەربازییانەدا، جارێکی تر دۆزی کورد لە مەلەفە نێودەوڵەتییەکاندا سەرکەوتەوە. پەیوەندیی کورد و وڵاتانی داگیرکەری کوردستان و وڵاتانی جیهان کەوتەوە بەر باس و لێکۆڵینەوە و پێداچوونەوە. وڵاتانی داگیرکەری کوردستان و هێزە جیهانییەکان بۆیان ئاشکرابوو ئەو هێزەی ڕۆڵی سەرەکیی لە ڕوخانی ڕژێمی بەعسی عێراقدا دەبینێت، گەلی باشووری کوردستانە.

بۆ هەموو لایەک ئاشکرابوو، ئەگەر ڕژێمە ناوەندییەکانی عێراق بە شێوەیەکی دیموکراتیی هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دۆزی گەلی کورددا بکردایە، شۆڕشی ئەیلول بەرپانەدەبوو. ڕێککەوتنی جەزائیری نێوان شای ئێران و سەدام حوسەین ساڵی ١٩٧٥

ئیمزا نەدەکرا. هەڵوەشانەوەی ئەو ڕێککەوتنە شەڕی عێراق و ئێرانی لێنەدەکەوتەوە. شەڕی ئێران و ئێراق، شەڕی عێراق و کوەیتی لێنەدەکەوتەوە. لەوێیشەوە شەڕی سیویەک وڵات و عێراق دروستنەدەبوو. ڕژێمی عێراقی لە مەرگ نزیکنەدەخستەوە. لەوێیشەوە دەرفەتی ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ و دامەزراندنی حکومەتی هەرێمی کوردستانی لێنەدەکەوتەوە.

بۆیە لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام لە ناو سیستەمی سیاسیی وڵاتانی داگیرکەری کوردستاندا مقۆمقۆیەک هاتە ئاراوە، دەبێت سیاسەتی نکوڵییکردن و قڕکردنی کورد دەستی لێبەربدرێت، گەلی کورد بە کەمێک مافی سیاسیی ڕازیبکرێت.

وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایش کە پێیخستە ناو عێراقەوە، بۆی ڕونبووەوە کە بەبێ کورد ناتوانێت لە عێراقدا بمێنێتەوە. لە لایەکەوە گەلی باشووری کوردستان بە پێچەوانەی عەرەبی عێراقەوە، ئەمریکا بە دۆستی خۆی دەزانێت و لە کوردستان پێشوازیی لێدەکات. هەرێمی کوردستان وەکو قووڵایی ستراتیژی سوپای ئەمریکا سودی لێوەردەگیرێت. لە لایەکی ترەوە هێزەکانی پاراستنی گەلی سەر بە پارتی کرێکارانی کوردستان (پ. ک. ک) ناوچە سنوورییەکانی هەرێمی کوردستانیان پاراست و ڕێگەیاننەدا لە سنووری ئەوانەوە هیچ هێزێک بێتە هەرێمی کوردستانەوە و ئاسایشی هەرێمی کوردستان و سوپای ئەمریکا تێکبدات.

بەم شێوەیە هەتا ماوەی چەند ساڵێک، هەتا ئەمریکا لە عێراقدا جێگەی خۆی کردەوە و سیاسەتەکانی خۆی جێگیرکرد، گەلی کوردستان و هێزە سیاسییەکانی کوردستان، ئاسایشی ئەمریکایان دەپاراست. ئەو هەڵوێستەی گەلی کورد و ئەو سیاسەتەی حکومەتی هەرێم و هێزەکانی پاراستنی گەل، ئەمریکایان ناچارکرد بە شێوازێکی تر سەیری دۆزی کورد بکات و وەک بەربەستێکی ئەمنی حسابی بۆ بکات، بەڵام هەتا ئێستا ئەو تێڕوانینەی ئەمریکا نەبووەتە بڕیاری سیاسیی و لە سیستەمی سیاسیی نوێی جیهانییدا جێگەی نەگرتووە، ئەمریکا هەتا ئەمڕۆیش کوردستان وەکو بەشێکی عێراق سەیردەکات.

ئەم نزیکبوونەوەی ئەمریکا و ئەوروپا لە کورد، جارێکی تر داگیرکەرانی کوردستانی ناچارکردەوە لەسەر دۆزی کورد بە هەڵوێستی خۆیاندا بچنەوە و کەمێک سیستەمی نکوڵییکردنی خۆیان بەرانبەر گەلی کورد نەرمبکەن.

گۆڕانکارییەکی تری گرنگ کە نیشانەی سەرەتایی گۆڕانکاریی سیستەمی سیاسیی جیهانە بەرانبەر بە دۆزی کورد، وڵاتانی داگیرکەری ناچارکرد بە جدیی لێوردببنەوە و حسابێکی بۆ بکەن، ئەو کونسوڵخانانەی وڵاتانە کە لەپایتەختی هەرێمی کوردستان دەکرێنەوە، بۆیە وڵاتێکی وەکو ئێران کونسوڵخانەی لە هەولێر کردەوە، حکومەتی تورکیایش ساڵی ٢٠١٠ کونسوڵخانەی وڵاتەکەی لە هەولێری پایتەختی هەرێم کردەوە.

### ٤- لە دروستبوونی داعشەوە:

ساڵی ٢٠١٤ کە داعش دروستبوو، لە یەک کاتدا پەلاماری کوردستان و ئەوروپا و ئەمریکای دا. بەم سیاسەتەی داعش کورد بەختیکرایەوە، لەسەر تێگەیشتنی دوژمنی دوژمنەکەم دۆستمە، کورد لە هاوپەیمانیی نێودەوڵەتیی دژی داعش خۆی بینییەوە.

پەیوەندییەکانی کورد و ئەمریکا و ئەوروپا هەنگاوێکی تر پێشکەوت. لە ڕووی سەربازییەوە پێشمەرگەی کوردستان و سوپای هاوپەیمانانی دژی داعش پەیوەندییان گەشەیکرد. پیشمەرگە چەک و تفاقی سەربازیی لیوەرگرتن، ئەفسەرەکانیان مەشق و ڕاهینانیان بە پێشمەرگە کرد. چەندیین جار کردەی سەربازیی هاوبەشییان دژی داعش ئەنجامدا.

لە ڕۆژئاوای کوردستان پەیوەندیی نێوان هاوپەیمانی دژی داعش و یەکینەکانی پاراستنی گەل درەنگ دروستبوو، بەڵام زۆر باش پیشکەوت. پەیوەندییەکە تەنها لە ئاستی سەربازییدا نەمایەوە، پەیوەندییەکی سیاسییش لە نێوان هاوپەیمانان و دەسەڵاتی سیاسیی ڕۆژئاوای کوردستاندا دروستبوو، نوێنەری ڕۆژئاوای کوردستان سەردانی گەلێک وڵاتی کرد، لە گەلێک وڵات نوسینگەی دیبلۆماسیی ڕۆژئاوای کوردستان کرایەوە.

گەشەکردنی پەیوەندیی کورد و هاوپەیمانی نێودەوڵەتیی دژی داعش، دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستانی ناچارکرد ڕاستیی دۆزی کورد لەبەرچاو بگرن. وایلێهات تورکیا ڕێگە بە هێزی پیشمەرگە بدات بچێتە کۆبانێ و هاوکاریی یەکینەکانی پاراستنی گەل بکەن. ئەو پەیوەندییە وای لە ڕۆژئاوای کوردستان کردووە بەرانبەر بە هێرشی سوپای تورکیا و سوریا پارێزراوبێت، سوریا ئامادەبێت لەگەڵ کوردانی ڕۆژئاوا گفتوگۆبکات.

## ٥- ناکۆکیی لە سیاسەتی داگیرکەراندا

لەژێر سێبەری ئەو گۆڕانکارییە ناوچەیی و جیهانییانەوە، وە کاریگەریی خەباتی شارستانیی گەلی باکوری کوردستان، حکومەتی تورکیا ناچاربوو بەرانبەر بە دۆزی کورد بەخۆداچوونەوە بکات و هەڵوێستی نوێ پیشانبدات. حکومەتی پارتی داد و گەشەپێدانی تورکیا بەرانبەر بە دۆزی کورد لە باکووری کوردستان، ساڵی ٢٠٠٩ بە ناوی کرانەوە بەرەو ڕووی کێشەی کورددا، ئامادەکاریی بۆ چارەسەری ئاشتییانەی کێشەی کورد پیشاندا. ئەمەیش ئاماژەیەک بوو کە دەوڵەتی تورکیا بەتەمایە سنوورێک بۆ سیستەمی نکوڵیکردنی گەلی کورد دابنێت و دەست لە سیاسەتی سەرکوتکردنی شۆڕشەکانی کورد هەڵبگرێت، دژی دەستکەوتەکانی پارچەکانی تری کوردستان نەوەستێتەوە. هەر لە هەمان کاتدا حیزبی گەلی کۆماری ئۆپۆزسیۆن لە تورکیا باسی لە پرۆژەیەک دەکرد بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد، ئەمەیش گۆڕانکارییەکی جدییە کە پوازێک لە سیستەمی سیاسیی دوای جەنگی یەکەمی جیهانیی تورکیا دەدات و دەرفەتێک بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد دەکاتەوە.

ئەو گۆڕانکارییانەی بەرامبەر بە دۆزی کورد لە عێراقی نوێدا جێگیر کرا لە دەستووری عێراقدا بە سودی کورد جێگیریان کردووە، ئەو گۆڕانکارییانەی حکومەتی تورکیا لە ئایندەدا ئامادەکاریی بۆ دەکات، حکومەتی سوریا لە ڕاگەیاندندا باسی لێوە دەکات، هەندێک لە ڕیفۆرمخوازەکانی ئێران لە کاتی هەڵمەتی هەڵبژاردنی پەرلەمانی ئێراندا سەبارەت بە دۆزی کورد باسی لێوە دەکەن، لە لایەکەوە بەشی چارەسەری کێشەی کورد و ئازادبوونی گەلی کورد ناکات، لە لایەکی تریشەوە ئەگەری ئەوە هەیە ئەو گۆڕانکارییانە سەرپێیی و کاتیی بن و لە دەستووری ئەو وڵاتانەدا شوێنیان بۆ دانەنرێت. بە تێپەڕبوونی کات و بە کشانەوەی ئەمریکا لە ناوچەکە تەمەنیان بەسەربچێت و کورد هیچی دەستنەکەوێت.

پێنج ساڵ بەسەر بەرنامەی کرانەوەی تورکیا بە ڕووی کێشەی کورددا تێنەپەڕی، پارتی داد و گەشە لەگەڵ پارتی نەتەوەپەرستیی تورکیا هاوپەیمانیی دروستکرد. لە بەرنامەی کرانەوە پەشیمانبووەوە، شەڕی نێوان تورکیا و شۆڕشی باکوری کوردستان بە توندیی دەستپێکردەوە. ڕەجەب تەیب ئەردوغان بەرنامەی کۆتاییهێنانی شۆڕشی (پ. ک. ک) داناوە، لە ساڵی ٢٠١٥ەوە شەڕێکی فراوان و بەردەوامە. حکومەتی تورکیا

درێژە بە زیندانییکردنی عەبدوڵڵا ئۆج ئالانی دەدات، خراپترین شێوازی زیندانییکردنی بەسەردا دەسەپێنێت. هەزاران سیاسەتمەداری لە زیندان توندکردووە. سەدان پەرلەمانتار و سەرۆکی شارەوانیی شارەکانی کوردستانی لەسەر کار لاداوە و زیندانییکردوون.

حکومەتی داد و گەشە تەنها بە دژایەتیی شۆڕسی باکووری کوردستانەوە نەوەستا، پەلاماری ڕۆژئاوای کوردستانیشی دا. عەفرین و سەرێکانی و چەندیین شار و گوندی ڕۆژئاوای کوردستانی داگیرکرد. لەو شوێنانە پاکتاوی ڕەگەزی کوردی دەستپێکردووە و کورد دەردەکات و لە شوێنیان عەرەب و تورکمان نیشتەجێدەکات.

لە کاتی ڕیفراندۆمی ساڵی ٢٠١٧ باشووری کوردستاندا، پەتای نەتەوەپەرستیی داگیرکەرانی کوردستان هەڵکشایەوە و بە هەموویان هەوڵیاندەدا سیستەمی فیدراڵیی عێراقیش کۆتاییپێبهێنن و ئەو کەمە مافانەی هەرێمی کوردستانیش نەهێڵن.

بەگوێرەی هەواڵەکانی دەنگوباسی ناو ئێران، حکومەتی نوێی ئێران بە سەرۆکایەتیی ڕەئیسی سیاسەتیکی توند دژی کورد پەیڕەودەکات، بڕیاریداوە نوسسینی کوردیی و ئەدەبیاتی کوردیی لە ئێراندا سنووردرابکات و کۆتاییپێبهێنێت.

بەو شێوەیە بەگوێرەی بارودۆخی ناوچەیی و جیهانیی دابەزین و هەڵچوون لە سیاسەتی دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستاندا بەرانبەر بە دۆزی کورد دەبینین. ئەمە واتای ئەوەیە هەتا سیستەمی حوکمڕانیی ئەو وڵاتانە لە دەستوور و یاسا و ڕۆشنبیریی سیاسییدا بەرانبەر بە دۆزی کورد گۆڕانکاریی بەسەردانەیەت، کاریگەریی گۆڕانکارییە سیاسییە جیهانیی و ناوچەییەکان لەسەر سیستەمی سیاسیی داگیرکەران کاتیی و سنووردار دەبێت.

## ٦- لە شەڕی ڕوسیا و ئۆکرانیاوە:

ئەم شەڕە پیشانیدا زلهێزەکان لەسەر هەژموون و پێگەی سیاسیی و ئابوریی خۆیان لە کێبڕکێدان، بە لایانەوە ئاساییە شەڕێکی تری جیهانیی بەرپا بکەن، پیشانیدا سیستەمی نێودەوڵەتیی باڵادەست توانای چارەسەرکردنی کێشەکانی سەردەمی نییە، پیشانیدا سیستەمی نێودەوڵەتیی بە تەنها لەگەڵ دەوڵەتاندا هەڵسوکەوتدەکات، مافی نەتەوە بێدەوڵەتەکان ڕەچاوناکات.

لەم شەڕدا ئەگەری ڕاگرتنی پێکدادانی سەربازیی هەیە، بەڵام ئەگەری بەردەوامبوونی شەڕی ئابوریی لە نێوان ڕوسیا و هاوپەیمانەکانی و ناتۆ و هاوپەیمانەکانیدا کراوەیە. ئەوروپا دەیەوێت بۆ دابینکردنی وزە چیتر پشت بە گاز و نەوتی ڕوسیا نەبەستێت، هەوڵدەدات سەرچاوەی سەرەکیی وزەی خۆی لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە بە باشووری کوردستانیشەوە بەدەستبخات، ئەمەیش وا دەکات ململانێ و شەڕی ڕوسیا و ڕۆژئاواییەکان بەرەو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ملبنێ. لە ئەنجامی ئەو شەڕەوە ئەگەر هەیە لە ئاستی جیهاندا سیستەمی دوو_جەمسەریی دروستببێتەوەو هێزە سیاسییەکانی گەلی کوردیش بەسەر دوو بەرەدا دابەشببن. ئەو جوڵانەی مانگی ڕابردووی دەسەڵاتدارانی هەرێم بۆ هەناردەکردنی گازی کوردستان بە هاوکاریی تورکیا و وڵاتانی عەرەبی سەر بە ئەوروپا و ئەمریکا دەستیانپێکرد، دەوڵەتی عێراقی هێنایە سەرخەت و دادگای فیدراڵیی عێراق ڕۆژی ١٥/ ٢/ ٢٠٢٢ بڕیاریدا دەرهێنان و بەبازاڕکردنی نەوت و گازی حکومەتی هەرێم نادەستوورییە. دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان و تورکیا و ئەمریکایش پشتیوانیی بڕیارەکەی دادگای فیدراڵیی عێراقیان نەکرد. بۆیە دەکرێت لە سێبەری شەڕی ڕوسیا و ئۆکرانیادا چاوەڕوانی گۆڕانکاریی هەڵوێستی ناوچەیی و جیهانیی بین بەرانبەر بە کێشەی کورد، چاوەڕوانی دابەشبوونی هێزە سیاسییەکانی کوردستانیش بەسەر ئەو دوو بەرەیەدا بکەین.

### ٣- هەڵوێستی نێودەوڵەتیی بەرانبەر بە مافەکانی کورد

### تەنها شاخەکان دۆستی کوردن:

گەلی کورد پێکهاتەیەکی نەتەوەیی چەوساوەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە، خاک و کەلتور و ناسنامەی لەتوپەتکراوە، هەزاران ساڵە سیستەمی سیاسیی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست مافی پێشێلدەکات و هەوڵی لەناوبردنی دەدات. سیستەمی سیاسیی جیهانیش، بەگوێرەی بەرژەوندییەکانی خۆی لەگەڵ ماف و ئازادیی گەلی کورددا دەجوڵێتەوە. بۆیە کورد گوتوویەتی بێجگە لە شاخەکانی کوردستان گەلی کورد دۆستی نییە.

لە جەنگی یەکەمی جیهانییدا ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی ڕوخا، نەتەوەکانی ژێردەستی داوای ماف و ئازادیی خۆیانیان کرد. سیستەمی سەرمایەداریی جیهانیی پشتیوانیی ماف و ئامانجە سیاسییەکانی عەرەب و ئەرمەنیان کرد. لەژێر سێبەری

دەسەڵاتی بەریتاینا و فەرەنسا و یەکێتیی سۆڤیەتدا، ئەو نەتەوانە دەوڵەتی نەتەوەییان دامەزراند. دەوڵەتە سەرمایەدارەکانی ئەو کاتە و یەکێتیی سۆڤیەت، نەک هەر پشتیوانیی گەلی کوردیان نەکرد هەتا دەوڵەتی نەتەوەیی ئاوابکات، بە دوبارە_دابەشکردنەوەی کوردستان بۆ چوار پارچە ڕازیبوون.

گەلی کورد بەو دابەشکاریی و داگیرکارییە ڕازینەبوو، بۆ ڕزگاریی و یەکگرتنەوەی نەتەوەیی تێکۆشانی دەستپێکرد. وڵاتانی باڵادەستی سیستەمی سەرمایەداریی جیهان و یەکێتیی سۆڤیەت، نەک هەر پشتیوانیی تێکۆشانی ڕزگارییخوازی گەلی کوردیان نەکرد، بەڵکو زۆر کاتیش بوونە بەشێک لە دەوڵەتانی داگیرکەر و شانبەشانی داگیرکەران دژی بزاڤی ڕزگارییخوازی گەلی کورد جەنگان.

ئەگەرچی لە دوای هەڵوەشانەوەی یەکێتیی سۆڤیەت و داڕمانی سیستەمی دوو_جەمسەریی، سیستەمی لیبراڵیی سەرمایەداریی جیهان لە گەلێک بواردا گۆڕانکارییکرد، بەڵام ئەوەی هەتا ئەمڕۆ دوای نزیکەی سی ساڵ دەبینرێت، ئەوەیە کە دۆزی کورد لەو سیستەمە نوێیەی جیهاندا هێشتا هەر گرنگییپێنەدراوە.

ئەگەرچی باڵادەستانی سیستەمی سەرمایەداریی بە قسە لەگەڵ نکوڵییکردنی دۆزی کورد و قڕکردنی گەلی کورددا نین، لەگەڵ ئەوەدان کە گەلی کورد لە چوارچێوەی وڵاتانی داگیرکەردا هەندێک مافی سنووورداری هەبێت و لەناونەبرێت، بەڵام مێژوو دەیسەلمێنێت کە وڵاتانی باڵادەستی جیهان دۆزی کوردیان وەکو کارتێکی سیاسیی بەرانبەر بە دۆست و دوژمنەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیان بەکارهێناوە، بازرگانییان بە کێشەی کوردەوە کردووە. هەر کاتێک بەرژەوەندیی وڵاتە زلهێزەکان لەوەدا بووبێت کە گەلی کورد دژی وڵاتە داگیرکەرەکانی کوردستان هەڵوێست پیشانبدات و خەباتی چەکداریی پێشبخات، پشتیوانیی خەباتی چەکداریی گەلی کوردیان کردووە، کاتێک کە دیویانە وڵاتانی داگیرکەری کوردستان سەر بۆ داواکانی وڵاتانی زلهێز دادەنەوێنن، دەستیان لە پشتیوانیی تێکۆشانی گەلی کورد بەرداوە و دژی وەستاونەتەوە و بە داگیرکەریان فرۆشتووە.

لە کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانییدا یەکێتیی سۆڤیەت پشتی لە کۆماری کوردستان کرد، گڵۆپی سەوزی بۆ دەوڵەتی شاهنشایی ئێران هەڵکرد هەتا هێرشی سەربازیی بکاتە سەر کۆماری کوردستان و کۆتاییپێبهێنێت.

سالّی ١٩٧٥ ولاّته یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئێران و ئیسرائیل پشتیان لە شۆڕشی ئەیلول کرد، گڵۆپی سەوزیان بۆ ڕژێمی سەدام هەڵکرد ناوچە ڕزگارکراوەکانی باشووری کوردستان داگیربکاتەوە.

سالّی ١٩٩٩ولاّته یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ڕوسیا و یۆنان و ئەڵمانیا و ئیسرائیل ڕازی نەبوون عەبدوڵلا ئوج ئالان لە ولاتێکی ئەوروپیی مافی پەنابەریی وەربگرێت، لە دەستگیرکردن و ڕفاندنیدا هاوکاریی تورکیایان کرد. لە شەڕی ڕەگەزپەرستانەی دەوڵەتی تورکیا دژی گەلی کورد، ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی پشتیوانیی تورکیا دەکەن. ئەمە پیشانیدەدات کە بالاّدەستانی سیستەمی جیهانیی هەتا ئێستایش لەسەر سیاسەتی دژایەتییکردنی ماف و ئازادییەکانی گەلی کورد بەردەوامن.

لە ٣/ ١١/ ٢٠٠٧ لە واشنتۆن، سەرۆککۆماری ئەمریکا جورج بوش لە کۆبوونەوەیەکدا لەگەڵ سەرۆکوەزیرانی تورکیا گوتی: (پ. ک. ک) دوژمنی تورکیا و عێراق و ئەمریکایە. هەر ئەو ڕۆژە سەرۆککۆماری ئەمریکا ڕەزامەندیی پیشاندا هێزە ئاسمانییەکانی سوپای تورکیا گەریلاکانی هێزی پاراستنی گەل لە ناوچە سنوورییەکانی هەرێمی کوردستان بۆردوومانبکەن .ئەم هەڵوێستەی سەرۆککۆماری ئەمریکا لە کاتێکدایە کە ڕۆژێک لە ڕۆژان (پ. ک. ک) نە دژی حکومەتی عێراق بووە، نە دژی دەوڵەتی ئەمریکا هیچ چالاکییەکی کردووە، نە خوێنی لە لوتی کەسێکی ئەمریکیی هێناوە، ئەو شەڕەی (پ. ک. ک) بەرانبەر تورکیا دەیکات، مافی پاراستنی ڕەوایە کە نەتەوە یەکگرتووەکان دانییپێداناوە.

لە کێشەی مادەی ١٤٠ی دەستووری عێراق و ناوچە دابڕاوەکانی کوردستاندا، عەرەب و تورکمانی عێراق دژی جێبەجێکردنی ئەو برگەیەن، حکومەتی ئەمریکایش پشتیوانیی عەرەب و تورکمان دەکات، لەگەڵ ئەوەدایە کە ئەو برگەیە جێبەجێنەکرێت و پارێزگای کەرکوک نەخرێتەوە سەر سنووری هەرێمی کوردستان.

ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی دژی ڕیفراندۆمی سالّی ٢٠١٧ وەستانەوە، گڵۆپی سەوزیان بۆ سوپای عێراق هەڵکرد بگەڕێتەوە بۆ کەرکوک.

لەگەڵ ئەوەیشدا کە گەلی کورد لە ڕۆژئاوای کوردستان شانبەشانی هاوپەیمانیی نیودەوڵەتیی دژی داعش و سوپای ڕوسیا، شەڕی مان و نەمانی دەکرد، بەلاّم سالّی ٢٠١٨ ڕوسیا گڵۆپی سەوزی بۆ تورکیا هەڵکرد عەفرینی ڕۆژئاوای کوردستان

داگیربکات. ساڵی ٢٠١٩ دۆناڵد ترامپی سەرۆکی ئەمریکا لە کاتی هێرشەکانی تورکیادا بۆ سەر سەرێکانی و گرێسپیی هیچ بەرگرییەکی لە کورد نەکرد و پشتیوانیی تورکیای کرد.

ساڵی ٢٠٠٨ هەر داهات و کۆمپانیایەکی پارتی ژیانی ئازاد (پژاک) لە ئەمریکا بوو، بە بڕیاری حکومەتی ئەمریکا بلۆککرا. ئەم بڕیارەی حکومەتی ئەمریکا لە کاتێکدایە کە دوژمنی سەرسەختی ئەمریکا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا کۆماری ئیسلامیی ئێرانە، پژاکیش یەکێک لە حیزبە ئۆپۆزسیۆنەکانی ئێرانە.

بەو شێوەیە دەبینین سیستەمی سیاسیی جیهانیی، ئەگەرچی لە بواری تردا بەخۆیدا دەچێتەوە و گۆڕانکارییدەکات، بەڵام لەسەر دۆزی نەتەوەی کورد هەتا ئەمڕۆ بە فەرمیی هەڵوێستی پیشاننەداوە، دانی بە بوونی کێشەی کورددا نەناوە، ڕێوشوێنی چارەسەری ئەو کێشەیەی باسنەکردووە.

## جیاوازیی هەڵوێستی ئەمریکییەکان:

پەیوەندییەکانی نێوان ئەمریکا و وڵاتانی داگیرکەری کوردستان لە سەردەمی حوکمڕانیی جۆرج بوشی حیزبی کۆمارییدا ئاماژە بەوە نادەن کە ئەمریکای ڕابەری سیستەمی نوێی جیهان، بۆچوونێکی نوێی بۆ دۆزی کورد هەبێت، هێشتا بۆچوونی حەفتاکانی سەدەی بیستەمی هنری کیسنجەری تێپەڕنەکردووە.

سیاسەتی دیموکراتەکانی ئەمریکا بەرانبەر بە کێشەی کورد هەندێک نەرمیی و هاوسۆزیی پێوەدیارە. لە مانگی نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٩١دا بیل کلنتۆنی سەرۆکی ئەمریکا سەردانی تورکیای کرد، لە پەرلەمانی تورکیا وتارێکی مێژوویی پێشکەشکرد، داوای لە پەرلەمانی تورکیا کرد زیندانە سیاسییەکانی کورد ئازادبکات و هەوڵی چارەسەری پرسی کورد بدات.

لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٩دا ئۆبامای سەرۆکی ئەمریکای سەر بە دیموکراتەکان سەردانی تورکیای کرد، لەگەڵ نوێنەرانی گەلی باکووری کوردستاندا (بەرپرسانی پارتی کۆمەڵگەی دیموکراتیی) دانیشت.

هەڵوێستی دیموکراتەکانی ئەمریکا بەرانبەر بە ڕۆژئاوای کوردستان لە هەڵوێستی کۆمارییەکان هاوسەنگترە. ساڵی ٢٠١٩ ترامپی سەرۆکی ئەمریکای کۆماریی ڕێگەی بە تورکیا دا گرێسپیی و سەرێکانی داگیربکات. ساڵی ٢٠٢١ تورکیا دەیویست ڕەزامەندیی بایدنی سەرۆککۆماری دیموکراتەکان وەربگرێت، بۆ ئەوەی قامیشلۆ داگیربکات. بایدن ڕەزامەندیی پیشاننەدا و هەڕەشەی لە تورکیا کرد. بۆیە دەتوانین بڵێین بەرپرسانی ئەمریکا و ڕابەرانی سیستەمی سیاسیی جیهان، لەسەر دۆزی کورد بۆچوونی جیاوازیان هەیە.

## هەڵوێستە جوانەکان:

ساڵی ١٩٦٣ کۆماری مەنغولیای سەر بە بلۆکی سوسیالیستیی، لەسەر چارەسەرکردنی کێشەی کورد پێشنیازێکی پێشکەش بە کۆبوونەوەی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان کرد، پێشنیازەکە گفتوگۆی جدیی لەسەر نەکرا، کە خرایە دەنگدانەوە ڕەزامەندیی زۆرینەی ئەندامانی ئەنجومەنی ئاسایشی بەدەستنەهێنا.

ساڵی ١٩٨٨ لە فەرەنسا کۆنفرانسێک لەسەر کیمیابارانی هەڵەبجە و ئەنفال بەسترا، فەرەنسا بە توندیی دژی کیمیاباران و ئەنفالی کورد هەڵوێستی پیشاندا، دەوڵەتی عێراقی تاوانبارکرد. ساڵی ١٩٩١ لە کاتی کۆڕەودا لەسەر پێشنیازی فەرەنسا، ئەنجومەنی ئاسایش بڕیاری ٦٨٨ی بۆ پاراستنی گیانی کوردانی باشوور و ئۆپۆزسیۆنی عێراق دەرکرد.

کوردی هەر چوار پارچەی کوردستان دەرفەتیان هەیە لە ئەورووپا لوبییکەن و هەوڵی خەباتی دیبلۆماسیی زیاتر بدەن. کۆنگرەی نەتەوەیی کوردستان (KNK) لە پەرلەمانی ئەورووپا لەسەر کۆمەڵکوژییەکانی کوردستان لەسەر زمان و مێژووی کورد کۆڕ و کبوونەوە و کۆنفرانس دەبەستێت، پەرلەمانی ئەورووپا پیشوازیی و بەشداریی کۆڕ و کۆبوونەوەکان دەکات و پشتگیرییاندەکات.

لە ئەورووپا لەسەر ئاستی کۆمەڵگە و دەسەڵات، هەوڵی لابردنی (پ. ک. ک) لە لیستی تیرۆر بەردەوامە. ڕۆژی ٢٦/ ١١/ ٢٠٢١ پەرلەمانی فەرەنسا لەسەر جینۆسایدی گەلی باشوور کوردستان لە لایەن ڕژێمی سەدامەوە گفتوگۆیکرد، بەڵام وەکو پێویست دەنگی بەدەستنەهێنا.

## ٤- سیمای سیستەمی سیاسیی هەرێم

### ١- جۆری سیستەم:

لەبەرئەوەی هەتا ئەمڕۆیش هەرێمی کوردستان دەستووری نییە، کار بە دەستووری عێراق و یاساکانی پەرلەمانی هەرێم و عێراق ناکرێت، بڕیاری حیزب دەستوورە، حزب قسەی بە برگەی یاسایە، حیزبیش لە ڕێگەی بنەماڵە و خێزانی دەسەلاتدارەوە بەڕێوەدەبرێت، بنەماڵە و خێزانە دەسەلاتدارەکانیش ولاتانی دەوروبەر ئاڕاستەیاندەکەن، ناتواینن شێوازی حوکمڕانیی هەرێمی کوردستان لە هیچ کام لە سیستەمە سیاسییە باوەکانی سەردەم نزیکبکەینەوە، ناتوانین بڵێین سیستەمی کوردستان لیبراڵە، یان شمولییە، لەبەرئەوەی دەسەلات هەرێم بەپێچەوانەی سیاسەت و دەستوری عێراقەوە دەجوڵێتەوە ناتوانین بڵێین سیستەمی سیاسی هەرێم بەشێکی سیستەمی سیاسی عێراقە، یان ئیسلامییە. ئاسنترین ناوێک کە بتوانین بەسەر سیستەمی سیاسیی هەرێمدا دایبڕین سیستەمێکی حیزبیی بنەماڵەیی گرێدراوە.

### ٢- دوژمنی سەرەکیی:

هەموو ولاتێک و نەتەوەیەک دۆست و دوژمنی هەیە، دوژمنی سەرەکیی و دوژمنی لاوەکیی هەیە. ڕیزکردنی ئەم دۆست و دوژمنانە سیستەمی سیاسیی ڕوندەکاتەوە. لە هەرێمی کوردستاندا دوژمنی سەرەکیی و دوژمنی لاوەکیی و دۆست بەناویەکداچوون، زۆر جار دوژمنی گەلی کورد وەکو دۆستی ستراتیژیی سەیردەکرێت.

ململانێی سەرەکیی لە هەرێمی کوردستاندا لە نێوان دەسەلاتی هەرێم و دوژمنەکانی گەلی کورد و دوژمنەکانی حکومەتی هەرێمدا نییە، هێزی کورد ڕووبەڕووی دوژمن ناکرێتەوە، ململانێی سەرەکیی لە نێوان حیزبە دەسەلاتدارەکاندایە، خەڵکی کوردستان و حکومەتی هەرێم و داهاتی کوردستان بۆ شەڕ و ململانێی ناوخۆیی بەکاردێت. شەڕ و ململانێی هەرێم لەسەر سنووری دەسەلاتی حیزبەکانە، لەسەر سنوور و دەسەلاتی کوردستان نییە، حیزبە دەسەلاتدارەکان سنووریان بۆ ئەو ململانێیە دانەناوە. بۆ

لابەلاکردنەوەی ململانێکان، سوپای داگیرکەرانی کوردستان پەلکێشی کوردستان دەکەن، خاکی کوردستان بە بەرتیل پێشکەش بە داگیرکەران دەکەن.

بەهۆی ئەوەوە کە پارتیی و یەکێتیی یەکتر بە دوژمنی سەرەکیی خۆیان دەزانن، چەندیین خولی شەڕی براکوژیی لە نێوان هێزی پێشمەرگەی کوردستانی حیزبەکاندا دروستبووە، بەهۆی ئەم شەڕەوە چەندیین جار سوپای ئێران و تورکیا و عێراق بۆ پێشێلکردنی سەروەریی خاکی هەرێم و عێراق بانگکراون.

## ٣- بانگکردنی سوپای داگیرکەران:

هەر کاتێک ناکۆکیيە ناوخۆییەکانی نێوان حیزبەکانی باشوور، یان ناکۆکییەکانی نێوان حیزبەکان و عێراقی ناوەندیی تاویسەندبێت، دەسەڵاتدارانی باشوور بیریانچووەتەوە کە بەشێکی کوردستان و عێراقن. بۆ لابەلاکردنەوەی ناکۆکییەکانیان لەگەڵ ڕکابەرەکەیاندا، بانگی لەشکری داگیرکەرانی تری کوردستانیان کردووە بە هانایانەوە بێت، بە پەلکێشکردنی سوپای ئەو وڵاتانە، سەروەریی هەرێمی کوردستان و عێراقیان پێشێلکردووە. بە سوپای تورکیا و ئێران عێراق، ناکۆکیی و شەڕە ناوخۆییەکانیان یەکلاکردووەتەوە. هەر کاتێک وسیتبێتیان زیان بە عێراق بگەیەنن کەوتوونەتە پێش سوپای ئێران و تورکیا بەشێک لە خاکی عێراقیان پێداگیرکردووە.

پارتیی گەورەترین حیزبی هەرێمی کوردستان و عێراقە، لە دروستبوونی عێراقی نوێوە بە بەردەوامیی پۆستی جێگری سەرۆکی پەرلەمان و وەزارەتێکی سیادیی و چەندیین پۆستی تری لە دەوڵەتی عێراقدا بەرکەوتووە، کەچی لە ڕاگەیاندن و لە قسەی دۆست و کادر و بەرپرسەکانیەوە، عێراق بە دوژمنی گەلی کورد دەزانێت. تورکیا بە هەرێمی کوردستان دەڵێت باکوری عێراق، بەگوێرەی دەستووری عێراق لەگەڵ هەرێمی کوردستاندا ناجوڵێتەوە. پارتیی تورکیا بە دۆستی کورد دەزانێت، ڕێگەدەدات سوپای تورکیا خاکی ئەو عێراقە داگیربکات کە بە دەستوور مافەکانی گەلی کوردستانی گەرەنتییکردووە.

ئەم دیاردەیە لە هیچ وڵاتێکدا و لە ناو هیچ گەلێکدا نەبینراوە، تەنها لە لای حیزبە دەسەڵاتدارانی باشووری کوردستاندا (پارتیی و یەکێتیی) دەبینرێت. ئەمە پێگەی

سیاسیی و مۆراڵی دەسەڵاتی باشووری نزمکردووەتەوە، پەرچەکرداری کوردستانیی و عێراقیی و جیهانیی خراپی لێکەوتووەتەوە. دەوڵەتی عێراق بە ئاشبەتاڵی ساڵی ١٩٧٥ و ئەنفال و کیمیابارانی ساڵی ١٩٨٨ وەڵامی ئەو سیاسەتەی داوەتەوە، کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیی بە پەراوێزخستنی دۆزی کورد وەڵامی دەسەڵاتی باشووری کوردستانی داوەتەوە.

## ٤- بڕیاری سیاسیی:

لە سەردەمی خەباتی چەکدارییدا، سیاسەتی حیزبە دەسەڵاتدارەکان گرێدراوی سیاسەتی وڵاتانی دەوروبەر بوو، بەو هۆیەوە بڕیاری سیاسیی حیزبەکان سەربەخۆ نەبوو، نەیاندەتوانی بە سەربەخۆ بەبێ ڕەزامەندیی ئەو وڵاتانە بڕیاربدەن. لە دوای ڕاپەڕین دەزگاکانی هەرێم لە لایەن حیزبەوە کۆنترۆڵکران، هەرێم ڕاپرسیی بۆ دەستوور نەکرد. ئیتر بڕیاری سیاسیی لەژێر دەستی حیزبدا مایەوە، حیزبیش وەکو جاران لەژێر کۆنترۆڵی وڵاتاندایە، بۆیە هەتا ئێستا هەرێمی کوردستان خاوەنی بڕیاری سیاسیی سەربەخۆ نییە.

لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام، دەرفەتێکی تر بۆ دەسەڵاتدارانی هەرێمی کوردستان هاتەپێشەوە هەتا هەرێم دەستووری هەبێت، بڕیاری سیاسیی بەگوێرەی دەستوور بدات، بڕیاری سەربەخۆ بدات، بەڵام دەسەڵاتدارانی باشووری کوردستان کارئاسانییان بۆ ئامادەکردنی ڕەشنوسی دەستوور نەکرد، بە چەندیین بیانووی جیاوازەوە ئامادەکردنی ڕەشنوس و ڕاپرسیی دەستوور دوادەخەن.

## ٥- دابەشکردنی کوردستان:

لە سنووری هەرێمی کوردستاندا دوو دەسەڵاتی ناکۆک هەیە، حکومەتی هەرێمی کوردستان لە زۆنی سەوزی (یەکێتیی) و لەزۆنی زەردی (پارتیی) پێکهاتووە. پەیوەندیی نێوان ئەو دوو زۆنە کۆنفیدراڵیی بنەماڵەیی نێوان بنەماڵەی بەرزانیی و بنەماڵەی تاڵەبانییە. لە زۆنی زەرد بنەماڵەی بەرزانیی دەستیان لە قوڕگی دامودەزگاکانی حکومەت و پەرلەمان

و دادوەریی و ئابوریی و ڕاگەیاندن گیرکردووە، خۆیان و دۆستە ناوچەییەکانیان چالاکییەکانی دامودەزگاکانی هەرێم ئاڕاستەدەکەن. لە زۆنی سەوزدا یەکێتیی و بنەماڵەی تاڵەبانیی، دەستیان بەسەر هەموو کایەکانی دەوڵەتداریی زۆنەکەدا گرتووە، خۆیان و دۆستە ناوچەییەکانیان سیاسەتی سنووری زۆنی سەوز ئاڕاستەدەکەن.

ئەم شێوازی ڕێکخستنە سیاسیی و ئیداریی و ئابورییەی هەرێمی کوردستان، لە هیچ وڵاتێکی جیهاندا نمونەی نییە. بڕیارەکانی ئەم دوو زۆنە زۆربەی کات بە یەکتر ناکۆکن، لەسەر پەیوەندییان بە عێراقی ناوەندییەوە زۆنی سەوز و زۆنی زەرد بۆچوونیان جیاوازە.

سیاسەتی دوو_زۆنیی و دوو_ئیدارەیی جیاواز لە هەرێمی کوردستاندا، جۆرێکی نوێی دابەشکردنی کوردستانە. جاران دوژمنەکانی کورد کوردستانیان دابەشدەکرد، ئێستا کورد بۆ خۆی، یان بەناو ڕزگارکەرانی کوردستان، کوردستان دابەشدەکەن.

### ٦- خێڵایەتیی و نەتەوایەتیی: خێڵ ڕێبەری نەتەوەیە

دەکرێت بنەماڵەیەک، یان خێڵێک ڕابەرایەتیی خەباتی ڕزگاریی نیشتیمانیی نەتەوەیەک بکات، بەڵام دەبێت بەگوێرەی کات گۆڕانکاریی لە هزر و دیدی خێڵەکیی ئەو پێکهاتەیەدا دروستببێت، لە پێکهاتەیەکی خێڵەکییەوە بۆ پێکهاتەیەکی نەتەوەیی بگۆڕدرێت، بۆ ئەوەی بتوانێت وەڵامی پێویستییەکانی قۆناغی نەتەوەیی بداتەوە.

لە شەستەکانی سەدەی بیستەوە بەرزانییەکان جڵەوی بزوتنەوەی ڕزگارییخوازی باشووری کوردستانیان بەدەستەوە گرتووە، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ هزری خێڵەکیی لە ناویاندا گەشەدەکات، هەتا سەر مۆخی ئێسقان خێڵەکیین و ناتوانن ببن بە بەشێک لە نەتەوەی کورد و خەڵکی کوردستان.

وا نزیکەی ٣٠ ساڵ بەسەر ڕاپەڕیین و پێکهێنانی حکومەتی هەرێمدا تێپەڕی، سەرکردایەتیی دەسترۆیشتووی پارتیی، هەوڵێنەدا ناکۆکیی نێوان پێکهاتەی خێڵایەتیی و خەباتی نەتەوەیی یەکلابکاتەوە. بنەماڵەی مەلا مستەفای بەرزانیی نایانەوێت خۆیان لە بۆتەی نەتەوەی کورددا بتوێننەوە، دەیانەوێت بەشێکی سەرەوەی کۆمەڵگەی کوردستان بن، تا کۆمەڵگەی کوردستان و نەتەوەی کورد خزمەتی ئەوان بکات.

دەیانەوێت هەموو گەلی کورد پەیڕەوی سیستەمی سیاسیی ئەوان بکات، دەیانەوێت لە یەک کاتدا پێکهاتەیەکی خێڵەکیی و نەتەوەیی و ئاینیی بن. ئەمەیش ناکۆکیی بۆ سیستەمی سیاسیی هەرێمی کوردستان دروستدەکات. لە ئەنجامی چارەسەرنەکردنی ئەو ناکۆکییەی کە لە نێوان ناوەڕۆکی کێشەی نەتەوەی کورد و شێوازی خێڵەکیی دەزگای چارەسەری کێشەکەدا هەیە، سیستەمی سیاسیی هەرێمی کوردستان هەتا ئەمڕۆیش پێینەگرتووە.

## ٧- ئۆپۆزسیۆنی سەرنەکەوتوو:

لە دوای کارەساتی ساڵی ١٩٧٥ شۆڕشی ئەیلولەوە، شۆڕشی نوێ دەستیپێکردەوە. دیاردەی فرەحیزبیی لە کوردستاندا سەریهەڵدا. هەندێک لە حیزبەکانی باشووری کوردستان وەکو حسک و پاسۆک و پارتی گەل و ئاڵای شۆڕش، هەر لە سەردەمی خەباتی چەکدارییەوە وەکو ئۆپۆزسیۆنی پارتیی و یەکێتیی خۆیان پیشاندا، بەڵام سەرکەوتنیان بەدەستنەهێنا، نەیتوانی ململانێیەکی جدی لەگەڵ پارتیی و یەکێتیی بکەن.

دوای ڕاپەڕیین حسک و پاسۆک و پارتی گەل، بۆ هەڵبژاردنی یەکەم خولی پەرلەمانی هەرێمی کوردستان یەکیانگرت و ویستیان وەکو ئۆپۆزسیۆنی پارتیی و یەکێتیی خۆیان پیشانبدەن، بەڵام کە بینییان لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩٢ی خولی یەکەمی پەرلەماندا سەرکەتوو نەبوون، هەریەکە و خۆی کردەوە بە دەرگای ئەوماڵەدا کە لێیەوە هاتبوونە دەرەوە، پەیوەندییان بە پارتیی و یەکێتییەوە کردەوە.

لە دوای ڕاپەڕینەوە باڵی باشووری کوردستانی (پ. ک. ک) چالاکییدەکات، ئەو کەسانەی باشوور کە لە (پ. ک. ک) نزیکدەبنەوە، ئامانجیان ئەوەیە باڵی باشووری (پ. ک. ک) ئۆپۆزسیۆنی دەسەڵات و بەدیلی دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان بێت، بەڵام سەرکردایەتیی (پ. ک. ک) بۆچوونی وا نییە، سەرکردایەتیی (پ. ک. ک) ڕەخنە لە دەسەڵاتی هەرێم دەگرێت، بەڵام هەرگیز ڕێگەینەداوە باڵی باشووری حیزبەکەی وەکو ئۆپۆزسیۆنی ڕاستەقینەی دەسەڵاتی هەرێم کاربکات، ڕازینەبووە باڵی باشووری حیزبەکەی کار بۆ جێگەگرتنەوەی دەسەڵاتی پارتیی و یەکێتیی بکات.

له ساڵی ٢٠٠٦وه، سەرەتا بە ناوی کۆمپانیای وشەوە، دواتر بە ناوی بزوتنەوەی گۆڕانەوە، بزوتنەوەیەکی سیاسیی و جەماوەریی لە هەرێمی کوردستاندا بە ڕابەرایەتیی نەوشیروان مستەفا دروستبوو. لە هەڵبژاردنی ٢٥/ ٧/ ٢٠٠٩ پەرلەمانی هەرێمی کوردستاندا، بیستوپێنج کورسیی پەرلەمانی بەدەستهێنا. ئەم بزوتنەوەیە باسی گۆڕینی سیستەمی سیاسیی هەرێم دەکرد، لە بەرنامەی هەڵبژاردنی لیستی گۆڕاندا، چەند خاڵێک بۆ گۆڕینی سیستەم دەبینرا، گرنگیی بە ئازادیی سیاسیی و خزمەتگوزاریی و بەدەزگابوونی سیاسەت و حوکمڕانیی دەدا.

خاڵی لاوازی بزوتنەوەی گۆڕان ئەوە بوو تاکی کۆمەڵگەی کوردستانی نەگۆڕی بۆ ئەوەی سیاسەتی پێبکات، بەو کەلتورە باوەی کۆمەڵگەی کوردستانەوە کاریکرد، کە پێشتر داگیرکەران و حیزب و خێڵ و بنەماڵە لە ناخی تاکی کورددا جێگیریانکردبوو. ئەو کەسانەی بزوتنەوەی گۆڕانیان دروستکرد چێژیان لە دەسەڵات و دەسەڵاتداریی وەرگرتبوو، زەحمەتبوو بۆ ماوەیەکی درێژ بەبێ دەسەڵاتداریی بتوانن سیاسەتبکەن.

بزوتنەوەی گۆڕان دەیەویست بینایەکی نوێ بە کەرەستەیەکی کۆن دروستبکات. ئەم جۆرە بیناسازییە بەزەحمەت گۆڕانکاریی جدیی لەگەڵ خۆی دەهێنێت، بۆیە پاش چوار ساڵ لە ئۆپۆزسیۆنبوون، ملی خۆی لەژێر چەقۆی دەسەڵاتدا دانا و خۆی ڕادەستی حیزبە دەسەڵاتدارەکان کردەوە. هەر جارەی لە پەراوێزی یەکێک لەو حیزبانەدا چاوشارکێدەکات، نەیتوانی سیستەم بگۆڕێت.

ئیتر پارتیی و یەکێتیی بەگوێرەی ئەو پەندەی کوردەواریی هەڵسوکەوتدەکەن کە دەڵێت: «کتکان لە ماڵەوە نین، مشکان تلیلیلیانە».

لە هەرێمی کوردستاندا هەر یەکەیان خۆی بە ئۆپۆزسیۆنی زۆنە ڕکابەرەی دەزانێت، هەردووکیان خۆیان بە ئۆپۆزسیۆنی حکومەتی عێراق دەزانن. ساڵی ٢٠١٨ حیزبێکی نوێ بە ناوی (نەوەی نوێ)وە دامەزرا، لەو کاتەوە خەباتدەکات، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە گەشەکردندایە. بەشداریی هەڵبژاردنەکانی هەرێمی کوردستان و عێراق دەکات، لەو کاتەوە ئۆپۆزسیۆنی دەسەڵاتی هەرێمن، لە پێکهێنانی حکومەتی هەرێمدا بەشدارییناکەن.

## ٨- حیزبی حیزب:

لە سەرتاسەری جیهاندا حیزبە سیاسییەکان سەربەخۆن، پەیڕەو و پڕۆگرام و سەرکردایەتیی و سیاسەتی تایبەتی خۆیانیان هەیە، ئامانجی حزبی سیاسی بەدەستەوەگرتنی دەسەڵاتە.لە هەرێمی کوردستاندا چەندیین حیزبی سیاسیی هەن بە ناچاری بێت یان بە قەناعەتەوە بێت، لە فەلەکی حیزبەکانی تردا دەسوڕێنەوە. پارتیی و یەکێتیی کۆنترۆڵی داهاتی کوردستانیان کردووە، دەستیان بەسەر هێزی چەکداریی هەرێم و دادگاکانی هەرێمدا گرتووە، پەیوەندییە کوردستانیی و عێراقیی و ناوچەیی و جیهانییەکانیان بە دەستی خۆیانەوە گرتووە، ڕێگەنادەن دەستاودەستکردنی دەسەڵات سەربگرێت. موچە بۆ حزبەکانی تر دەبڕنەوە، سەربەخۆیی سیاسیی و چالاکی حزبەکانی تر سنووردارردەکەن. لە کاتی هەر سەرکێشییەکی ئەو حیزبانەدا بۆ سەربەخۆبوونیان، پارە و هێز و یاسا و دیبلۆماسیەت لە دژیان بەکاردەهێنن و ملکەچیاندەکەن. ئیتر وایلێهاتووە ئەو حیزبانە لە سێبەری حیزبە دەسەلاتدارەکاندا سیاسەتبکەن، لە بڕیاری سیاسییدا سەربەخۆ نەبن، بۆیە خەڵک دەڵێت پارتیی و یەکێتیی تەنها ئەندام و کادر و سەرکردایەتییان نییە، حیزبیشیان هەیە.

لە دوای ڕاپەڕینەوە هەتا ئەمڕۆ (پ. ک. ک) لە باشووری کوردستاندا حیزب دروستدەکات، ئەم حیزبانە لە ڕووی ئایدۆلۆجیی و ڕێکخستنەوە سەر بە سیستەمی سیاسیی پارتی کرێکارانی کوردستانن، ئەو حیزبانە بە چالاکیی ڕێکخستنیی و جەماوەریی پشتگیریی سیاسەتی (پ. ک. ک) دەکەن. بەڵام پ. ک. ک ڕێگەیان پێنادات لە هەرێمی کوردستاندا لەسەر حوکمڕانیی ململانێی پارتیی و یەکێتیی بکەن و هەوڵی بەدەستهێنانی دەسەڵات بدەن، کەی بیەوێت ئەو حیزبانە هەڵدەوەشێنێتەوە و حزبێکی نوێ ئاوادەکاتەوە.

## ٩- لادان لە سیاسەتی عێراق:

ئەگەر سەیری سیستەمی سیاسیی عێراقی دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام بکەین، لەگەڵ سیستەمی سیاسیی هەرێم بەراوردیبکەین، جیاوازیی زۆرمان بۆ دەردەکەوێت. ژمارەیەکی بەرچاو لە حیزبە سیاسییەکانی عێراق کە تازە دامەزراون، دەسەڵات

بەدەستەوەدەگرن. لە هەرێمی کوردستاندا تەنها حیزبە کۆنەکانی سەردەمی خەباتی چەکداریی دەسەڵات بەدەستەوەدەگرن.

لە عێراقدا زۆر بە کەمیی خێزان و بنەماڵەکان سەرکردایەتیی حیزبەکان دەکەن، ڕێکخستنە سیاسییەکانی عەرەب و تورکمان و ئاشوریی و کلدان، هەژموونی خێڵ و بنەماڵە و خێزانیان بەسەرەوە نییە، بەڵام هەردوو حیزبی دەسەڵاتداری باشووری کوردستان و حیزبەکانی تر، لە لایەن خێزان و بنەماڵەکانی باشووری کوردستانەوە سەرکردایەتییدەکرێن. لە عێراقدا دەسەڵاتەکانی ڕاپەڕاندن و یاسادانان و دادوەریی و ڕاگەیاندن سەربەخۆن. لە هەرێمی کوردستاندا ئەو دەسەڵاتانە لە لایەن حیزبەوە دەستیانبەسەرداگیراوە.

لە عێراق و لە وڵاتانی تردا دەستوور هەیە، کار بە یاسا دەکرێت، دیاردەی دەستاودەستکردنی دەسەڵات لە ناو حیزب و لە ناو دەزگاکانی دەوڵەتدا جێگیربووە. لە هەرێمی کوردستاندا دەستوور نییە، یاسا لە خزمەتی حیزب و بنەماڵەدایە، دەستاودەستکردنی دەسەڵات لە سنووری بنەماڵەکاندا دەکرێت.

### ١٠- سەرمایەی هەرێم قۆرخدەکرێت:

یەکێک لە ئەرکەکانی هەر حکومەتێک ئەوەیە ئابوریی وڵاتەکەی ببوژێنێتەوە. یەکێک لە شێوەکانی بوژاندنەوەی ئابوریی سودوەرگرتنە لە سەرمایەی وڵاتانی تر. لە هەرێمی کوردستاندا بنەماڵە دەسەڵاتدارەکان لە ڕێگەی حیزب و حکومەتەوە دەستیان بەسەر سەرمایەی کوردستاندا گرتووە. لە کوردستان وەبەرهێنان بە سەرمایەکە ناکەن، پرۆژەی ئابوریی بەو سەرمایەیە دروستناکەن هەتا کار بۆ خەڵکی کوردستان بدۆزنەوە و ئابوریی کوردستان و عێراق بەهێزبکەن. سەرمایەکە ڕەوانەی دەرەوەی کوردستان دەکەن. ئیتر وڵاتانی بێگانە و داگیرکەرانی کوردستان سود لە سەرمایەی کوردستان وەردەگرن.

بنەمالە دەسەڵاتدارەکان لە دەرەوەی بڕگەکانی دەستووری عێراق، بەبێ ڕەزامەندیی پەرلەمانی کوردستان، نەوتی هەرێم دەردەهێنن و دەیفرۆشن، داهاتی

فرۆشی نەوتەکەیش نادیارە. لە هەرێمی کوردستاندا داهات بۆ پێشخستنی زانست و تەکنۆلۆژیا و بۆ ڕاستکردنەوەی ژێرخانی ئابوریی وڵات بەکارنایەت. داهاتی کوردستان بۆ دەوڵەمەنکردنی دەسەڵاتداران و بۆ مشەخۆرکردن و بێبەرهەمکردنی تاک و کۆمەڵگەی کوردستان بەکاردێت.

لەم ڕۆژانەدا کۆمپانیان دیلۆت ( Deloitte)*٣، ڕاپۆرتی شەش مانگی یەکەمی داهاتی نەوتی هەرێمی کوردستانی بڵاوکردەوە، لە ڕاپۆرتەکەدا هاتووە:

هەرێم بڕی ٧٧ ملیۆن بەرمیل نەوتی هەناردە کردووە، ٤ چوار ملیار دۆلار داهاتی فرۆشی ئەو نەوتە بووە، تەنها ١.٧٣٧ یەک ملیار و حەوتسەد و سیوحەوت ملیۆن دۆلاری داهاتی ئەو نەوتە گەڕاوەتەوە بۆ خەزێنەی حکومەتی هەرێم. هەر لە هەمان ڕاپۆرتدا دیلۆت دەڵێت:

بڕی ٢٩٤ ملیۆن دۆلار و ٣١٠ ملیۆن یۆرۆ پارەی نەوتی هەرێم لە بانکێکی لوبنان دەستیبەسەرداگیراوە.

### ١١- دەسەڵاتی دادوەریی حیزبییە:

لەو وڵاتانەدا کە سیستەمی دیموکراسیی پەیڕەودەکرێت، دادگا سەربەخۆیە و دوور لە دەستتێوەردانی دەسەڵاتی جێبەجێکردن و دەسەڵاتی یاسادانان، کاروباری خۆی بەڕێوەدەبات. لە هەرێمی کوردستاندا دادوەر حیزب دایدەنێت، ئەگەر دادوەرەکە حیزبیی نەبێت چەندە بەئەزموون و بەتوانا بێت، مافی ئەوەی نییە پۆستی دادوەریی وەربگرێت. لە هەرێمی کوردستاندا دامودەزگاکانی دەسەڵاتی دادوەریی بەسەر حیزبەکاندا دابەشدەکرێن، بەگوێرەی پێگەی سیاسیی حیزب، هەر حیزبە و چەند دادوەرێکی بەردەکەوێت. ئەم جۆرە دەستخستنە ناو دادگاکانی هەرێم بۆ ئەوەیە دادوەر بەگوێرەی یاسا بڕیارنەدات، بەگوێرەی بەرژەوەندیی حیزب بڕیاربدات.

سالانی ٢٠٠٤ - ٢٠٠٨ سەرۆکی حیزبێکی (پ. چ. د. ک) ئۆپۆزسیۆن بووم، لەگەڵ دەسەڵاتدارانی زۆنی سەوزدا لە ململانێدا بووم، بێجگە لەوەی چوار جار بەبێ بڕیاری دادگا زیندانییانکردم، چەندیین جار لە دادگایش سکاڵایان

لەسەر تۆماردەکردم، لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ دەکردم. منیش چەندینجار لە پۆلیسی سلێمانی و لە دادگای سلێمانی و سکاڵام لەسەر ئاسایش و دژەتیرۆر و دەزگای زانیاریی یەکێتیی تۆمارکرد، بە تۆمەتی ئەوەی دوور لە یاسا و مافی مرۆڤ هەڵسوکەوتیان لەگەڵ کردووم، ڕۆژێک نەمدی دادگا لە سکاڵاکەی من بپرسێتەوە، لەسەر سکالای من لێکۆڵینەوە لەگەڵ لایەنی بەرانبەر بکات.

ساڵی ٢٠٠٦ دادگایەکی شاری هەولێر حوکمی ٣٠ ساڵ زیندانیی بەسەر دکتۆر کەمال سەید قادردا سەپاند. دوای چەند مانگێک سەرۆکی حکومەت بڕیارەکەی دادگای هەڵوەشاندەوە و کەمال سەید قادری ئازاد کرد.

ساڵی ٢٠٢١ دادگای تاوانەکانی هەولێر حوکمی ٦ ساڵ زیندانیی بەسەر چوار چالاکوانی ناوچەی بادیناندا سەپاند، بڕیارەکە لە لایەن دادگای پێداچوونەوەی هەرێم سەیرکرایەوە، ئەو دادوەرانەی سەر بە پارتیی بوون بڕیارەکەی دادگای هەولێریان قبوڵکرد، ئەو داوەرانەی سەر بە یەکێتیی بوون دژی بڕیارەکەی دادگا وەستانەوە. لەیەکەم ڕۆژی جەژنی ڕەمەزانی ٢٠٢٢ لە ٢٠٢٢/٥/٢ کەناڵی ڕووداو لە چەمچەماڵ ئاشکرایکرد پێشمەرگەیەک چوار کەسی خێزانێکی کوشت، دەرکەوت ئەو پێشمەرگەیە پێشتریش حەوت کەسی کووشتووە و دەستگیر نەکراوە، لەبەرئەوەی حزب پشتگیریی لەو بکوژە کردووە و دادگا و پۆلیس بێهەڵوێست بوون.

ڕۆژی ٨/ ١٢/ ٢٠٢١ لە کەناڵی تەلەفزیۆنی ڕوداووە، سەرۆکی هەرێم لە مەراسیمی دەستبەکاربوونی سەرۆکی نوێی ئەنجومەنی دادوەریی هەرێمی کوردستان و ژمارەیەک دادوەردا گوتی: دەسەڵاتی دادوەریی کێشە و تەحەدایەکی زۆری لەبەردەمدایە، دەستوەردان و کاریگەریی سیاسەت لەسەر بڕیارەکانی دادگا هەیە. داوا دەکەم دەسەڵاتی دادوەریی داکۆکیی لە مافی خۆی بکات، دووربێت لە کاریگەریی سیاسیی.

ئەم لێدوانەی نێچیرڤان بەرزانیی بە دڵی خەڵکی کوردستان و دۆستەکانی کورد بوو، ئەمریکییەکان پشتیگریی خۆیان بۆ ئەو هەڵوێستەی بەرزانیی پیشاندا، ڕاگەیاندنەکانی کوردستان گرنگییان بە هەڵوێستە نوێکەی نێچیرڤان بەرزانیی دا.

### ١٢- هێزی چەکدار حزبی:

هێزی چەکداری هەرێمی کوردستان پێشمەرگە و ئاسایش و پۆلیس و دژەتیرۆر و پاسەوانی سنوور دەگرێتەوە، ئەم هێزانە سەر بە حیزبەکانن، سەر بە حکومەت نین. پێش ڕاپەڕین حیزبەکان پێشمەرگەی تایبەتی خۆیان هەبوو. دوای دامەزراندنی حکومەتی هەرێم و کۆتاییهاتنی شەڕی ناوخۆ، هێزی پێشمەگەی حیزبەکان وەکو خۆی مایەوە.

دوای ڕوخاندنی ڕژێمی سەدام، ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی خەڵکی کوردستان و ئۆپۆزسیۆن، هەوڵی زۆریان دا، بۆ ئەوەی هێزی پێشمەرگەی پارتیی و یەکێتیی تێکەڵبکرێت و هێزێکی نیشتیمانیی یەکگرتووی لێدروستبکرێت، بەڵام ئەو هەوڵانە سەرکەوتوو نەبوون.

لە دوای ڕاپەڕین ئاسایشی هەرێم لە کادر و پێشمەرگەی حیزبە دەسەڵاتدارەکان دروستکرا، هەر حیزبە و لەژێر دەسەڵاتی خۆیدا (زۆنی زەرد و سەوز) ئاسایشی سەر بە خۆی دروستکرد. بەرژەوەندیی حیزب چی بخوازێت ئاسایش ئەوە دەکات، دەزگای ئاسایش بە تەواویی دەزگایەکی حیزبییە، ئاسایش حیزبی دەسەڵاتدار دەپارێزێت. زۆر هەوڵدرا بۆ ئەوەی ئاسایشی پارتیی و یەکێتیی تێکەڵبکرێن و ئاسایشێکی نیشتیمانیی لێدروستبکرێت، بەڵام هەتا ئێستا هەوڵەکان سەرکەوتنیان بەدەستنەهێناوە.

دوای ڕاپەڕین دەزگاکانی پۆلیسی سەردەمی ڕژێمی بەعس لە شوێنی خۆیان مانەوە، هەر حیزبە و دەستی بەسەر دەزگای پۆلیسی سنووری دەسەڵاتی خۆیدا گرت. بەڕێوەبەری حیزبیی بۆ دانان، دەستی بەحیزبییکردنی پۆلیسەکان کرد، بەو شێوەیە پۆلیسیش لە لایەن حیزبەوە داگیرکرا.

هێزی پاسەوانی سنوورەکان لە ڕووی فەرمیی و موچەوە سەر بە حکومەتی عێراقن، بەڵام بەرپرس و ئەندامەکانی ئەو هێزە، هەر لە لایەن حیزبە دەسەڵاتدارەکانەوە دادەنرێت. پاسەوانی سنووری دهۆک و هەولێر سەر بە پارتییە، پاسەوانی سلێمانیی و گەرمیان سەر بە یەکێتییە.

دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام، بە پشتیوانیی ئەمریکا پارتیی و یەکێتیی دوو دەزگای سەربازیی تریان بۆ خۆیان دروستکرد، ناوی دەزگای دژەتیرۆریان لێنا. ئەم دوو

دەزگایە لە لایەن هاوپەیمانانەوە پشتیوانییدەکرێن، ئامانجی سەرەکیی دژایەتییکردنی تیرۆری ئیسلامییە توندڕەوەکانە. ئەم دوو دەزگایە نەک هەر دەزگای حیزبیین، دوو دەزگای دەمارگیری حیزبیین، ئەو دوو دەزگایە بە خەستیی سیاسەتی حیزبایەتیی تەسکی نێوان پارتیی و یەکێتیی زەقدەکەنەوە.

حیزبە دەسەڵاتدارەکان کەی بیانەوێت ئەم هێزە چەکدارانە دژی خەڵکی ناڕازی دەجوڵێنن، خۆپیشاندەر دەستگیردەکەن و زیندانییدەکەن و دەکوژن، کەس لێیانناپرسێتەوە. حیزبە دەسەڵاتدارەکان کەی بیانەوێت ئەم هێزە چەکدارە بەردەدەنە گیانی شۆڕشگێرانی پارچەکانی تری کوردستان و خزمەتی سیاسەتی شۆڤینیی داگیرکەرانی کوردستانیان پێدەکەن. هێزی دژەتیرۆر و هێزە چەکدارەکانی تر، بۆ لابەلاکردنەوەی ناکۆکییە ناوخۆییەکانی حیزبەکانی خۆیشیان بەکاردەهێنن*٤.

لەهیچ وڵاتێکدا حزب هێزی چەکداری نییە، هێزی چەکدار سەر بەدەوڵەت و نیشتمانییە.

## ١٣- پەرلەمانی حزبی:

لە ١٩/ ٥/ ١٩٩٢ هەڵبژاردنی خولی یەکەمی پەرلەمانی کوردستان کرا، خەڵک بەتەمابوو پەرلەمانی هەرێم وەکو پەرلەمانی وڵاتە دیموکراتییەکان بێت، دەسەڵاتی یاسادانان و چاودێرییکردن و لێپرسینەوەی حکومەتی هەبێت، لە بڕیارە هەستیار و ستراتیژییەکاندا ڕۆڵی هەبێت.

لە خولی یەکەمدا هەردوو حیزبی دەسەڵاتدار زۆرینەی کورسییەکانی پەرلەمانیان بەدەستهێنا، حیزبەکانی تریان پەراوێزخست، بەڵام پەرلەمانی هەرێم وەکو ئەوە نەبوو خەڵک بیری لێدەکردەوە، پەرلەمانی کوردستان وەکو دەزگاکانی تری ڕاپەڕاندن و داوەریی لە لایەن حیزبەکانەوە کۆنترۆلکرا. لەو کاتەوە پەرلەمان وەکو دەزگایەکی مەکتەبی سیاسیی حیزبەکان هەڵسوکەوتدەکات، سەرۆکی فراکسیۆنەکانی پەرلەمان ئەندامی مەکتەبی سیاسیی حیزبەکانن، هەر یاسایەکی پەرلەمان و هەر بڕیارێکی پەرلەمان ڕەزامەندیی حیزبی لەسەر نەبێت، پەرلەمان گفتوگۆی لەسەر ناکات و بڕیاری لەسەر نادات. لەبریی ئەوەی ئەندامپەرلەمانەکان داکۆکیی لە مافی خەڵک

بکەن، داکۆکیی لە بەرژەوەندیی حیزبەکەیان دەکەن. هەر فراکسیۆنێک پرۆژەیەکی هەبێت، لە لایەن فراکسیۆنەکەی ترەوە دژایەتییدەکرێت، ئەگەر ئەو پرۆژەیە لە خزمەتی گەلی کوردستانیشدا بێت.

لەگەڵ ئەو کەموکوورییانەیشدا پەرلەمان گەلێک یاسا و بڕیاری باشی دەرکردوە، بەڵام ئەگەر ئەو یاسایانە لە خزمەتی حیزب و دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستاندا نەبن، جێبەجێناکرێن.

## ١٤- حکومەتی حزبی:

لە وڵاتانی تردا کە حیزبێک بەشداریی پێکهێنانی حکومەت دەکات، تەنها وەزیر بۆ ئەو وەزارەتە دەستنیشاندەکات کە بەریکەوتووە، لە جێگری وەزیرەوە هەتا پۆستەکانی تری ئەو وەزارەتە، بە کەسانی پسپۆڕ و خاوەن_ئەزموون پڕکاتەوە.

لە هەرێمی کوردستاندا کە حکومەت پێکدێت، وەزارەتێک بەر حیزبی براوە دەکەوێت، لە وەزیرەوە هەتا فەرماشی فەرمانگەکە دەگۆڕێت، جێگری وەزیر، بەڕێوەبەری گشتیی، بەڕێوەبەری فەرمانگەکان، جێگرەکانیان دەگۆڕێ. بەڕێوەبەری ناحیە و بەڕێوەبەری قوتابخانە و جێگرەکەی دەبێت سەر بەو حیزبە بن. هەموو پۆستەکانی ئەو وەزارەتە بەحیزبییدەکرێن، یان بەگوێرەی ڕێککەوتنی حیزبەکان هەندێک لە پۆستەکان بە حیزبێکی تر دەدرێن. کاتێک حیزب کەسێک بۆ پۆستێکی حکومیی دیاریدەکات، مەرج بۆ پاڵێوراوەکە دادەنێت کە دەبێت هەموو کارمەندانی دەزگاکەی، یان وەزارەتەکەی بکات بە ئەندامی حیزب، ئەگینا ئەو پۆستەی پێنادرێت.

کاتێک حیزبێک پۆستێکی حکومیی بە ئەندامەکەی دەبەخشێت، مەرجی ئەوەی بۆ دادەنێت کە دەبێت ئاگاداری بەرژەوەندیی بەرپرسانی حیزب بێت، دەبێت چەند بۆی کرا ئاگاداری داهاتی حیزب بێت، پێگە حکومییەکەی بۆ زۆرکردنی داهاتی حیزب و بۆ زۆرکردنی داهاتی بەرپرسەکان بەکاربهێنێت.

هیچ حیزبێک لە هەرێمی کوردستاندا مەرجی خزمەتکردنی خەڵک بۆ پاڵێوراوەکەی دانانێت، تەنها مەرجی خزمەتکردنی حیزب و بەرپرسانی حیزب بۆ پاڵێوراوەکانی دادەنێت، بۆیە گەندەڵیی و لادان لە ئەرک وەکو دیاردەی لێهاتووە.

## ١٥- ڕاگەیاندنی حزبی:

لە هەرێمی کوردستاندا ڕاگەیاندنی سەربەخۆ نییە، ڕۆژنامە و ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکان لە لایەن سەرمایەدارەکان و کۆمپانیای کەرتی تایبەتەوە بەڕێوەنابرێن. لە دوای ڕاپەڕیین لە سلێمانیی هەوڵی دەرکردنی ڕۆژنامەی سەربەخۆ درا، بەڵام لەبەرئەوەی چالاکیی ئابوریی هەرێم ئازاد نییە، ئابوریی بە دەست حیزبی دەسەڵاتدارەوەیە، ئەو ڕۆژنامەیەی ڕەخنەی لە دەسەڵات دەگرت، ئابڵوقەی ئابوریی لەسەر دادەنرا، سکاڵای لەسەر تۆماردەکرا و سزا دەدرا. ڕۆژنامەنوسە یاخییەکان تیررۆدەکران. ئیتر ڕاگەیاندنی سەربەخۆ بۆی نەکرا لەسەر پێی خۆی بوەستێت. ئەگەرچی حکومەتی هەرێم وەزارەتی ڕۆشنبیریی و ڕاگەیاندنی هەیە، بەڵام ئەو وەزارەتە وەکو سەربازی بێچەک وایە، کەناڵی ڕاگەیاندنی تایبەت بە حکومەتی نییە، پرۆژەی ڕۆشنبیریی و ڕاگەیاندنی نییە، کادری ڕاگەیاندن پەروەردەناکات. تەنها کاری ئەوەیە سزای ئەو کەس و کەناڵانە بدات کە بەگوێرەی سیاسەتی حیزبە دەسەڵاتدارەکان ناجوڵێنەوە.

ڕاگەیاندنی هەرێم بە دەست حیزبە دەسەڵاتدارەکانەوەیە، حیزبەکان بودجەیەکی گەورەیان بۆ ڕاگەیاندنی حیزب داناوە، ناوەڕۆکی ڕاگەیاندنی حیزب بریتییە لە سیاسەتی حیزبایەتیی تەسک، ڕەشکردنی بەرانبەر، خۆبەستەوەدان بە سیاسەتی داگیرکەرانی کوردستان، سەرقاڵکردنی خەڵک بە شتی بچووکەوە، پروپاگەندە و چەواشەکاریی.

لە هەرێمی کوردستاندا ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و ڕۆژنامە و بەشێک لە سایتی ئەلیکترۆنیی و سۆشیاڵ_میدیا بە دەست دەسەڵاتەوەیە. ڕاگەیاندنی حیزب دوو جۆرە، جۆرێکی ڕاستەوخۆ بە ناوی حیزبەوە قسەدەکات، جۆرەکەی تری بە ناوی کەناڵ و سایت و پەیجی سەربەخۆوە قسەدەکەن، بەڵام هەر سەر بە حیزبن. ئەمانە پیاندەڵێن کەناڵی سێبەری حیزب، بە هەموویانەوە خزمەتی سیاسەتی حیزب دەکەن.

### ١٦- لیستی ڕەش:

لە دوای ڕاپەڕینەوە سەرکردایەتیی پەکەکە لە شاخەکانی کوردستان بنکە و بارەگایان داناوە. لەوێوە سیاسەتی خۆیان ئاڕاستەی کوردستان و ناوچەکە دەکەن. ئەو کەسانەی باشوور کوردستان ئاشنای سیاسەت و کەلتوری پەکەکە دەبن، هەوڵدەدەن بە کەلتوری سیاسیی و ڕێکخستنی پەکەکە، وەکو حیزبێکی سیاسیی لە باشووری کوردستاندا خەباتبکەن، بەڵام حکومەتی هەرێم ڕێگەی کار و چالاکییان پێنادات. چەندیین جار حیزبی سیاسییان پێکهێناوە و داوای مۆڵەتیان لە حکومەتی هەرێم کردووە، حکومەتی هەرێم مۆڵەتی پێنەداون، ڕێگەینەداون بەشداریی کۆبوونەوە سیاسییەکانی هەرێم بکەن، ڕێگەینەداوە بەشداریی هەڵبژاردنەکانی هەرێم بکەن.

ئەم سیاسەتەی هەرێم لە کاتێکدایە کە حکومەتی عێراقی ناوەندیی و حیزبە عێراقییەکان، هەتا ئەمریکییەکانیش هیچ تێبینییەکیان لەسەر خەباتی ئەو پێکهاتە سیاسییەی باشووری کوردستان نییە، مۆڵەتی فەرمیی کار و چالاکییان پێداون، ڕێگەیان لێنەگرتوون بەشداریی هەڵبژاردنەکان و بەشداریی کۆبوونەوە سیاسییەکانی عێراق بکەن.دەسەڵاتدارانی هەرێم نەک هەر مۆڵەتی فەرمیی ئەو پێکهاتە سیاسییەی نزیک پەکەکە نادەن، چەندیین جار کۆمەڵکوژیکردوون، زیندانییکردوون، بارەگا و نوسینگەی داخستوون. ئەم سیاسەتەی دەسەڵاتدارانی هەرێمی بەرانبەر بە پێکهاتەی پرۆ_پەکەکە لە کاتێکدایە، کە دەسەڵاتی هەرێم بەعسییە ئەنفالچییەکان دەپارێزێت، مۆڵەتی فەرمیی بەرەی تورکمانیی دەدات کە دان بە هەرێمی کوردستاندا نانێت.

### ١٧- داگیرکردنی گرد و سەیرانگا:

یەکێک لە سیما ناشیرینەکانی تری دەسەڵاتی هەرێم، داگیرکردنی سەیرانگا و گرد و دارستان و باڵەخانەکانی حکومەتە. حیزبە دەسەڵاتدارەکان و بەرپرسەکان، لە دەستبەسەرداگرتنی موڵکی گشتییدا درێغییان نەکردووە، لە هەر شوێنێک و هەر کاتێک بۆیان لوابێت، دەستیان بەسەر سەیرانگاکانی کوردستاندا گرتووە، وەکو موڵکی حیزب سودیان لێوەرگرتووە.

لە دوای ڕاپەڕینەوە پارتیی دەستی بەسەر سەیرانگای سەلاحەدین و سەری ڕەشدا گرت، بارەگای حیزبی تێدا کردنەوە، لە چالاکیی ئابوریی جوانکردنی سروشتی کوردستان و گەشتوگوزار دیبڕاندن.

یەکێتیی و گۆڕان هەرچی گردی ناو شاری سلێمانیی و دەوروبەری هەبوو، بە مەکۆی حیزب و بە گۆڕی سەرکردە کۆچکردووەکانیان داگیریانکرد.

دەوڵەتی عێراقی پێشوو شارەکانی هەرێمی بە دارستان ڕازاندبوویەوە، دەسەڵاتدارەانی هەرێم دارستانەکان داگیردەکەن، دارەکانی دەبڕن، زەوی دارستانەکان بۆ پرۆژەی بازرگانیی و بۆ بارەگای حیزبیی بەکاردەهێنن.

بەرانبەر بەم جۆرە ڕەفتارانەی دەسەڵات، نە داواکاریی گشتیی هەرێم و شارەکان، نە خەڵکی کوردستان نایەنەدەنگ. ئەمە وایکرد دەستبەسەرداگرتنی موڵکی گشتیی و سەیرانگا و دارستانەکان لە لایەن خەڵک و دەسەڵاتەوە بە کارێکی ئاسایی سەیربکرێت و وەکو بەشێک لە ئاوەزمەندیی حوکمڕانیی هەرێمی کوردستان لێکبدرێتەوە.

## ١٨- زیندووکردنەوەی دەرەبەگایەتیی:

شەڕی کورد و دەوڵەتی عێراق ناوی شۆڕش بێت، یان نا، بەردەوام دەستی لە ملی ئاغا و دەرەبەگدا بووە و شەقی لە بەر ورگی جوتیار هەڵداوە. زۆرێک لە لێکۆڵەران و سیاسییەکانی کورد و عێراق بۆچوونیان وایە، کە هۆکارێکی شۆڕشی ئەیلول بۆ تێکدانی پرۆسەی چاکسازیی کشتوکاڵی بووە، ئەو چاکسازییەی کە حکومەتی عەبدولکەریم قاسم بەتەمابوو لە کوردستان ئەنجامیبدات. لە کاتی گفتوگۆی ساڵی ١٩٧٠ - ١٩٧٤ نێوان حکومەتی عێراق و سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلولدا، حکومەتی عێراق یاسای ژمارە ١١٧ و دواتر یاسای ژمارە ٩٠ی بۆ چاکسازیی زەویی کشتوکاڵیی و بۆ دابەشکردنی زەوی بەسەر جوتیاراندا دەرکرد، ئەو یاسایانە لە سنووری ناوچەی حوکمی زاتییدا بە نیوەناچڵیی جێبەجێکرا، جوتیاری کوردستان سودێکی ئەوتۆی لێوەرنەگرت.

لە دوای ڕاپەڕیین و پێکهێنای حکومەتی هەرێم، شیخ و دەرەبەگی کورد، بە پشتیوانیی پارتیی و یەکێتیی دژ بە یاسای چاکسازیی زەویی کشتوکاڵیی حکومەتی عێراق، لە هەوڵدان ئەو زەوییانەی بەگوێرەی ئەو یاسایانە بەسەر جوتیاری کورددا دابەشکراوە، لێیانبسێننەوە داگیریبکەنەوە. لە هەندێک ناوچە ئەم هەنگاوەی دەرەبەگی کورد سەریگرتووە، لە هەندێک ناوچەیش کێشە دروستبووە و ململانێ هەیە.

## ٥- فەلسفەی حوکمڕانیی هەرێمی کوردستان

### ١- لە کوردایەتییەوە بۆ کۆنفیدراڵیی خێڵەکیی

لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەوە، گەلی کورد هەستی بە تایبەتمەندیی نەتەوەیی خۆی کردووە، هەوڵیداوە ماف و ئازادییەکانی بەدەستبهێنێت، ئەم جوڵانەوە سیاسییە ناوی کوردایەتیی لێنراوە. لە ساڵی ١٨٤٠وە هەتا جەنگی یەکەمی جیهانیی، لەوێشەوە هەتا جەنگی دووەمی جیهانیی گەلی کورد لە پێناوی ڕزگاریی نیشتیمانیی و مافی نەتەوەییدا چەندین جار سەرهەڵدانی سیاسیی و ڕاپەڕینی چەکداریی لە دژی داگیرکەرانی کوردستان ئەنجامداوە، هەتا دامەزراندنی کۆماری کوردستان هەموو جوڵانەوە سیاسیی و چەکدارییەکان، لە لایەن سەرۆک_خێڵ و پیاوە ئاینییەکانی کوردستانەوە ڕابەرایەتیی دەکران.

لە سەروبەندی جەنگی دووەمی جیهانییدا بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد، ڕێکخراوی سیاسیی دامەزرا، لەو کاتەوە کوردایەتیی لە دەستی سەرۆک_خێڵ و پیاوانی ئاینیی وەرگیراوە و ڕادەستی حیزبە سیاسییەکان کراوە. سەرەتا شۆڕشی ئەیلول لە لایەن حیزبەوە ڕابەرایەتییدەکرا، وەرگرتنی دەسەڵاتی حیزب لە لایەن تاکێکی ئاینیی و سەرۆک_خێڵێکەوە کارێکی ئاساییە ئەگەر ئەو سەرکردەیە پابەندی بەرنامە و پەیڕەوی ناوخۆی حیزب بێت، ڕێسا و یاسا خێڵەکییەکانی خۆی وازلێبهێنێت و وەکو تاکێکی حیزبیی و نەتەوەیی سیاسەتبکات. ئەم دیاردەیە لە زۆربەی کۆمەڵگەکانی جیهاندا بەڕێڕەوی سروشتیی خۆیدا تێپەڕیوە، ئەگەر سەرکردەکان خێڵەکییش بووبن لەگەڵ تێکۆشاندا گۆڕانیان بەسەرداهاتووە، ناسنامەی کەسایەتییەکی نەتەوەییان وەرگرتووە.

لە کۆمەڵگەی کوردستاندا ئەو گەشەکردنە کۆمەڵایەتییە سیاسییە نەک هەر دروستنەبوو، بەڵکو خێڵ و دەرەبەگی کوردستان هەر لە سەرەتاوە سیستەمی سیاسیی حیزبی کوردستانی قورخکرد، سیستەمی حیزبایەتیی و خەباتی شۆڕشییان بە لاڕێدا برد، سیستەمێکی یان حیزبیی خێڵەکیی بنەماڵەییان ئاواکرد.

له شۆڕشی ئەیلولی پەنجا ساڵ پێش ئێستا، مەلا مستەفا ڕابەرایەتیی خەباتی کوردایەتیی دەکرد، لەگەڵ ئەوەیشدا تاکێکی ئاینیی و خێڵەکیی بوو، بەڵام لەو کاتەدا بەو ڕادەیەی ئێستا بەڕێوەبردنی سیاسەتی شۆڕش و حیزب و حکومەت لە لایەن خێڵ و خێزانەوە قورخنەکرابوو. لەو سەردەمەدا تەنها مەلا مستەفا و دوو لە کوڕەکانی لە سەرکردایەتیی حیزب و شۆڕشدا بوون. بەگوێرەی کات هەریەک لە ئیبراهیم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانیی، حەبیب موحەممەد کەریم و عەلی عەبدوڵڵا و دارا تەوفیق و سامی عەبدولڕەحمان و دکتۆر مەحمود عوسمان و چەندین سیاسەتمەداری تر، لە بڕیاری سیاسیی ئەو کاتەدا بەشدارییاندەکرد و کاریان ڕادەپەڕاند. بەڵام لەم کاتەدا لە ساڵی (٢٠٢٢) یازدە بەرزانیی لە سەرکردایەتیی حیزبدان و پۆستەکانی حیزب و حکومەت و بوارە هەستیارەکانی ژیانی سیاسیی و ئابوریی کوردستان بە دەست بەرزانییەکانەوەیە.

یەکێک لە جیاوازییەکانی یەکێتیی لەگەڵ پارتیی ئەوە بوو کە یەکێتیی حیزبی بنەماڵە نەبوو، دژی سیستەمی بنەماڵچێتیی دەوەستایەوە. لە سەردەمی شۆڕشی نوێدا برازا و خزمەکانی مام جەلال پێشمەرگە و کادری ئاسایی بوون. بەگوێرەی توانا و دڵسۆزیی خۆیان لە حیزب و شۆڕشدا پۆستیان وەردەگرت. چەندین ئەندامی مەکتەب_سیاسیی وەکو نەوشیروان مستەفا و فواد مەعسوم و ملازم عومەر و هیی تر، لەگەڵ مام جەلال لە داڕشتنی سیاسەتی یەکێتییدا بەشداریی کاریگەریان هەبوو.

دوای ڕاپەڕیین خەڵکی کوردستان بەتەمابوو ژیانی مەدەنیی و خەباتی پەرلەمانیی و حکومەت، سیستەمی خێڵەکیی کوردستان لاوازبکەن، بەڵام ئاواتی خەڵک نەهاتەدی. لە سەردەمی پەرلەمان و حکومەتی هەرێمدا، سیستەمی خێڵایەتیی بەرزانییەکان هەم فروانبوو، هەم خۆی بەسەر حوکمڕانیی هەرێمدا سەپاند، هەم بەرەو حیزبەکانی تری باشوور دزەیکرد.

خەڵک بەتەمابوو یەکێتیی وەکو حیزبێکی مەدەنیی بمێنێتەوە، دژی سیستەمی خێڵەکیی ململانێی پارتیی بکات، بەڵام وادەرنەچوو، هزری خێڵایەتیی یەکێتییشی گرتەوە. یەکێتیی ڕووەو بنەماڵەچێتیی ملینا. ئێستا یەکێتیی لە لایەن بنەماڵە و خێزانی مام جەلالەوە بەڕیوەدەبرێت، حیزبەکانی تریش (بۆژەکراون).

دوای ئەوەی ئەمریکا و ئێران و ئۆپۆزسیۆنی عێراق و کورد ڕژێمی سەدامیان ڕوخاند، لەو کاتەوە پارتیی و یەکێتیی لەگەڵ ئەو وڵاتانە و لەگەڵ دەسەڵاتدارنی

عێراقدا تیکەڵبیان دروستکرد. ئەو لایەنانە هیچیان خێڵەکیی نین، خەڵک بەتەمابوو ئەو لایەنانە کاریگەرییان لەسەر سیاسەتی پارتیی و بنەماڵەی بەرزانیی هەبێت، سیاسەتی خێڵەکیی بەلاوەبنێن، سیستەمێکی سیاسیی نوێ پەیڕەوبکەن لەگەڵ ناوەڕۆکی کێشەی کورد و لەگەڵ سیستەمی سیاسیی عێراق و جیهاندا بگونجێت، بەڵام نە بەرزانییەکان بیریان لەو گۆڕانکارییە کردەوە، نە ئەندام و کادر و بەرپرسانی پارتیی پێشنیازی وایان بۆ بنەماڵەی بارزانیی کرد.

دوای ئەوەی ڕژێمی بەعسی عێراق ڕوخا، نەوەکانی مام جەلال و ئیبراهیم ئەحمەد لە ئەوروپا گەڕانەوە، بە پشتبەستن بە خەباتی باوک و دایکیان دەستیان بەسەر پۆست و پلە و دەسەڵاتی یەکێتییدا گرت. ئەمە بۆ خەڵکی کوردستان چاوەڕواننەکراو بوو، لەبەرئەوەی یەکێتیی خۆی بە حیزبی بنەماڵە حسابنەدەکرد. ئیبراهیم ئەحمەد و مام جەلال دوو سیاسیی ڕۆشنبیری کورد بوون، لە ڕێگەی خێڵ و بنەماڵەوە بە پۆست و پلەی حیزبیی نەگەیشتبوون، لە ڕێگەی کاریگەریی سیاسیی و ڕۆشنبیریی خۆیانەوە پلەی سەرکردایەتیی و ڕابەری بزوتنەوەی کوردایەتییان بەدەستهێنابوو. گرنگترین پەیامی سیاسییان ئەوە بوو کە سەرکردایەتیی بزوتنەوەی کوردایەتیی لە دەست بنەماڵە و خێڵ دەربهێنن.

بەڵام ئەوەی لە نەوەکانی ئەو دوو سیاسییانەمان بینی پێچەوانەی پەیامی سیاسیی باوکیان بوو، پێچەوانەی کەلتوری سیاسیی ئەوروپا بوو. کە زۆرینەی ژیانیان لە ئەوروپا بەسەربردووە، بەبێ ڕەچاوکردنی ڕۆشنبیریی سیاسیی و ئەزموونی تێکۆشان و ماندووبوونیان، بە پشتبەستن بە خەبات و ماندووبوونی باوکیان، وەکو نەوەکانی بنەماڵەی بەرزانیی، سواری کۆڵی بواری سیاسیی و ئابوریی و سەربازیی یەکێتیی و بەشە حکومەتی زۆنی سەوز بوون. یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستانیان لە حیزبێکی سۆشیاڵ_دیموکراتەوە بۆ حیزبێکی خێڵەکیی گواستەوە. دیاردەی خێڵەکییان لە هەرێمی کوردستاندا بەهێزتر کرد. ئیتر سیستەمی خێڵایەتیی لە کوردستان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ تەکاندەدات، حیزبایەتیی و حکومەت و پەرلەمان و دادوەریی و کوردایەتیی خێڵاوییتر دەکات.

ئەگەر سەیری بڕیاربەدەستەکانی پارتیی و دەسەڵاتی دەڤەری هەولێر بکەین، بە تەنها مەسعود بەرزانیی و نێچیرڤان بەرزانیی و مەسرور بەرزانیی و نەوەکانیان

دەبینین. ئەگەر سەیری بڕیاربەدەستەکانی یەکێتیی و دەسەڵاتی دەڤەری سلێمانیی بکەین، بە تەنها باڤڵ و قوباد و دەبینین.

ساڵی ٢٠٠٤ سەرۆکی پارتی چارەسەری دیموکراتی کوردستان (پ. چ. د. ک) بووم، دەستم بە سەردانی بەرپرسانی یەکێتیی و پارتیی کرد. دەمویست بەرپرسانی پارتیی و یەکێتیی قەناعەتپێبکەم کە (پ. چ. د. ک) حیزبێکی سیاسیی باشووری کوردستانە، بۆ ئەوەی پشتیوانییمبکەن هەتا حکومەتی هەرێم مۆڵەتی فەرمیی کاردکردنمان پێبدات. ڕۆژێکیان برادەێکی کۆنم تەلەفۆنی بۆ کردم و گوتی:

دەمەوێت بتبینم. کاتێک ئەو برادەرە سەردانیکردم، پێیگوتم: دەزانین هەتا ئێستا دوو جار سەردانی کۆسرەت ڕەسوڵت کردووە، پێمباشە بزانیت کە لە سنووری سلێمانییدا کۆسرەت ڕەسوڵ دەسەڵاتی نییە، دەسەڵاتی سلێمانیی و گەرمیان دراوەتە دەست مام جەلال و بنەماڵەکەی. دەسەڵاتی هەولێر و دهۆکیش دراوەتە دەست بەرزانیی و بنەماڵەکەی. بۆیە پێمباشە لەبریی ئەوەی سەردانی کۆسرەت ڕەسوڵ بکەیت، سەردانی بنەماڵەی تاڵەبانیی بکە، ئەو کات دەتوانیت بۆ بەفەرمییناسینی حیزبەکەت سود لە دەسەڵاتی بنەماڵەی تاڵەبانیی وەربگریت.

کاتێک ئەو برادەرە ئەو پەیامەی بە گوێی مندا دا، ئەوەم بیرهاتەوە کە لە یەکێک لە دیدارەکانمدا لەگەڵ کۆسرەت ڕەسوڵدا، خۆدی کۆسرەت پێیگوتم:

ئەگەر بۆ هەمان مەبەست کە هاتوویتە لای من چوویتە لای برادەرانی پارتیی، باشترە بچیتە لای کاک مەسعود، یان کاک نێچیر، یان کاک مەسرور، لەبەرئەوەی بڕیاری پارتیی بە دەستی ئەوانەیە.

### ڕێککەوتنی ستراتیژیی:

دوای ئەوەی پارتیی و یەکێتیی بە شەڕ یەکتریان بۆ لەناونەبرا، ساڵی ٢٠٠٧ ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی هەرێمی کوردستان لە ناو خۆیاندا دابەشبکەن. ناوەڕۆکی ڕێککەوتنەکە بریتییە لەوەی بەرژەوەندیی بنەماڵەی بەرزانیی و بنەماڵەی تاڵەبانیی لە سەروو بەرەژەوەندیی خەڵک و پرسە نیشتیمانیی و نەتەوەییەکانەوە بێت. ئەو ڕێککەوتنە ناوی ڕێککەوتنی ستراتیژیی نێوان پارتیی و یەکێتیی لێنراوە، بەڵام لە

ڕاستییدا ڕێککەوتنی ستراتیژیی نێوان بنەماڵەی بەرزانیی و بنەماڵەی تاڵەبانییە. ئەو ڕێککەوتنە کۆنفیدراڵیی خێڵەکیی نێوان بەرزانییەکان و تاڵەبانییەکانە.

بەگوێرەی ڕێککەوتنەکە نابێت هیچ کام لەو لایەنانە سنووری دەسەڵاتی ئەوانی تر ببەزێنێت. ئەگەر هەر لایەکیان سنووری بەزاند، ڕێککەوتنەکەی ناهاوسەنگکرد، هێزە چاودێرەکانی ڕێککەوتنەکە ناوهسەنگییەکە ڕاستدەکەنەوە. پۆستی سەرۆکی لە هەرێم بۆ بەرزانییەکان دەبێت، پۆستی سەرۆک لە عێراق بۆ تاڵەبانییەکان دەبێت. داهاتی نەوتی کوردستانیش لە نێوان ئەو دوو بنەماڵەیەدا بە نهێنیی دابەشدەکرێت.

کاتێک بزوتنەوەی گۆڕان دروستبوو، خەڵک بەتەمابوو گۆڕان لە هەولێر و دهۆک گەشەبکات و سیستەمی حوکمڕانیی هەرێم بگۆڕێت، زۆر کەس داوایان لە نەوشیروان مستەفا دەکرد پۆستی سەرۆکی پەرلەمان وەربگرێت و لە هەولێرەوە دەست بە گۆڕینی سیستەم بکات، بەڵام لەبەرئەوەی نەوشیروان مستەفا دەیزانی هەولێر و دهۆک بۆ ئەو بڤەیە، بە گوێی کەسی نەدەکرد. بۆچوونێکیش هەیە کە ئامانجی سەرەکیی دروستبوونی گۆڕان بۆ ئەوە بووە ڕێگە لە پارتی بگرێت دەست بەسەر سلێمانییدا بگرێتەوە و ڕێککەوتنەکە تێکبدات. ساڵی ٢٠١١ کاتێک پارتیی ویستی کاریگەریی خۆی لەسەر پارێزگای سلێمانیی بەهێزبکات و دەست بەسەر پارێزگای سلێمانییدا بگرێتەوە، بە خۆپیشاندانەکانی ١٧ی شوبات و ڕۆژانی دوایی وەڵامدرایەوە.

ساڵی ٢٠١٤ دوای هێرشەکانی داعش، سوپای عێراق لە کەرکوک پاشەکشەیکرد، هێزی پێشمەرگەی کوردستان شوێنی سوپای عێراقی گرتەوە. پارتیی ئەم هەلەی قۆستەوە، دەسەڵاتی خۆی لە کەرکوک بەهێزکرد و دەسەڵاتی یەکێتیی کەمکردەوە. بە ١٦ی ئۆکتۆبەری ٢٠١٧ وەڵامدرایەوە و لە کەرکوک پاشەکشەی پێکرا.

یەکێک لە پەیامە سیاسییەکانی هاوسەرۆکی یەکێتیی لاهور شێخ جەنگیی ئەوە بوو، کە پێگەی جارانی یەکێتیی دەگەڕێنێتەوە، هەوڵدەدا یەکێتیی لە هەولێر و دهۆک بەهێزبکاتەوە. لە هەولێر سەردانی بنەماڵەی شەهیدەکانی یەکێتیی دەکرد و پڕۆژەی خزمەتگوزاریی و پەروەردەیی سەر بە یەکێتیی پێشدەخست، پەیوەندی لەگەڵ سەرۆک_خێڵ و ڕۆشنبیرانی ناوچەی بادیناندا پێشدەخست. ساڵی ٢٠٢١ لاهور تاڵەبانیی هاوسەرۆکی یەکێتی گوتی:

لەمەولا چەقی ململانێکانمان بەرەو هەولێر دەبەین.

چاودێرانی ڕێککەوتنە خێڵەکییەکە و بنەماڵەی بەرزانیی، بە سیاسەتەکانی لاهور نیگەرانبوون، بە تێکدەری ڕێککەوتنەکەیان دەبینی. لە ڕێگەی یەکێتیی خۆیەوە لە ٨ تەموزی ساڵی ٢٠٢١دا لاهوریان لە یەکێتیی دوورخستەوە.

لە دوای ڕاپەڕینەوە (پ. ک. ک) لە هەرێمی کوردستاندا چالاکیی سیاسیی هەیە، بەڵام هیچ بەڵگەیەک بەدەستەوە نییە بیسەلمێنێت لقی باشووری کوردستانی (پ. ک. ک) بە جدیی کاری بۆ ئەوە کردووە بەدیلی پارتیی و یەکێتیی بێت. دۆستەکانی (پ. ک. ک) بەشداریی هەڵبژاردن دەکەن و هەوڵدەدەن لە هەرێمی کوردستان، یان لە عێراق دەسەڵات وەربگرن. بەڵام لە کاتی هەڵبژاردنەکاندا سەرکردایەتیی (پ. ک. ک) لێدواندەدەن و هەڵوێستی خۆیان بۆ پشتیوانیی لە دەسەڵاتی بنەماڵەی بەرزانیی و تاڵەبانیی دوبارەدەکەنەوە.

ساڵی ٢٠١٣ لە هەڵبژاردنی سەرۆکی هەرێمی کوردستاندا کەمال میراودەلیی ڕکەبەری مەسعود بەرزانیی بوو، موراد قەرەیلان هاوسەرۆکی کۆماجڤاکی کوردستان لە ستێرک تیڤی لێدوانیکی دا و گوتی:

ئێمە مەسعود بەرزانیی بە پەسەند دەزانین بۆ سەرۆکی هەرێمی کوردستان.

لە هەڵبژاردنی پێشوەختەی ١٠/ ١٠/ ٢٠٢١ی پەرلەمانی عێراقدا، ڕۆژی ٦/ ١٠ هاوسەرۆکی کۆماجڤاکی کوردستان جەمیل بایک لەسەر بارودۆخی باشووری کوردستان و عێراق لێدوانێکی دا، نەک هەر کاندیدەکانی لیستی تەڤگەری ئازادیی فەرامۆشکرد، داوای لە دۆستەکانی (پ. ک. ک) و ڕۆشنبیران کرد، لە سنووری پارێزگای سلێمانیی دەنگ بە یەنەکە (یەکێتیی) بدەن، نەیگوت لە پارێزگاکانی هەولێر و دهۆک دەنگ بە یەنەکە بدەن، لەبەرئەوەی ئەویش دەزانێت هەولێر و دهۆک شوێنی دەسەڵاتداریی یەکێتیی نییە، شوێنی دەسەڵاتداریی پارتییە.

چەند ساڵێک لەمەوبەر لە کەناڵێکی ڕاگەیاندن مەلا بەختیاری کارگێڕی مەکتەبی سیاسیی یەکێتیی گوتی:

ئەگەر یەکێتیی یەک کورسیی پەرلەمانیش بهێنێت، هەر یەکێتییە. دیارە مەلا بەختیاریش دەزانێت زۆنی سەوز لەسەر یەکێتیی تاپۆکراوە.

بۆچی ئەندامانی مەکتەبی سیاسیی پارتیی و یەکێتیی لە سەردەمی جیهانگیریی و زانست و تەکنۆلۆژیادا ئەم لادان و پاشەکەشە حیزبیی و سیاسییەی هەرێمی کوردستان قبوڵدەکەن؟ باشە ئەو هێزە کێیە کە سلێمانیی و گەرمیانی داوەتە دەست تاڵەبانیی و بنەماڵەکەی؟ هەولێر و دهۆکیشی داوەتە دەست بارزانیی و بنەماڵەکەی؟ ئایا ئەمە جۆرێکی تری دابەشکردنی کوردستان نییە وەکو ئەوەی لە جەنگی یەکەمی جیهانییدا ئینگلیز و هاوپەیمانەکانی کوردستانیان لە دوو پارچەوە بەسەر چوار پارچەدا دابەشکرد؟ وا لە دوای جەنگی ڕوخانی ڕژێمی سەدامدا کوردستان دەکەنە شەش پارچە؟ ئایا دەسەلاتدارانی باشوور بۆچی بەم دابەشکردنەی نیشتیمانەکەیان ڕازیدەبن؟ ئایا ئەم دابەشکردنە بنەماڵەییە لە سەردەمی جیهانگیرییدا مۆدێلێکی سیاسیی گونجاوە؟ یان جۆرێکە لە کۆنفیدراڵیی خێڵەکیی کە لە سەردەمی میدییەکاندا ٢٠٠٧ ساڵ پێش ئێستا باوبووە؟ ئایا بەم مۆدێلە سیاسییە کێشەی نەتەوەیی گەلی کورد چارەسەردەکرێت؟ یان مۆدێلێکە بۆ ئەوەی کێشەی کورد چارەسەرنەکرێت؟.

### کۆنفیدراڵیی خێڵەکیی:

لە مایسی ١٩٩٤دا خولی سێیەمی شەڕی براکوژیی لە نێوان یەکێتیی و پارتییدا دەستیپێکرد، ماوەی چوار ساڵی خایاند. بەگوێرەی ئەنجامی شەڕەکە، هەرێمی کوردستان بەسەر دوو هێزە بەشەڕهاتووەکەدا دابەشکرا. یەکێتیی دەستی بەسەر سلێمانیی و گەرمیاندا گرت، پارتیی دەستی بەسەر هەولێر و دهۆکدا گرت.

لە ساڵی ١٩٩٨دا، لەژێر گوشاری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا، شەڕی براکوژیی لە نێوان ئەو دوو لایەنەدا ڕاگیرا. هەوڵی ئاشتبوونەوە و یەکخستنەوەی حکومەتی هەرێم درا. هەوڵی یەکگرتنەوەی هەولێر و دهۆک و سلێمانیی و گەرمیان درا، بەڵام حکومەتی هەرێم و خاکە دابەشکراوەکەی یەکینەگرتەوە.

هێزە باڵادەستە ئاشکرا و نهێنییەکانی ناوچەکە و جیهان بۆیان دەرکەوت، بۆ ڕێگریی لە شەڕی نێوان پارتیی و یەکێتیی، باشترین شت ئەوەیە باشووری کوردستانیان بەسەردا دابەشبکرێت، هەر حیزبە و حوکمی بەشێکی کوردستان بکات. لەبەرئەوەی هەموو کاتێک شەڕ و ناکۆکیی پارتیی و یەکێتیی لە بەرژەوەندیی ئەو

هێزە باڵادەستانەدا نییە، بۆیە ساڵی ٢٠٠٧ پارتیی و یەکێتیی ڕێککەوتنی ستراتیژییان ئیمزاکرد، بۆ ئەوەی شەڕ نەکەن، شەڕنەکردن و یەکنەگرتنەوەی هەرێم لە خزمەتی دەوڵەتانی ناوچەکەشدایە.

بە شێوەیەکی کرداریی دوو بەڕێوەبەرایەتیی لە هەرێمی کوردستاندا هەیە، بودجەی زۆنی سەوز و زۆنی زەرد جیاوازە. ئاسایش و پێشمەرگەی زۆنی سەوز و زۆنی زەرد جیاوازە و یەکینەگرتووەتەوە. بەرپرسەکانی حکومەتی هەرێم لە هەولێر و دهۆک لە لایەن پارتییەوە دیاریدەکرێن، بەرپرسەکانی حکومەتی هەرێم لە سلێمانیی و گەرمیان لە لایەن یەکێتییەوە دیاریدەکرێن.

لە فەرهەنگی سیاسیی هیچ وڵاتێکدا سەرۆکی وڵات لە یەک کاتدا دوو کەسی بۆ پێکهێنای حکومەت ڕانەسپاردووە، وەکو ئەوەی مەسعوود بەرزانیی لە ساڵی ٢٠٠٩دا بەرهەم ساڵحی سەر بە بنەماڵە تاڵەبانیی و ئازاد بەرواریی سەر بە بنەماڵەی بەرزانیی بۆ پۆستی سەرۆکی حکومەتی هەرێم دەستنیشانکرد.

پەیوەندیی لە نێوان سلێمانیی و هەولێردا وەکو پەیوەندیی نێوان دوو وڵاتی سەربەخۆ وایە، هەر ناوچەیەک دەستوور و یاسا و ئابوریی و هێزی پاراستن و پەیوەندیی دیبلۆماسیی تایبەتی خۆی هەیە. لەپێناو سەرکوتکردنی خەڵکی کوردستاندا، پەیمانێکی دۆستایەتییان بەستووە. ئەم جۆرە پەیمانەی بنەماڵەی بەرزانیی و تاڵەبانیی لە سیستەمی کۆنفیدراڵیی نێوان دوو دەوڵـەت دەچێت، بەڵام لە ئاستی ناوخۆی هەرێمی هەولێر و سلێمانییدایە، لە ئاستی دوو دەوڵەتدا نییە، سیستەمی بەڕێوەبردنی دامودەزگاکان دامودەزگای دەوڵەت نین، دامودەزگای خێڵن. لە ئاستی عێراقیی و نێودەوڵەتییشدا هەرێمی کوردستان وەکو دەوڵەت ناناسرێت، وەکو ڕێککەوتنی دوو خێڵی کورد لەپێناو بەرژەوەندیی ئابوریی و سیاسییاندا دەناسرێت.

یەکێک لەو هۆکارانەی کە هەرێمی کوردستان دەستووری نییە، ئەم سیستەمە خێڵەکییەیە، ئەگەر هەرێم دەستووری هەبێت، دەبێت هەموو لایەنەکان پابەندی بەندەکانی دەستوور بن. ئەگەر بەگوێرەی دەستوور کاربکرێت، سیستەمی کۆنفیدراڵیی نێوان بنەماڵەی بەرزانیی و بنەماڵەی تاڵەبانیی هەڵدەوەشێتەوە.

## ٢- حیزبی قائید*٥:

یەکێک لە لایەنە خراپەکانی تری حوکمڕانیی هەرێم، پەیوەندیی ناهاوسەنگی نێوان حیزب و دامودەزگاکانی دەوڵەتە، لە سەرتاسەری جیهاندا حیزبی سیاسیی دەزگایەکی سیاسیی و کۆمەڵایەتییە، لە دەرەوەی دەوڵەتەوە وەستاوە، لە کاتی هەڵبژاردندندا بەشداریی کایە سیاسییەکان دەکات، بەرنامە و بەربژێری حیزبەکەی لە لیستی هەڵبژاردندا ڕێکدەخات و پروپاگەندەی بۆ دەکات، کە پرۆسەی هەڵبژاردن کۆتاییدێت، حیزب دەگەڕێتەوە شوێنی خۆی و هەتا هەڵبژاردنێکی تر خۆی متدەکات.

لە هەرێمی کوردستاندا حیزب دەستی لە بینی دامودەزگاکانی دەوەڵەت توندکردووە، سەرچاوەی ئابوریی وڵاتی قورخکردووە، لەسەر حسابی توێژە بێدەسەڵاتەکانی کۆمەڵگەی کوردستان سەرمایەی بێپیوانە کۆدەکاتەوە، سەرانە لەو سەرمایەدارانە وەردەگرێت کە پرۆژەی ئابورییان هەیە، نەوت دەردەهێنێت و دەیفرۆشیت. پیاوێکی ئاینیی عێراقیی لە سییەکانی سەدەی بیستدا دەڵێت: حیزب لە ڕۆژئاوا چارەسەرە، لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەردیسەرە*٦.

لە هەرێمی کوردستاندا پەرلەمان و حکومەت و دەسەڵاتی دادوەریی هەن، بەڵام ئەو دەزگایانەی هەرێمی کوردستان بەبێ بڕیاری حیزب دەست بە ئاودا ناکەن. لێرەدا لە باڵادەستیی حیزب بەسەر دامودەزگاکانی دەوڵەتدا، سیستەمی هەرێمی کوردستان لاسایی ڕژێمی سەدام و یەکێتیی سۆڤیەتی جاران و سیستەمە شمولییەکانی تری جیهان دەکاتەوە.

بۆ ئازادکردنی دەزگاکانی هەرێمی کوردستان لە چنگی حیزب، بۆ نزیککردنەوەی حیزبی کوردیی لە حیزبەکانی ڕۆژئاوا، دەبێت بزانین حیزبی ڕۆژئاوایی چۆن کار و چالاکیی بەڕێوەدەبات، بزانین هۆکاری بەحیزبییکردنی دەوڵەت و ژیانی مرۆڤی کورد چییە؟.

سیستەمی سیاسیی باوی ئەمڕۆی جیهان، سیستەمی سیاسیی لیبراڵ_دیموکراتە، لە کۆتایی سەدەی بیستدا ئەو سیستەمە جاڕی سەرکەوتنی خۆی دا، وڵاتانی ئەورووپا و ئەمریکا و هاوپەیمانەکانیان ئەو سیستەمە پەیڕەودەکەن، دەسەڵاتدارانی هەرێمی کوردستان وا پیشاندەدەن کە سیستەمی هەرێم بەشێکە لەو سیستەمە لیبراڵ_ دیموکراتە.

بەشێک لە وڵاتان و کۆمەڵگەکانی جیهان دەیانەوێت لەو سیستەمەی ڕۆژئاوا نزیکببنەوە، بەشێک لە خەڵکی کوردستانیش داخوازییان هەیە کە سیستەمی سیاسیی هەرێمی کوردستان لە سیستەمی سیاسیی ئەوروپا و ئەمریکا نزیکببێتەوە. ئەگەرچی دەسەڵاتدارە دەستڕۆیشتووەکانی هەرێم بە قسە لەگەڵ سیستەمی سیاسیی لیبراڵ_ دیموکراتی ئەوروپا و ئەمریکادان، بەڵام بەرپرسانی حیزبە دەسەڵاتدارەکان عاشقی ئەم سیستەمەی هەرێمی کوردستانن و دەیانەوێت بارودۆخی هەرێم هەروا بمێنێتەوە. لێرەدا ململانێیەک لە نێوان کۆمەڵگەی کوردستان و دەسەڵاتداراندا دروستدەبێت، خەڵکی کوردستان داوادەکەن و کاردەکەن بۆ ئەوەی سیستەمی سیاسیی هەرێم لە سیستەمی سیاسیی باوی لیبراڵ_دیموکراتی جیهان نزیکببێتەوە، دەسەڵاتدارانیش پێداگریی لەسەر مانەوەی ڕەوشی سیاسیی و ئابوریی و کۆمەڵایەتیی ئەمڕۆی هەرێمی کوردستان دەکەن و دەیانەوێت سیستەم هەروا بمێنێتەوە.

لە سیستەمی لیبراڵ_دیموکراتدا حیزب هەیە، بەڵام وەکو حیزبی هەرێمی کوردستان نییە. بە دەستوور و یاسا و کەلتوری شارستانیی پێکهێنان و چالاکیی حیزب دیاریدەکرێت، چالاکیی حیزب کاتی تایبەتی هەیە. لە وڵاتانی ئەوروپا و لەو وڵاتانەی تردا کە کەلتوری سیاسیی ئەوروپا پەسەنددەکەن، لە کاتی هەڵبژاردندا حیزب پێکهاتەیەکی سیاسیی چالاکە، بە بەرنامەیەکی ئامادەکراوەوە بە لیستێکی پاڵێوراوانەوە، بەشداریی لە هەڵبژاردندا دەکات، بەرنامەکەی پێشکەشدەکات، نوێنەرەکانی بە خەڵک دەناسێنێت. ئەگەر لە هەڵبژاردندا سەرکەوتنی بەدەستهێنا، کاندیدەکانی خۆی بۆ بەڕێوەبردنی دەزگا سیاسییەکانی دەسەڵات (پەرلەمان و حکومەت) دیاریدەکات و دەسەڵاتیان پێدەدات، بۆ ئەوەی وەکو نوێنەری خەڵک، بۆ بەرژەوەندیی وڵات و بۆ بەرژەوەندیی خەڵک کاربکەن، ئیتر حیزب لەوە زیاتر ناڕوات.

بەو شێوەیە لەو وڵاتانەدا لە ڕێگەی نوێنەرانی گەل و فەرمانبەرانی دەوڵەتەوە کاروباری وڵات بەڕێوەدەبرێت. نوێنەرانی گەل و فەرمانبەرانی دەوڵەت دەسەڵاتی ڕاستقینەیان هەیە و حیزب دەستناخاتە ناو بڕیار و کارەکانی حکومەت و پەرلەمان، هەتا هەڵبژاردنێکی تر لە دەسەڵاتداریی دووردەکەوێتەوە، سەرقاڵی پەروەردەی ئەندام و کادرەکانی دەبێت. ئەگەر حیزب لە هەڵبژاردندا سەرکەوتنی بەدەستنەهێنا، بە بەرنامە و کارەکانی ڕابردوویدا دەچێتەوە، خۆی بۆ هەڵبژاردنێکی تر ئامادەدەکات.

کەوابوو لە کۆمەڵگە دیموکراتەکاندا حیزب هەیە، بەڵام ئەو حیزبە هەموو ڕۆژێک و هەموو مانگێک وەکو یەک چالاک نییە. لە کاتی هەڵبژاردن و لە کاتی قەیرانی سیاسییدا سەردەردەهێنێت و قسەی خۆی دەکات. ئەو حیزبە دەست لە فەرمانڕەوایی وڵات وەرنادات، ئەندامێکی مەکتەب_سیاسیی حیزب بەرپرسیارێتیی پەرلەمان و حکومەت و دەسەڵاتی دادوەریی وەرناگرێت. حیزب لە دەرەوەی دەوڵەتەوە دەوەستێت و چاودێریی کارەکانی حکومەت دەکات. ئامادەکاریی بۆ بەرنامەی نوێ دەکات. ئەندێشەی خەڵکی کوردستانیش ئەوەیە کە شێوە و ناوەڕۆکی حیزبی کوردیی لە شێوە و ناوەڕۆکی حیزبی ئەو وڵاتانە نزیکببێتەوە. ئەگەرهەر لایەنێک بیەوێت گۆڕانکارییبکات، حیزب لە دەسەڵاتداری هەرێم جیابکاتەوە، سیستەمی سیاسیی هەرێمی کوردستان لە سیستەمی سیاسیی کۆمەڵگەی ڕۆژئاوا نزیکبکاتەوە، دەبێت دژی بوونی حیزبی سیاسیی نەوەستێتەوە، بەڵکو دەبێت دژی بەلاڕێداچوونی حیزبی سیاسیی هەرێمی کوردستان بوەستێتەوە، هەوڵبدات حیزبە سیاسییەکانی ئەمڕۆی هەرێمی کوردستان لە حیزبە سیاسییەکانی ئەورووپای لیبراڵ_دیموکرات نزیکبکاتەوە. ئەو هۆکارە مێژوویی و ئایدۆلۆژییانە کە پەیوەندیی نێوان حیزب و دەسەڵاتی هەرێمیان ناهاوسەنگکردووە و حیزبی کوردیان کردووە بە حیزبی قائید ئەمانەن.

### ١– سیستەمی بەعسی عێراق:

یەکێک لە سیاسەتەکانی ڕژێمی سەدام ئەوە بوو دەستی حیزبی واڵاکرد هەتا کۆنترۆڵی هەموو دامودەزگاکانی دەوڵەت بکات، لە حکومەتدا بەرپرسی حیزبی لە بەرپرسی حکومی دەسەڵاتی زۆرتر بوو، بڕیارەکانی ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش کە دەزگایەکی حیزبیی بوو، وەکو بڕگەکانی دەستوور و یاسای پەرلەمان بوو.

لەبەرئەوەی دەسەڵاتدارانی هەرێم، حەزیان لە کەلتوری سیاسیی ڕژێمی سەدامە، حەزدەکەن سەدام لە عێراقدا چی کردووە خۆیان لە کوردستان دوبارەیبکەنەوە. ئیتر حیزب وەکو مۆتەکە سواری سنگی هەموو بوارەکانی ژیانی خەڵکی کوردستان و دەزگاکانی دەوڵەت دەکەن.

## ٢- حیزبی خەباتی چەکداریی:

لە هەرێمی کوردستاندا حیزبی کوردیی لەپێناو سەرخستنی پرۆسەی هەڵبژاردندا ئاوانەکراوە، حیزب بۆ خەباتی چەکداریی ئاواکراوە بۆ وەڵامی زوڵم و زۆری داگیرکەران و بۆ خەباتی کوردایەتیی ئاواکراوە.

لە سەردەمی خەباتی چەکدارییدا حیزب و دەزگای پیشمەرگایەتیی لەبریی پەرلەمان و حکومەت و دادگا، حوکمی ناوچە ئازادکراوەکانی کوردستانی دەکرد. لە دوای ڕاپەڕیین لەگەڵ ئەوەیشدا هەڵبژاردنی پەرلەمان و پێکهێنانی حکومەتی هەرێم وەکو ئامانجی سەرەکیی سیاسیی گەلی کورد بینران، وەکو هۆکاری تێکۆشانی گەلی کورد و حوکمڕانیی هەرێمی کوردستان سودیان لێوەرگیرا، بەڵام لەبەر ئەوەی حیزبە دەسەڵاتدارەکانی کوردستان بۆ ماوەیەکی درێژ، بە چڕوپڕیی لەژێر کاریگەریی کەلتوری سیاسیی تێکۆشانی حیزبدا ژیاون، هەتا ئێستا نەیانتوانیوە قوناغی خەباتی حیزبیی و چەکداریی لەبیربکەن، بە پێودانگی تێکۆشانی سەردەمی شاخی پێش ڕاپەڕیین و پێش ڕوخانی ڕژێمی سەدام کاردەکەن.

دەسەڵاتدارەکانی سەردەمی شاخ، دەسەڵاتی خۆیان ڕادەستی پەرلەمان و حکومەت و دادوەریی ناکەن، بەو هزرەوە لە هەڵبژاردنی پەرلەمان و پێکهێنانی حکومەتی هەرێم و حکومەتی عێراق نزیکدەبنەوە، کە دروستکراوی دەستی حیزب و خەباتی پێشمەرگایەتیی بن. بۆ ئەوەی پەیوەندیی نێوان حیزب و دەسەڵات هاوسەنگبکرێت، دەبێت قۆناغی سەردەمی تێکۆشانی شاخ (هەموو شتێک لە ڕێگەی حیزب و پێشمەرگەوە ئەنجامبدرێت) بەجێبهێڵین، دەست لە مۆدێلی سیاسیی حیزبایەتیی کۆن بەربدرێت و مۆدێلیکی نوێی حیزبایەتیی پەیڕەوبکرێت.

## ٣- ئایدۆلۆژیای مارکسیزم-لینینیزم:

لە دوای جەنگی دووەمی جیهانییەوە کوردایەتیی کەوتە ژێر کاریگەریی سیاسەتی یەکێتیی سۆڤیەت و ئایدۆلۆژیای مارکسیزم-لینینیزم، ئەو سیستەمە بە بنەمای دیموکراتیی ناوەندیی کاردەکات، لە کۆنگرەدا حیزب سەرکردایەتیی هەڵدەبژێرێت.

ئیتر ئەو سەرکردایەتییە بکوژ و ببڕ خۆی دەبێت. سەرکردایەتیی حیزب بۆی هەیە کۆنترۆڵی هەموو کایە سیاسیی و کۆمەڵایەتیی و ئابوریی و کەلتورییەکانی کۆمەڵگە بکات، گرنگیی ئەوتۆ بە هەڵبژاردن و پەرلەمان و حکومەت نادات.

لەو سیستەمەدا بڕیاری سیاسیی حیزب لە سەرووی یاسای پەرلەمان و بڕیاری حکومەتەوەیە. سکرتیری حیزبی شیوعیی سۆڤیەتیی سەرۆکی دەوڵەتە، بە پێگە حیزبییەکەی کۆنترۆڵی حکومەت و پەرلەمان و دەسەڵاتی دادوەریی و ئابوریی وڵات دەکات.

لە سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی بیستەمدا گۆرباتشۆڤ، پرۆسەی پرۆستریکا و کلاسنۆسی (بەلیبراڵییکردنی سیاسەت) ئەنجامدا. حیزبە شیوعییەکانی سەر بە بلۆکی سۆڤیەتیی ئەو گۆڕانکارییەیان وەرگرت و چاکسازی سیاسییان کرد، کەچی حیزبی کوردی هێشتا لەژێر کاریگەریی ئەو تیۆرییە سیاسیی و ڕێکخستنەی چەمکی دیموکراتیی ناوەندییدا دەژیت، گۆڕانکارییەکی وای نەکردووە وەڵامی پێویستییەکانی قۆناغ بداتەوە. بۆیە بۆ لایەنە پەیوەندییدار و گۆڕانخوازەکانی هەرێمی کوردستان باشە، ئەو هۆکارە مێژوویی و ئایدۆلۆژییە ناهاوسەنگەی نێوان حیزب و حوکمڕانیی هەرێمی کوردستان ببینن و کار بۆ گۆڕینی بکەن.

### ٤- ئەفسانە و ئاین:

کۆمەڵگەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە قووڵیی لەژێر کاریگەریی ئەفسانە و ئایندا دەژین، ئاین لوتکەی ناوەندگەراییە، ئەگەرچی حیزبە دەسەڵاتدارەکانی هەرێمی کوردستان خۆیان بە سکۆلار دەزانن، بەڵام لە هەمان کاتدا کاریگەریی ناوەندێتیی ئاینیان لەسەرە. لە گفتوگۆی حیزبیی و ڕووبەڕووبوونەوەی دژبەرەکانادا، ئەم کاریگەرییە بە ڕوونیی دەردەکەوێت. کاتێک کادرێکی حیزب داکۆکیی لە سەرکردەکەی دەکات، دەڵێت فلان سەرکردەی من خودا، یان پێغەمبەری منە.

ناوەندێتیی ئاین بە ناو خانەکانی جەستەی کۆمەڵگەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بڵاوبووەتەوە، بەزەحمەت دەردەکرێت، بەزەحمەت ناناوەندێتیی لە شوێنی جێگیردەکرێت. ئەمەیش هۆکارێکی ترە کە دەسەڵاتدارانی هەرێم ناتوانن خۆیان بگۆڕن.

له لایەکی ترەوە ئیسلامییەکان پرۆسەکانی هەبژاردن و پەرلەمان و جیاکردنەوەی دەسەلاتەکان و ئازادیی سیاسیی بە کەلتوری لیبرالیزمی ئەوروپیی و داهێنانی مەسیحیی و جووی دەزانن، چەند بۆیان بکرێت دژایەتییدەکەن.

### ٣- ئیسلامیی و سکۆلاریی:

حیزبە ئیسلامییەکانی کوردستان (بزوتنەوەی ئیسلامیی کوردستان، یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان، کۆمەڵی دادگەریی کوردستان،) زۆربەی کات لە دەرەوەی دەسەلات بوون، وەکو ئۆپۆزسیۆنێکی فەرمییش سیاسەت ناکەن، بەلام چالاکیی سیاسیی و کۆمەلایەتییان هەیە. هەلوێستی ئەو لایەنانە لەسەر سیستەمی سیاسیی هەرێم و لەسەر دەستوور، لە پارتیی و یەکێتیی جیاوازترە، ئەگەرچی حیزبە ئیسلامییەکان لەسەر بارودۆخی سیاسیی هەلوێستی جیاوازیان هەیە، بەلام لە ئاستی ئایدۆلۆژیی و ستراتیژدا، جیاوازییەکی ئەوتۆیان نییە و هەموویان داوای چارەسەری ئیسلامییانەی کێشەکانی هەرێمی کوردستان دەکەن. داوا دەکەن قورئان سەرچاوەی یاساکانی هەرێم بێت.

حیزبە دەسەلاتدارە سکۆلارەکانی باشوور رێز لە ئاین دەگرن، بەلام وای بۆدەچن کێشەکانی ئەم سەردەمە بە ئیسلامی سیاسیی چارەسەر ناکرێن و نایانەوێت ئاین تێکەڵی سیاسەت ببێت، دەیانەوێت ئاین لە حوکمڕانیی جیابکرێتەوە. حیزبە سکۆلارەکان دەڵێن ئیسلامییەکان دەیانەوێت خەڵکی کوردستان لە کێشەی نەتەوەیی دووربخەنەوە، بە کێشەی ئاینییەوە سەرقاڵبکەن، بۆ ئەوەی گەلی کورد هەر بە ژێردەستیی داگیرکەرانی ولاتە ئیسلامییەکان بمێنێتەوە.

سکۆلارەکانی دەرەوەی دەسەلات دەڵێن: سەردەمی ئاینگەرایی بەسەرچووە، ئەگەر سیستەمی سیاسیی هەرێم سیستەمێکی ئیسلامیی بێت، هێندە کێشە بۆ کۆمەڵگەی کوردستان دروستدەکرێت، مرۆڤی کورد ئاوات بە پارتیی و یەکێتیی بخوازێت. دەڵێن ئەو ولاتانەی کە سیستەمی ئیسلامیی سیاسییان هەڵبژاردووە، دوچاری قەیرانی سیاسیی و ئابوریی دەبنەوە، ناکۆکییەکانیان لەگەڵ سیستەمی سەرمایەداریی جیهانیی کۆتایینایەت. لە سایەی ئەو سیستەمەدا گەلی کوردستان

پشوونادات، کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیی ڕێگەنادات ئیسلامی سیاسیی کوردستانیش وەکو ئیسلامی سیاسیی وڵاتانی تر کار بۆ جێگیرکردنی سیستەمێکی ئیسلامیی بکات. بۆیە بۆ حیزبە ئیسلامییەکان زەحمەتدەبێت سیستەمێکی سیاسیی ئیسلامیی لە هەرێمی کوردستاندا جێگیربکەن. حیزبە ئیسلامییەکانی کوردستان ماوەیەکە دەستیان لە خەباتی چەکداریی بەرداوە، خەباتی مەدەنیی دەکەن. چاو لەو هەموو گەندەڵیی و ناداپەروەرییەی حوکمڕانیی هەرێم دەپۆشن، بۆ ئەوەی پییاننەڵێن دژی مافەکانی گەلی کورد دەوەستنەوە.

## ٤- دراو و درۆ*٧:

لە تێگەیشتنی سیستەمی لیبراڵی کلاسیکدا هەر تاکێک، یان هەر پێکهاتەیەک خاوەنی زۆرترین سەرمایە و دەسەڵاتی ئابوریی بێت، ئەو تاک و پێکهاتەیە دەسەڵاتی سیاسیی مسۆگەردەکات. لەم سەردەمەدا سیستەمی لیبراڵیی جیهانیی گۆڕاوە، چیتر وەکو جاران کار بەو چەمکە مادییە پەتییە ناکات، سیستەمی نوێی لیبراڵ_دیموکرات، چەمکی دادپەروەریی و مافی مرۆڤ و مافی ژن و منداڵی لە سەرووی چەمکە ئابورییەکە داناوە و کاریانپێدەکات. پێش ڕاپەڕیین لە سەردەمی خەباتی چەکدارییدا، لە سێبەری کوردایەتیی و پێشمەرگایەتییدا، یەکێک لە ئامانجی بەرپرسەکانی شۆڕشی ئەیلول و شۆڕشی نوێ و حیزبەکان، کۆکردنەوەی سەرمایە و خۆدەوڵەمەندکردن بوو.

ساڵی ١٩٧٥ کە شۆڕشی ئەیلول کۆتاییهات، خاوەنی سەرمایەیەکی دارایی زۆر بوو، ئەو بڕەپارەیە لای سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول مایەوە، بنەماڵەی بەرزانیی دەستیان بەسەر ئەو پارەیەدا گرت.

لە سەردەمی شۆڕشی نوێدا چەندیین دەوڵەتی وەکو لیبیا هاوکاریی شۆڕشی کورد و سەرۆک_حیزبەکانی کوردی دەکرد. ئەو پارەیە چەند بووە؟ چۆن خەرجکراوە؟ بۆ خەبات و بۆ حیزب خەرجکراوە، یان لەسەر ژمارە بانکی بەرپرسەکان دانراوە؟ کەس نازانێت! ساڵی ١٩٨٣ لە گوندی زەڵێ ناوچەی مەنگوڕایەتیی پێشمەرگە بووم، نەوشیروان مستەفا سکرتێری کۆمەڵە پێیگوتم:

من نازانم داهاتی یەکێتیی چەندە، مام جەلال بڕی داهات و شێوەی خەرجکردن و شوێنی دانانی سامانی یەکێتیی بە منیش ناڵێت*٨.

لە دوای ڕاپەڕینەوە دەسەڵاتدارانی هەرێم تەنها بەو چەمکە مادییە پەتییە کۆنەی سیستەمی سەرمایەداریی جیهان کاردەکەن، (هەر کەس پارەی زۆرتربێت دەسەڵاتی زۆرتر دەبێت). گرنگیی بە پێوانەکانی سیستەمی نوێی جیهانیی نادەن و کاریپێناکەن. لە ناو دەسەڵاتدارانی هەرێمی کوردستاندا گەرمەی پێشخستنی هزری تاکپەرستیی و کۆکردنەوەی زۆرترین سەرمایەیە، لەسەر حسابی قووتی خەڵک گەورەترین خێزان و بنەماڵەی ئابوریی و سیاسیی دروستدەکەن، بۆ ئەوەی دەسەڵاتی سیاسیی مسۆگەربکەن و دەسەڵاتەکەیان بپارێزن.

لە دوای ڕاپەڕینەوە بە شێوەیەکی نهێنیی و نادادپەروەرانە داهاتی کوردستان لە لایەن حیزبەکانەوە کۆدەکرێتەوە، بە نهێنیی لە ناو خۆیاندا دابەشیدەکەن. لە دوای دامەزراندنی حکومەتی عێراقی نوێوە کەس نەیدەزانی چەند لە بودجەی هەرێمی کوردستان دەچێتە گیرفانی بەرپرسانی حیزبە دەسەڵاتدارەکانی هەرێمی کوردستان و لە کوێ کۆیدەکەنەوە؟

ساڵی ٢٠٠٤ ئەندامانی مەکتەبی سیاسیی یەکێتیی یاداشتێکی ناڕەزاییان ئاڕاستەی مام جەلال کرد، تیایدا ناڕەزاییان پیشاندا کە مام جەلال سامانی یەکێتییان لێدەشارێتەوە.

لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٩دا بەرپرسێکی بزوتنەوەی گۆڕان کە پێشتر ئەندامی مەکتەبی سیاسیی یەکێتیی بوو، ئاشکرایکرد کە هەردوو حیزبی دەسەڵاتدار مانگانە ٣٥ ملیۆن دۆلار لە بودجەی حکومەتی هەرێمی کوردستان بۆ خۆیان وەردەگرن*٩.

لە ساڵانی ڕابردوودا ئەندامێکی دەستەی کارگێڕیی مەکتەبی سیاسیی یەکێتیی، لە لیدوانێکیدا بۆ کەناڵەکانی ڕاگەیاندن باسی لەو دەفتەرە دۆلارانەی بەرپرسەکان کرد کە لە ژێرزەمینەکاندا شاردوویانەتەوە*١٠.

لەم کاتەدا کە من سەرقاڵی نوسینی ئەم کتێبەم، ڕۆژنامەکانی ئەمریکا باسی سامانی بنەماڵەی بەرزانیی دەکەن، باس لەوە دەکەن کە مەسرور بەرزانیی لە ویلایەتی مەیامی ئەمریکا قەسرێکی بە بایی هەژدە ملیۆن دۆلار کڕیوە. پرسیاری ئەوەی لێدەکەن ئەو سەرمایەی بە چی و لە کوێ دەستکەوتووە، کە قەسرەکەی

پێکڕیوه. ئەمریکییەکان نازانن دەسەڵاتدارانی هەرێم دەیان ساڵە لە سەردەمی شۆڕش و لە سەردەمی حکومەتی هەرێمدا دەست بەسەر سەرمایەی کوردستاندا دەگرن و لە دەرەوەی کوردستان وەبەرهێنانی پێدەکەن*١١.

خاڵێکی تری خراپ لە پشت دەستبەسەرداگرتنی داهاتی هەرێمی کوردستاندا لە لایەن حیزبەوە ئەوەیە، بازرگان و دەسەڵاتدار یەک کەسە، یان یەک پێکهاتەیە و سەر بە حیزبی دەسەڵاتدارە. لە سیستەمی سیاسیی وڵاتانی تردا، سیاسیی و بازرگان لە یەک جیاکراونەتەوە، حیزب سیاسەتدەکات و بازرگان و سەرمایەداریش کاسپییدەکەن. لە وڵاتانی تردا سیاسیی و بازرگان دوو پێکهاتەی جیاواز و ڕکابەرن، ململانێ لە نێوان سیاسیی و کاسپکاردا هەیە، سیاسیی داکۆکیی لە مافی خەڵک دەکات و بازرگان و سەرمایەداریش لەسەر حسابی خەڵک هەوڵی کۆکردنەوەی زۆرترین سەرمایە دەدات. سیاسیی چاودێریی سەرمایەدار دەکات، ڕێگەنادات سەرمایەدار هێڵی سوور ببەزێنێت، سیاسیی لە ڕێگەی حکومەتەوە باج لە سەرمایەدار وەردەگرێت، سەرمایەداریش گوشار لەسەر سیاسیی دادەنێت، بۆ ئەوەی بەرژەوەندییەکانی خۆی بپارێزێت، بەڵام لە هەرێمی کوردستاندا سیاسیی و سەرمایەدار یەکێکن، کەس چاودێریی ئەویتر ناکات، کەس گوشار لەسەر ئەوی تر دانانێت، هەردووکیان هەوڵی هەژارکردنی کۆمەڵگە دەدەن. بازرگانی سیاسیی، دامودەزگاکانی حکومڕانیی بۆ بەرژەوەندیی خۆی بەکاردەهێنێت.

ئەو سەرمایەدارە سەربەخۆیانەی کە وەبەرهێنان دەکەن، حیزب و دەسەڵاتداران هێندە سەرانەی قورسیان لێدەسێنن، سەرمایەدارەکە لە ژێریدا دەرناچێت، یان ئیفلاسدەکات، یان بەرهەم و خزمەتگوزارییەکان هێندە گراندەکات خەڵک ئیفلاسبکات.

کادر و بەرپرس و بنەماڵە دەسەڵاتدارەکانی حیزب، هەتا دوێنێ خۆیان بە پارێزەری کورد و کوردستان دەزانی، خەباتی چەکداریی و سیاسییان دەکرد. دوای ڕاپەڕیین لە کوردایەتیی پەشیمانبوونەوە، هەریەکە و چەندیین کۆمپانیای بازرگانیی دەکەنەوە، خەریکی کار و کاسپیین، خەباتی ڕابردوویان و دەسەڵاتی ئەمڕۆیان بۆ پشتیوانیی کۆمپانیاکانیان بەکاردەهێنن. ئەگەر خەڵک لەسەر ئەم لادانە سیاسیی و ئەخلاقییەیان ڕەخنەیان لێبگرێت، دەڵێن سەردەمی ئەی ڕەقیب بەسەرچوو.

هەر بنەماڵەیەک بە ناوی پێشمەرگە و کارمەندەوە کۆمەڵێک خەڵکی بۆ پاراستن و بەڕێوەبردنی پێگە سیاسیی و ئابورییەکەی لە دەوری خۆی کۆکردووەتەوە، نانێکی مەمرە و مەژییان دەداتێ و درێژە بەم ڕەوشەی ئەمڕۆی هەرێمی کوردستان دەدەن.

سیاسەت بەرژەوەندیی گەل و زانست و هونەرە، بەڵام دەسەڵاتدارانی هەرێم سیاسەت بە درۆکردن و هەڵخەڵەتاندنی خەڵک دەزانن. لە سەرەتای دروستبوونی شۆڕشی ئەیلولەوە، سەرکردایەتیی شۆڕش بە دروشمی (یان کوردستان، یان نەمان) دڵسۆزیی خۆی بۆ گەلی کوردستان پیشاندا. خەڵکی کوردستان بەم دروشمە سۆزدارییە نەتەوەییە فریویخوارد، سەدان هەزار کەس لە سێبەری ئەو دروشمەدا چەکی پێشمەرگایەتیی هەڵگرت، دەیان هەزاریان شەهید و برینداربوون. بەڵام هەر ئەو سەرکردایەتییە لەپێناو مانەوەی خۆیدا نەک بەرگریی لە کوردستان نەکرد، چەندیین جار شۆڕش و کورد و کوردستانی فرۆشت.

سەرکردەکانی شۆڕشی ئەیلول و شۆڕشی نوێ، کەرکوکیان بە دڵ و قودسی کوردستان دەچواند، بەڵام دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام، کاتێک دەرفەت هەبوو کورد کەرکوک بگەڕێنێتەوە سەر هەرێمی کوردستان، لەپێناو بەرژەوەندیی خۆیاندا وازیان لە دڵ و قودسی کوردستان هێنا. ساڵی ٢٠٠٥ و ساڵی ٢٠١٧ دەسەڵاتدارانی هەرێم لەسەر جۆری پەیوەندیی نێوان باشووری کوردستان و عێراق، ڕاپرسییان بە خەڵکی کوردستان کرد، بەڵام کاتێک بینییان بەو ڕاپرسییە لە بەرژەوەندییان دەدرێت، خۆیان نەکرد بە خاوەنی ڕاپرسییەکە و لێی پەشیمانبوونەوە.

لە ماوەی ڕابردوودا هەر کێشەیەک لە باشووری کوردستاندا دروستدەبێت، وەکو گرانیی و موچە بڕین و ئاوارەبوونی خەڵک و دروستبوونەوەی داعش، دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان هیچ بەرپرسیارێتییەک هەڵناگرێت، دەڵێت ئەوە خەتای حکومەتی عێراق و حەشدی شەعبیی و پەکەکەیە. ئەگەر ڕۆژنامە ئەمریکییەکان پەردە لەسەر سامانی تاڵانکراوی خەڵکی کوردستان هەڵبماڵن کە دەسەڵاتداران لە ئەمریکا کۆشک و تەلاری پێدەکڕن، تاوانەکە دەخەنە ملی ڕۆژنامەنوسە ئازادەکان و پەرلەمانتارە ناڕازییەکانی کوردستان و دەیکەن بە کێشەی تایبەتیی و شەخسیی.

دەتوانین بڵێین ئەو سیاسەتە بە ناو نەتەوەییەی دەسەڵاتدارانی هەرێمی کوردستان پەیڕەویدەکەن ڕاست نییە، هەمووی درۆیە و بۆ فریودانی خەڵکی سادەی

کوردستانە دەیانەوێت بازرگانیی بە هەستی نەتەوەیی خەڵکی کوردستانەوە بکەن، بۆ ئەوەیە خەڵکی کوردستان بە حیزبی نەتەوەییان بزانن و بە ڕزگارکەری کورد و کوردستانیان بزانن و پشتگیرییانبکەن. لە پاشەکەوتکردن و لێبڕین و دواخستنی موچەی فەرمانبەرانی هەرێمدا، کە لە ساڵی ٢٠١٤ دەستپێکرد هەتا ٢٠٢١ بەردەوام بوو، دەسەڵاتدارانی هەرێم بە دراو و درۆ پێکەوە کاردەکەن، دەست بەسەر داهاتەکەدا دەگرن و دەڵێن بودجەی پێویستمان نییە موچەی فەرمانبەران بدەین. ئەمە لە کاتێکدایە ئەندامانی پەرلەمان و شارەزایانی بواری ئابوریی دەیسەلێمنن کە داهاتی هەرێم بەبێ هاوکاریی حکومەتی عێراقی ناوەندییش، بەشی موچەی فەرمانبەران و پێویستیی تر دەکات.

## ٥- سەرکوتکردن و لەناوبردن:

لە دروستبوونی شۆڕشی ئەیلولەوە بەکارهێنانی هێز بۆ سەرکوتکردن و لەناوبردنی کەسان و گروپی ناڕازیی ناو حیزب و شۆڕش و دەرەوەی حیزب و شۆڕش بەردەوامە و هەتا ئەمڕۆ کارییپێدەکرێت. ئەو کەس و گروپانەی بەرانبەر بە سیاسەتی باڵادەستی حیزب، یان شۆڕش دەنگهەڵدەبڕن، دەنگیان کپدەکەنەوە. ئەگەر کۆڵیاننەدا ڕاستەخۆ، یان بە شێوەی تیرۆر لەناویاندەبەن، ڕێگەی سیاسەتی سەرکردایەتیی حیزب و شۆڕش تەختدەکەن.

لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلودا سەرکوتکردن و لەناوبردن لە لوتکەدا بوو، لە شۆڕشی نوێدا ئەو دیاردەیە بەردەوام بوو، لەگەڵ ئەوەیشدا ئەم جۆرە سیاسەتە بووە هۆکاری بێزاریی خەڵکی کوردستان و جیابوونەوە لە ناو حیزبەکاندا و چەندیین کارەساتی کۆمەڵکوژیی لێکەوتەوە، بەڵام حیزبەکان ئامادە نین دەست لە سیاسەتی سەرکوتکردن و لەناوبردنی ڕکابەرەکەیان هەڵبگرن.

لە دوای ڕاپەڕیین و هەڵبژاردنی پەرلەمان و پێکهێنانی حکومەت، خەڵکی کوردستان بەتەمابوون حیزبە دەسەڵاتدارەکانی کوردستان ئەوانەی هێزی چەکداریان هەیە، دەست لەو سیاسەتە هەڵبگرن، بەڵام حیزبە دەسەڵاتدارەکان قەت گوێیان بە هیوا و ئاواتی خەڵکی کوردستان نەداوە، لەسەر سیاسەتی سەرکوتکردن و لەناوبردنی ڕکابەرەکانیان بەردەوامن.

له پارێزگای دهۆک کۆمەڵێک کەسایەتیی سیاسیی وەکو ڕەئوف ئاکرێیی و نەزیر عومەر و لازار میخۆ و قەیس موحەممەد و ئەندام پەرلەمانی لیستی مەسیحییەکان فرانسیس یوسف تۆما تیرۆرکران.

له خولی سێیەمی شەڕی براکوژییدا کەمین بۆ حەسەن کوێستانیی ئەندامی سەرکردایەتیی یەکێتیی دانرا و شەهیدکرا. له کاتی شەڕی براکوژییدا ڕێبازی فەرماندەی سەربازیی یەکێتیی له لایەن هێزی پێشمەرگەی پارتییەوە بەدیلگیرا و شەهیدکرا. ساڵی ٢٠٠٤ بەرپرسی لقی دهۆکی یەکگرتووی ئیسلامیی (موشیر) بەر هێرشی لایەنگرانی پارتیی کەوت و له بارەگای لقدا شەهیدکرا.

له سلێمانیی بەکر عەلی، عەلی بۆسکانیی، عەزیز خۆشناو، جەلالی حاجی حسێن دوای ڕاپەڕیین تیرۆرکران. هەر دوای ڕاپەڕیین تەوفیقی نوری بەگ و عەلی کفریی و حەکیم شەهیدکران. ساڵی ١٩٩٦ دکتۆر سیروان سەرۆکی یەکێتی نەتەوەیی دیموکراتی کوردستان (yndk) شەهید کرا. ساڵی ٢٠٠٠ حەوت کادری حیزبی کۆمونیست له شاری سلێمانیی شەهیدکران. ساڵی ٢٠٠٢ مەلا عەبدوڵڵای قەسری ئەندامی مەکتەبی سیاسیی کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان و هاوڕێکانی له خاڵی پشکنینی سلێمانیی شەهیدکران.

له هەولێر هەر یەک له هابیل و قابیل و سەلاح هەورامیی و هەردوو ئەندامپەرلەمان، سیروان نەورۆلیی و عوسمان دزەیی تیرۆرکران، نزیکەی ٧٠ گەریلای (پ. ک. ک) دەستگیرکران و کۆمەڵکوژکران، هەتا ئێستا کەس شوێنی گۆڕەکانیان نازانێت. لەم ساڵانەی دواییدا مامۆستای ئاینیی مەلا هۆشیار له هەولێر تیرۆرکرا.

له تەوێڵە ساڵی ١٩٩١حەسەنی حاجی تەوفیقی ئەندامی پارتی گەل بە پیلانگێڕییەک شەهیدکرا. له کۆیە موحەممەد حەلاق و هاوڕێکانی بە پیلانگێڕییەک شەهیدکران. له بیتوێن مامۆستا ئەمین و هاوڕێکانی تیرۆرکران. ڕۆژی ٢٥/ ١١/ ٢٠٢١ له ڕانیە عەمیدی یاسایی موراد کانیی کوردەیی و هاوڕێکانی بە پیلانگێڕییەک شەهیدکران.

دەسەڵاتدارانی هەرێم هەر بە لەناوبردنی سیاسییەکانەوە نەوەستان، دەستیان بە کوشتنی ڕۆژنامەنوسانیش کرد، له کەرکوک سۆرانی مامەحەمە و عەبدولستار تاهیر شەریفیان تیرۆرکرد. له هەولێر سەردەشت عوسمانیان تیرۆرکرد. له کەلار کاوە گەرمیانیان تیرۆرکرد. له دهۆک ویداد حوسەینیان تیرۆرکرد.

## ٦- ئاغای گەل و جوتیاری داگیرکەر:

لە خولەکانی شەڕی براکوژییدا خەڵکی کوردستان و بنەماڵەی شەهیدان بەردەوام داوای ڕاگرتن و کۆتاییهێنانی شەڕی براکوژییان لە سەرکردایەتیی حیزبەکان دەکرد، دەسەڵاتدارانی هەرێم و لایەنە بەشەڕهاتووەکان وەڵامی داخوازیی خەڵک و بنەماڵەی شەهدانیان نەدەدایەوە، بەڵام کە وڵاتانی ناوچەیی و هێزی جیهانیی دەیانبینی شەڕی براکوژیی کورد لە بەرژەوەندییان نییە، ڕاگرتنی ئەو شەڕە و بەشەڕدانی کورد لە بەرەیەکی تردا خزمەتی سیاسەتی ئەوان دەکات، یەکسەر شەڕی براکوژیی کوردیان ڕادەگرت و کوردیان لە بەرەیەکی تردا بەشەڕدەدا.

ساڵی ١٩٨٦ ئێران خولی دووەمی شەڕی براکوژیی لە نێوان یەکێتیی و پارتییدا ڕاگرت، هەردووکیانی ڕێکخست و لەگەڵ هێزەکانی تری ئۆپۆزسیۆنی عێراقدا بەرەیەکی شەڕی دژی ڕژێمی سەدامی پێکردنەوە. ساڵی ١٩٩٨ ئەمریکا خولی سێیەمی شەڕی براکوژیی نێوان پارتیی و یەکێتیی ڕاگرت، هەردووکیانی ئاشتکردوە و بۆ ڕوخانی ڕژێمی سەدام سودی لێوەرگرتن. لە دوای ڕاپەڕینەوە پارتیی و یەکێتیی ئیش نەماوە بۆ تورکیای نەکەن، داوادەکەن (پ. م. ف) *١٢ بێتە ناو خاکی کوردستان و نێوەندگیریی شەڕی پارتیی و یەکێتیی بکات. دەعوەتی سوپای تورکیا دەکەن لە خاکی کوردستان و عێراق بنکەی سەربازیی و بنکەی هەواڵگریی بکاتەوە. هاوکاریی میتی تورکیا دەکەن، سیاسییەکانی باکووری کوردستان دەستگیربکات و تیرۆریانبکات. نەوتی کوردستان بە تورکیا دەبەخشن و هەرێمی کوردستان دەکەنە بازاڕێکی بێڕکابەری کاڵاکانی تورکیا.

لە کاتێکدا بەو شێوەیە خزمەتی تورکیا دەکەن هەتا ئێستا تورکیا بە هەرێمی کوردستان دەڵێت باکوری عێراق. وەزیری جەنگیی تورکیا لە پەرلەمانی تورکیا دەڵێت لە تورکیا و لە عێراق کوردستان نییە، وڵاتێک نییە بە ناوی کوردستانەوە. چاوپۆشیی لە سیاسەتی شۆڤینیی تورکیا بەرانبەر بە کورد، گەورەترین سوکایەتییە بە گەلی کورد و کوردستان دەکرێت. لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدامەوە دەوڵەتی عێراقی نوێ بە دەستوور گەرەنتیی مافە نەتەوەیی و ئیداریی و ئابورییەکانی هەرێمی کوردستانی کردووە. کورد نوێنەری لە دەزگاکانی دەوڵەتی عێراقدا هەیە،

دەتوانین بڵێین کورد لە عێراقدا دوو دەوڵەتی هەیە، دەوڵەتی هەرێمی کوردستان و دەوڵەتی عێراق، کەچی دەسەڵاتدارانی هەرێم وەکو دوژمن لەگەڵ عێراقدا هەڵسوکەوتدەکەن. ئەوەی خراپبێت بە عێراقی دەکەن، ڕێگەدەدەن دوژمنانی عێراق سەروەریی خاکەکەی پێشێلبکات. ئەمە لە کاتێکدایە بژاردەی لەوەی عێراق باشتر بۆ کورد لەئارادا نییە، ئەگەر ئەو بارودۆخەی عێراق گۆڕنکاریی بەسەردابێت، کوردی باشووری کوردستانیش وەکو کوردی باکور و ڕۆژهەڵاتی کوردستانی لێدێت. ئەو سەرکێشیی و نابەرپرسیارێتییەی دەسەڵاتدارانی هەرێم بەرانبەر بە دەوڵەتی عێراق دەیکەن، بە دژایەتییکردنی گەلی کورد و بە خزمەتکردنی دوژمنانی کورد دەژمێردرێت. دەسەڵاتدارانی هەرێم هەرێمیان وەکو بنکەیەکی دواوەی وڵاتانی ناوچەکە لێکردووە، بەسەر هەژموونی تورکیا و ئێراندا دابەشیانکردووە، ئەو وڵاتانە چییان بوێت و چۆنیان بوێت، درێژە بە سیاسەتی پاوانخوازیی و سەرکوتکردنی نارازییەکانیان و دژایەتییکردنی ماف و ئازادییەکانی گەلی کورد دەدەن. ئەم جۆرە سیاسەتە وایکردووە پارتیی و یەکێتیی و دەزگا ئەمنییەکانیان، وەکو بەشێکی دەزگا سیاسیی و هەواڵگرییەکانی ئەو وڵاتانە بن، ئیتر ئەو وڵاتانەیش وەکو بەشێکی بەرەی پێشەوەی جەنگی خۆیان داکۆکیی لە مانەوە و بەردەوامیی ئەو دوو حیزبە دەسەڵاتدارەی هەرێم دەکەن.

## ٧- کەلتوری سیاسیی پارتیی:

پارتیی وەکو حیزبێکی دێریین و بەدەسەڵاتترین حیزبی ئەمڕۆی باشووری کوردستان، لەسەر چەند پایەیەک سیاسەتدەکات، هەوڵدەدات هەندێک لە سیاسەتی خۆی بەسەر حیزبەکانی تری کوردستاندا بسەپێنێت، دەیەوێت هەندێک لە پایە سیاسییەکانیشی بە تەنها موڵکی خۆی بن و خۆی تێیاندا باڵادەستبێت.

١- پارتیی خۆی بە باوکی کوردایەتیی دەزانێت، بەهۆی دروشمەکانی کوردایەتییەوە، خەڵکی کوردستان فریودەدات و خۆی وەکو حیزبێکی نەتەوەیی دەناسێنێت. پێگەی سیاسیی خۆی لە ناو گەلی کورددا بەهێزدەکات. پارتیی دەیەوێت بە تەنها خۆی لەو مەیدانەدا شۆڕەسوار بێت و هیچ حیزبێکی تر لە کوردایەتییدا بۆڕینەداتەوە.

٢- دەستگرتن بەسەر سامانی خەڵکی کوردستاندا، پارتیی یەکێکە لە حیزبە سەرمایەدارەکانی جیهان، ساڵی ١٩٨٨ دوای ئەنفال و کیمیاباران کادرێکی پارتیی لە ئێران باسی ئەو سامانەی پارتیی بۆ کردم، کە لە بانکەکانی ئەوروپا و ئەمریکا هەڵگیراوە. ساڵی ١٩٩٨ جۆرج قرداحیٚ پێشکەشکاری بەرنامەی وەزنەک زەهەب (کێشی خۆت ئاڵتونە) لە کەناڵی تەلەفزیۆنیی (mbc) پرسیاری لە بەشداربوویەکی بەرنامەکە کرد، گوتی: پارتیی دیموکراتی کوردستان و پارتیی دیموکراتی ئەمریکا کامیان دەوڵەمەندترن؟ بەشداربووەکە گوتی: پارتیی دیموکراتی ئەمریکا. جۆرج قرداحیٚ گوتی: وەڵامەکەت هەڵەیە، پارتیی دیموکراتی کوردستان زۆر دەوڵەمەندە. ئاخۆ سەرمایەی پارتیی (سەرمایەی بەرزانییەکان) ئێستا چەند بێت!

پارتیی نایەوێت لەم بوارەدا کەس پێشیبکەوێتەوە، ئەگەرچی دوای ڕاپەڕین گومرگی ئیبراهیم خەلیلی لەگەڵ یەکێتیی بەشکردبوو، بەڵام بەهۆی خولی سێیەمی شەڕی براکوژییەوە ئەو ئیمتیازەی لە یەکێتیی سەندەوە، لەو کاتەوە یەکێتیی لە دەستبەسەرداگرتنی سامانی خەڵکدا برابچووکە.

٣- پارتیی سیاسەتێکی تایبەتی لەسەر کەمینەکانی کوردستان هەیە، بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان ڕێژەیەکی کۆتای بۆ تورکمانەکان و مسیحییەکان داناوە، لە هەر هەڵبژاردنێکدا ١١ کورسییان بەردەکەوێت. ئەم ١١ کورسییەی پەرلەمان لە بڕیار و دەنگدانی پەرلەماندا پشتگیریی سیاسەتی پارتیی دەکەن.

پۆستی سکرتێری پەرلەمان و وەزارەتێکی حکومەتی هەرێمیشی بە تورکمانەکان بەخشیوە، بەو شێوەیە لەو دوو دەزگایەیشدا پشتیوانیی تورکمانی بۆ خۆی مسۆگەرکردووە. بەو نزیکبوونەوەیەی لە تورکمانەکان هێندەی تر پشتیوانیی تورکیا بۆ خۆی بەدەستدەهێنێت، لەبەرئەوەی ژمارەی تورکمان و مەسیحیی هەرێم کەمن، ترسی ئەوەی نییە تورکمان و مەسیحیی لەسەر دەسەڵات ڕکابەری لەگەڵدا بکەن.

پۆستەکانی عێراقیشی بەسەر تورکمان و شیعە و مەسیحییەکانی خۆیدا دابەشکردووە، بۆ ئەوەی لەوێیش پشتگیریی شیعەکانی عێراق و دەوڵەتانی ئێران و تورکیا و ئەوروپا و ئەمریکا بەدەستبهێنێت. پارتیی نایەوێت و ڕێگەنادات لەم بوارەیشدا هیچ حیزبێک لاسایبکاتەوە.

٤- پارتیی حیزبێکی بنەماڵەییە، حیزبی کوڕ و نەوەکانی مەلامستەفایە. پارتیی گەرای بنەماڵەچێتیی لە ناو هەموو حیزبەکانی تری کوردستاندا دەخات، هەتا هەموویان بکات بە حیزبی بنەماڵە. لەم بوارەدا حەزدەکات هەموو حیزبەکان لاساییبکەنەوە، بۆ ئەوەی کەس گلەیی لە پارتیی نەکات و نەڵێت بنەماڵەی بەرزانیی هەموو پۆستەکانی حیزب و حکومەتیان قورخکردووە. پارتیی دەزانێت سیستەمی بنەماڵەچێتیی لە ناو حیزبەکانی تری کوردستاندا وەکو پارتیی سەرکەوتوو نابێت، ئاژاوە و گیروگرفت دەنێتەوە و ئەو حیزبانە دوچاری لێکترازان دەکات، بەو شێوەیە پارتیی ڕەخنەی خەڵک لەسەر خۆی کەمدەکاتەوە و حیزبە ڕکابەرەکانیشی دوچاری گیروگرفت دەکات.

٥- لە شۆڕشی ئەیلولەوە هەتا ئەمڕۆ پارتیی پەیوەندییەکی ناهاوسەنگی لەگەڵ داگیرکەرانی کوردستاندا دروستکردووە، ئەو پەیوەندییەی لەگەڵ ئێران و تورکیا بە زیانی خەبات و تێکۆشانی گەلی ڕۆژهەڵاتی کوردستان و باکوری کوردستان تەواوبووە. ئەم سیاسەتەی پارتیی لە لایەن گەلی کورد و دۆستانی کوردەوە ڕەخنەی زۆری لێگیراوە، پارتیی پێی لەکەدارکراوە، هەرچی دەکات ناتوانێت واز لەو سیاسەتەی بهێنێت و داوای لێبورد لە گەلی کورد بکات. پەنای بۆ ئەوە بردووە حیزبەکانی تری کوردستان لەم بوارەدا وەکو خۆی لێبکات، لەگەڵ داگیرکەرانی کوردستاندا پەیوەندیی ناهاوسەنگییان بۆ دروستبکات و بیانکات بەو تەڵەیەوە کە قاچی خۆی گرتووە، بۆ ئەوەی سەرنج و ڕەخنەکانی گەلی کورد و دۆستەکانی کورد، هەمووی ئاڕاستەی پارتیی نەکرێت، هەندێکیشی ڕووبەڕووی ئەو حیزبانە ببێتەوە کە پارتیی بۆژەیکردوون و قاچیان بە تەڵەی داگیرکەرانەوە دەکات.

## خزمەتگوزاری و دادپەروەری

دوای ڕاپەڕیین حکومەتی عێراق ئابڵوقەی ئابوریی بەسەر هەرێمی کوردستاندا سەپاند، کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیی ئابڵوقەی ئابوریی بەسەر عێراقدا سەپاند. لەبەر ئەو هۆکارانە خزمەتگوزاریی هەرێمی کوردستان تەگەرەیێتێکەوت و برسێتیی و کەمیی ئاو و بێکارەبایی و خزمەتگوزاریی تەندروستیی بۆ نزمترین ئاست دابەزین. ئەوەی کە

هەوڵی پارسەنگی ئەم هاوکێشە ناهاوسەنگەی دەکرد، هاوکاریی ڕێکخراوە بیانییەکان بوو، کە شەڕی ناوخۆیی دروستبوو، ڕێکخراوە بیانییەکانیش کوردستانیان چۆڵکرد. گرنگترین هۆکار و ئەنجامەکانی خراپیی خزمەتگوزاریی لە هەرێمی کوردستاندا ئەمانە بوون:

## ١- خۆپیشاندان و کۆچکردن:

بەهۆی سیاسەتی نادادپەروەریی دەسەڵاتی هەرێمەوە، خەڵکی کوردستان بەسەر دوو پێکهاتەدا دابەشکران، پێکهاتەیەکی دەسەڵاتداری خۆشگوزەران، پێکهاتەیەکی دوور لە دەسەڵاتی هەژار. لە بەرانبەر دابەزینی ئاستی بژێویی خەڵکدا، تاکەکانی کۆمەڵگە هەڵوێستیان وەردەگرت، سەرەتا بە خۆپیشاندان نارەزایەتییان پیشاندەدا. خۆپیشاندانی ١٧ی شوبات و ڕۆژانی دوایی ٢٠١١، گەورەترین نارەزاییدەربرین بوو بەرانبەر سیاسەتی برسییکردنی خەڵکی کوردستان. حیزبەکانی دەرەوەی دەسەڵات نارەزایی خەڵکیان دزی و دەستکەوتی سیاسییان پێوەرگرت. ئەمە وایکرد خەڵک باوەڕی بە حیزبە ڕکابەرەکانی دەسەڵات لاوازبێت، خۆی بۆ ئەو واقیع (کەتوار)ە شلبکات کە حیزبە دەسەڵاتدارەکان خوڵقاندوویانە، خۆی ڕادەستی حیزبە دەسەڵاتدارەکان بکات و بە ژیانی کوللەمەرگیی ڕازیببێت.

لە ساڵی ٢٠١٤ بە دواوە، بەهۆی سیاسەتی سەرکێشیی ئابووریی دەسەڵاتی هەرێمەوە، کێشەی بودجەی هەرێم لە نێوان هەرێم و بەغدا دروستبوو، لەو کاتەوە فەرمانبەرانی هەرێم بە شێوازی جیاجیا لە مافی موچە بێبەشدەکرێن. ئەمەیش هێندەی تر گوزەرانی خەڵکی خراپکرد. هەندێکی تر لە خەڵکی کوردستان ڕێگەی هاتونەهاتیان دەگرتەبەر و بەرەو هەندەران سەری خۆیان هەڵدەگرت، لە ئاوەکانی دەریای ئیجە دەخنکان، یان بەزەحمەت قوتاریاندەبوو. لە دوای ڕاپەڕینەوە هەتا ئەمڕۆ سیاسەتی برسییکردنی خەڵکی کوردستان بەردەوامە، لە پایزی ساڵی (٢٠٢١) لە هەرێمی کوردستانەوە کۆچێکی بەکۆمەڵی خەڵکی کوردستان بەرەو ئەوروپا دەستیپێکرد، کۆچبەرەکان لە وڵاتی بیلاڕوسیا گیریانخوارد، ژمارەیەکیان گەڕانەوە بۆ کوردستان.

### ٢- فەرامۆشکردن:

لە دوای ڕاپەڕینەوە هەتا ئەمڕۆ، خەڵکی کوردستان لە سێ سەرچاوەوە کارەبا وەردەگرێت، کارەبای گشتیی (حکومیی)، مۆلیدەی گەڕەک (ئەهلیی)، مۆلیدەی (ماڵ). دەسەڵاتی هەرێم هیچ بەرنامەیەکی جدیی نییە بۆ یەکخستنەوەی سەرچاوەی کارەبا، ئەم بێکارەباییەی فەرامۆشکردووە، ئامادە نییە کۆتایی بەو فەوزایە بهێنێت کە بەهۆی فرەسەرچاوەیی کارەباوە دروستبووە.

ئەگەر سەیری بەشە کارەبای خەڵک و بەشە کارەبای بەرپرسەکانی کوردستان بکەین، ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەکەوێت کە دەسەڵاتی کوردیی چەندە مافی خەڵکی لە دابەشکردنی کارەبادا پێشێلکردووە.

ساڵی ٢٠٠١ بەڕێوەبەری تەندروستیی شاری سلێمانیی بووم، کێشەی کارەبا لە لوتکەدا بوو، فیدەری دوو یەکێک لەو فیدەرانە بوو، کە کارەبای بەردەوامی هەبوو. لەو فیدەرەوە بە بەردەوامیی کارەبا بەسەر بارەگا حیزبییەکان و ماڵی بەرپرسەکاندا دابەشدەکرا، بەڵام نەک هەر ماڵی هاوڵاتیی ڕۆژانە چەندیین کاتژمێر کارەبای دەبڕا، نەخۆشخانەکانی سلێمانیی بە بەشی بوژانەوەی دڵیشەوە، ڕۆژانە چەندیین کاتژمێر کارەبای دەبڕا. بە مۆلیدە کارەبای نەخۆشخانە دابیندەکرا. زۆربەی کات مۆلیدەکان لەکاردەکەوتن، یان کارەبای مۆلیدەکان هێزی بەرکارهێنانی ئامێرە پزیشکییەکانیان نەبوو.

لە مانگی تەموزی ساڵی ٢٠١٠دا ئاگرێک لە سنووری هەرێمی کوردستاندا کەوتەوە، ڕۆژنامەی ئاسۆ لە ژمارە (١٢٧٥) ڕۆژی ٢/ ٨/ ٢٠١٠ مانشێتەکەی وا ڕازاندووەتەوە: لە یەک مانگدا (١٠٤٥) حاڵەتی ئاگرکەوتنەوە تۆمارکراوە*١٣.

لەو ئاگرکەوتنەوانەدا سەدان هەزار دۆنم پووش و دارستانی هەرێمی کوردستان دەسوتا، چەندیین هاوڵاتیی گیانیان لەدەستدەدا، سەدان کەسیش بریندار دەبوون. کاتێک کەناڵەکانی ڕاگەیاندن بۆ هۆکاری زۆریی ئاگرکەوتنەوە، زۆریی زیانەکان بەدواچوونیانکرد، دەرکەوت ئامێری سەرەکیی ئاگرکوژاندنەوەی شاخ و دەشتاییەکانی هەرێمی کوردستان، گونیە و هەژگە، دائیرەکانی ئاگرکوژانەوە و بەرگریی شارستانیی ئۆتۆمۆبێلی گونجاویان بۆ ئاگرکوژاندنەوەی شاخ و دەشتەکان نییە. دەرکەوت هەتا ئەو کاتە هەرێم فڕۆکەی ئاگرکوژاندنەوە نییە. نەبوونی هۆکارەکانی ئاگرکوژانەوە لە

کاتێکدایە، کە ڕۆژانە بە بەرچاوی خەڵکی کوردستانەوە هەزاران لۆریی بارهەڵگر، بە بڕی ٣ ملیۆن دۆلار لە ڕۆژێکدا نەوتی کوردستان باردەکەن و ئاودیویدەکەن، داهاتی ئەو نەوتە بۆ خزمەتی خەڵک بەکارناهێنن.

لە هەمان کاتدا دەرکەوت یەکێک لە هۆکاری زیانی زۆر و دواکەوتنی ئاگرکوژاندنەوە، بەهۆی ئەوەوەیە هەندێک لەو ناوچانەی ئاگریتێبەردەێت مینڕێژکراوە. هەتا ئەمڕۆیش زۆربەی ناوچە مینڕێژکراوەکانی کوردستان پاکنەکراونەتەوە. ئەمەیش پیشانیدەدات کە پاش ٣٠ ساڵ لە حوکمی دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان، هێشتا خاکی کوردستان لە مینی سەردەمی شەڕی ڕژێمی بەعس پاکنەکراوەتەوە. حکومەتی هەرێم ئەو ڕاستییە هەستیارەی فەرامۆشکردووە، کە بەهۆی مینەوە هەزاران کەس لە خەڵکی کوردستان گیانلەدەستدەدەن و بەشێکی جەستەیان لەدەستدەدەن.

نەبوونی بڕی کارەبای پێویست بۆ خەڵک، نەبوونی هۆکاری پێشکەوتووی ئاگرکوژاندنەوە، پاکنەکردنەوەی شاخ و دەشتەکانی کوردستان لە مین، لە کاتێکدایە کە بەرپرسانی کوردستان بۆ نەخۆشیی سەرەتایی خۆیان، سەردانی ئەوروپا و ئەمریکا دەکەن، هەر بەرپرسێک ڕەگەزنامەی چەند وڵاتێکی هەیە، مۆڵەتی مانەوەی (ئیقامە) لە چەند وڵاتێک هەیە، کەی بیەوێت بۆ ماوەیەک لەو وڵاتانە دەمێنێتەوە و ژیانێکی خۆش دەژی و خزمەتگوزاریی وڵاتەکەی خۆیشی بەو شێوەیە فەرامۆشدەکات.

## ٣- پێشمەرگایەتیی:

نوسەر (غاستون بوتول) لە ناملیکەی (ئا ئەوەیە شەڕ)دا*١٤، باس لەوە دەکات کاتێک لە وڵاتێکدا کێشەیەک دروستدەبێت، بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە پێکهاتەیەک پەنا بۆ زەبرزەنگ دەبات، لەبەرئەوەی ئەو پێکهاتەیە ئامادەیە لەپێناو بەرژەوەندیی گشتییدا قوربانییبدات، بە پێکهاتە هەرە باشەکەی کۆمەڵ دەژمێردرێت، دەبێت چۆن لە کاتی تەنگانەدا ئەو ئەرکانەی ئەنجامداوە، لە دوای چارەسەرکردنی کێشەکە و لە کاتی سەرکەوتندا، مافی لە پێکهاتەکانی تری کۆمەڵ زیاتر بێت.

بەرپرسەکانی دەسەڵاتی باشووری کوردستان لەبەرئەوەی زۆربەیان لە پێش ڕاپەڕیندا پێشمەرگە و ڕێکخستنی نهێنیی حیزبە دەسەڵاتدارەکان بوون، بەم

پێوانەیەی گاستۆن بۆتۆل لە ئەرک و ماف نزیکدەبنەوە. لەو باوەڕەدان لەبەرئەوەی لە سەردەمی خەباتی چەکدارییدا ئەرکی گرانیان ئەنجامداوە، قوربانیی زۆریان داوە، ئەو ڕۆژە ئەوان دروستیانکرد کە بە ڕاپەڕیین ڕژێمی سەدام هەرێمی کوردستانی چۆڵکرد، ئەو ڕۆژە ئەوان دروستیانکرد کە ڕژێمی سەدام ڕوخا و سیستەمی سیاسیی عێراق گۆڕدرا، ئیتر دەبێت مافی ڕەها و ئەرکی کەمیان بۆ حسابیکرێت. بۆیە بەرپرسی پێشمەرگەکانی دوێنێ و دەسەڵاتدارانی ئەمڕۆ، بە ڕەوای دەزانن هەرچی ماف و دەستکەوتی سیاسیی و ئیداریی و بەڕێوەبەرایەتیی هەرێم هەیە، لەسەر خۆیانی تاپۆبکەن. بە ڕەوای دەزانن تاک و پێکهاتەکانی تری کۆمەڵگە لەو ماف و دەسەڵاتانە سودمەند نەبن.

لە دوای ڕاپەڕیین زۆربەی کۆمپانیاکانی بازرگانیی و بەڵێندەرایەتیی هەرێمی کوردستان بە دەستی ئەو کەس و بنەماڵانەوەن کە کاتی خۆی پێشمەرگە بوون، یان بە دەستی ئەو کەسانەوەن کە باوک و برایان پێشمەرگە و کادری پلەبەرزی حیزبەکان بووە، ئەم پێشمەرگانە لە ڕێگەی دەسەڵاتی ئیداریی و سیاسییەوە، سەرمایەی کوردستان کۆدەکەنەوە، بازاڕ قۆرخدەکەن، توێژەکانی تری کۆمەڵگە لە چالاکیی بازرگانیی و بەرهەمهێنان دووردەخەنەوە، دادپەروەریی کۆمەڵایەتیی دەسڕنەوە. خۆیان لە سەرووی دەسەڵاتی دەوڵەتەوە دەبینن.

ساڵی ٢٠٠٦ لە کۆبوونەوەیەکی کادرانی دەڤەری سلێمانییدا، بەرپرسی کۆمیتەی کاسپکارانی سلێمانیی ناڕەزایی کاسپکارانی شاری سلێمانیی بە مام جەلالی سکرتێری یەکێتیی گەیاند و گوتی: "بەرپرسەکان بازاڕیان قۆرخکردووە و ڕێگەنادەن خەڵک کاسپیی بکات". وەڵامی مام جەلال بۆ ئەو کادرە ئەوە بوو، کە دەبێت لە پۆستەکەی دووربخرێتەوە. دوای قسەکەی تاڵەبانیی، مەڵبەندی یەک بەرپرسیارێتیی کۆمیتەی کاسبپارانی لەو کادرە سەندەوە. ئەم توێژە لە لایەکەوە دەست بەسەر سەرمایەی وڵاتدا دەگرێت، لە لایەکەوە بازاڕی وڵات قۆرخدەکات. ڕێگەی کێبڕکێی ئازاد دەگرێت و مافی کاسپکارانی تر دەخوات. سەرمایەداری کوردستان دەچەوسێننەوە و ڕێگەی کار و کاسپیی لێدەگرێت و دەیهاوێژنە ناو چینی هەژارانی کوردستانەوە.

## ٤- ناوچەگەری و حزبایەتی:

دەسەڵاتی هەرێم هزرێکی خێڵەکیی و حیزبیی هەیە، بەرپرسەکان تەنها لە بیری خۆیان و خێڵەکەیان و حیزبەکەیان و ناوچەکەیاندان. ئەگەر لەسەر ئاستی ناوچەکانی هەرێم سەیری دابەشکردنی خزمەتگوزارییەکانی حکومەتی هەرێم بکەین، بۆمان ڕوندەبێتەوە کە هەندێک ناوچە باش خزمەتکراوە، هەندێک ناوچەی تریش باش پشتگوێخراوە. ئەگەر بەرپرسێکی بەدەسەڵات خەڵکی شار و شارۆچکە و ناوچەیەکی دیاریکراو بێت، ئەو ناوچەیە لە ڕووی ئاوەدانکردنەوە و خزمەتگوزارییەوە، گرنگیی زیاتری پێدەدرێت، ئەو شار و شارۆچکە و ناوچانەی تر کە لە حیزب و حوکمڕانیی هەرێمدا بەرپرسی گەورە و نوێنەریان نییە، یان دۆستی لایەنگری حیزبی تری تێدایە، لە ئاوەدانکردنەوە و خزمەتگوزارییدا گرنگیپێنادرێت.

خۆ ئەگەر کەسایەتییەک لە دەسەڵاتی هەرێم ناڕازیبێت و خەڵکی گوندێک، یان ناوچەیەکی دیاریکراو بێت، ئەو ناوچەیە بەقوڕدادەکەن. لەبەرئەوەی بنەماڵەی دەسەڵاتداری پارتیی بەرزانیین، دەسەڵاتدارانی پارتیی گرنگیی زۆریان بە دەڤەری بارزان داوە، لە ڕووی ژینگە و تەندروستیی و ڕێگەوبانەوە، بەرزانیان پێشخستووە. هێندە گرنگییان بە ناوچەکانی تری زۆنی زەرد نەداوە. ساڵانێکە لە شاری هەڵەبجە پارتیی خانووی بۆ شەهیدەکانی خۆی کردووەتەوە، لەبەرئەوەی یەکێتیی لە هەڵەبجە دەسەڵاتدارە، شارەوانیی هەڵەبجە ئامادە نییە خزمەگوزاریی بۆ ئەو خانووانە دابینبکات، خانووەکان بە کەلاوەیی ماونەتەوە و کەس سودیان لێوەرناگرێت.

## ٥- وێرانکاریی جیاواز:

دوای ئەوەی ساڵی١٩٧٥ شۆڕشی ئەیلول شکستیهێنا، ڕژێمی بەعس دەستی بە ڕاگواستنی گوندەکانی سنووری (عێراق - ئێران) کرد و نزیکەی ٤٠٠٠ گوندی سەرسنووری باشووری کوردستانی وێرانکرد و دانیشتوانی لە ئۆردوگا زۆرەملێکاندا نیشتەجێکرد. لە ساڵانی ١٩٨٧ - ١٩٨٨دا، لە کیمیاباران و ئەنفالەکاندا، جارێکی تر ڕژێمی بەعس بە بە ڕادەیەکی فراوانتر گوند و شارۆچکە و شاری کوردستانی چۆڵ و وێرانکرد. لەم وێرانکردن و چۆڵپێکردنەدا، پارێزگای سلێمانیی بەشی شێری بەردەکەوێت. لە سنووری پارێزگای سلێمانییدا هەموو گوند و ناحیەکان چۆڵکران

و وێرانکران. زۆربەی قەزاکانی ئەو پارێزگایەیش بە دەردی گوند و ناحیەکان چوون. هەڵەبجە و پێنجوێن و چوارتا و قەڵادزێ، وێرانکران و دەیان هەزار کەس لە دانیشتوانی ئەو شارانە شەهیدکران، بریندارکران، ئەنفالکران، یان گواسترانەوە و لە ئۆردوگا زۆرملێکاندا نیشتەجێکران. بەو شێوەیە لە ڕووی زیانی مادیی و گیانییەوە پارێزگای سلێمانیی لە باشووری کوردستاندا گەورەترین زیانی بەرکەوتووە. لە سنووری پارێزگای هەولێر و دهۆکدا وێرانکردن و ڕاگواستن لە سنووری گوندەکاندا وەستا و سنووری ناحیە و قەزاکانی تێنەپەڕاند. ڕادەی وێرانکردنی کوردستان و زیانە گیانیی و مادییەکانی پارێزگای هەولێر و دهۆک هێندەی زیانەکانی پارێزگای سلێمانیی نەبوون.

ئەگەر پارێزگای سلێمانیی لە لایەن حکومەتی هەرێم و ڕێکخراوە خێرخوازەکانەوە هێندەی پارێزگاکانی تری کوردستانیش گرنگییپێبدرێت، هێشتا پێویستییەکانی ئەو پارێزگایە پڕناکاتەوە. لە ڕووی خزمەتگوزاریی و ئاوەدانکردنەوەوە پێشناکەوێت، بۆیە بە ئاشکرا دەبینین کە دانیشتوانی پارێزگای سلێمانیی بەردەوام هەستدەکەن لە لایەن دەسەڵاتەوە گرنگییانپێنەدراوە و فەرامۆشدەکرێن. خۆ ئەگەر سەیری وێرنکارییەکانی پارێزگای هەڵەبجە بکەین، کە بەهۆی کیمیابارانی ڕژێمی بەعس و درێژبوونەوەی شەڕی ناوخۆوە بەسەریداهات، هەڵەبجە بە وێرانترین پارێزگا دادەنرێت و لە سلێمانیی زیاتر زیانی بەردەکەوێت.

لە بەرنامەی کاری حکومەتی هەرێمی کوردستاندا باس لە جیاوازیی وێرانکردن و زیانی ناوچە جیاکانی هەرێمی کوردستان نەکراوە، هەوڵێکی وا لە سیاسەتی حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشووردا نابینرێت هەتا لە کاتی ئاوەدانکردنەوەدا گرنگیی زیاتر بەو ناوچانە بدرێت، کە لە سەردەمی سیاسەتی ڕەگەزپەرستانەی بەعسدا زیانی زۆرتریان بەرکەوتووە. لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام، لە بڕگەی ١١٢ی دەستووری کۆماری عێراقدا هاتووە لە کاتی ئاوەدانکردنەوەدا دەبێت سەرەتا گرنگیی بەو ناوچانە بدرێت، لە پێشدا ئەو ناوچانە ئاوەدانبکرێنەوە، کە لە سەردەمی ڕژێمی ڕابردوودا زیانی زۆریان بەرکەوتووە، بەڵام حکومەتی هەرێمی کوردستان لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدامیشەوە هەتا ئەمڕۆ کاری بەو بڕگە دەستوورییەی کۆماری عێراق نەکردووە.

## ٦- حیزب و ڕێکخراوە بیانییەکان:

لە دوای ڕاپەڕینەوە پارتیی لە سنووری بادینان حیزبی باڵادەستە، هاوکاریی ڕێکخراوە مرۆڤایەتییە بیانییەکان لە سنووری دەسەڵاتی پارتییەوە دەربازی هەرێم دەبێت. ئەو پێگە جیۆ_سیاسییەی پارتیی، کاریگەریی لەسەر دابەشکردنی خومەتگوزاریی و ئاوەدانکردنەوەی ئەو ڕێکخروانە دەکات. هەتا ڕوخانی ڕژێمی سەدام هەموو ڕێکخراوە مرۆییەکان لە سنووری پارێزگای دهۆک، لە مەرزی (ئیبراهیم خەلیل)ەوە، ئاودیوی هەرێمی کوردستان دەبوون، بۆیە هەر ڕێکخراوێکی بیانیی دەهاتە کوردستان، ڕاستەوخۆ پەیوەندیی بە پارتییەوە دەکرد، لەگەڵ بەرپرسانی ئەو حیزبە بەرنامەی ئەنجامدانی پرۆژەکانیان دادەڕشت. ئەمەیش وایدەکرد کە بەرنامەی ئاوەدانکردنەوە و خزمەتگوزاریی ئەو ڕێکخراوانە بەگوێرەی ویستی پارتیی بێت، نەک بەگوێرەی پێویستیی خەڵک بێت، نەک بەگوێرەی زیانی ناوچە جیاجیاکانی هەرێمی کوردستان بێت. پارتی بەگوێرەی بەرژەوەندیی حیزبیی خۆی، ڕێکخراوەکانی ئاڕاستە دەکرد.

ساڵی ١٩٩٢ بە مەبەستی بەشدارییکردن لە ئاوەدانکردنەوەی هەرێمی کوردستان، ڕێکخراوی قەندیل سەردانی هەرێمی کوردستانی کرد، ئەم ڕێکخراوە لە لایەن هەندێک کوردی ئاوارەی سویدی سەر بە یەکێتیی و کەسانی مرۆڤدۆستی سویدییەوە دامەزرابوو، لەو کاتەدا من کارگێڕی مەڵبەندی یەکی ڕێکخستنی سلێمانیی بووم، وەفدەکە گەیشتە سلێمانیی، لە مەڵبەند پێشوازییم لێکردن. پاش پشوودان داوایانکرد بۆ سەردانی مام جەلال مەوعدیان بۆ وەربگرم. بە تەلەفۆن پەیوەندییم بە سکرتاریەتی مام جەلالەوە کرد، یەکسەر وەڵامم بۆ هاتەوە کە مام جەلال ئامادەیە بیانبینێت. لەگەڵیاندا چووم بۆ قەڵاچوالان، سەرەتا مام جەلال زۆر خۆشحاڵبوو بە هاتنیان، پاش دانیشتن و قسەکردن، مام جەلال تێگەیشت ئەو ڕێکخراوی قەندیلەی کە عومەر شێخ مووس و کەسانی تری سەر بە یەکێتیی لەگەڵ سویدییە دۆستەکانیان دیانمەزراندووە، لەگەڵ هاتنیان بۆ ناو خاکی هەرێمی کوردستان و لەگەڵ یەکەم دیداریان لەگەڵ بەرپرسانی پارتیی لە سنووری پارێزگای دهۆک، پرۆژەکەیان ڕادەستی پارتیی کردووە و بڕیاریانداوە لەگەڵ ئەواندا پرۆژەکەیان ئەنجامبدەن.

هەر لەوێدا بە بەرچاوی خۆمەوە مام جەلال لێیانتورەبوو، قسەی توندی بەرانبەر کردن، دڵخۆشییەکەی مام جەلال بە دڵتەنگیی و نارەزاییدەربڕین گۆڕدرا. بەو شێوەیە پێگەی جیۆ_سیاسیی و سیاسەتی حیزبایەتیی تەسک، وایانکرد خزمەتگوزارییە سەرەتاییەکانی ڕێکخراوە مرۆڤدۆستەکان وەکو پێویست و لەسەر بنەمایەکی دادپەروەرانە لە خزمەتی خەڵکی کوردستاندا نەبێت.

لە خولی سێیەمی شەڕی براکوژییدا، هەڵەبجە لەژێر دەسەڵاتی پارتیی و بزوتنەوەی ئیسلامییدا بوو، سلێمانیی لەژێر دەسەڵاتی یەکێتییدا بوو، یەکێتیی چەندی بۆ دەکرا هەڵەبجەی لە خزمەتگوزاریی ڕێکخراوە بیانییەکان بێبەشدەکرد. پارتییش چەندی بۆ کرا سلێمانیی لە خزمەتگوزاریی ڕێکخراوە بیانییەکان بێبەشدەکرد.

## ٧- ئامێری خزمەتگوزاریی:

خزمەتگوزاریی تەندروستیی لە هەر وڵاتێکدا خەرجێکی زۆری پێویستدەبێت، لە هەرێمی کوردستاندا حکومەتی هەرێم بۆ دابینکردنی ئەم خزمەتگوزارییە نەک هەر کاری جدیی نەکردووە و خۆی ماندوونەکردووە، بە پێچەوانەوە لە ساڵانی پێش ڕووخانی ڕژێمی سەدامدا حیزبە دەسەڵاتدارەکان دەستیان بەسەر چەندین ئامێری پزیشکیی گرانبەهای نەخۆشخانەدا دەگرت و دەیانفرۆشت.ساڵی ١٩٩٣ ئەندامی پەرلەمانی کوردستان بووم، ڕۆژێک سەردانی نوسینگەی سەرۆکوەزیرانی هەرێمی کوردستانم کرد. لەو کاتەدا نوێنەری حکومەت لە ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان خۆی بە نوسینگەکەدا کرد، سەرۆکی حکومەت باسی ئەوەی لەگەڵ کرد ئەو بودجەیەی بۆ ئامێری نەخۆشخانە دابینکراوە، بیگۆڕێت بۆ پێویستیی کاروباری حیزب و پێشمەرگە.

لە ساڵی ٢٠٠١ بۆ ماوەی هەشت مانگ بەڕێوەبەری فەرمانگەی تەندروستیی شاری سلێمانیی بووم، بە چاوی خۆم دەمبینی ئەو ئۆتۆمۆبێلانەی کە ڕێکخراوی (WHO) بۆ وەزارەتی تەندروستیی دەنارد، وەزیر پێشکەشی بە بەرپرسە باڵاکانی حیزبی دەکردن، دامودەزگاکانی تەندروستییش ئۆتۆمۆبێلیان نەبوو، بۆ گواستنەوەی کارمەندانی نەخۆشخانەکان وەزارەتی تەندروستیی لە گیرفانی کارمەندەکان ئۆتۆمۆبێلی بەکرێدەگرت.

## ٨- کۆمپانیای حیزب:

ئەو کۆماپانیایانەی کاری دروستکردنی ڕێگەوبان لەئەستۆدەگرن، سەر بە بەرپرس و کۆمپانیاکانی حیزبە دەسەڵاتدارەکانن. ئەو کۆمپانیایانەی کاری گەیاندنی هێڵی تەلەفۆن و پەیوەندیی کوردستانیی و جیهانیی لەئەستۆدەگرن، کۆمپانیای حیزبە دەسەڵاتدارەکانن، کۆمپانیاکانی هاوردەی دەرمان سەر بە حیزبە دەسەڵاتدارەکانن، بۆیە کەمترین و خراپترین خزمەتگوزاریی ڕێگەوبان و گەیاندن، بە خەڵکی کوردستان دەگات. چەندان کۆمپانیای حزبی هەن کە بەبودجەی حکومەتی هەرێم دامەزراون و کارەکانیان بەڕێوەدەبەن.

ئەم جۆرە پەیوەندییەی نێوان دەسەڵاتی سیاسیی و بازرگانییکردن، وایکردووە کە دەزگای چاودێریی هەرێمی کوردستان، نەک هەر لە دامودەزگا بازرگانییەکانی کەرتی تایبەت نەپرسیتەوە و حساب بۆ بەرژەوەندیی خەڵک نەکات، بەو هۆیەوە کۆمپانیا خزمەتگوزارییەکان کەمترین و خراپترین خزمەتگوزاریی پێشکەشی خەڵکی کوردستان بکەن.

## ٩- ناکۆکییە ناوخۆییەکانی حیزب:

لە ناو پارتییدا ململانێی ناخۆیی دەسەڵات لەو ئاستەدا نییە ئاستەنگیی بۆ کارەکانی حکومەت دروستبکات، پڕۆژەکانی خزمەتگوزاریی و ئاوەدانکردنەوە هەرچەندبن بەهۆی ململانێی ناوخۆییەوە دواناکەون. لە هەر بوارێکی ژیاندا بڕیاری سەرەتا و کۆتا، بە دەست بنەماڵەی بەرزانییەوەیە. ئەو ناوەندگەراییەی دەسەڵاتی پارتیی وایکردووە، کێشەی پارێزگای دهۆک و هەولێر لە چاو پارێزگای سلێمانییدا لە ڕووی ئاوەدانکردنەوە و خزمەتگوزارییدا کەمتر بێت.

لە سنووری دەسەڵاتی یەکێتییدا، ناوەندی بڕیاری جیاواز هەیە، هەر ناوەندێک بەگوێرەی تێگەیشتنی خۆی و بەگوێرەی بەرژەوەندیی خۆی سەیری پڕۆژەکان دەکات، بۆیە لە ئامادەکردن و جێبەجێکردنی پڕۆژەی ئاوەدانیی و خزمەتگوزاریی پارێزگای سلێمانییدا، ململانێ و ناکۆکیی دروستدەبێت، کارەکان وەکو پێویست بەڕێوەناچن، پڕۆژەکان دوادەکەون و خەڵکی دەڤەری پارێزگای سلێمانیی لە کۆمەڵێک ماف و خزمەتگوزاریی بێبەشدەبێت.

## ١٠- سەرمایەی سروشتیی و سەرمایەی زانستیی:

لە هەرێمی کوردستاندا کانیی و ڕووبار و دەریاچەی زۆر هەیە، بەڵام یەکێک لە کێشە سەرکییەکانی هەرێم، کەمیی ئاوە. شاری سلێمانیی لە نێوان دەریاچەی دوکان و دەریاچەی دەربەندیخاندا هەڵکەوتووە، سەدان جۆگە و کانیاوی تریش ناو شار و دەوروبەری ئاودەدەن، کەچی سلێمانیی بەردەوام بە دەست بێئاوییەوە دەناڵێنێت، خانوویەک نابینیت ئاوی بەردەوامی هەبێت، هەزاران گەڕەک هەیە لە سێ ڕۆژدا دوو کاتژمێر هەتا سێ کاتژمێر ئاویان هەیە.

لەولایشەوە چەندیین ئەندازیاری کورد هەن چاوەڕوانی بڕیارێکی دەسەڵات دەکەن هەتا پڕۆژەی گەیاندن و دابەشکردنی ئاو جێبەجێبکەن، دانیشتوانی شاری سلێمانییش هەردەم ئامادەبوون کۆمەکیی دارایی بۆ پڕۆژەی گەیاندن و دابەشکردنی ئاوی سلێمانیی لەئەستۆبگرن، کەچی دەسەڵاتی هەرێم دەربارەی ئەو جۆرە پڕۆژانە بڕیارنادات. ئەمە وایکرد لە ڕاپەڕینەوە هەتا ساڵی ٢٠٠٩ هیچ پڕۆژەیەکی ئاو بۆ شاری سلێمانیی ئەنجامنەدرێت، ئەو پڕۆژەیەی لە ساڵی ٢٠٠٩دا دەستی بە جێبەجێکردن کردووە، گۆڕانکارییەکی وای دروستنەکرد هەتا کێشەی کەمئاویی شاری سلێمانیی چارەسەربکات.

ڕۆژی ٦/ ٨/ ٢٠١٠ سایتی سبەی، هەواڵێکی لەسەر کەمئاویی بڵاوکردووەتەوە، کە بەهۆی شکانی بۆریی ئاوەوە چەند گەڕەکێکی شاری سلێمانیی ماوەی چەند ڕۆژێکە ئاویان نییە. هاوینی ساڵی ٢٠٢١ شاری هەولێر دوچاری قەیرانی کەمئاویی هات، پارێزگاری هەولێر داوای هاوکاریی لە هەموو لایەک دەکرد، بۆ ئەوەی ئاوی خواردنەوە بۆ شاری هەولێر دابینبکەن. چاودێران دەڵێن ئەگەر لە ڕاپەڕیندا پارتیی و یەکێتیی سەدی بێخمەیان تێکنەدایە و ئامێرەکانی تاڵانفرۆش نەکرایە، بەشی چەندیین ساڵ ئاوی بۆ پارێزگای هەولێر گلدەدایەوە و کێشەی کەمئاویی چارەسەردەکرد.

لە پایزی ساڵی ٢٠٢١دا، دوای بارانبارینێکی لێزمە، دوو جار لافاو لە پارێزگای هەولێر هەستا، زیانی گیانیی و مادیی بە خەڵک گەیاند. هۆکارەکەی بۆ گەندەڵیی و کەمتەرخەمیی بەرپرسانی حکومەت دەگەڕێتەوە کە گرنگیی بە مەنهۆڵ ئاوەڕۆی شەقامەکان نادەن و پێشبینیی بۆ ڕوداوە سروشتییەکان ناکەن.

## ٧- خزمەتگوزاریی تەندروستیی:

لەبەرئەوەی خۆم پزیشکم، وەکو پزیشکی پێشمەرگە، ماوەیەک ئەندامپەرلەمان و سەرۆکی لیژنەی تەندروستیی پەرلەمانی کوردستان (١٩٩٢ - ٢٠٠٢)بـووم، ماوەیەکیش بەڕێوەبەری تەندروستیی شاری سلێمانیی بووم، شارەزاییم لەسەر خزمەتگوزاریی تەندروستیی هەیە، بۆیە ڕوداوەکانی پەیوەست بە لایەنی تەندروستی لەدیدی خۆمەوە و بەگوێرەی ئەزموونی خۆم دەخەمەڕوو.

## سیستەمێکی ئاڵۆز

زانستەکانی تر ناڕاستەوخۆ خزمەتی مرۆڤ دەکەن، زانستی پزیشکیی ڕاستەوخۆ خزمەتی مرۆڤ دەکات، بۆیە پێشکەوتنی خزمەتگوزاریی تەندروستیی لە هەر وڵاتێکدا، بە نیشانە هەرە هەستیارەکانی پێشکەوتنی سیستەمی سیاسیی و ئاستی زانستیی ئەو وڵاتە ئەژماردەکرێت. خزمەتگوزاریی تەندروستیی تەمەنی مرۆڤ درێژدەکات، مرۆڤ لە ئێش و ئازار و پەتا و کارەسات دەپارێزێت، ئەرکی هەر دەسەڵاتێکە زانستی پزیشکیی پێشبخات و خزمەتگوزاریی تەندروستیی بۆ هاوڵاتییان دابینبکات.

لە دوای ڕاپەڕینەوە هەتا ئەمڕۆ بەهۆی دیـاردەی پەنجا پەنجاوە، بەهۆی شەڕی ناوخۆوە، بەهۆی دەسەڵاتپەرستیی و مادەپەرستیی دەسەڵاتدارانەوە، بەهۆی نابەرپرسیارێتیی پزیشکانەوە، خزمەتگوزاریی تەندروستیی پێشنەکەوتووە.

هەر کەسێک لە نزیکەوە بە وردیی چاودێریی بەڕێوەچوونی کار و چالاکییەکانی نەخۆشخانە و تاقیگە و دەرمانخانەکانی هەرێمی کوردستان بکات، هەستدەکات کارەکان وەکو پێویست بەڕێوەناچن، هەموو پێکهاتەکانی ئەو دەزگایانە گلەییدەکەن و نـاڕەزایی پیشاندەدەن. پزیشک گلەیی لە مـاندووبـوون و بە گرنگ نەزانینی پیشەکەی و کەمیی موچەکەی دەکات. نەخۆش باس لە کەموکووڕیی نەخۆشخانە و بەدەنگەوەنەهاتنی پزیشک و کارمەند و فەرامۆشکردنی ئازارەکانی دەکات. کارمەندی تەندروستیی و کارگوزاری نەخۆشخانە، باس لە ئەرک و ماندووبوونی زۆری خۆیان و کەمیی ماف و موچەیان دەکەن. ئەگەر مرۆڤ کەمێکی تر لە شێوازی بەڕێوەچوونی کاروباری نەخۆشخانەکان وردبێتەوە، دەبینێت کەسانی دەوڵەمەند و شارنشین و

بەرپرس لە نەخۆشخانەکانی حکومەتی هەرێم، بە خۆرایی و بە باشیی خزمەتگوزاریی تەندروستییان پێشکەشدەکرێت. خەڵکی گوند و کەسانی نەناسراو و هەژارانی کوردستان، زۆر بە کەمیی سود لە خزمەتگوزاریی تەندروستیی نەخۆشخانەکانی حکومەتی هەرێم وەردەگرن.

لە هەرێمی کوردستـان، لە ئاستی زانستی پزیشکیی و تیشک و تاقیگە و دەرمانسازییدا، کەموکووڕیی جدیی بەدیدەکرێت، بەرزکردنەوەی ئاستی زانستی پزیشک و لێکۆڵینەوەی پزیشکیی و ناردنی پزیشک و کارمەند بۆ خوێندنی باڵا و هێنانی پسپۆڕی بیانیی بۆ کوردستان گرنگییپێنادرێت. نەخۆش و بریندار گوێ لە ئامۆژگاریی و ڕێنمایی پزیشک ناگرن، گوێ لە ڕاوبۆچوونی ئەو کەسانە دەگرن کە خۆیان لە شوێنی پزیشک دادەنێن. هەڵسوکەوتی زانستیی لەگەڵ نەخۆش و دەرماندا لە ڕێڕەوی خۆی لایداوە. بنەماکانی نوسینی دەرمان لە لایەن پزیشکەوە، بنەماکانی بەکارهێنانی دەرمان لە لایەن نەخۆشەوە، گرنگییەکی ئەوتۆی پێنادرێت. ئەو ئامێر و دەرمانە پزیشکییانەی دێنە ناو هەرێمی کوردستانەوە، ڕەخنە لە کوالێتیی کۆنترۆڵی دەگیرێت، لە ڕووی چەندایەتیی و چۆنایەتییەوە کەموکووڕیی تێدایە.

لەژێر دەسەڵاتی حکومەتی هەرێمدا، کێ بیەوێت کاری پزیشکیی و دەرمانسازیی دەکات، بەبێ مۆڵەتی سەندیکای پزیشکان و سەندیکای دەرمانسازان و سەندیکاکانی تر، چەندیین چارەخانە و تاقیگەی بێمۆڵەت کراونەتەوە. لە سایەی ململانێی ناڕەوای حیزبایەتییدا، چەندیین کەسی نەخوێندەوار، چەندیین کارمەندی تەندروستیی، لەسەر شەقامە گشتییەکان و لە کۆڵانی شار و شارۆچکەکاندا، عیادە و دەرمانخانە و تاقیگەیان کردووەتەوە.

لە بارودۆخێکی وادا کە چەندیین ساڵە سیستەمی خزمەتگوزاریی تەندروستیی هەرێمی کوردستان پێوەی دەناڵێنێت، دەسەڵاتی کوردیی بە دیدگایەکی نازانستیی و بە بێبایەخیی سەیری ئەم بوارەی ژیانی مرۆڤی کورد دەکات. حوکمڕانیی سلێمانیی و حوکمڕانیی هەولێر تێڕوانینی جیاوازیان بۆ زانستی پزیشکیی و بۆ خزمەتگوزاریی تەندروستیی هەیە. هەرچی دەسەڵاتدارانی هەولێرن لەبەرئەوەی سەر بە خانەدانەکانی خێڵی بەرزانن و دۆستایەتیی توێژەکانی سەرەوەی کۆمەڵگەی کوردستانیان بە لاوە گرنگە، دانیان بە چەندیین مافی پزیشکاندا ناوە، بەڵام بە جدیی بیر لە کێشە

تەندروستییەکانی خەڵکی کوردستان و توێژە هەژارەکانی هەرێمی کوردستان ناکەنەوە. لە سنووری دەسەڵاتی پارتییدا لە هەولێر و دهۆک، نرخی چارەرەخانە پزیشکییەکان لە سلێمانیی و گەرمیان گرانترە. کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی ئەو دەڤەرە کەمتر سەرشاخی پزیشکان دەگرن، ڕەخنە لە کارەکانیان ناگرن.

لەبەرئەوەی دەسەڵاتدارانی زۆنی سەوز نە خانەدانن و نە چەپن، حەزیان بە چارەی پزیشکان نایەت، خەڵکی هەژاریشیان خۆشناوێت، مافی پزیشک و نەخۆشیش فەرامۆشدەکەن. ڕۆژانە کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی حیزبیی و ناحیزبیی ژێر دەسەڵاتی یەکێتیی بە توانج و ڕەخنەی نابەجێ ڕۆحی پزیشکان بریندار دەکەن.

ئەو پزیشکانەی پلەی پسپۆڕ وەردەگرن، بەگوێرەی یاسای حکومەتی عێراق دەبێت ٦٠٠ مەتر زەوییان پێببەخشرێت. دەسەڵاتدارانی پارتیی ئەم بڕیارەی حکومەتی عێراق جێبەجێدەکەن، بەڵام دەسەڵاتدارانی یەکێتیی ئەو بڕیارە جێبەجێناکەن و تەنها ٢٠٠ مەتر زەوی بە پزیشکان دەدەن. جیاوازیی بۆچوونی دەسەڵاتدارانی هەرێمی کوردستان لەسەر توێژی پزیشکان هێندەی تر سیستەمی تەندروستیی هەرێمی کوردستانی تێکداوە.

لە زۆربەی کابینەکانی حکومەتی هەرێمدا، پۆستی وەزیری تەندروستیی بە دەست یەکێتییەوە بووە، یەکێتیی وەکو حیزب سودی زۆری لە وەزارەتی تەندروستیی وەردەگرت. ئەو ئامێرانەی کە ڕێکخراوی (WHO) بۆ وەزارەتی تەندروستیی دەنارد، لە ڕێگەی وەزیرەکان و بەڕێوەبەرەکانەوە بڕێکی بە بەرپرسە حیزبییەکانی یەکێتیی دەبەخشرا. لەسەر حسابی نەخۆشخانە و نەخۆش یەکێتیی پێدەوڵەمەنددەکرا.

لە هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی هەرێم و عێراقدا، دەسەڵات ئیسعافەکانی بۆ تەزویر بەکاردەهێنا، لەبەرئەوەی ئیسعاف تەفتیشناکرێت، پسوڵەی ئیمزاکراوی پێدەگواستەوە. ئیسعافەکانی وەزارەتی تەندروستیی تاوانبارانی لە نێوان شارەکاندا دەگواستەوە. ساڵی ٢٠١١ ئەو کەسانەی بینای کەناڵی تەلەفزیۆنی (NRT)یان سوتاند، بە ئیسعافەکان بەرەو هەولێر دەرکران، لەوێوە بەرەو تورکیا گوازرانەوە.

لە کابینەی نۆوە (٢٠١٩ بە دواوە) پۆستی وەزارەتی تەندروستیی بە دەست پارتییەوەیە. لەو کاتەوە یەکێتیی لە ڕێگەی دکتۆرە حیزبییەکانیەوە، ئاستەنگیی جدیی بۆ خزمەتگوزاریی تەندروستیی دروستدەکات، ناوبەناو پزیشکان و کارمەندانی نەخۆشخانەکانی سلێمانیی

ماندەگرن، لە کاتێکدا لە سنووری دەسەڵاتی پارتییدا مانگرتنی پزیشکان و کارمەندان بە دەگمەن دەبینرێت. ئەم سیاسەتەی یەکێتیی بۆ ئەوەیە بڵێت وەزارەت ناتوانێت خزمەتگوزاریی تەندروستیی وەکو خۆی پێشکەشبکات و سەرکەوتوو نییە.

لەو کاتەوە پارتیی پۆستی وەزارەتی تەندروستیی وەرگرتووە، سیاسەتی تەندروستیی یەکێتیی لە زۆنی سەوزادا گۆڕانکاریی مەترسییداری بەسەرداهاتووە، نەخۆشخانە گشتییەکانی سەر بە کەرتی گشتیی (حکومیی) ڕۆژ بە ڕۆژ کەمدەکرێنەوە. نەخۆشخانە تایبەتەکانی (سەر بە حیزب و دارودەستەکەی) ڕۆژ بە ڕۆژ زۆردەکرێن. لە ساڵی٢٠١٧ بە دواوە نەک هەر نەخۆشخانەی گشتیی دروستنەکراوە، نەخۆشخانەی فریاکەوتنی سلێمانیی داخرا. هەموو نەخۆشییە کتوپڕییەکانی زۆنی سەوز لە بەشێکی نەخۆشخانەی شاردا چارەسەردەکرێن. چەندیین نەخۆشخانەی تایبەتی وەکو ڕۆیاڵ، سەفین، سمارت، ئەنوەر شێخە، لە نزیک نەخۆشخانە کۆنەکانی شاری سلێمانیی دروستکران، چەندیین نەخۆشخانەی تریش بەڕێوەن. هەرچی نەخۆشخانەی شۆڕشە نەخۆشخانەیەکی حیزبییە، سەر بە یەکێتییە، دەرمان و ئامێر و پزیشک و کارمەندەکانی لە وەزارەتی تەندروستییەوە دابیندەکرێن، بەڵام سودە مادیی و سیاسییەکانی بۆ حیزبە.

ئەگەر سەیری بودجەی ساڵانەی هەر حکومەتێک بکەین، دەبینین یەکێک لە بەشە قورسەکانی بودجە بۆ خزمەتگوزاریی تەندروستیی تەرخاندەکرێت.

لەبریی ئەوەی حکومەت بودجەی کەرتی تەندروستیی هەرێم زیادبکات، باج لەسەر پزیشکان زیاددەکات، پزیشکانیش نرخی پشکنینی عیادەکانیان بەرزدەکەنەوە، لێرەیشەوە جارێکی تر نەخۆش زیانی بەردەکەوێت.

دەسەڵاتدارانی هەرێم هەتا ئەمڕۆیش بیریان لەوە نەکردووەتەوە بودجەی کەرتی تەندروستیی هەرێم زیادبکەن، خزمەتگوزاریی توێژە هەژارەکان باشبکەن، دەسەڵاتدارانی هەرێم هەتا ئەمڕۆیش بیریان لەوە نەکردووەتەوە بۆ پێشخستنی زانستی پزیشکیی و بۆ باشکردنی ئەو بەشە بودجەیەی حکومەت بۆ کەرتی تەندروستیی تەرخانیدەکات. ٣٪ بودجەی گشتیی نییە. لە وڵاتانی تردا نزیکەی ٢٥٪ بودجەی وڵات بۆ کەرتی تەندروستیی تەرخاندەکرێت.

لەبەرئەوەی پزیشکان بەزەحمەت دەستەمۆی دەسەڵات دەکرێن، دەسەڵات دەزانێت چۆن ڕۆژنامەنوسان و توێژە هەژارەکانی کۆمەڵگە دژی پزیشکان بوروژێنێت،

وایلێهاتووه لە هەرێمی کوردستان لەسەر بێسەروبەریی سیستەمی تەندروستیی و خزمەتگوزاریی تەندروستیی، دەسەڵات و میدیا و نەخۆش پێکەوە بەرۆکی پزیشکان دەگرن، پزیشکان بە بەرپرسیاری ئەو نادادپەروەرییەی سیستەمی تەندروستیی دەزانن.

ئەگەر دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان و پزیشکان و کارمەندانی تەندروستیی و میدیای کوردیی و ئەو تاک و پێکهاتانەی پەیوەندییان بە خزمەتگوزاریی تەندروستییەوە هەیە. بە ڕاستیی بیانەوێت خزمەتگوزارییەکی تەندروستیی باش بە خەڵکی کوردستان پێشکەشبکرێت، هاوسەنگیی و دادپەروەریی لە نێوان ماف و ئەرکەکانی نەخۆش و پزیشک و دەسەڵاتدا بە بنەما بگیرێت، دەبێت سیستەمی تەندروستیی هەرێمی کوردستان بگۆڕدرێت، گۆڕان بە شێوەیەک بێت کە پێشخستنی زانستی پزیشکیی، فراوانکردنی خزمەتگوزاریی تەندروستیی، پاراستنی ماف و ئەرکی پزیشک و کارمەند و نەخۆش لەخۆبگرێت، دەبێت لە سیستەمی نوێدا ئەو فەلسەفەیە بەلاوەبنرێت کە تەنها لە ڕێگەی پزیشکەوە، لەسەر حسابی ماندووبوونی پزیشک خزمەتگوزاریی تەندروستیی بۆ نەخۆش دابینبکرێت. دەبێت لە سیستەمی نوێدا ئەو فەلەسەفەیە بە بنەما بگیرێت کە داهاتی وڵات بۆ پێشخستنی زانست، بە زانستی پزیشکییشەوە بەکاربهێنرێت، زانستیش بۆ فراوانکردنی داهاتی وڵات و بۆ دادپەروەریی کۆمەڵایەتیی و بۆ خزمەتگوزاریی تەندروستیی باش بەکاربهێنرێت.

## چاکسازیی لە سیستەمی خزمەتگوزاری پزیشکیدا

هەر لایەنێک بیەوێت کار بۆ پێشخستنی خزمەتگوزاریی تەندروستیی بکات، دەبێت چەندیین لایەنی وردی سیستەمی تەندروستیی ئێستا ڕەخنەبکات، لە ئەنجامی ئەو کەموکوڕییانەی سیستەمی ئێستای تەندروستیی هەرێمەوە، بە ئاشنابوون بە سیستەمە پێشکەوتووەکانی تەندروستیی جیهانیی، بنەمای سیستەمێکی تەندروستیی هاوسەنگ بۆ هەرێمی کوردستان دابڕێژرێت.

### ١- پۆلێنكردنی نەخۆش:

له دوای ڕاپەڕینەوە هەتا ئەمڕۆ لە نەخۆشخانەكانی هەرێمی كوردستاندا هەموو چینوتوێژەكانی كوردستان وەكو یەك و بە یەك بلیت پشكنین و چارەسەریان بۆ دەكرێت. لە دوای ڕاپەڕینەوە هەتا ئەمڕۆ هیچ پێوانە و بنەمایەكی چینایەتیی بۆ بەدەستخستنی خزمەتگوزاریی تەندروستیی كارییپێنەكراوە. لەبەر واستە و خزمخزمێنە و حیزبایەتیی، گوندی و هەژار و بێلایەن كەمترین سود لە خزمەتگوزاریی تەندروستیی گشتیی هەرێمی كوردستان وەردەگرن.

بۆ دابینكردنی خزمەتگوزاریی تەندروستیی بەگوێرەی ئاستی داهاتی تاك، دەبێت حكومەتی هەرێم كاری جدیی بكات، كۆمەڵگەی كوردستان بۆ چینوتوێژی هەژار و مامناوەند و دەوڵەمەند پۆلێنبكات. حكومەتی هەرێم بە خۆڕایی خزمەتگوزاریی تەندروستیی بۆ تاك و توێژە هەژار و بێكارەكان دابینبكات. ئەو توێژە كۆمەڵایەتییەی كە سامانێكی مامناوەندی هەیە، حكومەتی هەرێم خەرجی بەشێك لە خزمەتگوزاریی تەندروستیی بۆ بكات و بەشەكەی تری لەسەر حسابی خۆی بێت.

ئەو توێژە كۆمەڵایەتییەی كە داهاتی مانگانەی لە ئاستێكی بەرزدایە، لە دابینكردنی خزمەتگوزاریی تەندروستیی خۆیان بەرپرسبكرێن، لە نەخۆشخانە تایبەتەكان و لە نەخۆشخانە گشتییەكاندا (حكومییەكان)دا بە یەك نرخ خزمەتگوزاریی پزیشكییان پێشكەشبكرێت، بۆ ئەوەی بە داهاتی چارەسەری نەخۆشییەكانیان بڕێك خەرجیی خزمەتگوزاریی بۆ نەخۆشە هەژارەكان دابینبكرێت، یان ڕێگەی دڵنیایی تەندروستیی بگیرێتەبەر. هەر كەسێك بەگوێرەی داهاتی ساڵانەی بڕێك پارەی لیوەربگیرێت، ئەو بڕەپارەیە بۆ خزمەتگوزاریی تەندروستیی خۆی لە كاتی پێویستدا بەكاربهێنرێت.

### ٢- زانستی پزیشكیی:

لە سێیبەری شەڕە یەك لە دوای یەكەكانی عێراق و هەرێمی كوردستاندا، زانستی پزیشكیی پاشەكشەیكرد، پزیشكان لە پێشكەوتنە زانستییەكان دابڕان. نەخۆشی كوردستان سودی لە پێشكەوتنی زانستیی وەرنەگرت. ئەم بارودۆخەی عێراق بە

خراپتر لە هەرێمی کوردستاندا ڕەنگیدایەوە. ڕۆژانە کێشەکانی دەستنیشانکردن و چارەسەرکردنی نەخۆشیی بەرۆکی پزیشکان دەگرێت.

زانکۆکانی کوردستان و وەزارتـی تەندروستیی حکومەتی هـەرێم، درەنـگ هەستیان بەم مەترسییە کرد، کاریان بۆ چارەسەرکردنی نەکرد. ئەگەر لە بەرنامەی حکومەتدا بێت خزمەتگوزاریی تەندروستیی پێشبخات، دەبێت هەوڵی پێشخستنی زانستی پزیشکیی بدات، بۆ ئەوەی بە زووترین کات و بە شێوەیەکی ڕاست، دەرد و نەخۆشییەکانی هاوڵاتییان دەستنیشانبکرێن و بە زووترین کات و بە باشترین شێوە چارەسەری نەخۆشیی و برینەکانیان بکرێت. ئەم ئەرکانە کاتێک وەکو پێویست ئەنجامدەدرێن کە پزیشکی خاوەن_زانستی بەرز و خاوەن_پسپۆری هەمەجۆر لە هەرێمی کوردستاندا هەبن، کەرەستە و پێداویستیی تاقیگە و تیشک و دەرمان بۆ پشتیوانیی دەستنیشانکردنی نەخۆشیی و بۆ چارەسەری نەخۆشیی لە هەرێمی کوردستاندا دابینبکرێت.

ئامانجێکی تر لە پێشخستنی زانستی پزیشکیی لە هەرێمی کوردستاندا ئەوەیە کە نەخۆش و بریندارەکانی هەرێم، بۆ دۆزینەوەی نەخۆشییەکانیان، بۆ وەرگرتنی چارەسەر ڕوو لە وڵاتانی تر نەکەن، بڕێک لە سامانی هەرێمی کوردستان نەبەنە دەرەوەی وڵات و سامان و دارایی تاک و کۆمەڵگەی کوردستان لاوازنەکەن.

ئەوەی لە دوای ڕاپەڕینەوە هەتا ئەمڕۆ لە سیستەمی تەندروستیی هەرێمدا پەیڕەوکراوە، بەرزکردنەوەی ئاستی زانستی پزیشکیی و ڕاهێنانی پزیشکان و کارمەندان نەبووە، ئەو کارە نیوەناچڵانەیش کە بۆ وەرگرتنی پلەی پسپۆڕیی و بۆ ناردنی پزیشکان بۆ دەرەوەی وڵات و بۆ هێنانی ئامێری نوێ کراوە، لەسەر بنەمای زانستیی و لێوەشاوەیی زانستیی و سەلیقەی پزیشکیی نەبووە، حیزبایەتیی و دۆستایەتیی و خزمایەتیی، لە پێش بنەماکانی زانستیی و لێوەشاوەیی و سەلیقەوە ڕەچاوکراوە.

چارەسەرکردنی ئەم گرفتە پێویستیی بە هەوڵێکی جدیی حکومەتی هەرێم هەیە، لە لایەکەوە بودجەیەکی باش بۆ گەشەپێدانی زانستی پزیشکیی دابینبکات، لە لایەکی ترەوە بەگوێرەی بنەمای زانستیی و سەلیقەی کار و پیشە، پزیشک و کارمەندی تەندروستیی بۆ پـەروەردە و فێرکردنی باڵا دەستنیشانبکات، دەبێت دەزگاکانی

تەندروستیی لە هەرێمی کوردستاندا کەسانێک بدۆزنەوە عاشقی پیشەکەی خۆیان بن، ئەوانە بنێرن بۆ پەروەردە و لێکۆڵینەوەی زانستیی و ڕاهێنان لەسەر ئامێری پزیشکیی بکەن، دەسەڵاتی کوردیی مەچەکی حیزبایەتیی و خزمایەتیی و ...هتد، لەسەر بینەقاقەی سیستەمی تەندروستیی شلبکات و چیتر وەکو جاران لە ڕێگەی کەلتوری حیزبایەتییەوە سیستەمی تەندروستیی ئیفلیجنەکات.

## ٣- کارگێڕیی:

ناوەندێتیی کارگێڕیی و سنووردارکردنی دەسەڵات لە دەستی وەزیری تەندروستیی و سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیراندا، کێشەیەکی تری بۆ سیستەمی تەندروستیی هەرێم دروستکردووە، خزمەتگوزاریی تەندروستیی لە هەرێمی کوردستاندا دوچاری قەیران کردووە. ئەگەرچی ناوەندێتیی نەخۆشییەکی بەڕێوەبردنە و سەرجەم دامودەزگا و وەزارەتەکانی تری حکومەتی هەرێمی کوردستانی گرتووەتەوە، بەڵام ئەم دیاردەیە لە نەخۆشخانە و بەڕێوەبەرایەتیی تەندروستیی پارێزگا و قەزاکاندا بە ڕوونیی کاریگەریی خراپی لەسەر ڕاپەڕاندنی کارەکان بەجێهێشتووە، ئاستەنگیی بۆ دابینکردنی پێویستییە بەپەلە و ڕۆژانەکانی خزمەتگوزاریی تەندروستیی دروستکردووە.

ئەگەر نەخۆشخانەیەک پێویستی بە ئامێرێکی سادە بێت، بەڕێوەبەری نەخۆشخانە دەسەڵاتی ئەوەی نییە ئەو ئامێرە بکڕێت، دەبێت بە نوسراوی فەرمیی سەرەوەی خۆی ئاگاداربکاتەوە، لەوانەیە بڕی پارەی ئامێرەکەیش لە دەسەڵاتی بەڕێوەبەری تەندروستیی پارێزگا و وەزیریشدا نەبێت، کڕینی ئەو ئامێرە تەنها لە دەسەڵاتی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیراندا بێت، ئەگەر ڕەزامەندیی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران و ڕۆتینی وەزارەتی دارایی و دامودەزگاکانی دارایی بخەینەسەر، بێنە و بەردەی کڕینی ئامێرێک، یان پێویستییەکی سادەی نەخۆشخانەیەک، جاری وا هەیە ساڵێکی پێدەچێت.

بۆیە سیستەمی ناناوەندیی (لامەرکەزیی) چەندە بۆ ڕاپەڕاندنی کاروباری وەزارەت و کەرتەکانی تری حکومەتی هەرێم گرنگە زۆرتر بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکانی نەخۆشخانە و دامودەزگاکانی تەندروستیی گرنگە.

سالّی ١٩٨٨ - ١٩٨٩ دوای ئەنفال ئاوارەی ئێران بووم، بۆ ماوەی ٨ مانگ لە نەخۆشخانەیەکی شاری سنەی ڕۆژهەلاتی کوردستان بە شێوەیەکی کاتیی دامەزرام، لە سیستەمی تەندروستیی ئەو کاتەی ئێراندا، ئەو نەخۆشخانەیە دەزگایەکی بەڕێوەبەریی و دارایی سەربەخۆ بوو، داهاتی نەخۆشخانەکە موچەی پزیشک و کارمەندەکانی خۆی دابیندەکرد. ئەگەر نەخۆشخانەکە پێویستی بە کەرەستە و ئامێری پزیشکیی هەبایە، بەڕێوەبەری نەخۆشخانەکە دەسەلاتی کڕینی ئەو پێویستییانەی هەبوو. ئەگەر داهاتی مانگانە و سالانەی نەخۆشخانە لە خەرجیی نەخۆشخانەکە زیاتر بایە، بەڕێوەبەر ئەو داهاتە زیادەیەی ڕەوانەی وەزارەتی دارایی دەکرد. ئەگەر داهاتی مانگانە، یان سالانەی نەخۆشخانەکە کەمیبکردایە، بەڕێوەبەر داوای هاوکاریی دارایی لە وەزارەتی دارایی دەکرد.

ئەگەر لە هەرێمی کوردستاندا بەڕێوەبەرەکانی نەخۆشخانە و فەرمانگەکانی تەندروستیی دەسەلاتیان پێبدرێت بۆ ئەوەی پێویستیی دەزگاکانیان جێبەجێبکەن، کارەکانی نەخۆشخانە و دەزگا تەندروستییەکان بە شێوەیەکی باش بەڕێوەدەچن، خزمەتگوزاریی تەندروستیی بە شێوەیەکی باش پێشکەشی خەلّک دەکرێت، پزیشک و نەخۆش و بەڕێوەبەرەکانی تەندروستیی کەمترین گلەیی و گازندە دەکەن، ئالۆزیی لە سیستەمی خزمەتگوزاریی تەندروستییدا کەمدەبێتەوە. بۆیە زۆر گرنگە کە دەسەلاتدارانی هەرێمی کوردستان بگەنە ئەو قەناعەتە کە پێویستە بڕێک لە دەسەلاتەکەی خۆیان بدەنە بەرپرسی دەزگاکانی شار و شارۆچکە و ناوچەکان، بۆ ئەوەی کارەکان بە زووترین کات ئەنجامبدرێن و خزمەتگوزاریی تەندروستیی بە باشی دابینبکرێت.

## ٤. بنکەی تەندروستیی:

لە هەرێمی کوردستاندا هەموو نەخۆشێک بۆی هەیە سەردانی هەر بنکەیەکی تەندروستیی و هەر نەخۆشخانە و هەر عەیادەیەکی پزیشک بکات، ئەم مافەی هاولاتیی لە بێسەروبەریی سیستەمی تەندروستیی هەرێمی کوردستانەوە سەریهەلّداوە، لە ولاتانی تردا کە خاوەنی سیستەمێکی تەندروستیی هاوسەنگن، هەر گەڕەکێک، هەر شار و شارۆچکەیەک بنکەی تەندروستیی تایبەتی خۆی هەیە، ناوی خەلّکی گەڕەک

و شارۆچکه و گوند، لەو بنکەیه تۆمارکراوه، ئەو بنکه تەندروستییه به تەنها ئەو نەخۆشانه دەبینێت، که له سنووری گەڕەک، یان شارۆچکه و گوندەکەدا ناویان لای تۆمار کراوه. له هەموو بنەکەیەکی تەندروستییدا پزیشکی گشتیی هەیە، نەخۆشی گەڕەک، یان گوند دەپشکنێت و چارەسەری بۆ دەنوسێت. ئەو نەخۆشانەی که خۆی دەستی بەسەریاندا دەشکێت چارەسەریاندەکات، ئەو نەخۆشانەی پێویستیان به پزیشکی پسپۆڕە، پزیشکی بنکه تەندروستییەکه ڕەوانەی پزیشکی پسپۆڕی تایبەتیان دەکات. هەموو خێزانێک لەو بنکه تەندروستییەدا فایلێکی تەندروستیی تایبەتی خۆی هەیە، جۆری نەخۆشیی هەموو ئەندامانی خێزانەکەی تێدا تۆمارکراوە، بەو شێوەیە کاروباری خزمەتگوزارییه تەندروستییەکان به باشیی بەڕێوەدەچن و ئاڵۆزیی و قەربالغیی نەخۆشخانه و بنەکەکان سنووری بۆ دادەنرێت، له هەمان کاتدا ئەو فایل و دوکیۆمێنتانەی خێزانەکان له بنکه تەندروستیەکاندا دەبنه بنەمایەکی زانستیی بۆ بەدواداچوون و دۆزینەوەی نەخۆشیی ئەندامانی خێزانەکە.

له هەرێمی کوردستاندا بنکەی تەندروستیی هەیە، پزیشکی گشتیی تێدایە، بەڵام به جدیی کارەکان ئەنجامنادەن، نەخۆشیی هەموو گەڕەک و ناوچەیەک دەبینن، فایلی نەخۆشییەکانی خێزانەکان به باشیی ناپارێزرێن و وەکو سەرچاوەیەکی زانستیی سودی لێوەرناگیرێت. خەڵکی هەرێمی کوردستان پابەندنابن بەو ڕێنماییانەوە که وەزراتی تەندروستیی بۆی داناون. جاری وا هەیە نەخۆش بۆ نەخۆشییەکی سادە دەچێتە لای پزیشکی پسپۆڕ، جاری وا هەیە بۆ نەخۆشیی گران و کوشندەیش نەک هەر ناچنه بنکەی تەندروستیی و سەردانی پزیشکی پسپۆڕ ناکەن، بەڵکو سەردانی دوکانی دەرمانفرۆشەکان دەکەن، یان دەچنه لای ئەو کەسانەی به دۆعا و جادوو نەخۆش چاکدەکەنەوە.

بۆیه گرنگه حکومەتی هەرێم و دەزگاکانی تەندروستیی به گرنگیی سیستەمی بنکه تەندروستییەکانی گەڕەک و شار و شارۆچەکاندا بچنەوە، له ڕێگەی ڕاگەیاندنەوە خەڵک هۆشیاربکەنەوە که پابەندی ڕێنمایی تەندروستیی و خزمەتگوزاریی بنکه تەندروستییەکان بن.

### ٥- نەخۆشخانە:

نەخۆشخانە شوێنی چارەسەری نەخۆشییە گرانەکانە، ئەگەر سەیری نەخۆشخانەکانی هەرێمی کوردستان بکەین، بۆمان ئاشکرادەبێت کە لە دوای راپەڕینەوە هەتا ئەمڕۆ بەگوێرەی پێویست و بەگوێرەی دابەشبوونی ژمارەی دانیشتوان، نەخۆشخانە دروستنەکراون. لە سەردەمی ڕژێمی بەعسدا پارێزگای سلێمانیی لەو نەخۆشخانە گەورەیە بێبەشکرا کە لە هەموو پارێزگاکانی عێراقدا بە ناوی نەخۆشخانەی سەدام حوسەین دروستدەکرا. لە دوای راپەڕین هەندێک نەخۆشخانەی بچووک دروستکران، دروستکردنی ئەو نەخۆشخانانە لەسەر بنەمای پێویستیی خەڵک و ژمارەی دانیشتوان نەبوو، لەسەر حەز و ئارەزووی دەسەڵاتداران بوو، بۆ نمونە لە شارۆچکەی سەیدسادق نەخۆشخانەیەکی ٨٠ قەرەوێڵەیی دروستکرا، بەڵام لەبەرئەوەی لە شارەوە دوور بوو، کادری پزیشکی پێویستی نەبوو، ماوەی شەش ساڵ بەسەر دروستکردنیدا تێپەڕی، وەکو پێویست سودی لێوەرنەگیرا.

ساڵی ٢٠٠١ ڕێکخراوی (WHO) بڕیاری دروستکردنی نەخۆشخانەیەکی ٤٠٠ قەرەوێڵەیی بۆ شاری سلێمانیی دەرکرد، لەبەرەئەوەی دەسەڵاتدارانی سلێمانیی شوێنی نەخۆشخانەکەیان گۆڕی، دە ساڵ زیاتر بەسەر بڕیارەکەدا تێپەڕی هەتا نەخۆشخانەکە دروستکرا. ئەمە لە کاتێکدایە کە پارێزگای سلێمانیی بە کێشەی کەمیی نەخۆشخانە و شوێنی حەوانەوەی نەخۆشەوە دەناڵێنێت.

نەبوونی شوێنی پێویست بۆ حەوانەوە و چارەسەرکردنی نەخۆش لە کاتێکدایە ڕۆژانە چەندیین باڵەخانەی گەورە لە ناو شاردا بەرزدەکرێنەوە، بەبێ ئەوەی ئەو باڵەخانانە پێویستییەکی گشتیی خەڵکی کوردستان دابینبکەن. ئەگەر حکومەتی هەرێم لایەک لە کەمیی نەخۆشخانەکانی هەرێم بکاتەوە، دەبێت بەگوێرەی بنەماکانی سیستەمی خزمەتگوزاریی تەندروستیی نەخۆشخانە دروستبکات.

ئەو نەخۆشخانە تایبەتییانەی کە لە هەرێمی کوردستان دروستکراون، لە ڕووی ئەندازیاریی و ژینگەییەوە ڕەچاوی مەرجی تەندروستیی تێدانەکراوە.

### ٦- پزیشک و کەرتی تایبەت:

لە هەرێمی کوردستان وەکو سیستەمی کۆنی عێراق، کاری نەخۆشخانە و کاری عەیادەی پزیشکان تێکەڵکراوە، پزیشک بەیانیان لە نەخۆشخانە کاردەکات، ئێوارە لە عەیادەکەی خۆی کاردەکات. پزیشکان توێژی سەرکەوتووی هەر کۆمەڵگەیەکن، پزیشک یەکێک لەو خوێندکارانەیە کە بە شێوەیەکی بەردەوام و بۆ ماوەیەکی درێژ خەریکی خوێندن و خۆپەروەردەکردن دەبێت. لە خوێندکاری هەموو زانستەکانی تر زیاتر ماندوودەبێت. بۆ پاداشتی ئەو ماندووبوونە زۆرە و بۆ پێزانین بەوەی توێژێکی سەرکەوتووە، لەبەرئەوەی بە پیشەکەی ڕاستەوخۆ خزمەتی مرۆڤ دەکات، تەمەنی مرۆڤ درێژدەکات و لە ئێش و ئازار دەیپارێزێت، دەسەڵاتی هەر وڵاتێک، بە چەندیین شێوە پاداشتی پزیشک دەدەنەوە و ڕێز و پێزانین بۆ پیشەکەیان پیشاندەدەن. یەکێک لەو جۆرە پێزانینانە دابینکردنی موچەیەکی بەرزە، بە شێوەیەک کە پزیشکان لە ڕێگەی موچەوە، یان کاری تایبەتی خۆیانەوە، بەگوێرەی یاسای وەزارەتی تەندروستیی و سەندیکای پزیشکان، ژیانێکی خۆش مسۆگەربکەن. گەرەنتییکردنی ژیانێکی خۆش بۆ پزیشکان لە لایەکەوە پاداشت و پێزانینە، لە لایەکی ترەوە دابینکردنی زەمینەیەکی لەبارە بۆ ئەوەی پزیشکان لە ڕەوشێکی ئارام و جێگیردا بژین، توانا زانستییەکانی خۆیان بە شێوەیەکی بەردەوام گەشەپێبدەن.

لەبەرئەوەی موچەی پزیشکانی هەرێمی کوردستان، بەگوێرەی سیستەمی موچەی پزیشکانی حکومەتی عێراقی پێشوو داڕێژراوە، سیستەمی تەندروستیی حکومەتی عێراق لەسەر بنەمای سیستەمی سۆسیالیستی کلاسیک داڕێژراوە، لەبەر ئەو هەموو شەڕ و کارەسات و ئابڵوقە ئابوورییانەی لە ٣٠ ساڵی ڕابردوودا بەسەر عێراق و هەرێمی کوردستاندا هاتووە، موچەی پزیشک و کارمەندی تەندروستیی هەرێم بەگوێرەی بەرزبوونەوەی ئاستی گوزەران بەرزنەکراوەتەوە، وەکو موچەی پزیشک و کارمەندانی وڵاتانی تر نییە. ئەو پزیشک و کارمەندانەی کوردستان کە هەرێم جێدەهێڵن و ڕوودەکەنە وڵاتانی ئەورووپا و کاریان دەستدەکەوێت، بڕی موچەی مانگانەیان لەو وڵاتانە دەقاتی ئەو موچانەیە کە لە هەرێمی کوردستان وەریدەگرن.

لە سەردەمی جیهانگیریی و بچووکبوونەوەی جیهاندا، پزیشکی هەرێمی کوردستان بە وردیی ئاگای لە ماف و ئەرکەکانی پزیشکانی سەرتاپای جیهان دەبێت،

دەیەوێت وەکو ئەوان کاربکات و وەکو ئەوان بژی. لێرەدا پزیشکان بەرانبەر بە کەمیی موچەکەیان و زۆریی کارەکەیان، ناهاوسەنگییەک لە نێوان ئەرک و مافەکانیاندا دەبینن و بەردەوام گلەیی لە دەسەڵات دەکەن.

بۆ پڕکردنەوەی پێویستییەکانی ژیان و بۆ ئەوەی گوزەرانیان باشبکەن، پزیشکان عەیادەی تایبەت دەکەنەوە، بەگوێرەی یاسای سەندیکای پزیشکانی هەموو جیهان، پزیشک مافی خۆیەتی لە دوای دەوامی فەرمیی نەخۆشخانە، عەیادە بکاتەوە و نەخۆشی تێدا ببینێت و هەقی پشکنین و چارەسەری خۆی وەربگرێت.

لە هەرێمی کوردستاندا کاری پزیشکیی لە نەخۆشخانە و لە عەیادەکاندا، بە شێوەیەکی یاسایی ڕێکنەخراوە، تێکەڵیی لە نێوان کەرتی گشتیی و کەرتی تایبەتدا دروستدەبێت. پزیشکان ڕووبەڕووی گلەیی و ڕەخنە دەبنەوە، بۆیە یەکێک لە ئەرکە گرنگەکانی تری سیستەمی نوێی تەندروستی ئەوەیە کە لەسەر بنەمای ستاندارە جیهانییەکان موچەی پزیشک و کارمەندان دابینبکات، کەرتی گشتیی لە کەرتی تایبەت جیابکاتەوە، پێوانە و بنەما بۆ جیاکردنەوەی کەرتی گشتیی و کەرتی تایبەتیی دابنێت.

### ٧- پزیشک و خەڵک:

یەکێک لە گلەییە بەردەوامەکانی خەڵک لە پزیشکان ئەوەیە، کە پزیشکان لە نەخۆشخانە ڕوویان خۆش نییە و بە باشیی نەخۆش نابینن، بەڵام لە عەیادەکانی خۆیاندا ڕوویان خۆشە و بە باشیی پشکنین بۆ نەخۆشەکان دەکەن. بە بۆچوونی من ئەم تێڕوانینەی خەڵک لەسەر پزیشکان ڕاستیی تێدایە، بەڵام ڕاستییەکی ڕەها نییە، باشترین چارەسەر بۆ ئەو گلەییانە جیاکردنەوەی کەرتی تایبەت و کەرتی گشتیی خزمەتگوزاریی تەندروستییە. ئەگەر ئەو تێڕوانینەی خەڵک هەتا ڕادەیەک ڕاستبێت، دەبێت هۆکارەکانی بدۆزینەوە. یەکێک لە هۆکارەکان ئەوەیە کە پزیشک لە نەخۆشخانە چەندیین کاری هەیە، پزیشک لە نەخۆشخانە تەنها بە پشکنینی نەخۆشەوە سەرقاڵ نییە، چەندیین کاری تری هەیە، پشکنین و دەستنیشانکردنی نەخۆشیی ئەو نەخۆشانەی لە نەخۆشخانەدا خەوتوون، وانەوتنەوە بە خوێندکارانی بەشە پزیشکییەکانی زانکۆ و پەیمانگاکان، کارکردن لە لێژنە پزیشکییەکاندا، کاری نەشتەرگەریی و ...هتد.

له نەخۆشخانە نەخۆش زۆرە، لەوانەیە پزیشکێکی پسپۆڕ لە مانگێکدا تەنها شەش کاتژمێر لە بەشی ڕاوێژکاریی نەخۆشخانەدا ئیشکگربێت، لەو شەش سەعاتەدا هیچ نەبێت ١٠٠ سەد نەخۆش دەبینێت، ئەو پزیشکە دەرفەتی نییە لەگەڵ نەخۆشدا قسەبکات و کاتی لەگەڵدا بەسەرببات، بۆیە ناتوانێت وەکو پێویست کات و توانای خۆی بۆ پشکنین و چارەسەری نەخۆشەکانی نەخۆشخانە بەکاربهێنێت، بەڵام هەموو پزیشکێک ئازادە لەوەی کە ڕۆژانە لە کلینیکی تایبەتی خۆیدا نزیکەی شەش کاتژمێر دابنیشێت و ژمارەیەک نەخۆشی کەم بپشکنێت و باش گوێ لە نەخۆشەکان بگرێت و چارەسەریان بۆ بنوسێت. لەبەرئەوەی پشکنینی نەخۆش لە نەخۆشخانە بۆ هەموو کەسێکە و بێبەرانبەرە، یان بە نرخێکی کەمە، هەندێک خەڵک بۆ کاتبەسەربردن دەچنە نەخۆشخانە و خۆیان پیشانی پزیشک دەدەن بەبێ ئەوەی هیچ جۆرە گرفتێکی تەندروستییان هەبێت. جارجارەیش کێشە بۆ پزیشکان دروستدەکەن. ساڵی ١٩٨١ پزیشکی خولاو بووم، لەسەر شەقامێکی شاری سلێمانیی وەکو هەر هاوڵاتییەک ڕێمدەکرد، چەند گەنجێک لە تەنیشتمەوە ڕێیاندەکرد و قسەیاندەکرد، کاتیان زۆر بوو نەیاندەزانی چۆن کات بەسەربەرن، یەکێکیان گوتی بۆ خۆمان نەکەین بە نەخۆش و سەردانی عەیادەی ڕاوێژکاریی نەکەین؟ ئەوانی تر بە پێشنیازەکەی ڕازیبوون و گوتیان با بڕۆین!

### ٨- مافی پزیشک دەخۆن:

له دوای ڕاپەڕیین چەندیین دیاردەی ناشارستانی لە ناو کەرتی تەندروستیی لە هەرێمی کوردستاندا سەریانهەڵدا، هەندێک دیاردەی کۆنی تریش هەبوون گەشەیانکرد. لە سایەی ململانێی حیزبایەتیی و زیندووبوونەوەی هزری خێڵایەتیی و پێشێلکاریی یاسادا، چەندیین دوکانی دەرمانفرۆشتن و عەیادەی نەخۆشبینین کرانەوە، هەندێک لەو سەرپێچییانە لە لایەن کارمەندانی تەندردوستییەوە ئەنجامدەدرێت، بەڵام ژمارەیەکی ئەو کارانەیش لە لایەن کەسانێکەوە ئەنجامدەدرێن کە خۆیان کردووەتە پزیشک و خوێندەوارییشیان نییە.

کەڵەشاخ و جەراحی خۆماڵیی لە ناو شارەکانی سلێمانیی و هەولێردا بە ئاشکرا دەبینرێت، هەر کەسێک بیەوێت کاری پزیشکیی بکات، یان دەرمان بکرێت

و بفرۆشێت، بە ئاسانیی بۆی دەچێتەسەر و کەس لێیناپرسێتەوە. ئەم دیاردەیە لە لایەکەوە زوڵمێکی گەورەیە لە پزیشک و دەرمانسازان دەکرێت، لە لایەکی ترەوە زوڵمێکە و لە نەخۆش دەکرێت.

ساڵی ٢٠٠١ بۆ ماوەیەکی کەم بەڕێوەبەری تەندروستیی شاری سلێمانیی بووم، کەسێک نۆرینگەیەکی بۆ چارەسەری نەخۆشی هەمەجۆر دانابوو، ناردم بە دواییدا و گوتم: شارەزاییت لە بواری پزیشکیی و دەرمانسازییدا هەیە؟ گوتی: نەخێر. گوتم: ئەی ئاستی خوێندەوارییت چییە؟ گوتی: خوێندەوار نییم. گوتم: ئەی چۆن ئەم عەیادەیەت داناوە و لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن ڕیکلام بۆ خۆت دەکەیت؟ گوتی: دکتۆر، من کاتی خۆی پێشمەرگە بووم، بە بەرد ڕەبایەم گرتووە. کاتێک پرسیارم لێکرد کەی و لە کوێ پێشمەرگە بوویت؟ چۆن ئەو ڕەبایەت گرت؟ لە وەڵامەکانیدا بۆم دەرکەوت نە پێشمەرگە بووە نە لەو شوینەی ئەو ناویهێنا ڕەبایەی حکومەت گیراوە.

## ٩- حیزب و سەندیکا تەندروستییەکان:

لە دوای ڕاپەڕیین ململانێی حیزبەکان لەسەر دەسەڵات پەرەیسەند، حیزب دەستی بەسەر سەندیکای پزیشکان و سەندیکای کارمەندانی تەندروستییدا گرت، هەردوو سەندیکا لەسەر بنەمای حیزبیی و ناوچەیی دابەشبوون. سەندیکا چالاکیی پیشەیی لەبیرچووەوە، کاری بۆ پێشخستنی سیستەمی تەندروستیی هەرێمی کوردستان نەدەکرد، کاری بۆ بەهێزکردنی حیزبەکەی دەکرد.

لەبەرئەوەی ئەندامانی سەندیکای کارمەندانی تەندروستیی بە ژمارە لە ئەندامانی سەندیکای پزیشکان زیاتر بوون، کارمەندان زۆرتر دەرفەتیان هەبوو لە چالاکییە سیاسییەکانی حیزبدا بەشدارییبکەن، لە ململانێی نێوان پزیشک و کارمەنداندا، حیزب پشتگیریی کارمەندانی دەکرد. سەندیکای کارمەندانی تەندروستیی ئەم هەلەیان قۆستەوە، بۆ دابینکردنی پشتگیریی کارمەندان لە سەندیکاکەیان، سەندیکای کارمەندان بە پشتگیریی حیزب، برێک پیشەی پزیشکیی و دەرمانسازیی لە دەستی پزیشکان سەند، ڕەواییاندا کارمەندان و کەسانی تر دوکانی دەرمانفرۆشتن و عەیادە بکەنەوە. ئێستا دوکان و عەیادەی نافەرمیی کارمەندان و خەڵکانی تر دیاردەیە و سەندیکای کارمەندان و حیزب پشتگیرییدەکەن. ئەم دیاردەیە لە هیچ وڵاتێکی تری جیهاندا

نییە، کاریگەرییەکی خراپی لەسەر سیستەمی تەندروستیی هەرێم و خزمەتگوزاریی تەندروستیی بەجێهێشتووە.

سەندیکا و ڕێکخراوە ناحکومییەکان بەشێکی کۆمەڵگەی مەدەنیی پێکدەهێنن، چاودێریی کارەکانی حکومەت دەکەن و داکۆکیی لە مافەکانی کۆمەڵگە دەکەن، بەڵام لە هەرێمی کوردستان، حیزب و حکومەت و سەندیکاکان پێکەوە کار لە دژی کۆمەڵگە دەکەن. لەسەر داوای حیزب حکومەت بڕیارێکی دەرکردووە دەبێت هەر موچەخۆرێکی کارمەندی تەندروستیی، مانگانە بڕێک لە موچەکەی بە سەندیکای کارمەندان ببەخشێت.

لە دوای ڕاپەڕینەوە هەتا ئەمڕۆ (٢٠٢١) یەک کەس سەرۆکی سەندیکای کارمەندانی تەندروستیی هەرێمی کوردستانە، دەبێت نهێنیی هێشتنەوەی ئەو سەرۆکە چی بێت، بێجگە لە خزمەتکردنی حیزب و تێکدانی سیستەمی تەندروستیی هەرێم. لە زۆربەی شار و شارۆچکەکانی کوردستاندا دوای نیوەڕوان کەس نازانێت کێ پزیشکە و کێ هاوکاری پزیشک و کێ برینپێچە! کەس نازانێت کام کەسە پزیشکی دەرمانسازە و کام کەسە دەرمانفرۆشە! دەرمانفرۆشەکان بە نرخێکی هەرزانتر دەرمان بە خەڵکی دەفرۆشن، هەتا نیوەی شەو دوکانەکانیان کراوەن، بەوەیش چاوی خەڵک و دەسەڵات و میدیایان لە ئاست کارە ناڕەواکانیان بەستووە.

ئەم دیاردەیە کاریگەرییەگی زۆر خراپی لەسەر هەست و بەرپرسیارێتیی پزیشکان بەجێهێشتووە، وایکردووە کە پزیشکان بە جدیی سەیری خۆیان و پیشکەیان نەکەن، دەسەڵات و کۆمەڵگە بە ناحەزی خۆیان بزانن، وەکو پێکهاتەیەکی زوڵملێکرا و نامۆ سەیری خۆیان بکەن. پزیشکانیش خۆیان لە کۆمەڵگە جیاکردووەتەوە، حساب بۆ گلەیی و گازندەی خەڵک ناکەن، لە زۆر ویستگەدا مافی خەڵک و نەخۆش پێشێلدەکەن، ئامادە نین ڕەخنە لە خۆیان بگرن و بە خۆیاندا بچنەوە، لە لایەن ڕۆژنامەنوسان و کارمەندان و تویژەکانی ترەوە مافیان پێشێلدەکرێت، داکۆکیی لە خۆیان ناکەن. ئەمە وایکردووە بارودۆخی پزیشکان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەرەو خراپتر بڕوات. پزیشکان بەرانبەر بە گەلەکەیان هەست بە بەرپرسیارێتیی ناکەن، بەرانبەر بە گەندەڵیی و ناداپەروەریی هەڵوێستیان نییە. ئەمە وایکردووە هێندەی تر دیواری نێوان خەڵک و پزیشک ئەستوور ببێت.

### ١٠- دەستتێوەردانی حیزب:

کاتێک بەڕێوەبەری فەرمانگەی تەندروستیی سلێمانیی بووم، کۆمەڵێک دیاردەی هەڵە و ناداپەروەرم بینی، دڵنیام ئەو دیاردانە بە تەنها لەو کاتەدا و لە شوێنی کارەکەی مندا نەبوون، ئەو دیاردانە سەرتاسەریی و درێژخایەن بوون، هەتا ئەمڕۆیش بەردەوامن و زۆردەبن.

دامەزراندن و دابەشکردن و گواستنەوە و کارکردنی پزیشک و کارمەند، لەسەر بنەمای پێویستیی نەخۆشخانە و خزمەتگوزاریی تەندروستی نەبوو، لە کاتێکدا کە نەخۆشخانەکانی سلێمانیی پێویستیان بە کارگوزار بوو، سەدان کارمەندی تەندروستیی زیادی هەبوو، سەرۆکی هەرێمی سنووری سلێمانیی بڕیارێکی دەرکرد بێجگە لە پزیشک و کارمەندی تەندروستیی هیچ ستافێکی تر بۆ وەزارەتی تەندروستیی دانامەزرێت. هەر ئەو سەرۆکەی هەرێم لە ناوەڕاستی مانگی حەوتی ٢٠٠١دا بە بڕیارێکی سەرپێیی داوای لە وەزیری تەندروستیی کرد بە زوترین کات پێنج پزیشک بۆ شارەدێی تەقەتەق بنێرن. ئەمە لە کاتێکدایە کە ژمارەی دانیشتوانی تەقەتەق لە پزیشکێک زیاتر هەڵناگرێت.

ئەو ماوەی بەڕێوەبەری تەندروستیی سلێمانیی بووم، بینیم ئەو کارمەندانەی تەندروستیی سەر بە حیزبی دەسەڵاتدارن و کەسی ناسراویان لە پشتەوەیە، لە بنکە تەندروستییەکانی شاردا دادەمەزرێن، ژمارەی کارمەندانی بنەکەکان هێندە زۆربوو هەفتەیەک ڕۆژێک بۆ دوو ڕۆژ (٦ بۆ ١٢) کاتژمێر ئەرکیان بەردەکەوت. نەخۆشخانەکانی شاری سلێمانیی ژمارەی کارمەندیان زۆر کەم بوو، بە شێوەیەک کە هەر کارمەندێک لە هەفتەیەکدا سێ جار ئێشکگریی (سێ هەژدە کاتژمێریی) کاری گرانی بەردەکەوت. ئەم دیاردە ناڕەوایە کە بەگوێرەی پێویست ستاف دانەمەزرێنرێت و بە ئارەزووی بەرپرسان پزیشک و کارمەندا دابەشبکرێت، هەتا ئێستایش نەگۆڕاوە و یەکێک لەو دیاردە ناداپەروەرانەیە کە سیستەمی تەندروستیی هەرێمی کوردستانیان داڕزاندووە، خزمەتگوزاریی تەندروستیی هەرێمی کوردستانیان پەکخستووە.

## ٨- دەسەڵات و ئۆپۆزسیۆن

### ١- ئۆپۆزسیۆن و خەباتی نەتەوەیی:

شۆڕشی ئەیلول بە سیستەمی تاکەحیزب دەستپێکرد، کە ساڵی ١٩٦٤ باڵی مەکتەبی سیاسیی لە پارتیی جیابووەوە، مەلا مستەفا ڕازینەبوو باڵی مەکتەبی سیاسیی وەکو حیزبێکی سیاسیی لە گۆڕپانی سیاسیی باشووری کوردستاندا خەباتبکات، باڵی مەکتەبی سیاسیی ناچارکرد پاڵبدەن بە حکومەتی عێراقەوە و دژی شۆڕشی ئەیلول بجەنگن و خولی یەکەمی شەڕی براکوژیی دروستببێت. بەو شێوەیە دەبینین ئەگەر دیموکراسیی نەبێت، دیاردەی فرەحیزبیی قبوڵنەکرێت، زیان بە گەلی کورد دەگات و چارەسەری کێشەی کورد دوادەکەوێت.

کە ڕێککەوتنی ٦ی ئازاری ١٩٧٥ی جەزائیر لە نێوان شای ئێران و جێگری سەرۆککۆماری عێراق (سەدام حوسەین)دا واژۆکرا. سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلول بڵاوەی بە شۆڕش کرد. ئەگەر لەو کاتەدا هێزێکی تری سیاسیی لە دەرەوەی پارتیی و شۆڕشی ئەیلولدا هەبایە، ڕێگەی بڵاوەپێکردنی شۆڕشی دەگرت و دەستکەوتەکانی گەلی کوردی دەپاراست. لەو ڕۆژەوە گەلی کورد بڕوایهێناوە ئەگەر لە کاتی بڵاوەکردنی سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلولدا، هێزێکی تری سیاسیی لە باشووردا هەبایە، پلانی دوژمنانی کورد بەو شێوەیە سەرنەدەکەوت، شۆڕش بەو شێوەیە کۆتاییپێنەدەهات و کارەساتی مێژوویی ئازاری ١٩٧٥ ڕوینەدەدا.

لەو کاتەوە گەلی کورد نەفرەت لە سیستەمی یەک_حیزبیی دەکات، خەو بە دیاردەی فرەحیزبیی و ئۆپۆزسیۆنەوە دەبینێت، بەڵام دەسەڵاتدارانی باشووری کوردستان بەردەوام ئەو خەوەی کوردیان شێواندووە.

بەو شێوەیە دەبینین کە گەلی کورد تەنها وەکو قووڵکردنەوەی سیستەمی دیموکراتیی خەوی بە دیاردەی فرەحیزبیی و ئۆپۆزسیۆنبوونەوە نەبینیوە، بەڵکو وەکو گەرەنتییکردن و پاراستنی دەسکەوتەکانی گەلی کورد، وەکو گەرەنتییکردنی سەرکەوتنی تێکۆشانی ئازادیخوازی گەلی کوردیش، سەیری فرەحیزبیی و ئۆپۆزسیۆنی کردووە.

پاش ساڵێک لە بڵاوەپێکردنی شۆڕشی ئەیلول، گەلی کورد ملی بە شکست نەدا، بەرخۆدان و شۆڕشی دەستپێکردەوە. ئەم جارەیان سیستەمی یەک_حیزبیی تێپەڕاند، چەندیین حیزبی سیاسیی وەکو کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان، باڵی سەرەکیی یەکێتیی، بزوتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان، پارتیی دیموکراتی کوردستان، پاسۆک، حیزبی شیوعیی عێراق و بزوتنەوەی ئیسلامیی کوردستان، دژی ڕژێمی بەعس دەستیان بە تێکۆشانی سیاسیی و خەباتی چەکداریی کردەوە.

لەگەڵ ئەوەیشدا کە هزری دکتاتۆریی و خۆسەپاندن بەسەر سیاسەتی حیزبە باڵادەستەکانی کوردستاندا (پارتیی و یەکێتیی)دا زاڵبوو. دیاردەی فرەحیزبیی شۆڕشی نوێی کوردی تێکدا و شەڕی خوێناویی شوێنی ململانێی سیاسیی گرتەوە و خولی دووەمی شەڕی براکوژیی دەستپێکرد، بەڵام کاتێک کارەساتی ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجە و ڕاگرتنی شەڕی (عێراق – ئێران) ڕوویدا، خەباتی پێشمەرگایەتیی ڕاگیرا و زەمینەی دوبارە_بڵاوەپێکردنی شۆڕشی کورد نزیکبووەوە، لەژێر گوشار و چاودێریی لایەنەکانی تردا هیچ لایەنێکی سیاسیی نەیتوانی کۆڵبدات و بڵاوە بە شۆڕش بکات.

## ٢– ئۆپۆزسیۆن شکستدەخوات:

دوای ڕاپەڕیین گەلی کورد بۆ پاراستنی دەستکەوتە نەتەوەییەکانی و بۆ جێگیرکردنی سیستەمێکی دیموکراتیی، دیاردەی فرەحیزبیی و ئۆپۆزسیۆنبوونی بە گرنگ دەبینی، لە هەڵبژاردنی پەرلەماندا هەر یەکێک لە پارتیی و یەکێتیی زۆربەی دەنگی خەڵکی کوردستانیان بەدەستهێنا، حکومەتیان پێکهێنا. ئەو لیستانەی کە لە هەڵبژاردنی پەرلەماندا دەنگی پێویستیان بەدەستنەهێنا، نەیانتوانی وەکو ئۆپۆزسیۆنی دەسەلاتی هەرێمی کوردستان خۆیان ڕابگەیەنن.

پێش هەڵبژاردن حیزبی سۆسیالیستی کوردستان (حسک) پارتی گەلی دیموکراتی کوردستان، پاسۆک بەرەیەکیان بە ناوی (یەکگرتن) پێکهێنابوو، کاتێک بینییان بەو ٣ حیزبەوە دەنگی کورسییەکی پەرلەمانیان نەهێنا، بەرەکەیان هەڵوەشاندەوە و زۆربەیان دەستیان لە حیزبەکەیان بەردا و پەیوەندییان بە پارتیی و یەکێتییەوە کرد، وەکو ئەندام و کادری ئەو حیزبانە دەستیان بە کار و چالاکیی سیاسیی کرد.

ئالای شۆڕش کە لە ساڵی ١٩٨٥ لە یەکێتیی جیابووەوە، پێش هەڵبژاردن لەگەڵ حیزبی زەحمەتکێشان یەکیانگرت، لەگەڵ لیستی سەوزی یەکێتییدا بەشداریی هەڵبژاردنیان کرد، لە دوای هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانەوە وردە وردە پەیوەندییان بە ڕیزەکانی یەکێتییەوە کردەوە. لقی کوردستانی حیزبی شیوعیی عێراق، لەگەڵ ئەوەیشدا کە کورسیی پەرلەمانی نەبوو، لە کابینەی یەکەمی حکومەتی هەرێمدا پۆستی وەزارەتیان وەرگرت، نەیانتوانی وەکو ئۆپۆزسیۆن بمێننەوە.

تەنها لایەنی سیاسیی کە لە هەڵبژاردندا سەرکەوتنی بەدەستنەهێنا و لە دەرەوەی دەسەڵاتدا مایەوە، بزوتنەوەی ئیسلامیی کوردستان بوو. بزوتنەوەیش وەکو هێزێکی سیاسیی ئۆپۆزسیۆن خۆی ڕانەگەیاند. دوای خولی سێیەمی شەڕی براکوژیی لە کابینەکانی دواتری حکومەتی هەرێمدا بەشداریی حوکمی کرد. بەو شێوەیە ئەو حیزبانەی کە لە سەردەمی خەباتی چەکدارییدا وەکو ئۆپۆزسیۆنی پارتیی و یەکێتیی خۆیان دەناساند، هەر کە لە هەڵبژاردنی یەکەمی پەرلەمانی هەرێمدا شکستیانهێنا، ئەژنۆیان شکا و نەیانتوانی وەکو ئۆپۆزسیۆن درێژە بە تێکۆشان بدەن، خۆیان کردەوە بە دەرگای ماڵە کۆنەکانیاندا و پشتی بەرەی ئۆپۆزسیۆنیان شکاند و پارتیی و یەکێتییان مەستی سەرکەوتن کرد.

خۆبەدەستەوەدانی ئۆپۆزسیۆن و پاشەکشەی دیاردەی فرەحیزبیی، هزری دەسەڵاتخوازیی یەکێتیی و پارتیی بەهێزتر کرد، شەڕی ناوخۆ و دابەشکردنی هەرێمی کوردستانی لەگەڵ خۆی هێنا.

### ٣- ڕێگریی لە دروستبوونەوەی ئۆپۆزسیۆن:

هەموو کاتێک پارتیی و یەکێتیی مەترسیی دروستبوونی ئۆپۆزسۆنیان لەبیرنەکردووە، بۆیە بێجگە لە شەڕی براکوژیی خۆیان، ناو بە ناو بە شێوازی هەمەجۆر پەلاماری ئەو حیزبانەیان دەدا، کە لە دەرەوەی دەسەڵاتدا مابوونەوە، لە ناوچەی بادینان چەندیین کەسی سیاسیی سەربەخۆ و سەر بە حیزبەکانی کوردستان تیرۆرکران. لە دەڤەری ژێردەسەڵاتی یەکێتییدا هەر کەسێک سەریدەربکردایە سەرکوتیاندەکرد، یان لەناویاندەبرد.

له لایەکی ترەوە بە بیانووی شەڕی ناوخۆوە، دەسەڵاتدارنی هەرێم ئاستەنگییان بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی هەرێمی کوردستان دروستدەکرد. سیازدە ساڵ بەسەر هەڵبژاردنی یەکەم پەرلەماندا تێپەڕی هیچ هەڵبژاردنێک نەکرا، بۆ ئەوەی لیستی تر بەشداریی هەڵبژاردن نەکات و لەسەر دەسەڵات و حوکمڕانیی کێبرکێی پارتیی و یەکێتیی نەکات.

سیاسەتێکی تری هەردوو حیزبی دەسەڵاتدار کە ڕێگەی گەشەکردنی ئۆپۆزسیۆنیان پێگرتبوو، بودجەی حیزبە سیاسییەکانی کوردستان بوو، یاسای حیزبە سیاسییەکانی پەرلەمانی کوردستانیان جێبەجێنەدەکرد، لە یاسای حیزبەکاندا بەگوێرەی چەند پێوانەیەک، خەڵکی کوردستان مافیان هەبوو حیزبی سیاسیی پێکبهێنن، بەگوێرەی چۆنایەتیی و چەندایەتیی چالاکیی حیزبەکەیان، دەبوو حکومەتی هەرێمی کوردستان هاوکاریی دارایی ئەو حیزبانە بکات و بودجەیان بۆ ببڕێتەوە.

بەڵام هەردوو حیزبی دەسەڵاتدار باج و بودجەی هەرێمی کوردستانیان لە ناو خۆیاندا دابەشدەکرد، ڕێگەیاننەدەدا وەزارەتی دارایی هاوکاریی حیزبەکانی باشووری کوردستان بکات، پارتیی و یەکێتیی هەر یەکێک لە لای خۆیەوە هاوکاریی چەند حیزبێکی دۆستی خۆی دەکرد. بەو شێوەیە دیاردەی کۆکردنەوەی داهات لە لایەن حیزبەوە، دیاردەی بەخشینی هاوکاریی بۆ حیزب لە لایەن حیزبەوە هاتە ناو کەلتوری سیاسیی باشووری کوردستانەوە. هەر کاتێک حیزبە دەسەڵاتدارەکان بیانزانیبایە ئەو حیزبەی کە هاوکارییدەکەن خەریکە گەشەدەکات و بەهێز دەبێت، هاوکارییەکەیان کەمدەکردەوە، بۆ ئەوەی پاشەکشێبکات و پێش نەکەوێت. هەر کاتێک حیزبە خێرپێکراوەکە بەگوێرەی بەرژەوەندیی حیزبی دەسەڵاتدار هەڵسوکەوتینەکردایە، هاوکارییەکەی کەمدەکرایەوە، یان ڕادەگیرا.

سیاسەتی برسیکردن و نانبڕینی حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشوور هۆکارێکی تری گەشەنەکردنی ئۆپۆزسیۆن بوو. حسک و حیزبی زەحمەتکێشان ئەو دوو حیزبە بوون کە بەو شێوەیە لەلایەن حزبە دەسەڵاتدارەکانەوە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکرا.

بەهۆی شەڕی براکوژیی و پەلکێشکردنی سوپای داگیرکەران بۆ سەر خاکی هەرێمی کوردستان و برسییکردنی خەڵکەوە، ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی ئۆپۆزسیۆنی کوردستان کوردایەتیی و سیاسەتی لەبەرچاوکەوت و کوردستانی جێهێشت و ئاوارەی ئەورووپا بوو، ژیانی ئاوارەیی هەڵبژارد و ئۆپۆزسیۆنی لاوازکرد.

یەکێک لە سیاسەتەکانی تری حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشووری کوردستان کە ڕێگەی گەشەکردنی هێزی ئۆپۆزسیۆنی دەگرت، ئەو سیاسەتە دوفاقیەیان بوو کە لە لایەکەوە وەکو دەسەڵاتدار هەڵسوکەوتدەکەن و لەولایشەوە وەکو ئۆپۆزسیۆن خۆیان پیشاندەدەین. لە دەڤەری دەسەڵاتی پارتییدا، یەکێتیی وەکو ئۆپۆزسیۆن کاریدەکرد، خەڵکی ناڕازیی دەسەڵاتی لە خۆی کۆدەکردەوە. لە دەڤەری دەسەڵاتی یەکێتییدا، پارتیی وەکو ئۆپۆزسیۆن کاریدەکرد، خەڵکی ناڕازیی لە خۆی کۆدەکردەوە. ئەگەر سەیری کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی هەردوو حیزبی دەسەڵاتدار بکەیت، بە ئاسانیی ئەو ڕاستییەت بۆ ئاشکرادەبێت.

## ٤- سەرکوتکردن و پەراوێزخستنی حیزبەکان:

دوای ئەوەی ڕژێمی بەعس ڕوخا، ئەمریکا کۆنترۆڵی حوکمڕانیی عێراقی کرد، ئەمریکا سنووری بۆ هەلسوکەوتی حیزبە دەسەڵاتدارەکانی هەرێمیش دانا، بۆیە پارتیی و یەکێتیی نەیانتوانی شەڕی ناوخۆ بکەن و نەیانتوانی وەکو جاران ڕووبەڕووی حیزبەکانی تری باشووری کوردستان و کەسایەتییە سیاسییەکان ببنەوە.

حیزبە دەسەڵاتدارەکان بەشی خۆیان فێڵ و پلانیان هەیە، ساڵی ٢٠٠٥ کاتێک پارتیی بینی یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان لە سنووری پارێزگای دهۆک گەشەدەکات، ڕێکخستنی جەماوەری پارتیی بارەگای لقی یەکگرتوویان داگیرکرد، بەرپرسی لقی یەکگرتوو چەندیین کادری تری یەگرتووی ئیسلامیی شەهید و برینداربوون و بارەگاکەیان سوتاند.

هەر لە هەمان ڕۆژدا ڕێکخستنەکانی پارتیی لە شەقلاوە و شوێنەکانی تر، پەلاماری بارەگاکانی تری یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستانیان دا و بارەگاکانیان سوتاندن و زیانێکی مەزنیان پێگەیاندن. کە ئەمریکییەکان سەرزەنشتی پارتییان کرد، پارتیی گوتی: ئەوە خەڵک ئەو کارەیکردووە و حیزب نەیکردووە.

پارتی چارەسەری دیموکراتی کوردستان (پ. چ. د. ک) ساڵی ٢٠٠٢ لە لایەن کۆمەڵێک کەسایەتیی سیاسیی ئاپۆچیی باشووری کوردستانەوە دامەزرا. کۆنگرەی دامەزراندنی لە چیاکانی کوردستان بەست، کۆنگرەی دووەمی لە بەغدا بوو. کۆنگرەی

سێیەم و چوارەمی لە شاری کەرکوکی ژێردەسەڵاتی ئەمریکادا بوو. دەسەڵاتی هەرێم ڕێگەینەدا یەک کۆنگرەی لە سنووری دەسەڵاتیدا ببەستێت. دەسەڵاتی هەرێم مۆڵەتی فەرمییان بە (پ. چ. د. ک) نەدا هەتا وەکو حیزبێکی سیاسیی کار و چالاکیی خۆی بەڕێوەببات. لە کاتی هەڵبژاردنەکاندا حکومەتی عێراق مۆڵەتیدەدا وەکو لیستێکی دانپێدانراو بەشداریی هەڵبژاردن بکات، بەڵام دەسەڵاتی هەرێم ڕێگەینەدەدا (پ. چ. د. ک) بەشداریی هەڵبژاردنی هەرێمی کوردستان بکات.

ناڕەزایی خەڵکی کوردستان بەرانبەر بە دەسەڵات هەتا دەهات پەرەیدەسەند، بۆ ڕێکخستنی ئەو ناڕەزاییەی خەڵک لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٦دا، پارتی چارەسەری دیموکراتی کوردستان، بزوتنەوەی دیموکراتی کوردستان، حیزبی ڕزگاریی کوردستان و کۆمەڵێک کەسایەتیی تری سەربەخۆ، بەرەیەکی ئۆپۆزسیۆنیان بە ناوی: (بەرەی گۆڕان) پێکهێنا. پارتیی و یەکێتیی بە هەموو توانای خۆیانەوە دژایەتیی ئەو بەرەیەیان دەستپێکرد، هەتا وایلێهات بەرە خۆی سڕکرد.

پارتیی و یەکێتیی کە بینییان خەریکە ئۆپۆزسیۆن سەرهەڵدەدات، ئەمریکایش دەسەڵاتداری عێراقە و ناتوانن وەکو جاران شەڕی ئۆپۆزسیۆن بکەن، بۆ ڕێگەگرتن لە گەشەکردنی ئۆپۆزسیۆن ساڵی ٢٠٠٧ ڕێککەوتنێکی ستراتیژان (کۆنفیدراڵی خێڵەکی) واژۆکرد، بەگوێرەی ئەو ڕێککەوتنە، هەردوو حیزبی دەسەڵاتدار وەکو برا دەسەڵات و داهاتی کوردستان لە ناو خۆیاندا دابەشدەکەن، ڕێگەنادەن هیچ هێزێکی تر، دەسەڵاتی باشووری کوردستان بەدەستەوەبگرێت.

لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠٦ و هەتا ناوەڕاستی ساڵی ٢٠٠٩، بزوتنەوەی گۆڕان وەکو هێزێکی ئۆپۆزسیۆنی باشووری کوردستان دەرکەوت، فراکسیۆنی گۆڕان و فراکسیۆنی کۆمەڵی ئیسلامیی و یەکگرتووی ئیسلامیی پەرلەمانی کوردستان لە ٢٠٠٩ – ٢٠١٣ بەشداریی پێکهێنانی کابینەی حکومەتی هەرێمیان نەکرد، لە پەرلەمان مانەوە و وەکو ئۆپۆزسیۆن خۆیان ڕاگەیاند.

بۆ ماوەی چوار ساڵ هەر سێ حیزب وەکو ئۆپۆزسیۆنی دەسەڵاتی پارتیی و یەکێتیی مانەوە، لەو ماوەیەدا ڕەخنەی جدییای ئاراستەی حوکمڕانیی هەرێم دەکرد، داوای چاکسازیی و گۆڕانکارییاندەکرد. گوشاریان لەسەر دەسەڵات دادەنا،

چەوسانەوە و نادادپەروەریی دەسەڵاتیان سنووردارکرد. گرنگترین ڕوداوی سەردەمی ئۆپۆزسیۆنی هەرێم، خۆپیشاندانی ١٧ی شوبات و ڕۆژانی دوایی بوو، کە لە ١٧/ ٢ هەتا ٢١/ ٤/ ٢٠١١ بەردەوامبوو. لەو کاتەدا پارتیی بەرنامەی پەلاماردانی گۆڕانی ئامادەکرد، بەڵام ئەمریکییەکان و بەشێک لە بەرپرسانی یەکێتی، ڕێگەیاننەدا پارتیی پەلاماری مەکۆی سەرەکیی بزوتنەوەی گۆڕان بدات.

دوای دروستبوونی ئۆپۆزسیۆنی فەرمیی لە هەرێمی کوردستاندا، پارتیی و یەکێتیی دەستیان بە دژایەتیی ئۆپۆزسیۆن کرد، نانی سەدان گۆڕانخوازانیان بڕی و لە دادگا حیزبیەکەی هەرێمدا، سکاڵایان لەسەر ڕۆژنامەنوسان و کەسانی ئۆپۆزسیۆن زۆرتر کرد. لە ڕێگەی ڕاگەیاندنی سێبەرەوە هەوڵی سوککردنی ئۆپۆزسیۆنیان دەستپێکرد و لە پەرلەمان بۆچوونی فراکسیۆنی ئۆپۆزسیۆنیان فەرامۆشدەکرد.

ئامانجی حیزبە دەسەڵاتدارەکان لەم سیاسەتەدا ئەوە بوو ئۆپۆزسیۆن سەرکوتبکەن، یان دەستەمۆیبکەن. بەو شێوەیە دەبینین دەسەڵاتی باشووری کوردستان دیاردەی فرەحیزبیی و ئۆپۆزسیۆنبوون وەکو میکرۆبی نەخۆشیی سەیردەکات و هەوڵی کوشتنی دەدات. هەتا چوار ساڵ ئۆپۆزسیۆنی فەرمیی لەسەر کار و چالاکیی بەردەوامبوو، لەو چوار ساڵەدا خەریکبوو بنەماکانی دیموکراسیی و دادپەروەریی کۆمەڵایەتیی لە هەرێمدا سەرهەڵبدەن، بەڵام ئۆپۆزسیۆنی هەرێم بەرگەی گوشار و سەرکوتکردنی دەسەڵاتی نەگرت، زوو ماندوو بوو. دوای هەڵبژاردنی پەرلەمانی ساڵی ٢٠١٣ هەرێم، بزوتنەوەی گۆڕان لەگەڵ پارتیی ڕێککەوتنی ١٧/ ٤/ ٢٠١٣ی ئیمزاکرد و بەشداریی کابینەی حکومەتی هەرێمی کرد. لە لایەکی تریشەوە بزوتنەوەی گۆڕان لەگەڵ یەکێتیی ڕێککەوتنی دەباشانی ئیمزاکرد. کە گۆڕان لەگەڵ حیزبە دەسەڵاتدارەکان ڕێککەوت، یەکگرتوو و کۆمەڵیش بەدوایداچوون و دەستیان لە ئۆپۆزسیۆنبوون هەڵگرت.

### ٥- ئۆپۆزسیۆن ئۆپۆزسیۆن دەخوات:

هەڵوێستی حیزبە دەسەڵاتدارەکان دەربارەی دروستبوون و چالاکیی ئۆپۆزسیۆن ڕونکرایەوە، ئاشکراکرا کە حیزبە دەسەڵاتدارەکان چۆن شەڕی سەرکوتکردن و لەناوبردنی ئۆپۆزسیۆن دەکەن، بەڵام ئەو حیزب و لایەنە سیاسییانەی کە بۆ ماوەیەک خۆیان وەکو ئۆپۆزسیۆن ڕادەگەیەنن و لە ڕێگەی ئۆپۆزسیۆن لادەدەن

و بەبێ گۆڕانکاریی لە سیستەمی حوکمڕانییدا بەشداریی حوکمڕانیی دەکەنەوە، هێندەی دەسەڵات زیان بە ئۆپۆزسیۆن دەگەیەنن.

ساڵی ٢٠٠٩ بزوتنەوەی گۆڕان وەکو حیزبێکی ئۆپۆزسیۆن دامەزرا، هیوای خەڵکی بۆ چاکسازیی و گۆڕینی سیستەمی حوکمڕانیی هەرێمی کوردستان گەشاندەوە. ئەو کەس و گروپانەی لە حوکمڕانیی هەرێم ناڕازیبوون لە دەوری گۆڕان کۆبوونەوە. بەرنامەی چاکسازیی و گۆڕانکاریی دانا، بەڵام بزوتنەوەکە پشودرێژ نەبوو، وەڵامی دەستوبردی بۆ سیاسەتەکانی دەسەڵات پێنەبوو، وەکو پێویست پێشبینیی بۆ ڕوداوەکانی ئایندە نەدەکرد، کادر و بەرپرسەکانی لەخۆباییبوون، نەک تەنها پەلاماری دەسەڵاتدارنیان دەدا، هەر ڕۆژنامەنوسێک، یان چالاکێکی مەدەنیی ڕەخنەی لە گۆڕان بگرتایە، لە دەسـەڵات توندتر و دوور لە ئاکاری سیاسیی و کۆمەڵایەتیی تومەتبارباندەکرد و وەڵامیاندەدایەوە. گۆڕان چوار ساڵ ئۆپۆزسیۆن بوو، پێش ئەوەی هیچ گۆڕانکارییەک لە سیستەمی حوکمڕانیی هەرێمدا بکرێت، پێش ئەوەی هەرێم دەنگ لەسەر دەستوورێکی دیموکراتیی بدات، پیش ئەوەی هێزی پێشمەرگە و ئاسایش یەکبگرنەوە و هێزێکی نیشتیمانیی پێکبهێنن، پێش ئەوەی دادگاکان سەربەخۆبکرێن، پیش ئەوەی داهاتی هەرێم ئاشکرابکرێت، بزوتنەوەی گۆڕان بەشداریی پێکهێنانی حکومەتی هەرێمی کرد و خۆی ڕادەستی دەسەڵات کردەوە و لەگەڵ پارتیی و یەکێتیی ڕێککەوت.

هەر کە گۆڕان بەشداریی حوکمڕانیی کرد، خەڵک پشتی لە گۆڕان کرد، دەسەڵاتیش بەوپەڕی تواناوە دەستی بە دژایەتیی گۆڕان و خەڵک کردەوە، کار بەوە گەیشت ڕێگریی لە سەرۆکی پەرلەمانی هەرێمی سەر بە گۆڕان کرا کە بەرەو هەولێر بچێتەوە، وەزیرەکانی گۆڕان لە کابینەی چوار دەرکران، گۆڕان نەیتوانی وەڵامێکی گونجاو بداتەوە. لە دوای کۆچی دوایی نەوشیروان مستەفای سەرۆکی بزوتنەوەی گۆڕان، بزوتنەوەکە بە تەواویی لاوازبوو، هەر جارەی لە یەکێک لە حیزبە دەسەڵاتدارەکانی هەرێم نزیکدەبێتەوە و لەگەڵیان ڕێکدەکەویت.

پێش دروستبوونی بزوتنەوەی گۆڕان پاشەکەوت و لێبڕینی موچە نەبوو، کابینەکانی حکومەتی پارتیی و یەکێتیی و گۆڕان پاشەکەوتی موچە و لێبڕینی موچەیان داهێنا، باج و خەراجیان لەسەر هاوڵاتییان زیادکرد.

لەبەرئەوەی بزوتنەوەی گۆڕان لە هێڵی گۆڕانکاریی و چاکسازیی لایدا، هەزاران ئەندام و کادر و بەرپرسی بزوتنەوەکە دەستیان لە گۆڕان کێشایەوە، خەڵکی کوردستان بڕوای بە گۆڕان نەما، خەڵک بڕوای بە ئۆپۆزسیۆن و گۆڕانکاریی و چاکسازییش نەما، هێندەی تر جولانەوەی ئۆپۆزسیۆنی هەرێم پاشەکشەیکرد و حیزبە دەسەڵاتدارەکان ئاهەنگی خنکاند و تارومارکردنی ئۆپۆزسیۆنیان گێڕا.

لە دوای ڕاپەڕینەوە هەتا ئەمڕۆ، (پ. ک. ک) و لایەنگرانی لە باشوور حیزبی سیاسیی دروستدەکەن و هەڵیدەوەشێننەوە، ئەوانەی کە بڕوایان بە هزری عەبدوڵڵا ئۆج ئالان هەیە و ئەوانەی بەشداریی خەباتی گەریلایی و جەماوەریی (پ. ک. ک) دەکەن، حیزبی سیاسیی دروستدەکەن، ئامانجی باشوورییەکان ئەوەیە جێگرەوەی پارتیی و یەکێتیی بن، ئۆپۆزسیۆنی هەرێم بن، بەڵام لە لایەکەوە دەسەڵاتی هەرێم دژی حیزبەکەیان دەوەستێتەوە و مۆڵەتی کار و چالاکییان پێنادات، ئەندام و کادر و سەرکردەکانیان شەهیددەکات، زیندانییدەکات، شاربەدەریاندەکات، لەولایشەوە (پ. ک. ک) کار و چالاکیی ئەم حیزبانە دیاریدەکات، سنووریان بۆ دادەنێت، ڕێگە نادات ئۆپۆزسیۆن بن.

لەپێناو بەرژەوەندیی نەتەوەییدا، بۆ ئەوەی پەیوەندیی (پ. ک. ک) و حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشوور زۆرتر تێکنەچێت، بۆ ئەوەی پارتیی و یەکێتیی زۆرتر لە تورکیا نزیکنەبنەوە، شەڕی براکوژیی دروستنەبێتەوە، (پ. ک. ک) لەسەر حیزبە نەتەوەییەکانی باشوور ناکاتەوە، لەسەر ئەوان خۆی لە پارتیی و یەکێتیی زویرناکات. ئەم سیاسەتەی دەسەڵاتی هەرێم و (پ. ک. ک) بەرانبەر بە ئاپۆچییەکانی باشوور و حیزبەکانیان، وای لەو پێکهاتە شۆڕشگێڕ و نەتەوەییەی خەڵکی باشوور کردووە، ڕەشبینبێت و لە سیاسەت دووربکەوێتەوە، ئەمەیش بە قازانجی دەسەڵات و بە زیانی ئۆپۆزسیۆن شکاوەتەوە.

## ٩- گەندەڵیی ناسنامەیە:

ئەو تاک و پێکهاتانەی گرنگیی بە دیاردەی گەندەڵیی دەدەن، لەپێناو کەمکردنەوەی گەندەڵییدا کاردەکەن، لەسەر پێناسی گەندەڵیی ڕێککەوتوون، کە بریتییە لەوەی مرۆڤ پلە و پایەی حکومیی و حیزبیی و یاسایی و کۆمەڵایەتیی خۆی لەپێناو بەرژەوەندیی تایبەتی خۆیدا بەکاربهێنێت.

گەندەڵیی دیاردەیەکی جیهانییە، تەنها لە سیستەمی حوکمڕانیی هەرێمی کوردستاندا بڵاونەبووەتەوە، لە سەرتاسەری جیهاندا وەکو گەنەی بەرهەنگڵی دەسەڵاتی لێهاتووە. لە سەرتاسەری جیهاندا کار بۆ کەمکردنەوە و سنووردارکردنی گەندەڵیی دەکرێت، بەڵام لە هەرێمی کوردستان هەتا ئێستا بە جدیی کار بۆ بەگژداچوونەوەی گەندەڵیی نەکراوە.

هەتا ئەمڕۆ لە هەرێمی کوردستان کەسێک لە ئاستی بەرپرسیارێتییدا (وەزیر، پەرلەمانتار، دادوەر) لەسەر کەمتەرخەمیی و فەرامۆشکردنی ئەرک و گەندەڵیی سزا نەدراوە، کەسێکیش لەسەر ئەوەی لە کاردا شکستیهێنابێت دەستی لە کارەکەی نەکێشاوەتەوە.

## جۆرو هۆکاری گەندەڵی:

### ١- دیاری بەرتیل:

سەرهەڵدان و بڵاوبوونەوەی گەندەڵیی هۆکاری ڕۆشبیریی هەیە، لاوازیی هۆشیاریی تاک و پێکهاتەکانی کۆمەڵگە کە بە باشیی لە ئەرک و مافەکانی خۆیان تێناگەن، نازانن مافیان چییە و ئەرکیان چییە، نازانن کامە ئەرکی دەسەڵاتە و دەبێت بۆ خەڵکی بکات، وای لە تاکی کورد کردووە کاتێک مافێکی لە دەسەڵات وەردەگرێت، وادەزانێت دەسەڵات خێرییپێدەکات، کاتێک دەسەڵات مافیان زەوتدەکات، وادەزانن زوڵمیان لێنەکراوە، هیچ پەرچەکردار و هەڵوێست پیشاننادەن. ئیتر دەسەڵات سواری ملی خەڵک دەبێت، گەندەڵیی و زوڵمی کۆمەڵایەتیی پەردەسێنێت.

کاتێک هاوڵاتییەک ڕوو لە دەرگای دەزگایەکی حکومیی دەکات، بەو تێگەیشتنەوە ناچێتە پێشەوە کە مافی خۆیەتی لەو دەزگایەدا کارەکەی بۆ ڕاپەڕێنرێت و خزمەتبکرێت، هاوڵاتییەکە وای بۆ دەچێت ئەگەر کارمەندەکە کارەکەی ڕاپەڕاند، قەرزاریکردووە و دەبێت پاداشتیبداتەوە، بۆیە بەرانبەر بە جێبەجێکردنی کارەکەی، هاوڵاتییەکە دیارییەک پێشکەشی کارمەندەکە دەکات. لێرەوە دیاردەی بەرتیلخواردن دروستدەبێت. لەولایشەوە کارمەندی حکومیی تێناگات ئەرکی سەرشانی ئەوەیە کاری هاوڵاتییان ڕاپەڕێنێت، وای بۆ دەچێت دەبێت لە بەرانبەر ئەنجامدانی کاردا

سوپاس و پاداشتی مادیی وەربگرێت. بۆیە کاتێک هاولاتییەکە دیاریی پێشکەشدەکات، کارمەندەکە بە مافی خۆی دەزانێت دیاریی وەربگرێت، یان هەندێک جار کارمەند کارەکانی هاولاتیی ئەنجامنادات هەتا دیاریی وەرنەگرێت، یان هەتا کەسێکی ناسراو و دیار داوا لە کارمەند نەکات کاری هاولاتیی ئەنجامبدات، کارەکە ئەنجامنادات.

## ٢- مەکتەبی کاروباری کۆمەلایەتیی:

دەسەلات پشتگیریی هەموو کار و ئاکارێکی کۆمەلگەی کلاسیک دەکات، هەر حیزبە و مەکتەبێکی کۆمەلایەتیی داناوە، لە تەنیشتی دادگاکانی کوردستانەوە کێشەی خەلک چارسەردەکات، چەندیین کێشەی کۆمەلایەتیی هەن، لەبریی ئەوەی لە ڕێگەی دادگاوە بە شێوازێکی یاسایی چارەسەربکرێن، لە ڕێگەی مەکتەبی کۆمەلایەتیی و خێلەکیی سەر بە حیزبەوە چارەسەردەکرێن.

کاری ئەم مەکتەبانە ئەوەیە هێزی سەرۆک_خێل و سەرۆک_بنەمالە و بەرپرسەکانی حیزب بەسەر خەلکی کوردستاندا زالبکات. لە ڕۆژنامەی هاولاتیی، ژمارە (٦٥١)ی ڕۆژی ٤/ ٨/ ٢٠١٠ بە مانشێتی: «بە بڕیاری مەسعود بەرزانیی شێخێک زیاتر لە دوو هەزار دۆنم زەوی داگیردەکات» هەوالێک بلاوبوویەوە. ئەگەر بە وردیی دوای هەوالەکە بکەوێت، دەبینیت چۆن بەشی کاروباری کۆمەلایەتیی حیزب شوێنی یاسا و دادگای گرتووەتەوە. ئەمەیش درێژەی هەوالەکەیە: «ژمارەیەک جوتیاری ناوچەی زینۆ لە قەزای چۆمان شێخێک بەوە تومەتباردەکەن، کە بە بڕیاری بەرزانیی دەستی بەسەر زیاتر لە دوو هەزار دۆنم زەوی ٦٦ جوتیاردا گرتووە. بەپێی بڕیاری ژمارە (١٦٩٠ سالی ١٩٧٠) ئەنجومەنی بالای کشتوکالی عێراقیی ١٧ دۆنم زەوی داوەتە هەر یەک لەو ٦٦ جوتیارەی ناوچەکە. شێرزاد ئاغا عەبدوللا یەکێک لە جوتیارەکان بە هاولاتیی گوت: ئەو زەوییانە تاپۆیان هەیە و بە ناوی ٦٦ جوتیاری ئەم ناوچەیەوە تۆمارکراون،بەلام لە دوای ڕاپەڕیینەوە لە لایەن شێخ مستەفای زینۆکییەوە دەستیبەسەرداگیراوە. ناوبراو ئەوەیشی خستەڕوو، کە چەند جارێک سەردانی مەکتەبی کۆمەلایەتیی پارتیی و نیهاد بەرزانییان کردووە، بەلام پێیانگوتوون ئەو زەوییانە بە بڕیاری مەسعود بەرزانیی دراوە بە شێخ مستەفا. لەم بارەیەوە دیاب عەلی کارگێڕ و لێپرسراوی بەشی زەوی و زار لە مەکتەبی کۆمەلایەتیی پارتیی

له لێدوانێکیدا به هاوڵاتیی گوت: ئەو کێشەیە ڕاستەخۆ بەستراوەتەوە بە سەرۆکی هەرێم و کاک نیهاد بەرزانییەوە. ناوبراو ئاماژەی بەوەیش دا کە بۆ ئەو مەبەستە چاوەڕێی گەڕانەوەی نهیاد بەرزانیی دەکەن لە ئەلمانیا، بۆ ئەوەی لەگەڵ سەرۆکی هەرێم دابنیشن و کێشەکە چارەسەربکەن. ئەو بەرپرسەی پارتیی هەرچەندە پێیوابوو جوتیارەکان مافی خۆیانە و پتشگیرییاندەکەن، بەڵام شێخ مستەفایش خاوەنی شەهیدە و خەڵکی ئەو ناوچەیە و دۆستایەتیی نزیکیشی لەگەڵ بەرزانییەکان هەیە، بۆیە دەبێت باڵانسێک لە نێوان هەردوولا ڕبگرین»

سەیربکەن کە چۆن بەرپرسەکانی باشووری کوردستان زەوی لە دەستی جوتیار وەردەگرن و دەیدەنە ئاغا و شێخ! سەیربکەن چۆن لە سایەی حکومەتی هەرێمدا مەکتەبی کۆمەڵایەتیی حیزب بە قازانجی سەرۆک_خێڵ و ئاغا دەست دەخاتە ناو کاروباری وەزارەتی کشتوکاڵ و یاسای وڵاتەوە بڕیارەکانی حکومەت پێشێلدەکات.

خەڵکی کوردستان هەتا ئێستا لە ئاستی ڕۆشنبیریی گشتیی و ڕۆشنبیریی یاساییەوە بەو ئاستە نەگەیشتووە هەست بە مەترسیی ئەم دامودەزگا کۆمەڵایەتییانەی حیزب بکەن و دژیان بوەستێتەوە، لەبەر ئەوەیە لە ڕێگەی مەکتەبەکانی کۆمەڵایەتیی پارتیی و یەکێتییەوە چەندین کاری نایاسایی دەکرێت. کارە نایاساییەکانیش لە بەرژەوەندیی لایەنە دەسەڵاتدارەکان و ئەو کەسانەدایە کە دۆست و لایەنگری حیزبە دەسەڵاتدارەکانن و لە ناو پێکهاتەکانی کۆمەڵگەی کلاسیکدا پێگەی کۆمەڵایەتیی و سیاسییان هەیە.

ئەو توێژە کۆمەڵایەتییەی هەست بە مەترسیی دامودەزگاکانی کاروباری کۆمەڵایەتیی دەکات، یاساناسان و دادوەرانی باشووری کوردستانن، ئەوانیش بەرانبەر بەو دیاردە نایاسایی و نادادپەروەرییانەی دەسەڵاتی باشووری کوردستان، هەڵوێستی جدیی پیشاننادەن و سنوورێک بۆ گەندەڵییەکانی دەسەڵات دانانێن.

## ٣- دەسەڵات و گەندەڵی:

دەسەڵاتدارانی باشووری کوردستان بە ئەرکی خۆیانی نازانن دەرفەتی کار بۆ هاوڵاتییانی هەرێمی کوردستان بڕەخسێنن، بەبێ بەرانبەری سیاسیی (پشتیوانیی

حیزبی) و خێڵەکیی و مادیی، گەنجانی هەرێم دانامەزرێنن. ئەوەی حیزبیی نەبێت، یان ناسراوێک پشتگیریی نەکات، لە دامودەزگاکانی هەرێمی کوردستان کاری پێنادرێت.

لە سەرتاپای جیهاندا ئەو تاکانەی دەسەڵات بەدەستەوەدەگرن، دەبێت کەسانی دڵسۆزی گەل و نیشتیمان بن، لە کەسە شارەزا و بەتواناکانی کۆمەڵگە بن، باش هەست بە ئەرکی خۆیان بکەن، باش مافەکانی خەڵک بپارێزن، دەبێت ئەو تاکە دەسەڵاتدارانە بۆ کەمکردنەوە و بنبڕکردنی دیاردەی گەندەڵیی کاری جدیی بکەن، لە ڕێگەی دامودەزگاکانی ڕاگەیاندن و دەزگای ڕۆشنبیریی گشتییەوە، خەڵک بە ئەرک و مافەکانی خۆی شارەزابکەن، وا لە تاک بکەن بەرانبەر بە مافەکانی بەئاگابێت و داکۆکیی لە خۆی بکات و کەس نەتوانێت مافەکانی پێشێلبکات. ئەرکی بەرپرسانی باڵای وڵاتە، کارمەند و بەرپرسانی ناو دامودەزگاکانی دەسەڵات سەبارەت بە ئەرکەکانیان پەروەردەبکەن و بیانەکەنە خاوەنی کۆمەڵێک ڕێسا و بەهای بەرز، هەتا بە شێوەیەکی ڕاست کارەکانیان ئەنجامبدەن. ئەرکی دەسەڵاتدارانە سکی بەرپرسان و کارمەندانی دامودەزگاکانی دەوڵەت تێربکەن، بۆ ئەوەی چاویان لە پارووی دەمی جەماوەر نەبێت. بەڵام دەسەڵاتی باشووری کوردستان لەو بوارەدا بە ئەرکی خۆی هەڵنەستاوە و دژی دیاردەی گەندەڵیی هیچ جۆرە پەروەردەیەکی کۆمەڵگەی نەکردووە. هیچ دەزگایەکی حیزبیی و حکومیی لە هەرێمی کوردستان، خەڵک و کارمەندەکانی حکومەتی هەرێمی بەرانبەر بە ماف و ئەرکەکانیان پەروەردەناکات. تەنها پێوانەیەک بۆ مافوەرگرتن و مافپاراستن و کارکردن، حیزبییبوونێکی کوێرانەیە.

### ٤- کەناڵەکانی ڕاگەیاندن:

لە ئاستی پەروەردە و هۆشیارکردنەوەی خەڵک و کارمەند و بەرپرساندا، کەناڵەکانی ڕاگەیاندن کەمتەرخەمن، کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی هەرێمی کوردستان سەربەخۆ نین و کەناڵی ڕاگەیاندنی حیزبین، پڕوپاگەندە بۆ حیزب و بەرپرسەکانی حیزب دەکەن، هەواڵی وروژێنەر بڵاودەکەنەوە، پەروەردەکردن و هۆشیارکردنەوەی خەڵکی کوردستان بە ئەرکی خۆیان نازانن، بۆیە لە دوای ڕاپەڕینەوە هەتا ئەمڕۆ،

گۆڕانکارییەکی ئەوتۆ لە هزری تاک و کۆمەڵگە بەرانبەر بە ماف و ئەرک، بەرانبەر بە دیاردەی گەندەڵیی و کاریگەرییە خراپەکانی بەدیناکرێت. بەو شێوەیە دەتوانین بڵێین کە ڕاگەیاندنی کوردییش بەرانبەر بە دژایەتییکردنی گەندەڵیی نەک هەر ئەرکی خۆی ئەنجامنەداوە، بەڵکو ئاسانکاریی بۆ تەشەنەکردنی گەندەڵیی کردووە.

**٥- دەستەی دەستپاکیی:**

دەبێت دەسەڵاتی یاسادانان کۆمەڵێک یاسای تایبەت بە دژایەتیی گەندەڵیی دەربکات، دەزگای تایبەت بە دژی گەندەڵیی ئاوابکات (دروستبکات)، وەکو دەستەی سەربەخۆی دەستپاکیی. ئەو دەستەیە دەبێت سەربەخۆ بێت و تەنها پەرلەمان بۆی هەبێت لێیبپرسێتەوە. لە ناو پەرلەمانیشدا دەبێت لێژنەیەکی تایبەت بە دەستپاکیی پێکبهێنرێت و چاودێریی کارەکانی حکومەت و دەستەی دەستپاکیی بکات.

لە ماوەی سیی ساڵی ڕابردووی دەسەڵاتی هەرێمی کوردستاندا، بە یاسا و بە بڕیار و بە پێکهێنانی دەزگای تایبەت، گەندەڵیی سنووردارنەکراوە.

دەسەڵاتی هەرێم ئاستەنگیی بۆ کارەکانی دەستەی دەستپاکیی عێراقیش دروستدەکات، ئەو بەرپرسە عێراقییانەی کە بە گەندەڵیی تۆمەتباردەکرێن و بڕیاری دەستگیرکردنیان بۆ دەردەچێت، بەرەو هەرێمی کوردستان هەڵدێن و لە لایەن دەسەڵاتی هەرێمەوە داڵدەدەدرێت و دەپارێزرێن*١٥. ئەو بەرپرسانەی هەرێمی کوردستان کە گەندەڵیی و دزییان لێ ئاشکرادەبێت، دەزگاکانی پۆلیس و ئاسایش دەستگیریان ناکەن و دەرفەتی هەڵهاتنیان بۆ دەڕەخسێنن*١٦.

ساڵی ٢٠١٠ لێژنەی دەستپاکیی پەرلەمانی هەرێمی کوردستان دروستکرا، لەم ساڵانەی دواییشدا لێژنەی دەستپاکیی هەرێمی کوردستانیش دروستکرا، بەڵام خەڵکی کوردستان بەرانبەر بە لێژنەی دەستپاکیی پەرلەمان ڕەشبینە، لەبەرئەوەی ئەندامپەرلەمانەکان زۆر حیزبیین، کار بۆ حیزبەکەیان دەکەن کە گەندەڵییکردووە، کار بۆ خەڵک ناکەن. خەڵکی کوردستان بەرانبەر بە لێژنەی دەستپاکیی هەرێمیش ڕەشبینە، لەبەرئەوەی حیزبە دەسەڵاتدارەکان ئەندام و بەرپرسی لێژنەکە دیاریدەکەن. ئیتر ئەو لێژنەیە بە گەندەڵە گەورەکان ناوێرێت، ئەو لێژنەیە بە تەنها دەتوانێت سزای گەندەڵە بچووکەکان بدات.

## ٦- چاودێریی دارایی:

لە ساڵانی ڕابردوودا دەزگای چاودێریی دارایی لە سنووری دەسەڵاتی ئیدارەی سلێمانییدا ڕاپۆرتی چاودێریی دارایی پێشکەشی پەرلەمان و لێژنەی دەستپاکیی هەرێم کرد. ڕاپۆرتەکان زانیاریی باشیان لەسەر گەندەڵیی دارایی و دەستبەسەرداگرتنی سامانی حکومەت تێدایە، بەڵام لەبەرئەوەی ئەو دەزگایانە لە لایەن حیزبەوە دەستنیشانکراون، حیزبیش لە گەندەڵییەکان بەرپرسە، نە پەرلەمان و نە دەزگای دەستپاکیی لەسەر گەندەڵیی و بەفیڕۆدانی سامانی وڵات هێچیان پێنەکرا، چاودێریی داراییش بێدەنگیی هەڵبژارد.

مام جەلال مانگانە و ساڵانە بە چەندیین کەسایەتیی و دەزگای حیزبیی و حکومیی پارەی دەبەخشی، چاودێریی دارایی لەسەر خراپ_خەرجکردنی ئەو بەخشیشانە ڕاپۆرتی دەنوسی، بەڵام لەسەر ئەوە ڕاپۆرتی نەدەنوسی کە بە کام یاسا مام جەلال پارە بەو دەزگایانە دەبەخشێت و سەرچاوەی پارەکە چییە؟

لەسەر دیارنەمانی سەدان هەزار دۆلاری پارەی حکومەت و پارەی وشکەساڵیی پارێزگاکانی هەرێم، ساڵی ٢٠٠٩ دەزگای چاودێریی دارایی ڕاپۆرتی نوسی، داواکاری گشتیی سلێمانیی سکاڵای لەسەر جێگری سەرۆکی حکومەت و پارێزگاری سلێمانیی تۆمارکرد، لەبەرئەوەی دەسەڵاتی دادوەرییش سەربەخۆ نەبوو، جارێکی تر سکرتێری گشتیی یەکێتیی کەیسی دادگاییەکەی داخست.

## ٧- ئاین و ئاکار:

ڕەوشت، یان ئاکار، یان ئەخلاق، بە پایەیەکی گرنگی سنووردارکردن و کزکردنی گەندەڵیی دەژمێردرێت، ئاین بە سەرچاوەی ڕەوشتی تاک و کۆمەڵی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەژمێردرێت. لە دوای ڕاپەڕینەوە هەتا ئەمڕۆ هێزە سیاسییەکانی باشووری کوردستان دژایەتییەکی بەردەوامی هەموو پایەکانی ئاین دەکەن، بە لایەنی ڕەوشتییشەوە، بەبێ ئەوەی بە لایانەوە گرنگ بێت بەم کارەیان ڕەوشتی مرۆڤی کورد لاوازدەکەن، لە دژایەتییکردنی ئاینی ئیسلامدا هیچ هەوڵێکیان بۆ پاراستنی ئەو ڕەوشتە نەداوە، کە ئیسلام لە ناخی تاک و کۆمەڵی کورددا چاندوویەتی.

که دژایەتیی ڕەوشتی ئاینیی دەکەن، هەوڵیاننەداوە ڕەوشتێکی نوێی نەتەوەیی، یان دیموکراتیی لە کۆمەڵگەی کوردستاندا پێشبخەن، هەتا شوێنی ئەو ڕەوشتە بگرێتەوە کە ئاینی ئیسلام لە ناخی تاکی کورددا چاندوویەتی، هەتا ئەو ڕەوشتە نوێیە ببێتە کەلتوری تاکی هەرێمی کوردستان و بەرەو چاکە هانیبدات و لە خراپەکاری دووریبخاتەوە. ئەو تاک و پێکهاتانەی خاوەنی ئیمان و ئایدۆلۆژیایەکی تایبەتی خۆیان بن، خاوەنی ڕەوشتی تایبەتی خۆیانن، ئەو ڕەوشتە لە گەندەڵیی دووریاندەخاتەوە. ڕێکخراوە سیاسییە ئیسلامییەکانی هەرێمی کوردستان یەکێک لەو پێکهاتە سیاسییانەن، کە بە کەمیی لە دیاردەی گەندەڵییەوە گلاون، هۆکارەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەو ڕێکخراوانە وەکو تاک و کۆ، خاوەنی ڕەوشتێکی کۆمەڵایەتیی وەهان لە گەندەڵیی دووریاندەخاتەوە.

هێزە دەسەڵاتدارەکانی هەرێمی کوردستان چەندە دژایەتیی ئاین دەکەن، هێندەیش دژایەتیی ئایدۆلۆژیا و بیروباوەڕی سیاسیی دەکەن. بەردەوام پڕوپاگەندە دەکەن، کە سەردەمی ئایدۆلۆژیا و بیروباوەڕی سیاسیی بەسەرچووە. ئەم جۆرە پڕوپاگەندانە مەبەستی سیاسیی هەیە، ئامانج ئەوەیە کە خەڵک بە هزر و بیرکردنەوە شارەزا نەبێت، فێری سیاسەت و ڕەوشتی نوێ نەبێت، بۆ ئەوەی کۆمەڵگە بە دواکەوتوویی بمێنێتەوە، هەتا بە ئاسانیی سواری ملی ببن.

پارتی کرێکارانی کوردستان (پ. ک. ک) لە ماوەی ٤٠ساڵی خەباتی سیاسیی و دیبلۆماسیی و سەربازییدا، دوچاری کەمترین گەندەڵیی بووەتەوە، لەبەرئەوەی خاوەنی ڕەوشتێکی تایبەتی کوردانەیە، کە لە ڕێگەی ئایدۆلۆژیاکەیەوە لە ناخی ئەندام و لایەنگرانیدا جێگیریکردووە. لەبەرئەوەی حیزبی شیوعیی عێراق و حیزبی شیوعیی کوردستان بیروباوەڕیان هەیە، ڕەوشتی تایبەتی خۆیان هەیە، دەستدرێژیی بۆ سەر ماڵ و موڵکی خەڵک و دەوڵەت ناکەن، کەمترین گەندەڵییان هەیە.

## ٨- ناڕونیی داهات:

لە ماوەی ٣٠ ساڵی حوکمڕانیی باشووری کوردستاندا، بێجگە لە ژمارەیەکی کەمی دەسەڵاتدار، هیچ تاکێکی هەرێمی کوردستان نازانێت داهاتی هەرێم چەندە، چۆن دابەشدەکرێت، ئاشکرا نییە. ئەمەیش گەورەترین پێوانەی گەندەڵیی هەرێمی کوردستانە.

له دوای ڕاپەڕینەوە پەرلەمانی هەرێم دەزگایەکی کاریگەر نەبووە، نەیتوانیەوە لە سەرچاوەکانی داهات و شێوازی کۆکردنەوە و بنەمای دابەشکردنی داهاتی هەرێم بپێچێتەوە. هەردوو کەسی دەسەڵاتداری یەکەمی پارتیی و یەکێتیی مافی ئەوەیان هەیە چۆنیان بوێت سود لە داهاتی هەرێم وەربگرن، بەبێ ئەوەی لە کۆکردنەوە و خەرجکردنی ئەو داهاتەدا پشت بە هیچ یاسایەک ببەستن، تەنها شتێک کە ئەو مافەی بە ئەوان داوە سەرۆک و سکرتێری حیزبە دەسەڵاتدارەکانن.

پەرلەمانی هەرێمی کوردستان چەندین یاسای دەرکردووە، یاسای کۆمەڵە و سەندیکا و یاسای حیزبە سیاسییەکان، بەگوێرەی ئەو یاسایانە دەبێت حکومەت هاوکاریی مانگانەی ئەو لایەنانە بکات کە یاساکە دەیانگرێتەوە، بەڵام حیزبە دەسەڵاتدارەکان داهاتی هەرێم ناخەنە بەردەستی حکومەت، هەتا حکومەت هاوکاریی مادیی ئەو لایەنە سیاسیی و جەماوەرییانە بکات، حیزبە دەسەڵاتدارەکان داهاتی هەرێم دەخەنە ژێردەستی خۆیان، ئەمە جۆرێکی تایبەتی گەندەڵیی ئابوریی و سیاسیی هەرێمی کوردستانە کە حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشوور دایانهێناوە، کە لە جیهاندا نمونەی نییە. بە سیمایەکی سیستەمی سیاسیی هەرێمی کوردستان دادەنرێت.

### ٩- بودجەی عێراق:

له دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدامەوە هەتا ساڵی ٢٠١٤، هەرێمی کوردستان لە ١٧٪ بودجەی عێراقی وەردەگرت، شێوازی خەرجکردنی ئەو بودجەیە بۆ پەرلەمانی هەرێمی کوردستانیش ڕوون نەبوو، لە سێبەری ئەو داهاتە زۆرەدا، خەڵکی هەرێمی کوردستان ڕۆژانە لەبەر نەبوون و کەمیی خزمەتگوزاریی سەرەتایی وەکو تەندروستیی، ئاو، کارەبا، تەلەفۆن و ڕێگەوبان دەیانناڵاند.

ئەو بودجە گەورەیە و ئەو کێشە سەرەتاییانەی خەڵکی کوردستان، ساغیدەکاتەوە کە دەسەڵاتدارانی هەرێمی کوردستان بەرانبەر بە گەلەکەی خۆیان ئەرکی سەرشانیان جێبەجێناکەن. ئەمە گەندەڵییەکی زۆر گەورە و لەبەرچاوە، نەک هەر لە ڕووی خزمەتگوزارییەوە زیانی بە گەلی کورد گەیاندووە، لە ڕووی سیاسییشەوە ئەزموونی هەرێمی کوردستانی لەکەدارکردووە.

بەهۆی سیاسەتی ئابوریی سەربەخۆی هەریمەوە، بەهۆی ئەوەوە بەبێ ئاگاداریی عێراق ڕێککەوتنی ئابورییان بۆ دەرهێنان و بە بازاڕکردنی نەوت لەگەڵ تورکیا و کۆمپانی بیانییەکاندا ئیمزاکرد، حکومەتی عێراقی ناوەندیی لە ساڵی ٢٠١٤ بەشە بودجەی هەرێمی کوردستان نانێرێت، عێراق بە هەرێم دەڵێت یان خۆت لە داهاتی خۆت موچەی کارمەندان بدە، یان داهاتی نەوت ڕادەستی عێراق بکە تا بەشە بودجەی هەرێم بنێرین. حکومەتی هەرێم هیچ کامیان ناکات، لەو کاتەوە دواکەوتنی موچە، پاشەکەوتی موچە، لێبڕینی موچە، بە سیمایەکی تری گەندەڵیی دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان دەژمێردرێت.

## ١٠- موچە و بەرهەمهێنان:

ئەرکی دەسەڵاتە هاوڵاتییانی هانبدات بۆ ئەوەی کاربکەن و بەرهەم زیادبکەن، ئەرکی دەسەڵاتە کار بۆ هاوڵاتییانی بدۆزێتەوە، دەسەڵاتدارانی هەرێمی کوردستان دەستیان بەسەر سەرچاوەی داهاتی وڵاتدا گرتووە، بە شێوەیەکی نایاسایی بڕێکی بەو کەسانە دەدەن کە پشتیوانیی دەسەڵات و حیزبەکەیان دەکەن. پێیڕادەگەیەنن کارنەکات حیزب ژیانی ئەو دەبیندەکات. بەم شێوەیە خەڵکی کوردستان لە بەرهەمهێنان دووردەخەنەوە، فێری تەمەڵیی و سواڵی حیزبی دەکەن. ئەمەیش دیاردەی گەندەڵیی لە هەرێمی کوردستاندا فراوانتر دەکات.

ئەو بڕە موچانەی حکومەتی هەرێمی کوردستان بۆ کارمەندانی هەرێمی بڕیوەتەوە، بەشی نیوەی ژیانی مانگێکی موچەخۆر ناکات، بۆیە بۆ دابینکردنی ژیانی سەرتاپای مانگەکە، کارمەند بیر لە شێوازی تری دابینکردنی داهات دەکاتەوە. یەکێک لەو شێوازانە پەنابردنە بۆ گەندەڵیی لە شوێنی کاردا، یان خۆهەڵواسین بە یەکێک لە حیزبەکاندا، بۆ ئەوەی بژێویی خۆی و خێزانەکەی پێ تەواوبکات. بەوەیش هێندەی تر دیاردەی گەندەڵیی زیاددەکات و دەبێتە سیمای زەقی سیستەمی سیاسیی هەرێمی کوردستان.

دیاردەیەکی تری هەڵە کە گەندەڵیی هەرێمی کوردستانی زۆرکردووە، فرەموچییە، مرۆڤی وا هەیە لە یەک کاتدا چەند موچەیەک وەردەگرێت، موچەی فەرمانبەریی، موچەی شەهیدانە، موچەی حیزب. ساڵی ٢٠٠٧ لە ڕاپۆرتێکی چاودێریی دارایی ئیدارەی سلێمانیی حکومەتی هەرێمدا ئاشکرابوو، کە بەرپرسە باڵاکانی حیزب و حکومەتی سلێمانیی لە

یەک کاتدا هەر یەکە و چەند موچەیەک وەردەگرن، موچەی پەرلەمان، موچەی حکومەت، موچەی حیزب، موچەی حکومەت و پەرلەمانی هەرێم و موچەی حکومەت و پەرلەمانی عێراق. ئەمە بە خۆی ڕاستەوخۆ گەندەڵییەکی ئاشکرا و حاشالێنەکراوە، زەمینەیش بۆ فراونبوونی گەندەڵیی لە ئاستی خوارەوەدا زۆرتر دەکات*١٧.

### ١١- تالانیی:

لە سەروبەندی ڕاپەڕیین و هەتا ماوەیەکی دوای ڕاپەڕیینیش، حیزبە سیاسییەکانی باشووری کوردستان دەستیان بەسەر ئەو ئامێر و دەزگا خزمەتگوزاریی و بەرهەمهێنارانەی هەرێمی کوردستاندا گرت، کە لە دوای ڕاماڵینی سوپای عێراق بەجێمابوو، حیزبەکانی بەرەی کوردستانیی چەند لە توانایاندا بوو، دەستیان بەسەر دامودەزگا و کەرەستە بەرهەمهێن و خزمەتگوزارییەکانی هەرێمدا گرت، بە تالانفرۆشیی ئاودیوی ئێرانیان کرد. هەزاران لۆریی بارهەڵگر، شۆفڵ، بۆریی ئاوڕاکێشان، کارگەی قیر، کە لە حکومەتی سەدام بەجێمابوون، دەستیانبەسەرداگیرا و ئاودیوی ئێران کران. نمونەی هەرە زیندوو و لەبیرنەکراو فرۆشتنی شتومەک و دامودەزگاکانی سەدی بێخمە بوو، پارتیی و یەکێتیی پێکەوە فرۆشتیان بە عومەر ئاغای سورکیی، ئەویش بە تالانفرۆشیی ئاودیوی ئێرانی کرد. ئەم تالانکردنە لە لایەکەوە ئابوریی هەرێمی کوردستانی داتەپاند، لە لایەکی ترەوە دیاردەی دزیی و تالانیی لە ناخی خەڵکدا جێگیرکرد، گوڕێکی تری بە گەندەڵیی دا.

### ١٢- داهاتی خەڵک بۆ حیزب:

لە دوای پێکهێنانی حکومەتی هەرێمەوە، لە خاڵە سنوورییەکانی هەرێم و وڵاتانی دەوروبەر گومرگ دانرا، پارەی گومرگ هەمووی نەدەگەڕایەوە بۆ خەزێنەی حکومەت، سەرەتا حیزبەکان بەشی گومرگی خۆیان دەبرد، هەندێکیشیان بۆ حکومەت دادەنا. گومرگی ئیبراهیم خەلیل لە نێوان هەرێمی کوردستان و تورکیا بوو، سەرچاوەیەکی سەرەکیی داهاتی هەرێم بوو. ساڵی ١٩٩٣ بۆ یەکەم جار نەوشیروان مستەفا لە لێدوانێکی دەربارەی داهاتی هەرێم و بەشی حیزبەکان دا و لە لێدوانەکەیدا گوتی: تەنها

٣٠٪ داهاتی گومرکی ئیبراهیم خەلیل بۆ حکومەتی هەرێمی کوردستانە، باقییەکەی تری ٧٠٪ پارتیی و یەکێتیی وەکو برا بەسەر خۆیاندا دابەشیدەکەن.

دوای بڕیاری ١٩٨٦ی نەتەوە یەکگرتووەکانی (نەوت بەرانبەر بە خۆراک) ئەو ١٣٪ بۆ هەرێمی کوردستان تەرخاندەکرا، بڕێکی باشی لە لایەن حیزبە دەسەڵاتدارەکانەوە بۆ خۆیان گلدەدرایەوە، لەسەر حسابی خەڵکی کوردستان خۆیانی پێی دەوڵەمەنددەکرد.

لایەنێکی تری گەندەڵیی حیزبە دەسەڵاتدارەکان ئەوەیە دەستیان بەسەر ئەو هاوکارییانەدا دەگرت، کە ڕێکخراوە خێرخوازە جیهانییەکان بۆ لێقەوماوانی کوردی دەنارد، زۆر کەس باس لەو هاوکارییانە دەکات کە لە ساڵانی ١٩٨٨ - ٢٠٠٣ بۆ هاوکاریی خەڵکی هەڵەبجە و لێقەماوانی چەکی کیمیاویی هاتووە، بەڵام لە لایەن بەرپرسانی هەرێمەوە دەستیبەسەرداگیراوە و خەڵکی هەڵەبجە سودی لێوەرنەگرتووە. ساڵانی ١٩٨٩ - ١٩٩١ ئەندامی سەرکردایەتی پارتی گەلی بووم، ماوەیەک نوێنەری ئەو حیزبە بووم لە ڕێکخراوێکی خێرخوازیی بە ناوی (KRA) لە خاچی سووری سویدیی هاوکارییەک لە ڕێگەی (KRA) بۆ ئاوەرەکانی کوردستان هاتبوو، سەرۆکی حیزب داوای لێکردم ئەو هاوکارییە وەربگرم و بیهێنم بۆ حیزب، منیش بەو داواکارییە ڕازینەبووم، بەو هۆیەوە کێشە لە نیوان من و سەرۆکدا دروستدبوو.

ساڵی ١٩٩٨ - ١٩٩٩ پرۆفیسۆرێکی بەریتانیی لە زانکۆی لیڤەرپول لەگەڵ وەزارەتی تەندورستیی حکومەتی هەرێم و نوێنەری حیزبە سیاسییەکانی باشوور و قائمقامی هەڵبجە و ڕاگری کۆلێژە پزیشکییەکانی زانکۆکانی کوردستان و چەند پزیشکێک کە دەسەڵات کردبوونی بەرپرسی دۆسیەی کیمیابارنی هەڵەبجە، پەیمانگایەکی زانستیی بۆ لێکۆڵینەوە لە ئاسەوارەکانی چەکی کیمیاویی لە هەڵەبجە دامەزراند. سەرەڕای ئەوەی ئەو پەیمانگایە هیچ لێکۆڵینەوەیەکی زانستیی ئەنجامنەدا، بەڵام لە شارەکانی هەڵەبجە و سلێمانیی و هەولێر و دهۆک و کەرکوک چەندین بارەگای وەهمیی بە ناوی پەیمانگای هەڵبجەوە کرانەوە. بڕەپارەیەکی باشیان بۆ خەرجکرا و چووە گیرفانی بەرپرسەکانەوە*١٨.

لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام، دەستووری کۆماری عێراق هەر سێ پارێزگای هەولێر و دهۆک و سلێمانیی بە ناوچەی هەرێمی کوردستانی فیدراڵ ناسی. لە

بڕگەیەکی دەستوورەکەدا هاتووە کە ئەو بڕیارانەی لە ساڵی ١٩٩٢ بەولاوە لە هەرێمی کوردستان دراون بەردەوام کاریانپێدەکرێت، هەموو بڕیارەکانی حکومەتی هەرێم بە بڕیارەکانی دادگا و گرێبەستەکانیشەوە کاریانپێدەکرێت مەگەر هەمواربکرێنەوە. بەو شێوەیە لە دەستووری عێراقدا ئەو گەندەڵیی و دەستگرتن بەسەر سامانی خەڵکەی کوردستاندا ڕەزامەندیی لەسەر پیشاندراوە.

## ١٣- ئیمتیازات:

یەکێک لە جۆرەکانی تری گەندەڵیی دوای ڕاپەڕیین، ئەو کۆمەڵە ئیمتیازاتەیە، کە دەسەڵات بۆ سەرۆک_خێڵ و شێخ و وەزیر و ئەندامپەرلەمان و بەرپرسانی باڵای حیزبەکانی باشوور و دۆستانی حیزبی بڕیوەتەوە، هەموو سەرۆک_خێڵەکانی کوردستان موچەی مانگانەیان هەیە، دەستەی پاریزگاریشیان هەیە و حکومەت موچەیان پێدەدات. دوای تەواوبوونی خولەکانی پەرلەمان و کابینەکانی حکومەت، ئەندامپەرلەمان و وەزیرەکان بەبێ ئەوەی گەیشتبنە تەمەنی خانەنشینیی، بە ٨٠٪ موچەکەیانەوە خانەنشیندەکرێن. ئامانجی ئەم کارەیش بۆ ئەوەیە کە ئەو توێژەی کۆمەڵگەی کوردستان بە خۆیانەوە گرێبدەن هەتا حیزب و دەسەڵات بپارێزن. بەم شێوەیە لە لایەکەوە توێژێکی مشەخۆری بێبەرهەم پێکدێت، لەولایشەوە نادادپەروەرییەکی کۆمەڵایەتیی دروستدەبێت و گەندەڵیی تەشەنەدەکات.

## ١٤- بڕیارەکانی دەوڵەتی عێراق:

لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام، حکومەتی عێراقی نوێ و پەرلەمانی عێراق، لەپێناو خۆشگوزەرانیی چینوتوێژەکانی کۆمەڵگەدا چەندیین بڕیاریان دەرکرد، ئەو بڕیارانەی پەیوەندیی بە خەرجکردنی موچەی زیاد و دەرماڵەوە هەیە، حکومەتی هەرێم بۆ خەڵکی کوردستانی جێبەجێناکات.

ساڵی ٢٠٠٥ پەرلەمانی عێراق بڕیاری ژمارە ٤ی هاوکاریی تایبەت بۆ زیندانییە سیاسییەکانی عێراق دەرکرد، کە تیایدا هاتووە هەر کەسێک لە سەردەمی ڕژێمی

سەدامدا زیندانی سیاسیی بووبێت مانگانە ٥٠٠ هەزار دینار زیاد لە موچەکەی بۆ دەبڕدرێتەوە. هەتا ساڵی ٢٠١٠ حکومەتی هەرێم ئەو بڕیارەی پەرلەمانی عێراقی جێبەجێنەکرد، موچە زیادەکەی بۆ زیندانییە سیاسییەکانی هەرێمی کوردستان نەبڕییەوە. بۆ ئەو مەبەستە کۆمەڵەی زیندانییە سیاسییەکان لە ماوەی چەند ساڵی ڕابردوودا چەندیین جار بە چالاکیی دیموکراتیی نارەزاییان پیشانداوە، هەتا دەسەڵاتی هەرێم لایەک لە داواکانیان بکاتەوە، ئەوانیش وەکو زیندانیانی عێراق مافەکانیان وەربگرن. ئەمەیش جۆرێکی تری گەندەڵیی ئیداریی و یاسایی و دارایییە و وا لە سیستەمی سیاسیی هەرێم دەکات کە لە گەندەڵییدا پێش حکومەتی عێراق بکەوێت.

ڕۆژی ٢/ ٨/ ٢٠١٠ فەرمانبەرانی دادی هەولێر و ڕانیە و هەڵەبجە، مانیانگرت، لەبەرئەوەی ماوەی پێنج ساڵە دەرماڵەی کارمەندانی دادگاکانی عێراق لە ٥٠٪ زیادبووە، فەرمانبەرانی عێراقی فیدراڵیی پێنج ساڵە ئەو دەرماڵەیە وەردەگرن، بەڵام فەرمانبەرانی دادوەریی هەر سێ پارێزگای هەولێر و دهۆک و سلێمانیی، هەتا ئێستا ئەو دەرماڵەیەیان وەرنەگرتەوە. بەرپرسانی حکومەتی هەرێم بۆ ماوەی پێنج ساڵە دەستییدەستییان پێدەکەن و مافەکانیان پێشێلدەکەن*١٩.

لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدامەوە، لە بەنزینخانەکانی عێراقی فیدراڵیی، یەک لیتر بەنزین بە (٤٠٠ بۆ٤٥٠) دینار بە هاوڵاتییان دەفرۆشرێت، لە هەرێمی کوردستان نرخی یەک لیتر بەنزین لە دوهێندەی نرخی عێراق نزیکدەبێتەوە.

### ١٥- داگیرکردن:

حیزبە باڵادەستەکان بە ئارەزووی خۆیان دوور لە یاسا و بنەمای ئەخلاقیی، دەستیان بەسەر سەرمایەی جێگیر و گۆڕوای خەڵکی کوردستاندا گرتووە، کەی بۆیان کرابێت سەیرانگا و گرد و دارستان و زەوی و خانووی حکومەتیان لەسەر خۆیان و حیزبەکانیان تاپۆکردووە.

لە دوای ڕاپەڕینەوە پارتیی سەیرانگاکانی سەلاحەدین و سەری ڕەشی بۆ خۆی داگیرکردووە، گەشتوگوزار لەو دوو سەیرانگا بەناوبەنگەدا نەماوە.هە تا ماوەیەکی درێژ یەکیتیی بەشێکی زۆری سەیرانگای دوکانی داگیرکردبوو. لە دەڤەری سلێمانیی هەرچی گرد و دارستان هەیە لە لایەن بەرپرسەکانی یەکێتیی و بزوتنەوەی گۆڕانەوە داگیرکراوە، لەسەر بەرپرسەکان تاپۆکراوە. ساڵی ٢٠٠٦ سەردانی دەزگای چاودێریی دارایيم کرد، کارمەندێک باسی ئایندەی دەزگاکەیانی بۆ کردم و گوتی: ماوەیەکی تر لێرە دەگوازینەوە. گوتم بۆ؟ گوتی: لەبەرئەوەی ئەم باڵاخانەیە لە لایەن مام جەلالەوە پێشکەشی کاک نەوشیروان کراوە. باشە بە کام یاسا مام جەلال مافی ئەوەی هەیە باڵەخانە پێشکەشبکات!

ساڵی ٢٠٠٨ ڕۆژنامەنوسانی هەرێم لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەنوسییدا پرسیاریان لە نێچیرڤان بەرزانیی کرد، ئەو خانوو و دارستانەی کە لە هەولێر تێیدا دەژیت هیی کێیە؟ لە وەڵامدا گوتی: ئەوە هیی خۆم نییە موڵکی پارتییە. باشە پارتیی، یان هەر حیزبێکی تر بە کام یاسا مافی ئەوەی هەیە موڵکی گشتیی داگیربکات؟

ئەگەر لە وڵاتێکدا دەستوور نەبێت، یاسا پەیڕەونەکرێت، دامودەزگاکانی دەوڵەت لەژێر دەسەڵاتی حیزبدا بن، ئابوریی وڵات لەژێر چنگی بەرپرسەکانی حیزبدا بێت، هەر کەسێک ئەندام و کادر، یان دۆستی حیزبی دەسەڵاتدار نەبێت ئەرکی بەڕێوەبردن و کاری بازرگانیی و بەرهەمهێنان و پۆستی سیاسیی پێنادرێت، دەبێت سیستەمی سیاسیی و بەڕێوەبەرایەتیی و ئابوریی ئەو وڵاتە چۆن بێت! هەر وەکو ئەو سیستەمەی ئەمڕۆی هەرێمی کوردستان دەبێت.

## ١٠- ئاسایشی هەرێم:

ئاسایشی تاک پەیوەندیی بە ئاستی گەشەکردنی کۆمەڵگە و سیستەمی حوکمڕانیی وڵاتەوە هەیە، ئاسایشی گشتیی پەیوەندیی بە سەروەریی وڵات و سەربەخۆیی سیاسیی و سەربەخۆیی ئابورییەوە هەیە.

## ١- ئاسایشی خەڵک و دەسەڵاتی هەرێم:

لەبەرئەوەی گەلی کورد لە دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقەوە هەتا ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١، ئازادیی بە خۆیەوە نەدیبوو و ئاسایشی پارێزراو نەبوو، ڕۆژی ١٩/ ٥/ ١٩٩٢ بە جۆشوخرۆشێکی کەموێنەوە، دوور لە دەسەڵاتی دەوڵەتی عێراقی ناوەندیی، بەشداریی یەکەم هەڵبژاردنی پەرلەمانی باشووری کوردستانی کرد.

یەکەم جار بوو گەلی کورد هەستبکات ئاسایشی تایبەتیی و ئاسایشی گشتیی دەپارێزرێت، هەستیدەکرد لە چاوسوورکردنەوە و گرتن و ڕاونانی دەزگا داپڵۆسێنەرەکانی ڕژێمی بەعس ڕزگاریبووە. هەستیدەکرد لە سیاسەتی بەعەرەبکردن و ڕاگواستن و بەبەعسکردن و زیندان و هەڵواسینی نیشتیمانپەروەران و ئەنفال و کیمیاباران ڕزگاریبووە.

گەلی کورد هەستیدەکرد هەڵبژاردنی پەرلەمان بەو واتایە دێت ئیتر ڕژێمی سەدام بۆی نییە جارێکی تر پێبخاتەوە ناوچە ڕزگارکراوەکانی هەرێمی کوردستان و لە ڕێگەی لیواکانی حەرەس جمهوریی و قوات_خاسەکانیەوە ئاسایشی گشتیی خەڵکی کوردستان تێکبدات. ئەو ڕۆژە زۆر بە گرنگ دەبینرا، چاوەڕواندەکرا ڕۆژێکی مێژوویی ژیانی سیاسیی خەڵکی کوردستان بێت، وەرچەرخانێکی سیاسیی گرنگی لێدروستبێت.

پاش پێکهێنانی حکومەتی هەرێم بە ماوەیەک، دیاردەی پەنجا بە پەنجای نێوان هەردوو حیزبی دەسەڵاتداری هەرێم دەستیپێکرد، هەر حیزبە و نیوەی دەسەڵات و نیوەی خاکی کوردستانی بەدەستەوەگرت، لەبەر ململانێی حیزبیی، کاروباری وڵات تەگەرەیتێکەوت. دوای نزیکەی دوو ساڵ لە حوکمی پەنجا بە پەنجا، خولی سێیەمی شەڕی براکوژیی دەستیپێکرد، هەتا سەرەتای ساڵی ٢٠٠٣ درێژەیکێشا، لەو سەردەمەدا ئاسایشی تاکەکانی گەلی کورد بەردەوام لە مەترسییدا بوو، ئەو تاکانەی لەگەڵ حیزبە دەسەڵاتدارەکاندا نەبوون، ژیانیان لە مەترسییدا بوو، بۆ هەر سەرکوتکردن و زیندانکردن و لەناوبردنێکی دامودەزگاکانی دەسەڵات پاڵێوراو بوون، ئەو تاکانەی لەگەڵ دەسەڵاتدا بوون هەموو کاتێک مەترسیی فڕاندن و تیرۆرکردنی لایەنە دژبەرەکەی دەسەڵاتیان لەسەر بوو. بۆیە ڕاپەڕین و هەڵبژاردن و پێکهێنانی حکومەتی هەرێم، نەیتوانی ئاسایشی تاکەکانی کۆمەڵگەی کوردستان بپارێزێت.

## ٢- دەسەڵاتی هەرێم و ئاسایشی گشتیی:

دوای هەڵبژاردنی پەرلەمان و پێکهێنانی حکومەتی هەرێم، خەڵکی کوردستان لە دەسەڵاتێکی بێگانەی شۆڤێنیی رزگاریبوو، بەلام ئاسایشی گەرەنتیینەدەکرا، دەسەلاتێکی کوردیی لە خوێن و رەگەز و زمانی خۆی حوکمی بەدەستەوەگرت، وەکو کورد خەڵکی نەدەچەوساندەوە، بەلام وەکو دەسەلاتێکی پێشێلکەری مافی مرۆڤ، وەکو هێزێکی دەسەلاتخوازی بێپێوانە، جەستە و رۆحی گەلی کوردی ئازاردەدا، ئاسایشی تایبەتیی خەڵکی کوردستانی دەخستە مەترسییەوە.

بۆ خەڵکی کوردستان دەرکەوت کە دەسەلاتی هەرێم ئاسایشی گەرەنتیی ناکات. کاتێک شەڕی ناوخۆ لە نێوان پێشمەرگەی حیزبەکانی باشووری کوردستاندا دروستبوو، شەڕ گەرەک و کۆلانی شارە رزگارکراوەکانی هەرێمی گرتەوە، کاتێک خولی سێیەمی شەڕی ناوخۆیی زۆر گەرمبوو، حیزبە بەشەڕهاتووەکان بانگی سوپای ئێران و عێراق و تورکیایان کرد، بۆ ئەوەی لە شەڕەکەدا بەشدارییبکەن و پشتیوانیی دۆستەکانیان بکەن. ئیتر ئاسایشی گشتیی خەڵکی کوردستان و سەروەریی هەرێمی کوردستان کەوتە مەترسییەوە. خەڵکی کوردستان بۆیان ئاشکرابوو دەسەلاتی باشووری کوردستان ئاسایشی گشتیی هەرێمی کوردستان و سەروەریی سیاسیی هەرێمیش ناپارێزێت.

## ٣- هەڕەشەی عێراقییەکان بۆ سەر ئاسایشی خەڵک:

لە سەروبەندی کۆڕەوی ساڵی ١٩٩١دا، ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتیی بڕیاری ژمارە ٦٨٨ بۆ پاراستنی ئاسایشی خەڵکی کوردستان لە دەستی رژێمی سەدام دەرکرد، بەگوێرەی ئەو بڕیارە دەبێت رژێمی سەدام لە سەرووی هێڵی پانیی ٣٦ پەلەماری خەڵکی کوردستان و دامودەزگاکانی هەرێمی کوردستان نەدات، فڕۆکەی جەنگیی بەسەر ئاسمانی ئەو سنوورەدا نەسوڕێتەوە و بۆردووماننەکات. خەڵکی کوردستان زۆر سودی لەو بڕیارە وەرگرت، خەڵکی ئاوارە گەڕانەوە کوردستان و دەستیان بە ئاوەدانکردنەوەی ولاتی خۆیان کرد.

خەڵکی کوردستان بەردەوام بیری لە ئاسایشی خۆی دەکردەوە، گەلی کورد مەترسیی

ئەوەی هەبوو جارێکی تر ڕژێمی سەدام بگەڕێتەوە کوردستان و ئاسایشی تێکبداتەوە. ساڵی ٢٠٠٣ ترسی خەڵکی کوردستان لە ڕژێمی سەدام بە لوتکە گەیشت کاتێک سوپای ئەمریکا و هێزی ئۆپۆزسیۆنی عێراق بە هێزی باشووری کوردستانیشەوە، هێرشیان بۆ سەر سوپای عێراق دەستپێکرد. خەڵکی کوردستان ترسی ئەوەی لێنیشتبوو ڕژێمی سەدام جارێکی تر دژی خەڵکی کوردستان چەکی کیمیاویی بەکاربهێنێت و کارەساتی هەڵەبجە و ئەنفال و کۆڕەو دوبارەبکاتەوە. خۆشبەختانە سوپای عێراق توانی تەنها ٢٠ ڕۆژ بەرگەی هێرشی ئەمریکا بگرێت. ڕۆژی ٩/ ٤/ ٢٠٠٣ ڕژێمی سەدام ڕوخا. ئیتر لەو ڕۆژەوە خەڵکی کوردستان وای هەستدەکرد هیچ مەترسییەکی عێراق بۆ تێکدانی ئاسایشی گشتیی کوردستان لەئارادا نەماوە.

ساڵی ٢٠١٤ ڕێکخراوی توندڕەوەی داعش لە سوریا و عێراق دروستبوو، پەلاماری باشووری کوردستان و ڕۆژئاوای کوردستانی دا، مەترسیی بۆ سەرئاسایشی گشتیی و ئاسایشی تایبەتیی خەڵکی کوردستان دروستکرد. ساڵی ٢٠١٧ لەسەر دۆسییەی کەرکوک شەڕ لە نێوان هێزە چەکدارەکانی عێراق و هێزی پێشمەرگە دروستبوو، عێراق دەستی بەسەر شاری کەرکوکدا گرتەوە، پەلاماری شار و شارۆچکەکانی تری باشووری کوردستانی دا، بۆ ماوەیەک ئاسایشی گشتیی و تایبەتیی خەڵکی کوردستان کەوتە مەترسییەوە.

### ٤- ئاسایشی خەڵک و سیاسەتی داگیرکەران:

دەزگاکانی ئاسایشی هەرێمی کوردستان دەزگای هەموو گەلی کورد نین، نوێنەری هەموو پێکهاتە سیاسییەکانی تێدا نییە، دەزگای حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشووری کوردستانن، بە تەنها لە نوێنەر و ئەندام و کادری حیزبە دەسەڵاتدارەکان پێکهاتوون. خەڵکی بێلایەن کە ئەندامی پارتیی و یەکێتیی نەبێت، لە ئاسایشی هەولێر و دهۆک و سلێمانیی و کەرکوک جێگەینابێتەوە. دەزگاکانی ئاسایش و پۆلیسی هەرێم لە لایەن دەزگا هەواڵگرییەکانی پارتیی و یەکێتییەوە ئاڕاستەدەکرێن، دەزگا هەواڵگرییەکانی حیزبیش بە بەرپرسی یەکەمی حیزبەوە بەستراونەتەوە، بەرپرسی یەکەمی حیزبیش بە دەزگا هەواڵگرییەکانی وڵاتانی بێگانە و وڵاتانی داگیرکەری کوردستانەوە بەستراوەتەوە.

بۆیە بەبێ ئەملاولا دەتوانین بڵێین دامودەزگاکانی ئاسایشی هەرێم دامودەزگای حیزبیین و بە حیزبەوە گرێدراون، ئاسایشی حیزب و وڵاتانی تر دابیندەکەن. هەر کاتێک ئاڕاستەی سیاسیی خەڵکی کوردستان بە پێچەوانەی ئاڕاستەی سیاسیی حیزبەوە بووبێت، ئاسایش ڕۆڵی دەزگایەکی سەرکوتکەری خەڵکی کوردستان دەبینێت، ئاسایشی خەڵکی کوردستان دەخاتە مەترسییەوە، بە هەڕەشە و زیندان و ڕاوانان و کوشتن وەڵامی خەڵکی دەداوەتەوە و داکۆکیی لە حیزب دەکات.

لە خۆپیشاندانەکانی ١٧ی شوبات و ڕۆژانی دواییدا، لە خۆپیشاندانەکانی تردا، ئاسایش و پۆلیس و پێشمەرگە هەزاران کەسیان دەستگیرکرد، سەدان کەسیان بریندار و شەهیدکرد، خۆپیشاندانەکانیان سەرکوتکرد.

لەسەر داوای دەوڵەتی تورکیا و ئێران ئاسایش و پۆلیسی هەرێم سەدان کەسی خەڵکی باشووری کوردستان و پارچەکانی تری کوردستانیان دەستگیرکردووە، هەندێکیانیان ڕادەستی ئاسایشی ئەو وڵاتانە کردووەتەوە. لە لایەکی ترەوە داگیرکەرانی کوردستان بە بەردەوامیی هەڕەشە لە گەلی کورد و دەسکەوتەکانی باشووری کوردستان دەکەن، لە ڕووی سیاسییەوە تورکیا هەرێمی کوردستان بە فەرمیی ناناسێت، بە هەرێمی کوردستان دەڵێت: باکوری عێراق، نەتەوەپەرستەکانی تورک دەڵێن کورد و کوردستان بوونی نییە. لە زۆر بۆنەدا تورکەکان نایشارنەوە کە هەوڵی ئەوە دەدەن ویلایەتی موسڵ بخەوە سەر دەوڵەتی تورکیا و کۆتایی بە ئەزموونی باشووری کوردستان بهێنن. دەوڵەتی تورکیا بە تۆپ و فڕۆکەی جەنگیی و تیرۆر، هەڕەشە لە ئاسایشی گشتیی خەڵکی کوردستان دەکات.

ئەو هەڕەشانەی دەوڵەتی تورکیا و هەڕەشە نەرمەکانی ئێران، ترس و دڵەراوکێیان لە ڕۆحی تاک و کۆی گەلی کورددا دروستکردووە.

### ٥- دژەتیرۆر و ئاسایشی خەڵک:

هەتا ئەمڕۆیش ئاسایشی هەرێمی کوردستان لە ئاسایشی دوو حیزب پێکهاتووە، پاش کۆتاییهاتنی شەڕی براکوژیی، پاش ڕوخانی ڕژێمی سەدام، پاش یەکگرتنەوەی حکومەتی هەرێم هێشتا دەزگاکانی ئاسایشی پارتیی و یەکێتیی یەکیاننەگرتووەتەوە،

هەر حیزبە لە لای خۆیەوە بەو ئاسایشە کار بۆ پاراستنی حیزبی خۆی دەکات. بەبێ ئاگاداریی و هاریکاریی یەکتر درێژە بەکاری خۆیان دەدەن.

لە سالانی ٢٠٠٣ - ٢٠١٧ کەرکوک لە لایەن کوردەوە حوکمدەکرا، پارتیی و یەکێتیی لەو شارەیشدا دەزگای ئاسایشی یەکگرتوویان نەبوو، ناوبەناو لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە، ئاسایشی پارتیی و ئاسایشی یەکێتیی بە جیا باسیان لە کار و چالاکیی خۆیان دەکرد، بەبێ ئەوەی شەرم دایانبگرێت.

دوای هەڵبژاردن و دامەزراندنی حکومەتی هەرێم، پارتیی و یەکێتیی دەزگای پاراستن و دەزگای زانیارییان هەڵنەوەشاندەوە، ئەو دو دەزگا حیزبییە درێژەیان بە کارەکانیان دا، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی تیرۆر، یەکی دەزگایەکی تری ئەمنیان بە ناوی دەزگای دژەتیرۆرەوە دروستکرد. بە حساب ئەم دوو دەزگایە پەیوەندییان بە هاوپەیمانیی نیوەدەوڵەتیی دژی تیرۆرەوە هەیە، بەڵام لە ڕاستییدا دو دەزگای سەرکوتکەری ئازادییەکانی خەڵکی کوردستانن، دوو دەزگای حیزبیی توندڕەون، لەبریی ئەوەی دژی تیرۆر بن و ئازادیی خەڵک بپارێزن، لە ڕێگەی کەنالەکانی ڕاگەیاندنی ئاشکرا و نهێنییانەوە، هانی ئەندامانی حیزبە ڕکابەرەکان دەدەن بۆ ئەوەی شەڕی براکوژیی و ئاژاوەبنێنەوە، دژی خەڵکی کوردستانیش دەستناپارێزن. هەر کردەیەکی کوشتنیی ناوخۆیی دروستببێت، خەڵک دەست بۆ دژەتیرۆر درێژدەکات.

### ٦- ئاسایشی خەڵک و هێزی پێشمەرگە:

هێزی پێشمەرگە هێزی پاراستنی خاک و سەروەریی کوردستانە، بەڵام لە دوای ڕاپەڕینەوە جارێکی تر ئەم هێزە بۆ شەڕی براکوژیی بەکارهێنرا، بۆ هاوکاریی سوپای تورکیا لە دژی شۆڕشی باکوری کوردستان بەکارهێنرا، بۆ پەلکێشکردنی سوپای عێراق و ئیران و تورکیا بەکارهێنرا. هێزی پێشمەرگەی کوردستان وەکو هێزێکی سەربازیی گەلی کورد، مایەی دڵخۆشیی هەموو کوردێکی دڵسۆزە، لەبەرئەوەی ئەو هێزە بە پارێزەری ئاسایشی گشتیی گەلی کوردستان سەیردەکرێت، بەڵام لە شێوزای پێکهێنان و چۆنیەتیی مەشق و پڕچەککردن و ناسنامەی حیزبایەتییەوە، تێبینیی جدیی لەسەر هێزی پێشمەرگە هەیە.

هێزی پێشمەرگە ناوی هێزی پێشمەرگەی کوردستانە، بەڵام لە ڕاستییدا هێزی پێشمەرگەی حیزبە دەسەڵاتدارەکانی هەرێمی کوردستانە، هێزی پێشمەرگەی پارتیی و یەکێتییە. بەرپرس و پێشمەرگەی فەوج و لیواکانی سنووری پارێزگای سلێمانیی و گەرمیان و کەرکوک، لە ناو وەزارەتی پێشمەرگە و لە ناو پاسەوانانی سنوور، لە ناو وەزارەتی بەرگریی عێراق، هەموویان سەر بە یەکێتیین. بەرپرس و پێشمەرگەی فەوج و لیواکانی سنووری پارێزگای هەولێر و دهۆک و موسڵ، لە ناو وەزارەتی پێشمەرگە، لە ناو هێزی پاسەوانی سنوور، لە ناو وەزارەتی بەرگریی عێراق، هەموویان سەر بە پارتیین. لەبەرئەوە هێزێکی بەو شێوەیە پێش ئەوەی ئاسایشی گشتیی گەلی کورد بپارێزێت، ئاسایشی حیزبە سیاسییەکانی باشووری کوردستان دەپارێزێت.

لە ساڵانی ڕابردوودا چەندیین جار سوپاکانی تورکیا و ئێران سنووری هەرێمی کوردستانیان بەزاند و ئاسایشی گشتیی خەڵکی کوردستانیان تێکدا، کەچی هێزی پێشمەرگەی کوردستان بێدەنگیی هەڵبژارد، لەبەرئەوەی حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشووری کوردستان بەرانبەر بەو دەستدرێژییانەی ئێران و تورکیا بێدەنگبوون، پێشمەرگەیش لە لایەن حیزبەوە ئاڕاستەدەکرێت، هەتا ئاسایشی حیزب نەکەوێتە مەترسییەوە پێشمەرگە لە شوێنی خۆی ناجوڵێت.

لە ڕووی مەشق و چەک و تەکنۆلۆژیای شەڕ و بەرگرییکردنەوە، هێزی پێشمەرگەی کوردستان ئەو توانا و ئامادەکارییانەی نییە بەرانبەر بە هێرشی وڵاتانی تر بوەستێتەوە. گەورەترین چەکی هێزی پێشمەرگەی کوردستان و پاسەوانی سنوور و ئەو لیوایانەی وەزارەتی بەرگریی عێراق کە لە سنووری هەرێمی کوردستاندا جێگیرکراون، ڕەشاشی (بی کەی سی)یە، بۆیە لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەی هێرشی دوژمندا زۆر زەحمەتە هێزی پێشمەرگەی کوردستان بتوانێت بەرگریی لە سەروەریی هەرێمی کوردستان بکات و ئاسایشی گشتیی خەڵکی کوردستان بپارێزێت. بۆیە لۆژیکییە ئەگەر بڵێین هێزی پێشمەرگەی کوردستان بە تەنها بۆ پاراستنی حیزبەکانی باشووری کوردستان و دەسەڵاتی ئەو حیزبانە دروستکراوە، بۆ پاراستنی ئاسایش و سەروەریی کوردستان دروستنەکراوە. لە خۆپیشاندانەکانی ١٧ی شوبات و ڕۆژانی دوایی و خۆپیشاندانەکانی تردا، ئەم بۆچوونە ڕاستدەرچوو. هێزی پێشمەرگە بۆ سەرکوتکردنی خەڵکی ناڕازیی بەکارهێنرا، لەبریی ئەوەی ئاسایشی خەڵک بپارێزێت، ئاسایشی خەڵکی تێکدا. ئیتر خەڵکی

کوردستان بەو ئەنجامە گەیشت کە هێزی پێشمەرگە بۆ پاراستنی سەروەریی هەرێم و بۆ پاراستنی ئاسایشی گشتیی (ئاسایشی نەتەوەیی) خەڵکی کوردستان دروستنەکراوە. یەکێک لە کێشەکانی تری ئاسایشی خەڵکی کوردستان ئەوەیە، کە لە کاتی هەڵبژاردنی هەرێمی کوردستاندا مەترسیی هەیە هێزە دەسەڵاتدارەکانی باشوور بە ئەنجامی هەڵبژاردن ڕازینەبن، لە ڕێگەی هێزی پێشمەرگەی حیزبەوە کودەتا بەسەر لیستە براوەکانی هەڵبژاردندا بکەن.

## ٧- ئاسایشی خەڵک و هاوپەیمانان:

دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام، ئەمریکا دەستی بەسەر ئاسایشی عێراقدا گرت، ئەمریکا لە هەرێمی کوردستان پێگەی داکوتا و کۆنترۆڵی ئاسایشی هەرێمیشی کرد. هەرێمی کوردستان بۆ ئەمریکییەکان بێکێشەترین شوێنی عێراقە، لەبەرئەوەی خەڵکی کوردستان ئەمریکا بە دۆستی خۆی دەزانێت. ئەمریکەییەکان دەزانن ئەوەی ئاسایشی هەرێم تێکدەدات حیزبە دەسەڵاتدارەکانن کە ئەگەر هەیە خولێکی تری شەڕی براکوژیی دروستبکەن، بۆیە ئەمریکییەکان بە جدیی ڕێگریی لە شەڕی نێوان پارتیی و یەکێتیی دەکەن. لەو کاتەوە ئەمریکا لە هەرێمی کوردستانە، شەڕی نێوان ئەو دوو حیزبە دروستنەبووە. ئەمریکا ڕێگەنادات پارتیی و یەکێتیی و (پ. ک. ک) شەڕبکەن، لەو کاتەوە ئەمریکا لە هەرێمی کوردستانە، تورکیا خۆی بە تەنها شەڕی گەریلاکانی (پ. ک. ک) دەکات. ساڵی ٢٠١١ لە کاتی خۆپیشاندانەکانی ١٧ی شوباتدا، پارتیی هێزێکی ئامادەکرد بۆ ئەوەی هێرشبکاتە سەر مەکۆی سەرەکیی بزوتنەوەی گۆڕان، ئەمریکییەکان ڕێگەیان بەو هێرشەی پارتیی نەدا.

## ٨- ئاسایشی خەڵک و (پ. ک. ک)

(پ. ک. ک) بە سێ ڕێگە ئاسایشی باشووری کوردستان دەپارێزێت:

١- دەوڵەتی تورکیا وای بۆدەچێت کە باشترین شەڕ دژی (پ. ک. ک) ئەوەیە دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان بۆ ئەو شەڕە بەکاربهێنێت، ئەگەر دەسەڵاتی هەرێم نەمێنێت بەرەیەکی دژی (پ. ک. ک) نامێنێت، هاوکێشەکە بە زیانی تورکیا کۆتاییدێت.

بەرانبەر بەو هاوكارییەی هەرێم پێشكەشی توركیای دەكات، دەوڵەتی توركیا زۆر دژی هەرێم ناوەستێتەوە و داگیرناكات.

لە ناو توركەكاندا كە باس دێتە سەر هەرێمی كوردستان، ئایا داگیریبكەن یان نا، زۆرێك لە توركەكان بڕوایان وایە كە سیاسەتی هەرێمی كوردستان لە خزمەتی توركیادایە، لە ڕووی سیاسیی و ئەمنییەوە هەرێمی كوردستان داگیركراوە، پێویستناكات بە سەرباز داگیربكرێت.

٢- ئەو ناوچە سەختانەی قەندیل و چیاكانی تری كوردستا كە گەریلاكانی (پ. ك. ك) پێگەی سەربازییان لێداناوە، ئەگەر چۆڵیبكەن لە لایەن تیرۆریستانەوە كۆنترۆڵدەكرێت، لەوێوە ئاسایشی هەرێمی كوردستان و ئاسایشی ئەمریكییەكانیش تێكدەچێت.

دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام سوپای ئەمریكا لە عێراق و كوردستان جێگیربوو، بەرپرسی سوپای ئەمریكا لە هەرێمی كوردستان ناوی (هاری شوت) بوو، دوو هەفتە جارێك لەگەڵ فەرماندە سەربازییەكانی پارتیی و یەكێتیی كۆدەبووەوە و دەربارەی بارودۆخی سەربازیی هەرێم قسە و باسیان دەكرد. لە كۆبوونەوەكاندا نوێنەرانی سەربازیی پارتیی و یەكێتیی بە بەردەوامیی داوایان لە هاری شوت دەكرد، كە ئەمریكا بۆردوومانی قەندیل بكات و گەریلاكانی( پ. ك. ك) لەو شاخانە دەربكات، وەكو چۆن بۆردوومانی هەورامانی كرد و جوندولئیسلامی لەو ناوچەیە دەركرد. هاری شوت پێیگوتبوون: ئەگەر ئێمە (پ. ك. ك) لەو شاخانە دەربكەین، هیچ هێزێك بۆی ناكرێت لەو شاخە سەختانەدا بمێنێتەوە، تیرۆریستان ئەو شاخانە داگیردەكەن و لەوێوە ئاسایشی هەرێمی كوردستان تێكدەدەن.

٣- هەركاتێك مەترسیی لەسەر هەرێمی كوردستان دروستبووبێت، وەكوساڵی ٢٠١٤ كە داعش پەلاماری شەنگاڵ و مەخموری دا، گەریلاكانی (پ. ك. ك) لە كاتی خۆیدا و بەبێ مەرج، وەكو ئەركێكی نەتەوەیی سەنگەری بەرگریی ئاوەداندەكەنەوە و باشووری كوردستان دەپارێزن.

## ١١- كۆتایی

بەهۆی ئەو هەڵە و لادان و گەندەڵیی و ناداپەروەرییەی حوکمڕانیی هەرێمی کوردستانەوە، ئەزموونی هەرێمی کوردستان لە ئاستی ناوخۆیی و عێراقیی و جیهانییدا هەتا دێت پاشەکشەدەکات. بارودۆخی ئابوریی و سیاسیی کوردستان هەتا دێت ناسەقامگیرتردەبێت. بۆ ڕێگەگرتن لە خراپتربوونی ئەم بارودۆخە، دەبێت جوڵەیەکی سیاسیی هەمەلایەنە بکرێت، ئەو جوڵەیە گەرەنتیی گۆڕینی ئەم بارودۆخە بکات. گۆڕانکاریی بە دوو ڕێگە دەبێت:

یان چاکسازیی ڕاستەقینە، یان ڕاپەڕینی خەڵک دژی دەسەڵاتی حیزبە دەسەڵاتدارەکان.

### ١- چاکسازیی دەسەڵات:

### ١- دەستوور:

بڕگەی ١٢٠ دەستووری عێراقی ساڵی ٢٠٠٥ دەڵێت: دەبێت هەرێمی کوردستان دەستووری هەبێت، بەڵام هەرێمی کوردستان هەتا ئێستا دەستووری نییە، بۆیە یەکێک لە خاڵە بنەڕەتییەکانی چاکسازیی لە حوکمڕانیی هەرێمدا، دەبێت هەرێمی کوردستان دەستووری هەبێت، بە زووترین کات ڕاپرسیی لەسەر ڕەشنوسی دەستووری هەرێم بکرێت، بۆ ئەوەی ماف و ئەرکی دەسەڵات، ماف و ئەرکی خەڵک لەو دەستوورەدا دیاریبکرێت، هیچ پێکهاتەیەک بۆی نەبێت دەستدرێژیی لەسەر مافی پێکاهاتەکەی تر بکات، دەستوور ببێتە سەرچاوەی بڕیاری سیاسیی هەرێمی کوردستان.

### ٢- حیزب:

لە هەرێمی کوردستاندا حیزب زۆر گەورەکراوە، دەبێت حیزب بچووکبکرێتەوە، دەزگاکانی کەمبکرێنەوە، ژمارەی بەرپرس و کادری حیزب کەمبکرێتەوە، دەبێ حیزب تەنها لە کاتی هەڵبژاردندا چالاکیی فراوان بکات و دوای هەڵبژاردنەکان خۆی

متبکاتەوە هەتا هەڵبژاردنێکی تر دەستپێدەکاتەوە. بە واتایەکی تر: دەبێت حیزب لە دەوڵەت جیابکرێتەوە و دەزگاکانی حوکمڕانیی لە چنگی حیزب ڕزگاربکرێن.

لە دەستووری هەرێمدا بڕگەیەک جێگیربکرێت کە نابێت حیزب بنەماڵەیی بێت، بۆ ئەوەی هیچ خێزان و بنەماڵەیەک بۆی نەبێت دەسەڵاتی حیزب قورخبکات، هەموو ئەندامێکی حیزب مافی هەبێت بەشداریی بڕیاری سیاسیی بکات.

بە دەستوور و یاسا ڕێگە لە حیزب بگیرێت دەست لە کاروباری ناوخۆی پەرلەمان و حکومەت و دادگا وەربدات، بە دەستوور و یاسا ڕێگەنەدرێت حیزب ئابوریی وڵات قورخبکات. بە دەستوور و یاسا ڕێگەنەدرێت حیزب هێزی چەکداری هەبێت، هێزە چەکدارەکانی هەرێمی کوردستان یەکبخرێنەوە، لە هێزێکی حیزبییەوە بکرێن بە هێزێکی نیشتیمانیی و لەبریی ئەوەی ئینتمایان بۆ حیزب هەبێت، ئینتمایان بۆ نەتەوە و نیشتیمان هەبێت. لە بەندەکانی دەستووردا بە یاسا ڕێوشوێنی دەستاودەسکردنی دەسەڵات دابنرێت.

### ٣- کۆمەڵگەی مەدەنیی:

کۆمەڵگەی مەدەنیی کەسایەتیی، ڕێکخراوی پیشەیی و سەندیکا و حیزبە سیاسییەکان دەگرێتەوە، ئەم دامودەزگایانە پردی نێوان خەڵک و دەسەڵاتن، چاودێریی دەسەڵات دەکەن، مافی خەڵک دەپارێزن.

هەر ڕێکخراو و سەندیکایەک نوێنەرایەتیی تیوێژێکی کۆمەڵایەتیی دەکات، مافە پیشەیی و سیاسییەکانیان دەپارێزێت، ڕێگەنادات دەسەڵات مافەکانیان پێشێلبکات. یەکێک لە ناشیرنییەکانی حیزبە دەسەڵاتدارەکانی پاش ڕاپەڕیین ئەوەیە کە سەندیکا و ڕێکخراوەکانی داگیرکرد و دابەشکرد و بە حیزبەوە گرێیدان. ئیتر ئەو دەزگا کۆمەڵاتییانە داکۆکیی لە خەڵک ناکەن، داکۆکی لە حیزب دەکەن. دەبێت بە دەستوور و یاسا و بە کردار، ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنیی ئازاد و سەربەخۆبکرێن و ڕۆڵی خۆیان بۆ داکۆکیکردن لە مافی پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکان زیندووبکەنەوە.

### ٤- کێشەکانی خەڵکی کوردستان:

کێشەیەکی تری ڕۆژانـەی خەڵکی کوردستان، هـەژاریی و نـادادپـەروەریی و کەمیی و خراپیی خزمەتگوزارییە. دەبێت دەسەڵاتی هەرێم بە دەستوور و یاسا و بە کردەوە کار بۆ ئاساییکردنەوەی بارودۆخی ئابوریی هەرێمی کوردستان بکات. موچە پاشەکەوتکراوەکان و موچە بڕاوەکانی خەڵک بگێڕیتەوە. سنوور بۆ ئەو باجە زۆرە دابنێت کە لەم ساڵانەی دواییدا بەسەر خەلکی کوردستاندا سەپێنراوە. دەرفەتی کار بۆ خەڵک بدۆزێتەوە و پێویستییە سەرەکییەکانی خەڵک وەکو خواردن و ئاو و کارەبا و نەوت و بەنزین و خزمەتگوزاریی تەندروستیی بە ئاسانیی دەستی خەڵک بکەون. جیاکاریی لە نێوان حیزبیی و ناحیزبییەکاندا نەهێڵێت و هەموو هاوڵاتییەک مافی کار و کاسپیی و ئازادیی سیاسیی هەبێت.

### ٦- ئاشتی کۆمەڵایەتی:

لە ئەنجامی شەڕی ناوخۆ و شەڕی شۆڕشی کورد و دوڵەتی عێراقەوە، بەهۆی کێشە خێڵەکییەکانی کۆمەڵگەی کوردستانەوە، ئاشتی کۆمەلایەتی لە هەرێمی کوردستان تێکچووە. دەبێت یەکێک لەکاری ئایندەی هەرێمی گێڕانەوی ئاشتی کۆمەڵایەتی بێت.

### ٥- یەکگرتنەوەی هەرێم:

لە دوای خولی سێیەمی شەڕی ناوخۆ، هەرێمی کوردستان بەسەر دەسەڵاتی پارتیی و یەکێتییدا دابەشکراوە، ئەم دابەشکردنە لە ڕووی نەتەوەییەوە تاوانێکی ترە بەرانبەر بە گەلی کورد ئەنجامدەدرێت، دژی دەستووری عێراقە کە وەکو هەرێمێکی فیدراڵ دانی بە هەرێمی کوردستاندا ناوە. بۆیە دەبێت لە ئاستی سیاسیی و یاساییدا کار بۆ یەکگرتنەوەی زۆنی زەرد و زۆنی سەوز بکرێت و دوو_ئیدارەیی کۆتاییپێبێت.

### ٦- لە ئاستی عێراقدا:

دەستووری ساڵی ٢٠٠٥ی عێراقی نوێ لە هەرێمی کوردستاندا گەرەنتیی مافەکانی گەلی کوردی کردووە، کورد لە پێکهێنانی دەوڵەتی عێراقدا بەشدارە، لە پەرلەمان و

حکومەت و دەسەڵاتی دادوەرییدا نوێنەری هەیە، لە دامودەزگاکانی تری عێراقدا پشکی هەیە.

کەچی دەسەڵاتدرانی هەرێم وەکو پێش ڕوخانی ڕژێمی سەدام لەگەڵ عێراقدا هەڵسوکەوتدەکەن، بۆ دڵخۆشکردنی ناحەزانی عێراق دژایەتیی ئەو عێراقە دەکەن کە خۆیان دروستیانکردووەتەوە، سەروەریی خاکەکەی ناپارێزن، ڕێگەدەدەن سوپای وڵاتان لە عێراقدا پێگە دابکوتن.

دەبێت یەکێکی تر لە پایەکانی چاکسازیی هەرێم، پشتکردنە وڵاتانی دەوروبەر بێت و ڕوکردنە عێراقی نوێ بێت، پەیوەندییەکانی هەرێم لەگەڵ ئەو وڵاتانە بەگوێرەی دەستوور و یاسای عێراق بێت، بەگوێرەی سیاسەتی ڕەگەزپەرستیی و پاوانخوازیی ئەو دەوڵەتانە نەبێت. دەبێت دەسەڵاتی هەرێم قەناعەت بهێنێت کە بارودۆخی عێراقیی و ناوچەیی و جیهانیی، ڕێگەنادات کورد لەوەی ئەمڕۆی هەرێمی کوردستان زیاتری دەستبکەوێت، هەر سەرکێشییەک و هەر خۆگرێدانێکی زیاتر بە وڵاتانی دەرەوە، ئەگەر هەیە ڕێسەکەمان بکاتەوە بە خوریی و ماف و ئازادییەکانمان وەکو پارچەکانی تری کوردستان لێبکاتەوە.

### ٢- چاکسازیی خەڵک:

ئەگەردەسەڵاتی هەرێم ڕێگەی چاکسازیی نەگرێتەبەر، خەڵکی کوردستان و پێکهاتە سیاسییە ناڕازییەکان ناچاردەبن خۆیان کۆبکەنەوە و پێکەوە هەوڵی گۆڕانکاریی و چاکسازی بدەن، ئەو چاکسازیی و گۆڕانکارییانەی کە دەسەڵات نایکات خەڵک خۆی دەیکات.

### ١- ئیسلامییەکانی کوردستان:

ئیسلامی سیاسیی باشووری کوردستان لە یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان و کۆمەڵی دادوەریی کوردستان و بزوتنەوەی ئیسلامیی کوردستان و ڕێکخراوی تر و کەسایەتیی ئیسلامیی سەربەخۆ پێکدێت. ئەم ڕەوتە سیاسییە لە دوای ڕاپەڕینەوە لە لایەن دەسەڵاتدارانی هەرێمەوە دەچەوسێتەوە، ڕووبەڕووی سیاسەتی پەراویزخستن

و سەرکوتکردن و لەناوبردنی کادر و بەرپرسەکانی دەبێتەوە. نە دەسەڵاتدارە و نە ئۆپۆسیۆنێکی کاریگەرە و نە یەککگرتووە، بەڵام لە ئاستی کۆمەڵگەدا هێزی هەیە، لە گەندەڵیی حیزبە دەسەڵاتدارەکانەوە نەگلاوە، سوپای دەوڵەتانی داگیرکەری پەلکێشی باشووری کوردستان و عێراق نەکردووە.

سیستەمی وڵاتانی عێراق و ئێران و تورکیا ئیسلامییە و پشتگیریی ئەم ڕەوتە سیاسییە دەکات. ئەگەر هەیە لە کاتی شکستی چاکسازیی دەسەڵاتی هەرێمدا، ئیسلامی سیاسیی هەرێم سود لە پێگەی سیاسیی ناوخۆیی خۆی و پشتیوانیی سیاسیی وڵاتە ئیسلامییەکانی ناوچەکە وەربگرێت، وەک حزبێکی کاریگەر بێتە مەیدانەوە.

## ٢- ئاپۆچییەکانی باشوور:

لە دوای ڕاپەڕینەوە گەنجی باشووری کوردستان بە بەردەوامی پەیوەندیی بە ڕیزەکانی گەریلای (پ. ک. ک)وە دەکەن، سەدان ڕۆشنبیر و سیاسیی باشووری لە پەکەکە نزیکدەنەوە. ئەو پێکهاتە سیاسییە چەندیین جار حیزبی سیاسیی و ڕێکخراوی سەر بە هێڵی سیاسیی ئاپۆیان لە هەرێمی کوردستاندا دروستکردوە، حکومەتی هەرێم مۆڵەتی کار و چالاکیی سیاسیی پێنەداون، ڕێگەی لە چالاکییان گرتووە. (پ. ک. ک) یش هێندە خۆی بە وانەوە سەرقاڵنەکردووە، بۆیە بڵاوەیان لێکردووە. ئەم پێکهاتەیە لەم کاتەدا پەرشوبڵاوە، وەکو گروپ چالاک نییە، وەکو تاک چالاکییان هەیە، لە ناو کۆمەڵگەی کوردستاندا پشتگیرییان هەیە. ئەم پێکهاتەیە بە پەروەردەی (پ. ک. ک) و هزری ئوج ئالان، کێشەکانی دەسەڵاتخوازیی و دزیی و گەندەڵیی و دەستاودەستکردنی دەسەڵات و مافی ژن و ئازادیی و هاوسەنگیی ئاینیی و نەتەوەییان لە لای خۆیان چارەسەرکردووە. دەتوانن چاکسازیی و گۆڕانکاریی جدیی لە سیستەمی حوکمڕانی هەرێمدا بکەن. بە ئیلهاموەرگرتن لە سەرکەوتنی ئاپۆچییەکانی ڕۆژئاوای کوردستان و بە ئیلهاموەرگرتن لە بەرگریی و کۆڵنەدانی ئاپۆچییەکانی باکوری کوردستان، بەڵام دوور لە دەستوەردانی پ. ک. ک، دەتوانن خۆیان ڕێکبخەنەوە و خۆیان چالاکبکەنەوە و ڕۆڵێکی گرنگ لە گۆڕینی سیستەمی حوکمڕانیی هەرێمدا ببینن.

### ٣- نارازییەکانی ناو حیزبەکان:

یەکێتیی و گۆڕان هەندێک جار پارتیی و حیزبەکانی تریش، بە بەردەوامیی خەڵکی نارازییان لێدەبێتەوە، ئەو خەڵکانەی لە یەکێتیی و گۆڕان دووردەکەونەوە بە سیاسەتی حیزبە دەسەڵاتدارەکانی هەرێم و سیستەمی حوکمڕانیی هەرێم ڕازی نیین. ئەگەر هەیە ئەو خەڵکە نارازییانەی گۆڕان و یەکێتیی لە چوارچێوەیەکی نوێدا یەکبگرن و بۆ گۆڕینی سیستەم کاری جدیی بکەن، بەڵام کێشەی ئەو پێکهاتەیە ئەوەیە بە کەلتوری حیزبە دەسەڵاتدارەکان سەیری بارودۆخی هەرێم دەکەن و بەرنامەی گۆڕانکاریی هەرێم دادەنێن، بۆیە بۆ ئەو پێکهاتەیە گرنگە سەرەتا خۆیان بگۆڕن.

### ٤- نەوەی نوێ:

لەو کاتەوە نەوەی نوێ دروستبووە و دەستی بە خەباتی سیاسیی کردووە، ئۆپۆزسیۆنی دەسەڵاتە و بەشداریی حوکمڕانیی هەرێم و عێراقیشی نەکردووە. پەیوەندییەکی دیبلۆماسیی لەگەڵ هێزە عێراقییەکان و نوێنەری دیبلۆماسیی وڵاتانی ڕۆژئاوا هەیە، توانای ڕاگەیاندنی باشی هەیە. لە ساڵی ٢٠٢١ لەگەڵ چەند هێزێکی تری عێراقیی هاوپەیمانیی ئۆپۆزسیۆنی دروستکردووە، ئەگەر نەوەی نوێ و هێزە سیاسییەکانی دەرەوەی دەسەڵاتی هەرێم پێکەوە لە چوارچێوەیەکی فراواندا بەرانبەر دەسەڵات بوەستنەوە، چاکسازیی و گۆڕانکاریی لە هەرێم نزیکدەبێتەوە.

٥- باشترین بژاردە بۆ ئەو پێکهاتانەی دەرەوەی دەسەڵات ئەوەیە، لە بەرەیەکی ئۆپزسیۆندا یەکبگرن، بەرنامەی چاکسازیی و گۆڕانکاریی دەسەڵاتی هەرێم داڕێژن و کارییپێبکەن.

### ٣- سیاسەتی عێراقی فیدراڵ:

هەتا ئەمڕۆیش هەرێمی کوردستان بە بڕیاری ٦٨٨ی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەککگرتووەکان لە هێرش و پەلاماری سوپای عێراق دەپارێزرێت، هەرێمی کوردستان لە ڕووی دەستوورییەوە بە دەستووری عێراقی ساڵی ٢٠٠٥ دەپارێزرێت. بە بەشدارییکردنی کورد لە دەوڵەتی عێراقی نوێدا، بە بوونی هاوپەیمانیی نێودەوڵەتیی لە عێراق و هەرێمی کوردستاندا، هەرێمی کوردستان دەپارێزرێت.

سیاسەتی سەرنەکەوتووی هەرێمی کوردستان وایکرد لە ڕووی ئابورییەوە خەڵکی عێراق گوزەرانیان لە خەڵکی هەرێمی کوردستان باشتربێت. سیستەمی سیاسیی عێراق لە سیستەمی سیاسیی هەرێم کراوەتربێت. دەستاودەستکردنی دەسەڵات هەنگاوی باشتر دەبڕێت، جیابوونەوە و سەربەخۆبوونی دامودەزگاکانی دەوڵەتی عێراق لە چاو هەرێمی کوردستاندا باشترە. ئەمە وایکردووە خەڵکی کوردستان چاویان لەسەر عێراق بێت.

لەبەرئەوەی کێشەی دەســەڵات لە نێوان حیزبە دەسەڵاتدارەکانی هەرێم بە چارەسەرنەکراویی مـاوەتـەوە، سیستەمی دوو_ئیدارەیی لە هەرێمدا باڵادەستە، هەندێک لە هێزە سیاسییەکان داوای فیدراڵیی پارێزگاکان دەکەن و دەیانەوێت سلێمانیی بخرێتەوە سەر ناوەند و لە هەرێم دابب‌ڕێت، ئەمەیش زەمینە بۆ گەڕانەوەی دەسەڵاتی عێراقی ناوەندیی خۆشدەکات.

ئەو گەندەڵییەی لە هەرێمدا هەیە ئەگەر چارسەرنەکرێت، کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیی چیتر پشتگیریی دەسەڵاتی هەرێم ناکات. ئەمەیش زەمینە بۆ گەڕانەوەی دەسەڵاتی عێراق خۆشدەکات. تورکیا و هەندێک وڵاتانی تری دراوسێ بەردەام داوا لە دەسەڵاتی ناوەندیی عێراق دەکەن سیستەمی فیدراڵیی هەڵبوەشێنێتەوە و سیستەمی ناوەندیی پەیڕەوبکات. مەبەستی تورکیا و ئەو وڵاتانە ئەوەیە ئەم سیستەمە فیدراڵییەی عێراق لە وڵاتەکانی ئەوانیشدا بڵاونەبێتەوە، هەتا باکوور و ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای کوردستان مافی فیدراڵیی وەرنەگرن. هەتا ئێستا دەوڵەتی عێراق سەری بۆ داواکانیان شلنەکردووە، بەڵام ئەگەر هاوکێشە سیاسییەکانی ناوچەکە گۆڕانی بەسەردابێت، ئەگەر هەیە عێراقی فیدراڵ بە دەستووردا بچێتەوە و سیستەمی فیدراڵیی هەڵبوەشێنێتەوە، لە ڕووی سیاسیی و دەستوورییەوە کۆتایی بە هەرێمی کوردستان بهێنێت.

کە دادگای فیدراڵیی عێراق بڕیاریدا دەرهێنان و ناردنەدەرەوە و بەبازاڕکردنی نەوت و گازی هەرێم نادەستوورییە، هەژموونی دەسەڵاتی عێراقی فیدراڵیی لە هەرێمی کوردستاندا زیاتر دەکات و ئەگەری گەڕانەوەی دەسەڵاتی عێراق بۆ هەرێمی کوردستان نزیکدەکاتەوە.

۳۱/ ۳/ ۲۰۲۲

**سلێمانیی**

## سەرچاوەکان:

١- تیۆری دەوڵەت و سیستەمە رامیارییەکان، یاساناس بەهادین ئەحمەد موحەممەد.

٢- دیموکراسیی چییە؟ ئالان تورین.

٣- لەبارەی دیموکراسیی و کومەڵگەی دیموکراتەوە، عەبدلئلاه بلقزیز.

٤- لێدوانی بنەماڵەی موراد کانی کوردەیی لە کەناڵی تەلەفزیۆنیی (NRT)، ٢٥/ ١١/ ٢٠٢١.

٥- دەستەواژەیەکی سەدام حوسەین بوو، وەسفی حیزبی بەعسی پێدەکرد.

٦- دکتور حوجەتوڵلا ئەیوبیی سەرهەڵدان و بەردەوامیی حیزبە سیاسییەکانی رۆژئاوا، وەرگێڕانی ئازاد وەلابەگی.

٧- دەستەواژەیەکی نەوشیروان مستەفا بوو، ساڵانی ٢٠٠٩ - ٢٠١٣ دژی دەسەڵاتی پارتیی و یەکێتیی بەکاریدەهێنا.

٨- ساڵی ١٩٨٣ لە سەردەمی پێشمەرگایەتییدا نەوشیروان مستەفا لەسەر ناڕونیی سامانی یەکێتیی گلەیی لە مام جەلال دەکرد.

٩- عومەری سەید عەلی.

١٠- مەلا بەختیار.

١١- لە کەناڵی تەلەفزیۆنیNRT هەواڵی کۆشکەکەی سەرۆکی حکومەتی هەرێم بڵاوکرایەوە.

١٢- پ. م. ف هێزی ئاشتیپارێزیی دەوڵەتی تورکیا.

١٣- رۆژنامەی ئاسۆ، رۆژنامەیەکی هەفتانە بوو لە شاری سلێمانیی دەردەچوو.

١٤- غاستون بۆتول ئا ئەوەیە شەڕ، وەرگێڕانی مەروان قەنەواتی، لە بڵاوکراوەکانی عوەیدات بەیروت پاریس ١٩٨١.

١٥- دادگای دژە گەندەڵیی عێراق، لەسەر گەندەڵیی دارایی داوای دەستگیرکردنی وەزیری بەرگریی عێراق و جێگری وەزیر و داوای دەستگیکردنی بەرپرسێکی حیزبی عێراق کرد، بۆ دادگاییکردنیان لەسەر دیارنەمانی برێک پارەی حکومەتی عێراق، سەرۆکی هەرێمی کوردستان لە هەولێر و سەلاحەدین داڵدەی بەرپرسە داواکراوەکانی دا و نەیاناردن بۆ دادگا.

١٦- قائیمقامی هەڵەبجە و ئەمین_سندووقی بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیسی سلێمانیی لەسەر ونکردنی دارایی دائیرەکانیان، لەبریی ئەوەی دەستگیربکرێن هەڵهاتن.

١٧- بەڵگەی ئۆفیسی وەهمیی پەیمانگای پزیشکیی هەڵەبجە.

١٨- گۆڤاری سڤیل، ساڵی یەکەم. ژمارە ٤٤، ٢٤-٧-٢٠١٠.

١٩- کەناڵی تەلەفزیۆنیی KNN.



د. فایەق گوڵپیی

لە باشووری کوردستان، ململانێی بنەماڵەکان لە ڕێگەی حیزبەوە، دیاردەیەکی زەقی بڵاوە و دەستی لە بینەقاقای بوارەکانی ژیانی خەڵک گیرکردووە. ئەگەر لە سەردەمی خەباتی چەکدارییدا حیزبایەتیی کاریگەریی ئەرێنیی لەسەر سیاسەتی کوردستان هەبووبێت، هەوڵی چارەسەرکردنی کێشە نەتەوەییەکانی گەلی کوردی دابێت، لە ڕاپەڕینی بەهاری 1991 بە دواوە، لایەنە نەرێنییەکانی حیزب موتوربەکراو بە ململانێی خێڵایەتییەوە، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ فراوانتر دەبن و کاریگەریی خراپ لەسەر دۆزی کورد دادەنێن. لە دوای ڕاپەڕینەوە حیزب ئاستەنگیی جدیی بۆ ئەرکەکانی حکومەت و پەرلەمان و دادگا دروستدەکات. لەبەرئەوەی حیزب بەرژەوەندیی توێژێکی تەسکی کۆمەڵگە دەپارێزێت، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ناکۆکیی زیاتر لە نێوان خەڵک و حیزبدا دروستدەبێت، خەڵک بە گومانەوە سەیری حیزب دەکات.

ئەمە لە کاتێکدایە کە گەلی کورد لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا بە دەست چەندیین کێشەی نەتەوەیی و ئابوریی و کەلتوریی و کۆمەڵایەتییەوە دەناڵێنێت، بۆ لابەلاکردنەوەی ئەو کێشانە، شانبەشانی دامودەزگاکانی دەوڵەت، حیزبیشی پێویستە. کەوابوو لێرەدا ڕووبەڕووی بارودۆخێکی ناکۆک دەبینەوە، لە سەرێکەوە جەماوەر حیزبی لەبەرچاوکەوتووە، لە سەرێکی ترەوە حیزب بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان پێویستە.

بۆ بەلاوەنانی ئەم ناکۆکییە، دوو ڕێگە هەیە، یان دەبێت حیزبەکان چاکسازیی بکەن، یان حیزبی مۆدیل_نوێ دابمەزرێت. بەو شێوەیە دیاردەی حیزبایەتیی سکەی سروشتیی خۆی وەردەگرێتەوە.